بسم الله الرحمن الرحيم

**ناسنامه تفسير**

........................

- **ناوی تفسیر: تفسير ابن الكثير بەکوردی**
- **وەرگێڕانی: علی حاجی عبدالله پریسی**
- **نۆرەی چاپ: یەکەم ۲۰۱۲**
- **شوێنی چاپ: تاران**
- **هەڵەچنی و دیزاین: ابراهیم معروف**

**بڵاوکار:**

**ناوەندی رۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

**سلێمانی**

﴿۞ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾﴾

## پلەو پایەی یوسف لە لای پاشای میسر

﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ﴾ منیش هەرگیز پاکانە بۆخۆم ناکەم، ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ﴾ نەفس هەموو شتێ بە مرۆڤ دەکا، مەگەر ئەوکەسەنەبێت پەروەردگارم بەزەیی پێیدا بێتەوە. واتە: ژنەکە گوتی: من پاکانە بۆ خۆم ناکەم چونکە نەفسو ئارەزوو هەموو شتێ بە مرۆڤ دەکا، بۆیە من ویستم دەستی لەگەڵا تێکەڵ بکەم. ئەم قسەیە مەشهورترو شیاوترو چاکترە بۆ ئەو ڕوداوەو مانای ئەم بەسەرهاتە. ماوەردی لە تەفسیرەکەیانەمەی گێڕاوەتەوە، ئیبنوتەمیمەش (ڕەحمەتی خوای لێبێ) پشتگیری ئەم قسەیەی کردووەو کتێبێکی تایبەتی لەسەر نووسیوە.ئەشڵێن: ئەمە: قسەکانی یوسفە (سەلامی خوای لێبێ) دەڵێ: ﴿ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ﴾ بۆ ئەوەی عەزیز بزانێ لە پاشە ملێ کاری خراپم لەگەڵ ژنەکەیا نەکردوە. ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾ بەڕاستی خودا فرِوفێڵی خائینان سەرکەوتوو ناکا بۆیە نوێنەرەکەم گەڕاندەوە تا پاشا بزانێو وەزیریش هەر بزانێ کە من پاکو خاوێنم، ئەم قسەیە هەر ئەو قسەیە کە ئیبنوجەریرو ئیبنوئەبی حاتیم گوتویانە، جگە لەمە هیچی تریان نەگوتوە. بەڵام قسەی یەکەم بەهێزترو ئاشکراترە، چونکە شێوازی قسەکان هەموو ئەوە دەگەیەنێ کە، ئەم قسانە، قسەی ژنەکەی عەزیزە لای پاشا کردوویەتی، یوسف (سەلامی خوای لێبێ) لەلایان نەبووە، بەڵکو دوای ئەوە پاشا داوای کردوە بیهێنن.

خوای گەورە باسی پاشای میسر دەکات، کاتێك بێتاوانیو پاکی یوسفی بۆ دەرکەوت دوای ئەو بوختانەی درایە پاڵی، دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ﴾ واتە: پاشا گوتی بیهێننە لای من دەیکەمە کەسێکی تایبەت بە خۆم، واتە: دەیکەمە پیاوێکی جێ ڕازو نیازی خۆم، ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ﴾ کاتێك دواندی و قسەی لەگەڵدا کرد بۆی دەرکەوت چەندە بەڕێزو شارەزاو پێکەوتوو ڕەوشت جوانە ﴿قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ﴾ پاشا گوتی: تۆ لەمڕۆوە لە لای ئێمە بەڕێزو جێگای باوەڕی. یوسف (سەلامی خوای لێبێت) گوتی: ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾ واتە: بمکەبە سەرکاری گەنجینەو بەروبوومی وڵات، دەیپارێزم و لێشی دەزانم، یوسف وەسفی خۆی بۆ پاشا کرد، ئەو وەسفکردنە دروستە بۆ کەسێك ئەگەر خەڵکی نەیدەزانی شارەزایی هەیە لە کارێکدا لە کاتی

پێویستدا، یوسف گوتی: ﴿إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ واتە: بە ڕاستی من پارێزەرێكی شارەزام، واتە: زۆر شارەزاو دووربین بوو، بۆ ئەو كارەی كە پێی سپێردرا، بۆیە داوای لە پاشان كرد بیكاتە بەرپرسیاری گەنجینەو بەروبوومی وڵات، كە بریتی بوو لەو ئەمرامانەی كە دەغڵو دانی تێدا كۆدەكرایەوە، لەو ساڵە قاتو قڕیانەی ڕوویان تێدەكات كە بۆی باسكردن، تا بە شێوەیەكی زۆر چاك دەستی پێوە بگرن، داواكەی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) قەبوڵ كرا بۆ ئەو كارە كە خۆی حەزی لێی بوو، وەك ڕێزلێنانێكیش وابوو بۆی.

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَاءُ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾﴾

**فەرمانڕەوایی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) لەناو میسردا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾ واتە: ئا بەو شێوەیە یوسفمان لەم سەر زەمینە بەڕێزەوە جێكردەوە، لە هەر شوێنێكی (میسر)دا ئارەزووی لێ بووایە لەوێ دەژیا، سودیو عەبدورەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێن: بە ئارەزووی خۆی (یوسف) هەرچی بویستایە لەوێدا دەیكرد[1].

ئیبنو جەریر دەڵێ: لە هەر شوێنێكدا یوسف بیویستایە دانیشێت ئارەزووی خۆی بوو دوای ئەوناڕەحەتیو بەندیخانەودەست بەسەریەی تووشی هات[2]. ﴿نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَاءُ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ هەر كەسێك ئێمە بمانەوێت بەربەزەیی خۆمانی دەخەین، پاداشتی چاكەكارانیش ون ناكەین، واتە: خۆڕاگری یوسفمان بە فیڕۆ نەدا، لەو سزاو ئازارەی براكانی دایانو ئەو خۆڕاگریەش لە بەندیخانەدا تووشی هات بەهۆی ژنەكەی عەزیزی میسرەوە، هەر لەبەر ئەوەیش بوو خودای مەزن بە دوای ئەو كارەساتانەی بەسەر یوسفدا هات ئەو ئاسایشو سەركەوتنەی بۆ ڕەخساندو یارمەتی داو فەرموویەتی: ﴿وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: پاداشتی چاكەكاران ون ناكەین، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ﴾ خۆ دیارە پاداشتی ئەولاش (ڕۆژی قیامەت) گەورەترە بۆ ئەوانەی باوەڕدارو خۆپارێزن، خوای گەورەهەواڵی ئەوەی داوە كە ئەوەی هەڵی گرتووەبۆ یوسفی پێغەمبەر(س)زۆرگەورە ترە لەوەی كە پێی داوەو سەرپشكی كردووەلە دونیادا كە

---

[1] الطبري (١٦/١٥١/١٥٢).

[2] الطبري (١٦/١٥١).

بە ئارەزووی خۆی چینەکات بیکات ، وەك لە بارەی سولەیمانەوە فەرموویەتی: ﴿هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾[1] ئەمەش بەخششی ئێمەیە کە لە ژمارە نایەت، سا تۆ یان چاکەی لێ بکە یان ڕای بگرە، سولەیمانیش نزیکی لەئێمەوە هەیەو، سەرەنجامی چاکیشی هەیە، موجاهید دەڵێ: مەبەست ئەوەیە، پاشای میسر کە ناوی ڕەیانی کوڕی وەلید بوو، یوسفی کردە وەزیر لە وڵاتی میسردا ئەو شوێنەی عەزیزی میسر یوسفی تیدا کڕی، مێردی ئەو ژنە کە ویستی دەست لەگەڵ یوسفدا تێکەڵ بکات ـ ئەو پاشایە کە لەسەر دەستی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) موسڵمان بوو.

﴿وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِى بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٦٢﴾﴾

## گەیشتنی براکانی یوسف بۆ ناو میسرو گەڕاندنەوەیان بە دەغڵو دانەوەو بەڵێندانیان بە هێناوی برا بچووکەکەیان بۆ میسر

سودیو موحەمەدی کوڕی ئیسحاقو کەسانی تریش لە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە، ئەوەی براکانی یوسفی وا لێکرد کە چوون بۆ وڵاتی میسر، ئەوەبوو کە یوسف بوو بە وەزیر لە میسرداو ئەو حەوت ساڵە بە پیتە تێپەڕیو ڕۆیشتو پاشان ئەو حەوت ساڵە قاتو قڕیە بە دوایدا هات، گرانی وڵاتی میسری بە تەواوی داگرت، ئەوەبوو ئەو قاتو قڕیە گەیشتە وڵاتی کەنعانیش، ئەو شوێنەی کە یەعقوب پێغەمبەرو (سەلامی خوای لێبێت) منداڵەکانی تێدا دەژیا، یوسف (سەلامی خوای لێبێت) لەو کاتەدا پاشەکەوتی دەغڵو دانی کردبوو بۆ خەڵکی، زۆر بە چاکی ئەو دەغڵو دانەی کۆکردبووەوە، بە هۆی ئەوەوە پارەو پوڵێکی زۆر بە دەست هاتبوو، دیاریەکی ئیجگار زۆری هەمەجۆرەیش هێنرابوو، خەڵکی لە هەموو کیشوەرو وڵاتو ناوچەکانەوە دەگەیشتنە میسر، بۆ ئەوەی بژێویماڵو منداڵیان بە دەست بێنن، یوسف (سەلامی خوای لێبێت) ساڵی باری وشترێك زیاتری بە کەس نەدەدا، خۆیشی تێری نەدەخوارد، خۆیو پاشاو سەربازەکانیشیان یەك جار نەبێت لە نیوەڕۆدا خواردنیان نەدەخوارد، بۆ ئەوەی ئەو خواردنەی هەیانە لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا بەشیان بکات، ئەوەیش بەزەییەك بوو لە لایەن خودای مەزنەوە بەرامبەر خەڵکی میسر، لە نێوان ئەو کەسانەی کە هاتن بۆ میسر بۆ کڕینی

[1] ص (٣٩ـ٤٠).

دانەوێڵە براکانی یوسف بوو کە بە فەرمانی باوکیان بەرەو میسر بەڕێ کەوتبوون، چونکە هەواڵیان بیستبوو کە عەزیزی میسر خواردن بە نرخی خۆی دەدات بە خەڵکی لەگەڵ خۆیاندا دراویان برد بۆ ئەوەی خواردنی پێ بکڕن ،"دە" کەسیان بە سواری کەوتنەڕێ، یەعقوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) بنیامینی کوڕی لە لای خۆی هێشتەوە کە برای دایكو باوکی یوسف بوو (سەلامی خوای لێبێت) لەبەر ئەوەی بنیامین دوای یوسف خۆشەویستترین کەس بوو لای باوکی، کاتێك براکانی چوونە لای، یوسف لە شوێنی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایەکەی خۆیدا دانیشتبوو، کاتێك سەیری براکانی کرد ناسینی، بەڵام براکانی ئەویان نەدەناسی، چونکە کاتێك لێی جیابووبوونەوە منداڵێکی بچووکی کەم تەمەن بوو، فرۆشتبوویان بە کاروانیەك، نەیاندەزانی بەرەو کوێ بردوویانە، بۆیە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات، ئاوای لێ دێت کە لێی هاتووە، لەبەر ئەوە نەیاندەناسی، بەڵام یوسف ئەوانی دەناسی،خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾ واتە: برایانی یوسف هاتن، بۆ بینینی چوونە ژوورەوە، (یوسف) ناسینیەوە، ئەوان ئەمیان نەدەناسی، سودی وکەسانی تریش گوتوویانە: یوسف دەستی کردە وتووێژ لەگەڵیاندا، وەك کەسێك کە نەیانناسێت پێی گوتن: چی ئێوەی هێناوە بۆ ئەم وڵاتەی من؟ گوتیان: ئەی عەزیز! ئێمە هاتووین بۆ خواردەمەنی، یوسف گوتی: لەوانەیە ئێوە جاسوس بن؟ گوتیان: ئەی پەنا بە خوا، یوسف گوتی: کەوایە ئێوە لە کوێوە هاتوون؟ گوتیان: لە وڵاتی کەنعانەوە هاتوونو باوکیشیان پێغەمبەری خوداو ناوی یەعقوبە، گوتی: ئایا جگە لە ئێوە منداڵی تری هەیە؟ گوتیان بەڵێ ئێمە دوانزە برا بووین، برا بچووکەکەمان نەماو لەناو چوو، لە هەموومان لای باوکمان خۆشەویستتر بوو، برایەکی ماوەتەوە باوکی لای خۆی هێشتویەتیەوە، بۆ ئەوەی لە جێی ئەو دڵی پێی بحەوێتەوە، یوسف فەرمانی دا شوێنیان بدەنیو ڕێزیان لێ بگرن. ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡ ﴾ دوای ئەمە باری بار کردن، گوتی: ئێوە برایەکی باوکیتان هەیە بۆمی بێنن، واتە: زۆر بە چاکی پێوانەکەی بۆ کردنو بارەکانی بۆ بارکردنو پێی گوتن: ئەو برای کە باستان کرد بۆم بێنن، بۆ ئەوەی ڕاستی ئەم قسەیەم بۆ دەردەکەوێت کە وتتان ﴿أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴾ ئەی نەتاندی من پێوانەکەم تەواویو خانەخوێیەکی چاکیشم. هەڵی دەنان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆلای. پاشان دەیترساندن وەك خوای گەورەلەسەر زمانی یوسف دەفەرموێت: ﴿ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ﴾ ئەگەر ئەوم (واتە بنیامین) بۆ نەهێنن، پێوانەتان لەلای من نیەو لێشم نزیك مەکەونەوە. واتە: ئەگەر لە جاری دووەمدا بنیامینتان بۆ نەهێنام لەگەڵ خۆتاندا، ڕۆزیتان لای من نیە، نزیکم نەکەونەوە ﴿قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴾

گوتیان هەولێکی زۆر دەدەین بۆتی بێنین، هیچ نکوڵیەکی لێ ناکەین هەتا ڕاستی قسەکانی ئێمەت بۆ دەردەکەوێت، ﴿وَقَالَ لِفِتْيَـٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَـٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ واتە: گوتی: بە غولامەکانی خۆی ئەو پارەی کە داویانە، بیخەنە ناو بارەکانیان، بەڵکو ئەگەر گەڕانەوە ماڵی خۆیان بیناسنەوە، بەڵکو ئەمجارەش بگەڕێنەوە، واتە: ئەو پارەیە لەگەڵ خۆیاندا بێننەوە. گوتراوە: یوسف (سەلامی خوای لێبێت) دەترسا لەوەی نەوەك پارەی تریان نەبێت کە بگەڕێنەوە و لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن بۆئەوە ڕۆزی پێ بکڕن.

﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾﴾

## داواکردنیان لە یەعقوب تابنیامینیان لەگەڵدا بنێرێت و وەڵامی یەعقوب بۆئەوان

خوای گەورە لە بارەی براکانی یوسفەوە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ﴾ کاتێك گەڕانەوە لای باوکیان گوتیان: باوکە لە پێوانە بێبەش کراین، سا تۆ براکەمان لەگەڵدا بنێرە پێوانەش دەکەین و ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ﴾ ئاگاداریشی لێ دەکەین. واتە: گەڕانەوە بۆ لای باوکیان و پێیان گوت: پاش ئەم جارە ئەگەر بنیامینمان لەگەڵدا نەنێری، هیچمان پێ نافرۆشن، چاك وایە براکەمان لەگەڵدا بنێری. هەندێ بە (يَكْتَلْ) خوێندوویانەتەوە. واتە: ئەو پێوانە بکات، دڵنیا بە ئاگاداری لێ دەکەین، هیچ ترست نەبێت لێی بێگومان بەو زووانە دێتەوە لات، بۆ یوسفیش (سەلامی خوای لێبێت) هەر وایان گوت: ﴿أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ﴾[1] سبەینێ لەگەڵمان بینێرە با گەشت بکات و خەریکی یاری کردن بێت، خۆمان پارێزکاری لێ دەکەین. بۆیە باوکیان پێی گوتن: ﴿قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ﴾ باوکیان گوتی: هەروەك جاری پێشوو براکەیم پێتان سپارد، ئەمیش بسپێرم بە ئێوە، واتە: چیتان بەسەر براکەی هێنا لە پێشاندا بەسەری ئەمیش ناهێنن، لەبەر چاومی ون کەن و لە یەك دورمان بخەنەوە؟ ﴿فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا﴾ هەندێ خوێندوویانەتەوە بە (حفظا) واتە: چاکترین پارێزەر خودایە ﴿وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ هەر خۆی لە هەموو دڵسۆزان دڵسۆزترە بە من، بێگومان بەزەیی بە پیری و

[1] یوسف (١٢).

لاوازیمدا دێتەوە دەزانێت چەندە شەیدای منداڵەکانم، لە خودا دەپاڕێمەوە کە بۆم بێنێتەوەو بە یەك شادمان بکاتەوە، چونکە خودا لە هەموو دڵسۆزێك دڵسۆزترە.

﴿وَلَمَّا فَتَحُوا مَتَاعَهُمْ وَجَدُوا بِضَاعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي هَذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ (٦٥) قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلَّا أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ (٦٦)﴾

**دەرهێنانی دراوەکان لە بارەکانیاندا**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَمَّا فَتَحُوا مَتَاعَهُمْ وَجَدُوا بِضَاعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي هَذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ واتە: کە بارەکانیان کردەوە، دراوەکەیان دەست کەوتەوە کە بۆیان ناردرابووەوە، گوتیان: باوکە چیمان دەوێ؟ ئەمە دەستمایەکەمانە کە بۆمان ناردراوەتەوە. ڕۆزی خێزانمان دێنین، ئەم بارەیش پێوانەیەکی زۆر نیە، خوای گەورە دەفەرموویێت: کاتێك براکانی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) بارەکانیان کردەوە، سەیریان کرد پارەکەیان بۆ گەڕاوەتەوە، ئەو پارەی کە یوسف (سەلامی خوای لێبێت) فەرمانی دا بە غولامەکانی بیخەنەوە ناو بارەکانیان، کاتێك کە پارەکەیان بینی لەناو بارەکانیاندا ﴿قَالُوا يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي﴾ واتە: ئێمە چیمان دەوێ؟ ﴿هَذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾ قەتادە دەڵێ: دوای ئەمە چیمان دەوێ؟ پارەکەمان بۆ گەڕێنراوەتەوەو پێوانەی تەواویشمان بۆ کراوە.[1]

﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾ ڕۆزی ماڵو منداڵیشمان دێنین، ئەگەر براکەمان لەگەڵدا ڕەوانە بکرێت ﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ﴾، چونکە یوسف (سەلامی خوای لێبێت) هەر کەسەو باری وشترێك دانەوێڵەی بۆ بارکردبوون ﴿ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ ئەم پێوانەیەش زۆر نیە، واتە: لە بری براکەیاندا کە لەگەڵیاندا بڕوات وەرگرتنی ئەمە شتێکی ئاسانە ﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ﴾ یەعقوب گوتی: لەگەڵتان نانێرم هەتا بەڵێنێکی تەواوم بەناوی خواوە نەدەنێ کە پارێزگاری لەو پەیمانو بەڵێنە دەکەن ﴿لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلَّا أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ﴾ کە هەر دەبێت بۆم بێننەوە، مەگین هیچ دەرەتانێکتان نەمێنێتو دەورە بگیرێن و توانای ڕزگارکردنیتان نەمێنێت ﴿فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ﴾ کاتێك کە پەیمانیان دایەو جەختی لەسەر کردنەوە، ﴿قَالَ اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ گوتی: خودا لەم گفتوگۆیەمان ئاگادارە.

---

[1] الطبري (١٦٢/١٦).

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: بۆیە یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) وای کرد، چونکە هیچ دەرەتانێکی نەمابوو، دەبووایە هەر بیناردایە بۆ ئەو دانەوێڵەیە، چونکە زۆر پێویستیان پێی هەبوو، ئیتر بنیامینی نارد لەگەڵیاندا.[1]

﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ (٦٧) وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٖ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ (٦٨) ﴾

**یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) فەرمانی دا بە کوڕەکانی لە چەند دەروازەیەکەوە بچنە ناو میسر**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖ ﴾ واتە: یەعقوب گوتی: ئەی کوڕەکانم لە یەك دەرگاوە مەچنە ناو (میسر) لە دەروازەی جیاجیاوە بچنە ژوور، خوای گەورە لێرەدا باسی یەعقوب دەکات (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك بنیامینی لەگەڵ کوڕەکانیدا بەڕێ دەکرد بۆ میسر، پێی گوتن: هەموویان لە دەروازەیەکەوە نەچنە ژوور، بەڵکو لە چەند دەروازەیەکی جیاجیاوە بڕۆن، وەك ئیبنو عەباس و موحەمەدی کوڕی کەعب و موجاهید و زەححاك و قەتادە و سودی دەڵێن: یەعقوب لەوە دەترسا چاو لێیان کار بکات، چونکە کوڕەکانی جوان و بەژن و باڵا ڕێکوپێك بوون، دەترسا خەڵکی بیانکەن بە چاوەوە، بێگومان چاو هەقە، سوار لە کۆڵ ئەسپەکەی دێنێتە خوار، پاشان یەعقوب گوتی: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾ واتە: من ناتوانم هیچ شتێك لە قەزای خوا لە ئێوە دوور بخەمەوە، فەرمان هەر بۆ خوایە و بەس، خۆم هەر بەو دەسپێرم و کەسانێکیش کە ئەو بە کارساز دەزانن با خۆیان هەر بەو بسپێرن، واتە: ئەو خۆپاراستنە، بڕیار و قەزای خوای ناگێڕێتەوە، بێگومان خودا ئارەزووی هەر شتێکی بوو بەرگری لێ ناکرێت و کەس ناتوانێت دژایەتی بکات و لەبەریدا بوەستێت، ﴿وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا﴾ واتە: کاتێك لەو جێیە کە باوکیان ڕای سپاردبوون چوونە ژوور، ئەم کارەیان هیچ شتێکی لە ئەوان دوور نەخستەوە، بەڵکو ئەوە نیازێك بوو لە دەروونی یەعقوبدا بوو بەو شێوەیە ئەنجامی دا، هەندێ لە زانایان دەڵێن: مەبەستی یەعقوب ئەوە بوو لە چاوی پیس دووریان

[1] الطبري (١٦/١٦٤).

بخاتەوە. ﴿وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِمَا عَلَّمْنَاهُ﴾ ئەویش بۆ خۆی بەهۆی ئەو شتانەی کە فێرمان کرد، زانایەك بوو بۆخۆی!، قەتادەو سەوری دەڵێن: یەعقوب زۆر بە چاکی کاری بە زانستەکەی دەکرد،[1] ئیبنو جەریر دەڵێ: شارەزابوو لەوەی کە فێرمان کرد ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[2] واتە: بەلام زۆرەی زۆری خەڵکی لێی نازانن.

﴿وَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ إِنِّي أَنَا أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾﴾

**یوسف سەرخۆشی لە بنیامین دەکات و دڵی دەداتەوە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَخَاهُ قَالَ إِنِّي أَنَا أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ واتە: کاتێك چوونە ژوورەوە بۆ ماڵەکەی یوسف براکەی خستە پاڵ خۆی و گوتی: من برای تۆم لەوەی ئەوان کردیان خەمگین مەبە، خوای گەورە لێرەدا باسی براکانی یوسف دەکات، کاتێك کە گەیشتنە لای یوسف و بنیامینی برایان لەگەڵدا بوو، کە برای دایك و باوکی یوسف بوو، بردنیە شوێنی تایبەتی خۆی و میوانداریەکی زۆر چاکی لێ کردن، بە سۆزو ڕێزێکی برایانەوە لەگەڵیاندا دەجولایەوەو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردن، بە تەنها وتووێژی لەگەڵ براکەیدا (بنیامین) کردو لە بەسەرهاتی خۆی ئاگاداری کرد کە چی بەسەر هاتووە، پێی گوت کە برای ئەوەو هیچ خەفەت نەخوا بەوەی براکانی بەسەریان هێناوەو پێشی گوت: کە ئەو نهێنیە بپارێزێت و لای براکانی باسی نەکات کە یوسف برای ئەوە. یوسف لەگەڵ بنیامین ڕێککەوت کە فێڵێك دەکات بۆ ئەوەی لای خۆی بیهێڵێتەوە زۆر بە سەنگینی و ڕێزو قەدرەوە.

﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا وَأَقْبَلُوا عَلَيْهِمْ مَاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾﴾

**دەفری ئاوخواردنەوەی پاشایان خستە ناو باری براکەی و بەو فێڵە بەند کرا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ السِّقَايَةَ فِي رَحْلِ أَخِيهِ﴾ واتە: کاتێك باری بۆ بارکردن ئاوخۆری (پاشای) خستە ناو باری براکەی. واتە: کاتێك وشترەکانیان لە خواردن بۆ

[1] الطبري (١٦/١٦٨).

[2] الطبري (١٦/١٦٨).

باردەکردن‌و بە ڕێیان دەکردن، یوسف فەرمانی دا بە غولامەکانی ئاوخۆری پاشا بخەنە ناو باری براکەی، لەسەر قسەی زۆرێك لە زانایان، ئەو دەفرە لە زیو دروست کرابوو، هەندێکی تریش گوتوویانە: لە ئاڵتون (زێڕ) دروست کرابوو، ئیبنو زەید دەڵێ: ئەو دەفرە پاشا ئاوی تێدا دەخواردەوە،[1] ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو قەتادەو زەححاك‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید دەڵێن: بەو ئاوخۆرە پێوانەیان بۆ خەڵکی دەکرد لە چاکترین خواردنی ئەو کاتە.[2] شوعبە دەڵێ لە ئەبو بیشرەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەباسەوە گوازراوەتەوەکە دەڵێ: ئاوخۆری پاشا لە زیو دروست کرابوو، ئاویان تێدا دەخواردەوە،جامۆڵکەیەك بووە وەك لگان وەك مەکوك (المكوك) وابووە.[3] ، کاتێك کەس ئاگای لێ نەبوو دەفرەکەیان خستە ناو بارەکەی بنیامین ، ﴿ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا الْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَارِقُونَ﴾ پاشان جارچییەك جاڕی دا: ئەی کاروانەکە ئێوە دزیتان کردووە، ﴿قَالُوا وَأَقْبَلُوا عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ﴾ واتە: ڕوویان تێکردن‌و گوتیان: ئێوە چیتان لێ گوم بووە؟ واتە: ڕوویان کردە جارچییەکە‌و گوتیان: چیتان لێ ون بووە. ﴿قَالُوا نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ﴾ واتەگوتیان: ئاوخۆریماڵی پاشامان لێ گوم بووە (کە پێوانەی پێ دەکرا). ﴿وَلِمَن جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ﴾ هەر کەسێك بیهێنێتەوە باری حوشترێکی هەیە، ئەمە لە بابی جەعالە واتە: پاداشتەکەی باری وشترێکی هەیە، ﴿وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ منیش دەستەبەرو کەفیلی دەبم، ئەمەیش لە بابی بارمتەو کەفالەتە.

﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا فَمَا جَزَاؤُهُ إِن كُنتُمْ كَاذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا جَزَاؤُهُ مَن وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزَاؤُهُ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَاءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾﴾

کاتێك لاوەکان تاوانی دزیان دایە پاڵ براکانی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) ﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ﴾ واتە: براکانی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) گوتیان: سوێند بە خوا خۆتان دەزانن ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین لەم زەویەدا بەدفەڕی بکەین‌و ئێمە

---

[1] الطبري (١٦/١٧٢).

[2] الطبري (١٦/١٧٣).

[3] الطبري (١٦/١٧٦).لەفەرهەنگەعەرەبییەکاندائەڵێ:لگانێکەچوارمشت ونیودانەوێڵە ئەگرێت (وەرگێڕ)

دزیمان نەکردووە. واتە: ئێوە خۆتان بۆتان دەرکەوتووەو چاك دەزانن لەو کاتەی ئێمەتان ناسیووە، ئێمە بۆ دزیکردن نەهاتووینو ئەو بەدفەرییەش لە ئێمە ناوەشێتەوە، ئەمانیش جگە لە ڕەوشتی جوان هیچ شتێکیان لێ نەبینیبوون، ﴿قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ﴾ واتە: لاوەکان گوتیان: ئەگەر درۆتان لێ دەرکەوت (دزەکە لە ئێوە بوو) سزاتان چیە؟ واتە: ئەو کەسەی کە دزیەکەی لێ ئاشکرابوو، ئاوخۆرەکەمان لای دۆزیەوە، سزاکەی چیە؟ ﴿قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: گوتیان: تۆڵەی ئەوەیە، لە باری هەر کەسێکدا دۆزرایەوە، ئەوە تۆڵەکەیەتی (ئەوەی دزیەکەی کردووە دەبێتە بەندەی ئەو کەسەی کە دزیەکەی لێکراوە) سزادانی ستەمکاران هەر ئەمەیە. شەریعەتی ئیبراهیم وابووە، هەر کەسێك دزی کردبێت دراوەتە دەستی دزی لێکراو، یوسفیش (سەلامی خوای لێبێت) مەبەستی هەر ئەوە بوو، بۆیەوەك(تەوریە) لە باری ئەوانەوە پێش باری براکەی دەستیان بە پشکنین کرد، بۆ ئەوەی گومانیان بۆ دروست نەبێت، ﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ واتە: ئەوسا پێش باری براکەی باری ئەوانی پشکنی، پاشان لە باری براکەی هێنایە دەرو براکەی لێ گلدانەوە بە پێی ئەو پابەندبوونو دانپیانانەی خۆیان،بەوە پابەندکران کە بڕوایان پێی هەبوو، ﴿كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ﴾ ئاوا فێڵمان بۆ یوسف دروست کرد، ئەمەیش یەکێکە لەو فێڵە باشانەی کە خوای گەورە پێی خۆشەو لێی ڕازیە، لەبەر ئەوەی بەرژەوەندیو کارزانی تیا بەدی دەکرێت، ﴿مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ﴾ لە یاسای ئەو پاشایە نەدەبووایە براکەی گل بدایەتەوە، زەححاكو کەسانی تریش ئەمەیان گوتووە.[1] ئەمە خوای گەورە بۆ یوسفی ڕەخساند کە براکانی پابەند بن بەو بەڵێنەی کە دابوویان، یوسف دەیزانی ئەو فەرمانە لە شەریعەتی ئەواندا هەیە، بۆیە خوای گەورە وەسفی کردووەو فەرموویەتی: ﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ﴾ مەگین خودا وا حەز بکات، هەر کەسێك ئێمە مەیلمان لێبێت پلەی بەرز دەکەینەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾[2] واتە: خودا ئەوانە لە ئێوە باوەڕیان هێناوەو ئەو کەسانەش کە لە زانیاری بەشدارن بە چەند پلە بەرزتریان دەکاتەوە. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ لەسەر

---

[1] الطبري (١٦/١٨٨).

[2] المجادلة (١١).

هەموو زانایەك زاناترێك هەیە، حەسەنی بەسری دەڵێ: هیچ زانایەك نیە مەگین زاناترێك لەسەرەوە هەیە، هەتا دەگاتە خوای گەورە.[1] هەر بەو شێوەیە عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێ: ئێمە لە لای ئیبنو عەباس بووین قسەیەکی زۆر سەیری گێڕایەوە، پیاوێکیش قسەکەی زۆر بە لاوە سەیر بوو بۆیە گوتی: سوپاس بۆ خودا کە لەسەر هەموو خاوەن زانستێکەوە زاناترێك هەیە، ئیبنو عەباس گوتی: قسەیەکی خراپت کرد، خودا زاناترەو هەر خۆیشی لەسەر هەموو زانایەکەوەیە.[2] هەر بەو شێوەیە سەمماك ڕیوایەتی کردووە لە عیکریمەوەوئەویش لە ئیبنو عەباسەوە ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ دەڵێ: دەبێت فلان زاناتر بێت لە فلان‌و کەسێکی تریش لە کەسێکی ترو خودایش لەسەروو هەموو زانایەکەوە زاناترە.[3] عیکریمەیش هەر وای گوتووە.[4] قەتادە دەڵێ: لەسەر هەموو زانایەکەوە زاناتر هەیە هەتا دەگاتە خوای گەورە، زانیاری لە خوداوە دەست پێدەکات، زانایانیش فێری بوون، هەر بۆ لای خودایش دەڕواتەوە، وە لە خوێندنەوەی عبدالله دا بەم شێوەیە هاتووە ﴿وفوق كل ذى علم عالم﴾[5] واتە: لەسەر گشت زانایەکەوە زانای تر هەیە.

﴿قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾﴾

**براکانی یوسف یوسفیان تاوانبارکرد بە دزی**

براکانی یوسف کاتێك کە ئاوخۆرەکەی پاشایان بینی لە بارەکەی بنیامیندا دەرهێنرا ﴿قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾ واتە: ئێستا دزی دەکات، لە پێشووشدا برایەکی ئەو دزی کرد. پاکانە دەکەن بۆ خۆیان لای عەزیزی میسر کە ئەمان دوورن لە ڕەوشتی ئەم برایانەوە، ئەم کارەی بنیامین هەر لە کاری براکەی تری دەکات کە لە پێشدا دزی کرد، مەبەستیان یوسف بوو (سەلامی خوای لێبێت) خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ﴾ یوسف ئەمەی لە دڵی خۆیدا هێشتەوەو لای ئەوان ئاشکرای نەکرد، واتە: ئەو وتەی دوای ئەمەی ئاشکرا نەکرد، کە خوای گەورە دەفەرمووێت لەسەر زمانی ئەو: ﴿قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾

[1] الطبري (١٦/١٩٣).
[2] عبدالرزاق (٢/٣٢٧).
[3] الطبري (١٦/١٩٢).
[4] الطبري (١٦/١٩٢).
[5] الطبري (١٦/١٩٣).

واتە: گوتی: ئێوە لەوان خراپترن، ئەو باسەیش ئێوە دەیکەن، خوا لە ئێوە چاکتر دەزانێت، ئەمەیش لە بابی ئیزمارە(واتەشاردنەوەی مەبەست) پێش ئاشکراکردن، عەوفی دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ﴾ دەڵێ: یوسف لە دڵی خۆیدا گوتی: ﴿قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾!

﴿ قَالُوا يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَـٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّظَـٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾﴾

## پێشنیاری براکان کە یەکێکیان لە جێی بنیامین گل بدرێتەوە وقەبوڵ نەکردنی ئەو پێشنیارە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالُوا يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ﴾ واتە: گوتیان ئەی عەزیزی میسر: ئەو باوکێکی زۆر پیری بە تەمەنی هەیە، لە جێگەی ئەو یەکێك لە ئێمە گل بدەرەوە، واتە: کاتێك بڕیار درا بنیامین گل بدرێتەوەو لای یوسف بمێنێتەوە بە پێی ئەو دان پیانانەی خۆیان، دەستیان کرد بە قسەی نەرمو سۆزو بەزەیی جوڵانی یوسف بۆ لای خۆیان گوتیان ئەی عەزیز ئەم کوڕە باوکێکی زۆر بە تەمەنی هەیەو زۆر خۆشی دەوێ، خستوویەتیە جێی ئەو کوڕەکەی کە لە دەستی چوو زۆر دڵی پێی دەکرێتەوە ﴿ فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ﴾ یەکێکمان لە جێی ئەو لای خۆت گل بدەوە، ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: ئێمەدەبینین تۆیەکێکی لەپیاو چاکان. واتە: لەڕیزی دادپەروەران و ڕاس بێژان و خێرخوازانی، ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَـٰعَنَا عِندَهُۥٓ﴾ واتە: یوسف گوتی: پەنا بە خوا، ئەگەر ئێمە جگە لە کەسێك کە ئاوخۆری خۆمان لە لای ئەو دۆزیوەتەوە، گل بدەینەوە. وەك خۆتان گوتووتانەو دانتان پێداناوە، ﴿إِنَّآ إِذًا لَّظَـٰلِمُونَ﴾ ئەگەر وا بکەین ئێمە لە ستەمکاران دەبین،یانی: ئەگەر بێتاوانێکمان لە جێی تاوانبارێك گلدایەوە.

﴿ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيًّا ۖ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِي يُوسُفَ ۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِي ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِي كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِيٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾﴾

**ڕاویژکردنیان و گفتوگۆی برا گەورەکەیان لەگەڵیاندا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا اسْتَيْأَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيًّا﴾ واتە: کاتێك کە لێی نائومێد بوون بۆ چپەو سرتە چوونە کەنارێکەوە، خوای گەورە باسی براکانی یوسف دەکات، کاتێك کە بێهیوا بوون لەوەی کە بنیامینی برایان ئازاد بکەن کە بەڵێنیان بە باوکیان دابوو لەگەڵ خۆیاندا دەیهێننەوە بۆ لای، سوێندیشیان بۆ خواردبوو، بەڵام ئەم ڕووداوە بوو بە ڕێگر لەبەر دەمیاندا بۆیە ﴿خَلَصُوا﴾ کەناریان گرت لە خەڵکی ﴿نَجِيًّا﴾چەچپ و وتووێژیان دەست پێکرد، ﴿قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوا أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ اللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِي يُوسُفَ﴾ واتە: گەورەکەیان هاتە قسەو گوتی: بۆ ئێوە نەتانزانیووە کە باوکتان پەیمانێکی بە ناوی خودا لێ وەرگرتن، لەوەو پێشیش خراپەی لە ڕادە بەدەرتان دەربارەی یوسف کردووە، برا گەورەکەیان کە ناوی ڕوبیل بوو، هەندێکیش گوتوویانە: ناوی یەهوزا بووە، پێی گوتن: ئێوە سوێندتان خواردو پەیمانتان دا کە بنیامین لەگەڵ خۆتاندا بیننەوە بۆ لای باوکی، خۆ بە چاوی خۆتان دیتتان کە حەزی لێ نەبوو لەگەڵتان بینێرێت، لە پێشیشدا یوسفتان لە باوکی دوورخستەوە لەناویاندا هەر ئەم برا گەورەیان بوو کاتێك براکانی ویستیان یوسف بکوژن، پێی گوتن: نەیکوژن و بیخەنە ناو ئەو بیرە چاکترە . بۆیە گوتی: ﴿فَلَنْ أَبْرَحَ الْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِي أَبِي﴾ واتە: سا لەم سەر زەمینە دەرناچم، هەتا بابم ئیزنم نەدا بگەڕێمەوە بۆ لای و لێم ڕازی نەبێت، ﴿أَوْ يَحْكُمَ اللَّهُ لِي﴾ واتە: یان خودا بڕیارم بۆ دەدات،ئەڵێن: بە شمشێر واتە: بە کوشتن، ئەشڵێن :یاخود بڕیارم بۆ دەداتو یارمەتیم دەدات بۆ وەگرتنەوەی براکەم، ﴿وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾ واتە: ئەو خۆیشی چاکترین دادوەرە، ﴿ارْجِعُوا إِلَىٰ أَبِيكُمْ فَقُولُوا يَا أَبَانَا إِنَّ ابْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَا إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا﴾ واتە: ئێوە بچنەوە لای بابتان، بڵێن: باوکە کوڕەکەت دزی کردووە، شایەتیشمان نەداوەلەوەدانەبێ کەلێ ی ئاگادارین، پاشان کوڕە گەورەکە فەرمانی پێدان کە بڕۆنەوە بۆ لای باوکیان و ئەوەی ڕوویداوە وەکو خۆی باس بکەن بۆی، هەتا ئەوەی بنیامین کردوویەتی بیکەنە بەڵگە لەسەر بێتاوانی خۆیان لای باوکیان و بڵێن: ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَافِظِينَ﴾ واتە: خۆ ئێمە ئاگاداری شاراوەو نهێنیەکان نەبووین، قەتادەو عیکریمە دەڵێن: یانی نەمانزانی کوڕەکەت دزی کردووە.[1] عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: گوتیان: ئاگامان لەوە نەبوو، کە شتێکی لێ دزراوە،

[1] الطبري (١٦/٢١١/٢١٢).

بەڵکو پرسیمان تۆڵەو سزای دز چیە؟ ﴿وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ ٱلَّتِي كُنَّا فِيهَا﴾ لە خەڵکی ئەو شارە کە ئێمەی لێ بووین پرسیار بکە، گوتراوە: مەبەست بە ﴿ٱلۡقَرۡيَةَ﴾ شاری میسرە.[1] قەتادەیش هەر وای گوتووە.[2] شتی تریش گوتراوە. ﴿وَٱلۡعِيرَ ٱلَّتِيٓ أَقۡبَلۡنَا فِيهَاۖ﴾ لەو کاروانەیش کە لەگەڵیان هاتینەوە پرسیار بکەن لە بارەی ڕاستیو ئەمانەتو پارێزگاریو چاودێری کردنمان لە بنیامین، ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ واتە: کە ئێمە ڕاست دەڵێین کەئەڵێن: نبیامین دزی کردووە، بە هۆی ئەو دزیەوە گلیان داوەتەوە.

﴿قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٌۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾﴾

**وەڵامی پێغەمبەری خودا(یەعقوب)و ژیانی دوای بیستنی ئەو هەواڵە پڕ ژانە**

یەعقوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) کاتێك هەواڵی بنیامینیان بۆ هێنا، هەر ئەو قسەی پێ گوتن کە کاتی خۆی لەکاتی هێنانەوەی کراسە خوێناویە درۆینەکەی یوسفیان بۆ هێنا، وەك خوای گەورە لەسەر زمانی یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٌۖ﴾ یەعقوب گوتی: نەخێر هەوای دڵتان کارەکەی لا جوان کردوون، بۆیە دەبێت دان بە خۆدا بگرم بە جوانی، هەندێ کەس گوتوویانە: لەبەر ئەوەی ئەم کارەیشیان لە کاری یەکەم جاریان دەچوو، هەمان بڕیاری پێشووی وەرگرتووە، ئەوەیش کە یەعقوب گوتی: وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٌۖ﴾ ڕاستە، پاشان هانا دەبات بۆ خودا کە هەرسێ کوڕەکەی بۆ بهێنێتەوە: یوسفو بنیامینی برای و ڕوبیل.[3] کە لە میسر مایەوە هەتا خودای مەزن بڕیارێکی بۆ دەدات لەو بارەیەوە. یان باوکی لێی خۆش دەبێتو فەرمانی پێدەکات بگەڕێتەوە بۆ لای، یان براکەی بە دزیو پەنهانی وەردەگرێتەوە. بۆیە گوتی: وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ بەڵکو ئەو خودایە هەموویان

---

[1] الطبري (١٦/٢١٠).

[2] الطبري (١٦/٢١٢).

[3] الطبري (١٦/٢١٤).

بهێنێتەوە بۆ لای من، خودا خۆی ئاگادارە بە حاڵم‌و کارزانە لە کردارو گفتارو بڕیاردا. ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ واتە: ئیتر ڕووی لەوان وەرگێڕاو گوتی: ئەی داخم بۆ یوسف لە داخ‌و خەفەتی ئەو تانە کەوتە سەرچاوانی‌و هەروا پیشی دەخواردەوە. واتە: یەعقوب خەفەتی ئەم دوو کوڕە، خەم‌و خەفەتی یوسفی بۆ تازە کردەوە کە لە دڵیدا پەنگی خواردبووەوە، عبدالرزاق دەڵێ: سەوری هەواڵی پێداوین لە سوفیانی عوسفوریەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەریرەوە کە گوتوویەتی: جگە لەم ئومەتە وتەی ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾ بە هیچ ئومەتێکی تر نەدراوە. ئایا گوێ ناگرن بۆ قسەی یەعقوب کە گوتی: وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾.[1] قەتادەو کەسانی تریش گوتوویانە: یانی: بێدەنگ بوو، دەردەدڵی خۆی لای کەس باس نەدەکرد.[2] زەحاك دەڵێ: ﴿كَظِيمٌ﴾ واتە:یەعقوب خەفەت بارو دڵ تەنگ بوو.[3] ئا لەو کاتەدا کوڕەکانی زۆر دڵیان بۆی سوتاو بەزەییان پێدا دەهاتەوە ﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُاْ تَذْكُرُ يُوسُفَ﴾ واتە: گوتیان: سوێند بە خوا تۆ هەرگیز یوسف لەبیر ناکەی ﴿حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا﴾ واتە: هەتا نەخۆش دەکەوی‌و هێزت تیانامێنێت، ﴿أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ﴾ یان دەتکوژێت، واتە: ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بیت‌و واز نەهێنیت دەترسین لەناوت بەرێت‌و نەمێنییت ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) وەڵامی دانەوەو گوتی: شکات‌و خەم‌و خەفەتی خۆم هەر بۆ خودا ئەدرکێنم، ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ واتە: من لە خوداوە گەلێك شتی وا دەزانم کە ئێوە لێی ئاگادار نین، بە هیوای هەموو چاکەیەکم لەلای خوداوە. لەئیبنوعەباسەوەئەگێڕنەوەکەلەتەفسیری ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ دافەرموویەتی مەبەستی خەوەکەی یوسفە کەخەوێکی ڕاستەو[4] بێگومان خودا هەردەیهێنێتەدی.

---

[1] عبدالرزاق (٢/٢٢٧).

[2] الطبري (١٦/٢١٦).

[3] الطبري (١٦/٢١٨).

[4] الطبري (١٦/٢٢٧).

﴿يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾﴾

## فەرماندان بە گەڕان بە دوای یوسف و براکەیدا

خوای گەورە لەسەر زمانی یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾ واتە: ڕۆڵەکانم، بڕۆن، بەڵکو سۆراغێکی یوسف و براکەی بکەن، نائومێدیش مەبن لە بەزەیی خودا، هەر ئەوانەی خوانەناسن لە بەزەیی خودا نائومێدن، خوای گەورە باس لە یەعقوب پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لێبێت) کە بانگی منداڵەکانی کرد کە بچن بگەڕێن بە دوای یوسف و بنیامینی برایدا گوێیان هەڵخەن بە هەموو لایەکی زەویدا،ووشەی(تحسس) بۆ کاری خێر بەکار دەهێنرێت، بەڵام (تجسس) بۆ کاری خراپ بەکاردەهێنرێت، هەڵی نان و مزگێنی دانیّ و فەرمانی پێدان کە بێهیوا نەبن لە بەزەیی خودا، واتە: نائومێدو دڵسارد نەبن لە بەزەیی خودا، بۆ ئەو کارەی نیازیانەو بۆی دەچن، چونکە هیچ کەسێك بێهیواو نائومێد نابێت لە بەزەیی خودا جگە لە کۆمەڵی خوانەناسان.

## براکانی یوسف چوونە لای یوسف

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ﴾ لە دوای ئەوەی براکانی یوسف (سەلامی خوای لێبێت) گەیشتنە لای، مانای قسەکە ئەوەیە: کاتێك کە براکانی یوسف گەیشتنە میسرو چوونە لای یوسف ﴿قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ﴾ گوتیان: ئەی عەزیز هەم خۆمان و هەم خێزانمان لە بژێویدا داماو کەلەلاین، مەبەستیان ئەوە بوو، قاتوقڕیو نەبوونیو هەژاری ڕووی تێ کردوون. ﴿وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ﴾ کەمێك پارەمان (دراومان) هێناوە ، ڕۆزی پێ بکڕین، موجاهیدو حەسەن و کەسانی تریش دەڵێن :(مزجاة) یانی: دراوێکی کەم.[1] پاشان خوای گەورە باسی براکانی یوسف دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ﴾ واتە: گوتیان بە یوسف: پێوانەی تەواومان بۆ بکە وەك جاری پێشو بەم دراوە کەمە، ﴿وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ﴾ واتە: بیکە سەدەقەی سەری خۆت. ئیبنو مەسعود خوێندوویەتیەوە بە (فأوفر رکابنا

[1] الطبري (١٦/٢٣٨).

وتصدق علینا)[1] یانی بارەکانمان بۆ بار بکەو خێریشمان پێ بکە، ئیبنو جورەیج دەڵێ:(تصدق علینا)یانی: خێرمان پێ بکە براکەمان پێ بدەرەوە.[2] پرسیار کرا لە سوفیانی کوڕی عویەینە ئایا سەدەقە (زەکات) حەرام کراوە لە هیچ پێغەمبەرێك لە پێش پێغەمبەری خۆمان (ﷺ)؟ گوتی: ئەی گوێتان لەم ئایەتە نەبووە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَوْفِ لَنَا ٱلْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ إِنَّ ٱللَّهَ يَجْزِى ٱلْمُتَصَدِّقِينَ﴾خێرمان پێ بکە خودا پاداشتی خێرومەندان دەداتەوە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە[3].

﴿قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓا۟ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِى ۖ قَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾﴾

## یوسف خۆی ناساند بە براکانی و لێشیان خۆش بوو

خوای گەورە باسی یوسف دەکات (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك براکانی باسی گرانی و قاتوقڕی و کەمی خۆراك و نەبوونی خۆیانی بۆ کرد، یوسف لەلایەکەوە باوکی وەبیر هاتەوە کە چەندە خەفەتبارو دڵگران بووە بە هۆی نەمان و پچڕانی خۆیی و بنیامینی برایەوە لێی وە لەلایەکی ترەوەئەو دەسەلاتو خێرو بێرەی وەبیرهاتەوەئەو تێیدا دەژی، لەو کاتەدا زۆر سۆزو بەزەیی جوڵاو دڵی سوتا بۆ باوك و براکانی و گریان گرتی و خۆی ناساند بە براکانی و ﴿قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ﴾ واتە: گوتی: ئایا زانیوتانە چیتان بەسەر یوسف و براکەی هێنا؟ ئێوە بە ڕاستی نەزان بوون. واتە: چۆن ئێوە یوسفو براکەیتان لەیەك جیاکردەوە. ﴿إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ﴾ واتە: ئەو نەزانیەتان وای لێکردن بەو کارە هەڵسن. وا دیارە یوسف (سەلامی خوای لێبێت) کە خۆی پێ ناساندن بە ئیزنی خودا بوو ـ والله أعلم ـ خودا فەرمانی پێکرد، وەك چۆن لە دوو جارەکەی تردا خۆی لێ شاردنەوە کە هەر بە فەرمانی خودا بوو، خۆی لێ ئاشکرا نەکردن ـ والله أعلم ـ بەڵام کاتێك کە ژیان کەوتە تەنگانەو زۆر ناڕەحەت بوون، خوای گەورە لە کاتی تەنگانەدا دەرووی لێ کردنەوە. وەك خوای

---

[1] الطبري (١٦/٢٣٨).

[2] الطبري (١٦/٢٤٣).

[3] الطبري (١٦/٢٤٢).

گەورە لەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا﴾[1] لەپاش تەنگانی فەرحانی هەیە، بەڵێ لە پاش تەنگانەدا فەرحانی هەیە. ئا لەوێدا گوتیان: ﴿قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ﴾ واتە: ئا توخوا بە ڕاستتە تۆ یوسفی؟ ئوبەی کوڕی کەعی خوێندوویەتیەوە (أو أنت يوسف) ئیبنو موحەیسن خوێندوویەتیەوە (إنك لأنت يوسف) بەلام خوێندنەوەی یەکەم مەشهورە، چونکەئەوپرسیارکردنە نیشانەی بەگەورە سەیرکردنی شتێکە، واتە: سەریان سوڕما لەوەی کە ئەوان دوو ساڵ زیاترە دێن‌و دەچنە لای یوسفو نایناسنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کەئەو ئەوان دەناسێت‌و خۆی ئاشکرا ناکات لێیان، بۆیە بە شێوەی پرسیارکردن گوتیان: ﴿قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ۖ قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَٰذَا أَخِي ۖ قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا﴾ ئا توخوا بە ڕاستتە تۆ یوسفی؟ یوسف گوتی: خۆم یوسفم‌و ئەوەیش براکەمە، خوا بەر منەتی خۆی خستین، دوای ئەو ماوەیە کە تەفروتونا بووین کۆی کردینەوە ﴿إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: چونکە هەر کەسێك خۆ پارێزو خۆڕاگر بێت، دیارە خودا پاداشتی ئاکار چاکان ون ناکات، ﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾ واتە: سوێند بە خوا خوای گەورەباوی تۆی داوەبەسەرئێمەدا و ئێمە لە خەتاکاران بووین، دانی پێدادەنێن‌و دەڵێن: کە ئەو (واتە یوسف) ڕێزی زیاترەو هەڵبژاردەیە لەناویاندا لە ڕەوشت چاکی‌و ڕوخسار جوانی‌و دەوڵەمەندی‌و دەسەلات‌و هەڵسوکەوتداو لە پێغەمبەریشدا، دانیشی پێدا دەنێن کە ئەوان خراپ بوون‌و ناهەقیان دەربارەی کردووە ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ﴾ واتە: یوسف گوتی: ئەمڕۆ هیچ گلەیی‌و قسەیەکتان لەسەر نەماوە لە لایەن منەوە جارێکی تر من باسی ئەو خراپانەی ئێوە ناکەم، پاشان داوای لێخۆش بوونیشی بۆ کردن لە لایەن خوداو گوتی: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ واتە: خوا لێتان خۆش بێت، ئەو لە هەموو بە سۆزان بەسۆزترە.

﴿اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ۝٩٣ وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ ۖ لَوْلَا أَن تُفَنِّدُونِ ۝٩٤ قَالُوا تَاللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَالِكَ الْقَدِيمِ ۝٩٥﴾

[1] الشرح (٥-٦).

**کراسەکەی یوسف‌و بۆنی بەسەر یەعقوبدا ( سەلامی خوای لێبێت )**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: یوسـف گـوتی: ﴿ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا﴾ واتە: ئەم کراسەی من بەرنەوە بیخەنەسەر دەم‌و چاوی بابـەم، چاوەکانی چاك دەبێتـەوە! چونکە بـاوکی ئەوەنـدە گریـابوو چاوەکانی لـە دەست دابـوو، کوێر بووبـوو ﴿وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾ واتـە: هـەموو کـەس‌و کارەکانیشتانم (لـە نـەوەی یـەعقوب) بـۆ بێنن، ﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ﴾ واتە: کاتێك کـاروان کەوتـەڕێ، واتـە: لـە میـسر دەرچـوو، ﴿قَالَ أَبُوهُمۡ﴾ واتـە: باوکیـان (یەعقوب) (سەلامی خـوای لێبێـت) لای ئـەو کوڕانـەی کـە مابوونـەوە لـەوێ گـوتی: ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ واتە: من بۆنی یوسفم بۆ دێت ئەگەر نەڵێن قسەی هەڵیت‌و پـەڵیت‌و بـێ مانـا دەکات، واتە: پیر بووە‌و بیروهۆشی نەماوە، عبدالرزاق ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئیبنـو عەباسـەوە دەڵـێ: کاتێك کاروانەکە (لە میسر)دەرچوو بایـەك هـەڵی کـرد، بـۆنی کراسـەکەی یوسـفی بـۆ یـەعقوب هێنـاو ئەویش گوتی: ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ بۆنی کراسەکەی یوسف هات بەسەریدا لـە دووری هەشت ڕۆژە ڕێوە.[1] هەر بەم شێوەیە سوفیانی سـەوری‌و شـوعبە‌و کەسـانی تـریش ڕیوایـەتیان کردووە لە ئەبو سینانەوە.[2] ﴿لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾ ئیبنـو عـەباس‌و موجاهیـدو عـەتاو قـەتادە‌و سـەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێن: ئەگەر بەبێ عەقڵم نەزانن،[3] موجاهید جارێکی ترو حەسەن دەڵێن: ئەگـەر نـەڵێن چووە بە ساڵەوە[4] خلەفاوە،خوای گەورە لەسەر زمانی ئـەو کوڕانـە فەرموویـەتی: ﴿قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ﴾ واتە: گوتیان: سوێند بـە خـوا تـۆ هـەر لەسـەر هەڵەکـەی کۆنی خـۆتی. ئیبنـو عەباس دەڵێ: لەسەر هەڵە پێشووەکەی خۆتی.[5] قەتادە دەڵێ: یانی لەسەر هەڵە پێشووەکەی خـۆتی، خۆشەویستی یوسفت هەر لە بیر ناچێت لە جێی ئەوەی دڵی خۆش بکەن، قسەیەکی زۆر جـەرگ بڕیـان

---

[1] عبدالرزاق (٣٢٩/٢).

[2] الطبري (٢٥٠/١٦).

[3] الطبري (٢٥٣/١٦).

[4] الطبري (٢٥٥/١٦).

[5] الطبري (٢٥٧/١٦).

پێ گوت، کە نەدەبوو ئەو قسەیە لەگەڵ پێغەمبەرێکی خودا(سەلامی خوای لێبێت) یان لەگەڵ باوکیاندا بیکەن.[١] سوودیو کەسانی تریش هەر وایان گوتووە.[٢]

﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٩٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ٩٧ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٩٨﴾

## یەهوزا کراسەکەی یوسفی بە مژدە هێنا بۆ یەعقوب

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗا﴾ واتە: کە مزگێنی دەر گەیشتەجێ، کراسەکەیان خستە سەر چاوی (یەعقوب) چاوەکانی چاك بوونەوە، ئیبنو عەباسو زەحاك دەڵێن: ﴿ٱلۡبَشِيرُ﴾ یانی: پۆسەچی.[٣] موجاهیدو سودی دەڵێن: ئەو مزگێنی دەرە یەهوزای کوڕی یەعقوب بوو،[٤] سودی دەڵێ: بۆیە یەهوزا کراسەکەی هێنا، چونکە ئەو کراسەکەی یوسفی خوێناوی کردبوو بە خوێنی درۆینە، پێی خۆش بوو ئەوە بسڕێتەوە بە ئەمە، کراسەکەی هێنا خستیە سەر چاوی باوکیو چاوەکانی چاك بووەوە.[٥] پاشان یەعقوب بە کوڕەکانی گوت: ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: من پێم نەگوتن: ئەوەی من لە لایەن خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن؟ واتە: من دەزانم بەم زووانە خودا بۆم دێنێتەوە، پێشم گوتن: ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ﴾.

## پەشیمانی دەربڕینی براکانی یوسف (سەلامی خوای لێبێت)

دوای ئەو براکانی یوسف بە نەرمو نیانیەوە ﴿قَالُواْ﴾ بە باوکیان گوت: ﴿يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ٩٧ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: بابە ئێمە لە ڕێ لاماندواە لە پەروەردگارت داوا بکە لێمان خۆش ببێت، باوکیان گوتی: لەداهاتودا داوا لە پەروەردگاری خۆم دەکەم کە لێتان ببورێت هەر خۆی لە گوناه دەبورێتو دلۆڤانە، واتە: ئەوەندە دلۆڤانە هەر

---

[١] الطبري (٢٥٧/١٦).

[٢] الطبري (٢٥٧/١٦).

[٣] الطبري (٢٥٨/١٦).

[٤] الطبري (٢٥٨/١٦).

[٥] الطبري (٢٥٩/١٦).

کەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای، لێی خۆش دەبێت، ئیبنو مەسعودو ئیبراهیمی تەمیمیو عەمری کوڕی قەیسو ئیبنو جورەیجو کەسانی تریش دەڵێن: دووعاکەی بۆ دواخستن بۆ کاتی بەرەبەیان[1].

﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾

**پێشوازیکردنی یوسف لە دایكو بابیو هاتنەدی ڕاستی خەونەکەی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ﴾ واتە: کاتێك کە هاتنە لای یوسف دایکیو باوکی بردە لای خۆی، خودای گەورە باسی گەیشتنی یەعقوب دەکات (سەلامی خوای لێبێت) بۆ ناو میسرو چوونی بۆ لای یوسف ، یوسف لە پێشدا داوای کرد لە براکانی کە خۆیانوماڵو منداڵیان هەموو بێنن بۆ لایو هیچیان لەوێ نەمێنێتو کۆچ بکەن لە وڵاتی کەنعانو بێن بۆ وڵاتی میسر، کاتێك یوسف زانی نزیك بوونەتەوە، هاتە دەرەوە بۆ پێشوازی لێکردنیان، (پاشا) ش فەرمانی دا بە کاربەدەستانو پیاو ماقوڵانی لەگەڵ یوسفدا بچنە دەرەوەی شار بۆ پێشوازیکردن لە پێغەمبەری خودا یەعقوب (سەلامی خوای لێبێت) ،ئەڵێن( پاشا) ش لەگەڵیان چووە دەرەوە بۆ پێشوازیکردن لە یەعقوب، زۆر لەوە دەچێت واش بێت، ﴿وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ﴾ واتە: گوتی: ئێوە وەرنە میسر خودا یاربێت، هیچ ناڕەحەتیتان تووش نابێت، واتە: لە دوای ئەوەی چوونە ناو میسر بردنیە لای خۆی دڵنیای کردنو پێی گوتن بۆ خۆتان لە میسردا دانیشن خوا مەیلی لێبێت هیچ مەترسیەکتان نایەتەڕێو تووشی قاتو قڕیو نەبوونی نابن، سودیو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێن: ﴿ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ﴾ ئەوانەی کە بردنیە لای خۆی باوکیو پوری بوو.[2] چونکە دایکی لە دێرزەمانەوە مردبوو.[3] موحەمەدی کوڕی ئیسحاقو ئیبنو جەریر دەڵێن: باوكو دایکی مابوونو دەژیان.ئیبنو جەریر دەڵێ: هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر مردنی دایکی، لە قورئانەوە وا دەردەکەوێت کە لە ژیاندا بووەو هەر ئەمەیش تەواوە کەئەو سەلماندوویەتی چونکە سیاقی باسەکە

[1] الطبري (٢٦٢/١٦).
[2] الطبري (٢٦٧/١٦).
[3] الطبري (٢٦٧/١٦).

بەڵگەیە لەسەری.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ واتە: دایکیو باوکی لەسەر تەختەوە دانا، ئیبنو عەباسو موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: یانی: قەنەفە (چەرپا)یانی: لەگەڵ خۆیدا لەسەر قەنەفە داینان.[2] ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا﴾ واتە: هەموویان کڕنووشیان بۆ برد، واتە: باوکو دایکیو براکانیشی کە یانزە کەس بوون کڕنووشیان بۆ برد. ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: گوتی: ئەمە لێکدانەوەی خەونەکەی پێشوومە، ئەو خەونەی کە گێڕایەوە بۆ باوکی لە پێشدا: ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا﴾. ئەو کڕنووش بردنە لە شەریعەتی ئەواندا دروستو ڕەوا بووە، کاتێك سڵاویان لە پیاوێکی مەزن کردووە کڕنووشیان بۆ بردووە، بەردەوام ئەو کڕنووش بردنە دروست بووە هەر لە ئادەمەوە هەتا قەدەغەکرا، وای لێکرا کە تەنها کڕنووش بۆ خودای پاكو بێعەیب ببرێت، ئەمە پوختەی قسەی قەتادەو کەسانی تریشە.[3] لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە مەعاز چووە شام خەڵکەکەی بینی کڕنووشیان بۆ پیاوە ئاینیەکانیان (أساقفة) دەبرد، کاتێك مەعاز گەڕایەوە کڕنووشی بۆ پێغەمبەری خودا برد (ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەمە چیە ئەی مەعاز؟) مەعاز گوتی: من ئەو خەڵکەم بینی کڕنووشیان بۆ پیاوە ئاینیەکانیان دەبرد، تۆ شایستەتری کە کڕنووشت بۆ ببرێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر من فەرمانم بکردایە بە کەسێك کە کڕنووش ببات بۆ کەسێك، فەرمانم دەدا بە ئافرەت (ژن) کڕنووش ببات بۆ هاوسەرەکەی (مێردەکەی) لەبەر هەقی زۆری بەسەریەوە).[4] مەبەست لێرەدا ئەوەیە، ئەم کڕنووش بردنە لە شەریعەتی ئاینە پێشووەکاندا دروست بووە، بۆیە دایكو باوکی یوسفو براکانی کڕنووشیان بۆ بردووە، ئا لەوێدا یوسف گوتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾ واتە: ئەمە ئاکامی ئەو خەونە بوو کە بینیم، چونکە ئەو لێکدانەوەیە دەدرێت بەسەر ئەوەدا کارەکەی بەرەو ڕوو دەبێتەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُۥ﴾[5] واتە: ئایا ئەمان هەر بۆ ئەو ڕۆژە دەڕوانن کە سەرەنجامی هەڕەشەکانی بەدی دێت ودێتە جێ؟یانی: ڕۆژی قیامەت ئەوەی بەڵێنیان پێدراوە لە چاکەو لە خراپە تووشیان دێت. پاشان یوسف گوتی: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَدْ

---

[1] الطبري (١٦/٢٦٧).

[2] الطبري (١٦/٢٦٧).

[3] الطبري (١٦/٢٦٩).

[4] ابن ماجه (١/٥٩٥)، فەرموودەیەکی مەرفوعی سەحیحە.

[5] الاعراف (٥٣).

جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ﴾ واتە: پەروەرندەم ئاکامەکەی وەدی هێناو زۆر چاکەی دەربارە کردووم، لە زیندان دەری هێنام، ئێوەشی لەو بیابانە هێنا بۆ (شام)، ئیبنو جورەیجو کەسانی تریش دەڵێن: یەعقوبو کوڕەکانی لە بیابان دەژیانو خاوەن مەڕو ماڵات بوون.[1] وە دەڵێ: لە شوێنێکدا نیشتەجێ بوون پێی دەگوترا عەرەبات لە زەوی فەلەستیندا لە قولایی شامدا. ﴿مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِيٓ ۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ﴾ واتە: لە پاش ئەوەی شەیتان لە نێوان منو براکانم بەدفەڕی کرد، پەروەرندەم بۆ هەر کەسێك خۆی مەیلی لێبێت بەسۆزە، واتە: بیەوێت هەر شتێك بکات دەیکاتو کار ئاسانی بۆ دەکات، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ﴾ واتە: وە هەر خۆی پەروەردگارەو بەندەکانی باشتر دەناسێت ، ﴿ٱلْحَكِيمُ﴾یانی: لە کارزانە لە گفتارو کردارو قەزاو قەدەریداو هەرچی بوێو مەیلیبێت، دەیکات.

﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾﴾

## لاڵانەوەو دوعاکردن بە کۆتا هێنانی ژیان بە ئیسلامەتی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە: ئەی پەروەردگارم، لەم وڵاتە دەسەڵاتت پێدامو فێرت کردم کە چۆن خەوەکان لێك بدەمەوە، دروستکەری ئاسمانەمانو زەمین! تۆ یارمەتی دەرمی لە دنیاداو لە قیامەتدا، بە موسڵمانی بممرێنەو بمگەیەنەوە بە پیاوچاکان، ئەو دوعایە دوعای یوسف پێغەمبەرە (یوسفی ڕاستگۆ) (سەلامی خوای لێبێت) بەم دوعایە پاڕایەوە لە پەروەردگاری مەزنی دوای ئەوەی کە ئەو هەموو بەهرەیەی بەسەردا ڕشت، لە گەیشتنی باوكو دایکیو براکانی بۆ لایو منەتیشی کرد بەسەریداو کردی بە پێغەمبەرو خاوەن دەسەڵات، لاڵایەوە لە خودای گەورە وەك چۆن لە دنیادا ئەو هەموو بەهرەیەی پێ بەخشی لە ئەو دنیاش ئەو بەهرانەی هەر بداتیو بەردەوام بێت لەسەری، کاتێکیش دەیمرێنێت بە موسڵمانی بیمرێنێت، زەحاك دەڵێ: بیگەیەنێت بە پیاوچاکان، کە براکانیەتی لە پێغەمبەران (سەلامی خوا لە گشت پێغەمبەران).[2] ئەم دوعایە لەوانەیە یوسف (سەلامی خوای لێبێت) لە کاتی مردنیدا کردبێتی، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: لە

[1] الطبري (١٦/٢٧٦).
[2] الطبري (١٦/٢٨٠).

عائیشەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کاتی مردندا پەنجەی مبارەکی بەرز دەکردەوەو دەیفەرموو: (خوایەداوات لێدەکەم لەگەڵ هاوەڵە پایە بڵندەکاندا بم سێ جار ئەمەی فەرموو).[1] لەوانەشە یوسف داوای کردبێت لەسەر موسڵمانێتی بمرێتو بگات بە پیاوچاکان کاتێك مردن یەخەی گرتو تەمەنی دوایی هات.

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾

**ئەوەی لە پێشەوە باس کرا لە بارەی ئەم بەسەرهاتانەوە هەموونیگا بوون لە لایەن خوداوە**

خوای گەورە کاتێك باسی بەسەرهاتی یوسفو براکانی کردووە کە چۆن بەرزی کردووەتەوە بەسەریانداو وای لێ کردووە سەرکەوتنو دەسەڵاتو فەرمانڕەواییو پاشەڕۆژ بۆ ئەو بێت بە پێچەوانەی براکانیەوە کە دەیانویست خراپی بەسەر بێننو بیکوژنو لەناوی بدەن، دەفەرمووێت بە پێغەمبەر موحەمەد (ﷺ): ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ﴾ واتە: ئەمانە ئەو دەنگو باسە نادیارانەن کە بە تۆی ڕادەگەیەنین، واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەم بەسەرهاتەو وێنەی ئەمە لەو باسە نادیارە پێشوانەن کە تۆی لێ ئاگادار دەکەین، پڕە لە پەندو ئامۆژگاری بۆ خۆتو ئەوانەی دوای خۆت دێن، ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ ﴾ واتە: تۆ لە لای ئەوان نەبوویتو چاوت لێیان نەبوو، ﴿إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ ﴾ کاتێك کە هەموو بڕیاریان دا (یوسف بخەنە ناو بیرەکەوە) ﴿وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾ وە فێڵی لێ بکەن، بەڵام ئێمە تۆمان ئاگادار کرد بەو نهێنیە، وەحیمان بۆ ناردیو‌ئەم نیگایە هاتەخوار بۆت، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴾[2] واتە: تۆ لەوێ نەبووی کە قەڵەمیان فڕێ دا کێ سەرپەرشتی مەریەم بێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِىِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا﴾[3] واتە: تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) لە لای خۆرئاوای کێوی تور نەبووی، کاتێك فەرمانی پێغەمبەرایەتیمان دا بە موسا (هەتا دەگاتە) وە تۆ لای کێوی تور نەبووی کاتێك بانگی

---

[1] فتح الباري (٧/٧٤٣).

[2] ال عمران (٤٤).

[3] القصص (٤٤ـ٤٦).

موسامانکرد. وەفەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِنَا﴾[1] واتە: تۆ ئەو کاتە لەناو خەڵکی مەدیەن نەبووی، کە نیشانەکانی ئێمەیان بۆ بخوێنیتەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەری خۆیەتیو ئاگاداری کردووە لە هەواڵی پێشینەکان کە پەندو ئامۆژگاری تێدایە بۆ خەڵکیو هۆی ڕزگاربوونیشە لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا بۆیان، لەگەڵ ئەوەیشدازۆرینەی خەڵکی بڕواناهێنن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: هەرچەندە زۆریش هەوڵ بدەی (بابای) ئەم مەردمە زۆربەیان بڕوا ناهێنن. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[2] واتە: ئەگەر کەوتیتە شوێنی قسەی زۆربەی ئەوانە وا لەم سەر زەویەدا لە ڕێگەی خودا لات دەدەن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾[3] واتە: لەمەدا دەرسی باش هەیە، بەڵام بەشی زۆریان بڕوادار نین. ﴿وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ واتە: خۆ تۆ هەرگیز (بۆ ئەم کارە) پاداشتێکت لەمانە ناوێ، واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) لەسەر ئەم ئامۆژگاریو دوعای خێرو ڕێ نیشاندانە داوای پاداشتیان لێ ناکەی، واتە: داوای کرێو بەرتیلیان لێ ناکەی لەسەر ئەوە، بەڵکو تەنها لەبەر ڕەزای خواو ئامۆژگاری بەندەکانیەتی. ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: تەنها پەندو ئامۆژگاریە بۆ خەڵکی دنیا، ڕێ نیشاندانیانە بەو ئامۆژگاریە ڕزگاریان دەبێت لە دنیاداو لە دواڕۆژدا.

﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓا۟ أَن تَأْتِيَهُمْ غَـٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾﴾

**بیرنەکردنەوەی خەڵکی لەو نیشانانەی کە لەبەردەستیاندایە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ چەندە زۆرن نیشانەکان لە ئاسمانەکانو زەمیندا بە لایاندا دەڕۆنو گوێی پێ نادەن، خودای گەورە باسی بێئاگایی زۆربەی خەڵکی دەکات کە بیر لە نیشانەو بەڵگەکانی تاکو تەنهایی خودا ناکەنەوە، کەچی دروست کردووە لە ناو ئەم ئاسمانو زەمینەدا، لە ئەستێرەی درەوشاوەو وەستاوو

---

[1] القصص (٤٥).

[2] الانعام (١١٦).

[3] الشعراء (٨).

گەڕۆك و ئەو گەردوونانە كە هەمیشە لە سوڕانەوەدان، هەموویان ڕام هێنراون، وە لەناو زەمیندا چەند پارچە زەوی لە تەنیشت یەك و باخ و باخات و كێوی زۆری بەناو زەمیندا داچوو، دەریای زۆری پڕ لە ئاوو دەشت و بیابانی كاكی بە كاكی و چۆڵ و چەندین لە گیاندارو بێگیان و زیندەوەرو ڕووەك و چەندەها میوەو بەروبوومی هەمەڕەنگ و جیاواز لە تام و بۆن و ڕەنگ و شێوەدا وەدی هێناوە، پاكی و بێعەیبی بۆ خودای تاك و تەنها، وەدیهێنەری هەموو جۆرە دروستكراوەكان كە پایەداری هەر بۆ خۆیەتی و هەر دەمێنێت، بێهاوتایە لە زات و سیفەتدا، پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ واتە: بەشی زۆریان بڕوا بە خوا ناهێنن و هەر دەیانەوێ شەریكی بۆ دابنێن. ئیبنو عەباس دەڵێ: بێباوەڕان ئەگەر پێیان بگوترێت كێ ئاسمانەكانی دروستكردووە؟ وەكێ زەمینی دروست كردووە؟ وە كێ كێوەكانی دروست كردووە؟ دەڵێن :خودا، كەچی شەریكیش بۆ خودا دادەنێن.[1] موجاهیدو عەتاو عیكریمەو شەعبی و قەتادەو زەحاك و عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەمیش هەر وایان گوتووە.[2] وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە، موشریكەكان لە كاتی تەوافكردنیاندا بەدەوری كەعبەدا دەیانگوت: (لبيك لا شريك لك إلا شريكا هو لك، تملك وما ملك)بەڵێ بۆتۆ ئەی خوایەك كەشەریكت نیە،شەریكێك نەبێت كەهی خۆتە وچ شەریكەكەش وەچ ئەوەش ئەوهەیەتی هەموو هەرهی خۆتە!![3] وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[4] واتە: شەریك بۆ خودا بڕیاردان ناهەقیەكی زۆر گەورەیە، لە تاوانە زۆر مەزنەكانە شەریك دانان بۆ خودا، وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ تاوانێك زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: هاوەڵ دانێیت بۆئەو خودایەی كە دروستی كردووی)[5]! حەسەنی بەسری لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ دەڵێ: ئەومەبەست ئەو دووڕووەیە كاتێك كارێكی ئەكات بە ڕیا دەیكات، ئەوە هاوەڵی داناوە بۆ خودا بەو كارەی، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾[6] واتە: دووڕووەكان دەیانەوێ خودا فریو بدەن، كەچی

---

[1] الطبري (١٦/٢٩٢).
[2] الطبري (١٦/٢٩٢).
[3] مسلم (٢/٨٤٣).
[4] لقمان (١٣).
[5] فتح الباري (٨/٣٥٠)، مسلم (١/٩٠).
[6] النساء (١٤٢).

خودا دەیانخەڵەتێنێت، کەدەچن نوێژ بکەن، بە تەمبەڵی هەڵدەستن، ڕووبینی لە خەڵك دەکەن، کەمێك نەبێت یادی خوا ناکەن،هەروەها هەندێ شیرکی تر هەیە شاراوەیەو ئەو کەسەی دەیکات هەستی پێ ناکات، وەك حەمادی کوڕی سەلەمە ڕیوایەتی کردووە لە عاسمی کوڕی ئەبی نەجودەوە (النّجود) لە عوروەوە دەڵێ: حوزەیفە چووە لای نەخۆشێك پارچەیەکی خەت خەتاوی بە باڵیەوە بوو، قرتاندیان و لای برد و پاشان گوتی: ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (هەر کەسێك سوێند بە غەیری خودا بخوات ئەوە شەریکی بۆ خودا داناوە) تیرمزی ڕیوایەتی کردووەو بە فەرموودەیەکی باشی زانیووە لەو فەرموودانەیە لە ئیبنو عومەر ڕیوایەتی کردووە.[1] وە لەم فەرموودەیەشدا کە ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نویشتەو موتوو مووروو بە خۆ داکردن و دوعای چەورو شیرینی شیرکە)[2] وە لە وتەیەکی تردا ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داود ڕیوایەتیان کردووە: (الطيرة شرك وما منا الا، ولكن الله يذهبه بالتوكل) واتە: ڕەشبینی شیرکە، هیچ کەس نیە لە ئێمە بزیزکێکی بەرنەکەوێ بەڵام خودا بە پشت بەستن بەخۆی دووری ئەخاتەوەلێمان.[3]

پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَأَمِنُوٓا۟ أَن تَأْتِيَهُمْ غَـٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوان بێ ترسن لەوەی کە جەزرەبەی داپۆشەری خودایان بۆ نایەت؟ یان لە پڕ قیامەتیان بەسەردا نایەت هەر هەستیش ناکەن؟ وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی:

﴿أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخْسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِى تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[4] واتە: ئاخۆ ئەوانە بە فێڵبازی خەریکی بەدفەڕی بوون، بێ ترسن کە خودا نوقمی عەرزیان ناکات یان لە شوێنێکەوە (کە هەر بیریشی لێ ناکەنەوە) ئازارێکیان بۆ نابارێت (یان لەو ڕێی هاتووچۆیانەدا لە گیریان خاو نەتوانن خۆیان دەرباز بکەن) یان کاتێك نارەحەتن ولە ترسدا بیانگرێت؟ سا هەر پەروەردگاری تۆیە وا دڵسۆزو دڵۆڤانە، وە فەرموویەتی: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَـٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ

---

[1] تحفة الأحوزي (١٣٥/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد (٣٨١/١)، ابو داود (٢١٢/٤)، ابن ماجه (١١٦٧/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٣٨٩/١)، ابو داود (٢٣٠/٤).

[4] النحل (٤٥-٤٧).

مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾[1] واتە: ئاخۆ خەڵكی ئەو شارانە نەترساون كە لە شەودا، بەڵای ئێمەیان تووش ببێتو ئەوان لە گەرمەی خەودا بن؟ ئەو شارنشینانە ئایا ناترسن كە لە دەمی چێشتەنگاوداو لە گەرمەی گەمەكردندا ئێمە تووشی بەڵایان بكەین؟ ئاخۆ لەوە دڵنیان لە نەخشەی خودا ڕزگاربن؟ خۆ جگە لە ڕەنجەساران كەس لە نەخشەی خودا هەستی هێمنی ناكات.

﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾

**ڕێگەی پێغەمبەر (ﷺ)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ﴾ واتە: بڵێ: ئەمە ڕێگەی منە، هەم خۆمو هەم ئەوانەش شوێنم كەوتون (بە بەڵگەوە)خەڵك بانگ دەكەین، خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەكەی كە ڕەوانەی كردووە بۆ ئینسانو جنۆكە فەرمانی پێكردووە خەڵكی ئاگادار بكات كە ئەمە ڕێگەی ئەوە، واتە: ئەمە ڕێو ڕچەو سوننەتی ئەوە، كە بریتیە لە بانگەوازكردن بۆ شایەتیدان كە جگە لە خودا هیچ پەرستراوێكی تر نیە، هەر خۆیەتیو شەریكی نیە، بانگی خەڵكی دەكات بۆ لای خودا كە وتەی (لا إله الا الله)یە، بە بڕوایەكی تەواوو بەڵگەی بەهێزەوە، خۆیشیو ئەوانەیش شوێنكەوتووی ئەون بانگی خەڵكی دەكەن بۆ ئەوەی پێغەمبەری خودا بانگی بۆ كردووە لەسەرچاوڕۆشنیو بڕوای تەواو وبەڵگەی عەقلیو شەرعیەوە. ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ واتە: خودایش پاكو بێ عەیبەو لەوانە نیم شەریكی بۆ پەیدا بكەم،یانی: پاكو بێگەردو گەورەو زۆر پیرۆزە، دوورە لەوەی كە شەریكو هاوتاو هاوشێوەو بابو منداڵو وەزیرو ڕاوێژكاری هەبێت، پایە بەرزو زۆر مەزنەو دوورە لەمانەوە هەمووی ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾[2] واتە: حەوت ئاسمانەكانو زەمینو هەرچی لە ناو ئەواندایە، هەر پاكانەی خودا دەكەن، هەموو شتێك (بە پەسەندانەوە) پاكانەی ئەو دەكات، بەڵام ئێوەلە پاكانەو تەسبیحاتی ئەوان حاڵی نابن، ئەو لەسەر خۆو لێبوردەیە.

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠٩﴾﴾

---

[1] الاعراف (٩٧-٩٩).

[2] الاسراء (٤٤).

**پێغەمبەران پیاوبوون ومرۆڤیش بوون**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ واتە: لە پێشتر لە تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) هەر پیاوانمان لە خەڵکی شارەکان لە لایەن خۆمانەوە نیگامان بۆ ناردوون و تێمان گەیاندوون ئایا نەچوون لەم زەمینەدا بگەڕێن، تا ببینن چارەنووسی پێشینەکان چۆن بووە؟ بۆ ئەوانەی لە خوا ترسن ماڵی ئەو دنیا چاکترە، دەی سا بۆچی هەر تێناگەن؟ خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هەر لەناو پیاواندا پێغەمبەری خۆی ناردووە، لە ناو ژناندا نەی ناردووە، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئیشارەتی پێ دەدات، کە خوا وەحی نەناردووە بۆ هیچ ئافرەتێك لە کیژەکانی نەوەی ئادەم، واتە: وەحی یاساو بەرنامە(یانی نیگای تەشریعی)، ئەهلی سونەت و جەماعەت هەموو لەسەر ئەم ڕایەن، هەر ئەوەیە کە شێخ ئەبولحەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیلی ئەشعەری لەزانایانی ئەهلی سوونئەت وجەماعەتەوە نەقڵی کردووە کە لەناو ئافرەتاندا پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو ئافرەتی (صدیقه)یان تێدا بووە، وەك خوای گەورە باسی بەرێزترین ئافرەت کە مەریەمی کچی عیمرانە دەکات و دەفەرموێت: ﴿مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾ واتە: مەسیحی کوڕی مەریەم پێغەمبەرێك بەولاوە هیچی تر نیە، لە پێش ئەویش زۆرێك پێغەمبەری تر هاتوون و چوون، دایکی ئەویش ژنێکی (صدیقه) ڕاست و دروست بوو، هەردووکیان خواردنیان دەخوارد. خوای گەورە لە بەرزترین و بەرێزترین پلەدا وەسفی دەکات کە (صدیقییە)، خۆ ئەگەر پێغەمبەر بووایە، خوای گەورە باسی پێغەمبەریەتیەکەی دەکرد، کەواتەمەریەم ژنێکی ڕاست و دروست بووە بە دەقی قورئانی پیرۆز.

**پێغەمبەران لە مرۆڤن، لە فریشتە نین**

زەحاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەگوازێتەوەکە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا ﴾ واتە: ئەمانە خەڵکی ئاسمان نین وەکو ئێوە گوتتان.[1] ئەمە قسەی ئیبنو عەباسە ئەم ئایەتەی تر پشتگیری لێ دەکات کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾[2] واتە: لە پێش تۆشدا ئەی

---

[1] الدر المنثور (٤/٥٩٥).

[2] الفرقان (٢٠).

موحەمەد (ﷺ) هەر كەسێكمان بۆ پێغەمبەری ناردووە، هەموو خواردنیان خواردووەو لەناو بازاڕدا گەڕاون، وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ ﴾[1] واتە: هیچ لەشی وامان پێ نەدان، كە هیچ نەخۆن و نەشمرن، پاشان هەموو بەڵێنێك كە پێمان دابوون بەجێمان هێنان، كە ئەوانیش و هەر كەسیش خۆمان ویستمان ڕزگارمان كردن، هەڵەڕۆشمان قڕان تێ خست، وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ الرُّسُلِ﴾[2] واتە: بڵێ: لەناو ئەو هەموو پێغەمبەرانە پێغەمبەرێكی نائاسایی نیم، ﴿مِّنْ أَهْلِ الْقُرَىٰ﴾لەناو خەڵكی شارەكاندا مەبەست بە ﴿الْقُرَىٰ﴾ شارەكانە، نەك خەڵكی لادێنشینەكان كەخەڵكێكی بیابانن و دڵڕەقترینی خەڵكن لە سروشت و ڕەوشتدا.

## پەند وەرگرتن لەوانەی پێشوو

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾ واتە: بۆچی ئەوانەی بڕوا ناهێنن ئەی موحەمەد(ﷺ) ناچن بگەڕێن بەسەر زەمیندا ﴿فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ تا ببینن پاشەڕۆژی پێشینەكانیان چۆن بووە، ئەو گەلانەی كە بڕوایان نەدەهێنا بە پێغەمبەرەكانیان، چۆن خودا قڕانی تێخستن، هەموو خوانەناسێك هەر ئەوە چارەنووسیەتی، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا ﴾[3] واتە: ئاخۆ هێشتا بە زەویدا نەگەڕاون تا ببنە خاوەن دڵ و تێبگەن، ئەگەرنەو هەواڵە ببیستن و ببینن كە خوای گەورە خوانەناسانی قڕ تێخستوەو خاوەن باوەڕانی ڕزگار كرد، وەتێدەگەن ئەمە یاسای خوایە لە دروستكراوەكانیداوبەردەوام دوبارە دەبنەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ واتە: بۆ ئەوانەی لە خواترسن ماڵی ئەو دونیا چاكترە، وەك چۆن لە ژیانی دنیادا خاوەن باوەڕانمان ڕزگار كرد لە دنیادا، هەر بەو شێوەیە لە ڕۆژی دواییشدا ڕزگاریان دەكەین، ئەمەیان زۆر لە دنیا چاكترە وەك ئەم ئایەتەی تر كە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾[4] واتە: بە

---

[1] الانبياء (٨ـ٩).

[2] الاحقاف (٩).

[3] الحج (٤٦).

[4] الغافر (٥١ـ٥٢).

ڕاستی ئێمە پێغەمبەران و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دنیادا وە لە ڕۆژی قیامەتدا کە شایەتەکان هەڵدەسنەوە، ڕۆژێك پاکانەکردنی ستەمکاران سوودیان پێ ناگەیەنێت، هەموویان نەفرینیان لێکراوەو خراپترین جێگایان هەیە. خوای گەورە ئیزافەی (دار)ی کردووە بۆ لای ئاخیرەت ﴿ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ فەرموویەتی: ﴿وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ وەك چۆنئەوترێ: (صلاة الأولى، ومسجد الجامع، وعام أول وبارحة الأولى، ويوم الخميس).

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١١٠﴾

**لە کاتی زۆر تەنگانەدا پێغەمبەران یارمەتی دەدرێن و سەردەخرێن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ واتە: تا ئەو ساتە کە پێغەمبەران نائومێد بوون (لە گەلەکەیان)و گەلەکەشیان وایان دەزانی کە درۆیان لەگەڵ کردوون، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات، کە یارمەتیەك دەنێرێت بۆ پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێبێت) لە کاتی زۆر تەنگانەدا کە چاوەڕوانی دەرووبەکن و زۆر پێویستیان پێیەتی و نارەحەتن. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ﴾[1] واتە: زۆر بە توندی تەکان دران، تەنانەت پێغەمبەران و یارانی باوەڕدارانیش لەگەڵیدا دەیانگوت : کەی خودا بە هانامانەوە دێت؟! تۆ بزانە کە یارمەتی خودا نزیکە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُذِبُواْ﴾ دوو خوێندنەوە هەیە،خوێندنەوەی یەکەم: بە توندگرتن (بالتشديد)واتە (قدكذّبوا) کە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) بەو شێوەیە خوێندوویەتیەوەوماناکەی واتە:بڕوایان پێ نەئەکردن ، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە لە عائیشەوە. کە عوروەدەربارەی ئەم ئایەتە پرسیاری لە عائیشە کردووە﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾عائشەش وەلامی داوەتەوە.عروە ئەڵێ:ئایا (كُذِبوا) یان( كُذّبوا)، عائیشەفەرمووی: (كُذّبوا)، گوتم: ئەوان (واتە پێغەمبەران) بێگومان بوون لەوەی کە گەلەکەیان بڕوایان پێ نەکردوون، ئیتر چۆن واگومانیان ئەبرد؟فەرموی: بەڵێ، سوێند بە خوا ئەوەیان چاك دەزانی، پێم گوت:کەواتە ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾واتە:پێغەمبەران وایان گومان بردکەڕاستیان لەگەڵدانەکراوە !عائشەفەرموی: پەنا بە خوا، پێغەمبەران گومانی وایان نەبردووە بە پەروەردگاریان، گوتم:کەواتە مانای ئەم ئایەتە چۆنە؟ گوتی: ئەوانە شوێنکەوتووی پێغەمبەرەکان

---

[1] البقرة (٢١٤).

بوون، کە بڕوایان بە پەروەردگاریان هێنابوو، بڕواشیان بە پێغەمبەرەکان کردبوو، بەڵام کە ماوەیەکی زۆر سەرکەوتنیان دوا خرا، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾ تا پێغەمبەرەکان بێهیوا بووبوون لەوانەی بڕوایان پێ نەکردبوون لە گەلەکەیان، واشیان دەزانی کە شوێنکەوتووەکانیشیان بڕوایان پێیان نەماوە. لەو کاتەدا سەرکەوتنی خوایان بۆ هاتووە.[1] عوروە دەڵێ: پێم گوت: لەوانەیە ﴿قَدۡ كُذِبُواْ﴾ بێت بە موخەففەف _بێ(شدّة)_؟ گوتی: پەنا بە خوا. ئەوەی عوروە ڕیوایەتی کردووە کۆتایی هات[2].

ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئیبنو ئەبی مولەیکە بۆی باس کردم، ئیبنو عەباس ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە خوێندووەوە ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ بە سووکی (بێ"شدّة")، عبدالله کە ئیبنو ئەبی مولەیکەیە ئەڵێ: پاشان ئیبنو عەباسیش پێی گوتم: ئەوانیش مرۆڤ بوون، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ﴾ ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئیبنو ئەبی مولەیکە پێی گوتم: عوروەیش بۆی باس کردوم لە عائیشەوە، کە عائیشە دژایەتی ئەوەی کردووەو بەو خوێندنەوەیە ڕازی نەبووەو فەرموویەتی: خودا هیچ بەڵێنێکی بە موحەمەد(ﷺ) نەداوە، مەگین زانیویەتی ئەو بەڵێنە هەر دێتەدی هەتا مردووە. بەڵام بەڵا هەر بەردەوام بووە بۆ پێغەمبەران هەتا وایان زانیووە، ئەوانەی لەگەڵیان بوون لە خاوەن باوەڕان بڕوایان پێیان نەماوە، ئیبنو ئەبی مولەیکە لە بارەی فەرموودەکەی عوروەوە دەڵێ: عائیشە ئەم ئایەتەی وادەخوێندەوە ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِّبُواْ﴾ بە(شدّە)وە،کە لە(تکذیب)ەوەهاتووەمانای درۆیان لەگەڵداکراوە.[3] خوێندنەوەی دووەم بە سوکی گرتن (بالتخفیف) بەڵام زانایان جیاوازیان هەبووە لە ماناکردنیدا، ئیبنو عەباس هەمان قسەی کردووەکەلەپێشەوە باسمانکرد،هەروەهاڕیوایەت کراوە، لە ئیبنو مەسعودەوە کە سوفیانی سەوری لە عەبدولاوەئەیگێڕێتەوە کەئەم ئایەتەی وەها، کە خوێندووەتەوە: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ بە سووکی (مخففة) عبدالله دەڵێ: ئەمە ئەوەیە کە پێی خۆش نیە، وە لە ئیبنو

---

[1] فتح الباري (٨/٢١٧).

[2] فتح الباري (٨/٢١٨).گومانەکەی (عروە)بۆئەوەڕۆیشتوەکەگوایەپێغەمبەرانیش گومانیان بردووەخوا (حاشا)وادەکانی ڕاست نەبوبێت لەگەڵ پێغەمبەراندا،بەڵام عائشەپەنابەخوائەگرێ وئەفەرموێ: شوێنکەوتەئیماندارەکانیش لەعەزرەتی ئەوهەمووەبەڵایەگومانی ئەوەیان بۆدروست بووەکەپێغەمبەران وادەی ڕاستیان بەئەمان نەداوە،کەکارگەیشتوەتەئەوسنورەلەنارەحەتی وبێئومێدی،خوای گەورە سەرکوتنی دابەزاندووە(وەرگێڕ)...

[3] الطبري (١٦/٣٠٧).

عەباسەوە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ دەڵێ: کاتێك پێغەمبەران نائومێد بوون کە گەلەکەیان بە گوێیان بکەن، گەلەکەیشیان وایان زانی پێغەمبەرەکان درۆیان لەگەڵدا کردوون، ﴿جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُ﴾ واتە: یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، ئەوانەش وا حەزمان کرد ڕزگار کران، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبراهیمی کوڕی ئەبو حوررەی جەزریەوە دەڵێ: لاوێکی قورەیش پرسی لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو پێی گوت: ئەی ئەبو عەبدوڵا ئەم لەمجەیەچۆنە؟ بە ڕاستی من کاتێك ئەگەمەئەم ئایەتە، حەز ئەکەم ئەم سورەتەم نەخوێندایە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾سەعیدفەرمووی: بەڵێ، تائەو کاتەی پێغەمبەران نائومێد دەبوون لە گەلەکەیان کە بڕوایان پێ بکەن، ئەوانەیش کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتبوو، وایاندەزانی پێغەمبەران ڕاستیان نەکردووەلەگەڵیاندا، زەحاکی کوڕی موزاحیم دەڵێ: هەرگیز وەك ئەمڕۆم نەدیووە کەسێك بانگ بکرێت بۆ زانیاریەك کەچی دەمی بێت بەیەکدا ، ئەگەر بچوومایە بۆ یەمەن لەبەر ئەمە هێشتا کەم بوو، پاشان ئیبنو جەریر جارێکی تر ڕیوایەتی کردووە بە شێوەیەکی تر کە موسلمی کوڕی یەسار پرسی لە سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم بارەیەوە، هەر بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە. هەڵسا بۆ لای سەعیدو دەستی کردە ملی‌و گوتی: خوا دەروت لێ بکاتەوە وەك تۆ چۆن دەروت لە من کردەوە.[1] هەروەها ڕیوایەت کراوە بە شێوەیەکی تر لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە هەر بەم مانایە تەفسیری کردووە، موجاهیدو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە هەر وا مانایان کردوە، ئەوە نەبێت هەندێکیان کە تەفسیریان کردووە، (واو)ی زەمیرەکەیان لە ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ﴾ گێڕاوەتەوە بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) لە خاوەن باوەڕان، هەندێکی تریشیان زەمیرەکەیان گێڕاوەتەوە بۆ خوانەناسان ناوی گەلەکەیان، واتە: خوانەناسان وایان زانیووە پێغەمبەران ڕاستیان نەکردووە لەو بەڵێنەی کە داویانە بەو سەرکەوتنە، بەڵام ئیبنو مەسعود وەك ئیبنو جەریر ڕوایەتی کردووە لە تەمیمی کوڕی حەزلەمەوەکە فەرمویەتی: بیستم لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەیفەرموو: لەم ئایەتەدا: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾ هەتا کاتێك کە پێغەمبەران نائومێد بوون لە باوەڕی گەلەکانیان، کە بڕوایان پێ بکەن گەلەکانیشیان (کە یارمەتی خودا دواکەت) وایانزانی پێغەمبەران ڕاستیان نەکردووەبەبێ (شدّة)[2].

---

[1] الطبري (١٦/٣٠٣).
[2]

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾

**پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسێکە دەرسی وەربگرێت**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ ﴾ واتە: لە بەسەرهاتی ئەمانە (واتە پێغەمبەران) پەند هەیە بۆ خاوەن ئاوەزاكان، واتەیەكی هەڵبەستە نیە، واتە: بێگومان دەنگو باسی پێغەمبەران لەگەڵ گەلەكانیاندا كە چۆن خاوەن باوەڕەكانمان ڕزگار كردو خوانەناسانیشمان لەناو برد، پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە بۆ ئەوانەی ئاوەزیان هەیە، ئەم قورئانە قسەیەكی هەڵبەستراو نەبووە، بە ناوی خواوە هەڵبەسترابێت‌و دروست كرابێت، ﴿وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئەوانەی لەبەر دەستیدایەئەسەلمێنێت،یانی لەو كتێبانەی كە هاتوونەتە خوار لە ئاسمانەوە ئەوەی ڕاستە تێیدا بە ڕاستی زانیووە، ئەوەیش گۆڕاوەو كەم‌و زیادی تیاكراوە دانی پیانەناوەو لای بردووە، ڕاستیەكەیشی هێشتووەتەوە ﴿وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ﴾ واتە: (ئەم قورئانە) شیكردنەوەی هەموو شتێكە، لە حەلاڵ‌و حەرام‌و چاك‌و خراپ‌و هەموو ئەو شتانەی تر لە فەرماندان بە خواناسی‌و بەجێهێنانی فەرزو سونەتەكان‌و قەدەغەكردنی خراپەكان‌و هاوشێوەكانی لە شتی ناپەسەند، باسی شتە دیارەكان‌و نادیارەكانی لەمەودواش ئەكات، بە كورتی‌و بە درێژیش، وە باسی خوای گەورەو ناوەكانی‌و سیفاتەكانی دەكات، كە لە هیچ شتێكدا لە دروستكراوەكانی ناچێت، بۆیە بەراستی ئەم قورئانە ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: ڕێ نیشاندەرو بەزەییە بۆ ئەو كەسانەی بە باوەڕن، ڕێنموونیان دەكات لە سەر لێ شێواویەوە بۆ ڕاستەڕێ، وە لە گومراییەوە بۆ چاكەخوازی، وە بەهۆی ئەو قورئانەوە بەزەیی خودا وەدەست دێنن بۆ خۆیان لەم ژیانی دنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا، خوازیارین لە خودای مەزن بمانخاتە ڕیزی ئەوانە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا، ئەو ڕۆژەی ئەوانەی ڕوویان سپیەو دەدرەوشێتەوە سەردەكەون‌و دەستكەوتی خۆیان بە دەست دێنن، ئەوانەیش كە ڕووڕەشن بە دۆڕاوی دەگەڕێنەوە.

## تەفسیری سورەتی (الرعد)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ١﴾

### قورئان قسەو گوفتاری خوایە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾، (الیف، لام، میم، ڕا) ئەمانە چەند نیشانەیەکی ئەم کتێبەن لەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتووەتە خوارەوە، دیارەپەیامێکی ڕاستە، بەڵام زۆربەی ئەم مەردمە بڕوا ناکەن. لە بارەی ئەم پیتانەوە لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا ئەم پیتانە قسەیان لێ کراوەو گوتمان هەر سورەتێك بەم پیتانە دەستی پێ کرابێت، ئەمە پێشگیریەکی تێدایە بۆ ئەم قورئانەو ڕوونکردنەوە بە کێشەکە ڕاستەو لە لایەن خوداوە ڕەوانە کراوەو گومانی تێدا نیە، لەبەر ئەمەیە فەرموویەتی: ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ واتە: ئەم (پیتانە) چەند بەڵگەیەکی ئەم کتێبەن (ئەم قورئانەن)، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ واتە: ئەوەی بۆ تۆ هاتووەتە خوارەوە لە پەروەردگارتەوە ئەی موحەمەد (ﷺ) ﴿ٱلۡحَقُّ﴾ هەر ئەوە ڕاستە، ئەمە خەبەرەو موبتەداکەی لە پێشەوەیە کە ﴿وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾یە، پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕوا ناکەن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾[1] واتە: هەرچەندە زۆریش هەوڵ بدەی، ئەم خەڵکە زۆربەیان بڕوا ناهێنن. واتە: لەگەڵ ئەم هەموو ئاگادارکردنەوەو ئاسانکاریو شیکردنەوەدا زۆربەیان بڕوا ناهێنن چونکە ئەوانە هەر خەریکی ناکۆکیو دووڕوویيو لاسارین.

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ٢﴾

---

[1] یوسف (١٠٣).

**باسی تەواوی و کەمالی توانای خودا**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ واتە: خودایە کە ئاسمانەکانی بەرزکردووەتەوە بێ هیچ پایەو ستوونێك کە دەیبینن، خودای گەورە باسی کەمالی تواناو دەسەڵاتی مەزنی خۆی دەکات، کە خودایەکە بە ئیزنو فەرمانی ئەو ئاسمانەکان بەرزکراوەتەوە بێ پایەو ئەستوون، وە هەر بە ئیزنو فەرمانو ڕامهێنانی ئەویشە کە زەمینی جیاکردووەتەوەو دوری خستووەتەوە بە شێوەیەك کە پەی پێ نابرێتو دووریەکەی نازانرێت، ئەم ئاسمانەی دنیا چواردەورەی گشت زەوی داوە بە ئاوو هەوایەوە لە هەموو شوێنو جێیەکیەوە، وە لە هەموو لایەکیەوە ماوەی ڕۆیشتنی پێنج سەد ساڵە، ئەستوورایییەکەی خۆیشی ماوەی ڕۆیشتنی سەد ساڵە، پاشان ئاسمانی دووەم دەوری ئاسمانی یەکەمو ئەوەی تیایەتی داوە، نێوان دووریان ماوەی ڕۆیشتنی پێنج سەد ساڵە، ئەستووریەکەیشی ماوەی ڕۆیشتنی پێنج سەد ساڵە، ئاسمانی سێیەمو چوارەمو پێنجەمو شەشەمو حەوتەمیش هەر وایە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾[1] واتە: ئەو خودایەی حەوت ئاسمانی وەدی هێناوە وەك ئەوانیش زەمینی وەدی هێناوە، ﴿بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾ واتە: بێ هیچ ئەستوونێك کە دەیبینن ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسو موجاهیدو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریشەوە کە دەڵێن: ئاسمانەکان ئەستوونیان هەیە بەڵام نابینرێت.[2] ئیاسی کوڕی موعاویە دەڵێ: ئەم ئاسمانە بەسەر زەمینەوە وەك گومەزەیەك وایە، یانی بێ ئەستوونە.[3] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە قەتادەوە، هەر ئەم مانایەش شیاوە بۆسیاقی ئەم ئایەتە.[4] وا دیارە لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ﴾[5] واتە: ئەم ئاسمانەی ڕاگرتووە کە بەسەر زەمیندا نەکەوێت مەگین خۆی ئیزنی لەسەر بێت، بۆ جەختکردنەوە لە ڕوونەدانی ئەوە، فەرموویەتی: ﴿تَرَوْنَهَا﴾ واتە: دەیبینن، واتە: ئەم ئاسمانە بێ ئەستوون وەستاوە وەك دەبینن، هەر ئەم شێوەیەش بەڵگەی تەواوە بۆ تواناو دەسەڵاتی خودا.

[1] الطلاق (١٢).
[2] الطبري (١٦/٣٢٤).
[3] الطبري (١٦/٣٢٤).
[4] الطبري (١٦/٣٢٥).
[5] الحج (٦٥).

## چوونە سەرتەخت

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ واتە: پاشان ئەو (خوا) چووە سەر تەخت بەو شێوەی شایستەی خوا بێت کە ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین، وەك لە پێشەوە لە سورەتی (الاعراف)دا باس کرا، وە چۆن قورئانو فەرموودە باسیان لێکردووە، ئێمەش هەر وا بەسەریدا دەڕۆین (بلا تکیف ولا تشبیه ولا تعطیل ولا تمثیل تعالی الله علوا کبیراً)(بێئەوەی چۆنیەتی یەکەی یان هاوشێوەکەی دیاری بکەین یان نکولی لیّ بکەین وبڵێین خواناچێتە سەرتەخت ،نمونەش بۆخوای گەورەو بەرزوبڵند ناهێننەوە).

## خستنەکاری خۆرو مانگو هاتوچۆیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ واتە: خۆرو مانگی خستەکار هەریەکەیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دێنو دەچن. گوتراوە: مەبەست ئەوەیە، خۆرو مانگ دێنو دەچن، بە هاتنی ڕۆژی قیامەت لە یەکتری دادەبڕێن (واتە جیادەبنەوەو دەوەستن) وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾[1] واتە: خۆریش بەرەو بنکەی خۆی لە گەڕاندایە، کەئەمەش لە خاوەن دەسەڵاتی زاناوەیە، ئەو فەرمانەی پێدراوە، گوتراویشە: مەبەست بە بنکەی خۆی (مستقرها) کە ژێری عەرشە ،عەرش ئەوەی ڕاست بێتو بەڵگەی لەسەر هاتبێت بریتیەلە گومەزێك لە دوای جیهانو بوونەوەرەوەیە لەو ڕوویەکەوەوئەمەش وەك باقی گەردوونەکانی تر دەوری جیهانی نەداوە ، چونك تەخت چەندین ستوونی هەیە، چەند هەڵگری هەیەو هەڵی دەگرن، ئەمە عەقڵ نایبڕێت بۆ گەردوونێك بسووڕێتەوە، ئەمەیش ڕوونە بۆ کەسێك ورد ببێتەوە لەو ئایەتو فەرموودە سەحیحانەی کە لە بارەی عەرشەوە هاتوون. سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.خوای گەورە کە باسی خۆرو مانگی کردووە، لەبەر ئەوەیە ئەو دووانە لە دیارترینی حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکانن کە بەڕێزترو گەورەترن لە ئەستێرە وەستاوەکان، کاتێك خوا ئەمەی خستبێتەکار (ڕام کردبێت) ئەستێرەکانی تر چاکترو باشتر دەخاتەکار، وەك خوای گەورە ئاگاداری داوە لەو ئایەتەدا: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾[2] واتە: ڕۆژو خۆرو مانگیش لە نیشانەکانی ئەون، نە بەرەو خۆر سوژدە بەرن، نە بەرەو مانگ، سوژدە

---

[1] یس (٣٨).

[2] فصلت (٣٧).

بۆ خودایەك بەرن كە ئەوانی وەدی هێناوە. لەگەڵ ئەوەیشدا بە ئاشكرا ئاماژەی كردووە بەوەو فەرموویەتی: ﴿وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[1] واتە: خۆرو مانگو ئەستێرەكانی بەدی هێناو هەر لە ژێر فەرمانی ئەودان، دروستكردنو فەرمانكردن هەر بۆ ئەوە، بەرزو بڵندبێت خودای پەروردگارو ڕاهێنەری گشت جیهان، ﴿يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ﴾ واتە: نیشانەكانی شی دەكاتەوە، بەڵكو ئێوە لە دیداری پەروەردگارتان بێگومان بن. واتە: ئەم نیشانانە ڕوون دەكاتەوەو دەیكاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ئەو، خەڵكیش زیندوو دەكاتەوەو هەر كاتێك مەیلی لێبێت وەك چۆن لە سەرەتاوە دروستی كردووە.

﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا ۖ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (٣) وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (٤)﴾

### نیشانەكانی خودا لەناو زەمیندا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا ۖ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ هەر ئەمیشە ئەم زەمینەی ڕاخستووەو زۆرێك كێوو ڕووباری لێ دروست كردووەو ئەو هەموو بەروبومە زۆرەشی وەدی هێناوە، ﴿جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ واتە: جوتی نێرو مێی تێدا دروست كردووە. دوای ئەوەی خوای گەورە باسی جیهانی سەرەوەی كرد، دێتە سەر باسی تواناو دەسەڵاتو كارزانی خۆیی و ڕێكوپێكی كارەكانی لە جیهانی خوارەوەدا، واتە: سەر زەمین كە درێژو فراوانی كردووەو كێوەكانیشی بە توندی لێ دامەزراندووە بەرزی كردووەتەوە تێیدا، ڕووبارەكانی و جۆگەلەی زۆری تێدا دەڕوات، بۆ ئەوەی ئاودێری ئەو بەروبومە زۆرە هەمەجۆرو ڕەنگو تامو بۆندارەی پێ بكات. ﴿وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾ كە هەمووی كردووەتە جوتە (نێرو مێ) تێیدا ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ﴾ واتە: شەو بەسەر ڕۆژدا هەڵدەكێشێت واتە: وای لێ كردووە بە دوای یەكتردا دەڕۆن بە هێواشی، كاتێك ئەمیان ڕۆیشت، ئەوی تریان دێت بە دوایداو دایدەپۆشێت، ئەم بەسەرچوو، ئەوی تر دێت، چۆن هەڵسوكەوت لە كاتدا دەكات هەر بەو شێوەیەش هەڵسوكەوت لەگەڵ شوێنو دانیشتواندا دەكات، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ

---

[1] الاعراف (٥٤).

لَآيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ واتە: ئەمانە گشت نیشانەن بۆ ئەوانەی ڕادەمێنن لە فەرمان و بەهرەکانی خودا، ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ ﴾ لەم زەمینەدا کە چەندین پارچە بە تەنیشت یەکەوە هەن، واتە: چەند پارچە زەمین لە تەنیشتی یەکتردا هەیە، لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەم پارچە زەویەیان بە پیتەو ئەوەی سودی بۆ خەڵکی هەیە تێیدا دەڕوێتو ئەمەی تریان زەویەکە پڕە لە خوێو بێکەڵکەو هیچی لێ ناڕوێت، هەر بەم شێوەیە لە ئیبنو عەباسو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاکو کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە.[1] ئەم ئایەتەدیسان جیاوازی ڕەنگی پارچەکانی زەویش دەگرێتەوە، ئەمە خۆڵێکی سوورەو ئەمە خۆڵێکی سپیەو ئەمە زەردەو ئەم ڕەشەو پڕ لە بەردەو ئەمەیان دەشتو بیابانەو ئەمەی تر زەویەکی لماویەو ئەم ئەستوورەو ئەمەیش تەنکە هەموو ئەم پارچانە لە لای یەکەوەن، ئەم زەویە بە شێوەیەك و ئەوی تریش بە شێوەیەکی تر ، ئەمانە هەموو دەبنە بەڵگە لەسەر تواناو دەسەڵاتی خودای مەزن کە مەیلی هەر شتێکی هەبێت دەیکات، هیچ پەرستراوێك نیە تەنها خۆی نەبێتو پەروەردگاریش هەر ئەوەو کەسی تر نیە، ﴿وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ ﴾ واتە: هەروەها باغاتی ڕەزو (تری) کشتوکاڵ و دارخورما،ئەم ڕستەیە هەڵدەگرێت عەتف کرابێتە سەر ﴿وَجَنَّٰتٞ ﴾ ئەو کاتە ﴿وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ ﴾ بە مەرفوعی دەخوێنرێتەوە، هەڵیش دەگرێت عەتف کرابنە سەر ﴿أَعۡنَٰبٖ ﴾ ئەو کاتە بەمەجروری دەخوێنرێنەوە، هەر لەبەر ئەوەیە بە هەر شێوەیەکیان دەستەیەك لە پێشەوایانی ئیسلام خوێندوویانەتەوە، ﴿صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ ﴾ واتە: لقی لە یەکترو لەیەك جیا ،(صنوان) واتە: چەند لقی بە یەکەوە بوو لە یەك شوێندا، وەك هەنارو هەنجیرو هەندێ دارخورماو لەم جۆرانە ﴿وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ ﴾ ئەوەی لەسەر یەك لق بووە وەك هەموو درەختەکانی تر، هەر لەمەوەیەئەوترێ(عم الرجل صنو ابيه)واتە: مامی مرۆڤ لقی باوکی خۆیەتی، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە عومەر: (ئایا زانیوتە مامی پیاو لقی باوکیەتی).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ ﴾ واتە: ئاوپاراو دەبن، بەڵام تامو چێژی بڕێکیان باو دەدەین بەسەر بڕێکی تریاندا، لە ئەبو هورەیرەوەو (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)ڕیوایەت کراوەکەدەربارەی ئەم ئایەتە(ونفضل

---

[1] الطبري (١٦/٣٣١-٣٣٢).

[2] مسلم (٢/٦٧٧، (١/٦٧٧).

بعضها‌على بعض في الاكل) فەرموویەتی: (خورمای خراپو چاكو شیرینو ترش).[1] تیرمزی ڕیوایەتی كردووەو دەڵێ: فەرموودەیەكی چاكو غەریبە (حسن غریب). واتە ئەم جیاوازیە لە چەشنی بەروبومو كشتوكاڵدا لە شێوەو ڕەنگو تامو بۆنو گەڵاو گوڵەكانیاندا، ئەمە زۆر ترشەو ئەمە زۆر شیرینە، ئەمە زۆر تاڵو تفتەو ئەمە زۆر خۆشە، ئەمە لە كۆمەڵی ئەوەیەوئەوە لەكۆمەڵەی ئەوەیەو، پاشان دەگۆڕێت بۆ تامێكی تر بە ئیزنی خوای گەورە، ئەمە زەردەو ئەمە سوورەو ئەمە سپیەو ئەمە ڕەشەو ئەمە شینە، گوڵەكانیش بە هەمان شێوە، لەگەڵ ئەمەیشدا هەموویان لە یەك سەرچاوەوە درێژە دەدەن بە بوونی خۆیان ئەویش ئاوە، لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازیە زۆرەی كە لە ژمارە نایەتو نازانرێت، ئەمانە هەموو بەڵگەن بۆ كەسێك خاوەنی ئاوەز بێتو گەورەترین نیشانەن لەسەر تواناو دەسەڵاتی ئەو خودای كە مەیلی هەر شتێكی بێ دروستی دەكاتو بە جیا وەدی دەهێنێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: ئەمانە گشتی نیشانەن بۆ ئەوانەی خاوەن ئاوەزن.

﴿وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا أَإِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ۗ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٥﴾﴾

**نكولیكردن و بڕوا نەكردن بەژیانی دوای مردن سەیرە!**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ﴾ واتە: ئەگەر تۆ سەیرت دەمێنی، سەیر لە قسەكانی ئەواندایە، خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەكەی موحەمەد (ﷺ) ئەگەر تۆ بە لاتەوە سەیرە كە ئەو موشریكانە بڕوایان نیە بە زیندووبوونەوە لەگەڵ ئەو هەموو نیشانانەی خودای گەورەدا كە بە چاوی خۆیان دەیبینن لە دروستكراوەكانیدا، كە چەند خودایەكی بە تواناو خاوەن دەسەڵاتەو هەرچی مەیلی لێ بكات دەیكات، وە لەگەڵ ئەوەیشدا دانی پێدا دەنێن كە هەر خودا لە سەرەتاوە هەموو شتێكی دروست كردووە لە نەبوونو شتێك نەبووە هەر باسیش بكرێت، پاشان ئەمانە دوای ئەوە بڕوا ناكەن بەو هەواڵەی كە دەڵێ: لەمەوبەدوا جیهانێكی تازە وەدی دێتو جارێكی تر دروست دەبینەوە، بەهەمانكاتدادانیان ناوە بەشتێكدا كەبە چاوی خۆیان بینیویانەوگەورەترو گرنگترەلەمەی كەبڕوای پێ ناكەن سەیریان لێ دێت. بەڵكو سەیرتر ئەوەیە كە دەڵێن: ﴿أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا أَإِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ واتە: ئایا كەدەبینەوەبە خاك سەر لەنوێ ساز دەكرێینەوە؟ هەموو زاناو خاوەن ئاوەزێ چاك زانیویە كە وەدی هێنانی ئاسمانەكانو زەمین زۆر گەورەترە لە دروستكردنی خەڵكی، ئەو كەسەی لە سەرەتاوە خەڵكی دروست كردووە، دروست كردنەوەی جارێكی تر زۆر ئاسانترە لە لای،

[1] تحفة الأحوذي ((٥٤٤/٨))، فەرموودەیەكی لاوازە.

وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[1] واتە: ئاخۆ ئەوان نەیانزانی ئەو خودایە کە ئاسمانەکان‌و زەمنی وەدی هێناوە، لە وەدی هێنانیشیدا تووشی ناتەوانی نەبووە، دەتوانێ زیندووشیان بکاتەوەپاش مردنیان؟ بەڵێ ئەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. پاشان باسی خراپی بێباوەڕان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ ۖ وَأُولَٰئِكَ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ﴾ ئا ئەمانە لە پەروەردگاری خۆیان حاشا دەکەن، ئەوانە تەوقی ئاسنیان لە ملدایە، پێی ڕادەکێشرێن بۆ ناو ئاگر ﴿وَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ واتە: ئەوانە یاری ئاگرن‌و تاهەتا هەتایی تێیدا دەبن. هەرگیز لێی نایەنە دەرەوەو تێیدا دەمێنن.

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ وَقَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِمُ الْمَثُلَاتُ ۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٦﴾﴾

**خوانەناسان پەلەی سزادانیانە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالسَّيِّئَةِ قَبْلَ الْحَسَنَةِ﴾ واتە: بەر لەوە چاکەو پاداشتت لێ داوا بکەن، بە پەلەو هەڵپەسزاو ئازارت لێ داوا دەکەن. واتە: ئەو بێباوەڕانە لە جێی ئەوەی داوای چاکەت لێ بکەن، داوای سزاو تۆڵەت لێ دەکەن. وەك خوای گەورە لەم ئایەتانەی تردا باسیان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَا الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلَائِكَةِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ إِلَّا بِالْحَقِّ وَمَا كَانُوا إِذًا مُنْظَرِينَ﴾[2] واتە: بێباوەڕان دەڵێن: ئەی ئەو کەسەی قورئان نێردراوەتە خوار بۆ سەرت، بە ڕاستی تۆ شێتی، دەی بۆ فریشتەمان بۆ ناهێنی (شایەتی بدات تۆ پێغەمبەری) ئەگەر قسەکانت ڕاستن، خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ئێمە فریشتە نانێرین مەگین بە هەق، ئەوکاتەئیتر مۆڵەت نادرێن. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ ۚ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُسَمًّى لَجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾[3] واتە: داوات لێ دەکەن کە زوو وا بکەی بەڵایان بەسەردا بێت، ئەگەر وەخت‌و سەعات دیاری نەکرایە، ئازاریان بۆ دادەباری، هەر ئەوەندەت زانی لە

---

[1] الاحقاف (٣٣).
[2] الحجر (٦ـ٨).
[3] العنكبوت (٥٣ـ٥٤).

ناکاوێکدا تووشیان هاتو هەستی پێ ناکەن، وا بە پەلە داوای سزات لێ دەکەن، بە ڕاستی دۆزەخ دەوری خوانەناسانی داوە. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿سَأَلَ سَآئِلُۢ بِعَذَابٖ وَاقِعٖ﴾[1] واتە: داواکارێك داوای سزایەکی کرد، کە ئەو سزایە هەر ڕوودەدات، وە فەرموویەتی: ﴿يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ﴾[2] واتە: ئەوانەی باوەڕیان نیە بەو ڕۆژەی دێت، پەلە لە هاتنی دەکەن، ئەو کەسانەیش کە باوەڕیان هێناوە لێی دەترسن، دەشزانن کە ئەوە ڕاستە. وە فەرموویەتی: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾[3] واتە: هەر دەڵێن: ئەی پەروەرێنمان، بەر لەوە ڕۆژی قیامەت بێت بەشی خۆمان پێ بدە، واتە: تۆڵەمان لێ بسێنە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا باسی خوانەناسان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾[4] واتە: ئەوسایش گوتیان: ئەی خودایە، ئەگەر ئەمە بە ڕاستیەو لە لایەن تۆوە هاتووە لە حەواوە بەردەبارانمان بکە یان ئازارێکی بە ژانمان بۆ بنێرە. زۆر بێباوەڕو لاسارو خوانەناس بوون، داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، کە سزای خودایان بۆ بێنێت، خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿وَقَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِمُ ٱلۡمَثُلَٰتُ﴾ واتە: پێش لەوانیش زۆری وابوون (تووشی جەزرەبە هاتن) واتە: تۆڵەو جەزرەبەی خۆمان لەو گەلە پێشووانەدا سەندو کردمانە پەندی زەمانە، بۆ ئەو کەسانەی دەرسیان لێ وەردەگرێت، پاشان خوای گەورە باسی کارزانیو لێبوردەیی خۆی دەکات، ئەگەر وا نەبووایە لە پڕ تووشی جەزرەبەی دەکردن وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ﴾[5] واتە: ئەگەر خودا ئەم خەڵکەی(بەهۆی ئەو کارانەی دەیکەن) بگرتایەوسزای بدانایە لەسەر پشتی ئەم زەمینە گیانلەبەرێکیش نەدەما، لێرەدا خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلۡمِهِمۡۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾ واتە: ئەگەرچی خەڵکی ستەمکار بن پەروەردگارت بەخشندەیەو لە تۆڵەشدا توندو تیژە. واتە: خوای گەورە خاوەن بەزەییو

[1] المعارج (١).
[2] الشورى (١٨).
[3] ص (١٦).
[4] الانفال (٣٢).
[5] فاطر (٤٥).

میهرەبانە، چاوپۆشی دەکات لە خەڵکی، هەرچەندە ستەمکارن‌و بە شەو بە ڕۆژ هەڵە دەکەن‌و پاشان بە دوای ئەو بەزەیی‌و میهرەبانیەدا باسی توندو تیژی خۆیشی کردووە بۆ ئەوەی ترس‌و ئومێد هاوتا بکات‌و (خەڵکی لەو نێوانەدا بژین) وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَاسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُ عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ﴾[1] واتە: ئەگەر وتیان تۆ ئەم قسەیەت ڕاست نیە، پەروەردگاری ئێوە خاوەن دلۆڤانیەکی بەربڵاوەو تاوانبارانیش لە سزای لانادرێن. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[2] واتە: پەروەردگارت بە پەلە تۆڵە دەسێنێت‌و هەر بۆ خۆشی لە گوناهکاران دەبوورێت‌و دلۆڤانە. وە فەرموویەتی: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ الْعَذَابُ الْأَلِيمُ﴾[3] واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر خۆمم لە گوناهان دەبوورم‌و دلۆڤانم. جەزرەبەشم زۆر بە ژانە. وێنەی ئەم ئایەتانە زۆرن کە هیواو ترسی تیا کۆبووەتەوە.

﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ۗ إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ۖ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴿٩﴾﴾

## موشریکەکان داوای بەڵگە دەکەن‌و وەڵامدانەوەی قورئانیش بۆیان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ واتە: خوانەناسان دەڵێن: باشە بۆچی لە پەروەرندەی خۆیەوە بەڵگەیەکی بتەوی بۆ نەهاتووە؟ خوای گەورە باسی بتپەرستەکان دەکات، ئەوەندە بێدین‌و لاسارن دەڵێن: بۆچی نیشانەیەکی بۆ نەهێناوین وەك چۆن پێشینەکان بۆیان هات، هەر وازیان نەدەهێناو داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد کەکێوی سەفایان بۆ بکات بە زێڕ، یان کێوەکانیان بۆ سارا بکاتەوەو بیکاتە لەوەڕگاو ڕووباری پێدا بڕوات، خودای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿وَمَا مَنَعَنَا أَن نُّرْسِلَ بِالْآيَاتِ إِلَّا أَن كَذَّبَ بِهَا الْأَوَّلُونَ﴾[4] واتە: ئێمە بۆیە بەڵگەکانمان نەدەنارد، لەبەر ئەوە بوو پێشینەکان بە درۆیان لە قەڵەم دەدان، (واتە: بە درۆیان

---

[1] الانعام (١٤٧).

[2] الاعراف (١٦٧).

[3] الحجر (٤٩-٥٠).

[4] الاسراء (٥٩).

دەزانی)، بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَـٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[1] واتە: ئەرکی سەر شانی تۆ نیە ئەمانە بخەیتە سەر ڕێ، بەڵام هەر کەسێك خودا خۆی مەیلی لێ نەبێت شارەزای ڕاستەڕێی دەکات. لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾ واتە: بۆ هەر گەلێك لە گەلانیش دەشێت ڕێنیشاندەرێك هەبێت، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێ لە ئیبنو عەباسەوە: واتە: بۆ هەر گەلێگ لە گەلان بانگخوازێك هەبێت.[2] وەك ئەم ئایەتە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾[3] واتە: هیچ کۆمەڵێك نەبوو کە ترسوەبەرهێنەریان بۆ نەچووبێت. قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدیش هەر وایان گوتووە.[4]

﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ الْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ ۖ وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْكَبِيرُ الْمُتَعَالِ ﴿٩﴾﴾

### ئاگادارلە نهێنی هەر خودایە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿اللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ﴾ واتە: لە تۆلی (ڕەحمی) هەر مێینەیەکدا هەرچی هەیە خوا دەیزانێ. خوای گەورە باسی فراوانیو تەواوی زانیاری خۆی دەکات کە هیچ شتێکی لێ ناشارێتەوە، ئاگاداری هەیە بەسەر ئەوەی لە سکی هەموو مێینەیەکدا هەیە لە مێینەی گشت گیانەوەرێکدا، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ﴾[5] واتە: خوا دەزانێ منداڵدانی (ڕەحمی) سکپڕان چی تێدایە، واتە: دەزانێ بە نێر یا بە مێ سکی پڕ بووە، جوانە یان ناشیرینە، بەختەوەرە یان بەدبەختە، تەمەنی درێژە یان کورتە، وەك دەفەرمووێت: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾[6] واتە: خودا ئێوە لە خۆتان باشتر دەناسێت، وەختێك ئێوەی لەم زەمینە پەیداکردووە، لە پێشدا بێچوویەك بوون. لەناو زکی دایکەکانتان. وە

[1] البقرة (٢٧٢).

[2] الطبري (١٦/٣٥٧).

[3] الطبري (١٦/٣٥٦).

[4] فاطر (٢٤).

[5] لقمان (٣٤).

[6] النجم (٣٢).

فەرموویەتی: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ﴾[1] واتە: ئێوەیش ئاوا دروست دەکات لە سکی دایکتاندا (جار لە دوای جار) لە سێ قۆناغی تاریکدا. وەك لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾[2] واتە:( ئێمە مرۆڤمان لە قوڕێکی خۆشکراو دروست کردووە، ئەوسا کردمانە تنۆکێك، لە بنکەیەکی بتەودا، پاشان هەر لەو تنۆکەوە خوێنی مەیومان پێك هێناو لەو خوێنەوە پلە گۆشتێکمان سازکردو ئەوسالە پلە گۆشتەکە پێشەمان دروست کرد، پێشەکەشمان بە گۆشت داپۆشی،پاشان کردمانە دروست کراوێکی تر، گەورەو پیرۆزە ئەو خوایەی کە چاکترین وەدی هێنەرانە)، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان وەدیهاتنی هەر یەکێك لە ئێوە لە سکی دایکیدا چل ڕۆژ کۆدەکرێتەوە ، پاشان چوار مانگ لە پاشان خودا فریشتەیەك دەنێرێت فەرمانی پێ دەکرێت بە چوار وتە : بە نووسینی ڕۆزیو تەمەنیو کارىو بەختەوەرە یان بەدبەختە).[3] لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (فریشتەکە دەڵێ: پەروەرندەم نێرە یان مێیە؟ پەروەرندەم بەختەوەرە یان بەدبەختە: ئەی ڕۆزی کامەیە؟ ئەی (ماوەی) تەمەنی کامەیە؟ خوای گەورە پێی دەفەرمووێتو فریشتەکەیش دەینوسێت).[4] ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ﴾ واتە: دەزانێ چی لێ کەم دەبێتەوەو چیشی دێتە سەر. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (کلیلی نهێنیەکان پێنجە، خوانەبێت کەس نایانزانێ: جگە لە خوا کەس نازانێت بەیانی چی دەبێت، جگە لە خوا کەس نازانێت منداڵدان چی لێ کەم دەبێتەوە، جگە لە خوا کەس نازانێت کەی باران دەبارێت، وە هیچ گیانێك نازانێت لە چ زەویەکدا دەمرێت، وە جگە لە خودا کەس نازانێت کەی قیامەت هەڵدەستێتو دێت).[5]

عەوفی دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ﴾ یانی لەبارچوو ﴿وَمَا تَزْدَادُ﴾ واتە: ئەوەی لەناو منداڵداندا زیادی کردووە بەسەر ئەوەدا کەمی کردووە هەتا بە تەواوی بوویەتی چونکە هەندێك

---

[1] الزمر (٦).

[2] المؤمنون (١٢ـ١٤).

[3] فتح الباري (٤٨٦/١١)، مسلم (٢٠٣٦/٤).

[4] فتح الباري (٤٨١/١١)، مسلم (٢٠٣٨/٤).

[5] فتح الباري (٢٢٥/٨).

ژن دە مانگ سکی پڕ دەبێتو هەندێ نۆ مانگ سکی پڕ دەبێتو هەندێکیان زیاترەو هەندێکیش کەمترە، ئەو کەمو زیادیەی کە خوای گەورە باسی کردووە هەمووی بە ئاگاداری خوای گەورەیە.[1]

قەتادە دەڵێ: ﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ﴾ هەموو شتێك لای خودا ئەندازەی هەیە، دانانی بژێویو دروستکردنو ماوەی ژیان، هەمووی ئەندازەی خۆی بۆ دیاری کراوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە، یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە کچێکی لە گیان کێشاندایە ، ئەم پێی خۆشە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە لای بێت، پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی نارد بۆ لای پێی بڵێ: (مەیلی خوایە ئەوەی بردوویەتیو وەری گرتووە ئەوەیش داویەتی هی ئەوە، هەموو شتێك لای ئەو بۆ ماوەیەکی دیاری کراوە فەرمانی پێ بکە با خۆڕاگرێتو ئومێدی بە پاداشتی خودا بێت)،[2] ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ واتە: لە نادیارانو لە دیاران ئاگادارە، یانی: ئاگاداری هەموو شتێکە ئەوەی خەڵکی دەیبیننو ئەوەیش لێیانەوە دیار نیەو نایبینن، هیچ شتێك لە خوا ون نابێت، ﴿ٱلْكَبِيرُ﴾ واتە: زۆر مەزنە، لە هەمو شت مەزنترە، ﴿ٱلْمُتَعَالِ﴾ واتە: بەرزە بەسەر هەموو شتێکدا، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًۢا﴾[3] واتە: زانستی خوا دەوری هەموو شتێکی داوە.

﴿سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾﴾

### زانستی خودا دەوری هەموو دیارو نادیارێکی داوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ﴾ واتە: هەر کەسێك لە ئێوە بەپەنهانی قسە بکاتو دەنگ هەڵبڕێت لای خودا وەك یەکە، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات، کە زانیاری ئەو دەوری هەموو دروستکراوەکانی داوە، ئەوانەی بە پەنهانی قسە دەکەن یان دەنگ بەرز دەکەنەوە، لای خودا جیاوازی نیە، چونکە خودا دەیبینێتو هیچی لێ ون نابێت. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى﴾[4] واتە: ئەگەر دەنگیشت هەڵبڕی، ئەو بە ڕازو

[1] الطبري (٣٥٩/١٦).
[2] فتح الباري (٥٠٢/١١).
[3] الطلاق (١٢).
[4] طه (٧).

نزمتریش دەزانێ. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾[1] واتە: هەرچی بشارنەوەو هەرچی ئاشکرای بکەن ئەو(خودا) دەیزانێت، عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پاکیو بێعەیبی بۆ کەسێك زانستی ئەو هەموو دەنگەکانی داگرتووەو هەموو دەنگەکان دەبیستێت، سوێند بە خوا! ئەو ژنە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) سکاڵای دەکرد لە مێردەکەی من لە تەنیشتی داولەماڵەکەدا بووم، هەندێ قسەیەم لا ڕوون نەبوو، کەچی خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾[2]، واتە: خوا قسەی ئەو ژنەی بیست کە سەبارەت بە مێردەکەی لەگەڵ تۆ (واتە: پێغەمبەر(ﷺ)) کێشەی دەکردو سکاڵای لای خوا دەکرد، خودا دەیبیست کە ئێوە وتووێژتان بوو، خودا بیسەرو بینایە، ﴿وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ﴾ واتە: یان کەسێك کەلە شەودا خۆ پەنانەدات.یانی: لەناو ماڵەکەیدا خۆی بشارێتەوە لەتاریکایی شەودا﴿وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ﴾ واتە: لەناو ڕۆژی ئاشکرادا بێتو بچێت. یانی: لە ڕۆژی نیوەڕۆداو لەو ڕۆشناییەدا هەردووکیان لای خودا وەك یەکەو ئاگای لێیەتی. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾[3] واتە: تۆ بزانە (ئەی موحەمەد ﷺ) لەو کاتەدا خۆیان بە جلەکانیان دادەپۆشن، ئەو دەزانێ چیە لەسەر چی دەکەنو چی بە ئاشکرا دەڵێن. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِنْ قُرْآنٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَنْ رَبِّكَ مِنْ مِثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِنْ ذَلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ﴾[4] واتە: تۆ (ئەی موحەمەد (ﷺ)) لە هەر بارێکدا بێتو هەرچی لە قورئان بخوێنیت لە زەمینو ئاسماندا با بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت یان وردتر یان درشتتر بێت، هیچیان لە پەروەردگاری تۆ ون نابێتو مەگین وا لە کتێبی ئاشکرادا.

## فریشتە پارێزەرەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ﴾ واتە: بۆ ئەو (ئادەمی) چەند فریشتەیەك هەیە کە بە دوای یەکدا دێن لە پێشیەوەو لە دوایەوە، بە فەرمانی خودا

---

[1] النمل (٢٥).

[2] البخاري (٧٣٨٥)، ابن ماجه (١٨٨)، النسائي في الكبرى (١١٥٧٠)، الطبري (٥/٢٨).

[3] هود (٥).

[4] يونس (٦١).

دەیپارێزن. واتە: بۆ هەر بەندەیەك چەند فریشتەیەك بە دوای یەكدا دێن بۆ لای، پاسەوانێك بە شەوو پاسەوانێك بە ڕۆژ دەیپارێزن لە خراپەو كارەساتەكان، وەك چۆن فریشتەی تر بە دوای یەكدا دێن بۆ پاراستنی كردارەكان لە چاكەو لە خراپە، فریشتەیەك بە شەوو فریشتەیەك بە ڕۆژ، دوو فریشتەی تریش لای ڕاستو لای چەپ كردارەكان دەنووسن، هاوەڵی لای ڕاست چاكەكان دەنووسێت، هاوەڵی لای چەپ خراپەكان دەنووسێت، دوو فریشتەی تریش پاسەوانی دەكەنو دەیپارێزن، یەكێكیان لە دوایەوەو ئەوی تریان لە پێشیەوە ئەو كەسە لە نێوانی چوار فریشتەی ڕۆژو چوار فریشتەی شەو دایە، یەكتری دەگۆڕن، دوو پارێزەرو دوو نووسەر. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (چەند فریشتەیەك هەیە بە دوای یەكدا دێن لەناو ئێوەدا فریشتەیەك بە شەوو فریشتەیەك بە ڕۆژ، كۆدەبنەوە لە نوێژی بەیانیو نوێژی عەسردا، ئەوانەی لای ئێوە ماونەتەوە، بەرز دەبنەوە بۆ لای خودا، پرسیاریان لێ دەكات (خوا ئێوە لە خۆتان باشتر دەناسێت): چۆن بەندەكانی منتان بەجێ هێشت؟ ئەڵێن: چووینە لایان ئەوان نوێژیان دەكرد، بەجێمان هێشتن ئەوان نوێژیان دەكرد).[1] ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵاوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ كەسێك نیە لە ئێوە مەگین هاوڕێیەكی جنۆكەو هاوڕێیەكی فریشتەی بۆ دانراوە) گوتیان: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟ (ﷺ) فەرمووی: (منیش، بەڵام خوا منی سەر خستوو بەسەریداو ئەو بە چاكە نەبێت فەرمانم پێ ناكات).[2] تەنها موسلیم ئەم فەرموودەی هێناوە.[3] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە ئیبراهیمەوە دەڵێ: خودا وەحی كرد بۆ یەكێك لە پێغەمبەرەكانی نەوەی ئیسرائیل، كە بڵێ بە گەلەكەت: هیچ كەسێكی خەڵكی شارێك یان ماڵێك نیە كە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بێتو پاشان وەرگەڕێت لەوە بۆ بێفەرمانی خودا، مەگین ئەوەی پێیان خۆشە خودا دەیگۆڕێت بۆ ئەوەی پێیان ناخۆشە، پاشان دەڵێ: ڕاستی ئەمەیش لە قورئاندا هەیە، خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ﴾ واتە: خودا بارودۆخ لە هیچ گەلێك ناگۆڕێت، تا ئەوان دڵیان نەگۆڕن. ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾ واتە: ئەگەر خودا بیەوێت تیرەیەك تووشی بەڵا بن، هیچ ڕێگری نایەتەڕێو خوداش نەبێت هیچ كەس دۆستایەتیان ناكات.واتە:هیچ كەسێك نایەت بەهاناتانەوە جگەلەخودا.

[1] فتح الباري (١٣/٤٢٦).

[2] أحمد (١/٤٠١)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] مسلم (٢٨١٤).

﴿هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ ﴿١٣﴾﴾

## هەورو بروسکەو هەورەگرمە بەشێکن لە تواناو دەسەڵاتەکانی خودا

خوای گەورە باس لەوە دەکات، کە هەر خۆی بروسکەی ڕام هێناوە، ئەو بروسکەی کە لە نێوان هەوردا ڕووناکیەکەی دەدرەوشێتەوەو پرشەی لێوەدێتو دیارەو دەبینرێت، ئیبنو جوبەیر ڕیوایەتی کردووە کە ئیبنو عەباس وەکەنامەکەی نوسی بۆ ئەبو جەلدو لە بارەی بروسکەوە پرسیاری لێکرد،ئەبوجلد گوتی: بروسکەبریتیەلە ئاو.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ هەر خودا خۆیەتی بۆ ترسانو ئومێد پەیدابوون بروسکەتان نیشان دەدات، قەتادە دەڵێ: بۆ ترساندنی ڕێبوار، چونکە ڕێبوار لە ئازارو ناڕەحەتیەکەی دەترسێت، بەڵام نیشتەجێ بە هیوای پیتو سودەکەیەتیو چاوەڕوانی ڕۆزی لێ دەکات لە لایەن خوداوە. ﴿وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ﴾ وە هەوری پڕ (قورس) وەدی دەهێنێت، واتە: ئەو هەورە دروست دەکاتو دەیکاتە سەرچاوەیەکی تازە، لەبەر زۆری ئاوی هەورەکە قورس دەبێتو لە زەوی نزیك دەبێتەوە. موجاهید دەڵێ: هەوری قورس ﴿ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ﴾ ئەوەیە کە ئاوی تێدایە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعْدُ بِحَمْدِهِۦ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِۦ﴾ واتە: هەورەکانو فریشتەکان لە سامی ئەم (خودا) سوپاسو ستایشی دەکەن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایە وایە کە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ﴾[3] واتە: هەموو شتێك بە سوپاسەوە پاکانەی ئەو دەکات، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە دەڵێ: باوکم هەواڵی دامێ گوتی: لە تەنیشتی حەمیدی کوڕی عەبدوڕەحمان لەناو مزگەوت دانیشتبووم، پیاوێکی بە تەمەن لە نەوەی غیفار تێپەڕی، حەمید ناردی بە دوایدا، کاتێك هات بۆ لای گوتی: ئەی برازای خۆم! لە نێوان منو خۆتدا جێی بۆ فراوان بکە، چونکە ئەو پیاوە هاوەڵی پێغەمبەری خودای کردووە (ﷺ) پیاوەکە هاتو لە نێوان منو ئەودا دانیشت، حەمیدی پێی گوت: ئەو فەرموودەی کە بۆت باس کردم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)

---

[1] الطبري (١٦/٣٨٧).

[2] الطبري (١٦/٣٨٨).

[3] الاسراء (٤٤).

کامەیە؟ پیاوە بە تەمەنەکە پێی گوت: بیستم لە پیاوێکی بە تەمەنی غیفاریەوە کە گوێی لە پێغەمبەر بووە (ﷺ) دەیفەرموو: (بێگومان خودا هەور دروست دەکات قسە دەکات بە چاکترین شێوەو، پێدەکەنێت بە چاکترین شێوە).[1] مەبەست بەمە(والله أعلم) قسەکردنەکەی بریتی یەلە هەورەگرمەو پێکەنینەکەیشی بریتیەلە بروسکەی. موسای کوڕی عوبەیدە لەڕێگەی سەعیدی کوڕی ئیبراهیمەوەدەڵێت: خودا باران دەنێرێت هیچ شتێك چاکتر لەو پێناکەنێتو لەو باشتر قسە ناکات، پێکەنینەکەی بروسکەیەو قسەکەیشی هەورەگرمەیە.

## دوعاکردن لە کاتی هەورەگرمەدا

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك کە گوێی لە هەورەگرمەو بروسکە بووایە دەی فەرموو: (ئەی خودایە بە توڕەیی خۆت مەمانکوژە، وە بە جەزرەبەی خۆت لەناومان مەبە، وە لە پێش ئەوەدا بمانپارێزە).[2] تیرمزی ڕیوایەتی کردووە، بوخاریش لە کتێبی (الإدب)دا ڕیوایەتی کردووە، نەسائی لە (اليوم والليلة)داو حاکمیش لە موستەدرەکدا ڕیوایەتیان کردووە،[3] لە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە، کاتێك کە گوێی لە هەورەگرمە بووایە، وازی لە قسەکردن دەهێناو دەیفەرموو:(پاكو بێعەیبی بۆ ئەو کەسەی هەورەکانو فریشتەکان لە ترسی ئەو سوپاسو ستایش دەکەن، پاشانفەرمووی: ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندی تیایە بۆ خەڵکی سەر زەمین)، مالیك ڕیوایەتی کردوە لە کتێبی (الموطأ)دا، بوخاریش لەکتێبی (الادب)[4]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (پەروەرندەی مەزنتان فەرموویەتی: ئەگەر بەندەکانم گوێڕایەڵیان بکردمایە بە شەو بارانم بۆ دەباراندنو بە ڕۆژیش خۆرم بۆ هەڵدەهێنان، دەنگی هەوریشم نەدەدا بە گوێیاندا).[5] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ﴾ واتە: هەورە تریشقەیش دەنێرێت، دەیدات لە هەر کەسێ مەیلی لێبێت، واتە: خوای گەورە هەورە تریشقە دەنێرێت، وەك تۆڵەیەك لەو کەسانەی حەز دەکات تۆڵەیان لێ بسێنێت، بۆیە لە کۆتایی زەماندا ئەم بەڵاییانە زۆر دەبێت، ئیمامی تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە ئەربەدی کوڕی قەیسو عامیری کوڕی توفەیلی (الطفيل) کوڕی مالیك هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەدینە، چوونە خزمەتیو لەبەر دەمیدا دانیشتن. عامیری کوڕی توفەیل

---

[1] أحمد (٤٣٥/٥)، سەنەدەکانی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم.

[2] أحمد (٢٠٠/٢)، لە لاوازەوە نزیکە.

[3] تحفة الأحوزي (٤١٢/٩)، الادب المفرد (١٨٧)، النسائي في الكبرى (٢٣٠/٦)، الحاكم (٢٨٦/٤)، لە لاوازەوە نزیکە.

[4] الموطأ (٩٩٢/٢)، الادب المفرد (٧٢٤).

[5] أحمد (٣٥٩/٢)، ئەم فەرموودەیە لە لاوازەوە نزیکە.

گوتی: ئەی موحەمەد (ﷺ) چیم بۆ دەکەی ئەگەر موسڵمان بووم؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەی دەدرێت بە موسڵمانان بە تۆش دەدرێت، ئەو ئەرکەیش دەدرێت بەسەر ئەواندا بەسەر تۆیشدا دەدرێت) عامیری کوڕی توفەیل گوتی: ئایا ئەگەر موسڵمان بووم دوای خۆت ئەو کارە بە من دەسپێری؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر ئەوە نە بە تۆو نە بە هۆزەکەیشت ناردێت، بەڵام جڵەوی ئەسپ ئەدرێت بەدەستەوە گوتی: من ئێستاجڵەوی ئەسپی نەجدم هەمووڵەدەستدایە،(نەخێر) ، بادەسەڵات لەخێوەتنشینەکاندا بۆمن بێت ودەسەڵاتیش لەخانونشینەکاندا بۆتۆبێت! پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی گوت:نەخێر (وانابێت). کاتێك عامیرو ئەربەد ڕۆیشتن، عامیر گوتیدەی سوێندبەخوا بەپیاووبەئەسپ ئەم دەشت ودەرەت لێ پڕئەکەم ،پێغەمبەر"ص"فەرموویخواڕێگریت ئەکات !جاکەئەربەدو عامیر چوونەدەرەوە،عامیرووتی : ئەربەد! من موحەمەد سەرقاڵ دەکەم بە قسەوە تۆیش بە شمشێرەکەت لێی بدە، بێگومان کاتێك تۆ موحەمەدت کوشت، خەڵکی هیچ چارەیەکیان بۆ نامێنێتەوە جگە لە خوێن وەرگرتن، پاشان بە خوێن وەرگرتن ڕازی دەبن‌و حەزیان لە جەنگکردن نیە، ئێمەیش خوێنیان دەدەینێ. ئەربەد گوتی: باشە وا بکە، هاتنەوەو چوونە لای پێغەمبەر(ﷺ) عامیر گوتی: ئەی موحەمەد هەڵسە لەگەڵم باچەند قسەیەکت بۆ بکەم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵیدا هەڵسا، لە پاڵ دیوارێکدا بوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵی وەستابوو قسەی بۆ دەکرد، ئەربەد دەستی برد بۆ شمشێرەکەی، کاتێك کە دەستی برد بۆ شمشێرەکەی دەستی وشك بوو بە مشتی شمشێرەکەیەوەو نەیدەتوانی شمشێرەکە هەڵکێشێت، ئەربەد هەرچاوەڕوانی عامیربوو شمشێرەکە بوەشێنێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لای کردەوە، چاوی پێکەوت ئەربەد چی دەکات، بەجێی هێشتن، کاتێك عامیرو ئەربەد لە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشتن،تا گەیشتنەحەڕە (حەڕەی واقیم )ولەوێدا دابەزین، سەعدی کوڕی مەعازو ئوسەیدی کوڕی حوزەیر (حُضیر) ڕۆیشتن بە دوایدا گوتیان: ئەی دوژمنانی خودا بەر لەعنەتی خوا بکەون، خۆتانمان بۆدەربخەن !عامیر گوتی: ئەمە کێیە ئەی سەعد؟ گوتی: ئوسەیدی کوڕی حوزەیری کەتائیبە پاشان ڕۆیشتن هەر لە ڕەقم بوون، خوای گەورە هەورە تریشقەیەکی نارد دای لە ئەربەدو کوشتی، عامریش ڕۆیشت، هەتا گەیشتە خەریم خودا برینێکی (زامێکی) بۆ ناردو گیرۆدەی کرد، بە شەو خۆی گەیاندە ماڵی ژنێکی بەنی سەلولو دەستی دەهێنا بە برینەکەیدا کەلە گەروویدا دروست بووبوو دەیگوت: گرێیەك وەك گرێ ی وشتر لە ماڵی سەلولیەکاندا ، کە حەز دەکات لە ماڵی ئەودا بمرێت! پاشان سواری ئەسپەکەی بوو زۆر ناڕەحەت بوو تا وای لێهات بەو برینەوەوبەسەر ئەسپەکەیەوەولەڕێگەی گەڕانەوەدا گیانی دەرچوو، خوای گەورەش ئەم ئایەتانەی لەسەر ئەوان ناردەخوارەوە: ﴿ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۚ وَكُلُّ

شَيْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلْكَبِيرُ ٱلْمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ يَحْفَظُونَهُۥ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴾ گوتی: ئەو فریشتانەی بە دوای یەکدا دێن‌و لە پێش‌و لە دوای ئەوەی ئادەمەوە بە فەرمانی خودا موحەمەد (ﷺ) دەپارێزن، پاشان باسی ئەربەدو ئەوەی پێی کوژرا کردو گوتی ﴿وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ﴾.[1] سەرچاوەی ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی بوخاریدا بە کورتی هاتووە بەم ژمارەیەیە (٤٠٩١). پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُمْ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ﴾ واتە: کەچی ئەوان دەربارەی خودا کێشەیانە، واتە: گومانیان لەگەورەیی‌و توانای خودا هەیە، کە جگە لەو هیچ خودایەکی تر نیە، ﴿وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ﴾ واتە: لە سزادانیدا زۆر توندو تیژە. ئیبنو جەریر دەڵێ: خودا زۆر توندو تیژە لە جەزرەبەدانیدا بەرامبەر ئەوەی کە سەربزێوو لاسارەو بەردەوامە لەسەر بێدینی.[2] ئەم ئایەتە لەو ئایەتانە دەچێت کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[3] واتە: خەریك بوون ئاژاوەیەك بنێنەوە ئێمەش کەتنی خۆمان پێکردن، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، سا بنواڕە سەرەنجامی کەتنەکەیان بە کوێ گەیشتن، ئەوانیش‌و کۆمەڵەکەی ئەوانیشمان لەناو برد، لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ﴿وَهُوَ شَدِيدُ ٱلْمِحَالِ﴾ یانی: خودا زۆر توندگیرە[4].

﴿لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ ۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿١٤﴾﴾

## نموونەی بێدەسەڵاتی خوکانی بتپەرستان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ﴾ واتە: نزاو پاڕانەوەی هەقیش هەر بۆ ئەوە (تەنها هاوار لە خوا بکەن) عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: ﴿لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ﴾واتە: یەکتاپەرستی

---

[1] الطبراني (١٠/٣٧٩/٣٨١).

[2] الطبري (١٦/٣٩٤).

[3] الطبري (١٦/٣٩٦).

[4] النمل (٥٠ـ٥١).

(التوحيد).[1] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە کە ئیبنو عەباس‌و قەتادەو مالیك دەڵێن لە موحەممەدی کوڕی موکەنەدەرەوە ﴿لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ﴾ یانی: (لا إلـه الاّ الله).[2] ﴿وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ﴾ واتە: ئەو کەسانەی بانگ لە غەیری خودا دەکەن، کەس بە دەنگیانەوە نایەت، ﴿كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ﴾ واتە: وەك کەسێك وان کە هەر لە دوور دەستی بۆ ئاو ڕابکێشێت حەز بکات بێتە دەستیەوەکەچی ناشیگاتێ، عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: وەك ئەو کەسە وایە کە لە کەنار بیرێکدا دەست بۆ ئاو ڕابکێشێت، کە هەرگیز ئەو ئاوە نایەتە دەستی! کەوایە چۆن دەیگەیەنێتە دەمی؟[3] موجاهید دەڵێ: ﴿كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ﴾ یانی: بە زمانی هاوار بۆ ئاو دەکات‌و ئیشارەتی بۆ دەکات، بەڵام ئەو ئاوە هەرگیز نایەت بۆ لای.[4] مانای ئەم قسەیە ئەوەیە، ئەو کەسەی دەستی ڕادەکێشێت بۆ ئەو ئاوە کە بیکاتە دەستی یان لە دوورەوە دەستی بۆ ڕابکێشێت، کە ناتوانێ بیگرێت، وەك چۆن ئەو کەسە سوود لەو ئاوە وەرناگرێت کە ناگاتە ناودەمی کە شوێنی ئاوخواردنەوەیەتی، هەر بەو جۆرە ئەو موشریکانەیش کە پەرستراوێکی تر لەگەڵ خودا ئەپەرستن، هیچ سوودێکی هەرگیز لێ وەرناگرن نە لە دنیاو نە لە ڕۆژی قیامەتدا. لەبەر ئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ﴾ واتە: پاڕانەوەی خوانەناسەکان هەموو پووچەو بە فیڕۆ دەچێت.

﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ۩ ﴿١٥﴾﴾

### هەموو شتێك سوژدە بۆ خودا دەبات

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم﴾ واتە: هەرچی لە نێوانی ئەم ئاسمانەو زەمینە داهەیە(بیەوێت یان نەیەوێت) خۆیان‌و سێبەرەکانیان هەموو بەیانی‌و ئێوارانێك هەموویان سوژدە بۆ خوا دەبەن. خوای گەورە باسی گەورەیی‌و دەسەڵاتی خۆی دەکات، کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو گشتی سەری بۆ دادەنەوێنێت، هەر لەبەر ئەمەیە کە هەموو شتێك سوژدەی بۆ دەبات لە خاوەن باوەڕان بە ئارەزووی خۆیان، لە خوانەناسانیش بە ناچاری، ﴿بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ﴾ واتە: لە ئێواران‌و بەیانیاندا.یانی: سێبەری هەموو شتێکیش سوژدە بۆ خوا دەبات لە

[1] الطبري (١٦/٣٩٨).
[2] الطبري (١٦/٣٩٨).
[3] الطبري (١٦/٤٠٠).
[4] الطبري (١٦/٤٠٠).

سەرەتای ڕۆژو لە کۆتاییەکەشیدا. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴾[1] واتە: ئایابەچاو نەیان دیوە، کەهەرچی خوا دروستی کردووە، سێبەریان بە ڕاستو چەپدا بە ملکەچی سوژدە بەرەو خوا دەبەن.

﴿ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ ۚ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ (١٦) ﴾

**سەلماندنی یەکخواپەرستی (التوحید)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ ۚ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُم مِّن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ نَفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾ واتە: بڵێ: کێیە ڕاهێنەری ئەم ئاسمانانو زەمینە؟ بڵێ: خودا.(جا) بڵێ: ئایا ئێوە پشتیوانانێکتان جگەلەئەوخودایە بۆ خۆتان داناوە کە قازانجو زیانی خۆشیان بە دەست نیە؟ خوای گەورە دەفەرمووێت کە هەر ئەو خوایە جگە لەو خوایەکی تر نیە، بێگومان خوانەناسان دان دەنێن بەوەدا کە خودا وەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەمینە، ئەو پەروەرندەو بەڕێوەبەریانە، کەچی ئەوانە لەگەڵ ئەوەیشدا هاوبەش بۆ خودا هەڵدەبژێرنو دەیانپەرستن، ئەو پەرستراوانەیش توانای بەدەست هێنانی قازانجو زیانیان نیە بۆ خۆیانو بۆ ئەو کەسانەیش دەیانپەرستن. واتە: کە بۆ خۆیان توانای هیچیان نیە، کەوایە بۆ کەسانی تر هەر هیچیان لە دەست نایەت، نە خێریان دەست دەخەنو نە شەڕیان لێ دووردەخەنەوە. ئایا ئەوەی ئەمانە دەپەرستێت لەگەڵ خودا، ئەوەیش خودا دەپەرستێت بە تەنهاو شەریکی بۆ دانانێتو لەسەر ڕووناکی پەروەرندەی دەڕوات وەك یەکن؟ لەبەر ئەمەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ ۗ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ ۚ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴾ واتە: بڵێ: ئایا کوێرو بینا بەرامبەرن؟ ئایا تاریکیو ڕووناکی سەربەسەرن؟ ئایا ئەوانە شتی وایان بە شەریکی خوا داناوە کە وەك ئەو دروستکراویان هەیەووەك دروستکراوەکانی خوان وئەمان تیایدا سەریان لێ شێواوە؟ بڵێ: هەر شتێك هەیە، هەمووی دەستکاری خودایەو هەر ئەمیش تاكو تەنهایە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، واتە: بەو شێوەیە نیە ئەوان دەیزانن! خودای مەزن هاووێنەو هاوشێوەو هاوکاری نیە، هیچ شتێك لە خوا ناچێتو کاری وەك کاری خودا نیە، نە جێگرو نە وەزیرو نە کورو نە هاوسەری

[1] النحل (٤٨).

نییه، خوای گەورە پاكو بێعەیبەو دوورە لە هەموو ئەمانە، بەڵكو بتپەرستان لەگەڵ خودادا ئەو شتانەیان پەرستووە، دانیشی پێدا دەنێن كە ئەو پەرستراوانە هەموو دروستكراوی خوداو عەبدی ئەون وەك بتپەرستان لە كاتی دوعاكردنیاندا دەڵێن: (لبيك لا شريك لك، إلا شريكاً هو لك، تملكه وما ملك) خوای گەورە باسیان دەكاتو دەفەرموویێت: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ﴾[1] واتە: ئێمە بۆیە دەیانپەرستین، لە خوا نزیكمان كەنەوە، خوای گەورە وەڵامی ئەو قسەیان دەداتەوەو ئەو بۆچوونەیان پوچەڵ دەكاتەوە، چونكە هیچ كەسێك بۆی نیە بە ئیزنی خوا نەبێت لاڵە بۆ كەس بكات، ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾[2] واتە: تكایش لای ئەو بەهرە نادا، مەگین بۆ كەسێك ئیزنی بدات، وە فەرموویەتی: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾[3] واتە: لەناو ئەو ئاسمانەدا زۆر فریشتە هەیە، كەسیان تكای لێ وەرناگیرێت مەگین كەسێك دوایی خوا ئیزنی بداتو تكا بۆ كەسێك بكات كە خۆی حەز بكاتو پێی ڕازی بێت. وە فەرموویەتی: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا﴾[4] واتە: هەرچی لەناو ئەم ئاسمانانەوئەم زەمینەدان، هەموو بە بەندایەتی دێنە لای خودا، ئەوسەر حیسابی هەموویانەو هەر بە هەژمار ژماردوونی، سەر لە بەریان ڕۆژی قیامەت بە تاكیوابە تەنهایی، دێنەلای ئەو. لەبەر ئەوەی هەموویان بەندەن، بۆیان نیە كە یەكتری بپەرستن بەبێ بەڵگەو هۆكارێك، هەر لە خۆیانەوە بە ئارەزووی خۆیان شت بۆ خۆیان دابنێنو هەڵی بژێرن، هەر لە سەرەتای دروستبوونیانەوە هەتا دوایین كەسیان خودای گەورە پێغەمبەرانی خۆی بۆ ناردوونو ترساندوونیو پەرستنی غەیری خودای لێ قەدەغەكردوون، بەڵام خوانەناسان بروایان پێ نەكردوونو دژیان وەستاون، جەزرەبەی خۆیان بۆ دابارانـدووەو ڕێی دەربازبوونیان نەماوە، ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾[5] واتە: پەروەرندەت ناهەقی لە هیچ كەسێك ناكات.

---

[1] الزمر (٣).

[2] سبأ (٢٣).

[3] النجم (٢٦).

[4] مريم (٩٣_٩٥).

[5] الكهف (٤٩).

﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدًا رَّابِيًاۖ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٍ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿١٧﴾﴾

## دوو نموونە لەسەر مانەوەی هەق و لەناوچوونی پڕوپووچی

ئەم ئایەتە پێکهاتووە لە دوو نموونە کە خودای مەزن هێناویەتیەوە بۆ هەق کەشتێکە هەر دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبێت، بۆ پڕوپووچیش کە دەتوێتەوەو نامێنێت و لەناو دەچێت، فەرموویەتی: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ واتە: لەو ئاسمانەوە بارانی باراندووە ﴿فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا﴾ واتە: هەر دۆڵێك بە ئەندازەی خۆی لافاوی هەڵدەسێت، واتە: هەر دۆڵێك بە ئەندازەی خۆی ئاو هەڵدەگرێت، دۆڵی وا هەیە زۆر گەورەو فراوانە ئاوی زۆر دەگرێت دۆڵی واش هەیە بچووکەو بە پێی خۆی ئاو دەگرێت، ئەمە ئیشارەتە بۆ دڵەکان و جیاوازیان لە یەکتری، دڵی وا هەیە ئامادەیی تێدایە بۆ وەرگرتنی زانیاری زۆر، دڵی واش هەیە کە فراوان نیەو تەنگەو ئامادەیی تیا نیە بۆ وەرگرتنی زانیاری زۆر، ﴿فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدًا رَّابِيًا﴾ واتە: لافاوەکە کەفێکی بەرزی هەڵگرتووە واتە: کەفێکی بڵند بەسەر ئەو ئاوەوەیە کە پڕاوپڕی دۆڵەکە دێت، ئەمە نموونەیەکیان. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٍ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥ﴾ واتە: هەر وەك ئەو کەفەی بە هۆی دماندنەوە (تاودانی ئاگرەوە) دێتە سەر کەرەستەی خشڵ و شتی تر، ئا ئەمەیش نموونەی دووهەم، ئەو شتانەی لەناو ئاگردا تاو دەدرێن لە زێڕو زیوو شتی تر، بۆ ئەوەی خشڵی مس و ئاسنی لێ دروست بکەن، بیکەنە قاپ و قاچاغ و کەرەسەی تر، بەو تاودانی ئاگرە کەفی لێ بەرز دەبێتەوە، وەك چۆن ئەو لافاوە کەفی لەسەر بەرز دەبێتەوە. ﴿كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَ﴾ واتە: ئا بەم شێوەیە خودا باسی ڕاستی و پڕوپوچی دەخاتە ڕوو، واتە: کاتێك کە هەق و ناهەق تێکەڵاو بوون، ناهەق و پڕوپوچ خۆی ناگرێت و بەردەوام نابێت، وەك چۆن کەف لەگەڵ ئاودا ناوەستێت و دەڕوات، ئەو کەفەیش لەگەڵ ئەو زێڕو زیوو ئەو شتانەی وەك ئەمانن بە تاودانی ئەو ئاگرە جیا دەبێتەوە، بەڵکو هەر دەڕوات و لەناودەچێت و نامێنێت.

لەبەر ئەمەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗ﴾ واتە: جا کەفەکە دەڕوات و لەناو دەچێت، سودی لێ وەرناگیرێت و بڵاوە دەکات و تەفروتونا دەبێت و دەکەوێتە ئەملاولای دۆڵەکە و بە دارو درەختدا شۆڕ دەبێتەوە با دەیبات، هەر بەو شێوەیەش کەف و پیسی زێرو زیووو مس و ئاسنەکەش دەڕوات و هیچی پێوە نامێنێت، ئەو زێڕو ئەو شتانەی وەك ئەون دەمێنێتەوەو سوودی لێ

وەردەگیرێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي ٱلْأَرْضِۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ﴾ واتە: وە هەر ئەو شتەی بۆ خەڵکی بە سوودە دەمێنێتەوە لە زەویدا، خودا ئاوا نموونە دەهێنێتەوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾[1] واتە: ئەم نموونانە بۆ خەڵك دێنینەوەو زانایان نەبێت تێی ناگەن، هەندێ لە زانایانی پێشینە (السلف) گوتوویانە: کاتێك کە ئێمە قورئانمان دەخوێندو لێی تێ نەدەگەیشتین، بۆ خۆمان دەگریاین، چونکە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾ واتە: زانایان نەبێت، تێی ناگەن! عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێ لە ئیبنو عەباسەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا ﴾فەرموویەتی:یانی: ئەمە نموونەیەکە خودای گەورە هێناویەتیەوە، دڵەکان هەریەکە بە ئەندازەی خۆی لەم قورئانە هەڵ گرتووە، بە پێی بڕوا پتەوی‌و لاوازی خۆیان،جا ئەو دڵەی گومانلاویە، هیچ کردارێك سودی نیە لەگەڵیدا، بەڵام دڵی بڕوا پتەو، خودا پڕ سودی دەکات بۆ خاوەنەکانیان﴿فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ﴾ کە بریتیە لە گومان ﴿فَيَذْهَبُ جُفَآءً﴾ بەڵام ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ کە بریتیە لە بڕوای پتەو، وەك چۆن خشڵ دەخرێتە ناو ئاگر ئەوەی پاکەکەیەتی هەڵدەگیرێت‌و پیسیەکەیشی لەناو ئاگرەکەدا بەجێ دەمێنێت، هەر بەو جۆرە خوای گەورە بڕوای پتەو وەردەگرێت‌و گوماناویودوودڵی واز لێ دێنێ‌و وەری ناگرێت[2].

## نموونەی ئەو ئاوو ئاگرە لە قورئان‌و فەرموودەدا هەیە

خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا دوو نموونەی لە بارەی دووڕووەکانەوە هێناوە: یەکێکیان بە ئاوو ئەوی تریان بە ئاگر، ئەمەیش دوو نمونەکەیە ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ﴾[3] واتە: ئەمانەڕاست بەحاڵی کەسانێك دەچن، کە خەریکی هەڵکردنی ئاگرێك بوون، هەرکە ڕۆشنایی ئاگر دەوروبەری ڕۆشن کردنەوە،خوالێیان ئەکوژێنێتەوە، پاشان فەرموویەتی: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ ﴾[4] واتە: یان هەروەکو کەسانێك کە بارانی بە لێزمەو بە تەوژم لەگەڵ هەورو چەخماخەیان لەو ئاسمانەوە بۆ ببارێت، ئەمەیش دوو نموونەی ترە لە سورەتی (نور)دا

---

[1] العنكبوت (٤٣).

[2] الطبري (١٦/٤١٠).

[3] البقرة (١٧).

[4] البقرة (١٩).

لە بارەی خوانەناسانەوە هاتووە. یەکەمیان: دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً﴾[1] ئەوانەی خوانەناس بوون، کردەوەکانیان وەك تراویلکە (سراب) وایە کە لە بیاباندا هەیە تینوو وادەزانێ ئاوە، ئەم تراویلکەیە لە ڕۆژی زۆر گەرما لە بیاباندا پەیدا دەبێت لە ئاو دەچێت، بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: لە ڕۆژی قیامەتدا دەگوترێت بە جوولەکە چیتان دەوێ؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان زۆر تینومان بووە ئاومان پێ بدەو تینوێتیمان بشکێنە، پێیان دەگوترێت :ئایا ناناچنە ئەوێ؟ ئەوانیش پەلاماری سەرابێك ئەدەن وائەزانن ئاوە،کەچی بۆیان دەردەکەوێ کەئەوە ئاگرەولەناوخۆیدا هەرپێچ ئەدات وخۆی ئەخواتەوە!!.[2] پاشان خودای گەورە بۆ نموونەکەی تر فەرموویەتی: ﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ﴾[3] یان وەك تاریکستانێك وایە، لە دەریایەکی بێ پەیدا، شەپۆلی ئاو لەسەر شەپۆلی ئاو دایپۆشنو لە لای سەرەوەیش هەور بێت. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی ئەو هیدایەت و زانیاریەی کە خودا بەمندا ناردوویەتی وەك بارانێکی زۆر وایە، کە دەبارێتە سەر زەمین، هەندێك لەو زەویە ئاوی بارانەکە وەردەگرێت، گیاو پوشی زۆر دەڕوێنێت، هەندێکی تری زەویەکی شۆڕە(گیاو شتی لێ ناڕوێت) بەڵام ئەو بارانە ناو خۆیداگل ئەداتەوە، خودا بە ئاوی ئەو زەویە سوود دەگەیەنێت بە خەڵکی،لێ ی دەخۆنەوەو مەڕوماڵاتی پێ ئاو دەدەنو کشتوکاڵی پێ دەکەن، بەشێکی تر لەو زەویانە کە باران لێی دەدات زەویەکی سافو لوسو تەختە کە ئاو ناگرێتە خۆیو گیا ناڕوێنێت، ئەم پارچە زەویانە وەك نموونەی ئەو کەسەیە کە لە ئاینی خوا شارەزا بووەو ئەوەی خودا منی پێ ناردووە سودی پێ گەیاندووەو کەڵکی لێ وەرگرتووەو فێری بووەو خەڵکیشی فێرکردووە،هەروەها وەك نموونەی ئەو کەسەیە کە بەوە سەری بەرز نەکردووەتەوەو گوێی پێ نەداوەو ئەو ڕێگەی خوداشی قەبوڵ نەکردووە کە من پێی هاتووم).[4] ئەمە نموونەیەکی ئاویە، وە لە فەرموودەی تردا کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (نموونەی منو نموونەی ئێوە، وەك نموونەی پیاوێك وایە، ئاگرێکی کردبێتەوە، کاتێك ئاگرەکە دەوری خۆی ڕۆشن کردەوە ئەو پەپولەو گیانەوەرانەی کە دەکەونە ناو ئاگر، دەکەونە ناوی، پیاوەکە هەوڵ دەدات بیانگرێت، زاڵ

---

[1] نور (٣٩).

[2] فتح الباري (٨/٩٨)، مسلم (١/١٦٨).

[3] نور (٤٠).

[4] فتح الباري (١/٢١١)، مسلم (٤/١٧٨٨).

دەبن بەسەریداو دەچنە ناوی، ئەوە نموونەی منو نموونەی ئێوەیە من دەتانگرم بۆ ئەوەی لەو ئاگرە لاتان دەمو لێی دووركەونەوە،كەچی ئێوە زاڵ دەبن بە سەرمداو دەچنە ناوی).[1] لە هەردوو سەحیحەكەیشدا ئەم فەرموودەیە هاتووە، ئەمەیش نموونەیەكی ئاگریە[2].

﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾﴾

### پاداشتی بەختەوەرانو بەدبەختان

خوای گەورە باسی پاشەڕۆژی بەختەوەرانو بەدبەختان دەكاتو دەفەرمووێت: ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ﴾ واتە: ئەوانەی وەڵامی خوایان داوەتەوە،یانی: گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەیانن و فەرمانەكانی خودایان جێبەجێ كردووەو بڕوایان هەیە بە هەواڵە پێشووەكانو ئەوانەیش كە لەمەوبەدواش دێن ،بۆ ئەوانە ﴿ٱلْحُسْنَىٰ﴾هەیە واتە: چاكەیان دەربارە دەكرێت، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە كە خوای گەورە باسی (ذوالقرنين)ی كردووەو فەرموویەتی: ﴿قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا﴾[3] واتە: گوتی: بەڵام هەر كەسێك ناهەقی بكات (لە دواڕۆژدا) ئێمە ئازاری دەدەینو پاشانیش دەبرێتەوە لای پەروەردگاری، ئەوسا ئەویش بە توندی ئازاری دەدات، هەر كەسیش باوەڕی هێناو ئاكار چاك بوو پاداشتی چاك بەشی دەبێتو كاری لەسەر ئاسان دەكرێت. وە لە ئایەتێكی تریشدا فەرموویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾[4] واتە: بۆ ئەوانەی چاكە دەكەن، چاكە دەكەینو زیاتریش، پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ﴾ واتە: ئەو كەسانەش كە بە دەنگەوە نەهاتوون، ئەگەر هەرچی لەم زەمینەدا هەیە هی ئەوان بێت ئەوەندەی تریشو لە باتی خۆیان بدەن، واتە: ئەوانەی گوێڕایەڵی فەرمانی خودایان نەكردووە لە ڕۆژی دوایدا ئەگەر پڕی ئەم زەمینە زێڕبێتو ئەوەندەی تریشی لەسەر بێت لە جێی ئەوەی لە سزای خودا ڕزگاریان ببێت بیدەن، خوا لێیان قەبوڵ ناكات، چونكە خوای گەورە لە ڕۆژی

---

[1] أحمد (٣١٢/٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.
[2] فتح الباري (٣٢٣/١١)، مسلم (١٧٩٠/٤).
[3] الكهف (٨٧ـ٨٨).
[4] يونس (٢٦).

قیامەتدا هیچ شتێکیان لێ وەرناگرێت ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ﴾ زۆر بە سەختی دەکەونە بەر لێپرسینەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا، واتە: پرسیاریان لێ دەکرێت لە کەمترین و بچووکترین شت، بە سوود بێت یان بێ سوود، هەر کەسێکیش لێپرسینەوەی لێ کرا جەزرەبە دەدرێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾ واتە: هەر جەهەنەم جێگایانە کە خراپترین شوێنە.

﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩﴾

### خاوەن باوەڕو خوانەناس وەك یەك نین

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓ﴾ واتە: ئایا کەسێك بڕوای وابێت ئەوەی لە پەروەرێنتەوە بۆ تۆ هاتووەتە خوارەوە هەمووی ڕاستە وەك ئەوەیە کە لەم بارەیەوە کوت و کوێرە؟ واتە: ئەو کەسەی کە بڕوای وایە ئەوەی هاتووەتە خوارەوە بۆ تۆ ئەی موحەمەد لە لایەن خوداوە هەمووی ڕاستە و گومانی تێدا نیەو هیچ شتێکی تێکەڵاو نەبووە و ناکۆکی لەسەر نیە، بەڵکو هەمووی ڕاستە و هەندێکی جەخت لەسەر ئەوی تری دەکاتەوە، هیچ شتێکی دژی شتێکی تری نیە، گشت هەواڵەکان ڕاستە، فەرمان دان و ڕێگریەکانی بەجێیە و زۆر تەواوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗا﴾[1] واتە: قسەکانی پەروەردگارت بەدادوبەڕاستی تەواوو بێ کەم و کوڕین، واتە: ڕاستە لە هەواڵیداو بێ کەم و کوڕیە لە داوایدا، کەوایە ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەوەی بڕوای بەو پەیامەی کە تۆ پێی هاتووی هێناوە، لەگەڵ ئەوەی کوێرەو ڕێی چاکە ناگرێتەبەرو شارەزا نابێت و لێی تێ ناگات، خۆ ئەگەر تێشی بگات ملی بۆ دانانەوێنێت و بە ڕاستی نازانێت و شوێنی ناکەوێ وەك یەك نین، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾[2] واتە: ئەو کەسانەی جەهەنەمین وەك ئەو کەسانەنین بەهەشتین، هەر ئەوانەی لە بەهەشتن بەختەوەرن و سەرکەوتوون. وە لەم ئایەتەیشدا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓ﴾ واتە: ئایا ئەوەی بڕوای وابێت ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتووەتە خوارەوە هەمووی ڕاستە وەك ئەوەیەکەلەم بارەوەکوێرە؟ نەخێر وەك یەك نین، پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾

---

[1] الانعام (١١٥).

[2] الحشر (٢٠).

واتە:تەنیا خاوەن ئاوەزاکان یادی ئەمانە ئەکەن، واتە: ئەوانەی کە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن و دەفامن،تەنیا خاوەن بیرو هۆشە ڕاستو ڕێکەکانن، خوای گەورە بمانکات بە یەکێك لەوانە.

﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾﴾

## ئەو ڕەوشتانەی بوونەتە هۆی چوونە بەهەشتی پیاوچاکان

خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە خۆیان ڕازاندووەتەوە بەم ڕەوشتە جوانو پیرۆزانە، بێگومان دواڕۆژی خۆش هەر بۆ ئەوانە لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی پەیمانی خودا بەجێ دێننو جارێکی تر لێی پاشگەز نابنەوە، وەك دووڕووەکان نین کە پەیمانێکیان دابێت نەیان بردووەتەسەرو ناپاکییان تیداکردووە، دەمەقاڵێو مشتتو مڕیان بووبێت لەگەڵ کەسێکدا قسەی خراپیان گوتووە، کە قسەیان کردبێت درۆیان کردووەو ئەمانەتێکیان پێ سپێردرابێت ناپاکییان لێ کردووە. ﴿وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە پەیوەستی دەکەن بەوەی حوا فەرمانی داوە پەیوەست بکرێت، وەك بەسەرکردنەوەی کەسو کارو چاکەکردن لەگەڵیانداو بە دەمەوەچوونی هەژارانو بێنەوایانو یارمەتی دانیان.

﴿وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ﴾ واتە: لە پەروەرندەیان دەترسنو لە خراپەو بسەختی لێپرسینەوە نێگەرانن، واتە:لەو کردارانەی دەیکەنو ئەوانەیش کردوویانە دەترسنو دەزانن خودا چاودێرە بەسەریانەوە، وە لە لێپرسینەوەی ڕۆژی قیامەت زۆر دەترسن، بۆیە کارەکانیان بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەبەنو لە هەموو کارێکی ژیانیاندا بەپێی فەرمانی خودا دەجوڵێنەوەو با ئەو کارە بچووك بێت یان گەورە. ﴿ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ﴾ واتە: وە ئەو کەسانەش کە لەبەر ڕەزامەندی خودا خۆیان گرت، واتە: لەبەر ڕەزامەندی خودا خۆیان لە تاوانو خراپە لاداو نەفسی خۆشیان لە ئارەزووە بەدەکان پاراست، بە ئومێدی وەرگرتنی پاداشتی گەورە لە لای خودا، ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە: نوێژیان کردووە، بە پێی ئەو سنوورو کاتو دەستورانەی شەرع دایناوە کوڕنوشو سوژدە بە ترسو لەرزەوە بۆ خوا دەبەن، ﴿وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ﴾ واتە: لەو بەشەی ئێمە پێمان دان خێر دەکەن، واتە: لە ماڵی خۆیان دەدەن بەو کەسانەی کە پێویستە لەسەریان یارمەتیان بدەن لە خێزانو کەسو کارو خەڵکی

هەژارو کەم دەستی بێگانە، ﴿سِرًّا وَعَلَانِيَةً﴾ واتە: بە نهێنیو بە ئاشکرا، بە شەوو بە ڕۆژ هیچ شتێك ڕێی لێ نەگرتوون لە هیچ کاتێکدا لە ماڵ بەخشینە، ﴿وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ﴾ واتە: بە چاکە خراپەکانیان لە خۆیان دوور دەخەنەوە، کاتێك کەسێك کارێکی ناشیرینیان لەگەڵدا بکات ئەوان چاکەی لەگەڵدا دەکەن، خۆڕادەگرنو چاوپۆشی لێ دەکەنو لێی دەبوورن، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ (٣٤) وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾[1] واتە: تۆ هەمیشە وەڵامی چاکتر بدرەوە، ئەوسا کەسێك لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیکت، ئەم کارەش هەر تووشی کەسانێك دەبێت کە بتوانن خۆڕاگرین، هەر کەسیش ئەو کارەی تووش بێت دیارە زۆر بەختەوەرە، ﴿أُولَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ واتە: دوارۆژی خۆشیش بۆ ئەوانە، بۆیە خوای گەورە باسی ئەو کەسانەی کردووە کە خاوەنی ئەم ڕەوشتە چاکانەن وئەفەرموێ: پاشەڕۆژ هی ئەوانە، پاشان مانای ئەوپاشەڕۆژەی کردووەو فەرموویەتی: ﴿جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا﴾ واتە: باغاتێکی واکە دوورە لە نەمان وتیاچوون و دەچنە ناویەوە، ﴿عَدْنٍ﴾ یانی مانەوەونیشتەجێبوون واتە:ئەچنەناوی وبەهەمیشەیی تێیدائەمێننەوە. ﴿وَمَنْ صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ﴾ واتە: خۆیانو بابو باپیرانیانو ژنەکانیانو تۆرمەشیان (ئەوانەی خواپەسەندن)، واتە: خودای مەزن کۆیان دەکاتەوەلەگەڵ خۆشەویستەکانیاندا وەك بابو باپیرو ژنو منداڵەکانیان، ئەوانەی کە خودا لێیان ڕازیەو دەشێت بچنە بەهەشت لە خاوەن باوەڕان، بۆ ئەوەی چاوی پێیان ڕوون ببێتەوە،تەنانەت ئەوانەیش کە پلەیان نزمترە خودا پلەیان بەرز دەکاتەوە وەك ڕێزو چاکەیەك لەگەڵ پلە بەرزەکاندا، بێ ئەوەی لە پلەی پلەبەرزەکان کەم بکرێتەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُمْ بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ﴾[2] واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێنا تۆرمەشیان چوونە سەر باوەڕی ئەوان ئێمە تۆرمەی ئەوانیش دەبەینە بەهەشت وئەیانگەیەنین بەیەکتری، پاشان خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ (٢٣) سَلَامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾ واتە: فریشتە لە هەموو لاوەدەچنە لایان، پێیان دەڵێن سەلامتان لێبێت، چونکە ئێوە خۆڕاگربوون، پیرۆزتان بێت دوارۆژی ڕوون، واتە: فریشتەکان لەم لاو لاوە دەستە دەستە دێن بۆ لایانو پیرۆزباییان لێ دەکەن بۆ ئەو هەموو بەهرەو دوارۆژە چاکەی تێی کەوتوون، بە

---

[1] فصلت (٣٤_٣٥).

[2] طور (٢١).

هێمنیو هەتاهەتایی لەو بەهەشتەدا دەمێننەوە لەگەڵ پێغەمبەرانو پیاو چاکاندا، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئایا دەزانن کێ یەکەم کەس لە دروستکراوەکانی خودا دەچێتە بەهەشت؟) گوتیان: خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) باش دەزانن، فەرمووی: (یەکەم کەس لە دروستکراوەکانی خوا دەچێتە بەهەش هەژارە کۆچەرەکانن، ئەوانەی کەسەنگەرەکانیان پێ دەگیرێتو لە تەنگانەدا پشتیان پێ دەبەسترێتو پێویستیەکانیان لەناو دڵیاندایە، ناتوانن جێبەجێی بکەن، خودای مەزن دەفەرموێت بە هەر فریشتەیەك مەیلی لێبێت، بچنە لایانو سڵاویان لێ بکەن، فریشتەکان دەڵێن: ئێمە دانیشتوانی ئاسمانەکانی تۆینو چاکترینی دروستکراوی تۆین ئەی خودایە فەرمانمان پێدەکەی بچینە لای ئەوانەو سڵاویان لێ بکەین؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ئەوانە ئەو بەندانە بوون کە منیان دەپەرستو هەرگیز شەریکیان بۆ دانەدەنام سەنگەرەکانیان پێ قایم دەکراولە تەنگانەدا پشتیان پێ دەسپێردرا، پێویستیەکانیان لەناو دڵیاندا بوو، توانای جێبەجێکردنی پێویستیەکانیان نەبوو! - جادەفەرموێ -: لەو کاتەدا فریشتەکان لە هەموو لایەکەوە دەچنە لایان پێیان دەڵێن: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ﴾سڵاوتان لێ بێ لەپاداشتی ئەوەدا کەبەئارامبوون ،ئائەوەیەخانەی دواڕۆژ[1] !

﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾﴾

## ڕەوشتە ناشیرینەکانی بەدبەختان کە دەبێتە هۆی چارەڕەشیو نەفرەت لێ کردنیان

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە پەیمانیان دا بە خواو لە پاشان پاشگەزبوونەوەو پەیمان نێوان خۆیانو خودایان شکاند (کە خودا فەرمانی پێدابوون نەیشکێنن) وە لە زەمیندا بەدفەڕی دەکەن، لە بەهرەی خودا بێبەشنو دواڕۆژی دژواریان هەیە، ئەمە حاڵی پیاوخراپو بەدبەختانوپاشەڕۆژی ڕەوشتە خراپەکانیانەکە خوای گەورەبەم شێوەیە باسی چارەنووسو پاشەڕۆژیشی کردوون لە ڕۆژی قیامەتدا، کە بە پێچەوانەی چارەنووسو پاشەڕۆژی خاوەن باوەڕەکانەوەیە، وەك چۆن لە دنیادا ڕەوشتیان بە پێچەوانەی ڕەوشتی خاوەن باوەڕانەوە بووە، خاوەن باوەڕان، ئەو بەڵێنانەی کە دابوییان بە خودا جێبەجێیان کردو ئەو پەیوەندیانەی کە خودا فەرمانی پێدابوون بەجێی بهێنن، بەجێیان هێنا ،وەك فەرموویەتی: ﴿يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ

[1] أحمد (٢/١٦٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ بەلام ئەمانە کە پەیمانیان دا بە خوا لە پاشان پەشیمان بوونەوەو پەیوەندی نێوان خوداو خۆیان پچڕاند، کە خودا فەرمانی پێ کردبوون نەیپچڕن، لەسەر زەویشدا خراپەکاری نەکەن. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کاتێك قسەی دەکات درۆی دەکات، وە کاتێك بەڵێنی بدات بەجێی ناهێنێت، وە کاتێك ئەمانەتێکی پێ سپێردرا خەیانەتی لێ دەکات).[1] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (وە کاتێك بەڵێنی دا ناپاك دەردەچێت نایباتە سەر، وە کاتێك مشتومڕو دەمەقاڵێی کردسنوور ئەبەزێنێت و بەدفەڕی دەکات).[2] هەر لەبەر ئەمەیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُولَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾ لە بەهرەی خودا بێ بەشنو دواڕۆژی دژواریان هەیە، شوێنیشیان ناو ئاگری جەهەنمە کە جێیەکی زۆر خراپو ناخۆشە.

﴿ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴿٢٦﴾﴾

### فراوانی ڕۆزیو کەمی ڕۆزی بە دەستی خودایە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە: هەر خودایە (چ زۆر چ کەم) بە هەر کەسێك خۆی مەیلی لێبێت ڕۆزی دەدات، ئەوان بە ژینی سەر دنیا دڵیان خۆشە، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە مەیلی لە هەر کەسێك بێت بژێوی بۆ فراوان دەکات، مەیلیشی لە هەر کەسێك بێت لێی دەگرێتەوە، ئەوەیش کە خودا دەیکات پڕە لە کارزانیو دادپەروەری، ئەو خودانەناسانەش زۆر دڵیان خۆشە بەو ژیانەی کە پێیان دراوە، خودایش ئەو ژیانەی دنیای پێداونو وازی لێ هێناونو کەم کەم جڵەوی بۆ شل کردوون کە ئاگایان لە خۆیان نەماوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾[3] واتە: ئایا ئەوانە لایان وایە ئێمە کە بە ماڵو کوڕان یارمەتیان دەدەین، هەر بۆ ئەوەیە، پەلەمانە کە چاکەیان لەگەڵدا بکەین؟ نەخێر ئەوانە نەزانن. پاشان خوای گەورە دنیای بە سوكو بێنرخ داوەتە قەڵەم لەچاو ئەو شتانەی کە دایناوە بۆ عەبدە خاوەن باوەڕەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ﴾ واتە: ژیانی دنیا لە چاو ژیانی ئەو دنیا ڕابواردنێکی کەمەو زۆر نیە، وەك لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ

---

[1] فتح الباري (٢/١٦٨).

[2] فتح الباري (١/١١١).

[3] المؤمنون (٥٥ـ٥٦).

لِمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴾[١] واتە: بڵێ: ژیانی دنیا کەم‌و کورتە بۆ ئەوانەی کە ترسیان لە خوا هەیە، ژیانی ئەو دنیا زۆر باشترە، بە ئەندازەی داوی پڕاوی ناو دەنکە خورما، کەس ناهەقی لێ ناکرێت. وە فەرموویەتی: ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴾[٢] واتە: بەلام ئێوە ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن، کەچی ژیانی ئەو دنیا چاکترو پایەدارترە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە مستەوردەوەکە برای بەنی فەهرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەم دنیایە لە چاو ئەو دنیادا مەگین وەك ئەوەیە کەسێك لە ئێوە ئەم پەنجەیە بخاتە ناو دەریایەك، با سەیر بکات چی بە پەنجەیەوە هێناوەتەوە)جا بە پەنجەی شایەتومانی ئیشارەتێکی کرد.[٣] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەیدا.[٤] لە فەرموودەی تریشدا هاتووە: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە لای کارژۆڵەیەکی کەریلەی مردارەوەبوودا ڕابورد، پاشان فەرمووی: (سوێند بە خوا دنیا لای خوا بێ نرخترە لەمە کە خاوەنەکەی فرێی داوە).[٥]

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَنۡ أَنَابَ ٢٧ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ٢٩﴾

## موشریکەکان وداوای بەڵگەکردنیان وەڵامدانەوەی خواش بۆیان

خوای گەورە باسی موشریکەکان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ واتە: ئەوانەی خوانەناسن دەڵێن: بۆچی بەڵگەیەکی لەلایەن خواوە بۆنەهاتووە؟ وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا باسیان دەکات کە دەڵێن: ﴿فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ﴾[٦] واتە: دەسا با نیشانەیەکمان نیشان بدات، وەك پێغەمبەرانی پێشوو، لە پێشەوە چەندجار لەم بارەیەوە قسەمان کردووە. بێگومان خودا دەتوانێت وەڵامی ئەو شتانەیان بداتەوە کە داوایان کردووە، لەم فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە هاتووە، کە خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کردەوە، کاتێك کە

---

[١] النساء (٧٧).
[٢] الاعلی (١٦_١٧).
[٣] احمد (٤/٢٢٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[٤] مسلم (٤/٢١٩٣).
[٥] مسلم (٤/٢٩٥٧).
[٦] الانبياء (٥).

بتپەرستەکان داوایان لێ کردووە کە سەفایان بۆ بکات بە زێڕو کانیەکیان بۆ هەڵقوڵێنێت لە بەری بڕواتو کێوەکانی دەوری مەککە لابەرێتو شوێنەکانیان بکاتە باغاتو سەیرانگاو سەوزایی. فەرموویەتی: ئەی موحەمەد ئەگەر حەز دەکەی ئەو شتانەیان پێ دەدەم، بەڵام ئەگەر بڕوایان نەهێنا جەزرەبەیەکیان دەدەم هیچ کەسێك لە جیهاندا ئەو جەزرەبەی نەدرابێت، وە ئەگەر حەزیش دەکەی دەرگای تەوبەو بەزەییان لێ دەکەمەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو دەرگای تەوبەو بەزەییان لێ بکرەوە،پەروەردگار!).[1] هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە: ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ﴾ واتە: بڵێ: خودا هەر کەسێك خۆی مەیلی لێبێت گومڕای دەکاتو هەر کەسێکیش بەرەو ئەو بگەڕێتەوە، شارەزای ڕاستەڕێی دەکات. واتە: هەر خودا خۆی مەیلی لە هەر کەسێك بێت شارەزای دەکات یان گومڕای دەکات، پێغەمبەر بنێرێت بە نیشانەوە بە پێی داوای ئەوانەیان وەڵامی داواکانیان نەداوەتەوە، شارەزابوونو گومڕابوون پەیوەندی نیە بە وەڵامدانەوەیان، وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾[2] واتە: ئەم هەموو نیشانەو ترساندنە کار ناکاتە سەر کۆمەڵی بڕوانەهێنان، وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[3] واتە: ئەو کەسانەی قسەی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتەدی، باوەڕ ناهێنن، با هەموو نیشانەیەکیشیان بۆ بێت، هەتا ئازاری بەژان بە چاوی خۆیان دەبینن، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ﴾[4] واتە:ئەگەر فریشتەمان بناردایەو مردووەکانیش قسەیان لەگەڵ بکردنایەو هەموو شتمان لە ڕووبەڕووی ئەوانەوە کۆکردایەتەوە، هەر باوەڕیان نەدەهێنا مەگین خودا مەیلی لێبێت، بەڵام زۆربەیان نەزان بوون، بۆیە لێرەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ﴾ واتە: هەر کەسێك تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە بۆ لای خوداو تەنها پەنا بۆ ئەو بەرێتو لێی بپاڕێتەوە شارەزای دەکات.

---

[1] احمد (١/٢٤٢).

[2] یونس (١٠١).

[3] یونس (٩٦ـ٩٧).

[4] الانعام (١١١).

## ئارامگربوونی دڵی خاوەن باوەڕ بە یادی خودا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان بە خودا هەیەو بە یادی خوا دڵیان ئارام دەبێتەوە، واتە: هەر بە یادی خودا دڵخۆش‌و هەست بە ئارامی دڵ دەکەن‌و تەنها بە دۆستایەتی‌و یارمەتی ئەو ڕازی دەبن، لەبەر ئەمەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾ واتە: باش بزانن کە یادی خودا ئۆقرەو ئارامی دڵانە، واتە: هەر بە یادی خودا ئەو ئارامیە دێتەدی.

## ڕوون کردنەوەی ووشەی ( طوبی )

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕن‌و ئاکار چاکن، خۆش لەوان، کە دواڕۆژی باشیان هەیە، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە: لە ئیبنو عەباسەوە ئەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی:﴿طُوبَىٰ ﴾ یانی: دڵخۆشی‌و چاوڕۆشنی،[1] عیکریمە دەڵێ:یانی چەند خۆشە ئەوەی ئەوانە هەیانە.[2] زەحجاك دەڵێ: خۆزگە بەوان.[3] ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێ: ﴿طُوبَىٰ ﴾یانی: هەر ئەوە چاکە بۆ ئەوان،[4] قەتادە دەڵێ: ﴿طُوبَىٰ ﴾ وتەیەکی عەرەبیە کەسێك دەڵێ: (طوبى لك) واتە: خۆش بە حاڵت،[5] وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: ﴿طُوبَىٰ لَهُمۡ ﴾ خۆش لەوان.[6] ﴿وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ﴾ دواڕۆژی باشیان هەیە. ئەم قسانە هەموویان یەك شتن‌و هیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا نیە. بوخاری‌و موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بە ڕاستی لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە سەد ساڵ سوار بە سێبەرەکەیدا دەڕوات‌و نایبڕێت) ئەمەی بۆ نوعمانی کوڕی ئەبو عەیاشی زورەقی باس کرد ئەویش دەڵێ: ئەبو سەعیدی خودری قسەی بۆ کردووم، ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە ئەسپسواری چوست‌و چالاکی خێرا سەد ساڵ دەڕوات‌و نایبڕێت)،[7] وە لە

---

[1] الطبري (١٦/٤٣٥).
[2] الطبري (١٦/٤٣٥).
[3] الطبري (١٦/٤٣٥).
[4] البغوي (٣/١٨).
[5] الطبري (١٦/٤٣٥).
[6] الطبري (١٦/٤٣٥).
[7] البخاري (٦٥٥٢)، مسلم (٢٨٢٧).

سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو زەڕەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لە خودای مەزنەوە: (ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم کەستان و دوایین کەستان و مرۆڤتان و جنۆکەتان هەموو پێکەوە بە یەك جار داوام لێ بکەن، داوای هەموو کەسێك بەجێ دێنم هیچ لە موڵکی من کەم ناکات مەگین وەك ئەندازەی دەرزیەك کەمی بکاتەوە کە دەخرێتە ناو دەریاوە)،[1] واتە: هیچی لێ کەم نابێتەوە، ئەم فەرموودەیە بە درێژی هاتووە، خالیدی کوڕی مەعدان دەڵێ: لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە پێی دەگوترێت (طوبی) ئەم درەختە چەندین گوانی هەیە هەموویان شیر دەدەن بە منداڵانی ئەهلی بەهەشت ئەو منداڵەی کە ژن لەباری دەچێت لە ڕووبارێکدایە لە ڕووبارەکانی بەهەشت تێیدا ئەم دیوەو دیو دەکات (یتقلب) هەتا قیامەت هەڵدەسێت، کە زیندوو دەکرێتەوە کوڕی چل ساڵەیە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە.

﴿كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ۚ قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾﴾

**مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر خوێندنەوەی ئەو پەیامەیە بۆی هاتووەو بانگکردنی خەڵکیە بۆی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ أَرْسَلْنَٰكَ فِىٓ أُمَّةٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهَآ أُمَمٌ لِّتَتْلُوَا۟ عَلَيْهِمُ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ واتە: ئاوا تۆمان ڕاسپاردە ناو ئەو گەلە، کە بەر لەوان زۆر هەگەلی تر هاتوون و چوون، کە هەر شتێك لە ئێمەوە بە تۆ گەیوە، بۆ ئەوانی بخوێنەوە، خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ئەی موحەمەد (ﷺ) وەك چۆن تۆمان ڕەوانەکردووە بۆ ئەم گەلە هەتا ئەو پەیامەی پێمان داوی بۆیان بخوێنیتەوەو ئاگاداریان بکەی و بۆیان ڕوون بکەیتەوە، هەر بەو جۆرەیش پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ ئەو گەلانەی پێشوویش کە بڕوایان بە خودا نەدەهێناو پێغەمبەرەکانی پێش تۆشیان بە درۆزن دەزانی، ئەمانەیش چاو لەوان دەکەن، وەك چۆن تۆڵەمان لەوانە سەندو سزامان دان، تۆیش ئەمانە بترسێنە کە وەك ئەوان بەڵایان بەسەردا بێت، چونکە بڕوانەکردنیان بە تۆ زۆر توندترە لە بڕوانەکردنی ئەوانە بە پێغەمبەرەکانی پێش تۆ. خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا بەر لە تۆیش پێغەمبەرانمان بۆ سەر گەلان نارد، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِ

---

[1] مسلم (٤/١٩٩٤).

[2] النحل (٦٣).

ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِي۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾[1] واتە: زۆر لە پێغەمبەرانیش لە پێش تۆ (هەروەك ئێستای تۆ) بە درۆزن ژمێردراون، دوای باوەڕ پێ نەکران و ئازاردانیش، هەروا خۆڕاگر مانەوە، هەتا یارمەتی ئێمەیان پێ گەیشت، گفتی خوداش بە هیچ کەسێك ناگۆڕێت و دیاریشە تۆ دەنگ و باسی پێغەمبەرانت بۆ هاتووە. کە چۆن سەرمان خستن و وامان کرد کە پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوان و شوێنکەوتووانی ئەوان بێت لە دنیا و لە ڕۆژی دوایشدا. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُمْ يَكْفُرُونَ بِٱلرَّحْمَٰنِ ﴾ واتە: کەچی ئەوان لە خوای ڕۆژی دەری خۆیان حاشا دەکەن، یانی: ئەو گەلەی تۆمان بۆ ناردووە ئەی موحەمەد (ﷺ) باوەڕ بە خودای ڕەحمان ناکەن و دانی پێدا نانێن، چونکە ئەوانە لەناو هێنانی خودا بە بەخشندەو دلۆڤان بێزارن، هەر لەبەر ئەوەبوو بێزاری خۆیان لە ڕۆژی حودەیبیەدا دەربڕی کە بنووسن بە ناوی خوای بەخشندەی دلۆڤان و گوتیان: ئێمە نازانین بەخشندەو دلۆڤان (الرحمن الرحيم) چییە، ئەمە قەتادە وتوویەتی،[2] ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە.[3] لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾[4] واتە: بڵێ: هاوار لەخودا بکەن یان هانابە ڕەحمان بەرن، هەر یەکێکە ئەو ناوی پیرۆزی زۆری هەیە، لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بە ڕاستی خۆشەویستترین ناو لای خوای گەورە ناوی عەبدوڵاو عەبدوڕەحمانە).[5] ﴿قُلْ هُوَ رَبِّى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: بڵێ ئەو پەروەردگارمەو جگە ئەو کەسی تر بۆ پەرستن ناشێت، واتە: ئەوەی ئێوە بڕوای پێ ناکەن من بڕوام پێی هەیەو دانی پێدا دەنێم کە هەر ئەو پەروەردگارەو تەنها هانا بۆ ئەو دەبرێت، هەر ئەو پەروەرندەی منەو هیچ خودایەك نیە غەیری ئەو ﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾ واتە: من خۆم هەر بەو سپاردووە لە هەموو کارو فەرمانێکدا ﴿وَإِلَيْهِ مَتَابِ﴾ واتە: هەر بۆ لای ئەویش دەچمەوە، هیچ کەسێك شایستەی ئەوە نیە بگەڕێیتەوە بۆ لای تەنها خوا نەبێت.

---

[1] الانعام (٣٤).

[2] الطبري (١٦/٤٤٦).

[3] فتح الباري (٥/٣٩٠).

[4] الاسراء (١١٠).

[5] مسلم (٣/١٦٨٢).

﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ ۗ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا ۗ أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ وَعْدُ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٣١﴾﴾

**ڕێزی قورئان و لاساری خوانەناسان**

خوای گەورە وەسفی ئەم قورئانە دەكات كە ناردوویەتی بۆ موحەمەد (ﷺ) كە چەندە ڕێزی داوە بەسەر كتێبەكانی تری پێش خۆیداو دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ واتە: ئەگەر قورئانێكی وا ببووایە لەناو كتێبە پێشووەكاندا كەژی لەجێ لابردایە، یان زەوی پێ لەت بكردایە، یان مردووی بهێنایەتە قسە لەناو گۆڕەكانیاندائەوەئەم قورئانە ئەبوو،یان ئەبوایەئەم قورئانە بوایە نەك كتێبێكی تر،یان شایستە ترین كتێب ئەم قورئانەیەچونكە پڕەلەموعجیزە. وە ئەم قورئانەیش كە خوای گەورە وەسفێكی وای قورئانی كردووە كە وەسفی كتێبەكانی تری بەو شێوەیە نەكردووە، یان باشتر بڵێین موعجیزەی قورئان لە كتێبەكانی تر زیاترە لەو موعجیزانە: مرۆڤو جنۆكە هەر لە یەكەم كەسیانەوە هەتا دواین كەسیان كۆببنەوە كە كتێبێكی وەك ئەم قورئانە بێنن یان تەنها سورەتێك وەك قورئان بێنن، ناتوانن بیهێنن، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو بتپەرستە خوانەناسانە هەر حاشا دەكەنو بڕوای پێ ناهێنن، ﴿بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا﴾ واتە: هەموو كارەكان بە دەستی خودانو هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، مەیلی لە هەر شتێك بێت دەبێتو مەیلیشی لە هەر شتێك نەبێت نابێت، هەر كەسێك خوا گومڕای بكات هیچ كەس ناتوانێت شارەزای بكات، هەر كەسیش خوا شارەزای بكات هیچ كەسێك ناتوانێت گومڕای بكات، جاری وا هەیە وشەی "قورئان" بەكارهێنراوە بۆ كتێبە پێشووەكانی تریش چونكە ئەم قورئانە پوختەی گشت كتێبەكانی ترەو لەوانەوە هەڵقوڵاوە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوێندنەوە (واتە خوێندنی زەبور) ئاسان كرابوو بۆ داوود، فەرمانی دەدا ئەسپەكەی بۆ زین بكرێت، قورئانی دەخوێند لە پێش ئەوەی ئەسپەكەی بۆ زین بكرێت، خواردنی نەدەخوارد لە ڕەنجی شانی خۆی نەبێت).[1] واتە: بە دەستی خۆی خواردنی خۆی وەدەست دەهێنا. بوخاری بە تەنها خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە.[2] مەبەست بە قورئان لێرەدا زەبورە، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ واتە: بۆچی خاوەن باوەڕان ئەوە نازانن و

---

[1] أحمد (٢/٣١٤)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢٤٨/٨).

تێناگەن ئەگەر خوا مەیلی لێ بوایە هەموو خەڵکی دەکردە خاوەن باوەڕ، وەك فەرموویەتی: ﴿أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ واتە: ئەگەر خودا بیویستایە گشت مەردمی شارەزای ڕاستەڕێ دەکرد، چونکە هیچ بەڵگەیەك‌و هیچ موعجیزەیەکی تر نیە لەم قورئانە بەهێزترو بەسوودتر بێت‌و کار بکاتە سەر دڵ‌و دەروون، ئەگەر خودای گەورە بینارداپەتە سەر کێوی تۆنەتبینی کە ملی کەچ دەکردو لە ترسی خودا لەت لەت ئەبوو، وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ پێغەمبەرێك نەبووە مەگین بەڵگەو موعجیزەیەکی پێدراوە وەك ئەو موعجیزەیەش دراوە بە پێغەمبەرەکانی پێش خۆی‌و خەڵکی بڕوایان پێ هێناوە. بەڵام ئەوەی بە من دراوە نیگا (وحی) بووەو خوا نیگای بۆ کردووم، هیوام وایە کە من شوێنکەوتووانم لەوان زۆرتر بێت لە ڕۆژی قیامەتدا).[1] واتە: موعجیزەی هەموو پێغەمبەرێك بە مردنی کۆتایی هاتووە، بەڵام ئەم قورئانە موعجیزەکانی هەر دەمێنێتەوە هەتا ڕۆژی دوایی، هەرگیز شتە گرنگ‌و سەرسوڕهێنەرەکانی دوایی نایەت بەزۆر ووتنەوەکۆن نابێت، زانایان لێی تێر نابن، ئەو قورئانە جیاکەرەوەیە، نەك گاڵتەو گەپ، هەر کەسێك لەبەر زۆرداران وازی لێ بێنێت خوا پشتی دەشکێنێت، وە هەر کەسێك بە تەمای هیدایەت بێت کەلە جگە لەقورئانەوەدەستی بکەوێت، خودا گومڕای دەکات. ﴿بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا﴾ واتە: هەموو کارەکان بە دەست خودان، ئیبنو عەباس دەڵێ: واتە: هیچ کارێك ناکرێت بە مەیلی ئەو نەبێت، هەر نەشبووە هەتا بکرێت.[2] ئیبنو ئیسحاق بە سەنەدی خۆی ڕیوایەتی کردووە لێیەوە، ئیبنو جەریریش دیسان ڕیوایەتی کردووە لێیەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُوا۟ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ﴾ واتە: خوانەناسەکانیش هەر (لەبەر کاروکردەوەکانیان) گرفتاری بەڵایەکی دژوار دەبن، یان هەر لە پەنای ماڵی خۆیان ئەو بەڵایە دێتە سەریان، واتە: بەهۆی خوانەناسی‌و بڕوانەهێنانیان‌و خراپەکاریان تووشی بەڵای زۆر گران دەبن لە دنیادا، یان ئەوانەی دەوروبەریان تووشی بەڵا دەبن بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْءَايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾[3] واتە: زۆرێك لەو شارانەمان قڕ تێخست کە هەر لە دەوری ئێوە بوون، هەموو جۆرە نیشانەیەکمان نیشاندان کە بەڵکو بگەڕێنەوە، وە فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا

---

[1] فتح الباري (٨/٦١٩).

[2] الطبري (١٦/٤٤٧).

[3] الاحقاف (٢٧).

مِنْ أَطْرَافِهَآ أَفَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴾[1] واتە: ئایا ئەوەندە نازانن ئێمە دێین‌و ئەم زەمینە (لە هـەموو لا) هـەر وا لێی کەم دەکەینەوە؟ ئایا هەر خۆیـان سـەرکەوتوون؟ قـەتادەو حەسـەن دەڵێن: ﴿أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ﴾ واتە(قارعە)یەك لەنزیك ماڵەکانیانەوە،یانی بەلای زۆر دژوار.[2] هـەر واش دیـارە لـە دەقەکـەوە، عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ﴿تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ﴾ دەڵێت:یـانی: سزایەك لـە ئاسمانـەوە بۆیـان دابارێـت، ﴿أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ﴾ واتـە: پێغەمبـەری خوایـان بـۆ دابـەزێت‌و شـەڕیان لەگەڵدا بکات، موجاهیدو قەتادەیش هەر وایان گوتووە، عیکریمە لە ڕیوایەتێکدا دەڵێت: لـە ئیبنـو عەباسـەوە: ﴿قَارِعَةٌ﴾ یانی بەلایەك. وە هەموویان دەڵێن: ﴿حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ ٱللَّهِ﴾ واتە: تا ئـەو کاتـەی بـەڵێنی خـودا دێتەجێ، واتە: فەتحی مەککە، حەسەنی بەسری دەڵێت:مەبەست ڕۆژی قیامەتە. پاشان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ﴾ واتـە: دیـارە خـودایش بـەڵێنی خـۆی ناداتـە دواو هـەڵی ناوەشێنێتەوە کە داویەتی بە پێغەمبەرەکەی بە سەرکەوتنی خۆی‌و شوێنکەوتووەکانی لـە دنیـاداو لـە قیامەتدا. وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴾[3] واتە: وا نەزانی خوا لەو بەڵێنانەی کە بە پێغەمبەرانی خۆی داوە، هـیچ کاتێك پاشگەز دەبێتەوە، خودا خاوەن دەسەلاتی تۆڵەسێنە.

﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾﴾

**دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ)**

خوای گەورە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەداتەوە، لە کاتێکدا کە هۆزەکەی بڕوای پـێ ناکـەن‌و بـە درۆی دەخەنەوە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَمْلَيْتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ واتە: بە پێغەمبـەرانی پێش تۆش گاڵتەکرا، ئەو کەسانەم مۆڵەت دا کە خوانەناس بـوون، تـۆش دەتـوانی چـاو لـەوان بکـەی، ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ﴾ واتە: تا لە ئاکامدا گـرتمن، چـۆن تۆڵەیـەکم لـێ سـەندن‌و گـرتمن، گرتنێکی لە ڕادەبەدەر، چیم بەسەر هێنان‌و پاشەڕۆژیان بەچی بوو دوای ئەو مۆڵەت دانـە. وەك خـوای گەورە لە ئایەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ

---

[1] الانبیاء (٤٤).

[2] الطبري (١٦/٤٥٩).

[3] ابراهیم (٤٧).

ﭐلۡمَصِيرُ﴾[1] واتە: زۆرلە شاران (كە ستەمكار بوون) مۆڵەتم دان و لە پاشاندا وەبەر تورەیی خۆم خستن، پاشەڕۆیش هەر بۆ لای خۆمە، لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (بێگومان خودا مۆڵەتی ستەمكار ئەدات هەتا كاتێك كە دەیگرێت ئیتر لە دەستی دەرباز نابێت) پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ﴾[2]، واتە: ئا بەو شێوەیە غەزەبی پەروەردگاری تۆ، كاتێك شارانێك دادەگرێت كە خەڵكەكەیان ستەمكارن، ئەو ئازارەی خودا دەیدات، زۆر بە ژانو زۆر دژوارە.

﴿أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ أَمۡ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَم بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِۗ بَلۡ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكۡرُهُمۡ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾﴾

## هیچ هاوبەشیەك لە نێوان خوداو پەرستراوی موشریكەكاندا نیە لە هیچ ڕوویەكەوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ﴾ واتە: ئایا ئەوەی چاودێری كاروكردەوەی هەموو كەسە، وەك ئەوەیە كە خەبەری لە هیچ كەسێك نیە؟ ئاگای لە هەموو گیانەوەرێكە كەهەناسەدەداتو دەزانێت چ كارێك دەكات لەخراپەو چاكەو هیچ نهێنیەكی لێ ناشاردرێتەوە، ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٖ وَمَا تَتۡلُواْ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٖ وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا إِذۡ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾[3] واتە: تۆ لە هەر حاڵێكدا بیتو هەرچی لە قورئان بخوێننو وە هەر كارێك ئێوە بیكەن، ئێمە لێتان ئاگادار ین، كاتێك خەریكی ئەو كارەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا﴾[4] واتە: هیچ گەڵایەك لە هەر شوێنێك بێت بێئاگاداری ئەو (خودا) ناوەریێ، وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾[5] واتە: لەم زەمینە هەر شتێك دەجوڵێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خودایە، دەزانێت بنكەی لە كوێیەو لە كوێدا خۆی حەشار دەدات هەمووی لە نووسراوێكی دیاریدایە. وە فەرموویەتی: ﴿سَوَآءٞ مِّنكُم مَّنۡ أَسَرَّ ٱلۡقَوۡلَ وَمَن

---

[1] الحج (٤٨).

[2] هود (١٠٢). فتح الباري (٨/٢٠٥)، مسلم (٤/١٩٩٧).

[3] يونس (٦١).

[4] الانعام (٥٩).

[5] هود (٦).

جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ﴾[1] واتە: هەر کەسێك لە ئێوە پەنامەکی قسە بکاتو دەنگ هەڵبڕێت یان لە شەودا خۆ پەناداو لەناو ڕۆژی ئاشکرادا بێتو بچێت، لای ئەم هەمووی وەك یەکە، وە فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى﴾[2] واتە: ئەو بە ڕازو نزم تریش لە ڕاز دەزانێت، وە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾[3] واتە: لە هەر کوێ بن ئەو (خودا) لەگەڵتانەو خودا کردەوەتان دەبینێت. ئایا ئەوەی ئاوایەو (ئاگاداری هەموو شتێکە) وەك ئەو بتانە وایە کە ئەوان دەیان پەرستن، کە نابینن‌و نابیسن‌و ئاوەزیان نیەو توانای قازانج‌و زیانیان بۆ خۆیان‌و ئەو کەسانەش دەیان پەرستن نیە (وەڵامەکە باس نەکراوە لەبەر ئەوە ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت) واتە وەك یەکن؟ بێگومان نەخێر، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ﴾ شەریکێکی زۆریان بۆ خوا بڕیار داوە، لەگەڵ خوادا دەیان پەرستن لەو بتانە، ﴿قُلْ سَمُّوهُمْ﴾ واتە: بلێ دەی ناویان بێنن، ئاگادارمان بکەن لێیان‌و دەرکەون تا بناسرێن، چونکە ئەوانە هەر نین، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: یان ئێوە ئەتانەوێ ئەو لە شتێك (لەم زەمینە) ئاگادار بکەن کە نایزانن لەم سەر زەمینەدا بوونی نیە، چونکە ئەگەر لەم سەر زەمینەدا ببووایە ئەو شتانەی دەزانی، بەڵام خوای گەورە هیچ شتێکی پەنهانی لا شاراوە نیە، ﴿أَم بِظَـٰهِرٍ مِّنَ ٱلْقَوْلِ﴾ واتە: یان ئەمە قسەیەکی پڕو پووچە، موجاهید دەڵێ: بە گومان واتان دەزانی.[4] زەححاك‌و قەتادە دەڵێن: بە قسەی پڕوپووچ.[5] واتە: ئەم بتانەتان دەپەرست هەر لە خۆتانەوە واتان دەزانی قازانجتان پێ دەگەیەنن یان زیانتان لێ دەدەن ناوی خوداتان لێ دەهێنان، ﴿إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾[6] واتە: تەنها ئەوانە چەند ناوێکن کە ئێوەو بابو باپیرتان ئەوانەتان پێ ناو ناون، خودایش هیچ بەڵگەیەکی پتەوی لەسەر ئەوانە نەناردوە، هەر دوای گومان دەکەون‌و ئەوەی دڵیان

[1] الرعد (١٠).

[2] طه (٧).

[3] الحديد (٤).

[4] الطبري (٢٦٦/١٦).

[5] الطبري (٤٦٦/١٦).

[6] النجم (٢٣).

حەزی لێ دەكات، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بَلْ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مَكْرُهُمْ﴾ واتە: نەخێر ئەو خوانەناسانە گزی خۆیان لە لا ڕازاوە كراوە، موجاهید دەڵێ: قسەی خۆیان لە لا جوان كراوە.[1] واتە: ئەو گومڕایەی لەسەرینو بە شەوو بە ڕۆژ بانگەوازی بۆ دەكەنو لە لایان شیرین كراوە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾[2] واتە: دۆستی واشمان (لە دنیا) بۆ پەیداركردن كاری ئێستاو ئایندەیان بۆجوان وشیرین ئەكردن. ﴿وَصُدُّوا عَنِ السَّبِيلِ﴾ واتە: وە لە ڕێی ڕاستیش لادراون، هەندێك بە فەتحی (صادەكە) خوێندوویانەتەوە، واتە:ئەوان خەڵكیان لەدین دوورئەخستەوە،یانی ئەوەی خەریكی بوون لایان شیرین بوو، بە ڕاستیان دەزانیو بانگەوازیان بۆ دەكردو خەڵكیان پەشیمان دەكردەوە لە شوێنكەوتنی ڕێگەی پێغەمبەران، ئەوانەش(صادەكە) بە زەممە دەیخوێندنەوە، واتە: لەبەر ئەوەی ئەو كارەیان لا شیرین كرابوو بە ڕاستیان دەزانی، بەوە لە ڕێی ڕاست دوور كەوتبوونەوە ا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ واتە: هەر كەسیش خودا گومڕای بكات، هیچ كەسێك شارەزای ناكات. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾[3] واتە: هەر كەسێك خودا ویستی سزای بدات تۆ ناتوانی لە خودا بێنیاز بكەیو هیچ كارێكی بۆ ڕێك بخەی، وە فەرموویەتی: ﴿إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَاهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾[4] واتە: هەرچەندە هەوڵ بۆ شارەزابوونیان بدەی، گومڕاكان خودا ڕێگەیان نیشان نادات و كەسیش بە هانایانەوە نایەت.

﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَقُّ وَمَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ (٣٤) مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوا وَّعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ (٣٥)﴾

## باسی تۆڵە سەندن لە خوانەناسان و پاداشتی پیاوچاكان

خوای گەورە باسی تۆڵە سەندنی لە خوانەناسانو پاداشتی پیاوچاكانیشی كرد، پاشان دێتە سەر باسی بتپەرستان كە چۆن ژیان بەسەر دەبەن لە خوانەناسیو بتپەرستیو گاڵتەو گەپداو كارەكانی

[1] الطبري (٤٦٧/١٦).
[2] فصلت (٢٥).
[3] المائدة (٤١).
[4] النحل (٣٧).

خۆیان چەندە لا شیرین بووە لە دنیادا، دەفەرموویت: ﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ واتە: هەر لە ژیانی دنیادا تووشی سزا دەبن، واتە: بە دەستی خاوەن باوەڕان لە دنیادا تووشی کوشتنو دەست بەسەری (دیلی) دەبن، ﴿وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَقُّ وَمَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ واتە: دیارە جەزرەبەی دواڕۆژیش توندترەو کەس ناتوانێت بیانپارێزێت لە خودا. واتە: ئەو سزایەی بۆیان هەڵگیراوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەو سەرشۆڕیەی دنیادا زۆر دژوارترو گرانترە. وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بەو دووکەسەی کەنەفرینیان لەیەکتری کرد: بێگومان سزای دنیا زۆر سوکترە لە سزای دواڕۆژ.[1] وەك لە شوێنی تریشدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی کە بێگومان سزای هەر کۆتایی دێت بەڵام سزای ڕۆژی دوایی هەر دەمێنێتو هەرگیز دوایی نایەت لەناو ئاگرێکدا لە چاو ئەم ئاگرەی دنیادا حەفتا ئەوەندە بەهێزترە. وە بە زنجیرێك شەتەك دەدرێت کە توندی وئەستووریەکەی مەزەندە ناکرێتو وەبیر نایەت وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژە کەس وەك ئەو جەزرەبە نادەن، کەسیش وەك ئەو بە زنجیر شەتەك نادرێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَا أُلْقُوا مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا الْيَوْمَ ثُبُورًا وَاحِدًا وَادْعُوا ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾ قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَاءً وَمَصِيرًا﴾[3] واتە: دیارە ئەوان قیامەتیان بە درۆ زانی، ئێمەش جەهەنەممان ئامادەکردووە بۆ هەر کەسێك کە قیامەت بە درۆ دەزانێت، کە لە شوێنێکی دوورەوە چاوی پێیان دەکەوێت، لرفەو نێڵەی (دەنگی توندو بەهێزی) کڵپەی ئاگریان دێتەگوێ، هەر کاتێك شەتەك دران‌و فڕێ درانە ناو جێگەی تەنگەلانی جەهەنەمەوە، ئاوات بۆ مردن دەخوازن، ئەمڕۆ ئیتر هەرتەنیا مردنێك داوا مەکەن، داوای مردنی زۆر بکەن. بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) ئایا ئەمە باشە، یان بەهەشتی هەمیشەیی کە بەڵێن بە خودا ترسان دراوە کەئەوە پاداشتو چارەنووسیانە. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە لێرەدا کە خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ واتە: ئەو بەهەشتەی بەڵێن وایە بدرێت بە لە خواترسان جۆبار بە بەریدا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە هەموو لایەکیدا دەڕواتو خەڵکەکەی بە ئارەزووی خۆیان لە کوێدا بیانەوێت ئاو هەڵدەقوڵێتو دێتەدەر بۆیان بۆ هەر کوێیان بوێت دەیبەن

---

[1] مسلم (١١٣١/٢).

[2] الفجر (٢٥_٢٦).

[3] الفرقان (١١_١٥).

لە هەموو کاتێکدا، وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾[1] واتە: ئەو بەهەشتەی خودا بەڵێنی داوە بە پارێزگاران چۆن چۆنین؟ چەندین ڕووباری وای تێدایە ئاوەکەیان لێڵ وبۆگەن نابێت، چەند ڕووباری شیری تێدایە هەرگیز تامی ناگۆڕێت، چەندین ڕووباری شەرابی (عارەقی) تێدا دەڕوات تا دەیخۆن حەزی لێ دەکەن، چەند ڕووباری لە هەنگوینی باڵفتەشی تێدایە. هەر میوەیەکیش ئارەزوویان لێبێت تێیدا هەیە، لەگەڵ لێخۆشبوونی پەروەردگاریشیان، لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا﴾ واتە: خواردەمەنی بەهەشت کۆتایی نایەتو هەمیشە سێبەریشی هەیە، واتە: پڕە لە هەموو جۆرە میوەیەکو خواردنو خواردنەوەی بەردەوام کە هەر نابڕێتەوەو دوایی نایەت، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە لە باس نوێژی خۆرگیراندا لە بەشێکی فەرموودەکەداکەئەڵێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاومان لێت بوو، دەستت بۆ شتێك برد لەم شوێنەی خۆتدا، پاشان چاومان لێ بوو وازت هێناو دەستت گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (من بەهەشتم بینیو پێم نیشان درا دەستم برد بۆ بۆشکێ(ترێ) تێیدا، ئەگەر بمگرتایە هەتا دنیا بمایە لێتان دەخوارد).[2] لە جابیری کوڕی عەبدولاوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خەڵکی بەهەشت دەخۆنو دەخۆنەوە نە چڵمیان هەیەو نە پیسایی دەکەنو نە میز دەکەن، بەڵکو پاشەڕۆژی خواردنیان جۆرە قرقێنەیەکە بۆنی هەر لە بۆنی میسك دەچێت سوپاسو ستایشی خودا فێردەبن وەك چۆن ئێوە هەناسە دەدەن) موسلم ڕیوایەتی کردووە.[3] ئیمامی ئەحمەدو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە ثومامەی کوڕی عوقبەوە کە بیستوویەتی لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە دەڵێ: پیاوێکی ئەهلی کتێب هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ودەڵێ: ئەی ئەبولقاسم! تۆ دەڵێی خەڵکی بەهەشت دەخۆنو دەخۆنەوە؟ فەرمووی: (بەڵی سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هەر پیاوێك لەو بەهەشتیانە توانای سەد پیاویان پێ دەدرێت، لە خواردنو لە خواردنەوەو لە جوتبوونو ئارەزوودا) پیاوەکە وتی: ئەوەی دەخواتو دەخواتەوە پێویستی بەوە هەیە (فرێی بدا) دەی خۆ لە بەهەشتدا پیسایکردن نیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (پیسایکردنی هەر کەسێك لەئەهلی بەهەشت ئارەقێکە لە پێستیانەوە دێتەدەر بۆنی وەك بۆنی میسك

---

[1] محمد (١٥).

[2] فتح الباري (٢/٢٧١)، مسلم (٢/٦٢٦).

[3] مسلم (٢٨٣٥).

وایە سکی دەباتەوە یەك) ئیمامی ئەحمەدو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە.[1] خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ۝٣٢ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ﴾[2] واتە: میوەش زۆرو زەبەندەیە، نە دوایی دێتو نە قەدەغەیە. وە فەرموویەتی: ﴿وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا﴾[3] واتە: سێبەری درەختەکانی بەسەریاندا شۆڕبوونەتەوەو میوەکەیان لەبەردەستە. واتە: سێبەریان تەواو نابێتو کەم ناکات. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا﴾[4] واتە(ئەو کەسانەی کە بوونە خاوەنی بڕواو ئاکاری چاك ڕەچاو دەکەن دەیانبەینە باغاتی وا جۆباریان بە بەردا دەڕوات‌و هەتا هەتایە هەر تیایدا دەبن، ژنانی پاك لە گشت عەیب‌و سێبەری پڕیان دەدەینێ)، زۆر جار خوای گەورە باسی بەهەشت‌و جەهەنەم بە یەکەوە دەکات، تا مەردم هان بدات بۆ بەهەشت‌و لە ئاگر بیانترسێنێت، هەر لەبەر ئەمەیە کاتێك کە وەسفی بەهەشتی کردووە بە دوایدا وەسفی جەهەنەمیشی کردووە فەرموویەتی: ﴿تِلۡكَ عُقۡبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْۖ وَّعُقۡبَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ﴾ واتە: ئا ئەمەیە ئاکامی لە خواترسان وپاشەڕۆژی خوانەناسانیش ئاگرە. وەك لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾[5] واتە: ئەو کەسانەی جەهەنەمین لەگەڵ ئەوانەی بەهەشتین، وەك یەك نین، هەر ئەوانەی لە بەهەشتن بەختەوەرن.

﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَۖ وَمِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ مَن يُنكِرُ بَعۡضَهُۥۚ قُلۡ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ إِلَيۡهِ أَدۡعُواْ وَإِلَيۡهِ مَـَٔابِ ۝٣٦ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيّٗاۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا وَاقٖ ۝٣٧﴾

**خەڵکە ڕاستگۆکان لە ئەهلی کتێب دڵخۆشن بەوەی هاتووەتە خوارەوە بۆ موحەمەد (ﷺ)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی ئێمە کتێبمان پێداون‌و بە پێی ڕێنمایی ئەو کتێبانە هەڵسوکەوتیان کردووە، ﴿يَفۡرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ﴾ دڵیان خۆشە بەوەی

---

[1] أحمد (٤/٣٦٧).

[2] الواقعة (٣٢_٣٣).

[3] الانسان (١٤).

[4] النساء (٥٧).

[5] الحشر (٢٠).

که بۆ تۆ هاتووه ، واته: بەو قورئانەی بۆ تۆ هاتووه خۆشحاڵن، چونکه له کتێبەکانی ئەواندا بەڵگه زۆرن لەسەر ڕاستی ئەم قورئانەو مزگێنیشی پێدراوه، وەك خوای گەورە له ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾[1] واته: ئەو کەسانەی که کتێبمان پێداونو وەك پێویست دەیخوێننەوه دیارەکه بڕوایان پێی هەیه، وه فەرموویەتی: ﴿قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا﴾[2] واته: بڵێ: ئێوه بڕواتان پێی ببێت یان نەبێت، ئەو کەسانەی له پێشوودا (لەمه) ئاگادار بوون، هەر کاتێك بۆیان دەخوێننەوه چەناگه دەخەنه سەر زەویو سوژده دەبەن، ﴿وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾[3] واته: دەشڵێن پاکی بۆ پەروەردگاری ئێمەیه، بەڵێنی پەروەردگارمان وا وەدی هات، واته: ئەوەی که خودا بەڵێنی پێداین له کتێبەکانی خۆماندا لەسەر ناردنی موحەمەد(ﷺ) هاتەدیو هەقو ڕاست دەرچوو، پاکیو بێعەیبی بۆ ئەو خودایه که چەند بەڵێنی ڕاستو دروستەو سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەوه به تەنها، ﴿وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩﴾[4] واته: دەمو دەست بەسەر زەویدا دەکەونو دەگرین، ئەمەیش خۆ به کەم زانینیان زیاتر دەکات، پاشان خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ﴾ واته: هەندێکیشیان بڕوا به هەندێکی ناکەن، واته: هەندێك لەوانه بڕوا به هەندێك لەوه ناکەن که بۆ تۆ هاتووەته خوار، موجاهید دەڵێ: ﴿وَمِنَ ٱلْأَحْزَابِ﴾ واته: جوولەکەو گاورەکان ﴿مَن يُنكِرُ بَعْضَهُۥ﴾ واته: هەیانه بڕوا به هەندێك لەو هەقه ناکەن که ڕەوانەکراوه بۆ تۆ، قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان کوتووه.[5] وەك خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ﴾[6] واته: لەناو ئەهلی کتێبیش کەسانی وا هەن که بڕوای به خودا هەیەو بەو قورئانەی که بۆ ئێوه هاتەخوار. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ

[1] البقرة (١٢١).
[2] الاسراء (١٠٧).
[3] الاسراء (١٠٨).
[4] الاسراء (١٠٩).
[5] الطبري (١٦/٤٧٤).
[6] ال عمران (١٩٩).

إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓ﴾ واتە: بڵێ فەرمانم پێدراوە کە خودا بپەرستم‌و کەسی تر نەکەمە شەریکی وەك چۆن پێغەمبەرەکانی پێش منیش ڕەوانە کران‌و بانگەوازیان کرد بۆ ڕێی خودا ﴿إِلَيۡهِ أَدۡعُواْ﴾ واتە: منیش بانگی خەڵکی دەکەم بۆ سەر ڕێگەی خودا، ﴿وَإِلَيۡهِ مَـَٔابِ﴾ واتە: چارەنووس و پاشەڕۆژم هەر بۆ لای ئەوە هەر هاوار بۆ خودا دەبەم‌و بەرەو ئەو دەگەڕێمەوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيّٗا﴾ واتە: ئێمە ئەم فەرمانەی خۆمان بە عەرەبی بۆ تۆ نارد، واتە: وەك چۆن لە پێش تۆوە پێغەمبەرانمان ناردو کتێبیشمان بۆ ڕەوانە کردن لە ئاسمانەوە، هەر بەو شێوەیە ئەم قورئانە پتەوە عەرەبیەمان بۆ ناردی‌و پلەمان بەرزکردیتەوە پێی‌و ڕێزمان دای بەسەر غەیری خۆتدا بەم کتێبە کە هەموو شت نیشان دەدات‌وئاشکرا ڕوونی دەکاتەوە، ﴿لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ﴾[1] واتە: پڕوپوچ ڕووی تێناکات (چ ڕووبەڕوو چ پاشملە) ئەمە کارزانێك ناردویە کە هەر دەبێت سوپاسی بکرێت، ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا وَاقٖ﴾ واتە: ئەگەر لە دوای ئەو زانستەی بۆت هاتووە، شوێن ئارەزووی ئەمان بکەوی، ئیتر نە خوا یارتەو نە ئەویش پارێزگارتە. ئەمە خۆی لە خۆیدا هەڕەشەیە بۆ زانایان کە نابێت شوێنی ڕێگای کۆمەڵی گومرایان بکەون، دوای ئەوەی ڕێی ڕاست‌و دروستیان گرتە بەرو شوێنی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتن.

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ﴿٣٨﴾ يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾﴾

### پێغەمبەران مرۆڤ بوون

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗ﴾ واتە: بێگومان پێش تۆش پێغەمبەرانمان ناردووە، ڕێگەشمان دان ژن‌و نەوەشیان هەبێت، واتە: وەك چۆن تۆمان ناردووە ئەی موحەمەد (ﷺ) بە پێغەمبەریەتی وەك مرۆڤێك، هەر بەو شێوەیە پێغەمبەرانیشمان نارد مرۆڤ بوون‌و خواردنیان دەخوارد بە بازاڕیشدا دەگەڕان‌و ژنیشیان دەخواست‌و منداڵیشیان هەبوو، هاوسەرو نەوەشمان پێدان، بۆیە خوای گەورە بە بەڕێزترین‌و دواین پێغەمبەریان دەفەرموێت کە

---

[1] فصلت (٤٢).

موحەمەدە (ﷺ)، ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾[1] واتە: بڵێ منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە خودا نیگا (وحی)ی بۆ ناردووم. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان من ڕۆژو دەگرمو دەشی شکێنم شەونوێژ دەکەمو دەشخەومو گۆشت دەخۆمو ژنیش دەهێنم هەر کەسێك لە سوننەتی من لابدات لە من نیە)[2].

## بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە، تەنها بەڵگەیەك بێنێت مەگین خودا ئیزنی دابێت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ واتە: هیچ کەسێك لەو پێغەمبەرانەش نەیتوانیووە هیچ بەڵگەیەك نیشان بدا مەگین خوا ئیزنی دابێت، واتە: هیچ پێغەمبەرێك نەیتوانیوە موعجیزەیەك نیشانی گەلەکەی خۆی بدات هەتا خودا فەرمانی نەدابێت پێی نیشان بدات، ئەو موعجیزەش هی خۆی نەبووە، بەڵکو خوا پێی داوەو لە لایەن خوای گەورەوە بووە، مەیلی هەر شتێکی بوێ دەیکاتو فەرمانی پێ دەدات، ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ﴾ واتە: بۆ هەموو کارێك کاتێکی تایبەتی هەیە کە نووسراوە. واتە: بۆ هەموو ماوەیەکی دیاریکراو کتێبێك هەیە تێیدا نووسراوە، هەموو شت لای خوا بە ئەندازەیە، ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾[3] واتە: مەگەر تۆ ئەی موحەمەد(ﷺ) نەتزانیوە، هەرچی لە ئاسمانو زەویدایە، خودا دەیزانێت؟ ئەمە هەموو لە نووسراوێکدایە، ئەم کارە بۆ خوا ئاسانە.

## مانای ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە: ئەوەی خودا بیەوێت دەیسڕێتەوە، ئەویش بیەوێت دەیهێڵێتەوە، سەرچاوەی کتێبەکان لای ئەو خوایە کە لە (لوح المحفوظ) واتە: هەتا هەموو کتێبەکان بەم قورئانەی کە خودا ناردیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سڕایەوە. موجاهید دەڵێ: ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ﴾ واتە: هەرچی خودا مەیلی لێبێت دەیسڕێتەوە یان دەیهێڵێتەوە ژیانو مردنو بەختەوەریو بەدبەختی نەبێت. چونکە ئەمانە گۆڕانکاریان بەسەردا نایەت،[4] مەنسور دەڵێ: پرسیم لە موجاهیدو گوتم: ئایانەودوعایەی کەیەکێك لە ئێمەنەیکەین چۆنە بە لاتەوە کە دەڵێ: (ئەی خوایە ئەگەر ناوم لەناو بەختەوەراندایە بیهێڵەرەوە، وە

---

[1] فصلت (٦).

[2] فتح الباري (٩/٥)، مسلم (٢/١٠٢٠).

[3] الحج (٧٠).

[4] الطبري (١٦/٤٧٩).

ئەگەر لەناو بەدبەختاندایە بیسڕەوە لە ناویاندا، بیخەرە ناو بەختەوەران؟ وتی: زۆر چاکە.پاشان دوای ئەوە بە ساڵێك یان زیاتر پێی گەیشتمەوە ، هەر ئەو پرسیارەم لێ کردەوە، وتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾[1] واتە: لە شەوێکی پڕ لە پیت و پیرۆزدا ئێمە (ئەم قورئانەمان) ناردە خوارەوە، ئێمە ویستمان ترس وەبەر مەردم بنێین. هەر لەویشدا هەموو کاروبارێکی بەجێ لەیەك جیادەکرێتەوە. گوتی: لە شەوی قەدردا بڕیاری ئەوەی لەو ساڵەدا ڕوودەدات لە بژێوی یان هەر بەڵایەك دەدرێت پاشان ئەوی مەیلی لێبێت پێش دەخرێت و ئەویش مەیلی لێبێت دوا دەخرێت، بەڵام کتێبی بەختەوەری و بەدبەختی ئەوە دەمێنێتەوەو ناگۆڕێت.[2] ئەعمەش دەڵێت: لە ئەبو وائیلەوەکە شەقیقی کوڕی سەلەمەیەئەگێڕنەوە، کە ئەم دوعایەی زۆرجار دەکرد: ئەی خودایە ئەگەر تۆ ناومانت بە بەدبەخت نوسیوە، بیسڕەوە، ناومان لە بەختەوەران بنووسە، ئەگەر تۆ ناومانت لە بەختەوەران نووسیووە بمانهێڵەوە، چونکە تۆ مەیلت لە هەر شتێك بێت دەیسڕیتەوەو دەیهێڵیتەوە، سەرچاوەی هەموو کتێبەکان لای تۆیە.[3] ئیبنو جەریرئەمەی ڕیوایەت کردووە، وە هەر لەم شێوەدوعایە ڕیوایەت کراوە لە عومەری کوڕی خەتاب و ئیبنو مەسعودەوە، مانای ئەم قسانە ئەوەیە: خوا مەیلی لە هەر کامێك ببێت لەبڕیارەکانی (قەدەرەکانی) دەیسڕێتەوەو مەیلیشی لەهەر کامێك بێت دەیهێڵێتەوە، بە ڕاستی دڵ دەکرێتەوە بەم قسەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەوبانەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بە ڕاستی پیاوی وادەیە بێبەش دەکرێت لە ڕۆزی بە هۆی ئەو گوناهەی کەتووشی دێت، هیچ شتێك قەدەر ناگێڕێتەوە مەگین دوعاکردن، وە هیچ شتێك تەمەن زیاد ناکات مەگین چاکەکردن). نەسائی و ئیبنو ماجەیش ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە.[4] وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی تەمەن زیاد دەکات.[5] وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (کە دوعاو بڕیارەکان(قەدەرەکان) شەڕیانەو دێن بە یەکدا لە نێوان ئاسمان و زەمیندا). عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتە: ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ الْكِتَٰبِ﴾دا دەڵێت: ئەوەحاڵەتی ئەو پیاوەیە ماوەیەك هەڵدەسێت بە خواپەرستی پاشان دەگەڕێتەوە بۆ سەرپێچیکردنی خواو لەسەر گومڕایی دەمرێت،

---

[1] الدخان (٣ـ٤).

[2] الطبري (١٦/٤٨٠).

[3] الطبري (١٦/٤٨١).

[4] احمد (٥/٢٢٧)، ابن ماجه (٩٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] مسلم (٢٥٥٧).

ئەوە(یمحو)ەکەیە، ئەوەیش کە دەمێنێتەوەحاڵەتی ئەو پیاوەیە کە سەرپێچی خوا دەکات، پاشان تووشی خێر دەبێت تا دەمرێت، ئەو کەسە لە خوا پەرستیدا ژیان بەسەر دەبات،ئەوەش(یثبت)ەکەیە.[1] ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئەم ئایەتە وەك مانای ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[2] واتە: هەر کێ خوا بۆ خۆی مەیلی لێبێت، لێی دەبوورێت، هەر کەسیش خۆی حەز بکات سزای دەدات، هەر خودایە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە[3].

﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا ۚ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٤١﴾﴾

**جەزرەبەدان بە دەست خودایە، پێغەمبەریش (ﷺ) تەنها گەیاندن و بانگەوازی لەسەرە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ﴾ واتە: یان هەندێك لەوەی بۆمان بڕیار داون پیشانی تۆ دەدەین، خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ) هەندێك لەوەی بەڵێنمان داوە بە دوژمنەکانت لە سەرشۆڕیو هێنانی بەلا بەسەریاندا لە دنیادا پیشانی تۆنەدەین، ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ﴾ یان دەتمرێنین و پێش ئەوە دەتبەینەوە بۆ لای خۆمان، ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ﴾ واتە: تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕایگەیەنی، واتە: تەنها تۆمان ناردووە کە پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنی، تۆش ئەوەی فەرمانت پێکرا بەجێت هێنا. ﴿وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾ واتە: لێپرسینەوەو پاداشت دانەوەشیان لەسەر ئێمەیە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَكْبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُم﴾[4] واتە: سا تۆ ئامۆژگاریان بکە، تۆ تەنها ئامۆژگاریکەری، تۆ لەسەریان نەبویتە خاوەن دەسەڵات، مەگەر ئەو کەسەی ڕوو وەرگێڕێت و نەیەوێت خوا بناسێت، ئەوسا خودا بە سزایەکی گەورەتر سزای دەدات، بێگومان کە هەموویان بۆ لای ئێمە دێنەوە، لە دوایدا لێپرسینەوەیان لەسەر خۆمانە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ

---

[1] الطبري (١٦/٤٨٣).

[2] البقرة (٢٨٤).

[3] القرطبي (٩/٣٣١).

[4] غاشية (٢١ـ٢٦).

أَطۡرَافِهَا﴾ واتە: ئایا (خوانەناسان) نەیان زانیوە کە ئێمە دێین‌و لە هەموو لایەکەوە ئەم زەمینە کەم دەکەینەوە. ئیبنو عەباس دەڵێت: ئایا (خوانەناسان) نەیانزانیوە کە ئێمە زەوی لە دوای زەوی ئازاد دەکەین بۆ موحەمەد (ﷺ).[1] حەسەن‌و زەححاکیش دەڵێن: ئەوکەمکردنەوەی زەوی یە بریتی یەلە سەرکەوتنی موسڵمانان بەسەر بتپەرستاندا.[2] وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا مَا حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡقُرَىٰ﴾[3] واتە: زۆرێك لەو شارانەمان قڕ تێخست کە هەر لە دەوری ئێوە بوون. (شار لە دوای شار). ﴿وَٱللَّهُ يَحۡكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكۡمِهِۦۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ واتە: فەرمانڕەوا هەر خودایە کەس ناتوانێت ڕێگرلەبەردەم کاری خودادروست بکات‌و زۆر زوو لێپرسینەوە دەکات.

﴿وَقَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَلِلَّهِ ٱلۡمَكۡرُ جَمِيعٗاۖ يَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٖۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلۡكُفَّٰرُ لِمَنۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾﴾

### فێڵبازی خوانەناسان‌و ڕزگاربوونی خاوەن باوەڕان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی پێش ئەمانیش فێڵ‌و پیلانیان گێڕا، بە پێغەمبەرەکانیان‌و دەیانویست لە وڵات‌و زێدی خۆیان دەریانکەن، ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡمَكۡرُ جَمِيعٗا﴾ واتە: بەڵام هەموو پیلانەکان هی خودایە، وای کرد کە پاشەڕۆژ هەر بۆ خواناسان بێت، وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَۚ وَيَمۡكُرُونَ وَيَمۡكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾[4] واتە: بێتە بیرت کاتێك خوانەناسان ویستیان فێڵێکت لێ بکەن، یان بەندت بکەن، یان بتکوژن یان دەرت کەن، ئەوانە فێڵەکەی خۆیان کرد، خودایش نەخشەی بۆ دانان، خودایش چاکترین نەخشەداڕێژە، وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ﴾[5] واتە: خەریك بوو کەتنێك بگێڕن، ئێمەش نەخشەی خۆمان بۆدانان، بێ ئەوە هەستی پێ

---

[1] الطبري (١٦/٤٩٣).

[2] الطبري (١٦/٤٩٤).

[3] الاحقاف (٢٧).

[4] الانفال (٣٠).

[5] النمل (٥٠ـ٥١).

بکەن، بڕوانە سەرەنجامی کەتنەکەیان بە کوێ گەیشت، ئێمە ئەوانیشمان و هۆزەکەی لەناو برد، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَعْلَمُ مَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ﴾ واتە: خۆی دەزانێ هەر کەسێك چ کارێك دەکات. واتە: خوای گەورە ئاگاداری هەموو پەنهانیو شاراوەیەکە هەر کەسەو بە پێی کرداری خۆی پاداشتی دەداتەوە. ﴿وَسَيَعْلَمُ الْكُفَّارُ﴾ بە (الكافر)یش خوێنراوەتەوە، لەمەودوایش خوانەناسان دەزانن ﴿لِمَنْ عُقْبَى الدَّارِ﴾ واتە: کە دواڕۆژ کێ دەیباتەوە، واتە: پاشەڕۆ بۆ کێ دەبێت، بۆ ئەوان یان بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، نەخێر بێگومان پاشەڕۆژ هەر بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانە، لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا. سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلًا قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ ﴿٤٣﴾﴾

**خواو ئەو کەسانەی زانستی کتێبیان لایەبەسن کە لەسەر شایەتی بدەن بۆ پەیامی پێغەمبەر(ﷺ)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَسْتَ مُرْسَلًا قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ﴾ واتە: ئەوانە خوانەناسن پێت دەڵێن تۆ پێغەمبەر نیت، بڵێ: خوا بۆ شایەتی دانی نێوان منو ئێوە بەسە، واتە: ئەوانەی کە خوانەناسن بڕوات پێناکەنو دەڵێن تۆ خوا نەیناردووی تۆیش بڵێ: خوا بەسە بۆ شایەتی دان لە نێوانمانداو شایەتیشە لەسەر ئەوەی کە من ئەو پەیامەی ئەوم گەیاندووە، وە شایەتە بەسەر ئێوەیشەوە ئەی بێباوەڕان بۆ ئەو درۆو بوختانەی هەڵی دەبەستن، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ عِنْدَهُ عِلْمُ الْكِتَابِ﴾ ئەوانەش زانستی کتێبیان لایە هەر شایەتن، موجاهید دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر عەبدوڵای کوڕی سەلام هاتووەتەخوار.[1] بەڵام ئەمە قسەیەکی زۆر پەسەندکراو نیە، چونکە ئەم ئایەتە لە مەککە هاتووەتە خوارەوە، عەبدوڵای کوڕی سەلامیش لە سەرەتای گەیشتنی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بۆمەدینە موسڵمان بووە، بەڵام وا دیارە قسەی عەوفی کە لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە لەم بارەیەوە پەسەندترە کە دەڵێت: ئەوانەی زانستی کتێبیان لایە لە جوولەکەو مەسیحیەکان.[2] قەتادە دەڵێت: لەوانە ئیبنو سەلامو سەلمانو تەمیمی داری.[3] بەڵام

[1] الطبري (١٦/٥٠٢).

[2] الطبري (١٦/٥٠٢).

[3] الطبري (١٦/٥٠٣).

ڕاستتر لەم بارەیەوە ئەوەیەکە ﴿وَمَنْ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْكِتَٰبِ﴾ئیسمی جنسە، ئەو زانایانەی ئەهلی کتێب دەگرێتەوە کە سیفەتی پێغەمبەریان لەو کتێبە پێشوانەدا _کە بۆیان هاتووە_ بینیووە کە پێغەمبەران مزگێنیان پێداوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ﴾[1] واتە: بەزەییم هەموو شتێکی گرتوەتەوە، چاکەی ئەوانە دەنووسم لە خراپە خۆپارێزنو زەکات دەدەن، ئەو کەسانەش بڕوایان بە خودا هەیە، ئەوانەش کە دەکەونە شوێن ئەم پێغەمبەرەی کە ڕاسپاردەی خوایەو نەخوێندەوارەو لە تەوراتو ئینجیلیش ناوی نووسراوە. وە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾[2] واتە: ئایا ئەمە بۆ ئەوان بەڵگەیەك نیە؟ کە زاناکانی نەوەی ئیسرائیلیش هەر لەوە ئاگادارن، ئایەتی زۆری تریش وەك ئەم ئایەتە هاتووە کە باسی زانایانی نەوەی ئیسرائیل دەکات کە ئەوان ئەوە دەزانن لەو کتێبانەوە کە بۆیان هاتووە.

## تەفسیری سورەتی (ابراهیم)

## لە مەککەدا هاتووەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٣﴾﴾

### پێناسەی قورئانو مەبەستی قورئانو واوەیلا بۆ کەسێك دژایەتی بکات

﴿الٓر ۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ﴾ (ئەلیف، لام، ڕا)، کتێبێکە ئەی موحەمەد(ﷺ) بۆ تۆمان ناردە خوارەوە. لەسەرەتای هەندێ سورەتداباسی ئەم پیتانەمانکرد، واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) ئەم کتێبەی کە بۆ تۆمان ناردە خوارەوە، ئەم قورئانە پیرۆزەیە کە بەڕێزترین کتێبە لای خودای مەزن ڕەوانەی کردووە بۆ سەر بەڕێزترین پێغەمبەر لەسەر زەمیندا، بۆ هەر هەموو خەڵك بە عەرەبو عەجەمیەوە،

---

[1] الاعراف (١٥٦_١٥٧).

[2] الشعراء (١٩٧).

﴿لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ واتە: تا خەڵکی لە تاریکی بەرەو ڕووناکی بەرن. واتە: بۆیە تۆمان ناردووە ئەی موحەمەد (ﷺ) بەم کتێبەوە تا خەڵکی لەو گومڕایی‌و سەر لێشێواویەی تێیدان دەربێنی بۆ سەر ڕاستەڕێ‌و شارەزایی. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِ﴾[1] واتە: خودا یاری گەلی خاوەن باوەڕانە لەناو تاریکستانەوە دەیانبات بەرەو ڕووناکی، دۆستی خودا نەناسانیش هەر تاغوتە لە ڕۆشنایی دەریان دێنن بەرەو تاریکستانیان بەرێ دەکەن, وە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾[2] واتە: هەر ئەوە (خودایە) چەند نیشانەی دیاری دەری بۆ سەر عەبدی خۆی ناردەخوار، تا لە تاریکی دەرتان بێنێت‌و بەرەو ڕووناکیتان بەرێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ﴾ بە ئیزنی پەروەردگاریان هەر خودا خۆی ڕێ نیشاندەرە بۆ کەسێك کە بڕیاری دابێت شارەزای بکات، لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرانەی کە ناردوویەتی بۆ ڕێ نیشاندانیان ﴿إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ﴾ واتەبۆ ڕێگەی خودای خاوەن دەسەڵات، ئەو خاوەن دەسەڵاتەی کە بەربەستی لێ ناکرێت‌و هیچ شتێك زاڵ نابێت بەسەریدا، بەڵکو هەر ئەو زاڵ‌و بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا، ﴿ٱلۡحَمِيدِ﴾ واتە: سوپاسکراوە لە هەموو کردارو گفتارو بەرنامەو فەرماندان‌و قەدەغەکردنیداو ڕاستگۆیە لە هەواڵدانیدا، ﴿ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئەو خودایەی هەرچی لەناو ئاسمانەکان‌و زەمیندان گشت هی ئەون. هەندێ (الله)یان بە مەرفوعی خوێندووەتەوەو هەندێکی تریش بە مەکسوری خوێندوویانەتەوە. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾[3] واتە: بڵێ: خەڵکینە بزانن من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە, هەمووتان، ئەو خودایە کە تەنها ئەو خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەمینە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ﴾ واتە: واوەیلا بۆ خوانەناسان، لە سزای زۆر توندو تیژ. واتە: هاوارو سزای سەخت لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ ئەوانە کاتێك کە دژایەتیت دەکەن‌و بڕوات

---

[1] البقرة (٢٥٧).

[2] الحديد (٩).

[3] الاعراف (١٥٨).

پیٚ ناکەن ئەی موحەمەد(ﷺ) پاشان خوای گەورە باسی خراپیتان دەکاتو دەفەرموویٚت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ واتە: ئەوانەی ژیانی دنیایان لە ڕۆژی دوایی پیٚ باشترو خۆشترە ڕیٚزی دەدەن بەسەریداو هەر کار بۆ دنیا دەکەنو قیامەتیان لە یاد نەماوەو وازیان لیٚ هیٚناوەو پشتگوییان خستووە، ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: دەبنە لەمپەر لە ڕیٚی شویٚنکەوتووانی ڕیٚگای خوادا، ﴿وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًا﴾ واتە: دەیانەویٚت خوارو خیٚچ بیٚت،یانی: حەز دەکەن ڕیٚگەی خودا لارو ویٚرو کەمو کوڕ بیٚت، بیٚگومان ڕیٚگەی خودا ڕیٚکو ڕاستە، ئەوانەی دژایەتی دەکەنو پشتی تیٚدەکەن هیچ زیانیٚکی پیٚ ناگەیەنیٚت، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ﴾ واتە: ئەوانە لە گومڕاییدا زۆر ڕۆچوون.یانی: بەهۆی ڕۆچوونیان لە نەفامیو گومڕاییدا لە هەق لایان داوەو هیوای چاك بوونەوەیان لیٚ ناکریٚت تا لەسەر ئەو حاڵە بنو واز نەهیٚنن.

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ ﴾

**هەموو پیٚغەمبەریٚك بە زمانی گەلەکەی ڕەوانەکراوە تا هیدایەت یان گومڕابوون دوای ڕوون کردنەوەکانی ئەوان دەربکەویٚت )**

خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴾ واتە: هیچ پیٚغەمبەریٚکمان نەنارد، مەگین بە زمانی گەلەکەی خۆی ناردوومانە تا هەقیان بۆ ڕوون بکاتەوە. ئەمەیش لە سۆزو بەزەیی خوداوەیە بۆ بەندەکانی کە پیٚغەمبەریٚکی لە خۆیانو بە زمانی خۆیان بۆ ڕەوانە کردوون، بۆ ئەوەی بزانن داوای چی دەکەنو شارەزای ئەو پەیامەش بن کە پیٚغەمبەران بۆیان هیٚناون. پاشان خودای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾ واتە: خودا کیٚی بویٚ گومڕای دەکاتو کیٚشی بویٚت شارەزای ڕاستە ڕیٚی دەکات. واتە: دوای ڕوون کردنەوەو بەڵگە پیٚدانیان مەیلی لە هەر کەسیٚك بیٚت گومڕای دەکاتو لەڕاستەڕیٚ لای دەدات، مەیلیشی لە هەرکەسیٚك بیٚت ڕیٚی ڕاستی نیشان دەدات، ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ واتە: هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە ئەوەی ویستی دەبیٚت، ئەوەیش نەیەویٚت نابیٚت، ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ واتە: کارزانە لە کارەکانیدا، ئەوەی شایستەی گومڕابوون بیٚت، گومڕای دەکات، ئەوەیش شایەنی ئەوە بیٚت کە شارەزا بیٚت، شارەزای دەکات، بەرنامەو سونەتی خودا هەروا بووە لە دروستکردنی خەڵکیدا، کە هیچ پیٚغەمبەریٚکی نەناردووە بۆ هیچ گەلیٚك مەگین بە زمانی ئەو گەلە بووە هەموو پیٚغەمبەریٚك تەنها کاری ئەوە بووە کە ئەو پەیامی

خودایە بگەیەنێت بە گەلەکەی خۆی و بەس. بەڵام موحەمەدی کوڕی عەبدوڵای (ﷺ) بە تایبەتی ڕەوانەکرد بۆ هەموو خەڵکی بە پەیامێکی تێرو تەواوو گشتگیرەوە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە جابیرەوە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج شتم پێ بەخشراوە، بە هیچ پێغەمبەرێکی تری پێش من نەبەخشراوە:زاڵ وسەرکەوتووی کردووم بەترس دووری مانگەڕێیەك ، زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و پاك و پاککەرەوە، دەستکەوتی بۆ حەڵاڵ کردووم، بۆ هیچ کەسێکی پێش من حەڵاڵ نەکراوە، شەفاعەتم پێ دراوە، پێغەمبەران ڕەوانە کران بۆ گەلەکەیان بە تایبەتی، من ڕەوانە کراوم بۆ هەموو خەڵك.[1] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾[2] واتە: بڵێ: خەڵکینە ! بزانن من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هەمووتان.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ۝٥ ﴾

**بەسەرهاتی موسا و هۆزەکەی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾ واتە: موسامان نارد هاوڕێ لەگەڵ چەند بەڵگەیەك لە لایەن خۆمانەوە. واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) وەك چۆن تۆمان ڕەوانەکردووە و قورئانیشمان ناردە خوارەوە بۆت، هەتا گشت خەڵکی دەربێنی لە تاریکی، بانگیان بکەی لە تاریکی بێنە دەرەوە بۆ ناو ڕووناکی هەر بەو جۆرەیش موسامان ڕەوانەکرد بۆ نەوەی ئیسرائیل، لەگەڵ چەند نیشانەیەك، موجاهید دەڵێت: نۆ نیشانەکە. پێمان وت: ﴿أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ واتە: کە هۆزی خۆت لە تاریکایی ڕزگار بکەو بەرەو ڕووناکی بەرە. واتە: بانگیان بکە بۆ چاکە تا لەو تاریکایی نەفامی و سەر لێ شێواویەی کە تێیدان ڕزگاریان ببێت و بەرەو ڕووناکی ڕاستەڕێ و چاوڕوونی باوەڕ بڕۆن. ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ڕۆژەکانی خودایان وەبیر بێنەوە. واتە: ئەو هەموو بەخشش و بەهرانەی خوایان وەبیر بێنەوە کە پێ ی داون کە دەری هێنان لە کۆیلەیی و زاڵم زۆرو ناهەقی و فیرعەون و ڕزگاری کردن لەو دوژمنەیان و دەریای بۆ لەت کردن و هەوری کردە سێبەر بۆیان و گەزۆو شەلاقەو( ڕیشۆڵە) و چەند بەهرەی تری بۆ ناردن، ئەمە

---

[1] فتح الباري (٥١٩/١)، مسلم (٣٧٠/١).

[2] الاعراف (١٥٨).

موجاهیدو قەتادەو کەسانی تریش گوتوویانە.[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ واتە: کە ئەم کارە بۆ هەموو خۆڕاگرێکی سوپاسگوزار زۆر پەندی باشی تێدایە. واتە: ئەوەی کردمان بۆ دۆستەکانمان لە نەوەی ئیسرائیل کاتێك کە دەربازمان کردن لە دەستی فیرعەونو ڕزگارمان کردن لەو ژیانە ناخۆشەو سزا سەختەی تێیدا بوون، پەندو ئامۆژگاریە بۆ هەموو خۆڕاگرێك لە کاتی تەنگانەداو شوکرانەبژێرە لە کاتی خۆشگوزەرانیدا، وەك قەتادە دەڵێ: باشترین عەبد ئەو عەبدەیە کاتێك تاقی بکرێتەوە ئارام ئەگرێت و کاتێك شتی پێی بدرێت سوپاسگوزارئەبێت.[2] وە هەر بەو شێوەیە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بە ڕاستی هەموو کاروبارێکی خاوەن باوەڕ سەیرە، خودای مەزن هیچ بڕیارێکی بۆ نادات مەگین ئەو بڕیارە ئەبێتەخێر بۆی، ئەگەر تووشی ئازار ببێت خۆی ڕائەگرێت، ئەوە چاکە بۆی بویَ، وە ئەگەر تووشی خۆشیەك ببێت سوپاسگوزار ئەبێت ئەوەش هەر چاکە بۆی)[3].

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ ۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَاكُم مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوءَ الْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَاءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَاءَكُمْ﴾ واتە: ئەوسا موسا بە هۆزەکەی خۆی ڕاگەیاند: ئەو چاکەیەی خودا دەربارەی ئێوەی کردووە، لە بیری مەکەن کە لە دەستی فیرعەونو داروودەستەکەی دەری هێنان، زۆر خراپ ئازاریان دەدان، کوڕەکانیان لێ سەردەبڕین، ژنەکانیان بە زیندوویی دەهێشتەوە. خوای گەورە لێرەدا باسی موسا دەکات، کاتێك یادی هۆزەکەی خستەوە کە ڕۆژگارەکانی خودا لەیاد نەکەن، کە ئەو هەموو بەهرەیەی پێ بەخشین، لە فیرعەونو دارو دەستەکەی ڕزگاری کردن، کە زۆر جەزرەبەی دەدانو کردبوونی بە کۆیلەو لە هەر کوێ کوڕێکیان ببووایە سەری دەبڕیو ژنەکانی دەهێشتەوە، خودا لەو ناڕەحەتیە ڕزگاری کردن، ئەمەیش بەهرەیەکی زۆر مەزنە لە لایەن خوداوە بەسەر ئێوەوە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:

---

[1] الطبري (٥٢١/١٦).

[2] الطبري (٥٢٣/١٦).

[3] مسلم (٢٢٩٥/٤).

﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ واتە: ئەمەیش تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو لە لایەن پەروەردگارتانەوە، یان ئەمە بەهرەیەکی زۆر گەورە بوو لە لایەن خوداوە بۆ ئێوە، چونکە ئێوە نەتان توانی هەڵسن بە شوکرانەبژێری خودا، دەشڵێین: ئێوە نەتان دەتوانی هەڵسن و بەرامبەر فیرعەون بوەستن، کاتێك فیرعەون و دارو دەستەکەی ئەو هەموو خراپەیان بەرامبەرتان دەکرد. ﴿بَلَاءٌ﴾ واتە: تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو،کە هەردوو ماناکە هەڵدەرێت (والله أعلم)، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾[1] واتە: بە خۆشی و بە ناخۆشی تاقیمان کردنەوە سا بەڵکو بگەڕێنەوە، پاشان دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ ﴾ واتە: پەروەردگارتان ڕایگەیان و لەو بەڵێنەی خۆی ئاگاداری کردنەوە کە پێی دابوون، وە هەڵیش دەگرێت ماناکەی بەم جۆرە بێت: پەروەردگارتان سوێندی خواردووە بە گەورەیی و دەسەڵاتی خۆی. وەك ئەم ئایەتانە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾[2] واتە: ئەو کاتەت لەبیر بێت ئەی موحەمەد (ﷺ) کە پەروەردگارت ڕایگەیاند. سوێندی خوارد کە دەیانکەمە ژێردەستەی کەسانی وا کە تا قیامەت بە توندی ئازاریان بدەن. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾ واتە: ئەگەر سوپاسگوزاری بەهرەکانم بن بەدڵنیاییەوە بۆتان زیاد دەکەم ، ﴿وَلَئِن كَفَرْتُمْ﴾ واتە: خۆ ئەگەر سەرپێچیتان کردو بەهرەکانی منتان شاردەوە، ﴿إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ واتە: سزای من زۆر توندو تیژە، واتە: خودا ئەو بەهرانەیان لێ دەسێنێتەوەو لەسەر ئەو سەرپێچیەشیان جەزرەبەیان دەدات، لە فەرموودەدا هاتووە: (بەڕاستی بەندەی واهەیە لە ڕۆزی بێبەش دەکرێت بە هۆی ئەو گوناهەوە کە تووشی دەبێت).[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ إِن تَكْفُرُوا أَنتُمْ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾ واتە: موسا وتی: جابا ئێوەو هەر کەسێك لەم زەویەدایە ناسوپاس بن، خوا نیازی بە کەس نیەو هەر شیاوی پیاهەڵدانە (وەسف کردنە) وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾[4] واتە: کە حاشایان کردو ڕوویان وەرگێڕا، خودایش بێنیازە، هەر شایانی سوپاس کردنە. لە سەحیحی

---

[1] الاعراف (١٦٨).

[2] الاعراف (١٦٧).

[3] احمد (٢٨٢/٥)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[4] التغابن (٦).

موسلیمدا هاتووە لە ئەبو زەڕەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە لە پەروەردگاری مەزنیەوە ڕیوایەتی کردووە کە فەرموویەتی: (ئەی بەندەکانم ئەگەر خەڵکەپێشووەکانتان وخەڵکەدواینیەکانتان وجنوکەکانتان ومرۆڤەکانتان هەمووله‌سەر دڵی پاکترین وخواناسترینتان بن بەوەهیچ شتێك لەدەسەلاتی من زیادناکات ،ئەی بەندەکانم ئەگەر کەسەپێشوەکانتان و دواین کەسەکانتان و مرۆڤتان و جنۆکەتان لەسەر دڵی بەدفەڕترین کەسێکتان بن، هیچ لە موڵکی من کەمی نەکردووە، ئەی بەندەکانم ئەگەر کەسەپێشوەکانتان و دواین کەسەکانتان و مرۆڤو جنۆکەتان لە یەك شوێندا داوام لێ بکەن داوای گشت مرۆڤ بەجێ بێنم، هیچ لە موڵکی من کەمی نەکردووە، مەگین وەك ئەوەی دەرزیەك کاتێ دەخرێتە ناو دەریایەکەوەبەوئەندازەیە کەم دەکات).[1] واتە: هیچ کەم ناکات، پاکیو بێعەیبی بۆ خودای بێنیازو سوپاسکراو.

﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾﴾

**بڕوانەهێنانی گەلان بە پێغەمبەرەکانیان و ئەوەی لە نێوانیاندا ڕوویداوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ﴾ واتە: ئایا ئێوە دەنگو باسی ئەوانەتان نەبیستووە کە بەر لە ئێوە ژیاون، وەك هۆزی نوحو هۆزی عادو سەمودو ئەوانەی لە دوای ئەوان هاتوون، کە خودا نەبێت هیچ کەسێکی تر نایانزانێت. خوای گەورە جارێکی تر باسی ئەو گەلانەمان بۆ دەکات کە بەسەرهاتەکانیان بۆ گێڕاوینەتەوە وەك هۆزی نوحو عادو سەمودو هۆزەکانی تریش، ئەوانە کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەدەهێناو بە درۆیان دەخستنەوە، کە خودا نەبێت هیچ کەسێك ژمارەیان نازانێت، ﴿جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ﴾ واتە: پێغەمبەرەکانی ئەوان بە بەڵگەی زۆر ئاشکراوە هاتنە لایان، واتە: بە نیشانەو بەڵگەی زۆر ڕوونو ئاشکراو تەواوو دیار هاتنە لایان. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: لە عەمری کوڕی مەیمونەوە لە عەبدوڵاوە لەم دەقەدا ﴿لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ﴾ _کە خوا نەبێت هیچ

[1] مسلم (٤/١٩٩٤).

کەسێکی تر نایانزانێت_، دەڵێت: ڕەچەڵەک ناسەکان درۆیان کردووە.[1] عوروەی کوڕی زوبەیریش دەڵێت: هیچ کەسمان نەدیوە پشتەکانی دواى مەعەدی کوڕی عەدنان بزانێت[2].

**ماناى ﴿فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ واتە: هەموویان دەستی خۆیان خستە ناو دەمی خۆیان، هەندێك دەڵێن: واتە: ئەو خوانەناسانە دەستیان ڕاکێشا بۆ دەمی پێغەمبەرانو فەرمانیان پێ کردن بێ دەنگ بن بانگیان نەکەن، کاتێك کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) بانگیان دەکردن بۆ لای خودای گەورە. گوتراویشە: دەستیان دەنا بە دەمی خۆیانداو بڕوایان پێ نەدەکردن، هەندێکی تریش دەڵێن: بەڵکو ئەوە بریتی بووە لە بێدەنگ بوون لە وەڵامدانەوەی پێغەمبەران. وتراوە: واتە: قەپیان دەگرت لە دەستیان لە تووڕەییدا. موجاهیدو موحەمەدی کوڕی کەعبو قەتادە دەڵێن: واتە: بڕوایان پێ نەهێنانو بەرپەرچی قسەکانیان دانەوە (بە قسەکردن) بە دەمیان.[3] منیش دەڵێم: موجاهید پشتگیری ئەو مانایە دەکات بەم ئایەتە خۆی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ﴾ واتە: وتیان: ئێمە بەو شتانەی ڕاسپێراون باوەڕ ناکەین، ئەوەیش ئێمەی بۆ بانگ دەکەن ئێمە زۆر بە گومانین لێی. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: کاتێك کە گوێیان لە فەرموودەی خودا زۆر سەیر بوو بە لایانەوەو دەستیان گرت بەدەمیانەوە.[4] ﴿وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ﴾ واتە: وتیان:ئێمە بەو شتانەی کە پێی ڕەوانەکراون باوەڕ ناکەین، ﴿وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ﴾ واتە: ئەوەیش ئێمەی بۆ بانگ دەکەن،ئێمە زۆر بە گومانین لێی.

﴿قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ۝١٠ قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأۡتِيَكُم بِسُلۡطَٰنٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ

[1] الطبري (١٦/٥٢٨).
[2] القرطبي (٩/٣٤٤).
[3] الطبري (١٦/٥٣٤).
[4] الطبري (١٦/٥٣٣).

﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾﴾

**مشتومڕی نێوان پێغەمبەران و خوانەناسان**

خــوای گــەورە دەفــەرموویێت: ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتــە: پێغەمبەرەکانیان وتیان: ئایا ئێوە لە داهێنەری ئاسمانەکان و زەمین گومانتان هەیە؟ خوای گەورە باسی ئەو وتووێژەی نێوان پێغەمبەرەکان و خوانەناسان دەکات کە چووەتە نێوانیان. لەبەر ئەوەی گەلەکانیان کاتێك ڕووبەڕوویان بوونەوەو بڕوایان نەکرد بەو پەیامەی پێغەمبەران بۆیان هێنابوون کە تەنها خوا بپەرستن کە شەریکی نیە، پێغەمبەرەکان پێیان گوتن: ئایا ئێوە لە پەرستنی خودا گومانتان هەیە، بە تەنها بیپەرستن کە وەدیهێنەری هەموو بوونەوەرە، هیچ کەسێك شایەنی پەرستن نیە جگە لەو کە تەنهایەو شەریکی نیە؟ چونکە زۆربەی گەلان دانیان دەنا بەوەدا کە خودا داهێنەری ئاسمانەکان و زەمینە، بەڵام لەگەڵ خودا شتی تریان دەپەرست و دەیانکردنە هاوەڵی خوداو وایان دەزانی سودیان پێ دەگەیەنن و لە خواوە نزیکیان دەخەنەوە، پێغەمبەرەکان دەیان وت: ﴿يَدْعُوكُمْ لِيَغْفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ﴾ واتە: (خودا) بانگتان دەکات تا لە گوناهەکانتان خۆش بێت، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿وَيُؤَخِّرَكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ واتە: تا ماوەیەکی دیاریکراو لێتان ڕاوەستێت. واتە: لە دنیادا. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ﴾[1] واتە: لە پەروەردەی خۆتان داوا بکەن، لێتان ببورێت و بشگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، تا ماوەیەکی داریکراو ژیانی خۆشتان بۆ دابین بکات و لەگەڵ هەموو خاوەن چاکەیەك چاکە بکات.

**دانپیانەنانی خواناسان بە پەیامی پێغەمبەراندا لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەرەکان مرۆڤن!**

گەلەکانیان دەیانوت بە پێغەمبەرەکانیان دوای ئەوەی کە بڕوایان هەبوو کە خودا ئەوانیش و بوونەوەریشی دروست کردووە ئێمە بڕوا ناکەین کە پەیامتان لە لایەن خواوە بۆ هاتبێت، ﴿قَالُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾ واتە: وتیان: ئێوەش هەروەك ئێمە مرۆڤن، چۆن ئێمە شوێنی ئێوە دەکەوین هەر بە قسەی ڕووت و هیچ نیشانەو موعجیزەیەکتان لێ نەبینین. ﴿تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ

[1] هود (٣).

ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: دەتانەوێت لەوانەی کە باب‌و باپیرانمان دەیانپەرست وەرمانگێڕن؟ دەی هەر بەڵگەیەکی بەهێزتان لایە پێمانی بڵێن. واتە: داوای هەر موعجیزەیەکتان لێ دەکەین بۆمان بەجێ بێنن، ﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ واتە: پێغەمبەرەکان وتیان: بەڵێ ئێمەهیچ نین ئەوەنەبێت مرۆڤێکین وەك ئێوە، ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ واتە: بەڵام خودا مەیلی لە هەر بەندەیەکی خۆی بێت ڕێزی لێ دەنێت، دەیکاتە پێغەمبەرو پەیامی پیادەنێرێت، ﴿وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ واتە: بۆمان نیە هیچ بەڵگەیەکتان بۆ بێنین، مەگین خودا خۆی ئیزنی لەسەر بێت، بەپێی ئەو داوایەی ئێوە دەیکەن، ئێمەیش لاڵەی لێ بکەین ڕێمان پێ بدات بەو کارە هەڵسین، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ واتە: با هەموو خاوەن باوەڕان خۆیان بدەنە دەستی خودا لە هەموو کاروبارێکیاندا. پاشان پێغەمبەران وتیان: ﴿وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ﴾ واتە: جا چۆن ئێمە خۆمان بە خوا ناسپێرین، کە هەر خۆی ڕێگەی ڕاستی نیشان داوین؟ هەر ئازارێکیشمان بدەن، خۆڕادەگرین، با ئەوانەش خودا بە پشتیوان دەزانن خۆیان بدەنە دەستی خوا. واتە: هیچ شتێك نابێتە ڕێگر لە ڕێگاماندا کە خۆمان دایە دەستی خودا، چونکە ئەو ڕێگەی ڕاستی نیشان داوین‌و بە جوانی بۆی ڕوون‌و ئاشکرا کردووین‌و خۆشمان ڕادەگرین بەرامبەر ئەو قسە ناشیرین‌و کردارە بەدو خراپانەی ئێوە.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾﴾

**هەڕەشەی گەلەکان لە پێغەمبەرەکانیان‌و مژدەی خواش بۆ ئەو پێغەمبەرانە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾ واتە: ئەوانەی خوانەناس بوون، بە پێغەمبەرەکانیان وت: ئێمە بێگومان لەم سەر زەمینەی خۆمان دەرتان دەکەین، یان دێنەوە سەر ئاینەکەی خۆمان. خوای گەورە باسی ئەو گەلە خوانەناسانە

دەکات کە هەڕەشەیان کرد لە پێغەمبەرەکانیان بە دەرکردنو دوورخستنەوەیان لە وڵاتەکەی خۆیان. وەك هۆزی شوعەیب وتیان بە شوعەیبو ئەوانەی بڕوایان پێ هێنابوو: ﴿لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾[1] واتە: ئێمە تۆشو ئەو کەسانەش لەگەڵ تۆ باوەڕیان هێناوە لە شاری خۆمان دەردەکەین، یان دێنەوە سەر دینی ئێمە. وەك هۆزی لوتیش وتیان: ﴿أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ﴾[2] واتە:خاو خێزانی لوت لە شاری خۆتان دەربکەن. خوای گەورە باسی بتپەرستەکانی قوڕەیش دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا﴾[3] واتە: ئەوەندەی نەمابوو ئەوانە لەو سەر زەمینە بتخەنە تەنگانەوە، هەتا لەوێ دەرت بکەن، ئەگەر واش بوایە، بە شوێن تۆدا ماوەیەك نەبێت ئەوانیش تێیدا نەدەمان. وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ﴾[4] واتە: بێتە بیرت کە خوانەناسان ویستیان فێڵێکت لێ بکەن، یان بەندت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان فێڵەکەی خۆیان کرد، خودایش پلانی دانابۆیان، خودا چاکترینی پلاندانڕێژە. کاری خودا وابووە کە پێغەمبەرەکەی ناردوەو یارمەتی داوەو سەری خستووە، هۆی دەرکردنەکەیشی لە مەککە وایلێکردووە کە خەڵکێکی زۆر ببنە یارمەتیدەرو هاوکارو لەشکری تالە ڕێی خوادا بجەنگن ،بەردەوام خوای گەورە کارەکانی یەك لە دوای یەك بۆ ڕێك دەخست، هەتا فەتحی مەککەی بۆ کرد، کە دەریان کردبوو لێی، بە تەواوی جێگیری کرد تێیدا، دوژمنەکانی سەرشۆڕکرد لەوێو لە شوێنەکانی تری سەر زەمیندا، تا وای لێهات خەڵکی پۆل پۆلو دەستەدەستە دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلام. وتەی (لا إله الاّ الله)و ئاینەکەی بەرزبووەوە بەسەر ئاینەکانی تردا، لە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای سەر زەمیندا، لە کەمترین ماوەدا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ﴾ واتە: پەروەردگاریان تێی گەیاندن: ئێمە ناهەقیکاران دەبێت قڕ بکەین، لە پاش ئەوان لەم زەویەدا ئێوە دادەمەزرێنین. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾

---

[1] الاعراف (٨٨).

[2] النمل (٥٦).

[3] الاسراء (٧٦).

[4] الانفال (٣٠).

إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾[1] واتە: بێگومان لە پێشیشدا قسەکانی ئێمە (لە بارەی بەندە ڕەوانەکراوەکانمانەوە) بە مەردم ڕاگەیەنراوە، کە هەر ئەوان یارمەتی دەدرێن، دیاریشە هەر سوپای ئێمە سەردەکەوێت. وە فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾[2] واتە: خوا خۆی بڕیاری داوە، بێگومان منو پێغەمبەرەکانم سەردەکەوین. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴾[3] واتە: لە زەبووردا کە پاش تەورات بوو نوسیمان: ئەم زەمینە هەر بۆ بەندە چاکەکانی ئێمە دەمێنێت. وە فەرموویەتی: ﴿قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾[4] واتە: موسا بە هۆزەکەی خۆی وت: هەر پشت بە خوا ببەستنو خۆڕاگر بن، ئەم زەمینە هی خودایە، بە هەر کەسێك لە بەندەکانی خۆی مەیلی لێبێت، پێی دەبەخشێت دوارۆژیش بۆ ئەوانەیە کەترسیان لە خوا هەیە. وە لە ئایەتیکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴾[5] واتە: ئەوسا ئێمە خۆرهەڵاتو خۆرئاوای ئەو وڵاتەمان (کە بەرەکەتمان پێدابوو) کردە بەشی ئەوانەی چەوساوە بوون، بەڵێنی پیرۆزی پەروەردگارت (بێ کەمو کوڕی) دەربارەی نەوەی ئیسرائیل هاتەجێ، لە پاداشتی خۆڕاگرتنیاندا، هەرچی فیرعەونو هۆزەکەی دایان ناو بەرزیان کردەوە هەموومان لێ تێکو پێك دان. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ﴾ واتە: ئەمەیش بۆکەسانێکە کە لە پایەبەرزی منو لە هەڕەشەی من دەترسن. واتە: ئەم هەڕەشانەی من بۆئەو کەسانەیە کە لەبەر دەستی مندا لە ڕۆژی قیامەتدا دەترسنو لە هەڕەشەی من ئۆقرەیان نیە کە سزاو جەزرەبەیە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ

---

[1] الصافات (١٧١ـ١٧٣).

[2] المجادلة (٢١).

[3] الانبياء (١٠٥).

[4] الاعراف (١٢٨).

[5] الاعراف (١٣٧).

ﭐلۡمَأۡوَىٰ﴾[1] واتە: جا هەر کەسێك کە سەربزێوی کردووەو ژینی دنیای هەڵبژاردووە، دیارە جەهەنەم جێیەتی. وە فەرموویەتی: ﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ﴾[2] واتە: بۆ هەر کەسێك لە پەروەردگاری ترساوە دوو باغ هەیە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱسۡتَفۡتَحُواْ﴾ واتە: پێغەمبەران داوای دەروویەکیان لە پەروەردگاریان کرد، کە لە دەستی گەلەکانیان ڕزگاریان بکات، ئەمە قسەی ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو قەتادەیە.[3] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ئەو گەلانە داوای سزایان کرد بۆ خۆیان.[4] وەك وتویانە: ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾[5] واتە: ئەی خودایە، ئەگەر بە ڕاستیەوە لە لایەن تۆوە هاتووە لە ئاسمانەوە بەردبارانمان بکە یان ئازارێکی بە ژانمان بۆ بنێرە. هەڵدەگرێت مەبەست ئەم مانایە بێت‌و ئەو مانایەش بێت، وەك چۆن لە ڕۆژی بەدردا داوای سزایان کرد کە بۆیان بێتەخوار، پێغەمبەریش داوای یارمەتی‌و دەروویەکی کرد لە خوای گەورە. خوای گەورە لە بارەی موشریکەکانەوە فەرموویەتی: ﴿إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُۖ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾[6] واتە: ئەگەر دەتانەویست سەرکەون، وا سەرکەوتن. ئەگەر واز لە شەڕیش بێنن قازانجتانە (خوای گەورە گاڵتەیان پێ دەکات)، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ﴾ واتە: هەر کەسێکیش کە ملهوڕو لاسار بوو نائومێد بوو، واتە: ئەوەی کە خۆی بە ملهوڕ دەزانی‌و دژایەتی هەقی کردووە ڕەنجەڕۆ بوو. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلۡقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٖ ٢٤ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٖ مُّرِيبٍ ٢٥ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلۡقِيَاهُ فِي ٱلۡعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ﴾[7] واتە: بە هەردووکتان، هەموو سپڵەیەکی لاسار بهاوێژنە ناو جەهەنەم، کە بەری چاکەی گرت‌و لە ڕێ لایداو خەڵکیشی بەدگومان کرد، کەسێك بوو کە جگە لە خودا، شتی تریشی دەپەرست، سا بە توندی بیانخەنە بەر جەزرەبەوە. وە لەم فەرمودەیەدا هاتووە: (بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا جەهەنم دەهێنرێت، بانگ لە هەموو خەڵکی

---

[1] النازعات (٣٧ـ٣٩).

[2] الرحمن (٤٦).

[3] الطبري (١٦/٥٤٤/٥٤٥).

[4] الطبري (١٦/٥٤٥).

[5] الانفال (٣٢).

[6] الانفال (١٩).

[7] ق (٢٤ـ٢٦).

دەكاتو دەڵێت: هـەموو ملـهوڕو لاسارێك دراوەتـە دەسـت مـن).[1] واتـە: داماویو سەرشۆڕی بۆ ئـەو كەسەی كە پێغەمبەران داوای لەناوچوون بكەن بۆیان لە لای خودای خاوەن دەسەلاتی بە توانـا. ﴿مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ﴾ واتە: جەهەنم لە دوایەوەیە، (وراء) لێرەدا بە مانای پێش هـاتووە. وەك ئـەم ئایەتـە كـە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾[2] واتـە: كـە لـەو لایـان پاشایەك بـوو هـەموو كەشتیەكی داگیر دەكـرد، ئیبنـو عـەباس بـە: (كـان أمـامهم ملـك) دەیخوێنـدەوە. واتـە: لەبەردەم هـەموو ملهوڕێكی لاساردا جەهـەنم ئامادەیە، واتـە: جەهـەنم لـە كەمینداپە بۆیـان دەبێتـە شـوێنیانو لـە ڕۆژی قیامەتـدا هـەتا هەتایـە تێیـدا دەمێننـەوە. ئێـوارانو بـەیانیان دەخرێنـە نـاویو جەزرەبە دەخۆن هەتا ئەو ڕۆژەی بانگنەكرێن﴿وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ﴾ واتە: دەبێت زوخاو بخواتـەوە لەناو ئاگردا، هیچ خواردنەوەیەكی تێدا نیە جگە لە ئاوی كوڵو كێمو زوخـاو. ئاوەكوڵەكـە زۆر گەرمـەو زوخاوەكـەیش ئیجگـار ساردەو بـۆنی پیسە. وەك خـوای گـەورە فـەرموویـەتی: ﴿هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ﴾[3] واتە: با لەوێدا ئاوی كوڵ بەكوڵو كـێمو زوخـاو بخۆنـەوە، هـەر لەم جۆرە جەزرەبانەو چەندین وێنەی تریش هەیە، عیكریمەو موجاهید دەڵێن: زوخاو لە كێمو خـوێن.[4] خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾[5] واتـە: ئاوەكوڵیـان پـێ دەدرێـتو ڕیخۆڵـەیان لـەتو پـەت دەكـات. وە دەفـەرموێت: ﴿وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ﴾[6] واتە: كـە هـاواری چارە دەكـەن ئاوێكیـان بـۆ دێـنن وەك مـسی تـواوە وایـە، دەمو چاویان دەبرژێنێت چ خواردنێكی خراپە! ئیبنو جەریریش هـەر وای ڕیوایـەت كـردووە.[7] خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَتَجَرَّعُهُۥ﴾ واتـە:بـە زۆر پێـی دەخورێتو قـومی لـێ دەدات، واتـە: بـە زۆر ناچـار دەكرێت بیخاتە ناو دەمی، فریشتەیش بـە گـورز لێـی دەدەن وەك خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَلَهُم

[1] تحفة الأحوزي (٧/٢٩٥).
[2] الكهف (٧٩).
[3] ص (٥٧_٥٨).
[4] الطبري (١٦/٥٤٨).
[5] محمد (١٥).
[6] الكهف (٢٩).
[7] الطبري (١٦/٥٤٩).

مَقَمِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾[1] واته: به گورزی ئاسنین لێیان دەدرێت. ﴿وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُ﴾ واته: بێزی لێ دەکاتەوە لەبەر خراپی تام و بۆن و ڕەنگ و گەرمی یان ساردیەکی وا کە ناتوانرێت بخورێتەوە.

﴿وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ واته: لە هەموو لایەکەوە مردنی بۆ دێت، واتە: هەموو جەستەو ئەندام و بەشەکانی لەش ژان دەکات. عەمری کوڕی مەیمون کوڕی مەهران دەڵێ: هەموو جەستەی بە ئێسک و ڕەگ و دەمارەوە ژان دەکات.[2] زەحاك دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ﴿وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾ ئەو جۆرە سزایانەی کە خوای گەورە جەزرەبەی پێ دەدات لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو ئاگری جەهەنەمدا، هیچ جۆرێکیان نیە مەگین مردنێکە بۆی، ئەگەر بمردایە، بەڵام نامرێت، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾* واتە:[3] نە ڕێی مردنیان پێ دەدەن، نە جەزرەبەی جەهەنەمیان لەسەر سوك دەکرێت. مانای قسەکەی ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) ئەوەیە هیچ جۆرێك لەو جۆرە سزایانە نیە مەگین، ئەگەر سزای پێ بدرێت، دەبوایە بمردایە ئەگەر مردن بمایە، بەڵام نامرێت بۆ ئەوەی هەتا هەتایە ئەو سزاو ئێش و ئازارە بەردەوام بچێنرێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ﴾ پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾ جەزرەبەی هەرە بە ژانیش بە دواوەیە واتە: دوای ئەم ژیانە خراپەی تیایەتی سزای زۆر بە ژانیش دەدرێت زۆر توندو تیژترە لەوەی پێشوو، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت و باسی درەختی ژەقنەبووت دەکات، ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾[4] واتە: ئەوە دارێکە لە ناوەڕاستی جەهەنەمەوە دێتە دەرەوە، بەرێك دەدات لە بیچمی کەللەسەرانی شەیاتین، جەهەنەمیەکان ورگیان لێ پڕ دەکەن، پاشان بەسەر خۆراکەکەدا، چڵك و چەپەڵیەکی زۆر گەرم دەخۆنەوە، خوای گەورە باسیان دەکات کە جارێ لە داری ژەقنەبوت دەخۆن و

---

[1] الحج (٢١).

[2] الدر المنثور (١٦/٥).

* الفاطر (٣٦).

[3] الدر المنثور (١٦/٥).

[4] الصافات (٦٤_٦٧).

جارێك لە ئاوەكوڵ، ﴿ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ﴾[1] واتە: پاشان هەر دەگێڕدرێنەوە بۆ ناو جەهەنەم، پەنا بە خوا لەو ژیانە، هەر بەو شێوەیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾[2] واتە: ئەم هەر ئەو جەهەنەمەیە تاوانباران بڕوایان وانەبوو هەیە، لە ناویدا لەناو ئاوەكوڵا دەخولێنەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ﴾[3]

واتە: بەری دارەكەی ژەقنەبوت خواردنی گوناهبارانە، لە شێوەی خڵتەی ڕۆن زەیتون، لەناو سكدا دێتە كوڵ، وەك كوڵینی ئاوی گەرم، بیگرن و ڕای بكێشن بۆ ناوەڕاستی جەهەنەم، پاشان هەر بۆ ئازاردان ئاوەكوڵی بكەن بەسەریدا، دە بیچێژە، تۆیەك كە لە دنیادا گەورەو خاوەن دەسەلات بووی، ئەوە ئەو شتە هاتەدی كە ئێوە لێی بە گومان بوون. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾[4] واتە: ئەوانەی دەستە چەپن، تووش چ نەگبەتیەك هاتوون، وان لەناو گڕە باو ئاوەكوڵدا، چڕە دوكەڵ سێبەریانە، نە فێنكایی تێدا هەیەو نە لە بەری دەحەسێنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ﴾[5] واتە: ئەمە ئاوا، ئەو كەسانەی كە لە ڕێی ئێمە لا دەدەن، دێنەوە شوێنی زۆر خراپ، ناوەڕاستی جەهەنەمە شوێنێكی زۆر نالەبارە، با لەوێدا ئاوەكوڵ و كێم و زوخاو بخۆنەوە، هەر لەم جۆرە جەزرەبانە، چەندین شێوەی تریش هەیە. چەندین تایبەتی تریش هەیە كە بەڵگەن لەسەر سزای جۆراوجۆری ترو دووبارەبوونەوەی و هاووێنەی ئەم سزایانە كە كەس ناتوانێت هەژماری بكات جگە لە خودای گەورە، ئەمەیش پاداشتێكی پڕبەپڕی تاوانەكانیانە، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾[6] واتە: پەروەردگارت غەدر لە عەبدانی ناكات.

---

[1] الصافات (٦٨).

[2] الرحمن (٤٣-٤٤).

[3] الدخان (٤٣-٥٠).

[4] الواقعة (٤١-٤٤).

[5] ص (٥٥-٥٨).

[6] فصلت (٤٦).

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيْءٍۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾ ﴾

**نموونەیەك لە كرداری خوانەناسان**

خوای گەورە نموونەی هێناوەتەوە بۆ كرداری خوانەناسان، ئەوانەی لەگەڵ خوادا شتی تریان پەرستووەو بڕوایان بە پێغەمبەرکانی نەکردووە، ئەو كارانەی كردوویانە لەسەر بنچینەیەكی چاك نەیان هێناوە، لەناو چووەو هەرەسی هێناوە لە كاتێكدا زۆر پێویستیان پێی بووە بەهرەی لێ وەرگرن وەك دەفەرموێت: ﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ﴾ واتە:نمونەی كاروكردەوەی ئەو كەسانەی لە پەروەردگاری خۆیان حاشا دەكەن نموونەیان وەك نموونەی ئەو خۆڵەمێشەیە كە لە ڕۆژی ڕەشەبادا با لێی هەڵكات، واتە: ئەو كارانەی لە دنیادا كردوویانە لە ڕۆژی قیامەتدا كە داوای پاداشت لە خوای گەورە دەكەن، وایان زانیوە كاری چاكیان كردووە، بەڵام هیچ وەدەست نایەنێتو بەدەست بەتاڵی دەمێننەوەو وەك ئەو خۆڵەمێشەیان لێ دێت كە لە ڕۆژێكی ڕەشەبای سەختدا با لێی هەڵكات، هیچ سودێك لە كردارەكانیان وەرناگرن كە لە دنیادا كردوویانە، وەك چۆن بەهرە لە كۆكردنەوەی ئەو خۆڵەكەوەیە وەرناگرن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فِي يَوْمٍ عَاصِفٍۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾ واتە: لە ڕۆژێكی ڕەشەبادا با لێی هەڵكات لەوەیش بە دەستیان هێناوە، ناتوانن سودی لێ وەرگرن. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەیە كە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾[1] واتە: هەر كارێك كردوویانە، ڕای دەماڵین هەروەكو تۆزی بابردوی لێ دەكەین، وە فەرموویەتی: ﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾[2] واتە: هەرچی ئەوان بە ڕیایی لە ژیانی دنیادا لە ماڵی خۆیان دەیبەخشن هەر وەك ئەو سەرماو سۆڵەیە وایە كە دەدات لە كێڵگەی ئەو كەسانەی ناهەقی لە خۆیان دەكەن، لەناوی دەبات، خوا ناهەقی لێ نەكردوون، بەڵام ئەوان ناهەقی لە خۆیان دەكەن. وە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ

---

[1] الفرقان (٢٣).

[2] ال عمران (١١٧).

كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ لَا يَهْدِى الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴾[1] واتە: ئەی خاوەن باوەڕان چاكەكانتان بە منەت كردنو ئازاردان بە فیڕۆ مەدەن، نەچن وەك ئەو كەسانەی كە باوەڕیان بە خواو ڕۆژی قیامەت نیە، بۆ ڕیایی لە ماڵی خۆیان دەبەخشن، ئەم كارەیان لەوە دەكات كە تاتە بەردێكی زۆر لووس هەندێ خۆڵی لەسەرەو بارانی توندی بەركەوێتو بیشتواتەوەو هەر بەردێكی ڕووت بمێنێتەوە، هیچ بەهرەیان لەو بەخشینە دەستگیر نابێتو خودا گرۆی خوانەناسان لە ڕێگە شارەزا ناكات، لەم ئایەتەداو لێرەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴾ واتە: ئا ئەمەیە گومڕابوونی دوور لە ڕاستی. واتە: ئەو هەوڵو كردارەیان دوور بووە لە ڕاستیو هیچ بناغەیەكی نەبووە، بۆیە ئەو پاداشتەیان لە دەستی خۆیان دا كە زۆر پێویستیان پێی بوو بەڕاستی وایە: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴾.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾﴾

**سەلماندنی ژیان لەدوای مردن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ﴾ واتە: تۆ نابینی ئەی موحەمەد (ﷺ) خوای گەورە ئاسمانەكانو زەمینی هەر بۆ ڕاستی دروست كردووە؟ خوای گەورە باسی تواناو دەسەلاتی خۆی دەكات لەسەر زیندووكردنەوەی جەستەو لاشەكان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەویش دروستكردنی ئاسمانەكانو زەمینە كە بەلگەیەكی زۆر گەورەترە لە چاو دروستكردنی مرۆڤدا، ئایا ئەو كەسەی توانیویەتی ئاسمانەكانو زەمین وەدی بێنێت بەو بەرزیو فراوانیو مەزنیەو ئەوەی كە لە نێوانیاندایە لە ئەستێرەی وەستاوو گەڕۆكەوە، وە ئەو هەموو جموجۆڵە جۆراوجۆرەوەو گشت نیشانە گەورانەو ئەو زەویە هەرچی تیایەتی لە تەختاییو دۆڵو كێوی داكوتاو دەشتو بیابانو چۆڵەوانیو دەریاو ڕووبارو دارو درەختو گیاو گژەو زیندەوەرێك بە جیاوازی ڕەنگو شێوەو سوودیانەوە، ناتوانێت لاشەكان زیندوو بكاتەوە، بێگومان دیارە بە ئاسانی خودای مەزن دەتوانێت لاشەكان زیندوو بكاتەوە. وەك لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِىَ الْمَوْتَىٰ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[2] واتە: ئایا ئەوان

---

[1] البقرة (٢٦٤).

[2] الاحقاف (٣٣).

نەیانزانی ئەو خودایەکە ئاسمانەکانو زەمینی وەدی هێناوە، لە وەدی هێنانیشیاندا تووشی ناتەوانی نەبوو، دەتوانێت زیندوویش بکاتەوەو بش مرێنێت، بەڵێ ئەو لەسەر هەموو شت توانای هەیە، وە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[1] واتە: مرۆڤ چۆن ئەوەندە نازانێ، کە ئێمە لە تنۆکێکمان ﴿نُّطْفَةٍ﴾ دروست کردووە، کەچی ئێستا دوژمنێکی ئاشکرایە، ئەو نموونەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوەو دروست بوونی خۆی لەبیرکرد، دەڵێت: ئێسکی لە پاش ڕزانو پووان کێ زیندوویان دەکاتەوە؟ بڵێ: کەسێك یەکەمجار دروستی کردوون، ئەو زیندوویان دەکاتەوە، بۆ هەموو دروست کردنێك خۆی زانایە، ئەو کەسێکە لە داری سەوزی تۆخ ئاگری بۆ پەیدا کردوون، ئێوەیش هەر لەو ئاگر دەکەنەوە، ئایا کەسێك توانای هەبێت ئەم ئاسمانانو زەمینەی دروست کردبێت، توانای نیە وێنەیان دروست بکاتەوە؟ بەڵێ لە توانایدا هەیەو دروستکەری زۆر زانا هەر خۆیەتی، هەر کاتێك هەر شتێکی بوێت پەیدا ببێت، بە فەرمان پێی دەڵێت: ببە، کتوپڕ پەیدا دەبێت، پاکیو بێعەیبی بۆ کەسێك کە هەموو شت لە ژێر فەرمانی ئەودایەو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە. پاشان خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ واتە: ئەگەر خۆی مەیلی لەسەر بێت، ئێوە دەباتو سەر لە نوێ خەڵکی تر دروست دەکات، کە ئەم کارەیش لە لای خودا گران نیە، واتە: قورس نیەو کەس ڕێی لێ ناگرێت بەڵکو زۆر ئاسانە لای ئەگەر بێگوێتیان کرد ئێوە لاببات و سەر لە نوێ خەڵکێکی تر بێنێت وەك ئێوە نەبێت، وەك خوای گەورە لەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾[2] واتە: ئەی خەڵکینە، ئێوە هەژارنو پێویستیتان بە خودا هەیە، هەر خودایە بێ نیازەو مەزنە سوپاس بکرێت، ئەگەر مەیلی لێبێت هەمووتان لەناو دەباتو سەر لە نوێ دەستەیەکی تر دێنێت، ئەمەیش لای خودا گران نیە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ

---

[1] یس (٧٧ـ٨٣).

[2] الفاطر (١٥ـ١٧).

قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴾[1] واتە: ئەگەر پشتیشی تێ بکەن، کۆمەڵێکی تر بە ئێوە دەگۆڕێتەوە، کە هەرگیز لە ئێوە ناچن. وە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾[2] واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، هەر کەسێك لە ئاینی خۆی پەشیمان ببێتەوە، خوا لەمەولا کۆمەڵێکی وا دەخاتە ڕوو، خۆشی بوێن‌و ئەوانیش خوایان خۆش بوێت. وە فەرموویەتی: ﴿إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴾[3] واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر خوا حەز بکات هەمووتان تەفرو تونا دەکات‌و کەسی تر لە جێتان دائەنێت، خودا ئەو کارەی لەدەست دێت.

﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعٗا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ قَالُواْ لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡۖ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ (٢١) ﴾

**مشتومڕی نێوان ئەوانەی شوێن خەڵکی دەکەون خەڵك شوێنیان دەکەوێت لەناوئاگردا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعٗا ﴾ واتە: هەموویان لە لای خوا کۆدەبنەوە، واتە هەموو خەڵکی کۆدەبنەوە بە پیاوچاك‌و بەدفەڕەوە لە لای خودای تاك‌و تەنهای بەهێزو زاڵ، واتە: گشتی کۆدەکرێتەوە لە زەوییەکی والاو فراواندا کە شوێنێکی وایە هیچ شتێکی تیا نیە کەس داپۆشێت‌و بیشارێتەوە، ﴿فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ ﴾ واتە: کەم دەستەکان بە فیز زلەکانیان دەڵێن، واتە: -بێدەسەڵاتەکان ئەوانەی شوێنکەوتووی ئاغاو کاربەدەست‌و گەورەکانیان دەڵێن بە ملهوڕەکانیان ئەوانەی ملیان نەدەدا کە تەنها خودا بپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن‌و دژایەتی پێغەمبەرەکانیان دەکرد- کەم دەستەکان بە خۆبەزلزانەکان دەڵێن: ﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ﴾ واتە: ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین، دەتوانن هیچ لە سزای خودا بمانپارێزن؟ خۆ ئێوە هەر فەرمانێکتان پێ بکردینایە ئێمەبەجێمان دەهێنا، ئایا ئێوە دەتوانن هەندێ لەو سزای خودایمان لە کۆڵ بکەنەوە وەك بەڵێنتان دەداینێ‌و بە هیواتان دەکردین، سەرکردەکانیش ﴿قَالُواْ﴾ دەڵێن: ﴿لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡ﴾ واتە: ئەگەر خودا ئێمەی شارەزا بکردایە، دیارە ئێمەیش ئێوەمان شارەزا دەکردو ئێوەمان لەگەڵ خۆمان دەبرد بەڵام قسەی

---

[1] محمد (٣٨).

[2] المائدة (٥٤).

[3] النساء (١٣٣).

پەروەردگارمان هاتەدی، بڕیاری خودا پێش ئێمەو ئێوەش کەوت، جەزرەبەو سزای سەخت بووە بەشی خوانەناسان ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٍ﴾ واتە: ئێستا بۆ هەموو لایەکمان (لەسەرخۆ بین یان بیکەین بە هاوار هاوار) هیچ دەرەتانێك نەماوە، لەمەی کە تێی کەوتووین ڕزگار بوونمان نیە، خۆڕاگرین یان هاوارو واوەیلا بکەین. من دەڵێم: وا دیارە ئەم مشتو مڕە لەناو ئاگردایە، دوای ئەوەی کە دەخرێنە ناوی ئەمە ڕوودەدات، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ﴾[1] واتە: کە ئەوسا لەناو ئاگر کێشە لەگەڵ یەکتر دەکەن بێهێزەکان بە خاوەنهێزەکان دەڵێن: ئێمە شوێن ئێوە کەوتبووین، ئایا ئێوە پێتان دەکرێت لە جێی ئێمە بەشێگ لەو ئاگرە هەلگرن؟ بەهێزە لەخۆباییەکان دەڵێن: هەموو لە ئاگرداین، بێگومان خودا لە نێوان بەندەکانیدا دادوەری کردووە. وەك فەرموویەتی: ﴿قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴾[2] واتە:دەفەرموێ: دوای ئەو ئومەتانەی کە بەرلە ئێوە لەناو چوون (لە مرۆڤو جنۆکە) بڕۆنە ناو ئاگرەوە، هەر ئومەتێك دەچێتە ناوئاگرەکە نەفرین لە هاوڕەوشتانی دەکات، کاتێك هەموویان لەوێدا کۆبوونەوە، شوێنکەوتووانیان لە بارەی سەرۆکەکانیان دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەوان سەریان لێ شێواندین، دوو ئەوەندە لە ئاگردا ئازاریان بدە، دەفەرموێت بۆ هەمووان دوو چەندانەیە ! بەڵام ئێوە نازانن. سەرۆکەکان بە شوێنکەووەکان دەڵێن: ئێوە هیچتان لە ئێمە زیاتر نیە، دە بچێژن ئازاری ئەو کارانەی وا کردووتانە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴾[3] واتە: ئەی پەروەردگارمان ئێمە دوای ئاغاکانو گەورەکانی خۆمان کەوتین، ئەوان ئێمەیان گومڕا کرد، ئەی پەروەردگاری هەموومان دوو ئەوەندە ئازاریان بدەو زۆر نەفرینیان لێ بکە، بەڵام لە بارەی مشتو مڕیانەوە لە ڕۆژی

---

[1] غافر (٤٧ــ٤٨).

[2] الاعراف (٣٨ــ٣٩).

[3] الاحزاب (٦٧ــ٦٨).

مەحشەردا لەناو خۆیاندا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر تۆ ئەو ناهەقكارانەت پیشانەت بدرایە کە لە بەرامبەر پەروەردگاریانەوە ڕاگیراون هەندێکیان ئاوڕ لە هێندێکیان دەدەنەوەو قسە دەکەن. ئەوانەی بێدەسەلات بوون، بە دەسەلاتدارەکانی دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە بڕوامان دەهێنا، خاوەن دەسەلاتەکانیش بەبێدەسەلاتەکان دەڵێن: ئایا ئێمە بووین نەمانهێشت ئێوە بە ڕێی ڕاستدا بڕۆن، دوای ئەوەی ڕێ پیشاندەرتان بۆ هات؟(نەخێر) بەڵکو ئێوە هەر خۆتان تاوانبارن. پاشان بێدەسەلاتەکان لە وەلامی ئەوانەدا کە خاوەندەسەلاتەکانن دەڵێن: ئێوە بە شەوو بە ڕۆژ هەر گەڕتان پێ دەپێچاین، کە دەبێت خوا نەناسین‌و چەندین هاوتای بۆ پەیدابکەین، کاتێك دەبینن بۆ ئازاردانی، خوانەناسەکان (زنجیر لە ملیان دەکرێت و) ڕادەکێشینە بەردەم لێپرسینەوە،هەموو بە دڵ پەشیمان دەبنەوە، دیارە هەموو کەس هەر لە سەر کردەوەی خۆی سزا دەدرێت.

﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴿٢٣﴾﴾

**وتاری شەیتان بۆ شوێنکەوتووانی و بەهانە هێنانەوەی بۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾ واتە: لە پاش کار لە کار ترازان، شەیتان دەڵێت: خوا بەڵێنی ڕاستی پێدان، منیش بەڵێنی خۆم پێدان‌و درۆم لەگەڵدا کردن، خوا باسی شەیتان دەکات، کە چۆن قسەی لەگەڵ

[1] سبأ (٣١_٣٣).

شوێنکەوتووانی کردووە، دوای ئەوەی کار لە کار ترازاو هیوا بڕاو بوون، خاوەن باوەڕان خرانە بەهەشتو خوانەناسانیش فڕێ درانە ناو قوڵایی جەهەنم، شەیتان (بەر نەفرینی خوا بکەوێت) لەو ڕۆژەدا هەڵدەستێت و ووتاریان بۆ دەدات بۆ ئەوەی زیاتر تووشی دڵگرانیو داخو خەفەتیان بکاتو هەر هەناسە هەڵکێشن، پێیان دەڵێت: خوا بەڵێنی ڕاستی پێدان، لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی ئەمانیش بەڵێنیان دا بە شوێن کەوتووەکانیان کە ڕزگارو سەرفراز دەبن، ئەو بەڵێنو هەواڵانەیش هەقو ڕاست بوون، منیش بەڵێنم پێدان، بەڵام درۆم لەگەڵ کردن وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾[1] واتە: بەڵێ بەڵێنیان پێ دەداتو دەیانخاتە سەر ئارەزوو، ئەو بەڵێنەی کە شەیتان بەوانی دەدا فریودان نەبێت هیچی تر نیە. پاشان شەیتان دەڵێت: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ﴾ واتە: هیچ زۆرێکیشم بەسەرتانەوە نەبوو، واتە: من هیچ بەڵگەیەکم بە دەستەوە نەبوو لەسەر ئەوەی کە ئێوەم بۆ بانگ دەکردو بەڵێنم پێ دەدان، ﴿إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي﴾ واتە: مەگین ئەوە بانگم دەکردنو ئێوەش بە دەنگی منەوە هاتن، واتە: تەنها ئەوە بوو هیچی تر، بەڵام پێغەمبەران بەڵگەو نیشانەی ڕاستو تەواویان پێدەدان لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە بۆیان هێنابوون. کەچی ئێوە دژایەتیتان دەکردن، بۆیە ئێستا ئاواتان بەسەر دێت. ﴿فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنفُسَكُم﴾ واتە: ئەمڕۆ ئێوە لۆمەی من مەکەن وسەرزەنشتی خۆتان بکەن ، چونکە تاوانەکە لە خۆتانەوەیە، لەبەر ئەوەی ئێوە دژایەتی ئەو بەڵگەو نیشانانەتان کردووە کە من بانگم کردن بۆ شتی پڕوپوچو بێسود شوێنم کەوتن، ﴿مَّا أَنَا بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ﴾ واتە:من ناتوانم بە فریاتان کەوم، هەروەك ئێوە ناتوانن بە فریای من بکەون، واتە: من ناتوانم سود بە ئێوە بگەیەنمو ڕزگارتان بکەم لەوەی ئێوەی تێکەوتوون، ئێوەش ناتوانن سود بە من بگەیەننو ڕزگارم بکەن لەو سزاو جەزرەبەی من تێی کەوتووم، ﴿إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ﴾ واتە: لەمەیش کە لە پێشدا منتان بە شەریکی خوا زانی، حاشام کردووە. قەتادە دەڵێت: بە هۆی ئەوەی لە پێشدا منتان بە شەریکی خوا دەزانی.[2] ئیبنو جەریر دەڵێت: شەیتان دەڵێت: من دانم پیانەدەنا کە شەریکی خوای گەورەم.[3] ئەم قسەی ئیبن جەریر بەهێزترە. وەك خوای گەورە

---

[1] النساء (١٢٠).

[2] الطبري (٥٦٤/١٦).

[3] الطبري (٥٦١/١٦).

فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴾[1] واتە: کێ لەو کەسە گومڕاترە، هانا بۆ جگە لە خوا دەبات؟ بۆ کەسێك کە هەتا قیامەت وەڵامی ناداتەوەو هەر ئاگاشیان لە پاڕانەوەیان نیە، کاتێك خەڵکی هەموویان کۆدەکرێنەوە، ئەوان دەبنە دوژمنیان‌و حاشا دەکەن لەوانەی پەرستوویانن.

وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ كَلَّاۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴾[2] واتە: نەخێر، حاشا لە پەرستنیان دەکەن‌و لە دژیشیان ڕادەوەستن، ﴿إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی ستەمکارن ئازاری بە ژانیان دەبێت. لەبەر ئەوەی پشت لە ڕاستی دەکەن‌و شوێنی پڕوپوچ دەکەون، سزای بە ژان دەدرێن، لە ئایەتەکەوە وا دیارە ئەم وتارە، وتاری شەیتان بووە دوای ئەوەی کە چوونەتە ناو ئاگر وەك لە پێشەوە باسمان کرد. عامیری شەعبی دەڵێت: دوو وتاربێژ لەناو ئەو خەڵکەدا هەڵدەسن، خوای گەورە دەفەرمووێت بە عیسای کوڕی مەریەم: ﴿ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾[3] واتە: ئایا تۆ گوتووتە بەو خەڵکە (جگە لە خوا) دەبێت ئێوە من‌و دایکم وەك دوو خودا بپەرستن، هەتا دەگاتە: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژێکە ڕاستەکان ڕاستیەکەیان بەهرەیان پێ دەگەیەنێت. دەڵێت: شەیتانیش هەڵدەسێت (نەفرینی خوای لێبێت) دەڵێت: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ﴾.[4] دوای ئەوەی خوای گەورە باسی پاشەڕۆژو چارەنووسی بەدبەختانی کرد کە چ سەرشۆڕی‌و داماویەکیان بەسەر هات‌و وتاربێژیان شەیتانئەبێت. دێتە سەر باس‌و چارەنووسی بەختەوەران‌و ئەفەرمووێت: ﴿ وَأُدْخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ﴾ واتە: ئەم کەسانەش کە بڕوایان هەیەو ئاکار چاك بوون، بە ئیزنی پەروەردگاریان دەبرێنە ناوەند باغاتێك ڕووباریان بەبەردا دەڕوات‌و تا هەتایە لەوێ دەبن‌و هەرگیز لێی نایەنە دەرەوە، ﴿تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾ واتە: بە سلاوکردن پێشوازی لە یەکتری

[1] الاحقاف (٥-٦).

[2] مريم (٨٢).

[3] المائدة (١١٦-١١٩).

[4] الطبري (١٦/٥٦٢).

دەکەن تێیدا. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ﴾[1] بەرەو بەهەشت بەڕێ کران دەرگا کرایەوەیە بۆیان و کاربەدەستانی بەهەشت پێیان دەڵێن: سڵاوتان لێبێت. وەك فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم﴾[2] واتە: فریشتە لە هەموو لاوە دەچنە لایانو (دەڵێن) هەر لە سایەی هێمنیدا بن، وە فەرموویەتی: ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا﴾[3] واتە: هەر بە درودو سەلامەوە لەگەڵیاندا ڕوویەڕوودەبوونەوە. وە فەرموویەتی: ﴿دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[4] واتە: نزایان لە بەهەشتدا هەر ئەوەیە، خودایە پاکی بۆ تۆیەو سڵاوکردنیان لەو بەهەشتەدا هەر سەلام کردنە لەیەکتری، دواین نزایان هەر ئەمەیە: سوپاس بۆ خوا کە پەروەردگاری هەموو دنیایە.

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾﴾

### نموونەی وتارەکانی ئیسلامو وتارەکانی خوانەناسی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً﴾ واتە: نەت دی خودا چۆن نموونە دەهێنێتەوە ؟کەبریتی یەلە قسەیەکی چاکو بەجێ، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوەئەگێڕێتەوەکەلەتەفسیری ئەم ئایەتەدافەرموویەتی:ئەو وتە شایەتومانە (أشهد أن لا إله الاّ الله)و وەك درەختێکی چاکو پاکە ﴿كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ﴾واتە: خاوەن باوەڕ ﴿أَصْلُهَا ثَابِتٌ﴾ واتە: ڕەگی ئەودرەختە توند داکوتاوەلەدڵی ئیمانداردا، دەڵێت: (لا إله الاّ الله) لەناو دڵی خاوەن باوەڕدایە، ﴿وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: لقی لەناو ئاسمانایە، دەڵێت: کرداری خاوەن باوەڕی پێ بەرز دەکرێتەوە بۆ ناو ئاسمان.[5] زەحجاكو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمەو موجاهیدو کەسانی تریش هەر وایان

---

[1] الزمر (٧٣).

[2] الرعد (٢٣ـ٢٤).

[3] الفرقان (٧٥).

[4] یونس (١٠).

[5] الطبري (٥٦٧/١٦).

وتووە،[١] ئەمەیش بریتیە لە ئاکاری خاوەن باوەڕو قسەی چاكو پاكو کردەوەی باشی. بێگومان خاوەن باوەڕ وەك داری خورما وایە، بەردەوام کردەوە چاکەکانی بەرز دەکرێتەوە لە هەموو کاتو شوێنو ئێوارەو بەیانیەکدا، بوخاری لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە ودەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووین (ﷺ) فەرمووی: (درەختێکم پێ بڵێن کە لە پیاوی موسڵمان بچێت، یان وەك پیاوی موسڵمان وابێت، کە گەڵاکەی لە هاوینو زستاندا نەوەرێت، لە هەموو کاتێکدا بەری خۆی دەبێت بە ئیزنی پەروەردگاری) ئیبنو عومەر وتی: کەوتە دڵم ئەو درەختە دارخورمایە، بینیم ئەبو بەکرو عومەر قسە ناکەن، پێم ناخۆش بوو من قسە بکەم، کاتێك کە هیچیان نەوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە دار خورمایە)، کاتێك کە هەڵسایین وتم بە عومەر: باوکە سوێند بە خوا کەوتە دڵم کە ئەو درەختە دارخورمایە، عومەر وتی: چی ڕێی لێ گرتی قسە بکەی؟ وتم: ئێوەم نەبینی قسە بکەن، پێم ناخۆش بوو من قسە بکەم یان شتێك بڵێم، عومەر وتی: ئەگەر تۆ ئەو قسەت بکردایە لام خۆشتر ئەبوو لە فلان شتو فلان شت.[٢] لە ئیبنو عەباسەوەریوایەت کراوەکە دەڵێت: ﴿كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ﴾ ئەوە درەختێکە لەناو بەهەشتدا.[٣] ﴿تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ﴾ وتراوە: بەری خۆی دەدات بەیانیانو ئێوارانیش، لە ئایەتەکەوە وا دیارە نموونەی خاوەن باوەڕ وەك درەختێك وایە بەردەوام بەری هەبێت، لە هەموو کاتێکدا لە هاوینو زستانو شەوو ڕۆژدا،دەی خاوەن باوەڕیش هەر وایە، بەردەوام ئاکارە چاکەکانی بەرز دەبێتەوە لە کاتی شەوو لە ڕۆژیشدا، لە هەموو کاتو زەمانێکدا، ﴿بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ واتە: بە ئیزنی پەروەردگاریان بە تەواویو چاکیو ئەوریو پاكو پیرۆزی، ﴿وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: خودا نموونە بۆ ئەو خەڵکە دێنێتەوە، بەڵکو پەندی لێ وەربگرن. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ﴾ واتە: نموونەی قسەی نابەجێش وەك بنچکێکی (ڕەگێکی) ناجسنو پیسە کە لە زەوی هەڵکەنرابێت، ئەمە نموونەی کوفرو حاشاکردنی خوانەناسە، نە بنچینەی هەیەو نەخۆشی ڕا دەگرێت، وەك درەختی گوژاڵك وایە، پێی دەگوترێت (الشريان)، شوعبە ڕیوایەتی کردووە لە مەعاویەی کوڕی قوڕڕەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە ئەو درەختە گوژاڵکە.[٤] ﴿ٱجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ ٱلْأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ﴾ واتە: کە لە زەمین

[١] الطبري (٥٧٢/١٦، ٥٧٣).
[٢] فتح الباري (٢٢٨/٨).
[٣] الطبري (٥٧٣/١٦).
[٤] الطبري (٥٦٩/١٦).

هەڵکەنرابێتو هەرخۆی نەگرێت. واتە: نە ڕەگی هەبێتو نە خۆشی ڕابگرێت، هەر بەو جۆرە خوانەناس نەڕەگو ڕیشەی هەیەو نەلقوچڵ، کرداری خوانەناس هەرگیز بەرز نابێتەوەو هیچیشی لێ وەرناگیرێت.

﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ﴾

**قایمکردنی خاوەن باوەڕان بە قسەی بتەو لە دنیاولە دواڕۆژدا**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ واتە: خوا لە دنیاو لە قیامەتدا، بە قسەی بتەو بڕواداران توندو قایم دەکاتـەوە، بوخاری ڕیوایـەتی کـردووە لـە بـەرائی کـوڕی عازیبـەوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) کـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویەتی: (موسڵمان کاتێك پرسیاری لێ دەکرێت لـە گۆڕدا، شـایەتی دا کـە هـیچ پەرسـتراوێك نیـە جگە لە خواو موحەممەدیش پێغەمبـەری خوایـە (ﷺ) ئـەوە (مانـای) ئـەو ئایەتەیـە کـە خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾،[1] موسلیمو هەموو خاوەن موسنەدەکانی تـریش ڕیوایـەتیان کـردووە.[2] ئیمـامی ئەحمـەدیش ڕیوایـەتی کـردووە لـە بەرای کوڕی عازیبەوە دەڵێت: لەخزمەت پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) لەگـەڵ تـەرمی پیـاوێکی ئەنسـاریدا چووینە دەرەوە، هەتا گەیشتینە لای گۆڕەکەی، کاتێك کـە گـۆڕەکـە هەڵدەکـەنرا، وەك ئـەوەی باڵنـدە بەسەرمانەوە نیشتبێتەوە وابووین، (واتە: بێـدەنگ بـوون)، پێغەمبـەر(ص) چیلکەیەکی بـە دەسـتەوە بوو،هەر دەیدا بەناو زەویەکەداو سەری بەرز کردەوەوپاشان فەرمووی: (پەنا بگرن بە خـودا لـە سزای ناو گۆڕ) دووجار یان سێ جارئەمەی فەرموو، پاشان فەرمووی: (بێگومان عەبدی خـاوەن بـاوەڕ کاتێـك لە دنیا بڕاو بەرەو قیامەت ڕۆیشت، فریشتە لـە ئاسمانـەوە دێنـە خـوار بـۆلای، ڕوویـان سـپی و، دەمو چاویان وەك خۆر وایە، کفنیان لە کفنەکانی بەهەشت لەگەڵ خۆیان هێناوە، بۆنی خۆشیشیان لـە بـۆن خۆشی بەهەشت پێیە تا چاو بڕ کات لە لایەوە دادەنیشن، پاشان فریشتەی گیان کێشان دێتو لـە لای سەری دادەنیشێتو دەڵێ: ئەی گیانە پاكو خاوێنەکە وەرە دەرەوە بـۆ لای لێخۆشـبوونو ڕەزامەنـدی خودا! (دەڵێـت) دێتـە دەرەوەو دەڕوات وەك چـۆن دڵۆپێـك ئـاو لـە دەفرێکـی ئـاودا دڵۆپـە دەکـات، فریشتەکە هـەڵی دەگرێـت، کاتێـك هـەڵی گـرت چـاو تروکانێـك لـە دەسـتیدا نایهێڵێتـەوە، هـەتا هـەڵی دەگرێتو دەیخاتە ناو کفنو بۆنە خۆشە، بۆنێکی لێوەدێت لە بۆن خۆشترین بۆنی میسکێك کە لەسەر

---

[1] فتح الباري (٨/٢٢٩).

[2] مسلم (٤/٢٢٠١)، ابو داود (٥/١١٢)، تحفة الاحوزي (٨/٥٤٧)، النسائي في الكبرى (٦/٣٧٢).

زەویدا بوبێت، ،فریشتەکان بەم(گیـان)ەوە ئەچنەوەبۆ ئاسمـان تێپەڕ نـابن پێیـەوە، واتـە: لای هـەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا مەگین دەڵێن: ئا ئەم گیانە پاکە کێیە؟ فریشتەکانیش دەڵێن: فڵانی کوڕی فڵانە، بە جوانترین نـاویێ نـاوی دەبـەن کـە لـە دنیـادا پێیـان گوتـووە تـا دەیگەیەننـە ئاسمـانی دنیـا، داوای کردنەوەی دەرگای بۆ دەکەن، دەرگای بۆ دەکەرێتەوە، لـە هـەموو ئاسمانێکدا، نزیکـەکانی خـودا لـە ئاسماندا بەرێی دەکەن، هەر یەکـەیان بـۆ ئاسمـانی دوای خـۆی هـەتا دەیگەیەننـە ئاسمـانی حەوتـەم، خوای گەورە دەفەرمووێت: نامەی ئەم عەبدەی من بنوسن لە (علیین)و بیگێڕنـەوە بـۆ زەمـین، چـونکە من لەزەوی دروستم کردوون،و دەشیان گێڕمەوە بۆ ناوی،و لەوێش جارێکی تر دەریان دێنمەوە، دەڵێت: گیانەکەی دەچێتەوە ناو لاشەی، دوو فریشتە دێنە لای ولە تەنیشتیەوە دادەنیشن، پێـی دەڵـێن: کـێ پەروەردگارت بووە؟ ئەمیش دەڵێت: (اللّه) پەروەردگارم بووە، پێی دەڵێن: ئاینت چی بووە؟ دەڵێت: ئاینم ئیسلام بووە، پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کێ بوو ڕەوانەکرا لـە نێوانتانـدا؟ دەڵـێ: ئـەوە پێغەمبـەری خوا بوو (ﷺ)، پێی دەڵێن: چۆن دەزانی؟ دەڵێت: کتێبی خودام خوێندەوە بروام پێ هێناو بە ڕاستم زانی، جاڕ دەرێك لە ئاسماندا جاڕ دەدات: بـەڵێ عەبدەکـەم ڕاسـتی کـردووە، ڕاخـەری بـۆ ڕاخـەن لـە فەرشـی بەهەشـتو لـە جلوبـەرگی بەهەشـتی لەبـەر بکـەن، دەرگایـەکی بەهەشتیـشی لـێ بکەنەوە،(ڕاویەکە) دەڵێت: پاشان ئەو خۆش،و بۆن خۆشی بەهەشتەی بۆ دێت،و گۆڕەکـەی بـۆ فـراوان دەکرێت هەتا چاو بڕ بکات، پاشان پیاوێکی ڕوجوان،و جلوبەرگ خاوێن،و بۆن خۆش دێتە لای،و دەڵێت: مژدە بێت بەوەی دڵخۆشت دەکات، ئەمە ئەو ڕۆژەی تۆیە کە بە تەمای بووی، مردووەکە پێی دەڵێت: تۆ کێیت دەم،و چاوی تۆ ئەو دەم،و چاوەیە کە مژدەی ئـەم خێـرەم بـۆ دێنێـت؟ ئـەمیش دەڵێـت: مـن کردارەکـانتم، پیاوەکـەیش دەڵێت: ئـەی پـەروەردگارم قیامـەت هەڵـستێنە! قیامـەت هەڵبـستێنە!، تـا بگەڕێمەوە بۆ لای کەس،و کارومالّ و منالّم. دەڵێت: بەنـدەی خوانەناسیش کاتێك لـە دنیـا دەبڕێت،و بەرەو قیامەت دەڕوات، فریشتە لە ئاسمانەوە دێنـە خـوار دەم،و چاو ڕەش جلوبـەرگی زبـرو خراپیـان پێیـە، هـەتا چـاو بـڕ بکـات لـە لای دادەنیشن، پاشـان فریـشتەی گیان کێشان دێـت لـە لای سـەری دادەنیشێت،و دەڵێت: ئەی گیانی پیس،و چەپەڵ، بێرە دەرەوە بۆ لای تـوڕەیی،و خەشـم،و قینـی خـودا، دەڵێت:لەوکاتە داگیانەکە بڵاودەبێتەوە بـەناو لاشـەو جەستەیدا،جافریشتەکە گیـانی دەردێنێـت، وەك چۆن تەل،و سیخ (شیشی دڕکاوی) لەناو خوری تەڕدا دەردەهێنرێت و هەڵی دەگرێت، کـە هـەڵی گـرت لەناو دەستیدا چاوتروکانێك نایهێڵێتەوە، هەتا دەیخاتە ناو ئەو جلوبەرگە زبرو خراپەوە، بۆنێکی لێـوە دێت کە لە بۆنی پیسترین مردارەوە بووی سەر زەوی ناخۆشتر دەبێت، سەردەکەون پێیەوە، تێناپەڕن بەسەر هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا مەگین دەڵێن: ئەم گیانە پیسەهی کێیە؟ دەڵێن: فڵانـی کـوڕی فڵانـە، بە ناشرینیترین ناوێك کە ناوی براوە لە دنیـادا، داوای کردنـەوەی دەرگـای ئاسمـانی بـۆ دەکـەن، بـۆی

ناکرێتەوە، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾[1] واتە: دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو ناچنە ناو بەهەشتەوە هەتا وشتر بە کونی دەرزیدا نەچێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: نامەکەی بنووسن لە (السجین)دا لەناو زەوی ژێرەوە، گیانەکەی بە توندی فڕێ دەدرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾[2] واتە: هەر کەسێك شەریك بۆ خوا دابنێت، وەك ئەوەیە لە ئاسمانەوە بکەوێتە خوارو باڵندە بیفڕێنێت یان بایەك لە بەرزایەکەوە فڕێی بدات بۆ شوێنێکی دوور. پاشان گیانەکە دەچێتەوە ناو لاچەی، دوو فریشتە دێنە لای لە لای دادەنیشنو پێی دەڵێن: کێ خواتە؟ دەڵێت: ها ها نازانم، پێی دەڵێن: ئاینت چی بوو؟ دەڵێت: ها ها نازانم، پێی دەڵێن: ئەو پیاوەی کە ڕەوانە کرایە لاتان کێ بوو؟ دەڵێت: ها ها نازانم، جاڕچیەك لە ئاسمانەوە جاڕ دەدات کە ئەو عەبدەی من درۆی کرد، جێی بۆ داخەن لە ئاگرو دەرگایەکی ئاگریشی بۆ ناو ئاگر لێ بکەنەوە، لەوێوە گڕەباو گەرمای جەهەنەمی بۆ دێت، گۆڕەکەی بۆ تەنگ دەکرێتەوە هەتا گشت پەراسووەکانی دەچێت بەناو یەکدا، پاشان پیاوێکی ڕوو ناشیرینو جلوبەرگ خراپو ناشیرینو بۆن پیس دێتەلای وپێ ی دەڵێت: مژدەت لێبێت بەوەی کە دلگرانت دەکات، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە تۆ دەت ویست، دەڵێت: باشە تۆ کێیت ڕووی تۆ ڕوویەکە بە شەڕەوە دێت؟ دەڵێت: من کردارە پیسەکانتم، ئەمیش دەڵێت: ئەی پەروەردگارم قیامەت هەڵمەسێنە).[3] ئەبو داودو ئیبنو ماجەیش ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردوە.[4] ئیمامی عەبد ئیبنو حومەید ڕەحمەتی خوا لێبێت، لە موسنەدەکەیدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك عەبد خرایە ناو گۆڕەکەی، هاوەڵەکانی بەجێیان هێشت، ئەو گوێی لە تەقەی نەعلەکانیانە دوو فریشتە دێنە لای دایدەنیشێنو پێی دەڵێن: تۆ چی دەڵێی لە بارەی ئەم پیاوەوە؟ دەڵێت: خاوەن باوەڕ دەڵێت: شایەتی دەدەم کە بەندەی خواو پێغەمبەری خوا بووە، دەڵێت: پێی دەگوترێت: سەیری شوێنی خۆت بکە لە ئاگردا، کە خوا بۆی گۆڕیوی بە شوێنێك لە بەهەشتدا)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەردووکیان دەبینێت)، واتە بەهەشتو جەهەنەمیش دەبینێت، قەتادە دەڵێت: بۆیان گێڕاوینەتەوە کە گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت بە ئەندازەی حەفتا باڵو بۆی پڕ

---

[1] الاعراف (٤٠).

[2] الحج (٣١).

[3] احمد (٢٨٧/٤)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[4] ابو داود (٥٤٦/٣)، النسائي (٧٨/٤)، ابن ماجه (٤٩٤/١)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

دەکرێت لە سەوزایی هەتا ڕۆژی قیامەت.[1] مسلم ئەم فەرموودەیەی لە عوبەیدی کوڕی حومەیدەوە بەو شێوەیە ڕیوایەت کردووە، نەسائیش هێناویەتی لە فەرموودەکەی یوسفی کوڕی موحەمەدی موئەدیبەوە هەر بەو شێوەیە.[2] تیرمزی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك مردوو خرایە ناو گۆڕەکەی (یان فەرمووی یەکێکتان) دوو فریشتەی ڕەش و شین (اسودان أزرقان) یەکێکیان پێی دەگوترێت مونکیر ئەوی تریان نەکیر دێنە سەری و پێی دەڵێن: تۆ چی دەڵێی لە بارەی ئەم پیاوەوە؟ دەڵێت: ئەو بەندەی خواو پێغەمبەری خوا بووە، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو شایەتیش دەدەم کە موحەمەد (ﷺ) بەندەی خواو پێغەمبەری خوایە، فریشتەکان دەڵێن: ئێمە دەمانزانی تۆ هەر ئەمە دەڵێیت، پاشان گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێت حەفتا باڵ بە حەفتا باڵ و بۆی ڕوناك دەکرێتەوە پاشان پێی دەگوترێت: بخەوە، ئەویش دەڵێت: دەڕۆمەوە بۆ لای کەس و کارم هەواڵیان دەدەمێ، فریشتەکان پێی دەڵێن: بخەوە، وەك خەوی ئەو زاوایە (العروس) هیچ کەسێك هەڵی ناسێنێت خۆشەویسترین کەسی خۆی نەبێت. هەتا خوای گەورە زیندووی دەکاتەوە لەو شوێنەی کە تیایەتی. خۆ ئەگەر دووڕوویش بوو دەڵێت: گوێبیستی خەڵکی بووم دەیان وت: منیش وەك ئەوانم دەوت، ئیتر نازانم، فریشتەکان دەڵێن: ئێمە دەمانزانی تۆ هەر ئەمە دەڵێیت، دەوترێت بە زەمین کە بچۆرەوە یەك لێی، زەمینەکەیش دەچێتەوە یەك هەتا پەراسووەکانی دەچێت بەناو یەکدا، بەردەوام جەزرەبە دەدرێت هەتا خوا لەو شوێنەی خۆیدا زیندووی دەکاتەوە).[3] پاشان ترمزی دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە، لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ ئەوە کاتێك کە پێی گوترا لەناو گۆڕەکەیدا کێ پەروەردگارتەو ئاینت کامەیەو پێغەمبەرت کێیە؟ ئەمیش دەڵێت: پەروەردگارم خوایەو ئیسلام ئاینمەو موحەمەدیش پێغەمبەرمە (ﷺ) بە نیشانە ئاشکراکانەوە هات لە لایەن خواوە، بڕوام پێ هێناو بە ڕاستم زانی، پێی دەگوترێت: ڕاستت وتووە، لەسەر ئەمە ژیایت و لەسەر ئەمەش مردی، لەسەریشی زیندوو دەکرێیتەوە).[4] ئیبنو جەریرش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەو مردووە تەپەی نەعلەکانی ئێوە،

[1] المنتخب لعبد بن حُمید (١١٧٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٢٨٧٠)، النسائي (٤/٩٧).

[3] الترمذي (١٠٧١)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[4] الطبري (١٦/٥٩٦).

دەبیستێ کاتێك کە دەگەڕێنەوە لە لای و پشت هەڵدەکەن لێ ی، ئەگەر خاوەن باوەڕ بوویێت، نوێژ لە لای سەریایەو زەکات لە لای ڕاستیەوەیەو ڕۆژوو لای چەپیەوەیەو خێروبیر کردن لە سەدەقەو پەیوەندی خزمایەتی و خێرو چاکەکانی تری لە لای هەردوو قاچیەوەیە، لای سەریەوە دێن، نوێژ دەڵێت: لای منەوە ڕێگا نیە، لای ڕاستیەوە دێن: زەکات دەڵێت: لە لای منەوە ڕێگا نیە، لای چەپیەوە دێن ڕۆژو دەڵێت: لە لای منەوە ڕێکا نیە، لای قاچیەوە دێن: کارە چاکەکان دەڵێن: لە لای ئێمەوە ڕێگای چوونە ژوورەوە نیە، پاشان پێی دەگوترێت: دانیشە، خۆری وانیشان دەدرێت کەلە نزیکی ئاوا بووندابێت، پێی دەگوترێت: ئەوەی لێت دەپرسین پێمان بڵێ: ئەمیش دەڵێت: وازم لێ بێنن هەتا نوێژەکەم دەکەم، پێی دەگوترێت: بێگومان تۆ دوایی دەیکەی، ئەوەی لێت دەپرسین پێمان بڵێ، دەڵێت: لە بارەی چیەوە لێم دەپرسن؟ پێی دەگوترێت: ئایا ئەو پیاوە کە لە ناوتاندا بوو، چی لە بارەیەوە دەڵێیت و(دەزانی) و تۆ چ شایەتیەك دەدەی لەسەری؟ ئەمیش دەڵێت: ئایا مەبەستتان موحەمەدە؟ پێی دەڵێن: بەڵێ، دەڵێت: شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خوایەو بە بەڵگە ئاشکراکانەوە هات بۆ لامان لە لایەن خواوەو بڕوامان پێکرد، پێی دەڵێن: لەسەر ئەوە ژیایت و لەسەر ئەوە مردی و لەسەر ئەوەیش زیندوو دەکرێیتەوە (إن شاءالله)، پاشان گۆڕەکەی حەفتا باڵ بۆ فراوان دەکرێت و ناو گۆڕەکەی بۆ ڕووناك دەکرێتەوەو دەرگایەکی بەهەشتی لێ دەکرێتەوەو پێی دەوترێت: سەیری ئەوە بکە کە خوا بۆی ئامادە کردووی لەناو زەویدا، بەوە زۆرتر هەست بە خۆشی و کامەرانی دەکات. پاشان گیانەکەی دەخرێتە ناو گیانێکی پاکەوە(دەزگایەکی هەناسەدانەوە)[1]، کە باڵدارێکی سەوزە بە درەختی بەهەشتەوە خۆی گرتووە، لاشەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی (یەکەمجار) لێیەوە هاتووە، کە خۆڵە، هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴾،[2] ئیبنو حەییان ڕیوایەتی کردووە، باسی وەڵامی خوانەناس و سزاکەیشی کردووە.[3] عەبدوڕەزاقیش ڕیوایەتی کردووە لە تاوسەوەکە: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ دەڵێت: (لا إاله الاّ الله)یە لە دنیاداو ﴿وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ﴾ لە ڕۆژی دوایشدا لێپرسینەوەی ناو گۆڕە.[4] قەتادە دڵێت: بە نیسبەت ژیانی دنیاوە: لەسەر چاکەو کاری چاك ڕایان دەگرێت، ﴿وَفِي

---

[1] ئەفەرموێ(وتجعل نسمته في النسم الطيّب)،لە(النهايه)دا_ابن الاثير_ئەڵێ (لنسمه)بەمانای هەناسەدان دێت ،بۆیەئێمەش ئەومانایەمانپێدا_والله اعلم_(وەرگێڕ).

[2] الطبري (١٦/٥٩٦).

[3] ابن حيان (٥/٤٥).

[4] عبدالرزاق (٢/٣٤٢).

﴿ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لەناو گۆڕیشدا.[١] هەر بەو شێوەیەش لە زۆر کەسی تری ناو لە زانایانی پێشینەوە ڕیوایەت کراوە[٢].

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلۡ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمۡ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾﴾

**چارەنووسی ئەو کەسەی بەهرەکانی خودا دەگۆڕێتەوە بە خوانەناسی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ﴾ واتە: ئایا نەتدی ئەو کەسانەی ناشوکریان لە بەرامبەر چاکەی خوادا کردووەو گەلی خۆیان بەرەو هەڵدێری گەورە بردووە. بوخاری دەڵێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا﴾ واتە: ئایا نازانی. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ﴾[٣] واتە: ئایا نازانی چۆن یان: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَهُمۡ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ﴾[٤] واتە: ئایا نەتدی بە هەزاران لەو کەسانەی ترسی مردن وای لێکردن زێدی خۆیان بەجێ بێڵن؟ ﴿ٱلۡبَوَارِ﴾ واتە: هەڵدێر،ئەوتریٚ (بارَ يَبورُ بَوراً). خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَكَانُواْ قَوۡمَۢا بُورٗا﴾[٥] واتە: بوونە گەلێکی بێخێر، عەلی کوڕی عبدالله و سوفیان بۆیان گێراینەوە لە عەمری کوڕی عەتاوەکە لە ئیبنو عەباسی بیستووە: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا﴾ دەڵێت: ئەوانە خوانەناسانی خەڵکی مەککەن.[٦] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبی توفەیلەوە کە ئیبنو کەواء لە عەلی پرسیەوە لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ﴾ئەویش لەوەڵامدا وتویەتی: ئەوانەبریتین خوانەناسانی قورەیش لە ڕۆژی بەدردا.[٧] وە دەڵێت: خوانەناسانی قورەیش بەهرەی خوایان بۆ هات کە باوەڕە، شوکریان نەکردو ئەو بەهرەیان گۆڕی بە خوانەناسی،

---

[١] الطبري (٦٠٢/١٦).

[٢] الطبري (٦٠٢/١٦).

[٣] الفيل (١).

[٤] البقرة (٢٤٣).

[٥] الفرقان (١٨).

[٦] فتح الباري (٢٢٩/٨).

[٧] الطبري (٦/١٧).

گەلی خۆیان بەرەو هەڵدێر برد، دیارە ماناکە هەموو خوانەناسێك دەگرێتەوە، چونکە خوای گەورە موحەمەدی (ﷺ) ڕەوانەکرد کە ڕەحمەت بێت بۆ هەموو جیهان، بەهرەیە بۆ هەموو خەڵکی هەر کەسێك وەری گرتو شوکرانەی خوای کرد چووەتە بەهەشتو هەر کەسیش وەری نەگرتو حاشای کرد چووەتە ناو ئاگر، ﴿ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ ﴾ واتە: لە دۆزەخدا هەڵدەچۆقێن و پیسترین شوێنیان هەیە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا عَن سَبِيلِهِ ﴾ واتە: شەریکیان بۆ خوا بڕیار دا، تا خەڵکی لە ڕێی خوا لادەن، واتە: هاوتایان بۆ خوا داناو لەگەڵیدا دەیانپەرست، بانگی خەڵکیشیان دەکرد بۆ پەرستنی ئەوشتە، خوای گەورە هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەیان ترسێنێت کە تووشی چارەنووسێکی زۆر خراپ دەبنو لەسەر زمانی پێغەمبەرکەی (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿قُلْ تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ ﴾ واتە: بڵێ: خۆش ڕابوێرن، چارەنووستان ئاگر دەبێت. واتە: هەرچیتان لە دەست دێت درێغی مەکەنو بیکەن لە دنیادا، ﴿فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ ﴾ واتە: شوێنو چارەنووستان هەر ئاگرە کە گەڕانەوە بۆ لای ئێمە. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾[1] واتە: وا دەکەین کەمێك ڕابوێرن، پاشان ناچار بەرەو ئاگری دژواریان ڕادەکێشین. وەك فەرموویەتی: ﴿ مَتَاعٌ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ الْعَذَابَ الشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا يَكْفُرُونَ ﴾[2] واتە: ڕابواردنێکی کەمە لە دنیادا، لە دواییدا دەگەڕێنەوە بۆ لامان لە پاش ئەوە، لەسەر سزای حاشا کردنیان بە توندی ئازاریان دەدەین.

﴿ قُل لِّعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا يُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَالٌ (٣١) ﴾

### فەرماندان بە نوێژکردنو ماڵ بەخشین

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُل لِّعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا يُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾ واتە: تۆ بە بەندە باوەڕدارەکانم بڵێ: نوێژ بکەنو لەو ڕۆزیەی بەشمان داون (پەنامەکیو بە ئاشکرا) خێر بکەن. خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە گوێڕایەڵی بنو هەڵسن بە خواپەرستیو چاکە لەگەڵ خەڵکیشدا بکەنو نوێژ بکەن کە بریتیە لە پەرستنی خوا بە تەنهاو شەریکی

---

[1] لقمان (٢٤).

[2] یونس (٧٠).

بۆ پەیدا نەکەن، لەو بژێویەش خوا پێی داون زەکات بدەن‌و پێویستی کەس‌و کاری لێ دەرکەن‌و خێریشی لێ بکەن‌و بیدەن بە خەڵکی تریش، مەبەست بە نوێژکردن، پارێزگاری لێ کردنیەتی، لە کات‌و سنووری خۆیداو بە کڕنوش‌و گەردنکەچی‌و سوژدەی ڕێك‌و پێکەوە بێت، وە فەرمانیشی کردوە بە بەخشینی ئەو ماڵەی کە داویەتی بە نهێنی‌و بە ئاشکرا، وە زۆر پەلە بکەن بۆ ئەو ماڵ بەخشینە بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆیان، ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ﴾ واتە: پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت، کە نە کڕین‌و فرۆشتنی تێدایەو نە دۆستایەتی‌و هاوەڵی، واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژی قیامەتە کە سەرانە لە کەس وەرناگیرێت کە خۆی بکڕێتەوەو ڕزگاری بکات، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُؤۡخَذُ مِنكُمۡ فِدۡيَةٞ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾[1] واتە: ئیتر ئەمڕۆ نە لە ئێوەو نە لەوانەی خوانەناس بوون سەرانەتان لێ وەرناگیرێت. وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا خِلَٰلٌ﴾ ئیبنو جەریر دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت لەوێدا دۆستایەتی دۆستان هیچ دادێك نادات‌و ناتوانێت چاوپۆشی لەو تۆڵەیە بکات کە تووشی ئەوانە دەبێت لەسەر تاوانەکانیان. بەڵکو ئەو ڕۆژە ڕۆژی دادو دادپەروەری‌و ڕاستیە، ﴿خِلَٰلٌ﴾ مەسدەرە وەك گوتراوە، (خاللتُ فلاناً، فأنا أخالُه مخالّة وخِلالاً)[2] ئەمانە بە مانای دۆستایەتی‌و هاوەڵایەتی دێن، قەتادە دەڵێت: بێگومان خوای گەورە زانیویەتی کە لە دنیادا مامەڵەو تێکەڵاوی‌و هاوڕێیەتی بووە، با ئەو کەسە سەیر بکات دۆستایەتی کێ دەکات‌و لەبەر چی دەیکات، ئەگەر لەبەر خوا کردوویەتی، با بەردەوام بێت لەسەری. ئەگەر لەبەر خوا نەبووە، زۆر نابات دەپچڕێت.[3] منیش دەڵێم:مەبەست لەمە ئەوەیە، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە کڕین‌و فرۆشتن‌و هیچ بریتیەك‌و بارتەقایەك سودی نیە بۆ کەس، با ئەگەر پڕی زەوی زێڕ وەدەست بێنێت‌و بیدات بۆ ئەوەی ڕزگاری ببێت، دۆستایەتی و لالانەوەی کەسیش کەڵکی نیە، ئەگەر بە خوانەناسی بگاتە لای خوا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾[4] واتە: دەی بترسن لەو ڕۆژەی کە ڕۆژێکە کەس لە بری کەس پاداشت نادرێتەوەو تۆڵەی لێ ناسێنرێت‌و کڕینەوە لەو ڕۆژەدا باوی نیەو تکاکاری بەهرە نادات، کەسیش بە هانای کەسەوە نایەت، وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا

---

[1] الحديد (١٥).

[2] الطبري (١٢/١٧).

[3] الطبري (١٢/١٧).

[4] البقرة (١٢٣).

بَيۡعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌۗ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾[1] واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان لەو ڕۆزیەی کە پێم داون ببیەخشن پێش ئەوەی ڕۆژەیك بێت، کە ئەو ڕۆژە نە کڕینو فرۆشتن دەمێنێتو نە تکاو نە دۆستایەتی، خوانەناسان ناهەقی لە خۆیان دەکەن.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ لِتَجۡرِيَ فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلۡتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ ﴿٣٤﴾ ﴾

**باسی هەندێ لە بەهرەکانی خوای گەورە.**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ لِتَجۡرِيَ فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ ﴾ واتە: ئەو خوایەی ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردووە لە ئاسمانەوە ئاوێکی داباراندووە، بەروبووم و ڕۆزی ئێوەی پێ دەربێنێت، کەشتیشی بۆ ڕام هێناون (کە بە پێی فەرمانی ئەو) لە زەویدا بێتو بچێتو ئەم هەموو ڕووبارانەشی بۆ ڕام کردوون. خوای گەورە بەهرەکانی خۆی دەژمێرێت کە داوێتی بە بەندەکانی، لەوانە ئاسمانەکانی بەسەریانەوە وەستاندووەو پارێزگاری لێ دەکات، زەمینیشی بۆ ڕاخستوون، بارانیشیان لە ئاسمانەوە بۆ باراندوون کە هەموو جۆرە ڕووەکێکی بۆ دەرهێناون لە میوەو کشتوکاڵی هەمەچەشن لە تامو بۆنو ڕەنگو کەڵکدا، کەشتی بۆ ڕام هێناونو وای لێکردووە دێتو دەچێت لە ناو شەپۆلی ئاوی دەریادا بەفەرمانی خودا، دەریاشی ڕام کردووە ئەو کەشتیە هەڵدەگرێت، تا ڕێبواران لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر پێی بڕۆنو ئەو ماوەیەی پێ ببڕن بۆ گواستنەوەی ئەو شتانەی لای خۆیانە بۆ ئەو هەرێمەو هێنانی ئەو شتانەش لەوێ هەیە بۆ لای خۆیان، ڕووبارەکانیشی بۆ ڕام کردووە زەوی لەت بکات (لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر)، بۆ بژێوی بەندەکانو خواردنەوەو بەکارهێنانی بۆ ئاودانی کشتوکاڵو بۆ چەندین شتی بەسودی تریش، ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ﴾ واتە: خۆرو مانگی بۆ ئێوە خستووتەکارو وچان نادەنو وەستانیان نیە، ئەو شەوگارو ڕۆژگارەیشی هەر بۆ ئێوە دەستەمۆکرد، وە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی:

---

[1] البقرة (٢٥٤).

﴿لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ﴾[1] واتە: نە خۆر توانای ئەوەی هەیە بگا بە مانگ، نە شەو پێش ڕۆژ دەکەوێت هەمووشیان لە ئاسمانێك مەلە دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَ يَطۡلُبُهُۥ حَثِيثٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۢ بِأَمۡرِهِۦٓۗ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[2] واتە: ڕۆژ بە شەو دادەپۆشێتو ڕۆژیش بە خێرایی دەکەوێتە شوێنی شەو. خۆرو مانگو ئەستێرەکانی وەدی هێناوە هەر لە ژێر فەرمانی ئەو دان، بزانن کە وەدی هێنانو فەرماندان هەر بۆ ئەوە، پاكو پیرۆزە ئەم خودایە کە پەروەردگاری گشت جیهانە. واتە: مانگو خۆر بە دوای یەکدا دێن، شەو ڕۆژیش ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، جارێك ڕۆژ لە شەو هەڵدەگرێتو درێژ دەبێتو جارێك شەو لە ڕۆژ هەڵدەگرێتو درێژ دەبێت و ڕۆژ کورت دەبێتەوە، ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ﴾[3] واتە: شەو دەخاتە ناو ڕۆژەوەو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەوەوە، خۆرو مانگیشی ڕام کرد هەریەکەیان هەتا کاتی دیاریکراو دێنو دەچن، پاشان خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلۡتُمُوهُۚ﴾ واتە: هەرچی لێتان داواکراوە پێی داون، ئەگەر بێنە سەر ژماردنی چاکەکانی خوا، ناتوانن ژمارەی بکەن، خوای گەورە دەفەرمووێت کە هەموو پێویستیەکی بۆ ئامادە کردوون کە داوایان کردبێت بۆ بەڕێکردنی ژیانیان لە هەموو کاتێکدا، وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَظَلُومٞ كَفَّارٞ﴾ واتە: ئەگەر بێنە سەر ژماردنی چاکەی خوا ناتوانن ژمارەی بکەن، بە ڕاستی مرۆڤ زۆر ستەمکارو سپڵەیە. خوای گەورە باسی لاوازیو بێ توانایی بەندەکانی دەکات کە هەرگیز ناتوانن بەهرەکانی خودا ژمارە بکەن، ئیتر چۆن دەتوانن هەڵسن بە شوکرانەبژێری بەهرەکانی، لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خودایە! سوپاس بۆ تۆلەسەر (بەهرەکانت) کەبەڕاستی هاوتاش ناوەستێ لەگەڵیاندا،ناشگەینەئەو سەریان، بەهرەکانی ئیمەت لا زیاد نەبێت، ئەی پەروەردگارمان).[4] لەئەسەردا ڕیوایەت کراوە لە داودەوە (سەلامی خوای لێبێت)

---

[1] یس (٤٠).

[2] الاعراف (٥٤).

[3] الفاطر (١٣).

[4] فتح الباري (٩/٤٩٣).

فەرموویەتی: ئەی خودایە چۆن شوکرت بکەم، شوکرانەبژێری من بەهرەیەکە تۆ داوتە بە من؟ خوای گەورە فەرمووی: ئێستابەڕاستی شوکری منت کرد ئەی داود!واتە: کاتێك کە دانت نا بەو کەمو کورییەتدا لە بەجێهێنانی شوکرانەبژێری ئەو کەسەی بەهرەی پێدای.

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ ﴾

**پاڕانەوەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك کە ئیسماعیلی لە مەککە دانا**

خوای گەورە لێرەدا بەڵگەی هێناوەتەوە بۆ عەرەبە بتپەرستەکان کە ئەم شارە پیرۆزەی مەککە کاتێك دروست کرا، یەکەمجار تەنها بۆ عیبادەتی خودا دانرا کە شەریکی نیە، بێگومان ئەو ئیبراهیمەی کە بە هۆی ئەوەوە ئەو شوێنە ئاوەدان کرایەوەو منداڵو خێزانەکەی لەوێ دانا، بەرائەتی خۆی ڕاگەیاند لەو کەسەی کە غەیری خوای پەرستووە. داوای هێمنیشی بۆ مەککە کرد، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴾ واتە: کاتێك کە ئیبراهیم وتی: پەروەردگار هێمنایەتی بدە بەم شارە، خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾[1] واتە: یەکەمین ماڵ کە بۆ مەردم سازکراوە، هەر ئەوەیە وا لە مەککە، کە زۆر بە پیتو پیرۆزەو نیشانەی خواناسینە، بۆ هەموو خەڵکی دنیا،چەندین بەڵگەی ڕۆشن لەوێدا هەیە ،کە شوێنەواری ئیبراهیمە،و هەر کەسێك بچێتەناوی وپەنای بۆببات، نابێت بترسێنرێت. وە لەم بەسەرهاتەیشدا فەرموویەتی: ﴿رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴾ واتە: ئیبراهیم داوای لە خودا کردووە کە هێمنایەتی بدات بەم شارە،شارەکەی بەناسراوناوی بردووە ، چونکە دوای دروستکردنی بەم دوعایە پاڕاوەتەوە.هەر بۆیە فەرموویەتی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ﴾[2] واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە پیری ئیسماعیلو ئیسحاقی بە من بەخشیوە.دەی خۆ دیارە کە ئیسماعیل سیانزە ساڵ لە ئیسحاق بە تەمەن تر بووە، بەڵام کاتێك کە ئیسماعیلو دایکی لەگەڵ خۆیدا بردە مەککە منداڵێکی شیرەخۆر بوو، دیسان ئیبراهیم دوعای کردەوەو وتویەتی: ﴿رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا ﴾ وەك لە سورەتی (البقرة)دا بە درێژی باسمان کرد، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ

[1] ال عمران (٩٦ـ٩٧).

[2] ابراهیم (٣٩).

ٱلْأَصْنَامَ ﴾ واتە: خۆم‌و منداڵەکانیشم لە بتپەرستی دوورخەوە. ئەرکی سەرشانی هەموو بانگ خوازێکەکەئەم دوعایە بکات بۆ خۆی‌و دایك‌و باوك‌و منداڵەکانی. پاشان باسی ئەوە دەکات کە خەڵکی بە هۆی بتپەرستیەوە تووشی بەلا هاتوون، ئیبراهیم دوورەپەرێزی خۆی ڕادەگەیەنێت لەوانەی کە پەرستوویانە، کاروباری ئەوانەی گێڕاوەتەوە بۆ لای خوا، ئەگەر خوا حەز بکات سزایان دەدات‌و مەیلی لە هەر کەسیش بێت لێی خۆش دەبێت، وەك خوای گەورە لەسەر زمانی عیسا فەرموویەتی: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾[1] واتە: ئەگەر بتەوێ ئازاریان بدەی،ئەوە بەندەی خۆتن، ئەگەر بشتەوێ لێیان خۆش بیت، خۆت دەزانی‌و هەر خۆتی کە دەسەڵاتت بە دەستەو کارزانی.مەبەست بە ئەمە تەنها سەلماندی مەیلی خوایەو بەس، نەك ئەوەی خواکاری وادەکات ، لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە ڕوایەت کراوەکەپێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم قسەی ئیبراهیمی خوێندەوە کە خوای گەورە فەرمووێت: ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: پەروەردگارم ئەو بتانە خەڵکی زۆریان لە ڕێ لادا، سا هەر کەسێك شوێنی من کەوت، ئەوە لە منەو، هەر کەسیش لێم یاخی بوو، ئەوسا تۆ لێبوردەی دلۆڤانی، وە ئەم قسەی عیسایش: ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾[2] واتە: ئەگەر سزایان بدەیت ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن وە ئەگەر لێشیان خۆش بیت ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بە دەسەڵات‌و کاردروست. پاش ئەم دووئایەتە دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی: (ئەی خودایە ئومەتەکەم، ئەی خودایە ئومەتەکەم، ئەی خودایە ئومەتەکەم)و گریا، خوای گەورە فەرمووی: ئەی جوبرەئیل بچۆ بۆ لای موحەمەد (ﷺ) ـ پەروەردگارت باشتر دەزانێت ـ لێی بپرسە چی دەتگرێنێت؟ جوبەرئیل هات بۆ لای (سەلامی خوای لێبێت) لێی پرسی، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەوەی گوتی بۆی باس کرد، خوای گەورە فەرمووی: بڕۆ بۆ لای موحەمەدو پێی بڵێ: ئێمە لەمەودوا ڕازیت دەکەین لە بارەی ئومەتەکەتەوەو دلگرانت ناکەین[3].

﴿رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾﴾

---

[1] المائدة (١١٨).

[2] المائدة (١١٨).

[3] مسلم (١/١٩١).

خوای گەورە لەسەرزمانی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ﴾ واتە: پەروەردگاری هەموومان من لەناو شیوێکی بێ کشتوکاڵ لە پەنا ماڵی پیرۆزت یەکێك لە منداڵەکانم نیشتەجێ کردووە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەئەمە دوعای دووهەمیەتی دوای دوعای یەکەمی کە کردی کاتێك کە هاجەرو کوڕەکەی بەجێ هێشت، دوعای یەکەمیان لەپێش دروست کردنی ماڵی خوا، بەڵام ئەمەیان دوای دروست کردنی بووە.[1] کە جەختی کردووەتەوەلەسەرنزای یەکەم و حەزی لە نزیك بوونەوە بووە لە خوای گەورە، بۆیە وتویەتی: ﴿عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی کە نوێژ بکەن، ئیبنو جەریر دەڵێت: ئەم دەقە پەیوەندی بە ﴿ٱلۡمُحَرَّمِ﴾وە هەیە واتە: بۆیە پیرۆزت کردووە بۆ ئەوەی خەڵکەکەی بتوانن نوێژ بکەن، ﴿ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ﴾ واتە: بەڵکو دڵی خەڵکێك وا لێ بکەیت سۆزیان ببێت بۆ لایان. ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو سەعدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریش وتویانە: ئەگەر ئیبراهیم بیفەرمووایە (أفئدة الناس)ئەوە فارس‌و ڕۆم‌و جوولەکەو گاور هەموو ڕوویان تێئەکردو لەسەری کۆدەبوونەوە.[2] بەڵام فەرموویەتی: ﴿مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾هەندێ لەخەڵکی،یانی: تایبەتی کردووە بە موسڵمانانەوە. ﴿وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ واتە: لە بژێویش بەشیان بدە، بۆ ئەوەی یارمەتی دەرێك بێت بۆ پەرستنی تۆ، خوای گەورە ئەو دوعایەی لێ قبوڵ کرد وەك فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنٗا يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ رِّزۡقٗا مِّن لَّدُنَّا﴾[3] واتە: ئایا ئێمە لە شوێنێکی هێمندا نیشتەجێمان نەکردوون، کە هەموو جۆرە بەروبوومێکیان بۆ دەنێرین، ئەم ڕۆزیەش لە لایەن ئێمەوەیە؟ ئەمەیش لە سۆزو ڕێزو بەزەیی‌و بەرەکەتی خوداوەیە، چونکە مەککەی پیرۆز هیچ درەختێکی نەبوو، بۆیە لە دەوری خۆیەوە میوەو بەروبوومی بۆ دەڕوا ئەمەش هەموو بەهۆی قەبوڵ بوونی دوعاکەی ئیبراهیمی خەلیلەوە بووە (سەلامی خوای لێبێت) ﴿لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾ واتە: بەڵکو سوپاسی تۆ بکەن.

---

[1] فەرموودەکەی بوخاری (٣٣٦٢) ئەوە دەگەیەنێت، بەڵکو بە ڕوونی دیارە کە ئیبراهیم لە جاری یەکەمدا کە هاتووەتە مەککەو ئیسماعیلی بە شیرەخۆری بەجێ هێشتووە تێیدا، ئەم دوعایەی کردووە.

[2] الطبري (١٧/١٢٥، ٢٦.

[3] القصص (٥٧).

﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ﴿٤١﴾﴾

خوای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُۗ وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ پەروەرێنمان هەرچی نهێنیو ئاشکرای ئێمە هەیە تۆ دەیزانیو هەرچیەك لە زەوی‌و ئاسماندا هەیە هیچی لە خوا گوم نابێت. ئیبنو جەریر دەڵێت: خوای گەورە باسی ئیبراهیمی خەلیل دەکاتو لەسەر زمانی ئەو فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعۡلَمُ مَا نُخۡفِي وَمَا نُعۡلِنُ﴾ واتە: تۆ نیازی من دەزانی لە نزاکەمدا، وە چیم مەبەست بووە لە نزاکەمدا بۆ خەڵکی ئەم شارە، بە ڕاستی تەنها نیازم ڕەزامەندی تۆو دڵپاکی خۆم بووە بەرامبەر تۆ، تۆ ئاگاداری هەموو شتێکی چ ئاشکراو چ نهێنی بێت، هیچ شتێکت لێ ون نابێت نە لە زەمینو نە لە ئاسماندا، پاشان ئیبراهیم سوپاسی خوای گەورە دەکات لەسەر ئەو منداڵەی پێی بەخشیوە دوای ئەوەی کە پیر بووەو، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى ٱلۡكِبَرِ إِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴾ واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایە کە بە پیری ئیسماعیلو ئیسحاقی بە من بەخشیوە. پەروەردەم نزای نزاکار دەبیستێ. واتە: وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە لێی دەپاڕێنەوە، ئەوەتا من داوای منداڵم لێکرد پێی بەخشیم، پاشان دەڵێت: وەك خوا دەفەرموێت: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ﴾ واتە: پەروەردەم وا بکە منیشو منداڵەکانیشم سوور بنو بەردەوام بن لەسەر نوێژکردن پەروەردەمان دوعاکەم قبوڵ بکە، واتە: وام لێ بکە پارێزگاری لە نوێژەکانم بکەم، بە چاکی سنوورەکانی بەجێ بێنم، منداڵەکانیشم هەر بەو شێوەیە پارێزگاری لێ بکەن، خودایە هەموو نزاکانم لێ وەربگرە کە لێم داوا کردووی، ﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ﴾ واتە: پەروەردەمان لە منیشو دایكو بابم خۆش بە، ئەم دوعایە لە پێش ئەوەدا بوو کە دوورە پەرێزی خۆی لە باوکیڕابگەیەنێت،بەڵام کاتێك بۆی دەرکەوت دوژمنایەتی خودا دەکات، لێی دوورکەوتەوە، ﴿وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: وە لە هەموو خاوەن باوەڕانیش خۆش بە، ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ﴾ واتە:لەو ڕۆژەدا کەژماردن دائەمەزرێت . واتە: ڕۆژێك کە لێپرسینەوە لە عەبدەکانت دەکەی لەسەر کردارەکانیان پاداشتمان دەدەیتەوە چاکە بە چاکەو خراپەیش بە سزادان.

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ ﴾

**چاوپۆشی خودا له خوانەناسان لەدونیادالە بێئاگایەوە نیه**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ واته: وامەزانه خودا له کرداری ستەمکاران بێ ئاگایه، خوای گەورە دەفەرمووێت به پێغەمبەر(ﷺ) ئەی موحەمەد وا مەزانه خودا له هەڵسوکەوتی زاڵمان ئاگادار نیه، واته: که دوایان دەخات و مۆڵەتیان دەدات ئیتر وازی لێ هێناون و لێیان ناپرسێتەوەو تۆڵەیان لێ ناسێنێت، بەڵکو هەموویان لەسەر دەژمێرێت و تۆماری دەکات، ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ واته: بەڵکو دەیانهێڵێتەوە تا ئەو ڕۆژەی که لەوێدا هەموو چاوەکان ئەبلەق دەوەستن،یانی: له توندیو نارەحەتی ڕۆژی قیامەتدا، پاشان خوای گەورە باسی چۆنێتی هاتنە دەرەوەیان دەکات لەناو گۆڕەکانیاندا که چەندە پەلەیانە بۆ وەستان له ڕۆژی مەحشەردا دەفەرمووێت: ﴿مُهْطِعِينَ﴾ واته: له ترسا به پەله دەچن. وەك له ئایەتی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾[1] واته: به پەله بەرەو بانگدەرەکە دەچن. وە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾[2] واته: لەو ڕۆژەدا به دەم کەسێکەوە دەچن، که به هیچ لایەکدا خوار نیه (لار نیه) لەبەر خوا هەموو دەنگێك نەوی دەبێت، چفەچف نەبێت هیچ نابیسن. وە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا ﴾[3] واته: ئەو ڕۆژەی له گۆڕستان دێنه دەرێ زۆر به پەله. ﴿مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ﴾ واته: سەرو ملیان ڕەق بووە، ئیبنو عەباس و موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: سەریان بەرز کردووەتەوە.[4] ﴿لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ﴾ واته: چاوەکانیان ناتروکێنن، واته: چاویان زەق بووەو دەرپەڕیووە بەردەوام دەڕوانن و ساتێك چاو ناتروکێنن، له ترسی ئەو نارەحەتیە گەورەی که تێی کەوتوون، هۆشیان لای خۆیان نەماوەو دڵیان داکەوتووە. پەنا دەگرین به خوای گەورە لەو حاڵەی ئەوانە تێیدان، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ﴾ واته: دڵیان بەتاڵ و وەتاڵە. واته: دڵیان داکەوتووە و چۆڵەو هیچی تیا نیه، له ترس و

[1] القمر (٨).

[2] طه (١٠٨).

[3] المعارج (٤٣).

[4] الطبري (١٧/٣١، ٣٢).

لەرزدا، بۆیە قەتادەو کۆمەڵێك لە زانایانی پێشینە دەڵێن: شوێنەکانی دڵەکانیان چۆڵە، چونکە دڵەکانیان هاتووەتە قورقوڕاگەیان ولەترساندا لە شوێنەکانی خۆیان دەرچوون[1].

﴿ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ ﴿٤٦﴾ ﴾

**دوای هاتنی سزا هیچ مۆڵەتێك نامێنێ**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ﴾ واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ)ئەو خەڵکە بترسێنە لەو ڕۆژەی سزا دەدرێن تێیدا، ستەمکاران دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، تۆ هەر کەمێك مۆڵەتمان بدە تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوەو شوێنی پێغەمبەران بکەوین، خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە ناهەقییان لە خۆیان کردووە کاتێك لە ڕۆژی قیامەتدا سزا دەدرێن دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ﴾[2] واتە: ئەوانە هەر وان کاتێك کە (مردن) یەخەی یەکێکیان دەگرێت، ئەوسا دەڵێت: ئەی پەروەرندەم بمگێڕەوە، بەڵکو ئەو کارە چاکەی کە نەمدەکرد، ئەمجارە بیکەم وەك فەرموویەتی: ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾[3] واتە: لەو ڕۆزیەی کە ئێمە پێمان بەخشیون، هەندێکی بدەن لە ڕێی خودا، بەر لەوەی یەکێك لە ئێوە مردن یەخەی بگرێت و بڵێت: ئەی پەروەرندەم، بۆچی تا ماوەیەکی نزیك مۆڵەتت نەدام، تا خێر بکەم و لە ڕیزی کار چاکەکان بم؟ خوای گەورە باسی حاڵ و ژیانی تاوانباران دەکات لە کاتێکدا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوەو دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا

---

[1] الطبري (١٧/٣٤).

[2] المؤمنون (٩٩ـ١٠٠).

[3] المنافقون (١٠).

وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾[1] واتە: كاتێك تۆ تاوانباران بە سەرشۆڕی دەبینی، كە لە لای پەروەردگاریانن، دەڵێن: ئەی پەروەردگاری هەموومان، بینیمانو بیستمانو تەواو باوەڕمان هێناوە، سا تۆ بمانگەڕێنەوە، ئەمجارە كاری چاك دەكەین. وەهەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾[2] واتە: ئەگەر دوایی بیانبینی كە لەسەر كەناری ئاگر ڕاگیراون، دەڵێن: خۆزگە دیسان دەیانگێڕاینەوە، ئەوسا بە نیشانەكانی پەروەردگارمان بڕوامان دەكردو ئێمەیش لە ڕیزی خاوەن باوەڕان دەبووین. وە فەرموویەتی: ﴿وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ﴾[3] واتە: هاوار دەكەنو دەگرینو دەپاڕێنەوە: پەروەردگارمان! لە جەهەننەم دەرمان بێنە لە ئاكاری پێشوو پەشیمان بووینەوە، ئەمجارە كاری چاك دەكەین، خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە لەسەر ئەو قسانەی دەیكەنو دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ﴾ واتە: ئایا ئێوە نەبوون كە لە پێشدا سوێندتان دەخوارد كە هەرگیز لەناو ناچن؟ هەر لەسەر ئەو ژیانە دەمێنەوە كە تێیدان، نە قیامەت هەیەو نە پاداشتو تۆڵە. سا بچێژن ئەم سزایە لەسەر ئەم قسانەی كە دەتانكرد، موجاهیدو كەسانی تریش دەڵێن: ﴿مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ﴾یانی: لە دنیاوە ناڕۆن بۆ ڕۆژی قیامەت.[4] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ﴾[5] واتە: بەهەرچی توانایانەوەبوو سوێندیان بەخوا ئەخواردو ئەیانووت: بە خوا، خودا كەسێك كە دەمرێنێت، ئیتر زیندووی ناكاتەوە! پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسَكَنتُمۡ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَتَبَيَّنَ لَكُمۡ كَيۡفَ فَعَلۡنَا بِهِمۡ وَضَرَبۡنَا لَكُمُ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ واتە: هەروەها چوونە جێگەی ئەوانەی كە ناهەقیان لە خۆیان دەكردو بۆتان ڕوون بووەوە كە چیمان بەسەر ئەوانەدا هێناو زۆر نموونەیشمان بۆ هێنانەوە یانی: بینیتانو ئاگادار كران كە چیمان بەو گەلانەی پێش ئێوە هێنا كە بڕوایان نەدەكرد، كەچی هیچ پەندو ئامۆژگاریەكتان لێ وەرنەگرت، ئەوەی كە بەسەر ئەوانەمان هێنا

---

[1] السجدة (١٢).

[2] الانعام (٢٧).

[3] فاطر (٣٧).

[4] الطبري (١٧/٣٦).

[5] النحل (٣٨).

ئێـوەی نەگێڕایـەوەو وازی پـێ نـەهێنان. ﴿حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾[1] واتـە: ئەمـە دانـای وفەلـسەفەیەکی تـەواوە، بـەڵام ئـەم ترسـاندنانە سـودیان پـێ ناگەیـەنێت. پاشـان خـوای گـەورە دەفـــەرمووێت: ﴿ وَقَدْ مَكَرُوا۟ مَكْرَهُمْ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكْرُهُمْ وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ واتە: مەکری خۆیان بەکارهێنا، مەکرەکەشیان بە خوارەوە بوو، هەرچەندە ئەو مەکرەی کە کردیان، کێویشیان پێ هەڵدەتەکان. شوعبە ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڕەحمانـەوە کە عـەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ دەڵێت: ئەو کەسـەی کە مشتو مڕی بوو لەگەڵ ئیبراهیمدا لەسەر پەروەردگاری دوو باڵندەی سەرگەڕی بچووکی گرت، بـەخێوی کردن هەتا بەهێزو گەورە بوونو تەواو خۆیان گرت. دەڵێـت: قاچـی هـەر یـەکێکیانی گرێدا بـە مێخـی تابوتێکەوەو برسی کردن، خۆیی‌و پیاوێکی تر لـەناو تابووتەکـەدا دانیـشتن، دەڵێـت: گاچۆنێکی لـەناو تابوتەکە بەرز کردەوە،هەندێ گۆشتی کرد بەسەری عەساکەوە، جـا دەڵێـت: دوو سـەرگەڕەکە فـڕین، لەو کاتەدا بە هاوەڵەکەی وت: سەیر بکە بزانە چی دەبینی؟ هاوەڵەکەی وتـی: فـلانو فیـسار دەبینـم، هەتا وتی: هـەموو دنیـا دەبینـم، کـە وەك مێشێم وایـە دەڵێـت: عەساکەی ڕوو تێکـە، عەساکەی ڕوو تێکردو دابەزین، وتی: ئەمە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ هەرچـەندە ئـەو پیلانـەی ئـەوان کردیـان چیاشـیان پـێ هەڵدەتەکانـد.[2] ئـیبن اسـحاق ئەڵێ:لەخوێندنەوەی"عبداللـه"دائـەوترێ:﴿وَإِن كاد مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ موجاهید ئـەم بەسەرهاتەی لە بارەی بوختەنەسرەوە هێناوە، کاتێك کە چاوی لـە زەوی‌و خەڵکەکـەی بـڕاوە بـانگ کراوە ئەی ستەمکار دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟ ،ئەویش تسری لێ دەنیشێت، پاشـان لەسـەری خۆیـەوە ئەو دەنگە ئەبیسێت، ڕووی ڕمەکەی ئەکاتە سەرگەڕەکەو لە دەنگەکەی چیاکان ئەلەرزێنـەوە. خـەریك بوو لە هەستی ئەو چیاکان لە جێـی خۆیـان هەڵتـەکێن‌و نـەمێنن، ئەمـەیش ئەوەیـە کە خـوای گـەورە دەفـــەرمووێت: ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ ئیبنـو جـورەیج لـە موجاهیـدەوە هێناویەتی کە ئەم ئایەتەی وا خوێندووەتەوە: (لَتزولُ منهُ الجبال) لامی یەکەمی بـە مـەفتوحی و لامـی دووەکی بە مەزمومی خوێندووەتـەوە، عـەوفی ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئیبنـو عەباسـەوە لـەم ئایەتـەدا: ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ دەڵێــت: پیلانەکــەیان کێــو هەڵناتەکێنێت،بــەڵکو

---

[1] القمر (٥).

[2] الطبري (١٧/٣٩).

زیانەکەی بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، حەسەنی بەسریش هەر وای وتووە، ئیبنو جەریر ماناکەی وا کردووە، ئەوەی کە کردویانە، بە خۆیان کردووە، لە هاوەڵ دانان بۆ خواو بروا نەکردن پێی، هیچ چیاو هیچ شتێك زیانی لێ نەکەوتووە، بەڵکو ئاکامی خراپەکانیان بەسەر خۆیانەوەیە، منیش دەڵێم: ئەم ئایەتە لەو ئایەتە دەچێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾[1] واتە: بە فیزەوە هەنگاو بەسەر زەمیندا مەنێ، تۆ ناتوانی ئەم زەمینە ببڕی‌و بقلیشێنی‌و لە درێژیشدا هەرگیز ناگەیتە شاخەکان. قسەی دووهەم لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەوەیە کە عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە، ﴿وَإِن كَانَ مَكْرُهُمْ لِتَزُولَ مِنْهُ ٱلْجِبَالُ﴾ واتە: شەریك دانانیان. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا﴾[2] واتە: لەوانەیە (لەو قسەیە) ئاسمانەکان هەڵتەکێنێت‌و زەمین شەقباو کێوەکان بڕوخێنێت. لەبەر ئەوە کە وتویانە: خوا فەرزەندەی هەیە.[3] زەحاك‌و قەتادەش هەر وایان وتووە[4].

﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُوا لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾﴾

### خوا لە بەڵێنی خۆی پاشگەز نابێتەوە

خوای گەورە باسی ئەو بەڵێنەی خۆی دەکات کە داویەتی‌و جەختی لەسەر دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخْلِفَ وَعْدِهِۦ رُسُلَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ واتە: پێت وانەبێت لەو بەڵێنانەی کە بە پێغەمبەرانی خۆی داوەهەرگیز پەشیمان دەبێتەوە، خوا خاوەن دەسەڵاتی تۆڵە سێنە، واتە: دێت بە هانای پێغەمبەرەکانیەوە لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتداو یارمەتی دەریانە، پاشان فەرموویەتی: کە خاوەن دەسەڵاتە‌و ویستی لە هەر شتێك بێت هیچ شتێك نابێتە لەمپەر لە ڕێیداو زاڵ نابێت بەسەریدا. خاوەن تۆڵەشە لەو کەسانە کە بڕوای پێ ناهێنن‌و ملی بۆنادەن، ﴿فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ

[1] الاسراء (٣٧).

[2] مريم (٩٠ـ٩١).

[3] الطبري (١٧/٤١).

[4] الطبري (١٧/٤١).

لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾[1] واتە: ئیتر لەو ڕۆژەدا هاوار بۆ بێباوەڕان. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ واتە: ڕۆژێك زەمین دەگۆڕدرێتو دەبێتە زەمینێکی ترو ئاسمانەکانیش بە هەمان شێوە. واتە: ئەو بەڵێنەی خودا دێتەدی کاتێك کە زەمین دەگۆڕریت بە زەمینێکی ترو بەم شێوە ئاسایيو ئاشنایەی خۆی نامێنێتەوە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژی قیامەت خەڵکی هەموو کۆدەکرێنەوە، لەسەر زەویەکی سپی مەیلەو سوور وەك نانێکی گەنمی پاکی بێ کەپەك (سوس)وایە، لەو زەویەدا شوێن پێیو پەرچەمی هیچ کەسی تیا نیە).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە دەڵێت: من یەکەم کەس بووم پرسیاری بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کرد لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ﴾ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو ڕۆژەدا خەڵکی لە کوێن؟ فەرمووی: (لەسەر پردی سیراتن).[3] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە بە تەنها بەو شێوەیە بوخاری لەگەڵدا نیە، ترمزيو ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە.[4] ئیمامی موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە سەوبانی مەولای پێغەمبەری خودا(ﷺ)دەڵێت: من بە پێوە ڕاوەستابووم لە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) زانایەك لە زانایانی جولەکە هاتو وتی: ئەی موحەمەد سڵاوت لێبێت، منیش پاڵێکی وام پێوە نا خەریك بوو بکەوێت، وتی: بۆ پاڵم پێوە دەنێی؟ وتم: بۆچی ناڵێی ئەی پێغەمبەری خوا؟ جولەکەکە وتی: بێگومان ئێمە هەر بەو ناوە بانگی دەکەین کەسو کاری ناوی لێ ناوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بە ڕاستی ناوی من موحەمەدەو کە کەسو کارم ناویان ناوم) جولەکەکە وتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا سودت پێ دەگات ئەگەر قسەت بۆ بکەم؟) وتی: بە هەردوو گوێچکەم دەبیستم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە چیلکەیەك پێی بوو لە زەوی داو فەرمووی: (پرسیار بکە) جولەکەکە وتی: خەڵکی لە کوێ دەبن ڕۆژێك زەمین دەگۆڕدرێت بە زەمینێکی ترو ئاسمانەکانیش هەروەها؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە تاریکستانێکدا دەبن لە خوار پردی سیراتەوە) جولەکەکە وتی: یەکەمین کەسێك کێیە کە بەسەریدا تێدەپەڕێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کۆچەریە هەژارەکانن)جولەکەکە وتی: کاتێك دەچنە بەهەشت دیاریەکەیان چیە؟ فەرمووی: (زیادەی

---

[1] طور (١١).

[2] فتح الباري (٣٧٩/١١)، مسلم (٢١٥٠/٤).

[3] أحمد (٣٥/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٢١٥٠/٤)، تحفة الأحوذي (٥٤٨/٨)، ابن ماجه (١٤٣٠/٢).

جگەری نەهەنگ) وتی: دوای ئەوە خۆراکیان چیە؟ فەرمووی: (گای بەهەشتیان بۆ سەردەبڕن کە لە قەراغی بەهەشتدا لەوەڕاوە) وتی: چ خواردنەوەیەك دەکەن بەسەریدا؟ فەرمووی: (لە کانیاوێکی بەهەشتە پێی دەوترێت سەلسەبیل) وتی: ڕاست دەکەی، وتی: هاتووم پرسیارت لێ دەکەم لە شتێ هیچ کەسێك لە خەڵکی ئەم زەمینە نایزانێت جگە لە پێغەمبەرێك، یان پیاوێك یان دوو پیاو. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا سودت پێدەگات ئەگەر قسەت بۆ بکەم؟) وتی: بە هەردوو گوێچکەم دەیبیستم، وتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم دەربارەی دروستبوونی منداڵ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئاوی پیاو سپیو ئاوی ژن زەردە، ئەگەر کۆبوونەوە ئاوی پیاو سەرکەوت بەسەر ئاوی ژنەکەدا کوڕیان دەبێت بە ئیزنی خوا، ئەگەر ئاوی ژنەکە سەرکەوت بەسەر ئاوی پیاوەکەدا کچیان دەبێت بە ئیزنی خودا) جولەکەکە وتی: ڕاستت کرد بە ڕاستی تۆ پێغەمبەری پاشان ڕۆیشت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بە ڕاستی ئەم پیاوە کە پرسیاری لێ کردم دەربارەی ئەوانەی کەکردی من هیچ جۆرە زانستێکم نەبوو دەربارەیان تا خوا ئاگاداری کردم لێیان).[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ واتە: ئەوسا هەموو دێنە بەر بارەگای تاكو تەنهاو زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا، واتە: هەموو خەڵکی لە گۆڕەکانیان هاتوونەتە دەرەوە بۆ لای ئەو خودایەی کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو ملیان بۆ نەوی کردووەو دڵەکانیش بە ترسو لەرزەوە لەبەر بارەگای ئەودان.

﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجْزِىَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٥١﴾ ﴾

### بارو ژیانی تاوانباران لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات لە ڕۆژێکدا ئەم زەمینە دەگۆڕێت بە زەمینێکی ترو ئاسمانەکانیش دەگۆڕێ بە ئاسمانی ترو ئەوسا هەموو لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، دێنە بەر بارەگای خودای تاكو تەنهاو زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا، ﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ ﴾ واتە: وە لەو ڕۆژەدا ئەی موحەمەد (ﷺ) تاوانباران دەبینی، ئەوانەی بە هۆی خوانەناسیو خراپەکاریانەوە تاوانی زۆریان کردووە، ﴿مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ﴾ واتە: بە زنجیر بە یەکەوە جڵەوکراون، واتە: هەندێکیان بە هەندێکیانەوە بەستراون، ئەوانەی کە لەیەك دەچنو هاوشێوەن لە خراپەکاریدا کۆی کردوونەتەوەو لە پاڵ یەکن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱحْشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزْوَٰجَهُمْ﴾[2] واتە: ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان

---

[1] مسلم (٣١٥).

[2] الصافات (٢٢).

بکەنەوە لەگەڵ هاوشێوەکانیان. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ﴾[1] واتە: کاتێك هەموو گیانەکان جووت کرایەوە (بە لاشەیاندا) وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا﴾[2] واتە: هەر کاتێك شەتەك دران و خرانە ناو جێگەی تەنگەلانی جەهەنەمەوە لەوێدا ئاوات بۆ مردن دەخوازن، وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ﴾[3] واتە: هەموو شەیاتینەکانمان ڕام هێنابوو کە تەلارو مەلەوانی ژێر دەریا بوون، هەندێکی تریشیان کە بە یەکەوە بەسترابوون بە زنجیرکراوی، هاتبوونە بەرفەرمانی ئەو. لەمانای ﴿ٱلۡأَصۡفَادِ﴾دا ئیبنو عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەعمەش و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید دەڵێن: واتە: کۆت و زنجیر.[4] لە زمانیشدا هەر وا بەناوبانگە. ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٖ﴾ پۆشاکیان قەترانی ڕەشە، واتە: ئەو جلوبەرگەی لەبەری دەکەن لە قەترانە، ئەو شتەیە دەدرێت لە وشتر، قەتادە دەڵێت: ئەو قەترانە لە هەموو شتێك باشتر ئاگر کاری تێ دەکات، ئیبنو عەباس دەڵێت: مەبەست لێرەدا بە ﴿قَطِرَانٖ﴾ واتە: مسی تواوە،[5] وە لەوانەشە ئەم ئایەتەی خوێندبێتەوە: ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٖ﴾ واتە: پۆشاکێکیان لە مسێکی گەرمی زۆر گەرم بۆنەکرێت، هەر بەو شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و قەتادەوە.[6] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ﴾[7] دەم و چاویان بە ئاگر دەسوتێت لێوەکانیان هەڵدەقرچێت، ئیمامی ئەحمد دەڵێت: یەحیای کوڕی ئیسحاق بۆی باس کردین، ئەبانی کوڕی زەید هەواڵی داینێ لە یەحیای کوڕی ئەبو کەسیرەوە لە زەیدی کوڕی ئەبو سەلامەوە، لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (چوار شت لەناو ئومەتی مندا کە کرداری (سەردەمی) نەفامی یە و وازی لێ ناهێنێت، خۆ هەڵبڕین بە بنەماڵەوە، تانەدان لە ڕەچەڵەك و هیوای باران بارینی بە ئەستێرەکان و باڵۆرە بەسەر مردوودا، باڵۆرەکەرێك ئەگەر لەپێش مردنی پەشیمان نەبێتەوە ڕادەوەستێنرێت لە ڕۆژی قیامەتداو کراسێکی

---

[1] التكوير (٧).

[2] الفرقان (١٣).

[3] ص (٣٧ـ٣٨).

[4] الطبري (١٧/٥٣، ٥٤).

[5] الطبري (١٧/٥٦).

[6] الطبري (١٧/٥٥، ٥٦).

[7] المؤمنون (١٠٤).

قەترانی ڕەشی لەبەر دەكرێت لەگەڵ قەڵغانێ لە (پێستە).[١] تەنها موسلیم خۆی هێناویەتی،[٢] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لِيَجْزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ ﴾ بۆ ئەوەی خودا هەر كەسێك بە پێی ئاكاری و كرداری خۆی سزا بدات، لە ڕۆژی قیامەتدا وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ﴾[٣] واتە: تا سزای ئەوانە بدات كە خراپەیان كردووەو چاكەی باشیش دەربارەی كارچاكان بكات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ بە ڕاستی خوا لێپرسینەوەی خێرایە، واتە: لە كاتی لێپرسینەوەدا لە بەندەكانی زۆر خێرایە، چونكە خودا ئاگای لە هەموو شتێكە، هیچ شتێكی لێ ون نابێت هەموو خەڵكی لە بەرامبەر توانای خواوە وەك تەنها كەسێك وایە لە خۆیان، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێت: ﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾[٤] واتە: وەدی هێنانی هەمووتانو زیندووكردنەوەتان وەك دروستكردنی تەنها كەسێك وایە، ئەمە مانای قسەكەی موجاهیدە لەم ئایەتەدا ﴿سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ واتە: بە خێرا هەژمار دەكات.

﴿ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ (٥٢) ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ هَٰذَا بَلَٰغٌ لِّلنَّاسِ ﴾ ئەم قورئانە ڕاگەیاندنو جاڕێكە بۆ خەڵكی، وەك ئەم ئایەتە كە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ ﴾[٥] واتە: بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنمو هەر كەسێكی كەش كەئەم قورئانەی پێ دەگات، ئەوە ڕاگەیاندنێكە بۆ هەموو كەسێك لە مرۆڤو جنۆكە، وەك لە سەرەتای ئەم سورەتەدا فەرموویەتی: ﴿الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾[٦] واتە: (الیف، لام، ڕا) كتێبێكە بۆ تۆمان ناردە خوارەوە، هەتا خەڵكی لە تاریكی بەرەو ڕووناكی بگوێزیتەوە. ﴿وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ﴾ هەتا پێی بێدار بكرێنەوەو دەرس لێ وەرگرن، ﴿وَلِيَعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ وە بیشزانن كە ئەو خودایەكی تاكو تەنهایە، واتە: ئەو پەندو

---

[١] احمد (٣٤٢/٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.
[٢] مسلم (٦٤٤/٢).
[٣] النجم (٣١).
[٤] لقمان (٢٨).
[٥] الانعام (١٩).
[٦] ابراهیم (١).

ئامۆژگاریانە بکەنە بەڵگەو نیشانە لەسەر ئەوە کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا ﴿وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ واتە: تا خاوەن ئاوەزانیش ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

## تەفسیری سورەتی (الحجر)

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾﴾

### ڕۆژێك دێت خوانەناسان خۆزگە دەخوازن کە موسڵمان بوونایە

﴿الٓر﴾، (ئەلیف، لام، ڕا) لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا باسی ئەم پیتانە کرا پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەینەوە، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: ئەمانە بەڵگەو نیشانەی ئەم کتێبەڕۆشنەن کە قورئانەو چاكو خراپ نیشان دەدات، ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾ واتە: دوور نیە ئەوانەی خوانەناسن ڕۆژێك بڵێن: خۆزگە موسڵمان بوینایە، خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات کە ڕۆژێك دێت پەشیمان دەبنەوەو دەڵێن: خۆزگە موسڵمان بووینایە لە دنیادا، سوفیانی سەوری دەڵێت: لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە لە ئەبو زەعراوە لە عەبدوڵاوە لەتەفسیری م ئایەتەدا: ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾ فەرموویەتی: ئەم ئایەتەباسی ئەوجەهەنەمیانەدەکات کاتێك کەتاوانبارانی موسڵمانان دەبینن لە ناو ئاگر دێنە دەرەوە،[1] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە کە ئیبنو عەباسو ئەنەسی کوڕی مالیك مانای ئەم ئایەتەیان واکردووە: ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾یانی ڕۆژێك کە خوای گەورە تاوانبارانی موسڵمانان بەند دەکات لەگەڵ بتپەرستاندا لەناو ئاگردا بتپەرستان دەڵێن بەو موسڵمانە تاوانبارانە: ئەوەی ئێوە لە دنیا دەتان پەرست هیچ سودێکی پێ نەگەیاندن، خوای گەورە تووڕە دەبێت لە موشریکەکانو بە سۆزو بەزەیی خۆی خاوەن باوەڕان لە ئاگر دەردەهێنێت، لەبەر ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ﴾،[2] خوای گەورە هەڕەشە لە خوانەناسان دەکاتو دەفەرموێت:

---

[1] الطبري (٦٢/١٧).

[2] الطبري (٦٢/١٧).

﴿ ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ ﴾ واته: وازیان لێ بێنه با بخۆنو خۆش ڕابوێرن، بۆ کوێ دەچن، وەك ئەم ئایەتەیش کە دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمۡ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾[1] واتە: بێژە: ڕابوێرن بێگومان چارەنووستان هەر ناو ئاگرە، وە دەفەرمووێت: ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ﴾[2] واتە: كۆمەڵی تاوانباران بخۆنو کەمێك ڕابوێرن ئێوەخەڵكانێكی تاوانكارن، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾ واته: با ئارەزوو سەرقاڵیان بکات لە تەوبەکردنو گەڕانەوە بۆ لای خودا، بەو زووانە چارەنووسی خۆیان دەزانن.

﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤﴾ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴿٥﴾ ﴾

**هەموو شارو تیرەیەك كاتی خۆیی بۆ دیاری كراوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤﴾ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴾ واته: ئێمە خەڵكی هیچ شارێكمان قڕ نەكردووە مەگین لە پێشدا نوسراوێكی دیارو زانراومان بۆ دانابێت، هیچ تیرەیەكیش لە پێش ڕۆژی خۆی نامرێتو هەرگیز دواش ناخرێت، خوای گەورە لێرەدا باسی كردووە كە هیچ شارێك وێرانو كاول ناكات هەتا بەڵگەو نیشانەی تەواویان بۆ ڕوون نەكاتەوە، مۆڵەتی ژیانیان تەواو نەبێت، هەر گەلێكیش كاتی لەناوچوونیان هات هەرگیز دوا ناخرێت لەو كاتەی كە بۆیان دیاری كراوەو پێشیش ناخرێن، ئەمە ئاگاداركردنەوەیەكە بۆ خەڵكی مەككەو ئامۆژگاریەكیشە بۆیان، هەتا كۆڵ بدەنو واز لەو بتپەرستیو لاساریو بێدینیەی خۆیان بێنن كە دەبێتە هۆی لەناوچوونو تەفرو تونابوونیان.

﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴿٦﴾ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾

**بوختانی كافران بۆ پێغەمبەر(ﷺ) كە گوتوویانە شێتەو داوای دابەزینی فریشتەیان كردووە، وەڵامی خواش بۆیان.**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴾ واته: خوانەناسان وتیان: ئەی ئەو كەسەی كە قورئان نێردراوەتە خوار بۆ سەرت، بە ڕاستی تۆ شێتی، خوای گەورە باسی بێدینیو لاساریو كەللەڕەقی ئەوانە دەكات كە تۆمەتی شێتی دەدەنە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)

[1] ابراهيم (٣٠).

[2] المرسلات (٤٦).

ئەڵێن: تۆ بانگی ئێمە دەکەی کە شوێنت بکەوینو واز لە ڕێو ڕەچەی باب و باپیرانمان بێنین، بە ڕاستی ئەمەی تۆ دەیڵێی شێتی نەبێت هیچێکی تر نیە، ﴿ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِالْمَلَائِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴾ واتە: ئەگەر ڕاست دەکەی کە پێغەمبەری، دەی بۆ فریشتە ناهێنیت بۆ لامان شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کە تۆ هێناوتە ڕاستە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت کە فیرعەون وتویەتی: ﴿ فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَاءَ مَعَهُ الْمَلَائِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴾[1] واتە: دە بۆچی بازنی ئاڵتونی پێ نەدراوە؟ (ئەگەر ڕاست دەکات) یان فریشتەی (گەواهی دەری) لەگەڵدا نەهاتووە. ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا ۗ لَقَدِ اسْتَكْبَرُوا فِي أَنفُسِهِمْ وَعَتَوْا عُتُوًّا كَبِيرًا ﴿٢١﴾ يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَائِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾[2] واتە: ئەوانەی بە هیوای دیداری ئێمە نین (لە ڕۆژی دواییدا) دەڵێن ئەوە بۆ فریشتە نانێردرێتە خوارەوە بۆ سەرمان یاخود پەروەردگارمان نابینین سوێند بە خوا بە ڕاستی ئەوانە لە دەروونی خۆیاندا خۆیان بە گەورە دەزانیو سەرکەشیەکی گەورەیان کرد، ئەو ڕۆژەی فریشتەکان دەبینن (کاتی مردن یان قیامەت) لەو ڕۆژەدا هیچ مژدەیەك بۆ تاوانباران نیەو دەڵێن (پەنامان بدەن) بە پەنادانی پارێزراو. خوای گەورە لێرەدا وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿ مَا نُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ إِلَّا بِالْحَقِّ وَمَا كَانُوا إِذًا مُّنظَرِينَ ﴾ واتە: ئێمە فریشتە نانێرین مەگین بە ڕاستو ڕەوا،ئەو کاتەش ئەوان مۆڵەت نادرێن، موجاهید لەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿ مَا نُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ ئێمە فریشتە نانێرین مەگین بە پەیامو جەزرەبەوە نەبێت.[3] واتە: یان پەیامیان پێیە بۆتا یان سزاتان دەدەن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾ واتە: ئێمە خۆمان ئەو قورئانەمان ناردووەتە خوار، هەر ئێمەش دەیپارێزین، لە هەر دەست تێوەردانێكو گۆڕانکاریەك تێیدا بکرێت، چونکە خودا خۆی ئەو قورئانەی ناردوەتە خوار بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەر خۆشی پارێزەریەتی لە هەموو دەستکاریەكو ئاڵوگۆڕکردنێك تێیدا بکرێت.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ ۖ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾﴾

---

[1] الزخرف (٥٣).

[2] الفرقان (٢١ـ٢٢).

[3] الطبري (١٧/٦٨).

**گاڵتەکردنی بتپەرستانی هەموو گەلێك بە پێغەمبەرەکانیان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي شِيَعِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ واتە: واتە: پێش لە تۆ پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ ناو کۆمەڵەکانی پێشینە، هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتوە مەگین داویاننەتە بەر گاڵتەو تەشەر، خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەرەکەی دەداتەوە لەسەر باوەڕنەهێنانی خوانەناسانی قورەیش، کە زۆر دڵگران نەبێت، چونکە پیشەی خوانەناسان هەر وابووە لەناو گەلە پێشوەکانیشدا، هیچ گەلێك نەبووە کاتێك کە پێغەمبەرانیان بۆ هاتووە زۆرێك لەو گەلانە بڕوایان پێ نەهێناوەو دەستیان داوەتە گاڵتەو تەشقەلە پێی، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە ئێمە خوانەناسی دەخەینە دڵی تاوانبارانەوە، ئەوانەی کە خۆیان بە زل دەزانن‌و لاساری دەکەن‌و لە ڕێی ڕاست لادەدەن‌و شوێنی پەیامی خوا ناکەون، ئەنەس‌و حەسەنی بەسری وتوویانە: ﴿كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِينَ﴾یانی: ئێمە شیرك‌و بێباوەڕی دەخەینە دڵی خوانەناسانەوە.[1] ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الْأَوَّلِينَ﴾ واتە: بڕوا بەم قورئانە ناهێنن، سروشتی پێشینەکانیش هەر وا بووە، ڕۆشنەکە خوای گەورە چی بەسەر ئەو خوانەناسانە هێنا کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی نەهێناو چۆن لەناوی بردن‌و قڕی کردن، وە چۆنیش پێغەمبەرکان‌و شوێنکەوتووەکانیانی ڕزگار کرد لە دنیاو لە قیامەتدا.

﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾﴾

**ئەوانەی لاسارو خوانەناسن هەرچەندە نیشانەیان نیشان بدرێت‌و بە چاوی خۆشیان بینینن هەر بڕوا ناهێنن**

خوای گەورە باس زۆر بێدینی‌و لاساری‌و خۆ بە زلدانینی خوانەناسان دەکات بەرامبەر بە هەق دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ السَّمَاءِ فَظَلُّوا فِيهِ يَعْرُجُونَ﴾ واتە: ئەگەر دەرگایەکیان لەم ئاسمانەوە بۆ بکرێتەوەو پێیدا بڕۆنە سەرەوە بڕوا بە ئەوەیش ناکەن، بەڵکو ئەڵێن: ﴿لَقَالُوا إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَارُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ﴾ واتە: ئێمە چاومان بەستراوەو جادوومان لێکراوە، موجاهیدو

[1] الطبري (١٧/٧٠).

ئیبنو کەسیر و زەححاك دەڵێن: ﴿إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَـٰرُنَا﴾ واتە: چاومان بەستراوە.[١] قەتادە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: واتە: چاومان گیراوە، عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێن: لێمان گۆڕاوەو جادوومان لێ کراوە.[٢] ئیبنو زەید دەڵێت: ﴿سُكِّرَتْ أَبْصَـٰرُنَا﴾، (السكران:سەرخۆش) ئەو کەسەیە کە عەقڵی لەدەست داوە.

﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَـٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَـٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَـٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾﴾

## دەسەڵاتی خوداو نیشانەکانی لە ئاسمانەکان و زەمیندا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَـٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: لەم ئاسمانە چەند بورجێکمان وەدی هێناوەو ڕازاندووەتەوە بۆ ئەوانەی کە سەیر دەکەن، ئەوانەشمان لە هەموو شەیتانێکی نەفرین لێکراو پاراستوە مەگین ئەوەی بە پەنهانی گوێ دەگرێت ئەوەگرەئاگرێکی ڕووناك ڕاوی دەنێت، خوای گەورە باسی وەدیهێنانی ئەم ئاسمانە دەکات کە چەندە بەرزەو چۆن بە ئەستێرەی وەستاوو گەڕۆك ڕازاندوویەتیەوە، کە پڕە لە نیشانەو بەڵگەی سەرسوڕهێنەرو بۆ ئەو کەسانەی کە بە تێڕامانەوە چەند جارێك سەیری دەکەن،بە سەیرکردنی چاویان ئەبڵەق دەبێت، بۆیە موجاهیدو قەتادە دەڵێن: مەبەست بە (البروج) لێرەدا ئەو ئەستێرانەیە.[٣] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا﴾[٤] واتە: سەروەری بۆ ئەو کەسەیە کە چەند بورجی لە ئاسماندا دامەزراندووە. عەتیەی عەوفی دەڵێت: (البروج) لێرەدا بریتیە لەو کۆشکانەی پاسەوانی تێدایە.[٥] خوای گەورە گڕی ئاگری کردووە بە پاسەوان لە ئاسماندا بۆ ڕاونانی ئەو شەیتانانە بۆ ئەوەی گوێبیستی قسەی فریشتە بەڕێزەکان نەبن، هەر شەیتانێك یاخی ببێتو لێیان نزیك ببێتەوە بۆ ئەوەی قسەیەك بدزێت، گڕێکی ئاگری ڕووناکی بۆ دێتو لەناوی دەبات، هەندێ جار ئەو قسەی کە وەری دەگرێت،

[١] الطبري (٧٤/١٧).
[٢] الطبري (٧٥/١٧).
[٣] الطبري (٧٧/١٧).
[٤] الفرقان (٦١).
[٥] البغوي (٤٥/٣).

دەیدات بە یەکێك لە خواری خۆیەوە پێش ئەوەی گڕی ئاگرەکە پێی بگات، ئەمیش بۆ یەکێکی تر لە خواری خۆیەوە، ئەویش دەیگەیەنێتە دۆستەکەی لە جادوگەرو فاڵچیەکان، کە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووەو باس کراوە، وەك بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو هورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (کاتێك خوای گورە فەرمانێك دەردەکات لە ئاسماندا فریشتەکان باڵەکانیان دەدەن بە یەکدا وەك فەرمانبەرداریەك بۆ خوا کە وەك ئاسنێك وایە بیدەی بە بەردێکی سافدا)، چۆن دەنگی لێوە دێت، جا ئەو کاتە ترسی دڵیان دادەمرکێتو ئەڵێن: پەروەردگاری ئێوە چی گوت؟ ئەڵێن ئەوەی گوتی: خودا ڕاستی فەرمووە، هەر ئەویشە هەرەپایە بەرزو مەزن، شەیتانەکان ئەوانەی بە پەنامەکی گوێ دەگرن هەندێ لەوقسەیە دەبیستن، ئەوانەیش قسە دەدزن ئابەم شێوەیەن: هەر یەکەیان بەسەر ئەوی ترەوە، (سوفیان بە دەستی وێنای شتەکەی کردو نێوان پەنجەکانی دەستی ڕاستی کردەوەوپاشاندانەدانە بەسەر یەکەوە داینان)، جاری وا هەیە گڕی ئاگرەکە دەگاتە ئەوەی گوێ دەگرێت دەیسوتێنێت! لەپێش ئەوەی خۆی بگەیەنێتە هاوەڵەکەی، جاری واش هەیە گڕی ئاگرەکە پێی ناگات،جایەك دەیگەیەننە ئەوەی لە دواوەیانەو لە خواری خۆیانەوەیە هەتا دەیگەیەننە سەر زەوی (پێش دەچێت سوفیان گوتبێتی: هەتا دێتە سەر زەوی) دەگاتە دەستی ئەو جادوگەرە یان ئەو فاڵچیە،ئەویش سەد درۆی تری پێوە دەلکێنێتو بڕوای پێ دەکرێت، مەردم ئەڵێن: فلانە ڕۆژو فلانە ڕۆژ پێی نەگوتین فلانە شتو فلانە شت دەبێت، بینیمان ئەو قسەیە ڕاست دەرچوو کە لە ئاسمانەوە بیستبووی).[1] پاشان خوای گەورە باسی زەمین دەکات کە چۆن دروستی کردووەو ڕای خستووەو واڵاو تەختی کردووە کە پڕە لە کێوی بەرزو شیوو زەوی لماوی‌و هەموو جۆرە ڕووەکێکی وەك میوەو کشتوکاڵ تێدا ڕواندووە، وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْزُونٍ﴾ واتە: زەویشمان کردووە بە ڕایەخ‌و کێوەکانیشمان تێ فڕێداوە، هەموو جۆرە ڕووەکێکیشمان بەڕێك‌و پێکی تیا ڕواند، ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْزُونٍ﴾ واتە: بە دیاری کراو بەئەندازە، سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمەو ئەبو مالیك‌و موجاهیدو حەکەمی کوڕی عوتەیبەو حەسەنی کوڕی موحەمەدو ئەبو ساڵح‌و قەتادەیش هەر وایان وتووە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ﴾ واتە: هۆکاری ژیانیشمان لەوێدا بۆ پێکهێنان‌و ئاسانکاری تەواویشمان بۆ کردوون لە هەموو ڕوویەکەوە، ﴿وَمَن لَّسْتُمْ

---

[1] فتح الباري (٨/٢٣١).

[2] الطبري (١٧/٧٩ـ٨١).

﴿لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ﴾ واتە: بۆ ئەوانەیش کە ئێوە بژێویان نادەن(وئاگاتان هەرلێیان نییە)، موجاهید دەڵێت: لە چوارپێو مەڕو ماڵات.[1] ئیبنو جەریر دەڵێت: لە بەندەو کەنیزەکو مەڕو ماڵات، کە مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە خوای گەورە منەت دەکات بەسەریاندا لەسەر ئەو هەموو ئاسانکاریەی بۆی ڕەخساندوون، بۆ وەدەستهێنانی بژێویانو ئەو شتانەی کە خودای مەزن بۆی ڕام هێناون وەك وڵاغی سواریو مەڕو ماڵات کە گۆشتەکەی دەخۆنو ئەو بەندەو کەنیزانەی کە بەکاریان دێننو خزمەتی خۆیانی پێ دەکەن، کە ڕۆزییان لای ئەو خودایە کە دروستی کردوون، لەسەر ئەوان نیە، بەڵکو سودەکەی بۆ ئەوانە، ڕۆزیشیان لەسەر خودای گەورەیە[2].

﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾﴾

### گەنجینەی هەموو شتێك لای خوایە

خوای گەورە لێرەدا باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کە هەر خۆی خاوەنی هەموو شتێکەو هەموو شتێك لای ئەو سوكو ئاسانەو هەموو گەنجینەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە خۆی خاونیەتی وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾ واتە: گەنجینەی هەموو شتێك لای ئێمەیە، ئەوەشمان هەر بە ئەندازەی دیاریکراو ناردووەتە خوار، واتە: خودا خۆی چۆن مەیلی لێ بێتو بیەوێت وا دەکات، ئەوەیش پەیوەندی بە کارزانیو سۆزو بەزەیی خوداوەیە، پێویست نیە لەسەری، خۆی بڕیاری داوە کە بە سۆزو بەزەیی بێت، یەزیدی کوڕی ئەبو زیاد دەڵێت: لە ئەبو جوحەیفەوە لە عەبدوڵاوە: هیچ ساڵێك نیە بارانی زیاتر تێدا ببارێت لە ساڵێکی تر، بەڵام خودای مەزن ئەوبارانە دابەش دەکات لە نێوانیاندا بە مەیلی خۆی ساڵێ لێرەوساڵێکیترلە شوێنێکی ترپاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ﴾[3] ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی ئەم فەرموودەیەی کردووە.

### سوودی (با)

خوای گەورە دەفەموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ﴾ واتە: باکانمان نارد تا موتوربە بکەن واتە: هەور ئاوس بکەن، هەتا ئاوی لێ بێتو دارودرەخت ئاوس بکەنو شکۆفەو گەڵاکانی بکاتەوە، خوای

---

[1] الطبري (١٧/٨٢).
[2] الطبري (١٧/٨٢).
[3] الطبري (١٧/٨٤).

گەورە باسی بای کردووە بە شێوەی کۆ هێناویەتی بۆ ئەوەی بەروبوومی هەبێت، بە پێچەوانەی بای نەزۆکەوە (الريح العقيم) کە بە تاکی هێناویەتی‌و وەسفیشی کردووە بە نەزۆك، واتە بای بێ بەروبووم، چونکە بەروبووم بە دوو شت یان زیاترنەبێت ،نابێت. لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ ﴾ دەڵێت: با ڕەوانە دەکرێت ئاو هەڵدەگرێت لە ئاسمانداو پاشان ئەو بایە هەور دەجولێنێت‌و ئاوس دەبێت‌و پڕ دەبێت لە ئاو، وەك چۆن وشتری ئاوس گوانی پڕ دەبێت لە شیر.[1] ئیبنو عەباس‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و قەتادەش هەر وایان وتووە.[2] زەححاك دەڵێت: خوای گەورە با دەنێرێت بۆ هەورو ئاوسی دەکات‌و پڕ دەبێت لە ئاو.[3] عوبەیدی کوڕی عومەیری لەیس دەڵێت: خوای گەورە بای مزگێنیدەر دەنێرێت زەوی دەسڕێت‌و پاکی دەکاتەوە، پاشان بای بەرزکەرەوە دەنێرێت هەور بەرز دەکاتەوەو دەیجولێنێت، پاشان بای کۆکەرەوە دەنێرێت ئەو هەورە کۆدەکاتەوە، پاشان خوای گەورە بای دارئاوس دەنێرێت دارو درەخت ئاوس دەکات پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَـٰحَ لَوَٰقِحَ ﴾[4].

## یەکێك لە بەهرەکانی خودا ئاوی شیرین‌و سازگارە

خوای گەورە دەفەموویت: ﴿فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَـٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَـٰزِنِينَ ﴾ واتە: لە ئاسمانەوە ئاومان ناردە خوارەوە، ئێوەمان پێ تێرئاو کرد، ئێوە ناتوانن لە لای خۆتان ئەو ئاوە ڕاگرن‌و بیهێڵنەوە، ئەو ئاوەی دەیبارێنین دەتوانن لێی بخۆنەوە ئەگەر بمان ویستایە دەمانکردە ئاوێکی تاڵ. وەك لە ئایەتی تردا لە سورەتی (الواقعة)دا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَـٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾[5] واتە: جا پێم بڵێن ئەو ئاوەی کە دەیخۆنەوە، ئایا ئێوە لە هەورەوە دەیبارێنن یا ئێمە دەیبارێنین، ئەگەر بمان ویستایە دەمانکرد بە ئاوێکی زۆر سوێری تاڵ، ئیتر بۆ سوپاسی خوا ناکەن. وە لە ئایەتێکی تریشدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ

---

[1] الطبري (١٧/٨٦).

[2] الطبري (١٧/٨٧ـ٨٨).

[3] الطبري (١٧/٨٨).

[4] الطبري (١٧/٨٨).

[5] الواقعة (٦٨ـ٧٠).

تُسِيمُونَ ﴾[1] واتە: هەر خودایە لە ئاسمانەوە بارانێکی بۆ باراندن کە ئێوە لێی دەخۆنەوەو ڕووەکی پێ سەوز دەبێتو مەڕو ماڵاتی لێ دەلەوەڕێنن، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ﴾ واتە: ئێوە ناتوانن ئەو ئاوە ڕاگرنو پارێزگاری لێ بکەن بەڵکو ئێمە دەیبارێنینو ڕاشی دەگرین بۆتانو بەشێوەی ڕووبارو کانیاو لەناو زەمیندا بۆتان دەردێنین، ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت ئەو ئاوە ڕۆ دەکات بە ناخی زەمینداو وشکی دەکات، بەڵام خودا بە ڕەحمی خۆی دەیبارێنێتو شیرینیشی کردووەو لە کانیاو ڕووبارو بیردا ڕایگرتووە، بۆ ئەوەی بە درێژایی ساڵ بۆیان بمێنێتەوەو لێی بخۆنەوەو مەڕو ماڵاتەکانیانی پێ ئاودەنو دارو درەختو کشتوکاڵیشی پێ ئاودێری بکەن.

**باسی توانای دەسەڵاتی خودا کە خەڵکی دروست کردووەو دەیمرێنێتو پاشانیش زیندووی دەکاتەوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾ واتە: هەر خۆمانین گیان دەبەخشینو گیان دەکێشین، ئێمەش میراتی بەریانین، لێرەدا خوای گەورە باسی دەسەڵاتو توانای خۆی دەکات کە هەر خۆی خەڵکی دروست کردووەو دەیمرێنێت. لە ڕۆژی قیامەتیشدا زیندوویان دەکاتەوە، هەر خۆی دەمینێتەوە نامرێتو خودا خۆی خاوەنی زەمینەو ئەوەیش لەسەر زەمیندایەو لە پاشەڕۆژیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ﴾ واتە: ئاگادارین لەوانەی لە پێش ئێوە بوونو، دەشزانین کێن ئەوانەی لە دوای ئێوە دێن، ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ﴾ واتە: ئەوانەی لە پێش ئێمەوە مردوون لە ئادەمەوە (سەلامی خوای لێ بێت) هەتا ئێستا، ﴿ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ﴾ واتە: ئەوانەی زیندوونو ئەوانەیش لە پاشان دەبن هەتا ڕۆژی قیامەت.[2] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە عیکریمەو موجاهیدو زەحاکو قەتادەو موحەمەدی کوڕی کەعبو شەعبیو کەسانی تریشەوە.[3] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە موحەمەدی کوڕی ئەبو مەعشەرەوە ئەویش لە باوکیەوە، کە لە عەوفی کوڕی عەبدوڵاوە بیستوویەتی کە لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ﴾ قسەیان کردووەنەو وتوویەتی: مەبەست لەم ئایەتە سەفو ڕیزەکانی نوێژە، موحەمەدی کوڕی کەعب دەڵێت: نەخێر وانیە، مەبەست

---

[1] النحل (١٠).

[2] الطبري (٩١/١٧).

[3] الطبري (٩٢/٩٠/١٧).

به ﴿ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ﴾ مردوان‌و كوژراوانه‌و به ﴿ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ﴾ یش ئه‌وانه‌ن له‌مه‌ودوا په‌یدا ده‌بن، ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ﴾ واته: په‌روه‌ردگارت هه‌موویان كۆده‌كاته‌وه‌و هه‌ر خۆی كاربزان‌و زانایه، عه‌وفی به موحه‌مه‌دی كوڕی عه‌بدولای ووت: خودا سه‌ركه‌وتووت بكات‌و پاداشتی چاكه‌ت بداته‌وه[1].

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾﴾

**ئه‌و ماده‌ی كه مرۆڤ‌و جنۆكه‌ی لیٰ دروست بووه**

خوای گه‌وره ده‌فه‌موویت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ واته: ئیمه مرۆڤمان دروست كرد، له قوڕه ڕه‌شه‌ی ترشاوی ڕه‌ق هه‌لاتوو، ئیبنو عه‌باس‌و موجاهیدو قه‌تاده ده‌لێن: مه‌به‌ست به ﴿صَلْصَـٰلٍ﴾ لێره‌دا، خۆڵی وشكه،[2] به‌لام دیاره ئه‌م ئایه‌ته وه‌ك ئه‌و ئایه‌ته‌یه كه خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾[3] واته: ئاده‌مینی دروست كرد له قوڕێكی وشكه‌وه‌بووی وه‌ك سواڵه‌ت. دیسان له موجاهیده‌وه: ﴿صَلْصَـٰلٍ﴾ واته: قوڕی گه‌نیوو ترشاو.[4] مانای ئایه‌ت به ئایه‌ت بكرێت زۆر چاكتره، خوای گه‌وره ده‌فه‌رموویت: ﴿مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ له قوڕی ڕه‌ش ترشاوی ڕه‌ق، وه ده‌فه‌رموویت: ﴿وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ﴾ واته: له پێشتردا جنۆكه‌مان وه‌دی هێنا له ئاگرێكی به‌هالاو به تین، ئیبنو عه‌باس ده‌لێت: ئه‌و ئاگره به‌تینه‌ی كه كوشنده‌یه.[5] ئه‌بو داودی ته‌یالیسی ده‌لێت: شوعبه بۆی گێڕاینه‌وه له ئه‌بو ئیسحاقه‌وه ده‌لێت: ئایا قسه‌یه‌كت بۆ بگێڕمه‌وه كه له عه‌بدولای كوڕی مه‌سعودم بیستووه، ده‌یوت: ئه‌م ئاگره به‌تینه ﴿ٱلسَّمُومِ﴾ به‌شێكه له حه‌فتا به‌ش له‌و ئاگره به‌تینه‌ی كه جنۆكه‌ی لیٰ دروست كراوه، پاشان ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه: ﴿وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ﴾،[6] وه له فه‌رمووده‌ی سه‌حیحدا هاتووه: (فریشته له ڕووناكی –نور– دروست كراوه، جنۆكه له بڵێسه‌ی ئاگری بێدوكه‌ڵ دروست كراوه،

[1] الطبري (١٧/٩٠).
[2] الطبري (١٧/٩٦).
[3] الرحمن (١٤).
[4] الطبري (١٧/٩٧).
[5] الطبري (١٧/٩٩).
[6] الطبري (١٧/١٦/٢١).

ئادەمیش لەوە دروست کراوە کە بۆتان باس کراوە).[1] مەبەست ئەم ئایەتە ئاگادارکردنەوەیە لەسەر بەڕێزی ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت)و چاکی توخمەکەی‌و پاکیەتی جەوهەری.

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٣٣﴾ ﴾

**دروست کردنی ئادەم‌و فەرماندان بە فریشتەکان کە سوژدەی بۆ ببەن‌و یاخی بوونی شەیتان**

خوای گەورە دەفەموویێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ واتە: کاتێك پەروەرندەت بە فریشتەکانی وت: وا من مرۆڤم لە قوڕە ڕەشەی ترشاوی وشکەڵاتو دروست کردووە، هەر کاتێك ڕێکوپێکم کردو لە گیانی خۆم فوم پێدا کرد، ئێوە دەبێت سوژدەی بۆ بەرن، فریشتەکان گشت سوژدەیان برد، شەیتان نەبێت ﴿ إِلَّآ إِبْلِيسَ ﴾ کە ملی نەدا لەگەڵ سوژدە بەرەکان بێت، لێرەدا خوای گەورە فریشتەکان ئاگادار دەکاتەوە پێش ئەوەی ئادەم دروست بکات‌و ڕێزی لێ بنێت‌و فەرمان بکات بە فریشتەکان سوژدەی بۆ بەرن، وە باسی سەرپێچی شەیتان دەکات (کە دوژمنی سەرسەختی ئادەمە) لە نێوان ئەو هەموو فریشتەدا سوژدە نابات لەبەر حەسودی‌و لاساری‌و بێ دینی‌و خۆ بە زلزانینی‌و شانازی کردن بە پڕوپوچەوە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ واتە: ئەی ئیبلیس تۆ چیتە، لەگەڵ ئەم سوژدە بەرانە سوژدە نابەی؟ ﴿ قَالَ لَمْ أَكُن لِّأَسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُۥ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ واتە: شەیتان وتی: من چۆن سوژدە ببەم بۆ مرۆڤێك لە قوڕە ڕەشەی گەنیووی ڕەق هەڵاتو دروستت کردووە، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: شەیتان وتی: ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾[2] واتە: من لەو بەڕێزترم منت لە ئاگر دروست کردووە، ئەوت لە قوڕ دروست کردووە،

---

[1] مسلم (٤/٢٢٩٤).

[2] الاعراف (١٢).

وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ ﴾[1] واتە: شەیتان وتی: ئەمەت بە زلتر زانیوە لە من.

﴿ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ ﴾

**دەرکردنی شەیتان لە بەهەشتو مۆڵەت پێدانی هەتا ڕۆژی قیامەت**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ ٱللَّعْنَةَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ واتە: لێرە (بەهەشت) بڕۆ دەرەوە تۆ لە لای من دەرکراوی تا ڕۆژی قیامەت نەفرەتی خودا لەسەر تۆیە، ﴿ قَالَ ﴾ شەیتان وتی: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ واتە: ئەی پەروەرندەم مۆڵەتم بدە هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە، خوای گەورە وەڵامی دایەوەو ﴿ قَالَ ﴾ فەرمووی: ﴿ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾ واتە: بڕۆ تۆ لە مۆڵەت دراوانی، هەتا وەختی دیاریکراو، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە فەرمانی دەرکرد بۆ شەیتان لەو شوێنەی خۆی دەرچێت کە تێیدا بووە لەگەڵ فریشتە بەڕێزەکاندا، چونکە نەفرینی لێکراوەو بێبەشە لە بەزەیی خودا، ئەو نەفرینەش لەگەڵیەتی‌و لێی نابێتەوەو بەردەوامە لەسەری هەتا ڕۆژی قیامەت. لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: وەختێك کە خودا نەفرینی کرد لە شەیتان، ڕوخساری لە شێوەی فریشتەوە گۆڕا (واتە شێوەیەکی تری وەرگرت) هاوارێکی وای لێوە هات، هەموو هاوارێکی تری لە دنیادا هەتا ڕۆژی قیامەت هەر بەو شێوەیە، ئیبنو ئەبی حاتەم ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە.

﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾

**شەیتان بەڵێنی دا کە نەوەی ئادەم گومڕا بکات، خودایش هەڕەشەی لێکرد بە چوونیە ناو جەهەنەم**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ واتە: شەیتان وتی: ئەی پەروەردگارم هەر چۆن تۆ گومڕات کردم،منیش

[1] الاسراء (٦٢).

لەسەر زەمین خراپەیان وەها لەبەر چاو شیرین دەکەم، هەموویان لە ڕێگە هەڵە دەکەم، خودای مەزن باسی یاخی بوونو لاساری شەیتان دەکات، کە وتی: بە خوای گەورە ﴿بِمَآ أَغْوَيْتَنِى﴾ واتە: چۆن تۆ منت گومڕا کردو لە ڕێ لات دام، ﴿لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ﴾ واتە: خراپە لەبەر چاوی نەوەکانی ئادەم وا شیرین دەکەم، ﴿فِى ٱلْأَرْضِ﴾ لەسەر زەمیندا، گوناهیان لا خۆشەویست دەکەمو هەڵیان دەنێمو کوڵیان لێ نادەمو هەراسانیان دەکەم هەتا توشی تاوان نەبن وازیان لێ ناهێنم، ﴿وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: هەموویان گومڕا دەکەم، وەك تۆ چۆن منت گومڕا کردو بڕیارت دا لەسەرم، ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ واتە: مەگین بەندە دڵو دەروون پاکەکانت، ئەم ئایەتانە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1] واتە: پێم بڵێ لە بارەی ئەوەی کە ڕێزی ئەوت داوە بەسەر مندا لە من بە زلترت زانیووە؟ ئەگەر هەتا ڕۆژی قیامەت مۆڵەتم بدەی، نەوەکەی (کەمێکیان نەبێت) دەبێت هەموو بخەمە ژێر چنگی خۆم، خوای گەورەیش هەڕەشەی لێ دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ﴾ واتەفەرمووی: ئەمە ڕێگەی ڕاستی بەرەو منە، واتە: هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆ لای من، لەسەر کردارەکانتان پاداشتتان دەدەمەوە، پاداشتی چاکە بە چاکەو پاداشتی خراپەیش بە سزادان، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلْمِرْصَادِ﴾[2] واتە: بێگومان پەروەردەی تۆ ئەوانە دەبینێتو ئاگای لێیانە، وەك ئەم ئایەتەیش کە دەفەرمووێت: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ﴾[3] واتە: خودا هەر ئەوەی لەسەرە ڕێگەی ڕاستت نیشان بدات، پاشان خوای گەورە دەفەمووێت: ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ﴾ واتە: بەندەکانی من لەوانە نین کە تۆ دەرەقەتیان بێیت، جگە لەوانەی شوێنکەوتووی تۆنو گومڕا بوون، واتە: ئەوانەی کە من شارەزام کردوون تۆ ناتوانی لە ڕێ لایان بدەیو دەستت بەوانە ناگات، مەگین ئەوانەی کە شوێنت کەوتوونو گومڕات کردوون، ئەمە لێرەدا ئیستیسنای مونقەتیعە، ئیبنو جەریر لێرەداقسەیەکی هێناوەلە یەزیدی کوڕی قوسیتەوە ڕیوایەتی دەکات ودەڵێت: پێغەمبەران لە دەرەوەی شارەکەیانو دێکەیان مزگەوتیان

[1] الاسراء (٦٢).

[2] الفجر (١٤).

[3] النحل (٩).

هەبووە، کاتێك پێغەمبەرێك ویستبێتی داوای شتێك بکات لە پەروەردگاری، چووە بۆ ئەو مزگەوتە: ئەوەی خوداکردبێتی بەنسیبی نوێژی کردووەو پاشان ئەوەی نیازی بووە داوای کردووە لە خودا، جارێك پێغەمبەرێك لە مزگەوتەکەیدا دەبێت، لەو کاتەدا دوژمنی خودا(إبلیس) دێتە لای لە نێوان ئەوو قیبلەکەیدا دادەنیشێت، پێغەمبەرەکە ئەڵێت: (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) شەیتان وتی: ئایا نازانی ئەوەی پەنای پێ دەگریت لە خودا، ئەوەمن خۆمم ، پێغەمبەرەکە وتی: (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) وتی: سێ جار ئەمەی وتەوە، دوژمنی خوا شەیتان وتی: پێم بڵێ بە چ شتێك لە دەستی من ڕزگارت دەبێت؟ پێغەمبەرەکە وتی: نەخێر، تۆ پێم بڵێ بە چ شتێك زاڵ دەبی بەسەر نەوەکانی ئادەمدا، دوو جار هەریەکەیان بەڵێنی خۆی لەوی تر وەرگرت، کە وەڵامی بداتەوە، پێغەمبەرەکە وتی خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ﴾ دوژمنی خوا وتی: بە ڕاستی من پێش ئەوەی تۆ لە دایك ببیت ئەوەم بیستووە،پێغەمبەرەکە وتی: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[1] واتە: وە ئەگەر خەتەرەو خەیاڵو وەوەسەیەکت بۆ هات لە لایەنی شەیتانەوە یەکسەر پەنا بگرە بە خوا بە ڕاستی هەر ئەو بیسەری زانایە. سوێند بە خوا کاتێك نەبووە کە هەستم بە تۆ کردبێت مەگین پەنام بردووە بە خوا لێت، دوژمنی خوا وتی: ڕاست دەکەی بەوە تۆ لە دەستی من ڕزگارت دەبێت، پێغەمبەرەکە وتی: پێم بڵێ تۆ بە چی شتێك زاڵ دەبیت بەسەر نەوەی ئادەمدا، شەیتان وتی: لە کاتی تورەیی‌وهەوەسپەرەستیدا.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: جەهەنەم جێگای هەموویانە، واتە: جێگای هەموو ئەوانەیە شوێنی شەیتان دەکەون، وەك خوای گەورە لەئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[3] واتە: هەر کەسێك لەو کۆمەڵانە بڕوای پێ نەکات لەناو ئاگردا جێی بۆ ئامادە کراوە.

### دەرگاکانی جەهەنەم حەوت دەرگان

پاشان خوای گەورە باسی ئەوەئەکات کەجەهەننم حەوت دەرگای هەیەوەك ئەفەرمێ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾واتە: جەهەنەم حەوت دەرگای هەیە، هەر دەرگایەکیشیان بۆ بەشێك لەوانە دیاری کراوە. خوای گەورە باسی دەرگاکانی جەهەنەم دەکات کە حەوت دەرگایە، هەر

---

[1] الاعراف (٢٠٠).

[2] الطبري (١٠٥/١٧).

[3] هود (١٧).

دەرگایەك لەوانە دەستەیەك لە شوێنكەوتووەكانی شەیتان دەچنە ژوورەوە پێیداو فەرمانی خودایەو دەبێت بێتەدیو دەربازبوون نیە لێی، خودا بمانپارێزێت لێی، هەریەكەو بە پێی كرداری خۆی لەو دەرگایەوە دەڕواتە ژوورەوە،و لە ناوەڕاستیو قوڵایی جەهەنەمدا دەمێنێتەوە.

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ۞ نَبِّئْ عِبَادِىٓ أَنِّىٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِى هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾

**باسی خەڵكی بەهەشتو گوزەرانیان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾ خوای گەورە باسی حاڵو گوزەرانی خەڵكی ناو ئاگری كرد پاشان دێتە سەر باسی خەڵكی بەهەشت كە لەناو باغاتو كانیاودا ژیان دەبەنە سەرو پێیان دەڵێن: بچنە ژوورەوە بە هێمنیو بێترس لە هەموو بەڵایەك، ترسی ئەوەشتان نەبێت كە لێی بێنە دەرەوەو هەرگیز دوایی نایەتو لەناویش ناچێت، هەرچی ڕقو كینەیەكتان لە دنیادا هەبووە لە دڵدا لە یەكتری لامان بردووە، دەبنە براو هەموویان لەسەر تەخت بەرامبەر یەكتری دادەنیشن، قاسم ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو ئومامەوە دەڵێت: خەڵكی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشت لەگەڵ ئەو ڕقو كینەیەدا كە لە دڵیان بووە لە دنیادا هەتا كاتێك كە هەقی یەكتری دەدەنەوەو بە یەكتری دەگەن، خوای گەورە ئەو ڕقو كینەیە لادەبات لە دڵیاندا كەلەدنیادا بوویانە لەیەكتری.[1] پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴾ ئەم ڕیوایەتە بەم شێوەیە هاتووە، ئەم قاسمە كە ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو ئومامەوەكەسێكی لاوازە، بەڵام ئەم ڕیوایەتە ڕێكە لەگەڵ ئەو فەرموودە سەحیحەی كە قەتادە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ئەبو متەوەكیلی ناجی بۆی گێڕاینەوە: كە ئەبو سەعیدی خودری بۆی گێڕاینەوە: كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (خاوەن باوەڕان ڕزگاریان دەبێت لە ئاگر، لەسەر پردێك لە نێوان بەهەشتو ئاگردا ڕادەوەستێنرێنو بەند دەكرێن ئەو هەقانەی لە دنیادا بەسەر یەكەوە بوویانە بۆیان وەردەگیرێت لە یەكتری، هەتا كاتێك كە پاكو پوخت بوونەوە، ڕێیان دەدەن كە بچنە ناو بەهەشت).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴾ واتە: لەوێدا نە ماندوو بوون ڕوویان تێدەكاتو نە هەرگیز لێی دەردەچن، وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا

---

[1] الطبري (١٧/١٠٧).

[2] البخاري (٦٥٣٥).

هاتووە: (خوای گەورە فەرمانی پێ کردووم (واتە بە پێغەمبەر(ﷺ) کە مژدە بدەم بە خەدیجە بە خانوویەك لە بەهەشتدا کە لە قەسەبە ، نە قرەقرو دەنگ بەرز کردنەوەی تێدایەو نە ماندوو بوون).[1]

﴿وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ﴾ واتە: هەرگیز لێی نایەنە دەرەوە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (دەوترێت بە خەڵکی بەهەشت، ئێوە ئیتر هەمیشە تەندروستن‌و هەرگیز نەخۆش ناکەون هەر دەژین‌و هەرگیز نامرن، هەمیشە لاون‌و پیر نابن‌و دەمێننەوەو هەرگیز نارۆن).[2] واتە: هەرگیز لە بەهەشت ناچنە دەرەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ﴾ واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر خۆمم لە تاوانەکان دەبوورم و دڵۆڤانم، جەزرەبەیشم زۆر بە ژانە، خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەر: ئەی موحەمەد (ﷺ)! هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر من خاوەنی بەزەییم‌و سزایشم زۆر توندو بە ژانە، وێنەی ئەم ئایەتە لە قورئاندا زۆرە کە خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە هەمیشە دەبێت لە خوا بترسن‌و بە هیوای بەزەیی‌و سۆزی خوداش بن‌و نائومێد نەبن.

﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾﴾

## میوانەکانی ئیبراهیم‌و مژدەدانیان پێی بە کوڕێك

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) هەواڵی بەسەرهاتی میوانانی ئیبراهیمیان پێ بڵێ، وتەی ﴿ضَيْفِ﴾ بەکاردەهێنرێت بۆ تاك‌و کۆمەڵیش وەك (الزور، السفر)، ﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ﴾ واتە: کاتێك چوونە ژوورەوە لای‌و وتیان سەلام، ئیبراهیم وتی: ئێمە لێتان دەترسین، باسی بۆ کردن کە بۆچی لێیان دەترسێت، چونکە کاتێك بینی کە دەست نابەن بۆ ئەو خواردنەی کە بۆی ئامادە کردبوون، کە گوێرەکەیەکی قەڵەوی برژاو بوو، ﴿ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ ﴾ واتە: وتیان: هیچ ترسێکت نەبێت، ﴿إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ﴾ واتە: ئێمە مژدەت دەدەینێ تۆ کوڕێکی زۆر زانات دەبێت، واتە: ئیسحاق (سەلامی خوای لێ بێت) وەك لە سورەتی (هود)دا لە پێشەوە باس کرا، ﴿ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِيَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴾ واتە:

---

[1] فتح الباري (٧/١٦٦)، مسلم (٤/١٨٨٧).

[2] مسلم (٤/٢١٨٢).

وتی: ئایا مزگێنیم پێ دەدەن لە کاتێکدا کە پیر بووم ئیتر چی مژدەیەکم دەدەنێ. زۆر سەری سوڕما چونکە خۆشیو ژنەکەیشی پیر بوون، خۆ بەڵێنی خودایش هەر دێتەجێ، بۆیە وتی: منێکی وا پیر بە چی مزگێنیم دەدەنێ! ﴿ قَالُوا۟ بَشَّرْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَـٰنِطِينَ ﴾ واتە: فریشتەکان وتیان: ئەو مژدەیەی پێمان دای ڕاستەو دەبێت، تۆ لە ڕیزی نائومێدان مەبە، ﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴾ واتە: ئیبراهیم وتی: کێ لە بەزەیی خودا نائومێدە مەگین لەڕێ لادەرەکان.

﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾

### هۆی هاتنی فریشتەکان

خوای گەورە باسی ئیبراهیم دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك کە ترسی نەماو مژدەی کوڕێکی پێدرا، دەستی کرد بە پرسیارکردن لە فریشتەکان لە بارەی ئەو کارەی کە بۆی هاتوون، ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ واتە: وتی: ئەی ڕاسپاردەکان ئێوە چ کارێکتان هەیە، ﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴾ واتە: وتیان: ئێمە بۆ سەر گەلێکی تاوانبار ڕەوانەکراوین، مەبەستیان هۆزی لوت بۆ (سەلامی خوای لێ بێت)، هەواڵیان دا بە ئیبراهیم کە کەس‌و کاری پێغەمبەر لوت ڕزگاریان دەبێت لەو سزاسە جگە لە ژنەکەی لووت کە توشی ئەو سزایە دەبێت‌و لەناو دەچێت، وەك خوای گەورە دەفـــەرموێت: ﴿ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴾ واتە: جگە لە خێزانی لووت، هەموویان ڕزگار دەکەین، ژنەکەی نەبێت کە بڕیارمان داوە دەبێت جێ بمێنێت‌و لەناو بچێت.

﴿ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾

### هاتنی فریشتە بۆ لای لووت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت)

خوای گەورە باسی لوت پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك کە فریشتەکان لە شێوەی چەند لاوێکی زۆر جوان‌و پێکەوتوودا چوونە ناوماڵەکەی وەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴾ واتە: لووت وتی: ئێوە کەسانێکن ناتان ناسین، فریشتەکان وتیان: بەڵام ئێمە شتێکمان هێناوە، کە

ئەوانە لێی دوودڵ بوون، کە سزایەکی سەختو لەناوبردنو ڕیشەکێشکردنیانە، کە بڕوایان نەدەکرد شتی وایان تووش ببێتو کارەساتێکی وایان بەسەردا بێت، ﴿ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾ واتە: ئێمە ڕاستیمان بۆ تۆ هێناوە، دیارە درۆ ناکەین، (لووت) یان دڵنیا کرد کە خۆیو کەسو کاری ڕزگار دەکەن بێجگە لە ژنەکەی، کە لەگەڵ هۆزەکەیدا لەناو دەچن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾[1] واتە: ئێمە فریشتە نانێرینە خوارەوە بە ڕاستو ڕەوانەبێت.

﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾

**فەرمان درا بە لووت (سەلامی خوای لێ بێت) بە شەو لەگەڵ کەسو کاریدا دەرچنو بڕۆن**

خوای گەورە باسی فریشتەکان دەکات کە فەرمانیان دا بە لووت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) بە خۆیو کەسو کاریەوە ماوەیەك لە شەو تێپەڕی دەربچن، لووت خۆی لە دوایانەوە بڕوات چاکترەو پارێزراوتر دەبن(بۆئەوەی ئاگاداربێت وکەس جێ نەمێنێ–وەرگێڕ)، پێغەمبەری خودایش (ﷺ) لە غەزاکاندا هەر بەو شێوەیە لە دواوە دەڕۆیشت بۆ ئەوەی ئەوانەی لاوازنو پەکیان دەکەوێ یامەتیان بداتو بەڕێیان بکات، خودای مەزن لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴾ واتە: کە ئەندازەیەك لە شەو ڕۆیشت تۆ خۆتو کەسو کارت دەرچن وخۆت لە دوایانەوە بڕۆ، هیچ کەسێك لانەکاتەوە، بۆ کوێ ڕێتان نیشان دەدرێت، بەرەو ئەو شوێنە بڕۆن، واتە: کاتێك کە گوێتان لە نەعرەتە بوو دای لەوانە، نەکەن لاکەنەوەو سەیریان بکەن، هەرچیان بەسەردێت لە سزاو بەدبەختی با بەسەریان بێت، وەك ئەوەی یەکێکیان لەگەڵدا بێت ڕێیان نیشان بدات وابوو، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴾ واتە: ئەم کارەمان بە وەحی بە لووت ڕاگەیاند، بێگومان لە بەرەبەیاندا ئەوانە دوابڕاو دەبنو هەموویان لەناو دەچن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾[2] واتە: کاتی دیاری کراویان بەرەبەیانە، ئایا بەیانی نزیك نیە ؟

---

[1] الحجر (٨).

[2] هود (٨١).

﴿ وَجَآءَ أَهۡلُ ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيۡفِي فَلَا تَفۡضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ نَنۡهَكَ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾

## چوونی خەڵکی شار بۆ لای فریشتەکان، وایان دەزانی ئەوانە پیاون

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَجَآءَ أَهۡلُ ٱلۡمَدِينَةِ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴾ واتە: خەڵکی شارەکە بەرەو ماڵی لووت هاتنو مژدەیان بە یەکتر دەدا، خوای گەورە باسیان دەکات کە چۆن بە هەلهەلەکێشان بەرەو ماڵی لووت کەوتنە ڕێ کاتێك کە زانیان میوانی هەیەو کۆمەڵێك لاوی جوانو شێوە شیرینن، ﴿ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيۡفِي فَلَا تَفۡضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ ﴾ واتە: لووت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) پێی گوتن: ئەوانە میوانی منن، ڕوو زەردی ئەوانەم مەکەن، لە خوا بترسنو ئابڕووم مەبەن، لووت (سەلامی خوای لێ بێت) پێش ئەوەی بزانێت ئەو فریشتانە ڕاسپاردەی خودانو ڕەوانەکراون ئەمەی وت، وەك لە سورەتی (هود) لە پێشدا باسکرا، بەڵام لێرەدا، دەیزانی ئەوانە فریشتەنو ڕەوانە کراون بۆ کارێك کە پێیان سپێردراوە، (هەرچەندە لێرەدا باسی هاتنی هۆزەکەیو مشتو مڕی لەگەڵیاندا عەتف کراوەتەسەرئایەتەکانی پێشوو، بەڵام ئەم (واوە) مانای (ترتیب) ناگەیەنێت، بە تایبەتی ئەگەر بەلگەیەك هەبێت پێچەوانەی ئەوەبسەلمێنێت، جا خەڵکی شارەکە وەڵامیان دایەوەو پێیان وت: ﴿ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ نَنۡهَكَ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: وتیان: پێمان نەگوتی نابێت کەس بێت بە لاتدا، میوانداری لە هیچ کەسێك نەکەی؟ ﴿قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴾ لووت پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) وتی: ئەوانە کچەکانمن، چیتان دەوێ وەرن لە ئەوان بیکەن، واتە: وەرن ئەوە کچەکانمەمارەی بکەم لێتان و ئەوەی خودا ڕێی پێداوە لێیان لەگەڵ ئەوان بیکەن، لە بارەیەوە بە ڕوونی لە پێشەوە باسی لێ کراوە، پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەینەوە، ئەم قسانە هەموو ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان نەیانئەزانی چ شتێك چاوەڕوانیان دەکاتو چیان بەسەر دێت، چ بەلایەك دەوری داون ولەملاّسدایەبۆیان و بەیانی چ سزایەك تووشیان دەبێت!! بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێت بە موحەمەد (ﷺ): ﴿ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ واتە: دە سوێند بە گیانی تۆ، ئەوانە لەبەر سەرخۆشی وێڵ و سەرگەردان بوون، خودای گەورە بە گیانی پێغەمبەر(ﷺ) سوێند دەخوات ئەمەیش ڕێزێکی زۆر گەورەو پلەو پایەیەکی بەرزو فراوانە کە خودا داویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی مالیکی نوکریی دەڵێت: لە ئەبو جەوزائەوە لە ئیبنو عەباسەوە کە وتوویەتی: خوای گەورە لە موحەمەد (ﷺ) بەڕێزترو چاکترو

نەفسو گیان پاکتری دروست نەکردووە، نەمبیستووە خودا سوێند بە گیانی هیچ کەسێك بخوات جگە لەگیانی ئەو، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ واتە: بە گیانی تۆ، وەبە تەمەنی تۆ، وەبە مانەوەی تۆلەدنیادا سوێندبێت، ﴿إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾[1] ئەوانەلەبەرسەرخۆشی خۆیان گومڕا بوون، ئەمە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە، قەتادە دەڵێت: ﴿لَفِي سَكْرَتِهِمْ﴾ واتە: لە گومڕاییاندا، ﴿يَعْمَهُونَ﴾ یاری دەکەن،[2] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿لَعَمْرُكَ﴾ سوێند بە ژیانی تۆ، ﴿إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ لەسەرخۆشی خۆیاندا دوو دڵو سەرگەردانن.

﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾﴾

## لەناوچوونو قڕبوونی هۆزی لووت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ﴾ واتە: لەگەڵ گزنگی خۆردا شریخەو گرمە گرتنی، وڵاتەکەیان سەرەوژێر بوو،سەرەوەی کەوتە ژێرەو ژێرەوەیشی کەوتە سەرەوە، وردە بەردی کلسیشی بەسەردا باراندن،، لە سورەتی (هود)دا (سجیل)مان بە تێرو تەواوی باسکرد پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەینەوە، وەك خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ﴾ واتە: هەموومان سەرەوژێر کردو گڵی بەردینمان بەسەردا باراندن، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ واتە: بە ڕاستی لەم ڕووداوەدا زۆر بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی کە خەڵکی شایستەن، واتە: پاشماوەی ئەم جەزرەبەو بەڵایە کە بە چاو دەبینرێت کە هات بەسەر ئەم وڵاتەدا پەندو دەرسێکی زۆر چاکە بۆ کەسێك کە دڵ زیندوو وشیارە، وەك موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ دەڵێت: ئەوانەی کە وشیارنو فیراسەتیان هەیە.[3] ئیبنو عەباسو زەحاك دەڵێن: بۆ

---

[1] الطبري (١٧/٧٨).

[2] الطبري (١٧/١١٩).

[3] الطبري (١٧/١٢٠).

ئەوانەی خاوەن ئەزموونن[1]. قەتادە دەڵێت: بۆ ئەوانەی پەند وەردەگرن.[2] ﴿لِلْمُتَوَسِّمِينَ﴾ واتە: ئەوانەی کە ڕادەمێنن.

**شاری سەدووم لە سەرڕێدایە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ﴾ واتە: ئێستاش شوێنەواری ئەوان لەسەر ڕێگەی ئاوەندایە، شاری سەدوم ئەو کارەساتەی بەسەر هاتو سەرەوژێر بوو بەردەباران کراو لەبەر چاوی خەڵکیش کەوت، وای لێهات بووە دەریایەکی بۆگەنو پیس لەسەرە ڕێیەگی پانو بەریندا، کە هەتا ئێستاش خەڵکی پێیدا دێنو دەچن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[3] واتە: بە ڕاستی ئێوە بەیانیان بە لایاندا دەڕۆن هەروەها بە شەویش، چۆن لەئەو ڕووداوە تێ ناگەن؟ پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئا لەمەدا بەڵگە زۆرە بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕن، واتە: ئەوەی بەسەری هۆزی لووتماندا هێناو قڕمان تێخستنو سەروژێرمان کردنو لووتو خاوخێزانمان ڕزگارکرد جگە لە ژنەکەی، نیشانەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

﴿وَإِن كَانَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ لَظَالِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾﴾

**خاوەنی پیشەو داریش (هۆزی شوعەیب) لەناو چوون**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ لَظَالِمِينَ﴾ واتە: خاوەنی باخە پڕو چڕەکانیش لەسەر ناهەقی بوون، خاوەن باخە پڕو چڕەکان هۆزی شوعەیبن (سەلامی خوای لێ بێت) زەححاك و قەتادەو کەسانی تریش دەڵێن: ﴿الْأَيْكَةِ﴾ درەختی چڕو پڕە[4]، ناهەقیەکەیشیان بریتی بووە لە شەریك دانان بۆ خوداو ترزووبازیو ڕێگری بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: تۆڵەمان لەوانیش کردەوە، کە هەردووکیان وان بەسەر کاروانە ڕێوە، خوای گەورە هەقی لێ سەندن بە شریخەو گرمەو زەمین لەرزەو جەزرەبەی ڕۆژی هەورو سێبەر، شوێنەکانیان لە شوێنی هۆزی لووتەوە نزیك بوو هەرچەندە ماوەکەیان زۆر بوو، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[1] الطبري (١٢١/١٧).

[2] الطبري (١٢١/١٧).

[3] الصافات (١٣٧-١٣٨).

[4] الطبري (١٢٥/١٧).

﴿وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: هەردوو هۆزەکە شوێنیان لەسەریەك ڕێگادا بوو، ئیبنو عەبباس و موجاهیدو زەححاك و کەسانی تریش هەر وایان وتووە، ﴿وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: ڕێگایەکی دیارو ئاشکرا،[1] بۆیە کاتێك شوعەیب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) هەڕەشەی لە هۆزەکەی کرد، لە هەڕەشەکەیدا وتی: ﴿وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ﴾[2] واتە: بەسەرهاتی هۆزی لووتیش زۆر دوور نیە لێتانەوە.

﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾

**تیاچوون و قڕبوونی خەڵکی حیجر (هۆزی سەمود)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمْ ءَايَٰتِنَا فَكَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ واتە: خەڵکی حیجریش (الحجر) پێغەمبەرەکانی خۆیان بە درۆزن دەزانی، نیشانەی خۆشمان بۆ ناردن، بڕوایان بە هیچ نیشانەیەکیان نەکرد، خەڵکی حیجر، هۆزی سەمود بوون کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکەیان کە سالح بوو (سەلامی خوای لێ بێت) نەکرد، هەر کەسێك بڕوای بە پێغەمبەرێك نەبێت، وەك ئەوە وایە کە بڕوای بە هەموو پێغەمبەرەکان نەکردبێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَٰبُ ٱلْحِجْرِ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە نیشانەی زۆری بۆ ناردن کە بەڵگە بێت لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی سالح (سەلامی خوای لێ بێت) وەك ئەو وشترەی کە لەو بەردە ڕەقە دەری هێنا بۆیان بە دوعای سالح لە وڵاتەکەیاندا لەوەڕی دەخواردو ئاوەکەشیان ڕۆژێکی بۆ خۆیان بوو، ڕۆژێکیش بۆئەم وشترە بوو، کاتێك دەستیان دایە لاساری و وشترەکەیان سەربڕی، پێغەمبەر سالح (سەلامی خوای لێ بێت) پێی وتن: ﴿تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾[3] واتە: لە ماڵی خۆتاندا سێ ڕۆژ ڕابوێرن، ئەمە بەڵێنی خودایەو درۆ نیە، خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾[4] واتە: ئێمە ڕێگەی بەرەو خۆمان نیشانی هۆزی سەمود داکەچی لەباتی شارەزابوون حەزیان کرد نابینا بن، لێرەدا خوای گەورە باسی هۆزی سەمود دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَكَانُوا۟ يَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ﴾ واتە: لە شاخەکاندا

---

[1] الطبري (١٧/١٢٥).

[2] هود (٨٩).

[3] هود (٦٥).

[4] فصلت (١٧).

خانوویان دەتاشی هەتا لێیان بێ ترس بن‌و نەڕوخێن، هیچ پێویستیەکیان بەو خانووانەش نەبوو، بەڵکو بۆ خۆشی‌و ڕابواردن‌و فیزکردن بوو، وەك ئەوەی ئێستا دەبینرێت لەو خانوانەی کە دروستیان کردووە لە شیوی حیجر دا ئەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە لایدا تێ پەڕی‌و بەرەو تەبوك کەوتەڕێ، سەری دانەواندو ولاغەکەی بە پەلە لێخوڕی‌و فەرمووی بە هاوەڵەکانی: (مەچنە ناو ماڵی هۆزێك کە سزا درابن مەگین کاتێك کە بگرین، خۆ ئەگەر گریانتان نەهات، خۆتان بگرێنن لە ترسی ئەوەی نەکا ئەوەی تووشی ئەوان بوو، تووشی ئێوەش ببێت).[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فاخذتهم ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ واتە: لە بەرەبەیانێکدا شریخەو گرمە گرتنی، هەرچی پەیدایان کردبوو هیچ سودێکی بێ نەگەیاندن، واتە: ئەوەی وەدەستیان هێنابوو لە کشتوکاڵ‌و بەروبوومی باغ‌و بەرە، ئەوەندە چاوچنۆك بوون وشترەکەیان کوشت، هەتا ئاوەکە بەشیان بکات،ئەوانەهەمووی هیچ سوودێکی نەبوو بۆیان، ئەو ماڵ‌و سامانە فریایان نەکەوت‌و لەو بەڵایە ڕزگاری نەکردن، کە خوای گەورە بۆی ناردن.

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾﴾

**ئەم دنیایەبۆمەبەستێکی تایبەت دروست کراوە، ڕۆژی قیامەت بەڕێوەیە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ ۖ﴾ واتە: ئاسمانەکان‌و زەمین‌و ئەوەی لەنێوانیان دایە، بۆ ڕاستیمان وەدی هێناون، لە چەند ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ﴾[2] واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە چاکەی باشیش دەربارەی کار چاکان بکات، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾[3] واتە: ئێمە ئاسمانەکان‌و زەمین‌و ئەوەی لە نێوانیاندایە بە خۆڕایی دروستمان نەکردووە، ئەوانەی خوانەناسن وا بیردەکەنەوە، هاوار بۆ ئەوانەی خوانەناسن بۆ ئەو ئاگرەی تێی دەچن. وە دەفەرموێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ

---

[1] احمد (٢/٩١)،فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] النجم (٣١).

[3] ص (٢٧).

ٱلۡكَرِيمِ﴾[1] واتە: ئاخۆ ئێوە واتان زانیووە بە گەمە ئێوەمان دروست کردووەو ناتانگەڕێنینەوە بۆ لای خۆمان؟ پایەبەرزی هەر بۆ خوایە، کە پاشای ڕاستەقینەیە، هیچ پەرستراوێکی تر جگە لەو نیەو هەر خۆیەتی پەروەردگاری تەختی مەزن ﴿ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ﴾. پاشان خوای گەورە هەواڵی ڕۆژی قیامەت دەدات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە هەر دێتو گومانی تێدا نیە، ﴿فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ﴾ واتە: تۆش بە جوانی چاوپۆشی بکە لەو موشریکانە کە ئازارت دەدەنو بڕوا ناکەن بەو پەیامەی کە بۆت هێناون، وەك لەم ئایەتەی تریشدا دەفەرموێت: ﴿فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾[2] واتە: تۆ چاوپۆشی بکە لەوانەو بڵێ: ئێستا مەترسن، لەمەودوا دەزانن! قەتادەو موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: ئەم ئایەتە لە پێش فەرمان کردن بووە بە جەنگ، ئەم ئایەتە لە مەککە هاتووە، فەرمان بە جەنگ دوای کۆچ کردن بووە بۆ مەدینە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ واتە: بێگومان هەر پەروەردگارت وەدیهێنی زانایە، ئەمە سەلماندنی ڕۆژی قیامەت دەگەیەنێت کە خوای گەورە دەتوانێت ڕۆژی قیامەتیش بێنێت، چونکە خودا وەدیهێنەرێکی وایە، هیچ شتێکی لە لا گران نیەو ئەو تەنو لاشانەیش کە لە هەموو بەشەکانی سەر زەمیندا پەرشو بڵاو دەبنو دەڕزێن لێی ون نابێتو ئاگای لێیەتی، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾[3] واتە: ئایا کەسێك توانای هەبێت ئەم ئاسمانانو زەمینە دروست بکات، توانەی نیە وێنەیان دروست بکاتەوە؟ بەڵێ لە تواناییدا هەیەو دروستکەرو زۆر زانا هەر خۆیەتی، هەر کاتێك هەر شتێکی بوێ پەیدا ببێت، کە پێی بڵێت ببە! دەبێت، پاکیو بێ عەیبی بۆ کەسێك کە هەموو شت لە ژێر فەرمانی ئەودایە، هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە.

﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾

[1] المؤمنون (١١٥ـ١١٦).

[2] الزخرف (٨٩).

[3] يس (٨١ـ٨٣).

## قورئان نعمەتێکی گەورەیە بەسەرخەڵکەوە و ئەرکیشە لەسەرئیماندارخەڵکی بۆبانگ بکات

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ واتـە: ئێمـە حـەوت ئایەتی دووبارەکراوەمان (کەسورەتی فاتیحایە) داوە بە تۆ هەروەها قورئانی گەورەیش ، خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) وەك چۆن ئێمە قورئانی پیرۆزمان داوە بە تۆ، تۆش چاو مـەبڕە خۆشیو ڕازاوەیی دنیـاو ئـەو خۆشگوزەرانیەی کـە داومانـە بـە خـەڵکی دنیـا، تێیـدا سـەرقاڵو پـاش ماوەیەك دەبڕێتەوەو نامێنێت، ئێمە تاقیان دەکەینەوە پێی، ئاواتەخواز مەبە بە مـاڵو ژیـانی ئەوانـەو زۆریش خەمیان مەخۆو دڵگران مەبە بۆیان، کە بڕوات پێ ناکەنو دژایەتیت دەکەن، ﴿وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾[1] واتە: باڵی بەزەیت ڕاخە بۆ ئەوانەی شوێنت دەکـەون لـە خـاوەن بـاوەڕان، وەك لە ئایەتێکی تردا خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[2] واتـە: پێغەمبـەرێکتان بـۆ هاتووە لە خۆتانە، هەر بەڵایەك بەسەرتاندا بێت لای گرانە، زۆر دڵی لای ئێوەیە، دڵسۆزی باوەڕدارانەو دڵۆڤانە، جیاوازی ڕاوبۆچوون هەیە لە نێوان زانایاندا لەسەر ئەم حەوت شتە دووبارەیە، ئایا ئەم حەوت شتەدووبارەیە کامەیە؟ ئیبنو مەسعودو ئیبنـو عومـەرو ئیبنـو عـەبباسو موجاهیـدو سـەعیدی کـوڕی جوبەیرو زەححاكو کەسانی تریش ئەڵێن: ئەو حەوت سورەتە درێژەیە، مەبەستیان سورەتی (البقرة، ال عمران، النساء، المائدة، الانعام، الاعراف، یونس)ە سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر دەڵێـت: ئەرکـەکانو سنوورەکانو بەسەرهاتەکانو بڕیـارە شـەرعیەکانیان تێـدا ڕوون کراوەتـەوە، ئیبنـو عـەبباس دەڵێـت: نموونـەی زۆرو دەنـگو بـاسو پەنـدو ئامۆژگاریـان تێـدا بـاس کـراوەو ڕوون کراوەتـەوە.[3] ڕای دووەم: سـورەتی (الفاتحـة) حـەوت ئایەتـە، کـە ڕیوایـەت کـراوە لـە عـەلیو عومـەرو ئیبنـو مەسـعودو ئیبنـو عەباسەوە، ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئایەتی حەوتەمی سورەتی (الفاتحة)یە، خـوای گەورە ئێوەی تایبەتمەند کـردووە پێیـەوە.[4] ئیبراهیمـی نەخـەعیو عبـدالله ی کـوڕی عبیـدالله ی کـوڕی

---

[1] الشعراء (٢١٥).

[2] التوبة (١٢٨).

[3] الطبري (١٧/١٣٠ـ١٣٢).

[4] الطبري (١٧/١٣٣).

عومەیرو ئیبنو ئەبی مولەیکەو شەهری کوڕی حوەیشیبو حەسەنی بەسریو موجاهیدیش هەر وایان وتووە.[1] ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لێرەدا دوو فەرموودەی هێناوە:

**فەرموودەی یەکەم:** لە ئەبو سەعیدی کوڕی ئیبنول موعەللاوەدەیگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەر بە لامدا ڕۆیشت، من نوێژم دەکرد، بانگی کردم نەچووم بۆ لای هەتا نوێژەکەم کرد، پاشان چوومە خزمەتی، فەرمووی: (چی ڕێگری لێ کردی کە بێیت بۆ لام؟) وتم: نوێژم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا خودا نەیفەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ ﴾[2] (واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە وەڵامی خواو پێغەمبەر بدەنەوە کاتێك کە بانگتان دەکات)، فەرمووی: ئایا گەورەترین سورەتت فێر بکەم لە قورئاندا پێش ئەوەی لە مزگەوت بڕۆمە دەرەوە)، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت لە مزگەوت بچێتە دەرەوەمنیشقسەکەم وەبیر خستەوە، فەرمووی: (الحمد لله رب العالمین) ئەوە حەوت دووبارە کراوەکەیەو ئەو قورئانەیە کە پێم بەخشراوە.

**فەرموودەی دووەم:** لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (دایکی قورئان (أم القران) ئەو حەوت دووبارە کراوەیەو ئەم قورئانە گەورەیە).[3] ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەودەقە لەسەر ئەوە کە سورەتی (الفاتحة) ئەم حەوت ئایەتە دووبارەیەو هەروەها ئەم قورئانە گەورەیشە ، بەڵام ئەمە پێچەوانەی وەسفی حەوت سورەتە درێژەکە نیە (السبع الطوال) کەهەمان وەسفی پێ بکرێت، چونکە ئەم سورەتانەیش هەمان وەسفی تێدایە، هەروەها پێچەوانەی وەسفی هەموو قورئانیش نیە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ ﴾[4] واتە: خودا چاکترین قسەی ناردووەتە خوارەوە، کتێبێك کە قسەکانی لە جوانیدا وەك یەکنو هەر دووبارەش دەکرێتەوە، چونکە ئەم قورئانە لە یەك دەچێت لە ڕوویەکەوەو دووبارەش دەکرێتەوە لە ڕوویەکی ترەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ﴾ واتە: چاو مەبڕە ئەو شتەی داومانە بە کۆمەڵێك لەوانە، ﴿وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾ واتە: خەمیان مەخۆ، واتە: پشت ئەستوور بە بەوەی کە خودا ئەو قورئانە پیرۆزەی پێ بەخشیوی، چاوت مەبڕە ئەو گوزەرانو ڕابواردنە کەمەی ئەوانە لە دنیادا بەسەری دەبەنو دەڕواتو نامێنێت، عەوفی دەڵێت: لە

[1] الطبري (١٧/١٣٥).

[2] الانفال (٢٤).

[3] فتح الباري (٨/٢٣٢).

[4] الزمر (٢٣).

ئیبنو عەباسەوە، ﴿لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ﴾ خودا ڕێی نەداوە بە کەس خوازیاری شتێك بێت کە هاوەڵەکەی هەیەتیو چاوی تێ ببڕێت.[1] موجاهید دەڵێت: ﴿إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ واتە: دەوڵەمەندەکان،[2] واتە: چاو نەبڕیتە دەوڵەمەندەکان کە تۆش وەك ئەو دەوڵەمەند بیت، ﴿وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: باڵی بەزەیی ڕاخە بۆ خاوەنباوەڕان.

﴿وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾﴾

**ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوەیە**

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ﴾ واتە بڵێ: من ترسێنەرێکی ڕوون کەرەوەم، ترسێنەرێك بۆ خەڵکی لە سزایەکی بە ژان کە تووشیان ببێت بە هۆی ئەو بێدینیو دوورییەیان لە خواوە، ئەوسزای کە تووشی گەلە پێشووەکانی بەر لە خۆیان هات چونکە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد،بۆیە تووشی ئەو جەزرەبەیە هاتن، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو موساوە، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (وێنەی منو وێنەی ئەو شتەی (پەیامەی) کە خودا منی پێ ناردووە، وەك نموونەی پیاوێکە کە هاتوە بۆ لای هۆزەکەی پێیان ئەڵێ: ئەی هۆزەکەم، من ئەو سوپایەم بە چاوی خۆم بینی(کەنیازی هەلاماردانی ئێوەیەتی)، بە ڕاستی من ئەو عریانە ترسێنەرەم، ڕاکەن، ڕاکەن، (واتە خۆ ڕزگار بکەن) دەستەیەك لە هۆزەکەی بە گوێیان کردو بە شەو ڕایان کردو لەسەر خۆیان دەرچوونو ڕزگاریان بوو، دەستەیەکی تریان بڕوایان پێ نەکرد لە شوێنی خۆیاندا تا بەیانی مانەوە، لە بەرەبەیاندا سوپاکە دای بەسەریاندا داگیری کردنو لەناوی بردن، ئا ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە کە گوێڕایەڵی منیان کردو شوێنی ئەو شتەئەکەون کە من هێناومە، نموونەی ئەوانەشە کە بەرفەرمانم نابنو یاخی ئەبنو بڕواناکەن بەو هەقەی کەبەمندا نێردراوەبۆیان)[3].

---

[1] الطبري (١٤١/١٧).

[2] الطبري (١٤١/١٧).

[3] فتح الباري (٢٦٤/١٣)، مسلم (١٧٨٨/٤).

**ماناى (المقتسمين)**

خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴾ واتـە: وەك ئـەوەی کـە ناردمـان بـۆ بەشـکەرەکان، ﴿ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴾ واتـە:هاوپـەیمانان، ئەوانـەی کـە پـەیمانیان بـە یـەکتری دا کـە دژی پێغەمبـەران ڕاوەسـتن‌و بڕوایـان پـێ نەکـەن‌و ئازاریـان بـدەن، وەك خـوای گـەورە باسـی هـۆزی سـاڵح دەکات‌و دەفەرموویت: ﴿قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥ﴾[1] واتە: وتیـان ئێـوە سـوێند بخـۆن ئێمـە ئەمشەو خۆی و ماڵ‌و منداڵی دەکوژین، موجاهید دەڵێت: سوێندیان خواردو پـەیمانیان دا بـە یـەکتری، وە دەفەرموویت: ﴿وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ﴾[2] واتـە: سـوێندیان دەخـواردو ڕەش هەڵدەگەڕان‌و دیان وت: بە خـودا، خـودا کەسـێکی مرانـد زینـدووی ناکاتـەوە، وە دەفـەرموویت: ﴿أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ﴾[3] واتـە: ئایـا هـەر ئێـوە نـەبوون پێـشتر سوێندتان دەخوارد، کە هـەرگیز لـەناو ناچـن؟ وە دەفـەرموویت: ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍ﴾[4] واتە: ئایا ئەوانە ئەو کەسانە نین کە ئێوە سوێندتان دەخوارد کە بەر بەزەیی خودا ناکەون؟ ئەوەندە گومڕا بووبوون کە بڕوایان بە شتێك نەدەکرد لە دنیادا سوێندێکیشیان لەگەڵ دەخـوارد، بۆیـە ناونران بە سوێند خۆرەکان﴿ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴾ ، ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلۡقُرۡءَانَ عِضِينَ﴾ ئەوانـەی کە قورئانیـان بەش بەش کرد، واتە: ئەو کتێبانەی کە بۆیان دەهـات، بـەش بەشیان دەکـرد، بڕوایـان بـە هەنـدێکی دەکردو بڕوایان بە هەندێکی نـەدەکرد، بوخـاری ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئیبنـو عەبباسـەوە:کەلـەمانای ﴿جَعَلُواْ ٱلۡقُرۡءَانَ عِضِينَ﴾دا وتوویەتی: ئەوانە ئەهلی کتێب بـوون کـە کتێبـەکانیان بـەش بـەش کـردو بڕوایان بە هەندێکی دەکـردو بڕوایـان بـە هەنـدێکی نـەدەکرد.[5] ئـەڵێن: مەبـەست لـە سـوێندخۆرەکان، ﴿ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴾ قورەیشە، وەمەبەست لـە قورئـانیش ئـەم قورئانەیـە، وە مەبەسـتیش بـە ﴿عِضِينَ﴾ بەش بەشکردنیش ئەوەیە کە عەتا وتوویەتی: هەندێکیان دەڵێن جادووگـەرە، هەنـدێکی تریـان دەڵێن فاڵچیە، هەندێکی تریشیان دەڵێن شێتە، هەر بەم شێوەیە لـە زەحـاك‌و کەسانی تریشەوە ڕیوایـەت

[1] النمل (٤٩).
[2] النحل (٣٨).
[3] ابراهيم (٤٤).
[4] الاعراف (٤٩).
[5] فتح الباري (٨/٢٣٣).

کراوە. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە: کە کۆمەڵێك لە قورەیشیەکان لە وەلیدی کوڕی موغیرە کۆبوونەوە کە خاوەنی ڕێز بوو لە نێوانیاندا، کاتی حەج نزیك بوبووەوە، وەلید پێی گوتن: ئەی خەڵکی قورەیش ئەوە کاتی حەج نزیك بووەتەوە، لە هەموو لایەکەوە عەرەبەکان دێن بۆ حەج بۆ لای ئێوە، دەنگو باسی ئەم هاوەڵەی ئێوەمان (موحەمەد) ئەزانن، هەمووتان لەسەر یەك قسە ڕێکەون دەربارەی ئەو، جیاواز مەبن، یەکتری بە درۆ بخەنەوەو دژی یەکتری قسە بکەن، وتیان: ئەی باوکی عبدالشمس تۆ قسە بکەو ڕێمان بۆ دابنێ هەتا ئێمەش ئەوە بڵێین، وەلید وتی: نەخێر ئێوە قسە بکەن، من گوێ دەگرم، وتیان: ئێمە دەڵێین: فاڵچیە، وتی: فاڵچی نیە، وتیان:بابڵێین: شێتە، وتی: شێت نیە، وتیان: ئەڵێین: شاعیرە، وتی: شاعیریش نیە، وتیان: جادووگەرە، وتی: جادووگەر نیە، وتیان: باشە ئەی چی بڵێین؟ وتی: سوێند بە خوا قسەکانی ئەوەندە جوانو شیرینە، ئێوە هەرچی بڵێن لە بارەیەوە مەگین خەڵکی دەزانێ قسەکەتان پڕوپوچە، چاکترینو نزیکترین قسە ئەوەیە کە بڵێن: جادووگەرە، بەو شێوەیە لە لای هەڵسان، خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەسەریان ناردە خوارەوە: ﴿ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ واتە: سوێند بە پەروەردەت لە هەموویان دەپرسینەوە، لەسەر ئەو کارانەی کە دەیانکرد، واتە: ئەو کەسانەی کە ئەو قسەیان وت بە پێغەمبەر(ﷺ) لێیان دەپرسینەوە.[1] ئەبو جەعفەر دەڵێت: لە ڕەبیعەوە لە ئەبولعالیەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ دەڵێت: هەموو بەندەکانی خودا پرسیاریان لێ دەکرێت لە دوو شتدا لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو شتەی کە پەرستوویانەولەوەش کە چۆن وەڵامی پێغەمبەرانیان داوەتەوە.[2] عەلی کوڕی ئەبو تەلحەئەڵێ: ئیبنو عەباس لەمانای ئەم ئایەتانەدا: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ پاشان لەمانای ئەم ئایەتەشدا کەئەفەرموێ: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ﴾[3] (واتە: لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێك لە مرۆڤو جنۆکە لەو گوناهەی کە کردوویانە پرسیاریان لێ ناکرێت)فەرموویەتی: پرسیاریان لێ ناکرێت ئایا ئەو کارەتان کرد؟ چونکە خودا باشتر لە خۆیان ئاگادارترە لێیان، بەڵکوپێیان ئەوترێ: بۆچی ئەو شتەو ئەو شتەتان کرد؟[4]

---

[1] ابي هشام (٢٨٨/١).

[2] الطبري (١٥٠/١٧).

[3] الرحمن (٣٩).

[4] الطبري (١٥٠/١٧).

﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدۡرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾

## فەرمانکردن بە ڕاگەیاندنی هەق بەڕوون و ئاشکرایی

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد (ﷺ) ئەو پەیامەی کە پێیدا ناردووە ئاشکرای بکاتو ڕایگەیەنێت، ڕووبەڕووی موشریکەکان بوەستێو بەردەوام بێت لەسەری، وەك دەفەرموێت: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾ واتە: هەر فەرمانێك بە تۆ دەدرێت ئەی موحەمەد ئاشکرای بکە، ئیبنو عەبباس لەم ئایەتەدا: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾ دەڵێت: بەردەوام بە لەسەری.[1] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (إفعل ما تؤمر) موجاهید دەڵێت: مەبەست پێی خوێندنی قورئانە لە کاتی نوێژدا بە ئاشکرا.[2] ئەبو عوەبیدە دەڵێت: لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە: پێغەمبەر(ﷺ) خۆی دەرنەدەخستو خۆی دەشاردەوە هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ ﴾ خۆیو هاوەڵەکانی هاتنە دەرەوە[3].

## فەرماندان بە وازهێنان لە بتپەرستانو بەڵێن بە لەکۆڵکردنەوەی گاڵتەچیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴾ واتە:واز لە بتپەرستان بێنە، ئێمە گاڵتەچیانت لە کۆڵ دەکەینەوە، ئەوەی کە لە لای پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە ڕایبگەیەنە، هیچ گوێ مەدە بە بتپەرستان ئەوانەی کە دەبنە لەمپەر لە ڕێگەی تۆدا بۆ ڕاگەیاندنی نیشانەوئایەتەکانی خودا، ﴿وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ﴾[4] واتە: حەز دەکەن تۆ نەرم بیت لەگەڵیانو ئەوانیش نەرمی بنوێنن، هیچ لێیان مەترسە، خودا دەتپارێزێتو ئەوانەت لە کۆڵ دەکاتەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾[5] واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) هەر شتێکت لە لایەن پەروەردگارتەوە، بۆ هاتووە، ڕایبگەیەنە، ئەگەر وانەکەی ڕاسپێریت بەجێ نەهاتووە، خودا لەو خەڵکە

---

[1] الطبري (١٧/١٥١).

[2] الطبري (١٧/١٥١).

[3] الطبري (١٧/١٥٢).

[4] القلم (٩).

[5] المائدة (٦٧).

دەتپارێزێت، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: گاڵتەچیەگەورەکان پێنج کەس بوون، هەمووبەتەمەن ودەم سپی هۆزەکەیان بوون یەکێك لەوانە لە بەنی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوزای کوڕی قوسەی بووکەناوی :ئەسوەدی کوڕی موتەلب ئەبو زەمەعەبوو، پێغەمبەری خودا وەك پێم گەیشتووە،ئەم دوعایەی لێ کردوە، کاتێك کە گاڵتەی پێ ئەکردو ئازاری دا، فەرمووی: (ئەی خودایە چاوی کوێر بکەو کوڕیشی بکوژە). وە لە بەنی زوهرەش ئەسوەدی کوڕی یە غوثی کوڕی وەهەبی کوڕی عبدالمنافی کوڕی زوهرە، و لە بەنی مەخزوم وەلیدی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدولای کوڕی عومەری کوڕی مەخزوم. و لە بەنی سەهمی کوڕی عەمری موڕی هویەیسس ی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەیش عاس کوڕی وائیل کوڕی هشامی کوڕی سەعیدی کوڕی سەعد. و لە خزاعەش حارسی کوڕی تولاتیلەی کوڕی عەمەری کوڕی حارس کوڕی عەبدو عەمری کوڕی میلکان هەبوون،ئەمانە کاتێك کە بەردەوام بوون لەسەر خراپەکاری‌و زۆر گاڵتەیان بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيۡنَٰكَ ٱلۡمُسۡتَهۡزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾ ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: یەزیدی کوڕی ڕومان بۆی گێڕامەوە لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوەیان لەهەندێ زانای ترەوە، کە جوبرەئیل هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) دەسوڕایەوە بە دەوری کەعبەدا (تەواف بەیتی ئەکرد)، جوبرەئیل بە پێوە وەستاو پێغەمبەریش (ﷺ) لە تەنیشتیەوە ڕاوەستا، ئەسوەدی کوڕی موتەلیب بە لایدا تێپەڕی گەڵایەکی سەوزی کێشا بەنێو چاوانیدادەمودەست کوێر بوو، ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغوسیش بە لایدا ڕۆیشت هێمای (ئیشارەتی) کرد بۆ لای سکی توشی ئاوبەند بوو (نەخۆشیەکە سك هەڵدەئاوسێت‌و ئاوی تێ دەچێت) خودا بەو نەخۆشیە کوشتی، وەلیدی کوڕی موغیرەش بە لایدا ڕۆیشت، ئیشارەتی کرد بۆ برینێك کە لە لای خوارەوەی پاژنەی پێیەوە بوو کە پێش دوو ساڵ تووشی بووبوو، کراسەکەی ڕائەکێشابەدوای خۆیدا، چوو بۆ لای پیاوێکی خزاعەیی کە تیری بۆ چاك دەکرد یەکێك لە تیرەکانی ئەو پیاوە گیرایە کراسەکەی‌و پێی بریندار کرد، برینەکەی برینێکی وا نەبوویەوئامازەکردنەی جوبرەئیل بۆی ئەو برینەکەی هاتەوەسۆو کوشتی، عاصی کوڕی وائیلیش دای بەلایاندا وجوبرەئیل ئامازەیەکی کرد بۆ پاژنەی پێ یو بەرەو تایف کەوتەڕێ بە سواری کەرێك کە هەیبوو،لەڕێگەدا کەوت بەسەر شتێکی تیژداو چوو بە ژێری پێیداو کوشتی، حارسی کوڕی تەلاتیلە بە لایدا ڕۆیشت جوبرەئیل ئیشارەتی کرد بۆ سەری، سەری بوو بە کێم‌و جەراحەت‌و کوشتی.[1] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَجۡعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾ ئەو کەسانەی جگە لە خوا شتی تریش

[1] ابن هشام (٤٠٩/١، ٤١٠)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

دەپەرستن، لە پاشان لێی تێ دەگەن، ئەمە هەڕەشەیەکی توندو تیژە لەو کەسانەی کە جگە لە خودا شتێکی تر دەپەرستنو دەیکەنە هاوەڵی خودا.

**هەڵنان بۆ خۆگرتن لەسەر ناڕەحەتیو فەرماندان بە خۆخەریك كردن بە تەسبیحاتو خواپەرستیەوە هەتا مردن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ واتە: ئێمە دەزانین کە تۆ لە قسەی ئەمانە دڵتەنگ دەبیت، سا هەر سوپاسی پەروەردگاری خۆت بکەو لە ڕیزی سوژدەبەران بە، واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) ئێمە ئاگامان لێیە کە ئازارت دەدەن،تۆش خەفەت دەخۆیو دڵت تەنگ دەبێت، با ئەو ئازارە کۆڵت پێ نەداتو ماندووت نەکات لە گەیاندنی پەیامی خودا، پشت بە خوا ببەستەو خودا دەتپارێزێتو یارمەتیت دەداتو زاڵت دەکات بەسەریاندا، بەردەوام سوپاسو تەسبیحاتی خوا بکەو نوێژ بکەو خەریکی خواپەرستی بە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ﴾. وەك لەو فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە هاتووە: لە نوعەیمی کوڕی هەممارەوە (نعيم بن همّار) کە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (خوای گەورە فەرموویەتی ئەی نەوەی ئادەم! ماندوو مەبەو دەستەوسان مەبە، لە چوار ڕکات نوێژ لە سەرەتای ڕۆژەوە، من بەسم بۆ تۆ لە دواییەکەیدا).[1] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ﴾ واتە: پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت. بوخاری دەڵێت: سالمی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت: ﴿ٱلْيَقِينُ﴾ واتە: مردن.[2] وەك ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سالمی کوڕی عەبدوڵاوە: ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ﴾ دەڵێت: مەبەست پێی مردنە.[3] بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە ئوموعەلاوە کە ژنێکی ئەنساریە کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە لای عوسمانی کوڕی مەزغون کە مردبوو، ئوموعەلاء وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەبو سائب، من شایەتیت بۆ دەدەم کە خوا ڕێزی لێ ناوی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تۆ چۆن دەزانی خوا ڕێزی لێ ناوە؟) وتم: دایكو بابم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەی کێ خودا ڕێزی لێ دەگرێت؟ فەرمووی: (ئێستا ئەویەقینی بۆهاتوە (مردن یەخەی پێ

---

[1] احمد (٥/٢٨٦)، فەرموودەیەکی باشە (جید)، سەنەدەکانی حەسەنی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٨/٢٣٥).

[3] الطبري (١٧/١٦٠).

گرتووە) من هیوای چاکەی بۆ دەخوازم).[1] ئەم ئایەتە: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾ بەلگەیە لەسەر ئەوە کە خواپەرستی وەك نوێژو ئەو شتانەی واجبن لەسەر مرۆڤو هەتا ئاوەزی لەسەر خۆی بێت دەبێت نوێژ بکات بە هەر شێوەیەك بۆی بکرێت، وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ڕەزای خوایان لێ بێت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بە پێوە نوێژ بکە ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتن بیکە، ئەگەر نەتتوانی بە پاڵەوە بیکە).[2] ئەم فەرموودەیە ئەبێتە بەلگەدژ بە ئەو هەڵەگەورەیەی کەخەڵکێکی خوانەناسی تێکەوتووە گوایە مەبەست بە ﴿ٱلۡيَقِينُ﴾ واتە:یەقین پەیدابوون و گومان نەمانە،جا هەر کاتێك کەسێکتان گەیشتە ئەو پلەیەو بێ گومان بوو، هیچ ئەرکێکی شەرعی لەسەر نامێنێت بە لای ئەوانەوە ئەمەبێدینیو گومڕاییو نەفامی نەبێت هیچێکی تر نیە، چونکە پێغەمبەرانو (سەلامی خوایان لێ بێت) هاوەڵەکانیان بەیەقینترین و زاناترین کەس بوون بە خوداولەهەمووکەس چاکتر زانیویانە ئەو ئەرکانە چین لەسەریانە بەرامبەر خوداو باشتر ئاگاداری سیفاتەکانی خودا بوون، کە چەندە شایستەی ڕێز لێنانەو کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا لە هەمو کەس خواناسیان زیاتر کردووەو بە بەردەوامی خەریکی کاری خێر بوون هەتا کۆچی دواییان کردووە، گومانی تێدا نیە مەبەست لێرەدا بە ﴿ٱلۡيَقِينُ﴾ مردنە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد، سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە، سوپاس بۆ خوا کە ڕێی نیشان داین لەوەی کە بە شێوەیەکی چاكو ڕێك بمانمرێنێت، بێگومان خوا زۆر بەخشندەو مەزنە.

## تەفسیری سورەتی (النحل)

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ١﴾

### ترساندن بە نزیکبوونەوەو هاتنی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾ واتە ئەوا فەرمانی خودا هات، پەلە مەکەن، خودا پاكەو زۆر لەوە بەرزترە کە بڵێن هاوکاری هەیە، خوای گەورە لێرەدا باسی نزیکی هاتنی ڕۆژی قیامەت دەکات، خەریکە بێت بە زەمانی ڕابوردویش باسی کردووە کە بەلگەیە لەسەر هاتنو ڕوودانی ئەو کارەساتەوبێ گومان بوون لێی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

[1] فتح الباري (٣/١٣٧).

[2] فتح الباري (٢/٦٨٤).

﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾[1] واتە: وا قیامەت نزیك بووەوەو مانگ بوو بە دوو کەرتەوە، لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ﴾ واتە: ئەوەی کە بە دوور دەزانرێت نزیك بووەتەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ ۚ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾[2] واتە: داوات لێ دەکەن کە زۆر زوو کارێك بکەی بەڵایان بەسەردا بێت، ئەگەر کاتی بۆ دیاری نەکرایە، سزایان بۆ دەهاتە خوار، هەر ئەوەندەت زانی لە پڕ تووشیان هات بەڵام بە خۆیان نازانن، وا بە پەلە داوای ئازار دانت لێ دەکەن، بێگومان جەهەنەم دەوری خوانەناسانی داوە، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا هەورێکی ڕەش دێت بەسەرتاندا لە کاتی خۆرئاوابووندا وەك زرێبەن وایە[3]، ترس: پۆشاکێکی دروست کراوە لە ئاسنو پۆڵا بۆ خۆپاراستن لە شمشێر، بەردەوام بە ناو ئاسماندا بەرز دەبێتەوە پاشان جاڕ دەرێك جاڕ دەدات لەناوئاسماندا ئەی خەڵکینە! خەڵکی دەڕۆن بۆ لای یەکتری ئەڵێن: ئایا گوێتان لێ بوو، هەندێکیان دەڵێن: بەڵێ، هەندێکی تریشیان بە گومانن لە بیستنی، جاری دووەمیش هاوار دەکات، ئەی خەڵکینە! خەڵکی ئەڵێن: بە یەکتری: ئایا گوێتان لێ بوو؟ ئەڵێن: بەڵێ، پاشان جاری سێیەمیش بانگ دەکات، ئەی خەڵکینە! ئەوا فەرمانی خودا هات، پەلە مەکەن، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەو دوو پیاوەی جلوبەرگەکەیان بڵاوکردووەتەوە، فریاناکەون بیپێچنەوە، ئەو پیاوەی حەوزەکەی درێژ ڕاکێشاوە هەرگیز هیچ شتێکی لێ ئاو نادات، ئەو پیاوە کە وشترەکەی دەدۆشێت هەرگیز لێ ناخواتەوە، فەرمووی:دوای ئەوەئیتر خەڵکی سەرقاڵ دەبن).[4] پاشان خوای گەورە باسی پاکیو بێعەیبی خۆی دەکات لەو هاوکارو شەریکانەی بۆیان داناوە لە غەیری خۆی ولەگەڵیدا دەیپەرستن لەو بتو دارو بەردە، زۆر لەوە گەورەو بەرزترە، ئەوانە ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نیە، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.

﴿يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾﴾

---

[1] القمر (١).

[2] العنكبوت (٥٣ـ٥٤).

[3] زرێبەن:پۆشاکێکی دروست کراوەلەئاسن وپۆڵاوئەکرێتەبەربۆخۆپاراستن لەشمشێر(وەرگێڕ).

[4] الحاكم (٥٣٩/٤)، ئەم فەرموودە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە جگە لە سەرەتاکەی.

**خودا مەیلی لەسەر کەسێك بێت ڕەوانەی دەكات بۆ گەیاندنی یەكخواپەرستی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ ﴾ واتە: فریشتە دەنێرێتە خوارەوە بە پێی فەرمانی خۆی لەگەڵ وەحیدا، وەك ئەم ئایەتە كە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾[1] واتە: هەر بەو شێوەیە ئێمە گیانێكمان ناردە لای تۆ لە فەرمانی خۆمان، تۆ لە پێشا نەتدەزانی كتێب كامەیەو بڕوا چیە، بەڵام ئێمە ئەوەمان كرد بە ڕووناكیەك كە بەندەكانمان ئەوانەی خۆمان مەیلمان لێ بێت بەوە دەیخەینە سەر ڕێگا، وە دەفەرموێت: ﴿عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ﴾ واتە بۆ لای هەر كەسێك لە بەندەكانی كە خۆی حەز بكات، كە پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾[2] واتە: خودا خۆی باشتر دەزانێت كێ بۆ پێغەمبەرایەتی هەڵبژێرێت، وە دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾[3] واتە: خودا لە فریشتەكان پەیامنێری هەڵدەبژێرێتو لەناو مرۆڤیشدا، وە دەفەرموێت: ﴿يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾[4] واتە: بە فریشتەی تایبەتی دا وەڵامی خۆی دەنێرێت بۆ هەر كەسێك لە بەندەكانی كە بیەوێت، تا لە ڕۆژێك كەحەتمەن تووشیان دێت بیانترسێنێت، ڕۆژێك كە هەموو دێنەدەر لە گۆڕەكانیانو هیچ شتێكیان لە خودا نهێنی نیە، خوای گەورە دەفەرموێت ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی بۆ كێیە؟ دەفەرموێت: هەر بۆ خوای تاكو تەنهای زاڵەبەسەر هەموو شتدا ، لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ﴾ واتە: ئاگاداری لە خەڵكەكە بكەن كە هیچ شتێك شیاوی پەرستن نیە جگە لەمن، دەبێت هەر من بپەرستن، بترسن لە تۆڵەی من ئەگەر سەرپێچی فەرمانم بكەنو غەیری من بپەرستن.

﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾﴾

---

[1] الشوری (٥٢).

[2] الانعام (١٢٤).

[3] الحج (٧٥).

[4] الغافر (١٥ـ١٦).

**خودا، ئەو خودایە کە ئاسمانەکان و زەمین و مرۆڤی دروست کردووە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: ئەم ئاسمانانەو زەمینەی بە هەق وەدی هێناوە، بەرزترو دوورە لەوەی ئەوانە دەیکەن بە شەریکی، خودای گەورە باسی دروست کردنی بوونەوەر دەکات بە جیهانی سەرەوە کە ئاسمانەکانەو جیهانی خوارەوەیش کە بریتیە لە زەوی‌و ئەوەی تیایەتی، کە بە ڕاستی دروست کراون، نەك بە گاڵتەو بێهودە، بەڵکو بۆ ئەوەی خراپەکار سزای خۆی وەرگرێت‌و پیاوچاکیش پاداشتی خۆی وەربگرێت وەك دەفەرموویت: ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى﴾[1] واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووەو چاکەی باشیش دەربارەی کارچاکان بکات، پاشان باسی پاکی‌و بێ عەیبی خۆی دەکات کە هاوەڵی نیەو هەر خۆی وەدی هێنەرو تاك‌و تەنهایەو شەریکی نیە، بۆیە هەر ئەو شایەنی پەرستنە بە تەنها، پاشان دێتە سەر دروستبوونی مرۆڤ و دەفەرموویت: ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: مرۆڤی لە تنۆکێك ئاو وەدی هێناوە، کەچی بووەتە دوژمنی بە ئاشکرا، بڕوای پێ ناکات‌و دەچێت بەگژ پێغەمبەرەکانیدا، لە ڕاستیدا مرۆڤ بۆ ئەوە دروست کراوە کە بەندەی خوا بێت نەك دژایەتی بکات، وەك دەفەرموویت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا﴾[2] واتە: واتە: هەر خۆیەتی لە تنۆکێك ئاو مرۆڤێکی وەدی هێناوەو کردوویەتیە سەرچاوەی نەوەو خزم پەیدا بوون، پەروەردگارت هەموو کارێکی پێدەکرێت جگە لە خودا شتی وا دەپەرستن نە قازانجیان پێ دەگەیەنن‌و نە زیانیان لێ دەدات، خوانەناسان بەردەوام دژی پەروەردگاریان پشتیوانی یەکترن، وە دەفەرموویت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾[3] واتە: ئایا مرۆڤ نازانێت کە ئێمە لە تنۆکێك ئاو دروستمان کردووە، کەچی ئێستا دوژمنێکی ئاشکرایە، ئەو نموونەیەکی بۆ ئێمە هێناوەتەوە، دروست بوونی خۆی لە بیرکردووە، ئەڵێ: ئێسکەکان لە پاش ڕزان کێ زیندوویان دەکاتەوە، بڵێ: کەسێك یەکەمجار دروستی کردوون، ئەو زیندوویان

---

[1] النجم (٣١).

[2] الفرقان (٥٤ـ٥٥).

[3] یس (٧٧/٧٩).

دەكاتەوە، بە هەموو دروستكردنێك خۆی زانایە، لەو فەرموودەی كە ئیمامی ئەحمەدو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان كردووە لە بوسری كوڕی جەمماشەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تفی كردە ناو لەپی خۆیو پاشان فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێت ئەی نەوەی ئادەم چۆن من بەبێ دەسەڵات دەزانی، كە من تۆم ئا لەمە دروست كردووە؟ كاتێك كە تۆم دروست كردو ڕێكو پێكم كردی، سامانت كۆكردەوەو چاكەت لێ نەكرد، هەتا گیان گەیشتە قوڕقوڕاگەت ئەوسا ئەڵێ: خێرو بێر دەكەم! كەی ئێستا كاتی خێرو بێر كردنە)[1].

﴿وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾﴾

**مەڕو ماڵات لە دروستكراوەكانی خوداو بەهرەی خودان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ واتە: ئاژەڵیشی هەر بۆ ئێوە بەرهەم هێناوە، كە گەرمایی‌و قازانجی بۆ ئێوە تێدایەو لێشیان دەخۆن، خوای گەورە لێرەدا باسی مەڕو ماڵات دەكات كە بریتیە لە مەڕو بزنو وشترو ڕەشەوڵاخ كردویەتیە منەت بەسەر بەندەكانیەوە وەك لە سورەتی (الانعام)دا بە درێژی باسی كردووە كە هەشت سەر ماڵاتی نێرو مێی دروست كردووە بۆیان، كە سوود وەردەگرن لە خۆیانو بەرهەمەكانیان لە خوریو موو توكیان كە جلوبەرگو ڕایەخیان لێ دروست دەكەنو شیرەكەیان دەخۆنو لێشیان سەردەبڕنو دەیخۆن، بۆ جوانیش بەكاریان دێنن بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ﴾ واتە: لاتان جوانو ڕازاوەن، كاتێك دەیانبەن بۆ لەوەڕو كاتێكیش دەیانهێننەوە بە تێریو گوانەكانیان پڕ لە شیر دەبێتو قەڵەو دەبن، ﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: باری گرانتان بۆ هەڵدەگرێت بۆ شوێنی وا كە بۆ ئێوە زۆر گرانە كە پێی بگەن پەروەردگارت زۆر دڵسۆزو دلۆڤانە، وە بۆ زۆر شتی تریش بەكاریان دێننو سواریشیان دەبن وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾[2] واتە: بە

[1] احمد (٢/٢١٠)، ابن ماجه (٢/٩٠٣)، سەنەدەكانی سەحیحە.

[2] المؤمنون (٢١ـ٢٢).

ڕاستی بۆ ئێوە لە ماڵاتو ئاژەڵدا پەند هەیە دەرخوارتان دەدەین لەو شیرەی لەناو سکیاندایەو بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا سوودو کەڵکێکی زۆر هەیەوو لێشیان دەخۆن، وە لەسەر (پشتی هەندێ لە) ئەوان‌و لەسەر (پشتی) کەشتیەکانیش سوار دەکرێن. وە دەفەرمووێت: ﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾[1] واتە: خوا ئەو زاتەیە ئاژەڵ‌و ماڵاتی بۆ ئێوە بەدی هێناوە بۆ ئەوەی سواری هەندێکیان بن‌و گۆشتی هەندێکیشیان بخۆن‌و لەو (ئاژەڵ)انەدا چەند سودو کەڵك بۆ ئێوە هەیەو تا بە هۆی ئەوانەوە بگەنە پێویستی یەك کە لە دڵ‌و دەروونتادایەو لەسەر پشتی ئەو (وڵاخانە)و لەسەر کەشتی ئێوە سوار دەکرێن، خوا زۆر نیشانەی خۆیتان نیشان دەدات جا ئێوە کام لە نیشانەکانی خوا دان پیانانێن. بۆیە لێرەدا خوای گەورە دوای ژماردنی ئەم بەهرانەو ڕامهێنانی بۆ مرۆڤ دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: ئەو پەروەردەیەی کە ئەم ئاژەڵەی دەسەمۆکردووەو ڕامی هێناوە پەروەردەیەکی زۆر دڵسۆزو دلۆڤانە بۆ ئێوە، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾[2] واتە: ئایا نەیان دی‌و نەیان زانیوە کە بێگومان بە دەستی خۆمان ئاژەڵمان بۆ دروست کردوون ئەنجا ئەوان خاوەنیانن، وە ڕاممان هێناون بۆیان ئەنجا سواری هەندێکیان دەبن‌و لە گۆشتی هەندێکیشیان دەخۆن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾[3] واتە: وە گۆشتی وڵاخی بۆ فەراهەم هێناون کە سواریان دەبن، بۆ ئەوەی سواری پشتیان بن لە پاشان بیر لە بەهرەی پەروەردگارتان بکەنەوە کاتێك سواریان بوون‌و بڵێن پاك‌و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین کە ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو، بە ڕاستی ئێمە بۆ لای

---

[1] الغافر (٧٩ـ٨١).

[2] يس (٧١ـ٧٢).

[3] الزخرف (١٢ـ١٤).

پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ﴾ واتە: جلوبەرگ، ﴿وَمَنَافِعُ﴾ ئەوەش سودی لێ وەردەگرن بۆ خواردنو خواردنەوە[1].

﴿ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ واتە: ئەسپو ئێسترو کەریشی بۆ سواربوونو ڕازانەوەی ئێوە دروست کردووە، شتی وایش وەدی دێنێت کە نایزانن، ئەمەیش باسێکی ترە لەو باسانەی کە خوای گەورە منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا کە بۆی دروست کردوون کە بریتیە لە ئەسپو ماینو ئێسترو کەر، کە دەستەمۆی کردووە بۆیان، سواری دەبنو خۆشیان پێ دەڕازێننەوە، هەر بۆ ئەوەیش دروست کراونو ڕام هێنراون، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵاوە دەڵێت: (پێغەمبەری خودا(ﷺ) خواردنی گۆشتی کەریماڵی قەدەغەکردووە، ئیزنی خواردنی گۆشتی ئەسپ(ومایني) داوە).[2] ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داود هەریەکەیان بە دوو سەنەد لەسەر مەرجی موسلیم لە جابیرەوە ڕیوایەتیان کردووە، دەڵێت: لە ڕۆژی خەیبەردا ئەسپو ئێسترو کەرمان سەربڕی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەدەغەی ئێسترو کەری لێکردین، بەڵام قەدەغەی ئەسپی لێ نەکردین).[3] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەسمای کچی ئەبو بەکرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: ئێمە لە مەدینەدا بووین ئەسپێکمان سەربڕی لە زەمانی پێغەمبەری خودا و(ﷺ) خواردمان[4].

﴿وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾﴾

## ڕوونکردنەوەی ڕێگە دینی یەکان

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ﴾ واتە: هەر خودایە ڕێگەی ڕاست نیشانی بەندەکانی دەدات، دوای ئەوەی خوای گەورە باسی ئاژەڵو سوودەکانیو ڕامهێنانی بۆ کردین دێتە سەر باسی ڕێگای مەعنەویو ئاینی زۆرجار لە قورئاندا هاتووەکاتێك کە باسی شتە دیارەکانی دەکات دوای ئەوە ئەچێتەسەر باسی شتەئاینی یە مەعنەویە بەسوودەکان، وەك لە ئایەتێکی تردا

---

[1] الطبري (١٧/١٦٨).

[2] فتح الباري (٩/٥٧٠)، مسلم (٣/١٥٤١).

[3] احمد (٣/٣٥٦)، ابو داود (٤/١٤٩ـ١٥١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٣/١٥٤١).

دەفەرموویت: ﴿وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ﴾[1] واتە: توێشووی ڕێگەتان پێ بێت، چاکترین توێشوو بۆ ئێوە لەخواترسانە، وە دەفەرموویت: ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾[2] واتە: ئەی نەوەی ئادەم ئێمە جلوبەرگی وامان داوە بە ئێوە کە عەیب‌و عارتان داپۆشێت‌و جوانیشتان بکات چاکتر لەوەیش پۆشاکی خۆپاراستنە، کاتێك خودای مەزن لەم سورەتەدا باسی گیانەوەرەکانی کرد لە ئاژەڵ‌و ئەسپ‌و ئێسترو کەرو هەر ماڵاتێکی تر، کە سواری دەبن‌و باری خۆیان لێ دەنێن بۆ ئەو شوێنانەی کە زۆر دوورن‌و بە ئاسانی خۆیان ناتوانن پێی بگەن‌و کەلوپەلەکانیانی بۆ بەرن، دێتە سەر باسی ئەو ڕێگانەی کە مرۆڤەکان دەیگرنەبەر بۆ گەیشتن‌و چوونە سەر ڕێگەی هەق، هەقیش ئەوەیە کە خودا پێی ڕازی بێت، ڕێگای ڕاست نیشاندان بە بەندەکانیش هەر خودایە، بۆیە دەفەرموویت: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتە: خودا هەر ئەوەی لەسەرە ڕێگەی ڕاست دەست نیشان بکات، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ﴾[3] واتە: ئەمە ڕێگەی ڕاستی منە، ئێوە هەر بەو ڕێگا برۆن‌و مەچنە سەر ڕێگای تر، نەکا لە ڕێگاکەی ئەو دوورتان بخەنەوە، وە دەفەرموویت: ﴿قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَىَّ مُسْتَقِيمٌ﴾[4] واتە: وتی ئەمە ڕێگەی ڕاستی بەرەو منە، موجاهید دەڵێت: لەم ئایەتەدا ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێگای ڕاست نیشاندان لەسەر خوایە.[5] عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕوونکردنەوە لەسەر خودایە،واتە: ڕێگای شارەزایی‌و گومڕایی ڕوون بکاتەوە، عەلی کوڕی ئەبو تەلحەیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە، قەتادەو زەححاکیش هەر وایان وتووە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْهَا جَآئِرٌ﴾ واتە: هەندێ لە ڕێگاکانیش لارو چەوت‌و خواروخێچن لە ڕێی ڕاست لایانداوە، ئیبنوعەبباس‌و کەسانی تریش دەڵێن: ﴿وَمِنْهَا جَآئِرٌ﴾ ئەو ڕێگا جیاوازەکانن[6]. کەبریتین لەو بۆچوون‌و ئارەزووبازیە جیاوازانەی گاورو

---

[1] البقرة (١٩٧).

[2] الاعراف (٢٦).

[3] الانعام (١٥٣)

[4] الحجر (٤١).

[5] الطبري (١٧/١٧٥).

[6] الطبري (١٧/١٧٦).

جوولەکەو ئاگرپەرستەکان هەیانە. ئیبنومەسعودئەم ئایەتەی بەم شێوەیە ئەخوێندەوە:﴿ومنكم جَآئِرٌ﴾[1]. واتە: هەندێ لەئێوە لەڕێگەی ڕاست لائەدەن، پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەموو شتێك لە ژێر دەسەڵاتو مەیلی خۆیدایەو دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: ئەگەر بیویستایە هەمووتانی دەخستە سەر ڕێی ڕاست، وە لەئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾[2] واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەو (خەڵکەی) وا لە زەویدا هەموو تێکڕا بڕوای دەهێنا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[3] واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە گشت خەڵکی دەکرد بە (پەیڕەوی) یەك ئایین بەڵام ئەوان بەردەوام جیاواز دەبن، مەگەر کەسێك پەروەردگارت میهرەبانی لەگەڵ کردبێتو هەر لەبەر ئەوەیش دروستی کردوون بڕیاری پەروەردگارت دەرچوو (کۆتایی هات) کە سوێند بە خوا دۆزەخ پڕ دەکەم لە جنۆکەو لە ئادەمی هەموو پێکەوە.

﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ۖ لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلْأَعْنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾﴾

**باسی باران و سودەکانی کە بەڵگەیەکی ئاشکرایشە لەسەر توانای بێسنوری خوای گەورە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ۖ لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ﴾ واتە: هەر خۆیەتی لە سەرەوە بارانی بۆ باراندن، کە ئێوە لێی بخۆنەوەو ڕووەکیشی پێ سەوز دەبێتو لەو ڕووەکە مەڕو ماڵاتی پێ دەلەوەڕێنن. دوای ئەوەی خوای گەورە باسی ئەو بەهرانەی کرد کە بەخشیویەتی بە مرۆڤ لە مەڕو ماڵات دێتە سەر باسی بەهرەیەکی تر کە بارانی باراند لە ئاسمانەوە، کە بە هۆی ئەو بارانەوە ژیان بەسەر دەبەنو ئاژەڵەکانیشیان بەخێو دەکەن، وە دەفەرمووێت: ﴿لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ﴾ واتە: شیرینو سازگاری کردووە ئێوە لێی دەخۆنەوە، سوێرو تاڵی

[1] الطبري (١٧/١٧٦).
[2] يونس (٩٩.
[3] هود (١١٨ـ١١٩).

نەکردووە، ﴿وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ﴾ بە هۆی ئەو بارانەوە ڕووەکی سەوز کردووە ئاژەڵەکانی تیا دەلەوەڕێنن، وەك ئیبنو عەبباس و عیکریمە و زەححاك و قەتادە و ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿تُسِيمُونَ﴾ واتە: دەلەوەڕێنن.[1] وەك وتراوە (الابل السائمە) واتە: وشتری ناو لەوەڕ، (السوم) یانی لەوەڕاندن. وە دەفەرمووێت: ﴿يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلْأَعْنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾ واتە: هەر بەو ئاوە کشتوکاڵ و زەیتون و ڕەزو دارخورماتان بۆ دەڕوێنێت و هەموو بەروبوومێکتان پێدەدات، کە هەموویان بە یەك ئاو ئاو دەدرێن، هەر یەکە جۆرێکە و تام و بۆن و ڕەنگ و شێوەی جیای خۆی هەیە. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: ئەمە زۆر بەڵگەی تێدایە کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا بۆ ئەوانەی کە بیردەکەنەوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾[2] واتە: یان ئەو کەسە باشترە کە ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردووە و لەو سەرەوە بارانی بۆ ئێوە باراندووە؟ باخچەی زۆر جوانی بە ئاوەکەی سەوز کردووە کە خۆتان نەتان دەتوانی دارەکانی بڕوێنن، ئایا هیچ پەرستراوێکی وەك خودا هەیە؟ نەخێردەی دیارەئەوانە گەلێکی لە هەق لادەرن.

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتٌۢ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥٓ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾﴾

**چەند بەڵگەی تر لەسەر ڕامهێنانی شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ و ئەوەی لەناو زەویدا دێتە دەرەوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتٌۢ بِأَمْرِهِۦٓ﴾ واتە: خودا شەوو ڕۆژی بۆ ڕام کردوون، مانگ و خۆرو هەموو ئەستێرەکانی ملکەچی فەرمانی ئەون، خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لەو هەموو نیشانە مەزن و بەهرە زۆرانەی کە پێی بەخشیون هەر لە ڕامهێنانی شەوو ڕۆژەوە کە بە دوای یەکدا دێن و ئەو مانگ و خۆرەیش کە بەردەوام سوڕ دەخۆن، ئەو ئەستێرە وەستاوو گەڕۆکانە لە هەموو لایەکی ئاسماندا کە دنیایان ڕووناك

---

[1] الطبري (١٧/٢٧٨).

[2] النمل (٦٠).

کردووەتەوە، بۆ ئەوەی لە تاریکاییدا ڕێگای پێ دەرکەن، هەر یەکێك لەمانە لە گۆڕەپانی خۆیدا دەسوڕێتەوە کە خودا بۆی داناوە، بەو جۆرە دەڕوات کە خودا بۆی دیاری کردووە نە زیاد دەڕواتو نە کەم، ئەمانە هەموو لە ژێر تواناو دەسەڵاتی خوادان، بەو شێوەی کە بۆی داناونو ئاسانی کردووە بۆیان، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی پەروەردگارتان ئەو خودایەیە کە ئاسمانەکانو زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە پاشان (خودا) چووە سەر عەرش (ئێمە ئیمانمان پێیەتی بەڵام شێوەکەی نازانین) بە (تاریکایی) شەوو (ڕۆشنایی) ڕۆژ دادەپۆشێت (بە پێچەوانەشەوە)، (ڕۆژ بە شوێن شەوەوەیە بە خێرایی‌و) شەو بە شوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی خۆرو مانگو ئەستێرەکانیش ژێربار کراون بە فەرمانی خۆی بێدار بن کە بەدی هێناوونو فەرماندان هەر بۆ خوایە پاكو بێگەردە (لە هەموو کەمو کوڕیەك) خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیان. بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: لەمەشدا زۆر نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کە تێدەگەن، کە خودا چەند خاوەن دەسەڵاتو توانای گەورەیە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ واتە: لەم زەمینەیش زۆر شتی ڕەنگاوڕەنگی بۆ ئێوە دروست کردووە، دوای ئەوە خوای گەورە باسی ئاسمانو ئەو شتانەی کرد کە تێیدایەو ڕامی هێناوە دێتە سەر باسی ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی ناو زەمین لە گیانەوەرانو کانزاو ڕووەكو گەلێ شتی تری بێگیان بە هەموو ڕەنگو شێوەکانیەوە، کە چەند سودو تایبەتمەندیان تێدایە بۆ مرۆڤ، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ﴾ واتە: لەمەدا نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی ڕادەمێننو شوکرانەبژێری خودان.

﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٤﴾ وَأَلْقَىٰ فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَامَاتٍ ۚ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ ۗ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾﴾

---

[1] الاعراف (٥٤).

**نیشانەی زۆرهەیەلەسەردەسەلاتی خوا لەناو دەریاو کێوو ڕووبارو ڕێگاو ئەستێرەکاندا**

خوای گەورە باسی ئەو دەریایە پڕ شەپۆلە بەرزانە دەکات کە چۆن ڕامی هێناوەو دەیکاتە منەت بەسەر بەندەکانیەوە کە بۆی ژێربارکردوون بە ئاسانی دەچێتە ناوی‌و سواری دەبێت، گۆشتی ماسی‌و نەهەنگیشی حەڵاڵ کردووە بۆیان بە زیندووی‌و بە مردوویش لە کاتی ئیحرام پۆشین‌و کاتەکانی تریشدا، مرواری‌و جەواهیری زۆر بە نرخیشی پێداون تا بۆ جوانی لەبەری خۆیانی بکەن، وە ئەم دەریایەی وا لێ کردووە کەشتیەکان هەڵگرێت‌و بەسەریدا بڕوات‌و بە پشتەیان بەهەوا تیرەکەی ببڕێت‌و لەتی بکات، دیارە خوای گەورە بەندەکانی شارەزا کردووە بەو شێوەیە دروستی بکەن، ئەو شارەزاییەش لە باپیریانەوە نوح (سەلامی خوای لێ بێت) بۆیان ماوەتەوە، چونکە یەکەم کەسێك کەشتی دروست کرد نوح پێغەمبەر بوو (سەلامی خوای لێ بێت) لە ئەوەوە هەموو فێری دروست کردنی کەشتی بوون، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی ترو لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر پێی دەڕۆیشتن، بۆ هێنانی ئەو شتانەی لەو وڵاتانەدا هەیەو گواستنەوەی ئەو شتانەی خۆشیان بۆ ئەو وڵاتانە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا۟ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا۟ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: هەر خودایە دەریای خستووەتە بەردەستت کە گۆشتی تازەی لێ بخۆن، خشڵیشی لێ بێننە دەرێ، بە خۆتانیەوە هەڵواسن، وە دەبینی کەشتیش سنگی دەریا لەت دەکات، تا چاکەی خوداتان دەست کەوێت‌و بەڵکو شوکری چاکەو بەهرەکانی بکەن، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ﴾ واتە: ئەو خودایەی کە کێوە زۆر بەرزەکانی لەناو ئەم زەمینەدا داکوتاوەو کردوویەتی بە لەنگەر بۆ ئەوەی نەتانلەرزێنێت، زیندەوەرەکان لەسەری بژین ئەگەر بلەرزێت ژیانی مرۆڤ تاڵ دەکات‌و هەموو خۆشیەکیان لەبیر دەباتەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا﴾[1] واتە: زۆر کێوی پتەویشی تیا دامەزراندووە، ﴿وَأَنْهَٰرًا وَسُبُلًا﴾ واتە: چەم‌و ڕوباری نیشان داون بۆ ئەوەی ڕێگا بدۆزنەوە، واتە: ڕووباری زۆری لە زەویدا داناوە لە شوێنێکەوە دەڕوات بۆ شوێنێکی تر، بۆ ئەوەی خەڵکی لە ڕۆژی سەر زەوی بخۆن، لە شوێنێکدا ئەو ئاوەی دێتە دەرو دەچێت بۆ شوێنێکی تر دەبێتە هۆی بژێوی خەڵکی ئەو شوێنە، بە شوێنی بیابان‌و چۆڵەوانیدا ڕێگە دەبڕێت‌و بە لا کەژو کێوو تەپۆلکەدا دەڕوات‌و دەیبڕێت‌و دەگاتەوە ئەو شوێنەی کە بۆی دانراوە، ئەم ڕووبارانە بە ڕاست‌و چەپ‌و باکورو باشورو

---

[1] النازعات (٣٢).

ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا دەڕۆن، هەندێکی ڕووباری بچووکەو هەندێکیشی گەورەن، دەچنە چۆمەکانەوەو جاری واش هەیە وشك دەکەن یان دەچێتە ناو زەوی تێیدا کۆدەبێتەوە، لە هەندێ شوێنیشدا بە هێواشی دەڕواتو لە هەندێ شوێندا بە گوڕ دەڕوات بە پێی ئەو بڕیارەی خودا داویەتیو مەیلی لێیەتی، ئەو خودایەی کە هەر ئەو شایەنی پەرستنەو هەر ئەویش پەروەردگارە، وە هەر خودایە کە ڕێگای لەناو زەمیندا داناوە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە وڵاتێکەوە بڕوات بۆ وڵاتێکی تر هەتا کێوەکانی لەت کردووە بۆ ئەوەی نێوانی کێوەکان ببێتە ڕێگاو پێیدا بڕۆن، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا﴾[1] واتە: چەند ڕێگامان لەناو زەمیندا پێك هێنا، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَعَلَامَاتٍ وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ واتە: نیشانەی زۆری تر هەیەو بە ئەستێرەیش ڕێ دەردەکەن، بە شەوی تاریكو نوتەکان، واتە: بەڵگە زۆرن لە کێوەکانو تەپۆڵکەو شتی تریش کە ڕێبوار بیکاتە دەستنیشان لە وشکانیو دەریادا هەر کاتێك ڕێگای لێ تێکچوو پێی بدۆزێتەوە، ﴿وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾ ئیبنو عەبباس دەڵێت: بە ئەستێرەکان لە تاریکانی شەودا ڕێگا دەردەکەن[2].

**خودا پەرستی هەقی خودایە**

پاشان خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە نابێت هیچ کەسێکی تر بپەرستین غەیری خۆی وەك ئەو بتانەی کە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن بەڵکو خۆیان دروست کراون، بۆیە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَن يَخْلُقُ كَمَن لَّا يَخْلُقُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ واتە: ئایا ئەوەی دروستکردن بە دەستی ئەوە، چۆن وەك ئەو کەسە وایە کە دروست ناکات، ئایا ئێوە پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن، دیسان خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لەو هەموو بەهرەو چاکانەی لەگەڵی کردوون، دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: ئەگەر چاکەکانی خودا بژمێرن، لە ژمارە نایە بۆتان، خودا لە تاوان خۆش دەبێتو دلۆڤانە، واتە: ئەگەر خودا داوای شوکرانەبژێری بەهرەکانی لە ئێوە بکات ئێوە هەرگیز ناتوانن بەجێی بێنن، وازی لێ دەهێننو دەستەوسان دادەنیشن، خۆ ئەگەر سزاتان بدات سزاشتان دەداتو ناهەقیشی پێ نەکردوون، بەڵام خوا زۆر دڵسۆزو دلۆڤانە لە زۆر تاوانتان دەبووڕێتو لەسەر کەمترین چاکەیش پاداشتتان دەداتەوە، ئیبنو جەریر دەڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ﴾ خودا لێتان دەبورێت لەسەر هەندێ کەمو کوڕی لەسەر شوکری ئەو

[1] الانبياء (٣١).

[2] الطبري (١٧/١٨٥).

بەهرانەی کە پێی داون، ئەگەر پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە بۆ لای‌و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون‌و بە پێی ڕەزامەندی ئەو جوڵانەوە، دلۆڤانە بۆتان‌و سزاتان نادات دوای پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوەتان بۆ لای[1].

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾﴾

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾ واتـە: هەرچـی بـشارنەوەو هەرچیش ئاشکرا بکەن خودا دەیزانێت، لێرەدا خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە ئاگای لە هەموو شاراوەکانی ناو دڵەو هیچی لێ ون نابێت وەك چۆن ئاگای لە شتە ئاشکراکانە کە دەیکەن، بەو زووانە پاداشتی هەموو کەسێك دەداتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو کردارانەی کە کردوویەتی، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێ سەندن.

**خوای بتپەرستان دروست کراوە، نەك دروستکەر**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ﴾ واتە: ئـەو بتانەی کە هانایان پێ دەبەن بێجگە لە خودا،ئەوانە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن بەڵکو خۆیان دروست دەکرێن، وەك خـوای گـەورە لەسـەر زمـانی ئیبراهیمـی خـەلیل دەفـەرمووێت: ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾[2] واتە: وتی: ئایا ئێوە شتێك دەپەرستن کە خۆتـان دایدەتاشـن؟ کە هەر خودایە ئێوەش‌و بتەکانتانیشی دروست کردووە، پاشـان دەفـەرمووێت: ﴿أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ واتە:ئەو بتانە بێ گیانن، گیانیان تێدا نیـە، نـە دەبیـستن، نـە دەبینن‌و نـە ئاوەزیان هەیە، ئاگاشیان لێ نیە کەی ڕۆژی قیامەت دێت، چۆن ئەوانە دەبنە جێی هاناو سود بە کەس دەگەیەنن‌و پاداشتی چاکەو خراپە دەدەنەوە؟ بەڵکو ئەوەی کە هیوای ئەوەی لێ دەکرێت ئەو کەسەیە کە ئاگاداری هەموو شتێکەو وەدیهێنەری هەموو شتێکە کە خودایە.

﴿إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾

**هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا**

---

[1] الطبري (١٧/١٨٧).

[2] الصافات (٩٥ـ٩٦).

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویّت: ﴿ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ فَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾ واتە: خوای ئێوە یەك خودایە، ئەو كەسانەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، دڵـەكانیان بـێ باوەڕەو خۆشیان بە زل دەزانن. خوای گەورە باسی خۆی دەكات كە تاكو تەنهایەو بێنیازە لە هـەموو شتێكو جێنیازی گشت شتێكە هیچ خودایەك نیە خۆی نەبێت، وە ئەو كەسانەی خوانەناسن دڵیان ئـەو باوەڕ بە خودایە قەبوڵ ناكات، وەك خـودا خـۆی باسـیان دەكـات كـە جێـی سەرسـوڕمانە بـە لایانـەوە ئـەڵێن: ﴿ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ ﴾[1] واتـە: چـۆن دەبێـت لـە جێـی ئـەو بتانـەی دەتانپەرست هەر خودایەك بپەرستن؟ وە دەفـەرموویّت: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾[2] واتە: هەر كاتێك یـادی خـودا بـە تەنها یاد بكرێت دڵیان بەو ناوە تێك دەچێتو ناڕەحەت دەبن، ئەگەر باسی جگە لـە خوایـان لا بكرێـت پێیان خۆشەو دڵیان پێـی دەكرێتـەوە، ﴿وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾ واتـە: خۆیـان بـە زل دەزانـنو ناپەرسـتنو دڵیـان یەكتاپەرسـتی وەرناگرێـت، وەك خـوای گەورەلەئایـەتێكیتردا دەفـــەرموویّت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾[3] واتە: ئەو كەسانەی هەر لەبـەر خـۆ بـە زلزانین نایانەوێت خواپەرستن، بە زەبوونی دەچنە نـاو جەهەنـەم، بۆیـە خـوای گـەورە لێرەدا دەفـەرموویّت: ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْتَكْبِرِينَ ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتی خـودا دەزانێت چی لە خودا دەشارنەوەو چی دەردەخەن، خودا خۆشـی نایـەت لەوانـەی خـۆ بـەزل دەزانـن، تۆڵەیان لێ دەسێنێتو جەزرەبەی توندیان دەدات.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾

**لەناوچوونی خوانەناسان بەهۆی سەرپێچیان لە فەرمانی خواو دوو قات تۆڵەكردنەوەلێیان**

خـوای گـەورە دەفـەرموویّت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴾ واتـە: هـەر كاتێك پرسیاریان لێ بكرێت: پەروەردگارتان چی ناردووەتـە خـوار؟ ئـەڵێن: چیرۆكی پێشینان، واتـە: نكولی لێ دەكەنو ئەڵێن: خودا هیچی نەناردووەتە خوار بەڵكو ئەوەی موحەمـەد (ﷺ) باسـی دەكـات

[1] ص (٥).
[2] الزمر (٤٥).
[3] الغافر (٦٠).

بۆمان بەسەرهاتی پێشینانە لە کتێبی ئەوانەوە وەری گرتووە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴾[1] واتە: وتیان: ئەمانە چیرۆکی پێشینانن، هەموو بەیانیو ئێوارانێك بۆی دەخوێننەوەو لەبەری دەنوسێتەوە، واتە: بوختان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەواسنو ئەو هەموو قسە نارێكو بێ ڕێو جێو پڕوپوچە بەرامبەری دەکەن. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴾[2] واتە: سەیرکە چۆن نموونەیان بۆ تۆ هێناوەتەوەو لە ڕێ لایان داوەو هەرچی دەکەن ڕێ دەرناکەن، بێگومان هەر کەسێك لە ڕێی هەق لایدا هەرچی بڵێ نایپێکێتو هەر هەڵە دەکات، دەیان وت: جادوگەرە، فاڵچیە، شاعیرە، شێتە، پاشان هەموو هاتنە سەر قسەی گەورەکەیان وەلیدی کوڕی موغیرەی مەخزومی کە بۆی دانان، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ١٨ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ١٩ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ٢٠ ثُمَّ نَظَرَ ٢١ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ٢٢ ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ ٢٣ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ﴾[3] واتە: ئەو هەر ڕاماو لێکی دایەوە، ئەی نەژی کە چۆنی لێکدایەوە، دیسان نەژی چۆنی بۆ چوو، پاشان سەیری کرد، ئەوسا ڕووی گرژ کردو ترش هەڵگەڕا، لە پاشان پشتی هەڵکردو فیزی نواند، ئەوسا گوتی: ئەم قورئانە هەبێ و نەبێ جادوویەکە لە کۆنەوە دەیگێڕنەوە. قسەکەی وەلیدیان پەسەند کردو بڵاوەیان لێ کرد (خوا ڕوویان ڕەش کات)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾ واتە: با لە ڕۆژی قیامەتدا باری تاوانی خۆیانو ئەو کەسانەش هەڵگرن کە بەبێ زانست، ئەوان لە ڕێ لادەدەن، واتە: بۆیە ئاوامان بەسەر هێنان هەتا باری گرانی خۆیانو ئەو کەسانەش هەڵگرن کە شوێنیان دەکەونو هاوڕای ئەوانن، دووجار گوناهکارن، جارێك لەسەر گومڕای خۆیانو جارێکی تر لەسەر خەڵەتاندنی ئەوانەی کە شوێنیان دەکەونو دەیانکەنە پێشەنگو چاویان لێ دەکەن، وەك لە فەرموودەدا هاتووە: (هەر کەسێك بانگەوازی کردبێت بۆ ڕێی ڕاست، ئەوە ئەو کەسە پاداشتی بە وێنەی ئەو کەسە وەرگرتووە کە شوێنی کەوتووە، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەو هیچ کەم ببێتەوە، وە هەر کەسێك بانگەوازی کردبێت بۆ گومڕایی، ئەوە ئەو کەسە تاوانی ئەوانەی هەڵگرتووە، بەبێ ئەوەی لە تاوانەکانی ئەوان هیچ کەم ببێتەوە).[4] خوای

---

[1] الفرقان (٥).

[2] الفرقان (٩).

[3] المدثر (١٨ـ٢٤).

[4] مسلم (٤/٢٠٦٠).

گـــەورەیش دەفـــەرمووێت: ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَمَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾[1] واتە: باری گرانی خۆیانو باری گرانی خەڵکی تریش لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرنو ڕۆژی قیامەتیش لەسەر ئەو بوختانە کردوویانە پرسیاریان لێ دەکرێت، هەر بەم شێوەیە عەوفی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوەکەفەرموویەتی ئەم ئایەتە: ﴿ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ﴾*، موجاهید دەڵێت:[2] باری گرانی تاوانی خۆیانو ئەوانەی کە گوێبیستیان بوون هەڵدەگرن، گوناهی ئەوانەی کە گوێڕایەڵیان بوون هیچ سووك ناکرێت[3].

﴿ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَـٰٓقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾

**باسی ئەو خراپانەی پێشینەکان کردوویانەو باسی ئەوچارەنووسەیش کە بەسەریاندا هاتووە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوانەی پێش ئەمانەیش فێڵباز بوون، عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ دەڵێت: مەبەست پێی ئەو نەمروودەیە کە کۆشکێکی زۆر بەرزی دروست کرد.[4] هەندێکی تر دەڵێن: ئەو کەسە بەختەنەسرە ،بەڵام ڕاستیەکەی ئەمە نموونە هێنانەوەیە بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو شتانەی کە خوانەناسان دەیانکرد، ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، وەك خوای گەورە لەسەر زمانی نوح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا﴾[5] واتە: فێڵبازیان کرد، بەڵام فێڵبازیەکی زۆر گەورە، بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان دەداو فرو فێڵیان لە خەڵکی دەکرد بۆ ئەوەی گومڕایان بکەنو بەرەو بتپەرستی بیانبەن، هەموو ڕێگایەکیان دەگرتەبەر، وەك لە ڕۆژی

---

[1] العنكبوت (١٣).

* العنكبوت (١٣).

[2] الطبري (١٧/١٩١).

[3] الطبري (١٧/١٩٠).

[4] الطبري (١٧/١٩٣).

[5] نوح (٢٢).

قیامەتدا شوێنکەوتووەکانیان پێیان ئەڵێن: ﴿بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَن نَّكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أَندَادًا﴾[1] واتە: ئێوە بە شەوو بە ڕۆژ کۆڵتان لێ نەدەداین کە دەبێ خوا نەناسن‌و چەندین هاوتای بۆ دابنێین، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ﴾ واتە: خوا خانووەکانی لە بناغەوە هەڵتەکاندن، کارەکانی پێ بەتاڵ کردنەوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ﴾[2] واتە: هەر کاتێك کە ئاگری شەڕیان هەڵدەگیرساند خودا دەیکوژاندەوە، وە دەفەرموێت: ﴿فَأَتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾[3] واتە: لە شوێنێکی واوە خودا سزای بۆ ناردن کە بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات، بە شێوەیەك ترسی خستە دڵیان، ماڵی خۆیان بە دەستی خۆیان‌و خاوەن باوەڕان کاول دەکرد، دەی ئێوە پەند وەرگرن ئەی کۆمەڵی خاوەن بیروهۆش. لێرەیشدا دەفەرموێت: ﴿فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُخْزِيهِمْ﴾ واتە: بنمیچی خانووەکانیان بەسەردا ڕووخاو لە شوێنێکەوە ئازاریان بۆ داباری، کە هەر هەستیشیان پێ نەکرد. پاشان لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئابڕوویان دەبات، ئەوەی کە لە دڵیاندا شاردبوویانەوە ئاشکرای کرد. وەك ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ﴾[4] واتە: لەو ڕۆژەدا کە نهێنی ئاشکرا دەبێت، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ هەموو ناپاکێك ئاڵایەك بەرز دەکرێتەوە لە دوایەوە بە ئەندازەی ناپاکیەکەی، پێی دەگوترێت: ئەمە ئاڵای ناپاکی فلانی کوڕی فلانە).[5] هەر بەو شێوەیە ئەو کەسانە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەی شاردوویانەتەوە بۆ خەڵکی ئاشکرا دەکرێت لە فروفێڵ‌و ناپاکی‌و خوای گەورە ئابڕوویان دەبات لەبەر چاوی ئەو خەڵکەو هەڕەشەیان لێ دەکات‌و گاڵتەیان پێ دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَائِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تُشَاقُّونَ فِيهِمْ﴾ واتە: لە کوێن ئەو شەریکانەی کە ئێوە مشت‌و مڕتان لەسەر دەکردن‌و شەڕو دژایەتیتان لە ڕێی ئەواندا

---

[1] سبأ (٣٣).

[2] المائدة (٦٤).

[3] الحشر (٢).

[4] الطارق (٩).

[5] فتح الباري (١٠/٥٧٨)، مسلم (٣/١٣٦٠).

دەكرد بۆ نایەن یارمەتیتان بدەنو ڕزگارتان بكەن لێرەدا، ﴿هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ﴾[1] واتە: ئایا ئەوانە دێنە هاناتان یان یارمەتی خۆیان دەدەن، وە دەفەرموێت: ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾[2] واتە: ئەو نە هیچ هێزێكی هەیەو نە یارمەتی دەر، ئەو كاتە كە بەڵگەو نیشانەی نیشان دراو ئەو ڕاستیەی كە چاوەڕوانی نەدەكرد یەخەی گرتو لە قسە كەوتو ڕێی ڕاكردنیشی نەما، ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن زانستنو ڕێزدارن لە دنیاداو لە قیامەتدا، هەق بێژبوون لە دنیاو لە قیامەتدا، ئا لەو كاتەدا ئەڵێن: ﴿إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ واتە: ئەمڕۆ ئابڕوچوونو بەدبەختی بۆ ئەو كەسەیە كە شەریكی بۆ خودا داناوە كە هیچ سودێكی پێ ناگەیەنێتو زیانیشی لێ دوور ناخاتەوە.

﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾﴾

**حاڵ و بەسەرهاتی خوانەناسان لە كاتی مردنو لە پاش مردنیشدا.**

خوای گەورە باسی حاڵو ژیانی بتپەرستان دەكات ئەوانەی كە ناهەقیان لە خۆیان كرد لە كاتی گیان كەنشتدا كە فریشتەكان دێنە سەریان بۆ ئەوەی ئەو گیانە پیسەیان بكێشن وەك دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍۭ﴾ واتە: ئەوانەی كە فریشتەی گیان كێشانی خودا گیانیان دەكێشێت كە ستەمیان لە خۆكردووە مل ڕادەكێشنو ئەڵێن: هیچ خراپەمان نەكردووە، خۆیان بە چاكو گوێڕایەڵو ملكەچ نیشان دەدەن، وەك لە ڕۆژی قیامەتدا دەڵێن: ﴿رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[3] واتە: بەو خوایەی كە ئێمەی پەروەرادووە ئێمە هیچ شتێكمان نەكردووەتە شەریكی ئەو، وە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾[4] واتە: ڕۆژێك كە خودا هەموویان زیندوو دەكاتەوە، سوێند بۆ خوا دەخۆن وەك چۆن بۆ ئێوە سوێند دەخۆن، خوای گەورەیش بە درۆیان دەخاتەوە لەسەر ئەو قسەیانو دەفەرموێت: ﴿بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ﴾ واتە: بەڵی خودا خۆی دەزانێت ئاكاری ئێوە چۆن بووە، سا لە دەرگای جەهەنەم بچنە ژوورەوە، هەتا هەتایە هەر لەوێ بن،

---

[1] الشعراء (٩٣).
[2] الطارق (١٠).
[3] الانعام (٢٣).
[4] المجادلة (١٨).

ئای کە جێی خۆ بە زلزانان چەندە خراپە، ئەوانەی کە گوێیان بە نیشانەکانی نەدەداو شوێنی پێغەمبەرەکەی نەدەکەوتن لەو ڕۆژەوە کە گیانیان دەردەچێتو دەچێتە ناو جەهەنەم، گیانەکانیان لە ناو گۆڕەکانیاندا توشی ئەو سزاو گەرمی یەی جەهەنەم دەبێت، وەختێك کە ڕۆژی قیامەتیش هات گیانەکەیان لەگەڵ لاشەکەیاندا یەك دەگرنەوەو هەتا هەتایە لەناو جەهەنەمدا دەمێنێتەوە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾[1] واتە: نە ڕێیان پێ دەدرێت کە بمرنو نە سزای جەهەنەمیان لەسەر سووك دەکرێت، وەك دەفەرمووێت: ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾[2] واتە: هەموو بەیانیو ئێوارانێك دەیانبەنە سەر ئاگرو ڕۆژێك کە قیامەت دێت فەرمان دەدرێت دارو دەستەی فیرعەون زۆر بە توندی ئازار بدرێن.

﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ (٣٠) جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ (٣١) الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٣٢)﴾

## قسەی خۆپارێزان سەبارەت بەنیگاو وەحی، پاداشتیانو حاڵیان لە کاتی مردنو دوای مردنیشدا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ﴾ واتە: لە پارێزکاران دەپرسن: پەروەردەتان چی بە خەڵات ناردەخوار؟ ئەڵێن: ئەوەی کە زۆر چاکە، بۆ ئەوانەی لە دنیا خاوەن چاکە بوون چاکە هەیەو دیارە شوێنی. ئەو دنیاش زۆر باشترە، ئای کەماڵی لە خواترسان چەند خۆشە. لێرەدا خوا باسی بەختەوەران دەکات بە پێچەوانەی حاڵی بەدبەختان کاتێك کە پێیان وترا: ﴿مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ﴾ واتە: خودا چی بۆ ئێوە ناردە خوار؟ ئینکاریان دەکردو دەیان وت: هیچ شتێکی بۆ نەناردووین بەڵکو ئەوەی موحەمەد (ﷺ) باسی دەکات چیرۆکی پێشینانە، بەڵام لە خواترسان وتیان: خێرو چاکەی بۆ ناردووین، واتە: سۆزو بەزەییو خێرو بەرەکەتە بۆ ئەو کەسەی شوێنکەوتوەو بڕوای پێ هێناوەو خاوەنی چاکە بوون لە ژیانی دنیادا، ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾، ئەم ئایەتە وەك ئەو

---

[1] الفاطر (٣٦).

[2] الغافر (٤٦).

ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾[١] واتە: هەر کەس لە نێر یان لە مێ کردەوەی چاکی کردبێتو بڕواداریش بووبێت ئەوە سوێند بە خوا بە ژیانێکی خۆش دەیان ژێنینو سوێند بێت پاداشتیان دەدەینەوە بە چاکتر لەوەی کە ئەوان دەیانکرد. واتە: هەر کەسێك کرداری چاکەو خاوەن باوەڕە (چ نێرو چ مێ) هەتا دەژی بە خۆشی دەیژێنین، باشتریش لەوەی کردوویانە پاداشتیان دەدەینەوە. لە دنیاو لە قیامەتیشدا، دیاریشە ئەو شوێنەی لە ڕۆژی دوایدا دەدرێت بە خاوەن باوەڕان زۆر باشترە لە دنیاو پاداشتیشی زۆر چاکترە لە پاداشتی دنیا، وەك خوای گەورە لەسەر زمانی خاوەن زانستەکان دەفەرموویت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ ﴾[٢] واتە: خاوەن زانستەکانیش دەیان وت: هەی ماڵ وێرانینە پاداشتی خودا زۆر چاکترە، وە دەفەرموویت: ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴾[٣] واتە: ئەوەی لە لای خوداوەیە هەر بۆ پیاوچاکان باشە، وە دەفەرموویت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ ﴾[٤] واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) ڕۆژی دوایی بۆ تۆ لە دنیا باشترە، پاشان وەسفی ماڵی دوایی دەکاتو دەفەرموویت: ﴿وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ پاشان دەفەرموویت: ﴿ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واتە: دەچنە ناو باغاتێکی وا هەرگیز لەناو ناچێتو ڕووبارەکان بە بەریدا دەڕوات، ﴿ جَنَّٰتُ عَدْنٍ﴾ بەدەلە بۆ ﴿دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: شوێنی خۆپارێزان زۆر خۆشە کە دەچنە ناوی، ﴿تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ڕووبارەکان بە ژێر کۆشكو درەختەکانیدا دەڕوات، ﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ﴾ واتە: هەرچی ئارەزوو بکەن ئامادەیە بۆیان، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموویت: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ۖ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾[٥] واتە: هەرچی دڵ ئارەزووی بکاتو چاو لەزەتی لێ دەبینێت تیایەتی، ئێوەیش لەوێدا نامرن، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كَذَٰلِكَ يَجْزِى ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ واتە: ئا بەو شێوەیە خودا پاداشتی خۆپارێزان دەداتەوە، ئەوانەی بڕوایان بووە پێیو لێی ترساونو ئاکاری چاکەیان

---

[١] النحل (٩٧).

[٢] القصص (٨٠).

[٣] ال عمران (١٩٨).

[٤] الضحى (٤).

[٥] الزخرف (٧١).

کردووە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی فریشتە گیانیان دەکێشێتو چاكو پاك لە دنیا کۆچی دوایی دەکەن، پێیان ئەوترێت: سەلامی خواتان لێ بێت، بچنە بەهەشت بە هۆی کردارەکانتانەوە کە کردووتانە ، واتە: فریشتەکان پێیان ئەڵێن لەبەر ئەو کردارە چاکانەی کە پێی هەڵساونو خۆتان پاك ڕاگرتووە لە بتپەرستیو شتی ناشیرینو تەنها خواتان پەرستووە سڵاوتان لێ بێتو مژدەی بەهەشتیان دەدەنێ، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی وتیان خوا پەروەردگارمانەو لە پاشان ڕاست (لەسەر ئایین) بەردەوام بوون فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتی مردن یان زیندووبوونەوە) (پێیان دەڵێن): مەترسنو خەفەت مەخۆنو مژدە بێت لێتان ئەو بەهەشتەی کە بەڵێننتان پێ درابوو، ئێمە لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی دواییدا دۆستی ئێوەینو لەو (بەهەشتەدا) هەرچی حەزی لێ بکەن بۆتان ئامادەیەو هەرچی داوا بکەن لەوێدا لە خزمەتتاندایە، ڕێزلێنانو میواندارییە لە لایەن خوای لێبوردەی میهرەبانەوە. لە پێشەوە فەرموودەمان هێنا لە بارەی گیان کێشانی خاوەنباوەڕو گیانکێشانی خوانەناسەوە لە کاتی تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴾[2] واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە وتەی بەڕێو جێ (کە شایەتمانە) لە ژیانی دنیاداو لە ڕۆژی دوایشدا وە خوا ستەمکارانیش گومڕا دەکاتو خوا هەرچی بیەوێت دەیکات.

﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾

[1] فصلت (٣٠_٣٢).

[2] ابراهيم (٢٧).

**ماناى باوەڕ نەهێنانى خوانەناسان ئەوەیە چاوەڕوانى سزاى خوایى ئەکەن!**

خواى گەورە دەفەرمووێت: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ﴾ واتە: ئایا ئەو خوانەناسانە جگە لەوە کە فریشتە بێنە لایان، یان فەرمانى پەروەردگاریان پێ بگات، چاوەنواڕێکى تریان هەیە؟ قەتادە دەڵێت: خوداى گەورە هەڕەشە لە بتپەرستان دەکات کە واز ناهێنن و بەردەوامن لە سەر گومڕایی و دنیا باییەواى کردوون، ئایا ئەوانە چاوەڕوانى فریشتە دەکەن کە بێن بۆ لایان هەتا گیانیان بکێشن.[1] ﴿أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ﴾ واتە: یان چاوەڕوانى فەرمانى پەروەردگاریانن کە پێیان بگات لە ڕۆژى قیامەتدا هەتا ئەو نارەحەتیە بچێژن، ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ واتە: پێشینەکانى ئەمانەیش هەر ئەم کردارانەیان هەبوو، بەردەوام بوون لەسەر بتپەرستى هەتا ئەو تۆڵەى خودایان چەشت و ئەوەیان بەسەر هات کە بەسەریان هات و تووشى ئەو جەزرەبەو ڕسواییە هاتن، ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ﴾ خودا هەموو بیانوویەکى بڕین و بەڵگەى تەواوى دایە دەستیان و پێغەمبەرى بۆ ڕەوانە کردن و کتێبیشى پێدا ناردن و ناهەقى لێ نەکردن، ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ بەڵام خۆیان ناهەقیان لە خۆیان کرد، گوێڕایەڵى پێغەمبەرەکانیان نەکردو بڕوایان نەکرد بەو کتێبانەى کە بۆیان هێنان، ﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟﴾ واتە: سزاى کردارى خۆیان هاتە ڕێیان، تووشى ئەو جەزرەبەیە بوون، ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ واتە: ئەو سزایەى کە ئەوان بە گاڵتەجاڕیان دەزانى کە لەسەر زمانى پێغەمبەرانەوە بەڵێنیان پێ درابوو دەورى دان ، بۆیە لە ڕۆژى قیامەتدا پێیان دەوترێت: ﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾[2] واتە: ئەوە ئەو ئاگرەیە کە بڕواتان نەدەکرد هەبێت.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾﴾

---

[1] الطبري (١٧/١٩٩).

[2] طور (١٤).

**بتپەرستان بەڵگە دەهێننەوە بۆ بتپەرستیەکەیان گوایەخوا ئارەزووی وابووەئەمان بتپەرست بن!، خوایش وەڵامی ئەو قسە پڕوپوچانەیان دەداتەوە**

خوای گەورە باسی ئەو قسە پڕپووچانەی بت پەرستان دەکات کە دەیکەنە بەڵگە لەسەر پەرستنی بتەکانیان‌و ئێژن خودا ئارەزووی لەسەرئەو بتپەرستی یەی ئەوان بووە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە شەریکیان بۆ خودا دانا، وتیان: ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە، نە ئێمەو نە بابو باپیرمان جگە لە خودا شتی ترمان نەدەپەرست و هیچ شتێکمان بەبێ فەرمانی ئەو حەرام نەدەکرد، یانی وەك: "بەحیرە"و "سائیبە"و "واسیلە".[1] هاوشێوەی ئەوان کە دایان نابوون‌و بە ئارەزووی خۆیان ناویان لێ نابوون بێئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت لەو بارەیەوە، دەیان وت: ئەگەر خودا ئەو کارەی ئێمەی پێ ناخۆش بووایە، نەیدەهێشت ئێمە پێی هەڵسین‌و سزای دەدایین، نەماندەتوانی ئەو کارە بکەین خوای گەورەیش ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێك لێیان وەڵامی ئەو قسە پڕوپوچەیان دەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾ واتە: پێشینەکانی ئەوانە هەر بەو شێوەبە بوون،دەی ئایا پێغەمبەران جگە لە ڕاگەیاندنی بە ئاشکرا، هیچی تریان لەسەرە؟ واتە: بەو شێوەیە نیە کە ئێوە دەزانن، کە خودا پێی ناخۆش نەبووە بەڵکو زۆر پێی گران بووەو زۆر دژایەتیشی کردووە، بە توندیش لێی قەدەغە کردوون، لە هەموو کۆمەڵێکدا پێغەمبەری ڕەوانە کردووە بۆ خەڵکی، هەموویان بانگەوازیان کردووە بۆ خواپەرستی‌و داوایانکردووە لەوگەلانە کەواز بێنن لەپەرستنی غەیری خودا، وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ واتە: بۆ ناو هەموو گەلێك پێغەمبەرێکمان ناردووە، کە خوا بپەرستن‌و لە شەیتان دوورکەونەوە، واتە: بەردەوام خودا پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەم خەڵکەو داوای لێ کردوون کە تەنها خودا بپەرستن، لەو کاتەوە کە بتپەرستی پەیدا بووە لەناو نەوەی ئادەمدا لە ناو هۆزی (نوح)دا کە خودا نوحی بۆ ناردن، کە یەکەم ڕەسول بوو خودا ناردی بۆ خەڵکی سەر زەمین کە دواین ڕەسولیان موحەمەد بوو (ﷺ) کە

---

[1] بتپەرستان هەندێ شتیان حەرام ئەکردلەخۆیان بۆنمونە: بەحیرە: ئەو وشترە بوو کە پێنج سکی دەکرد، پێنجەم سکی نێر بووایە، ئەو کاتە گوێیان لەت دەکردو بەرەڵایان دەکرد.

سائیبەش: وشترێك بوو دە تا دوانزە سکی دەکردو هەمووی مێینە بوو.

واسیلە: وشترێك بوو کە یەکەم‌و دووەم سکی مێینە بوو.(ئەمانەیان بەرەڵائەکردوگۆشتەکانیان لەسەرخۆیان حەرام ئەکرد(وەرگێڕ)

بانگەوازەکە مرۆڤو جنۆکەیشی گرتەوە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوایشدا بە کشتی، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾[1] واتە: ئێمە نەمان ناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە کەواتە تەنها من بپەرستن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ﴾[2] واتە: تۆ پرسیار بکە لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن ئایا بێجگە لە خوای میهرەبان بڕیارمان داوە پەرستراوێك بپەرسترێت. لێرەیشدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾ ئیتر چۆن هیچ کەسێك لە بتپەرستان دوای ئەوە دەتوانێت بڵێ: ﴿لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ﴾ئەمەی کە ئەیڵێن خوا مەیلی لێ بووایە ئێمە ئەو شتانەمان نەدەپەرست قسەی پڕوپوچەو ڕاست نیە چونکە خوای گەورە بتپەرستی لێ قەدەغە کردن لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێت) بەڵام مانەوەیان لەسەر بتپەرستیو واز نەهێنانیان بووە هۆی گومڕابوونیان بۆیە ئەوە نابێتە بەڵگە بە دەستیانەوە، چونکە خوای گەورە ئاگرو ئەو کەسانەشی دروست کردوون کە شایەنی ناو ئاگرن لە شەیتانەکانو خوانەناسەکان، خودا هەرگیز ڕازی نیە بەندەکانی بێدین بن، دیارە هەموو شتێکی خودا پڕە لە کارزانیو هەموو کارەکانی چاکو بەجێیە، پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کەزۆرناڕەزایی دەربڕیوە بەرامبەریان هەر لەدنیاداسزای داون لە پاش ئاگادارکردنەوەیان لە لایەن پێغەمبەرانەوە، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ واتە: هەندێ لەوانە خودا خۆی شارەزای کردن، هەندێکیشیان گومڕایی بووە کاڵای باڵایان، بڕۆن بەسەر زەمیندا بگەڕێنو سەیر بکەن، چارەنووسی ئەوانەی کە پێغەمبەرانیان بە درۆ دادەنا بە کوێ گەیشت، خودا تەفروتونای کردنو هەمووی لەناودان، بۆ خوانەناسانیش هەر تۆڵەی وا هەیە،وەك دەفەرمووێت: ﴿دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا﴾[3] واتە: خوا لەناوی بردن بۆ بێباوەڕانیش هەرسەرەنجامی ئاوا هەیە، وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ

[1] الانبياء (٢٥).
[2] الزخرف (٤٥).
[3] محمد (١٠).

﴿كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾[1] واتە: لە پێش ئەمانەش هەر هەبووە بڕوایان بە نیشانەکانی من نەبووە، سا چۆن بە گژیاندا چووم، پاشان خوای گەورە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار دەکات، هەرچەندە هەوڵ بدات بۆ ئەوەی ڕێگایان نیشان بدات، هیچ سوودێکی لێ وەرناگرن، ئەگەر خودا بڕیاری دابێ گومڕایان بکات وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا﴾[2] واتە: وە هەر کەسێك خوا بیەوێت کافرو گومڕای بکات ئەوە تۆ لە بەرامبەر خودا هیچت پێ ناکرێت بۆی. نوحیش وتی بە هۆزەکەی وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَنفَعُكُمۡ نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡ﴾[3] واتە: هەرئامۆژگاریەکتان بکەم سودی نیە، ئەگەر خودا بڕیار بدا گومڕاتان بکات، وە لەم ئایەتەیش لێرەدا دەفەرموێت: ﴿إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ واتە: هەرچەندە هەوڵ بدەی بۆ شارەزاکردنیان، ئەوانە کە گومڕان خودا ڕێگەیان نیشان نادات، کەسیش بە هانایانەوە نایات، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ وَيَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾[4] واتە: هەر کەسێك خوا گومڕای بکات (بە تاوانی کردەوەی خراپی) ئەو هیچ ڕێبەریەکی بۆ نیە (خوا) وازیان لێ دێنێت لە گومڕاییو یاخی بوونی خۆیاندا گێژ بخۆن. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[5] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی بڕیاری پەروەردگارت دەرچووەو چەسپاوە بۆیان بڕوا ناهێنن، (بڕوا ناهێنن) هەرچەندە هەموو بەڵگەو نیشانەیەکیشان بۆبێت هەتا سزای سەختی ئازاردەر دەبینن (بە چاوی خۆیان). واتە هەرچی خودا بڕیاری لەسەر دا هەر ئەوە دەبێت، ئەوەی خودا گومڕای کرد کێ دەتوانێت ڕێگەی نیشان بدات؟! بێگومان هیچ کەس ناتوانێت، وە کەسیش ناتوانێت بێت بە هانایەوە لە سزای خودا ڕزگاری بکات، ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ

[1] الملك (١٨).

[2] المائدة (٤١).

[3] هود (٣٤).

[4] الاعراف (١٨٦).

[5] یونس (٩٦-٩٧).

رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾[1] واتە: وەدیهێنان و فەرماندان بۆئەوخودایەی کە زۆر پاکو بێعەیبەو پەروەردگاری هەمووجیهانە.

﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ ۚ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَـٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾﴾

**زیندووبوونەوەی پاش مردن ڕاستەو پڕە لە کارزانیو زۆر ئاسانە لە لای خودا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ﴾ واتە: بە توندی سوێندیا دەخواردو ڕەش هەڵدەگەڕان لە سوێند خواردنەکەیاندا کە: بە خوا کەسێك کە دەمرێت جارێکی تر زیندووی ناکاتەوە، واتە: خوانەناسان زیندووبوونەوەیان زۆر بە لاوە دوور بوو، بۆیە ئەو هەواڵانەی کە پێغەمبەران بۆیان باس دەکردن، باوەڕیان پێ نەدەکردو سوێندیشیان دەخوارد کە هەرگیز شتی وا نابێت، خوای گەورەیش وەلامیان دەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە:ئەرێ! هەر بەلێنێك خودا بیدات هەر دێتەجێ بەلام زۆربەی ئەو خەڵکە نازانن، واتە لە نەفامی ئەو خوانەناسانەیە کە دژایەتی پێغەمبەران دەکەنو تووشی بێباوەڕی دەبن، پاشان خوای گەورە باس لە کارزانی خۆی دەکات لە زنیدووبوونەوەو وەستانی خەڵکی بە لاشەوگیانەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾ واتە: هەتا خودا ئەو شتەی ئەوان کێشەیان لەسەر کرد ئاشکرا بکات، تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە چاکەی باشیش دەربارەی کارچاکان بکات وەك دەفەرمووێت: ﴿لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى﴾[2] واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە بە پێی کردەوەکانیانو پاداشتی ئەوانەش بداتەوە کە چاکەیان کردووە بە چاکتر (لەوەی کردوویانە). پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَـٰذِبِينَ﴾ واتە: تا خوانەناسان بزانن کە نەخێر هەر ئەوان درۆیان دەکرد. کە سوێندیان ئەخوارد کە هەر کەسێك مرد خودا زیندووی ناکاتەوە! بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێن بۆ ناو ئاگری جەهەنەم فریشتەی سزادان (زەبانیە) پێیان ئەڵێ: ﴿هَـٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم

---

[1] الاعراف (٥٤).

[2] النجم (٣١).

بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَا أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ اَصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾[1] واتە: (پێیان دەوترێت) ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بە درۆتان دەزانی، ئایا ئەم ئاگرە جادووە یان ئێوە نابینن، بچنە ناویەوە ئینجا ئارام بگرن یان نەیگرن یەکسانە بۆتان، بێگومان هەر تۆڵەی ئەو کردەوانەی دەتانکرد لێتان دەسەنرێتەوە. پاشان خوای گەورە باسی دەسەڵاتی خۆی دەکات، ئەگەر بیەوێت شتێك بكات هیچ کەس ناتوانێت ببێتە ڕێگری، دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾ واتە: ئێمە هەرچیەك بمانەوێ ببێت، هەر ئەوەندەیە کە پێی بڵێین: ببە! دەبێت، زیندووبوونەوەیش وەك ئەوە وایە، هەر کاتێك خوای گەورە فەرمان بدا کە ببێت، یەکجار دەفەرمووێت:ببە،ئەویش بەو شێوەیەی کە مەیلی لێیەتی دەبێت، وەك لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴾[2] واتە: کاری ئێمە یەك جارەیەو هەر لە چاوتروکانێکدا کۆتایی پێدێت، وە دەفەرمووێت: ﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾[3] واتە: دروست کردنو زیندووکردنەوەتان وەك دروست کردنو زیندووکردنەوەی تەنها کەسێك وایە، واتە: خودا کە فەرمانی بە شتێك کرد پێویستی بە جەختکردنەوە نیە لەسەر ئەو شتە، چونکە خودا هیچ شتێك نابێتە ڕێگریو بتوانێت دژایەتی بکات، تاكو تەنهایەو زاڵو مەزنە، زاڵیو مەزنیو دەسەڵاتی ئەو هەموو شتێکی بەزاندوەو ملی پێ ئەوی کردوە، هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لە خوداو هیچ پەروەردگارێکیش نیە غەیری خۆی.

﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾

## پاداشتی کۆچەران

خوای گەورە باسی پاداشتی ئەو کۆچەریانە دەکات کە لە ڕێی خوداو ڕەزامەندی ئەودا زێدی خۆیان بەجێ هێشت، ئەوانەی کە دوورکەوتنەوە لە خزمو کەسو کارو براو دۆست، بە هیوای چاکەو پاداشتی خودا، هەڵدەگرێت ئەم ئایەتە هۆی هاتنەخوارەوەی لە بارەی کۆچەریەکانی حەبەشە بوویێت، ئەوانەی کە ئازاری توندی هۆزەکەیان لە مەککەدا وای لێ کردن کە بەجێیان بێڵنو بەرەو وڵاتی حەبەشە بکەونەڕێ، تا بتوانن لەوێ عیبادەتی خودا بکەن، لە کەسە بەناوبانگەکانیان عوسمانی

---

[1] الطور (١٤ـ١٦).

[2] القمر (٥٠).

[3] لقمان (٢٨).

کوڕی عەفانو ڕوقیەی خێزانی کە، کچی پێغەمبەری خوابوو (ﷺ)، جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ئامۆزای پێغەمبەر(ﷺ)، أبو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسوەدو کۆمەڵێك کە نزیکەی هەشتا کەسێك دەبوون لە پیاوو ژنی ڕاستگۆو لێبڕاو بۆ ئاینی خودا(ڕەزای خوایان لێ بێت)، لەبەر ڕەزامەندی خودا کۆچیان کرد لە مەککەوە بۆ حەبەشە، خوایش بەڵێنی پێدان کە پاداشتیان بداتەوە لە دنیاو لە قیامەتدا وەك دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ﴾ واتە: ئەوانەی لە ڕێی خودا کۆچیان کرد، پاش ئەوەی کە ستەمیان لێ کرا، بێگومان لە دنیادا جێگیریان دەکەین بە چاکی، ئیبنو عەبباسو شەعبیو قەتادە دەڵێن: مەبەست پێی مەدینەیە.[1] واتە لە مەدینەدا جێگیریان دەکەین. موجاهید دەڵێت: ڕۆزی پاکیان پێدەدەین .[2] هیچ دژایەتیەك لە نێوان ئەم دوو قسەیەدا نیە، چونکە ئەوانە شوێنوماڵو سامانی خۆیان بەجێ هێشت، خوای گەورەیش لەوە زیاتر پاداشتی دانەوە لە دنیادا، هەر کەسێك لەبەر ڕەزامەندی خودا واز لە شتێك بێنێت خودا پاداشتی زیاتر دەداتەوە لەو شتەی کە بەجێی هێشتووەو وازی لێ هێناوە، هەر بەو شێوەیەش بوو، ئەوانەی کۆچیان کرد لە مەککەوە بۆ حەبەشە، خودا پاداشتی دانەوەو لەو وڵاتەدا (مەککەو مەدینە) جێگیری کردنو بوونە کاربەدەستو فەرمانڕەوایان، هەر یەکێك لەوانە بوونە پێشەوای لە خواترسان، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ﴾ واتە: ئەگەر بە خۆیان بزانن پاداشتی ڕۆژی دوایی باشترە، لەوەی کە لە دنیادا پێمان داون، واتە: ئەگەر ئەوانەی کە کۆچیان نەکردووە دەیان زانی کە خودا چی بۆ ئەوانە داناوە لە ڕۆژی دوایدا کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودانو شوێنکەوتووی پێغەمبەرن (ﷺ)، واتە زۆر لەوە باشترە کە لە دنیادا پێی داون، پاشان خودای گەورە وەسفیان دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی خۆڕاگربوونو خۆیان هەر بە خوا سپارد، لە کاتی ئەو ئازارو ئەشکەنجەی کە هۆزەکەیان دەیاندان، پاشەڕۆژ لە دنیاو لە قیامەتدا هەر بۆ ئەوانە.

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾

---

[1] الطبري (١٧/٢٠٥، ٢٠٦).

[2] الطبري (١٧/٢٠٦).

**خودا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە مەگین ئەو پێغەمبەرە مرۆڤ بووە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: لە پێش تۆدا ئەی موحەمەد (ﷺ) هەر کەسێکمان بە پێغەمبەری ناردووە مەگین پیاو بووەو بە فریشتەکاندا فەرمانی خۆمان بۆ ناردوون، ئەگەر ئێوە نەتان زانیووە لەو کەسانە پرسیار بکەن کە کتێبیان خوێندووەتەوە. زەححاك دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە کاتێك خودا موحەمەدی (ﷺ) ڕەوانەکرد بە پێغەمبەرێتی، عەرەبەکان ناڕەزاییان دەربڕی یان هەندێ لە عەرەبەکان ناڕەزاییان دەربڕی‌و وتیان: خودا زۆر لەوە مەزنترە کە پێغەمبەرانی لە مرۆڤ بێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾[1] واتە: ئایا خەڵکی بە لایانەوە سەیرە، پیاوێکمان لە خۆیان ڕاسپاردووە کە مەردم بترسێنێت، وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: پرسیار لە خاوەن کتێبە پێشینەکان بکەن ئایا ئەو پێغەمبەرانەی هاتن بۆ لای ئەوان مرۆڤ بوون یان فریشتە؟ ئەگەر فریشتە بوون ئەوە ناڕەزایی خۆتان دەربڕن، خۆ ئەگەر مرۆڤ بوون، ئیتر ئینکاری مەکەن لەوەی کە موحەمەد(ﷺ) ڕاسپاردەیە، لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾[2] واتە: وە ئێمەش پێش تۆ (پێغەمبەرمان) نەناردووە جگە لە پیاوانێك کە نیگامان بۆ دەکردن لە خەڵکی شارەکان. واتە: ئەم پێغەمبەرانە خەڵکی شارەکان بوون لەسەر زەمیندا، خەڵکی ئاسمان نەبوون وەك ئێوە وتتان.[3] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەباسەوە مەبەست بە ﴿أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ﴾ زانایانی ئەهلی کتێبە.[4] وەك ئەم ئایەتانەش کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ۝٩٣ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ۝٩٤ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا﴾[5] واتە: (ئەی

---

[1] يونس (٢).

[2] يوسف (١٠٩).

[3] الطبري (٢٠٨/١٧).

[4] الطبري (٢٠٨/١٧).

[5] الاسراء (٩٣-٩٤).

موحەمەد(ﷺ)) بلێ پاکیو بێگەردی بۆ پەروەردگارم ئایا من (شتێکی ترم) بێجگە لە ئادەمیەکی نێردراوو پێغەمبەر؟ هیچ شتێك بەرگری خەڵکی نەکرد لەوەی کە باوەڕ بێنن کاتێك کە ڕێنموونیو ئایینی هەقیان بۆ هات جگە لەوەی دەیان وت:چۆن خوا ئادەمییەك بە پێغەمبەر دەنێرێت؟!وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ﴾[1] واتە: ئێمە لە پێش تۆ هەر کام لە پێغەمبەرانمان ناردبێت بێگومان ئەوان خواردنیان خواردووەو بە بازاڕدا ڕۆیشتوون. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَٰهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُوا۟ خَٰلِدِينَ﴾[2] واتە: ئێمە ئەو پێغەمبەرانەمان نەکردۆتە پەیکەرێك کە خواردن نەخۆنو ئەوان هەمیشەییو نەمر نەبوون. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾[3] واتە: بلێ من یەکەم پێغەمبەر نیم (نێردرابم). وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ﴾[4] واتە: بلێ (بەو بێباوەڕانە) بێگومان منیش تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە بەڵام سروشم بۆ دێت. پاشان خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە گومانیان هەیە پێغەمبەران مرۆڤ بوون، با پرسیار لە خاوەنی کتێبە پێشووەکان بکەن لەو پێغەمبەرە پێشینانەی ئەوان، ئایا مرۆڤ بوون یان فریشتە؟ پاشان خوای گەورە باسی ئەو پێغەمبەرانە دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ﴾ واتە: لەگەڵ چەند بەڵگەو کتێبی ئاسمانی، ئیبنو عەباسو موجاهیدو زەححاكو کەسانی تریش وتوویانە: (الزبور) واتە: ئەو کتێبانە.[5] (الزُّبُر) کۆی (زبور)ە، عەرەب ئەڵێن: (زَبَرْتُ الكتاب–إذا كتبتُه) واتە کاتێك نووسیمەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ﴾[6] واتە: هەر کارێك کە کردوویانە وا لەناو دەفتەردا (الزبور). وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾[7] واتە: لە زەبوردا کە لە پێش تەورات هات، نووسیمان ئەم زەمینە هەر بۆ بەندە چاکەکانی ئێمە دەمێنێتەوە، پاشان خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ﴾ واتە: بۆ تۆش ئەی

---

[1] الفرقان (٢٠).

[2] الانبياء (٨).

[3] الاحقاف ( ٩).

[4] الكهف (١١٠).

[5] الطبري (١٧/٢١١).

[6] القمر (٥٢).

[7] الانبياء (١٠٥).

موحەمەد (ﷺ) ئەم قورئانەمان نارد، ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ واتە: هەتا خەڵكی لێ تێ بگەیەنی، چونكە تۆ شارەزای ئەو قورئانەی كە بۆت هاتووەو زۆر هەوڵ دەدەی فەرمانەكانی بەجێ بێنیو زۆر پابەندی پێیەوە، وە ئێمە باش دەزانین كە تۆ بەڕێزترینو مەزنترین منداڵی ئادەمیو هەرچی لایان گران بێت لێی تێ نەگەن تۆ بۆیان ڕوون دەكەیتەوە، ﴿وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: بەڵكو بیربكەنەوەو بە خۆیاندا بچنەوەو شارەزا بنو سەركەوتن بە دەست بێنن لە دنیاو قیامەتدا.

﴿أَفَأَمِنَ الَّذِينَ مَكَرُوا السَّيِّئَاتِ أَن يَخْسِفَ اللَّهُ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِي تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾﴾

**چۆن تاوانباران ناترسن ودڵەخورپەیان نی یە؟!**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَأَمِنَ الَّذِينَ مَكَرُوا السَّيِّئَاتِ أَن يَخْسِفَ اللَّهُ بِهِمُ الْأَرْضَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: ئایا ئەوانەی بە فێڵبازی خەریكی خراپەكاری بوون ناترسن كە خودا نوقمی ناو زەوییان بكات، یان لە شوێنێكەوە سزایان بۆ بێت كە هەر بیریشی لێ ناكەنەوە؟ خوای گەورە لێرەدا باسی دەرون گەورەییو مۆڵەتدانی خۆی دەكات بەرامبەر ئەو كەسانەی كە یاخینو كاری خراپ دەكەنو خەڵكیشی بۆ بانگ دەكەن و بە فێڵبازیش خەڵكی لە خشتە دەبەنو تووشی ئەو خراپەی دەكەن، لەگەڵ ئەو هەموو تواناو دەسەڵاتەیدا، ئەگەر مەیلی لێ بێت نوقمی ناو زەویان بكات یان سزایان بۆ بنێرێت، ﴿مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾ لە شوێنێكەوە كە هەر نازاننو بیریشی لێ ناكەنەوە لە كوێوە بۆیان دێت. وەك ئەم ئایەتانە كە دەفەرموێت: ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾[1] واتە: ئایا دڵنیان لەو خوایەی كە لە ئاسمانە بتانباتە خوارەوە بە ناخی زەویدا لە كاتێكدا كە زەوی (وەك دەریا) گێژ بخوات (وبێتە لەرزین)؟ ئایا دڵنیان لەو خوایەی كە لە ئاسمانە كە بای توندتان بنێرێتە سەر بە وردە زیخەوە ئەو دەمە تێدەگەن كە هەڕەشەی ئێمە چۆنە؟ وە پاشان دەفەرموێت: ﴿أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِي تَقَلُّبِهِمْ فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾ واتە: یان لە ڕێی هاتوچۆیاندا سزا بیانگرێتو نەتوانن خۆیان دەرباز بكەن، واتە: كاتێك خەریكی بژێوی پەیداكردنیو سەرقاڵكردنو فرۆشن لە سەفەرەكانیانداو كارو كاسبی هەموو شتێكی لە بیربردوونەتەوە ناترسن سزایان بۆ بێت، قەتادەو سودی دەڵێت: ﴿تَقَلُّبِهِمْ﴾ یانی:

[1] الملك (١٦ـ١٧).

هاتوچۆیاندا.[1] وەك ئەم ئایەتانە كە دەفەرموویّت: ﴿أَفَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَٰتًا وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ﴾[2] واتە: ئایا خەڵكی ئەو شارانە ترسیان نەبوو لەوەی سزای ئێمەیان بۆ بێت لە شەودا كاتێك ئەوان خەوتوون، وە ئایا خەڵكی ئەو شارانە ترسیان نەبوو لەوەی كە سزای ئێمەیان بۆ بێت لە چێشتەنگاودا لە كاتێكدا یاریو گاڵتە دەكەن. وە دەفەرموویّت: ﴿فَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾ واتە: لە دەستی خودا دەربازیان نابێت لەسەر هەر حاڵێك بن، وە دەفەرموویّت: ﴿أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ فَإِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: كاتێك كە دەترسن بیان گرێت؟ هەر پەروەردگاری ئێوەیە وا دڵسۆزو دلۆڤانە، واتە: چونكە ئەو ترسە زۆر زیاتر كار دەكاتە سەر خەڵكی لە كاتی ڕوودانی كارەساتدا، بۆیە عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلَىٰ تَخَوُّفٍ﴾ خودا دەفەرموویّت: ئەگەر بمەوێت لە كاتی مردنی دۆستو هاوەڵیدانەویش دەگرم،چونكە لەو كاتەدا زیاتر دەترسێت.[3] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە موجاهیدو زەحاكو قەتادەو كەسانی تریشەوە.[4] بەڵام خودا دڵسۆزو دلۆڤانە بۆتان، كە تۆڵەی لێ نەسەندن، وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە: ( هیچ كەسێك خۆڕاگرتر نیە لەسەر ئازارێك كە بیستبێتی جگە لە خوا، ئەوان منداڵ بۆ خودا دادەنێن، كەچی خودا ڕۆزیان دەداو تەندروستیان دەكات).[5] دیسان لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە: (بێگومان خوا مۆڵەتی ستەمكار دەدات، هەتا كاتێك كە گرتی لە دەستی دەرباز نابێت)، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[6] واتە: ئا بەو شێوەیە سزادانی پەروەردگارت كاتێك خەڵكی شارەكان سزا دەدات كە ستەمكار بوون بە ڕاستی تۆڵەسەندنی ئەو ئازاردەرو بەتینە. وە دەفەرموویّت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾[7] واتە: وە (خەڵكی) چەندەها شارو دێ

---

[1] الطبري (٢١٣/١٧).

[2] الاعراف (٩٧_٩٨).

[3] الطبري (٢١٤/١٧).

[4] الطبري (٢١٥/١٧).

[5] فتح الباري (٣٧٢/١٣)، مسلم (٢١٦٠/٤).

[6] هود (١٠٢).

[7] الحج (٤٨). فتح الباري (٢٠٥/٨)، مسلم (١٩٩٧/٤).

(هەبوون) مۆڵەتم دان کە ستەمکار بوون لە پاشان تۆڵەم لێ سەندن (لەناوم بردن)و هەر بۆ لای من دەگەڕێنەوە.

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ (٤٨) وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ (٤٩) يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ (٥٠) ﴾

### هەموو شتێك سوژدە بۆ خوا دەبات

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴾ واتە: ئایا بە چاو نەیان دیوە، کە هەرچی خودا دروستی کردووە، سێبەریان بە ڕاستو چەپدا سوژدە دەبەن بۆ خودا بە ملکەچی؟ خوای گەورە باسی گەورەیی‌و خاوەن دەسەڵاتی‌و بێباکی خۆی دەکات کە هەموو شتێك ملکەچە بۆی‌و سەری بۆ نەوی دەکات بە هەمووجۆرەکانیەوە بە گشتی: بە بێگیان‌و گیانداریەوە،ئەوانەی ئەرکیان لەسەر (مكلف) لە مرۆڤو جنۆکەو فریشتەکان، وە دەفەرموێت: هەرچی سێبەری هەیە بە ڕاستو چەپدا واتە: بەیانیان‌و ئێواران سوژدە دەبەن بە سێبەرەکەیان بۆ خوای گەورە، موجاهید دەڵێت: کاتێك کە خۆر لار بووەوە هەموو شتێك سوژدە دەبات بۆ خوای گەورە.[1] قەتادەو زەحاكو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2] موجاهید دەڵێت: سوژدەی هەموو شتێك سێبەرەکەیەتی.[3] کێوی بە نموونە هێناوەتەوە دەڵێت سوژدەی کێو سێبەرەکەیەتی: ئەبو غالبی شەیبانی دەڵێت: شەپۆلەکانی دەریا نوێژەکەیەتی خوای گەورە کاتێك باسی سوژدەی ئەمانەی کردووە، وەك کەسێکی خاوەن بیرو هۆش مامەڵەی لەگەڵ کردوون، فەرموویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ واتە:هەرچی لە ناو ئاسمانەکان و زەمیندا هەیەو جوڵەی هەیە، فریشتەکانیش سوژدە بۆ خودا دەبەن فیز ناکەن‌و عیبادەتی خوا دەکەن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ۩﴾[4] واتە: سوژدە بۆ خوا دەبات هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدایە بیانەوێ‌و نەیانەوێ هەروەها سێبەرەکانیان لە بەیانیان‌و ئێواراندا (سوژدە

---

[1] الطبري (١٧/٢١٧).

[2] الطبري (١٧/٢١٧).

[3] الطبري (١٧/٢١٧).

[4] الرعد (١٥).

دەبەن). پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾ واتە: ترسیان هەیە لە پەروەردگاری بان سەریان، هەر فەرمانێکیان بۆ بێت بەجێی دێنن، بە ترس و لەرزەوە سوژدە بۆ پەروەردگاری مەزنیان دەبەن و بەردەوام گوێڕایەڵی فەرمانی ئەون و ئەوەی فەرموویەتی جێبەجێی دەکەن، ئەوەیش لێی قەدەغە کردوون وازی لێ دێنن.

﴿وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا ۚ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ ۗ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾﴾

## تەنها خودا شایەنی پەرستنە

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ اللَّهُ لَا تَتَّخِذُوا إِلَٰهَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَإِيَّايَ فَارْهَبُونِ﴾ واتە: خوا فەرموویەتی: با دوو پەرستراوتان نەبێت، پەرستراو تەنها یەکێکە و دەبێت هەر من بپەرستن، خوای گەورە دەفەرموویت پەرستراو تەنها هەر خۆیەتی و دەبێت عیبادەت هەربۆ ئەو بکرێت بە تەنهاو شەریکی نیەو خاوەنی هەموو شتێکە و پەروەردگاریشیەتی، ﴿ وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا ۚ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ ﴾ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەیە، هەر هی ئەون و ئاینی هەمیشەییش هەر تایبەتی ئەوە، ئایا دەبێت لە غەیری خودا بترسن؟ ئیبنو عەبباس و موجاهیدو عیکریمەو مەیمونی کوڕی میهران و سودی و قەتادەو کەسانی تریش دەڵێن: ﴿وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا﴾ واتە: ئاینی هەمیشەیی هەر تایبەتی خودایە.[1] ئیبنو عەباس دیسان دەڵێت: ﴿وَاصِبًا﴾ واتە: (واجباً).[2] موجاهید دەڵێت: گوێڕایەڵی هەمیشەیی هەر بۆ خودایە، واتە: ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەمیندان دەبێت هەر عیبادەت بۆ خودا بکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿﴿٨٢﴾ أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴾[3] واتە: ئایا (بێباوەڕان) داوای غەیری

[1] الطبري (٢٢٢/١٧).
[2] الطبري (٢٢٣/١٧).
[3] ال عمران (٨٣)

دینی خودا دەکەن؟! لە کاتێکدا ئەوانەی لە ئاسمانو زەویدان فەرمانبەری خوان بیانەوێت یان نەیانەوێت و هەموو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە.(هەمووبۆلای خوادەگەڕێنەوە) ئەم ڕستەیە لەسەر قسەی ئیبنو عەبباسو عیکریمە لە بابی خەبەرە بەڵام لەسەر قسەی موجاهید لە بابی داوایە واتە: بترسن ئەگەر هەر شتێك بکەنە شەریکم، بە ڕێکیو پاکی بمپەرستن، وەك ئەم ئایەتەی کە دەفەرموویت: ﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ﴾[1] واتە: بێداربە ئاینی (گەردنکەچی) پاکو خاوێن هەر بۆ خودایە! واتە: چاك بزانە ئاینی پاك هەر ئاینی خوایە،پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ﴾ واتە: هەر بەهرەیەك هەتانە لە خواوەیە، پاشان تووشی هەر ناڕەحەتیەك ببن، هەر لە خودا دەلاڵێنەوە، خوای گەورە لێرەدا باسی ئەوە دەکات کە هەر خۆی خاوەنی هەموو شتێکە، قازانجو زەرەر بە دەستی ئەوە، ئەوەیش کە دەیدات بە بەندەکانی لە ڕۆزیو تەندروستیو سەرکەوتن لە ڕێزو چاکەی خۆیەتی پێتان دەبەخشێت، چاکیش بزانن هەر ناڕەحەتیەکتان توش ببێت هیچ کەسێك ناتوانێت ڕزگارتان بکات لێی تەنها ئەو نەبێت، بێگومان ئێوە لە کاتی لێقەومانو ناڕەحەتیدا هەر لە خودا دەلاڵێنەوەو داوا لەو دەکەن، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّا إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الْإِنسَانُ كَفُورًا﴾[2] واتە: وە کاتێك لە دەریادا تووشی بەڵاو زیان بێن هەموو ئەو (پەرستراوانە)ی هاواریان لێ دەکەن ون دەبن بێجگە لە خوا کەچی کاتێك کە (خوا) ڕزگارتان دەکاتو دەگەنە وشکانی ڕوو وەردەگێڕن (چونکە) ئادەمی هەمیشە سپڵەو ناسوپاسە. لێرەدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: لە پاش ئەوەی خودا ئەو بەڵایەی لەسەر لابردن، هێشتا دەستەیەك لە ئێوە هاوەڵ بۆ پەروەردگاری دادەنێت، با حاشا بکەن لەوەی کە پێمان بەخشیون، لە دنیادا ڕابوێرن، بەو زووانە تێدەگەن چیتان بەسەر دێنین! ﴿لِيَكْفُرُوا﴾ وتراوە ئەم لامە (اللام)لامی عاقیبەتە لێرەدا(واتە:سەرەنجامی ئەو ناشوکرییەیان سەرلەکافربوونەوە دەردەکات)[3] ، وتراویشە: لامی تەعلیلە (التعليل) واتە: ئاوامان لێ کردوون هەتا حاشا بکەن، یانی: بۆ ئەوەی دان نەنێن بەو بەهرانەی خودا پێی بەخشیونو بیشارنەوە،

---

[1] الزمر (٣).

[2] الاسراء (٦٧).

[3] ئەوزیادەیە(هی وەرگێڕەوماناى تیپی(ل)دەیگەیەنێت وەك ئایەتی (ومن الناس من يشتري لهوالحديث ليضلواعن سبيل الله)

کە هەر خودایە ئەو بەهرانە دەڕێژێت بە سەریانداو بەڵاشیان لێ لادەدا، پاشان هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەفەرموویێت: ﴿فَتَمَتَّعُواْ﴾ لە دنیادا کەمێك ڕابوێرن، هەرچی دەکەن بیکەن، ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ زۆر ناخایەنێت تێدەگەن چیتان بەسەردێت.

﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ ۗ تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾﴾

**یەکێك لە کردارەکانی بتپەرستان ئەوەیە لەو ڕۆزیەی کە خودا پێی داون نەزر دەکەن بۆ پەرستوەکانیان!**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ﴾ واتە: لەو ڕۆزیەش کە پێمان داون بەشێکی دەدەن بەو بتانەی کە هیچ نازانن، خودای گەورە باسی ئەو شتە ناشیرینانە دەکات کە بت پەرستان پێی هەڵدەستن، وەك پەرستی ئەو بتانە لەگەڵ خوادا کە خۆیان دروستی دەکەن، بێ ئەوەی هیچ زانیاریەکیان لەسەر هەبێت، لەو ڕۆزیەی کە خودا پێی داون بەشێکی دەدەن بەو بتو هەیکەلانە، ئەڵێن: ئەمە بۆ خواو ئەمەیش بۆ بتەکان، بە خەیاڵی خۆیان ئەوەی بۆ بتەکانە ناگات بە خودا، بەڵام ئەوەی بۆ خودایە دەگات بە بتەکانیان، ئەم بڕیارەیان بڕیارێکی زۆر خراپە، واتە: بەشێکیان داناوە بۆ پەرستراوەکانیان لەو بژێویەی کە خوا پێی داون، بۆیە خوای گەورە سوێند دەخواتو دەفەرموویێت: ﴿تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا لەسەر ئەو درۆ هەڵبەستنەیان پرسیاریان لێ دەکرێت. خوا سوێند دەخوات بە گیانی پیرۆزی خۆی کە لەسەر ئەو بوختانەی کردوویانە لێیان دەپرسێتەوەو بە پێی ئەو تاوانە گەورەیە کە کردوویانە تۆڵەی تەواویان لێ دەسێنێت، لەناو ئاگری جەهەنەمدا، پاشان خودا باسیان دەکاتو دەفەرموویێت: ﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ﴾ واتە: کچانیان داناوە بۆ خودا، واتە: فریشتەکانیان بە کچ داناوە کە ئەوانە بەندەی خودان، لەگەڵ خودا دەیانپەرستن،کافران لێرەداسێ هەڵەیان کرد، سێ هەڵەی زۆر گەورە، لە سێ شتدا: یەکەم: ئەڵێن خودا منداڵی هەیە، لەکاتێکداخودا منداڵی نیە، دووەم: سووکترین بەشیان داوە بە خودا لە منداڵ کە کچە، سێیەم: خۆیان بۆ خۆیان کیژ بە شایستە نازانن. وەك خوای گەورە لە

ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ﴾[1] واتە: ئایا ڕاستە ئێوە کوڕتان ببێتو خوا کچ.
وە لە چەند ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾[2] واتە: بێدار بن بە ڕاستی ئەوان لە دەس هەڵبەستی خۆیانەوە دەڵێن، خوا منداڵی بووەو بێگومان ئەوانە درۆزنن، ئایا (خوا) کچانی هەڵبژاردووە (بۆ خۆی) بەسەر کوڕدا، چیتانە چۆن بڕیاری وا دەدەن. لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ﴾ بۆ خۆیان چی ئارەزوو دەکەن هەڵی دەبژێرن، واتە کوڕ بۆ خۆیان هەڵدەبژێرن و پێیان شورەییە کیژ هەڵبژێرن، کە بۆ خوایان داناوە،لەکاتێکدا کە خودا پاکو بێعەیبەو دوورە لەو شتانەی کە ئەوان بۆ خودای دادەنێن.

## بتپەرستان خۆیان دوورە پەرێز دەگرن لە کیژان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ واتە: هەر کاتێك مژدەی کچێك بۆ ئەمانە بچێت، ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێت، لە خۆیەوە پیش دەخواتەوە خەم دایدەگرێتو ماتو بێدەنگ دەبێت، لە خەفەتدا نازانێت چی بکات، ﴿يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ﴾ واتە: لە مەینەتی ئەو هەواڵەی کە پێی دراوە، لە کەسو کاری خۆی ڕادەکاتو دوور دەکەوێتەوە، بیردەکاتەوە ئایا بە سوکایەتی بە خێوی بکات، یان زیندە بەچاڵی بکات، وەك لە زەمانی نەفامیدا دەیانکرد، تا ئەمەی کە بۆ خۆیان زۆریان پێ ناخۆش بوو، بە شوورەییان دەزانی بۆ خۆیانی دابنێن، بۆ خودایان دادەنا! ﴿أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ واتە: ئای چ بڕیارێکی خراپە کە دەیدەن، شتێکی خراپیان وتووەو شتێکی خراپیان داوەتە پاڵ خوداو بەشێکی خراپیشیان پێداوە، وەك خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾[3] واتە: وە کاتێك مژدە بە یەکێك لەوان بدرێت بەوەی بە نموونە بۆ خودای دادەنا ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێو پیش دەخواتەوە. وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ﴾ ئەم نمونەخراپانە هی ئەو کەسانەیە کە بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نیە،

---

[1] النجم (٢١).

[2] الصافات (١٥١_١٥٤).

[3] الزخرف (١٧).

﴿وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ﴾ نموونەی باشترین کردار لای خودایە، تەواو هەر بۆ خودایە لە گشت ڕوویەوە، ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتی لە کارزانە.

﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَابَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ (٦١) وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَىٰ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ (٦٢)﴾

**خودا لەسەر گوناهکردن گورج و بە پەلە تۆڵە ناسێنێت**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللَّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَابَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ واتە: ئەگەر خەڵکی لەبەر ستەمکاری خوا بیانگرێت، گیان لەبەریان لەسەر ئەم زەمینە لێ دەبڕا، بەڵام خودا دوایان دەخات هەتا ڕۆژی دیاریکراو ئەگەر ئەو کاتەیش هات، ساتێك پێش ناکەون‌و دواش ناکەون، خودای گەورە باسی خۆگری خۆی دەکات کە چەندە دەروونی گەورەیە بەرامبەر مەردم لەگەڵ ئەو هەموو تاوان‌و ناهەقیەدا دەیکەن، خۆ ئەگەر تۆڵەیان لێ بسێنێت لەسەر کردارەکانیان گیان لەبەر لەسەر زەمیندا ناهێڵێت‌و گشتی لەناو دەبات لەگەڵ ئادەمیزاددا، بەڵام خوای گەورە پەلە ناکات‌و چاوپۆشی لەو لێ ناسێنێت، خۆ ئەگەر تۆڵەیان لێ وەرگرێت هیچ کەسێك لەسەر زەمیندا نامێنێت، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەلەمەوە دەڵێت: ئەبو هورەیرەگوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: ستەمکار زیانی نابێت بۆ کەس بۆ خۆی نەبێت، دەڵێت:ئەبوهورەیرە لای کردەوە بۆی‌و وتی: بەڵێ سوێند بە خوا! باڵندەی حوبارا لە هێلانەکەی خۆیدامردارئەبێتەوە بەهۆی ستەمی ستەمکارەوە[1].

**بتپەرستان شتێك دەدەنە پاڵ خودا کە خۆیان بۆ خۆیان پێیان ناخۆشە بدرێتە پاڵیان!**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ﴾ واتە: هەر شتێك پەسەندی ناکەن بۆ خوای دادەنێن، لە کیژ‌و لەو شەریکانە کە عەبدی ملکەچی خودان، وەك فریشتەکان، کەچی خۆیان پێیان شورەییە هیچ کەسێك لەوانە هاوبەشی هەبێت لە ماڵی خۆیدا، ﴿وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَىٰ﴾ واتە: زمانیان بە درۆ دەڵێت: بێگومان پاداشتی زۆر چاك هەیە بۆ خۆیان، خوای گەورە بە درۆیان دەخاتەوە لەسەر ئەو قسەی کە دەیکەن‌و ئەڵێن: لەگەڵ ئەوەی لە دنیا پاداشتی چاکیان

---

[1] حباری: باڵندەیەکی گێلە لەسەر هێلکەی باڵندەی تر دەنیشێت هەستی پێ ناکات کەئەمانە هێلکەی خۆی نین.(وەرگێڕ).

هەیە، لەوێش ئەگەر زیندووبوونەوە دیسان پاداشتی زۆر چاکیان بۆ هەیە، وەك ئەم ئایەتانەی كە خودای گەورە باسی هەندێ لە قسەكانی ئەوانە دەكات‌و دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِمَا عَمِلُوا وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾[1] واتە: دوای ئەوەی كە تووشی دەردو مەینەت دێت، تامی خۆشیمان پێ چەشت، ئەڵێ: ئەمە لە خۆمەوەیەو باوەڕ ناكەم قیامەت هەر هەبێت! خۆ ئەگەر گەڕامەوە بۆ لای پەروەرندەم چاك دەزانم ئەو زیاتر چاكەم لەگەڵ دەكات، بێگومان ئەوانەی خوانەناسن هەر كارێكیان كردووە ئاگاداریان دەكەین‌و سزای زۆر توندیان پێ دەچێژین، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي ۚ إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا ئەگەر ئێمە لای خۆمانەوە بچێژین بە ئادەمی چاكەو بەهرەیەك پاشان ئەو (چاكەو بەهرەیەی) لێ بگرینەوە بێگومان ئەو زۆر نائومێدو سپڵەیە (لەو كاتەدا) خۆ ئەگەر پێی بچێژین بەهرەو چاكە دوای ئەو سەختی‌و ناڕەحەتیانەی تووشی بووە بێگومان دەڵێن: گشت سەختی‌و زیانەكانم لە مل بوویەوە بێگومان (لەو كاتەدا) زۆر دڵخۆش‌و لووت بەرزو خۆ بەزلزانە. وە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾[3] واتە: ئایا ئەو كەسەت دیوە بێباوەڕ بوو بە نیشانەو ئایەتەكانی ئێمە وتی (لە ڕۆژی دواییدا) ماڵ‌و كوڕم پێ دەدرێت. خوای گەورە باسی یەكێك لەو پیاوانە دەكات كە چووە ناو باغەكەیەوە، ناهەقی لە خۆی كرد دەفەرموێت: ﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا﴾[4] واتە: وە چووە ناو باخەكەیەوە لە كاتێكدا كە ستەمكار بوو لە خۆی وتی باوەڕناكەم هەرگیز ئەم باخەم لەناو بچێت، باوەڕیش ناكەم ڕۆژی دوایی بێت‌و ڕووبدات سوێند بە خوا ئەگەر (پاش مردن) بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم بێگومان باشتر لەم باخەم دەست دەكەوێت. ئەم خوانەناسانە كرداری خراپ‌و ئاواتی پڕوپوچیان تێكەڵاو كردووەو بە هیوای پاداشتی چاكیشن وەری گرن، ئەمەیش

---

[1] فصلت (٥٠)

[2] هود (٩ـ١٠).

[3] مریم (٧٧).

[4] الكهف (٣٥ـ٣٦).

هەرگیز نابێتو نایەتەدی، بۆیە خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە لەسەر ئەو ئاواتە پڕوپوچەیانو دەفەرموویێت: ﴿لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ﴾ واتە: بێگومان بەشی ئەمانە ناو ئاگرە زۆر بە پەلەیش دەدرێنە بەر بۆ جەهەنەم لە قیامەتدا، موجاهیدو قەتادەو سەعیدی کوڕی کوڕی جوبەیر دەڵێن:لەناو جەهەنەمدا لەبیر دەکرێنو بەدبەخت دەبن.[1] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾[2] واتە: پێیان دەوترێ ئەمڕۆ لەبیرتان دەکەین هەر چۆنێك ئێوە ئەم ڕۆژەتان لەبیر چووبوو. قەتادە جارێکیتر دەڵێت: ﴿مُّفْرَطُونَ﴾ واتە: زۆر بە پەلە دەبرێن بۆ ناو ئاگر، لە (الفرط)ەوە هاتووە کەواتای: پێشبڕکێ دێ بۆچوونەسەرئاو.[3] هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان ئەم دوو قسەیەدا چونکە ئەوانە پەلەیان لێ دەکرێت بۆ ناو ئاگرو پشتگوێ دەخرێنو هەتا هەتایە لەناو ئاگردا دەمێننەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾ وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾﴾

**ماندوو نەبوونو چاوکردن لە پێشینەکان**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: سوێند بە خوا لە پێش تۆیش پێغەمبەرانمان ڕەوانەکرد بۆ سەر گەلانی تریش، شەیتان کردەوەکانیانی لا ڕازاوە کردن، ئەمڕۆیش دۆستی نزیکی ئەمانە هەر شەیتانە. وە بەشیان سزای بە ژانە، خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ گەلە پێشینەکانو بڕوایان نەکردووە پێیان، هەر بەو جۆرە ئەی موحەمەد (ﷺ) تۆش ئەو پێغەمبەرانەی برات بکە بە پێشەنگ بۆ خۆتو ماندوو مەبەو گوێ مەدە بە قسەی ئەو خوانەناسانە کە بڕوات پێ ناکەن لە هۆزەکەت، وە ئەو بت پەرستانەی کە بڕوات پێ ناکەن، ئەوە شەیتان کردارەکانیانی لەبەر چاو شیرین کردوونو ئەمڕۆیش دۆستی نزیکی ئەمانە شەیتانەو ئێستا وان لەبەردەم تۆڵەی توندی خوادا، توانای دەربازبوونیان نیەو هاواریان ناگاتە هیچ شوێنێو سزای بە ژانیش دەدرێن.

**مەبەست لە هاتنەخوارەوەی قورئان**

---

[1] الطبري (١٧/٢٣٣).

[2] الجاثية (٣٤).

[3] الطبري (١٧/٢٣٤).

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتە: هەر بۆیە ئەم کتێبەمان ناردە خوارەوە بۆ تۆ، کە بە کێشەی ئەماندا ڕابگەیو ڕێنیشاندەرو بەزەیی بی بۆ کەسانی خاوەن باوەڕو، چونکە ئەم قورئانە هەموو ئەو کێشانەی لەنێوان خەڵکیدا ڕوودەدات چارەسەری دەکات بۆیانو ڕێنیشاندەری دڵەکانەو بەزەیشە بۆ ئەو کەسانەی لەسەری دەڕۆنو دەستی پێوە دەگرنو خاوەنباوەڕن، وەك خوای گەورە قورئانی ناردووەو دڵە مردووەکانی پێ زیندوو کردووەتەوە کە خوانەناس بوون، هەر بەو شێوەیەش زەوی زیندوو دەکاتەوە پاش مردنی بە هۆی باراندنی باران لە ئاسمانەوە بەسەریدا وەك دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ واتە: خودا لە ئاسمانەوە بارانی داباراند، زەوی مردووی پێ ژیاندەوە، کە لەمەدا نیشانە هەیە بۆ ئەو کەسانەی دەبینن.

﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾

**پەند وەرگرتن لەو بەهرەی کە لە مەڕو ماڵاتو بەروبوومی دارخورماو ڕەزدایە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾ واتە: پەندێك لە ئاژەڵدا بۆ ئێوە هەیە: لەناو سکیاندا لە نێوان شیاکەو خوێندا شیرێکی پاكو پاڵفتەی تێدایە،ساناو ڕەوانە بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە، ﴿فِى ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ لە وشترو مانگاو مەڕو بزندا، ﴿لَعِبْرَةً﴾ پەندو بەڵگە هەیە لەسەر لە کارزانیو تواناو بەزەییو دڵسۆزی خودا لەوەی کە وەدیهێنەیانە. ﴿نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ﴾ لێرەدا بە تاك زەمیرەکەی گەڕاندووەتەوە بۆ مانای ﴿ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ یان زەمیرەکەی گەڕاندووەتەوە بۆ (الحيوان) چونکە ﴿ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ واتە: (الحيوانات) واتە: پێتان نۆش دەکەین لەوەی کە لە سکی ئاژەڵدایە، وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿مِّمَّا فِى بُطُونِهَا﴾[1] واتە: لەوەی لەناو سکیاندایە. ئەمەیشو ئەوەیش دروستە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ﴾[2] واتە: وا مەکە ! بێگومان ئەو ڕێنموونیانە ئاگادارکەرەوەیە، ئینجا ئەو کەسەی

[1] المؤمنون (٢١).

[2] عبس (١١_١٢).

بیەوێت یادی خوا دەکات. وە دەفەرموویێت: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَاءَ سُلَيْمَانَ﴾[1] واتە: جا بە ڕاستی من دیاریەکی بە نرخو گەورەیان بۆ دەنێرم ئەنجا چاوەڕوان دەکەم کە نێردراوەکانی بە چیەوە دەگەڕێنەوە، ئیجا کاتێك (نێردراوەکە) هاتە لای سولەیمان. واتە: کاتێك ماڵە (دیاریەکە گەیشتە لای سولەیمان). وە دەفەرموویێت: ﴿مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا﴾ واتە: لە نێوان ئەو پیسو (سەنێررە) خوێنەدا شیرێکی پاکو ڕەوان لە ناو سکی ئەو ئاژەڵەدایە ئەو خوێنو شیاکەیە لەو شیرە سپیو پاکو تام خۆشو شیرینە جیادەبێتەوە هەر شتەو بۆ شوێنی خۆی دەچێت پاش ئەوەی لە گەدەدا ئەم خواردنە دەتوێتەوەو خوێن دەچێت بۆ خوێنبەرەکانو شیر بۆ گوانی ئەو ئاژەڵەو میز بۆ میزڵدانو شیاکەیش بۆ شوێنی چوونە دەرەوە، هیچیان ئەوی تر لەکەدار ناکاتو تێکەڵاوی ئەوی نابێت، پاش ئەوەی لێی جیابووەوە، ڕەنگیشی ناگۆڕێت، وە دەفەرموویێت، ﴿لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ﴾ واتە: شیرێکی پاکو ڕەوانە بۆ ئەو کەسانەی دەیخۆنەوە، گەروویان ناگرێت، کاتێك کە خوایگەورە باسی شیر دەکاتو وای لێ کردووە کەئاسان و ڕەوانە بۆ ئەو کەسانەی دەیخۆنەوە دێتە سەر باسی ئەو بەروبوومانەی لە دارخورماو ڕەز بەرهەم دەهێنرێنو بۆ خواردنەوە بەکار دەهێنرێن، وەك چۆن ئارەقیان لێ دروست دەکرد لە پێش قەدەغەکردنیدا، بۆیە خوای گەورە منەت دەکات بە سەریانداو دەفەرموویێت: ﴿وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا﴾ واتە: لە بەرهەمی دارخورماو ڕەزەکانیش، خواردنەوەی سەرخۆشکەری لێ دروست دەکەن، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر حەڵاڵی لە پێش قەدەغە کردنیدا، بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی سەرخۆشکەرەکە لە ئاوی تریو خورما دروست دەکرێت، حوکمی ئەو سەرخۆشکەرانەی کە لە گەنمو جۆو گەنمەشامیو هەنگوین دروست دەکرێ هەر بەو شێوەیەیە، لەم بارەیەوە فەرموودەی زۆر هاتووە. وەك ئیبنو عەبباس لەم ئایەتەدا: ﴿سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا﴾ دەڵێت: ﴿السكر﴾ ئەوەی قەدەغەکراوە، لە بەرهەمی هەردووکیان (خورماو تری)، ﴿الرزق الحسن﴾ ئەوەی حەڵاڵ کراوە لە بەرهەمی هەردووکیان،[2] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (سکر) قەدەغەکراوەکەی، (الرزق الحسن) حەڵاڵەکەی.[3] واتە: ئەوەی وشك بووەتەوە لە هەردووکیان، لە خورماو مێوژ، وە لەو دۆشاوانەی کە لێیان دروست دەکرێت وەك دۆشاو و سرکەو مێوژ، ئەمانە خواردنیان حەڵاڵە هەتا وای لێ دێت خەڵکی شەرخۆش دەکات، ئەو کاتە حەرامە، وەك

---

[1] النمل (٣٥ـ٣٦).

[2] الطبري (١٧/٢٤١).

[3] الطبري (١٧/٢٤٢).

فەرمووده هاتووه لەو بارەیەوە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: لەمەشدا نیشانە هەیە بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن، جێگای خۆیەتی لێرەدا باسی عەقڵ هاتووە، چونکە بەرێزترین شتە لە مرۆڤدا، بۆیە خوای گەورە خواردنەوەی سەرخۆشکەری قەدەغەکردووە لەسەر ئەم ئومەتە بۆ ئەوەی عەقڵیان پارێزراو بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1] واتە: وە لەو (زەویە)دا چەند باخ لە خورماو ترێمان بەدی هێناو چەند کانیاومان تێدا هەڵقولاندووە، بۆ ئەوەی لە بەروبوومەکەی (میوەکانی) بخۆن کە دەستی ئەوان پێکی نەهێناوە دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن،خوا پاکو بێگەردەو زاتێکە کە هەموو جووتەکانی (نێرو مێ) دروست کردووە لەوەی کە زەوی دەیڕوێنێتو لە (ئادەمی) خۆیانو لەو شتانەش کە نایزانن.

﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾﴾

## لە هەنگو هەنگوینەکەیدا بەهرەو پەند هەیە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴾ واتە: خوا هەنگی ڕاسپارد کە لە چیاکانو دارەکانو لەو شوێنانەش لە (ماڵاندا) دروست دەکرێن، شوێنی خۆت هەڵبەستە، مەبەست لێرەدا بە (وحی) ڕاسپاردنو ڕێنیشاندانە، ڕێنیشاندان بۆ هەنگیش دروستکردنی شوێنە لە کێوەکاندا بۆ ئەوەی تێیدا درێژە بە ژیانیان بدەن و بمێننەوە، وە لەناو دارستانو ئەو شوێنانەیش لە ماڵاندا بۆیان دروست دەکرێت، پاشان زۆر بە توندو تۆڵیو وردەکاریەکی هەندەسیەوە ڕێکی دەخەن بە جۆرێك کە هیچ بۆشاییو کەمو کوڕیەکی تێدا نیە، پاشان خوای گەورە ئیزنی پێداوەو وای ڕامهێناوە کە لە بەروبوومی هەموو شتێك بخۆنو ئەو ڕێگایە بگرنە بەر کە خوا ئاسانی کردووە بۆیان کە بۆ هەر شوێنێك بڕوات بە ئاسانی پێی دەگاتو دەگەڕێتەوە، لەم دنیا پانو بەرینو گەورەدا بە دەشتی فراوانو دۆڵو چیای بەرزیەوە، پاشان هەر یەکێ: لەو هەنگانە دەچنەوە بۆ ئەو ماڵەی کە لێی دەرچوون، هەڵە ناکەنو لێیان تێك ناچێت، نە بە ڕاستو نە بە چەپدا، وە لەو

[1] یس (٣٤-٣٦).

ماڵەدا هەنگوین دادەنێن‌و بێچوش بەرهەم دێنن، بە باڵەکانیان مێو دروست دەکەن و لە دەمیشیانەوە هەنگوین دەرێژن‌و هێلکەش لە دوایانەوە دەردەکەن، پاشان بەیانیان دەردەچن بۆ گوڵ مژین (کەلەوەڕگەکەی ئەوانە). قەتادەو زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێن:﴿فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا﴾ واتە: بە ملکەچی ڕێگەی پەروەردگاری خۆت بگرەبەر.[1] قەتادەوزەید﴿سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا﴾یان بە حاڵ داناوە بۆ (فاسلكي)،ئیبنو زەید دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿وَذَلَّلْنَـٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ واتە[2]: وە ڕاممان هێناون بۆیان ئەنجا سواری هەندێکیان دەبن‌و (گۆشتی) هەندێکیشیان دەخۆن. دەڵێت ئایا نابینی ئەو خەڵکە هەنگەکان دەگوێزنەوە بە هێلانەکانیانەوە (ماڵەکانیانەوە) لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لەگەڵ خۆیاندایە ئەیانبەن وئەوانیش ملکەچن!، بەڵام قسەی یەکەم ڕوونترە، کە حاڵە بۆ ڕێگاکە، واتە: ئەو ڕێگایە بگرە بەرکە بۆت ئاسانکراوە ئەمە قسەی موجاهیدیشەو ئیبنو جەریریش دەڵێت: هەردوو قسەکەهەر ڕاستن.[3] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾ واتە: لە سکی ئەو هەنگانە خواردنەوەیەکی هەمەڕنگ دێتەدەر لە ڕەنگی سپی‌و زەردو سوورو چەندین ڕەنگی تری چاك بە پێی ئەو شوێنانەی کە تێیدا دەچی‌و لێی دەخوات، شیفای تێدایە بۆ نەخۆش، واتە: دەرمانە بۆ ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی دەبن، ئەو کەسانەی دەربارەی (کارەدکتۆریەکانی پێغەمبەر"ص") قسەیان کردووە، دەڵێن ئەگەر خودا بیفەرمووایە: (فیه الشفاء للناس) لە جێی ﴿فِيهِ شِفَآءٌ﴾ بێ (الیف‌و لام) ئەو کاتە هەنگوین دەرمان دەبوو بۆ هەموو نەخۆشیەك، بەڵام فەرموویەتی: ﴿فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ﴾ واتە: هەنگوین دەشێ‌و دەرمانە بۆ هەموو نەخۆشیەکی سارد چونکە هەنگوین گەرمەو هەموو شتێك بە دژەکەی چارەسەر دەکرێت، بوخاری‌و موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردووە لە ڕیوایەتی قەتادەدا لە ئەبو موتەوەکیلەوە عەلی کوڕی ئەبو داودی ناجیەوەئەویش لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پیاوێك هاتووە بۆ لای پێغەمبەر خودا(ﷺ) وتی: براکەم سکی دەچێت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەنگوینی دەرخوارد بدە، پیاوەکە ڕۆیشت‌و هەنگوینی دایە، پاشان هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەنگوینم دایە، سکچوونەکەی هەر زیاد دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: برۆ هەنگوینی دەرخواردبدە، پیاوەکە ڕۆیشت هەنگوینی دایە، پاشان هاتەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا

---

[1] الطبري (١٧/٢٤٩).

[2] يس (٧٢)، الطبري (١٧/٢٤٩).

[3] الطبري (١٧/٢٤٩).

(ﷺ) سكچوونەكە هەر زیاد دەكات، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا ڕاستی فەرمووە، سكی براكەت درۆی ئەكات، برۆ هەنگوینی بدەرێ).[1] پیاوەكە ڕۆیشت هەنگوینی دایەو چاك بوویەوە، وە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) حەزی لەحەڵوا و لە هەنگوین بوو،[2] ئەمە لەفزی فەرمودەكەی بوخاریە، وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، كە ئیبنو عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (شیفا لە سێ شتدایە: لە بریندارکردندایەبۆ كەڵەشاخ یان لە خواردنەوەی هەنگویندایە یان لە داخ كردندایە بە ئاگر وە من داخكردنم لە ئومەتەكەم قەدەغەكردووە).[3] پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: كە لەمەشدا نیشانە هەیە بۆ ئەو كەسانەی بیردەكەنەوە، واتە لە تێگەیاندنی ئەم گیاندارە لاوازە كە خوای گەورە دروستی كردووەو هەڵدەستێ بەو كارە گرنگەو ئەو هەموو بەروبوومە دەمژێتو كۆی دەكاتەوە دەیكات بە مێوو هەنگوین، كە چاكترینو پاكترین شتە،بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئەو كەسانەی كە بیردەكەنەوە لە گەورەییو وەدیهێنەرو ڕامهێنەری ئەو گیانەوەرە لاوازە كە هەنگەو دەیكەنە بەڵگە لەسەر تواناو كارزانیو زانایيو مەزنیو سۆزو بەزەیی ئەو دروستكەرە كە خودایە.

﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾

## لە مرۆڤ خۆیدا پەندو ئامۆژگاری هەیە

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ واتە: خودا ئێوەی لە نەبوو دروست كردو پاشان دەتانمرێنێت، هی واتان هەیە پیر دەبێتو دەگەڕێتەوە بۆ لاوازترین تەمەن. خوای گەورە باسی ئەوە دەكات كە خۆی خاوەنی عەبدەكانیەتیو خۆشی دروستی كردوون لە نەبوونەوەو پاشانیش دەیانمرێنێت، هەندێكیشیان واز لێ دێنێت تا ماوەیەك تەمەن دەكاتو پیر دەبێتو هەموو ئەندامەكانی لاشەی لاواز دەبن، وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِن بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۖ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ﴾[4] واتە: خوا ئێوەی دروست كردووە لە سەرەتادا بێهێز بوون، پاش بێهێزی بەهێزی كردن لە پاشان كوڕو هێزی لێ سەندنەوەو پیری كردن، بە مەیلی خۆی دروستتان دەكات، زاناو بەتوانا هەر

[1] فتح الباري (١٠/١٧٨)، مسلم (٤/١٧٣٦).

[2] فتح الباري (١٠/٨١)، مسلم (٢/١١٠١).

[3] فتح الباري (٨/١٤٣).

[4] الروم (٥٤).

خۆیەتی، پاشان دەفەرموویت: ﴿لِكَيْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئًا﴾ واتە: هەتا لە پاش زانینی زۆر شت، هیچ شتێکی لەبیر نامێنێتو ئاوەز لە دەست دەدات لە پیریدا، بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعای دەکرد دەیفەرموو: (خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە چاوچنۆکیو تەمەڵیوپەککەوتن وئەو پیرییەی ئاوەز نایەڵێتو لە سزای گۆڕو بەڵای دەجالو لەبەڵای کاتی ژیانومردن)[1]. زوهەیری کوڕی ئەبوسەلما لەموعەلەقاتە بەناوبانگەکەیدا دەڵێت:

سئمت تكاليف الحياة ومن يعش ثمانين حولاً –لا أبالك– يسأم

رأيتُ المنايا خبط عشواء من تصب تمتة ومن تُخطئ يعمرفيهرم

واتە: بێزار بووم لە ئەرکەکانی ژیان هەر کەسێك هەشتا ساڵ بژی بێزار دەبێت لە ژیان، مردن شەلم کوێرم دەست ناپارێزێت، دای لە هەر کەسێك دەیکوژێتو هەر کەسیشی نەپێکاوزۆر ژیا پیر دەبێت وپەکی دەکەوێت!

﴿وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ ۚ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ ۚ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ واتە: خوا بژێوی هەندێکتانی لە هەندێکتان زیاتر داوە،ئەوی زیاتریان پێدراوە،بەشی ژێر دەستانی خۆیان نادەنەوە کە لەوەیشدا وەك یەکن، ئایا ئێوە لە بەهرەی خودا حاشا دەکەن، خوای گەورە باسی نەفامی بتپەرستان دەکات، ئەوەندە خوانەناسان شەریك بۆ خودا دادەنێن کەچی خۆشیان دانی پێدادەنێن کە بەندەی خودان وەك لە لە پاڕانەوەیاندا لە کاتی حەجدا دەیان وت: (لَبيكَ لا شَريكَ لَكَ إلا شريكاً وهو لك، تملكُهُ وملك) خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە کە پێوە پێتان قەبوڵ ناکرێت لەگەڵ کۆیلەکانتاندا لە ڕۆزیدا وەك یەك بن، لەو ڕۆزیەی کە پێمان داون، دەی چۆن خودای مەزن ڕازی دەبێت لەگەڵ عەبدێکی خۆیدا وەك یەك بێت، لە پەرستنو ڕێزلێناندا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾[2] واتە: نموونەیەکی لە خۆتان بۆ هێناونەتەوە، ئاخۆ ئێوە لەو بژێویەی کە

[1] فتح الباري (٨/٢٣٩).

[2] الروم (٢٨).

پێتان گەیشتووە، بەندەکانی خۆتان دەکەنە هاوبەش، هەردوولا وەك یەك دەبن؟ هەروەك ئێوە ترستان لە یەکتر هەیە، هەر بەو شێوەیە ترستان لەمانیش هەیە، عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: خوا دەفەرمووێت: ئەوانە بەندەکانی خۆیان نەدەکردە شەریك لە سامانو خێزانەکانیدا،ئەی چۆن بەندەکانی خۆم دەکەنە هاوبەشم لە دەسەلاتدا؟! بۆیە دەفەرمووێت: ﴿أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾[1] واتە: ئایا لە بەهرەکانی خودا حاشا دەکەنو دانی پێدا نانێن؟ لە ریوایەتێکی تردا ئیبنو عەباس دەڵێت: خودا دەفەرمووێت: چۆن شتی وا بۆ من قبوڵ دەکەن کە ئێوە قەبوڵی ناکەن بۆ خۆتان. ئەو خوانەناسانە بەروبومی زەویو ئاژەڵیان بە هی خودا دەزانی کەچی حاشایان لە بەهرەکانی خودا دەکردو شتی تریان دەکردە شەریکی خودا، حەسەنی بەسری دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) نامەیەکی نوسی بۆ ئەبو موسای ئەشعەریو پێی وت: ڕازی بە بەو ڕۆزیەی خۆت لە دنیادا، چونکە خودای ڕەحمان ڕۆزی هەندێ لە بەندەکانی زیاتر کردووە لە هەندێکی تریو بەلام ئەوە بەلایەکە هەردوو لای پێ تاقی دەکاتەوە، ئەوەی ڕۆزی زیادەی دەداتێ بەو زیادەیە تاقی دەکاتەوە تابزانرێ ئایاشوکرانەبژێرەو ئەو هەقەی لەسەریەتی دەیدات لەو سامانەداکە خوا فەرزی کردووە لەسەریو خستویەتیە ئیختیاری ئەو. ئیبنو ئەبی حاتەم ئەم فەرمودەیەی ریوایەت کردووە.

﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ۚ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾

## هەندێ لە نیشانەو بەهرەکانی خوداکە داویەتی بە مرۆڤ خێزانو منداڵو بنەماڵەیە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ﴾ واتە: خودا هەر لە خۆتان هاوسەری داونەتێ، لەو هاوسەرەش کوڕو نەوەی پێ بەخشیونو ڕۆزی چاکیشی پێداون، خوای گەورەلەم ئایەتەدا باسی بەهرەکانی خۆی دەکات کە بەخشیویەتی بە عەبدەکانی، لەوانە هەر لە ڕەگەزی خۆیان هاوسەری پێداون خۆ ئەگەر ئەو هاوسەرانە لە ڕەگەزی خۆیان نەبووایە ئەو تێکەلاویو خۆشەویستیو بەزەییە دروست نەدەبوو، بەلام لە بەزەیی خودایە کە لە نەوەی ئادەم نێرو مێی وەدی هێناوەو ژنی کردووە بە هاوسەری پیاو، پاشان خوای گەورە لەو پیاوو ژنە کوڕو کوڕەزای دروست کردووەو پێی داون، ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسو

[1] الطبري (١٧/٢٥٢).

عیکریمەو حەسەنو زەحاكو ئیبنو زەیدە.[1] شوعبە ڕیوایەت ئەكات لە ئەبو بەشیرەوەوئەویش لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوەو ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە كەلەمانای ﴿بَنِينَ وَحَفَدَةً﴾فەرمویەتی: واتە: كوڕو كوڕی كوڕ.[2] وە وتراوە: واتە: خزمەتكارو هاوكاران، دیسان وتراوە: واتە:دایكو باوكی ژن ، وتراویشە: واتە: هاوسەری كچ، منیش ئێژم، هەركەسێ ﴿وَحَفَدَةً﴾ی موتەعەللیق كردووەبە(من ازواجكم) دەبێت مەبەستی بە ﴿وَحَفَدَةً﴾هەر كوڕەكانو كوڕی كوڕەكان ئەو هاوسەرانە (زاوایانە) بێت چونكە ئەوانە هاوسەری ئەو كچانەن، یانی كوڕانی ئەو ژنەن، ﴿وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ واتە: ڕۆزی چاكیشی پێداون لە خواردنو خواردنەوە. پاشان خوای گەورە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر ئەوانەی كە عیبادەتی جگەلە خودا دەكەنو دەیكەنە شەریكی ئەو كە ئەو هەموو بەهرەی پێ بەخشیون، دەفەرموێت: ﴿أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: چۆن بڕوایان بەو هیچو پوچانە هەیەو ﴿وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ﴾ لە بەهرەی خودا حاشا دەكەنو دەیشارنەوە و وا دەزانن لە كەسێكی ترەوەیە جگەلە خودا، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت بە بەندەكانیو منەت دەكات بەسەریاندا، ئایا من هاوسەرم پێ نەداوی؟ ئایا ڕێزم لێ نەگرتووی؟ ئایا من وشترو ماینو ئەسپم بۆ ڕام نەهێناویو نەمپاراستوویو نەمكردوی بە سەرۆكو خاوەن دەسەلات؟[3]

﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾﴾

**ناڕەزایی دەربڕین لەسەر پەرستنی غەیری خودا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ واتە: جگە لە خوا شتی وا دەپەرستن، كە لە ناو ئاسمانانو زەمیندا هیچ ڕۆزیەك شك نابەن، كە پێیان بدەنو هەرگیز ناشتوانن. خوای گەورە لێرەدا باسی ئەو خوانەناسانە دەكات كە شتی تر لەگەڵیدا دەپەرستن، كە هەر خودا خاوەنی بەهرەو وەدیهێنەرو ڕۆزی دەریانەو ڕێزی لێ ناون، كە تاكو تەنهاو بێهاوتایە، كەچی ئەوانە شەریكی بۆ دادەنێنو بتو شتی تر دەپەرستن لەگەڵی، ﴿مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا﴾ خاوەنی هیچ بژێویەك نین بۆ ئەوانە لە ئاسمانانو

[1] الطبري (١٧/٢٥٦، ١٥٧).

[2] الطبري (١٧/٢٥٧).

[3] مسلم (٤/٢٢٧٩).

زەمیندا. ناشتوانن ڕۆزیان بدەن. یان: ناتوانن بارانیان بۆ ببارێنن‌و ڕووەك‌و كشتوكاڵیان بۆ سەوزكەن‌و بڕوێنن، بۆ خۆشیان هیچیان لە دەست نایەت ئەگەر هەوڵیش بدەن ناتوانن، چونكە ئەوە كاری ئەوان نیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئێوە نموونە بۆ خودا مەهێننەوە، خودا هەموو شتێك دەزانێت‌و ئێوە هیچ نازانن. كەواتە: ئێوە شەریك‌و هاوشكڵ‌و هاوێنە بۆ خودا دامەنێن، خودا هەموو شتێك دەزانێت‌و شایەتی دەدات كە هیچ پەرستراوێك نیە جگەلە خۆی، ئێوە بە نەفامی خۆتان شتی تر دەكەنە شەریكی.

﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُونَ ۚ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾

**نموونەیەك بۆ كەسی خاوەن باوەڕوكەسی خوانەناس، یان بۆ بت‌و هەق**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَّمْلُوكًا لَّا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقًا حَسَنًا فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا ۖ هَلْ يَسْتَوُونَ﴾ واتە: خودا نموونەیەك دێنێتەوە، عەبدێك هەیە هیچ كارێكی لە دەست نایەت، كەسێكیش هەیە ڕۆزی باشمان داوەتێ، بە نهێنی‌و بە ئاشكرا دەیبەخشێت، ئایا وەكو یەكن؟ عەوفی لە ئیبنو عەباسەوەدەگێڕێتەوەكە فەرموویەتی: ئەمە نموونەیەكە خوای گەورە هێناویەتیەوە بۆ خوانەناس‌و خاوەن باوەڕ.[1] قەتادەیش هەر وای وتووە.[2] ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.[3] كۆیلەیەكی خاوەندار كە توانای هیچ شتێكی نیە نمونەیە بۆ خوانەناس. بەڵام كەسێكی خاوەن بژێوی كە ڕۆزی چاكی هەیەو بە ئارەزووی خۆی بە نهێنی‌و ئاشكرا لەو ڕۆزیە دەبەخشێت نمونەیە بۆ خاوەن باوەڕ ، ئیبنو ئەبی نەجیح لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە كە ووتویەتی: ئەوە نموونەیەكە هێنراوەتەوە بۆ ئەو بت وخوای بەڕاست ، ئایا ئەم دووانە وەك یەكن؟[4] لەبەر ئەوەی جیاوازی لە نێوان ئەم دووانەدا دیارو ڕوون‌و ئاشكرایە هیچ كەسێك نیە نەیزانێت مەگین شێت‌و بێ ئاوەز بێت، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: سوپاس هەر بۆ خودایە، بەڵام زۆربەیان نەزانن.

---

[1] الطبري (١٧/٢٦١).

[2] الطبري (١٧/٢٦١).

[3] الطبري (١٧/٢٦٣).

[4] الطبري (١٧/٢٦٣).

﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّهْهُ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾

**نموونەیەکی تر**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّهْهُ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ﴾ واتە: خوا ئەمەیش بە نموونە دێنێتەوە، دوو پیاو هەن، یەکێکیان لاڵەو هیچ کارێکی لە دەست نایە، کۆڵو بارە بەسەر خاوەنەکەیەوە، بۆ هەر کوێیەکی بنێرێت هیچ بەهرەیە ناهێنێتەوە، موجاهید دیسان دەڵێت: مەبەست پێی ئەو بتانەو خوای گەورەوە، واتە: ئەو بتە لاڵەو ناتوانێت قسە بکات نە بە چاکو نە بە خراپ، توانای هیچ شتێکی نیە، نە بە کردارو نە بە گفتار، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەرکو بارە لەسەر خاوەنەکەی، ﴿أَيْنَمَا يُوَجِّهْهُ﴾ بۆ هەر کوێی ڕەوانەکەی، ﴿لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ﴾ هیچ خێرو بێرێك ناهێنێتەوەو سەرکەوتوو نابێت، ﴿هَلْ يَسْتَوِى هُوَ﴾ واتە: ئایا ئەوەی ئەمە حاڵی بێت، ﴿وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ﴾ لەگەڵ ئەو کەسەی فەرمان بە دادپەروەری دەداتو خۆیشی لەسەر ڕاستەڕێیە چۆن وەکو یەکن؟ عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: ئەوە نموونەی خوانەناسوخاوەن باوەڕە وەك لە پێشەوە باسکرا، تەبەری لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێت: ئەم ئایەتە: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّهْهُ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِى هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾مەبەستی بە ئەو پیاوە عوسمانی کوڕی عەفانەو پیاوە لاڵەکەیش کە چاکەی پێ ناکرێت ڕووی لە هەر شوێنێك بکرێت بەندەکەی عوسمانی کوڕی عەفانە، کە عوسمان بەخێوی کردو خەرجی دەدا بەڵام ئەو بەندە حەزی لە ئیسلام نەبوو، موسڵمانیش نەدەبوو، بە عوسمانیشی دەوت: ماڵ مەبەخشەو چاکە مەکە! ئیتر ئەو ئایەتە دەربارەی عوسمانو ئەو بەندەیەی هاتە خوارەوە.

﴿ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾

**(غەیب و) نهێنیەکان هەرلە لای خودایە و کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەتیش هەرلای ئەوە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: هەموو نهێنییەکی ئاسمانەکانو زەمین لە لای خودایە هاتنی ڕۆژی قیامەتیش وەك چاوتروکانێك وایە، یان نزیکترە، خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. خوای گەورە باسی زانیاریو توانای خۆی دەکات بەسەر هەموو شتێکداو ئاگاداری بەسەر نهێنیەکانی ئاسمانەکانو زەمیندا هەیە، ئەو نهێنیانەش پەیوەندی بە خواوە هەیە بە تەنها، هیچ کەسێك بۆی نیە ئەو شتانە بزانێت مەگین خودا خۆی مەیلی لێ بێت کەسێکی لێ ئاگادار بکات. هەموو شتێك لە ژێر دەسەلاتی ئەودایە هیچ کەسێك ناتوانێت ببێتە لەمپەرو دژایەتی بکات، خوای گەورە مەیلی لە هەر شتێك بێت دەفەرموێت ببە لە پڕ دەبێت، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾[1] واتە: فەرمانی ئێمە یەکجارەیە هەر لە چاوتروکانێکدا ڕوودەدا، وەك لێرەیشدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، وەك لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾[2] واتە: دروست کردنی هەمووتانو زیندووکردنەوەتان وەك دروست کردنو زیندووکردنەوەی یەك کەس وایە.

**هەندێك لە بەهرەکانی خوا، بریتی یەلە گوێو چاوو دڵ**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّن بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: خودا ئێوەی لە سکی دایکتاندا دەرهێنا، کە ئێوە هیچتان نەدەزانیو گوێو چاوو دڵی پێدان، بەڵکو شوکرانەبژێری بن. خودای مەزن منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا کە لە سکی دایکیان دەری هێناون و هیچیان نەدەزانی، دوای ئەوە گوێی دانێ هەتا دەنگی پێ ببیستنو چاوی دانێ، کە هەموو شتێکی پێ ببینن و عەقڵیشی دانێ کەڕاست وایە بڵێ ی لە ناو دڵدایە، هەندێکیش ئەڵێن:عەقڵ وا لەناو مێشکدایە، بەهۆی ئەو عەقڵەوە شتی زیانبەخشو بەسود لە یەکتر جیادەکرێتەوە، وە ئەو هێزی تواناو هەست کردنە وردەوردەو کەم کەم پەیدا دەبێتو زیاد دەکات لە مرۆڤدا، بە پێی تەمەنی مرۆڤ ئەو عەقڵو چاوو گوێیەی بەهێزتر دەبێت، خوای گەورە ئەم شتانەی لە مرۆڤدا وەدی هێناوە بۆ ئەوەی پەروەردگاری خۆی بپەرستێ، هەموو ئەندامەکانی لەشی

[1] القمر (٥٠).

[2] لقمان (٢٨).

بەکاربێنێت لە گوێڕایەڵی پەروەردگاریدا، وەك لەسەحیحی بوخاریداهاتووە لەئەبوهورەیرەوە، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: هەر کەسێك دوژمنایەتی بکات لەگەڵ دۆستێکی مندابکات، ئەوەمن شەڕی لەگەڵدا بەرپا ئەکەم، وە بەندەکانی من نزیك نابنەوەلێم بە شتێك لام خۆشەویستتر بێت لە بەجێهێنانی ئەوەی کە فەرزم کردووە لەسەریان، بەردەوام بەندەم نزیك دەبێتەوە لێم بە سونەتەکان تا خۆشم دەوێت، وەختێك کە خۆشم ویست، دەبم بەو گوێیەی کە پێی دەبیستێت وە بەو چاوەی کە پێی دەبینێتو ئەو دەستەی کە پێی دەگرێتو ئەو پێیەی کە پێی دەڕوات، ئەگەر داوای شتێکم لێبکات پێی دەبەخشم، هاوارم لێبکات وەڵامی دەدەمەوە، ئەگەر پەنام بۆبهێنێ پەنای دەدەم، لە هیچ شتێکدا دوو دڵیم نەکردووە، کە کردبێتم، وەك ئەو دوو دڵیەی لە گیان کێشانی عەبدی خاوەن باوەڕمدا کردوومە، ئەو مردنی پێ ناخۆشەو منیش دڵگرانی ئەوم پێ ناخۆشە، دەبێت ئەو مردنەیش هەر بەردەرگای پێ بگرێت).[1] مانای ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: هەر کاتێك بەندە بە دڵسۆزی گوێڕایەڵی خودای کرد، هەموو کردارەکانی بۆ خوای گەورە دەبێت، هیچ شتێك نابیستێت بۆ خوا نەبێت، وە هیچ شتێك نابینێت بۆ خوا نەبێت، یانی ئەوەنەبینێ کەلەشەرعدا ڕێگەی پێدراوە ،دەست لەهیچ شتێك ناوەشێنێ بۆخوا نەبێت، هیچ شتێك ناگرێو بۆ هیچ شتێك ناڕوات غەیری گوێڕایەڵی خوای گەورە، پشت بە خوا دەبەستێ لە هەموو شتێکدا، بۆیە لە هەندێ ڕیوایەتی فەرموودەی (غیر صحیح)دا هاتووە: دوایی دەبم بەو پێیەی کە پێی دەڕوات، بە من دەبیستێو بە من دەبینێو بە من دەیگرێو بە من دەڕوات).[2] واتە: من پارێزەری گوێیو چاویو دەستیو پێیم لە شەیتان. یان من لە ناو دڵیدام لەکاتی بیستنیو بینینیو گرتنو ڕۆیشتنیدا، کاتێك کە یادم دەکات واز دێنێت لەو کارەی بۆ کەسێکی ترە غەیری من. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: گوێو چاوو دڵی پێدان بەڵکو شوکرانە بژێر بن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾[3] واتە: بڵێ: هەر خودایەك کە دروستی کردوونو گوێو چاوو دڵی پێداون ئێوە کەمتر شوکری دەکەن، بڵێ: هەرئەوەکەئێوەی لەم زەمینەداپەرش‌وبڵاوکردووەتەوە لای ئەویش کۆدەکرێنەوە.

**یەکێك لە نیشانەکانی خودا ڕامهێنانی پەلەوەرە لە هەوای ئاسماندا**

---

[1] فتح الباري (١١/٣٤٨).

[2] فتح الباري (١١/٣٥٣).

[3] الملك (٢٣ـ٢٤).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ﴾ واتە: ئایا پەلەوەر نابینن، کە لە هەوای ئاسماندا ڕام کراون، جگە لە خوا کێ ڕایان دەگرێت. خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە سەیری ئەو باڵندانە بکەن کە لە نێوان ئاسمانو زەمیندا ڕام هێنراون، کە چۆن دەفڕن لە نێوان ئاسمانو زەمیندا بە دوو باڵ، کێ لەوێدا ڕایان دەگرێت جگە لە خودا کە بە دەسەڵاتی بێ پایانی خۆی ئەو هێزو توانایەی داوە بەو پەلەوەرانە کە بەو شێوەیە بفڕن، هەوایشی ڕام کردووە هەڵیان دەگرێتو بەو شێوەیە بڕۆنو بگەڕێن، وەك خوای گەورە لە سورەتی (الملك)دا دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ﴾[1] واتە: ئایا ئەوان ئەو پەلەوەرانەیان نەدیوە، لەسەرووی ئەوانەوە باڵیان کراوەتەوەو لێکیان دەدەن، جگە لە خودا کێ ڕاگیریان دەکات، خودا خۆی بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە، وە لێرەیشدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتە: لەمەدا نیشانە زۆرن بۆ خاوەن باوەڕان.

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الْأَنْعَامِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ (٨٠) وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ (٨١) فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ الْمُبِينُ (٨٢) يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنْكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ (٨٣)﴾

### خانووو کەلوپەلی ناو ماڵو جلوبەرگی خۆشتان دیسان لە بەهرەکانی خودایە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الْأَنْعَامِ بُيُوتًا ﴾ واتە: خودا خانووی پێداون کە تێیدا بحەسێنەوە، وە لە پێستی ئاژەڵیش دەوارو ڕەشماڵی بۆ وەدی هێناون، خوای گەورە باسی بەهرە زۆرەکانی خۆی دەکات کە بەخشیویەتی بە بەندەکانی کە خانووی کردووە بە شوێنی نیشتەجێ بوونو حەسانەوەیانو تێدا دەژینو هەموو جۆرە سودێکی لێ وەردەگرن، وە لە پێستی ئاژەڵیش خانوو بۆ خۆیان دروست دەکەن، واتە: لە خوریو موو توکی وشتر ڕەشماڵ دروست دەکەن،کە هەڵگرتنی سوکەو بە ئاسانی هەڵدەدرێت کاتی لە شوێنێکدا دادەنیشێت لە شاردا

---

[1] الملك (١٩).

بێت یان لە کاتی کۆچکردنیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ﴾ واتە: لە ڕۆژی کۆچکردنداو لە کاتی مانەوەشتاندا سووک بێت بۆتان. ﴿وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ واتە: لە خوریو موو توکەکەی، کەلوپەلی پێویستو کالا هەیە کە سودی لێ وەردەگرن لە ماوەی ژیانتاندا ﴿أَصْوَافِهَا﴾ خوری مەڕ، ﴿وَأَوْبَارِهَا﴾ توکی وشتر، ﴿وَأَشْعَارِهَا﴾موی بزن. زەمیرەکە دەگەڕێتەوە بۆ (الانعام) هەندێك دەڵێن: ﴿أَثَاثًا﴾ یانی ماڵ، هەندێکی تر وتوویانە: واتە: کەڵكو سود، هەندێکی تریش وتوویانە: جلوبەرگ، واتە: بۆ ئەمانە هەموو بەکاری دێنن، بەڵام لە ڕاستیدا لەمە زیاتر سودی لێ وەردەگیرێت، بۆ کەلوپەلی ناوماڵو فەرشو بۆ بازرگانی پێوەکردنو زۆر شتی تریش، ئیبنو عەبباس دەڵێت: (الاثاث) واتە: کەلوپەلی پێویست،[1] موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنو عەتیەی عەوفیو عەتای خۆراسانیو زەحاكو قەتادەیش هەر وایان وتووە. ﴿إِلَىٰ حِينٍ﴾ واتە: تا کاتێکی دیاری کراو.

### سێبەرو ئەشکەوتی ناو کێوەکانو جلوبەرگو پۆشاکی ئاسنیش هەر لە بەهرەکانی خودان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَالًا﴾ واتە: خودا لەوەی دروستی کردووە سێبەری زۆری وەدی هێناوە بۆتان، قەتادە دەڵێت: واتە: درەخت سێبەری بۆ دروست کردوون.[2] ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا﴾ وە لە کێوەکانیشدا پەناگاو ئەشکەوتو شوێنی مانەوەی بۆ وەدیهێناون، ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ﴾ واتە: جلوبەرگیشی بۆ سازداون لە لۆکەو کەتانو خوری لە کاتی گەرمادا دەتانپارێزێت، ﴿وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ﴾ وە پۆشاکی ئاسن لە کاتی شەڕدا لەبەری دەکەنو خۆتانی پێ دەپارێزن، وەك پۆشاکی زرێو ئاسنی پانکراوەو شتی تریش، ﴿كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ﴾ بەم شێوەیە خودا بەهرەکانی خۆی بەتەواوی ئەڕژێت بەسەر ئێوەدا، تا بە کاری بێننو سودیان لێ وەرگرن لە ژیانی ڕۆژانەتاندا، هەر کاتێك پێویستیتان پێی بوو، یارمەتی دەرێکیش بێت بۆتان بۆ گوێڕایەڵیو خواپەرستی، ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ﴾ زۆربەی زانایان بەم شێوەیە تەفسیریان کردووەو (لامەکەی) ﴿تُسْلِمُونَ﴾یان بە کەسرە خوێندووەتەوە، واتە بۆ ئەوەی ملکەچو موسڵمان بن، ﴿تُسْلِمُونَ﴾ واتە: لە (الاسلام)ەوە هاتووە.

---

[1] الطبري (١٧/٢٦٨).

[2] الطبري (١٧/٢٦٩).

**پێغەمبەر(ﷺ) تەنها بانگەوازیی لەسەرە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾ ئەگەر هەر ڕوویان وەرچەرخاند،ئەوەتەنها ڕاگەیاندنی ئاشکرا لەسەر تۆیە، واتە: ئەگەر پشتیان هەڵکردو ئەو هەموو بەهرانەی خودایان لەبەر چاو نەبوو، تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) وازیان لێ بێنە، ئەوەی لەسەر تۆیە تەنها ئاگادار کردنەوەیانە، تۆیش ئەو فەرمانەت بەجێ هێناوە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا ﴾ واتە: ئەوانە بەهرەکانی خودا دەزانن، کەچی حاشای لێ دەکەن، واتە چاك دەزانن کە خوا ئەو بەهرانەی پێداونو هەر خودا پێی بەخشیون، لەگەڵ ئەوەیشدا حاشا لەوە دەکەنو شتی تر دەپەرستن لەگەڵیدا، وا دەزانن سەرکەوتنو بژێوی لای ئەوانەوە وەدەست دێت، ﴿وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ واتە: زۆربەیان بێ وەفاو ئەمەك نەناسن.

﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾

**حاڵی بتپەرستان لە ڕۆژی کۆبوونەوە (الحشر)دا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ﴾ واتە: ڕۆژێك کە لە هەر کۆمەڵێك کەسێك بۆ شایەتی دێنن، خودای گەورە باسی بتپەرستان دەکات لەو ڕۆژەدا کە کۆدەکرێنەوە لە قیامەتدا، لە هەموو گەلو کۆمەڵێك یەکێك دەهێنرێت بۆ شایەتیدان، ئەو کەسەیش پێغەمبەرەکەیانە (سەلامی خوایان لێ بێت) شایەتی دەدات کە چۆن وەڵامیان داوەتەوە لەسەر ئەو پەیامەی کە پێی گەیاندوون لە لایەن خوداوە، ﴿ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ واتە: پاشان ڕێگە نادرێت بە خوانەناسان قسە بکەن، هیچ بروبیانوویەکیان لێ قبوڵ ناکرێت، چونکە دەزانن کە قسەکانیان پڕوپوچو درۆیە، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ﴾[1] واتە: ئەمڕۆ ڕۆژێکە قسە ناکەن، ڕێگەی عوزرخوازیشیان نادەن، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا هُمْ

[1] المرسلات (٣٥_٣٦).

﴿يُسْتَعْتَبُونَ﴾ واتە: عوزریشیان لێ وەرناگیرێت، پاشان دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ واتە: هەر کاتێك ئەوانەی ستەمکار بوون، ئازارو چەرمەسەریان دی، نە لەسەریان سوك دەکرێتو نە هیچ مۆڵەتێکیان پێ دەدرێت، بەڵکو بە پەلەو بێ لێپرسینەوە بەرەو جەهەنم راپێچ دەکرێن. وەختێك کە جەهەنەم دەهێنرێت، حەفتا هەزار لەغاوی پێوەیە لەگەڵ هەر لەغاوێك حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵەو رادەکێشرێت، گەردنێك لەناو جەهەنەمەوە بەرز دەبێتەوە بەسەر ئەو خەڵکەدا، هەناسەیەك دەدا هەموو خەڵکی بەسەر ئەژنۆدا دەکەون، دەڵێت من کراوم بە وەکیل (بریکار) بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە خۆیان بە زل زانیووەو لاساریان کردووە، ئەوانەی کە شەریکیان بۆ خوا داناوە، وە بۆ ئەوانەو ئەوانەیش باسی چەند دەستەیەك لە خەڵکی دەکات وەك لە فەرموودەدا هاتووە پاشان دەدەن بەسەریاندا هەڵیان دەگرن لەو شوێنەدا وەك چۆن باڵندەیەك دانەوێڵەیەك هەڵدەگرێت، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُواْ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْاْ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُواْ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُواْ ثُبُورًا كَثِيرًا﴾[1] واتە: کاتێك (ئەم ئاگرە) لە دوورەوە ئەوان دەبینێت نرکەو ناڵەی گڕو بڵێسەی دەبیستن (کە نیشانەی ڕقو کینەی زۆریەتی لێیان)، وە کاتێك فڕێ دەدرێنە جێگایەکی تەنگ لە دۆزەخدا، بە جووت کراوی دەستو قاچو ملیان لە کۆتو زنجیردایەو لەوێدا داوای تیاچوونو مردن دەکەن، ئەمڕۆ داوای مردنێك مەکەن بەڵکو داوای مردنی زۆر بکەن. وە دەفەرموویت: ﴿وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا﴾[2] واتە: وە تاوانباران ئاگری دۆزەخ دەبیننو هەموو دەزاننو دڵنیان کە دەچنە ناویو تێیدەکەونو ڕێگایەکیان دەست ناکەوێت بۆ دەربازبوون لەو (ئاگرە). وە دەفەرموویت: ﴿لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾[3] واتە: ئەگەر ئەوانەی کافرن بیانزانیایە (چ سزایەکی سەخت لەبەر دەمیان دایە) کاتێك ناتوانن بڵێسەی ئاگر لە دەمو چاوو پشتیان دوور بخەنەوە هەروەها ئەوان هیچ یارمەتییەك نادرێن، بەڵکو لە کاتی ناکاودا

---

[1] الفرقان (١٢ـ١٤)

[2] الکهف (٥٣).

[3] الانبیاء (٣٩ـ٤٠).

تووشیان دێتو سەرسامیان دەکات (بە شێوەیەك) نە دەتوانن بیگێڕنەوە (بەرگری بکەن) وە نە مۆڵەتیان دەدرێت (تەوبە بکەن).

**پەرستراوانی بتپەرستان خۆیان بەرائەتی خۆیان دەردەبڕن لەبتپەرستان لە کاتێکدا کە بتپەرستان زۆر پێویستیان بە یارمەتی ئەوان هەیە**

خوای گەورە باسی خۆبەریکردنی بتپەرستان دەکات لە بت پەرستان لەو شوێنەدا کە زۆر پێویستیان بە یارمەتی هەیەوەك دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ شُرَكَآءَهُمْ ﴾ ئەوانەی دەیان وت خودا شەریکی هەیە هەر کاتێك چاویان بە هاوبەشەکانیان کەوت کە لە دنیادا دەیانپەرستن ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا۟ مِن دُونِكَ ۖ فَأَلْقَوْا۟ إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەمانە هاوبەشەکانمانن کە جیا لە تۆ هانامان بۆ دەبردن،ئەوانیش ئەڵێن: درۆ دەکەن! ئێمە فەرمانمان پێ نەکردوون بمانپەرستن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴾[1] واتە: کێ لەو کەسە وێڵترە کە هانا بۆ غەیری خوا دەبات؟ کە تا ڕۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوەو هەر ئاگاشیان لە پاڕانەوەکانیان نیە، کاتێك مەردم هەموو کۆ دەکرێنەوە، ئەوان دەبنە دوژمنیانو حاشا دەکەن لەوانەی پەرستوونیان. وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ۝٨١ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴾[2] واتە: جگە لە خوا ئەوانە پەرستراوێکی تریان پەرست، تا ببنە هۆی سەربەرزیان، نەخێر بەڵکو پەرستراوەکان حاشا لە پەرستنیان دەکەنو لە دژیشیان ڕادەوەستن. ئیبراهیم خەلیلی خواش(سەلامی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ﴾[3] واتە: پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا حاشا لە یەکتری دەکەن.

**لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووکەس ملکەچی فەرمانی خودان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَلْقَوْا۟ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا ناچار دەبن ملکەچی فەرمانی خودا بن، ئەوقسانەیش کەوا هەڵیان دەبەست هەمووی بە

---

١ الاحقاف (٥ـ٦).

[2] مريم (٨١ـ٨٢).

[3] العنكبوت (٢٥)

فیرۆ دەردەچێت، (قەتادەو عیکریمە دەڵێن): ﴿ وَأَلْقَوْاْ إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ﴾یانی: هەموو ملکەچ و سەرشۆڕ دەبن.[1] واتە هەموو ملکەچی فەرمانی خودان، هیچ کەسێك نیە گوێبیستی فەرمانی ئەو نەبێت، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾[2] واتە: ڕۆژێك کە دێنە لای ئێمە زۆر چاو تیژو گوێ سووکن. وە دەفەرموویێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا﴾[3] واتە: کاتێك تۆ تاوانباران بە سەرشۆڕی ببینی کە لە لای پەروەردگاریان ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بینیمان‌و بیستمان، تەواو باوەڕمان هێنا، وە دەفەرموویێت: ﴿وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ﴾[4] واتە: هەموو خەڵکی ملکەچی ئەو کەسەن، کە هەر نامرێت‌و پایەدارە. ئەو شتانەی ئەوانە دەیانپەرست ڕۆیشتن‌و توانەوەو ئەوەیش بە دەم خواوە هەڵیان بەست بە درۆ دەرچوو، هیچ کەس نەبوو یارمەتیان بداتو بێت بە هانایانەوەو بیانگرێتە خۆی.

**بێباوەڕانی گەندەڵ لە خوانەناسان سزایەکی زیاتر دەدرێن**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفْسِدُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی خوایان نەناسی‌و بوونە لەمپەر لە ڕێی خوادا، لە پاداشتی ئەو خراپانەیاندا کە پێی هەڵدەستان، جار لە دوای جار ئازاریان زیاتر دەکەین، واتە جەزرەبەیەك لەسەر خوانەناسیان‌و جەزرەبەیەکی تر لەسەر ئەوەی دەبوونە ڕێگر لە ڕێی خەڵکیدا بۆئەوەی شوێنی ڕاستی نەکەون، وەك ئەم ئایەتەی تردا کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴾[5] واتە: هەر ئەوانە ناهێڵن خەڵك بێنە لای خواو دین و خۆشیان خۆی لێ دوور دەگرن، ئەم کەسانە بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن هەر خۆیان لەناو دەبەن. ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر زیادو کەمی سزای خوانەناسان لەناو جەهەنەمدا وەك چۆن خاوەن باوەڕان پلەکانیان لە یەکتری جیاوازەو هەیە پلەی بەرزەو هەیشە پلەی بەرزترە، خوای گەورە لە بارەی خوانەناسانەوە

---

[1] الطبري (١٧/٢٧٦).

[2] مريم (٣٨).

[3] السجدة (١٢).

[4] طه (١١١).

[5] الانعام (٢٦).

دەفەرموویت: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: بۆ هەر کامتان (سزا) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە نازانن‌و بێئاگان.

﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ (٨٩)﴾

### هەموو پێغەمبەرێك لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتی دەدات لەسەر ئومەتەكەی

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ﴾ واتە: ڕۆژێك دێت لەناو هەر گەلێك یەكێك لە خۆیان دەكەین بە شایەت بەسەریانەوە، تۆش شایەتی ئێمەی بەسەر ئومەتەكەتەوە، واتە: یادی ئەو ڕۆژەو نارەحەتیەكەی‌و ئەو ڕێزە گەورەیەو ئەو پلە بەرزەیش بكەرەوە كە خودا پێی بەخشیوی، ئەم ئایەتە لەو ئایەتە دەچێت كە عەبدوڵای كوڕی مەسعود پێی گەیشت، كاتێك دەیخوێند بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرەتای سورەتی (النساء)دا كەخوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾[2] واتە: ئینجا (حاڵی كافران چۆن ئەبێت كاتێك لە هەموو ئومەتێكدا شایەتێك (كە پێغەمبەرەكەیانە) هێنامان تۆیشمان هێنا (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بە شایەت بەسەر ئائەوانەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: (بەسە) واتە: بوەستە ئیتر مەیخوێنە، عەبدوڵا دەڵێت: كە لام كردەوە چاوەكانی پێغەمبەر(ﷺ) فرمێسكیان پێدا دەهاتە خوارەوە[3].

### ئەم قورئانە هەموو شت ڕوون دەكاتەوە

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ﴾ واتە: ئەم قورئانەشمان بۆ ناردووی، هەموو شت ڕوون دەكاتەوە، ئیبنو مەسعود دەڵێت: خوا لەم قورئانەدا هەموو زانیاری‌و هەموو شتێكی بۆ ڕوون كردووینەتەوە،[4] چونكە قورئان گشت زانستە بەسودەكانی بۆ ڕۆشن كردووینەتەوە لەو شتە چاكانەی پێش خۆمان‌و ئەم زانیاریە بەسوودانەی لەمەودوایش، لە حەڵاڵ‌و لە حەرام‌و ئەو شتانەی كە مەردم پێویستیان تێی دەكەوێت لە كاروباری دنیاو ئاین‌و بژێوی‌و ڕۆژی

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] النساء (٤١).

[3] فتح الباري (٩٩/٨).

[4] الطبري (٢٦٩/١٧).

دوایدا، ﴿وَهُدًى﴾ ڕێنیشاندەری دڵەکانە، ﴿وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾ دلۆڤانیو مژدەیشە بۆ موسڵمانان، ئەوزاعی دەڵێت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ﴾ واتە:بەهۆی(سوونەتەوە) هەموو شت ڕوون دەکاتەوە.[1] نزیکیەك لە نێوان ئەم ئایەتە ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ﴾و ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾ هەیە، چونکە مەبەست پێی (والله أعلم) ئەوەیە،ئەو کەسەی کە ئەرکی ڕاگەیاندنی ئەم قورئانەی کە ناردوویەتی خستووەتە سەر شانی تۆ،لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیارت لێ دەکات لەو بارەیەوە ،وەك لەم ئایەتانەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَنَسْأَلَنَّ الَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْأَلَنَّ الْمُرْسَلِينَ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی پرسیار دەکەین لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ نێردرا (کە چۆن پێشوازیان لێ کردن)و بێگومان پرسیاریش دەکەین لە پێغەمبەران (کە چۆن وەڵام درانەوە). وە دەفەرموێت: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[3] واتە: جا سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین، لەوەی کە دەیانکرد (لە دنیادا). وە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ اللَّهُ الرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَا أُجِبْتُمْ قَالُوا لَا عِلْمَ لَنَا إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ﴾[4] واتە: لە ڕۆژێك (بترسن) خوا هەموو پێغەمبەران کۆدەکاتەوە ئەوسا پێیان دەفەرموێت: چ وەڵامێکتان درایەوە؟ دەڵێن: چ زانیاریەکمان نیە بێگومان تەنها تۆ ئاگاداری هەموو نهێنیەکانیت. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾[5] واتە: بێگومان ئەو (خوایەی) کە قورئانی بۆ تۆ(پێویست کردووە) دەتگێڕێتەوە بۆ مەککە. واتە: ئەو کەسەی ئەم قورئانەی کردە ئەرکی سەر شانی تۆ، بێگومان دەتباتەوە ئەو شوێنەی کە بەڵێنی پێدای، پرسیارت لێ دەکات دەربارەی ئەوئەرکەی خستیە سەرشانت، ئەمەتەفسیرێکە لە تەفسیرەکانیو بۆچوونێکی چاكو جوانە.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾

**فەرمان دان بە دادپەروەریو چاکەخوازی**

---

[1] الدر المنثور (٥/١٥٨).

[2] الاعراف (٦).

[3] الحجر (٩٢-٩٣).

[4] المائدة (١٠٩).

[5] القصص (٨٥).

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾ واتە: خودا فەرمان دەدات بە دادپەروەریی چاکەخوازی کەبریتی یە لە جیاوازی نەکردن لەنێوان خەڵکیداو مامەڵەکردن لەگەڵیاندا بە یەکسانی، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ﴾[1] واتە: ئەگەر تۆڵە دەسێنن با بەرامبەر بێتو زیاتر نەبێت، خۆ ئەگەر خۆڕاگریش بن، دیارە ئەوە بۆ خۆڕاگران زۆر باشە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾[2] واتە: سزا بۆ هەر خراپەیەك، خراپەیەکی وەك ئەوە، کێ چاوپۆشی لە تۆڵە بکاتو هەوڵ بۆ ئاشتی بدات، پاداشتی لەسەر خودایە، وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥ﴾[3] واتە: برینەکانیش تۆڵەیان هەیە، کێ لە تۆڵە واز بێنێت، گوناهی پێ هەڵدەوەرێت، چەندین ئایەتی لەم بارەیەوە هاتووە؟ باسی دادپەروەریی یەکسانیو چاکەخوازیو لێبوردەیی دەکات.

**فەرماندان بە ڕاگرتنی پەیوەندی خزمایەتیو قەدەغەکردنی بەدڕەوشتیو کاری ناڕەواو دەستدرێژی لەسەر خەڵکی**

پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ واتە: چاکەو ماڵ بەخشین بە خزمو کەسو کار، توندکردنی پەیوەندی خزمایەتی، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا﴾[4] واتە: وە مافی خزمانت بدە (هەروەها مافی) هەژارو ڕێبواریش زیادەڕەویش مەکە. کەسو کار بەشی خۆی بدەریو هەژارو لە ڕێماوەیش بێبەش مەکە، زۆریش دەست بڵاو مەبە، ﴿وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾ قەدەغەی کاری پیسو خراپ دەکات، (الفواحش)حەرام و قەدەغەکراوەکان (المنكرات)کردنی کاری خراپ بە ئاشکرا، بۆیە لە شوێنێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ﴾[5] واتە: بڵێ: پەروەردگارم ئەوەی قەدەغەکردووە کە کاری خراپ بە ئاشکراو بە نهێنی بکرێت. ﴿وَٱلۡبَغۡيِ﴾ واتە: دەستدرێژی لەسەر

---

[1] النحل (١٢٦).

[2] الشورى (٤٠).

[3] المائدة (٤٥).

[4] الاسراء (٢٦).

[5] الاعراف (٣٣).

خەڵکی، لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (هیچ گوناهێك نیە کە بشێت خودا زوو تۆڵەی بسێنێت لە دنیادا لەگەڵ ئەوسزایەیش کە بۆخاوەنەکەی هەڵدەگرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە دەستدرێژی لەسەر خەڵکیو بچراندنی پەیوەندی خزمایەتی).[1] ﴿يَعِظُكُمْ﴾ ئامۆژگاریتان دەکات کەهەوڵبدەن بۆچاکەو وازبێنن لە خراپەکاری، ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵکو پەندی لێ وەرگرن. شەعبی لە شوتەری کوڕی شەکەلەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: بیستم لە ئیبنو مەسعودەوە دەیوت: پڕماناترین (جامعترین) ئایەت لە قورئاندا لە سورەتی (النحل)دایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[2] ئیبنو جەریریش ئەم قسەیەی ڕیوایەت کردووە.

## ڕوداوێکی تایبەت بەعوسمان-ر.خ-

لەفەرموودەیەکی حەسەندا هاتووە دەربارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ﴾ کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەردەم ماڵەکەیدا دانیشتبوو، عوسمانی کوڕی مەزعون بە لایدا ڕابوردو زەردەخەنەیەکی دەربڕی بۆپێغەمبەری خواو، پێغەمبەریش (ﷺ)پێی فەرموو : (دانانیشی؟) وتی: با !ئەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووبەڕووی دانیشتبوو، کاتێك ئەو قسەی بۆ ئەکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی خۆی چەرخاند بەرەو ئاسمان، ماوەیەك سەیری ئاسمانی کرد، پاشان وردە وردە چاوی دانەواندو، ڕووی کردە لای ڕاستی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی چەرخان لە عوسمان کە لە لای دانیشتبوو بۆ ئەو شوێنەی کە چاوی تێ بڕیبوو، پێغەمبەر"ص" هەر سەری دەجوڵاند وەك ئەوەی شتێکی پێ بگوترێت وئەویش لێی تێ دەگات و"بەڵێ"ی بۆبکات، ئیبنو مەزعونیش هەر سەیری دەکرد، وەختێك کارەکەی تەواو کردو ئەوەی پێی گوترا وەری گرت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان وەك چۆن لە سەرەتاوە چاوی تێ بڕیبوو چاوی لێی کەلا نەدەکرد هەتا بەرەو ئاسمان ئەوشتە ڕۆیشتەوەو لەبەرچاو نەما، جا ڕووی کردە عوسمان وەك دانیشتنی یەکەمجار، وتی: ئەی موحەمەد(ﷺ) هەرکاتێك لەگەڵت دانیشتبم نەم دیوی ئەو کارە بکەی کە ئەم بەیانیە کردت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تۆ چیت لە من بینی کردبێتم؟) وتی: من تۆم بینی چاوت بڕیبووە ئاسمانو بۆ ئاسمانت دەڕوانی پاشان داونەواند بۆ ئەو شوێنەی لای ڕاستت، لات کردەوە بۆ ئەولاو

---

[1] أبوداود (٥/٢٠٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] الطبري (١٧/٢٨٠).

وازت لە من هێنا، پاشان دەستت کرد بەسەر جوڵاندن (سەرلەقاندن) وەك ئەوەی بەڵێ بۆ شتێك دەکەی کە پێت دەوترێ، فەرمووی: (بە ئەوەت زانی؟) عوسمان وتی: بەڵێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فوروستادەی خوا کەمێك لەمەوپێش کە تۆ دانیشتبووی هاتە لام) عوسمان وتی: فوروستادەی خوا؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ: وتی: چی پێ وتی؟ فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ﴾. عوسمان وتی: لەو کاتەوە باوەڕ لە دڵمدا بە تەواوی جێگیر بوو ئیتر موحەمەدم(ﷺ) خۆشویست،سەنەدەکەی(جيد)و(متصل)ەوراویەکان(سەماعی موتتەصیل) یان بەکاربردوە.

﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَـٰثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَـٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ ۚ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ ۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾

**فەرماندان بە جێبەجێکردنی پەیمان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ إِذَا عَـٰهَدتُّمْ ﴾ واتە: ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ خوادا دەیبەستن بەجێی بێنن، ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە خوا فەرمانی پێ دەکات، کە بریتیە لە بەجێهێنانی پەیمانو بەڵێنەکانو پارێزگاری لەو سوێنانەی کەبەدڵخواردووتانە بەجێی بێنن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنقُضُوا۟ ٱلْأَيْمَـٰنَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ واتە: بەڵێنو پەیمانەکانتان مەشکێنن لە پاش بەهێزکردنیان، هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتانەدا کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجْعَلُوا۟ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَـٰنِكُمْ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا مەکەن بە کەرەستەی (بەرهەڵستی) سوێندی خۆتان، وە لە نێوان ئەم ئایەتەشدا کە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ كَفَّـٰرَةُ أَيْمَـٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَـٰنَكُمْ﴾[2] واتە: ئەمە کەفارەتی سوێندتانە کە بە ئەنقەست خواردبێتتان، سوێندی خۆتان بپارێزن. واتە: وازی لێ مەهێنن هەتا کەفارەتی نەدەن، وە جیاوازیش نیە لەگەڵ ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە لە هەردوو سەحیحەدا هاتووە فەرموویەتی: (وە سوێند بە خوا (إن شاء الله) من سوێندێك ناخۆم کە

[1] البقرة (٢٢٤).

[2] المائدة (٨٩).

ببینم شتێکی تر چاکترە لەوە مەگین ئەوەیانم ئەدەم کە چاکترەو سوێندەکەم ئەشکێنم(وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە) کەفارەتی سوێندەکەم داوە).[1] هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوان هەموو ئەمانەداو لەنێوان ئەم ئایەتەی لێرەدا کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ –سوێندەکانتان هەڵمەوەشێننەوە پاش ئەوەی دوپاتیان ئەکەنەوە–چونکە ئەم سوێندە مەبەست پێی بەڵێنو پەیمانە، نەك ئەو سوێندی کە دەخورێت لەسەر شتێك بکرێت یان نەکرێت، بۆیە موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا تَنقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا﴾ دەڵێت: واتە:پەیمننامە کەبریتی یەلەو پەیمانو بەڵێنانەی کاتی نەفامی بەستبوویان.[2] ئەم فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جوبەیری کوڕی موعتیمەوە پشتگیری ئەوە دەکات کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نیە، هەر پەیمانێك لە کاتی نەفامیدا بەسترابێت، بێگومان ئیسلام زیاتر بە توند دەیگرێتو گرنگی پێ دەدات).[3] موسلیمیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[4] واتە: ئیسلام پێویستی بەو پەیمانبەستنە نیە کە خەڵکی زەمانی نەفامی پێی هەڵدەسانو دەیانبەست، چونکە پابەندبوون بە ئیسلامەوە بەس بوو لەوەی ئەوان دەیانکرد، بەڵام ئەوەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەیمانی بەست لە نێوان کۆچەریەکانو ئەنساریەکاندا (الانصار) لە ماڵی ئێمەدا.[5] واتە: برایەتی خستە نێوانیان، بەو پەیمانە میراتیان لە یەکتری دەبرد تائەوکاتەی خوای گەورە ئەوەی هەڵوەشاندەوە(والله أعلم).وەدەفەرموێت: ﴿وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا ۚ إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ﴾ واتە: خوداتان بە چاودێری خۆتان داناوە، دیارە خودا ئاگاداری کردەوەکانتانە، ئەم ئایەتە هەڕەشەیە لەو کەسانەی کە پەیمان دەشکێنن دوای بەهێزکردنو جەختکردن لەسەری، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِن بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَاثًا﴾ واتە: نەکەن وەك ئەو ژنە بکەن کە ڕیسەکەی لە پاش گرژی خاوکردەوەو پچڕپچڕی کرد، عەبدوڵای کوڕی کەسیرو سوودیی دەڵێن: ئەم ژنە ژنێکی بێعەقڵ بوو لە مەککەدا هەر شتێکی بڕیسیایە، پاش ڕێسانی خاوی دەکردەوە.[6] موجاهیدو قەتادەو ئیبنو زەید

[1] فتح الباري (١١/٥٢٥)، مسلم (٣/١٢٦٩).

[2] الطبري (١٧/٢٨٢).

[3] احمد (٤/٨٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/١٩٦١).

[5] فتح الباري (٤/٥٥٢)، مسلم (٤/١٩٦٠).

[6] الطبري (١٧/٢٨٥).

دەڵێن: ئەمە نموونەیە بۆ ئەو کەسەی کە پەیمانی هەڵوەشاندووەتەوە پاش بەستنی.[1] ئەمە قسەیەکی بەهێزو روونە، با ژنێ لە مەککەدا بووبێت ڕیسەکەی خاو کردبێتەوە یان نەیکردبێتەوە. ﴿أَنكَٰثًا﴾ پێدەچێت ئیسمی مەسدەر بێت واتە: (نقضت غزاها أنكاثاً) یان (أنقاضاً) لەوانەیشە بەدەل بێت لە خەبەری (کان)ە واتە: ئێوەیش وا مەبن ﴿أَنكَٰثًا﴾ جەمعی (نكث)یە لە (ناكث)ەوە هاتووە. بۆیە خوای گەورە پاشان دەفەرمووێت: ﴿تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًا بَيْنَكُمْ﴾ سوێندەکەتان بکەنە هۆی فریودانو ﴿أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ﴾ لەبەر ئەوەی کۆمەڵێك بەهێزترو زۆرترە لە کۆمەڵێکی تر، پەیمانی لەگەڵ دەبەستن بۆ ئەوەی ترسیان نەبێت لێتان، بەڵام هەر کاتێك بۆتان گونجا خەیانەتیان لێ دەکەن، خوای گەورە ئەوەی لە پێغەمبەرەکەی قەدەغە کرد، لە خوارەوە بۆ سەر، واتە: هەموو شێوەیەکی، ئەگەر لە کاتێکدا قەدەغەی کردبێت کە موسڵمانان لاوازو بێ هێز بووبن، چاکتر قەدەغەی دەکات لە کاتی دەسەڵاتو هێزدا، موجاهید دەڵێت: کاتی نەفامی خەڵکی پەیمانێکیان دەبەست لەگەڵ کۆمەڵێکدا، کە کۆمەڵێکی تریان دەبینی ئەوان زۆرترو خاوەن دەسەلا تتر بوون، پەیمانی ئەوانەیان هەڵدەوەشاندەوەو لەگەڵ ئەوانەدا کە زۆرترو خاوەن دەسەڵاتتر بوون پەیمانیان دەبەست،ئەوەبوو ئەوەیان لێ قەدەغە کرا. زەححاكو قەتادەو ئیبنوزەیدیش هەر وایان وتووە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ﴾ دیارە خودا بەمە تاقیتان دەکاتەوە، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: خودا تاقیتان دەکاتەوە بەو زۆریە.[2] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. ئیبنو جەریر دەڵێت: واتە: کە فەرمانی داوە بە ئێوە پەیمان بەجێ بێنن، ﴿وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ تا لە ڕۆژی قیامەتیشدا بۆتان روون بکاتەوە لەسەر چی پێك نەدەهاتن، هەتا هەر کەسە بە پێی کرداری خۆی پاداشتی خۆی وەرگرێت لە چاکەو لە خراپە[3].

﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن

---

[1] الطبري (٢٨٥/١٧).

[2] الدر المنثور (١٦٣/٥).

[3] الطبري (٢٨٧/١٧).

كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾

**ئەگەر خودا مەیلی لێبووایە هەمووخەڵكی وا لێ دەكرد یەك ئاینیان ببوایە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ واتە: ئەی خەڵكینە ئەگەر خودا مەیلی لێبوایە وای لێ دەكردن یەك ئاینتان ببووایە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾[1] واتە: ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە هەرچی لەم زەمینەدایە تێكڕا بڕوای دەهێناو ڕێكی دەخستن‌و ناكۆكی‌و ڕق‌و كینەی لە نێواندا نەدەهێشتن، وەك لەم ئایەتەیشدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾[2] واتە: پەروەردەت ئەگەر مەیلی لێ بووایە خەڵكی دنیای گشت دەكردە یەك ئاین، بەڵام هەر بەناتەبایی دەمێننەوە (مەگین پەروەردەی تۆ بەزەیی پێیاندا بێتەوە، وە هەر بۆ ئەوەی دروست كردوون. بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ بەڵام كەسێك خۆی مەیلی لێ بێت گومڕای دەكات‌و مەیلیشی لە هەر كەسێك بێت دەیخاتە سەر ڕاستەڕێ، بێگومان لێشتان دەپرسن لە ڕۆژی قیامەتدا كە ئێوە چیتان كردووە، پاداشتی گشت كردارەكانتان وەردەگرن چاكە بە چاكەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندن، بە ئەندازەی توێكڵی دەنكە خورمایەك ستەم لە كەس ناكرێت.

**قەدەغەكردنی سوێندخواردن بۆ یەكتری فریودان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌۢ بَعْدَ ثُبُوتِهَا﴾ بە سوێند یەكتری مەخەڵەتێنن، تا پێتان لە پاش جێگیربوونی (لەسەر باوەڕ) هەڵنەخلیسكێت. لێرەدا خوای گەورە بەندەكانی خۆی دەترسێنێت كە بە سوێنددان یەكتری بخەڵەتێنن، بۆ ئەوەی دوای بڕواهێنان پێیان هەڵنەخلیسكێت پاش جێگیربوونی، ئەمە نموونەو دەرسێكە بۆ ئەو كەسانەی كە لەسەر ڕاستەڕێن‌و پاشان لادەدەن لەسەر ئەو ڕاستەڕێیەو بە هۆی ئەو سوێند خواردنەشەوە خەڵكی دوور دەخەنەوەو چونكە وەختێك خوانەناس بینی خاوەن باوەڕ بەڵێنی دەداتی‌و پاشان خەیانەتی لێ دەكات هیچ متمانەیەكی بەو ئاینە نامێنێت، ئەوە دەبێتە هۆی دووركەوتنەوەی لە ئیسلام‌و توخنی ئەو

[1] یونس (٩٩).

[2] هود (١١٨ـ١١٩).

ئاینە ناکەوێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتَذُوقُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: ئازارو جەزرەبە دەچەژن بەهۆی بەرهەڵستی کردنتان لە ڕێی خوداو سزای گەورەیش دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا.

**پەیمانەکانتان مەشکێنن لەبەر خاتری دنیا**

پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِعَهْدِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ واتە: پەیمانی خودا بە نرخێکی کەم مەفرۆشن، واتە: ئەو بڕوا بوونەتان بە خوای گەورە بە خۆشیو جوانی ئەم ماوە کەمەی ژیانی دنیا مەفرۆشن، چونکە ئەگەر هەموو دنیا بکەوێتە دەستی نەوەیەکی ئادەم بە تەنهاو هیچی لێ کەم نەکرێت، ئەوەهێشتا لای خودایە زۆر چاکترە بۆی لەو هەموو دنیایە، واتە: ئەو پاداشتو چاکەی خودا زۆر باشترە بۆ کەسێك ئومێدی بە خودایەو بڕوای پێ هێناوەو هانای بۆ بردووەو پەیمانی نەشکاندووەو چاوەڕوانی بەڵێنەکانیەتی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ ئەگەر بزانن.

پاشان دەفەرمووێت: ﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾ واتە: ئەوەی لە لای ئێوەیە لەناو دەچێت، ئەوەی لای خودا هەیە، هەر دەمێنێت، هەتا هەتاییە، ﴿وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓا۟ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ ئەو کەسانەی کە خۆڕاگر بوون پاداشتیان دەدەینەوە بە پاداشتی چاکترین کردەوەیان. ئەمە سوێندێکە لە خوداوە کە جەختی لەسەر دەکاتەوە بە لامی تەئکید، کە پاداشتی خۆڕاگران زۆر بە زیادەوە دەداتەوەو چاوپۆشیش لە تاوانەکانیان دەکات.

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾

**کاری چاكو پاداشتی کاری چاکە.**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ هەر کەسێك کرداری چاکەبکاتو خاوەن باوەڕبێت (نێر یان مێ) هەتا لە ژیاندایە بە خۆشی پێی دەگوزەرێنین، بێگومان بە چاکتر لەوەی کردویانە ئێمە پاداشتیان دەدەینەوە. ئەمە بەڵێنی خودایە بۆ ئەو کەسانەی ئاکار چاکن، ئاکاری چاکیش ئەوەیە کە بە پێی کتێبی خوداو سونەتی پێغەمبەر بێت (ﷺ)، ئیتر ئەو کەسە نێرە یان مێیە هیچ جیاوازیەکی نیە، مادام بڕوای بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە (ﷺ) ئەو کارەیش کە فەرمانی پێکراوە، لە لایەن خوداوە ڕێی پێ درابێت، بێگومان خوا هەر لە دنیادا ژیانێکی خۆشی پێ

دەبەخشێت، لە ڕۆژی دوایشدا پاداشتی لەوە چاکتری دەداتەوە، ژیانی خۆشیش لە دنیادا زۆر شت دەگرێتەوە لەو شتانەی کە دەبێتە هۆی دڵئارامی لەهەرکایەیەکی ژیاندابێت، لە ئیبنو عەباسو کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە کەئەم ژیانە خۆشەیان تەفسیر بە ڕۆزی پاکو حەلاڵ کردووە. وە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)ڕیوایەت کراوە کە بە قەناعەتو ڕازی بوون بە بەشی خودا تەفسیری کردووە. ئیبنو عەبباسو عیکریمەو وەهەبی کوڕی مونەبەیش هەر وایان وتووە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە کەفەرموویەتی: مەبەست پێی خۆشبەختیە، حەسەنو موجاهیدو قەتادە دەڵێن:ژیانی خۆش بۆهیچ کەس نابێت لەناوبەهەشتدا نەبێت. زەحاك دەڵێت: ﴿حَيَوٰةً طَيِّبَةً﴾ ڕۆزی حەلاڵو خواناسیە لە دنیادا. دیسان زەحاك دەڵێت: خۆ خەریك کردن بە خواناسیو دڵگوشادی بەو خواناسیەوە، ڕاستتر ئەوەیە (ژیانی خۆش) هەموو ئەمانە دەگرێتەوە. وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە (عمرو) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان ڕزگاری بووە کەسێك کە موسڵمان بووبێتو بەشی خۆی ڕۆزی پێ درابێتو خوای گەورەش قانیعی کردبێت،بەوبەشەی کەپێ ی داوە).[1] موسلمیش ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە.[2]

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾﴾

**فەرماندان بە خۆدانە پەنای خوا لە پێش قورئان خوێندندا.**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ واتە: کاتێك کە قورئان دەخوێنیت هەر پەنا بۆ خوا بەرە لە شەیتانی بێبەشکراو لە بەزەیی خودا. ئەمە فەرمانی خودایە بۆ بەندەکانی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی کەحەزرەتی موحەممەدە (ﷺ)کە کاتێك ویستیان قورئان بخوێنن با پەنا بە خوا بەرن لە شەیتانی دەرکراو لە بەزەیی خودا، لە سەرەتای ئەم تەفسیرەدا چەندین فەرموودەمان هێنا لە بارەی پەنابردن بۆ خوا لە شەیتان،سوپاس وستایش هەربۆخوایە مانای پەنابردن بۆ خواش لە سەرەتای خوێندنی قورئانەوەبۆ ئەوەیە کە قورئان خوێن لە کاتی قورئان خوێندنداقورئانەکە لێهەڵە نەبێت و شتی تری تێکەڵاوبێت و ببێتە ڕێگر لە بیرکردنەوەو تێڕامانیدا، بۆیە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە پەنا بردن بۆخوا(الاستعاذة) لە پێش قورئان خوێندندا بێت.

---

[1] احمد (٢/٢٦٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٢/٧٣٠).

پاشان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ بە ڕاستی شەیتان دەسەلاتی نیە بەسەر ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو تەنها پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، سەوری دەڵێت: شەیتان دەسەلاتی نیە بەسەر ئەو خاوەن باوەڕانەدا کە توشی تاوانێکیان بکات نەتوانن لێی پەشیمان ببنەوە.[1] هەندێکی تر ئەڵێن: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾[2] واتە:(شەیتان ووتی:هەموو بەندەکانت وێڵ ئەکەم)[3] ئەوانە نەبێت کە بەندەی پاکو هەڵبژاردەی تۆن. بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ﴾تەنها دەسەلاتی بەسەر ئەوانەدا هەیە دۆستو پشتیوانی ئەونو شەریك بۆ خوا پەیدا دەکەن. موجاهید دەڵێت: ﴿يَتَوَلَّوْنَهُۥ﴾ واتە: گوێڕایەڵی دەکەن.[4] هەندێکی تر وتوویانە: لە جێی خودا شەیتان دەکەنە دۆستی خۆیان.

﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾﴾

**بتپەرستان بوختان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هەڵدەبەستن کە دەربارەی هەندێ ئایەت ئەفەرموێ نەسخبونەتەوە، و وەڵامدانەوەیان لەلایەن خواوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ ۙ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: هەر کاتێك ئێمە ئایەتێکمان بە ئایەتێکی تر گۆڕی خوایش خۆی دەزانێ چی دەنێرێت،ئەڵێن خۆت هەڵت بەستووە، نا وانیە! ئەوان زۆربەیان نازانن، خوای گەورە لێرەدا باسی لاوازی عەقڵی بت پەرستان دەکات کە چەندە ڕاڕاو بێ متمانەن کە ئومێدی بڕواهێنانیان لێ ناکرێت چونکە ئەوانە خودا ئەوەندە بەدبەختی کردوون کە بینیان خودا بڕیارێکی خۆی گۆڕیوە ئایەتێکی لابردووەو ئایەتێکی تری لە جێی داناوە ئەڵێن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ): ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ﴾ تۆ خۆت هەڵتبەستووە،نەخێر وانیە، خودا مەیلی لە هەر شتێك بێت دەیکاتو هەر

---

[1] الطبري (٢٩٤/١٧).

[2] ص (٨٣).

[3] ئەوزیادەیەهیوەرگێرە.

[4] الطبري (٢٩٤/١٧).

بڕیارێکی بوێت دەیدات، موجاهید دەڵێت: ﴿بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ﴾ واتە: ئایەتێکمان لابردو ئایەتێکی ترمان لە جێی داناوە،[1] قەتادە دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ (البقرة: ١٠٦)[2] واتە: هەر ئایەتێك لە کار بخەین یان لە بیری بەرینەوە ئەوەیان لەو پڕخێرتر ئەهێنین یان وەك ئەوپڕخێرئەبێت. خوای گەورە وەڵامی بتپەرستان دەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ بڵێ: گیانە پیرۆزەکە (جوبرەئیل) بە ڕاستی لە لایەن پەروەردگارتەوە هێناویەتی، هەتا خاوەنباوەڕەکان دڵنیا بکاتو ڕێنیشاندەرو مزگێنیدەریش بێت بۆ موسڵمانان، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە خوداو پێغەمبەرەکەی.

﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾﴾

**بتپەرستان ئەڵێن مرۆڤێك ئەو قورئانە فێری موحەمەد (ﷺ) دەکاتو وەڵامی ئەم قسەیەی بتپەرستانیش**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ﴾ واتە: ئێمە ئەوە باش دەزانین ئەوان ئەڵێن: مرۆڤێك فێر دەکات. خوای گەورە باسی بتپەرستان دەکات کە چ درۆو بوختانێکیان هەڵبەست بۆ پێغەمبەرو (ﷺ) دەیان وت: ئەوەی کە دەیخوێنێتەوە بۆمان پیاوێك فێری دەکات، مەبەستیان پیاوێکی عەجەمی بوو کە لە ناو یەکێك لە بنەماڵەکانی قورەیشدا دەژیان، کاسپی سەرپێی دەکرد لە سەففادا شتی دەفرۆشت هەندێ جار پێغەمبەری خوا (ﷺ) لای دادەنیشتو قسەی لەگەڵ دەکرد، ئەو پیاوە زمانی عەجەمی بوو عەرەبی باش نەدەزانی، یان کەمێکی دەزانی، بە ئەندازەی ئەوەی ئەگەر خەڵکی پرسیاریان لێ بکردایە، دەبوو وەڵامیان بداتەوە، بۆیە خوای گەورە وەڵامی ئەو درۆو بوختانەیان دەداتەوە کە هەڵیان بەستبوو بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە: کەچی ئەو کەسەی ئەوان مەبەستیانە خۆی لەزمانی عەرەبیدا کوڵەو ئاشکرایشە ئەم قورئانە بە عەرەبیەکی ڕەوان هاتوە. کەوایە چۆن کەسێك ئەم قورئانەی هێناوە بەم هەموو ڕەوانبێژیو مانا تێروتەواوەوە کە لە گشت

---

[1] الطبري (٢٩٧/١٧).

[2] الطبري (٢٩٧/١٧).

کتێبەکانی تر کە هاتووە بۆ پێغەمبەرەکانی تر پڕ ماناترە لە پیاوێکی عەجەمیەوە فێر دەبێت؟ هەر کەسێك تۆزێ عەقڵی هەبێت قسەی وا ناکات. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی ئاسنگەری لە مەککەدا دەناسی کە ناوی بیلعام بوو زمانی عەجەمی بوو، بتپەرستەکان پێغەمبەریان دەبینی هاتوچۆی دەکرد، وتیان: دیارە بیلعام ئەم قورئانەی فێر دەکات. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ﴾[1].

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە بە بەڵگەکانی خودا باوەڕ ناکەن، خودا شارەزایان ناکاتو جەزرەبەی بە ژانیان دەدرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت هەر کەسێك پشت بکاتە قورئانو خۆی لادات لەوەی کە خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نیازیشی نەبێت باوەڕ بێنێت بەوەی لە لایەن خواوە هاتووە، ئەم جۆرە کەسانە خودا ڕێیان نیشان نادات کە بڕوا بێنن بە نیشانەکانیو ئەوەیش کە بە پێغەمبەرەکەیدا ناردوویەتی لە دنیادا سزای بە ژانو پڕ ئازاریش دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا، پاشان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يَفْتَرِى ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾ واتە: هەر ئەوانە درۆ بە دەم خواوە دەکەن، کە بڕوا بە ئایەتەکانی خودا ناکەن، ئەوانە هەر خۆیان درۆزنن، پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەرەکەی درۆزنو بوختانچی نیە، بەڵکو ئەوانەی کە درۆ بە دەم خواو پێغەمبەرەکەیەوە(ﷺ) هەڵدەبەستن خراپترین کەسن، ﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانەی کە بڕوا بە نیشانەکانی خوا ناکەن لەو خوانەناسو بێئاینانەی کە ناسراون لەناو خەڵکیدا بە درۆزن، ئەم پێغەمبەرەیش موحەمەد(ﷺ) ڕاستگۆترینو چاکترینو پاکترینو تەواوترین کەس بووە لە کردارو گفتارو بڕوادا، ناسرابوو لەناو هۆزەکەیدا بە ڕاستگۆ، هیچ کەسێك لە هۆزەکەی گومانی نەبووە لە ڕاستگۆیی پێغەمبەر(ﷺ) هەتا لە ناو قورەیشدا ناو دەبرا بە موحەمەدی ئەمین. بۆیە کاتێك هەرقەل پاشای ڕۆم چەندپرسیارێکی کرد لە ئەبو سوفیان کەیەکێك لە پرسیارەکانی ئەوە بوو، پرسیاری لە سیفەتو ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد پێی وت: ئایا ئێوە تۆمەتبارتان دەکرد بە

---

[1] الطبري (١٧/٢٩٨).

درۆزنی لە پێش ئەوەی ئەم قسانە بکات؟ ئەبو سوفیان وتی: نەخێر، هەرقەل وتی:کەواتە مەحاڵەو ناگونجێت درۆ بە دەم خەڵکیەوە نەکاتو بچێت درۆ بە دەم خواوە بکات.

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾

**هەڕەشەو توڕەیی خودا لەوانەی کە پاشگەز دەبنەوە لە ئاین مەگین کەسێك کە ناچار بکرێت حاشا بکات لە ئاینەکەی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ واتە: هەر کەسێك بڕوای بە خوا بوبێتو پاشان حاشای لێ بکات سزا دەدرێت مەگین کەسێك ناچار کرابێتو لە باوەڕی دڵنیا بێت، بەڵام کەسێك بە حاشاکەی دڵی خۆش بێت،ئەوە بەر توڕەیی خودا کەوتوونو ئازاری زۆر گەورە دەدرێن، خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە پاشگەز بوونەتەوە پاش باوەڕهێنانو دڵیشیان خۆش بووە بەو پاشگەزبوونەوە، ئەوانە بەر توڕەیی خودا کەوتوون، لەبەر ئەوەی شارەزاییان پەیدا کردووە لە ئاینو پاشان پەشیمان بوونەتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی زۆر گەورەیان بۆ ئامادە کراوە، چونکە ئەوانە ژیانی دنیایان لە دوارۆژ لا گرنگو خۆشەویستتر بووە، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: چونکە ئەمانە ژیانی دنیایان لە دوارۆژ زیاتر خۆش دەوێت، دیارە خوایش کۆمەڵی خوانەناسان شارەزا ناکاتو ڕاوەستاویان ناکات لەسەر ئەم ئاینە ڕاستە. ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴾ واتە: ئەمانە هەر ئەو کەسانەن کە خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیانداو چاوی کوێر کردوونو گوێی کپ کردوونو ئەمانەن کەسانی بێئاگا. واتە: ئەمانە خوا مۆرێکی وای ناوە بەسەر دڵیاندا ئاوەزیان بە هیچ شتێك ناشکێتو چاویان کوێر بووەو گوێشیان کەڕ بووە، هیچ سوودێکیان لێ وەرناگرن، هۆشیان بە خۆیانەوە نیەو لە بیریان دەچێتەوە کە بۆچی دروست کراون. خوای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ دیارە لە

ڕۆژی قیامەتدا ئەوانە هەر خۆیان زیانبارن، جێی سەرسوڕمانیش نیە کەسێك ئەوە ڕەوشتو کرداری بێت، خۆیی و کەس و کاری توشی سزاو جەزرەبە دەکات لە دواڕۆژدا. بەڵام وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾.[1] ئەم ئیستیسنایە بۆ کەسێکە بە زمان پەشیمانی دەربڕێت و هاوڕا بێت لەگەڵ بتپەرستان بە زمانی بە ناچاری بە هۆی ئەو ئازارەوە تووشی بووە،بەڵام ئەو کەسە دڵنیایەو بڕوای بە خواو پێغەمبەرەی (ﷺ) بتەوو دامەزراوەو بەدڵ ئەوشتانە ناڵێ.

**هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە**

عەوفی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوەکە ئەم ئایەتە: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾ لەسەر عەمماری کوڕی یاسر هاتووەتە خوار، وەختێك کە بت پەرستان سزایان دەدا بۆ ئەوەی حاشا بکات لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش بە ناچاری بە گوێی کردن، پاشان هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و عوزری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە.[2] شەعبیو قەتادەو ئەبو مالیکیش هەر وایان وتووە.[3] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو عوبەیدەوە، موحەمەدی کوڕی عەماری کوڕی یاسرەوە دەڵێت: بتپەرستان عەمماری کوڕی یاسریان گرتو زۆر سزایان دا هەتا وایان لێ کرد کە هەندێ لەو شتانەی ئەوان ویستیان بیڵێت، دەڵێت: عەممار سکاڵای هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دڵت چۆن دەبینی؟) وتی: دڵنیام لە باوەڕی خۆم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر گەڕانەوە بۆ ئەو سزا دانەت تۆش بگەڕێرەوەو قسەکانی خۆت بکەرەوە).[4] بەیهەقی ڕوونتر لەمە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: عەممار قسەی بە پێغەمبەر(ﷺ) وتبوو باسی بتەکانیشی بە چاکە کردبوون، پاشان سکاڵای هێنا بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازیان لێ نەهێنام هەتا قسەم بە تۆیش وتو باسی بتەکانیشم بە چاکە کردن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چۆن دڵی خۆت دەبینی؟) عەممار وتی: دڵنیام لە باوەڕی خۆم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر گەڕانەوە تۆیش بگەڕێرەوە سەر قسەی خۆت) لەسەر ئەوە ئەم ئایەتە هاتەخوار کە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ﴾. لەبەر ئەوە زانایان یەکڕان لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسێك ناچار کرا کوفر بکات، دروستە کوفر بکات بۆ پاراستنی گیانی خۆی. وە دەشتوانێت نەیکات، وەك چۆن بیلالی حەبەشی کوفری نەکردو بە گوێی نەکردن،

---

[1] النحل (١٠٦).

[2] الطبري (١٧/٣٠٤).

[3] الطبري (١٧/٣٠٤).

[4] الطبري (١٧/٣٠٤).

ئەوەی لە توانایاندا بوو پێیان کرد هەتا ئەوەبوو بەردی گەورەیان خستە سەر سنگی لە ڕۆژی زۆر گەرمدا، داوایان لێ کرد حاشا بکات لە خواناسیو واز بێنێت لە ئاینەکەی، بەڵام ئەو هەر بەگوێی نەدەکردن، دەیوت: (أحد أحد) سوێندی دەخوارد ئەگەر وتەیەکی ترم بزانیایە لەم وتەیە زیاتر تورەی بکردنیایە پێم دەوتن،حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاریش، کاتێك کە موسەیلەمەی درۆزن پێی وت: ئایا شایەتی دەدەی کە موحەمەد پێغەمبەری خودایە؟ حەبیب دەیوت بەڵێ، وتی: ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟ حەبیب دەیوت گوێم لێ نیە، بەردەوام پل پل گۆشتی لێ دەبڕی ئەو هەر ڕاوەستاو بوو لەسەر بڕوای خۆی. چاکترو باشتر وایە کە موسڵمان ڕاوەستاو بێت لەسەر ئاینی خۆی، بائەو خۆڕاگرییەشی بێتە هۆی کوشتنی، وەك ئیبنو عەساکر لە ژیاننامەی عەبدوڵای کوڕی حوزافەی سەهمیدا باسی کردووە کە یەکێك بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ڕۆمەکان دیلیان کردبوو، هێنایان بۆ لای پاشاکەیان، پێی وت: ببە بە گاور دەتکەمە هاوکاری خۆم لە دەسەڵاتداو کچەکەی خۆمت لێ مارە دەکەم، عەبدوڵا وتی: ئەگەر گشت سامانەکەی خۆتو ئەوەیش کە هەموو عەرەب هەیانە پێم بدەی بۆ ئەوەی پەشیمان ببمەوە لە ئاینی موحەمەد(ﷺ) چاوتروکانێك شتی وا ناکەم، پاشای ڕۆم وتی: کەوایە دەتکوژم، عەبدوڵا وتی: ئارەزووی خۆتە بمکوژە. فەرمانی دا هەڵیانواسیو فەرمانی دا بە تیرئەندازەکان تیر بهاوێژن بە لای قاچو دەستیدا، پاشان داوای لێ دەکرد کە ببێتە گاور ئەویش ڕازی نەدەبوو، پاشان فەرمانی دا دایگرن و فەرمانی دا قازانێك بێنن،قازانگەکەیان گەرم کردو دیلێکی موسڵمانیان هێنا هاویشتیانە ناو قازانەکەو عەبدوڵا سەیری دەکرد هەتا بووە کۆمەڵێك ئێسك، لەو کاتەدا داوای لێ کرد کە ببێتە گاور، گفتی نەدا، فەرمانی دا ئەویش بخەنە ناوی، بە بەکرەیەك بەرزیان کردەوە هەتا بیخەنە ناوی عەبدوڵا گریا، ئومێدیان پەیدا کرد پێی کە ببێتە گاور، بۆیە وازیان لێ هێنا. وتی: بۆیە گریام چونکە من تەنها گیانێکم هەیە، تەنها ساتێك لەبەر خودا دەخرێتە ئەو قازانگە، حەزم دەکرد بە ژمارەی ئەو موانەی بە لاشەمەوەیە گیان بووایە ئەم جەزرەبەیە بدرایە لەبەر ڕەزامەندی خودا، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە چەند ڕۆژێك بەندی کردو خواردنو خواردنەوەی لێ قەدەغە کرد، پاشان ئارەقو گۆشتی بەرازی بۆ نارد، نزیکی نەکەوتەوە، پاشان ناردی بە شوێنیدا، پێی وت: چی بووە ڕێگرت نەیخۆی؟ وتی: خۆ ئەوە بۆ من حەلاڵ بوو؟ بەڵام من نەمویست تۆ بەوە قسەت سوار بێت بەسەرمداو قسەم پێ بڵێیی، پاشان پێی وت: سەرم ماچ بکە ئازادت دەکەم، وتی: هەموو دیلی موسڵمانانم لەگەڵ ئازاد دەکەی؟ وتی: بەڵێ، سەری ماچ کردو ئازادی کردو هەموو دیلە موسڵمانەکانیشی لەگەڵ ئازاد کرد کە لای بوو، کاتێك کە گەڕایەوە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای

خوای لێ بێت) وتی: پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك سەری عەبدوڵای کوڕی حوزافە ماچ بکات، من یەکەم کەسم ماچی دەکەم، هەڵساو سەری ماچ کرد (ڕەزای خوایان لێ بێت).[1]

﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾ ۞ يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾

**چاوپۆشی لە کەسی ناچارە کرێت بەو مەرجەی لە پاش ئەوناچارکردنە کاری چاکەدەست بداتێ**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ واتە: پاشان پەروەردگارت بۆ ئەوانەی دوای ئەو تاقیکردنەوە سەختانە زێدی خۆیان بەجێهێشتو غەزایان کردو خۆڕاگر بوون، پەروەردگارت دوای ئەمانە دیارە لەمانە دەبوورێتو دلۆڤانە. ئەمانەیش کۆمەڵێکی ترن کە ژێردەستە بوون لە ناو مەککەداو سووکایەتیان پێکرا لەناو هۆزەکەیانداو زۆر جەزرەبەیان دان هەتا لە ناچاریدا بە قسەی بتپەرستەکانیان کرد. پاشان بۆیان لوا کە خۆیان دەربازکەنو کۆچیان کردو زێدو سامانو کەسو کاریان بەجێهێشت لەبەر خاتری ڕەزامەندیو لێبوردنی خودا خۆیان گەیاندە ناو موسڵمانانو دەستیان دایە غەزاکردن دژی خوانەناسانو زۆر خۆڕاگر بوون، خوای گەورە هەواڵیان دەداتێ کە پاش ئەو تاقیکردنەوەیەی کە توشیان هات، لەسەر ئەو کارەی کردیان، کە بە قسەی خوانەناسیان کرد، خوای گەورە لێبوردەو دلۆڤانە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆیان، لەو ڕۆژەدا کە هەموو کەسێك هەر خەمی خۆی دەخواتو دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا هەر کەسێك هەر تەنها کێشەی خۆیەتیو هەر کەس بە پێی کردەوەی خۆی پاداشتی تەواو وەردەگرێتو هیچ ناهەقیان لێ ناکرێت. واتە: لەو ڕۆژەدا کەس خەمی کەس ناخوات، نە بابو نە کوڕو نە براو نە خێزان هەر کەسەو خەمی خۆیەتی، هەر کەسە پاداشتی کرداری خۆی وەردەگرێتو لە چاکەی کەم نابێتەوەو خراپەیشی بۆ زیاد ناکرێتو بە ئەندازەی پێستی ناوکە خورمایەك ناهەقیان لێ ناکرێت.

---

[1] ئەم بەسەرهاتە (الحافظ) (حافیظ ئیبن حەجەر)لەکتێبی(الاصابە:ت:٤٦٦٤ )دا۔ بە کورتی هێناویەتی وداویەتەپاڵ ئیمامی بەیهەقی...

﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَاقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾﴾

**نموونەیەك كەمەبەست پێی خەڵكی مەككەیە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً﴾ واتە: خودا شارێكی بە نموونە هێناوەتەوە كە زۆر هێمن‌و بێوەی بوون، ئەمە نموونەیەكە مەبەست پێی خەڵكی مەككەیە، كە زۆر ئارام‌و هێمن بوو، خەڵكی لە دەوریان لە زێدی خۆیان دەركران، هەر كەسێك بچووایەتە ناو مەككە پارێزراو دەبوو لە هیچ شتێك ترسی نەبوو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا﴾[1] واتە: ئەڵێن: ئەگەر لەگەڵ تۆ بین‌و پەیڕەوی ئاینەكەی تۆ بین، لە زێدی خۆمان دەرمان دەكەن، ئایا ئێمە لە شوێنێكی هێمندا دامان نەناون، كە هەموو جۆرە بەروبوومێك كۆدەكرێتەوەو دەنێردرێت بۆ ئەوێ واتە مەككە، ئەو بژێویەش هەر لە ئێمەوەیە، بەڵام زۆربەیان نازانن، هەر بەو شێوەیەش لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿یاتیهارِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ﴾ واتە: لە هەموو لایەكەوە ڕۆزیان بە زۆری بۆ دەهات، كەچی لە هەموو چاكەیەی كە خودا دەربارەی كردن حاشایان كرد لە بەهرەكانی خودا، مەزنترین بەهرەیەك كە خوا پێیدابوون ڕەوانەكردنی موحەمەد بوو (ﷺ) بۆیان، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾[2] واتە: ئایا نەتدی ئەوانەی ناشوكریان لە بەرامبەر چاكەی خوادا كردووەو گەلی خۆیان زۆر بەرەو هەڵدێر برد، لە جەهەنەمدا هەڵدەچۆقێن‌و پیسترین شوێنیان هەیە، بۆیە خوای گەورە ئەو ژیانە باشەی گۆڕین بەو ژیانە خراپەو دەفەرمووێت: ﴿فَأَذَاقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ﴾ لە باتی ئەو كارەی كە دەیانكرد خودا بەرگی برسیەتی‌و ترسی كردە كاڵای باڵایان، پاش ئەوەی كە لە هەموو لایەكەوە هەموو جۆرە بەروبوومێكیان بۆ دەهات بە لێشاو، بەڵام كاتێك دەستیان دایە لاساری بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) هەر دژی دەوەستان‌و وشێنی نەدەكەوتن، پێغەمبەری

---

[1] القصص (٥٧).

[2] ابراهيم (٢٨_٢٩).

خوا (ﷺ) نزای لێ کردن کە توشی قاتوقڕی ببن وەك حەوت ساڵەکەی یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) تووشی ئەو قاتوقڕیە بوون، هەرچیان بوو لە دەستیان چوو هیچ نەما، وایان لێهات کە ئەو توکی وشترەیان دەخوارد کە تێکەڵاوی خوێنەکەی دەبوو لە کاتی سەربڕیندا، دەفەرمووێت: ﴿وَٱلْخَوْفِ﴾ ئەوانە ئەو هێمنیەی خۆیانە گۆڕی بە ترس،کە پێغەمبەری خواو(ﷺ) هاوەڵەکانی کۆچیان کرد بۆ مەدینە بوونە خاوەنی دەسەڵاتو لەشکرو سوپاو ئەوانیش ئەو هەمووماڵوێرانیو سەرشۆڕیەیان لە مەککەدا بەسەرداهات، هەتا خوای گەورە مەککەی ڕزگار کرد بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەوەیش کە تووشیان بوو بە هۆی خراپیو ستەمکاری و بڕوا نەهێنانیان بوو بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە خوای گەورە ڕەوانەی کرد بۆیانو کردیە منەتێك بەسەریانەوە وەك دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾[1] واتە: بێگومان خودا چاکەو منەتی خۆی نا بەسەر باوەڕداراندا کە یەکێکی هەر لە خۆیان ناردووە پێغەمبەریان بێت، وە دەفەرمووێت: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا﴾[2] واتە: لە خودا بترسن ئەی خاوەن ئاوەزان، ئەوانەی خاوەن باوەڕن، ئەوا خودا قورئانی بۆ ناردوونەتەخوارو پێغەمبەرێکیشی بۆ ناردوون، وە دەفەرمووێت: ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ﴾[3] وەك چۆن پێغەمبەرێکمان لە خۆتان ناردە لاتان، نیشانەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندنەوەو بە پاکی ڕاتان دەهێنێتو فێرتان دەکات لە کتێبو لە کارامەیی سەرتان دەرچێت. وەك چۆن بە پێچەوانەوە بۆ خوانەناسان بوو بە ترس و بووە کاڵای باڵایان دوای هێمنی، پاش تێریو ڕۆژی زۆر تووشی برسیەتی هاتن، خوای گەورە ژیانی خاوەن باوەڕانی گۆڕی دوای ترس تووشی هێمنی کردنو بژێوێکی زۆری ڕشت بەسەریاندا پاش نەبوونیو هەژاریو کردنیە سەرۆكو خاوەن دەسەڵاتو پێشەواو کاربەدەستی خەڵکیو ئەمە ئەو قسەیە بوو کە وتمان کە ئەم نموونەیە نموونەیەکە بۆ خەڵکی مەککە.ئەم قسەیە

[1] ال عمران (١٦٤).
[2] الطلاق (١٠ـ١١).
[3] البقرة (١٥١ـ١٥٢).

عەوفی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە.[1] موجاهیدو قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وای بۆچوون، مالیکیش گێڕاویەتیەوە لە زوهریەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).[2]

﴿ فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ۖ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ ﴾

**فەرماندان بە خواردنی ڕۆزی حەلاڵو شوکرانەبژێریو ڕوونکردنەوەی شتە حەرامەکانیش**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ لەو بژێویەی خوا پێی داون بخۆن، حەلاڵو زەلاڵەو هەر شوکرانەبژێری بەهرەکانی خوا بن ئەگەر هەر ئەو دەپەرستن خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی کە ڕۆزی حەلاڵو پاك بخۆنو سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو بەهرانەی کە پێی بەخشیون، چونکە ئەو خاوەن بەهرەیەی کە ئەو هەموو ڕۆزیەی بەخشیوە بە بەندەکانی شایەنی پەرستنە بە تەنهاو نابێت شەریکی بۆ دابنرێت، پاشان خوای گەورە باس لە ئەو شتانە دەکات کە حەرامی کردووە لێیانو زیانی زۆرە بۆیان لە دنیاو لە قیامەتدا،وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ ﴾ واتە:بە خوا تەنها هەر لە خوێنو بەرازو مردارەوە بوودا پارێزی بۆ داناون ، ﴿وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ﴾ هەرچیش ناوی جگە لە خوای لێ دێنن، لەگەڵ ئەوەیشدا ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾کێش ناچار بوو،هەرئەوەندەبخوا تێری بکات وئیتر دەستدرێژی نەکات، بێگومان خودا لە گوناه دەبوورێتو دلۆڤانە. پاشان خوای گەورە موسڵمانان ئاگادار دەکاتەوەو ڕەوشتی بتپەرستانی لێ قەدەغەکردوون کە بە ئارەزووی خۆیان شت حەلاڵ دەکەنو حەرامیشی دەکەن بە درۆوە زمانیان هەڵدەسوڕێنو ناوێکی لێ دەنێن بە کەیفی خۆیان وەك (بەحیرەو سائیبەو وەسیلەو حام)و چەندەها ناوی تری لەمانە، کە کردبوویان بە بەرنامەو خۆیان دروستیان کردبوو لە سەردەمی نەفامیدا، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ

---

[1] الطبري (٣٠٩/١٧).

[2] الطبري (٣١٠/١٧).

ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ بە درۆ زماتان بامەدەن وبڵێن: ئەمە ڕەواو ئەمە ناڕەوایە، هەر بۆ ئەوە بە دەم خواوە درۆ هەڵبەستن، ئەم ئایەتە گشت ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە خۆیانەوە شتێك حەڵاڵ دەکەن کە هیچ بەڵگەیەکی شەرعیان بە دەستەوە نیە، بە مەیلی خۆیان شتێك حەڵاڵ دەکەن خوا حەرامی کردووە، یان شتێك حەرام دەکەن کە خوا حەڵاڵی کردووە یان خوا چاوپۆشی لە شتێك کردووە ڕێی پێداوە ئەوان حەرامی دەکەن بە هەواو ئارەزووی خۆیانو درۆ بە دەم خواوە دەکەن، خودایش هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ﴾ ئەو کەسانەی درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستن ڕزگار نابن، نە لە دنیاو نە لە ڕۆژی دوایدا، لە دنیادا ژیانو ڕابواردنێکی زۆر کەم ئەگوزەرێننو دوایی دێت، لە ڕۆژی دوایشدا سزای بە ژانیان هەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿نُمَتِّعُهُمۡ قَلِيلٗا ثُمَّ نَضۡطَرُّهُمۡ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٖ﴾[1] واتە: وا دەکەین کەمێك ڕابوێرن، پاشان بەناچاری وبێویستی ئەوان بەرەو ئازاری جەهەنەمیان ڕادەکێشن، وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ﴾[2] واتە: ئەو کەسانەی درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستن ڕزگار نابن، ڕابواردنێکی کەمە لە دنیاداو لە دوایدا دەگەڕێنەوە لامان، لە پاش ئەوە، لە سزای ئەوەی کە حاشایان کرد بە توندی ئازاریان دەدەین.

﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُۖ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾﴾

### قەدەغەکردنی هەندێ لەو شتانەی کە حەڵاڵ کرابوو بۆ جوولەکەکان

خوای گەورە باسی ئەو شتانەی کرد کە حەرام کرا لەسەرمان وەك خواردنی گۆشتی بەرازو خوێنو ئەو شتانەی ناوی غەیری خوای لەسەر ببرێت، بەڵام لە کاتی ناچاریدا ڕێگای پێداوە (ئەمەیش ئاسانکارییەك بوو خوای گەورە لەگەڵ ئەم ئومەتەدا کردی لەکاتی ناچاربووندا،کەخوای گەورە مەبەستێتی ئاسانکاری بۆ بکات وناڕەحەتی ناوێت بۆی،جا) دێتە سەر باسی جوولەکە کە ئەو شتانەیش لە پێش قەدەغەکردنو هەڵوەشاندنەوەیدا حەرام نەکرابوو لەسەریان، ئەوەندەیش تووشی

---

[1] لقمان (٢٤).

[2] یونس (٦٩ـ٧٠).

تەنگانەو ناڕەحەتی و هەژاریو کوتو زنجیر نەبووبوون وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: بۆ ئەوانەی جوولەکەیشن، ئەو قەدەغانەمان داناوە کە لە پێشدا بۆ تۆمان باسکرد، یان لە سورەتی (الانعام)دا: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾[1] واتە: ئێمە گیانەوەرێکی نینۆك دارو بەزو پیوی (مەڕو ڕەشەوڵاغمان- گاوو مانگامان-) حەرام کرد لەوانەی بوونە موسایی ، مەگین پیوێك کە لەسەر پشتی ئەو دووانە بەجێ مابێت، یان ئەو پیوەی لەگەڵ ڕێخۆڵەکانیاندایە، یان ئەو پیوەی تێکەڵاوی پێستە بووە، بۆیە ئەو سزایەمان دان چونکە ستەمکار بوونو لە ڕێگەی ئێمە دەردەچوون، بێگومان ئێمە ڕاست ئەڵێین. بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئێمە هیچ کاتێك ناهەقیمان بەوان نەکرد،بەڵکو ئەوان ناهەقیان لە خۆیان دەکرد. وەك ئەم ئایەتە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾[2] واتە: بەو ناهەقیەی جوولەکەکان کردیانو زۆر کەسیان لە ڕێگەی خودا لادا، لەو شتانەی کە بۆیان حەلاڵ کرابوو، بێبەشمان کردن، پاشان خوای گەورە باسی منەتو ڕێزی خۆی دەکات سەبارەت بە خاوەنباوەڕە تاوانبارەکان کە هەر کاتێك پەشیمان ببنەوە ئەوە خودا تەوبەیان لێ وەردەگرێت، دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ﴾ واتە: ئەوانەی لە نەزانین خراپە ڕوویداوە لێیان لە پاشان پەشیمان دەبنەوە، هەندێ لە زانایانی پێشینە دەڵێن: هەر کەسێك بێفەرمانی خودا بکات ئەوە نەفامە، ﴿ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓاْ﴾ واتە: دوورکەوتەوە لەو گوناهانەی کە دەیکردو ڕووی کردە خواناسی، ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: پەروەردگارت (پاش ئەمانە) لێبوردەو دلۆڤانە.

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾﴾

---

[1] الانعام (١٤٦).

[2] النساء (١٦).

**باسی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەرو هەڵبژاردەو پێشەوای یەکخواپەرستان و باوکی پێغەمبەران – ئیبراهیم– دەکات(سەلامی خوای لێبێت)کە بەرکەناری کردووە لە بت پەرستان و لە گاوری و جوولەکەیی دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا ﴾ واتە: ئیبراهیم پێشەوایەکی یەکخواپەرست و بەرفەرمان بووە، مەبەست بە (الأمة) واتە: ئەو پێشەوایەی کە چاوی لێ دەکرێت. (القانت): واتە: گەردنکەچ و گوێڕایەڵ. (الحنیف): واتە:بەمەبەست خۆی لابدات لە بتپەرستی و بڕوات بەرەو یەکخواپەرستی. بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ لە ڕیزی ئەوانەدا نەبوو کە شەریك بۆ خوا دادەنێن. موجاهید دەڵێن: مانای ﴿أُمَّةً﴾ یانی: ئیبراهیم خۆی بەتەنیا ئومەتێك بووە، ﴿ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ چاکەی خوای لەبەر چاو بوو، خودایش بۆ خۆی هەڵیبژاردو شارەزای ڕێگەی ڕاستی کرد، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾[1] واتە: ئەو ئیبراهیمەی کە ئەرکی خۆی بە تەواوی بەجێ هێنا، ﴿ٱجْتَبَىٰهُ﴾واتە: هەڵیبژارد، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴾[2] واتە: لەمەوپێش (ئیبراهیم)مان لە کارەکان شارەزا کرد هەمیشە لێی بە ئاگا بووین، ﴿وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ شارەزای ڕێگەی ڕاستی کرد کە خوا پەرستیە بە تەنهاو بەو شێوەیەی کە خوا خۆی پێی خۆشە، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ لە دنیادا بەهرەمان دایە، واتە خێروبێری دنیامان ڕشت بەسەریدا لەوەی کە خاوەن باوەڕ پێویستی پێیەتی بۆ بەسەربردنی ژیانێکی خۆش. ﴿وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ لەو دنیاش لە پیاو چاکانە، موجاهید لەمانای ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً﴾ یانی: لە دنیادا بە چاکە ناوی دەبرێت.. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ پاشان بە تۆمان ڕاگەیاند کە شوێنی ئاینی ئیبراهیمی یەکخواپەرست بکەوە، ئەو وەك ئەوانە نەبوو کە شەریك بۆ خوا دادەنێن، لەبەر مەزنی و ڕێکوپێکی و ڕاستی ڕێگەو دڵسۆزی لە یەکخواپەرستیدا، ئێمە تۆمان ئاگادار کرد ئەی دواین پێغەمبەرو گەورەی هەموو پێغەمبەران موحەمەد (ﷺ)! پەیڕەوی ئاینی ئیبراهیم بکەو بەرکەنار

---

[1] النجم (٣٧).

[2] الانبياء (٥١).

بە لە بتپەرستی و بە دڵ بەرەو یەکخواپەرستی برۆ، وەك خوای گەورە لە سورەتی (الانعام)دا دەفەرموویت: ﴿قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾[1] واتە: تۆ بڵێ ئەی موحەمەد (ﷺ) پەروەردگاری من خستوومیەتە سەر ڕاستەڕێگەیەك، کە بریتی یە لە دینێك هەر پایەدارئەبێت: دینی ئەو ئیبراهیمەی کە لە ناهەق لایداوەو یەکخواپەرستەو هەرگیز شەریکی بۆ خوا دانەناوە پاش ئەمە خوا ڕەخنە لەهەڵس و کەوتی جوولەکە ئەگرێت و ئەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ ۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾﴾

**دانانی شەممە بۆ جوولەکە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ ۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ ڕێزگرتن لە ڕۆژی شەممە بۆ ئەوانە بڕیار درا کە کێشەیان لەسەر دەکرد، پەروەردگارت ڕۆژی قیامەت بەو کێشە ڕادەگات کە لەناو ئەواندا ڕوویدا، بێگومان خوای گەورە بۆ هەموو گەلێك ڕۆژێکی داناوە لە هەفتەدا تا خەڵکی کۆببنەوە تێیدا بۆ عیبادەتکردن، بۆ ئەم ئومەتەیش ڕۆژی هەینی داناوە، چونکە ڕۆژی هەینی ڕۆژی (شەممە) کە خوای گەورە سازاندنی بوونەوەری تێدا تەواو کردو هەموو شتێکی تێدا داناو بەهرەکانی خۆی بەخشی بە بەندەکانی خۆی،ئەڵێن: خودا ئەم ڕۆژەی دا بە نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)بەلاَم ئەوان گۆڕیانو ڕۆژی شەممەیان هەڵبژارد، کە ئەو ڕۆژەیە خودا هیچ شتێکی تێدا دروست نەکردووە لە دروستکراوەکانی، کە لە ڕۆژی هەینیدا گشت شتەکانی تێدا تەواو کرد، لەبەرئەوە خوای گەورە پابەندی کردن بە ڕۆژی شەممەوەو لە ئاینی تەوراتدا ئامۆژگاری کردن کە توند بیگرنو پابەند بن پێیەوەو پارێزگاری لێ بکەنو فەرمانیشی پێدان کە پەیڕەوی موحەمەد (ﷺ) بکەن کاتێك ڕەوانەی ئەکات، پەیمانو بەڵێنی لێوەرگرتن لەسەرئەمە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا جُعِلَ السَّبْتُ عَلَى الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ موجاهید دەڵێت: پەیڕەویان لەشەممەکردو وازیان لە هەینی هێنا.[2] پاشان بەردەوام پابەند بوون پێیەوە هەتا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەمی نارد (سەلامی خوای لێ بێت) شەممەی گۆڕی بۆیان بە یەك شەممە،ئەشوترێت: عیسا وازی لە هیچ برگەیەکی شەریعەتی موسا نەهێناوە، هەندێ لەو حوکمانە نەبێت کە نەسخ کرانەوە، بەردەوام بووە لەسەر ڕێزگرتنی ڕۆژی

[1] الانعام (١٦١).

[2] الطبري (١٧/٣٢٠).

شەممە و پابەند بووە پێیەوە تا ئەو کاتەی بەرز کراوەتەوە بۆئاسمان، گاورەکان دوای عیسا (سەلامی خوای لێ بێت)و لە زەمانی قوستەنتیندا گۆڕیویانە بۆ ڕۆژی یەك شەممە، بۆ ئەوەی خۆیان جیا بکەنەوەلە جوولەکەکان هەروەهالە نوێژکردنیشدا ڕوویان گۆڕی بەرەو ڕۆژهەڵاتی گومەزی(الصخرة) (والله أعلم) وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە بیستوویەتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە لە دنیادا دوایەمین میللەتین،بەلام لە قیامەتدا لە پێش هەموومیللەتانەوەین، ئەوەندە هەیە ئەوان لە پێش ئێمەدا کتێبیان بۆ نێردراوە، ئەم ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە لەسەریان فەرز کراوکەچی ئەوان ناکۆکیان تێدادرووست بوو،بەلام خوا ڕێگەی نیشانی ئێمەدا بۆ ئەو ڕۆژە، هەموو خەڵکی لەڕێزگرتنی ڕۆژانی هەفتەلە دوای ئێمەوەن، جوولەکە سبەینێیان هەیە، گاوریش دوو سبەی).[1] ئەمە قسەی بوخاریە، دیسان لە ئەبو هورەیرەو حوزەیفەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت)ڕیوایەت کراوەکە دەڵێن: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خودا ڕۆژی هەینی ون کرد لەسەر ئەوانەی پێشوومان، جوولەکە ڕۆژی شەممەیان هەبوو، نەساراکانیش ڕۆژی یەك شەممەیان هەبوو، خودا ئێمەی هێناو ڕێی نیشان داین بۆ ڕۆژی هەینی، وای لێ هات ڕێزی ڕۆژانی هەفتە بوو بە ڕۆژی هەینیو شەممەو یەك شەممە، هەر بەو شێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی بە دوای ئێمەوەن، ئێمە لە دنیادا دواکەوتووین لە قیامەتدا لە پێشەوەین، لە پێش خەڵکی داوەری لە نێوانماندا دەکرێت)[2]. موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾

### فەرماندان بەوەی بانگەواز بە دانایی و ئامۆژگاری چاك بکرێت

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەر(ﷺ) ودەفەرمووێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾ بە کارزانیو ئامۆژگاری پەسەند، مەردم بەرەو ڕێگەی پەروەردگارت بانگ بکەو بە چاکترین شێوە لەگەڵیاندا بدوێ، ئیبنو جەریر دەڵێت:یانی لەژێر ڕۆشنای ئەوەی ڕەوانەکراوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لە قورئانو لە سوننەت، ﴿وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ﴾ واتە: بە چاکترین شێوە ئەوەی لە قورئاندا نێردراوە بۆیان ڕوون بکەرەوە لە مزگێنیو هەڕەشەو ئەو بەسەرهاتانەی کە

---

[1] فتح الباري (١١/٥٢٦)، مسلم (٢/٥٨٦).

[2] مسلم (٢/٥٨٦).

بەسەر خەڵكیدا هاتووە.[1] وە بیریان بێنەوە هەتا لە تۆڵەو سزای خودا بترسن، ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾ ئەوانەی دەیانەوێ ڕووبەڕوو قسەت لەگەڵدا بكەن بە چاكترین شێوە لەگەڵیان بدوێو نەرمو نیانو ڕووخۆش بە لەگەڵیاندا، وەك لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ﴾[2] واتە: ئەگەر لەگەڵ ئەهلی كتێب كەوتنە وتووێژەوە، بەوپەڕی نەرمو نیانی قسەیان لەگەڵ بكەن، لەگەڵ ئەوانەدا نەبێت كە ناهەقیان كردووە، خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەر(ﷺ) كە نەرمو نیان بێت لەگەڵیان وەك فەرمانی دا بە موساو هارون (سەلامی خوایان لێ بێت) كاتێك كە ڕەوانەی كردن بۆ لای فیرعەون كە نەرمو نیان بن لەگەڵی وەك دەفەرموێت: ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ﴾[3] واتە: بە نەرمو نیانی قسەی لەگەڵدا بكەن، بەڵكو بیر بكاتەوە، یان بترسێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ﴾ پەروەردگارت لەو كەسانەی لە ڕێگەی ئەو لایان داوە، (لە گشت كەس) ئاگادارترەو هەر خۆیشی باشتر دەزانێت كێ لەسەر ڕاستە ڕێیە، واتە: خوا خۆی دەزانێ كێ لەوانە بەدبەختەو كێش بەختەوەرە لە لای خۆی نووسراوەو لێ بووەتەوە لێی، تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) هەر ئەوەت لەسەرە بانگیان بكەی بۆ ڕێگەی خودا، خەم مەخۆو دڵگران مەبە بۆ ئەوانەی كە لە ڕێگە لایانداوە، ئەركی سەر شانی تۆ نیە ئەمانە بخەیتە سەر ڕێ، تۆ تەنها ترسێنەرێكیو گەیاندنت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە، وەك دەفەرموێت: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ﴾[4] واتە: لەسەر تۆ نیە (ئەی موحەمەد (ﷺ)) ڕێنموونیو موسڵمان كردنی خەڵكی بەڵكو خوا هەر كەسێكی بوێ هیدایەتی دەدات، وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ﴾[5] تۆ ناتوانی كەسێك كە خۆت خۆشت بوێ شارەزای بكەی.

---

[1] الطبري (١٧/٣٢١).

[2] العنكبوت (٤٦).

[3] طه (٤٤).

[4] البقرة (٢٧٢).

[5] القصص (٥٦).

﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ١٢٦ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ١٢٧ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ١٢٨﴾

**فەرماندان بەڕچاوکردنی یەکسانی لەکاتی تۆڵەسەندنەوەدا**

خوای گەورە فەرمان دەکات بە دادپەروەری لە تۆڵەسەندندا لەکاتی وەرگرتنەوەی هەقدا، وەك عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو سیرینەوە کە لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ﴾فەرموویەتی واتە: ئەگەر تۆڵە دەسێننەوە با بەرامبەر بێتو زیاتر نەبێت، دەڵێت: ئەگەر پیاوێك شتێکی لێسەندن ئێوەیش هەر وەك ئەوە لێی بسێننەوە.[1] موجاهیدو ئیبراهیمو حەسەنی بەسریو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2] ئیبنو جەریریش ئەم ڕایە بە لایەوە پەسەندە. ئیبنو زەید دەڵێت: فەرمان کرا بە خاوەن باوەڕان کە چاوپۆشیان هەبێت بەرامبەر بتپەرستان، ئەوەبوو هەندێ پیاوی عەشرەتدارو خاوەندەسەلات موسڵمان بوون،ئەیانووت: ئەگەر خودا ئیزنی بدانیایە تۆڵەی خۆمانمان لە ئەو سەگانەئەکردەوە،ئەوەبوو ئەم ئایەتە هاتەخوارو پاشان بە جیهادکردن نەسخ بووەوە.[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ١٢٦ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ﴾ خۆ ئەگەر خۆڕاگریش بیت ئەوخۆڕاگرییە بۆ خۆڕاگران باشترە، خۆڕاگر بە، دیارە خۆڕاگرتنیشت هەر بە خودایە، ئەمە خۆی بۆخۆی جەخت کردنە لەسەر خۆڕاگری، هەواڵیشە بەوەی کە خۆڕاگریش بە دەست نایەت تەنها بە یارمەتی ویستو تواناو دەسەلاتی خوا نەبێت، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: خەمیان بۆ مەخۆ، لەسەر ئەو دژایەتییەی لەگەڵت دەکەن، ئەوە بڕیاری خودایە، ﴿وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ﴾ لەو گزیو فێڵانەیش دڵتەنگ مەبە کە دەیکەن، خۆیان ماندوو دەکەن لە دژایەتیو ئازار پێگەیاندنت، تۆ خوات بەسەو یارمەتی دەرو پشتیوانتە، سەرت دەخاتو زاڵت دەکات بەسەریاندا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ﴾ بێگومان خوا لەگەڵ خۆپارێزانو چاکەکارانە، بە پشتگیری کردنو یارمەتیدانو کۆمەکو ڕێگە نیشاندان، بەمە دەڵێن (لەگەڵ بوونی تایبەتی)، وەك دەفەرمووێت: ﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ

---

[1] عبدالرزاق (٣٦١/٢).

[2] الطبري (١٧/٥٢٥،٥٢٤).

[3] الطبري (١٧/٣٢٤).

أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾[1] واتە: خوا فریشتەی تێگەیاند کە خۆشم لەگەڵ ئێوەدام، غیرەت وەبەر خاوەن باوەڕان بێنن. وە دەفەرموویت بە موساو هارون: ﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴾[2] واتە: ترستان نەبێت من لەگەڵ ئێوەمو دەبیستمو چاویشم لێیە، پێغەمبەریش (ﷺ) کاتێك لە ئەشکەوتەکەدا بوو فەرمووی: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾ (التوبة: ٤٠).[3] واتە: مەترسە خوامان لەگەڵە، بەڵام (لەگەڵ بوونی گشتی) بە بیستنو بینینو زانیاری بوونە وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموویت: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾[4] واتە: لە هەر کوێ بن خوالەگەڵتانەو خوا کردەوەکانتان دەبینێت، وە دەفەرموویت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟﴾[5] واتە: ئایا تۆ نەتزانیووە هەر شتێك لە ئاسمانو زەوی بێت خوا دەیزانێت؟ هەتا سێ کەس بەیەکەوە چپە بکەن، دیارە ئەو چوارەمیانە، پێنج بن ئەو شەشەمیانە، کەمتر بنو زیاتریش بن لە هەر کوێ بن هەمیشە لەگەڵیانە. وە دەفەرموویت: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا ﴾[6] واتە: تۆ لە هەر حاڵێکدا بیو هەرچی لە قورئان بخوێنی، هەر کارێك ئێوە بیکەن ئێمە لێتان ئاگادارین. ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ﴾ واتە: ئەوانەی خۆیان لە قەدەغەکراوەکان ئەپارێزن، ﴿وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە گوێڕایەڵی خوایان ئەکەن، خودا پارێزگاریان لێ دەکاتو یارمەتیان دەداتوپشت و پەنایانەو سەریان دەخات بەسەر دوژمنە ناحەزەکانیاندا.

---

[1] الانفال (١٢).

[2] طه (٤٦).

[3] فتح الباري (١١/٧).

[4] الحديد (٤).

[5] المجادلة (٧).

[6] يونس (٦١).

## تەفسیری سورەتی(الاسراء)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزو گەورەیی سورەتی(الاسراء)

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە(ڕەزای خوای لێبێت) لەبارەی سورەتی بەنی ئیسرائیل(الاسراء)و کەهفو مەریەمەوە دەڵێت: ئەمانە لەعیتاقی ئەوەڵن و لەو سورەتانەن کەسەرەتا خەڵك فێریاندەبێت[1]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەندە بە ڕۆژو دەبوو، دەمانوت: نایەوێت بیشکێنێت، ئەوەندەیش بە ڕۆژو نەدەبوو، دەمان وت: نایەوێت ڕۆژو بگرێت و هەموو شەوێکیش سورەتی بەنی ئیسرائیلو زومەری دەخوێند[2].

﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ۝١﴾

### باسو ڕوونکردنەوەی(الاسراء)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ واتە: پاکیو بێعەیبی بۆکەسێك لەشەوێکدا شەوڕەوی بەبەندەی خۆی کرد، لە(مسجد الحرام)ەوە بۆ(مسجد الاقصی، مزگەوتی ئەولاتر) ئەو مزگەوتەی ئێمە پیتو بەرەکەتمان داوە بە دەوروبەرەکەی، لەبەر ئەوەی کە هەندێك بەڵگەی خۆمانی پیشان بدەین، هەر خۆی بیسەرو بینایە، خوای گەورە باسی پاكو بێ عەیبی خۆی دەکات لەسەر ئەو توانا مەزنەی کە ئەو نەبێت هیچ کەسێك ئەو توانایەی نیە، هیچ خودایەك نیە غەیری ئەو، پەروەردگاریش هەر ئەوە، ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ﴾ واتە: پاکیو بێ عەیبی بۆ ئەو خودایەی لە شەوێکدا شەوڕەوی کرد بە بەندەی خۆی موحەمەد(ﷺ) لە(مسجد الحرام)ەوە کە کەعبەی پیرۆزە بۆ(مسجد الاقصی) کە ماڵە پیرۆزەکەیە(بیت المقدس) کە لە ئیلیایە کە لانەی پێغەمبەران بووە لە سەردەمی ئیبراهیمی خەلیلەوە(سەلامی خوای لێبێت) هەربۆیەخوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی کۆکردەوە لەوێدا بۆ پێغەمبەر موحەمەد(ﷺ) و لە شوێنو ماڵی خۆیاندا و ئەوزاتەش پێش نوێژی بۆکردن، ئەوەخۆی نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە پێشەوای گەورە و سەردار بریتییە لە پێغەمبەر(سلاوی

---

[1] ارشاد الساری(٩/١٩٨)، وەرگێڕ: واتە لەو سورەتانەی کە زۆر لە پێشدا هاتوونەتە خوارەوە، لە ڕیزبەندیدا لە پێشەوە نووسراون، عەرەبەکان بە شتێك زۆر چاك بێت لە چاکیدا کەم وێنە بێت پێی دەڵێن:(عتیق).

[2] احمد(٦/١٨٩)،سەنەدەکانی حەسەنەو پیاوەکانی جێی متمانەن.

خوا لە پێغەمبەرو هەموو پێغەمبەرانبێت) پاشان دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ﴾ واتە: ئێمە پیتو بەرەکەتمان خستە دەوروبەرەکەی، بۆ ئەوەی هەندێ نیشانەی خۆمان پیشانی موحەمەد(ﷺ) بدەین لە نیشانە گەورەکان، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾[1] واتە: دیارە زۆریش لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینیوە، بەو زووانە ئەو شتانە کە چاوی پێی کەوتووەو لە فەرموودەدا هاتووە باس دەکەین، لە دواییدا خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ واتە: بێگومان خودا بیسەرو بینایە، هەموو ئەو قسانە دەبیستێت کە خاوەن باوەڕانو خوانەناسان دەیکەن، چاوی لەبڕوادارو بێباوەڕە، پاداشتی هەموویان دەداتەوە، هەر کەسە بە پێی خۆی لە دنیاو لە دوارۆژدا.

## باسی ئەو فەرموودانەی لە بارەی شەو ڕەوی یەوە هاتوون

### ڕیوایەتی ئەنەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێبێت)

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(بوراقم بۆ هێنرا، بوراق ولاغێکی سپیو درێژە لە نێوانی گوێدرێژو ئێستردایە لە گەورەییدا، چاوی تاکوێ بڕبکات سمی لەوێ دادەنێ. سواری بووم تا چوومە(بیت المقدس) بوراقەکەم بەستەوە بەو حەڵقەیەی کە پێغەمبەران حەیوانی پێوە دەبەستنەوە، لە دواییدا چوومە ناو مزگەوتەکەوە دوو ڕەکات نوێژم تیاکرد. پاشان هاتمە دەرێ، جوبرەئیل(سەلامی خوای لێبێت) هات پیاڵەیەك عەرەقو پیاڵەیەك شیری بۆ هێنام، شیرەکەم هەڵبژارد، جوبرەئیل وتی: سروشتی پاکت هەڵبژارد، پاشان فەرمووی: سەرخراین بۆ ئاسمان. جوبرەئیل(سەلامی خوای لێبێت) وتی: دەرگاکەم لێبکەنەوە، وتیان: تۆ کێی؟ وتی: جوبرەئیلم، وتیان: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ) وتیان: پەیامی بۆنێرراوە؟ وتی: پەیامی بۆ نێرراوە. دەرگامان لێ کرایەوە، گەیشتین بە ئادەم(سەلامی خوای لێبێت) سڵاوی لێکردم، دوعای خێری بۆ کردم، (ئیتر بەم شێوەیە سەرکەوتن بۆ هەموو ئاسمانەکان لە هەموو ئاسمانێك ئەم پرسیارو وەڵامەیان لێ دەکرا. پێویست ناکات لێرەدا ئەو وەرگێڕانە گەشت جارێك دووبارە بکەینەوە)[2]، لە ئاسمانی دووهەمدا گەیشتم بە عیسا کە پورزای یەکتری بوون(سەلامی خوایان لێبێت) لە ئاسمانی سێهەمدا یوسف پێغەمبەری لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت) نیوەی جوانی دروست کراوەکانی پێدرابوو، لە ئاسمانی چوارەمدا ئیدریس پێغەمبەری لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت) لە ئاسمانی پێنجەمدا هارونی لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت) لە ئاسمانی شەشەمدا موسا پێغەمبەری لێبوو

---

[1] النجم(١٨).

[2] وەرگێڕ.

(سەلامی خوای لێبێت) لە ئاسمانی حەوتەمدا ئیبراهیم پێغەمبەری لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت) پاڵی دابووەوە بە(بیت المعمور)ەوە،(بیت المعمور) هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناویەوەو جارێکی تر ناچنەوە ناوی. پاشان جوبرەئیل بردمی بۆ (سدرةالمنتهی) کە درەختێك بوو گەڵاکانی وەك گوێچکەی فیل وابوو وە بەرەکەشی وە ك (کونه)وابوو! کاتێك کە لە لای خوداوە شتێکی هات بەسەرداو دایپۆشی ئەوەندە جوان بوو هیچ کەسێك نیە لە دروستکراوەکان خودا بتوانێت وەسفی جوانی بکات، فەرمووی: جاخوای گەورەئەوەی ویستی ناردیە سەرم و پێی ڕاگەیاندم، پەنجا نوێژی لەسەر فەرز کردم لە هەموو ڕۆژو شەوێکدا، هاتمە خوارێ لای موسا(سەلامی خوای لێبێت) پرسی: خوا چی لەسەر ئومەتەکەت فەرز کرد؟ وتم: پەنجا نوێژ، وتی: بگەڕێرەوەبۆلای پەروەردگارت داوای لێبکە کە لەسەریان سووك بکات ئومەتی تۆ توانای ئەوەیان نیە، من نەوەی ئیسرائیلم زۆر تاقیکردووەتەوە، ئەفەرموێ: گەڕامەوە: وتم: ئەی پەروەردگارم ئەرك لەسەرئومەتەکە سووك بکە. پێنج نوێژی لەسەر سووك کردن، گەڕامەوە بۆ لای موسا(سەلامی خوای لێبێت) هەواڵم دایە، وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سووك کردنی لێبکە، ئیتر بەم شێوەیە لە نێوان خوای گەورەو موسادا(سەلامی خوای لێبێت) هاتوچۆم کرد، پێنج پێنج لەسەری لادەبردم، هەتا خوای گەورە فەرمووی: ئەی موحەمەد(ﷺ) پێنج نوێژە لە هەموو ڕۆژو شەوێکدا هەر نوێژێ بە دە نوێژ دەژمێردرێت، ئەوە پەنجا نوێژ ئەکات، هەر کەسێك نیەتی شتێکی چاك بکات و نەیکات چاکەیەکی بۆ دەنووسم، ئەگەر کردی دە چاکەی بۆ دەنووسم، هەر کەسێك نیەتی خراپەیەك بکاتو نەیکات هیچی لەسەر نانووسم، ئەگەر کردی تەنیاگوناهێکی لەسەر دەنووسم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: هاتمە خوارەوە هەتا چوومە لای موسا(سەلامی خوای لێبێت) هەواڵم دایە، وتی: بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت داوای سووك کردنی لێبکە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(ئەوەندە هاتوچۆی پەروەردگارم کرد، شەرم گرتمی).[1] موسلیمیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[2]

ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) بوراقی بۆ هات لەو شەوەی شەوڕەوی پێکرا، زینو ڕەشۆ کرابوو بۆ ئەوەی سواری ببێت، بوراق بە لایەوە گران بوو، جوبرەئیل پێی وت: چی وات لێ دەکات تا وا بکەی؟ سوێند بە خودا هەرگیز هیچ کەسێك سوارت نەبووە لە لای خودا بەڕێزتر بێت لەم پێغەمبەرە(ﷺ)، بوراق ئارەقێکی زۆری کردلەتەریقیدا، تیرمزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: فەرموودەیەکی غەریبە(غريب).[3] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە دەڵێت:

---

[1] احمد(١٤٨/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم(١٤٥/١). ئەم فەرموودەیە بەدرێژی مەلاڕەشیدی بابان وەری گێڕاوە لە(إقتران السيرين)دا(وەرگێڕ).

[3] الترمذي(٣١٣١)، فەرموودەیەکی غەریبە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(کاتێك بەرزکرامەوەبۆلای پەروەردگاری مەزنم، ڕۆیشتم بەلای کۆمەڵێکدا نینۆکەکانیان لەمس بۆکرابوو، دەم‌و چاوو سنگیان پێ دەڕنی‌و بریندار دەکرد، وتم: ئەمانە کێن ئەی جوبرەئیل؟ وتی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن‌و باسی ناموسی خەڵکی دەکەن).[1] ئەبو داودیش ئەم فەرموودەیەی هێناوە.[2] دیسان ڕیوایەت کراوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(ئەو شەوەی کە شەو ڕەویم پێکرا، ڕۆیشتم بە لای موسادا(سەلامی خوایان لێبێت) لە گۆڕەکەیدا وەستابوو بە پێوە نوێژی دەکرد).[3] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە[4].

**ڕیوایەتی ئەنەسی کوڕی مالیك لە مالیکی کوڕی سەعسەعەوە**

ئەنەسی کوڕی مالیك ڕیوایەتی کردووە لە مالیکی کوڕی سەعسەعەوە(ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی شەوی میعراجی بۆ دەکردن، فەرمووی: (لە(حەتیمدا) پێدەچێت –قەتادە وتبێتی لەحیجردا– ڕاکشابووم، یەکێك هات وبەو کەسەی ووت کەلەناوەڕاستی سێ کەسەکەیرتردا دانیشتبوو: وەرەپێشەوە، ئەویش هات و نێوان ئێرەو ئەوێمی شەق کرد، قەتادە دەڵێت: جاروودم لە تەنیشتەوە بوو، لێم پرسی، مەبەستی ئەنەس، یا مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) لەمە کە فەرموویەتی لە نێوان ئێرەم تا ئەوێم چیە؟ ئەنەس وتی: لە سپیایی ملیەوە تا مووی سەرسنکی، لەوەش دڵنیام کەووتی: لەنزیکی گوێچکەیەوە تاموی سەرسنگی، فەرمووی:(دڵی دەرهێنام تەشتێکی زێڕینی پڕ لە ئیمان و پڕ لەحیکمەتم بۆ هێنرا، دڵم شورا و پڕ کرا لە ئیمان‌و لە کارزانی، لە دوایدا خستیەوە جێی خۆی، پاشان وڵاغێکیان بۆ هێنام لە ئێستر بچووکترو لە گوێدرێژ گەورەترو ڕەنگی سپی بوو، چاوی تاکوێ بڕی دەکرد سمی لەوێ دادەنا، جاروود لە ئەنەسی پرسی: ئەو وڵاغە بوراق بوو؟ ئەنەس وتی: بەڵێ، فەرمووی:(سواری ئەو وڵاخەکرام، جوبرەئیل(سەلامی خواین لێبێت) بردمی تا ئاسمانی دنیا، وتی: دەرگاکەم لێبکەنەوە، پرسیان: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، پرسیان: نێردراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، وتیان: سڵاوی لێبێت، چ هاتنێکی باشە هاتنەکەی ئەو. دەرگاوان(خازین) هات دەرگاکەی کردەوە بۆمان، کە گەیشتمە ئەوێ، ئادەم پێغەمبەری لێ بوو، جوبرەئیل وتی: ئەمە ئادەمی پێغەمبەری باوکتە سڵاوی لێبکە، سەلامم لێکردو سڵاوی سەندەوە، فەرمووی: سڵاو لە کوڕێکی چاك‌و پێغەمبەرێکی چاك، پاشان سەرکەوت، هەتا چووە ئاسمانی دووەم، وتی: دەرگاکەم لێبکەنەوە، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبەرئیلە، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: نێراوە

---

[1] احمد(٣/٢٢٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] ابو داود(٤٨٧٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] احمد(٣/١٢٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم(٣٣٧٥).

بە شوێنیدا. وتی: بەڵێ. وتیان: سڵاوی لێبێت، چ میوانێکی چاکە ئەمەی هاتووە، فەرمووی: دەرگاکەی کردەوە بۆمان، کە گەیشتمە ئەوێ عیساو یەحیای لێ بوو، کە پورزای یەك بوون، وتی: ئەمە عیسایەو یەحیایە سڵامیان لێبکە، فەرمووی: منیش سڵاوم لێکردن، ئەوانیش وەڵامی سڵاوەکەیان دایەوە، پاشان وتیان: سڵاو لە برای چاكو پێغەمبەری چاك، پاشان سەرکەوت هەتا چووە ئاسمانی سێیەم وتی: دەرگاکەم لێبکەنەوە، پێی وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبرەئیلە، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: نێراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ: وترا: سڵاوی لێبێت چ هاتنێکی چاکە هاتنەکەی ئەو، وتی: دەرگاکەی کردەوە بۆمان. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، یوسف پێغەمبەری لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت)، وتی: ئەمە یوسفە، دەڵێت: سڵاوم لێکردو سڵاوەکەی سەندەوە پاشان وتی: سڵاو لە برای چاكو پێغەمبەری چاك، پاشان سەرکەوت هەتا چووە ئاسمانی چوارەم، وتی: دەرگاکەم لێبکەنەوە، پێی وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبرەئیلە، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: نێراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ: وترا: سڵاوی لێبێت چ هاتنێکی چاکە هاتنەکەی ئەو، وتی: دەرگاکەی کردەوە بۆمان. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، ئیدریس پێغەمبەری لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت) وتی: ئەوە ئیدریسە، دەڵێت: سڵاوم لێکرد وەڵامی دایەوە، پاشان وتی: سڵاو لە برای چاكو پێغەمبەری چاك، وتی: پاشان سەرکەوت هەتا چووە ئاسمانی پێنجەم داوای کرد دەرگاکە بکەنەوە، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبرەئیلە، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: نێراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ: وترا: سڵاوی لێبێت چ هاتنێکی چاکە هاتنەکەی ئەو، وتی: دەرگاکەی کردەوە بۆمان. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، هارونی لێبوو(سەلامی خوای لێبێت) وتی: ئەمە هارونە، سڵاوی لێبکە، سڵاوم لێکرد، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، پاشان وتی: سڵاو لە برای چاكو پێغەمبەری چاك، دەڵێت: پاشان سەرکەوت هەتا چووە ئاسمانی شەشەم، داوای کرد دەرگاکە بکەنەوە، پێی وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبرەئیلە، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: نێراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ: وترا: سڵاوی لێبێت چ هاتنێکی چاکە هاتنەکەی ئەو، وتی: دەرگاکەی کردەوە بۆمان. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، موسای لێ بوو(سەلامی خوای لێبێت) یان گەیشتم بە موسا(سەلامی خوای لێبێت) وتی: ئەوە موسایە، سڵاوی لێبکە، سڵاوم لێکرد، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، پاشان وتی: سڵاو لە برای چاكو پێغەمبەری چاك، دەڵێت: کاتێك لێی تێپەڕیم گریا، پێیان وت: چی دەتگریێنێت؟ وتی: بۆ ئەوە دەگریم لاوێك ڕەوانە کراوە دوای من کەژمارەیەکی زۆرتری ئومەتەکەی زیاتر لە ئومەتەکەی من دەچنە بەهەشتەوە، دەڵێت: پاشان سەرکەوت هەتا گەیشتە ئاسمانی حەوتەم، داوایکرد دەرگاکەبکەنەوە، وترا: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبرەئیلە، وترا: کێت لەگەڵە؟ وتی: موحەمەد(ﷺ)، وترا: نێراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ: وترا: سڵاوی لێبێت چ هاتنێکی چاکە هاتنەکەی ئەو، وتی: دەرگاکەی کردەوە بۆمان. کاتێك گەیشتمە

ئەویش ئیبراهیمی لێبوو(سەلامی خوای لێبێت) وتی: ئەوە ئیبراهیمە، سڵاوی لێبکە، ئەڵێ: سڵاوم لێکرد، وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، پاشان وتی: سڵاو لە کوڕێکی چاکو پێغەمبەرێکی چاك، دەڵێت: بەرزکرامەوە بۆ(سدرة المنتهى) بەری ئەو درەختە وەك کونەی کۆچەریان وابوو، گەڵاکەشی وەك گوێی فیل وابوو، ئەڵێ: ئەمە(سدرة المنتهى)یە، سەیرمکرد چوار ڕووباری تێدا دەهاتە دەرەوە، دوو ڕووباریان لە ناوەوە بوو دوو ڕووباریشیان لە دەرەوە بوو، وتم: ئەی جوبرەئیل ئەم ڕووبارانە چین؟ وتی: دوو ڕووبارەکەی ناوەوە دوو ڕووبارن لە بەهەشتدا، دوو ڕووبارەکەی دەرەوەش نیلو فوراتە، پاشان(بیت المعمور)م بۆ دەرخرا، (قەتادە دەڵێت: حەسەن بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە(بیت المعمور)ی بینی، هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچوونە ناوی جارێکی تر نەدەگەڕانەوە ناوی) پاشان گەڕایەوە بۆ فەرموودەکەی ئەنەس‌و فەرمووی: (پاشان پیاڵەیەك ئارەق‌و پیاڵەیەك شیرو قاپێك هەنگوینیان بۆ هێنام، فەرمووی: شیرەکەم وەرگرت، وتی: ئەمە ئەو سروشتەیە(الفطرة) کە تۆو ئومەتەکەتی لەسەرن، فەرمووی: پاشان پەنجا نوێژم لەسەر فەرز کرا لەهەموو ڕۆژێکدا، فەرمووی: هاتمە خوارەوە هەتا گەیشتمە لای موسا، وتی: پەروەردگارت چی لەسەر ئومەتەکەت فەرز کردووە؟ دەڵێت: وتم: هەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژ، وتی: بە ڕاستی ئومەتەکەت توانای پەنجا نوێژیان نیە، من لە پێش تۆدا خەڵکم تاقی کردووەتەوە، زۆر هەوڵم داوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلدا، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێبکە بۆ ئومەتەکەت، وتی: گەڕامەوەو دە نوێژی بۆ لابردم، دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای موسا، وتی: فەرمانت بە چی پێکرا؟ وتم: فەرمانم بە چل نوێژ پێکرا لەهەموو ڕۆژێکدا، وتی: ئومەتەکەت توانای چل نوێژیان نیە هەموو ڕۆژێك، من خەڵکم تاقی کردووەتەوە، زۆر هەوڵم داوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێبکە بۆ ئومەتەکەت، دەڵێت: گەڕامەوەو دە نوێژی تری لەسەر لابردم، گەڕامەوە بۆ لای موسا، وتی: فەرمانت بە چی پێکرا؟ وتم: فەرمانم بە سی نوێژ پێکرا، وتی: ئومەتەکەت توانای سی نوێژیان نیە لەهەموو ڕۆژێکدا، من خەڵکم لە پێش تۆوە تاقیکردووەتەوە، زۆر هەوڵم داوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلدا، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێبکە بۆ ئومەتەکەت، دەڵێت: گەڕامەوەو دە نوێژی تری لەسەر لابردم، گەڕامەوە بۆ لای موسا، وتی: فەرمانت بە چی پێکرا؟ وتم: فەرمانم بە بیست نوێژ پێکرا لەهەموو ڕۆژێکدا، وتی: ئومەتەکەت توانای بیست نوێژیان نیە لەهەموو ڕۆژێکدا، من لە پێش تۆوە خەڵکم تاقی کردووەتەوە، زۆر هەوڵم داوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێبکە بۆ ئومەتەکەت، دەڵێت: گەڕامەوەو دە نوێژی تری لەسەر لابردم گەڕامەوە بۆ لای موسا، وتی: فەرمانت بە چی پێکرا؟ وتم: فەرمانم بە دە نوێژ پێکرا لەهەموو ڕۆژێکدا، وتی: ئومەتەکەت توانای چل نوێژیان نیە هەموو ڕۆژێك، من خەڵکم تاقی

کردووەتەوە لە پێش تۆدا، زۆر هەوڵم داوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێبکە بۆ ئومەتەکەت، دەڵێت: گەڕامەوە فەرمانم پێکرا بە پێنج نوێژ هەموو ڕۆژێك، گەڕامەوە بۆ لای موسا، وتی: فەرمانت بە چی پێکرا؟ وتم: فەرمانم بە پێنج نوێژ پێکرا لە هەموو ڕۆژێکدا، وتی: ئومەتەکەت توانای پێنج نوێژی نیەهەموو ڕۆژێك، من خەڵکم تاقی کردووەتەوە، زۆر هەوڵم داوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل، بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگارت داوای سووککردنی لێبکە بۆ ئومەتەکەت، دەڵێت: وتم: ئەوەندە داوام کردووە لە پەروەروەرندەم شەرم دەمگرێت، بەوە ڕازی دەبم، خۆم تەسلیمی فەرمانی خودا دەکەم، کە لە لای موسا دەرچووم بانگ کەرێك بانگی کردم: من فەرزەکانی خۆم مۆرکردو سووکیشم کرد لەسەر بەندەکانم).[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا هەر بەم شێوەیە هاتووە[2].

**ڕیوایەتی ئەنەس لە ئەبو زەڕڕەوە**

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: ئەبو زەڕ ئەڵێ: کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرمووێ: (سەقفی خانووەکەمان شەقی برد من لە مەککە بووم، جوبرەئیل(سەلامی خوای لێبێت) لەوێوە هاتە خوارو سنگی شەق کردم، لە دواییدا بە ئاوی زەمزەم شۆردی لە پاشان تەشتێکی زێڕینی هێنا پڕ بوو کارزانیو ئیمان، کردیە ناو سنگمەوە، لە دواییدا سنگی هێمانەوە یەك، پاشان دەستی گرتمو بردمی بۆ ئاسمانی دنیا، کە هاتمە ئاسمانی دنیا، جوبرەئیل بە دەرگاوانی ئاسمانی وت: دەرگامان لێبکەرەوە، دەرگاوانەکە وتی: ئەوە کێیە؟ وتی: جوبرەئیلم، وتی: هیچ کەست لەگەڵە؟ وتی: بەڵێ، موحەمەد(ﷺ)م لەگەڵە، دەرگاوانەکە وتی: نێردراوە بە شوێنیدا؟ وتی: بەڵێ، کە دەرگاکە کرایەوە چوینە ئاسمانی دنیاوە پیاوێك دانیشتبوو هەندێ کەس لە لای ڕاستیەوە بوو هەندێکی تریش لە لای چەپیەوە بوو، کە تەماشای لای ڕاستی کرد پێدەکەنی، کە تەماشای لای چەپی دەکرد دەگریا، فەرمووی: سڵاو لە پێغەمبەرێکی چاكو کوڕێکی چاکم، بە جوبرەئیلم وت: ئەم پیاوە کێیە؟ وتی: ئەوە ئادەم(سەلامی خوای لێبێت) ئەوانەی لای ڕاستو چەپیەوە گیانی نەوەی ئەون، ئەوانەی لای ڕاست ئەهلی بەهەشتن، ئەوانەی لای چەپی ئەهلی جەهەنەمن، کە تەماشای لای ڕاستی دەکات پێدەکەنێتو تەماشای لای چەپی دەکات دەگریێت، پاشان جوبرەئیل سەری خستم بۆ ئاسمانی دووەم: بە دەرگاوانەکەی وت: دەرگاکەمان لێبکەرەوە، دەرگاوانی ئاسمانی یەکەم چ قسەیەکی لەگەڵ جوبرەئیلدا کرد ئەمیش کردی، دەرگاکەمان لێ کرایەوە)، ئەنەس دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) لە ئاسمانەکاندا ئیدریسو موساو عیساو ئیبراهیمی بینی(سەلامی خوایان لێبێت) شوێنەکانیانی لە چ ئاسمانێك یبنی

---

[1] احمد(٢٠٨/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري(٣٤٦/٦)، مسلم(١٥١/١).

باسی نەکرد، تەنها باسی ئەوەی کرد کە ئادەمی لە ئاسمانی یەکەم بینیووە، ئیبراهیمی لە ئاسمانی شەشەمدا بینیووە، ئەنەس دەڵێت: کاتێك کە جوبرەئیلو پێغەمبەر(ﷺ) بە لای ئیدریسدا ڕۆیشتن، ئیدریس وتی: سڵاو لە پێغەمبەرێکی چاکو برایەکی چاك، پێغەمبەر(ﷺ) لە جوبرەئیلی پرسی: ئەمە کێیە؟ وتی: ئیدریسە(سەلامی خوای لێبێت)، پاشان ڕۆیشت بە لای موسادا، وتی: سڵاو لە پێغەمبەرێکی چاکو برایەکی چاك، وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: ئەمە موسایە، پاشان بە لای عیسادا ڕۆیشتم، وتی: سڵاو لە پێغەمبەرێکی چاکو برایەکی چاك، وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: ئەمە عیسایە، پاشان بە لای ئیبراهیمدا ڕۆیشتم، وتی: سڵاو لە پێغەمبەرێکی چاکو کوڕێکی چاك، وتم: ئەمە کێیە؟ وتی: ئەمە ئیبراهیمە، زوهریی دەڵێت: ئیبنو حەزم هەواڵی داومەتیٚ کە ئیبنو عەباسو ئەبو حەببەی ئەنساری وتیان: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (پاشان بردمیانە شوێنێکی بەرز لەوێدا گوێم لە کیڕەی قەڵەمی فریشتەکان بوو کە بڕیارەکانی خوایان دەنووسی)، ئیبنو حەزمو ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێن: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە شەوو ڕۆژی پەنجا نوێی لەسەر ئومەتەکەم فەرز کرد، بەو فەرمانەوە گەڕامەوە تا بە لای موسادا تێپەڕیم، وتی: خوا چی لەسەر ئومەتەکەت فەرز کرد؟ وتم: پەنجا نوێژی فەرز کرد، موسا وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت ئومەتی تۆ توانای ئەوەیان نیە، گەڕامەوە بەشێکی لیٚ لابرا، گەڕامەوە بۆ لای موساو پێم وت: هەندێکی تری لابرا، وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت ئومەتی تۆ توانای ئەوەیان نیە، گەڕامەوە بۆ لای، خوای گەورە فەرمووی: ئەوە پێنج نوێژە بە پەنجا نوێژ هەژمار(حیساب) دەکرێت، بەڵێنی من گۆڕانی بەسەردا نایەت، پاشان گەڕامە بۆ لای موسا وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت، وتی: من ئیتر شەرم ئەکەم لە خودای خۆم، پاشان بردمیان بۆ(سدرة المنتهى) ڕەنگێکی زۆر داپۆشیبوو، نەمدەزانی چیە؟ لە دوایدا برامە بەهەشتەوە، پەت و گوریسی مرواری تێدابوو، کە دیم خۆڵەکەی میسك بوو، ئەمە قسەی بوخاریە لە (كتاب الصلاة)دا، وە لە باسی نەوەی ئیسرائیلیشدا ڕیوایەتی کردووە، لە حەج و لە(أحاديث الأنبياء)یشدا لە ڕێگای ترەوە لە یونسەوە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە، موسلیمیش لە سەحیحەکەیدا لە (كتاب الأيمان)دا بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[1] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی شەقیقەوە دەڵێت: بە ئەبو زەڕم وت: ئەگەر پێغەمبەری خوام بدیایە لێم دەپرسی، وتی: چیت لیٚ دەپرسی؟ دەڵێت: لێم دەپرسی خوات بینیوە؟ ئەبوزەڕ وتی: دەی من پرسیم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا پەروەردگارت بینیووە؟ فەرمووی: نوورێکم بینی، لەچۆن دەبینریٚ؟ ئابەم شێوەیە لە ڕیوایەتی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە[2]. موسلیمیش هێناویەتی لە

---

[1] فتح الباري(١/٥٤٧/٣/٥٧٦)/٦/٤٣١)، مسلم(١/١٤٨).

[2] احمد(٥/١٤٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

سەحیحەکەیدا لە عەبدوڵای کوڕی شەقیقەوە، ئەویش لە ئەبوزەڕەوە دەڵێت: پرسیم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا پەروەردگارت بینیووە؟ فەرمووی: خوا نورێکە کەچۆن دەیبینم؟[1] عبدالله ی کوڕی شەقیق ڕیوایەت کراوە کە دەڵێت: بە ئەبو زەڕم وت: لە چ شتێك تۆ پرسیارت لێدەکرد؟ وتی: من لێم دەپرسی ئایا پەروەردگارت بینیوە؟ ئەبو زەڕ وتی: من پرسیارم لێکرد، فەرمووی:(نورێکم بینی)[2].

## ڕیوایەتی جابیری کوڕی عەبدولا( ڕەزای خوای لێبێت )

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵاوە ئەڵێ: کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ی بیستووە فەرموویەتی: (کاتێك کە قورەیش بڕوایان پێ نەئەکردم کە شەوڕەویم پێکراوە بۆ (بیت المقدس) لەحیجردا ڕوەستام و خودا(بیت المقدس)ی پیشاندام و بۆ ئەڕوانی و نیشانەکانیم پێ دەگوتن)[3]. بوخاری‌و موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە لە چەند ڕێگاوە.[4] بەیهەقی(أبو شهاب) ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە دەڵێت: خەڵکی پاش ئیسرا سەریان لێ تێکچوو چەند کەسێکیان هاتنەلای ئەبوبەکرپێیان وت: لەوەیشدا بڕوا بە هاوەڵەکەت دەکەیت کە دەڵێت لەشەوێکدا چووە بۆ(بیت المقدس)و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ مەککە، ئەبو بەکر دەڵێت: ئایا ئەو قسەی کردووە؟ وتیان: بەڵێ، ئەبوبەکر وتی: من شایەتی دەدەم ئەگەر ئەو ئەوەی وتبێت ڕاستی کردووە، وتیان: بڕوای پێدەکەی کە بچێتە شام لە شەوێکداو پاشان بگەڕێتەوە بۆ مەککە پێش ئەوەی ڕۆژی لێ ببێتەوە؟ وتی: بەڵێ من بڕوای پێ دەکەم لەشتی لەوە گەورەتریشدا بڕوای پێئەکەم، هێنانی هەواڵی ئاسماندا، ئەبو سەلەمە وتی لەبەر ئەوە ناونرا بە زۆر ڕاستگۆ(الصدیق)[5].

## ڕیوایەتی عەبدوڵای کوڕی عەبباس( ڕەزای خوای لێبێت )

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: ئەو شەوەی کە شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە بەهەشت لە لایەکی بەهەشتەوە گوێی لە دەنگێکی هێواش بوو فەرمووی: ئەی جوبرەئیل ئەمە چیە؟ وتی: ئەوە بیلالی بانگ بێژە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك هات بۆ ناو خەڵکی فەرمووی:(بیلال ڕزگاری بووە ئەوەو ئەوەم پێوە بینی)، فەرمووی: گەیشت بە موسا(سەلامی خوای لێبێت) خۆشحاڵی دەربڕی بۆی و وتی: سڵاو لەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە، فەرمووی: ئەو پیاوێکی گەنم‌ڕەنگ ئەسمەری باڵا بەرز بوو، قژێکی خاوی هەبوو تاسەرگوێی یان لەسەرو گوێیەوە

---

[1] مسلم(١٦١/١).

[2] مسلم(١٦١/١).

[3] احمد(٣٧٧/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] البخاري(٤٧١٠)، مسلم(١٧٠).

[5] دلائل النبوة(٣٥٩/٢).

بوو، فەرمووی: ئەمە کێیە ئەی جوبرەئیل؟ وتی: ئەمە موسایە، دەڵێت: پاشان ڕۆیشتو گەیشت بەپیاوێکی بەتەمەنی باڵابەرزی بە ویقار خۆشحاڵی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەربڕی بۆیو سڵاوی لێکرد، هەموو هەرسڵاویان لێ دەکرد فەرمووی: ئەمە کێیە ئەی جوبرەئیل؟ وتی: ئەمە باوکتە، ئیبراهیم فەرمووی: دوای ئەوە سەیری ئاگری کرد کۆمەڵێکی تێدابوو مردارەوەبوویان دەخوارد، فەرمووی: ئەمانە کێن ئەی جوبرەئیل؟ وتی: ئەمانە ئەو کەسانەن گۆشتی خەڵکی دەخۆن، پیاوێکی بینی زۆر سوورو شین بوو، فەرمووی: ئەمە کێیە ئەی جوبرەئیل؟ وتی: ئەوە ئەو کەسەیە وشترەکەی سەربڕی. دەڵێت: کاتێك کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشتە قودسی پیرۆز(بیت المقدس) هەڵسا نوێژ بکات، هەموو پێغەمبەران نوێژیان لەگەڵدا کرد، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد، دوو پیاڵەیان بۆ هێنا، یەکێکیان لای ڕاستەوەو ئەو پیاڵەکەیان لای چەپەوە، یەکێکیان شیری تێدابوو، ئەوی تریان هەنگوینی تێدابوو، شیرەکەی وەرگرتو لێی خواردەوە. ئەو کەسەی پیاڵەکەی پێ بوو، وتی: سروشتی ئیسلامت هەڵبژارد(أصبت الفطرة).[1] سەنەدەکەی صحیحە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ قودسی پیرۆز، پاشان هەر لەو شەوە هاتەوە، باسی ڕۆیشتنەکەیو نیشانەکانی قودسی پیرۆزو کاروان و قافڵەکەیشیانی بۆ کردن، هەندێ لە خەڵکی وتیان: ئێمە بڕوا بەو قسانەی موحەمەد ناکەین کە دەیڵێت، بۆیە هەڵگەڕانەوەو بوونەوە بە خوانەناس و خودا لەگەڵ ئەبو جەهلدا ملی شکاندن، ئەبو جەهل وتی: موحەمەد بەدرەختی زەقوم(الزقوم) دەمانترسێنێت، ئادەی خورماو کەرەبێنن و بیکەنە زەقنەموت و بابیخۆین، پێغەمبەر(ﷺ)عیساو موساو ئیبراهیم پێغەمبەرو جەجالیشی بە چاوی خۆی بینیووە نەك بە خەو بینین، پرسیار کرا لە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی دەجالەوە، فەرمووی: (بینیم پیاوێکی زلەی ڕەنگ سپی، چاوێکی بەرز بووبووەوە وەك ئەستێرەی دروشاوە وابوو، سەری وەك لقو چڵی درەخت بوو، عیسام بینی(سەلامی خوای لێبێت) لاوێکی ڕەنگ سپی بوو، مووی لول بوو چاوی تیژ بوو، چوارشانە بوو(نە بەرز نە کورت) مسلمیش بینی(سەلامی خوای لێبێت) پیاوێکی گەنم ڕەنگی تێر بوو، مووی سەری زۆر بوو، زۆر بەهێز بوو، سەیری ئیبراهیمم کرد(سەلامی خوای لێبێت) سەیری هیچ کوێم نەدەکرد، مەگەر کە سەیرم دەکرد لە خۆم دەچوو، هەتا دەتوت ئەم هاوەڵەتانە، جوبرەئیل وتی: سڵاو لەباوکت بکە، منیش سڵاوم لێکرد. نەسائیش ڕیوایەتی ئەم فەرموودەیەی کردووە لە فەرموودەکەی ئەبوزەیدەوە کە سابتی کوڕی زەیدەئەویش لە هیلالەوە(کە ئیبنو خەبابە) بەم شێوەیە هێناویەتی[2]. ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی ڕاستە(صحیح)ە.

---

[1] احمد(٢٥٧/١)، پیاوەکانی جێی متمانەن جگە لە قابوس کە لاوازە.

[2] احمد(٣٧٤/١)، النسائي في الكبرى(١١٤٨٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لەئەبولعالیەوە کەدەڵێت: ئامۆزای پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) ئیبنو عەبباس(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو شەوەی شەوڕەویم پێکرا موسای کوڕی عیمرانم بینی پیاوێکی باڵا بەرزی قژ لول بوو وەك یەکێك لە پیاوانی شنوئەت وابوو، عیسای کوڕی مەریەمیشم بینی پیاوێکی چوارشانەو سوورو سپی‌و مووی سەری خاوبوو مالیکی ئاگرەوانم نیشان درا، دەجالیشم نیشان درا، لەگەڵ چەندین ئایەتی تر کە خوا پیشانیدا، جا خوایگەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾[1] واتە: ئینجا گومانت نەبێت(ئەی موحەمەد(ﷺ)) لە گەیشتنت بە موسا(یان گومانت نەبێت لە گەیشتنی تەورات بە موسا). قەتادە وا تەفسیری دەکات کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەیشتووە بە موسا(سەلامی خوای لێبێت) ﴿وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾[2] واتە: خوا موسای کردە ڕێ نیشاندەر بۆ نەوەی ئیسرائیل.[3] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیداو بە کورتیش بوخاری و موسلیم لە قەتادەوە ڕیوایەتیانکردووە[4]. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(کاتێك ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێکرا کەڕۆژم کردەوە لە مەککە زۆرترسام، دەمزانی خەڵکی بڕوام پێناکەن)، جا پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها دوور لە خەڵکی بە خەمباری دانیشتبوو، ئەبو جەهلی دوژمنی خوا بە لایدا تێپەڕی‌و هات لە لایدا دانیشت، وەك گاڵتەپێکردنی وتی: ئایا شتێك ڕوویداوە؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی وت:(بەڵێ) وتی: ئەو شتە چیە؟ فەرمووی:(ئەمشەو من شەوڕەویم پێکراوە) وتی: بۆ کوێ؟ فەرمووی: بۆ (بيت المقدس)، وتی: پاشان بەیانی هاتیتەوە ناومان؟ فەرمووی: (بەڵێ) وتی: ڕای وا نەبوو کەبە درۆی بخاتەوە لە ترسی ئەوەی ئەگەر هۆزەکەی بانگ کرد پەشیمان ببێتەوە لە قسەکەی، بۆیە وتی: ڕت چییەئەگەر هۆزەکەتم بانگ کرد ئایا ئەم قسانەیان بۆ دەکەی کە بۆ منت کرد؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: ئەی خەڵکی بەنی کەعبی کوڕی لوئەی، ئەو خەڵکەی کە دانیشتبوون هەموو هاتن‌و داباڕین بەسەریانداو لە لایاندا دانیشتن، ئەبو جەهل وتی: ئەو قسەی بۆ منت کرد بۆ هۆزەکەیشت باسی بکە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(ئەمشەو من شەوڕەویم پێکرا) وتیان: بۆ کوێ؟ فەرمووی: بۆ (بيت المقدس) وتیان: بەیانیش هاتیتەوە ناومان؟ فەرمووی:(بەڵێ). دەڵێت: هەندێ دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان‌و هەندێکی تریان دایان بەسەریانداو

---

[1] السجدة(٢٣).

[2] السجدة(٢٣).

[3] دلائل النبوة(٢/٣٨٦)، فەرموودەیەکی صەحیحە.

[4] البخاري(٣٢٣٩)، مسلم(١٦٥).

سەریان سوڕما بەحسابی خۆیان لەو درۆیە کە کردی، وتیان: دەتوانی وەسفی ئەو مزگەوتەمان بۆ بکەی؟ چونکە کەسی وایان هەبوو کە ڕۆیشتبوو بۆ ئەو وڵاتەو مزگەوتەکەی بینیبوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(بەردەوام وەسفم بۆ دەکردن هەتا هەندێ لەو سیفەتانەم لێ تێکچوو، فەرمووی مزگەوتەکەم بۆ هێنراو پێشانم درا من وەسفم دەکرد هەتا لەبەردەم ماڵی عەقیلدا(یان عەقال) دانرا. من وەسفم دەکردو سەیرم دەکرد (فەرمووی) لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو وەسفانەم بۆ لەبەر نەکرا، فەرمووی: خەڵکەکە وتیان: سوێند بە خوا ئەو سیفەتانەی ئەو باسی کرد تیایەتیو پێکایو ڕاستی کرد.[1] نەسائیش هێناویەتیو بەیهەقیش ڕیوایەتی کردووە[2].

## ڕیوایەتی عەبدوڵای کوڕی مەسعود( ڕەزای خوای لێبێت)

بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کاتێك کە شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشت هەتا گەیشتە(سدرة المنتهى) کە لە ئاسمانی شەشەمە، ئەوەی لە زەمینەوە ببرێتە لای خوای گەورە تا ئەوێ دەچێتو لەوێوە وەردەگیرێتو دەبرێتە لای، ئەوەی لە سەرەوە بێتە خوارێ تا ئەوێ دێتو لەوێوە وەردەگیرێت و بەش دەکرێت بەسەر ئاسمانەکانو زەویدا، ﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ﴾[3] لە کاتێکدا ئەوەی لە لای(سدرة المنتهى)یە دایپۆشیووە ئەوەی کە دەبێ دایپۆشێت، ئەوەی(سدرة المنتهى) دادەپۆشێت چەندپەپولەیەکی ئاڵتونینە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی لەسەر فەرزکراو دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی(البقرة)یشی پێدرا، مژدەی ئەوەشی درایە کە هەر کەسێك لە ئومەتی ئەگەر شەریك بۆخودا بڕیارنەدات خوای گەورە لە گوناهی گەورەی خۆش دەبێت، موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا، لە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی نومەیر و زوهەیری کوڕی حەربەوە، هەردووکیان لە عەبدوڵای کوڕی نومەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە بەو شێوەیە.

## ڕیوایەتی عومەری کوڕی خەتتاب( ڕەزای خوای لێبێت)

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە کاتێك کە عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ لەجابیەدا بوو، جاباسی ئازادکردنی قودسی پیرۆزی(بیت المقدس) ئەکات و ئەڵێ: ئەبو سەلەمە ئەڵێ: ئەبو سینان لە عوبەیدەی کوڕی ئادەمەوەئەگێڕێتەوە و دەڵێت: بیستم لە عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێبێت) دەیوت بە کەعب کوێ بە باشی دەزانی نوێژی تێدا بکەم؟ وتی: ئەگەر قسەی من وەردەگری لە دوای بەردەکەوە نوێژ دەکەی، ئەو کاتە هەموو قودس ئەکەوێتەپێشەوەت!

---

[1] احمد(٣٠٩/١)، فەرمودەیەکی سەحیحە.

[2] النسائي في الكبرى(١١٢٨٥)، دلائل النبوة(٣٦٣/٢)، سەحیحە.

[3] النجم(١٦).

عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: تۆ وەك جوولەکەکان دەکەی! بەلامنا، من لەو شوێنەدا نوێژ دەکەم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نوێژی تێدا کردووە، چووە پێشەوە ڕووەو قیبلەوەستاو دەستی کرد بەنوێژ کردن، پاشان هاتو بەعەباکەی زبڵو تۆزەکەی پاککردەوەو تەکاندی خەڵکەکەیش شوێنی خۆیانیان پاك کردەوە، بەردەکەی ئەوەندە ڕێز لێ نەنا لە پشتیەوە نوێژ بکات و ڕووی تێبکات، وەك کەعبی ئەحبار ئاماژەی بۆکرد، کەعب لە هۆزێك بوو ڕێزیان لەو بەردە دەگرتو کردبوویانە قیبلەی خۆیان، بەلام خوای گەورە منەتی کرد بەسەریداو موسڵمانیکرد و ڕێگەی هەقی نیشان درا، بۆیە کاتێك ئاماژەی کرد بەو شێوەیە، گەورەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێبێت) وتی: تۆچاو لە جوولەکەکانئەکەی، وەك گاورەکان سوکایەتی نەکرد بەو بەردە کە کردبوویان بە شوێنی زبڵو خاشاك لەبەر ئەوەی قیبلەی جوولەکەکان بووە، بەڵکو هەرچی تۆزو پیسایی پێوە بوو سڕیو بە عەباکەی پاکی کردەوە[1].

**ڕیوایەتی ئەبو هورەیرە( ڕەزای خوای لێبێت )**

بوخاریو موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کەدەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(کاتێك شەوڕەویم پێکرا، گەیشتم بە موسا(سەلامی خوای لێبێت) جادەستیکردەوەسفکردنی و وائەزانم فەرمووی: پیاوێك بوو نە قەڵەو نە لاوازو مووی سەری خاوو داهێنرابوو، وەك پیاوانی گەلی شنۆئە وابوو، وە فەرمووی: گەیشتم بە عیسا(سەلامی خوای لێبێت)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەسفی کرد فەرمووی: پیاوێکی چوارشانەی سووروسپی و ڕوو ئاڵ بوو، وەك لە حەمام هاتبێتە دەرێ وابوو، گەیشتم بە ئیبراهیم(سەلامی خوای لێبێت) من زیاتر لە منداڵەکانی تری لە ئەو دەچووم، دوو جامیان بۆ هێنام، یەکێکیان شیرو ئەوی تریان عەرەق(شەراب)ی تیا بوو، پێیان وتم: ئارەزووت لە کامیان هەیە بیخۆرەوە، شیرەکەم وەرگرتو خواردەمەوە، پێیان وتم: سروشتی ئیسلامەتیو ڕێی ڕاستت هەڵبژاردووە، ئەگەر شەرابەکەت هەڵبژاردایە ئومەتەکەت ڕێیان ون دەکرد،[2] دیسان لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(خۆم وا بینی لە حیجردا بووم قورەیش پرسیاریان لێ دەکردم، لە بارەی چەند شتێکی قودسی پیرۆزەوە چاك سەیرم نەکردبوو هەتا لە یادیان بکرم، ئەوەندە خەفەتبارو دڵتەنگ بووم هەرگیز دڵتەنگی وام بەسەردا نەهاتبوو، فەرمووی خوای گەورە قودسی پیرۆزی بۆبەرز کردمەوە و منیش سەیرم دەکرد، هیچ شتێکیان لێ نەدەپرسیم خەبەریان نەدەمێ، خۆم لەناو کۆمەڵی پێغەمبەراندا بینی، موسا(سەلامی خوای لێبێت) ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد کە سەیرم کرد پیاوێك بوو

---

[1] احمد(١/٣٨)، سەنەدەکانی لاوازە.

[2] فتح الباري(٦/٤٩٣)، مسلم(١/١٥٤).

مووی کەمێك لول بوو وەك پیاوانی شەنۆئە وابوو، هەر لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەمم دی(سەلامی خوای لێبێت) ئیبراهیمیشم بینی(سەلامی خوای لێبێت) لەوێ بوو، ڕاوەستابوو نوێژی دەکرد، ئەوەی زیاتر لە ئیبراهیم بچێت هاوەڵەکەتانە(واتە پێغەمبەر خۆی(ﷺ))، کاتی نوێژ هات پێش نوێژیم بۆ کردن، کە لە نوێژ بوومەوە یەکێك وتی: ئەوە مالیکی خاوەنی ئاگرە سەلامی لێبکە، ئاوڕم دایەوە ئەو لە پێشدا سڵاوی لە من کرد.[1]

## ڕیوایەتی دایکی موسڵمانان عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت)

بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: کاتێك کە شەوڕەوی کرا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ مزگەوتی ئەقسا(مسجد الاقصى) بەیانیەکەی خەڵکی کەوتنە باسکردنی، هەندێ لەو خەڵکەی کە موسڵمان بووبوون و بڕوایان بە پێغەمبەر(ﷺ) هێنابوو پاشگەز بوونەوەو بە پەلە ئەو هەواڵەیان گەیاندە ئەبو بەکر وتیان: ئایا ئاگات لە هاوەڵەکەتە؟ کە دەڵێت: ئەو ئەمشەو شەوڕەوی پێکراوە بۆ قودسی پیرۆز، ئەبو بەکر وتی: ئایا ئەو ئەوەی فەرمووە؟ وتیان: بەڵێ، ئەبو بەکر وتی: ئەگەر ئەو ئەو قسەی کردبێت ڕاستی وتووە، وتیان: بڕوای پێ دەکەی کە ڕۆیشتووە بۆ قودسی پیرۆزو پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە هاتبێتەوە؟ وتی: بەڵێ، من بڕوای بە شتێك پێ دەکەم زۆر لەوە گەورەترە، من بڕوای ئەوەی پێدەکەم لە بەیانیەکدا یان لە ئێوارەیەکدا هەواڵی ئاسمانم ئداتێ! لەبەرئەوەبوو ناونرا ئەبو بەکری صدیق.[2]

## باسی کاتی شەوڕەویەکەی پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەوەش کە بە لاشەو گیانی بووەو لەکاتی بێداریدا بووەو لە کاتی خەوتندا نەبووە

موسای کوڕی عوقبە: لە زوهەریەوە ئەگێڕێتەوە کە شەوڕەویەکە ساڵێك لە پێش کۆچکردندا بووە،[3] عورووەیش هەر وای وتووە.[4] سودی دەڵێت: شانزە مانگ لە پێش کۆچکردن بووە.[5] بێگومان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەوە شەوڕەوی پێکرا بۆ قودسی پیرۆزو لەحاڵەتی بێداریدابوو و لە خەودا نەبووە و سواری بوراق بووە، کاتێك گەیشتە دەرگای مزگەوت لای دەرگاکەدا وڵاغەکەی بەستەوەو چووە ژوورەوە لە قیبلەکەیدا دوو ڕەکەعات نوێژی سڵاوی مزگەوتی(تحية المسجد) کردو پاشان میعراجی بۆهێنرا کە (وەك پلەی پەیژە وابوو پێیدا سەردەکەوت) سەرکەوت بەو میعراجەدا بۆ ئاسمانی

---

[1] مسلم(١٥٦/١)، عن زهير بن حرب.

[2] دلائل النبوة(٣٦٠/٢)، ڕیوایەتێکی لاوازە.

[3] دلائل النبوة(٣٥٥/٢).

[4] دلائل النبوة(٣٥٤/٢).

[5] القرطبي(٢١٠/١٠).

دنیا، پاشان بۆ حەوت ئاسمانەکەی تر، لە هەموو ئاسمانەکاندا دەگەیشت بە کەسە خاوەن ڕێزو پلە بەرزەکانی‌و سڵاوی دەکرد لەو پێغەمبەرانەی کە لەو ئاسمانانەدا بوون، بە پێی پلەو ڕێزیان، هەتا تێپەڕی بە لای موسای کەلیمدا لە ئاسمانی شەشەمداو ئیبراهیمی خەلیل لە حەوتەمدا، پاشان لەئەوان و لەپلەی ئەودوانەش تێپەڕی (سەلامی خوا لە ئەوان و لەهەموو پێغەمبەرانی تریش بێت) تا دەگاتە شوێنێك کە دەنگی قەڵەمەکانی تێدا دەبیسترێت، واتە: واتە قەڵەمەکانی قەدەر بەو شتانەی کە دەبن، (سدرة المنتهى)ی بینی کە فەرمانە گەورەو گرنگەکانی خوای گەورە داپۆشیبوو، بە پەپولەی ئاڵتونی‌و ڕەنگی هەمەجۆرە فریشتەکانیش دەورەی درابوو، لەوێدا جوبرەئیلی بینی لە شێوەی خۆیدا، شەش سەد باڵی هەبوو، چەندین فریشتەی باڵسەوزی بینی کەئاسۆیان داگیر کردبوو، (بيت المعمور)ی بینی و ئیبراهیمی خەلیلی بینی کە کەعبەی پیرۆزی سەر زەمینی دروست کردووە، پاڵی دابووبە(بيت المعمور)ەوە، چونکە(بيت المعمور) کەعبەی ئاسمانە، کە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی خواپەرستی تێدا دەکەن پاشان هەتا ڕۆژی قیامەت ناگەڕێنەوە بۆی، بەهەشت‌و جەهەنەمی بینی، لەوێدا خوای گەورە پەنجا نوێژەکەی لەسەر فەرز کرد، پاشان سووکی کرد بۆ پێنج نوێژ لەبەر سۆزو بەزەیی خۆی بە بەندەکانی، لەمەوە ڕێزو گرنگی نوێژ دەردەکەوێت چەندە گەورەیە. پاشان دابەزی بۆ قودسی پیرۆز و پێغەمبەرانیش دابەزین لەگەڵیدا، کەکاتی نوێژ هات لەناو قودسی پیرۆزدا پێغەمبەر(ﷺ) پێش نوێژی بۆ کردن، لەوە دەچێت نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژە بووبێت، هەندێ کەس وای بۆ دەچن کە ئەو پێش نوێژیەی بۆ پێغەمبەران لە ئاسماندا بۆی کردبن، بەڵام زۆرینەی ڕیوایەتەکان ئەوە دەگەیەنن کە لە قودسی پیرۆزدا بووە، لە هەندێ ڕیوایەتەکاندا دەڵێن ئەو پێش نوێژیە لە سەرەتای چوونیەوە بووە بۆ ناو مزگەوتی(الاقصى) بەڵام ڕوونتر ئەوەیە لە دوای گەڕانەوەی بووبێت بۆ قودسی پیرۆز، چونکە کاتێك کەئەیدا بەلایاندا لە شوێنەکانیاندا پرسیاری لە جوبەرئیل دەکرد لە بارەی هەر پێغەمبەرێکیانەوە، جوبەرئیل باسی دەکردن بۆی، ئەمە گونجاوترە، چونکە یەکەمجار داواکراوە بۆ خزمەت خودای مەزن بۆ وەرگرتنی ئەو ئەرك‌و فەرزانەی کە خودا دەیەوێت بیدا بەسەر خۆی‌و ئومەتەکەیدا، پاشان کە لێ بووەتەوە لەوەی کە بۆی بانگ کراوە، کۆبووەتەوە لەگەڵ پێغەمبەرەکانی برایداو پاشان خوای گەورە ڕێزو مەزنی پێغەمبەری دەرخستوە بۆیان‌و پێشنوێژی بۆ کردوون، ئەمەیش بە ئاماژەیەکی جوبەرئیل بوو کەبۆیکرد لەوبارەیەوە. پاشان لە قودسی پیرۆز دەرچووە و سواری بوراق بووە و گەڕاوەتەوە بۆ مەککە لە تاریکایی شەودا، (خوای پاك‌و بێ عەیبیش باشتر دەزانی) بەڵام هێنانی پیاڵەی شیرو هەنگوین یان شیرو ئارەق یان شیرو ئاو یان هەموویان، ئەمانە لە فەرموودەدا هاتووە کە لە قودسی پیرۆزدا بووە، وە لەفەرمودەی تریشدا هاتووە کە لە ئاسماندا بووە، هەڵدەگرێت لە هەردوولا ڕوبدابێ، چونکە وەك پێشوازی وایە لە میوان (خوا خۆیشی

باش دەزانیَ)، پاشان شەوڕەوی بە گیان‌و لاشەی پێغەمبەر لەحاڵەتی بێداریدا نەك لە خەودا، بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ واتە: پاکی و بێ عەیبی بۆکەسێك لە شەوێکدا شەوڕەوی بە بەندەی خۆی کرد لە(مسجد الحرام)ە وە بۆ(مسجد الاقصی) ئەو مزگەوتەی ئێمە پیت‌و پیرۆزیمان داوە بە دەوروبەرەکەی بەو نیازەی کە هەندێك بەڵگەی خۆمانی پیشان بدەین، هەر خۆی بیسەرو بینایە. تەسبیحات لێرەدا بۆ شتی زۆر گەورەو گرنگە، خۆ ئەگەر لە خەودا بوایە، شتێکی گەورەی وا نەبوو(سبحان الله)ی بۆبکرێت و زۆر بە گرنگیش نەدەگیرا، ئەگەر بە خەو بوایەخوانەناسانی قورەیش بە پەلە بە درۆیان نەدەخستەوەو هەندیَ لەوانەش کەموسڵمان بووبوون پاشگەز نەدەبوونەوە و وتەی (عەبدیش) بریتیە لە گیان‌و لاشە، وەك فەرموویەتی: ﴿أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا﴾ وە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ﴾[1] واتە: ئەو بینینەش کە پێمان نیشاندای بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی بوو، ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئەو بینینە بینینی بە چاو بوو پیشانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)درا لەو شەوەی کە شەوڕەوی پێکرا، ئەو درەختە مەلعونەیش درەختی زەققومە بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[2] خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾[3] واتە: چاوی لیَ کەلا نەکردوەو نەیگوێزتووەتەوەو ڕێشکەو پێشکەی نەکرد. چاو لە بەشەکانی لاشەیە نەك گیان‌و سواری بوراقیش کراوە کە وڵاغێکی سپی بووەو درەوشاوەتەوە ئەمەیش درەوشانەوەی لاشەیە نەك گیان، چونکە گیان پێویست ناکات لە ڕۆیشتندا سواری شتێك ببێت (والله أعلم).

## شتێکی گەورە و بەسوود

حافیز ئەبو نەعیمی ئەسبەهانی لە کتێبی(دلائل النبوة)دا ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەی موحەمەدی کوڕی عومەری واقیدیەوە دەڵێت: مالیکی کوڕی ئەبو ریجال بۆی باس کردم لە عەمری کوڕی عەبدوڵاوە لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەزیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دیحیەی کوڕی خەلیفەی نارد بۆ لای قەیسەر، جا دەستیکردە باسکردنی ڕۆیشتن و چوونەکەی بۆلای، لەناو ئەم باسەدا بەڵگەیەکی مەزن هەیە لەسەر فرەژیری هیرەقل، پاشان هیرەقلَ هەرچی بازرگانی شامە بانگی کردو ناردی بە

---

[1] الاسراء(٦٠).

[2] فتح الباري(٨/٢٥٠).

[3] النجم(١٧).

شوێن ئەبو سوفیان (سەخری کوڕی حەرب) و هاوەڵەکانیدا لە بارەی ئەو پرسیارە مەشهورانەوە لێی پرسین کە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوون وەك لە دواوە باسیان دێت، لەکاتێکدا ئەبوسوفیان دەیویست کارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بێنرخو بچووك بکاتەوە لای هیرەقل، دەڵێت: ئەبو سوفیان ووتی: هیچ شتێك ڕێگەی لێ نەگرتم کە دژی قسە بکەمو لەبەر چاوی هیرەقلی بخەم ئەوە نەبێت پێم ناخۆش بوو درۆیەك بکەم لە لای هیرەقلداو پێم بزانێتو پاشان بڕوای بە هیچ قسەیەکم نەمێنێت. دەڵێت: ئەو قسەیەم بەبیرهاتەوە کە ئەوشەوەی شەوڕەوی پێکرا باسی بکەم بۆی، دەڵێت: وتم: ئەی پاشا هەواڵێکت بدەمێ هەتا بزانی کە ئەم کابرایەدرۆدەکات؟ وتی: ئەو درۆیە کامەیە؟ دەڵێت: وتم: پێمان دەڵێت کە لەسەر زەمینی ئێمەوە لە مەککەوە لە یەك شەودا هاتووە بۆ ئەم مزگەوتەی ئێوە، مزگەوتی ئیلیاء پاشان هەر ئەو شەوە گەڕاوەتەوە لە پێش خۆرهەڵاتندا بۆ لامان، وتی: بطریکی ئیلیا بەڕاسەری قەیسەرەوە بوو، بطریکی ئیلیا وتی: من ئەوشەوەم لە یادە، وتی: قەیسەر سەیری کردو وتی: تۆچۆن بەوە دەزانی؟ وتی: من هیچ شەوێك ناخەوم هەتا هەموو دەرگاکانی مزگەوت دانەخەم، ئا ئەو شەوە هەموو دەرگاکانم داخست تەنها دەرگایەکیان نەبێت، بۆم دانەخرا، داوای یارمەتیم کرد لە خزمەتچیەکانو ئەوانەی لە لام بوون کە دای بخەن، هەرچیمان کرد بۆمان دانەخرا، وەك ئەوەی پاڵ بە کێوێکەوە بنێین، دارتاشەکانیشم بۆ بانگ کرد سەیریان کردو وتیان: ئەم دەرگایە سەردەرگاو دیوارەکەی کەوتووە بەسەردا، ناتوانین جوڵەی پێبکەین هەتا ڕۆژدەبێتەوە هەتابزانین لەکوێوە نیشتووەتەسەری، دەڵێت: گەڕامەوەو دوو دەرگاکەم واز لێهێنا بە کراوەیی، کاتێك ڕۆژم لێ بووەوە چوومەوە بۆ لایان، ئەو بەردەی لە سووچی مزگەوتەکەدا بوو کونی تێ بووبوو، پاشماوەی بەستنەوەی وڵاغێکی پێوە دیار بوو، دەڵێت: وتم بە هاوەڵەکانم: ئەم دەرگایە ئەمشەو حەتمەن بۆ پێغەمبەرێك ڕگیراوە و بەکراوەیی مایەوە، بێگومان ئەمشەو لەناو ئەم مزگەوتەی ئێمەدا ئەو پێغەمبەرە نوێژی کردووە. جا ئیتر فەرموودەکەی بە تەواوی باس ئەکات.

**سوودێکی تر**

حافیز ئەبولخەتتاب عومەری کوڕی دیحیە لە کتێبەکەیدا (التنویر في مَولِد السّراج المنیر) کە باسی فەرموودەی ئیسرای کردووە لە ڕێگەی ئەنەسەوە، قسەیەکی زۆری لەسەر وتووە، قسەکەی زۆر جوانو پڕ مانای کردووە، پاشان دەڵێت: بێگومان ئەو ڕیوایەتانەی لە بارەی ئیسراوە هاتوون گەیشتووەتە پلەی تەواتور لە عومەری کوڕی خەتتابو عەلیو ئیبنو مەسعودو ئەبو زەڕو مالیکی کوڕی سەعسەعەو ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدو ئیبنو عەبباسو شەددادی کوڕی ئەوسو ئوبەی کوڕی کەعبو عەبدوڕەحمانی کوڕی قورت ئەبو حەببەو ئەبو لەیلاش کە هەردووکیان ئەنسارین، هەروەها عەبدوڵای کوڕی عومەرو جابیرو حوزەیفەو بورەیدەو ئەبو ئەیوبو ئەبو ئومامەو سەمورەی کوڕی جوندوبو

ئەبولحەمراء و سوهەیبی ڕۆمیو ئومموهانیئەوە هەتا عائیشەو ئەسمائی کچی ئەبوبەکری سدیقەوە(ڕەزای خوا لە هەموویان بێت) هەیانە بە درێژی باسەکەی هێناوە هەشیانە بە کورتی هێناویەتی، وەك لە موسنەدەکاندا هاتووە، هەرچەندە ڕیوایەتی هەندێکیان مەرجی سەحیحی تێدا نیە، بێگومان گشت موسڵمانان کۆن لەسەر فەرموودەی ئیسرا، تەنها بێدین و خوانەناسان بڕوایان پێی نیە، ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾[1] واتە: دەیانەوێت ڕووناکی دینی خوا بکوژێنەوە بە(فووی) دەمیانو خوا ڕووناکی خۆی تەواو دەکات با بێباوەڕانیش پێیان ناخۆش بێت.

﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾ ﴾

**باسی موساو بەخشینی تەورات پێی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴾ واتە: کتێبمان دا بە موساو کردمانە ڕێ نیشاندەرێك بۆ بەرەی ئیسرائیل کە: جگە لە من با بریکارێکتان(وەکیلێکتان) نەبێت. کاتێك کە خوای گەورە باسی شەوڕەوی بە بەندەی خۆی موحەمەد(ﷺ) دەکات پاشان دێتە سەر باسی بەندەو پێغەمبەرو کەلیمی خۆی موسا(سەلامی خوای لێبێت) زۆرجار خوای گەورە کە باسی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات لەگەڵیدا باسی موساش دەکات، کە باسی قورئان دەکات لەگەڵیدا باسی تەوراتیش دەکات، بۆیە لێرەیشدا کە باسی شەوڕەوی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات لە پاشان دەفەرمووێت: ﴿ وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾ واتە: تەورات، ﴿وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى﴾ واتە: کردوومانە بە ڕێ نیشاندەر، ﴿لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴾ واتە: جگە لە من هیچ کەسێکی تر مەکەنە دۆستو یارمەتی دەرو پەرستراو، چونکە خودا پەیامی ناردووە بۆ هەموو پێغەمبەرێك کە ڕەوانەی کردووە کە تەنها هەر ئەو بپەرستنو شەریکی بۆ دانەنێن. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ﴾ واتە: ئەی تۆرمەی ئەوانەی کە لەگەڵ نوحدا هەڵمان گرتن لەو کەشتیەدا لە بابی خۆتان نوح بکەن، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾ بە ڕاستی نوح بەندەیەکی زۆر شوکرانەبژێر بوو، سا ئێوەش یادی ئەو بەهرەی منە بکەن کە پێم داون کە موحەمەدم(ﷺ) بۆ ڕەوانە کردوون، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(بێگومان خوای گەورە ڕازییە لەو بەندەیەی کە خواردنێك دەخوات یان

---

[1] الصف(٨).

خواردنەوەیەك دەخواتەوە سوپاسی خوای لەسەر دەكات).[1] موسلیمو ترمزیو نەسائیش ڕیوایەتیان كردووە هەر بەو شێوەیە.[2] مالیك دەڵێت لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە: بەردەوام و لەهەموو كاتێكداسوپاسی خودای دەكرد. بوخاری لێرەدا باسی فەرموودەكەی ئەبو زورعەی كردووە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (من بەڕێزترینی مندالی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا(فەرموودەكە درێژە، تێیدا هاتووە) خەڵكی دێن بۆ لای نوح دەڵێن: ئەی نوح بێگومان تۆ یەكەم نێردراوی بۆ سەر خەڵكی سەر زەمین، خوا بە عەبدێكی شوكرانە بژێر ناوی بردووی، تكامان بۆ بكە لە لای پەروەردگارت)[3]. فەرموودەكەی بە تەواوی باسكرد.

﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾﴾

**لە تەوراتدا هاتووە كە جوولەكە دووجار دەست دەدەنە خراپەكاری( لەسەر زەمیندا )**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا﴾ وە هەر لەناو كتێبەكەدا نەوەی ئیسرائیلمان ئاگادار كردووە كە: ئێوە لەو سەر زەمینەدا دوو كەڕەت دەست دەدەنە بەدفەڕیو زۆر بە توندی بایی هەوا دەبنو لە خۆ دەگۆڕێن. خوای گەورە باسی نەوەی ئیسرائیل دەكات كە بڕیاری داوەو ئاگاداری كردوون لە تەوراتدا، واتە: لە پێشەوە لەو كتێبەدا كە بۆی ناردوون هەواڵی پێداون كە لەسەر زەمیندا دووجار هەڵدەسن بە كاری خراپو ناپەسەند، خۆیان لێ دەگۆڕێتو دەست دەدەنە تاوانو دەستدرێژی كردنە سەر خەڵكی، وەك ئەم ئایەتەی كە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ﴾[4] چاكیو

---

[1] احمد(٣/١١٧)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] مسلم(٤/٢٠٩٥)، تحفة الأحوزي(٥/٥٣٦)، النسائي في الكبرى(٤/٢٠٢).

[3] فتح الباري(٦/٤٢٨).

[4] الحجر(٦٦).

خراپی کارەکەمان لەبەردەم دانا و ئاگادارمانکرد، کە لە بەری بەیانیدا کەهەڵسان قڕیان تێدەکەوێتو دوا بڕاو دەبن، واتە: لە پێشەوە هەواڵمان دا بەو بەڵایە کە تووشی دەبنو ئاگادارمان کرد لێی.

**بەدفەڕی جوولەکە لە یەکەم جارداو تۆڵە لێ سەندنیان لەسەر ئەو بەدفەڕیە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴾ واتە: هەر کاتێك بەڵێنی یەکەمیان لەو دووجارە هاتەجێ، چەند عەبدێکی زۆر ئازای خۆمان ئەنێرینەسەرتان، گشت وڵاتیان لێ تێك ئەدەن، ئەم بڕیارەیش جێبەجێ دەبێت. واتە: لە خراپەکاری یەکەم جاردا لەشکرێکمان لە دروستکراوەکانی خۆمان زاڵ کرد بەسەریاندا کە زۆر توندوتیژو خاوەن هێزو پڕ چەك بوون، ئەم شوێن بۆ ئەو شوێن دەگەڕان بە شوێنیانداو وڵاتەکەیان داگیرکردنو بە ناویدا هاتوچۆیان دەکردو لە هیچ کەسێك نەدەترسانو باکیان نەبوو ئەوەی خودا بڕیاری دابوو هاتەجێ، زانایانی تەفسیر لە پێشینەو پاشینە ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەو کەسانەی کە زاڵ بوون بە سەریاندا ئایا ئەوانە کێ بوون؟ لەم بارەیەوە ئیسرائیلیاتی زۆرهەیە پێم باش نیە لەم تەفسیرەدا بە درێژی باسی بکەمو بیگێڕمەوە، چونکە هەندێکی هەڵبەستراوە و هەندێك لە بێدینەکانیان دایان ناوە، هەندێکیشیان لەوانەیە ڕاست بێت، بەڵام ئێمە هیچ پێویستیەکمان پێی نیە، سوپاسی خوا دەکەین کە لە کتێبەکەی خویدا بۆی باس کردووین و پێویست بە کتێبەکانی تر ناکات کەلە پێش ئەم قورئانەوە هاتوون، خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بێنیازیان کردووین لەوانە، خوای گەورە ئاگاداری کردووین کە کاتێك یاخی بوونو دەستیان دایە لاساری خوا دوژمنەکانی زاڵ کرد بەسەریانداو وڵاتەکەی داگیرکردن بە ئارەزووی خۆیان هاتوچۆیان بەناو ماڵەکانیاندا دەکردو سەرشۆڕیان کردنو ملیان پێ دانەواندن لە بەرامبەری ئەو کارە خراپانەی ئەوان پێی هەڵسان پەروەردگارت ناهەقی لە بەندەکانی خۆی ناکات، چونکە ئەوانە یاخی بوونو خەڵکێکی زۆریان لە پێغەمبەرانو زانایان لەناو بردو کوشتنیان، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە دەڵێت: گوێم لە سەعیدی کوڕی موسەیب بوو دەیوت: بوختەنەصر دای بەسەر شامدا، قودسی پیرۆزی ڕوخاندو تێکی داو خەڵکەکەی کوشت، پاشان هات بۆ دیمەشق خوێنێکی دی بەسەر خۆڵەمێشێکەوە بوو(ژێری سکڵ بوو) دەکوڵا. لێی پرسین ئەم خوێنە چیە؟ وتیان: باب‌و باپیرانمان دیوە وایان کردووە، هەر کاتێك ئەو خۆڵەمێشە بکرایە بەسەریدا ئەویش سەردەکەوت. دەڵێت: لەسەر ئەو خوێنە حەفتا هەزار موسڵمانو خەڵکی تریشی کوشت.[1] ئەم ڕیوایەتە هەتا دەگاتە سەعیدی کوڕی موسەیب صەحیحە و هەرئەمە مەشهوریشە، پاشان ئەم بوختەنەصرە دانیشت کە هەموو پیاوماقوڵ و

---

[1] الطبري(١٧/٣٦٩).

زاناکانی کوشتن بەڕادەیەك وای لێهات کەسێك نەما کە تەوراتی لەبەربێت، خەڵکێکی زۆریشی گرتنو بە دیلیو دەستبەسەری بردنی، لە کوڕی پێغەمبەرانو کەسانی تریشیان تێدابوون، چەندەها ڕووداوو بەسەرهاتی تریش بەسەریاندا هات باس کردنی زۆری دەوێ.

خۆ ئەگەر ئەوەی ڕاستەیان نزیکە لە ڕاستیەوە دەستمان بکەوتایە چاك بوو بمان نووسیایە یان ڕیوایەتمان بکردایە والله أعلم، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴾ واتە: لە پاشان کارێکی وامان کرد ئێوە لەوان بەهێزتر بن، هەژماریشتان زۆرتر بێت، بە دارایيو نەوەیش یارمەتیمان پێ گەیاندن، ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە چاکە بکەن، چاکە لەگەڵ خۆتان دەکەن، ئەگەر خراپەیش بکەن. خراپە لەگەڵ خۆتان دەکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾[1] واتە: هەر کەسێك کاری چاك دەکات بۆ خۆی دەکات، کەسێکیش خراپە دەکات لە دژی خۆی کردوویەتی.

**خراپەکاری جاری دووەم**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ ﴾ هەر کاتێك بەڵێنی دوایش هاتەجێ، واتە: دەستتان دایەوە خراپەکاری لەجاری دووەمیشدا دوژمنەکانتان هاتنەوە سەرتان ﴿لِيَسُـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ ﴾ واتە: تا واتان لێبکەن خەمو پەژارە لەنێو چاوانتاندا دەرکەوێتو ملکەچو سەرشۆڕتان بکەنو ﴿وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ﴾ واتە: بشچنە ناو قودسی پیرۆزەوە ﴿كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ واتە: وەك جاری پێشوش چوونە ناوی بەئارەزووی خۆیان تێیدا دەگەڕانو ﴿وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴾ واتە: وە هەرچیەکیان دەستکەوێت بیڕوخێننو خابووری بکەن، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا﴾ واتە: بەڵکو پەروەردگارتان بتانخاتە بەر بەزەیی خۆی، ئەگەریش تێهەڵچنەوە و دەست بکەنەوە بە خراپەکاری ئێمەیش تێ هەڵدەچینەوە، زەبوونو سەرشۆڕتان دەکەینەوە لە دنیاداو لەگەڵ ئەو هەموو سزاو جەزرەبەیەش کە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆمان داناون، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا﴾ واتە: جەهەنەممان کردووە بە بەندیخانەو زیندان بۆ کۆمەڵی خوانەناسان، هەرگیز ناتوانن بێنە دەرەوە لێی. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿حَصِيرًا﴾

---

[1] فصلت(٤٦).

واتە: بەندیخانە.[1] موجاهید دەڵێت: گیردەخۆن تێیدا.[2] کەسانی تریش هەر وایان وتووە. حەسەن دەڵێت: فەرش‌ولانکەیانە.[3] قەتادە دەڵێت: ئەوەی ئیسرائیل دەستیان دایەوە خراپەکاری خوای گەورە ئەم موحەممەدەوهاوەڵەکانی زاڵکردبەسەریانداو ملکەچی کردن‌و سەرانەیشی لێ سەندن[4].

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ ﴾

**وەسفکردنی ئەم قورئانە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾ واتە: بێگومان ئەم قورئانە ڕێگایەك پیشان دەدات کە لە گشت ڕێگاکان سەرڕاسترە، مژدەش دەدات بەو خاوەن باوەڕانەی ئاکار چاکن کە پاداشتێکی گەورەیان بۆهەیە، خوای گەورە وەسفی کتێبە پیرۆزەکەی دەکات، واتە: قورئان کە چاکترین ڕێنیشاندەرو ڕێك‌و ڕەوانترین ڕێگایە لەناو ڕێگاکانی تردا، مژدەیش دەدات بەو خاوەنباوەڕانەش کە بە پێی پەیڕەوی ئەو هەڵسوکەوت دەکەن کە پاداشتێکی گەورە یان هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ واتە: ئەو کەسانەش باوەڕ بە دواڕۆژ ناکەن، ئازارێکی زۆر بە ژانمان بۆ ئامادەکردوون، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[5] واتە: مژدەیان پێ بدە کە تووشی جەزرەبەیەکی بە ژان دەبن.

﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴿١١﴾ ﴾

**پەلەکردنی مرۆڤ و دوعاکردن لە خۆی**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا﴾ واتە: مرۆڤ چۆن حەز دەکات چاکەی بۆ بێت، ئاواش دەیەوێت خراپی لێ بقەومێ، مرۆڤ هەر وا بە پەلەیە، خوای گەورە باسی مرۆڤ دەکات کە زۆر پەلەیەتی کاتی وا هەیە دوعای شەڕ لە خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی دەکات، واتە: بە مردن یان بێبەش بوون لە بەزەیی خوا یان بە ماڵکاوڵی‌و وێران بوون‌و چەندەها دوعای شەڕی لەو

---

[1] الطبري(١٧/٣٩٠).

[2] الطبري(١٧/٣٩٠).

[3] الطبري(١٧/٣٩٠).

[4] الطبري(١٧/٣٨٩).

[5] الانشقاق(٢٤).

جۆرە، ئەگەر خوای گەورە نزاکەی قەبوڵ بکات بەو نزایە لەناودەچن، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ﴾[1] واتە: ئەگەر هەروەك مەردم لە خۆشی بە پەلەن، خودایش بۆ زیان لێدانیان بە پەلە بووایە هەر زوو لەناو دەچوون. موجاهیدو ئیبنو عەباس‌و قەتادەیش هەر وایان وتووە.[2] لە پێشەوە لە فەرموودەیەکدا باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(نزا لە خۆتان مەکەن لە سامانتانی مەکەن نەکا رێکەوتی کاتی وەرگرتنی نزا بکەن لە لای خوداو قەبوڵی بکات تێیدا).[3] پەلەپەل‌و دڵە ڕاوکەی ئەوەی ئادەم وایان لیّ دەکات کە نزا لە خۆیان بکەن بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا﴾ واتە: مرۆڤ هەر بە پەلە بووە، سەلمانی فارسی‌و ئیبنو عەبباس لێرەدا باسی بەسەرهاتی ئادەم پێغەمبەر دەکەن (سەلامی خوای لێبێت) کاتێك کە ویستی هەستێتە سەر پیّ، لەپێش ئەوەی گیان بگاتە قاچەکانی چونکە فووەکە لە لای سەریەوە هات، کاتێك کە گەیشتە مێشك‌و دەماغی پژمی، وتی: سوپاس بۆ خوا(الحمد لله) خوای گەورە فەرمووی: بەر بەزەیی پەروەردگارت بکەوی ئەی ئادەم، کاتێك کە گەیشتە چاوەکانی، چاوەکانی کردەوە، کاتێك کە بڵاوەی کرد بە ئەندامەکانی لەشیدا وای لێهات سەیری دەکردو بە لایەوە سەیر بوو، ویستی هەڵسێت پێش ئەوەی گیان بگاتە قاچەکانی، نەیتوانی هەڵسێت، ئەی پەروەردگارم پەلە بکە پێش ئەوەی شەو دابێت.[4]

﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾﴾

## شەوو ڕۆژ بەشێکن لە نیشانەکانی دەسەڵاتی بەرفراوانی خوا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾ واتە: شەوو ڕۆژمان بە دوو نیشانە نیشان دان، نیشانەی شەومان کوژاندەوە نیشانەی ڕۆژیشمان کردە هۆی بینین، خوای گەورە منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا بە نیشانە گەورەکانی خۆی لەوانە: جیاوازی شەوو ڕۆژ کە بە شەو ئارام دەگرن‌و بە ڕۆژیش دەگەڕێن‌و بڵاوە دەکەن بە شوێن کاروکاسپیداو ڕێگای دوورو درێژی بۆ دەبڕن، بۆ ئەوەی بەو نیشانانە ژمارەی ڕۆژو هەفتەو مانگو

[1] یونس(١١).

[2] الطبري(١٧/٣٩٣/٣٩٤).

[3] مسلم(٤/٢٣٠٤).

[4] الطبري(١٧/٣٩٤/٣٩٥).

ساڵ بزانن، وە ئەو کاتانەش بزانن کە دیاری دەکەن‌و دای دەنێن تێدەپەڕێت بۆ قەرزدان‌و وەرگرتنەوەی‌و بۆ عیبادەت‌و مامەڵەکردن‌و شت بە کرێ گرتن‌و بە کرێدان‌و زۆر شتی تریش، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِتَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡ﴾ تا بگەڕێن بە شوێن ڕۆزیدا کە پەروەردگارتان پێتاندەدات لە ئیش‌و کارو هاتوچۆو هەر شتێکی تردا، ﴿وَلِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ وَكُلَّ شَيۡءٖ فَصَّلۡنَٰهُ تَفۡصِيلٗا﴾ واتە: تا ژمارەی ساڵەکان‌و ژمارەی تریش بزانن و لێتان تێك نەچێت‌و ئێمەش هەموو شتێکمان بە وردی شی کردووەتەوە. خۆ ئەگەر زەمانە هەمووی وەك یەك بووایەو بە شێوازێك بڕۆیشتایە، هیچ شتێك لەمانەتان نەدەزانی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلَّيۡلَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِضِيَآءٍۚ أَفَلَا تَسۡمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرۡمَدًا إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِلَيۡلٖ تَسۡكُنُونَ فِيهِۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحۡمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾[1] واتە: بڵێ: چۆن بیردەکەنەوە ئەگەر خودا شەوتان هێندە لێ درێژ بکاتەوە، کە تا قیامەت نەبڕێتەوە؟ جگە لە خوا کێ شیاوی پەرستنە، ڕووناکیتان بۆ بێنێت؟ ئایا نابیسن؟ بڵێ: ئێوە چۆن بیردەکەنەوە ئەگەر خودا ڕۆژتان هێندە لێ درێژ بکاتەوە هەتا قیامەت بخایەنێت؟ غەیری خوا چ پەرستوویەك دەتوانێت شەوێکتان بۆ دابنێت، کە ئێوە تێیدا ئارام بگرن؟ ئایا نابینن؟ لە بەزەیی خودایە کە شەوو ڕۆژی والێکردووە بۆتان کە تێیدا ئارام بگرن‌و ڕۆزیشی تیادا بە دەست بێنن، بەڵکو ئێوە شوکری بکەن. وە فەرموویەتی: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا﴾[2] واتە: پاك‌و بێگەردو پیرۆزە ئەو(خوایەی) کە لە ئاسماندا چەند خولگە(بورج)ی دروست کردووەو دایناوە لە ئاسماندا خۆرێکی پرشنگدارو مانگێکی ڕووناککەرەوە(بۆ زەوی)، ئەو خودایە زاتێکە شەوو ڕۆژی بە جێی یەکتر داناوە(بە دوای یەکدا دێن‌و شوێن یەکتر دەگرنەوە) بۆئەوکەسەی بیەوێت بیربکاتەوە یا بیەوێت شوکرانەبژێری خوابکات. فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾[3] واتە: ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژیش بە دەستی ئەوە. وە فەرموویەتی: ﴿يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ

---

[1] القصص(٧١_٧٣).

[2] الفرقان(٦١_٦٢).

[3] المؤمنون(٨٠).

وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى أَلَا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴾[1] واتە: شەو دەهێنێت بەسەر ڕۆژداو ڕۆژ دەهێنێ بەسەر شەوداو خۆرو مانگی ڕام هێناوە هەریەکەیان تا ماوەی دیاریکراو(بۆیان) دەگەڕێن بێدار بە هەر ئەو(خوا) زاڵی لێبوردەیە. ئاسمانەکان‌و زەمینی بە ڕاست وەدی هێناوە، شەو دەپێچێت بە ڕۆژەوەو ڕۆژیش دەپێچێت بە شەوەوە، خۆرو مانگیشی ڕام هێناوە، هەر یەکە تا کاتی دیاریکراو دێن‌و دەچن، باش بزانن: بە دەسەلات و خەتاپۆش هەر خۆیەتی، وە فەرموویەتی: ﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾[2] واتە: پەردەی شەوگار لادەدات‌و سپێدەتان بۆ دەخاتەڕوو، شەوی بۆ ئارامگرتن‌و خۆرو مانگی بۆ ژمارەی ئێوە سازداوە، خوای خاوەن دەسەلاتی زانا ئەم کارەی کردووە، وە فەرموویەتی: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾[3] واتە: بۆ ئەوانە، شەویش هەیە لە نیشانەکان، ئێمە ڕۆژی لێ دادەڕنین‌و لەناکاو تاریکاییان بەسەردا دێت، خۆریش بەرەو شوێنی خۆی لە گەڕاندایەو کە لە خاوەن دەسەلاتی زاناوەیە، ئەو فەرمانەی پێدراوە، واتە: شەوی کردووە بە نیشانەیەك کە مانگی تیا دەردەکەوێت‌و ڕۆژیشی کردووە بە نیشانەیەك کە خۆری تیا هەڵدێت، ڕووناکی مانگی لە ڕووناکی خۆر جیاکردووەتەوە بۆ ئەوەی هەر یەکێکیان وەك خۆی بناسرێت، وەك فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: هەر خۆیەتی خۆری کردە تیشکدەرو مانگیشی کردە تریفەدارو چەند قۆناغی بۆ دیاریکرد هەتا ژمارەی ساڵەکان‌و حیسابتانی پێ بزانن، خوا ئەمانەی بە ڕاستی وەدی هێناوە، هەتا دەگاتە: ﴿لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴾[4] واتە: زۆر بەڵگە هەن بۆ ئەوانەی کە لە خواترسن، وە فەرموویەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ﴾[5] واتە: دەربارەی مانگ نوێبوونەوەیش لێت دەپرسن، بڵێ: بۆ زانینی وەخت و چوونە حەجی خەڵکی سودبەخشە، ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە عەبدوڵای کوڕی کەسیرەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ

---

[1] الزمر(٥).
[2] الانعام(٩٦).
[3] يس(٣٧ـ٣٨).
[4] يونس(٥ـ٦).
[5] البقرة(١٨٩).

وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴾ دەڵێت: مەبەست پێی تاریکی شەوو ڕووناکی ڕۆژە[1]. ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە موجاهیدەوە: خۆر نیشانەی خۆرو مانگیش نیشانەی شەوە، ﴿فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ ﴾ دەڵێت: ئەو ڕەشاییەی ناو مانگە، خودا هەر بەو شێوەیەدروستی کردووە[2]. ئیبنوئەبی نەجیح دەڵێت: لەئیبنو عەبباسەوە: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ﴾ دەڵێت: واتە: شەووڕۆژمان کردووە بەدوو نیشانە، خودا بەو شێوەیە دروستی کردون[3].

﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ ﴾

**هەموو کەسێك کارنامەی خۆی لەگەڵدایە**

دوای ئەوەی خوای گەورە باسی شەوو ڕۆژو ئەو شتانەیکرد کە مرۆڤ پێی هەڵدەسێت تێیاندا دەفەرموێت: ﴿ وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ﴾ واتە: کارنامەی هەموو کەسێکمان (وەك تەوق) لە ملی کردووە، (طَٰٓئِرَهُۥ) هەمووکارێکی ئەم مرۆڤە کە ئەبرێت بۆناسمان، وەك موجاهیدو ئیبنو عەباسو کەسانی تریش دەڵێن هەرچی کردووە لە چاکەو خراپە بەرپەرسە لێیو پاداشتی لەسەری دەدرێتەوە چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێ سەندن.[4] ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾[5] واتە: ئینجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوەو هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێت دەیبینێتەوە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾[6] واتە: دوو فریشتەکە لە ڕاستو لە لای چەپیەوە دانیشتوون، هەموو وتەیەك لە دەمیەوە دەرچێت چاودێرێکی بەسەرەوەیەو دەینوسێت. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا

---

[1] الطبري(١٧/٣٩٦).

[2] الطبري(١٧/٣٩٦).

[3] الطبري(١٧/٣٩٧).

[4] الطبري(١٧/٣٩٨/٤٠٠).

[5] الزلزلة(٧ـ٨).

[6] ق(١٧ـ١٨).

كَٰتِبِينَ (١١) يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ﴾[1] واتە: بێگومان چەند چاودێرێکتان بە سەرەوەیە، کە بەڕێزو نووسەرن، هەرچی بکەن دەیزانن. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾[2] واتە: بێگومان پاداشت دەدرێنەوە لەسەر ئەوەی کە دەیکەن. وە دەفەرمووێت: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾[3] واتە: هەر کەسێك خراپەیەك بکات پاداشتی دەدرێتەوە. مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە هەرچی کرداری ئەوەی ئادەمە چ گەورەبێت یان بچووك هەمووی حیساب کراوە لەسەری‌و بەیانیان‌و ئێواران‌و بە شەوو بە ڕۆژ لەسەری دەنووسرێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنُخۡرِجُ لَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ كِتَٰبٗا يَلۡقَىٰهُ مَنشُورًا﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بە نووسراوی سەر ئاواڵە پیشانی دەدەین، واتە: گشت کردارەکانی بۆ کۆدەکەینەوە لە ڕۆژی قیامەتدا پیشانی دەدرێت، یان بە دەستی ڕاستی وەریدەگرێت ئەگەر لە بەرختەوەران بوو یان بە دەستی چەپی وەریدەگرێت ئەگەر لە بەدبەختان بوو، ﴿مَنشُورًا﴾ بە سەرهەڵپچڕاوەیی‌و بە کراوەیی، خۆی‌و کەسانی تریش دەیخوێننەوە کە هەموو کردارەکانی لە سەرەتای ژیانیەوە هەتا کۆتایی هەژمار کراوە لەسەری. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ (١٣) بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ (١٤) وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾[4] واتە: لەو ڕۆژەدا ئادەمی هەواڵی پێ دەدرێت لەوەی کە پێشی خستووەو دوای خستووە(لە چاکەو خراپە)، بەڵکو ئادەمی ئاگادارە بە حاڵی خۆی، با بروبیانووی زۆریش بێنێتەوە. بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ ٱقۡرَأۡ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفۡسِكَ ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكَ حَسِيبٗا﴾ واتە: نامەی خۆت بخوێنەوە، ئەمڕۆ ئیتر خۆت حیساب بۆ خۆت بکە، واتە: تۆ هیچ ناهەقیەکت لێ ناکرێت‌و هیچیشت لەسەر نانوسرێت تەنها کردارەکانی خۆت نەبێت، چونکە خۆت دانت ناوە بە گشت ئەو شتانەدا کە کردووتە، هیچ کەسێك ئەوەی کردوویەتی لە بیری ناچێتەوە، هەر کەسەو نامەی خۆی دەخوێنێتەوە، خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار، خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي عُنُقِهِۦ﴾ واتە: هەر کەسەو نامەی کرداری لە ملی دەکرێت بۆیە باسی ملی کردووە، چونکە مل یەکێکە لە ئەندامە کەم وێنەکانی لاشە، وە هەر کەسێك شتێك کرایە گردنی دەربازبوونی نیە لێی بە هیچ شێوەیەك، موعەمەر دەڵێت لە قەتادەوە ﴿أَلۡزَمۡنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِي

[1] الانفطار(١٠ـ١٢).
[2] التحريم(٧).
[3] النساء(١٢٣).
[4] القيامة(١٣ـ١٥).

عُنُقِهِۦ﴾ واتە: کردارەکەی. ﴿وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ واتە: ئەو کردارانەی بۆ دەردەخەین. ﴿كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا﴾ موعەمەر دەڵێت: حەسەنی بەسری ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی نەوەی ئادەم نامەی کردارتم ئامادە کردووە دوو فریشتەی بەڕێزیشم کردووەتە بریکار یەکێکیان لە لای ڕاستو ئەوی تریان لە لای چەپ، ئەوەی لە لای ڕاستەوەیە چاکەکانت دەنوسێتو ئەوەیش لە لای چەپتەوە خراپەکانت دەنوسێتو دەیپارێزن. کرداری کەم بکەی یان زۆر کاتێك کە مردی پەڕاوو نامەکەت دەپێچرێتەوە. لە ملت دەکرێت، لەناو گۆڕەکەتدا لەگەڵتدایە، هەتا ڕۆژی قیامەت کە دێیتە دەرەوە نامەکەت بە کراوەیی نیشان دەدرێت، پێت دەڵێ: نامەکەت بخوێنەرەوە، سوێند بە خوا ئەو کەسەی کە وای کردووە کە خۆت حیسابی کردارەکانی خۆت بکەی دادپەروەرانە لەگەڵت جوڵاوەتەوە[1]. ئەمە قسەیە کە یەکێکە لە قسە زۆر جوانەکانی حەسەن(ڕەحمەتی خوای لێبێت).

﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾

## هیچ کەسێك کۆڵی تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ﴾ واتە: کەسێك شارەزای ڕێگە بێت شارەزاییەکەی بۆ خۆی بەسوودە، واتە: هەر کەسێك شوێن هەق کەوتبێتو پەیڕەوی سونەتی پێغەمبەرانی خوای کردبێت، ئەوە ئەو کەسە خێرو چاکەی بۆ خۆی وەدەست هێناوە ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ واتە: هەر کەسێکیش لە ڕێ دەرچێت، ئەو لەڕێدەرچوونەی لە دژی خۆیەتی، واتە: هەر کەسیش لە ڕێی هەق لابداتو لەسەری بترازێت ئەوە تاوانی لە دژی خۆی کردووە، بۆ خۆی دەگەڕێتەوەو ئەبێ باجەکەشی دەدات، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ واتە: کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، بەڵکو هەرکەسێ تاوانکارە ئەوە ناهەقی بەرانبەر خۆی کردووە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ﴾[2] واتە: ئەگەر گران بارێك داوا بکات لە کەسێك شان بداتە ژێر بارەکەی، خۆ ناداتە ژێر بارەکەیو هیچی بۆ هەڵناگرێت باخزم و کەسیشی بێت، هیچ دژایە تییەك نیە لە نێوان ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتەدا کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ

[1] الطبري(١٧/٤٠٠).

[2] الفاطر(١٨).

وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ﴾[1] واتە: بارگرانی خۆیان‌و بارگرانی خەڵکی تریش لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن. یان ئەو ئایەتەی کە دەفەرموویت: ﴿وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾[2] واتە: تاوانی ئەوانەش هەڵدەگرن کە بەبێ زانست ئەوان لە ڕێیان لادەدەن، چونکە ئەوانەی بانگەشە بۆ بێدینی دەکەن دوو تاوان هەڵدەگرن، تاوانی خۆیان‌و تاوانی ئەوانەیش کە لە ڕێگە لایان دەدەن، بەبێ ئەوەی هیچ لە تاوانی ئەوانە کەم بکەنەوەو باری گرانیان سووك بکەن یانی: لەبری ئەوان کۆڵی گوناه هەڵناگرن. ئەمەیش لە دادپەروەری‌و بەزەیی خودایە بۆ بەندەکانی خۆی.

## سزادان نیە دوای ڕەوانەکردنی پێغەمبەران نەبێت

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ واتە: تا پێغەمبەر نەنێرین سزا لە لای ئێمەوە نیە، لێرەدا باسی دادپەروەری خوای گەورە دەکات کە سزای هیچ کەسێك نادات هەتا بەڵگەی تەواوی بۆ نەنێرێت بەو پێغەمبەرەی بۆی ڕەوانە دەکات، وەك دەفەرموویت: ﴿كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا بَلَىٰ قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ﴾[3] واتە: هەرچەند دەستەیەك فڕێ بدرێتە ئاگرەوە دەرگاوانەکانی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەکەن ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە(لە دنیادا)، وتیان: بەڵێ بۆمان هاتووە بەڵام بە درۆمان دەزانی‌و دەمان وت(پێی) خوا هیچی نەناردووەتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومراییەکی گەورەدان. وە ئەم ئایەتەیش کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾[4] واتە: ئەوسا ئەوانەی بێباوەڕ بوون ڕاپێچ دەکرێن بۆ دۆزەخ کۆمەڵ کۆمەڵ تا کاتێك دێنە(نزیکی) دۆزەخ دەرگاکانی دەکرێنەوەو دەرگاوانەکانی دۆزەخ بەوان دەڵێن: ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی پەروەردگارتان بەسەردا بخوێننەوەو بتانترسێنن لە گەیشتنتان بەم ڕۆژە؟ دەڵێن: بەڵێ (هاتن ئاگاداریان کردین) بەڵام بڕیاری سزا دراوە بەسەر(ئێمەی) بێباوەڕدا. وە دەفەرموویێت: ﴿ وَهُمْ

---

[1] العنكبوت(١٣).

[2] النحل(٢٥).

[3] الملك(٨ـ٩).

[4] الزمر(٧١).

يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾[1] واتە: ئەوانە لە دۆزەخدا هاوار دەکەن(دەڵێن) ئەی پەروەردگارمان(لە دۆزەخ) دەرمان بێنە تا کردەوەی چاك بکەین جیاواز لەوەی دەمانکرد(وەڵام دەدرێنەوە) ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێت بیر بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە و ترسێنەرتان بۆنەمات؟ دەی ئەو سزایە بچەژن چونکە هیچ یاریدەدەرێك بۆ (بێباوەڕ) ستەمکارەکان نیە.

## پرسی ئەو منداڵانەی کە هەربەمنداڵی ئەمرن

باسێك ماوە لێرەدا کە پێشەوایانی ئەم ئومەتە ڕەحمەتی خوایان لێبێت لە دێرزەمانەوە هەتا ئێستایش کێشەیان لەسەری هەیە، ئەوەیش ئەو منداڵانەن کە بە بچووکی مردوون یان دەمرن و باب و باپیرانیان خوانەناسن، ئایا فەرمانی شەرع چیە دەربارەی ئەو منداڵانە هەروەها دەربارەی ئەو شێت و کەڕو پیرە خڵەفاوانەی کە هەموو شتێکی لە بیرچووەتەوە یان ئەوانەی ئەهلی (فیطرة)ن و لە چەرخێکدا مردوون کە بانگەوازیان پێ نەگەیشتووە؟ ئەمانەچەندین فەرموودە دەربارەیان هاتووە بە یارمەتی خوای گەورە من بۆتان باس دەکەم.

**فەرموودەی یەکەم:** ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەسوەدی کوڕی سەریعەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(چوار کەس بەڵگە دەهێننەوە بۆخۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا، پیاوێکی کەڕ کە هیچ شتێك نابیستێت، پیاوی بێعەقڵ(أحمق)، پیاوی پیرو بە ساڵاچوو، پیاوێك کە لە چەرخێکدا مردووە بانگەوازی پێ نەگەیشتووە، کەڕەکە دەڵێت: پەروەردگارم ئیسلام هات و من هیچ شتێکم گوێ لێ نەبووە، بێ عەقڵیش دەڵێت: پەروەردگارم ئیسلام هات منداڵان بەردبارانیان دەکردم، بە ساڵاچووەکەیش دەڵێت: پەروەردگارم ئیسلام هات من هیچ شتێکم لەبیر نەمابوو، ئەو کەسەیش کە مردووە و بانگەوازی ئیسلامی پێ نەگەیشتووە دەڵێت: پەروەردگارم، پێغەمبەر نەهاتووە بۆ لام لە لایەن تۆوە، کە پەیمانم لێ وەرگرێت کە پەیڕەوی بکەم، دەنێرێت بە دوایاندا کە بڕۆنە ناو ئاگر، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەگەر بچوونایەتە ناوی ئەو ئاگرە ساردێکی بێ زیان دەبوو بۆیان. هەر بەو سەنەدە فەرموودەیەکی تر بەهەمان شێوە ڕیوایەت کراوە لە قەتادەوە لە حەسەنەوە لە ئەبو ڕافیعەوە لە ئەبو هورەیرەوە بەڵام لە دواییەکەیدا هاتووە:(هەر کەسێك بچووایەتە(ئەو ئاگرە) ساردێکی بێ زیان دەبوو بۆی، هەر کەسیش نەچوایەتە ناوی ڕادەکێشرایە ناوی).[2] (ئیسحاقی کوڕی

---

[1] الفاطر(٣٧).

[2] احمد(٤/٢٤)، سەنەدەکانی سەحیحە.

ڕامەوەیە)یش ڕیوایەتی کردووە لە مەعازی کوڕی هیشامەوە هەر بەو شێوەیە.[1] بەیهەقیش لە کتێبی (الاعتقاد)دا ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت: سەنەدەکانی ڕاستن. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لەفەرموودەکەی مەعمەرەوە لە هەممامەوە لە ئەبوهورەیرەوە بە مەرفوعی هێناویەتی، پاشان ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئەگەر حەز ئەکەن بۆڕاستی ئەمە ئایەتی ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾ بخوێنن[2]. مەعمەریش هەر بەوشێوەیە ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی تاوسەوە لە باوکیەوە لە ئەبوهورەیرەوە بەمەوقوفی[3].

**فەرموودەی دووەهەم:** لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: هەموو لە دایك بوویەك لەسەر سروشت(ئیسلام) لە دایك دەبێت، بابو دایکی دەیکەنە جوولەکە یان گاور یان ئاگر پەرست(مەجوسی) وەك چۆن ئاژەڵێکی ساغ وتەواو بەچکەیەکی ساغ و تەواوی دەبێت ئایا هەست بە هیچ کەمو کوڕیو نوقسانیەك دەکەن تێیدا بێت؟). لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە، دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا ئەوەی بە منداڵی دەمرێت چۆنە؟ فەرمووی: (خودا باش دەزانێت بەوەی کە کردوویانە)[4]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لەئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (منداڵی موسڵمانان لەناو بەهەشتدان، ئیبراهیم پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) دەستەبەرو کەفیلیانە)[5]. لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەیازی کوڕی حەممادەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لە خوای گەورەو باڵادەستەوە کە فەرموویەتی:(من بەندەکانم دروست کردووە بەئیمانداری)[6]. لە ڕیوایەتێکی تری جگە لەوەدا هاتووە، دروستم کردوون بە موسڵمانی).

**فەرموودەی سێیەم:** لە سەمورەوە (ڕەزای خوای لێبێت) کەحافیز ئەبوبەکری بورقانی ڕیوایەتی ئەکات لێوەی لەو کتێبەیدا کەناوی (المستخرج على البخاري)یە لە فەرموودەکەی عەوفی ئەعرابیەوە لە ئەبو ڕەجائی عەتاریدیەوە لە سەمورەوە(ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی:(هەموو لە دایك بوویەك لە سەر سروشت(ئیسلامەتی) لە دایك دەبێت) خەڵکی بانگیان کرد: ئەی پێغەمبەری

---

[1] الطبراني(١/٢٨٧) ، سەنەدەکانی سەحیحە.

[2] الطبري(١٧/٤٠٣).

[3] القرطبي(١٠/٢٣٢).

[4] البخاري(١٣٨٥)، مسلم(٢٦٥٨).

[5] أحمد(٢/٣٢٦)، مجمع(٧/٢١٩).

[6] مسلم(٢٨٦٥).

خوا(ﷺ) منداڵی بتپەرستانیش؟ فەرمووی: (منداڵی بتپەرستانیش)[1]، تەبەرانیش ڕیوایەتی کردووە لە سەمورەوە دەڵێت: پرسیارمان لە پێغەمبەری خوا کرد(ﷺ) لە بارەی منداڵی بتپەرستانەوە فەرمووی:(ئەوانە خزمەتکاری ئەهلی بەهەشتن)[2].

**فەرموودەی چوارەم:** لەمامی حەسنائەوە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حەسنائی کچی مەعاویەوە کە لە بەنی صەریمەیە دەڵێت: مامەم بۆی گێڕامەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کێ لەناو بەهەشتایە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەر لەناو بەهەشتدایە، شەهید لە ناو بەهەشتدایە، منداڵ لە بەهەشتدایە، زیندەبەچاڵ لە بەهەشتدایە)[3].

**وورد کردنەوەی ئەم باسە چاك نیە!**

لەبەر ئەوەی قسەکردن لەسەر ئەم باسە پێویستی بە بەڵگەی زۆر چاكو ڕاست هەیە، هەندێ کەسیش لەم بارەیەوە قسەدەکات و زانیاری تەواوی لانیە کە لەلایەن خوداو پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەریگرتبێت، بۆیە کۆمەڵێك لە زانایان پێیان چاك نیە زۆر قسەی تێدا بکرێت، ئەم ڕایە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسو قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو بەکری صدیقەوەو موحەممەدی کوڕی حەنیفەو کەسانی تریشەوە[4]. ئیبنو حەبانیش لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی لە جەریری کوڕی حازمەوە دەڵێت: گوێم لە ئەبو ڕەجائی عەتاریدیەوە بوو وتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (ڕەزای خوایان لێبێت) کە لەسەر مینبەرەوە دەیوت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (بەردەوام کاری ئەم ئومەتە لەهاتدایە-یان وتی بەرەو یەکبوونە- بەمەرجێ باسی منداڵو قەدەر نەکەن). ئیبنو حەبان دەڵێت: مەبەستی منداڵانی بتپەرستانە[5]. هەر بەم شێوەیە ئەبوبەکری بەزاریش ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەی جەریری کوڕی حازمەوە. پاشان ئەڵێ: بەدڵنیاییەوە کۆمەڵێکیش ئەم قسەیان ڕیوایەت کردووە لە ئەبو ڕەجائەوە ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە بەڵام بە مەوقوفی[6].

﴿ وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ﴿١٦﴾ ﴾

---

[1] البخاري(٧٠٤٧).

[2] المعجم الكبير(٧/٢٤٤)، مجمع(٧/٢١٩)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[3] احمد(٥/٥٨)، فتح الباري(٣/٢٤٦).

[4] احمد(٥/٧٣).

[5] ابن حبان(١/٢٥٦).

[6] کشف الاستار(٣/٣٥).

**خوێندنەوەکانی( أمرنا )و ماناکانی**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴾ واتە: هەر کاتێك ویستمان شارێك قڕکەین فەرمانی بەخێر دەدەین بەسەر دەوڵەمەندە خۆشگوزەرانەکانی ئەواندا، کەچی ئەوان یەکسەر نافەرمانی دەست ئەدەنێ و یەکسەرەش سزادانیان لەسەر دەسەپێتو پێویست دەبێت، ئەوساکە وێرانی دەکەینو تێکی دەهاڕین. قورئان خوێنەکان جیاوازییان هەیە لەخوێندنەوەی ﴿أَمَرْنَا﴾ بەناوبانگترین خوێندنەوە ﴿أَمَرْنَا﴾ بە تەخفیفی خوێندوویانەتەوە، بەبێ تەشدید، زانایانی تەفسیریش ڕایان جیاوازە لە ماناکەیدا، هەندێ وتوویانە: واتە: هانی خۆشگوزەرانەکان دەدەین بۆ بەدفەڕیو خراپەکاری، ئەمەش فەرمانێکی قەدەرییە، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا ﴾[1] واتە: هەتا کاتێ فەرمانی ئێمەی دێتە سەر بە شەو یان بە ڕۆژ، دیارە بێگومان خودا فەرمان نادات بە بەدفەڕیو خراپەکاری، بۆیە وتوویانە: یانی ڕامیان دێنێت لەسەر کاری بەدڕەوشتیو خراپەکاریو سزایان لەسەر پێویست دەبێتو جەزرەبە دەدرێن، هەندێکی تر ئەڵێن: واتە: فەرمانمان پێ کردوون بە گوێڕایەڵیو خواناسی کەچی ئەوان بەدفەڕیو خراپەکاریان کردووە. بۆیە شایەنی تۆڵە لێسەندن بوون، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە[2]. سەعیدی کوڕی جوبەیریش هەر وای وتووە.[3] عەلی کوڕی تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا﴾ دەڵێت: خراپەکارەکانمان زاڵ کرد و دەستیان دایە بەدفەڕیو خراپەکاری، کاتێك کە هەستان بەو سەرپێچیو خراپەکاریە خودا بەو سزایە لەناوی بردن. ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَٰبِرَ مُجْرِمِيهَا ﴾[4] واتە: هەرئاوەها ئێمە تاوانکارانی هەرکۆمەڵێکمان کردووەتە خاوەن دەسەڵات لەناویاندا دەستیاداوەتە نەفرەت وفێڵکردن[5]. ئەبولعالیەو موجاهیدو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وایان وتووە[6]. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿ وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ

---

[1] یونس(٢٤).

[2] الطبري(١٧/٤٠٣).

[3] الطبري(١٧/٤٠٣).

[4] الانعام(١٢٣).

[5] الطبري(١٧/٤٠٤).

[6] الطبري(١٧/٤٠٤).

قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا﴾ واتە: ژمارەی خراپەکارانمان زۆر کردووە[1]. عیکریمەو حەسەنو زەحاكو قەتادەش هەر وایان وتووە[2]. عەوفی لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە مانای ئەم ئایەتەی ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا﴾ی واکردووە و فەرمویەتی: ئانی ژمارەی تاوانبارانمان زۆر کردووە، عەکریمە و حەسەن و زەحاك و قەتادەش هەرهەمان قسە دەکەن. لە مالیکیشەوە لە زوهرییەوە: ﴿أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا﴾ یانی: فەرمانمانکرد زۆر بن.

﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿١٧﴾﴾

**هەڕەشەکردن لە قورەیش**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا﴾ واتە: زۆر گەلیشمان لە پاش نوح لەناو بردووە، بۆ تۆ ئەوەندە بەسە کە پەروەردگارت لە گوناهی بەندەکانی ئاگادارەو دەیانبینێت، خوای گەورە لێرەدا خوانەناسانی قورەیش دەترسێنێت لەسەر بڕوا نەهێنانیان بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ) کە زۆر بەرەی دوای نوح لەناو بردووە لەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە بە پێغەمبەرەکانیان، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو گەلانەی کەوتوونەتە نێوان ئادەمو نوح(سەلامی خوایان لێبێت) لەسەر ئیسلامەتی ژیاون، وەك ئیبنو عەبباس وتوویەتی: لە نێوان ئادەمو نوحدا(سەلامی خوایان لێبێت) دە گەل بوون هەموویان لەسەر ئیسلامەتی ژیاون.[3] واتە: ئێوەیش ئەی بێباوەڕان، لەو گەلانە بەڕێزتر نین لە لای خودا، بێگومان ئێوە بڕواتان بە بەڕێزترین پێغەمبەر(ﷺ)و بەڕێزترین کەس نەهێنا، سزای ئێوەلای خوا لەپێشترو ڕەواترە، خودا ئاگاداری گشت ئاکارەکانتانە، چاکەو خراپەو هیچ شاراوەیەکی لا ون نابێت، خودا پاكو بێ عەیبو زۆر مەزنە.

﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾﴾

**پاداشتی ئەوەی دنیاویست بووەو ئەوەیش بە تەمای دواڕۆژ بووە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا﴾ واتە: هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیای بوێت لەم دنیادا ئەگەر بمانەوێت

---

[1] الطبري(١٧/٤٠٤).

[2] الطبري(١٧/٤٠٤/٤٠٥).

[3] مجمع(٦/٣١٨).

داواکەی زوو بۆپێك دێنین، پاشان بە ئابڕووبراوی‌و دەرکراوی لە بەزەیی خودا دۆزەخمان بۆ ساز داوە و دەیسوتێنین، خوای گەورە لێرەدا دەفەرموویێت: ئەوەی خەڵکی داوای دەکات‌و بە تەمایەتی لە خۆشگوزەرانی ژیانی دنیا هەمووی بە دەست نایەنێت، بەڵکو ئەوەی خودا خۆی مەیلی لێبێت بۆ هەر کەسێك پێی دەدات، ئەم ئایەتە بە ڕەهایی نەهاتووە وەك ئایەتەکانی تر چونکە دەفەرموویێت: ﴿عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ﴾ پاشان لە ڕۆژی دوایدا جەهەنەممان بۆ ساز داوە ﴿يَصْلَىٰهَا﴾ دەچێتە ناوی‌و بە تەواوی تێیدا نوقم دەبێت ﴿مَذْمُومًا﴾واتە: بەزەمکراوی و ئابڕووبراوی لەسەرئەوکارە خراپانەی کەکردوویەتی و ڕیزی دنیای داوە بەسەر قیامەتدا ﴿مَّدْحُورًا﴾ دوورە لە بەزەیی خوداوەو سەرشۆڕو داماوو ڕیسوایە، پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ﴾کێش ڕۆژی دوایی دەوێت‌و حەزی لەو بەهرەو خزمەتگوزاریانەیە کە تێیدایە، ﴿وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا﴾ واتە: بە پێی توانا بۆی تێدەکۆشێت لە ڕێگای خۆیەوە، یانی: پەیڕەوی فەرمانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات، ﴿وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ خاوەن باوەڕپیشەو بڕوای بە پاداشت‌و سزای خوا هەیە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا﴾ واتە: ئەوانە کۆششیان بە فیڕۆ ناچێت‌و لەبەر چاوەو ڕەنجیان وەرگیراوە.

﴿كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ﴾ واتە: هەموو لایان(چ ئەوان‌و چ ئەمان) لە خەڵاتی پەروەردگارت بێبەش ناکەین یانی: گشت کەسێك لەو دوو دەستەیە، ئەوانەی ئارەزوویان هەر لە خۆشی دنیایەو ئەوانەیش حەز لە ژیانی ئەو دنیا دەکەن لە بەخشندەیی پەروەردگارت بێئومێد ناکەین، چونکە خودا خۆی ئەو خاوەن دەسەڵاتەیە کە ناهەقی لە کەس ناکات، هەر کەسە شایستەی هەر شتێکە لە بەختەوەری یان بەدبەختی پێی دەدا، هیچ کەسێك ناتوانێت بڕیاری خودا ڕاگرێت‌و ئەوەی دەیبەخشێت ببێتە لەمپەر لە ڕێیداو ئەوەی خودا مەیلی لێیەتی پێی بگرێت، بۆیە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا﴾ واتە: خەڵاتی پەروەردگارت کەموکوڕی تێدا نیە[1]. حەسەن‌و کەسانی تریش دەڵێت: خەڵاتی پەروەردگارت قەدەغەکراونییە. پاشان خوای

[1] الطبري(١٧/٤١٠).

گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾ واتە: بڕوانە چۆن هەندێکمان لە چاو هەندێکی سەرخستووە، واتە لە دنیادا هەیانە دەوڵەمەندو هەیانە هەژارو هەشیانە مامناوەندیە، هەیانە پێکەوتووەو هەیانە ناشیرینو هەشیانە مامناوەندیە، هی وا هەیە هەر بە منداڵی دەمرێتو کەسی واش هەیە تەمەن دەکات هەتا زۆر پیر دەبێت، کەسی واش هەیە مامناوەندیە لە تەمەندا، ﴿وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلًا﴾ لە دواڕۆژیشدا پلەوپایەو سەرخستنی لەمە زۆرترە. واتە: پلەو پایەو ڕێزلێگرتن لە ڕۆژی دوایدا زۆر زیاترە لە پلەو پایەو ڕێزی دنیا. چونکە کەسی وا هەیە لە پلە هەرەخواری جەهەنەمدایەو کۆتو زنجیریش کراوە تێیدا کەسی واش هەیە کە لە پلە هەرە بەرزەکانی بەهەشتدایەو لەناو ئەو بەهرانەدا ڕادەبوێرێتو زۆر کامەرانە، وەك چۆن ئەوانەی وان لە پلە هەرە خوارەکانی جەهەنەمدا جیاوازیان هەیە لە یەکتری لە جەزرەبەدا، ئەوانەیش وان لە بەهەشتدا پلەکانیان جیاوازە لە یەکتری، چونکە بەهەشت سەد پلەیە، نێوانی هەر پلەیەك بە ئەندازەی نێوانی زەمینو ئاسمانە، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە:(بێگومان خەڵکی پلە زۆر بەرزەکان خڵکی (عیلیین) دەبینن وەك چۆن ئێوە ئەستێرە دوورەکان دەبینن لە ئاسۆو کەناری ئاسماندا.[1] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلًا﴾.

﴿ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومًا مَّخۡذُولًا ﴿٢٢﴾ ﴾

### هیچ کەسێك مەکەنە شەریکی خودا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ﴾ واتە: لەگەڵ خودا هیچ شتێکی تر مەپەرستن، مەبەست پێی لێرەدا ئەو کەسانەن کە ئەرك دەخرێتە سەر شانیانو موکەلەفن لەم ئومەتەدا واتە ئەی ئەو کەسانەی کە ئەرکەکان بەڕێوە دەبەن لە خوا پەرستیدا شەریکی بۆ دامەنێن، ﴿فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومًا مَّخۡذُولًا﴾واتە: ئەگینا بە تەشەنەلێدراوی و دەرکراوی دادەنیشن، لەسەر ئەو شەریك دانانەت بۆ خوا، چونکە خوا نایەت بە هاناتەوەو دەتداتە دەست ئەوەی تۆ پەرستووتە لەگەڵیدا، کە توانای هیچ قازانجو زەرەرێکی نیە بۆت، چونکە خاوەنی قازانجو زیان هەر خودا خۆیەتی بە تەنهاو هاوەڵی نیە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(هەر کەسێك تووشی هەژاری بوو هانای برد بۆ خەڵکی هەژاریەکەی لەکۆڵناکرێت، بەڵام هەر کەسێك هانای برد بۆ خوا ئەوە خوا دەوڵەمەندی دەکات، یان لە دواڕۆژدا بێنیازی دەکات

---
[1] فتح الباري(٦/٣٨٦)، مسلم(٤/٢١٧٧).

یان لە دنیادا زوو دەوڵەمەندی ئەکات)[١]. ئەبوداودو ترمزیش ڕیوایەتیان کردووە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستو غەریبە.[٢]

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾

**فەرماندان بە یەك خوا پەرستی و چاکەکردن لەگەڵ باوكو دایکدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾ واتە: پەروەردگارت فەرمانیداوە کە غەیری ئەو مەپەرستن، بەرامبەر باب‌و دایکیش چاکە بکەن، هەر کاتێك یەکێکیان یان هەردووکیان کە لای تۆن تووشی تەمەن درێژی و پیری بوون هەرگیز ئۆف مەکە لەگەڵیان‌و تێیان مەخوڕەو بە زمانی خۆش بیان دوێنە. خوای گەورە فەرمان دەکات کە تەنها ئەو بپەرسترێت‌و شەریکی بۆ دانەنرێت، دەستەواژەی (القضاء) لێرەدا بە مانای فەرمان هاتووە، موجاهید دەڵێت: ﴿وَقَضَىٰ﴾ واتە: پەروەردگارت ڕایسپاردووە[٣]. هەر بەم شێوەیە، ئوبەی کوڕی کەعب‌و ئیبنو مەسعودو زەحاکی کوڕی موزاحیمیش خوێندوویانەتەوە: (ووصى ربك ألاّ تعبدوا إلاّ إيّاه)[٤]. خوا ڕایسپاردووە کە جگەلەو کەس نەپەرستن، هەر لەبەر ئەمەیە کە خودا چاکەی لەگەڵ دایك‌و باوك لەگەڵ عیبادەتی خۆیدا لە پاڵ یەك داناوە و دەفەرموێت: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ واتە: فەرمانی داوە بە چاکەکردن لەگەڵ دایك‌و باوکیدا، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾[٥] واتە: فەرمانماندا بە ئادەمی کە سوپاسگوزاری من (واتە خوا) و دایك‌و باوکت بکە ئەنجا بۆ لای منە گەڕانەوەتان، پاشان دەفەرموێت: ﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾ واتە: قسەی ناخۆش مەدە بە گوێیاندا، هەتا نابێت ئۆف بکەی بەرامبەریان کە ئەمە

[١] أحمد(١/٤٠٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] ابو داود(٢/٢٩٦)، تحفة الأحوزي(٦/٦١٧)، سەحیحە.

[٣] الطبري(١٧/٤١٤).

[٤] الطبري(١٧/٤١٣/٤١٤).

[٥] لقمان(١٤).

کەمترین ناڕەزایی دەربڕین و قسەی خراپە، ﴿وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا﴾ تێیان مەخوڕەو مەقیڕێنە بەسەریاندا، واتە: بە کرداری ناشیرین مامەڵەیان لەگەڵ مەکە وەك عەتای کوڕی ڕەباح لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا﴾ دەڵێت: واتە: دەستیان لێ ڕامەوەشێنە.[1] کاتێك کە خوای گەورە قسەی ناشیرینو کرداری ناشیرینی قەدەغەکردووە بەرامبەر دایكو باوك، فەرمانیشی داوە کە بە قسەی جوانو کرداری چاك مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێتو دەفەرموێت: ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا﴾ واتە: بەڵکو وتەی نەرمو شیرینیان لەگەڵدا بەکاربێنەو زۆر ڕێزیان لێ بگرە، ﴿وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ﴾ بەبێ فیزی باڵی بەزەیت ڕاخە بۆیان، واتە بە کردار خۆبەکەم زانینی خۆت دەرخە بۆیان، ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴾ بڵێ: ئەی پەروەردگاری من، وەك ئەمان منیان بە منداڵی پێگەیاند، تۆش بیانخەرە بەر بەزەیی خۆت، کاتێك بەساڵا دەچن، یان لە کاتی مردنیاندا، ئیبنو عەبباس دەڵێت: پاش ئەم ئایەتانەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ﴾(التوبة: ١١٣).[2] واتە: ڕەواو شایستە نیە بۆ پێغەمبەرو باوەڕداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران. لە بارەی چاکەکردن لەگەڵ دایكو باوك فەرموودەی زۆر هاتووە لەو فەرموودانە کە ڕیوایەت کراوە لە چەند ڕێگاوە لە ئەنەسش کەسانی تریشەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کە سەرکەوتە سەر مینبەر پاش کەمێك فەرمووی: ئامین، ئامین، ئامین، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەرچی ئامینت کرد؟ فەرمووی:(جوبرەئیل هاتە لامو وتی: ئەی موحەمەد(ﷺ) لوتی بە خۆڵدا بچێت و سەرشۆڕو داماو بێت پیاوێك کە ناوی تۆی لا ببرێتو سەڵاوات لەسەرت نەدا، بڵێ: ئامین، وتم: ئامین، پاشان وتی سەرشۆڕو داماو بێت پیاوێك کە ڕەمەزانی بەسەردابێتو پاشان بڕوا و لێی نەبوورێت، بڵێ: ئامین، وتم: ئامین، پاشان وتی: سەرشۆڕو داماو بێت پیاوێك گەیشتبێت بە دایكو باوکیو لەگەڵیدا بووبن یان یەکێکیان و نەبوبنە هۆی چوونە بەهەشتی. بڵێ: ئامین: وتم: ئامین)[3].

**فەرموودەیەکی تر:** ئیمامی ئەحمەدڕیوایەتی کردووە لەئەبوهورەیرەوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (سەرشۆڕو داماو بووە، دیسان سەرشۆڕو داماو بووە، دیسان سەرشۆڕو داماو بووە

---

[1] الطبري(١٧/٤١٧).

[2] الطبري(١٧/٤٢١).

[3] تحفة الأحوذي(٥/٥٥٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

پیاوێك گەیشتبێت بە یەكێك لە دایكو باوكی یان هەردووكیان لە كاتی پیریدا و نەچێتە بەهەشت)[١]. بەم شێوەیە فەرموویەكی ڕاستە موسلیم نەبێت كەسی ترنەی هێناوە[٢].

**فەرموودەیەكی تر:** ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە موعاویەی كوڕی جاهیمەوە كە جاهیمە هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەمەوێت غەزا بكەم، هاتووم بۆ لات ڕاوێژت پیٚ بكەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئایا دایكت هەیە؟) وتی: بەڵیٚ، فەرمووی:(لەگەڵ دایكت بە چونكە بەهەشت لە لای پێكانی ئەو دایە). دووبارەو سیٚ بارە لە چەند شوێنی تردا، فەرموودەی وەك ئەم فەرموودەیە ڕیوایەت كراوە.[٣] نەسائیو ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان كردووە[٤].

**فەرموودەیەكی تر:** ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە میقدامی كوڕی (مەعدیەكریب)ەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) كە فەرموویەتی: (خودا ئامۆژگاریتان دەكات كە چاك بن لەگەڵ باوكتاندا، خودا ئامۆژگاریتان دەكات كە چاك بن لەگەڵ دایكتاندا، خودا ئامۆژگاریتان دەكات كە چاك بن لەگەڵ دایكتنادا، خودا ئامۆژگاریتان دەكات كە چاك بن لەگەڵ دایكتاندا. خوا ئامۆژگاریتان دەكات بە چاكە لەگەڵ نزیكترو نزیكتردا)[٥]. ئیبنو ماجەیش لە فەرموودەكەی عەبدوڵای كوڕی عەیاشەوە بەو شێوەیە هێناویەتی[٦]. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە پیاوێكەوە لە بەنی یربوع دەڵێت: هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) گوێم لیٚ بوو قسەی بۆ خەڵكی دەكرد دەیفەرموو:(ئەو دەستەی دەبەخشێتو لای سەرەوەیە ئەبیٚ بۆدایكت، باوكت، خوشكت، برات، پاشان خوارترو خوارتربێت)[٧].

﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُوا صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلْأَوَّابِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾﴾

## چاوپۆشی دەكرێت لە هەڵەی منداڵ لەگەڵ باوكو دایك ئەگەر بە دڵ و تەوبەبكات

سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: ئەو پیاوەی كە هەڵەیەك دەكات لەگەڵ باوكو دایكیو لە دڵی خۆیدا وادەزانێت خراپی نەكردووە تاوانبار نابێت پێی، لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە: مەبەستی چاكە نەبێت هیچی تر نیە بەوەی كە كردوویەتی.[٨] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ﴾

---

[١] أحمد(٢/٣٤٦).

[٢] مسلم(٤/١٩٧).

[٣] أحمد(٣/٤٢٩)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[٤] النسائي(٦/١١)، ابن ماجه(٢/٩٣٠) ، حەسەنە.

[٥] أحمد(٤/١٣٢) ، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[٦] ابن ماجه(٢/١٢٠٧) ، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[٧] أحمد(٤/٦٤) ، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[٨] الطبري(١٧/٤٢٢).

إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾ واتە: پەروەردگاری ئێوە لە خۆتان چاکتر دەزانێت چی بە دڵتاندا دێت، ئەگەر کردەوەتان چاك بێت ئەوە خوا لێبوردەیە بەرانبەر تەوبەکاران، وەك دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾ واتە: بێگومان خودا بۆ ئەوانەی لە گوناه پەشیمان دەبنەوە لێبوردەیە. قەتادە دەڵێت: بۆ ئەوانەی گوێڕایەڵو نوێژکەرن لێبوردەیە.[1] شوعبەی کوڕی یەحیای کوڕی سەعید دەڵێت: لە سەعیدی کوڕی مسییەبەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾ دەڵێت: ئەوانەی تووشی گوناه دەبن پاشان پەشیمان دەبنەوە، دیسان تووشی گوناه دەبنەوەو پاشان پەشیمان دەبنەوە.[2] خوا لێیان دەبوورێت. عەتای کوڕی یەسارو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهید دەڵێن: ئەو کەسانەی گەڕاونەتەوە بۆ چاکەخوازی.[3] موجاهید دەڵێت: لە عوبەیدەی کوڕی عومەیرەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾ وتوویەتی: ئەو کەسەی کاتێك کە بیر لە گوناهەکانی دەکاتەوەو خۆی بە تەنهایە داوای لێبوردن لە خوا دەکات لەو گوناهەی کردوویەتی. موجاهیدیش هەمان ڕای ئەمی هەیە لەم ئایەتەدا.[4] ئیبنو جەریر دەڵێت: چاکترین بۆچوون قسەی ئەو کەسەیە کە دەڵێت: ئەو کەسەیە کە پەشیمانە لە گوناهو گەڕاوەتەوە لە تاوانکردن ڕوویکردووەتە خواناسیو وازی هێناوە لەو شتانەی خوا پێی ناخۆشە بۆ ئەو شتانەی کە خودا پێی خۆشەو پێی ڕازیە.[5] ئەمەی کە وتوویەتی هەر ئەمە ڕاستە چونکە(الأوّاب) لە وتەی(الأوب) دەرهێنراوە، واتە پەشیمان بوونەوە، وتراوە(آب فلان) کاتێك کە گەڕاوەتەوە. خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴾[6] واتە: بێگومان هەر بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان. وە لە فەرموویەکی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك لە سەفەرێك ئەگەڕایەوە ئەی فەرموو: (آيبون تائبون عابدون لربنا حامدون)[7] واتە: هاتینەوە ئێمەلە تەوبەکارانو خواناسانو سوپاسگوزارانی پەروەردگارمانین.

---

[1] الطبري(١٧/٤٢٢).

[2] الطبري(١٧/٤٢٣).

[3] الطبري(١٧/٤٢٤/٤٢٥).

[4] الطبري(١٧/٤٢٤).

[5] الطبري(١٧/٤٢٥).

[6] الغاشية(٢٥).

[7] فتح الباري(٣/٧٢٤).

﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ ﴾

**فەرماندان بە جێبەجێکردنی پەیوەندی خزمایەتی و قەدەغەکردنی دەست بڵاوی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ واتە: بەشی خزمی خۆت بدەو هەژاران و لە ڕێدا ماوانیش بێبەش مەکە، خوای گەورە باسی چاکەکردنی کرد لەگەڵ دایكو باوك لە پێشەوە، لێرەدا دێتە سەر باسی چاکەکردن لەگەڵ خزمانداو پەیوەندی بەردەوام لەگەڵیاندا وەك لە فەرموودەکەدا باسمان کرد:(دایکتو باوکت پاشان بەرەو خوارو بەرەو خوارتر)و لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:(پاشان نزیکترو نزیکتر).[1] وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە:(هەر کەسێك پێی خۆشە ڕۆزی تەواو بێتو ئەجەلیشی دوابکەوێت با پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنێت).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا﴾ تەواویش دەست بڵاو مەبە. کاتێك خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەخشینی سامان، قەدەغەیشی کردووە لە دەست کراوەیی لە ئەندازە بەدەر، بەڵکو ڕاست ئەوەیە مامناوەند بێت، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا﴾[3] واتە: ئەوانەش کە لە کاتی ماڵ بەخشیندا نە یەکجاری دەست بڵاونو نە تەواویش دەست قوژاون هەر لەو ناوەندەدا ماون، پاشان خوای گەورە باسی خراپی دەست بڵاوی و ماڵ بە فیڕۆدان دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ واتە: ئەوانەی هەڵە خەرجن، لەگەڵ شەیتان دەبنە براو هاوشێوەی شەیتان لەو ماڵ بەفیڕۆدانەدا، ئیبنو مەسعود دەڵێت: (التبذير) واتە: ماڵ بەخشین لە ناهەقیدا.[4] ئیبنو عەباسیش هەر وای وتووە[5]. موجاهید دەڵێت: ئەگەر کەسێك هەموو سامانی خۆی ببەخشێت لە پێناو هەقدا ئەوە دەستبڵاو نیە بەڵام ئەگەر مشتێك بدات لە غەیری هەقدا ئەوە ئەو کەسە دەستبڵاوە.[6] قەتادە دەڵێت: دەست بڵاوی ماڵ بەخشینە لە شتانێکدا

---

[1] أحمد(٢/١٢٢٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] مسلم(٤/١٩٨٢).

[3] الفرقان(٦٧).

[4] الطبري(١٧/٤٢٨).

[5] الطبري(١٧/٤٢٩).

[6] الطبري(١٧/٤٢٩).

کە ناڕەزایی خوای گەورەی تێدایە یان ناهەقییە یان گەندەڵییە[1]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پیاوێکی بەنی تەمیمی هات بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من خاوەنی سامانێکی زۆرمو خاوەنیماڵو منداڵو کەسو کارم، پێم بڵێ چۆنی ببەخشمو چی بکەم؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(زەکات لە سامانەکەت دەرکە ئەگەر زەکاتی لەسەرە، چونکە زەکات دان پاککەرەوەیەکە پاکت دەکاتەوە، خزمەکانت بەسەر بکەرەوە، هەقی ئەوەی لە دەرگا دەداتو ئەوەی دراوسێتەو ئەوەی هەژارە بزانە). وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆم کەم بکەرەوە. فەرمووی: ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴾ پیاوەکە وتی: بەسمە! ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر ئەو زەکاتەم دا بە ڕاسپاردەکەت ئەو کاتە ڕزگارم بووە لە لای خواو پێغەمبەرەکەی، واتە: تاوانبار نابم؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(بەڵێ کاتێك دات بە ڕاسپاردەکەم تۆ لێی بەرپرسیار نیتو پاداشتی خۆتی لەسەر وەردەگریت، تاوانەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە دەیگۆڕێتو دەستکاری دەکات).[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾ دەستبڵاوەکان برای شەیتانەکانن، واتە: ئەوانەی دەستوالآن لە ماڵ بەفیڕۆدان و واز هێنان لە گوێڕایەڵی خوداو هەڵسان بە تاوانو خراپەکاریدا برابەشن لەگەڵ شەیتانەکاندا، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴾ واتە: شەیتانیش بۆ پەروەردگاری بێ ئەمەك و سپڵە دەرچوو. واتە: حاشای کرد لەو بەهرانەی خودا پێی دا، سەرپێچی فەرمانی کردو دەستی دایە لاساریو خراپەکاری، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا ﴾ واتە: ئەگەر نەتبوو بەشی ئەم خاوەنبەشانەبدەیت و بە هیوای ئەوە بووی خوا بە بەزەیی خۆی دەروویەکت لێ بکاتەوە. واتە: ئەگەر خزمەکانت داوای یارمەتیان لێکردی یان ئەوانەی کە فەرمانمان پێ کردووی یارمەتیان بدەی، پشتت تێکردن لەبەرئەوەی هیچت نەبوو پێیان بدەی، بیاندوێنە و وەعدی ئەوەیان پێبدە کە ئەگەرخودا ڕۆزی نارد بەشتان دەدەمو بێ بەشتان ناکەم. موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریش ئەم ئایەتەیان: ﴿فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴾ بە بەڵێندان تەفسیر کردووە[3].

---

[1] الطبري(١٧/٤٢٩).

[2] أحمد(٣/١٣٦)، فەرموودەیەکی باشە(جید).

[3] الطبري(١٧/٤٣١/٤٣٢).

﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ ﴾

**میانەڕەوی لە ماڵبەخشین و ماڵخەرج کردندا**

خوای گەورە فەرمان بە مرۆڤ دەکات کە میانەڕەو بێت لە ماڵخەرجکردنداو باسی خراپی چاوچنۆکی دەکات و دەستواڵایی قەدەغە دەکات و دەفەرموویێت: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ ﴾ واتە: دەستەکانت کۆت مەکە بە گەردنتەوە. واتە: ئەوەندە بەخیل و چاوچنۆك مەبە کەس خێرت لێ نەبینێت، وەك جوولەکەکان لەعنەتی خوایان لێبێت دەیانوت: ﴿يَدُ اللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾[1] واتە: دەستی خوا قوچاوە. دەست قوچاویان داوەتە پاڵی خودا، خودای پاك و بێ عەیب و مەزن زۆر بەخشندەیە. هەروەها دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ﴾ تەواویش واڵای مەکە. واتە: ئەمەندەیش زۆر مەبەخشە زیاد لە توانای خۆت، زیاتر لەوە خەرج بکەی کە وەدەستی دێنی، هەتا بە داماوی و شەرمەزاری دانیشی، ئەمە لە ڕەوانبێژیدا پێی دەوترێت لەف و نەشر (اللف والنّشر) واتە: ئەگەر چاوچنۆك بوویت خەڵکی تانەو تەشەرت لێدەدان و بە تەنها دەمێنێت و کەس لێت نزیك نابێتەوەو بێ نیازن لێت. ئەگەر دەستبڵاویش بیت زیاد لە ئەندازە هیچت بە دەستەوە نامێنێتو داماوو هەناسە سارد دادەنیشیت و ئەچیتە حاڵەتی(حسیر)کە بریتییە لەو ولاغەی کە توانای بارهەڵگرتنی نامێنێتو پەکی دەکەوێت لەبەر لاوازی و بێ توانایی، بەو حاڵەتە ئەوترێ (حسیر) و لەماناکانی هیلاکبوون وەرگیراوە وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموویێت: ﴿فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ﴾[2] واتە: چاو بگێڕەو ورد بەرەوە(بزانە) هیچ ناتەواویەك دەبینێت، دووبارە چاو بگێڕە یەك لە دوای یەك چاوت بەهیلاکی و نائومێدی دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆت و ئەو(چاوە) ماندووەت تاقەتی چووە. ئەوەندە داماو دەبێت هەستی چاکەو خراپەی نامێنێت، ئیبنو عەبباس و حەسەن و قەتادەو ئیبنو جورەیج و ئیبنو زەیدو کەسانی تریش هەر بەم شێوەیە مانای ئەم ئایەتەیان کردووە، کەمەبەست پێی ڕژدی و دەستواڵایی لە ئەندازە بەدەرە[3]. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەی ئەبوزنادەوە لە ئەعرەجەوە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) کە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەیفەرموو:(وێنەی چاوچنۆك(البخيل) و بەخشندە

---

[1] المائدة(٦٤).

[2] الملك(٣ـ٤).

[3] الطبري(١٧/٤٣٤/٤٣٥).

وەك نموونەی دوو پیاو وایە، کە دوو قەڵغانی(زرێی) ئاسنیان لەبەردابێت کە نێوان مەمكو سنگو ملیان داپۆشێت، پیاوە بەخشندەکە هەرکەدەبەخشێت ئەو قەڵغانە قەف قەف دەکرێتەوەو شۆڕدەبێتەوەو بەسەر لاشەیدا تا پەنجەکانی دایدەپۆشێتو ئاسەواری نامێنێت. بەڵام ئەو چاوچنۆکەی کەهەرجارێك حەزناکات شتێك ببەخشێت ئەوە هەموو حەڵقەیەکی لە شوێنی خۆیدا دەلکێن بەیەکەوە و دەنووسێت بە لاشەیەوە، ئەو چاوچنۆکە دەیەوێت فراوانی بکاتو شلی بکات بۆی فراوان ناکرێت).[1] ئەمە لەفزی بوخاریە لە باسی زەکاتدا هێناویەتی. دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ڕێگەی موعاویەی کوڕی ئەبو موزەڕیدەوە لە سەعدی کوڕی یەسارەوە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ ڕۆژێك نیە بەندەکان ڕۆژی تیادەکەنەوە مەگین دوو فریشتە لە ئاسمانەوە دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەڵێت: ئەی خودایە! ئەوەی دەبەخشێت جێگەی بۆ پڕبکەرەوە، ئەی خوایە ئەوەی نابەخشێتو دەست قوچاوە لەناوی بدە بۆی). موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە بە مەرفوعی: (هیچ ماڵێك بە بەخشینو خێرکردن کەم ناکات، هیچ بەندەیەك ماڵ نابەخشێت مەگین خودا زیاتر سەربەرزی دەکات، هەر کەسێك لەبەر خوا خۆی بە کەم بزانێت خوا بەرزی دەکاتەوە)[2]. وە لە فەرموودەی ئیبنو کەسیردا لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە بە مەرفوعی هاتووە:(دەتانترسێنم لە چاوچنۆکی(واتە چاوچنۆك مەبن) چونکە چاوچنۆکی ئەوانەی پێش ئێوەی لەناو بردووە، ئەو چاوچنۆکیە فەرمانی پێداون دەست قوچاوبن ئەوانیش دەستقوچاویانکردووە، فەرمانیشی پێکردوون کە پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنن، ئەوانیش پچڕیویانە، فەرمانی پێکردوون خراپە بکەن دەسیان داوەتە خراپەکاری).[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ﴾ بە ڕاستی پەروەردگارت ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەسێك مەیلی لێبێت تەنگی دەکات بۆ هەر کەسێك بیەوێت، چونکە خودا خۆی ڕۆزی دەر و خۆیشی ڕۆزی دەیگرێتەوە، بە مەیلی خۆی کاری خەڵکی بەڕێوە دەبات، مەیلی لە هەر کەسێك بێت دەوڵەمەندی دەکاتو مەیلی لە هەر کەسیش ببێت هەژاری دەکات، هەموو ئەم کارانەشی پڕە لەحیکمەت و کارزانی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا﴾ واتە: هەرخۆیەتی لە عەبدانی ئاگادارەو دەیانبینێت. واتە: ئاگادارو بینایە کە کێ شایەنی دەوڵەمەندیەو کێش شایەنی هەژاریە لەوانەیە دەوڵەمەندی بۆ هەندێ کەس دەست بۆ شلکردنو مۆڵەتدان بێت، هەژاریش تۆڵە بێت، پەنا بە خوا لەمەیشو لەوەیش.

---

[1] فتح الباري(٣/٣٥٨)، مسلم(٢٠/٧٠٨).

[2] مسلم(٤/٢٠٠١).

[3] أحمد(٢/١٥٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾

**قەدەغەکردنی کوشتنی منداڵان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾ واتە: منداڵی خۆتان لە ترسی برسێتی لەناو مەبەن، ئێمەین ڕۆزی ئەوانیش‌و ئێوەیش دەدەین، کوشتنی ئەوانە هەڵەیەکی گەورەیە. ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە زۆر بە بەزەیی ترە لە بەندەکانی، هەتا لە باوکیش بۆ منداڵەکانی، چونکە خوا کوشتنی منداڵی قەدەغە کردووە‌و ئامۆژگاری باوکانیشی کردووە کە لە میراتیشدا هەقی هەموو منداڵەکان بدەن، چونکە لە چەرخی نەفامیدا میراتیان بە کچان نەدەدا، بەڵکو زۆرجار کەسی وایان بووە لەبەر هەژاری کیژەکەی خۆی کوشتووە، خوای گەورە ئەو کوشتنەی قەدەغەکردو فەرمووی: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ﴾ واتە: لەبەرهەژاری‌و نەبوونی منداڵی خۆتان مەکوژن، بۆیە گرنگی داوە بە ڕۆزی پێدانیان‌و ڕۆزی دانی مناڵەکانی پێش ئەمان خستووە، دەفەرموێت: ﴿نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ واتە: ئێمە ڕۆزی ئەوانیش و ئێوەش دەدەین، وە لە سورەتی(الانعام)یشدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾[1] واتە: لە ترسی لە برسان مردن فەرزندەی خۆتان مەکوژن، ئێمە ڕۆزی ئێوە‌و ئەوانیش دەدەین. پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴾ واتە: کوشتنی ئەوانە هەڵەیەکی گەورەیە. هەندێ خوێندوویانەتەوە:(خَطأً كبيراً) هەمان مانای ئەوی هەیە، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چ گوناهێك زۆر گەورەیە؟ فەرمووی:(هاوەڵ بۆ خوا دابنێی کە ئەو دروستی کردووی) وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی:(فەرزندەی خۆت بکوژی لە ترسی ئەوەی لەگەڵتدا خواردن بخوات)، وتم: چی تر؟ فەرمووی:(زیناکردن لەگەڵ ژنی دراوسێدا)[2].

﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾

---

[1] الانعام(١٥١).

[2] فتح الباري(١٣/٨).

**فەرمان دان بە دوورکەوتنەوە لە زیناکردن و لەهۆکارەکانی**

خوای گەورە داوێنپیسی قەدەغەکردووە لەسەر بەندەکانی و ئەو هۆکارانەشی قەدەغەکردووە کە دەبنە هۆی داوێنپیسی و دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴾ واتە: توخنی داوێنپیسی مەکەون، چونکە داوێنپیسی ئاکاری زۆر ناله‌بارەو ڕێبازێکی خراپە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئومامەوە، کە لاوێك هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگام بدە داوێنپیسی بکەم، خەڵکەکە ڕوویان تێکردو سەرزەنشتیان کرد، وتیان: بێدەنگ بە بێدەنگ بە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نزیکی کەنەوە، باش لێیان نزیك کردەوە، جا فەرمووی: (دانیشە). دانیشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئایا بۆ دایکت پێت خۆشە؟) وتی: نە بە خوا، خوا بمکاتە قوربانت، وتی:(خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ دایکیان). فەرمووی:(ئایا پێت خۆشە بۆ کچەکەت؟) وتی: نە بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوا بمکاتە قوربانت، فەرمووی:(خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ کچەکانیان)، فەرمووی:(پێت خۆشە بۆ خوشکت؟) وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوا بمکاتە قوربانت، فەرمووی: (خەڵکیش بۆ خوشکەکانیان پێیان ناخۆشە)، فەرمووی:(ئایا پێت خۆشە بۆ پورت (خوشکی باوکت(وەرگێڕ)؟) وتی: نە بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوا بکاتە قوربانت، فەرمووی: (خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ پوریان)، فەرمووی:(ئایا پێت خۆشە بۆ پورت(خوشکی دایکت (وەرگێڕ))؟) وتی: نە بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خوا بکاتە قوربانت، فەرمووی: (خەڵکیش پێیان ناخۆشە بۆ خوشکی دایکیان)، ئەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) دەستی لەسەر داناو فەرمووی: (ئەی خودایە! لە گوناهی ببوورەو دڵی پاك کەرەوەو شەرمگەی بپارێزە). ئەڵێ: دوای ئەوە ئەو لاوە لای لە هیچ شتێك نەدەکردەوە[1].

﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ۗ وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا فَلَا يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ ۖ إِنَّهُ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ ﴾

**قەدەغەکردنی کوشتنی بە ناهەق**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾ واتە: کەسێك کە کوشتنی بە ناڕەوا دانراوە مەکوژن لەسەر هەق نەبێت. خوای گەورە کوشتنی خەڵکی قەدەغە کردووە بێ بەڵگەیەکی شەرعی، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(خوێنی هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نیە کە شایەتومان بێنێت کە هیچ پەرستراو نیە جگە لە

---

[1] أحمد(٥/٢٥٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە(ﷺ) مەگین بە مەرجێك لەم سێ مەرجە: گیان بە گیانو زیناکەر پیاو بێت یان ژن، ژنی هێنابێت یان شووی کردبێتو پەشیمان بووەوە لە دینو موسڵمانانی بەجێ هێشتبێت)[1]. لە سەنەدەکاندا هاتووە: (نەمانی دنیا ئاسانترە لە لای خوا لە کوشتنی موسڵمانێك).[2] لە پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ هەر کەسێك بە ناهەقی بکوژرێت دەسەڵاتمان داوەتە دەست خاوەنی خوێنەکەی. کە هەرچی بکات لەگەڵ پیاوکوژەکە ئارەزووی خۆیەتی. دەتوانێت بیکوژێتەوە یان عەفوی بکاتو خوێنی لێ بسێنێت یان عەفووی بکاتو هیچی لێ نەسێنێت. وەك چەندفەرموودە هاتووە لەو بارەیەوە، پێشەواو زانای مەزن ئیبنو عەبباس ئەم ئایەتەی کردووەتە بەڵگە لەسەرئەوەی دەسەڵات دەست معاویە ئەکەوێت، چونکە معاویە خاوەنی خوێنی عوسمانە (ڕەزای خوای لێبێت) لەبەر ئەوەی بە ناهەقی شەهید کرا، ئەوەبوو معاویە دەسەڵاتی گرتە دەستو هەر بەو شێوەیەش دەرچوو، کە چۆن ئیبنو عەبباس لەم ئایەتە پیرۆزە تێگەیشتبوو، ئەمەیش یەکێکە لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی کەڕوویانداوە، وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا يُسْرِف فِّى ٱلْقَتْلِ﴾ واتە: لە تۆڵەسەندندا زیادەڕەوی مەکەن، واتە: دروست نیە بۆ خاوەن هەق کە پیاوکوژەکەی کوشت لوتو گوێی بکات یان کەسێکی تر لە جێی بکوژێت، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا﴾ واتە: چونکە ئەو خاوەن خوێنە یارمەتی دراوە بەسەر بکوژەکەدا بە پێی شەرعو عورفو قەدەریش.

﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾﴾

**فەرماندان بە چاك مامەڵەكردن لەگەڵ ماڵی هەتیوداو بەچاك كێشانەو پێوانە بە ڕێك و ڕاستی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ﴾ واتە: نەچن نزیکی ماڵی هەتیوان بکەون، مەگین بە شێوەیەکی چاکتر بێت هەتا پێدەگاتو تێدەگات. وەك لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾[3] واتە: ماڵی هەتیوان تێکەڵ ماڵی خۆتان مەکەن و دەست بکەنەخواردنی، چونکە ئەوەتاوانێکی گەورەیە. وە دەفەرمووێت:

[1] فتح الباري(١٢/٢٠٩)، مسلم(٣/١٣٠٢).

[2] تحفة الأحوزي(٤/٢٥٦)، النسائي(٧/٨٢)، ابن ماجه(٢/٨٧٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] النساء(٢).

﴿وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾[1] واتە: زیاد لە ئەندازە ماڵیان مەخۆن کێ دەوڵەمەندە خۆی بپارێزێت، کێش هەژارە هەر ئەوەندە کە پێویستی ژیانیەتی بە عورفی ڕۆژ لێی هەڵگرێت. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی بە ئەبوزەڕ: (ئەی ئەبوزەڕ من وا دەتبینم کە لاوازی، وە من ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە بۆ تۆش پێم خۆشە، مەبە بەبەرپرس بەسەرکەسەوە و سەرپەرشتی ماڵی هەتیوانیش مەکە[2].

﴿وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ﴾ واتە: پەیمانتان بەرنە سەر، لەگەڵ خەڵکیدا کە دەیبەستن یان کڕین و فرۆشتیان لەگەڵ دەکەن، چونکە پەیمان و بەڵێن کە دەیدەن لێپرسینەوەی لەسەرە، ﴿إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾ واتە: گشتیان پرسیاریان لەسەرە. پاشان دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ﴾ ئەگەر پێوانە دەپێون بە تەواوی پێوانە بکەن، کێشانەتان بە تەرازوو بەرامبەر بێت، خەیانەت لە کەس مەکەن (القِسْطاس) قافەکە بە بۆرو بەژێریش خوێنراوەتەوە وەك چۆن (القرطاس)یش بە بۆرو ژێریش ئەخوێنرێتەوە، (القِسْطاس)یش یانی تەرازوو، ﴿ٱلْمُسْتَقِيمِ﴾ واتە: ڕاست. کە لار نەبێت و کەم و زیادی تێدا نەبێت، ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ و هەم بۆ ئێوە باشترە و هەم ئاکامی پەسەندترە لە دنیا و لە قیامەتیشدا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ سەعید دەڵێت: لە قەتادەوە: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴾ ئەوەچاکترین پاداشت و باشترین ئامانجە بۆئێوە[3]. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئەی کۆمەڵی کاربەدەستان! ئێوە دوو شتتان پێ سپێردراوە، گەلەکانی پێشینەتان بە هۆی ئەو دوو شتەوە لەناو چوون، ئەوانەش ئەم پێوانە و ئەم کێشانەیە.

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾

**بەبێ زانیاری قسە مەکەن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾ واتە: مەکەوە شوێنی شتێکی وا کە نازانی چیە و چۆنە، چونکە گوێ و چاو و دڵیش، هەموویان پرسیاریان لەسەرە، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَا

---

[1] النساء(٦).

[2] مسلم(٣/١٤٥٨).

[3] الطبري(١٧/٤٤٦).

تَقۡفُ ﴾ واتە: قسەمەکە[1]. عەوفی دەڵێت: هێرش مەبە سەر کەسێك بە شتێك کە تۆ زانیاریت لێی نیە،[2] موحەمەدی کوڕی حەنیفە دەڵێت: یانی: شایەتی درۆ[3]. قەتادە دەڵێت: مەڵێ بینیم، کە نەتدیوە، مەڵێ بیستم کە نەتبیستووە، مەڵێ زانیم کە نەتزانیوە، چونکە خوای گەورە پرسیاری ئەمانەت گشت لێ دەکات[4]. هەموو ئەمانەی کەزانایان باسیان کردووە، ئەوەیە کە خوا نەهی لەقسەیەك کردووە کە بێ زانیاری دەکرێت، بەڵکو تەنها گومانو خەیاڵە. وەك دەفەرموێت: ﴿ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞ﴾[5] واتە: لە زۆرێك لە گومان خۆ بپارێزن، چونکە هەندێ گومانی وا هەن گوناهن، وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (خۆتان بپارێزن لە گومان چونکە گومان بردن خراپترین درۆیە)[6]. لە(سنن)ی ئەبو داوود دا هاتووە(خراپترین کەرەسەی دەستی خەڵکی ئەوەیەبڵێ: خەڵکی وا ئەڵێن)[7]. لەفەرمودەیەك تردا هاتووە: (درۆترین قسە ئەوەیە کەسێك شتێکی بەچاوی خۆی نەبینیبێت و بڵێ بینیومە)[8]. لەحەدیسی (صەحیح)یشدا هاتووە: (هەرکەسێك لەخۆیەوە بڵێ ئەم خەوەم بینیوە و نەیبینیبێت لەڕۆژی قیامەتدا زۆری لێدەکرێت گرێ لەدووموو بدات و ناشتوانێت)[9]. ﴿ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتە: ئەم سیفەتانەی کە گوێو چاوو دڵ هەیانە. ﴿ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴾ واتە: پرسیاریان لەسەرە، هەموو بەندەیەك پرسیاری لێ دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە بارەیەوە کە چۆن بە کاری هێناون، دروستە بەکارهێنانی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ لە جێی(تلك).

﴿وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ٣٧ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ٣٨﴾

---

[1] الطبري(١٧/٤٤٦).
[2] الطبري(١٧/٤٤٧).
[3] الطبري(١٧/٤٤٧).
[4] الطبري(١٧/٤٤٦).
[5] الحجرات(١٢).
[6] فتح الباري(٩/١٠٦).
[7] أبوداود (٥/٢٥٤).
[8] فتح الباري (١٢/ ٤٤٦).
[9] فتح الباري (١٢/ ٤٤٦).

**باسی خراپەی ڕۆیشتن بە ڕێدا بە فیزەوە**

خوای گەورە فیزکردن‌و خۆ بەزلزانینی قەدەغەکردووە لە بەندەکانی لە کاتی ڕۆیشتن بە ڕێدا، ئەوەتادەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾ واتە: بە فیزەوە هەنگاو بەسەر زەویدا مەنێ. وەك ستەمکارە لەخۆباییەکان، ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ﴾ واتە: تۆ ناتوانی ئەم زەمینە دادڕیو هەڵیقڵیشێنی بە هەنگاوی خۆت، ئیبنو جەریر دەڵێ: ئەم نیوە شیعرەی ڕەئوبەی کوڕی عەججاجی بە نموونە هێناوەتەوە کە دەڵێت: (وقاتم الأعماق خاوى المُختَرَق).

وە دەفەرموویێت: ﴿وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا﴾ واتە: لە درێژیشدا هەرگیز ناگەیتە کێوەکان، بە خۆبازدان‌و فیزکردن‌و خۆ بەزلزانین، بەڵکو خاوەنی ئەم خوە بەدانە بە پێچەوانەی ئەو مەبەستەی خۆی پاداشتی دەدرێتەوە، وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە:(پیاوێك بووە لە پێش ئێوەوە ڕۆژێکیان دەڕۆیشت بە ڕێدا دوو عەبای پۆشیبوو فیزی پێوە دەکردن، لە پڕ بە زەویدا ڕۆچووە خواری، ئەو کەسە هەتا ڕۆژی قیامەت لەناویدا هەر زرمەی دێت‌و دەنگ دەداتەوە)[1]. هەربەوشێوەیەش خوای گەورە باسی قارونی کردووە، کەهاتووەتە دەرەوەو خۆی ڕازاندبووەتەوە، خودا بەخۆی‌و کۆشك‌و تەلاریەوە بردی بە ناخی زەویدا، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ واتە: هەموو ئەمانە خراپەکانیان بە لای پەروەردگاری تۆوە ناپەسندن، ئەوزانایانەی کە خوێندوویانەتەوە بە(سيئة) یانی: ناشیرین، واتە: لای خوا هەموو ئەوانەی کە قەدەغەی کردوون شتێکی ناشیرینن، هەر لەو ئایەتەوە کە دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا﴾ واتە: هەموو ئەوانە لای خوا شتێکی زۆر خراپەو تۆڵەی خۆی هەیە، خودا پێی ناخۆشەو لێی ڕازی نیە، بەڵام ئەوانەی کەبە ﴿سَيِّئُهُۥ﴾ دەیخوێننەوە وەك ئیزافە(الإضافة) واتە: ئەوانەی کە گشت باسمان کردن هەر لە: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ هەتا ئێرە، ئەوانە شتە ناشیرینەکان‌و لای خوا باش نیەو خراپە، ئیبنو جەریریش هەر بەو شێوەیە تەفسیری کردووە (ڕەحمەتی خوای لێبێت).

---

[1] مسلم(٣/١٦٥٤).

﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾﴾

**هەمووئەوبڕیارانەی پێشەوە بەشێکن لە نیگاو لە کارزانی پەروەردگار**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ﴾ واتە: ئەمانەیش بەشێکن لەو کارزانانە کە پەروەردگارت بە تۆی ڕاگەیاندووە، کە بریتیە لە ڕەوشتی جوانو دوورکەوتنەوە لە کاری بەدو ناشیرین. تا تۆ ئەی موحەمەد(ﷺ) خەڵکی لێ ئاگادار بکەی کە بەجێی بێنن، ﴿وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا﴾ واتە: جگە لە خوا پەرستراوی تر مەپەرستە، ئەوسا بە سەرزەنشتکراویو ڕاونراوی دەخرێیتە ناو جەهەنەمەوە، خۆت نەفرین لە خۆت دەکەیو خواو خەڵکیش لۆمەت دەکەن. لە هەموو خێرێك بێبەش دەبی، ئیبنوعەباسو قەتادە دەڵێن: ﴿مَّدۡحُورًا﴾ واتە: دەرکراوە.[1] مەبەست بەم ئاگاداریە ئوممەتی پێغەمبەرە(ﷺ) لەڕێگەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) چونکە پێغەمبەرخۆی(ﷺ) بێ گوناهو مەعصومە لەو خراپانە.

﴿أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾﴾

**وەڵامدانەوەی ئەوانەی وا گومان دەبەن کە فریشتەکان کچی خوان( سبحانه وتعالى )**

خوای گەورە وەڵامی ئەو بتپەرستە درۆزنانە دەداتەوە(بەر نەفرینی خوا کەون) کە وا گومان دەبەن کە فریشتە کچی خوان، هەروەها ئەو فریشتانەی کە بەندەی ڕاستی خوان خودان مێینەن و پاشان ئەڵێن: ئەم کچانەی خوا ئەبێ بپەرسترێن، ئەمانە لە هەرسێ بۆچوونەکەیاندا بە هەڵەدا چوونو تاوانێکی زۆر گەورەیان کردووە، بۆیە خوا ڕەتیان ئەداتەوە و دەفەرمووێت: ﴿أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ﴾ واتە: ئایا پەروەردگاری ئێوە بە تایبەتی کوڕی بە ئێوە بەخشیوە، ﴿وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا﴾ فریشتە مێینەکانیشی بۆ خۆی داناوە؟ بە خەیاڵی ئێوە. پاشان توندتر ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێتو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا﴾ بە ڕاستی ئێوە قسەیەکی ناقۆڵای زۆر زل دەکەن. کە ئەڵێن خودا منداڵی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو پاشان لە منداڵیشدا کیژتان بۆخوا داناوە کە خۆتان پێتان شوورەییە بۆ خۆتانی دابنێن کەڕێدەکەوت، بە زیندەبەچاڵ کردن ئەتانکوشتن، بە ڕاستی ئەو بەشکردنە، بەشێکی زۆر ناڕەوایە. خوای گەورە لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ

---

[1] الطبري(١٧/٤٥٢).

ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴾[1]

واتە: گاورو جوولەکەکان دەیان وت خوا مندالّی بۆ خۆی داناوە، سوێند بە خوا بە ڕاستی شتێکی زۆر نابەجێو سەیر دەڵێن، نزیکە ئاسمانەکان لەت لەتو پارچە پارچە ببن لەبەر ئەو(قسەیە)و(نزیکە) زەویش شەق بەرێتو بقلیشێتو(نزیکە) شاخو چیاکان بەیەك جار بڕوخێن، لەبەر ئەوەی(بێباوەڕان) مندالّ دەدەنە پالّ خوای میهرەبان، بۆ خوای میهرەبان شیاو نیە کە مندالّی هەبێت، هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدان بە بەندەیی دێنە لای خوای میهرەبان(هیچ کەسێك لەوانە نیە بەندەی خوای میهرەبان نەبێت)، سوێند بە خوا بە ڕاستی هەموویانی سەرژمێری کردووە بە ژماردن، هەر هەموویان بە تاکو تەنها دێنەوە بۆ لای(خوا) لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ واتە: ئێمە لەناو ئەم قورئانەدا زۆر شتمان ڕوونو شی کردووەتەوە، لە هەڕەشەو نیشانەی زۆرو ئامۆژگاری، بۆ ئەوەی پەند وەرگرنو وازبێنن لە بتپەرستیو ناهەقیو بوختان هەڵبەستن، ﴿وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ کەچی ئەو خوانەناسانە هەر زیاتر لە هەق دوور دەکەونەوە.

﴿قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِي ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِي ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا﴾ ئەی موحەمەد(ﷺ) بلّێ: ئەگەر لەگەلّ خودا پەرستراوێکی تر ببوایە، وەك ئەو بتپەرستانە ئەلّێن، ئەو کاتە دەگەڕان بە دوای ڕێگەیەکدا بۆ لای خاوەنی تەخت(العرش) کە خوایە. واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) بلّێ بەو بتپەرستانەی کە وا دەزانن خوا شەریکی هەیە لەوانەی کە خۆی دروستی کردوون، دەیکەنە هاوەڵیو دەیپەرستن لەگەڵی، بۆ ئەوەی لە خواوە نزیکیان بخەنەوە، ئەگەر ئەوەی ئەوانە دەیڵێن وایەو لە لای خودا تکایان بۆ دەکەن ئەگەر ئەوانەی ئەوان دەیانپەرستن، ویستیان ببوایە ئەوانیش هەر خودایان دەپەرست و خۆیان لە خودا نزیك دەکردەوەو دەگەڕان بە شوێن ئەو هۆکارانەدا کەلەخوا نزیکی بکردنایەتەوە، دەی کەواتە ئێوەش تەنها ئەو خودایە بپەرستن وەك ئەوانە کە دەیپەرستن کە ئێوە هاواریان لێ دەکەن جگە لە خوا، ئێوە هیچ پێویستیەکتان بە پەرستراوێکی تر نیە کە ببێتە تکاکار لە نێوان ئێوەو خوادا، دیارە خودا شتی وای پێخۆش نیەو پێشی ڕازی نیە، بەلّکو پێی

[1] مریم(٨٨ـ٩٥).

ناخۆشەو هەگیز قەبوڵی ناکات، چونکە خودا لەسەر زمانی گشت پێغەمبەرەکانی(سەلامی خوایان لێبێت) قەدەغەی ئەوەی کردووە. بۆیە باسی پاکیو بێعەیبی خۆی دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا﴾ واتە: خوا پاکو بێعەیبو بەرزترە لەوانەی کە ئەو(بتپەرستانە) باسی لێ دەکەن، دەڵێن لەگەڵ خودا پەرستراوێکی تر هەیەو ئەمە ناهەقیەکی زۆر گەورەیەو خوا دوورە لەو قسانەوە ئەوانە دەیکەن، بەڵکو تاکو تەنهایەو بێ نیازە لە هەموو شتێکو کەس لێی نەبووەو کەسیشی لێ نابێت، هیچ کەس هاوتای خوا نیە.

﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾﴾

## هەموو شتێك باسی پاكو بێعەیبی خوا دەكات

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ واتە: هەر حەوت ئاسمانەکانو زەمینو هەرچی لەناویاندایە ستایشی خودا دەکەن، واتە: هەرچی دروستکراوەکانە باسی پاکو بێعەیبیو گەورەییو دەسەڵاتو توانای بێسنووری ئەودەکەنو خوا دوورە لەو شتانەی کە بتپەرستان دەیڵێن، هەموو شایەتی دەدەن کە تاکو تەنهایە لە پەرستنو پەروەردگارییدا.

ففي كل شيء له آية تدل على أنه واحد

واتە: لە هەموو شتێکدا نیشانە هەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا یەکەو شەریکی نیە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا﴾[1] واتە: لەوانەیە لەو قسەیە ئاسمانەکان هەڵتەکێنو زەمین شەق ببێتو کێوەکان و بروخێن، لەبەر ئەوە ئەڵێن خوا فەرزندەی هەیە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ واتە: هەموو شتێك تەسبیحانی ئەو دەکات بەڵام ئێوە ئەی خەڵکینە تەسبیحاتو پاکانەی ئەوان نابیسن چونکە ئەو تەسبیحاتە بەزمانی ئێوەناکرێت، ئەمەش هەموو شتێك دەگرێتەوە، بە زیندەوەرو بێگیانو رووەکیشەوە، ئەم قسەیە مەشهورترە لەهەموو قسەکانیتر. وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە کە دەڵێت: ئێمە گوێمان لە تەسبیحاتی خواردن بوو کە دەخورا[2]! ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە مەعازی کوڕی ئەنەسەوە،

---

[1] مريم(٩٠ـ٩١).

[2] فتح الباري(٦٧٩/٦).

لە باوکیەوە، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە چووە ناو کۆمەڵێك لەسەر وڵاغەکانیان دەوەستان و بە ڕێگایشدا دەڕۆیشتن دەمەتەقێیاندەکرد، پێی فەرموون: (سواریان بن بە سەلامەتیو وازیشیان لێ بێنن بە سەلامەتی مەیانکەنە کورسی بۆ خۆتان بۆ قسەکردن لە ڕێگاو بازاڕەکاندا، لەوانەیە وڵاغی سواری وا هەبێت زۆر چاکتر بێت لە سوارەکەی سەری! و لەئەو زیاتریش یادی خوا بکات).[1] وە لە سونەنی نەسائیشدا هاتووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی کوشتنی بۆق کردووە. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا﴾ واتە: ئەو خوایە لەسەرخۆو لێبوردەیە، چونکە پەلە ناکات لەو کەسانەی کە لێی یاخی دەبن، زوو تۆڵەیان لێ ناسێنێت، بەڵکو دوایان دەخات و مۆڵەتیان بۆ دەهێڵێتەوە. ئەگەر هەر بەردەوام بوون لەسەر بێدینیو لاساری خۆیان زۆر بە توندی دەیانگرێت و کپیان دەکاتەوە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە:(بێگومان خودا مۆڵەتی ستەمکار دەدات بەڵام کاتێك کە گرتی لە دەستی دەرناچێت).[2] پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ﴾[3] واتە: ئا بەو شێوەیە سزای پەروەردگارت، کاتێك خەڵکی شارەکان سزا دەدات کە ستەمکار بوون. وە دەفەرموویت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ﴾[4] واتە: وە(خەڵکی) چەندەها شارو دێ(هەبوون) مۆڵەتم دان کە ستەمکار بوون. وە دەفەرموویت: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ﴾[5] واتە: ئینجا چەندەها شارو دێهاتمان وێران کرد کە(خەڵکەکەی) ستەمکار بوون. بەڵام کەسێك وازی هێنا لەو خوانەناسیو لاساریەی کە تێیدا ژیاوەو گەڕایەوە بۆ لای خوداو پەشیمان بووەوە، خوا تەوبەی لێ قەبوڵ دەکات. وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[6] واتە: هەر کەسێك کارێکی نالەبار بکات، یان ناهەقیەك لە خۆی بکات، پاشان لە خودا بخوازێت کە بیبەخشێت، دەبینێت کە خوا بەسۆز و لێبوردەیە. وەك ئەم ئایەتانەیش کە لە کۆتایی سورەتی(الفاطر)دا هاتووە کە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾

---

[1] أحمد(٣/٤٣٩)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[2] فتح الباري(٨/٢٠٥)، مسلم(٤/١٩٩٧).

[3] هود(١٠٢).

[4] الحج(٤٨).

[5] الحج(٤٥).

[6] النساء(١١٠).

وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴾[1].

﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ ﴾

**پەردە بەسەر دڵی بتپەرستانە وەیە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾ واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) کاتێك کە قورئان دەخوێنی، لە نێوان تۆو ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە پەردەیەك دادەنێین. قەتادەو ئیبنوزەید دەڵێن: واتە: ئەوپەردە ئەستوورانەی لەسەردڵیانە[2]. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ ﴾[3] واتە: وتیان: ئەوەی کە تۆ بانگمان دەکەی بۆی، دڵمان پۆشاکی لەسەرەو گوێمان کەڕەو پەردەیەك هەیە لە نێوان ئێمەو تۆدا. کە بووە بە لەمپەر هیچ قسەیەکی تۆ بە ئێمە ناکات ﴿ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴾ بەمانای: پەردەی داپۆشێنەر دێت. وەك (میمون و مشئوم) کە بە مانای (یامن و شائم)دێت، کەلە (يَمَنَهُمْ) و (شَأَمَهُمْ)ە وە هاتووە، واتە: پیرۆزی کردن و ڕەشبینی کردن، ئەڵێن: (مستوراً) یانی لەبەر چاو نیەو داپۆشراوە و نابینی، لەگەڵ ئەمەشدا پەردەیەکیشە لە نێوان ئەوانو شارەزابووندا! ئیبنو جەریر ئەم ڕایەی بە لاوە چاکە، حافیز ئەبویەعلای موسڵی لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ڕیوایەتی کردووە و ئەڵێت:

---

[1] الفاطر(٤١ـ٤٥).

[2] الطبري(١٧/٤٥٧).

[3] فصلت(٥).

کاتێك کە سورەتی ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾ هاتەخوارەوە، ژنە دەم پیسەکە کە(ئوم جەمیل)ە هات و بەدەم وەلوەلە کێشانەوە بەدرێکی سافی بە دەستەوە بوو دەیوت: (مذمماً أتينا-أو أبينا ودينُهُ قلينا وأمره عصينا) ئەبو موسا دەڵێت: من خۆم گومانم هەیە ئایا(أبينا) یان(أتينا)یە، واتە: زەمکراوێك هات بۆ لامان، ئێمە قەبوڵمان نەکردو ئاینەکەیمان پشتگوێ خشتو گوێشمان لێ نەگرت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانیشتبوو، ئەبو بەکریش لە تەنیشتی، یان لەگەڵی بوو. دەڵێت: ئەبو بەکر(ڕەزای خوای لێبێت) وتی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوژنە هات من دەترسم تۆ ببینێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەو من نابینێت) دەستی کرد بە قورئان خوێندن بەو قورئان خوێندنە خۆی پاراست لێی: ﴿وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا﴾، دەڵێ: هاتو لە لای ئەبو بەکر وەستا، بەڵام پێغەمبەری(ﷺ) نەبینی، وتی: هەواڵم پێ گەیشتووە کە هاوەڵەکەت قسەی پێ وتووم، ئەبو بەکر وتی: نەخێر بە پەروەردگاری ئەم ماڵە، واتە: (کەعبەی پیرۆز) قسەی پێ نەوتووی، وتی: پاشان ڕۆیشتو دەیوت: قورەیش چاك زانیویانە کە من کچی گەورەکەیانم[1]. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً﴾ واتە: چەند پەردەیەکی ئەستوور دەدەین بەسەر دڵیاندا، ﴿أَكِنَّةً﴾ کۆی(کنان) ئەو پەردەیە کە دڵ دادەپۆشێت، بۆ ئەوەی لە قورئان تێ نەگەن. ﴿وَفِيٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا﴾ گوێکانیشیان کپ دەبن، واتە: گوێیان وا قورس دەکات کە نایەڵێت قورئان باش ببیسن، بەوشێوەیە سودی لێ وەربگرنو ڕێگای پێ دەرکەن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ﴾ هەر کاتێك لە قورئانەکەدا ناوی پەروەردگاری تاکت بە دەمدا دێ، دەڵێت: (لا إله الاّ الله). ﴿وَلَّوْاْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا﴾ واتە: بە قینەوە پاش هەڵدەکەن. ﴿نُفُورًا﴾ کۆی(نافر)ە وەك چۆن(قعود) کۆی(قاعد)ە. دەشبێت چاوگی بێت و فیعلی نەبێت (والله أعلم). وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾﴾[2] واتە: هەر کاتێك ناوی خوای تەنیا بە یاد بکرێت، ئەو کەسانەی باوەڕیان بەو دنیا نیە، دڵیان بەو ناوە دەشێوێت، ئەگەر باسی غەیری خوایان لا بکرێت حەزی لێدەکەنو پێیان خۆشە. قەتادە دەڵێت: لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِي ٱلْقُرْءَانِ﴾ کاتێك موسڵمانان بڵێن: (لا إله الاّ الله) موشریکەکان ئەوەیان زۆر پێناخۆشەو زۆر بە لایانەوە گرانەو شەیتانو

---

[1] مسند أبي يعلى(١/٥٣)، سەنەدەکانی لاوازە.

[2] الزمر(٤٥).

لەشکرەکەی دڵیان تەنگ دەبێت، بەڵام خوای گەورە: ئاینی خۆی هەر برەو پێدەداتو بەرزی دەکاتەوەو سەری دەخاتو زاڵی دەکات بەسەر ئەو کەسانەدا کە دژایەتی دەکەن، ئەم وتەی (لا إله الاّ الله)یە، هەر کەسێك بەم چەکە دژایەتی بکات ڕزگاری دەبێت، هەر کەسێك بەم چەکە جەنگ بکات سەرکەوتوو ئەبێت، بێگومان خەڵکی ئەم دوورگەیە لە موسڵمانان باش ئەمەدەزانن، دوورگەیەك کە لەچەند شەوێکی کەمدا سوارێك دەیبڕێت، کەچی زەمانە دەڕواتو تێدەپەڕێت بەسەر کۆمەڵی کەسدا کەئەم ڕاستییە هەر نازانن‌و دانی پێدا نانێن.[1]

﴿ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٤٨﴾ ﴾

## چەپەچپی قورەیش دوای گوێ گرتنیان لە قورئان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴾ ئێمە باشتر دەزانین گوێ لە چی دەگرن، لەو کاتەدا کە گوێ بۆ تۆ دەگرن، هەر خەریکی سرتەکردنن، کاتێك ستەمکاران دەڵێن: ئێوە هەر دەکەونە شوێن پیاوێکی جادولێکراو. خوای گەورە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئاگادار دەکات لە سرتەو جفەی پیاوە سەردارەکانی قورەیش لەناو خۆیاندا کاتێك دەهاتن بۆ گوێ گرتن لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) بە پەنهانی‌و بە دزی هۆزەکەیانەوە، کە لەناوخۆیاندا دەیانوت: محمد پیاوێکی جادوولێکراوە، لەو بارەیەوە قسەی زۆر دەکرا، بەڵام لەوێدا دەیانویست بڵێن: جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە، جنۆکەیەکی هەیە دێتە لای ئەو قسانەی فێر دەکات کە دەیخوێنێتەوە. هەندێك دەیان وت: شاعیرە، هەندێ دەیانوت: فاڵچییە، هەندێ دەیاوت: شێتە، هەندێکی تر دەیانوت: جادووگەرە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴾ واتە: دە بڕوانە چۆن نموونەت بۆ دەهێننەوە، ئەوانە وا لە ڕێ لایانداوە، تازە ڕێگە دەرناکەن. واتە: ئیتر شارەزای ڕێگای ڕاست نابن‌و ڕێگایەك نادۆزنەوە لێیەوە ڕزگار بن. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق لە (السيرة)دا دەڵێت: موحەمەدی کوڕی موسلمی کوڕی شیهابی زوهەری بۆی گێڕامەوە کە ئەبو سوفیانی کوڕی حەربو ئەبو جەهلی کوڕی هیشام‌و ئەخنەسی کوڕی شەریقی کوڕی عەمری کوڕی وەهەبی سەقەفی کە هاوپەیمانی بەنی زوهرە بوو، هەرسێکیان شەوێك لە ماڵ چوونە دەرەوە بۆ ئەوەی گوێ بگرن لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك لە شەودا لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژ دەکات. هەر کەسەو شوێنێکی بۆ خۆی گرت بۆ ئەوەی گوێی تیا بگرێت، هیچ

[1] الطبري(١٧/٤٥٨).

کەسێکیان بە شوێنی هاوەڵەکەی تری خۆی نەدەزانی. هەتا بەیانی خۆرهەڵدەهات دەمانەوەو پاشان بڵاوەیان لێدەکرد، کاتێك کە لە ڕێگادا بەیەك دەگەیشتن لۆمەی یەکتریان دەکرد، بە یەکتریان دەوت: جارێکی تر مەیەنەوە بۆ ئێرە ئەگەر هەندێ لەو خەڵکە سادەیە چاوی پێتان بکەوێت تووشی دوو دڵیو گومانیان دەکەن، پاشان بڵاوەیان لێکرد، کاتێك کە شەوی دووهەم هات هەریەکە لەو پیاوانە گەڕانەوە بۆ شوێنەکەی هۆیانو مانەوە گوێیان لێدەگرت، هەتا خۆرهەڵدەهات، پاشان بڵاوەیان لێ دەکردو لە ڕێگا دەگەیشتن بەیەك، دیسان ئەو قسانەیان بە یەکتری دەوت کە یەکەمجار وتیان، پاشان دەڕۆیشتن هەتا شەوی سێهەم، دیسان هەر کەسەو دەچووەوە بۆ شوێنی خۆیو گوێی لێدەگرت، هەتا خۆری بەیانی هەڵدەهاتو بڵاوەیان لێکردو لە ڕێگا بەیەك گەیشتنەوە، ئەمجارە بە یەکتریان وت: لە یەك جیا نابینەوە هەتا پەیمان دەدەین جارێکی نەگەڕێینەوە! پەیمانیاندا بە یەکتری لەسەر ئەوەو پاشان بڵاوەیان لێکرد. بۆبەیانی ئەخنەسی کوڕی شەریف گاچۆنەکەی هەڵگرت و پاشان هاتە دەرەوە و چووە بۆ ماڵی ئەبو سوفیان، وتی: ئەی ئەبو حەنزەلە پێم بڵێ تۆ چی دەڵێیت سەبارەت بە ئەوەی بیستت لە موحەمەد(ﷺ)؟ وتی: ئەی ئەبو سەعلەبە سوێند بە خوا چەند شتێکیشم بیستووە لە ماناکەی باش حاڵیم وئەزانم مەبەستیش پێی چییە، هەندێ شتیشم لێبیستووە و لێی تێ نەگەیشتوم و ناشزانم مەبەست پێی چیە! ئەخنەس دەڵێت: سا منیش بەو کەسەی تۆ سوێندت پێ خوارد (هەروەکو تۆم)، پاشان لە لای ئەبو سوفیان هەڵساو ڕۆیشت بۆ لای ئەبو جەهل چووە ماڵی ئەبو جەهل، وتی: ئەی ئەبولحەکەم پێم بڵێ تۆ ڕت چییە لە بارەی ئەوەی بیستوتە لە موحەمەدەوە(ﷺ)؟ وتی: من چیم بیستووە؟ جا وتی: ئێمەو نەوەی عەبدولمەناف کێشەمان بوو لەسەر سەرداری، ئەوان خواردنیان دەدا بە خەڵکی، ئێمەیش خواردنمان ئەدا بە خەڵکی، ئەرکی گرانی خەڵکیان هەڵدەگرت، ئێمەش هەڵمان دەگرت، ماڵیان دەبەخشی ئێمەیش دەمان بەخشی، هەتا وای لێهات کێ بەرکێمان دەکرد لەگەڵ یەکتری وەك دووسواری ناو کێبەرکێ، ئەوان دەڵێن: لەناو ئێمەدا کەسێ هەیە نیگاوو وەحی بۆ دێت لە ئاسمانەوە. دەی ئێمە کەی ئەگەینە ئەوشتە؟ کەواتە بە خوا هەرگیز بڕوا بەوەناکەین و نایسەلمێنین، ڕیوایەتەکە ئەڵێ: ئیتر ئەخنەس هەڵسا لایو بەجێی هێشت[1].

﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾ ۞ قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ

---

[1] ابن هشام(١/٣٣٧)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ قُلْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبًا ﴿٥١﴾ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٥٢﴾﴾

**وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی بڕوایان نیە بە زیندووبوونەوەی پاش مردن**

خوای گەورە باسی خوانەناسان دەگێڕێتەوە، ئەوانەی کە هاتنی ڕۆژی قیامەت بە دوور دەزانن‌و بڕوایان پێی نیە، پرسیاری نکوڵیکەر ئەکەن: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا وَرُفَـٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ واتە: ئاخۆ ئەگەر ئێسك‌و پروسکیش بین سەرلەنوێ دروست دەبینەوە؟. واتە: ئایا ئەگەر ببینە خۆڵیش هەر زیندوو دەکرێینەوە، عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو موجاهید دەڵێن: لە ئیبنو عەبباسەوە واتە: ئایا بوینە تۆز هەر زیندوو دەکرێینەوە[1]؟ ﴿أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا کە بووینە ئێسکە ڕزیوو نەماین‌و باسمان بڕایەوە وەك خوای گەورە لەسەر زمانی ئەو خوانەناسانە لە چەند ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ﴾[2] واتە: ئەڵێن: ئایا دەمانگێڕنەوە بۆ سەر زەمین؟ لە پاش ئەوە کە چەند پێشەی کلۆرو ڕزیو بووین؟ ئەڵێن: ئیتر ئەگەر وابێت ئەم گەڕانەوەیە دۆڕانەو زیان بەخشە. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ﴾[3] واتە: ئەو نموونەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوە و دروست بوونی خۆی لەبیر کردووە. خوای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە وەڵامیان بداتەوە و دەفەرمووێت: ﴿قُلْ كُونُوا۟ حِجَارَةً أَوْ حَدِيدًا﴾ واتە: بڵێ: ئێوە باببن بە بەرد یان بە ئاسن (هەر زیندوو ئەکرێنەوە). چونکە بەردو ئاسن بەرگریان زۆرترەو ڕەقترن لە ئێسك‌و پروسکی ڕزیو، ﴿أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ﴾ واتە: یان هەر دروستکراوێك کە لە خەیاڵی ئێوەدا زل بنوێنێت. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: لە ئیبنو ئەبی نەجیمەوە، لە موجاهیدەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە ئیبنوعەبباس دەربارەی ئەم ئایەتە، وتی: ئەوە مەبەست پێی مردنە، عەتیە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِى صُدُورِكُمْ﴾ ئەڵێ: یانی ئەگەر مردوویش بوونایە زیندوومان دەکردنەوە.[4] سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو ساڵح و حەسەن و قەتادەو زەححاك‌و کەسانی

---

[1] الطبري(١٧/٤٦٤).

[2] النازعات(١٠ـ١٢).

[3] يس(٧٨).

[4] الطبري(١٧/٤٦٣).

تریش هەر وایان وتووە.[1] مانای ئەوەیە، ئەگەر واتان دانا چوون بە ڕێی خۆتانەوەو مردن-کە مردن دژی ژیانە- خودا زیندووتان دەکاتەوە هەرکات کە مەیلی لێبێت، چونکە هیچ شتێك نابێتە ڕێگر لە ڕێیدا ئەگەر بیەوێت. موجاهید دەڵێت: ﴿أَوْ خَلْقًا مِّمَّا يَكْبُرُ فِي صُدُورِكُمْ﴾ واتە: ئاسمانو زەمینو کێوەکان. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: هەرچی ئارەزووتان لێیە ببن بەوە، پاش مردن خوا هەر زیندووتان دەکاتەوە، ﴿فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَا قُلِ الَّذِي فَطَرَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ ئەوسا دەڵێن: کێ زیندوومان دەکاتەوە؟ کاتێك کە بوینە بەردو ئاسن و هەر شتێکی تر، بڵێ: ئەوەی یەکەمجار دروستی کردن، کە شتێ نەبوون باستان بکرێت پاشان کردنیە مرۆڤو بڵاوەتان کرد بەسەر زەمیندا، ئەو کەسە توانای هەیە دروستتان بکاتەوە با بن بە هەر شتێك، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَؤُا الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[2] واتە: ئەو(خوا) زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردووە لە پاشان (دوای مردن) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم(دروستکردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَسَيُنْغِضُونَ إِلَيْكَ رُءُوسَهُمْ﴾ واتە: ئەوسا سەرت بۆدەلەقێنن. ئیبنو عەبباسو قەتادە دەڵێت: بە گاڵتە کردنەوە سەر دەلەقێنن[3]. ئەمەی ئیبن عەبباس و قەتادە ئەیڵێن عەرەبەکان چاکتر لێی تێدەگەن لە زمانی خۆیاندا، چونکە(الأنغاص) بریتیە لە سەر لەقاندن لە سەرەوە بۆ خوارەوەو یان لە خوارەوە بۆ سەرەوە. بۆیە وتراوە بە بەچکەی نەعامە (نَغض) چونکە کاتێك کە بە ڕێدا دەڕوات بە پەلە دەڕواتو سەری دەلەقێنێت، وتراوە:(نَغَضَتْ سِنُّهُ) دانەکەی لەقی، یانی کاتێ دان جوڵاو لە شوێنی خۆی بەرز بووەوەو سەری دەرهێنا، ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ﴾ دەڵێن ئەوە کەی دەبێت. ئەوەندە بە دووری دەزانن و بڕوایان پێی نیە کە ڕوویدات. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[4] واتە: وە دەڵێن ئەم بەڵێنە کەی دێت ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن. وە فەرموویەتی: ﴿يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا﴾[5] واتە: ئەوانەی باوەڕیان پێی نیە پەلەی هاتنی دەکەن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ عَسَىٰ أَن

---

[1] الطبري(١٧/٤٦٣).

[2] روم(٢٧).

[3] الطبري(١٧/٤٦٧).

[4] يس(٤٨).

[5] شورى(١٨).

يَكُونَ قَرِيبًا ﴾ واتە: بلّێ: لەوانەيە (ئەو ڕۆژە هاتنی) نزيك بێت. واتە: ئاگاتان لە خۆتان بێتو بترسن لە هاتنی ئەو ڕۆژە، چونكە زۆر نزيكەو گومانی تێدا نيە هەر دێت، هەر شتێك كە بێت هەر دێت، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴾[1] واتە: پاشان كاتێك(تەنها يەكجار) بانگتان بكات لەم زەمينەدا ئێوە لە پڕ دێنەدەر، بێ گوێيی ناكرێتو ڕێگری نيە وەك لە ئايەتێكی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِٱلْبَصَرِ ﴾[2] واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها يەك جارە وەك چاوتروكانێك(وايە لە خێرايدا). وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾[3] واتە: بێگومان وتەی ئێمە بۆ هەر كارێك كاتێك بمانەوێت(ئەمەيە) كە پێی دەڵێين: ببە! ئەويش يەكسەر دەبێت. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾[4] واتە: تەنها ئەمە كاری يەك نەعرەتەيە ئەوسا لەپڕ لەو دەشتە دەردەكەون. واتە: خەڵكی لەناو زەمين دێنە دەرەوە بۆ سەر زەمين. وەك لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِۦ﴾ واتە: ڕۆژێك كە بانگتان دەكات ئێوە بە سوپاسەوە وەڵامی دەدەنەوەو گوێڕايەڵی فەرمانی دەكەنو چی بفەرمووێت بەجێی دێنن، ﴿وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: وا دەزانن كەمێك نەبێت لەسەر دنيا نەژياون. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا﴾[5] واتە: بێباوەڕان كە ئەو ڕۆژە دەبينن وا دەزانن ئێوارەيەك يان چێشتەنگاوێك نەبێت لە دنيادا نەماونەتەوە. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا﴾[6] واتە: ئەو ڕۆژەی كە فوو دەكرێت بە شەيپووردا (بۆ جاری دووەم) ئەوسا تاوانباران كۆدەكەينەوە لەو ڕۆژەدا لەشو چاويان شين هەڵگەڕاوە، بە چرپەوە لە نێوان خۆياندا دەڵێن ئێوە تەنهادە شەوو ڕۆژ لە دنيادا ماونەتەوە، ئێمە چاك ئاگادارين لەوەی ئەوان دەيڵێن كاتێك (ئەوەيان) كە ژيرترينيانە و نزيكترينيانە

---

[1] روم(٢٥).
[2] القمر(٥٠).
[3] النحل(٤٠).
[4] النازعات(١٣ـ١٤).
[5] النازعات(٤٦).
[6] طه(١٠٢ـ١٠٤).

لە ڕاستیەوە دەڵێت: ئێوە تەنها یەك ڕۆژماونەتەوە. وە دەفەرموویێت: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ﴾[1] واتە: وە ڕۆژی قیامەت هەڵدەستیٚ تاوانباران سوێند دەخۆن (لە دنیادا یا لە بەرزەخدا) تەنها ساتێك ماونەتەوە هەر بەوشێوەیە ئەوان لە دنیادا فریویانخوارد و لادران لە ڕاستی. وە دەفەرموویێت: ﴿قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[2] واتە:(خوا) دەفەرموویێت: چەند ساڵ لەسەر زەویدا مانەوە(لە وەڵامدا) دەڵێن: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێك ماینەوە و لەو فریشتانە بپرسە کە ژمێریارن، (خوا) ئەفەرمویٚ: ماوەیەکی کەم نەبێت نەماونەتەوە. ئەگەر بە ڕاستی ئێوە دەتانزانی؟

﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾﴾

**با مەردم کە قسە دەکەن زۆر بە چاکیو ئەدەبەوە قسە بکەن**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا﴾ واتە: تۆ بە بەندەکانی من بڵیٚ چی باشترە ئەوە بڵێن، چونکە شەیتان ئاژاوە دەخاتە نێوانیان، بە ڕاستی شەیتان بە ئاشکرا دوژمنی ڕەگەزی ئادەمیە. خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەمەد(ﷺ) کە بەندە خاوەن باوەڕەکانی ئاگادار بکات کاتێك کە قسەو گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری دەکەن بە شێوەیەکی چاك بدوێن قسەی باش بکەن، ئەگەر وا نەکەن شەیتان دەخزێتە ناویانو لێیان تێك دەدات هەر بە قسەکردن ناوەستێت، بەڵکو بە کرداریش دەکەونە ئازاردانی یەکتری، ئاژاوە و پشێویو کوشتار دەخاتە ناویان. چونکە لەو ڕۆژەوە شەیتان سوژدەی نەبردووە بۆ ئادەم دوژمنایەتیەکی گەورەی بەرپاکردووە بەرامبەر ئادەمو نەوەکانی، بۆیە ڕێگا نەدراوە هیچ کەسێك ئاسنو چەك ڕوو بکاتە برای موسڵمانی خۆی، چونکە لەوانەیە شەیتان لە دەستی لاداتو بیترازێنێتو برینداری بکات یان بیکوژێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:( هیچ کەسێك لە ئێوە با چەك ڕوونەکاتە برای موسڵمانی خۆی، چونکە هیچ کەسێك لە ئێوە نازانێت لەوانەیە شەیتان لە

[1] روم(٥٥).

[2] المؤمنون(١١٢_١١٤).

دەستی بیترازێنێت‌و لایدات بەو هۆیەوە بکەوێتە نا چاڵێکی ئاگر).[١] بوخاری‌و موسلیمیش هێناویانە لە فەرموودەکەی عەبدورەزاقەوە[٢].

﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَىٰ بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ ﴾

## خودا لە بەندەکانی ئاگادارترە زیاترلە خۆیان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ ﴾ واتە: پەروەردگارتان ئاگادارترە بە ئێوە، باش دەزانێت کێ شایەنی ڕێزلێگرتنە لە ئێوەو کێش شایەنی ڕێزلێگرتن نیە، ﴿إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ﴾ واتە: ئەگەر بیەوێت بەر بەزەیی خۆیتان دەخات، یارمەتیتان دەدات بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای، ﴿أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ﴾ واتە: مەیلیشی لێبێت توشی جەزرەبەتان دەکات. ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴾ واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) تۆمان نەناردووەتە لایان تاچاودێرو بریکاربێت. بەڵکو ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە بیانترسێنیت، هەر کەسێك گوێڕایەڵی کردی دەچێتە بەهەشت‌و هەر کەسیش بێفەرمانی کردی دەچێتە جەهەنەم.

## ڕێزی پێغەمبەران، هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریانەوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ واتە: پەروەردگارت زاناترە بەو شتانەی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندان لە ناو پێغەمبەرانیشدا هەندێکمان لە هەندێکی تر بەڕێزتر کردووە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ ﴾[٣] واتە: ئەو پێغەمبەرانە(کە باسمان کردن) هەندێکمان لە هەندێکیان بەڕێزتر کردوە، لەو پێغەمبەرانە هی وایان هەبووە کە خوا قسەی لەگەڵ کردووە. وە هەندێکیانی چەند پلەیەك بەرز کردۆتەوە. ئەمە هیچ دژایەتیەکی نیە لەگەڵ ئەو فەرموودانەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(جیاوازی لە نێوان پێغەمبەراندا مەکەن لە ڕێزگرتندا).[٤] مەبەست بەم فەرموودەیە ئەوەیە، تەنها لەڕووی ئارەزوو و

---

[١] احمد(٢/٣١٧)، سەحیحە.

[٢] فتح الباري(١٣/٢٦)، مسلم(٤/٢٠٢٠).

[٣] البقرة(٢٥٣).

[٤] فتح الباري(٦/٥١٩)، مسلم(١٨٤٤).

دەمارگیری یەوە ئەو ڕێزە بگرێت و نەك لەڕووی بەڵگەوەبێت، خۆ ئەگەر بەڵگە هەبوو لەسەر شتێك پێویستە شوێنی ئەو بەڵگەیە بکەوی، ناکۆکی نیە لەنێوان زانایاندا کە خاوەن پەیامەکان(الرسل) بەڕێزترن لە پێغەمبەرەکانی تری بێپەیام، (اولوالعزم)ە کان لەناو پەیامدارەکاندا لەوانی تریان بەڕێز ترن، کەبریتین لە ئەو پێنج پێغەمبەرەی کە بەدەق باسیان هاتووە لەو دوو ئایەتەدا لە سورەتی(الأحزاب) کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾[1] واتە: (ئەی موحەمەد(ﷺ) بیریان بخەرەوە) کاتێك کە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران هەروەها لە تۆو نوحو ئیبراهیمو موساو عیسای کوڕی مەریەم. وە لە سورەتی(شوری)دا کە دەفەرمووێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ ۖ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[2] واتە: ئەو ئاینەی بۆ داناون کە فەرمانی داوە بە نوحو ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆو ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیمو موساو عیسا کە لەسەر ئەو ئایینە بن بە ڕێكو ڕاستیو بەرقەراری بکەن و جیاوازی تێدا مەکەن. زانایان جیاوازیان نیە لەوەدا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕێزترینی ناو هەموو پێغەمبەرانە(سەلامی خوایان لێبێت) پاشان دوای ئەو ئیبراهیم پاشان موسا پاشان عیسا بەپێی قسەی مەشهوری ناویان، ئێمە ئەمەمان بە بەڵگەوە ڕوون کردووەتەوە لە شوێنی تردا، ﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ واتە: زەبوریشمان دا بە داود، ئەمەیش ئاگاداریەکە بۆ ڕێزو پلەی داود. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی: (خوێندنەوەی زەبور ئاسان کرا بۆ داود، کەفەرمانی ئەدا بە زینکردنی وڵاغەکانی، پێش ئەوەی لەزینکردنی وڵاغەکان ببنەوە ئەو هەموو زەبوری ئەخوێندەوە)[3].

﴿ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ ۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾ ﴾

---

[1] الاحزاب(٧).

[2] شوری(١٣).

[3] فتح الباري(٥٢٢/٦).

**پەرستراوەكانی بتپەرستان توانای قازانج و زیانیان نیە، بەڵكو داوای نزیك بوونەوە هەر لە خودا دەكرێت**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴾ واتە: بڵێ: هانا بەرن بۆ ئەو كەسانە(وا لە جێی خودا) بە پەرستوویان دەزانی كە ناتوانن بەڵاتان لەسەر لابەرن، پێشیان ناكرێت بۆ یەكێكی تری بنێرن، خوای گەورە فەرمان دەكات بە پێغەمبەرو(ﷺ) ئەفەرمووێت: ئەی موحەمەد(ﷺ) بڵێ: بەو بتپەرستانە ئەوانەی لە جێی خودا پەرستراوێكی تر دەپەرستن لە بتو شتی تر، بێگومان ئەوانە توانای لابردنی هیچ زەرەرێكیان نیەو ناشتوانن ڕەوانەی بكەن بۆ كەسێكی تر، واتە: ئەو كەسەی ئەو شتانەی لە دەست دێت تەنها هەر خودایە كە شەریكی نیەو بڕیاری بوون و نەبوون و گشت شتێك بەدەستی ئەوە، عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم ﴾ دەڵێت: بتپەرستان دەیانوت ئێمە فریشتەكانو مەسیحو عوزەیر دەپەرستین ئەمانە ئەوانەن كەهانایان بۆنەبرا، یانی فریشتەو مەسیحو عوزەیر.[1] ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ ﴾ واتە: ئەو كەسانەی هانایان پێ دەبەن كامەیان نزیكترە، بە دوای هۆكارێكدا دەگەڕێن كە نزیكیان بكاتەوە لە پەروەردگاریان. بوخاری لە سلیمانی كوڕی میهرانی ئەعمەشەوە ئەویش لەئیبراهیمەوە ئەویش لە ئەبومەعمەرەوە ئەویش لەعەبدوڵاوە ڕیوایەتی كردووە كە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلْوَسِيلَةَ ﴾ دەڵێت: كۆمەڵێك لە جنۆكە دەپەرستران پاشان موسڵمان بوون. وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە، دەڵێت: كۆمەڵێك لە مەردم كۆمەڵێك جنۆكەیان دەپەرست، جنۆكەكان موسڵمان بوون، بەڵام مەردمەكە هەر دەستیان لە ئاینەكەیان بەر نەدا.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ﴾ واتە: بە هیوای بەزەیی ئەونو لە سزایشی دەترسن، چونكە خواناسی تەواو دروست نابێت بەكۆبوونەوەی ترسان لە خوا لەگەڵ هیوا بە بەزەیی ئەو نەبێت، بە ترسان لە خوا مرۆڤ دوردەكەوێتەوە لە خراپەكاریو لێی دەگەڕێتەوە، بە هیوا بونیش دەبێتە هۆی گوێڕایەڵیو عیبادەتی زۆر. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴾ جەزرەبەی

---

[1] الطبري(٤٧١/١٧).

[2] فتح الباري(٢٤٩/٨-٢٥٠).

پەروەردگاری تۆ هەمیشە مەترسی هەیەو خۆپارێزی لێبکەن. واتە: دەبێت خۆ بپارێزرێت لە سزای خواو ترسی ڕوودانی ببێت، خۆمانندەدەینە پەنا خوا لە سزای سەختی.

﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾﴾

## هەموو خەڵكی شارو دێهاتەكانی خوانەناسان لەناو دەچن و سزا دەدرێن پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا﴾ واتە: پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت، هیچ ئاوەدانی نامێنێت تێكی دەدەین یان خەڵكەكەی توش ئازاری بە ژان نەكەین، كە هەر ئەمەیش لە كتێبەكەدا نووسراوە. واتە: ئەمە بڕیاری خوای گەورەیەو بڕاوەتەوە لە لای خۆی ولە لەوحێكی پارێزراودایە[1]، كە هەموو شارو دێهاتێك وێران دەكاتو خەڵكەكەیشی گشت لەناو دەبات یان سزای توندو بە ژانیان بۆ دەنێرێت بە كوشتن یان هەر بەڵایەكی تر خۆی مەیلی لێبێت. بەهۆی ئەو تاوانو خراپەكارییەی لە زەمیندا دەیكەن لە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەتدا. وەك خوای گەورە لە بارەی گەلە پێشینەكانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا ظَلَمْنَـٰهُمْ وَلَـٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾[2] واتە: ئێمە ناهەقیمان لێنەكردوون، ئەوانە خۆیان ناهەقیان لە خۆیان كردووە. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَـٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾﴾[3] بەرهەمی ئاكاری خۆیان چەشتو ئەنجامی هەموو كردارەكانیان هەر ڕەنجەساری بوو.

﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾﴾

## هۆی نەناردنی نیشانە و سزای قڕكەر

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا﴾ واتە: ئێمە كە نیشانەكانمان نەنارد، هەر لەبەر ئەوە بوو پێشینەكان بە درۆیان دەزانی، وشتریشمان بە ئاشكرا دا بە سەموود، كەچی ناهەقیان لەگەڵ كرد، ئێمە هەر بۆ ترس وەبەرنان نیشانەكان بەڕێ دەكەین. سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت:

---

[1] یانی لە (لوح المحفوظ)دا.(وەرگێڕ)

[2] هود(١٠١).

[3] الطلاق(٩).

موشریکەکان ئەیانوت: ئەی موحەمەد(ﷺ) تۆ دەڵێیت پێغەمبەرەکانی پێش تۆ هەندێکیان (با)ی بۆ ڕام کراوە، هەندێکی تریان مردووی زیندوو کردووەتەوە، ئەگەر پێت خۆشە ئێمە بڕوات پێ بکەینو بە ڕاستت بزانین، داوا لە پەروەردگارت بکە کە کێوی سەفامان بۆ بکات بە زێڕ. خوای گەورە پێغەمبەری ئاگادار کرد: من گوێم لەوانە بوو چیان وت ئەگەر حەز دەکەی ئەوەی ئەوانە وتیان دەیکەین، ئەگەر بڕوایان نەهێنا سزایان بۆ دەنێرین. چونکە دوای ناردنی نیشانە ئیتر لێیان ناگەڕێین، ئەگەر حەزیش دەکەی لەسەرخۆ بین لەگەڵ هۆزەکەت لەسەرخۆ دەبین لەگەڵیان. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەی پەروەردگارم لەسەرخۆ بە لەگەڵیان)[1]. قەتادەو ئیبنو جورەیجو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2]
ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: خەڵکی مەککە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) سەفایان بۆ بکات بە زێڕ، ئەو کێوانەشیان بۆ لابەرێت تا کشتوکاڵ بکەن پێی وترا: ئەگەر حەز دەکەی لەسەرخۆ دەبین لەگەڵیانو پەلەیان لێ ناکەین، ئەگەر حەزیش دەکەی ئەوەی داوایان کردووە بۆیان دێنین، ئەگەر بڕوایان نەهێنا لەناو دەچن، وەك چۆن گەلەکانی پێش ئەمان لەناو چوون، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر، بەڵکو لەسەرخۆ بە لەگەڵیان). خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردووە خوارەوە: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡـَٔايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَ﴾[3] نەسائیش ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە لە فەرموودەکەی جەریرەوە،[4] دیسان ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: قورەیش وتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) داوامان بۆ بکە لە خودا کە سەفامان بۆ بکات بە زێڕ، بڕوات پێ دەهێنین، فەرمووی:(وا دەکەن؟) واتە: بڕوا دێنین؟ وتیان: بەڵێ، وتی: داوای کرد جوبرەئیل هات بۆ لایو وتی: پەروەردگارت سڵاوت لێ دەکات، پێت دەڵێت: ئەگەر حەز دەکەی سەفایان بۆ دەکەمە زێڕ، هەر کەسێك لەوانە بڕوا نەکاتو حاشا بکات دوای ئەوە جەزرەبەیەکی دەدەم هیچ کەسێك لە جیهانیان جەزرەبەی وایان نەدرابێت. ئەگەر حەزیش دەکەی دەرگای تەوبەو بەزەییان بۆ دەکەمەوە. فەرمووی: (بەڵکو داوای کردنەوەی دەرگای تەوبە و بەزەیی ئەکەین)[5]. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡـَٔايَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا﴾ واتە: ئێمە هەر بۆ ترساندن نیشانەیەك مەیلمان لێبێت دەینێرین بۆ ئەوەی پەند وەرگرنو بیربکەنەوەو بگەڕێنەوە، بۆیان گێڕاوینەتەوە کە کوفە لە زەمانی ئیبنو مەسعودا(ڕەزای خوای لێبێت) لەرزیوەتەوە وتی: ئەی خەڵکینە ! پەروەردگارتان لێتان

---

[1] الطبري(١٧/٤٧٧).
[2] الطبري(١٧/٤٧٧).
[3] احمد(١/٢٥٨)، حاکمو زەهەبی بە سەحیحیان داناوە.
[4] النسائي في الكبرى(٦/٣٨٠)، الطبري(١٧/٤٧٦).
[5] احمد(١/٢٤٢)، پیاوەکانی جێی متمانەن.

نارازیە داوای لێبوردنی لێبکەن[1]. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە مەدینە لە زەمانی عومەری کوڕی خەتابدا(ڕەزای خوای لێبێت) چەند جارێك لەرزیوە، عومەر فەرمووی: دیارە شتێکی تازەتان کردووە لە پێشدا نەکراوە، سوێند بە خوا ئەگەر جارێکی تر لەرزیەوە وا دەکەم.[2] پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هەر وای فەرمووە لەو فەرموودەی کە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە: بێگومان خۆرو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی خودا، ئەو دووانە ناگیرێن بۆ مردنی هیچ کەسێكو بۆ ژیانی هیچ کەسێك، بەڵکو خوای گەورە بەو دوو نیشانەیە بەندەکانی خۆی دەترسێنێت، کاتێك ئەو نیشانانەتان بینی ڕاچڵەکێنو بترسنو بەرەو یادی خواوهانابردنو داوای لێبوردن بڕۆن. پاشان فەرمووی: ئەی ئومەتی موحەمەد(ﷺ) سوێند بە خوا هیچ کەسێك نیە لە خودا زیاتر کە پەلە بکات لە تۆڵەسەندنەوە لەوبەندەیەی کە داوێنپیسی دەکات، یان لەو کەنیزەیەی کە داوێنپیسی دەکات، ئەی ئومەتی موحەمەد(ﷺ) سوێند بە خوا ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە کەم پێدەکەنینو زۆر دەگریان)[3].

﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَانًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾ ﴾

**خودا دەورەی خەڵکی داوە، ئەو شتانەش کە پێغەمبەر(ﷺ) بینینی تاقیکردنەوەیەك بوو بۆئەو خەڵکە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرْآنِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَانًا كَبِيرًا ﴾ واتە: ئەو کاتەیش کە بە تۆمان وت: پەروەردگاری تۆ دەورەی لە خەڵکی داوە، شتانێکیش کە پیشانماندای، وە ئەو دارە لەعنەتیەی کە لە قورئاندا باسی کراوە، هەمووی بۆ تاقیکردنەوەی مەردم بوو، ئێمە ئەوان دەترسێنین، کەچی ئەوان هەر پتر ملهوڕی دەکەن. خوای گەورە لێرەدا پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هان دەدا بۆ گەیاندنی پەیامەکەیو ئاگاداری دەکات کە خودا پارێزگاری لێکردووە لە خەڵکیو توانای بەسەریاندا هەیەو لە ژێر دەسەڵاتی ئەودانو هەرگیز لێی دەرناچن. موجاهیدو عوروەی کوڕی زوبەیرو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریش لەم ئایەتەدا: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِالنَّاسِ ﴾ دەڵێن: واتە: تۆمان

---

[1] الطبري(١٧/٤٧٨).

[2] ابن أبي شيبة(٢/٤٧٣).

[3] فتح الباري(٢/٦١٥)، مسلم(٢/٦١٨).

پاراستووەلێیان[١]. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ﴾ دەڵێت: ئەو بینینە، بینینی بەچاو بووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەندان شتی پیشان دراوە (لەو شەوەدا کە شەوڕەوی پێکراوە)، ﴿وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ﴾یش بریتییە لە درەختی زەقنەموت[٢]. ئەحمەدو عەبدوڕەزاق‌و کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[٣] عەوفیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە.[٤] موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن‌و مەسروق‌و ئیبراهیم‌و قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدو کەسانی تریش، ئەوە(ڕۆیا)یان بە شەوی ئیسرا مانا کردووە.[٥] فەرموودەکانی ئەو شەوڕەویەمان لە سەرەتای سورەتەکەدا لە پێشەوە بەدرێژی باسکرد سوپاس بۆخوا، وە هەر لە سەرەتای سورەتەکەوە باسمان کرد کە هەندێ لە خەڵکی پەشیمان بوونەوە لە ئاینەکەیان دوای ئەوەی کە موسڵمان بوون و هەقیان ناسی، چونکەدڵ‌و ئاوەزیان توانای قەبوڵکردنی ئەوشەو ڕەوییەیان نەبوو،نکوڵییان لەو شتە کرد کەزانیارییان پێنەبوو، بۆ هەندێکی تریش خوا ئەم شەو ڕەوییەی کردە هۆی دڵنیایی‌و خۆراگری، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا فِتْنَةً﴾ واتە: تاقیکردنەوە، وە مەبەست بە ﴿وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ﴾ واتە: درەختی زەقنەموتە کاتێك کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی دانێ کە بەهەشت‌و ئاگری بینیووەو درەختی زەقنەموتیشی بینیووە، بڕوایان بەوە نەکرد، هەتا ئەبو جەهل(لەعنەتی خوای لێبێت) وتی: خورماو کەرێمان بۆ بێنن جا ئەمیانی بە ئەویانەوە ئەخوارد و ئەیوت (تزقموا) ئادەی زەقووم بخۆن، جگە لەمە ئێمە ئیتر نازانین زەقوم چیترە. ئیبنو عەبباس‌و مەسروق‌و ئەبو مالیك‌و حەسەنی بەسری‌و کەسانی تریش هەموو کەدەڵێن: ئەو بینینەی پێغەمبەر(ﷺ) مەبەست شەوی ئیسرا بووە، (الشجرة الملعونة)یشیان بە(شجرة الزقوم) تەفسیر کردووە[٦]. ﴿وَنُخَوِّفُهُمْ﴾ ئێمە ئەو خوانەناسانە دەترسێنین بە سزاو تۆڵەی توند، ﴿فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا﴾ یانی: تابێت یاخیتر ئەبن و زیاتر ڕۆئەچن لە گومڕایی و بێدینیدا، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە خوا دەستی لێبەرداون و سزای خۆی لێگرتونەتەوە.

---

[١] الطبري(١٧/٤٨٠).

[٢] فتح الباري(٨/٢٥٠).

[٣] احمد(١/٢٢١)، عبدالرزاق(٢/٣٨٠).

[٤] الطبري(١٧/٤٨١/٤٨٤).

[٥] الطبري(١٧/٤٨١/٤٨٢).

[٦] الطبري(١٧/٤٨٤/٤٨٥/٤٨٦).

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾﴾

**بەسەرهاتی باوکە ئادەم و شەیتان**

خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾ واتە: کاتێك وتمان بە فریشتەکان: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، سوژدەیان برد شەیتان نەبێت، وتی: چۆن سوژدە دەبەم بۆ کەسێك لە قوڕ دروستت کردووە. خوای گەورە لێرەدا باسی دوژمنایەتی شەیتانو وەچەکانی دەکات(لەعنەتی خوایان لێبێت)، کە دوژمنایەتیەکی دێرینەیە لە دروست بوونی ئادەمەوە(سەلامی خوای لێبێت) دەست پێدەکات، کاتێك کە خودا فەرمانی دا بە فریشتەکان سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد، بەڵام شەیتان ملی نەداو خۆی بە زلتر دەزانیو ئادەمی بە کەم بایەخ سەیر دەکردو دەیوت: چۆن سوژدە دەبەم بۆ کەسێك کە لە قوڕ دروستت کردووە، ﴿قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾ وەك لە ئایەتێکی تریشدا لە بارەی شەیتانەوە فەرموویەتی: ﴿أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾[1] واتە:(شەیتان) وتی من لەو چاکترم چونکە منت لە ئاگر دروست کردووە بەڵام ئەو لە قوڕ. پاشان خوای گەورە هەر لە بارەی شەیتانەوە دەفەرموویّت: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: وتی: باشە باوابێت جەنابت ئائەمەت لەمن بە بەڕێوتر دانا بێت، مەرجە ئەگەر تا ڕۆژی قیامەت دوام بخەیت ئەبێ نەوەکانی(کەمێك نەبێت) هەموو بخەمە ژێر چنگی خۆم، دیاریشە شەیتان چەندە بێئابڕوو بووەو خودای مەزنیش چەندە لەسەرخۆ بووەو مۆڵەتی داوە، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە فەرموویەتب: ﴿لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ﴾ یانی: شەیتان دەڵێت دەست دەگرم بەسەر نەوەکانیدا مەگین کەمێکی نەبێت. موجاهید دەڵێت: دەیانخەمە ژێر چنگی خۆم، ئیبنو زەید دەڵێت: گومڕایان دەکەم.[2] ئەم مانایانە هەموو نزیکن لە یەکەوە، واتە: شەیتان ئەڵێ: (خوایە) ئەوەی کە ڕێزت داوە بەسەر منداو گەورەترت کردووە، مۆڵەتم پێ بدە سوێند بە تۆ تۆرمەکەی هەموو گومڕا دەکەم کەمێکیان نەبێت.

---

[1] ص(٧٦).

[2] الطبري(١٧/٤٨٩).

﴿ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴿٦٣﴾ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا ﴿٦٥﴾ ﴾

## شەیتان دەسەڵاتی نیە بەسەر بەندە خواناسەکاندا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴾ واتە: فەرمووی بڕۆ هەر کەسێك لەوان شوێنی تۆ بکەوێت، سزای هەمووتان دۆزەخە کە تۆڵەیەکی پڕبەپڕە. کاتێك کە شەیتان داوای مۆڵەتی کرد، خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿ٱذۡهَبۡ﴾ بڕۆ وا مۆڵەتم دایت، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴾[1] واتە: تۆ یەکێکی لەوانەی مۆڵەتت پێدراوە، هەتا ئەو ڕۆژەو ئەو کاتەی دیاری کراوە. پاشان خوای گەورە هەڕەشە دەکات لە شەیتانو ئەوانەی شوێنی شەیتان دەکەون لە نەوەی ئادەم بە دۆزەخو دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴾ موجاهید دەڵێت: تۆڵەیەکی پڕبەپڕ.[2] قەتادە دەڵێت: تۆڵەیەکی تەواوتان لێ دەسێنرێتو هیچی لێ کەم ناکرێتەوە بۆتان.[3] ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴾ هەر کەسێك لەوانە تۆ پێی دەوێری بانگی بکەو دنەی بدە. وتراوە: ﴿بِصَوۡتِكَ﴾ واتە: بە گۆرانی. موجاهید دەڵێت: بە ڕابواردنو گۆرانی[4]. یانی: بە گۆرانی ژێربارو سوکان بکە. ئیبنو عەبباس لەم ئایەتەدا: ﴿ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ ﴾ دەڵێت: ئەم ئایەتە هەموو بانگخوازێك دەگرێتەوە کەبانگی خەڵکی بکات بۆسەرپێچیکردنی فەرمانی خوای گەورە.[5] قەتادەیش هەر وای وتووە.[6] ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە. ﴿وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ بە سوارو پیادەی خۆتەوە بدە بە سەریاندا، واتە: هێرش بکە سەریان بە سوپاکەتەوە بە سوارو پیادەوە. چونکە(رَجِلْ) کۆی(راجل)ە یانی پیادە، وەك چۆن(رَكِبْ) کۆی(راکب)ەو(صَحِبْ) کۆی(صاحب)ە. واتە:

---

[1] ص(٨٠_٨١).

[2] الطبري(١٧/٤٩٠).

[3] الطبري(١٧/٤٩٠).

[4] الطبري(١٧/٤٩٠).

[5] الطبري(١٧/٤٩١).

[6] الطبري(١٧/٤٩١).

دەست بگرە بەسەریاندا بە هەموو ئەو شتانەی دەتوانی بەکاریان بێنی، ئەمە فەرمانێکی قەدەرییە.
وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا﴾[1] واتە: تۆ نەتزانی ئێمە شەیتانەکانمان ناردووتە سەر خوانەناسان ختوکەو دانەیان دەدەن، واتە: هەراسانیان دەکەن‌و هەڵیان دەنێن‌و پاڵیان دەنێن بۆ گوناهکردن،، ئیبنو عەبباس‌و موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ﴾ دەڵێن: هەموو سوارو پیادەیەك دەگرێتەوە کە لە ناو گوناهدایەو سەرپێچی فەرمانی خودا دەکات.[2] قەتادە دەڵێت: شەیتان سوارو پیادەی لەناو جنۆکەو مرۆڤدا هەیە و ئەوانەن کە گوێڕایەڵی دەکەن[3]. عەرەب دەڵێن: (أجلب فلان على فلان)کاتێك دەقیڕێنێت بەسەریدا. وەلەم مانایەدایە کە وتوویانە: لە کێبەرکێدا نابێ(جَلَبْ و جَنَبْ)بکرێ، واتە: تێخوڕین‌و پاڵ پێوەنان. لەزمانی عەرەبیدا(الجَلَبَة) داتاشراوە لەفیعلی (جَلَبَ) کە یانی بەرزکردنەوەی دەنگ. ﴿وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ﴾ واتە: هاوبەشیان بکە لە ماڵ‌و منداڵیاندا، ئیبنو عەبباس‌و موجاهید دەڵێن: واتە: شەیتان فەرمانیان پێدەکات کە ماڵ ببەخشن لە بێ فەرمانی خوای گەورەدا[4]. ﴿وَٱلْأَوْلَـٰدِ﴾ عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو زەحاکەوە واتە: منداڵی زینا[5]. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ئەو منداڵانەیە کە کوشتوویانن بە نەفامی‌و نەزانی.[6] قەتادە دەڵێت: لە حەسەنی بەسریەوە: سوێند بە خوا هاوبەشی کردوون لە ماڵ‌و منداڵدا، ئەوەنییە بوونەتە ئاگرپەرست‌و گاورو جوولەکەو هەڵساون ڕەنگێکی تریان لەخۆیانداوە و ماڵەکانیان بەش بەش کردووەو بەشێکیان داناوە بۆ شەیتان[7]. قەتادەیش هەر وای وتووە[8]. خوای گەورە بەم ئایەتە ﴿وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ﴾ هاوبەشیەکەی تایبەت نەکردووە بە ماناکەیەوەو مانایەکی تر نەبەخشێت، واتە: هەر شتێك سەرپێچی خودای تیابکرێت، یان بە هۆی ئەو ماڵ‌و منداڵانەوە، گوێڕایەڵی شەیتانی پێکرابێت، ئەوە هاوبەشی کردنە لەگەڵ شەیتان، لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەیازی کوڕی حیمارەوە کە پێغەمبەری

---

[1] مريم(٨٣).
[2] الطبري(١٧/٤٩١/٤٩٢).
[3] الطبري(١٧/٤٩١).
[4] الطبري(١٧/٤٩٣).
[5] الطبري(١٧/٤٩٤).
[6] الطبري(١٧/٤٩٤).
[7] الطبري(١٧/٤٩٥).
[8] الطبري(١٧/٤٩٥).

خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(خوای گەورە دەفەرموویت من بەندەکانی خۆم دروست کردووە بەرەو هەقانیەت برۆن، شەیتان هات بۆیان لە ئاینەکەیان لایدان، ئەوەی من بۆم حەڵاڵ کردبوون حەرامی کرد لێیان).[1] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر کەسێك ویستی بچێتە لای ژنەکەی ووتی: (بسم الله، اللهم جنبنا الشیطان و جنب الشیطان ما رزقتنا) یانی:بە ناوی خودا، ئەی خودایە شەیتانمان لێ دوورخەرەوە، شەیتانیش لەوەیش دوورخەرەوە کە پێمان ئەدەیت، ئەگەر منداڵێك لە نێوانیاندا پەیدا ببێت ئەوە شەیتان هەرگیز زیانی پێ ناگەیەنێت)[2]. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَعِدْهُمْ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا﴾ واتە: بەڵێنیشیان پێ بدە، بەڵام شەیتان بەڵێنیان پێ نادات، تەنها هەر هەڵخەڵەتاندنە، وەك خوای گەورە باسی شەیتانی کردووە، کاتێك کە هەق دەردەکەوێ بۆی لە ڕۆژی هەقدا، واتە: ڕۆژی قیامەت و خودا بە دادپەروەری خۆی لێپرسینەوەی لێکردن، لەو کاتەدا شەیتان دەڵێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ﴾[3] واتە: خوا بەڵێنی ڕاستی پێدان، منیش بەڵێنی خۆم پێدان، بەڵام درۆم لەگەڵ کردن. پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾ واتە: تۆ بەسەر بەندەکانی مندا هیچ دەسەڵاتێکت نیە. ئەمە ئاگاداریەکە لە خواوە کە پشتگیری بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆی دەکاتو دەیانپارێزێتو چاودێریان دەکات لە شەیتانی لەعنەتی، بۆیەدەفەرموویت ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾ واتە: پەروەردگارت بریکاریانە، بەسیانە یارمەتیان بداتو پشتیان بگرێتو سەریان بخات.

﴿ رَّبُّكُمُ الَّذِي يُزْجِي لَكُمُ الْفُلْكَ فِي الْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ ﴾

**کەشتی لە نیشانەکانی سۆزی خوای گەورەیە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ رَّبُّكُمُ الَّذِي يُزْجِي لَكُمُ الْفُلْكَ فِي الْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴾ واتە: پەروەندەتان بەرامبەر ئێوە دڵۆڤانە، کەشتیتان لە دەریادا بۆ دەخاتەڕێ تا بە هۆیەوە بژێوی خۆتان دەست بکەوێت. خوای گەورە لێرەدا باسی دڵۆڤانی خۆی دەکات بەرامبەر بەندەکانی کە کەشتی بۆ ڕام هێناون لەناو دەریادا ئاسانکاری کردووە بۆیان، هەتا بە کاری بێنن لە بەرژەوەندی خۆیانداو بۆ بازرگانیو گەلێ شتی تر لە هەرێمو کیشوەرێکەوە بۆ هەرێمو کیشوەرێکی

---

[1] مسلم(٤/٢١٩٧).

[2] فتح الباري(٦/٣٨٦)، مسلم(٢/١٠٥٨).

[3] ابراهيم(٢٢).

تر، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ واتە: پەروەردگارتان بە هەمیشەیی دلۆڤانە بەرامبەر بە ئێوە، ڕامهێنانی کەشتیش بەهرەیەکە لە بەهرەکانی بۆ ئێوە.

﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾﴾

**خوانەناسانیش لە کاتی تەنگانەدا هاوار تەنها لە خودا دەکەن**

خوای گەورە ئاگادارمان دەکات لەوەی کاتێك کە خەڵکی تووشی تەنگانەیەك ئەبن بە دڵێکی پاك هانا دەبەن بۆ خودا، بە زەلیلیەوە لێی دەپاڕێنەوە بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾ واتە: هەر کاتێك لە دەریادا توشی فەرتەنەیەك بوون، هەموو ئەو پەرستراوانە هاواریان لێ دەکەن ون دەبن لاتان جگە لە خوا. لە دڵتان دەردەچنو بیریان لێ ناکەنەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ﴾ واتە: هەر کاتێك ڕزگاری کردنو چوونە سەر زەوی، پشتی تێدەکەن، ئەو دڵپاکیو یەکتاپەرستیەتان لەبیردەچێتەوە و دەچنەوە سەر دۆخی جاران، ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا﴾ واتە: مرۆڤ زۆر سپڵە و بێمنەتە. چونکە سروشتی وایە بەهرەکانی خوای زوو لە بیردەچێتو حاشای لێ دەکات مەگەر کەسێك خودا پارێزگاری لێکردبێت.

﴿ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾﴾

**ئایا سزای خودا وشکانیدا نایەت؟**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ﴾ واتە: ئێوە ناترسن لەوەی کە لە وشکاییدا زەمین لەرزە بتانبات بە ناخی زەویدا؟ یان بای توندی زیخاوی لێتان هەڵبکات. خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ئایا ئێوە وا تێدەگەن کە لە دەریا هاتنە دەرەوە بۆ سەر وشکایی ئیتر ناترسنو بێباکن لەوەی کە خودا بەلاتان بۆ بنێرێتو تۆڵەتان لێ بسێنێت بە زەمین لەرزە یان بە ڕەشەبای زیخاوی ئەمە قسەی موجاهیدو کەسانی تریشە.[1] وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ۖ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا﴾[2] واتە: گێژەلووکەی زیخو چەومان ناردە سەریان، جگە لە کەسو کاری (لووت) کە بەیانی ڕزگارمان کردن، ئەوە لە چاکەو بەزەیی خۆمانەوە بوو. لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن

---

[1] الطبري(١٧/٤٩٨)، عن قتادة.

[2] القمر(٣٤_٣٥).

سِجِّيلٍ﴾[1] واتە: بارانێکمان لە گڵێك(کە ببووە بەرد) بەسەردا باراندن. وە دەفەرمووێت: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾[2] واتە: ئایا ئێوە لەو کەسەی کە لە ئاسمانە ناترسن بتانبات بە ناخی زەویداو لە پڕ زەمین بێتە لەرین؟ یان ئایا ئێوە لەو کەسەی لە ئاسمانە ناترسن ڕەشەبایەکی زیخو چەوتان لێ هەڵ بکات؟ ئەوساکە دەزانن هەڕەشەی من چۆن بووە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ وَكِيلًا﴾ ئەوسا کەستان دەست نەکەوێت فریاتان بکەوێت.

﴿ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ الرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾﴾

**لەوانەیە جارێکی تر خوا بتانباتەوە ناو دەریا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَمْ أَمِنتُمْ﴾ ئاخۆ ناترسن، ئەی ئەو کەسانەی کە پشتتان تێکردین دوای ئەوەی دانتان نابەتاك و تەنهایی ئێمەدا لەناو دەریاداو هاتنە دەرەوە بۆ سەر وشکایی، ﴿أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ﴾ لەوەی جارێکی تر بتانگێڕینەوە ناو دەریا، ﴿فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ الرِّيحِ ﴾ ئەوسا بایەکی بەهێزتان لێ هەڵبکات. بدات لە خاوەن کەشتیو کەشتیەکەش نوقم بکاتو بیخاتە ژێر ئاو، ئیبنو عەبباسو کەسانی تریش دەڵێن:(القاصف) بای دەریایە کە کەشتی دەشکێنێتو دەیخاتە ژێر ئاو.[3] ﴿فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ﴾ لە تۆڵەی خوانەناسیتاندا نوقمتان بکات، ﴿ثُمَّ لَا تَجِدُوا لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِ تَبِيعًا ﴾ واتە: پاشان کەستان دەست ناکەوێت کە لە بەرامبەر ئێمەوە یارمەتیتان بدات، ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿تَبِيعًا ﴾ واتە: بریکارو یارمەتیدەرێك.[4] موجاهید دەڵێت: یارمەتی دەرێك کە هەقتان بۆ بسێنێت دوای خۆتان[5]. قەتادە دەڵێت: لە هیچ کەسێك ناترسین داوای شتێکمان لێ بکات لەو بارەیەوە[6].

[1] الحجر(٧٤).

[2] الملك(١٦ـ١٧).

[3] الطبري(١٧/٥٠٠).

[4] الطبري(١٧/٥٠٠).

[5] الطبري(١٧/٥٠٠).

[6] الطبري(١٧/٥٠٠).

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾﴾

## باسی گەورەیی و ڕێزی مرۆڤ

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت. خوای گەورە لێرەدا باسی گەورەیی‌و ڕێزی نەوەی ئادەم دەکات کە دروستی کردووە لە جوانترین‌و تەواوترین شێوەدا، وەك فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾[1] واتە: ئێمە مرۆڤمان لە ڕێکترین شێوەدا وەدیهێناوە. واتە: بە پێوە هەنگاو دەنێت‌و لەسەر هەردوو پێ دەوەستێت‌و بە دەستی خواردن دەخوات، بەڵام گیانەوەرەکانی تر لەسەر چوار پێ دەڕوات‌و بە دەمی خواردن دەخوات، خوا (گوێ) و (چاو) و (دڵی) داوە بە مرۆڤ بە هۆیانەوە لە هەموو شتێك تێ دەگات‌و سوودی لێ وەردەگرێت، جیاوازی لە نێوان شتەکاندا پێ دەکات، کامەی چاکەو کامەی خراپە، کامەی گرنگە لە کاروبارەکانی دین‌و دنیادا، ﴿وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ لە وشکانی‌و دەریادا هەڵمانگرتن. لەسەر چوارپێ وەك ئەسپ‌و ماین‌و ئێسترو لەسەر کەشتی بچووك‌و گەورەیش، ﴿وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ واتە: ڕۆزی پاکیشمان پێداون. لەبەروبوومی میوەو گۆشت‌و شیرو هەموو خواردنێکی خۆش‌و بەتام‌و هەمەڕەنگ‌و شوێنەواری جوان‌و جلوبەرگی بە نرخ‌و هەمەڕەنگیش بە چەندەها شێوە کە دروستی دەکەن بۆ خۆیان، کە خەڵکی لە کیشوەرەو هەرێم‌و شوێنەکانی تریشەوە بۆیان دەهێنین. ﴿وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا﴾ واتە: لە چاو زۆر لە دروستکراوەکانی خۆمان زۆر زیاتر ڕێزمان لێ گرتوون، واتە: لە چاو گیانەوەرەکان‌و دروستکراوەکانی تردا زۆر زیاتر قەدرمان لێ گرتوون، ئەم ئایەتە پیرۆزە کراوە بە بەڵگە لەسەر بەرێزی مرۆڤ بەسەر فریشتەکانیشدا.

﴿يَوْمَ نَدْعُواْ كُلَّ أُنَاسِۭ بِإِمَٰمِهِمْۖ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلْأٓخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾﴾

## هەموو کەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا بە ناوی ڕابەرەکەیەوە بانگ دەکرێت

خوای گەورە باسی ڕۆژی قیامەت دەکات کە هەموو کۆمەڵێك بانگ دەکرێت بۆ لای ئیمامەکەی خۆی، زانایان ڕایان جیاوازە لەسەرمانای ئەو ئیمامە، موجاهیدو قەتادە دەڵێن: هەموو کۆمەڵێك لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا بانگ دەکرێت. هەندێ لە زانایانی پێشینە دەڵێن: ئەمە گەورەترین ڕێزە بۆ زانایانی

[1] التين(٤).

فه‌رمووده كه‌ ئیمامه‌كه‌یان پێغه‌مبه‌ره‌(ﷺ). ئیبنو زه‌ید ده‌ڵێت: ﴿بِإِمَٰمِهِمۡ﴾ یانی: به‌ كتێبه‌كه‌یان كه‌ ڕه‌وانه‌كراوه‌ بۆ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان كه‌ په‌یڕه‌وو پڕۆگرامی تێدایه‌، ئیبنو جه‌ریریش ئه‌م ڕایه‌ی هه‌ڵبژاردووه‌. ڕیوایه‌ت كراوه‌ له‌ ئیبنو ئه‌بی نه‌جیمه‌وه‌ له‌ موجاهیده‌وه‌ كه‌ وتوویه‌تی: به‌ناوی كتێبه‌كه‌یانه‌وه‌ بانگ ده‌كرێن، هه‌ڵده‌گرێت ئه‌و ئه‌و مانایه‌بێت، هه‌ڵیشده‌گرێت مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ بێت كه‌ عه‌وفی ڕیوایه‌تی كردووه‌ له‌ ئیبنو عه‌باسه‌وه‌، له‌م ئایه‌ته‌دا: ﴿يَوۡمَ نَدۡعُواْ كُلَّ أُنَاسِۭ بِإِمَٰمِهِمۡ﴾ ده‌ڵێت: له‌و ڕۆژه‌دا هه‌ر كۆمه‌ڵێك له‌ مه‌ردم بانگ ده‌كرێن بۆلای كارنامه‌كانی خۆیان[1]. ئه‌بولعالیه‌و حه‌سه‌ن‌و زه‌حاكیش هه‌ر وایان وتووه‌[2]. ئه‌م قسه‌یه‌ به‌هێزتره‌. وه‌ك خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رمووێت: ﴿وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ﴾[3] واته‌: وه‌ هه‌موو شتێكمان له‌ كتێبی ڕوونكه‌ره‌وه‌دا هه‌ڵگرتووه‌ (به‌ نووسین). وه‌ ده‌فه‌رمووێت: ﴿وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ﴾[4] واته‌: نامه‌ی كرده‌وه‌كان دابه‌ش ده‌كرێت ئینجا تاوانباران ده‌بینن زۆر ده‌ترسن له‌و (هه‌موو تاوان‌و خراپه‌)ی كه‌ تێیدایه‌. وه‌ ده‌فه‌رمووێت: ﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٖ جَاثِيَةٗۚ كُلُّ أُمَّةٖ تُدۡعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝٢٨ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيۡكُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾[5] واته‌: هه‌موو گه‌لێك ده‌بینی كۆمه‌ڵ كۆمه‌ڵ كه‌وتوون به‌سه‌ر ئه‌ژنۆدا هه‌موو گه‌لێك بانگ ده‌كرێت بۆ لای په‌ڕاوه‌كه‌ی خۆی، ئه‌مڕۆ سزاو پاداشت ده‌درێنه‌وه‌ به‌ گوێره‌ی ئه‌و كرده‌وانه‌ی كه‌ ده‌تانكرد، ئه‌مه‌ په‌ڕاوه‌كه‌مان به‌ ڕاستی له‌سه‌رتان ده‌دوێت، به‌ ڕاستی ئێمه‌ وه‌ك خۆی نووسیومانه‌ته‌وه‌ و (وێنه‌مان گرتووه‌ته‌وه‌) ئه‌وه‌ی كه‌ ئێوه‌ ده‌تان كرد. ئه‌م ئایه‌تانه‌ دژایه‌تیان نیه‌ له‌گه‌ڵ هێنانی پێغه‌مبه‌راندا(سه‌لامی خوایان لێبێت) بۆشایه‌تیدان كاتێك كه‌خوای گه‌وره‌ دادوه‌ری ده‌كات له‌ نێوان ئومه‌ته‌كانیاندا، چونكه‌ گومانی تێدانیه‌ كه‌ هه‌موو پێغه‌مبه‌رێك ده‌بێت شایه‌تی خۆی بدات له‌سه‌ر ئومه‌ته‌كه‌ی سه‌باره‌ت به‌ كرداره‌كانیان، به‌ڵام مه‌به‌ست لێره‌دا به‌:(إمام) كتێبی كرداره‌كانه‌. بۆیه‌ خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿يَوۡمَ نَدۡعُواْ كُلَّ أُنَاسِۭ بِإِمَٰمِهِمۡۖ فَمَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقۡرَءُونَ كِتَٰبَهُمۡ﴾ هه‌ر كه‌سێك نامه‌ نرایه‌ ده‌ستی ڕاستی، ئه‌مانه‌ نامه‌كه‌ی خۆیان ده‌خوێننه‌وه‌، واته‌: له‌ خۆشی نامه‌كه‌ی كه‌ كرداره‌ چاكه‌كانی تێدایه‌ ده‌یخوێنێته‌وه‌،

---

[1] الطبري(١٧/٥٠٢).

[2] الطبري(١٧/٥٠٢/٥٠٣).

[3] يس(١٢).

[4] الكهف(٤٩).

[5] الجاثية(٢٨_٢٩).

زۆر خۆشحاڵە کە دەیخوێنێتەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾[1] واتە: ئەوسا ئەو کەسەی کە نامەی(کردەوەی) درایە دەستی ڕاستی دەڵێت: ها نامەکەم بگرنو بیخوێننەوە، بێگومان من خۆم دەمزانی کە تووشی ئەم لێپرسینەوەیە دەبم، ئەو کەسە لە ژیانێکی پەسەندا دەبێت، لە بەهەشتێکی بەرزدا، کە میوەی نزیکە دەستە،(پێیان دەوترێت) بخۆنو بخۆنەوە نۆشتان بێت بە هۆی ئەو چاکانەوە کە لە ڕۆژانی ڕابردوودا کردووتانە، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ واتە: بە ئەندازەی داوی ڕزاوی ناو ناوکە خورماش ناهەقیان لیٚ ناکرێت، حافیز ئەبوبەکری بەزار فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردووە لە ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەم ئایەتەدا: ﴿يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ﴾ فەرمووی: (هیوامەیە بانگ دەکرێت کتێبەکەی بە دەستی ڕاستی پێدەدرێت لاشەی گەورە دەکرێتو ڕووی سپی دەبێت، تاجێکی مرواری لەسەر دەنرێت، دەدرەوشێتەوە و دەڕوات بۆلای هاوەڵەکانی و لە دوورەوە چاویان پێی دەکەوێت، دەڵێن: ئەی خودایە لەمەیش بدە بە ئێمە، لێمان پیرۆز بکە دێتە لایانو پێیان ئەڵێ: مژدە بێت بۆ هەر یەکێك لە ئێوەیش وەك ئەمە هەیە. بەڵام خوانەناس ڕووی ڕەش دەبێتو لاشەی گەورە دەکرێت، هاوەڵەکانی چاویان پێی دەکەوێت، ئەڵێن: پەنا دەگرین بە خوا لەمە، (یان لە شەڕی ئەمە)، ئەی خوایە شتی وامان بۆنەیەت، کەچی دەیهێنن بۆ لایان، دەڵێن: ئەی خودایە سەرشۆڕو ڕیسوای بکە. ئیٚڵیٚ: خودا لەسۆزی خۆی دوورتان بخاتەوە. بێگومانبن لەوەیکە هەر کەسێك لە ئێوە ئەمە بەشیەتی). پاشان بەزار دەڵێت: بەم شێوەیە نەبێت ڕیوایەت نەکراوە.[2] ﴿وَمَن كَانَ فِى هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ﴾ واتە: هەر کێش لەم دنیایە کوێرە، نیشانەو بەڵگە ڕوونەکانی خودا نابینێت، ﴿فَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ﴾ لە دواڕۆژیشدا کوێرە، ﴿وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾ زیاتریش ڕێگەی لیٚ ون دەبێت، پەنا بە خودا دەگرین لەو حاڵو ژیانە.[3]

---

[1] الحاقة(١٩ـ٢٥).

[2] موارد الضمآن(٢٥٨٨)، تیرمزی بە حەسەنی داناوە.

[3] الطبري(١٧/٥٠٤/٥٠٥).

﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾

**پێغەمبەر(ﷺ) سزای توند دەدرا ئەگەر کەمێکیش بە لای ئەو خودانەناسانەدا بچوایە کە داوایان کرد هەندێ لەو وەحیەی بۆی هاتووە بگۆڕێت...**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴾ واتە: ئەوەندەی نەمابوو ئەمانە لەو فەرمانەی کە پێمان ڕاگەیاندی لات بدەن‌و شتێکی تریان بۆ بێنێت جگە لە قورئان‌و درۆ بە دەمی ئێمەوە هەڵبەستێت، ﴿وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾ ئەگەر خۆمان تۆمان توند ڕانەگرتایەوە، لەوانەبوو کەمێك بە لای ئەوانە بچیت، ﴿ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾ ئەگەر وایش بووایە، چاك بزانە هەر لە ژیاندا دوو قات سزامان دەدای، لە کاتی مردنیشدا سزاکەت هەر دووقات دەبوو، ئەوسا کەسی واشت نەبوو دژبەئێمە بێتە هانات. خوای گەورە هەواڵمان دەداتێ کەخۆی پشتگیری لە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەکات‌و دەیپارێزێت‌و ڕاگیری دەکات‌و لە شەڕی پیاوخراپ‌و بەدی بەدکاران ڕزگاری دەکات، وە هەر خودا خۆی کارەکەی دەگرێتە دەست‌و سەری دەخات، بە دەستی کەسی تری نادات. لە دروستکراوەکانی‌و خۆیشی یارمەتی دەرو پارێزەرو پشتیوانیەتی، سەری دەخات‌و ئاینەکەیشی سەردەخات بەسەر دوژمن‌و نەیارەکانیدا لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای ئەم سەر زەمینەدا، دروودو سڵاوێکی زۆر لەسەر پێغەمبەر بێت(ﷺ) هەتا ڕۆژی قیامەت.

﴿وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا ۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾ ﴾

**هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ لەوانەیە خواناسان لەو سەر زەمینە بتخەنە تەنگانەوە تاکو لەوێ دەرت بکەن، ئەگەر واش بووایە، دوای تۆ کەمێك نەبێت ئەوانیش تێیدا نەدەمان. ئەم ئایەتە لەسەر خوانەناسانی قورەیش هاتە خوارەوە. کاتێك ویستیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرکەن لە نێوان خۆیان،

خوای گەورە بەم ئایەتە هەڕەشەی لێکردن، ئەگەر بهاتایە پێغەمبەریان(ﷺ) دەرکردایە، دوایی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانیش لە مەککەدا ماوەیەکی کەم نەبێت نەدەمانەوە، هەر وایش بوو پاش ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کردو لە نێوان قورەیشیەکاندا نەما، هەر ساڵو نیوێکی بەسەرداڕۆیشت، دوای ئەو هەموو ئازارە زۆرەی کە تووشی پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی کرا. هەتا خوای گەورە لە (بەدر)دا بێ ئەوەی بڕیاری جەنگ بدرێت، خودا قورەیشو پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی بە یەك گەیاند. خوای گەورە پێغەمبەری(ﷺ) سەری خست بەسەریانداو چۆکی پێدادانو زاڵیکردبەسەریاندا، پیاوە گەورەکانی کوشتنو ژمارەیەکی زۆریشی دەست بەسەر(لێ دیل) کردن، بۆیەخوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴾ واتە: ئەمە یاسایەکە لە ئێمەوە دانراوە بۆ ئەو پێغەمبەرانەی پێش لە تۆش بوون و ناردوومانن، یاسای ئێمە گۆڕانی بەسەردا نایەت. واتە: عادەتی ئێمە هەر وایە بۆ ئەوانەی بڕوایان نەکردووە بە پێغەمبەرانو ئازاریان داون، هەر بە دەرکردنی ئەو پێغەمبەرە جەزرەبە دراون، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەمبەری ڕەحمەت نەبووایە، بەڵای وایان بەسەردا دەهات لەودنیادا، هیچ کەسێك خۆی لەبەرا نەدەگرت. واتە: هەموو لەناو دەچوون. بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾[1] واتە: هەتا تۆیان لەناو دابێت(ئەی موحەمەد(ﷺ)) خودا جەزرەبەیان نادات.

﴿ أَقِمِ الصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ الَّيْلِ وَقُرْءَانَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ الَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ ﴾

**فەرماندان بە کردنی نوێژەکان لە کاتی خۆیدا**

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەیو فەرمانی پێ دەکات کە نوێژە فەرزەکان بکەن لە کاتی خۆیدا: ﴿ أَقِمِ الصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ الَّيْلِ ﴾ واتە: لەو ماوەی خۆر کلا دەبێت هەتا تاریکی ئەو دادێ نوێژ بکە. هوشەیم دەڵێت لە موغیرەوە لە شەعبیەوە لە ئیبنو عەباسەوە(دلوکها) واتە: کلابوونی خۆر.[2] نافعیش ئەم تەفسیرەی ڕیوایەت کردووە لە ئیبنو عومەرەوە.[3] مالیکیش ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیرەکەیدا لە زوهەریەوە لە ئیبنو عومەرەوە[4]. ئەبوبورزەی ئەسلەمی و

---

[1] الانفال(٣٣).

[2] الطبري(١٧/٥١٤).

[3] الطبري(١٧/٥١٥).

[4] الطبري(١٧/٥١٥).

موجاهید و حەسەن و زەححاك و ئەبوجەعفەری باقر و قەتادەیش هەر وایان وتووە[1]. ئەوەی بووەتە بەڵگە بۆئەم مانایە ئەو فەرموودەیە کە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵاوە کە دەڵێت: میوانداریو دەعوەتی پێغەمبەری خواو(ﷺ) هەندێ لە هاوەڵانیم کرد، خوادنیان لە لام خواردو پاشان چوونەدەرەوە کاتێك کە خۆر کلا بوو، پێغەمبەر(ﷺ) چووە دەرەوە فەرمووی:(ئەبو بەکر وەرە دەرەوە، ئەوە کاتێك بوو کە خۆر کلا بووبوو)[2]. بەم پێیە ئەم ئایەتە کاتی پێنج نوێژەکەی تیایە و هەموو کاتەکانیانی دیاری کردووە، لەوێوە کە دەفەرموێ: ﴿لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ﴾ یانی: تاریکایی شەو، وتراویشە: خۆرئاوابوون. هەتا ئێرەی ئایەتەکە نێوەڕۆو عەسرو مەغریبو عیشای لێ وەرگیراوە. ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ﴾یش: خوێندنی نوێژی بەیانی. لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بە موتەواتەری کە هەموو ئەم کاتانەی ڕوون کردووەتەوە بە درێژی، وەك ئەوەی ئەمڕۆ موسڵمانان لەسەری ئەڕۆن و پاشینەکان لە پێشینەکان و چەرخ لە دوای چەرخ لەیەکتریان وەرگرتووە لە شوێنی خۆیدا باسکراوە ، سوپاس بۆ خوای گەورە.

**کۆبوونەوەی فریشتە لە نوێژی بەیانیو عەسردا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ واتە: خوێندنی نوێژی بەیانی بەجێ بێنە، چونکە قورئان خوێندنی بەیانی هەمیشە دەبینرێت (لە لایەن فریشتەکانی شەوو ڕۆژەوە). ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو مەسعودەوە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوایان لێبێت) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ فەرموویەتی: (فریشتەکانی شەوو فریشتەکانی ڕۆژ ئامادەی نوێژی بەیانی دەبن)[3]. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕێزی نوێژی بە کۆمەڵ بەسەر نوێژی بە تەنهادا بیستو پێنج پلەیە، فریشتەی شەوو فریشتەی ڕۆژ لە نوێژی بەیانیدا کۆدەبنەوە). ئەبو هورەیرە ئەڵێ: ئەگەر حەز دەکەن ئایەتی ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ بخوێنن[4]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودو ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) لەم ئایەتەدا: ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ فەرموویەتی:

---

[1] الطبري(١٧/٥١٥/٥١٦).

[2] الطبري(١٧/٥١٨)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[3] الطبري(١٧/٥٢٠).

[4] فتح الباري(٨/٢٥١).

(فریشتەی شەوو فریشتەی ڕۆژ ئامادەی دەبن)[1]. تیرمزیو نەسائی ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە. تیرمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاکو ڕاستە[2]. وە لە فەرموودەیەکدا کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (بە دوای یەکتریدا فریشتەکانی شەوو فریشتەکانی ڕۆژ دێنە لاتان، کۆدەبنەوە لە نوێژی بەیانیو لە نوێژی عەسردا ئەو فریشتانەی لە لاتان ماونەتەوە، سەردەکەون، پەروەردگاریان لێیان دەپرسێت، (خوا باشتر دەزانێ لە خۆتان ئاگادارترە لێتان) کە چۆن بەندەکانی منتان بەجێ هێشت؟ فریشتەکان دەڵێن: چووینە لایان ئەوان نوێژیان دەکرد، بەجێمان هێشتن هەرنوێژیان دەکرد)[3]. عەبدوڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: ئەو پاسەوانانە کۆدەبنەوە لە نوێژی بەیانیدا ئەوانە سەردەکەونو ئەوانەیتریان دەمێننەوە[4]. ئیبراهیمی نەخەعیو موجاهیدو قەتادەو کەسانی تریش هەر وایان وتووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.[5]

## فەرماندان بە شەونوێژکردن

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ﴾ واتە: لە شەویشدا هەستە بۆ نوێژ، ئەوە زیادە نوێژێکە تایبەت بە تۆیە. ئەمە فەرمانێکە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە لە شەودا هەڵسێتو شەونوێژ بکات. دوای فەرزەکان، وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، پرسیاری لێکرا کام نوێژ گەورەترە دوای نوێژە فەرزەکان؟ فەرمووی:(شەونوێژ)[6]. بۆیە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، دوای نوێژە فەرزەکان هەڵسێت بۆ شەونوێژ، بێگومان شەونوێژ دوای هەڵسان لە خەوتن بووە، ئەمە قسەی عەلقەمەونەسوەدو ئیبراهیمی نەخەعیوکەسانی تریشە[7]؟ ئەمانیش دیارو ئاشکرایە لە زمانی عەرەبیدا. وە لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا(ﷺ) هەر بەو شێوەیە هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)پاش خەوتن شەونوێژی دەکرد. ئەم ڕایەش لە ئیبنو عەبباس[8]و عائیشە[9]و زۆر کەسی

---

[1] احمد(٤٧٤/٢) ، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي(٥٦٩/٨)، النسائي في الكبرى(٣٨١/٦)، ابن ماجه(٢٢٠/١) ، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[3] فتح الباري(٤١/٢)، مسلم(٤٣٩/١).

[4] الطبري(٥٢١/١٧).

[5] الطبري(٥٢١/١٧).

[6] الطبري(٥٢١/١٧).

[7] الطبري(٥٢٤/١٧).

[8] فتح الباري(٨٣/٨).

[9] فتح الباري(٣٩/٣).

تریشەوە ڕیوایەتکراوە. وەك لە شوێنی خۆیدا بە تەواوی باس کراوە، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە. حەسەنی بەسری دەڵێت: ئەو نوێژەیە دوای نوێژی عیشا کراوە ئەم قسەیەش براوەبەبەر ئەونوێژانەدا کەلە دوای خەوتن کراون[1]. پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿نَافِلَةً لَّكَ﴾ ئەوە زیادە نوێژیشە تایبەت بە تۆیە. بۆیە زیادە نوێژی تایبەت کردووە بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) چونکە خوای گەورە لە گوناهی پاش و پێشی خۆش بووە، بەڵام بۆ ئومەتەکەی دەبێتە هۆی لێخۆشبوونی ئەو گوناهانەی کە کردوویانە، ئەمە موجاهید وتوویەتی[2] و کە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددا لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە(ڕەزای خوای لێبێت) ڕیوایەت کراوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾ بەڵکو پەروەردگارت تۆ بنێرێتە جێگایەکی پەسەندکراو. واتە: هەڵسە بەو کارەی کە فەرمانم پێ کردووی تا لە ڕۆژی قیامەتدا لە شوێنێکی پەسەندکراودا داتبنێم. کە هەموو خەڵکی و وەدیهێنەرەکەشیان سوپاست بکەن. ئیبنو جەریز دەڵێت: زۆرینەی زانایانی تەفسیر وتوویانە: ئەوە ئەو شوێنەیە کە موحەمەد(ﷺ) تێیدا دەوەستێ لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ تکاکردن بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی پەروەردگاریان. ڕزگاریان بکات لە ناڕەحەتی و بارگرانی ئەو ڕۆژە[4]. حوزەیفە دەڵێت: خەڵکی کۆدەکرێنەوە لەیەك شوێندا، دەنگی جارچیەك دەبیستن و تاچاو بربکات شت دەبینرێت، هەموو پێ پەتی و ڕووتن وەك چۆن دروست کران لە پێشدا، بە پێوە وەستاون و هیچ کەسێك قسە ناکات بە ئیزنی خوای گەورە نەبێت، بانگ دەکرێت ئەی موحەمەد(ﷺ)! ئەمیش دەفەرموویێت: (بەڵێ ئەوە هاتم و لەخزموتدام[5]، هەموو چاکەیەك بە دەستی تۆیە، شەڕ لای تۆ نیە، ڕێ نیشاندەرو ئەو کەسەیە تۆ ڕێت نیشان داوە عەبدی خۆت لەبەر دەستتدایەو لە خزمەتتدایە، هەموو شتێك لە تۆوەیەو بۆ لای تۆیە. ڕزگارکەرو پەناگەیەك نیە لە تۆ تەنها خۆت نەبێت، مەزن و پایەبەرزی، پاکی و بێعەیبی هەر بۆ تۆیە، ئەی خاوەنی کەعبە). ئەمە ئەو شوێنە پەسەندکراوەیە(المقام المحمود) کە خوای گەورە باسی کردووە[6]. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئەم شوێنە پەسەندکراوە شوێنی شەفاعەتکردن تکاکردنە[7]، ئیبنو

---

[1] الطبري(١٧/٥٢٤).

[2] الطبري(١٧/٥٢٥).

[3] احمد(٥/٢٥٥).

[4] الطبري(١٧/٥٢٦).

[5] مانای (لبيك وسعديك) مان بە(بەڵێ ئەوە هاتم و لەخزمەتدام) کرد (وەرگێڕ).

[6] الطبري(١٧/٥٢٦).

[7] الطبري(١٧/٥٢٧).

ئەبی نەجیمیش هەر وای ڕیوایەت کردووە لە موجاهیدەوە. حەسەنی بەسریش هەر وای وتووە. قەتادە دەڵێت: ئەو (واتە پێغەمبەر(ﷺ)) یەکەم کەسێکە کە زەمینی بۆ لەت دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا و دێتەدەرەوە، یەکەم تکاکاریشە[2]. زانایان بە لایانەوە وایە ئەو شوێنە پەسەندکراوە ئەوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾.منیش دەڵێم: لەڕۆژی قیامەتداپێغەمبەر(ﷺ) چەندین ڕێزی لێدەنرێت، هەندێکیان کەس بەشدار نییە تێیدا و هەندێکیشیان کەس یەکسان نییە بەئەو لەوەدا، پێغەمبەر(ﷺ) یەکەم کەسە کە زەمینی بۆ دەقڵیشێت و بە سواری بۆ گۆڕەپانی مەحشەر دەبرێت، ئالآیەکی هەیە ئادەمو ئەوانەی دوای ئادەمیش لە ژێرئەو ئالآیەدان، حەوزێکیش هەیە هیچ کەسێك نیە لەوێدا بە ئەندازەی ئەو حەوزەی ئەو خەڵکی بێتە سەر. تکاگەورەکەشی هەیە لە خوای گەورە بۆئەوەی بێت بۆدادوەری خەڵکی و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات، ئەمەیش دوای ئەوەیە کە خەڵکی داوا دەکەن لە ئادەمو پاشان لە نوحو ئیبراهیمو موساو عیسا کە بچن بە هانایانەوە. هەموو دەڵێن: من بۆ ئەوە ناشێم، هەتا دێنە لای موحەمەد(ﷺ) دەفەرمووێت: (من هی ئەوەم، من هی ئەوەم). جائەگەر خوا مەیلی لێبێت کەمێکیتر بە درێژی لەم شوێنەدا باسی ئەوەدەکەین. یەکێکی تر لەو ڕێزانەی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەنرێت ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) تکادەکات بۆ خەڵکانێك کە فەرمان دراوە بیانبەن بۆ ناوئاگر، یەکسەر دەیانگێڕنەوەو ناچنە ناوئاگر. هەروەها حەزرەتی محمد(ﷺ) یەکەم پێغەمبەرە کە دادوەری ئومەتەکەی یەکەمجار دەکرێت. یەکەم ئومەتیشن کە مۆڵەتیان پێ دەدرێت پێغەمبەر(ﷺ) پیانپەڕێنێتەوە لە پردی سیرات. یەکەم تکاکاریشە لەناو بەهەشتدا وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە[3]. لە فەرموودەکەی فوکردن بە(الصور)یشدا هاتووە کە خاوەنباوەڕان بە تکای پێغەمبەر نەبێت(ﷺ) ناچنە بەهەشتەوە، یەکەم کەسیش دەچێتە بەهەشت پێغەمبەر(ﷺ) خۆیەتی، ئومەتەکەیشی لە پێش هەموو ئومەتەکانی تر دەچنە بەهەشت، تکاش دەکات بۆ بەرزکردنەوەی پلەی زۆر کۆمەڵ کە بە کردەوەی خۆیان پێی ناگەن. خاوەنی وەسیلەیشە(الوسيلة) کە بەرزترین شوێنە لە بەهەشتدا کە شایەنی کەسی تر نیە ئەو نەبێت، کاتێك کە خوای گەورە ئیزن ئەدا تا تکابکرێت بۆ تاوانباران، فریشتەو پێغەمبەرانو خاوەنباوەڕانیش دەست بە تکا دەکەن بۆ خەڵکی. جا پێغەمبەریش(ﷺ) تکا بۆ خەڵکانێك دەکات کە خودا خۆی نەبێت کەس ژمارەیان نازانێت، هیچ کەسێك وەك ئەو تکا ناکات ویەکسان نابێت بە ئەو[4]. من بە چاکیو بە ڕوونی لە کۆتایی ژیاننامەکەی

[1] الطبري(١٧/٥٢٧).

[2] الطبري(١٧/٥٢٨).

[3] مسلم(١/١٨٢).

[4] الطبراني في الطوال(٣٦).

پێغەمبەردا و لەباسی(الخصائص)دا سیرەتەکە باسم کردووە سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە. ئێستاش بەپشتیوانی خوا ئەو فەرموودانەی کە لەبارەی ئەو شوێنە پەسەنکراوەوە هاتووە باس بکەین: بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە کە دەڵێت: خەڵکی لەو ڕۆژەدا بەچۆکدا دەکەونو هەموو ئومەتێك شوێن پێغەمبەرەکەی خۆی دەکەوێتو دەڵێن: ئەی فلان تکامان بۆ بکە، ئەی فلان تکامان بۆ بکە هەتا ئەو تکایە دەگاتە موحەمەد(ﷺ) ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە ڕەوانەی دەکات بۆ شوێنە پەسەندکراوەکە (المقام المحمود)[1]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(خۆر ئەوەندە نزیك دەبێتەوە هەتا ئارەق دەگاتە نیوەی گوێچکە، کاتێك ئەو خەڵکە وایان بەسەردێت، هانا دەبەن بۆ ئادەم، ئەویش دەفەرموێت: من خاوەنی ئەوە نیم، پاشان هانا دەبەن بۆ موسا، ئەویش هەر وا دەڵێت، پاشان هانادەبەن بۆ موحەمەد(ﷺ)ئەویش لە نێوان خەڵکیدا دەست بە تکاکردن دەکات و دەڕوات هەتا دەست دەگرێت بە هەڵقەی دەرگای بەهەشتەوە. ئا لەو ڕۆژەدا خودا زیندووی دەکاتەوە بۆ ئەو شوێنە پەسەندکراوە.[2] هەر بەم شێوەیە بوخاری لە(کتاب الزكوة) دا ڕیوایەتی کردووەو ئەم زیادەیەشی خستووتە سەر (هەموو خەڵکی مەحشەریش ستایشی دەکەن)[3]. ئەبو داودی تەیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵاوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: پاشان خوای گەورە ئیزنی تکاکردن دەدات، گیانی پیرۆز کەجوبەرئیلە هەڵدەستێ، پاشان ئیبراهیمی خەلیل هەڵدەستێ، پاشان عیسا یان موسا هەڵدەستێ، ئەبولزەعرا دەڵێت: نازانم کامەیانە، دەڵێت: پاشان: پێغەمبەرەکەی ئێوە(ﷺ) چوارەمیان هەڵدەستێ، تکا دەکات، هیچ کەس نیە دوای ئەو زیاتر لەوەی ئەو تکا بکات. ئەو شوێنەش شوێنە پەسەندکراوەکەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا﴾[4].

**فەرموودەی ئەبو هورەیرە( ڕەزای خوای لێبێت )**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: گۆشتێ هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دەستەکەیخرایە بەردەستی، چونکە حەزی لەگۆشتی دەست بوو، قەپێکی لێگرت پاشان فەرمووی: (من سەرداری خەڵکیم لە ڕۆژی قیامەتدا، ئایا دەزانن ئەوە لەبەر چیە؟ خودا پێشینانو پاشینان کۆدەکاتەوە لە یەك شوێندا، دەنگی جارچیەك پێیان دەگاتو چاوی هەموویان دەبینێت، خۆر نزیك دەبێتەوە، خەڵکی ئەوەندە غەمبارو نارەحەت دەبن و توانایان نامێنێتو خۆیان

---

[1] فتح الباري(٨/٢٥١).

[2] الطبري(١٧/٥٢٩).

[3] فتح الباري(٣/٣٩٦).

[4] مسند الطيالسي(٥١)، سەنەدەکانی لاوازە.

بۆ ناگیرێت، هەندێ لەو خەڵکە بە یەکتری دەڵێن: ئایا نابینن ئێوە حاڵتان چۆنەو چیتان بەسەر هاتووە، ئایا چاوەڕوانی کەسێك ناکەن تکاتان بۆ بکات لە لای پەروەردگارتان؟ هەندێ لەو خەڵکە دەڵێت بەوی تر: بچنە لای ئادەم، ئەوانیش دەچن بۆ لای ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) ئەڵێن: ئەی ئادەم! جەنابتان باوکی ئەو خەڵکەن، خودا بە دەستی خۆی دروستی کردووی، لە ڕوحی خۆی فوی پێدا کردووی، فەرمانیشی کردووە بە فریشتەکان سوژدەیان بۆ بردووی، تکامان بۆ بکە لە لای خودا، ئایا نابینی ئێمە لە چ حاڵێکدان، ئایا نابینی چیمان بەسەر هاتووە؟ ئادەم دەفەرمووێت: بە ڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تورەبووە، بە تورەبوونێ کە پێش ئەوە وا تورە نەبووە لەمەودواش وا تورە نابێت، بە ڕاستی خودا ئەودرەختەی لێ قەدەغەکردم، کەچی من بێ گوێیم کرد. نەفسی نەفسی نەفسی[1]، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ لای نوح، دەچن بۆ لای نوح ئەڵێن: ئەی نوح! تۆ یەکەم ڕاسپێردراو بۆ خەڵکی زەمینی، خودا ناوی بردووی بە بەندەیەکی سوپاسگوزار، تکامان بۆ بکەی لای پەروەردگارت، ئایا نابینی لە چ حاڵەتێکداین، ئایا نابینی چیمان بەسەر هاتووە؟ نوح دەفەرمووێت: بە ڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ ئەوەندە توورە بووە، بە تورەبوونێکی وا کە پێش ئەمە وا تورە نەبووە، لەمەودوایش وا تورە نابێت، بێگومان من کاتی خۆی نزایەکم کردووە لە هۆزەکەم[2]، نەفسی، نەفسی، نەفسی، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم، دەچن بۆ لای ئیبراهیم، ئەڵێن: ئەی ئیبراهیم تۆ پێغەمبەری خودای‌و خەلیلی ئەوی[3] لە خەڵکی زەمیندا، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی لە چ حاڵێکداین، ئایا نابینی چیمان بەسەر هاتووە؟ دەفەرمووێت: بە ڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توورە بووە بە توورەبوونێکی وا کە پێش ئەم توورە بوونە وا توورە نەبووە، لەمەودوایش وا تورە نابێت، باسی درۆکانی خۆی دەکات، نەفسی نەفسی نەفسی، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ لای موسا، دەچنە لای موسا(سەلامی خوای لێبێت) ئەڵێن: ئەی موسا تۆ ڕاسپاردەی خودای‌و خودا هەڵی بژاردووی لەناوخەڵکیدا بەوەی پەیامەکانی خۆی پێداوی و قسەی لەگەڵداکردووی، جا بەڵکوتکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت، ئایا نابینی لە چ حاڵێکداین، ئایا نابینی چیمان بەسەر هاتووە؟ موسایش دەفەرمووێت پێیان: بە ڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ توورە بووە بە توورەبوونێکی وا کە پێش ئەم توورە بوونە وا توورە نەبووە، لەمەودوایش وا تورە نابێت، بە ڕاستی من پیاوێکم کوشت، لەکاتێدا فەرمانم پێ نەکرابوو بیکوژم، نەفسی نەفسی نەفسی، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆلای عیسا، دەچن بۆلای عیساو ئەڵێن: ئەی عیسا تۆ ڕاسپادەی خوای و ووتەی ئەو پەروەردگارەی و

---

[1] واتە: من هەرفریای نەفسی خۆم ئەکەوم وتکام هەربۆئەو پێئەکرێت (وەرگێڕ).

[2] واتە: ئەو نزایە بەهەڵە ئەزانم و هەرتکای لێخۆشبونم بۆخۆم پێئەکرێ(وەرگێڕ).

[3] خلیل الله: واتە دۆستی بەڕاستی خوای گەورە(وەرگێڕ).

فرێدراوەی بۆ مەریەم‌و ڕوحێکی لەلایەن خواوە، لە بێشکەدا قسەت لەگەڵ خەڵکی کردووە بە منداڵی، جا بەڵکو تکامان بۆبکەی لای پەروەردگارت، ئایا نابینی لە چ حاڵێکداین، ئایا نابینی چیمان بەسەر هاتووە؟ عیسایش دەفەرمووێت پێیان: بە ڕاستی پەروەردگارم ئەمڕۆ تووڕە بووە بە تووڕەبوونێکی وا کە پێش ئەم تووڕە بوونە وا تووڕە نەبووە، لەمەودوایش وا تورە نابێت-باسی هیچ گوناهێکی ناکات- نەفسی نەفسی، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، دەچن بۆ لای موحەمەد(ﷺ) ئەڵێن: ئەی موحەمەد(ﷺ)! تۆ ڕاسپاردەی خوای و کۆتایی پێغەمبەرانیشی، خودا لە گوناهی پێشیش‌و پاشیشت خۆش بووە، تکامان بۆ بکە لای پەروەردگارت ئایا نابینی چیمان بەسەر هاتووە؟ جا منیش هەڵدەسم‌و دێم بۆ ژێری عەرش و دەکەوم بە سوژدەدا بۆ پەروەردگاری مەزنم. خودا دەرگای ئیلهامم و بیرم لێدەکاتەوەو فێری سوپاس‌و ستایشێکی وام دەکات کە لە پێش مندا بۆ هیچ کەسێکی تری لەو شتانەی نەکردووە، پاشان فەرمانم پێ دەکرێت: ئەی موحەمەد(ﷺ) سەر هەڵبڕە، داوا بکە دەتدرێتێ، تکا بکە لێت قەبوڵ دەکرێت، سەر بەرز دەکەمەوە و دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئومەتەکەم! ئومەتەکەم! جا فەرمانم پێ دەکرێت ئەی موحەمەد(ﷺ)لە ئومەتی خۆت ئەوەی حیسابی لەسەر نیە لە دەرگای لای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشتەوە ببەرە ناو بەهەشتەوە، ئەوان لە دەرگاکانی تریشدا شەریکی خەڵکن، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بە دەستە نێوانی دوو لاشیپان لە لاشیپانی دەرگای بەهەشت بە ئەندازەی نێوان مەککەو هەجەرە، یان فەرمووی: بە ئەندازەی نێوان مەککەو بوسرایە[1]. ئەمە حەدیسە و لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە[2].

﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ ۚ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾

**فەرماندان بە کۆچکردن**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککەدا بوو پاشان فەرمانی پێدرا کۆچ بکات، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴾[3] واتە: دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، ڕێکەم بەرەو ڕاستی بەرەو بەرەو ڕاستیشم بەرێ بکە، هێزێکی یارمەتی دەریشم بۆ دیاری بکە.

---

[1] احمد(٤٣٥/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] البخاري(٤٧١٢)، مسلم(٨٩٤).

[3] احمد(٢٢٣/١) ، سەنەدەکانی لاوازە لەبەر لاوازی قابوس.

تیرمزی دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەكی چاكو ڕاستە[1]. حەسەنی بەسری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: كاتێك خوانەناسانی قورەیش پیلانیان نایەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) كە بیكوژن یان وەدەری نێن لە مەككە یان قۆڵبەستی بكەن، خودایش بڕیاری جەنگی دابوو دژبە خەڵكی مەككە، فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ)كە دەرچێ لە مەككەو بڕوات بەرەو مەدینە، ئەوەیە كە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ ﴾[2]. قەتادە دەڵێت: ﴿ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ﴾ مەبەست: مەدینەیە، ﴿ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ﴾ مەبەست: مەككەیە[3]. عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەمیش هەر وای وتووە.[4] پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَٱجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَـٰنًا نَّصِيرًا﴾ واتە: دەسەڵاتێكی یارمەتی دەریشم بۆ دیاری بكە. حەسەنی بەسری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: پەروەردگاری بەڵێنی دابوو بە پێغەمبەر(ﷺ) كە دەسەڵاتی فارسو گەورەیی فارس لە دەستی فارسەكان بسێنێتو بیداتە دەستی ئەو، دەسەڵاتو گەورەیی ڕۆمیش لە دەستی ڕۆرمەكان بسێنێتو بیداتە دەستی ئەو.[5] قەتادەیش دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیزانی كە ئەو توانای ئەو كارەی نیە پێویستی بە هێزێك هەیە، بۆیە داوای هێزی لە خودا كرد هێزێكی یارمەتیدەری بۆ یارمەتی پەیامی خوداو پاراستنی سنوورەكانیو بەجێهێنانی فەرزەكانیو جێگیركردنی ئاینی خودا، چونكە ئەو دەسەڵاتە دەبێتە ڕەحمەت لە نێوان عەبدەكانی خودا، ئەگەر ئەو هێزە نەبێت، خەڵكی پەلاماری یەكتری دەدەنو دەسەڵاتدار بێدەسەلات دەخواتو لەناوی دەبات[6].

كەواتە پێویستە هێزێك هەبێت لەگەڵ هەقدا بۆ ملدان بە ئەوانەی بەری لێدەگرنو دژایەتی دەكەن. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ﴾[7]. ئێمە پەیامبەرانی خۆمانمان هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەی ڕووندا ڕەوانەكردووە وترازوویشمان لەگەڵیاندا ناردووە بۆئەوەی خەڵكی داد بەرقەرار بكەن و ئاسنیشمان ناردووەتە خوارەوە.

---

[1] تحفة الأحوزي(٥٧٤/٨).

[2] الطبري(٥٣٣/١٧).

[3] احمد(٢٢٣/١).

[4] الطبري(٥٣٤/١٧).

[5] الطبري(٥٣٦/١٧).

[6] الطبري(٥٣٦/١٧).

[7] الحديد(٣٥).

**هەڕەشەیەك لە خوانەناسانی قورەیش**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾ واتە: بڵێ: ئەوە ئاینی ڕاست هات، ئاینی ناهەق نەماو ڕۆیشت، بە ڕاستی بەتاڵ هەمیشە لەناو چووە. ئەمە هەڕەشەیەکی خودایە لە قورەیشیەکان، کە ئاینی هەقیان بۆ هاتووە، کە دوورە لە هەموو گومانێکەوە و ئەوانیش ناتوانن ببنە لەمپەر لە بەرانبەریدا، ئەو پەیامەیە کە بە پێغەمبەردا(ﷺ) ڕەوانەی کردووە وبریتییەلە قورئانو باوەڕو زانستی بەسوود، بەتاڵەکەی ئەوانیش لەناو دەبات، چونکە ناهەقی خۆی ناگرێت بەرامبەر بە هەقو بەردەوام نابێت، ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ﴾ واتە: نەخێر ئێمە دەمانەوێت بەچەکی هەق بکێشین بەبەتاڵدا و مۆخی دەربهێنین و وای لێبێت پوچ ببێتەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) چووە ناو مەککە لە دەوری کەعبەدا سێ سەدو شەست بت هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) بە بەشوڵێك کەبەدەستیەوە بوو پێیدا ئەکێشان و دەیفەرموو: ﴿ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾ وە دەیفەرموو: ﴿ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴾[1] واتە: ڕاستی هات و جێی پڕوپوچی گرتەوەو ناهەق هیچ باوێکی نەماو تازە هەرگیز ناگەڕێتەوە)[2].

﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾

**ئەم قورئانە هەم چارەسەرو هەم ڕەحمەتیشە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾ واتە: لەم قورئانەدا ئەوەی کە هۆی شیفا و ڕەحمەتە دەنێرینە خوارەوە بۆ خاوەن باوەڕان ستەمکارانیش زیاتر پێی زیانبار دەبن. خوای گەورە باسی کتێبەکەی خۆی دەکات کە ناردوویەتیە خوار بۆ سەر پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ)، ئەو قورئانەی کە پڕوپوچی تێکەڵاو نابێت نە لە ئێستاداو نە لەمەودوایش، هاتووەتە خوار لە لایەن خودای کارزان و سوپاسکراوەوە، ئەم قورئانە چارەسەرو ڕەحمەتە بۆ خاوەنباوەڕان، واتە: هەرچی نەخۆشیە دەروونیەکانە لە دوودڵیو دووڕوویيو بتپەرستيو لادانو ئارەزووی خراپە لای دەبات، قورئان چارەسەری گشت نەخۆشیەکانە، پڕیشە لە سۆزو بەزەیی کە لەو زەمینەدا باوەڕو کارزانیو گەڕان بە شوێن چاکەو چاکەکاریدا گەشەی زیاتر دەکات، ئەمەیش بۆ هیچ کەسێك وەدەست نایەت، مەگین ئەو کەسانەنەبێت کە بڕوایان بەو قورئانە

[1] سبأ(٤٩).

[2] فتح الباري(٨/٢٥٢).

هێناوەو بە ڕاستیان زانیووەو شوێنی کەوتوون، بێگومان قورئان شیفاو ڕەحمەتە بۆیان، بەڵام خوانەناس‌و ئەوەی ناهەقی لە خۆی کردووە بەو خوانەناسیە، گوێ گرتنی لە قورئان زیاتر دووری دەخاتەوەو بێدین تری دەکات، نەخۆشیەکە لە خوانەناسەکەوەیە، نەك لە قورئانەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾[1] واتە:(ئەی موحەمەد(ﷺ)) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێك باوەڕیان پێی هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانەو ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لە گوێیاندا گرانی‌و کەڕی هەیە(لە بیستنی هەق) هەروەها لە ئاستی ئەو قورئانەدا کوێرن، ئەوانە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە بانگ دەکرێن. هەروەها دەفەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ﴾[2] واتە: وە کاتێك کە بنێردرێتەوە خوارەوە سورەتێك(لە قورئان)،(دووڕووەکان) هی وایان هەیە دەڵێت: کام لە ئێوە باوەڕی زیادیکرد بەم (سورەتە) جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەمە ئیمانیان زیاد دەکات(و بەهێزتر دەبێت) وە ئەوان مژدە بەخشن‌و خۆش حاڵن، بەڵام ئەوانەی لە نێو دڵیاندا نەخۆشی‌و ناپاکی هەیە ئەوە سورەتەکە بۆیان زیاد دەکات سەرەڕای ئەو پیسی‌و ناپاکی یەی خۆیان پیسی‌و ناپاکی تر، ئەو (ناپاکانە) دەمردن لە کاتێکدا کە بێباوەڕن. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرە، قەتادە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ دەڵێت: کاتێك خاوەنباوەڕ گوێی لە قورئان بوو سوودی لێ وەردەگرێت‌و لەبەری دەکات‌و لێشی تێدەگات. ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ بەڵام خوانەناسان سودی لێ وەرناگرن‌و لەبەری ناکەن‌و لێشی تێناگەن، چونکە خوای گەورە ئەم قورئانەی کردووە بەچارەسەرو ڕەحمەت بۆ خاوەن باوەڕان.

﴿وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾﴾

### باوو نەریتی مرۆڤ لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا

[1] فصلت(٤٤).

[2] التوبة(١٢٤_١٢٥).

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا﴾ واتە: مرۆڤ هەر کاتێك بەهرەیەکی دەدەینێ، پشتی تێدەکات و باییەوایی دەنوێنێت، هەر کاتێك بەڵایشی بەسەرهات، توشی نائومێدی دەبێت. خوای گەورە باسی کەمو کوڕی مرۆڤ دەکات وەك مرۆڤ خۆی چۆنە، مەگەر کەسێك خودا خۆی پاراستبێتی لە کاتی خۆشیو ناخۆشیدا، هەر کاتێك خودا بەهرەمەندی کردبێت بە سامانو تەندروستی و ڕۆزی و یارمەتیدان و ئەوەی حەزی لێکردبێت پێی دابێت، پشتی کردووەتە گوێڕایەڵی خوداو عیبادەت کردنی، لە خۆبایی بووە. موجاهید دەڵێت: ﴿وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾ واتە: لێمان دوورکەوتووەتەوە[1]. منیش دەڵێم: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ﴾[2] واتە: کاتێك لامان برد زیانەکەیو نەمان هێشت دەچێتە سەر حاڵی پێشوی وەك هەرهاواری نەکردبێت لێمان بۆ لابردنی زیانێك کە دوچاری بووە! هەروەها وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموویت: ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ﴾[3] واتە: کەچی کاتێك کە خوا ڕزگارتان دەکات دەگەنە وشکانی و ڕوو وەردەگێڕن. کاتێك کە تووشی خراپە هات واتە: گیروگرفتو لێقەومانو کارەسات هات ﴿كَانَ يَـُٔوسًا﴾ بێ ئومێد دەبێتو بە هیوا نیە جارێکی تر تووشی چاکە ببێتەوە، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾[4] واتە: سوێند بە خوا ئەگەر ئێمە بچەژێنین بە ئادەمی چاکەو بەهرەیەك لای خۆمانەوە پاشان ئەو(چاکەو بەهرەیەی) لێ بگرینەوە بێگومان ئەو زۆر نائومێدو سپڵەیە(لەو کاتەدا)، سوێند بە خوا ئەگەر پێی بچێژین بەهرەو چاکە دوای ئەو سەختیو نارەحەتیانەی تووشی بووە بێگومان دەڵێت گشت سەختیو زیانەکانم لە مل بوویەوەو بەرۆکی بەردام، بێگومان لەو کاتەدا زۆر دڵخۆشو لووت بەرزو خۆبەزلزانە، جگە لەوانەی کە بە ئارامو خۆگر بوونو کردەوە چاکەکانیان بەجێ هێناوە، ئەوانە بۆیان هەیە لێبوردنو پاداشتی گەورە. پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ قُلْ كُلٌّ

[1] الطبري(١٧/٥٣٩).
[2] يونس(١٢).
[3] الاسراء(٦٧).
[4] هود(٩ـ١١).

يَعۡمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَنۡ هُوَ أَهۡدَىٰ سَبِيلٗا﴾ واتە: بڵێ: ڕەفتاری هەر كەسێك بە پێی ئاكاری خۆیەتی، پەروەردگارت زاناترە، كێ لە ئێوە لە ڕێگە شارەزاترە، ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ﴾ واتە: ڕووەو خۆیەتی[1]. موجاهید دەڵێت: بە پێی توندو تیژیو سروشتی خۆی[2]. قەتادە دەڵێت: بە پێی مەرامو نیەتی خۆی[3]. ئیبنو زەید دەڵێن: بە پێی ئاینی خۆی[4]، ئەم قسانە هەموو لە یەكەوە نزیكن لە مانادا، ئەم ئایەتە(والله أعلم) هەڕەشەیە لە بتپەرستانو بەڵێن دانە بە تۆڵە لێسەندنیان لە ڕۆژی قیامەتدا. وەك فەرموویەتی: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنَّا عَٰمِلُونَ﴾[5] واتە: بەو كەسانەی كە باوەڕیان نیە بڵێ: هەرچی لە دەستتان دێت بیكەن، وا ئێمەش كاری خۆمان دەكەین. بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ كُلّٞ يَعۡمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَنۡ هُوَ أَهۡدَىٰ سَبِيلٗا﴾ واتە: كێ لە ئێمەو ئێوە لە ڕێگە شارەزاترە، هەر كەسەو بە پێی كرداری خۆی پاداشت وەردەگرێت، چونكە خوای گەورە هیچ پەنهانیەكی لێ ون نابێت.

﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾

**باسی (ڕۆح)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا﴾ واتە: لە تۆ دەپرسن(ئەی موحەمەد(ﷺ)) گیان چیە؟ بڵێ گیان لەوشتانەوایە كە تەنیا پەروەردگارم دەیزانێت، ئێوە كەمێكتان لە زانست پێدراوە. بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە عەبدوڵای كوڕی مەسعودەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: من لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دەڕۆیشتم لە كێڵگەیەكدا پێغەمبەر(ﷺ) لقێكی دارخورمای وەك گۆچان بە دەستەوە بوو، هێزی دەدایە سەر. لەو كاتەدا چەند كەسێك لە جولەكە بە لایدا ڕۆیشتن، هەندێكیان بە هەندێكیان وت: پرسیاری لێبكەن لەبارەی گیانەوە، وتیان چی بەدگومانی كردون لە ڕاستی ئەو پیاوە؟ هەندێكیان وتیان: (وازبێنن) نەكا شتێكی وا بڵێت كە ئێوە پێتان ناخۆش بێت، كەچی وتیان: لێی بپرسن،

---

[1] الطبري(١٧/٥٤١).

[2] الطبري(١٧/٥٤١).

[3] الطبري(١٧/٥٤١).

[4] الطبري(١٧/٥٤١).

[5] هود(١٢١).

پرسیاریان لە بارەی گیان(ڕوح)ەوە لێکرد، پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو هیچ وەڵامێکی نەدانەوە، (ئیبن مەسعود ئەڵێ) زانیم کە نیگای (وەحی) بۆ دێت. لە شوێنی خۆم هەڵسام، کاتێك کە نیگاکە هاتە خوارەوە فەرمووی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴾ ئەم دەقە لە سەرەتاوە وا دیارەو ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم ئایەتە لە مەدینەدا هاتووەتەخوارەوە، کاتێك هاتووەتەخوارەوە کە جوولەکەکان پرسیاریان لێکردووە لەو بارەیەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم سورەتەهەمووی مەکییە. وەڵامی ئەم ئیشکالە ئەوەیە کە لەوانەیە جارێکی تر ئەم ئایەتە هاتبێتە خوار لە مەدینەدا، وەك چۆن لە پێشدا لە مەککە هاتووەتە خوار بۆی. یان لەوانەیە پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار کراوە کە بەو ئایەتەی کە لە پێشدا هاتووەتەخوار بۆی وەڵامیان بداتەوە کە ئەم ئایەتەیە. ئیبنوجەریریش ڕیوایەتی کردووە لە عیکریمەوە کە دەڵێت: ئەهلی کتێب پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)لە بارەی گیانەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوار: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾ وتیان: تۆ وا دەزانی ئێمە کەمێك زانیاری نەبێت هیچیترمان پێمان نەدراوە؟! ئێمە تەوراتمان پێدراوە کە پڕلە کارزانی و هەرکەسێك لە کارزانی بەشی پێدرابێت، ئەوە چاکەیەکی زۆری پێدراوە، ﴿وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾[1] عەکریمە دەڵێت: جا ئەم ئایەتە هاتەخوار: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ﴾[2] واتە: بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت لە زەویدایە قەڵەمو پێنووس بێت هەموو دەریای زەوی ببێتە مرەکەب حەوت دەریای تر دوای (ئەوەی باسکرا) ببێت بە مرەکەب وتەو زانراوەکانی خوا دوایی نایەنو تەواو نابن. جا فەرمووی ئەوەی پێتاندراوە لە زانست ئەگەر بە هۆیەوە خودا ڕزگاری کردن لە ئاگر. ئەوەزانیارییەکی زۆر وچاکیشە، بەڵام لە چاو زانیاری خوادا هەرکەمە[3]. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ﴾ ئەوەکاتێکبوو جوولەکەکان وتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) باسی گیانمان بۆبکە و بابزانین ئەو گیانەی لەناو لاشەدایە چۆن سزا دەدرێت، چونکە ئەو گیانە لە لای خوداوەیە، هیچ شتێك لەو بارەیەوە نەهاتبووە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ). بۆیەهیچ وەڵامێکی نەدانەوە، جوبرەئیل هاتە لای پێی فەرموو: ﴿قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾. پێغەمبەر(ﷺ) ئەو هەواڵەی پێدان. وتیان: کێ ئەم هەواڵەی بۆ هێنای؟ فەرمووی: جوبرەئیل بۆی هێنام لە لایەن خواوە، بە پێغەمبەریان وت:

---

[1] البقرة(٢٦٩).

[2] لقمان(٢٧).

[3] الطبري(١٧/٥٤٢).

سوێندبەخوا دوژمنەکەی ئێمە نەبێت کەس ئەوقسەی پێ نەوتووی. خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾[1]. واتە: بڵێ هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیلە(با بزانێ) هەر ئەوە کە ئەم قورئانە (بە ئیزنی خوا) هەواڵەی دڵی تۆ دەکات، بە کتێبەکانی دیکەی ئاسمانیش باوەڕدەکات.

## جیاوازی لەنێوان گیان و دەروونا

سوهەیلی(سُهيلی) باسی ئەو جیاوازیانەی کردووە کە لە نێوان زانایاندا هەبووە، کە ئایاڕۆح و نەفس یەك شتن یان ڕۆح شتێکی ترە، ئەوەسەلماوە کە ڕۆح شتێکی ناسکە وەك با وایە لە لاشەدا دەگەڕێت وەك چۆن ئاو بە ڕەگی درەختدا دەڕوات، دەشڵێن ئەو ڕۆحەی کە فریشتە دەیکات بە بەری منداڵدا لەسکی دایکیدا ئەوە نەفسە بە مەرجێك پەیوەندی بە لاشەوە هەبێت، بە هۆی ئەو لەشەوە مەدح و زەم هەڵدەگرێت، ئەو نەفسەش یان نەفسی بێ خەمە(المطمئنة) یان نەفسی خراپەکارە، وەك چۆن ئاو هۆی ژیانی درەختە، کاتێك کە تێکەڵاوی درەخت بوو ناوێکی تایبەتی بۆ خۆی هەڵدەگرێت، کاتێك تێکەڵاوی داری مێو بوو پاشان گوشرا دەبێت بە بادەیەکی سەرخۆشکەر یان ئاوێکی گوشراو، ئیتر ئەو کاتە پێی ناوترێت ئاو مەگەر بەشێوەیەکی مەجازی، هەر بەو شێوەیە بە نەفسی ناوترێت ڕۆح بەو جۆرە نەبێت، دیسان بە ڕۆحیش ناوترێت نەفس. مەگەر بەو پێیە کە ئاماژەمان پێکرد، ئەوەی کە وتمان بە کورتی: ئەوەیە کە ڕۆح سەرچاوەی نەفسە و مادەکەیەتی، نەفسیش لەو پێك هاتووە، کاتێك کە تێکەڵاوی لاشەدەبێت، ڕۆح خۆی نەفسە لە ڕوویەکەوە. نەك لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەم مانایەش مانایەکی چاکە(والله أعلم).[2] منیش دەڵێم: خەڵکی زۆر قسەیان کردووە لە بارەی ماهیەتی ڕۆح و یاساکانییەوە. زۆر کتێبیان لەبارەیەوە داناوە. چاکترینی ئەو کەسانەی قسەیان لەم باسە کردووە حافیز ئیبنو مەندەهە لە کتێبێکیدا وەك بیستوومانە لە بارەی گیانەوە دایناوە.

﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ ﴾

## ئەگەر خودا مەیلی لێبێت قورئان دەباتەوە

---

[1] (البقرة: ٩٧) الطبري(١٧/٥٤٣).

[2] الروض الأنف(٢/٦٢).

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴾ ئەگەر ئێمە مەیلمان لێبێت، هەرچیەکمان پێ ڕاگەیاندووی دەیبەینەوە کەسیش نیە لە دژی ئێمە لەمەدا بەرگریت لێ بکات، ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا﴾ جا مەگین پەروەردگاری تۆ بەزەیی پێتدا بێتەوە، کە چاکەی زۆری لەسەرتە. خوای گەورە لێرەدا باسی بەهرەو ڕێزی زۆری خۆی دەکات لەسەر بەندەو پێغەمبەری خۆی کە ئەو قورئانە پیرۆزەی بە نیگا بۆ ناردووە، کە هەرگیز پڕوپوچی تێکەڵاو نابێت نە ئێستاو نە لەمەودوایش، چونکە لە لایەن خوای کارزانی ستایش کراوەوە هاتووە. ئیبنو مەسعود(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: ڕۆژێك دێت بایەکی سوور هەڵدەکات و لەدەرگای هەموو ماڵێك دەدات، واتە: لەئاخر زەماندا و لەوڵاتی شامەوە دێت نە لە پەڕەی قورئانو نە لە دڵی هیچ کەسێکدا ئایەتێك نامێنێت، پاشان ئیبنو مەسعود ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾[1].

### تەحەددا کردنی بتپەرستان بە قورئان

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾ بڵێ: ئەگەر مرۆڤو جنۆکە هەموو کۆببنەوە بۆئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن وێنەی ئەو بێنن، با هەمووشیان پشتیوانی یەکتری بکەن. پاشان خوای گەورە باسی ڕێزی ئەم قورئانە پیرۆزە دەکاتو دەفەرموویت ئەگەر گشت مرۆڤو جنۆکەکان کۆببنەوەو ڕێکەون کە بە وێنەی ئەم قورئانە کە خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی بێنن، ناتوانن‌و بۆیان ناکرێت، با هەموو پشتگیری‌و هاوکاری‌و یارمەتی یەکتریش بدەن چونکە ئەمە کارێکە لە توانای هیچ کەسێکدا نیە، وتەی خودا چۆن لە وتەی دروستکراوەکانی دەچێت، ئەو خودایەی کە هاوشێوەو هاوتاو هاو وێنەی نیە، دوای ئەمە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا﴾ ئێمە لە هەموو بارەیەکەوە لەم قورئانەدا نموونەمان هێناوەتەوە بۆ مەردم، بەڵام زۆربەی ئەم مەردمە جگە لە سپڵەیی نەبێت هیچ نازانن. واتە: هەموو نیشانەو بەڵگەیەکی تەواومان بۆ هێناون‌و بۆمان ڕوون کردوونەتەوە، ڕاستیشمان بۆ ڕۆشن کردوونەتەوەو لێکمان داوەتەوە مانامان کردووەو سووك‌و ئاسانمان کردووە بۆیان، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆرینەی خەڵکی سپڵەو بێ ئەمەکن‌و ملی پێ نادەن‌و بە گژی ئەو هەقەدا دەچن.

[1] الطبري(١٧/٥٤٦).

﴿ وَقَالُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الْأَنْهَارَ خِلَالَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِي السَّمَاءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَابًا نَّقْرَؤُهُ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ ﴾

**قورەیشیەکان داوای چەند بەڵگەیەکی دیاریکراو دەکەن و وەڵامی خوایش بۆ ئەو داوایانە**

ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە، کە ئەڵێ شێخێکی خەڵکی بەسرە بۆی گێڕامەوە کە چل ساڵی زیاترە لێرەدایە و ئەویش لە عیکریمەوە و ئەویش لە ئیبنوعەبباسەوە: کە عوتبە و شەیبەی هەردوو کوڕی ڕەبیعەو ئەبو سوفیانی کوڕی حەربو پیاوێك لە بەنی عەبدودار و ئەبو بەختەری برای بەنی ئەسەدو ئەسوەدی کوڕی موتەلیبی کوڕی هیشامو زەمعەی کوڕی ئەسوەدو وەلیدی کوڕی موغیرەو ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییە و ئومەییەی کوڕی خەلەف و عاسی کوڕی وائیل و نوبەیهە و مونەبیهە هەردوو کوڕی حەجاجی سەهمی ئەمانە کۆبوونەوە یان هەندێك لەمانە دوای ئاوابوونی خۆر لە پشتی کەعبەوە کۆبوونەوە، هەندێکیان بە هەندێکیانیان وت: بنێرن بۆلای موحەممەد لەگەڵی بدوێنو مشتومڕی لەگەڵدا بکەن هەتاخەڵك ناهەقتان نەگرێت چی پێئەکەن. ئەوەبوو ناردیان بۆ لای کە پیاو ماقوڵانی هۆزەکەت کۆبوونەتەوە و دەیانەوێ گفتوگۆت لەگەڵ بکەن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە پەلە هات بۆ لایان، وای زانی لە بارەی ئەو کارەی ئەوەوە شتێکیان بۆ دەرکەوتووە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر سوور بوو لەسەریان پێی خۆش بوو ڕاستەڕێ بگرنەبەر، دڵگران دەبوو بە ناڕەحەتیان بۆیە لەگەڵیان دانیشت، وتیان: ئەی موحەممەد(ﷺ)! ئێمە ناردوومانە بە شوێنتدا هەتا کەس لەمەودوا لۆمەمان نەکات لە بارەی تۆوە. سوێند بە خوا ئاگاداری هیچ کەسێك نین لەناو عەرەبدا، ئەوەی تۆ هێناوتەتە ناو هۆزەکەت ئەو هێنابێتیە نا هۆزەکەی خۆی، تۆ قسە بە باب و باپیرانمان ئەڵێیت و بە ناشیرین باسی ئاینمان دەکەی و بەبێعەقڵیان دەزانیو قسە بە خواکانمان دەڵێیتو دوو بەرەکیشت خستووەتە نێوانمان، هیچ شتێکی خراپو ناشیرین نەماوە تۆ دروستت نەکردبێت لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، ئەگەر تۆ ئەم دەنگو باسەت بۆ ئەوە هێناوە بە هۆیەوە سامان وەدەست بێنیێ، ئەوەندە سامانت بۆ کۆ دەکەینەوە لە ماڵی خۆمان هەتا لە هەموومان سامانت زۆرتر بێت، خۆ ئەگەر داوای گەورەیی دەکەی، دەتکەینە گەورەی خۆمان، ئەگەر داوای پاشایش دەکەی دەتکەینە پاشای خۆمان، ئەگەر ئەوەیش کە دێتە لات ئەو شتانەت بۆ دێنێت جنۆکەیەو هەست دەکەی زاڵ بووە بەسەرتدا کاتی خۆی ئەوەی شوێن خەڵکی دەکەوت لە جنۆکە پێیاندەوت ڕیئی(الرئی) لەوەش دەچێت ئەوەجنۆکە بێت، ئەگەر وایە ئەوە هەموو ماڵی خۆمان دەدەینو

دەگەڕێین بە دوای پزیشکدا بۆتو چاکت دەکەینەوە، ئەگەرنا ئەوەبا هیچ گلەییەکمان لێنەکرێت لەسەرتۆ. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەوەی ئێوەبۆیدەچن دەربارەی من، من وا نیم، من نەهاتووم بۆ لای ئێوە، بەوەی کە بۆم هێناون تاداوای ماڵەکانتان بکەمو گەورەبم لە ناوتانداو ببمە پاشا بەسەرتانەوە. بەڵکو خوای گەورە منی ڕەوانەکردووە بۆ لای ئێوەو کردومی بە پێغەمبەر و کتێبێکی بۆ ناردوومو فەرمانی پێ کردووم، کە مزگێنی دەرو ترسێنەر بم بۆ ئێوە، من پەیامی پەروەردگارم پێگەیاندنو ئامۆژگاریم کردن ئەگەر ئەوەی بۆم هێناون لێم وەرگرن، بێگومان بەختەوەری دنیاو قیامەت بە دەست دێنن. ئەگەر وەڵامیشم نەدەنەوە من خۆڕادەگرم لەبەر فەرمانی خودا تا خودا بڕیاری خۆی دەدا لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، وتیان: ئەی موحەمەد(ﷺ) ئەگەر تۆ ئەوەی خستوومانەتە بەردەمی تۆ قەبوڵی ناکەی، تۆ خۆت چاك دەزانی کە هیچ کەسێك نیە وەك ئێمە لە وڵاتێکی تەنگەلانو کەم دەرامەتو ژیانی وا سەختو گراندا بژی، داوا بکە لەو پەروەردگاریەی کە تۆی ڕەوانە کردووەو ئەو پەیامەی پێدا ناردووی، ئەو کێوانەمان بۆ تەخت بکات کە ڕێی لێ گرتووینو وڵاتەکەمان بۆ فراوان بکاتو ڕووباری لێ هەڵقوڵێت وەك ڕووبارەکانی شامو عێراق بابو باپیرە پێشینەکانیشمان بۆ زیندوو بکاتەوە، لەو کەسانەیش کە زیندوو دەکرێنەوە بۆمان با قوسەیی کوڕی کیلابی تێدا بێت، چونکە ئەو پیاوێکی زۆر ڕاستگۆ بووە، پرسیاری لێ دەکەین ئایا ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاستە یان پڕوپوچە؟ جا ئەگەر ئەوەت کرد کە ئێمە داوامان لێکردووی ئەوئەو خەڵکانەش بڕوایان پێ کردی ئەوە ئێمەیش بڕوات پێ دەکەین، بەوە ئیتر ئێمە ڕێزی تۆمان بۆ دەردەکەوێت لای خوداو دیارە کە خودا تۆی ڕەوانەکردووە وەك خۆت دەڵێیت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموون: (من بۆ ئەوە ڕەوانە نەکراوم، بەڵکو من لای خواوە هاتووم بۆ لای ئێوە، بەو پەیامەی کە پێیدا ناردووم، منیش ئەوەی پێیدا ناردووم بۆ ئێوە وا پێم گەیاندن، ئەگەر وەری گرن ئەوە خۆشبەختی دنیاو قیامەت وەدەست دێنن، ئەگەر باوەڕیشی پێ ناکەن خۆ دەگرم لەبەر فەرمانی خودا هەتا خوای گەورە بڕیاری خۆی دەدات لە نێوان ئێمەو ئێوەدا) وتیان: ئەگەر ئەوەمان بۆ نەکەی، هەڵی بگرە بۆخۆتو داوا بکە لە پەروەردگارت فریشتەیەك بنێرێت بۆ لات بڕوات پێ بکات بەوەی دەیڵێیت تا لە جێی تۆ سەرمان لێ بدات، پاشان داوا بکە لە خودا باغاتو گەنجینەو کۆشکی زێڕو زیوت بداتیو ئەوەیش دەتەوێ پێت بداتو بێنیازت بکات. چونکە خۆ تۆش بە ناو بازاڕدا دەگەڕێیت بە دوای بژێویدا وەك چۆن ئێمە دەگەڕێین، با ئەوکاتە ئێمەش ڕێزو پلەی تۆمان بۆ دەربکەوێت لە لای پەروەردگارەکەت، ئەگەر تۆ پێغەمبەری وەك خۆت دەیڵێیت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموون: (من کاری وا ناکەم، من ئەو کەسە نیم کە ئەم داوایە لە پەروەردگاری بکات، بۆ ئەوەیش ڕەوانە نەکراوم بۆ لای ئێوە، بەڵکو خودا منی ڕەوانەکردووە کە ترسێنەرو مزگێنی دەربم، ئەگەر ئەوەی من پێی هاتووم قەبوڵی بکەن، ئەوە

خۆشبەختی دنیاو قیامەت بەدەست دێنن، ئەگەر لێشم وەرنەگرن خۆڕادەگرم لەبەر فەرمانی خوادا هەتا خودا بڕیاری خۆی دەدات، لە نێوان ئێمەو ئێوەدا). وتیان: ئاسمان بڕوخێنەو بیخەرە خوار وەك خۆت قەناعەتت وایە ئەگەر پەروەردگارت مەیلی لێبێت ئەوە دەکات، دڵنیابە ئێمە بڕوات پێ ناکەین هەتا ئەوە نەکەی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموون: (ئەوە بۆ خودایە، ئەگەر مەیلی لێبێت ئەوەتان پێ دەکات) وتیان: ئەی موحەمەد(ﷺ) ئایا پەروەردگارت نەیزانیووە ئێمە لەگەڵت دادەنیشین، ئەو پرسیارانەت لێ دەکەین کە لێمان کردی، ئەوەی دەمانەوێت داوات لێ دەکەین، لە پێشەوە پێت بڵێتو ئاگاداری ئەو شتانەت بکات کە تۆ بۆمان باس دەکەی، هەواڵت بداتێ کە چیمان لەگەڵدا دەکات لەسەر ئەوە ئەگەر ئێمە ئەوەی تۆ هێناوتە بۆمان قەبوڵمان نەکرد، هەواڵمان پێ گەیشتووە کە ئەوەی تۆ فێری ئەم شتانەدەکات دەکات پیاوێکە لە یەمامە (ڕەحمان)ی پێ دەڵێن، سوێند بە خوا ئێمە هەرگیز بڕوا بە(ڕەحمان) ناکەین، ئێمە ئیتر پاساوی خۆمان هەیە ئەی موحەمەد(ﷺ) بەڵام سوێند بە خوا ئێمە وازت لێ ناهێنین هەتا لەناو دەچین یان تا لەناوت دەبەین، یەکێکیان وتی: ئێمە فریشتەکان دەپەرستین کە کیژی خودان، یەکێکی تریشیان وتی: بڕوات پێ ناکەین هەتا خوداو فریشتەکان بە ئاشکرا نەهێنی، کاتێك کە ئەو قسانەیان کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستاو جێی هێشتن، عەبدوڵای کوڕی ئومەییەی کوڕی موغیرەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عومەری کوڕی مەحزوم لەگەڵی هەڵسا کە کوڕی پوری عاتیکەی کچی عەبدولموتەلیب بوو، وتی: ئەی موحەمەد(ﷺ) هۆزەکەت ئەوەی خستیانە بەر دەمت بۆخۆت خستیان، لێت قەبوڵ نەکردن، پاشان چەند شتێکیان لێ داوا کردی بۆ خۆیان، بۆ ئەوەی پلەو ڕێزی تۆ بزانن بە هۆی ئەو شتانەوە لە لای خوا، تۆ ئەوەشت نەکرد، پاشان داوایان لێکردی تا پەلە بکەی بەهێنانی ئەو سزایەی کە دەیان ترسێنی پێی، سوێند بە خوا منیش هەرگیز بڕوات پێ ناکەم هەتا پلەکانەیەك دروست نەکەی پاشان پێدا بەرزبیتەوە و منیش سەیرت بکەم کەئەچیت و جا کتێبێکی کراوە لەگەڵ خۆت بێنیو چوار فریشتەیشت لەگەڵدا بێت شایەتیت بۆ بدەن کە ئەوەی تۆ دەیڵێیت وایە، سوێند بە خوا ئەگەر ئەوەیش بکەی، بە ڕاستی من هەر گومانم وایە بڕوات پێ ناکەم. پاشان پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەجێ هێشت پێغەمبەریش(ﷺ) گەڕایەوە بۆ ناو کەس‌و کاری بە دلگرانیو کەسەرێکی زۆرەوەلەبەر ئەوەی ئەو هەلەی لە دەست چوو کە بە هیوای بوو کاریان تێبکات کاتێك کە هۆزەکەی ناردیان بەشوێنیدا، هەروەها لەبەر ئەوەش کەبەو شێوەیە دووریان گرت لێی[1].

**هۆی قەبوڵ نەکردنی داوای موشریکەکان**

---

[1] الطبري(١٧/٥٥٧).

ئەو دانیشتنەی ئەوانە بۆی کۆبوونەوە، خوا خۆی ئاگای لێیان بووە، ئەگەر ئەو پرسیارانەی ئەوانە دەیانکرد بۆ ئەوە بووایە شارەزا ببن خوای گەورە وەڵامی دەدانەوە بەڵام خوا خۆی زانیویەتی کە هەر لەبەر بێ دینیو سەرکەشی ئەو پرسیارانە دەکەن، بۆیە وتراوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر حەزت لێیە ئەوەی داوایان کردووە پێیان دەدەین، ئەگەر هەر حاشایان کرد جەزرەبەیەکیان دەدەم کە هیچ کەسێك لە جیهانیان ئەو جەرزەبەیەم نەدابێت، ئەگەر حەزیشت ئەکەی دەرگای لێبوردنو بەزەییان لێ دەکەمەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵکو دەرگای لێبوردنو بەزەییان لێبکەرەوە).[1] ئەمەی ئەو خوانەناسانە داوایان دەکرد، وەك لەم ئایەتەدا لە پێشەوە باسمان کرد کە خودا فەرموویەتی: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَاۚ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفًا﴾[2] واتە: وە هیچ شتێك بەرگری ئێمەی نەکردووە کە ئەو موعجیزانە بنێرین جگە لەوەی کە پێشینەکان بە درۆیان دەزانی، وە بەخشیمان بە(هۆزی) سەمود ئەو وشترەی کە(موعجیزەیەکی) ئاشکرا بوو، کەچی باوەڕیان نەهێناو ستەمیان لێکردو ئێمە موعجیزەکان نانێرین مەگەر بۆ ترساندن. وە لەم ئایەتانەیشدا دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴿١٠﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا﴾[3] واتە: (بێباوەڕان) دەیان وت ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە خواردن دەخواتو بە بازاڕدا دەڕوات؟! بۆچی فریشتەیەك نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ لای بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ترسێنەربێت، یا گەنجینەیەکی (لە ئاسمانەوە) بۆ خۆی پێبدرایە یا باغێکی ببوایە لێی بخواردایەو ستەمکاران دەیانوت (بە ئیمانداران) ئێوە تەنها شوێن پیاوێکی جادولێکراو کەوتوون، سەیرکە چۆن نموونەی پووچ بۆ تۆ دێننەوە بەو هۆیەوە گومڕابوون ئیتر ناتوانن ڕێگای هەق بدۆزنەوە، گەورەو پیرۆزە ئەو زاتەی ئەگەر بیەوێت(لە دنیادا) چاکتر لەوەی(بێباوەڕان دەیڵێن) بۆت سازدەدات باخاتێك کە ڕووبارەکان بە ژێریاندا دەڕوات وە چەند کۆشکت بۆ فەراهەم دێنێت،(ڕاست ناکەن وا نیە) بەڵکو ئەوانە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیەو

---

[1] احمد(١/٢٤٥).

[2] الاسراء(٥٩).

[3] الفرقان(٧ـ١١).

ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ کەسێك باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێت ئاگری هەڵگیرساو. لێرەشدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَـٰرَ خِلَـٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴾ واتە: وتیان: بڕوات پێ ناهێنین تا لەم زەمینەدا کانیەکمان بۆ هەڵدەقوڵێنی، یان باغاتێکی دارخورما و ڕەزت هەبێتو کارێکی وا بکەی کە ڕووبارەکان لەناویاندا بە خوڕ بڕوات،(الینبوع) واتە: کانی ئاو لەبەر ڕۆیشتوو، داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە کانی ئاوی لەبەر ڕۆیشتوویان لەسەر زەمینی حیجازدا لێرەولەوێ بۆ هەڵقوڵێنێت، ئەوە زۆر سوكو ئاسان بوو، بۆ خوای گەورە، ئەگەر مەیلی لێ بووایە دەیکردو هەموو داواکانیشی بۆ جێبەجێ دەکردن، بەڵام خودا خۆی دەزانێ کە ئەمانە ڕێی ڕاست ناگرنە بەر وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[1] واتە: ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتەدی ئیتر باوەڕ ناهێنن، جا با هەموو نیشانەکانیشیان بۆ بێت، هەتا ئازاری بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. وە دەفەرمووێت: ﴿۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُوٓاْ ﴾[2] واتە: فریشتەیشمان بناردایەو مردووەکانیش قسەیان لەگەڵ بکردنیایە، هەموو شتمان لەبەرانبەر ئەوانا کۆبکردایەتەوە هەرباوەڕیان نەدەهێنا. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴾ واتە: یان ئاسمان بڕوخێنێت بە سەرماندا هەر چۆن خەیاڵت کردووە بە پارچە پارچە کراوی یان خوداو فریشتەکان بێنێت ڕووبەڕوو(بیان بینن) واتە: تۆ بەڵێنت پێداین ڕۆژی قیامەت ئاسمان دەقڵیشێت لە هەموو لایەکیەوە، داوامان بۆ بکە زوو لە دنیادا بە پارچە پارچەیی بکەوێ بەسەرماندا، وەك خوای گەورە لەشوێنێکی تردا باسیان دەکات کە چی دەڵێنو دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَـٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾[3] واتە: ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە. هەر بەم شێوەیە هۆزی شوعەیبیش هەمان داوایان کرد وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی

---

[1] یونس(٩٦-٩٧).

[2] الانعام(١١١).

[3] الانفال(٣٢).

تردا فەرموویەتی: ﴿ فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾[1] واتە: دەسا ئەگەر تۆ ڕاست ئەڵێی، چەند پارچەیەك لە ئاسماندا بەسەرماندا بخەرە خوارێ، ئەوەبوو خوای گەورە جەزرەبەی دان بە(ڕۆژی سێبەرەکە) کە ڕۆژێکی هەور و گڕەبایەکی لێ هەڵکردن‌و سزایەکی زۆر توندی دان، بەڵام پێغەمبەری سۆز و ڕەحمەت و پێغەمبەری تۆبە کردن کەمیهرەبانییە بۆ هەموو جیهانەکان داوای کرد لە خوا مۆڵەتیان بدات‌و دوایان بخات بەڵکو خودا لە پشتی ئەوانە کەسانێك بێنێت کە هەر خودا بپەرستن‌و هیچ شتێك نەکەنە شەریکی، هەر واش بوو، هەر لەوانەی کە باس کران چەندکەس لێیان موسڵمان بوو لە دواییداو بووە موسڵمانێکی چاك، تەنانەت عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئومەیە کە شوێن پێغەمبەر(ﷺ) کەوت، ئەوەی وت کە وتی، بە تەواوی گەڕایەوە بۆ لای خواو موسڵمانێکی چاکی لێ دەرچوو، ﴿أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ﴾ واتە: یانماڵێکت لە زێڕ هەبێت، ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو قەتادە دەڵێن: مەبەست پێی زێڕە.[2] لە خوێندنەوەی ئیبنو مەسعودیشدا هەر بەو شێوەیە هاتووە: (أن يكون لكَ بيتاً من ذهب).[3] ﴿أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ یان بە ئاسماندا هەڵبچی‌و سەریش کەوی، ئێمە بۆت بڕوانین، ﴿وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥ﴾ باوەڕ ناکەین تا کتێبێکمان لەگەڵ خۆت بۆ دێنی بۆمان‌و دەیخوێنینەوە، موجاهید دەڵێت: واتە: کتێبێکمان بۆ بێنە بۆ هەر یەکێکمان لاپەڕەیەکی تێدابێت، نوسرابێت ئەمە نامەیەکە لە لایەن خوداوە بۆ فلانی کوڕی فلان و بەیانی هەڵسا لە لای سەریدا دانرابێت[4]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴾ بڵێ: پاکی هەر بۆ پەروەردگارکەم! ئاخۆ من چیم جگە لە پەیامبەرێکی خودا، بەڵکو خودا خۆی هەرچیەکی بوێ دەیکات، ئەگەر مەیلی لی بێت ئەوەی داوای دەکەن دەتان داتێ، مەیلیشی لێبێت وەڵامتان ناداتەوە، من تەنها پێغەمبەرێکم ڕەوانە کراوم بۆ لای ئێوە، کە پەیامی پەروەردگاری خۆتان پێ ڕابگەیەنم‌و ئامۆژگاریتان بکەم، ئەوەیشم لەگەڵدا کردن، بۆ ئەوەیش داواتان کردووە خودا خۆی دەزانێ چیتان لەگەڵدا دەکات.

﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرٗا رَّسُولٗا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوۡ كَانَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَلَٰٓئِكَةٞ يَمۡشُونَ مُطۡمَئِنِّينَ لَنَزَّلۡنَا عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكٗا رَّسُولٗا ﴿٩٥﴾ ﴾

---

[1] الشعراء(١٨١)

[2] الطبري(١٧/٥٥٣).

[3] الطبري(١٧/٥٥٣).

[4] الطبري(١٧/٥٥٤).

**مل نەدانو باوەڕ نەهێنانی بتپەرستان لەبەر ئەوە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) مرۆڤە، وەڵامی خواش بۆیان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴾ تەنها بیانووی ئەو خەڵکە(کە شارەزاییان بۆ هاتو بڕوایان پێ نەکرد) جگە لەوەی کە دەیان وت: چۆن خودا ئادەمیەك بە پێغەمبەر دەنێرێت، واتە: بیانووی زۆری ئەو خەڵکە ئەوە بوو کە بڕوایان بە پێغەمبەر(ﷺ) نەدەکردو شوێنی نەدەکەوتن ئەوە بوو دەیان وت: چۆن دەبێت پێغەمبەر لە ئادەمی بێت، جێی سەرسوڕمان بوو، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾[1] واتە: ئایا مەردم سەیر ماون، پیاوێکمان هەر لەناو خۆیان ڕاسپاردووە کە خەڵکی بترسێنێو مژدە بدات بەوانەی کە خاوەن باوەڕن، کە پلەی بەرزیان لە لای پەروەردگاریانەوە هەیە، وە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا ﴾[2] واتە: ئەو(سزایە) بێگومان بە هۆی ئەوەوە بوو کە پێغەمبەرەکانیان بۆ هات بە بەڵگەی ئاشکراوە کەچی دەیانوت: چۆن دەبێت ئادەمیەك لە خۆمان ڕێنموونیمان بکات. فیرعەونو دارو دەستەکەی وتیان: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴾[3] واتە: ئایا ئێمە بە دوو کەسی وەك خۆمان باوەڕ بێنین لە کاتێکدا گەلەکەیان(بەنی ئیسرائیل) ئێمە دەپەرستنو گەردنکەچن بۆ ئێمە. هەر بەو شێوەیە گەلەکان بە پێغەمبەرەکانیان وتووە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأْتُونَا بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾[4] واتە: ئێوەیش هەر ئادەمیەکی وەك ئێمەن دەتانەوێ بەرگری ئێمە بکەنو لامان دەن لە(پەرستنی) ئەوەی کە باووباپیرانمان دەیانپەرست دەی نیشانەو بەڵگەیەکی ڕونمان بۆ بێنن(ئەگەر ڕاست دەکەن ئێغەمبەرن). ئایەت لەم بارەیەوە زۆرە. پاشان خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لە سۆزو بەزەیی خۆی بەرامبەر بەندەکانی کە پێغەمبەرانی لە ڕەگەزی خۆیان بۆ ناردوون بۆ ئەوەی لێی تێبگەنو بتوانن قسەی لەگەڵ بکەن، ئەگەر ڕاسپاردەی

---

[1] یونس(٢).

[2] التغابن(٦).

[3] المؤمنون(٤٧).

[4] ابراهیم(١٠).

ڕەوانە بکردایە لە فریشتەکان نەیاندەتوانی بەرامبەری بوەستن و ئەو پەیامەی لێ وەرگرن وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتدا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾[1] واتە: سوێند بێت بێگومان خوا چاکەو منەتی نا بەسەر بڕواداراندا کاتێك کە ڕەوانەی کرد لە ناویاندا فروستادەو نێردراوێك لە خۆیان. وە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی بۆتان هاتووە پێغەمبەرێك لە خۆتان. وە فەرموویەتی: ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ﴾[3] واتە: وەك ڕەوانەمان کرد لەناوتاندا پێغەمبەرێك لەخۆتان کە ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا بخوێنێتەوە و پاکتان بکاتەوەو فێرتان بکات قورئانو دانایی (فەرموودەکانی خۆی)و فێرتان بکات ئەو شتانەی کە نەتان دەزانی، کەواتە یادم بکەن تا منیش لە بیرتان نەکەم و سوپاسم بکەن پێ نەزانو ناسوپاسیم مەکەن. بۆیە لێرەیشدا فەرموویەتی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَّسُولًا﴾ واتە: بڵێ: ئەگەر فریشتە بە دڵنیایی لەم زەمینەدا بڕۆیشتنایە، دیارە ئێمە لە ئاسمانەوە پێغەمبەری فریشتەمان بۆ دەناردن واتە: وەك ئێوە چۆن بە دڵنیایی لەسەر زەمیندان، ئەگەر فریشتەکانیش وەك ئێوە دڵنیابوونایە، لە ڕەگەزی خۆیان فریشتەمان بۆ دەناردن، لەبەر ئەوەی ئێوە مرۆڤن ئێمەش هەر لە خۆتان مرۆڤمان ناردووە بۆتان لەڕووی سۆز و بەزەیی یەوە.

﴿قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا﴾ واتە: بڵێ: خودا بەسە بۆ شایەت لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، هەر ئەو دەربارەی عەبدانی ئاگادارەو دەیانبینێت. خوای گەورە ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی دەکات کە بەڵگە بێنێتەوە بۆ هۆزەکەی لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی هێناویەتی بۆیان، پێیان بڵێت کە خودا شایەتە بەسەر منیش و ئێوەیشەوە ئاگاداری ئەو پەیامەیە کە هێناومە بۆتان، ئەگەر من درۆم بە دەم خواوە هەڵبەستایە، خودا تۆڵەی توندی لێ دەسەندم وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ

---

[1] ال عمران(١٦٤).

[2] التوبة(١٢٨).

[3] البقرة(١٥١_١٥٢).

﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ﴾[1] ئەگەر هەندێ قسەی بە دەم ئێمەوە بکردایە، بێگومان بە هەموو توانا دەمانگرت، ئەوسا ڕەگی لاملیمان دەبڕی. پاشان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا﴾ هەر خودایە دەربارەی بەندەکانی ئاگادارەو دەیانبینێت، دەزانی کێ شایستەی چاکەو بەهرەو ڕێی نیشاندانەو کێش شایەنی گومڕاییو بەدبەختیو ڕێ لێ تێکچوونە.

﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّاۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾﴾

### شارەزابوونو گومڕایی بە دەستی خودایە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ﴾ کەسێك خوا ڕێی نیشاندا، شارەزایە، گومڕایشی بکات تۆ دۆستیان بۆ پەیدا ناکەی لە غەیری خودا، خودای گەورە لێرەدا باسی دەسەڵاتو توانای خۆی دەکات لە نێوان دروستکراوەکانیدا کە چۆن بڕیارەکانی بێ دواکەوتن جێبەجێ دەکرێت، هیچ کەسێك ناتوانێت بەری بگرێت، هەر کەسیش شارەزا بکات هیچ کەسیك ناتوانێت گومڕای بکات. کەسێکیش گومڕا بکات، کەس ناتوانێت دۆستی بۆ پەیدا بکاتو ڕێی نیشان بدات، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾[2] واتە: هەر کەسێك خوا ڕێنموونی بکات ئەو کەسە ڕێنموونی کراوە وە هەر کەسیش گومڕا بکات ئەوە هیچ پشتیوانو ڕێ نیشاندەرێکت دەست ناکەوێ بۆی.

### پاداشتی خەڵکی گومڕا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا﴾ واتە: ڕۆژی قیامەتیش بە دەمەوڕوویی بە کوێریو لاڵیو کەڕی هەموویان کۆدەکەینەوە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: وتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چۆن خەڵکی بەدەمەوڕوودا کۆدەکرێتەوە؟ فەرمووی:(ئەو کەسەی بە قاچەکانیان بردوونی هەر ئەو کەسەش توانای هەیە بە دەمو ڕوویاندا بەڕێدا بیانبات).[3] لە هەردوو صەحیحەکەیشدا ئەم حەدیسە هاتووە[4]. بۆیە ئاوایان بەسەر دێت چونکە ئەوانە لە ژیانی دنیادا کەڕو کوێرو لاڵ بوون لە ئاستی هەق، لە ڕۆژی

---

[1] الحاقة(٤٤ـ٤٦).

[2] الكهف(١٧).

[3] احمد(٣/١٦٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري(٨/٣٥٠)، مسلم(٤/٢١٦١).

کۆکردنەوەشیاندا بەو شێوەیە پاداشتیان دەدرێتەوە کە زۆر پێویستیان بە چاوو گوێو قسەکردن هەیە، ﴿مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾ ئاکام و داهاتوویان لە جەهەننەمدایە، ﴿كُلَّمَا خَبَتْ﴾ ئیبنوعەبباس دەڵێت: هەرکات دامرکایەوە[1]. موجاهید دەڵێت: هەرکات کوژایەوە. ﴿زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا﴾ ئەوە بڵێسەو پشکۆو گڕی ئاگرەکەیان بۆ زیاد دەکەین. وەك خوای گەورە فەرموویەتی لە ئایەتێکی تردا: ﴿فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾[2] واتە: بچێژن، هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزا نەبێت.

﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ واتە: ئەوە تۆڵەی ئەوانەیە، چونکە ئەوانە لە نیشانەکانی ئێمە حاشایان کردوو و وتیان: ئایا کە ئێمە بووینە ئێسكو پروسك دیسان زیندوو دەکرێینەوە؟ واتە: ئەو سزاو جەزرەبەو ئەو تۆڵەیەی کە لێمان دەسەندن کە زیندوومان کردنەوە بە کوێریو لاڵیو کەڕی، پڕبەپڕی ئەو کارەیان بوو کە کردیان، چونکە ئەوانە بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە نەبوو، زیندووبوونەوەشیان بە درۆ دەزانی، وەك دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا﴾ واتە: دەیانوت: ئایا ئەگەر ئێمە دوای ئەوەی کە بووینە ئێسكو پروسکی ڕزیوو لەناو زەمیندا پوکاینەوەو هیچمان نەما جارێکی تر زیندوو دەکرێینەوە؟ خوای گەورە بەڵگەیان بۆ دەهێنێتەوە لەسەر تواناو دەسەڵاتی خۆیو ئاداگاریان دەکاتەوە کە ئاسمانەکانو زەمینیش هەر خوا دروستی کردوون، دروست کردنەوەیان زۆر سوكو ئاسانترە وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ﴾[3] واتە: دروست کردنی ئاسمانەکانو زەمین لە وەدیهێنانی مرۆڤ گەورەترە. وە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن

---

[1] الطبري(١٧/٥٦١).

[2] النبأ(٣٠).

[3] الغافر(٥٧).

يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾[1] هەتا کۆتایی سورەتەکە. واتە: ئایا زاتێك کە ئاسمانەکان‌و زەوی بەدی هێناوە ناتوانێت وێنەیان دروست بکات؟ بەڵێ دەتوانێ‌و هەر ئەویش دروستکەری زانایە، بە ڕاستی کاری(خوا) ئەمەیە هەر کاتێك بیەوێت شتێك بەدی بێنێت پێی دەڵێت: ببە دەست بەجێ(ئەو شتە) دەبێت. لێرەیشدا دەفەرموێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ﴾

واتە: ئایا ئەوەندە نازانن، ئەو خودایەی ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کردووە دەتوانێت هی وەك ئەوانیش دروست بکات، ماوەیشی بۆ دیاری کردوون، بێگومان هەر دێت؟ واتە: ڕۆژی قیامەت هەر دێت‌و دیسان لاشەکانیان زیندوو دەکاتەوەو گیان دەکاتەوە بە بەریاندا، وەك چۆن لە سەرەتاوە دروستی کردوون‌و گیانی کرد بە بەریاندا، کاتی زیندووبوونەوەو لە گۆڕ هاتنە دەرەوەشیان بۆ دیاری کراوە گومانی تێدا نیەو هەر ڕوو دەدات‌و دێتەدی. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی:

﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژە دواناخەین مەگین بۆ ماوەیەکی کەم، پاشان خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا﴾ بەلام ستەمکاران هیچیان ناوێ بێباوەڕی و سپلەیی نەبێت، یانی بەردەوامبوون لەسەر پڕوپوچی و یاخی بوون نەبێت.

﴿قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾﴾

**چروکی بەشێکە لە سروشی مرۆڤ**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا﴾ واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خاوەنی گەنجینەکانی بەزەیی پەروەردگاری من بوونایە، هەر ڕژدیتان دەکرد، مرۆڤ ڕژد و چاوچنۆکە. خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ) بڵێ پێیان: ئەی خەڵکینە ! ئەگەر ئێوە خاوەنی هەموو گەنجینەکانی سەر زەمین بن لە ترسی هەژاری دەستتان والا نەدەکرد. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ﴾ واتە: لە ترسی هەژاری.[3] واتە لە ترسی ئەوەی نەك بڕوات‌و لە دەستتان بچێت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەرگیز تەواو نابێت‌و دوایی نایەت، چونکە ئەو ڕژدی‌و چروکیە لە سروشتی ئادەمیە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا﴾ واتە: مرۆڤ

---

[1] يس(٨١ـ٨٢).

[2] هود(١٠٤).

[3] الطبري(١٧/٥٦٣).

پیسکەو چاوچنۆکە. قەتادە دەڵێت: ﴿قَتُورًا﴾ واتە: ڕژدو چاوچنۆکە.[1] وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا﴾[2] واتە: ئایا ئەمانە بەشیان بەو مولکەوە هەیە؟ ئەگەر بیشیان بێت، بە ئەندازەی توێکڵی دەنکە خورمایە سودیان بۆ مەردم نیە، واتە: ئەگەر بەشیشیان لەو سامانەدا ببێت، هیچی لێ نادەن بە کەس با بە ئەندازەی توێکڵی دەنکە خورمایەکیش بێت، خوای گەورە باسی مرۆڤ دەکات کە سروشتی چۆنە مەگین کەسێك خودا خۆی یارمەتی بداو ڕێی نیشان دا، چونکە مرۆڤ هەمیشە ڕژدو چاوچنۆكو پیسکەیە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا ﴿١٩﴾ إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا ﴿٢٠﴾ وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا ﴿٢١﴾ إِلَّا الْمُصَلِّينَ﴾[3] واتە: بێگومان ئادەمی دروست کراوە بە ڕژدیو چاوچنۆکی، کاتێك کە تووشی ناخۆشیەك ببێت هاوارو ناڵە ناڵە دەست پێدەکات، کە سامانیش ڕووی تێ بکات دەیگرێتەوە لە خەڵکی، تەنیا ئەوانە نەبێت کە نوێژ خوێنن. لەم شێوەیە نموونە زۆرە لە قورئانی پیرۆزدا، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ڕێزو بەزەیيو چاکەی خودای مەزن بەسەر بەندەکانیەوە. لە هەردوو سەحیحەکەیشدا هاتووە: (دەستی خودا پڕە، بەخشش کەم ناکاتەوە بە شەوو بە ڕۆژ هەمیشە لێی دەڕژێت، ئایا نابینن، لەو کاتەوەی ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردووە چەندی لێبەخشیوە، دەی ئەوەی لە دەستی دایە کەمی نەکردووە)[4].

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۖ فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَٰؤُلَاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ بَصَائِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا فِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ الْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِن بَعْدِهِ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ اسْكُنُوا الْأَرْضَ فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ الْآخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾ ﴾

**نۆ نیشانەکەی موسا**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ۖ فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴾ واتە: نۆ نیشانەی ئاشکرامان دابوو بە موسا، لە بەرەی

[1] الطبري(١٧/٥٦٣).
[2] النساء(٥٣).
[3] المعارج(١٩_٢٢).
[4] فتح الباري(٨/٢٠٢)، مسلم(٢/٦٩١).

ئیسرائیل بپرسە، ئەوانە دەزانن کاتێك موسا گەیشتنە بەرەوە، فیرعەون پێی وت: من وا خەیاڵ دەکەم تۆ جادووت لێ کراوە موسا! خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە موسای ڕەوانە کردووە بە نۆ نیشانەی ئاشکراوە کە بریتین لەو بەڵگە بەهێزو دیارانە کە نیشانەن لەسەر ڕاستی موساو پەیامەکەی لە لایەن خۆیەوە بۆ لای فیرعەون، کە ئەمانەن: گاچۆنەکەی و دەستی و گرانی و قات و قڕی و لافاو و لەشکری کولله و ئەسپێ و بۆق و بەخوێنبوونی ئاوەکانیان، ئەمانە کە چەند نیشانەی ئاشکرا بوون، ئیبنو عەبباس ئەمەی وتووە.[1] موحەمەدی کەعب دەڵێت: ئەو نیشانانە دەستو گاچۆنو سڕینەوەی ماڵ و ئاوی ناوبەردەکە و پێنجەکەی سورەتی(الاعراف)یش[2]. ئیبنو عەبباسو موجاهیدو عیکریمەو شەعبیو قەتادە دیسان وتوویانە: ئەو نیشانانە بریتین لە دەستو گاچۆنەکەی و قاتوقڕیو کەمی بەروبوومو لافاوو کولله و ئەسپێو بۆقو خوێن.[3] ﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ﴾[4] واتە: لەگەڵ ئەو هەموو نیشانانەدا کە بە چاوی خۆیان دیان، هەرچەندە لە دڵی خۆیاندا بە ڕاستیان دەزانی، خۆبەزلزانیو ناهەقی بوونە هۆی حاشاکردن لێیان و ئەو نیشانانە کاری تێ نەکردن، هەر بەو شێوەیە، ئەگەر وەڵامی ئەوانەمان بدایەتەوە کە داوایان لە تۆ کرد ئەی موحەمەد(ﷺ) وتیان: بڕوات پێ ناکەین هەتا کانیەکمان بۆ هەڵنەقوڵێنیت لە زەویدا بەو جۆرەو بەو جۆرە هەتا دوایی. ئەوانە هەر نەدەهاتن بە دەمتەوەو بڕوایان پێ نەدەکردی مەگین خودا خۆی مەیلی لێبێت، وەك فیرعەون بە موسای وت: کاتێك کە ئەو هەموو بەڵگانەی بە چاوی خۆی بینی لەسەر دەستی موسادا: ﴿إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسۡحُورٗا﴾ واتە: من وا دەزانم تۆ جادووت لێکراوە موسا، هەندێك دەڵێن: من وا دەزانم تۆ جادووگەری(والله أعلم)[5].

ئەم نۆ نیشانەیە کە ئەو زانایانە باسیان کرد ئەوانەن کە مەبەستن لێرەدا، هەر ئەوانەن کە لەم ئایەتانەدا خوای گەورە دیاری کردوون وەك دەفەرموێت: ﴿وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ١٠ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾[6] ئەم دوو ئایەتە باسی دەستو گاچۆنەکەی تێدا هاتووە، نیشانەکانی تریش لەسورەتی(الاعراف)دا

[1] الطبري(١٧/٥٦٤).

[2] الطبري(١٧/٥٦٥).

[3] الطبري(١٧/٥٦٥/٥٦٦).

[4] الاعراف(١٣٣).

[5] واتە (مسحور): مەفعولی بەمانا فاعله (وەرگێڕ).

[6] النمل(١٠ـ١٢).

بەدرێژی باس کراوە، موسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت) نیشانەو موعجیزەی زۆری تریش لەسەر دەستیدا ڕووی داوە، لەوانە: لێدانی بەردەکە بە گاچۆنەکەی‌و ئاو لێدەرهاتنی‌و سێبەری هەور بۆیان‌و باراندنی گەزۆو ناردنی ڕیشۆلە(شەلاقە)و چەندین شتی تریش، کە درا بە نەوەی ئیسرائیل دوای ئەوەی کە وڵاتی میسریان بەجیْ هێشت بەڵام لێرەدا تەنیاباسی لەو نۆ نیشانەیە کردووە کە فیرعەون‌و هۆزەکەی بە چاوی خۆیان بینیوویانە، کە بوویە بەڵگە بەسەریانەوە، کەچی ئەوان دژی وەستان‌و دانیان پێدا نەناو حاشایان لێکرد، بۆیە موسا(سەلامی خوای لێبێت) وتی بە فیرعەون وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴾ وتی: تۆ خۆت سوور دەزانی ئەم شتانە کەوا زەق لەبەر چاوانن هەر دروستکەری زەمین‌و ئاسمانەکان‌و ناردوویەتیە خوار، فیرعەون من لام وایە تۆ تیا دەچی. واتە: ئەو نیشانانە کە بە چاو دەبینرێن بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو پەیامەی کە من بۆم هێناوی پەیامی خوایە، ﴿وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴾ واتە: من وا دەزانم کە تۆ لەناو دەچی، قەتادەو موجاهید وایان وتووە.[1] ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿مَثْبُورًا ﴾ واتە: بێ بەش لە بەزەیی خوا.[2] دیسان ئیبنو عەبباس‌و زەحاك دەڵێن: ﴿مَثْبُورًا ﴾ واتە: شکست خواردوو(ژێرکەوتوو).[3] (تیاچووش) وەك موجاهید دەڵێ هەموو ئەو مانایانە دەگرێتەوە.

### لەناوچوونی فیرعەون‌و هۆزەکەی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا﴾ واتە: فیرعەون ویستی گەریان تێ بچێنێت‌و لەو سەر زەمینە دەریان بکات، ئێمەش ئەم‌و هەموو ئەوانەیش لەگەڵیان بوون خنکاند. ئەم ئایەتە مژدەیەکی تێدایە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە فەتحی مەککە دەکات، هەرچەندە ئەم سورەتە مەککەییە و لە پێش کۆچکردندا هاتووەتەخوارەوە، ئەوەبوو هەرواش دەرچوو، خەڵکی مەککە ویستیان پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە دەریکەن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَادُوا۟ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ﴾[4] لەبەر ئەمەبوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی کردە خاوەنی مەککەو بە زۆر چووە ناوی‌و زاڵ بوو بەسەر خەڵکەکەیدا(بەپێی بەهێزترین قسەی

---

[1] الطبري(١٧/٥٧١).

[2] الطبري(١٧/٥٧٠).

[3] الطبري(١٧/٥٧٠).

[4] الاسراء(٧٦).

زانایان)، پاشان بەڕێزو لێبوردەیی ئازادی کردن، وەك چۆن خودا ئەو هۆزەی نەوەی ئیسرائیلی کردە خاوەنی وڵاتی فیرعەون کە لە پێشدا لاوازو ژێردەستە بوون لە هەموو لایەکی ئەو وڵاتەدا، هەرچی گەنجینەو کشتوکاڵو بەرووبوومیان هەبووە کەوتە ژێر دەستی نەوەی ئیسرائیل، وەك خوای گەورە فەرمووی: ﴿كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾[1] واتە: ئا بەو جۆرە(لەناومان بردن) و نەوەکانی یەعقوب (جوولەکە)مان لە جێگایان دانا. وە لێرەیشدا دەفەرموویت: ﴿وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا﴾ واتە: لە پاش ئەوەیش بە بەرەی ئیسرائیلمان وت: نیشتەجێ بن لەم وڵاتەو هەر کاتێکیش قیامەت هات، ئەوسا هەموو پێکەوە کۆدەکەینەوە. واتە: ئێوەو دوژمنەکانیشتان کۆدەکەینەوە. ئیبنو عەبباسو موجاهیدو قەتادەو زەحاك دەڵێن: ﴿لَفِيفًا﴾ واتە: هەمووان[2].

﴿وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾﴾

### هاتنە خوارەوەی قورئان بە جیاجیا

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ واتە: ئەم قورئانەمان بە هەق ناردو بە هەقیش هاتە خوارەوە، ئێمە تۆمان هەر بۆیە نارد مژدەدەرو ترسێنەر بیت، خوای گەورە لێرەدا باسی کتێبە مەزنەکەی خۆی دەکات کە قورئانی پیرۆزە، کە هەر بە ڕاستی ناردوویەتی واتە: پڕە لە ڕاستی وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَ﴾[3] واتە: خودا خۆی ئاگای لێیەو فریشتەکانیش هەموو ئاگادارن، کە خودا بە زانستی خۆی ئەمەی بۆ تۆ ناردووەتەخوار. دەیەوێت ئاگادارتان بکات لە بڕیارو فەرمانو قەدەغەکراوەکانی خۆیو ئەو قورئانەیش کە بۆی ناردووی ئەی موحەمەد(ﷺ) چاودێری کردووەو پاراستوویەتیو هیچ شتێکی تێکەڵاو نەبووەو زیادو کەمیشی تێدا نەکراوە بەڵکو بە ڕاستی گەیشتووە بە تۆ، کەسێك هێناویەتی زۆر بەهێزو تواناو خاوەن ئەمانەتو قسە ڕەوایە لە لای فریشتە پایە بەرزەکان، ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) ئێمە تۆمان بۆیە ناردووە کە

---

[1] الشعراء(٥٩).

[2] الطبري(١٧/٥٧٢/٥٧٣).

[3] النساء(١٦٦).

مژدەدەر بی بۆ ئەو کەسانەی کە سەرپێچیت دەکەن لە خوانەناسان، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ﴾ واتە: قورئانێکە بە جیاجیا ناردوومانە، ئەگەر ووشەی(فَرَقۡنَٰهُ) بەبێ شەددە بخوێنرێتەوە، ئەوە یانی: جیامان کردووەتەوە لە(لوح المحفوظ) بۆ(بيت العزة) کەلە ئاسمانی دنیادایە، پاشان بەش بەشو جیاجیا هاتووەتە خوارەوە لەسەر ڕووداوەکان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماوەی بیستو سێ ساڵدا، ئەمە عیکریمە وتوویەتی لە ئیبنو عەبباسەوە.[1] وە هەر لە ئیبنو عەبباسەوە کە (فَرَّقۡنَٰهُ)ی بە تەشدید خوێندووەتەوە ، کە ئەمەش یانی: ئایەت ئایەت ناردوومانەتە خوارەوە بە ڕوونیو ماناکراوی[2]. بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ﴾ واتە: تا بە ئارامی بۆ مەردمی بخوێنیتەوە ﴿وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا﴾ واتە: ئەم قورئانەمان بەو شێوەیە دابەزاند یەك بە دوای یەکدا.

﴿قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا۩ ﴿١٠٩﴾﴾

**ئەم قورئانە هەقە و خەڵکانی زاناش لە پێشینەکان دانیان بەم ڕاستیەداناوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ) ئەی موحەمەد بڵێ بە ئەوانەی خوانەناسن و بڕوایان نیە بەم قورئانە پیرۆزەی کە بۆت هێناون ﴿ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْ﴾ واتەك بڕواتان پێی هەبێت یان نەبێت، وەك یەکە، ئەم قورئانە خۆی بۆ خۆی ڕاستەو خودا ناردوویەتیو هەر بە باسی ئەم قورئانە خەڵکی پێش ئێوەیئاگادار کردووە لەم قورئانە لە دێرزەمانەوە، لە ڕێگەی ئەو کتێبانەوە کە خودا ناردویەتیە خوار بۆسەر پێغەمبەرەکانی، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ﴾ واتە: ئەو کەسانەی لە پێشوودا ئاگادارکرابوون، لە پیاوچاکانی ئەهلی کتێب ئەوانەی دەستیان گرت بە کتێبەکانیانەوەو فەرمانەکانیان بەجێ هێنا، بەبێ ئەوەی دەستکاریان کردبێت یان گۆڕیبێتیان، ﴿إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗا﴾ واتە: هەر کاتێك بۆیان دەخوێننەوە چەناکەیان دەخەنە سەر زەویو سوژدە دەبەنو سوپاسو ستایشی خوای گەورە دەکەن لەسەر ئەو بەهرەیەی کە پێی داونو کردوونی بە شایستەی ئەوەی ئەگەر گەیشتن بەو پێغەمبەرە کە ئەو کتێبەی بۆ ناردووە شوێنی بکەون، بۆیە دەڵێن: ﴿سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا﴾ پاکی بۆ پەروەردگاری ئێمەیە، بەڵێنی پەروەردگارمان وەدی هات. دیارە خوای گەورە لەسەر زمانی ئەو پێغەمبەرانەی کە لە پێشەوە

---

[1] الطبري(١٧/٥٧٤).

[2] الطبري(١٧/٥٧٣/٥٧٤).

هاتوون بەڵێنی داوە پێیان کە موحەمەد(ﷺ) ڕەوانە دەکات. ﴿ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ ﴾ واتە: دەمو ڕوو بەسەر زەویدا دەکەونو دەگرین لە ترسی خودا دەلەرزنو باوەڕێکی تەواوو ڕاستیشیان هەیە بە پێغەمبەر(ﷺ)و کتێبەکەیشی ﴿وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾ ئەمەش خۆ بە کەم زانینیان کەم دەکات. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾[1] ئەو کەسانە کە هاتوونەتە سەر ڕاستەڕێ زیاتر شارەزایان دەکاتو ترسی خودایان زیاتر دەخاتە دڵەوە. ﴿ وَيَخِرُّونَ ﴾ (بەدەم گریانەوە کڕنوش دەبەن) ئەمە عەتفی سیفەتە لەسەر سیفەت نەك عەتفی سوژدە لەسەر سوژدە.

﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴿١١١﴾﴾

### ناوە پیرۆزەکان هی خوان

خوای گەورە دەفەرمووێت، ئەی موحەمەد(ﷺ) بڵێ بەو بتپەرستانە ئەوانەی کە بڕوایان بە سیفەتی ڕەحمەت نیە بۆ خودای گەورەو نکوڵی لە ناوی ﴿الرَّحْمَٰنَ﴾ی ئەو دەکەن ﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾ واتە: هاوار لە خودا بکەن یان هانا بە ڕەحمان بەرن هەر یەکێکە ئەو ناوی پیرۆزی زۆر هەیە. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ۖ هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾[2] خوا هەر ئەو زاتەیە هیچ شایانی پەرستن نیە بێجگە ئەو زانای هەموو نهێنیو ئاشکراکانە هەر ئەوە بەخشندەی میهرەبانە، ئەوە ئەو خوایە بێجگە لەو پەرستراوی تر نیە پاشاو پاكو بێگەردو ئاشتی دەرو دڵنیاکەرو چاودێرو پارێزکارو زاڵو خاوەن شکۆو شایستەی هەموو گەورەییەکە پاکیو بێگەردی بۆ خوایە لەو هاوبەشانەی کە بۆی دادەنرێت،هەر ئەوە خواو بەدیهێنەرو داهێنەرو وێنەکێشە هەر بۆ ئەوە هەموو ناوێکی هەرە جوانو

[1] محمد(١٧).

[2] الحشر(٢٢ـ٢٤).

پاك هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە ستایشی ئەو دەکەن. مەکحول ڕیوایەتی کردووە پیاوێك لە بتپەرستەکان گوێی لە پێغەمبەر بوو(ﷺ) لە کاتی سوژدە بردنیدا دەیفەرموو:(یا رحمن یا رحیم). پیاوە بتپەرستەکە وتی: موحەمەد وای دەگەیەنێت کە هاوار لە یەك کەس دەکات، کەچی ئەوەتا هاوار لە دوو کەس دەکات. خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەبباسەوە. ئیبنو جەریر هەردوو فەرموودەکەی ڕیوایەت کردووە[1].

## فەرماندان بە خوێندنەوەی قورئان لە نێوان دەنگ بەرزکردنەوە و دەنگ نزم کردنەوەدا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ لە نوێژدا دەنگت بەرز نەبێتو نەویش نەبێت،شێوەیەکی ناوەنجی بۆ خۆت ڕەچاو بکە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەدا بە پەنهانی بانگەوازی دەکرد. ئەڵێت کاتێك کە نوێژی بکردایە بۆ هاوەڵەکانی دەنگی بەرز دەکردەوە لە قورئان خوێندندا، کاتێك موشریکەکان گوێیان لیّ بووایە قسەیان دەوت بە قورئانو بەو کەسەی ناردوویەتیو ئەو کەسەیش هێناویەتی، دەڵێت: خوای گەورە فەرمووی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ): ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾ واتە: دەنگت بەرز مەکەرەوە تا موشریکەکان گوێیان لێبێتو قسە بە قورئان بڵێن، ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ نزمیشی مەکەرەوە کە هاوەڵەکانت گوێیان لیّ نەبێت، هەتا قورئانت لێوە فێر بن، ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾[2] لەو نێوانەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە، واتە: مامناوەند بە لە قورئان خوێندندا. بوخاریو موسلیمیش لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناوە[3]. هەر بەو شێوەیە زەححاکیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە و ئەمەی لیّ زیاد کردووە: کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینە ئەوەی لەسەر لاچوو بە هەر شێوەیەك مەیلی لیّ بوایە قورئانی دەخوێند.[4] موحەمەدی کوڕی ئیسحاقیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك بە دەنگی بەرز قورئانی بخوێندایە لە نوێژدا، بتپەرستەکان لێی دووردەکەوتنەوە نەیاندەویست گوێیان لێی بێت، ئەگەر پیاوێکیان حەزی بکردایە گویّ لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگرێت لە هەندیّ لەو قورئانەی لە کاتی نوێژدا دەیخوێنێت لە ترسی بتپەرستەکان بە دزیەوە گوێی دەگرت، کاتێك هەستی بکردایە کە پێیان زانیووە گویّ دەگرێت، لە ترسی ئەوەی تووشی ئازار نەبێت دەڕۆیشتو گوێی نەدەگرت کاتێکیش

---

[1] الطبري(١٧/٥٨٠).

[2] أحمد(١/٢٣).

[3] فتح الباري(٨/٢٥٧)، مسلم(١/٣٢٩).

[4] الطبري(١٧/٥٨٤).

دەنگی ئەوی بکردایە، ئەوەی گوێی لێ دەگرت، هیچ لە قورئان خوێندنەکەی تێ نەدەگەیشت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ﴾ یانی: دەنگ بەرز مەکەرەوە بەرادەیەك دوورکەونەوە لێت، ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ دەنگیش ئەوەندە نەوی مەکە هەتا ئەو کەسانەی دەیانەوێت بە دزیەوە گوێت لێ بگرن نەیبیسن، چونکە لەوانەیە بەوگوێگرتنە لێی تێ بگەن‌و سوودی لێ وەرگرن. ﴿وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ واتە: ڕێگایەکی مامناوەندی بگرەبەر.[1] هەر بەم شێوەیە عیکریمەو حەسەنی بەسری‌و قەتادە وتوویانە: ئەم ئایەتە دەربارەی خوێندنەوەی قورئان لە نوێژدا هاتووەتەخوارەوە[2].

ئیبنو مەسعودیش دەڵێت: ﴿وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾ بە نهێنیش مەیخوێنە بۆ کەسێك کە گوێی بۆ گرتووە[3].

## ڕوونکردنەوەی یەکخواپەرستی

دوای ئەوەی خوای گەورە ناوە پیرۆزەکانی ﴿الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾ی بۆ خۆی دانا باسی پاکو بێعەیبی خۆی دەکات و ئەفەرموێت: ﴿ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ﴾ بڵێ: سوپاس بۆ خودایە کە هیچ فەرزندەیەکی بۆ خۆی هەڵنەبژاردووەو لە ملکیدا هیچ هاوبەشێکی نەبووە. بەڵکو خودایەکی تاك‌و تەنهایە و کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، هیچ کەسیش هاوتای نەبووەو نابێت، ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ﴾بە ناچاریش هانای بە کەس نەبردووە، بێ دەسەڵاتیش نەبووە هەتا هاوبەش‌و دۆست‌و بریکارو ڕاوێژکار بۆ خۆی دابنێت، بەڵکو ئەو خودایە، وەدیهێنەری هەموو شتێکەو هەر خۆیەتی‌و شەریکی نیە، بە مەیلی خۆی هەموو شتێك دەکات‌و ئاگاداری هەموو شتێکە. موجاهید دەڵێت: ﴿وَلَمْ يَكُن لَّهُ وَلِيٌّ مِّنَ الذُّلِّ﴾ هاوپەیمانی لەگەڵ کەس نەکردووەو داوای یارمەتی لە کەس نەکردووە.[4] ﴿وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾ تاریفی گەورەیی بکە، تاریفێك کە شایەنی ئەوە، لەسەر ئەوەی کە ستەمکاران دەیڵێن لە قسەی ناشایستە بەرامبەر بە خوای گەورە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە محمدی قورەزیەوە کە لەم ئایەتەدا: ﴿ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ ئەڵێت: جوولەکەو مەسیحیەکان دەڵێن: خودا فەرزندەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، عەرەبەکانیش دەڵێن: (لبيك لا شريك لك إلاّ شريكاً هو لك تملكه وما ملك) سابیئەو مەجوسیەکانیش دەڵێن: ئەگەر دۆستەکانی خودا نەبووایە

---

[1] الطبري(١٧/٥٨٥).

[2] الطبري(١٧/٥٨٧).

[3] الطبري(١٧/٥٨٩).

[4] الطبري(١٧/٥٩٠).

بەدڵنیاییەوە خودا داماو دەبوو، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴾[1].

## سورەتی( الكهف )

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

**باسی ئەو فەرموودانەی لە بارەی ڕێزی سوورەتی( الكهف )ەوە هاتووە، بە تایبەتی دە ئایەت لە سەرەتاوەو دە ئایەت لە کۆتاییەوە، خوێندنی ئەم سورەتە دەبێتە هۆی پارێزگاری لە دەججال**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە بەڕائەوەئەڵێت: پیاوێك سورەتی(الكهف)ی خوێند، ولاغێکی کە لە ماڵەکەدا بوو خەریك بوو ڕابکات، سەیری کرد تەمێکی یان هەورێکی بینی دای بەسەریدا، ئەوەی بۆپێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (فلانە کەس تائەتوانی قورئان بخوێنەوە، بێگومان ئەوە ئارامیەکە لە کاتی قورئاندا دێتە خوارەوە، یان بۆ قورئان دێتە خوارەوە).[2] بوخاریو موسلیمیش لە هەردوو صەحیحەکەدا ئەم فەرموودەیان هێناوە[3]. ئەو پیاوەی کە دەیخوێند ئوسەیدی کوڕی حوضەیر بوو وەك لە پێشەوە لە سورەتی(البقرة) باسکرا، دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو دەردائەوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی:(هەر کەسێك دە ئایەتی لە سورەتی کەهف لەبەر کرد پارێزراوە لە دەججال)[4]. موسلیم و ئەبو داود و نەسائی و تیرمزی ڕیوایەتیان کردووە، ڕیوایەتەکەی تیرمزی بەم جۆرەیە: (هەر کەسێك سێ ئایەت لە سەرەتای سورەتی(الكهف)ی لەبەر بێت) تیرمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە.[5] حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا هێناویەتی لە ئەبو سەعیدەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی:(هەر کەسێك سورەتی کەهفی لە ڕۆژی هەینیدا خوێندبێت لە نێوانی ئەو کەسەو ئەو دوو هەینیەدا ڕووناکیەکی بۆ هەڵدەکرێت) پاشان حاکیم دەڵێت: ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی ڕاستن،بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان نەکردووە.[6] هەر بەم شێوەیە بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە سونەنەکەیدا لە حاکیمەوە پاشان بەیهەقیش ڕیوایەتی کردووە

---

[1] الطبري(٥٩٠/١٧).

[2] أحمد(٢٨١/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري(٧١٩/٦)، مسلم(٥٤٨/١).

[4] أحمد(١٩٦/٥).

[5] مسلم(٥٥٥/١)، أبو داود(٤٩٧/٤)، النسائي في الكبرى(٢٣٦/٦)، تحفة الأحوزي(١٩٥/٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] الحاكم(٣٦٨/٢).

لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کەفەرموویەتی: (هەر کەسێك سورەتی کەهفی خوێندبێت، بەوشێوەیەی کە هاتووەتەخوارەوە، ئەبێتە ڕوناکی بۆی لە ڕۆژی قیامەتدا)[1].

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّـٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾﴾

### خوا قورئانی ناردووە تا مژدەدەر و ترسێنەر بێت

لە سەرەتای تەفسیرەدا باسمان کرد کە خوای گەورە وەسفی پیرۆزی خۆی دەکات لە سەرەتای هەموو شتێکەوەو لە کۆتایشیدا، بێگومان خودا لە هەموو کاتو ساتێکدا هەر سوپاسو ستایش دەکرێت لە دنیاداو لە قیامەتدا، هەر بۆیە ستایشی خۆی دەکات لەسەر ئەو کتێبە پیرۆزەی کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەی موحەمەد(ﷺ) کە مەزنترین بەهرەیە کە بەخشیویەتی بە خەڵکی سەر زەمین، کە هیچ لاریو کەموکوڕیەکی تێدا نیە، ئەو قورئانە کە لە تاریکی دەری هێناون بۆ ڕووناکی، ڕێگەی ڕاستی نیشان داون وەك دەفەرموێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا﴾ واتە: سوپاس بۆ ئەو خودایەی ئەم کتێبەی بۆ بەندەی خۆی ناردە خواریو هیچ نالەباری تێ نەخست، مەردم شارەزا دەکات بۆ سەر ڕاستەڕێ، زۆر بەڕوونیو ئاشکرا خوانەناسان دەترسێنێتو مزگێنیش دەدات بە خاوەن باوەڕان، ﴿قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا﴾ کتێبێکی ڕاستو پایەدارە تا لە سزای توندو تیژی خۆی ترس وەبەر مەردم بێنێتو بە ئەو خاوەن باوەڕانەش کە ئاکار چاکن مژدە بدات کە پاداشتی باشیان دەبێت، واتە: بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە بڕوای پێ ناکەنو دژایەتی دەکەن بە توندی بیانترسێنێت هەر لە دنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزایان بداتو تۆڵەیان لێ بسێنێت، بەو قورئانە مژدەیش بدات بەوانەی کە خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن بە پاداشتی چاك لە لایەن خوداوە ﴿مَّـٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾ واتە: لەو بەهەشتەدا هەتاهەتایە دەمێننەوە، کە هەرگیز لەناو ناچێتو کۆتایی نایەت، ﴿وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا﴾ هەتا ئەوانەش بترسێنێت کە دەڵێن: خودا فەرزەندەی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

[1] البيهقي(٣/٢٤٩).

ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ئەوانە بتپەرستانی عەرەب بوون دەیانوت: ئێمە فریشتەکان دەپەرستین کە کچانی خودان.[1] ﴿مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِآبَآئِهِمْ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾ واتە: نە خۆیان زانان پێی‌و نە باب‌و باپیرانیشیان، قسەیەکی خراپ و زۆر گەورەیان لەدەم دەرچووە، ئەم قسەیەخراپی‌و نابەجێیی‌و گەورەیی ئەوبوختانەیان دەردەخات بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ﴾ واتە: هیچ شتێکیان بە دەستەوە نیە کە بیکەنە بەڵگە لەسەر ئەو قسانە جگە لەو درۆو بوختانەی خۆیان، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا﴾ هەرچی دەڵێن لە درۆ زیاتر هیچی ترنیە.

### هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتە

موحەمەدی کوڕی ئیسحاق باسی هاتنەخوارەوەی ئەم سورەتە پیرۆزەی کردوەو دەڵێت: پیاوێکی مەزنی خەڵکی میسر زیاتر لە چل ساڵ لەمەوپێش هات بۆ لامان بۆی باس کردم لە عیکریمەوە و ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە کە فەرمووی: قورەیش نەزری کوڕی حارس‌و عوقبەی کوڕی ئەبی موعیتیان نارد بۆ لای زانایانی جوولەکە لە مەدینە، پێیان وتن: برۆن پرسیاریان لێبکەن دەربارەی موحەمەد و هەموو سیفەتەکانی باس بکەن بۆیان، هەواڵی ئەو قسانەشیان بدەنێ کە دەیڵێت، چونکە ئەوانە لە ئەهلی کتێبە پێشبنەکانن، ئەوەی ئەوان لایانە ئێمە لامان نیە دەربارەی پێغەمبەران هەردووکیان دەرچوون‌و هاتن بۆ مەدینە، پرسیاریان کرد لە زاناکانی جوولەکە، لەبارەی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) باسی کارەکەی‌و هەندێ لە قسەکانی پێغەمبەریان- (ﷺ) کرد بۆیان، وتیان: ئێوە ئەهلی تەوراتن ئێمە هاتووین بۆ لای ئێوە، بۆ ئەوەی هەواڵی ئەم هاوەڵەی خۆمانمان بدەنێ، ئەڵێ: زانا جوولەکەکان پێیان وتن: پرسیاری سێ شتی لێبکەن کە پێتان دەڵێین، ئەگەر هەواڵی دانێ ئەوە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، ئەگەر وایش نەبوو، ئەوە پیاوێکی درۆزنەو چی بە باش دەزانن لەگەڵی بکەن، پرسیاری لێبکەن لە بارەی ئەو کۆمەڵە گەنجەوە کە لە زەمانی زوودا سەری خۆیانیان هەڵگرت چیان بەسەر هات؟ چونکە ئەوانە ڕووداوێکی سەیریان بەسەرا هات، پاشان پرسیاری لێبکەن لە بارەی پیاوێکی گەڕۆکەوە کە کاتی خۆی خۆی گەیاندوەتە خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەم زەمینە، دەنگو باسی چی بووە و چۆن بووە؟ لە بارەی (گیان)یشەوە پرسیاری لێبکەن، گیان چیە؟ ئەگەر وەڵامی ئەوانەی دانەوە، ئەوە پێغەمبەرەو شوێنی بکەون، ئەگەر هەواڵیشی نەدانێ ئەوە پیاوێکی درۆزنەو هەرچی بە لاتانەوە باشە سەبارەت بەئەو بیکەن، نەزرو عوقبە گەڕانەوەو چوونەوە بۆ لای قورەیشیەکان‌و وتیان: ئەی خەڵکی قورەیش شتێکمان بۆ هێناون کێشەی نێوان ئێوەو موحەمەد یەکلایی دەکاتەوەو

---

[1] الطبري(١٧/٥٩٥).

دەیبڕێتەوە، زاناكانی جوولەكە فەرمانیان پێ كردوون پرسیار لە موحەمەد بكەن لە چەند شتێك(شتەكانیان بۆ باس كردن) هاتن بۆ لای پێغەمبەری خواو(ﷺ) وتیان: ئەی موحەمەد ئامادەی هەواڵمان پێ بدەیت ئەوەی زاناجوولەكەكان پێیان وتن پرسییان لە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی وتن: (ئەوەی پرسیارتان لێوە كرد بەیانی هەواڵتان دەدەمێ) بەلام (إنشاء الله)ی نەكرد، ئەوانیش لە لای پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پانزە شەو چاوەڕوانیكرد، لەو بارەیەوە خودا هیچ ئاگاداریەكی نەكردو وەحی بۆ نەنارد، جوبرەئیلیش(سەلامی خوای لێبێت) نەهات بۆ لای، خەڵكی مەككە كەوتنە ووتی وتی و دەیانوت: موحەمەد بەڵێنی بەیانی داینێ، ئەمڕۆ پانزەهەمین ڕۆژمانە كە بەیانیمان تیاكردووەتەوە، تا ئێستا وەڵامی هیچ شتێك لەوانەی كە پرسیارمان لێكردووە نەیداوینەتەوە. هەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ)دواكەوتنی وەحی بۆی دڵگرانیكرد، ئەو قسانەی خەڵكی مەككە دەیانكرد زۆر بە لایەوە گران بوو، پاشان جوبرەئیل(سەلامی خوای لێبێت) هات بۆ لای‌و سورەتی(الكهف)ی بۆ هێنا لە لای خوای گەورەوە، كە گلەیی لە پێغەمبەر(ﷺ) دەكات تێیدا لەسەر دڵگران بوونی بۆ بتپەرستان‌و وەڵامی ئەو پرسیارانەشی داوە كە لە بارەی كۆمەڵە لاوەكەو پیاوە گەڕۆكەكەو گیانەوە لێیان كرد وەك لە باسی گیاندا لە سورەتی(الاسراء)دا فەرموویەتی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾[1] واتە: وە(ئەی موحەمەد(ﷺ)) پرسیارت لێ دەكەن لە بارەی ڕۆحەوە(كە چیە) بڵێ ڕۆح لە كارو فەرمانی تایبەت بە پەروەردگارمەو ئێوە تەنها كەمێك لە زانیاریتان پێ بەخشراوە.

﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ ﴾

**خەم مەخۆ لەسەر ئەوەی كە بتپەرستان بڕوا ناهێنن**

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەرەكەی(ﷺ) دەداتەوە لەسەر ئەوەی كە خەم دەخوات بۆ ئەو بتپەرستانە كە باوەڕ ناهێنن‌و لێی دووردەكەونەوە وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾[2] واتە: دەی كەواتە: بە خەفەت خواردن لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾[3] واتە: خەمیان مەخۆ. وە فەرموویەتی: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ

---

[1] (الاسراء: ٨٥)، الطبري(١٧/٥٩٥).

[2] فاطر(٨).

[3] النمل(٧٠).

نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾[1] لەوانەیە بەو خەمە خۆت لەناوبەری، کە ئەوانە نایانەوێت بڕوا بێنن. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا﴾ واتە: ڕەنگە تۆ بۆ ئەو کەسانەی بڕوا بەم کتێبە ناکەن، ئەوەندە خەم بخۆی لەناو بچی، یانی ئەم قورئانە، ﴿أَسَفًا﴾وەك دەڵێن: لە داخا خۆت لەناو مەبە، قەتادە دەڵێت: خۆت مەکوژە بە داخ‌و خەفەت خواردن بۆیان.[2] موجاهید دەڵێت: شپرزە و بێتاقەت مەبە بۆیان.[3] ماناکان لە یەکەوە نزیکن، واتە: خەمیان بۆ مەخۆ، بەڵکو تۆ پەیامی خوایان پێ بگەیەنە، هەر کەسێك ڕێی ڕاستی گرتەبەر بۆ خۆیەتی، هەر کەسیش گومڕابوو، خۆی سەری لێ شێواوە، بە خەفەت خواردن لەبەر ئەوان خۆت لەناو مەبە.

### ئەم دنیایە خانەی تاقیکردنەوەیە

پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات، کە دنیا شوێنێکی کاتیەو نامێنیو ڕازاوەیە بەو شتانەی کە بەردەوام نابن‌و لەناو دەچن، کردوویەتی بە خانەی تاقیکردنەوە نەك خانەی نیشتەجێ بوون، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە هەرچی وا بەسەر زەمینەوە کردوومانە بە جوانی بۆی، بۆ ئەوەی خەڵکی تاقی بکەینەوە، کامەیان کار چاکتر دەبن، قەتادە دەڵێت: لە ئەبو نەزرەوە لە ئەبو سەعیدەوە، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕیوایەتکراوە کە فەرموویەتی: (دنیا خۆش‌و سەوزە، بە ڕاستی خودا ئێوەی کردووەتە جێنشینی تێیدا، سەیر دەکات کە چی دەکەن، خۆ بپارێزن لە دنیا، خۆش بپارێزن لە ژنان، چونکە یەکەم بەڵای نەوەی ئیسرائیل لە ئافرەتاندا بوو)[4]. پاشان خوای گەورە باسی دنیا دەکات کە نامێنێت‌و لەناو دەچێت‌و کەسیشی تێدا نامێنێت‌و چۆڵ دەبێت‌و کۆتایی دێت‌و دەڕوخێت بەسەر یەکداو دەڕوات. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا﴾ واتە: ئێمە ئەوەی وا لەسەر ئەم زەمینەیە دەیکەینە بیابانێکی وشکی کاکی بە کاکی واتە: دوای ئەو جوانی‌و ڕازاوەییەی کە هەیەتی ئێمە دنیا دەکەینە وێرانەو کاولی دەکەین، ئەو شتانەیش هەموو لەسەریەتی تێکی دەدەین‌و دەیکەینە بیابانێکی چۆڵ نە ڕووەکی لێ دەڕوێت نە سوودیشی لێوەردەگیرێت. وەك عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا﴾ دەڵێت: هەموو شتێك لەسەر زەمیندا لەناو

---

[1] الشعراء(٣).

[2] الطبري(١٧/٥٩٧/٥٩٨).

[3] الطبري(١٧/٥٩٨).

[4] احمد(٣/٢٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

دەچێتو نامێنێت.[١] موجاهید دەڵێت: ﴿صَعِيدًا جُرُزًا﴾ زەمینێکی چۆڵ کە هیچی تیادا نەمێنێت.[٢] قەتادە دەڵێت:(الصعيد) ئەو زەویەیە کە هیچ درەختو ڕووەکێکی تێدا نەبێت.[٣]

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ ﴾

**بەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت**

خوای گەورە باسی یارانی ئەشکەوت بەگشتی و کورتی دەکات، پاشان بە درێژی بۆمان باس دەکات، وەك ئەفەرمووێت: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴾ واتە: تۆ(ئەی موحەمەد(ﷺ)) وات دەزانی کە یارانی غارو ڕەقیم لە نێوانی نیشانەکانی ئێمەدا سەرسوڕهێنەرە؟ واتە: بەسەرهاتی ئەوانە لە تواناو دەسەلاتی خودا سەرسوڕهێنەرەتر نیە بەڵکو دروستکردنی ئاسمانەکانو زەمینو ئاڵوگۆڕکردنی شەوو ڕۆژو ڕام کردنی خۆرو مانگو ئەستێرەکانو چەندین نیشانەی تریش لەوە گەورەترنو بەڵگەن لەسەر دەسەڵاتی خودای گەورەو هەرچی مەیلی لێبێت دەیکاتو هیچ شتێك نابێتە لەمپەر لە ڕێیدا با ئەوشتە لە بەسەرهاتی یارانی غاریش سەیرو سەرسوڕهێنەرتریش بێت وەك ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە موجاهیدەوە: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴾ دەڵێت: زۆر شتی تر لە نیشانەکانی ئێمە هەبووە سەرسوڕهێنەرتر بووە لەم بەسەرهاتە.[٤] عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴾ دەڵێت: ئەوەی پێم داوی لە زانیاری و سوننەت و قورئان چاکترە لە کاروباری یاوەرانی ئەشکەوتو ڕەقیم.[٥] موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: هیچ بەڵگەیەکم نەخستووەتە ڕوو لە بەڵگەکانم سەرسوڕهێنەرتر بێت بۆ خەڵکی لە کاری یارانی ئەشکەوتو ڕەقیم[٦]. (الكهف)بەو ئەشکەوتە ئەوترێت لەناو کێودایە، (الكهف)ئەو ئەشکەوتەیە کە ئەو کۆمەڵە

---

[١] الطبري(١٧/٥٩٩).

[٢] الطبري(١٧/٥٩٩).

[٣] الطبري(١٧/٦٠٠).

[٤] الطبري(١٧/٦٠١)

[٥] الطبري(١٧/٦٠١).

[٦] الطبري(١٧/٦٠١).

لاوەی باسكران هانایان تێ بردو چوونە ناوی، بەڵام (ڕەقیم) عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە ئەو (شیووە)یە كە نزیكە لە هەرێمی (ئەیلە)وە[1]. عەتیەی عەوفیو قەتادەیش هەر وایان وتووە. زەحاك دەڵێت: (الكهف) ئەو ئەشكەوتەیە لەناو شیوێكدایە[2]. (ڕەقیم)یش ناوی شیوەكەیە، موجاهید دەڵێت: (الرّقیم)خانووەكانیان بووە. هەندێ لەزانایان وتوویانە: (ڕەقیم)ئەو شیوەیەكە ئەشكەوتەكەیانی تێدابووە.[3] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەربارەی (الرقیم) دەڵێت: كەعب وا دەزانێت (ڕەقیم)شارێك بووە. ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە:(الرقیم) ئەو كێوەیە كە ئەشكەوتەكەی لێبوو، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت:(الرقیم) لەوحێكە لە بەرد بەسەرهاتی یارانی غاریان تێدا نوسیوە، پاشان لە دەرگای ئەشكەوتەكەدا دایان ناوە.[4] ﴿إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ كاتێك لاوەكان پەنایان بۆ غارەكە بردو وتیان: ئەی پەروەرێنی هەموومان تۆ بەر بەزەیی خۆتمان بخەو كارەكانمان بۆ ئاسان بكە. خوای گەورە باسی ئەو كۆمەڵە لاوە دەكات كە بە ئاینەكەیانەوە ڕایان كرد لە ترسی گەلەكەیان هەتا پاشگەزیان نەكەنەوە بە زۆر، بۆیە ڕایانكردو پەنایان بردە بەر ئەو ئەشكەوتە لە كێوێكدا، تا خۆیان بشارنەوە لە هۆزەكەیان، كاتێك كە چوونە ناو غارەكە داوای سۆزو بەزەییان لە خوای گەورە كرد و وتیان: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ واتە: ئەی پەروەردگارمان تۆ بەر بەزەیی خۆتمان بخە، بەزەییەك كە لەبەر چاوی هۆزەكەمان ونمان بكەو دامان پۆشە، ﴿وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ واتە: ئەم كارەمان بۆ پڕخێر بكەو ڕزگارمان بكە وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (پەروەردگارا! ئەوەی بڕیارت داوە لە هەر بڕیارێك بۆمان، كۆتاییەكەی بەخێر بگێڕە).[5] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا﴾ لەو ئەشكەوتەدا هەتا چەند ساڵێك، گوێی هەموویانمان ئاخنیو خەومان لێخستن، واتە: كاتێك كە چوونە ناو ئەشكەوتەكە خەواڵومان كردنو چەند ساڵێكی زۆر خەوتن. ﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا﴾ واتە: پاشان وەخەبەرمان هێنان، بۆ ئەوەی دەریخەین، لەو دوو دەستەیە(كەناكۆكن دەربارەیان) كامیان چاكتر ماوەی خەوی ئەوانیان

---

[1] الطبري(١٧/٦٠١).

[2] الطبري(١٧/٦٠٢).

[3] الطبري(١٧/٦٠٢).

[4] الطبري(١٧/٦٠٣).

[5] أحمد(٦/١٤٧).

ژماردووە، یەکێکیان ڕۆیشتو هەندێ پارەی لەگەڵ خۆی برد تا بەو پارەیە خواردنیان بۆ بکرێت تا بیخۆن وەك لەمەودوا بە درێژی باس دەکرێت. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدًا ﴾ وتراوە: ﴿أَمَدًا﴾ واتە: ژمارە، ئەشوتریٚ ﴿أَمَدًا﴾ یانی مەودایەك. وەك دلێك(سبق الجواد) کاتێك ئەو ماوەیەدەبرێت.

﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَٰنٍۭ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓاْ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ ﴾

### بڕوا یان بە خوا و دابڕانیان لە گەلەکەیان

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى ﴾ ئێمە بەسەرهاتی ڕاستی ئەمانەت بۆ دەگێڕینەوە: چەند لاوێك بوون، باوەڕیان بە پەروەردگاری خۆیان هەبوو، ئێمەیش زیاتر شارەزایمان دابوونێ. لێرەدا خوای گەورە دێتە سەر باسی ئەم سەرگوزشتەیەو ڕوونی دەکاتەوە، کە ئەم کۆمەڵە لاوە زیاتر بەرەو هەق هاتوونو باشتر شارەزای ڕێی ڕاست دەبوون لەو کەسانەی کە تەمەنیان کردو چووبوون بە ساڵەوە، چونکە ئەمانە ڕاهاتبوون لەسەر ئاینی پڕوپوچ، بۆیە زۆرینەی ئەو کەسانەش کە وەڵامی خوداو پێغەمبەری ئیسلامیان دەدایەوەلاو بوون، بەڵام پیاوە بەساڵاچووەکانی قورەیش زۆربەیان لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە، ژمارەیەکی کەمیان نەبێت لەسەر بتپەرستی مانەوەو موسڵمان نەبوون، هەر بەو شێوەیەش خودای مەزن باسی یارانی غار دەکات کە کۆمەڵێك لاو بوون، موجاهید دەڵێت: خودا شارەزای کردنو ترسی خۆی خستە دڵیانو بڕوایان هێنا بە پەروەردگاریانو بوونە یەکخواپەرستو شایەتیان دا کە جگە لە خوا هیچ خودایەکی تر نیە، ﴿وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى﴾ زۆرێك لە پێشەوایان وەك بوخاریو کەسانی تریش ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر کەموزیادکردنی باوەڕ، وتوویانە: باوەڕ زیادو کەم دەکات.[1] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَزِدْنَٰهُمْ هُدًى﴾ لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ

[1] فتح الباري(١/٦٠).

﴿هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ﴾[1] واتە: ئەو کەسانەی هیدایەتیان وەرگرتووە(خوا) شارەزاییان زیاد دەکاتو تەقواو پارێزکاریان پێ دەبەخشێت. وە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَـٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾[2] واتە: جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەمە ئیمانیان زیاد دەکات(و بەهێزتر دەبێت) وە ئەوان مژدە بەخشنو خۆشحاڵن. وە فەرموویەتی: ﴿لِيَزْدَادُوٓا۟ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ﴾[3] واتە: تا ئیمانیان زیاد بکات لەگەڵ ئەو ئیمانەی کە هەیانە. چەندەها ئایەتی تریش کە بەڵگەن لەسەر زیادو کەمکردنی باوەڕ. واباسکراوە کە ئەم کۆمەڵە لاوە لەسەر ئاینی مەسیح–عیسای کوڕی مەریەم– بوون، ئیتر خوا باشتر ئەزانێت، بەڵام وادیارە ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئاینێکی تری جگە لەگاورێتی بوون، چونکە ئەگەر لەسەرئاینی نەصارا بوونایە زانایانی جوولەکە ئەوەندە گرنگیان پێ نەدەدانو ئەو بەسەرهاتەیان بەو شێوەیە نەدەپاراست و فەرمانیان نەدەدا بە قورەیشیەکان ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر(ﷺ) بکەن، لە پێشەوە ریوایەت کرا لە ئیبنو عەبباسەوە کە قورەیشیەکان ناردیان بۆ لای زانایانی جوولەکە داوای چەند شتێکیان کرد کە پێغەمبەری خوای(ﷺ) پێ تاقی بکەنەوە وەڵامیان بۆ ناردنەوە کە پرسیاری (ئەو لاوانەو زیلقەرنەینو گیان)ی لێبکەن، ئەمە بەڵگەیە کە ئەم شتانە لە ئاینی ئەهلی کتێبدا ماوەتەوەو پارێزگاری لێکراوە کە ئەو ئاینەش –بە بێگومان– لەپێش ئاینی نەسرانیدا هاتووە(والله أعلم). پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَـٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا﴾ واتە: دڵیانمان بەهێزکرد کاتێك کە ڕاپەڕین، ئەوسا وتیان: پەروەرێنمان، پەروەرێنی ئاسمانەکانو زەمینە ئەگەر جگە لەو هانا بۆ هەر پەرستوویەك بەرین، دیارە ئێمە لە ڕاستی وتن لامان داوە خوای گەورە باس لەوە ئەکات کە ئارامیو خۆڕاگریمان خستە دڵیان کە پێچەوانەی هۆزەکەیانو شارەکەیان بجوڵێنەوە و لێیان جیاببنەوە و خۆیان دوور بگرن لەو ڕابواردنوخۆش گوزەرانیو بەهرانەی ئەوان، بۆیە زۆرێك لە زانایانی تەفسیر لە پێشینەو پاشینە باسیان کردووە کە ئەو لاوانە لە کوڕانی پاشاو پیاو ماقوڵانی ڕۆم بوون، ڕۆژێك لە جەژنێك لە جەژنەکانی گەلەکەیاندا کە هەموو ساڵێك دەچنە دەرەوەو کۆدەبوونەوە لە دەرەوەی شار، ئەم کۆمەڵە لاوەیش لەگەڵیان چوونە دەرەوە، کەسو کاریان بتیان دەپەرستو مەڕو ماڵاتیان بۆ سەردەبڕین دەیانکردە قوربانی بۆیان، پاشایەکی زۆر ستەمکارو لاساریان هەبوو پێیان دەوت

[1] محمد(١٧).

[2] التوبة(١٢٤).

[3] الفتح(٤).

دەقیانوس ئەو فەرمانی پێ دەكردن‌و هەڵی دەنان كە ئەو كارانە بكەن، كاتێك كە ئەو خەڵكە دەرچوون بۆ ئەو شوێنی كۆبوونەوەیانە، ئەو كۆمەڵە لاوەیش لەگەڵ باوك‌و كەس‌و كاریاندا چوونە دەرەوە، سەیری ئەو شتانەیان كرد كە گەلەكەیان دەیكەن‌و بە چاوی خۆیان بینیان، دەیانزانی ئەوەی كەس‌و كاریان دەیكەن لە سوژدە بردن بۆ بتەكان‌و سەربڕینی مەڕو ماڵات بۆیان دروست نیە تەنها بۆ ئەو خودایە نەبێت كە ئاسمانەكان‌و زەمینی دروست كردووە، هەر یەكێك لەو لاوانە لە كەس‌و كاری جیابووەوەو دووركەوتەوە لێیان‌و بە تەنها لە شوێنێكدا دانیشت، یەكەم كەسێك لەوانە كە بە تەنها خۆی دانیشت لە ژێر سێبەری درەختێكدا دانیشت، یەكێكی تریش هات‌و لە ژێر درەختەكەدا لای دانیشت، یەكێكی تریش هات‌و لە لایاندا دانیشت، یەكێكی تریش هات‌و لە لایان دانیشت، پاشان یەكێكی ترو یەكێكی تریش، هیچ كامیان ئەوی تری نەدەناسی، بەڵكو ئەوەی لەوێدا كۆی كردبوونەوە ئەو كەسە بوو كە دڵەكانی لەسەر بڕوا كۆكردبووەوە. واتە: خوای گەورە كۆی كردبوون، وەك لەو فەرموودەیەدا هاتووە كە بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(ڕۆحەكان سەربازی ڕاهێنراون ئەوانەی هاوڕەوشت‌و هاوبیرن پێكەوە دەگونجێن، ئەوانەیش سروشت‌و بیروباوەڕیان بە یەك ناخوات جیاواز دەبن).[1] موسلیمیش لە سەحیحەكەیدا هێناویەتی لە فەرموودەكەی سوهەیلەوە كە لە باوكیەوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕیوایەتی كردووە.[2] خەڵكی ئەڵێن: مرۆڤ بوون هۆكاری یەكگرتنیان بووە، مەبەست ئەوەیە كە هەر كەسێك لەوانە ئەوەی لەسەری بوو دەیشاردەوە لە هاوەڵەكەی لە ترساندا، نەیدەزانی ئەوانیش هەر وەك ئەو وان، هەتا یەكێكیان وتی: سوێند بە خوا ئەی خەڵكینە! هەریەك لە ئێوە هیچ نییەی دەزانن كە یەك شت نەبێت كە ئێوە لە گەلەكەتان وەدەر نەناوەو جیای كردوونەتەوە، با هەر كەسەو ئەو شتەی كە بڕوای پێیەتی ئاشكرای بكات، یەكێكی تریان وتی: ئەوسا من سوێند بە خوا وورد بوومەوە لە ئەوەی كە گەلەكەمی لەسەرە بۆم دەركەوت شتێكی پڕوپوچە، بەڵكو ئەو كەشەی شایەنی پەرستنە بە تەنهاو هاوەڵی بۆ دانانرێت هەر خودایە، كە هەموو شتێكی دروست كردووەو ئاسمانەكان‌و زەمین‌و ئەوەیشی لە نێوانیاندایە دروستی كردووە، یەكێكی تریان وتی: منیش سوێند بە خوا هەمان حاڵەتم بەسەردا هاتووە، یەكێكی تریشیان هەر وای وت، هەتا هەموو ڕێككەوتن لەسەر یەك قسە و بوونە یەك دەست و برای بەڕاستی یەكتری، شوێنێكیان كردە پەرستگاو خواناسیان تێدا دەكرد، گەلەكەیان پێیان زانین و زمانیان لێدان لای پاشا كەیان و ئەویش ناردی بەشوێنیاندا و پرسیاری لێكردن بڕوایان چۆنە و خەریكی چین؟ ئەوانیش بە ڕاستی

---

[1] فتح الباري(٦/٤٢٦).

[2] مسلم(٤/٢٠٣١).

وەلامیان دایەوە و ئەویشیان بانگ کرد بۆ لای خودای مەزن، لەبەر ئەوە خودای مەزن بەمشێوەیە باسیان دەکاتو دەفەرموویت: ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا مِن دُونِهِ إِلَٰهًا ﴾، ﴿لَن ﴾یش بۆ هەتا هەتا پێکردنی نەفیە، واتە: هەرگیز ئێمە جگە لە خودا هانا بۆ هیچ پەرستوویەك نابەین، ئەگەر هانامان برد دیارە ئێمە لەرێ لامان داوە، بۆیە خوای گەورە لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا﴾، پاشان دەفەرموویت: ﴿ هَٰؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴾ ئەوانەی لە هۆزی ئێمەن، جگە ئەو(واتە خوا) چەند پەرتسووی تریشیان هەیە، دەی با بەلگەو نیشانەی ئاشکرایان بۆ بهێننەوە، سا کێ ستەمکارترە لەوەی کە درۆ هەلبەستێ بە دەم خواوە. واتە: خۆزگە ئەوانە بەلگەی روونیان بهێنایەتەوە لەسەر راستی ئەو شتانەی کە دەیلێنو پێی هەلدەسن، بەلام ئەوانە هەر بوختانچیو درۆزن بوونو هەمیشە درۆیان بە دەم خواوە هەلبەستووە، ئەلێن: کاتێك ئەو لاوانە پاشاکەیان بانگ کرد تا بڕوا بێنێت بە خودای مەزن، پێی رازی نەبوو هەرەشەشی لێکردن و پێی ووتن خراپتان بەسەر دێنم، بۆیە فەرمانی دا کە ئەو جلوبەرگەی کە لەبەریان کردبوو لەو جەژنەدا لەبەریان داکەننو مۆلەتیان دانێ کە هەتا بەلکو بە خۆیاندا بچنەوەو پەشیمان ببنەوەو واز بێنن لەو ئاینەی کە لە سەرینی، ئەو مۆلەت دانە سۆزو بەزەیی خودا بوو بۆیان، لەو هاتنە سەر ئەوەی کە لە دەستیان راکەنو خۆیان دەرباز بکەن، خۆیانو ئاینەکەیان رزگار بکەن لەو بەلایە، ئەو خۆ دەربازکردنەیش کارێکی چاکەو دروستە لە کاتی هاتنی بەلا(الفتنة)دا کە بەسەر خەلکیدا دێت، کە خۆیانو ئاینەکەیان لادەن لەو بەلایەو ئەو شوێنە بەجێ بێلنو رابکەن بۆ ئەوەی نەوەك ئاینەکەیان لە دەست بدەن. وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (نزیکە چاکترین سامانی هەر کەسێك لە ئێوە بریتی بێت لە رانە مەرێك شوێنیان بکەوێت بۆ سەر کێوەکانو شوێنی ئاودار، بە ئاینەکەیەوە هەلبێت لە(ترسی تووشبوون) بەلا).[1] ئا لەم حالەدا دروستە دوور کەوتنەو بەرکەناری لە خەلکی، لە هیچ کاتێکی تردا دروست نیە، چونکە دەبێتە هۆی وازهێنان لە نوێژی جەماعەتو نوێژی هەینی، جا کاتێك کە لاوەکان هاتنە سەر ئەوەی بڕۆنو رابکەنو جیاببنەوە لە گەلەکەیان، خوای گەورەیش ئەوەی بۆ هەلبژاردنو ئاسانکاری بۆ کردن وەك دەفەرموویت: ﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ﴾ کاتێك ئێوە دوورە پەرێزیتان گرت لەوانو لەوانەیش وا جگە لە خودا دەیانپەرستن، یانی: کە ئێوە لێیان جیابوونەتەوە و بەهۆی ئەم ئاینەی خۆتان دژایەتیان دەکەن و ئەوان غەیری خوا دەپەرستن، کەواتە بە لاشەیشتان هەر لێیان جیا

[1] فتح الباري(١/٨٧).

ببنەوە، ﴿فَأْوُۥٓاْ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ﴾ سا بەو غارە پەنا بەرن، پەروەردگارتان بەر بەزەیی خۆیتان دەخاتو دەتانشارێتەوە لە گەلەکەتان، ﴿وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا﴾ هۆیەکی وایش دەڕەخسێنێت بە ئاواتی خۆتان بگەیەن، ئا لەو کاتەدا دەرچوونو پەنایان برد بۆ ئەو ئەشکەوتە، لەناو هۆزەکەیاندا نەمانو ون بوون، پاشایش هەر هەواڵی دەپرسین، دەڵێن: هەرچەندی کرد نەیدۆزینەوە خوای گەورە چاوی کوێر کرد لە ئاستیان وەك چۆن چاوی موشریکەکانی قورەیشی کوێر کرد لە ئاستی پێغەمبەرەکەی موحەمەدو(ﷺ) هاوەڵەکەی ئەبو بەکری صیدیق، کاتێك کە پەنایان برد بۆ غاری سەور(غار الثور) موشریکەکانی قورەیش هاتنو دەگەڕان بە شوێنیاندا، بە لایاندا دەرچوون بەڵام نەیان دەبینین، لەوێدا پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك کە ئەبو بەکری دی پەشێوەو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر یەکێکیان سەیری جێ پێی خۆی بکات دەمان بینێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەی ئەبو بەکر بڕوات چۆنە بە دوو کەس کە خوا سێیەمیانە).[1] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[2] واتە: ئەگەر ئێوە یارمەتی ئەو(پێغەمبەرە(ﷺ)) نەدەن ئەوە بێگومان خوا یارمەتی داوە کاتێك بێباوەڕان دەریان کرد لە مەککە پێغەمبەر(ﷺ) یەکێك بوو لەو دوو کەسە کاتێك ئەو دووانە(پێغەمبەر(ﷺ)و ئەبو بەکر) لە ئەشکەوتی(ثور)دا بوون ئەو کاتە بە هاوەڵەکەی دەوت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە، ئینجا خوا ئارامیو ئاسایشی بۆ بۆ ناردە خوارەوەو یارمەتی دا بە سەربازانێك کە نەتاندین، وتەی بێباوەڕانی گێڕا بە ژێرکەوتووو وتەی خوا هەر بەرزو بڵندەو خوا زاڵی کار دروستە. بەدڵنیاییەوە بەسەرهاتی ئەم ئەشکەوتە زۆر گرنگترو گەورەترو بەڕێزترو سەرسوڕهێنەرترە لە بەسەرهاتی یارانی غار(أصحاب الكهف).

﴿وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾﴾

---

[1] فتح الباري(٧/١١).

[2] التوبة(٤٠).

## شوێنی ئەشكەوتەكە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ﴾ كە خۆر هەڵدێت دەبینی لای ڕاستی ئەشكەوتەكەیانی داوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دەرگای ئەشكەوتەكە ڕووەو باكوورە، چونكە خوای گەورە باسی كردووە، كاتێك خۆر لە كاتی هەڵاتندا دەچێتە ناوی بەرەو لای ڕاستی ئەشكەوتەكە لار دەبێتەوە. وەك ئیبنو عەبباس‌و سەعیدی كوڕی جوبەیرو قەتادە دەڵێن: ﴿تَّزَٰوَرُ﴾ واتە: لار دەبێتەوە.[1] چونكە هەر كاتێك خۆر بەرز ببێتەوە لە ئاسۆوە تیشكەكەی كەم دەبێتەوە و شوێنەدا هەتا تیشكی هیچ نامێنێت لە كاتی ئاوابوونیدا، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ﴾ كاتێكیش ئاوا دەبێت لای دەدات لێیان بە لای چەپدا، یانی: خۆر كە دەچێتە ناو ئەشكەوتەكەیان لە باكووری دەرگاكەوە ئەچێتە ژوورەوەكە لە ڕووی خۆرهەڵاتەوەیە، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەو قسەیەی كە وتوومانە. ئەمەیش دیارو ئاشكرایە بۆ ئەو كەسانەی كە زانیاریان هەیەو شارەزان لە بارەی هاتوچۆی خۆرو مانگو ئەستێرەكان، دیارە ئەگەر دەرگای ئەشكەوتەكە لە ڕووی خۆرهەڵاتەوە بووایە، لە كاتی خۆرئاوابووندا هەرگیز خۆر نەدەچووە ناوی، خۆ ئەگەر ڕووەو قیبلەیش بووایە نە لە كاتی هەڵاتنی خۆرو نە لە كاتی ئاوا بوونیدا نەدەچووە ناوی، نە بە لای ڕاست‌و نە بە لای باكوریشدا نەدەچوو، وە ئەگەر دەرگاكە لە ڕووی خۆرئاواشەوە بووایە، لە كاتی هەڵاتندا خۆر نەدەچووە ناو ئەشكەوتەكە بەڵكو دوای نیوەڕۆ دەچووە ناوی‌و تا خۆرئاوابوون تێیدا دەمایەوە ئیبنو عەبباس‌و موجاهید قەتادە دەڵێن: ﴿تَّقۡرِضُهُمۡ﴾ واتە: وازیان لێ دێنێت‌و لێیان لادەدات.[2] خوای گەورە بەو شێوەیە باسی كردووە، بۆ ئەوەی ئێمە بیری لێبكەینەوەو لێی تێ بگەین، باسی شوێنی ئەشكەوتەكەی بۆ نەكردووین، كە لە چ وڵاتێكی ئەم سەر زەمینەدایە، چونكە لەناوبردنی ئەو وڵاتەدا ئێمە هیچ سوودێكی لێ وەرناگرین، هیچ مەبەستێكی شەرعیشی تێدا بەدی ناكرێت، خۆ ئەگەر سوودێكی ئاینی تێدا بووایە خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی(ﷺ) ئاگاداریان دەكردین لەو بارەیەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ شتێكم بەجێ نەهێشتووە نزیكتان بخاتەوە لە بەهەشت‌و دوورتان بخاتەوە لە ئاگر مەگین ئاگادارم كردوون لەو شتە).[3] خوای گەورە ئاگاداری كردووین لە تایبەتمەندیەكانی ئەو ئەشكەوتە، لە

---

[1] الطبري(١٧/٦٢٠).

[2] الطبري(١٧/٦٢١/٦٢٢).

[3] عبدالرزاق(١١/١٢٥).

شوێنەکەی ئاگاداری نەکردووین، ﴿وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ﴾ مالیك دەڵێت: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﴿تَّزَٰوَرُ﴾ واتە: لار دەبێتەوە، ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ﴾ لە دەمی زەردە پەڕیشدا بەرەو چەپ لێیان لا دەدات و ئەوان لە کۆڕەپانەکەیدان لە ناوەوە بۆ ئەوەی خۆرەکە لێیان نەدات، ئەگەر لێی بدانایە لاشەو جلوبەرگەکەیشیانی دەسوتاند،[1] ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ﴾ ئەوە هەندێکە لە نیشانەکانی خودا، کە ڕێی نیشان داون بۆ ناو ئەو ئەشکەوتەو بە زیندوویی هێشتنیەوەو خۆرو هەوا دەچووە ژوورەوە بۆیان، بۆ ئەوەی لەشەکانیان بمێنێتەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ﴾ پاشانیش فەرموویەتی: ﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا﴾ واتە: کەسێك خودا ڕێی نیشان بدات، تەنها ئەو شارەزا دەبێت، هەر کەسیش گومڕا بکات، دۆستێکی ڕێنمایی کەری دەست ناکەوێت، واتە: هەر خودایە ئەو کۆمەڵە لاوەی ڕێنمایی کرد لە نێوان گەلەکەیاندا هەر کەسیش خودا ڕێی نیشان بدات، شارەزا دەبێت، هەر کەسیشی گومڕا کرد هیچ کەسێك ناتوانێت شارەزای بکات.

﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴿١٨﴾ ﴾

### خەوە درێژەکەی ناو ئەشکەوتەکەیان

هەندێك لە زانایان وتوویانە کاتێك خوای گەورە گوێی ئاخنین و پەردەی دا بەسەر گوێیانداو خەوتن چاویان نەنرابوو بەیەکداو دەیانڕوانی، نەوەك لە ناکاو تووشی بەڵایەك بن، ئەو چاو کردنەوەیەش هەوا لێی دەدا، هۆکارێك بوو بۆ پاراستنی چاویان بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ﴾ تۆ وات دەزانی بێدارن کەچی خەوتبوون، لە بارەی گورگەوە وتراوە کاتێك دەخەوێت چاوێکی دەنێت بە یەکداو بە چاوەکەی تری دەڕوانێت، پاشان ئەم چاوەکەی دەکاتەوەو ئەو چاوەکەی دەنێت بە یەکدا، خەوتوویشە، وە دەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ﴾ ئێمە بە ڕاست و بە چەپدا ئەم دیو ئەودیویان پێدەکەین، سەگەکەیان هەردوو دەستی درێژ کردبوو لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکەدا، ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئەگەر

[1] الطبري(١٧/٦٢٠).

ئەم دیو ئەودیویان پێ نەکرایە زەوی دەیخواردن.[1] ئیبنو عەبباس و موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادە دەڵێن:(الوصید) بەر دەرگا.[2] ئیبنو عەباس دەڵێت: لە دەرگاکەدا.[3] وتراویشە: لەسەر خۆڵەکە، ڕاست ئەوەیە لە بەردەم دەرگاکەدا بوو. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ﴾[4] واتە: بێگومان ئەو ئاگرە لەسەریان داخراوە. واتە: گیراوەو داخراوە. سەگەکەیان لە دەرگاکەدا بەسەر دەستیدا کەوتبوو، وەك چۆن سەگ سروشتی خۆی وایە، ئیبنو جورەیج دەڵێت: سەگەکە پاسەوانی دەرگاکەی بۆ دەکردن.[5] سروشتی سەگ هەر وایە لەبەر دەرگای خاوەنی دەکەوێت، وەك ئەوەی پاسەوانیان بێت. کەوتنەکەیشی لە دەرەوەی دەرگاکە بوو، چونکە فریشتەکان ناچنە ماڵێك سەگی تێدا بێت، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە، وە لە فەرموودەیەکی حەسەندا هاتووە فریشتەکان ناچنە ماڵێك سەگو وێنەو لەش پیس و خوانەناسی تێدابێت، ڕێزی ئەم لاوانە سەگەکەیشی گرتەوە وەك چۆن ئەمان خەویان لێکەوت، سەگەکەیش خەوی لێ کەوت بەو شێوەیە، ئەمە سوودی هەڵسوکەوتە لەگەڵ پیاوچاکاندا، ئەم سەگە وای لێهات کە بەردەوام باس بکرێت، وتراویشە: ئەو سەگە لەوە دەچێت سەگی ڕاوی یەکێکیان بووبێت، وتراویشە: سەگی چێشتکەرێکی پاشا بووە، کە هاوئاینی هاوەڵەکانی بووە، سەگەکەی شوێنی کەوتووە (والله أعلم)، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا﴾ ئەگەر سەیرت بکردنایە بێگومان ڕات دەکردو بەرەو دوا دەگەڕایتەوە، پڕ بە دڵ لێیان دەترسایت، واتە: بێگومان خوای گەورە وای لێکردبوون، هەر کەسێك سەیری بکردنایە ترس دای دەگرت، نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێت لە ترساندا، بۆ ئەوەی کەس لێیان نزیك نەکەوێتەوەو دەستی کەسیان نەگاتێ، هەتا ماوەکەیان تەواو دەبێت و ئەوخەوەی خودا بڕیاری داوە بۆیان کۆتایی دێت، بێگومان ئەم کارە پڕە لە سۆزو بەزەییو بەڵگەی بەهێزو کارزانی خودای گەورە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَا أَزْكَىٰ طَعَامًا

---

[1] الطبري(١٧/٦٢٠).

[2] الطبري(١٧/٦٢٤/٦٢٥).

[3] الطبري(١٧/٦٢٥).

[4] الهمزة(٨).

[5] الطبري(١٧/٦٢٥).

فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٢٠﴾﴾

**وەخەبەربوونەوەیان و ناردنی یەکێکیان بۆ کڕینی خواردن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ﴾ واتە: ئاواش وەخەبەرمان هێنان تا لەگەڵ یەکتردا بدوێن، یەکێکیان وتی: چەند ماونەتەوە؟ وتیان: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێك ماینەتەوە. یانی: وەك چۆن خەومان لێ خستن هەر بەو شێوەیەش خەبەرمان کردنەوە بە لەشی ساغو پێستو مووی خۆیانەوە، واتە: هیچ شتێکیان نەگۆڕا بوو وەکو خۆی مابووەوە. ئەمەیش دوای سێ سەدو نۆ ساڵ، بۆیە لە نێوان خۆیاندا دەیانپرسی: ﴿كَمۡ لَبِثۡتُمۡ﴾ یانی چەند خەوتان لێکەوتووە؟ ﴿قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ﴾ بۆیە واشیان ووت چونکە کاتێك کە چوونە ناو ئەشکەوتەکە سەرەتای بەیانی بوو، بێداربوونەوەو لەخەو هەڵسانیشیان لە خۆرئاوابووندا بوو، بۆیە وا گومانیان دەبردو وتیان: ﴿يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ﴾ وتیان: پەروەردگاری ئێوە لە خۆتان چاکتر دەزانێت چەند ماونەتەوە، وا دیار بوو گومانیان بۆ پەیدا بووبوو چونکە زۆر خەوتبوون(والله أعلم)، پاشان وازیان لەوە هێناو بیریان لە شتێکی گرنگتر کردەوە ئەویش خواردنو خواردنەوە بوو کە زۆر پێویستیان پێی هەیە، وتیان: ﴿فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ﴾ یەکێك بەم پارەیە بنێرنە شار، واتە: یەکێك بەو زیوە هەتانە، چونکە ئەو لاوانە لەماڵەکانی خۆیانەوە هەندێ پارەیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتبوو بۆ کاتی پێویستی خۆیان هەندێکیان لێ بەخشیبوو، هەندێکیان پێ مابوو، بۆیە وتیان: ﴿فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ﴾ واتە: ئەو شارەی کە لێی دەرچوونو ڕاتان کرد تێیدا، ﴿ٱلۡمَدِينَةِ﴾ ألفو لامەکە بۆ عەهدی زیهنییە (یانی شارەکەی خۆیان)، ﴿فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا﴾ کام خواردنێك پاکە بیهێنێت، (زەکات) مانای (پاکی) ئەگەیەنێت وەك ئەم ئایەتەیتر کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا﴾[1] واتە: ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبووایە بەسەرتانەوە هەرگیز کەسێك لە ئێوە پوختو پاك نەدەبووەوە. وە فەرموویەتی: ﴿قَدۡ

---

[1] نور(٢١).

أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ﴾[1] واتە: بە ڕاستی سەرفراز بوو ئەوەی خۆی پاك ڕاگرت. وە (زەكات)یش هەر لەمەوە هاتووە كە ماڵ پاكو خاوێن دەكاتەوە. ﴿وَلۡيَتَلَطَّفۡ﴾ دەبێت زۆر ئاگای لە خۆی بێت، لە كاتی دەرچوونو هاتوچۆو شت كڕینو گەڕانەوەیدا، ﴿وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا﴾ هیچ كەسیش پێتان نەزانێت، ﴿إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ﴾ چونكە ئەگەر هەواڵی ئێوەیان دەست كەوت، یان بەردبارانتان دەكەن یان دەتانگێڕنەوە سەر ئاینی خۆیان. واتە: مەبەستیان دارو دەستەكەی دەقیانوسە چونكە ئەم لاوانە دەترسان ئەوانە شوێنەكانیان بزاننو دەست بكەنەوە بە ئازاردانیان، هەرچی نەشێت پێیان بكەن، بە زۆر بیانگێڕنەوە بۆ سەر ئەو ئاینەی كە خۆیان لەسەرینی، یانی: ئاینی بتپەرستی، یان خۆیان بگرن هەتا دەمرن، خۆ ئەگەر بە گوێیان بكەنو بگەڕێنەوە سەر ئاینەكەی ئەوان، لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا ڕزگاریان نابێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدًا﴾ واتە: هەرگیز ڕزگاریتان نابێت.

﴿وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ فَقَالُواْ ٱبۡنُواْ عَلَيۡهِم بُنۡيَٰنٗاۖ رَّبُّهُمۡ أَعۡلَمُ بِهِمۡۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا ﴿٢١﴾﴾

**ئاگاداربوونی خەڵكی ئەو شارە لێیانو دروست كردنی مۆنۆمێنتێك لەسەر ئەشكەوتەكەیان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ﴾ هەر بەو شێوەیە وامان كرد پێیان بزانن، كە بەڵێنی خودا ڕاستەو ڕۆژی قیامەتیش گومانی تێدا نیە. واتە: خەڵكیمان لێ ئاگاداركردن. زۆرێك لە زانایانی پێشینە وتوویانە: خەڵكی ئەو كاتە گومانیان بوو لە هاتنی ڕۆژی قیامەتو زیندووبوونەوە. عیكریمە دەڵێت: كۆمەڵێكیان تێدا بووە وتوویانە: گیان زیندوو دەكرێتەوە بەڵام لاشە زیندوو ناكرێتەوە. خوای گەورە یارانی كەهفی نارد وكردنیە بەڵگەو نیشانە لەسەر ئەوە[2]. هەندێ لە زانایان باسی ئەوە دەكەن، گوایە كاتێك كە یەكێكیان ئەیەوێت دەرچێتو بڕوا بۆ ناو ئەو شارە بۆ كڕینی شتێك بۆیان تا بیخۆن، خۆی دەرناخات و بە لاڕێدا دەڕوات هەتا خۆی ئەگەیەنێتە شارەكە، دەڵێن: ئەو كەسە ناوی دەقسوس بووە،ئەو كەسە وای دەزانی زۆر نیە لەوشارە دەرچووە، كەچی خەڵكی ئەو شارە چەرخ دوای چەرخو نەوە دوای نەوەو گەل دوای گەل

---

[1] الاعلى(١٤).

[2] تأريخ الطبري(٢/٩).

گۆڕانکاری بەسەریاندا هاتبوو، وڵاتەکەیش بە تەواوی گۆڕابوو، وای لیّ هاتبوو کە هیچ نیشانەیەکی ئەو وڵاتەی ئەوی تیایدا ژیابوو لەشارەکەدا نەمابوو، هیچ کەسێکیشی نەدەناسی لە خەڵکی ئەو شارە، نە لە پیاوە گەورەکان نە لە خەڵکەکەی تر، خۆی بۆ خۆی زۆر سەری سوڕمابوو، دەیوت: لەوانەیە من شێت بوویم یان جنۆکە دەستی لیّ وەشاندبم یان خەو دەبینم، پاشانیش دەیوت: بە خوا هیچێك لەوانەم تووش نەبووە، من ئەم شارەم دوێنیّ بەجیّ هێشت بەم شێوەیە نەبوو، پاشان وتی: هەتازووە من لێرە دەرچم چاکترە، پاشان چوو بۆ لای پیاوێك کە خواردنی دەفرۆشت، ئەو پارەیەی پێی بوو دایەو پێی وت: بەو پارەیە هەندیّ خواردنی بداتیّ، کاتیّ ئەو پیاوە چاوی پێی کەوت، پارەکەیش و نەخشی پارەکەشی نەدەناسی، بردی بۆ لای دەراوسێکەی‌و باسیان دەکرد لە نێوان خۆیانداو دەیانوت: لەوانەیە ئەم پیاوە گەنجینەیەکی دۆزیبێتەوە، پرسیاریان لێکرد لە کوێوە هاتووەو ئەم پارەیەی لە کوێوە هێناوە، لەوانەیە دۆزیبێتیەوە، وتیان: تۆ کێیت؟ ئەویش وتی: من خەڵکی ئەم شارەم، دوێنیّ لێرە بووم کە دەقیانووسی تێدا بووە، وتیان ئەو پیاوە شێت بووە بردیان بۆ لای پاشاکەیان، ئەویش پرسیاری لێکرد لە بارەی خۆی‌و ئەوەی باسی کردووە، بۆیان بگێڕێتەوە.پاشاکەیش زۆر سەری سوڕما لێی‌و ئەوەی کە باسی دەکات، کاتێك کە ئاگاداری کردن لەو رووداوە، هەڵسان‌و لەگەڵی چوون بۆ ئەشکەوتەکە (یانی: پاشاو خەڵکی شارەکە) بردنی‌و گەیاندنیە لای ئەشکەوتەکەو پێی وتن: رێم بدەن لە پێش ئێوە برۆمە ژوور تا هاوەڵەکانم ئاگادار بکەم، جا چووە ژوورەوە، دەڵێن: نەیانزانی چۆن چووە ناو ئەشکەوتەکەوە و خوای گەورە هەواڵی ئەوانەی لیّ شاردنەوە، دەشڵێن: خەڵکەکە و پاشا چوونەتە ناویان و چاویان پێیان کەوتووەو پاشاکەیش سڵاوی لێکردوون و لە ئامێزی گرتوون و لەسەر ئاینەکەی ئەوان بووە و موسڵمان بووە وەك ئەڵێن، ئەو پاشایەش ناوی یەندۆسیس بووە، لاوەکان زۆر خۆشحاڵ بوون پێی‌و قسەکانی سەرنجی ڕاکێشاون‌و پاشان بەڕێیان کردووەو خوا حافیزیان لێکردووەو گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی خەوە کانیان و خوای گەورە مراندوونی(والله أعلم).[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ﴾ ئا بەو شێوەیە خەڵکمان لیّ ئاگادار کردن، واتە: چۆن خەومان لیّ خستن هەر بەو شێوەیەش لەو خەوە هەڵمان ساندن بە ڕەنگ‌و بۆی خۆیان‌و خەڵکی ئەو کاتەمان لیّ ئاگادار کردن، ﴿لِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ﴾ واتە: تا بزانن بەڵێنی خودا ڕاستەو ڕۆژی قیامەتیش بیّ گومانە، لە نێوان خۆیاندا دەستیان کردە گفتوگۆ کردن، لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە هەندێکیان بڕوایان پێی هەبوو، هەندێکیشیان بڕوایان پێی نەبوو، خودای گەورە هاوەڵانی ئەشکەوتی پیشان دان‌و

---

[1] تاريخ الطبري(٢/٩).

کردیە بەڵگە بۆ هەردوو لایان. ﴿فَقَالُواْ ٱبۡنُواْ عَلَيۡهِم بُنۡيَٰنٗاۖ رَّبُّهُمۡ أَعۡلَمُ بِهِمۡۚ﴾ وتیان: وا چاکە خانوویەکیان لەسەردروست کەن، پەروەردگاریان لە ئێوە چاکتریان دەناسێت، دەرگای ئەشکەوتەکەیان لەسەر دابخەن، بەو شێوەیەی خۆیان بەجێیان بێلن، ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا﴾ ئەوانەی دەربارەی ئەمانە قسەیان زۆرتر دەڕۆیی، وتیان: دەبێت مزگەوتێکیان لەسەر دروست بکەین. ئەوانەی ئەم قسەیان کرد خاوەن دەسەلاتەکان بوون، بەلام ئایا (ئەمە کارێکی چاکە) ئەوانە سوپاس کراون یان نا؟ ئەمە جێی تێڕوانینە! چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(خوا لەعنەتی لە جوولەکەو گاور کردووە لەبەر ئەوەی گۆڕی پێغەمبەرانو پیاوچاکەکانیان کردووە بە مزگەوت) هەڕەشە دەکات لەوکردەوەیەی ئەوانە کردوویانە[1]. هەروەها لە گەورەی موسڵمانانەوە عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێبێت) ڕیوایەتمان کردووە کاتێك کە گۆڕی (دانیال) لە زەمانی خۆیدا لە عێراق دۆزرایەوە، فەرمانیدا لە خەڵکی بشارنەوە، ئەو بەڵگەنامەیەش کە لەگەڵیدا دۆزیبویانەوە داپۆشن[2]. کە هەندێ داستانو شتی تری تێدا بووە.

﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٢٢﴾﴾

## ژمارەی یارانی غار

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: دەڵێن:(ئەو لاوانە) سێ کەسنو چوارەمیان سەگەکەیانە، دەشڵێن پێنج کەسنو بە سەگەکەیانەوە شەشن، لە نەدیو خەیالات دەکەن، خودای مەزن کاتێك ئەو جیاوازی بۆچوونانە باسدەکات لەناو خەڵکیدا لەسەر ژمارەی یارانی ئەشکەوتەکە، سێ ڕا باسدەکات، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە کەس ڕای چوارەمی نەبووە، لەسەریان وەختێك قسەی یەکەمو دووەم لاواز دەردەکات، وەك ئەفەرموێ: ﴿رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ﴾ قسەیەکی بێ زانیاریە، وەك کەسێك تفەنگ بە تاریکە شەوەوە بنێت وایە، چونکە لەوانەیە نەیپێکێت، ئەگەر پێکایشی بە ئارەزووی خۆی نەبووە. پاشان ڕای سێهەم دێنێو لێی بێ دەنگ ئەبێت! وەك ئەوە وایە بسەلمێنێت کەدەفەرمووێت: ﴿وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ

---

[1] فتح الباري(١/٦٣٤).

[2] البداية والنهاية(٧/٨٨).

كَلْبُهُمْ﴾ هەندێكیش دەڵێن: حەوتن بە سەگەكەیانەوە دەبن بە هەشت، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی قسەی ئەمانە، لە ڕاستیشدا هەر وابووە. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم﴾ پەروەردگارم چاكتر دەزانێ چەند كەسن. ئەمە ڕێنماییەكە بۆئەوەی لەم جۆرە قسانەدا چاكتر وایە زانیاری ئەوشتانە بگێڕیتەوە بۆلای خودا، چونكە پێویست بە ڕۆچوون ناكات لەم شتانەدا بەبێ زانیاری، خۆ ئەگەر زانیاریەكمان هەبوو لە شتێكدا باش وایە بیڵێین، ئەگەرنا ئەوە نەزانین لەوێدا ئەبێ ڕامانبگرێت كە زانیاری قسەمان پێدەكات، كە خوا دەفەرموێت: ﴿مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ كەمێك نەبێت لە خەڵكی ژمارەیان نازانێت، قەتادە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: من یەكێكم لەو كەسانەی كە خودای گەورە لە ئایەتەكەدا جیای كردووەتەوە، ئەو لاوانە حەوت كەس بوون.[1] ئیبنو جەریریش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی كردووە لە عەتای خۆراسانیەوە و ئەویش لە ئیبنو عەبباسەوە كە فەرموویەتی من یەكێكم لەو كەسانەی خودا جیای كردووەتەوە. ئەو لاوانە ژمارەیان حەوت كەسە.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەمەدا كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ دەڵێت: من لەو كەسانەم كە ژمارەكەیان دەزانن، ئەوانە حەوت كەس بوون. ئەم سەنەدانە هەموو ڕاستن كە ئیبنو عەبباس فەرموویەتی: ئەوانە حەوت كەس بوون، ئەمەیش هاو هەنگە لەگەڵ ئەوەدا كە ئێمە لە پێشەوە باسمان كرد. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا﴾ واتە: تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) لەو بارەیەوە دەمەقاڵەیان ببڕەو زۆر لەسەر باسەكە مەڕۆ، جگە لەوەی قورئان فەرموویەتی هیچی تر مەڵێ. چونكە زانینی ئەوەو قسەكردن لەسەری زۆر سوودی نیە، ﴿وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا﴾ واتە: لە بارەی ئەوانەشەوە لە كەسیان مەپرسە. چونكە ئەوانە هیچ زانیاریەكیان نیە لەو بارەیەوە، ئەوە نەبێت هەر لە خۆیانەوە قسە دەكەن، لە نەدیو و نەناس هەر خەیاڵات دەكەن. واتە: بێ ئەوە نیشانەیەكیان بە دەستەوە بێت لە لایەن پێغەمبەرێكەوە كە وتبێتی. ئەی موحەممەد(ﷺ) خودای مەزن قورئانی بۆ ناردی كە هیچ لاریو گومانێكی تێدا نیە، ئەو قورئانە لە پێشترە لە هەموو ئەو كتێبو قسانەی كە لە پێشەوە هاتوونو كراونو فەرمان ڕەوایشە بە سەریانەوە.

﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ ﴾

[1] الطبري(١٧/٦٤٢).

[2] الطبري(١٧/٦٤٢).

**( إن شاء الله ) كردن لە كاتی نیەت هێنان بۆ كردنی كارێك لە داهاتوودا**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ هەرگیز مەڵێ: من سبەی ئەم كارە دەكەم، مەگین (خودا حەزكا)ی لەگەڵ بێت. ئەمە ئامۆژگاریەكە لە لایەن خوداوە بۆ پێغەمبەرەكەی(ﷺ) بۆ هەر كارێك بیەوێت بیكات لە داهاتوودا بە ئەدەبەوە ئەو شتە بگێڕێتەوە بۆ مەیل و ویستی خوای گەورە، كە ئاگاداری گشت نهێنیەكانە، ئاگای لەوەیە كە بووەو لەوەیش كە دەبێت، ئەوەیش تا ئێستا نەبووەو ئەگەر بشبێت چۆن دەبێت. وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) كە فەرموویەتی:(سولەیمانی كوڕی داود(سەلامی خوایان لێبێت) وتی: سوێند بە خوا ئەمشەو دەگەڕێم بەسەر حەفتا ژنا(لە ڕیوایەتێكی تردا) نەوەد ژندا، (لە ڕیوایەتێكی تردا) سەد ژندا، تا هەر ژنێك لەوژنانە منداڵێكیان ببێت لە ڕێی خوادا بجەنگن، پێی وترا و لە ڕیوایەتێكی تردا، فریشتەیەم پێی ووت: بڵێ: (إن شاء الله)، ئەو(إن شاء الله)كەی نەووت و بەسەریاندا گەڕا، هیچیان منداڵی نەبوو تەنها ژنێكیان نەبێت، ئەویش نیو مرۆڤ بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر بیوتایە (إن شاء الله) سوێندەكەی نەدەكەوت و پێویستیەكەی خۆیشی دەست كەوت)، وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە:(هەمووشیان بەسواری دەجەنگان لە ڕێی خوادا).[1] لە پێشەوە لە سەرەتای سورەتەكەدا باسی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە كرا، لەوەی كە پێغەمبەر(ﷺ) كاتێك كە پرسیاری لێكرا سەبارەت بە بەسەرهاتی یارانی ئەشكەوتەكە فەرمووی: بەیانی وەڵامتان دەدەمەوە). ئەوە بوو پانزە ڕۆژ وەحی دواكەوت[2]. بە درێژی باسمان لێوە كرد لە سەرەتای سورەتەكەدا، پێویست بە دووبارە كردنەوەی نییە لێرەدا. ئەوەش كە دەفەرموویێت: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ ئەگەر لە بیریشت نەما، یادی پەروەردگارت بكە. هەندێ وتوویانە: یانی: كاتێك(إن شاء الله)ت لەبیر چوو، هەر كاتێك یادت كەوتەوە،(إن شاء الله) بكە، ئەمە قسەی ئەبولعالیە و حەسەنی بەسریە.[3] هوشەیم دەڵێت لە ئەعمەشەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنو عەبباسەوە فەرموویەتی: كاتێك پیاوێك سوێند دەخوات لەبیری بچێت (إن شاء الله) بكات دەڵێت: دەتوانێ (إن شاء الله) بكات، با ساڵێكیشی بەسەردا ڕۆشتبێت! ئیبن عەبباس ئەیفەرموو ئەم ئایەتە ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ بۆ ئەوشتەیە. وتیان بە ئەعمەش ئەمەت بیستووە لە موجاهیدەوە؟ وتی: لەیسی كوڕی ئەبی سلیم بۆی گێڕامەوە بەو شێوەیە

---

[1] فتح الباري(٦/٤١)، مسلم(٣/١٢٧٥).

[2] الطبري(١٧/٥٩٢).

[3] الطبري(١٧/٦٤٥).

وكەسائیش هەمان ڕای هەیە[1]. مانای ئەم قسەی ئیبنو عەباس كە(إن شاء الله) بكات با دوای ساڵێكیش بێت، واتە: كاتێك لە بیری چوو لە سوێندەكەیدا یان لە قسەكەیدا(إن شاء الله) بكات. ئەگەر دوای ساڵێكیش هاتەوە بیری، سونەتە ئەو(إن شاء الله)یە بكات، بۆ ئەوەی ئەو سوننەتە بەجێ بێنێت با لە پاش سوێندەكەیشی شكابێت، ئەوە قسەی ئیبنو جەریرە.[2] وە وتوویەتی: ئەو(إن شاء الله)یە نابێتە هۆی نەكەوتنی سوێندەكەو لابردنی كەفارەتەكەی، ئەمەش ئیبنو جەریر وتوویەتی هەر ئەوە ڕاستە، گونجاویشە لەگەڵ قسەكەی ئیبنو عەبباسدا (والله أعلم). تەبەرانی ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتانەدا كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ﴾ واتە: یادی خوا بكەرەوە كە لە بیرت چوو بڵێیت (إن شاء الله).[3] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدًا﴾ بەڵكو پەروەردگارم ڕێگایەكی نزیكتر لەمە نیشان بدا. واتە: ئەگەر پرسیارت لێ كرا لە شتێك كە نایزانی، داوای یارمەتی بكە لە خودا بۆ ئەوەی شارەزاو سەركەوتووت بكاتو یارمەتیت بداتو هەقت نیشان بدات لەو شتەدا(والله أعلم).

﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٦﴾﴾

**ماوەی مانەوەیان لەناو ئەشكەوتەكەدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾ سێ سەد ساڵ لە ئەشكەوتەكەدا مانەوە نۆ ساڵیشیان لێ زیاد كرد. ئەمە هەواڵێكە لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەرەكەی(ﷺ) لەسەر ئەندازەی ئەو ماوەیە كە لاوەكان ماونەتەوە لە ئەشكەوتەكەیاندا لەو كاتەی كە خەویان لێ كەوتووە هەتا ئەو كاتەی كە خودا خەبەری كردوونەتەوەو خەڵكی ئەو زەمانەی لێ ئاگادار كردووە كە ماوەی سێ سەد ساڵی هەتاوی بووەو نۆ ساڵی لێ زیاد كراوە بۆ ساڵی مانگی. چونكە جیاوازی سەد ساڵی مانگی لەگەڵ سەد ساڵی هەتاویدا سێ ساڵە، بۆیە دوای ﴿ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ﴾ ئەفەرموێ: ﴿وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾، كە خوای گەورەش ئەفەرموێ ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْ﴾ واتە: بڵێ: خودا باشتر دەزانێ چەند ماونەتەوە، یانی: ئەگەر پرسیارت لەو ماوەیە لێكرا و تۆ زانیاری

---

[1] الطبري(١٧/٦٤٥).

[2] الطبري(١٧/٦٤٦).

[3] الطبراني من الأوسط(٧/٥٤٥).

یەکیشت نەبوو لەوبارەوە بیگێڕەوە بۆ لای خوا، لە خۆتەوە هیچ شتێك مەڵێت‌و بەڵكو بڵێ: ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ نهێنیەکانی ئەم ئاسمانانەو زەمینە تەنها خوا دەیزانێت‌و ئەو کەسانەیش کە خۆی ئاگاداری بکات لە دروستکراوەکانی. ئەمەی کە وتمان زۆرینەی زانایانی تەفسیر هەر وایان وتووە وەك موجاهیدو کەسانی تریش لە پێشینەو لە پاشینەش. قەتادە دەڵێ لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ﴾ ئەمە قسەی ئەهلی کتێبە کە وادەڵێن، خوای گەورەیش ئەمە ڕەت ئەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ﴾ بڵێ: هەر خوا دەزانێت چەندێك ماونەتەوە، قەتادە ئەشڵێت: لە خوێندنەوەی(عبدالله)دا هاتووە کە ئایەتەکەیدا خوێندووەتەوە(وقالوا: و لبثوا)، واتە: خەڵکی وتوویانە سێ سەد ساڵ ماونەتەوە.[1] موتەڕڕەفی کوڕی عەبدوڵایش هەروای وتووە.[2] لەم قسەیەدا کە قەتادە دەیڵێت، جێی تێڕوانینە، ئەوەی بە دەستی ئەهلی کتێبەوەیە و ئەیگێڕنەوە ئەوەیە کە ئەو لاوانە تەنها سێ سەد ساڵ ماونەتەوە، نۆ ساڵی لەگەڵ نیە، مەبەستیان ساڵی هەتاوی یە. ئەگەر خودا قسەکەی ئەوانی بگێڕایەتەوە نەیدە فەرموو ﴿وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾. لە ئایەتەکەشەوە وا دەردەکەوێت کە ئەوە خودا خۆی فەرموویەتی نەك ئەوە قسەی ئەهلی کتێب بێت. ئیبنو جەریریش ئەم ڕیوایەتەی هەڵبژاردووە کە ئێمە ئەیڵێین (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئیتر والله أعلم. ﴿أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ﴾[3] ئای خودا چ بیسەرو بینایە. واتە: خودا باش دەیان بینێت‌و گوێی لێیانە، ئیبنو جەریر دەڵێت: ئەمە بۆ موبالەغەیە لە وەسف کردندا وەك وترابێت:(ما أبصره وما أسمعه) مانای وتەکە ئای چ بیسەرە خوداو ئای چ بینەرە خودا، هیچ شتێکی لەوانە لێ ناشارێتەوە، پاشان ڕیوایەت کراوە لە قەتادەوە کە مانای ﴿أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ﴾ واتە: هیچ کەسێك لە خوا بینەرترو بیسەرتر نیە.[4] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا﴾ جگە لە خوا کەسیان بە دۆست دەست ناکەوێت‌و کەسیش ناکات بە هاوبەشی خۆی لە فەرمانیدا، واتە: بوون‌و نەبوون بە دەستی خودا خۆیەتی هەرچی بوێ دەیکات، کەس ناتوانێت دەست بخاتە کارەکانی، وەزیرو بریکارو ڕاوێژکارو هاوبەش‌و یارمەتی دەری ناوێت.

---

[1] الطبري(١٧/٦٤٧).

[2] الطبري(١٧/٦٤٨).

[3] الطبري(١٧/٦٥٠).

[4] الطبري(١٧/٦٥٠).

﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ ﴾

**فەرماندان بە خوێندنی قورئان و خۆڕاگری لەگەڵ خاوەن باوەڕاندا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ ئەوەی کە بۆت هاتووەتەخوار و سروش کراوە بۆت کە کتێبی پەروەردگارتە بخوێنەوە، کەس ناتوانێ وتەکانی خودا بگۆڕێت. لێرەدا خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) قورئانی پیرۆز بخوێنێت و بە خەڵکیشی بگەیەنێت، ﴿لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ واتە: کەس ناتوانێت بیگۆڕێت و دەستکاری بکات و بە ئارەزووی خۆی مانای بکات، ﴿وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا﴾ جگە لە خوا هیچ کەسێك بە هاناتەوە نایەت، موجاهید دەڵێت: ﴿مُلۡتَحَدٗا﴾ واتە: پەنایەك.[1] قەتادە دەڵێت: هیچ دۆست و پشتیوانێك.[2] ئیبنو جەریر دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی موحەمەد(ﷺ) ئەگەر تۆ ئەو قورئانەی کە بۆت ڕەوانە کراوە لە لایەن پەروەردگارتەوە نەیخوێنیت، ئەوسا هیچ پەنایەك نیە هانای بۆ بەری لە خودا.[3] وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾[4] واتە: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر شتێکت لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆ هاتووە ڕای بگەیەنە ئەگەر وا نەکەی ڕاسپێریت بەجێ نەهێناوە، خودا ئەوپارێزێت لەو خەڵکە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٖ﴾[5] واتە: ئەو کەسەی ئەم قورئانەی کردە ئەرکی سەرشانی تۆ، بێگومان دەتباتەوە ئەو شوێنەی کە بەڵێنی پێداوی و پرسیارت لێ دەکات لەسەر ئەو ئەرکەو گەیاندنی ئەو پەیامە، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥ﴾ واتە: خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەو مەبەستیان ڕەزامەندی خودایە، واتە: لەگەڵ ئەوعەبدانەی خوا

---

[1] الطبري(١٧/٦٥١).

[2] الطبري(١٧/٦٥١).

[3] الطبري(١٧/٦٥١).

[4] المائدة(٦٧).

[5] القصص(٨٥).

دانیشە کە یادی خوا دەکەن و خوا بەهەق ئەزانن و سوپاسی دەکەن و بە بێگەرد ڕائەگرن و بەگەورە سەیرئەکەن و ئێواران‌و بەیانیان لێی دەپاڕێنەوە، با ئەوانە هەژار یان دەوڵەمەند بەهێز یان لاوازیش بن جیاوازی نیە و هەموویان لای خوا وەك یەکن. ئەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر پیاوماقوڵانی قورەیش هاتەخوار کاتێك کە داوایان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆی بە تەنها پێکەوە دایان نیشێنێت، لەگەڵ هاوەڵە هەژارو لاوازەکانیدا لەگەڵیان دانەنیشێت، وەك بیلال‌و عەمارو سوهەیب و خەباب و ئیبنو مەسعود، با بە تەنها لەگەڵ ئەوانەدا لە شوێنێکی تردا دانیشێت (دوور لە ئەمان). خوای گەورە ڕێی نەدا بە پێغەمبەر(ﷺ) بە تەنها لەگەڵیان دانیشێت‌و دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾[1] واتە: ئەوکەسانەدەرمەکە هەمووبەیانیان و ئێوارانێك دەپاڕێنەوە لە پەروەردگاریان. خوای گەورە فەرمانیدا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆگر بێت و لەگەڵ ئەوانەدا دانیشێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾. موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر بووین(ﷺ) شەش کەس بووین، موشریکەکان وتیان بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانە دەرکە با نەیەنە لامان، دەڵێت: من‌و ئیبنو مەسعودو پیاوێکی هوزەیلی‌و(هُذَیل) بیلال‌و دوو پیاویش ناوەکانم لەبیر نەماوە، ئەوەی خوا مەیلی لێ بوو بکەوێتە دڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتە دڵی و وورد ودرشتی دڵی خۆی ئەکرد، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ﴾[2] واتە: وە ئەوانە دەرنەکەیت کە پەروەردگاریان دەپەرستن‌و هاواری لێ دەکەن بە بەیانیان‌و ئێوارانداا(ڕەزامەندی) خوایان دەوێ. تەنها موسلیم ڕیوایەتی کردووە بوخاری لەگەڵدا نیە.[3]

﴿وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ چاوەکانت لەوانە وەرمەگێڕە بۆ ژینی پڕ نیق‌و بەرقی ئەم دنیایە، ئیبنو عەبباس دەڵێ: چاوت وەرمەگێڕە بۆ کەسانی تر جگە لەمانە.[4] واتە: بگەڕێیت بە شوێن پیاوماقوڵ‌و دەوڵەمەنددا لە باتی ئەمان‌و لە جێی ئەمان دای بنێیت، ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا﴾بە گوێی کەسێك مەکە کە دڵیمان لە یادی خۆمان بێ ئاگا کردووە، واتە: لە باتی ئەوەی

---

[1] الانعام(٥٢).

[2] الانعام(٥٢).

[3] مسلم(١٨٧٨/٤).

[4] الطبري(٦/١٨).

پەیڕەوی ئاینەکەی بێت و خواپەرستی بکات، ﴿وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾ ئەو کەسە هەر لە شوێن ئارەزووی خۆیەتی و کاری لە ڕادەدەرچووە، هەڵەشەیەو ئاگای لە خۆی نیەو تۆ ئەی موحەمەد(ﷺ) بە گوێی ئەوانە مەکەو خۆشیت لە ڕێگاکەیان نەیەت، ئاوات بە حاڵیان مەخوازە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾﴾[1] واتە: چاوت مەدە سەر ئەو شتەی کە داومانە بە کۆمەڵێك لەوانە، ئەوە هەر خۆشی ژیانی دنیایەو هەر ویستوومانە تاقیان بکەینەوە. ڕۆزی پەروەردگاری تۆ چاکترو بەردەوامترە.

﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾﴾

**هەق هەر لای خودایەو سزای ئەوانەی کە بڕوای پێ ناکەن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ واتە: بڵێ: هەق(ئەم قورئانە) لە لایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە، کێ بڕوای پێدەکات، بیکات و کێش بڕوای پێ ناکات هەر نەیکات، خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ)، ئەی موحەمەد(ﷺ) بڵێ بەو خەڵکە، ئەوەی من بۆم هێناون لە لایەن پەروەردگارتانەوە هەر ئەوە هەقە هیچ گومانێکی تێدا نیە: ﴿فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾ ئەمە خۆی شێوازێکی توندە لە هەڕەشەکردن. بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ﴾ ئێمە بۆ ناهەقیکاران ئەوانەی کە بڕوایان نیە بە خواو پێغەمبەرو(ﷺ) کتێبەکانی ﴿نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ ئەو ئاگرە بڵێسەکەی وەك دەوار(چادر) دەوریان دەدات، ﴿سُرَادِقُهَا﴾ واتە: دیوارەکەی. یبنو جورەیج دەڵێت: لەئیبنوعەبباسەوە: ﴿نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾ یانی: دیوارێك لەئاگر.[2] وەدەفەرموێت: ﴿وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ﴾ ئەگەر(لە تینواندا) هاواری ئاو بکەن، ئاوێکیان بۆ دەهێنرێت وەك مسی تواوە ڕوو و دەم و چاوەکان دەبرژێنێت. ئیبنو عەبباس دەڵێت:(المُهل) واتە: ئاوی زۆر گەرم وەك چڵك و چەپەڵی زەیت.[3] موجاهید دەڵێت:(المُهل) وەك خوێن و کێم.[4] عیکریمە دەڵێت ئەو شتەیە کە لەوە گەرمتر نیە،

---

[1] طه(١٣١).

[2] الطبري(١١/١٨).

[3] الطبري(١٣/١٨).

[4] الطبري(١٣/١٨).

هەندێكی تر دەڵێن:(المهل) هەموو شتێكی تواوەیە.[1] قەتادە دەڵێت: ئیبنو مەسعود هەندێ زێڕی لە چاڵێكدا تواندەوەو بووە ئاوو كەف، وتی: ئەمە لە هەموو شتێك زیاتر لە(المُهل) دەچێت.[2] زەحاك دەڵێت: ئاوی جەهەنەم ڕەشەو جەهەنەمیش ڕەشترەو خەڵكەكەیش زۆر ڕەشتر.[3] ئەم قسانە هیچیان دژی یەكتر نین، چونكە(المُهل) ئەم سیفەتە ناشیرینانەی هەموو تێدا كۆبووەتەوە، واتە: زۆر ڕەش‌و بۆگەن‌و پیس‌و گەرم. بۆیە فەرموویەتی: ﴿يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَ﴾ دەم‌و چاو دەبرژێنێت ئەوەندە گەرمە، وەختێك خوانەناس دەیەوێت بیخواتەوەو لە دەم‌و چاوی نزیكی بكاتەوە دەیبرژێنێت‌و دەم‌و چاوی پێستەكەی دەكەوێتە ناو ئەو ئاوە. سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: كاتێك خەڵكی ناو ئاگر برسییان دەبێت هاوار دەكەن، درەختی زەقنەموتیان(زقوم) بۆ دێننۆ لێی دەخۆن. پێستی ڕوویان هەمووی دەكەوێت‌و لە بن دێت، ئەگەر كەسێك بە لایاندا بڕوات دەیان ناسێت، بە شێوەی پێستیاندا لەو ئاگرەدا، پاشان كە تینوویان دەبێت، هاوار دەكەن، ئاویان بۆ دێنن وەك مسی تواوە وایە، ئەوەندە گەرمە لەوە گەرمتر نیە كاتێك كە نزیكی دەكەنەوە لە دەمیان ئەوەندە گەرمە گۆشتی دەم‌و چاویان دەبرژێنێت، پێستەكەی دەكەوێتە خوارەوە.[4] بۆیە خوای گەورە پاشان وەسفی ئەو خواردنەوەیە دەكات بەو شێوە پیس‌و ناشیرینەو دەفەرمووێت: ﴿بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ﴾ ئەو خواردنە چ خواردنێكی پیس‌و خراپە، وەك لە ئایەتێكی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ﴾[5] واتە: ئاوی كوڵاو كوڵیان دەرخوارد بدرێت كە ڕیخۆڵەكانیان پارچە پارچە بكات. وە فەرموویەتی: ﴿تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ﴾[6] واتە: ئاوێكی سووتێنەریان دەدرێتێ، وەك لە ئایەتێكی تریشدا فەرموویەتی: ﴿يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ﴾[7] واتە: هاتو چۆیانە لەنێوان ئاوێكی كوڵاوی زۆر گەرمدا ﴿وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا﴾ ئەو ئاگرە چەند شوێن‌و جێگە و

---

[1] الطبري(١٨/١٢).

[2] الطبري(١٨/١٣).

[3] الطبري(١٨/١٣).

[4] الطبري(١٨/١٤).

[5] محمد(١٥).

[6] الغاشية(٥).

[7] الرحمن(٤٤).

ڕێگایەکی خراپە بۆ مانەوەو پشوودان. وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾[1] واتە: بە ڕاستی دۆزەخ جێگەو شوێن مانەوەیەکی زۆر خراپە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾ ﴾

**پاداشتی ئەوانەی خاوەنباوەڕ بوون و ئاکاری چاکیان بووە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوون‌و ئاکار چاکن(با بزانن) ئێمە پاداشتی کارچاکان ون ناکەین. دوای ئەوەی خوای گەورە باسی ژیانی بەدبەختانی کرد لە جەهەنەمدا. دێتە سەر باسی بەختەوەران، ئەوانەی کە بڕوایان بووە بە خوا و ئەو پێغەمبەرانەشیان بە ڕاست زانیووە کە ئەو پەیامانەیان هێناوە بۆیان. هەر فەرمانێکی چاکیشیان پێ سپێردرابێت جێبەجێیان کردووە، ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ ﴾ بۆ مانەوە دەیانبەینە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوات‌و دەڕازێنەوە(لەو بەهەشتەدا) بە بازنی زێڕ. لە وێنێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴾[2] واتە: بە مرواری‌و جلوبەرگیشیان ئاوریشمە لەناو بەهەشتدا. لێرەدا جیای کردووەتەوەو فەرموویەتی: ﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ پۆشاکی سەوز دەپۆشن لە ئاوریشمی تەنك و ئەستوور ﴿سُندُسٍ﴾ پۆشاکی تەنك‌و ناسکە وەك کراس‌و ئەو شتانەی وەك کراس وان، بەلام ﴿وَإِسْتَبْرَقٍ﴾ ئەوریشمی ئەستووری ڕازاوە ﴿مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ﴾ لەسەر تەختەکان پاڵ دەدەنەوە،(الاتكاء) هەندێ دەڵێن: یانی پاڵکەوتن هەندێکی تر دەڵێن: دانیشتن بە چوارمشقی، لێرەدا مەبەست لە دانیشتن لەسەر کورسیە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (ئەوسا من بە پاڵدانەوەوە خواردن ناخۆم).[3] ﴿ٱلْأَرَآئِكِ﴾ جەمعی(أريكة)یە واتە: چوار پاس(قەنەفەی) ژێر کەژاوە، وەك ئەوانەی کە خەڵکی ئەم زەمانە چاك لێی شارەزان پێی ئەڵێن (باشخانە) والله أعلم. پاشان خوای

---

[1] الفرقان(٦٦).

[2] الحج(٢٣).

[3] تحفة الأحوزي(٥/٥٥٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

گەورە دەفەرمووێت: ﴿نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقًا﴾ ئای چەند پاداشتێکی چاکەو شوێنێکی خۆشە، ئەو بەهەشتەی کە خوا داویەتی بە خاوەن باوەڕان لەسەر ئەو کارە چاکانەی کە کردوویانە، وەك چۆن لە بارەی ناو ئاگریشەوە فەرموویەتی: ﴿بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا﴾[1] واتە: بە ڕاستی دۆزەخ جێگەو شوێن‌و مانەوەیەکی زۆر خراپە. چ خواردنێکی خراپ‌و شوێنێکی نالەبارە. هەر بەم شێوەیە لە سورەتی(الفرقان)دا بەراوردی نێوان بەهەشت‌و ئاگری کردووەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾[2] واتە: بە ڕاستی دۆزەخ جێگەو شوێنمانەوەیەکی زۆر خراپە. پاشان باسی سیفاتی خاوەن باوەڕانی کردووەو فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾[3] واتە: جا لەپاداشتی خۆڕاگرتنیان هۆدەکانی(بەهەشتیان) پێدەدرێت‌و لەوێدابەدروودو سەلامەوە لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو دەبن‌و هەر لەوێدا دەمێننەوە، چ جێگایەکی خۆش شوێنێکی چاکە.

﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ﴿٣٦﴾﴾

### نموونەی بتپەرستێکی دەوڵەمەندو موسلمانێکی هەژار

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا﴾ تۆ نموونەی دوو مرۆڤیان بۆ بگێڕەوە، دوو ڕەزمان بە یەکێکیان داو بە دارخورما دەورمان گرتن‌و ناویشیانمان کردە کشتوکاڵ.

خوای گەورە دوای ئەوەی باسی بتپەرستانی کرد، ئەوانەی کە خۆیان بە زل دەزانی‌و پێیان شورەیی بوو لەگەڵ موسڵمانە لاوازو هەژارەکاندا دانیشن‌و فیزیان بە سامان‌و بنەماڵەیانەوە دەکرد، نموونەی ئەوانە بە دوو پیاو دێنێتەوە کە یەکێکیان دوو باغی ترێی هەبووە بە دارخورما دەوری دراوەو زۆر جوان‌و سەرنج ڕاکێش بووە ناوەکەیشی کشتوکاڵ بووە. گشت درەخت‌و کشتوکاڵەکەی پڕ بەر

[1] الكهف(٢٩).

[2] الفرقان(٦٦).

[3] الفرقان(٧٥_٧٦).

بووەو بەرەو پێگەیشتن چووەو زۆر چاکیش بووە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْئًا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَالَهُمَا نَهَرًا﴾ ئەم دوو باغە ترێیە بەری خۆیان بەبێ کەموکوڕی دەدا، لە ناو هەر یەکێکیاندا ڕووبارێکمان هەڵقوڵاندبوو. ﴿وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا﴾ داراییەکی زۆریش هەبوو، کاتێ لەگەڵ هاوەڵەکەیدا خەریکی گفتوگۆ بوو وتی: من لە تۆ پارەم زۆرترو دەستو پەیوندیشم زۆرترە. وتراوە: مەبەست بە(الثمر) سامانە. وتراویشە مەبەست پێی بەروبوومە، بەڵام ئەمەیان لێرەدا گونجاوترە، (ثمر) لە خوێندنەوەیەکداهاتووە ﴿وَكَانَ لَهُ ثُمُرٌ﴾ بە زەمەی (الثاء)ە کە و سکونی میمەکە ئەو کاتە ئەبێتە جەمعی(ثَمَرة) وەك(خَشَبَة و خُشُب) ئەویش یانی بەرو بوم، هەندێ تر خوێندوویانەتەوە بە(ثَمَرٌ) بە فەتحی(ثاء) و(میم)ە کە[1].

خاوەنی ئەم دوو باغە وتی بە هاوەڵەکەی کاتێك کە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردو فیزی دەکردو خۆی بە گەورە دەزانی من زۆر سامان دارترم لە تۆو خزمەتکارو کوڕو کاڵیشم لە تۆ زیاترە. قەتادە دەڵێت: سوێند بە خوا ئەوە ئاواتی هەموو کەسێکی بەرەڵڵایە.[2] سەروەت و سامانی زۆرو حەشەمی ئازا.

﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِ أَبَدًا﴾ بەناو باغەکەیدا گەڕاو بۆ خۆی ناهەقی لە خۆی کرد. وتی: هەرگیز پێم وا نیە ئەمەم لە دەست دەربچێت. لە خۆی بایی بوو کاتێك کە ئەو کشتوکاڵو بەروبومو درەختانەی بینیو ئەو ڕوبارانەیش بە ناویاندا دەڕواتو دەگەڕێتو بە هەموو لایەکیدا. وای دەزانی هەرگیز ئەو باغو سامانو دەسەڵاتەی. لەناو ناچێتو هەر دەمێنێتو خراپ نابێتو نافەوتێ، ئەمەیش لە کەم ئاوەزیو بڕوا لاوازیەوە بوو بەرامبەر بە خودا. خەڵەتاوی بە دنیاو ڕازاوەیی دنیاو بڕوا نەبوون بە ڕۆژی دوایی. بۆیە وتی: ﴿وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا﴾ باوەڕ ناکەم قیامەت بێت، ئەگەر هەر براشمەوە بۆ لای پەروەردگارم، دەزانم لەمە چاکترم دەست دەکەوێت. واتە: ئەگەر قیامەتیش هەبوو گەڕامەوە بۆ لای خودا لەوێ شتی چاکترم دەست دەکەوێت لە ئێرە، چونکە ئەگەر من بەڕێز نەبوومایە لە لای خودا، خودا ئەمەی نەئەدامێ. وەك لە ئایەتی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَىٰ﴾[3] واتە: وە ئەگەر گەڕێنرامەوە بۆ لای پەروەردگارمو زیندووبوونەوە هەبوو بێگومان لای

[1] الطبري(١٨/٢١).

[2] الطبري(١٨/٢٢).

[3] فصلت(٥٠).

خودا(پاداشتی) زۆر چاكم هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾[1] واتە: ئەوەت بینی حاشای دەكرد لە نیشانەكانمانو وتی: لێم ڕوونە ماڵو منداڵم هەر دەدەنێ؟ واتە: لە ڕۆژی دوایدا، سوێندیشی لەسەر دەخوات بە خوا، ئەم ئایەتە لەسەر(عاص)ی كوڕی وائل هاتە خوارەوە. وەك لە دوایدا باسی دێت خوا مەیلی لێبێت. هەر ئەویش پشتو پەنایە.

﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّـٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾﴾

### وەڵامی خاوەنباوەڕە هەژارەكە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا﴾ هاوەڵەكەی كە خەریكی گفتوگۆ بوو لەگەڵ ئەودا پێی وت: ئەرێ چۆن تۆ حاشات كرد لەو كەسەی تۆی لە خۆڵ و خاك دروست كردو پاشان هەر لە دڵۆپێك(ئاو) پاشانیش كردویتی بە پیاوێك. خوای گەورە لێرەدا باسی ئەوە دەكات كە هاوەڵە خاوەن باوەڕەكەی چۆن وەڵامی دەداتەوەو ئامۆژگاری دەكاتو سەرزەنشتیشی دەكات لەسەر ئەو بڕوا نەكردنەی بە خواو ئەو لە خۆبایی بوونەی، ئەوەتا پێی دەڵێت: ﴿أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ﴾ ئەمە نارەزایی دەربڕینێكی زۆر گەورەیە لە هاوەڵە بێ ئاینەكەی كە چەندە سپڵەو بێ ئەمەكە بەرامبەر ئەوپەروەردگارەی كە دروستی كردووە، یەكەم جاریش مرۆڤی لە قوڕ دروست كردووە كە ئادەمە(سەلامی خوای لێبێت) پاشان نەوەكانیشی لە ئاوێكی بێزراو وەدی هێنا. وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَـٰكُمْ﴾[2] واتە: چۆن لەو خودایە حاشا دەكەن كە لە نەبوو ژیانی داوە بە ئێوە. واتە: چۆن نكوڵی لە پەروەردگارتان دەكەن كە نیشانەی دەسەڵاتی دیارو ئاشكرایە، هەموو كەسێك بە خۆیدا دەزانێ، هیچ دروست كراوێك نیە مەگین چاك دەزانێ كە لە نەبوو هاتووەتە ژیانی دنیاو بوونیشی بە دەست خۆی نەبووەو كەسێكی تریش لە دروستكراوەكانی خودا ئەوی دروست نەكردووە، چونكە هەموو دروستكراوێك وەك خۆی وایە، هەر خودا خۆی ئاگاداری

---

[1] مریم(٧٧).

[2] البقرة(٢٨).

بوونیەتی کە خوایەکە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خۆی، ئەو وەدیهێنەری هەموو شتێکە بۆیە پیاوە خاوەنباوەڕەکە وتی: ﴿لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا﴾ بەلام من هەر دەلێم کە ئەو خودایەو پەروەردگارمە و کەس ناکەم بە شەریك بۆ پەروەردگارم. واتە: ئەو قسەی تۆ دەیلێیت من نایلێم. من دان دەنێم بە تاكو تەنهایی خوداو هەر ئەو پەروەردگارمە. هەر ئەو پەرستراومەو هاوبەشی نیە، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا﴾ کاتێك چویتە ناو باغەکەت، بۆچی نەتوت: ئەمە بە مەیلی خودایە، توانایش هەر بە خوایە؟ ئەگەر تۆ من دەبینی ئێستە مالو مندالم لە تۆ کەمترە. ئەمە هاندانو هەلنانە بۆ ئەو شتە، واتە: خۆزگە کاتێك کە چویتە باغەکەو سەیرت کرد لەخۆبایی نەبویتایە، بەلکو سوپاسی خوات بکردایە لەسەر ئەو بەهرەیەی کە پێی داوی و مال و مندالی زۆریشی پێ بەخشیوی کە بە زۆر کەسی تری نەداوە. ئەبوایە بتوتایە: ئەمە بە مەیلی خودایەو تواناش هەر بە یارمەتی خودایە، هەر لەبەر ئەمە یە کە لە هەندێ لەپێشینانەوە کە وتویانە: هەرکەس شتێکی خۆی -مال یان منال یان حالی- سەرنجی ڕاکێشا بابلێ: (ماشاء الله لا قوة إلا بالله)، ئەمقسەیەش لە ئایەتەوە وەرگیراوە، لە حەدیسی صەحیحیشدا هاتووە لە ئەبو موساوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی:(ئایا ڕێنمایت بکەم بۆ گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی بەهەشت؟ لا حول ولا قوة إلاّ بالله).[1] واتە: هیچ بەندەیەك ناتوانێت خۆی لە گوناه لادەبات مەگین خودا لایدا لە گوناه، هیچ کەسیش ناتوانێ چاکە بکات مەگین خودا یارمەتی بداتو مەیلی لێبێت، پاشان دەفەرمووێت: ﴿فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ﴾ لەوانەیە پەروەردگارم لەو باغەی تۆم باشتر پێ ببەخشێت، لە ڕۆژی دواییدا و ﴿وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا﴾ بەلایەکیش لە ئاسمانەوە بەسەر باغەکەی تۆ بێنێت لە دنیادا، کەوات دەزانی هەرگیز لەناو ناچێتو هەر دەمێنێتەوە. ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسو قەتادەو زەحاکە[2] لە مالیکیشە وە لە زوهەریەوە کە ئەلێ: ﴿حُسۡبَانٗا﴾ یانی: سزایەك لە ئاسمانەوە. وا دیارە بارانێکی زۆر توندو گەورەی بووە کشتوکالو درەختەکان لەناو بەرێت و لە بن دەریان بهێنێت. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا﴾ واتە: باخەکەت ببێتە دەشتێکی چۆلو قاقرو نەرمو شلو پێ لەسەری نەوەستێو دابچێت، ئیبن عەبباس ئەفەرموێت: وەك ئەو بەردەلانەی هیچی لێ سەوز نابێت[3]. وەك

---

[1] فتح الباري(١١/٢١٧)، مسلم(٤/٢٠٧٦).

[2] الطبري(١٨/٢٥).

[3] الطبري(١٨/٢٦).

خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا﴾ واتە: یان ئاوەکەی ڕۆچوو بە ناخی زەمیندا، ئەو ئاوەی دەچێت بە ناوی زەویدا بە پێچەوانەی ئەو ئاوەیە کە هەڵدەقوڵێت لە ناویدا. ئەو ڕۆدەچێ بۆ خوارەوە ئەم هەڵدەقوڵێت بەرەو سەرەوە، لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ﴾[1] واتە: بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ئاو(ی خواردنەوە)تان ڕۆبچێت بە ناخی زەویدا دەی کێ(بێجگە لە خودا) ئاوی زوڵاڵتان بۆ دەهێنێت. ﴿مَّعِينٍ﴾ زەڵاڵو ڕەوان، لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا﴾،(الغور) چاوگە بە مانای(غائر) خۆ بەخۆ ڕۆ بچێت هاتووە بەڵام بوترێ (غور) ڕەوانترە.

﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾﴾

**ئەنجامی خراپی خوانەناس**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا﴾ هەموو بەرەکەی هەڵوەری و کە بەیانی هاتەناوی دارەکانی گشتی بەسەر یەکدا هاتن، هەر دەستی خۆی دەپرواندو داخ و حەسرەتی هەڵدەکێشا بۆ ئەو ماڵەی تێیدا خەرج کرد، دەیوت: خۆزگە هیچ کەسێکم نەکردایە بە شەریکی پەروەردگارم. مەبەست پێی، ئەو بەڵایەی کە خاوەن باوەڕەکە لێی دەترساند کە لەوانەیە تووشی باغو کشتوکاڵەکەی ببێت کە خۆی پێوە هەڵدەناو فیزی پێوە دەکردو داخو کەسەرێکی زۆری دەخوارد بۆ ئەو هەموو سامانەی لە دەستی چوو، ﴿وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ﴾،[2] واتە: هیچ کۆمەڵێك نەبوو لە عەشیرەت یان کوڕ کەئەو فیزی پێوە دەکردنو خۆی بە خاوەن دەسەڵات دەزانی بەوانەوە ﴿يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ﴾ کە بێتە یارمەتی دەری لەخوار خواوە و بەبێ یارمەتی دەر مایەوە (لەوێدا یاریدەدەر هەر خودای هەقە)، جیاوازی ڕا هەیە لە نێوان خوێنەراندا لێرەدا هەندێ لە ﴿وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ﴾دا دەوەستن. واتە: لەو شوێنەدا کە سزاکەی خودا تێیدا داباریوە، هیچ

[1] الملك(٣٠).

[2] الطبري(٢٧/١٨).

کەسێك نەبووە لەو سزایە ڕزگاری بکات. پاشان لە ﴿ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ﴾ دەست پێ دەکاتەوە بە خوێندن. هەندێکیش لە﴿وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴾دا ئەوەستێ و لە﴿ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ﴾دا دەست پێدەکاتەوە پاشانیش ڕای جیاواز هەیە لەسەر خوێندنەوەی ﴿ٱلْوَلَٰيَةُ﴾ هەندێ واوەکەی مەفتوح کردووە. ماناکەی وای لێ دێت، لەوێدا هەموو کەسێك موسڵمان یان خوانەناس دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا کە خاوەنیەتیو گەردنی بۆ کەچ دەکات، کە سزاکە ڕوویدا. وەك ئەم ئایەتانەی تر کە خودا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ﴾[1] کاتێك دیبیان بەڵای ئێمەیان هاتە سەر وتیان: ئیتر خوای تاكو تەنها دەناسینو لەو شتانەی دەمانوت(شەریکی خودان) حاشا دەکەین. وەك ئەم ئایەتەیش کە خوای گەورە باسی فیرعەون دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾[2] واتە: هەتا ئەو کاتەی خەریك بوو(فیرعەون) بخنکێت ئەوسا وتی بڕوام هێنا کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ئەو(خوایە) نەبێت کە نەوەی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە و منیش لە موسڵمانانم، ئێستا(باوەڕ دێنێت؟) کە بێگومان لەوەو پێش سەرپێچیت کرد وە تۆ لە خراپەکارانو تێکدەران بوویت. هەیشیانە واوەکەی﴿ٱلْوِلَٰيَةُ﴾یان مەکسور کردووە کە ماناکەی ئەوەیە: بڕیاری دروست هەرهی خوایە، هەندێکیش﴿ٱلْحَقُّ﴾ بە مەرفوعی ئەخوێننەوە وەك سیفەتێك بۆ ﴿ٱلْوَلَٰيَةُ﴾کە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ عَسِيرًا﴾[3] واتە: لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایەتی تەنها بۆ خوای میهرەبانە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەختە لەسەر بێباوەڕان. هەندێکی تر حەقیان(الحق) بە تەخفیفی هێناوە لەبەر ئەوەی سیفەتە بۆ خوای گەورە، وەك فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ﴾[4] واتە: پاشان دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خوا کە سەروەری ڕاستەقینەیانە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا﴾ واتە: ئەو کردارانەی کە لەبەر ڕەزای خوایە، پاداشتی باشتر دەداتو ئەنجامەکەیشی چاکترو ڕێکترەو هەمووی هەرخێرە.

---

[1] الغافر(٨٤).

[2] یونس(٩٠ـ٩١).

[3] الفرقان(٢٦).

[4] الانعام(٦٢).

﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا (٤٥) ٱلۡمَالُ وَٱلۡبَنُونَ زِينَةُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ أَمَلٗا (٤٦) ﴾

## نموونەی ژیانی دنیا

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ ئەی موحەمەد(ﷺ) نموونەیان لەسەر ژیانی دنیا بۆ بێنەرەوە سەبارەت بە کۆتایی هاتنو نەمانو لەناوچوونی، ﴿ كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ﴾ وەك ئاوێکە لە ئاسمانەوە دامان باراندبێت هەموو جۆرە ڕووەکێکی تێکەڵو پێکەڵ بەرهەم ئەهێنێ. سەرەنجامیش ئەبێ بە پوش، هەوا پەرش و بڵاوی ئەکات بە ڕاستو چەپداو بە هەموو لایەکدا، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴾ خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، دەتوانێت سەوزیشی بکاتو وشکیشی بکات. زۆرجار خودای مەزن نموونە بە ژیانی دنیا بەم شێوەیە دەهێنێتەوە، وەك لە سورەتی (یونس)دا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ ﴾[1] واتە: بێگومان وێنەی ژیانی دنیا وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە باراندوومانە جا بە هۆی ئەو(بارانەوە ڕووەکی زۆر ڕوواوە) تێکەڵ بووەو بە یەکدا چووە لەوشتانەی کە خەڵکیو ئاژەڵیش دەیخۆن. وە لە سورەتی(الزمر)دا فەرموویەتی: ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥ ﴾[2] واتە: ئایا نەتبینی کە خوا لە ئاسمانەوە بارانی دەبارێنێت(بۆ سەر زەوی) ئەنجا ئەو بارانە دەبات بەناو زەویدا کانیاوەکانی لێ دەردێنێت لە پاشان کشتوکاڵو گژوگیاو گوڵی پێ دەڕوێنێت کە ڕەنگەکانیان جیاوازە. وە لە سورەتی(الحدید)دا فەرموویەتی: ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ﴾[3] واتە: بزانن کە بێگومان ژیانی دنیا تەنها گاڵتەو گەمەو ڕازاندنەوەیەو خۆهەڵکێشانە لە نێوانیانداو لاف لێدانە بە داراییو منداڵی زۆرەوە وەك بارانێك وایە کە حاسڵاتەکەی جوتیاران دڵخۆش بکات. بزانن ژیان لە

[1] یونس(٢٤).

[2] الزمر(٢١).

[3] الحدید(٢٠).

دنیادا هەر زۆربوونی منداڵو سامانتانە. وەك تۆوێك وایە بە هۆی بارانەوە سەراو بووەو بەروبوومەكەی جوتیاران دڵخۆش دەكات. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (ئەم دنیایە خۆشو سەوزە)[1].

**جیاوازی نێوان سامان و ئەو كارە چاكانەی كە دەمێننەوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ واتە: ماڵو منداڵ جوانی ژیانی دنیان، ئەو كارە چاكانەش كەوا دەمێننەوە پاداشتەكەیان لە لای پەروەردگارتەوە گەورەترەو باشتریش جێگەی ئومێدن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە دەفەرمووێت: ﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَـٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ﴾[2] واتە: جوان كراوە بۆ خەڵكی(دنیاپەرست) خۆشیو ئارەزواتی نەفسی لە ئافرەتانو كوڕانو دارایی زۆری كەڵەكەكراو لە ئاڵتونو زێڕو زیوو ئەسپو ماینانی نیشانەدار(بە سپێتی ناوچەوانو هەر چوارپەل)ی زیندەگانیی(ژیان)ی دنیان وە لای خودا هەیە خۆشترین جێی پاشەڕۆژ. ئارەزووی ژیان كردنو كوڕی زۆرو دەستكەوتنی دارایی زۆر بەسەر یەكدا لە زێڕو زیو و ئەسپی بە نیشانەی تایبەتیو مەڕو ماڵاتو زەوی كشتوكاڵ بۆ مەردم ڕازاوەتەوەو لە ژیانی دنیادا مایەی خۆشین، بەڵام وەختێك دێنەوە بەر دەستی خودا، چاك دەزانن كە زۆر لەوە باشتر هەیە، وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَـٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾[3] واتە: ئەو داراییو منداڵانەی هەتانن، مایەی تاقیكردنەوەن، پاداشتێك كە لە لای خودایە ئەوە گەورەترە. واتە: ڕووكردنە عیبادەتی خودا و خۆ یەكلایی كردنەوە بۆی زۆر چاكترە لە خۆسەرقاڵكردن بەوانەوە و بكەونە هەوڵی سامان كۆكردنەوە و سۆز و خۆشەویستی زیادەیان بەرانبەر بنوێنن. بۆیە خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ ئیبنو عەبباسو سەعیدی كوڕی جوبەیرو هەندێ لە زانایانی پێشینە وتوویانە: ﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ﴾ واتە: پێنج نوێژە فەرزەكان.[4] عەتای كوڕی ئەبو ڕەباحو سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێن: لە ئیبنو عەبباسەوە كە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ﴾ واتە: (سبحان الله

---

[1] مسلم(٤/٢٠٩٨).

[2] ال عمران(١٤).

[3] التغابن(١٥).

[4] الطبري(١٨/٣٢).

والحمد لله ولا إله الا الله والله أكبر).[١] هەر بەو شێوەیەش پرسیار کرا لە عوسمانی کوڕی عەفان(ڕەزای خوای لێبێت) کە: ﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ﴾ کامەیە؟ وتی: بریتیە لە:(لا إله الاّ الله وسبحان الله، والحمد لله، والله أكبر ولا حول ولا قوة إلاّ بالله العلي العظيم) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە[٢]. هەروەها ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە خزمەتکارێکی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(بەخ بەخ چەندێ سەنگینن لە ترازوودا، لا اله الاّ الله والله أكبر وسبحان الله والحمد لله و منداڵێکی چاك كە بمرێت باوکی بە هیوای پاداشتێك بێت لەسەری لای خودا و پاشانیش فەرمووی بەخ بەخ بۆ پێنج شتیش کە هەر کەسێك گەیشتبێت بە خودا و بەدڵ بڕوای پێیان بووبێت ئەچێتە ناو بەهەشت، بڕوای بە خودا ببێتو بە ڕۆژی دواییو بە بەهەشتو بە ئاگرو زیندووبوونەوەی دوای مردنو لێپرسینەوە[٣]. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: دەڵێت: ﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ﴾ یادی خودایە کە بریتی یە لە وتنی(لا اله الاّ الله والله أكبر وسبحان الله والحمد لله وتبارك الله ولا حول ولا قوة إلاّ باللهٰ واستغفر الله وصلى الله على رسول الله) ڕۆژوو حەجو خێرو بێرکردنو عەبد ئازادکردنو جیهادو بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیو هەموو کردارێکی چاك ئەوە لە ئاکارە چاکەکانە. وە ئەو کارانەن کە دەمێننەوە بۆ خەڵکەکەی لە بەهەشتدا هەتا ئاسمانەکانو زەمینی مابێت[٤]. عەوفی دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ﴾واتە: قسەی چاك[٥]. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: واتە: هەموو کردەوەیەکی چاك[٦]. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.

﴿ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَـٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَـٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَـٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَـٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَـٰذَا ٱلْكِتَـٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾﴾

[١] الطبري(٣٣/١٨).

[٢] أحمد(٧١/١)، پیاوەکانی جێی متمانەن.

[٣] أحمد(٢٣٧/٤)، پیاوەکانی جێی متمانەن.

[٤] الطبري(٣٥/١٨).

[٥] الطبري(٣٥/١٨).

[٦] الطبري(٣٥/١٨).

**گرنگترین ڕووداوە ناڕەحەتەکانی ڕۆژی قیامەت**

خوای گەورە باسی ڕۆژی قیامەتو ناڕەحەتیەکانی ئەو ڕۆژە دەکات کە چ کارەساتی گەورە تێیدا ڕوو دەدات. وەك لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ۝٩ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا﴾[1] واتە: لەو ڕۆژەدا کە ئاسمان دەجووڵێتو دەکەوێتە هاتوچۆ، هەموو چیاکان لە ڕۆینیدا پەلە دەکەن، واتە: دەڕۆنو لە جێی خۆیان نامێنن. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ﴾[2] واتە: کێوەکانیشت وا دێنە بەر چاو کە هەر ناجولێن، کەچی وەك هەورەکان دەڕۆنو ڕێ دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ﴾[3] واتە: چیاکانیش وەك خوری شیکراوەی لێ دێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ۝١٠٥ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ۝١٠٦ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا﴾[4] واتە:(ئەی موحەمەد(ﷺ)) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە شاخەکان تۆش بڵێ پەروەردگار لە بێخیان دێنیو وردو خاشیان دەکات ئینجا(با) پرژو بڵاویان دەکاتەوە، نابینی تێیدا هیچ جۆرە لاریو بەرزیو نزمیەك. لەسەر کێوەکان لێت دەپرسن، بڵێ: پەروەردگارکەی من هەر بە هاڕین دەیانهاڕێتو دەیانکاتە دەشتێکی کاکی بە کاکی، نە هیچ کەندی تێدا دەمێنێتو نە هیچ کۆسپێك. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە چیاکان تەخت دەبنو نامێننو زەمینیش وەك دەشتێکی بەرینی لێ دێتو تەخت دەبێتو بەرزییو نزمیو کەنو کۆسپی تێدا نامێنێت. نە شیوو نە کێوی تێدەکەوێت بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ ڕووی زەوی بە تەختیو ڕوونی دەبینیو دەشتێکی دیارەو هیچ نیشانەیەکی تێدا نیە بۆ کەسو هیچ شوێنێك نیە کەس خۆی تێدا بشارێتەوە. بەڵکو هەموو خەڵکی لەبەردەم پەروەردگاریاندان و هیچ شتێکیان لای خودا پەنهان نیە، موجاهد دەڵێت: ﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً﴾ جێی خۆ لادانو شاردنەوەی تێدا نیە.[5] قەتادە دەڵێت: درەختو خانووی تێدا نیە.[6] ﴿وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا﴾

---

[1] الطور(٩_١٠).

[2] النمل(٨٨).

[3] القارعة(٥).

[4] طه(١٠٥_١٠٧).

[5] الطبري(٣٦/١٨).

[6] الطبري(٣٦/١٨).

هەموویان كۆدەكەینەوە، بێ ئەوەی واز لە كەسیان بێنین. واتە: لە یەكەم كەسیانەوە تا دواین كەسیان هەموو كۆدەكەینەوە، كەسیان بەجێ ناهێڵین لە گەورە تا بچووك وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ﴾[1] واتە: بڵێ: بێگومان ئەوانەی لە پێشوودا بوون و ئەوانەش لە دوایی هاتوون، بە كۆمەڵ كۆدەكرێنەوە بۆ شوێنێ كە ڕۆژێكی دیاریكراوە. هەروەها فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ﴾[2] كە ڕۆژێكە هەموو مەردم گشت لەوێ كۆدەكرێنەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژێكی دیارو بەرچاوە، لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَعُرِضُوا عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا﴾ لە بەرامبەر پەروەردگارت ڕیز دەكرێن. هەڵدەگرێت مەبەست پێی هەموو خەڵكی لەبەردەم خوادا دەوەستن بە یەك ڕیز. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾[3] واتە: ڕۆژێك كە جوبرەئیلو فریشتەكان هەموو بەڕیز ڕاوەستاون، قسە ناكەن مەگین كەسێك خودا ئیزنی پێدابێت. هەڵیش دەگرێت بە چەند ڕیزێك ڕاوەستابن. وەك فەرموویەتی: ﴿وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا﴾[4] واتە: پەروەردگارت دێتو فریشتەكانیش پۆل پۆل دێن ڕیز دەبەستن. وە فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ واتە: وەك یەكەمجار دروستمان كردن، هەر بەو شێوەیە هاتوونەتە لامان، ئەم سوكایەتی پێكردنو هەڕەشەیە لەو كەسانەی كە بڕوایان نەبووە بە زیندووبوونەوە لەبەردەم ئەو هەموو خەڵكەدا بۆیە خوای گەورە ڕووی قسەیان تێ دەكاتو دەفەرموێت: ﴿بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا﴾ بەڵكو ئێوە واتان دەزانی كاتێك دانانرێت بۆتانو ئەمەتان بەسەردا نایەتو ڕوونادات. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا﴾ دەفتەرەكە دادەنرێت، دەبینی تاوانبارەكان لەبەردەم ئەو تاوان و خراپانەی كە تێیدایە دەترسنو دەڵێن: هاوار لە ئێمە، ئەمە چ دەفتەرێكە هەموو شتێكی وردو درشتی سەر لەبەر تێدا نووسراوە. واتە: دەفتەری كرداریان هەموو شتێكی تێدایە، لە گەورەو بچووكو وردو درشتو بێنرخو لەبەرچاو، ﴿فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ﴾ستەمكاران دەبینی زۆر لە

---

[1] الواقعة(٤٩ـ٥٠).

[2] هود(١٠٣).

[3] النبأ(٣٨).

[4] الفجر(٢٢).

ئەنجامی ئەو کردارە خراپانە دەترسن کەلە کارنامەکانیاندا ئەیبینن، لەوێدا هەناسەی سارد هەڵدەکێشن و ﴿وَيَقُولُونَ يَٰوَيۡلَتَنَا﴾دەڵێن ئەی بەدبەخت خۆین، چەندکەمتەرخەم بووین سەبارەت بە تەمەنی خۆمان، ﴿مَالِ هَٰذَا ٱلۡكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَا﴾چ کتێبێکە هیچ گوناهێکی بەجێ نەهێشتووە لە گەورەو لە بچووكو هیچ کردارێکی لێ ون نەبووە هەموو نووسیوەو پاراستوویەتی چەندە بچوکیش بوبێت، ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرٗا﴾ ئەوسا کردەوەی خۆیانی تێدا دەبینن لە چاکەو لە خراپە، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی:﴿يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا ﴾یانی: ئەو ڕۆژەی هەموو کەسێك چی کردبێت(لەخێر و شەڕ) هەمووی بەئامادەکراوی ئەبینێتەوە، هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾[1] واتە: لەو ڕۆژەدا ئادەمی هەواڵی پێ دەدرێت لەوەی کە پێشی خستووەو دوای خستووە(لە چاکەو خراپە). وە فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ تَجِدُ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ مِنۡ خَيۡرٖ مُّحۡضَرٗا﴾[2] واتە:(بترسن) لەو ڕۆژەی هەموو کەسێ دەبینێت هەر کارێکی باشی کردبێت ئامادەیە. هەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾[3] واتە: لە ڕۆژێکدا هەرچی نهێنیو شاراوەکانە ئاشکرا دەکرێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە و ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەموو ناپاکێك پەرچەمێکی تایبەتی خۆی هەیەو پێی دەناسرێتەوە)[4]. لە هەردوو سەحیحەکەیاندا بوخاریو موسلیم هێناویانە. وە لە وتەیەکی تردا هاتووە:(بۆ هەموو ناپاکێ پەرچەمێك بەرز دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای مسمتی یەوە بە ئەندازەی ناپاکیەکەی، دەوترێت: ئەمە(پەرچەمی) ناپاکی فلانی کوڕی فلانە).[5] ﴿وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا﴾ پەروەردگارت ئەی موحەمەد(ﷺ) ناهەقی لە هیچ کەس ناکات و دادوەری لە نێوان عەبدەکانیدا دەکات لەسەر ئەو هەموو کارانەی کردوویانەو ستەم لە هیچ کەسێك لە دروستکراوەکانی ناکات. بەڵکو دەبوورێتو چاوپۆشی دەکاتو خۆش دەبێتو میهرەبانە لەگەڵیان، مەیلی خۆیەتی سزای هەر کەسێك بدات، دەیدات لە ڕووی کارزانی و دادوەری خۆیەوە، ئاگریش پڕ دەکات لە

---

[1] القيامة(١٣).

[2] ال عمران(٣٠).

[3] الطارق(٩).

[4] أحمد(١٤٢/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري(٣٥٤/١٢)، مسلم(١٣٦١/٣).

خوانەناسان‌و گوناهباران، پاشان گوناهباران لە ئاگر دەردێنێت‌و خوانەناسان بە هەمیشەیی لەناو ئاگردا دەمێننەوە خودا خاوەن دەسەلاتێکە کە ستەم‌و ناهەقی لە هیچ کەسێك ناکات. وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا﴾[1] واتە: بە ڕاستی خوا قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناکات‌و ئەگەر چاکەیەك هەبێت(خودا) چەندانەی دەکاتەوە. هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ﴾[2] واتە: وە ئێمە دادەنێین تەرازووەکانی دادپەروەری (کە کردەوەی پێ دەکێشرێت) لە ڕۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەسێك کەمترین ستەمی لێ ناکرێت با قورسی(کردەوەکەی) بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت دەیهێنین و ئەوەش بەسە کە ئێمە ژمێریاری (کردەوەی بەندەکان) بین. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرن.ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدولای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەقیلەوە کە بیستوویەتی لە جابیری کوڕی عەبدولاوە دەیفەرموو: فەرموودەیەکم پێ گەیشت لە پیاوێکەوە کە لە پێغەمبەری(ﷺ) بیستبوو، منیش وشترێکم کڕی، پاشان بەرەو ئەو پیاوە بەڕێ کەوتم، مانگێك بەڕێ چووم هەتا گەیشتمە لای کە لە شام بوو، ئەو پیاوەش بریتی بوو لە عەبدولای کوڕی ئەنەس، وتم بەو کەسەی لە دەرگاکەدابوو: پێی بڵێ جابیر لەبەر دەرگایە. وتی: کوڕی عەبدولا؟ وتم: بەڵێ، هاتە دەرەوە پۆشاکەکەی بەری کەوتبووە ژێر پێی و دەستی کردە ملم‌و دەستم کردە ملی و پێم وت: فەرموودەیەکیان بۆ باسکردووم لەدەمی تۆوە، کە تۆ لە پێغەمبەری خوات(ﷺ) بیستووە لە بارەی تۆڵەسەندنەوە ترسام کە تۆ بمری یان من بمرم پێش ئەوەی گوێم لێی بێت. ئەنەس فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) دەیفەرموو: (خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی(یان فەرمووی) عەبدەکان کۆدەکاتەوە بە ڕووتی‌و خەتەنە نەکراوی و یەکڕەنگی) وتم: یەکڕەنگی یانی چی؟ وتی: هیچیان لەگەڵدا نیە، پاشان بانگ دەکرێن بە دەنگێك ئەوەی لە دوورەوەیە وەك ئەوەی لە نزیکەوە دەنگەکە دەبیستێ، منم پادشای بەڕاست، منم زاڵ و بەهێز، هیچ کەسێك بۆی نیە لە خەڵکی ناو ئاگر بچێتە ناو ئاگر کە هەقێکی هەبێت لە لای خەڵکی بەهەشت تا هەقەکەی بۆ وەرنەگرمەوە، وە هیچ کەسێك بۆی نیە لە خەڵکی بەهەشت بچێتە ناو بەهەشت کە هەقێکی هەبێت لای خەڵکی ناو ئاگر تا هەقەکەی لێ دەستێنم، با پیاکێشانێکیش بێت. دەڵێت: وتمان: چۆن؟ خۆ ئێمە کاتێك کە دێین بۆ لای خودا بە ڕووتی‌و خەتەنەنەکراوی و یەکڕەنگی

---

[1] النساء(٤٠).

[2] الانبياء(٤٧).

دێین؟ فەرمووی: (هاوڕێن لەگەڵ چاكەكانتانو خراپەكانتاندا)[1]. لە شوعبەوە لە عەووامی كوڕی موزاحیمەوە لە ئەبو عوسمانەوە لە عوسمانی كوڕی عەففانەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(بێگومان ئاژەڵی بێ شاخ (كۆڵ) تۆڵەو هەقی لە شاخدار وەردەگیرێتو دەسێنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا).[2] عەبدوڵای كوڕی ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە فەرموودەی تریش هەیە بۆ شاهیدی ئەم فەرمودەیە لە چەند ڕووی ترەوە.

﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴿٥٠﴾ ﴾

خوای گەورە بەرەی ئادەم ئاگادار دەكاتەوە لە دژایەتی شەیتان بەرامبەر خۆیانو باوكیان لە پێشیانەوە، سەركوتی ئەو كەسانە دەكات كە شوێنی دەكەونو دژایەتی وەدیهێنەرو گەورەكەی خۆیان دەكەن. ئەو خودایەی كە دروستی كردوون بە سۆزو بەزەیی خۆی ڕۆزی داونو بەخێویان دەكات. پاشان دوای ئەمانە هەموو دەبنە دۆستی شەیتانو دژایەتی خودا دەكەنو فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ﴾ كاتێك بە فریشتەكانمان وت، واتە: بە گشت فریشتەكان وەك لە پێشەوە باسمان كرد لە سەرەتای سورەتی(البقرة)دا، ﴿ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ سوژدە بەرن بۆ ئادەم، سوژدەی ڕێز قەدرو بە گەورە سەیر كردن، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴾[3] واتە: كاتێك پەروەردگارت بە فریشتەكانی وت: وا من مرۆڤم لە قوڕە ڕەشەی ترشاوی وشكەڵاتوو دروست كرد، هەر كاتێك ڕێكو پێكم كردو لە گیانی خۆم فووم پیا كرد دەبێت ئێوە زوو سوژدەی بۆ بەرن، ﴿فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ﴾ هەموو سوژدەیان برد شەیتان نەبێت كە لە ڕەچەڵەكی جنۆكە بوو، ڕەچەڵەكەكەی سەری لێتێكدا، چونكە جنۆكە لە بڵێسەی بێ دوكەڵ وەدیهێنراوە، سەرچاوەی دروست بوونی فریشتەیش ڕووناكیە، وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی:(فریشتەكان لە ڕووناكی(النور) دروست كراون، ئیبلیس لە بڵێسەی ئاگری بێ دوكەڵ دروست كراوە، ئادەمیش لەوە دروست كراوە كە بۆتان باس كراوە)[4].

---

[1] احمد(٣/٤٩٥)، پیاوەكانی جێی متمانەن.

[2] زوائد المسند(١/١٢).

[3] الحجر(٢٨ـ٢٩).

[4] مسلم(٤/٢٢٩٤).

هەروایشە لە كاتی پێویستی خۆیدا هەموو دەفرێكەوەی لێدەرژێت كە تیایەتی، سروشتەكەی ئیبلیس خەیانەتی لێكردو لەو كاتە پێویستەدا، ئەوە بوو وەك فریشتەكان هەڵسوكەوتی دەكردو خۆی وەك ئەوان لێكردبوو هەر خەریكی خواپەرستی بوو، بۆیە لەگەڵ فریشتەكاندا ناوی هاتووە، بەڵام ئەو سەرپێچی كردو دەستی دایە دژایەتی كردن، لێرەدا خوای گەورە ئاگاداری كردووین كە شەیتان لە جنۆكەیە، واتە: لە ئاگر دروست كراوە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت كە شەیتان دەڵێت: ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾[1] واتە: من لەو چاكترم منت دروست كردووە لە ئاگرو ئەویشت(ئادەم) لە قوڕ دروست كردووە. حەسەنی بەسری دەڵێت: شەیتان هەرگیز چاوترووكانێك لە فریشتەكان نەبووە، بێگومان شەیتان ڕەسەنی جنۆكەیە، وەك چۆن ئادەم ڕەسەنی مرۆڤە، ئیبنو جەریر ئەمەی ڕیوایەت كردووە بە سەنەدێكی ڕاست لە حەسەنەوە.[2] ﴿فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ﴾ واتە: لە فەرمانی پەروەردگاری سەرپێچی كرد، بە گوێی نەكرد،(الفسق) واتە: دەرچوون، وتراوە: وەختێك میوە لە گۆپكەی (قۆزاخەی) خۆی دێتەدەر پێی ئەوترێت (فسقت الرطبة)، هەروەها ئەوترێ (فسقت الفأرة من جحرها) كاتێك مشك لە كونەكەی دێتە دەرەوە بۆ یاریكردن و شت تێكدان، پاشان خوای گەورە سەرزەنشتو هەڕەشە دەكات لەو كەسانەی كە شوێنی شەیتان دەكەون و بە گوێی ئەو دەكەن وەك ئەفەرمووێ: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى﴾ ئایا ئێوە توخمی شەیتان و تۆرمەی ئەو جگە لە من بە دۆستی خۆتان ڕادەگرن، جا ئەفەرمووێ: ﴿وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا﴾ كە ئەوان بە ئاشكرا دوژمنتانن؟ ئای چ گۆڕینەوەیەكی خراپە بۆ ستەمكاران، ئەم شوێنە وەك ئەو ئایەتانە وایە كە دوای باسی ڕۆژی قیامەتو ناڕەحەتیەكانیو ئاكامی هەردوو دەستەكە بەختەوەرانو بەدبەختان لە سورەتی(یس)دا فەرموویەتی: ﴿وَٱمْتَٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ﴾[3] واتە: ئێوە ئەی تاوانباران ئەمڕۆ جیاببنەوە(لە ئیمانداران)، ئەی نەوەكانی ئادەم ئایا وەسیەتم بۆ نەكردن كە شەیتان مەپەرستن چونكە بە ڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشكرای ئێوەیە، وە(ئایا وەسیەتم بۆ نەكردن) كە من بپەرستن، ئەمە ڕێگای ڕاستە، سوێند بە خوا بێگومان(شەیتان) خەڵكێكی زۆری لە ئێوەی گومڕا كرد دەی ئایا بۆ ژیر نەبوون.

---

[1] ص(٧٦).

[2] الطبري(١٨/٥٦).

[3] یس(٥٩_٦٢).

﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ﴿٥١﴾﴾

**پەرستراوەكانی بتپەرستان دانیان نەناوە بە هیچ شتێكدا كە دروستیان كردبێت، تەنانەت دروست كردنی خۆشیان**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا﴾ ئێمە لەدروستكردنی ئەم ئاسمانانەو ئەم زەمینەدا هیچ پرسێكمان بەوان نەكردووە، تەنانەت بۆ دروستكردنی خۆشیان، هەرگیز ئەوانەی كە ڕێگە لە خەڵكی تێك دەدەن، نەمكردوون بە یاریدەدەری خۆم. خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ئەو كەسانەی ئێوە كردووتانن بە دۆستی خۆتان بێجگە لە من، ئەوانیش بەندەن وەكو ئێوە، خاوەنی هیچ شتێك نین، لە كاتی دروستكردنی ئاسمانەكان و زەمینیشدا ئامادەم نەكردوون و لەو كاتەدا ئەوانە هەر نەبوون، من خۆم هەموو شتێكم دروست كردووەو خۆیشم فەرمانیان پێ دەدەم و هەموو شتێكیان بۆ دیاری دەكەم بە تەنها، كەسم لەگەڵدا نیە نە هاوكارو نە وەزیرو نە ڕاوێژكار و نە هاوێنە، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥ﴾[1] واتە: بڵێ: ئێوە هاوار لەو شتانەی جگە لە خودا بكەن بە خەیاڵ بە پەرستووتان دەزانین، ئەوانە قورسایی مێرووله وردیلەیە دەستیان ناڕوات و لە دروست كردنی ئەم ئاسمانانەو زەمینە بەشیان نەبووەو یارمەتی خودایان نەداوە، وە تكاكردن لای خوا سوودی نیە مەگەر بۆ كەسێك ئەو(خودا) ڕێگە بدات، بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا﴾ واتە: ئەوانەی ڕێگا لە خەڵكی تێك دەدەن نەمكردوون بە یاریدەدەری خۆم. مالیك دەڵێت: ﴿عَضُدٗا﴾ یاریدەدەر.

﴿وَيَوۡمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُم مَّوۡبِقٗا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴿٥٣﴾﴾

**دەستەوسانی و بێتوانایی هاوبەشەكان لە وەڵامدانەوەو ئامادەبوونی تاوانباران بۆ سەرئاگر**

خوای گەورە باسی ئەو بتپەرستانە دەكات لە ڕۆژی قیامەتدا كە چۆن بانگ دەكرێن لەبەر چاوی ئەو خەڵكەدا و سەرزەنشت و ڕیسوا دەكرێن. وەك فەرموویەتی: ﴿وَيَوۡمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ

---

[1] سبأ(٢٢_٢٣).

زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ﴾ ڕۆژێك دێت كە خوا دەفەرموێت بانگی ئەو بتانە بكەن كە لاتان وابوو هاوبەشی منن(یا یارمەتیتان بدەن)، واتە: ئەوانەی لە دنیادا بە هاوبەشی خواتان دەزانین با ئەمڕۆ بێن‌و ڕزگارتان بكەن لەو ناڕەحەتیەی كە تێیدان. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾[1] واتە: هەروەك بە تەنهاو تاك تاك لە پێشوودا ئێوەمان دروست كرد، هەر وایش هاتوونەتەوە لامان، هەرچیش ئێمە پێمان دابوون لە دواتانەوە بەجێما، ئەو كەسانەش نابینن كە لاتان وابوو تكاكارن‌و بە شەریكی خواتان دەزانین، دیارە ئێستا لە یەكتری جیابوونەتەوە چی بە خەیاڵ داتان نابوو، هەمووتان لێ بە هیچ دەرچوو، ئایەتی: ﴿فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ﴾ وەك ئەو ئایەتە وایە كە فەرموویەتی: ﴿وَقِيلَ ادْعُوا شُرَكَاءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ﴾[2] واتە: وە(پێیان) دەوترێ هاوار بكەن لەو بتانەی كە داتان نابوو بە هاوبەشی خوا، ئەوانیش هاواریان لێ دەكەن بەڵام وەڵامیان نادەنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ﴾[3] واتە: كێ گومڕاترە لەو كەسەی كە هاوار لە غەیری خوا بكات كە وەڵامی ناداتەوە تا ڕۆژی دوایی‌و ئەو(هاوارلێكراو)انە لە هاواری ئەوان بێئاگان. وە فەرموویەتی: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا (٨١) كَلَّا سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾[4] واتە: ئەوانە بێجگە لە خوا بڕیاریان داوە بۆ خۆیان چەند پەرستراوێك دابنێن بۆ ئەوەی ئەو پەرستراوانە ببنە یارمەتی دەرو(تكاكار) بۆیان، نەخێر(وانیە) بەڵكو پەرستراوەكان(لە قیامەتدا) نكوڵی لە پەرستنەكەی ئەوان دەكەن‌و دەبنە دژیان‌و بەرپەرچیان دەدەنەوە. لە دوایی ئایەتەكەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا﴾ ئێمە لە نێوانیاندا شیوێكی بڵاومان داناوە. ئیبنو عەبباس‌و قەتادەو كەسانی تریش دەڵێن: ﴿مَّوْبِقًا﴾ كەندێكی فراوان لە نێوانیاندایە[5]. واتە: خوای گەورە ڕوونی كردووەتەوە كە هیچ ڕێگایەك نیە بۆ ئەو بتپەرستانەو هەرگیز ناگەن بەو بتانەی كە

---

[1] الانعام(٩٤).

[2] القصص(٦٤).

[3] الاحقاف(٥).

[4] مريم(٨١ـ٨٢).

[5] الطبري(٤٦/١٨).

دەیان پەرست کەلە دنیادا وایان دەزانی دێن بە هانایانەوە و خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا لە یەکتری جیایان دەکاتەوە، هیچ لایەکیان ڕێگای دەربازبوونیان نیە بۆ لای ئەوی تر. چونکە شیوو کەنارێکی وا کەوتوەتە نێوانیان زۆر ترسناكو کارەساتێکی زۆر گەورەیە، بەڵام ئەگەر زەمیرەکە گەڕایەوە لە(بینهم) دا بۆ خاوەن باوەڕانو خوانەناسان وەك عەبدوڵای کوڕی عەمر(عمرو) دەڵێت: نێوانی خەڵکی شارەزاو گومڕا جیا دەبێتەوە بەو کەنداوە فراوانە[1]. وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەستێ (خەڵك) لەوڕۆژەدا جیادەبنەوە لەیەکتر. وە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾[3] واتە: لەو ڕۆژەدا خەڵکی بڵاوە دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱمْتَٰزُواْ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾[4] واتە: ئەی ئەوانەی تاوانبارن، ئەمڕۆ دەبێت خۆتان جیاکەنەوە، وە فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُواْ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ﴾[5] واتە: (ئەی موحەمەد(ﷺ) باسی بکە بۆیان) ئەو ڕۆژەی هەموویان کۆدەکەینەوە ئینجا دەڵێین بەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە: لە شوێنی خۆتاندا نەجوڵێن و ڕاوەستن خۆتانو بتو پەرستراوەکانتان! ئینجا لێکیان جیادەکەینەوە. لەو ڕۆژەدا کە هەمووان کۆدەکەینەوە، پاشان بەو کەسانە دەڵێین: کە شەریکیان بۆ خودا داناوە، ئێوە لەگەڵ شەریکەکانتاندا لەجێ مەبزوێن، ئەوسا لە یەکیان هەڵادەوێرینو جیادەکەینەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴾ تاوانباران ئاگریان بە چاوی خۆیان بینی، زانیان کە هەر تێی دەکەونو هیچ دەرەتانێکیان نیە. واتە: کاتێك کە تاوانباران بە چاوی خۆیان جەهەنەمیان بینی، هێنراو حەفتاهەزار ڕەشۆی پێوەیە، هەر ڕەشۆیەك حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵدایە. ﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ ﴾ تاوانباران کە ئاگرەکەیان بینی، زانیانو گومانیان نەما کە دەچنە ناوی. لەوێدا خەمو خەفەت دایان دەگرێت لە پێش ئەوەی بڕۆنە ناوی، چونکە سزاو ترسان لێی لە پێش چوونە ناوی ئەوە خۆی

---

[1] الطبري(١٨/٤٦).

[2] الروم(١٤).

[3] الروم(٤٣).

[4] يس(٥٩).

[5] يونس(٢٨).

سزاو جەزرەبەیە. ﴿وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا﴾ واتە: هیچ ڕێگاو دەرەتاکێنی تر نیە ڕووی تێ بکەن‌و خۆیان لەو ئاگرە لادەن، دەبێت هەر بچنە ناوی.

﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾﴾

## هێنانەوەی نموونە لەناو قورئاندا

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا﴾ واتە: ئێمە لەناو ئەم قورئانەدا هەموو جۆرە نموونەیەکمان هێناوەتەوە بۆ خەڵکی مرۆڤ لە هەموو شتێك زیاتر حەزی لە مشتومڕکردنە. خوای گەورە لێرەدا دەفەرموویت: ئێمە لەناو ئەم قورئانەدا زۆر شتمان ئاشگراو ڕوون کردووەتەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی هەق ون نەکەن‌و لە ڕێی ڕاست دەرنەچن لەگەڵ ئەم هەموو ڕوون کردنەوەو جیاکردنەوەی هەق‌و ناهەقیەدا، مرۆڤ هەر بەردەوام خەریکی مشتومڕو ململانێکردنە بەرامبەر بە هەق بە شتی پڕوپوچ‌و بێ سوود، مەگین کەسێك خودا شارەزای کردبێت‌و چاوی کرابێتەوە بەرەو ڕێگای نەجات‌و سەرفرازی، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زوهەریەوە لە عەلی کوڕی حەسەنەوە لە حوسەینەوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە کە هەواڵی پێداوە کە پێغەمبەری خوای(ﷺ) خەبەریکردەوە و هەڵیساندو فەرمووی: (ئایا هەڵناسن نوێژ بکەن؟) منیش وتم: دەرونمان بە دەستی خودایە، ئەگەر مەیلی لێبێت خەبەرمان بکاتەوە، دەمانکاتەوە، کاتێك کە من ئەو قسەیەم کرد ڕۆیشت‌و هیچ قسەی لەگەڵدا نەکردم‌و وەڵامی نەدامەوە، پاشان گوێم لێی بوو کە پشتی هەڵکردبوو دەیدا بە ڕانیداو دەیفەرموو: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا﴾[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە[2].

﴿وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُواْ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوًا ﴿٥٦﴾﴾

---

[1] أحمد(١/١١٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري(٣/١٣)، مسلم(١/٥٣٨).

**باسی یاخیبوونی خوانەناسان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُواْ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴾ ئەوەی نەیهێشت کە ئەو خەڵکە(پاش هاتنی ڕێنیشاندەر بڕوا بێنن‌و داوای لێبووردن لە پەروەردگاریان بکەن، ئەوە بوو کە چاوەڕوان بوون یا بە دەردی ئەوانەی پێشوویان بچن، یان ڕووبەڕوو جەزرەبەیان بۆ بێت. خوای گەورە لێرەدا باسی سەرکەشی‌و یاخیبوونی خوانەناسان دەکات، لە دێرزەمانەوەو لە ئێستایشدا، کە چۆن بڕوایان نەهێناوە بەو هەقە ڕوون‌و ئاشکرایە لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە زۆرانە لەبەر چاوی خۆیان دەبینن، ئەوەی وای لێکردوون شوێنی ئەو هەقە نەکەون، داواکردنیان بووە بۆ دابارینی ئەو جەزرەبەیە کە هەڕەشەیان لێکراوە و ویستویانە بۆیان بێت، وەك چۆن ئەوانە بە پێغەمبەرەکانی خۆیان وتووە: ﴿ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾[1] واتە: چەند پارچەیەك لە ئاسمان بخەرە خوارەوە بەسەرماندا ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی. هەندێ تریان وتوویانە: ﴿ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾[2] واتە: سزای خوامان بۆ بێنە ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی. قورەیشیەکان ئەیانووت: ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾[3] واتە: ئەی پەروەردگار! ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە یان سزای سەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە. هەروەها ئەیانوت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ۝٦ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾[4] واتە: (بێباوەڕان) وتیان ئەی ئەو کەسەی کە قورئان نێردراوەتە خوار بۆ سەرت بە ڕاستی تۆ شێتی، دەی بۆ فریشتەمان بۆ ناهێنی(شایەتی بدات تۆ پێغەمبەری) ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت. زۆر ئایەتی تریش لەم بارەیەوە هاتووە، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی:﴿إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ ئیمان ناهێنن تائەوەی بەسەر میللەتەکانی پێشودا هاتووەبەسەر ئەمانیشدا نەیەت و تیابچن، یان: ﴿أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴾ یان ڕووبەڕوی سزا ببنەوە و لەبەرانبەریدا دابنرێن، پاشان خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ

---

[1] الشعراء(١٨٧).

[2] العنكبوت(٢٩).

[3] الانفال(٣٢).

[4] الحجر(٦-٧).

﴿إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ﴾ كە پێغەمبەران دەنێرین، هەر ئەوەندەیان لەسەرە مژدەدەرو ترسێنەر بن. خوانەناسان هەر بە ناهەق چەقە دەکەن تا هەقی پێ لە بەین بەرن. واتە: پێش سزادان مژدە دەدەن بەوانەی کە بڕوایان پێ دێنن، ئەو کەسانەش دەترسێنێت کە بڕوایان پێ ناکەن‌و دژایەتیان دەکەن. پاشان باسی خوانەناسان دەکات کە مشتومڕ دەکەن هەتا ئەو هەقەی کە پێغەمبەران بۆیان هێناون لاوازی بکەن بەڵام خەیاڵیان خاوە، ئەوەی ئەوان نیازیانە هەرگیز نایەتەدی بۆیان. ﴿وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَمَآ أُنذِرُوا۟ هُزُوًا﴾ ئەوانە نیشانەکانی ئێمەو ئەو کتێبەی کە ترسی وەبەر ناون هەر بە گاڵتەو گەپی دەزان. واتە: ئەو ئەو هەموو نیشانەو موعجیزانەی کە پێغەمبەران بۆیان هێناون‌و ترساندوونیان لە سزای خودا کە بۆیان بێت بە درۆی دەزانن‌و گاڵتەی پێ دەکەن زۆر بە شێوەیەکی خراپ‌و ناشیرین.

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا۟ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا۟ مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾﴾

## ستەمکارترین کەس ئەو کەسەیە پاش ئەوەی بەڵگەی بۆ هێنرایەوە پشت هەڵیکات

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە چەند نیشانەی پەروەرینی بۆ خوێنرایەوە گوێی نەدایەو ئەوەشی لە بیر بردەوە کە لە پێشدا کردویەتی، ئێمە پەردەمان بەسەر دڵیاندا هەڵکێشاوە کە تێ نەگەن، گوێشمان ئەوەندە گران کردوون کە نەبیسن، چەند هەوڵ بدەی شارەزای ڕێگەیان بکەی، هەرگیز بۆت ناکەونە سەر ڕێ. ئەمە یانی: کێ لەو کەسە ستەمکارترو خراپترە کە نیشانەکانی خودای بۆ باس بکرێت گوێی بۆ نەگرێت‌و پشتی تێ بکات‌و لە بیری خۆیی بباتەوەو هیچ گرنگیەکی پێ نەداو بە سوک سەیری بکات، ﴿وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ﴾ ئەوەیش لە پێشا کردوویەتی لە کرداری خراپ‌و ڕەوشتی ناشیرین حیسابی بۆ نەکات، ﴿إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ﴾ ئێمە چەند پەردەی ئەستورمان داوە بەسەر دڵیاندا، بۆ ئەوەی لەم قورئانە شارەزا نەبن‌و سودی لێ وەرنەگرن، ﴿وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن

يَهْتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدًا ﴾ گوێشمان ئەوەندە قورس کردوون(تا ڕاستی نەبیسن)، ئەگەر بانگیان بکەی بۆ سەر ڕێگای ڕاست، هەرگیز شارەزا نابن. پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ﴾(ئەی موحەمەد(ﷺ)) پەروەردگارت گوناه بەخش‌و دلۆڤانە، ئەگەر هەر کەسێك کاری خراپی بکردایە و یەکسەرە خوا بیگرتایە، بێگومان بە پەلە سزای سەختی بۆ ئەمانیش دەنارد، وەك لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾[1] واتە: وە ئەگەر خوا قار بگرێت لەخەڵکی و تۆڵەیان لێ بسێنێت لەبەر ئەو(خراپانەی) کردوویانە هیچ گیاندارێکی بەسەر زەویەوە نەدەهێشت. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلْمِهِمْ ۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾[2] واتە: بە ڕاستی پەروەردگارت خاوەنی لێبوردنە بۆ خەڵکی گەرچی ستەمکاریش بن هەروەها بە ڕاستی پەروەردگارت تۆڵەسێنێکی توندو تیژە. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، پاشان خوای گەورە باسی بە سۆزی‌و چاوپۆشی‌و دلۆڤانی‌و لێبودەیی خۆی دەکات، کە لەوانەیە هەندێ لەو خەڵکە لە گومڕایی لابدات‌و شارەزای بکات بۆ ڕاستەڕێ‌و ئەوانەیش کە کۆڵ نادەن‌و بەردەوام دەبن لەسەر خراپەو تاوان کردن لەو ڕۆژەدا کە منداڵ سەری تێیدا سپی دەکات‌و هەموو ئافرەتێکی سك پڕ سکەکەی فڕێ دەدات جەزرەبەی سەختیان دەدا، ﴿بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴾ بەڵام بۆ(سزادانی) ئەوان کاتێکی دیاری کراو هەیە ناتوانن خۆیان لێی ڕزگار بکەن، پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُواْ ﴾ ئەو شارانەیش کاتێك کە دەستیان دایە ناهەقی کردن، قڕمان تێخستن، واتە: قڕمان خستە گەلە پێشینەکان لەبەر لاساری‌و خوانەناسیان، ﴿وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴾ بۆ لەناوبردنیان، کاتێکی دیاری کراومان دانا. بێ زیادو کەم، واتە: ئێوەیش ئەی بتپەرستان چاك بزانن کە چارەنووسی ئێوەیش هەر وەك ئەوانەدەبێت، ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئەو خوانەناسیەو بڕوا نەکەن بەو پێغەمبەرە کە بەڕێزترین‌و گەورەترین پێغەمبەرە، ئێوە لەوانەی کە لە پێشدا لەناوچوون بەڕێزتر نین لای ئێمە، کەواتە لە سزاو تۆڵەو هەڕەشەی خودا بترسن.

---

[1] الفاطر(٤٥).

[2] الرعد(٦).

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ ﴾

**بەسەرهاتی موسا پێغەمبەر و (خضر)ی پیاو چاك**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴾ جارێ موسا بەو لاوەی بەردەستی خۆی وت: من لێبڕاوم سەفەر بکەم تا دەگەمە شوێنی گەیشتنی هەردوو دەریاکە، یان ماوەیەکی دوورودرێژ دەڕۆم. هۆکاری ئەو قسەی کە موسا وتی بە لاوەکەی بەردەستی کە ناوی یوشەعی کوڕی نون بوو. ئەوە بوو پێی وت: کە عەبدێك لە عەبدەکانی خودا لە شوێنی گەیشتنی دوو دەریاکەدایە، هەندێ زانیاری لایە کە ئەو واتە:(موسا) هیچ زانیاریەکی نیە لە بارەیەوە، حەز دەکات بە ڕێکەوێت بۆ لای. وتی بە لاوەکە ﴿لَآ أَبْرَحُ﴾ من لێبڕاوم و کۆڵ نادەم هەر دەڕۆم ﴿حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ﴾ هەتا دەگەمە شوێنی گەیشتنی هەردوو دەریاکە ﴿أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا﴾ واتە: با ئەو ماوەیەش ڕۆژگارێکی زۆری پێ بچێت. ئیبنو جەریر(ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت: هەندێ لە زانایانی زمانی عەرەبی وتوویانە:(الحقب) لە زمانی قەیسیەکاندا یەك ساڵە.[1] پاشانیش ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە وتوویەتی: (الحقب) هەشتا ساڵە[2]. موجاهید دەڵێت: حەفتا پایزە[3]. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا﴾ عەیامێك[4]. قەتادەو ئیبنو زەیدیش هەر وایان گوتووە.[5] ﴿ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا﴾ وەختێك گەیشتنە ئەو جەمسەرە ماسیەکەیان لە بیر چوو. مەسەلەکەس ئەوەیە کە موسا(سەلامی خوای لێبێت) فەرمانیدا بە لاوەکە ماسیەکی خوێکراو هەڵگرێت و پێی وت: کەی ماسیەکە ون بوو، ئەو

---

[1] الطبري(١٨/٥٦).

[2] الطبري(١٨/٥٦).

[3] الطبري(١٨/٥٦).

[4] الطبري(١٨/٥٧).

[5] الطبري(١٨/٥٧).

پیاوەی مەبەستمان لەو شوێنەدایە، ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە جەمسەری دوو دەریاکە، لەوێدا کانیەك هەبوو پێیان دەوت (کانی ژیان)، لەوێ خەویان لێکەوت ماسیەکە پرشی ئەو ئاوەی بەرکەوت، لەناو سەبەتەکەدا کە بە یوشع بوو جوڵەجوڵی دەست پێکردو لەناو سەبەتەکەدا هەڵبزیداو خۆی هەڵدایە ناو دەریاکە، کە یوشع خەبەری بووەوەو ماسیەکە لەناو ئاوەکەدا خەریك بوو دەڕۆیشت وەك بەناو ڕێگایەکدا بڕوات وابوو ئاوەکە لە دوایەوە لەت دەبوو نەدەلکایەوە بە یەکدا! بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلۡبَحۡرِ سَرَبًا﴾ ماسیەکەش بە هەڵبزوینێك خۆی گەیاندە ناو دەریاکە. واتە: وەك تراویلکەی سەر زەمین. ئیبنو جورەیج ئەڵێ: ئیبنو عەبباس ئەڵێ: شوێنەوارەکەی وەك شوێنی بەردی لێ هات[1]. محمدی کوڕی ئیسماعیلیش لەئیبن عەباسەوە ئەویش لەئوبەی کوڕی کەعبەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك ئەمباسەی بۆگێڕانەوە، فەرمووی: شوێنەواری ماسی یەکە نەیاندایەوە لەیەك وەك تاقێك ئەینواند تاموسا گەڕایەوە و ڕێڕەوی ماسی یەکەی بینی و ووتی: ﴿ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِ﴾ئەمە ئەوەیە کەئێمە بەدوایدا دەگەڕێین. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا جَاوَزَا﴾ جا کاتێك تێپەڕین(لەو شوێنەی کە ماسیەکەیان لەبیر چوو) لەبیرچوونەکەی داوەتە پاڵ هەردووکیان، هەرچەندە یوشع لەبیری چووبوو، وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ﴾[2] واتە: لە هەردووکیان مرواریو مەرجان دەردەچوو، واتە: لە دەریا شیرینەکەو دەریا سوێرەکە (تفت)، بەڵام ڕایەك لەو دوو ڕایە دەڵێت: مرواری لە دەریا تفتەکە پەیدا دەبێت، کاتێك لەو شوێنەی کە ڕۆیشتنو ماسیەکەیان تێدا لەبیر چوو بە قۆناغێك. ﴿قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾ موسا بە بەردەستەکەی وت: لەم سەفەرە زۆر ماندوو بووین، خواردنەکەمان بۆ بێنە، ﴿قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥ﴾ لاوەکە وتی: دیتت چۆن ماسیەکەم لەبیر چوو؟ دیارە شەیتان نەیهێشت وەبیرم بێتەوە، بۆیە وتی: ﴿وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلۡبَحۡرِ عَجَبًا﴾ ئەمیش وەك شتێك سەیر ڕێگەی دەریای گرتەبەر، ﴿قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا﴾ موسا وتی: ئێمەیش ئەوەمان دەویست، ئینجا بە شوێنی خۆیاندا بەچاوگێڕان، گەڕانەوە. بەجێ پێی خۆیانداو شوێن پێکانیان کوێر بووەوەو نەمابوو، ﴿فَوَجَدَا عَبۡدًا مِّنۡ عِبَادِنَآ

[1] الطبري(١٨/٥٨).

[2] الرحمن(٢٢).

ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾ئەوسا تووشیان هات بە تووشی عەبدێك لە عەبدەكانی ئێمەوە، كە بەربەزەیی خۆمان خستبوو، زانیاریشمان لە خۆمانەوە پێدابوو، ئەو عەبدە(خضر) بوو سەلامی خوای لێبێت، وەك فەرموودەی سەحیح هاتووە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) كە خزر بووە، بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە سەعیدی كوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: بە ئیبنو عەباسم وت: نەوفەلی بەكالی وا دەزانێت كە موسای هاوەڵی خزر(سەلامی خوای لێبێت) ئەو موسای هاوەڵی نەوەی ئیسرائیل نیە، ئیبنو عەبباس دەڵێت: درۆی كردووە دوژمنی خوا، ئوبەی كوڕی كەعب بۆی گێڕاینەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت: كە گوێی لە پێغەمبەری خوا بووە(ﷺ) دەیفەرموو: (موسا هەڵساو وتارێكی دا بۆ نەوەی ئیسرائیل، پرسیاریان لێكرد: چ كەس زۆر زانایە؟ فەرمووی: من. خوای گەورەیش گلەیی لێكرد لەبەر ئەوەی زانیایەكەی نەگێڕایەوە بۆ لای خوا. خوای گەورە ئاگاداری كرد. من عەبدێكم هەیە لە جەمسەری هەردوو دەریاكەدا لە تۆ زاناترە. موسا وتی: ئەی پەروەردگارم چۆن دەتوانم پێی بگەم؟ فەرمووی: ماسیەك لەگەڵ خۆت هەڵدەگریو بیخە ناو سەبەتەیەكەوە لە هەر شوێنێكدا ماسیەكەت ون كرد، ئەوە ئەو كەسە لەوێیە، ماسیەكی هەڵگرتو نایە ناو سەبەتەیەك و دەرچوو، لاوەكەیشی لەگەڵی خۆی برد كە یوشەعی كوڕی نون بوو (سەلامی خوایان لێبێت) هەتا ئەو كاتەی كە گەیشتنە لای بەردەكەو سەریان خستە سەریو خەویان لێكەوت، ماسیەكە كەوتە جوڵەجوڵ لەناو سەبەتەكە هاتە دەرەوەو كەوتە دەریاكە، ڕێگای خۆی گرتەبەرو دەریاكەی دەبڕی وەك وشكانی دەبڕی، خوای گەورە ئاوەكەی گرتو بۆ ماسیەكەی وەستاند و نەدەڕۆیشتو وەك تاقێكی لێكرد، كاتێك موسا(سەلامی خوای لێبێت) هەڵسا هاوەڵەكەی لە بیری چوو هەواڵی ماسیەكەی بداتێ(كە نەماوە) ڕۆژو شەوێك ڕێیان كرد، لە ڕۆژی دوایدا موسا وتی بە لاوەكە: ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا﴾ موسا هیچ ماندووبوونێكی پێوە دیار نەبوو هەتا لەو شوێنەی كە خوا فەرمانی پێ كربوو تێپەڕی. بەردەستەكەی پێی ووت: ﴿أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا﴾ ماسیەكە ئاوەكەی لەت دەكردو وەك خۆی لێ نەدەهاتەوە، موساو بەردەستەكەیش سەریان سوڕمابوو، ﴿قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا﴾ وتی: بە شوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە هەتا گەیشتنەوە لای بەردەكە، لە پڕ چاویان كەوت بە پیاوێك پۆشاكێكی لە خۆیەوە پێچابوو، موسا سڵاوی لێكرد، خزر وتی: لەم سەر زەمینەی تۆدا سەلامەتی كواهەیە؟ وتی: من موسام، وتی: موسای نەوەی ئیسرائیل؟ وتی: بەڵێ، جا وتی: من هاتووم بۆ لای تۆ تا ئەو زانستەی فێركراوی منیش وەك خۆت ڕابێنی، ﴿قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا﴾ وتی: تۆ ناتوانی هەرگیز لەگەڵ

من دەربەری و خۆ بگری. ئەی موسا من خودا لە زانیاری خۆی هەندێ زانیاری فێرکردووم تۆ نایزانی، وە تۆیش خودا لە زانیاری خۆی هەندێ زانیاری فێرکردووی من نایزانم، موسا وتی: ﴿قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا﴾ ئەگەر خودا حەز بکات، بە خۆڕاگری دەمبینی و هیچ نافەرمانیەکت ناکەم، خزر پێی وت: ﴿فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا﴾ ئەگەر شوێنم کەوتی، هیچ شتێکم لێ مەپرسە، هەتا خۆم دەربارەی باست بۆ دەکەم، دەرچوون و بە کەنار دەریاکەدا دەڕۆیشتن، کەشتیەك تێپەڕی، قسەیان لەگەڵ کردن تا هەڵیان گرت، خزریان ناسی و هەڵیان گرت بەبێ ئەوەی هیچیان لێ وەرگرن، کاتێك سواری کەشتیەکە بوون، هەر گەیشتنە ناوی خزر لەوحێکی لە لەوحەکانی کەشتیەکە لێکردەوەو هەڵی کەند، موسا پێی وت: بەبێ ئەوەی داوای هیچیان لێبکەن سواریان کردین، کەچی تۆ پەلاماری کەشتیەکەیانت داو کونت تێ کرد تا خەڵکەکەی نوقم بکەی لە ئاودا، بە ڕاستی کارێکی خراپت کرد، ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ وتی ئاخر من بە تۆم نەوت: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆ ڕابگری؟ ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا﴾ وتی: ئەمەی لەبیرم چوو لێم ببوورەو زۆر بە گران لێم مەگرە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(یەکەمجار موسا کە پرسی لە بیری چووبوو). وتی: چۆلەکەیەك هات و لە تەنیشت کەشتیەکە نیشتەوە، دەنوکێ یا دوو دەنوکی دا لە دەریاکە، خزر بە موسای وت: ئەندازەی زانیاری من و تۆ لەچاو زانیاری خودادا مەگێن وەك کەم کردنەوەی(ئەم ئاوەیە) ئەم چۆلەکەیە لەم دەریایە کەمی کردەوە پاشان لە کەشتیەکە هاتنە دەرەوە، وەختێك لە کەنار دەریاکەدا دەڕۆیشتن خزر منداڵێکی بینی لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد، خزر سەری گرت و سەری هەڵکێشاو کوشتی، موسا پێی وت: ﴿أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا﴾ چۆن گیانێکی پاکت کوشت کە بێ ئەوەی کەسی کوشتبێت؟ کارێکی زۆر نابەجێت کرد. ﴿قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا﴾ وتی: نەموت ناتوانی لەگەڵ من هەڵکەی. وتی: ئەم جارەیان توندتر بوو قسەکانی لە جاری یەکەم. ﴿قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ٧٦ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا﴾ وتی: ئەگەر پاش ئەم جارە هیچ شتێکم لە تۆ پرسی، هاوڕێیەتیم مەکەو هیچ گلەیشت لێ ناکەم، دیسان ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنە خەڵکی شارێك، خواردنیان لێ داوا کردن، ڕازی نەبوون خواردنیان بدەنێ، دیوارێکیان لەوێ چاو پێکەوت، خەریك بوو دەتلایەوە(خزر) ڕاستی کردووە، موسا وتی: ئەگەر داوات بکردایە کرێی ئەم

کارەت وەردەگرت، خزر پێی وت: ﴿ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴾ ئەوا لە یەکتر جیادەبینەوە، وا ئێستا نهێنی ئەو ڕووداوانەت بۆ باس دەکەم، کە نەتدەتوانی خۆ بگری. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (پێمان خۆش بوو موسا خۆی بگرتایە، هەتا خودا بەسەرهاتەکەیانی بۆ باس دەکردین). سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ئیبنو عەبباس ئەم ئایەتانەی بەم شێوەیە دەخوێندەوە (وكان أمامهم ملك يأخذ كل سفينة صالحة غصباً، وأما الغلام فكان كافراً وكان أبواه مؤمنين)[1]. پاشان بوخاریش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کردووە ئەمەیشی تێدا باس کردووە. موسا دەرچوو کوڕە لاوەکەیش(یوشەعی کوڕی نونی) لەگەڵدا بوو ماسیەکەیشیان پێ بوو، هەتا گەیشتنە بەردەکە، لە لای بەردەکەدا دانیشتن، موسا سەری داناو خەوت. دەڵێت: لەناو بەردەکەدا کانیەك(عین) هەبوو پێی دەوترا ئاوی ژیان(الحیاة)، ئاوەکە بەری هەر شتێك بکەوتایە مەگین زیندوو دەبووەوە، ئاوی ئەو کانیە بەری ماسیەکە کەوتو دەستی کردە جوڵەجوڵ و لە سەبەتەکە هەڵبزواو چووە ناو دەریاکە، کاتێك کە موسا لە خەو هەڵسا بە بەردەستەکەی وت: ﴿ءَاتِنَا غَدَآءَنَا﴾ ئیتر هەموو فەرموودەکەی باسکرد کەچۆلەکەکە لە کەناری کەشتیەکەوە نیشتەوەو دەنوکی کرد بەناو دەریاکەداو خزر وتی بە موسا: زانیاری منو تۆو هەموو دروستکراوەکانی تریش لە چاو زانیاری خودادا مەگین بە ئەندازەی نوقم بوونی ئەو چۆلەکەیە(لە دەریاکەدا) پاشان فەرموودەکەی بە تەواوی بەو شێوەیە باس کرد.[2]

﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾﴾

### گەیشتنی موساو خزر بە یەك و هاوڕێیەتی کردنی موسا لەگەڵ خزردا

خوای گەورە باسی قسە و بەسەرهاتی موسا دەکات کە داوای کرد لەو پیاوە زانایە(کە خزر بوو) خوا ئەو پیاوەی کە تایبەتمەندی کردبوو بەزانیاریەکەوە کە موسا هیچی لێ نەدەزانی وەك چۆن موسایشی شارەزا کردبوو لە زانیاریەکدا کە نەیدابوو بە خزر، ﴿قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ﴾ موسا پێی وت: ئاخۆ دەتوانم دوات کەوم، داوایەکی پڕ سۆزو میهرەبانی بوو، نەك بە شێوەی فەرماندان بەسەریداو ناچارکردنی، داوای خوێندکاریش هەر دەبێت بەو شێوەیە بێت لە زانا، ﴿عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا

[1] فتح الباري(٨/٢٦٢).

[2] فتح الباري(٨/٢٧٦).

عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾ لەو زانستەی کە فێرکراوی منیش وەك خۆت ڕابێنی، بە هۆی ئەو زانستەوە کاروبارەکانم بەجێ بێنم لە زانستی بەسوودو ئاکاری چاك، ﴿قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ تۆ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕابگری، لەبەر ئەو کارانەی من دەیکەم کە دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەو پەیامەی تۆدا، چونکە من هەندێ زانیاریم لایە خودا فێری کردووم، خوا تۆی فێر نەکردووە، تۆیش هەندێ زانیاریت لایە خودا فێری کردووی، خودا منی فێری ئەو زانیاریە نەکردووە، هەر یەکێك لە منو تۆش خودا ئەرکێکی داوە بەسەریدا، لە ئەرکی هاوەڵەکەی ناچێت، تۆ ناتوانی هاوڕێیەتی من بکەی، ﴿وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا﴾ تۆ چۆن خۆت دەگری لەسەر شتێك کە لە ڕازو نهێنی ئەو شتە ئاگادار نیت، من دەزانم تۆ ناڕەزایی دەردەبڕی لەو شتانەی کە بە لاتەوە گرانە دەکرێت، بەڵام تۆ لەو حیکمەتو بەرژەوەندیە نهێنیانە ئاگادار نیت، کە من ئاگادارم لێیو تۆ نایزانی. ﴿قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِي لَكَ أَمْرًا﴾ موسا وتی: ئەگەر خوا مەیلی لێبێت بە خۆڕاگری دەمبینیو هیچ نافەرمانیەکەت ناکەم، لەسەر ئەو کارانەی دەیبینم دەیکەیو لە هیچ شتێکدا بێ گوێیت ناکەم، ئا لەوێدا خزر مەرجی لەسەردانا، ﴿قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْـَٔلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا﴾ وتی: ئەگەر شوێنم کەوتی، هیچ شتێکم لێ مەپرسە، هەتا خۆم دەربارەی باست بۆ دەکەم، پێش ئەوەی تۆ پرسیارم لێبکەی.

﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ۖ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ ﴾

### بەسەرهاتی کون کردنی کەشتیەکە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا ۖ قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا﴾ ڕۆیشتن تا هەردوو سواری کەشتیەك بوون کونی تێکرد، وتی: هەر بۆیە کونت کرد خەڵکەکەی لە ناو نوقم بکەی؟ کارێکی ناشیرینت کرد، خوای گەورە لێرەدا باسی موساو هاوەڵەکەی خزر دەکات کە هەردووکیان ڕۆیشتن پاش ئەوەی ڕێکەوتن کە هاوڕێیەتی یەکتر بکەن. خزر مەرجی لەسەر موسا دانا کە نابێت پرسیاری لەو شتانە لێ بکات کە لێی ڕازی نیە هەتا خۆی بۆی باس دەکاتو ڕوونی دەکاتەوە بۆی، سواری کەشتیەکە بوون، لەو فەرموودەی پێشەوەدا باسمان کرد کە چۆن سواری ئەو کەشتیە بوون خەڵکی ناو کەشتیەکە خزریان دەناسی، بێ ئەوەی کرێی لێ وەرگرن هەڵیان گرتن، وەك ڕێزلێنانێك لە خزر، کاتێك کەشتیەکە کەوتەڕێ لەناو دەریاکەدا کەوتە ناو شەپۆلی

دەریا، خزر هەڵساو كونی تێكرد، لەوحێك لە لەوحەكانی دەرهێناو پاشان پینەی كرد، موسا خۆی بۆ نەگیراو ناڕەزایی خۆی دەربڕی لەو كارەی كە كردی. وتی: ﴿أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا﴾ كارێكی ناشیرینت كرد، موجاهید دەڵێت:(منكرا) واتە: ناپەسەند.[١] قەتادە دەڵێت:(منكراً) واتە سەیرو سەمەرە.[٢] ئا لەو كاتەدا ئیتر خزر ئەو مەرجەی لەسەر موسای دانابوو، وەبیری هێنایەوە: ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ وتی: ئایا پێم نەوتی: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆڕابگری؟ واتە: ئەو كارەی كردت بە ویستی خۆت بوو، ئەویش یەكێك لەو شتانەیە كە بە مەرجم دانا لەگەڵتاندا، كە ناڕەزایی دەرنەبڕی لێم تێیدا، چونكە تۆ لە نهێنی ئەو شتە ئاگادار نیت. ئەمەیش بەرژەوەندیەكی ترە كە تۆ نایزانی. ﴿قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا﴾ موسا وتی: لەمەی كە لەبیرم چوو لێم ببوورەو زۆر بە سەخت لێم مەگرە. واتە: تەنگم لێ هەڵمەچنەو زۆر گرانی مەكە لە سەرم، بۆیە لە پێشەوە لە فەرموودەیەكدا باسمان كرد كە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(یەكەم جاری موسا لەبیرچوونەوە بوو). واتە: كە ناڕەزایی دەربڕی لەو كارەی خزر كردی(سەلامی خوای لێبێت).

﴿فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴿٧٦﴾﴾

**بەسەرهاتی كوشتنی كوڕە لاوەكە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَانطَلَقَا﴾ دوای ئەوە بەڕێ كەوتن، ﴿حَتَّىٰ إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ﴾ واتە: تووشی منداڵێكی بچووك هاتن‌وخزر دەمودەست كوشتی، لە پێشەوە باسمان كرد كە ئەو منداڵە لەگەڵ منداڵی دێیەك لەو دێهاتانەدا سەرگەرمی یاری كردن بوو لەگەڵ هاوەڵەكانی، لە هەموویان چاكترو جوانترو ڕووخسار شیرینتر بوو، كاتێك موسا ئەو بەسەرهاتەی بینی، زیاتر بێزاری خۆی دەربڕی لەوەی پێشوو زیاتر، خێرا وتی: ﴿أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً﴾ واتە: چۆن گیانێكی پاكت كوشت كە هێشتا باڵغ نەبووەو هیچ تاوانێكی نەكردووە، ﴿بِغَيْرِ نَفْسٍ﴾ بێ ئەوەی بەڵگەیەك هەبێت بۆ كوشتنی یان ئەو كەسێكی كوشتبێت، ﴿لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا﴾ واتە: كارێكی زۆر خراپت كردووە، ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا﴾ وتی: پێم نەوتی تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆڕاگری. دیسان جەختی كردەوە

---

[١] الطبري(١٨/٧٢).

[٢] الطبري(١٨/٧٢).

لەسەر قسەکەی پێشووی خۆی‌و وەبیری موسای هێنایەوە کە ناتوانێت لەگەڵی بمێنێتەوە. بۆیە موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لی بێت) پێی وت: ﴿إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا﴾یانی ئەکەرجاریکی ترپرسیارم لیکردی ئەوەهاورییەتیم مەکە ،بەراستی تولەلای من بیانوی تەواوت هە یە... ئیتر هاورێم مەکە پاش ئەم گلەیی یەك لە دوای یەکانەت، منیش هیچ گلەیی لە تۆ ناکەم. ئیبنو جەریر ڕیوایی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە، لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەختێك ناوی کەسێکی بهێنایەو دوعای بۆ بکردایە لە پێشەوە بە خۆیەوە دەستی پێکرد، ڕۆژێکیان فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لە ئێمەو لە موسایش ئەگەر لەگەڵ هاوەڵەکەی هەڵی کردایە شتی سەیری دەبینی، بەڵام وتی: ئەگەر دوای ئەمجارە هەر پرسیارێکم لی کردی هاوەڵیم مەکەو هیچ گلەیەکت لی ناکەم)[1].

﴿فَانطَلَقَا حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾﴾

### بەسەرهاتی ڕاستکردنەوەی دیوارەکە

خوای گەورە باسی موساو خزر دەکاتو دەفەرموێت: ﴿فَانطَلَقَا﴾ واتە: دیسان جارێکی تر دەستیان بە ڕۆیشتن کردەوە، ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ﴾ واتە: هەتا گەیشتنە خەڵکی شارێك. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو سیرینەوە دەڵێت: ئەو شارە، شاری ئیلە بووە.[2] وە لە فەرموودەشدا هاتووە: (هەتا کاتێك کە گەیشتنە خەڵکی شارێك کە زۆرنامەرد بوون).[3] واتە: بەخیل بوون، ﴿اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾ واتە: داوای خواردنیان لی کردن، میواندariyan لی نەکردن، دیوارێکیان چاو پی کەوت خەریك بوو دەڕوخا، لێرەدا ویستو توانای داوەتە پاڵ دیوارەکە بە شێوەی ئیستیعارە چونکە ویست لە ناو دروستکراوەکاندا بە مانایخواربونەوەدێ، (انقض)ە ش یاني خەریك بوو داکەوی، ﴿فَأَقَامَهُ﴾ واتە: ڕاستی کردەوەولاریەکەی نەهێشت. لە پێشەوە لە فەرموودەیەکدا باسمان کرد کە (خزر) بە دەستی

---

[1] الطبري (٧٧/١٨).

[2] الطبري (٧٨/١٨).

[3] أحمد (١١٩/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

خواریەکەی ڕاکرت و لاریەکەی نەهێشت ئەمەیش موعجیزەیەك بوو لەسەر دەستی (خزر)دا ڕوویدا. ئا لەو کاتەدا موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لی بێت) وتی: ﴿لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا﴾ واتە: ئەگەرمەیلت لێبووایە کرێت لەسەر وەردەگرت. لەبەرئەوەی ئەوانە میواندارایان لە ئێمە نەکرد، دەبوو تۆیش بە خۆڕایی کاریان بۆ نەکەی، ﴿قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾( خزر) وتی بە پێغەمبەر موسا (سەلامی خوای لی بێت) :تۆ بە مەرجت گرت لە کاتی کوشتنی کوڕە بچووکەکەدا ئەگەر جارێکی تر پرسیارت لی کردم لە بارەی هەر شتێکی ترەوە هاوڕێم نەبی. ئەوا ئیتر لە یەکتری جیادەبینەوە، ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ﴾ وا ئێستا نهێنی ئەو ڕووداوانەت بۆ باس دەکەم ﴿مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ واتە: کە تۆ نەت توانی خۆ بگری لەسەری.

﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ ﴾

### مانای کون کردنی کەشتیەکە

ئەمە مانای کونکردنی ئەو کەشتیەکە کە موسا (سەلامی خوای لی بێت) لێی بووە موشکیلەو بێزاری خۆی دەربڕی لە کون تێکرنی، خوای گەورە (خزر)ی لە نهێنیەکەی ئاگادار کردبوو، (خزر) وتی: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ﴾ کەشتیەکە هی خەڵکێکی هەژار بوو، لەناو دەریادا کاریان دەکرد، ویستم عەیبداری بکەم، پاشایەك لەوێدا بوو لێیانەوە دوور نەبوو، ﴿يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ واتە: هەموو کەشتیە چاکەکانی داگیر دەکرد، بۆیە عەیبدارم کرد هەتا پاشا وازی لی بێنێتو خاوەنە هەژارەکانی سوودی لی وەرگرن، کە هیچ شتێکی تریان نەبوو پێی سوودمەند بن جگە لەو کەشتیە، وتراوە: خاوەنەکانی ئەو کەشتیە هەتیو بوون.

﴿ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ ﴾

### مانای کوشتنی کوڕەبچکۆلەکە

ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو منداڵەی کە (خزر) کوشتی لە ڕۆژی مۆرکردندا نوسرابوو کە خوانەناسە).[1]

[1] الطبري (١٨/٨٥).

بۆیە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا﴾ واتە: کوڕە بچکۆلەکە باب‌و دایکی خاوەن باوەڕ بوون، ترساین کە زۆریان پی بێنی‌و لە فەرمانی خودا دەربچن‌و ببنە خوانەناس، واتە: خۆشەویستی کوڕەکەیان وایان لی بکات وەك ئەو دەست بدەنە خوانەناسی، قەتادە دەڵێت: باب‌و دایکی زۆر کەیف خۆش بوون پێی کاتێك کە لە دایك بوو، زۆریش دڵ گران بوون کاتێك کە کوژرا، خۆ ئەگەر بمایە دەبووە هۆی لەناوچوونی هەردووکیان سا با مەردم ڕازی بن بە بڕیاری خوا، چونکە بڕیاری خوا بۆ خاوەن باوەڕ لەوشتەدا کە پێی ناخۆشە چاکترە بۆی لەوشتەدا کە پێی خۆشە.[1] وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (خوداَ هیچ بڕیارێکی نەداوە لە بڕیارەکانی بۆ خاوەن باوەڕ مەگین ئەو بڕیارەبوئەو چاکترە).[2] خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾[3] واتە: وە دەگونجێت شتێکتان پی ناخۆش بێت‌و باش بێت بۆتان. وە لێرەدا دەفەرموویت: ﴿فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا﴾ واتە: ئێمە ویستمان (پەروەردگاریان) بە منداڵێکی دڵ پاك‌و زۆر بە سۆز بۆیان قەرەبوو بکاتەوە. واتە: منداڵێك کەپاکترو چاکتربێت لەئەوو باب‌و دایکیشی بە سۆزتر بن بۆی لەوی تر. ئەمە قسەی ئیبنو جورەیجە[4].

﴿وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ۚ ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾﴾

**مانای ڕاست کردنەوەی دیوارەکە بەبی کری وەرگرتن**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا﴾ واتە: دیوارەکە هی دوو کوڕی هەتیو بوو لەو شارەدا لە ژێر ئەو دیوارەدا گەنجینەیەك هەبوو، سەر بەوان بوو. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (دێهات )یش بە شار ناودەبرێت، چونکە خوای گەورە لە پێشەوە دەفەرموویت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ﴾[5] واتە: هەتا گەیشتنە لای خەڵکی شارێك (لەو

[1] الطبري (٨٦/١٨).

[2] أحمد (١١٧/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] البقرة (٢١٦).

[4] الطبري (٨٧/١٨).

[5] الكهف (٧٧).

کاتەدا برسییان بوو. وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ﴾، وەك لە ئایەتی تریشدا فەرموویەتی: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ ﴾[1] واتە: وە (خەڵکی) زۆر شار بوون کە بەهێزتر بوون لە (خەڵکی) مەککە کە تۆیان دەرکرد. وە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴾[2] واتە: وتیان بۆچی ئەم قورئانە نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ پیاوێکی گەورەی (ناودارو دارا) لەم دوو شارە (مەککەو طائف). مانای ئایەتەکەش ئەوەیە، لەبەر ئەوە ئەم دیوارە م ڕاست کردەوەچونکە ماڵی دوو منداڵە هەتیوبوو لەو شارەداو گەنجینەیەکی لە ژێردابووکە سەر بە ئەوانە. عیکریمەو قەتادە کەسانی تریش وتوویانە: لە ژێر ئەو دیوارەدا سامانێکی شاراوە هەبوو بۆ ئەوان دەگەڕایەوە.[3] لە ئایەتەکەشەوە وا دەردەکەوێت. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە، ﴿وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا﴾ واتە: باوکیشیان لە پیاو چاکان بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیاوی چاك ماڵو منداڵی دەپارێزرێتو لە خێرو بەرەکەتی عیبادەکەییدا بەشدارن لە دنیا،و لە ڕۆژی دوایشدا بۆیان دەپارێنەوەو پلەکانیشیان بەرز دەکرێتەوە بۆ پلە بەرزەکانی بەهەشت، بۆ ئەوەی چاوی پێیان ڕووناك بێتەوە وەك لە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: دەڵێت: بە هۆی چاکی باوکیانەوەئەوان پاریزراوبوون،کەچی باسی چاکی خۆیان نەکراوە![4] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا﴾ واتە: پەروەردگارت ویستی ئەو دوو منداڵە گەورە بنو گەنجینەکەیان دەربێنن، لێرەدا ویستەکەبەتەنیا دراوەتە پاڵ خوای گەورە، چونکە گەورەبوونیان تادەگەنەباڵغ بوون لە توانای هیچ کەسێکدا نیە غەیری خوای گەورە.بەڵام لە بارەی منداڵەکەوە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ﴾ وە لە بارەی کەشتیەکەوە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا﴾ والله أعلم[5].

---

[1] محمد (١٣).

[2] الزخرف (٣١).

[3] الطبري (١٨/٩٠).

[4] الطبري (١٨/٩٠).

[5] دیارە لە ژێر ڕۆشنایی ئەمەدایە کە زانایان لەباسی (قەدەروقەزا)دا باسی سێ مەیدان و سێ جۆر (ئیرادە) ئەکەن، هی خوا و هی عەبد و هاوبەشێکیش لە نێوان عە بدو خوادا (أردت ،اردنا،ارادالله ) (وەرگێر)

## ئایا خزر پێغەمبەر بوو

خوای گەورەدەفەرموویت: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾ واتە: ڕەحمەتێك بوو لە پەروەردگارتەوە، من لە خۆمەوە ئەو کارانەم نەکردووە. واتە: ئەوەی من کردوومە لەو سی حالەتەدا، تەنیا لە بەزەیی خوداوە بووە (لەوەی کە باس کرا لە خاوەنەکانی کەشتیەکەو باب‌و دایکی منداڵەکەو دوو منداڵی پیاو چاکەکە) هیچی لەوانە لە خۆمەوە نەمکردووە، بەڵکو فەرمانم پێدراوەو کردوومە، ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەو کەسانەیە کە وتوویانە( خزر )پێغەمبەر بووە (سەلامی خوای لی بێت) لەگەڵ ئەو ئایەتەی کە لە پێشەوە باسمان کرد کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا﴾[1] واتە: جا بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان دی کە لە لایەن خۆمانەوە ڕەحمەتمان پی دابوو شارەزاشمان کردبوو لە زانیاری تایبەتی خۆمان. زۆرێکیش لە زانایان وتوویانە: پێغەمبەر نەبووە بەڵکو دۆستێکی خودا بووە والله أعلم.

### هۆی ناونانی بە ( خزر )

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لی بێت) ئەمیش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە بارەی خزرەوە کە فەرموویەتی: (بۆیە ناونراوە بە (خزر) چونکە لەسەر گیایەکی سپی وشك دانیشتبوو، کاتێکی زانی گیایەکە لە ژێریدا دەجووڵێت‌و سەوز هەڵگەڕاوە).[2] لە عەبدوڕەزاقیشەوە جارێکی تر ڕیوایەتی کردووە.[3] وە لە صەحیحی بوخاریشدا هاتووە لە هەممامەوە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بۆیە ناونراوە (خزر) چونکە لەسەر فەروەیەك دانیشتووە کاتێکی زانی فەروەکە دەجولێت‌و سەوز هەڵگەڕا).[4] لێرەدا مەبەست لە(فەروە) پوشی ڕووەکە کەکاتێك دروینە ئەکرێت ووشك ئەبێتەوە. ئەمە قسەی عەبدوڕەزاقە.[5] وتراویشە مەبەست بەو فەروە ڕووی زەمینە. ﴿ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا﴾ واتە: ئەمە ئەوە بوو کە تۆ نەت توانی خۆ ڕاگری تاپێتی بڵێم وتۆش بیزانی، کاتێك کە تێی گەیاندو شتەکانی بۆ ڕوون کردەوەو گومانەکەی نەهێشت‌و وتی: ﴿مَا لَمْ تَسْطِع﴾بەڵام لە پێش ئەوەدا لەبەر ئەوەی زۆر بە لایەوە گران‌و

---

[1] الكهف (٦٥).

[2] أحمد (٢/٣١٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٢/٣١٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٦/٤٩٩).

[5] أحمد (٢/٣١٨).

گەورە بوو پێی وت: ﴿سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَلَيْهِ صَبْرًا﴾ گرانی بە گران‌و ئاسانی بە ئاسان وەڵام دایەوە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ﴾ واتە: نەیان دەتوانی سەرکەون بۆ سەرەوەی، ﴿وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا﴾ وە نەیان دەتوانی کونیشی تی بکەن، ئەمە لە سەرکەوتن گرانترە. هەریەکەیان چۆن شیاوەبەو پێیە وەڵام دراوەتەوەو گونجاو لەگەڵماناو دەستە واژەکەشدا والله أعلم. ئەگەر وترا ئەی ئەو لاوەی لەگەڵ موسا پێغەمبەردا بوو (سەلامی خوای لی بێت) چی بەسەرهات کە لە پێشەکی بەسەرهاتەکەدا لەگەڵی بوو، پاشان باسی نەما؟ وەڵام بۆ ئەو پرسیارە ئەوەیە: مەبەست لەو باسە بەسەرهاتی موساو (خزر)ەو ئەوەی لە نێوانیاندا ڕوویدا، لاوەکە شوێنی ئەو کەوتبوو، لە فەرموودە پێشووەکاندا باسی هاتووە لە فەرموودەی صەحیح‌و غەیری صەحیحیشدا، کە ناوی یوشعی کوڕی نون بووە کە لە ناو نەوەی ئیسرائیلدا دوای موسا (سەلامی خوای لی بێت)ماوەتەوە وکار وبارێانی گرتوە دەست.

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا (٨٣) إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا (٨٤)﴾

**بەسەرهاتی( زولقەرنەین )**

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿وَيَسْأَلُونَكَ﴾ واتە: پرسیارت لی دەکەن ئەی موحەمەد (ﷺ): ﴿عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ﴾ واتە: لە بارەی زیلقەرنەینەوە چۆن بووە؟ ﴿قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا﴾ واتە: بێژە: لە بارەی زیل قەرنەینەوە شتێکتان بۆ باس دەکەم. لە پێشەوە باسمان کرد کە خوانەناسانی مەککە ناردیان بۆ لای ئەهلی کتێب کە لێیان بپرسن چی لە پێغەمبەر (ﷺ) بپرسن بۆ ئەوەی تاقی بکەنەوە، ئەوانیش وتبوویان: پرسیاری ئەو پیاوەی لی بکەن کە گەڕۆکێك بووە لەسەر زەمیندا ئەوە کێ بووە، وە لە بارەی ئەو لاوانەشەوە پرسیاری لێ بکەن کە نازانری چیان بەسەرهات‌و لە باری ڕوحیشەوە پرسیاری لی بکەن.ئەوە بوو سورەتی (الكهف) هاتە خوارەوە.

**زولقەرنەین خاوەنی دەسەڵاتێکی مەزن بوو**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ﴾ واتە: کردمانە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورەو هەرچی پاشاکان پێویستیان پێی بێت بۆمان ڕەخساند لە دەسەڵات‌و لەشکرو کەلوپەل‌و کەرەسەی جەنگی وکەمارودان، بۆیە بووە خاوەن دەسەڵات لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای سەر زەمیندا، وڵاتان هەموو چوونە ژێر دەسەڵاتی‌و گشت پاشاکان سەریان بۆ دانەواند، گەلانی عەرەب‌و عەجەم هەموو خزمەتیان دەکرد، بۆیە هەندی وتوویانە: لەبەر ئەوە پێی دەڵێن زولقەرنەین، چونکە گەیشتووەتە ئەمسەرو

ئەوسەری خۆر،یانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا، ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾ واتە: هەموو هۆکارێکمان خستە بەردەستی، ئیبنو عەبباسو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمەو سودیو قەتادەو زەححاكو کەسانی تریش دەڵێن: واتە: زانستی هە موو شتێکمان پێدا،هەروەها[1] قەتادە دەڵێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾ واتە: لە شوێنەکانی سەر زەمینو ڕێگاکانی شارەزامان کردبوو.[2] خوای گەورە لە بارەی بەلقیسیشەوە (بلقيس) فەرموویەتی: ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾[3] واتە: کە هەموو شتێکی (پادشایەتی) پی دراوە. واتە: ئەوەی پادشاکان بوویان بەلقیسشی پی درابوو، زولقەرنەینیش هەر وابووە خودا هۆکارەکانی بۆ ئاسان کردبو کە ئەو کیشوەرو وڵاتو ناوچانەی لەسەر زەمیندا پی داگیر بکات، دوژمنانی تێکشکاندو پاشاکانی هەمووخەفە کردو بتپەرستانیشی زەلیل کرد، هەموو شتێکی پێدرابوو، لە وشتانەی یەکیکی وەکو ئەو پێویستی پێی هەبوو والله أعلم.

﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾﴾

## ڕۆیشتنو گەیشتنی بە خۆرئاوا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾ واتە: بە شوێن مەبەستدا چوو، ئیبنو عەبباس دەڵێت: مەبەست بە (السبب) واتە: نشینگە .[4] موجاهید دەڵێت: ئەو نشینگە یەی گرتەبەر کە لە نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادابوو.[5] وە لەڕیوایەتێکیتردا لە موجاهیدەوە دەڵێت: ﴿سَبَبًا﴾ ڕێگایەکی لەسەر زەمیندا گرتەبەر.[6] قەتادە دەڵێت: نشینگە وشوێنە دیاردەکانی زەمینی گرتەبەر.[7] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ﴾ واتە: ڕێگایەکی گرتەبەر هەتا گەیاندیە دوورترین شوێن لە لای خۆرنشین، کە خۆرئاوای سەر زەمینە، چونکە گەیشتن بە خۆرنشین لەبۆشاییدا ڕێی تێنا چێت.

---

[1] البداية والنهاية (٢/١٠٦)، الطبري (١٨/٩٤/٩٥).

[2] البداية والنهاية (٢/١٠٦)، الطبري (١٨/٩٤/٩٥).

[3] النمل (٢٣).

[4] الطبري (١٨/٩٩).

[5] الطبري (١٨/٩٥).

[6] الطبري (١٨/٩٥).

[7] الطبري (١٨/٩٩).

وەك هەندی لەمانەی چیرۆكو بەسەرهاتەكان باس دەكەن كە ماوەیەك بەسەر زەویدا ڕۆیشت كە خۆر لە دوایەوە دەنیشت، ئەمە شتێكە ڕاستی تێدا نیە، زیاتر لە قسەی پڕوپوچو خورافاتی ئەهلی كتێبو درۆ هەڵبەستی بۆ دینەكانیانە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ واتە: وای دەزانی لە لای كانیەكی قوڕە ڕەشەدا ئاوا دەبێت، واتە: لای وابوو كە لە دەریای موحیتدا دەنیشێت، چونكە هەر كەسێك بكاتە كەناری ئەو دەریایە وا دەزانێت لەوێدا خۆر ئاوادەبێت،چونكە خور لەخولگەی چوارەمدای ولەوێدا جێگیرەو لێی جیانابێتەوە ﴿حَمِئَةٍ﴾ لە یەكێك لە خوێندنەوەكاندا لە (الحمأة)ەوە وەرگیراوە كەیانی: قوڕ. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾[1] واتە: بە ڕاستی من بەشەرێك دروست دەكەم لە قوڕێكی ڕەشی ترشاوی ڕەق. واتە: لە قوڕێكی وشك هەڵاتوو، وەك لە پێشەوە باسمان كرد، ﴿وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا﴾ واتە: لەوی تووشی گەلێك لە گەلان بوو، وا باس كراوە كە گەلێكی زۆر گەورە بوون لە نەوەی ئادەم، ﴿قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا﴾ واتە: وتمان: ئەی زولقەڕنەین !دەتوانی سزایان بدەی یان دەشتوانی چاكەیان لەگەڵ بكەی، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە خوای گەورە زاڵی كردووە بەسەریانداو فەرمانڕەواییانی گرتوە تەدەست ، لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون، خوای گەورە سەرپشكی كردووەو ڕێی پێداوە مەیلی خۆیەتی دەیانكوژێت یان دەیانكاتە كۆیلە یان ئازادیان دەكات، خودا خۆی چاكی ناسیووە كە چەندە دادپەروەرو خاوەن باوەڕە وەك دەركەوت كە وا دەرچوو. ﴿قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ﴾ واتە: وتی: بەڵام هەر كەسێك ستەمكاری بكاتو بەردەوام لەسەر بێدینی خۆی بێتو هاوەڵ بۆ خودا دابنی، ﴿فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ﴾ واتە: بەو زووانە سزای دەدەین، قەتادە دەڵێت: سزای دەدەین بە كوشتن.[2] ﴿ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا﴾ واتە: پاشان دەگەڕێنرێتەوە بۆ لای پەروەردگار، خودایش سزایەكی زۆر توندو بە ئێشو ژانی دەدات. ئەم ئایەتە ڕۆژی قیامەتو پاداشت دانەوە دەسەلمێنێت، ﴿وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ﴾ واتە: ئەوانەیش باوەڕیان هێناوەو شوێنی ئەو بانگەوازەی ئێمە كەوتوون كە بریتیە لە ناسینی خودا بە تەنهاو شەریك دانەنان بۆی، ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ واتە: ئاكاری چاك بوبێت، ﴿فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ﴾

---

[1] الحجر (٢٨).

[2] الطبري (١٨/٩٨).

واتە: پاداشتی چاك دەدرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە لای خوای گەورە، ﴿وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا﴾ واتە: كاریشی بۆ ئاسان دەكەین، موجاهید دەڵێ‌ت: چاكەی لەگەڵ دەكەین[1].

﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾﴾

## بەڕێكەوتنی بەرەو ڕۆژهەڵات

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا﴾ واتە: پاشان ڕێگایەكی تری گرتەبەر لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات، بە لای هەر گەلێكدا بڕۆیشتایە مەگین دەیهێنان بە چۆكداو سەری پی نەوی دەكردن‌و ماڵ‌و سامانی داگیردەكردن‌و لە هەموو گەلێكیش كۆمەڵێكی بەكاردەهێنان بۆ هاوكاری‌و بەڕێكردنی سوپاكەی‌و بۆ شەڕكردن لەو هەرێمانەی دەوری خۆیان، وەختێك كە گەیشتنە خۆرهەڵاتی ئەو سەرزەمینە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا﴾ واتە: هەتا گەیشتە خۆرهەڵات بینی تیشكی خۆر بەسەریانەوەیەو لێیان دەدات، جگە لەو خۆرە هیچێكی ترمان نەدابونی بیكەنە پۆشاك، واتە: خانوویەكیان نەبوو هەتا دایانپۆشێت‌و درەختیشیان نەبوو هەتا بە سێبەرەكەی دایانگرێت لە گەرمای خۆر بیانپارێزێت، قەتادە دەڵێت: بۆمان باس كراوە لەسەر زەمینێكدا بوون كە هیچ ڕووەكێكی لی نەدەڕوا، كاتێك كە خۆر هەڵبهاتایە دەچوونە ژێر زەمین كە خۆر ئاوادەبوو دەهاتنە دەرەوە بۆ ناو كێلگەكانیان‌و دەگەڕان بە شوێن بژێویدا.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا﴾ واتە: بەو شێوەیە، هەرچی ئەو بیری لی بكردایەتەوە ئێمە لێی ئاگادار بووین، موجاهیدو سودی دەڵێن: زانیاری، واتە: ئێمە ئاگاداری هەموو جموجوڵێكی خۆی‌و سوپاكەی بووین، هیچی ئەوانمان لی پەنها نەبوو، باگەلەكان پەرش‌و بڵاویش بن و هەریەكەی لەسەرزەمینێكدا بن، چونكە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَىْءٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ﴾[3] واتە: خوای گەورە نە لە زەمین‌و نە لە ئاسمانەكان هیچی لی پنهان نابێت[4].

---

[1] الطبري (١٨/٩٩).

[2] الطبري (١٨/١٠٠).

[3] ال عمران (٥).

[4] الطبري (١٨/١٠١).

﴿ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمًا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلًا ﴿٩٣﴾ قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيۡرٞ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجۡعَلۡ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُمۡ رَدۡمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلۡحَدِيدِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيۡنَ ٱلصَّدَفَيۡنِ قَالَ ٱنفُخُواْۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفۡرِغۡ عَلَيۡهِ قِطۡرًا ﴿٩٦﴾﴾

**ڕۆیشتن بۆ سەر زەمینی یەئجوج و مەئجوج و دروست کردنی بەنداوەکە**

خوای گەورە باسی زولقەڕنەین دەکات‌ودەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ أَتۡبَعَ سَبَبًا﴾ پاشان ڕێگایەکی تری گرتەبەر لە خۆرهەڵاتەوە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيۡنَ ٱلسَّدَّيۡنِ﴾ هەتا گەیشتە نێوان دوو کێوی مەزن‌و لە نێوانیاندا بوشاییەك هەبوو ،هە موو جارێك یەئجوج‌و مەئجوج لە وێوە پەلاماری وڵاتی تورکیان دەداو دەستیان ئەکردە کوشتن‌وخراپە کاری و ماڵ‌و سامانیشیان بە تاڵان دەبردن، یەئجوج‌و مەئجوج لە نەوەی ئادەمن وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی ئادەم، ئادەمیش ئەفەرموێ: بەڵێ ئەی خودایە، خوای گەورەیش دەفەرمووێت: کۆمەڵ‌و دەستەی ئاگر ڕەوانە بکەو دەریکە بۆ ئاگر. ئادەم ئەفەرموێ: کامەیە دەرکراو بۆ ناو ئاگر خوای گەورەیش دەفەرمووێت: لە هەزار کەس نۆ سەدو نەوەدو نۆ کەس بۆ ناو ئاگرو یەك کەس بۆ بەهەشت ئا لەو کاتەدا منداڵی بچووك سەری سپی دەکات‌و پیر دەبێت‌و هەموو سك پڕێك بەرەکەی خۆی فڕێ دەدا ت پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: دوو گەل (کۆمەڵ) لە نێوان ئێوەدا پەیدا دەبن، لەناو هەر شتێکدا نابن مەگین زۆری دەکەن ئەوانەیش یەئجوج‌و مەئجوجن).[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوۡمًا لَّا يَكَادُونَ يَفۡقَهُونَ قَوۡلًا﴾ لە لای ئەو دوو چیادا هۆزێکی دی لە هیچ زمانی تی نەدەگەیشتن و نەیاندەزانی قسە بکەن، یانی قسە کانیان ناڕوون بووچونکە لەخەڵکی زۆردوور بوون، ﴿قَالُواْ يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِنَّ يَأۡجُوجَ وَمَأۡجُوجَ مُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَهَلۡ نَجۡعَلُ لَكَ خَرۡجًا عَلَىٰٓ أَن تَجۡعَلَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَهُمۡ سَدًّا﴾ واتە: وتیان: ئەی زولقەڕنەین! یەئجوج‌و مەئجوج خراپ‌و بەدکارن، ئایا باجێکت بدەینی کە لە نێوان ئێمەو ئەواندا (بەربەستێکمان) بۆ دروست بکەی؟ ئیبنو جورەیج دەڵێت لە قەتادەوە لە ئیبنو عەبباسەوە (خرجاً) یانی: (پاداشتێکی) مەزن.[2] واتە: ئەوان دەیان ویست لە نێوان خۆیاندا سامانێکی بۆ کۆبکەنەوەو بیدەنی هەتا ئەو بەربەستەیان بۆ دروست بکات، لە نێوان ئەوان‌و یەئجوج‌و مەئجوجدا، زولقەڕنەین بە نیەتێکی چاك‌و

[1] فتح الباري (٨/٢٩٥)، مسلم (١/٢٠١).

[2] الطبري (١٨/١١٢).

پاكو دیندارانە پێی وتن: ﴿مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ﴾ واتە: ئەوەی خودا بە منی داوەو بۆی ڕەخساندووم لە دەسەڵاتو ماڵو سامان لەوەی ئێوە باشترە كۆی دەكەنەوە، وەك سولەیمان (سەلامی خوای لی بێت) دەڵێت: ﴿أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾[1] واتە: ئێوە ماڵو سامان بە من دەدەن؟! دەی ئەوەی خوا بە منی داوە چاكترە لەوەی داویەتی بە ئێوە. زول قەرنەینیش هەر وای وت: ئەوەی من هەمە زۆر چاكترە لەوەی ئێوە كۆی دەكەنەوە بەڵام ئێوە بە دەستو برد یارمەتیم بدەن، واتە: بە خۆتانو كەرەسەی خانوكردنەوە دەست بەكار بن لەگەڵم. ﴿أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا﴾ واتە: هەتا لە نێوان ئێوەو ئەواندا بەربەستێك دروست دەكەم، ﴿ءَاتُونِي زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ﴾ واتە: پارچە ئاسنم بۆ بێنن، (الزبر) جەمعی (الزبرة) واتە: پارچە ئاسن، ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسو موجاهیدو قەتادەیە.[2] وەك خشت وابوو. وتراوە هەر خشتێكی بە ئەندازەی قینتارێكی (قنطار) دیمەشقی قورس بوو یان زیاتر قورس بوو لێی. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ﴾ واتە: كاتێك كە هەردوو لای كەژەكەی پڕكردەوە. واتە: خشتەكانی لەسەر یەك دانا هەر لە بناغەوە هەتا نێوانی هەردوو كەژەكەی بەرزو ڕێك كرد بە پانیو بە درێژیش، جیاوازی ڕا هەیە لەسەر ماوەی درێژیو پانی بەربەستەكە، ﴿قَالَ ٱنفُخُوا۟﴾ وتی: ئێوە ئاگری تی بەردەنو بیدەمێنن، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِيٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا﴾ واتە: هەتا هەموو بووە ئاگر، وتی: مسی تواوەم بۆ بێنن ئیبنو عەبباسو موجاهیدو عیكریمەو زەحاكو قەتادەو سودی دەڵێن: ﴿قِطْرًا﴾ واتە: مس، هەندێكی تریان ووشەی تواوەیشیان بۆ زیاد كردووە.[3] ئەم ئایەتەیان هێناوەتەوە بە بەڵگە كە دەفەرموێت: ﴿وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ﴾[4] واتە: وە مسمان بۆ تواندەوە وەك كانیاو (دەڕۆی).هەربۆیە بەنداوی (یەئجوج ومەئجوج) شوبهێنراوە بەعەبایەكی خەت خەت، والله أعلم .

﴿فَمَا ٱسْطَٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى ۖ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ ۖ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِى بَعْضٍ ۖ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾﴾

---

[1] النمل (٣٦).

[2] الطبري (١٨/١١٤).

[3] الطبري (١٨/١١٦/١١٧)، (الدر المنثور (٥/٤٦٠).

[4] سبأ (١٢).

**ڕاستە بەربەستەکە بووەتە لەمپەربەڵام بەو زووانە پێش هاتنی قیامەت خاپوردەبێت!**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا﴾ خوای گەورە باسی یەئجوج و مەئجوج دەکات کە نەیانتوانی سەرکەون بەسەر بەربەستەکەداو نەشیان توانی کونی بکەن لە خواریەوە، هەرچەندە سەرکەوتن بەسەریدا ئاسانتر بوو لە کون کردنی خوای گەورە هەر شتەو بە پێی خۆی باسی هێناوە دەفەرموێت: ﴿فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓاْ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُواْ لَهُۥ نَقْبًا﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەتوانیویانە کونی بکەن‌ونەتوانیویانە هیچ شتێکی تری لی بکەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زەینەبی کچی جەحشەوە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)ئەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە خەو هەڵساو ڕەنگی سور هەڵگەڕابوو دەیفەرموو: (لا إله الاّ الله) واوەیلا بۆ عەرەب لە شەڕی کە نزیك بووەتەوە، ئەمڕۆ بەربەستی یەئجوج و مەئجوج کرایەوە وەك ئەمە) بە پەنجە گەورەو پەنجەکەی تەنیشتی بازنەیەکی دروست کرد، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئایا پیاو چاکیشمان لەناودا بێت هەر لەناو دەچین؟ فەرمووی: (بەڵی کاتێك کە خراپە زۆر بوو).[1] ئەم فەرموودەیە صەحیحە بوخاری‌و موسلیم هاوڕان لەسەری.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ هَـٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّى﴾ واتە: ئەمە بەزەییەکە لە لایەن پەروەردگارمەوە بەرانبەر خەڵکی،چونکە بووەیە دیوارێك لەنێوان خەڵکی ویە ئجوج ومەئجوجداو ڕێگری لی کردن لە تاوان‌و خراپەو کوشتن‌و بەدڕەوشتی لەسەر زەمیندا، ﴿فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ رَبِّى﴾ واتە: کاتێك پەروەردگاری من بەڵێنە ڕاستەکەی خۆی بەجی هێنا ﴿جَعَلَهُۥ دَكَّآءَ﴾ واتە: لەگەڵ زەویدا تەختی کرد، عەرەب ئە ڵێن: (ناقة دکاءَ) حوشترێکی پشت تەخت،بەحوشترێك ئەوترێ کە پشتی تەخت بێت بەرزایی تێدا نەبوو. خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا﴾[3] واتە: جا کاتێك پەروەردگاری موسا خۆی دەرخست بۆ شاخەکە شاخەکەی تەخت کرد. واتە: یەکسانی کرد لەگەڵ زەویدا، ﴿وَكَانَ وَعْدُ رَبِّى حَقًّا﴾ واتە: بەڵێنی پەروەردگارم ڕاستەو هەر وەدی دێت،هەروەها کە دەفەرموێ(وترکنابعضهم) واتە: ئەو ڕۆژەی ئەو بەربەستە تەخت دەکەین‌و یەئجوج‌و مەئجوج دێنە ناو ئەو خەڵکەی کەماوە، ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن، دەست دەدەنە خراپەکاری‌و تالانکردن‌و بەدڕەوشتی لە زەویدا، سودیش هەر وای وتووە لەم ئایەتەدا: ﴿وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِى

---

[1] أحمد (٦/٤٢٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٤٤٠)، مسلم (٤/٢٢٠٨).

[3] الاعراف (١٤٣).

بَعۡضٍ﴾ واتە: ئەو كاتەی كە دێن بۆ سەر خەڵكی.[١] ئەم بەسەرهاتانە هەمووی پێش هاتنی ڕۆژی قیامەتە، پاش دەجال، وەك لەمەودوا باسی دێت لەو ئایەتەدا كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ۝٩٦ وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾[٢] واتە: هەتا كاتێك دەرگا لە یەئجوجو مەئجوج دەكرێتەوەو لە هەموو شوێنێكی بەرزەوە دێنە خوارەوە. ئەو كاتە بەڵێنی خودا وەدی دێت، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾ واتە: فو دەكرێت بە كەڵەشاخدا، (كەڵەشاخ) وەك لە فەرموودەدا هاتووە: بووقێكە فووی پێدا دەكرێت، ئەو كەسەیش فوی پێدا دەكات ئیسرافیلە، وەك لە پێشەوە بە درێژی لە فەرموودەیەكدا باس كراوە، فەرموودەیش لەم بارەیەوە زۆرە.[٣] وە لە فەرموودەیەكدا لە عەتیەو ئیبنو عەبباسەوە.[٤] وە لە ئەبو سەعیدیشەوە بە مەرفوعی هاتووە: (چۆن (دڵم خۆش بێت)كە خاوەنی كەڵەشاخ، كەڵەشاخەكەی بە دەمەوە گرتووە، ڕووی نەوی كردووەو گوێی گرتووە كەی فەرمانی پی دەكرێت؟)، وتیان: ئێمە چی بڵێین؟ فەرمووی: (بڵێن (حسبنالله ونعم الوكيل علي الله توكلنا) خوامان بەسەوەهەرئەو چاكترین بریكارمانەو پشتمان بە خوا بەستووە).[٥] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَجَمَعۡنَٰهُمۡ جَمۡعٗا﴾ واتە: هەموویان كۆدەكەینەوە بۆ لێپرسینەوە، وەك لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَوَّلِينَ وَٱلۡأٓخِرِينَ ۝٤٩ لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ﴾[٦] واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵی بێگومان هەموو پێشینانو پاشینان، كۆدەبنەوە لە ژوانگەی ڕۆژی دیاریكراودا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَحَشَرۡنَٰهُمۡ فَلَمۡ نُغَادِرۡ مِنۡهُمۡ أَحَدٗا﴾[٧] واتە: هەموویان كۆدەكەینەوەو هیچیان بەجی ناهێڵین.

﴿وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا ۝١٠٠ ٱلَّذِينَ كَانَتۡ أَعۡيُنُهُمۡ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكۡرِي وَكَانُواْ لَا يَسۡتَطِيعُونَ سَمۡعًا ۝١٠١ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا ۝١٠٢﴾

---

[١] الدر المنثور (٤/٤٥٤).

[٢] الانبياء (٩٦ـ٩٧).

[٣] تحفة الأحوزي (٩/١١٦)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[٤] الطبري (١٨/١٢٢).

[٥] تحفة الأحوزي (٧/١١٧)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[٦] الواقعة (٤٩ـ٥٠).

[٧] الكهف (٤٧).

**لە ڕۆژی قیامەتدا جەهەنەم پیشانی خوانەناسان دەدرێت**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا جەهەنەم لەبەردەم خوانەناساندا ڕادەخەین چ ڕاخستنێك. واتە: خوای گەورە باسی خوانەناسان دەكات لە ڕۆژی قیامەتدا چیان بەسەر دێنێت، جەهەنەمیان دەخرێتە بەردەمو پیشانیان دەدرێتو چاك دەیبینن هەتا باش ئەو سزاو ناڕەحەتیەی ناو جەهەنەمیان بۆ دەركەوێت پێش چوونە ناوی، بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە توشی خەمو خەفەتو دڵ تەنگی ببن، لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا جەهەنەم دەهێنرێت حەفتا هەزار گیرەی پێوەیە بەڕێ دەكرێت، هەر گیرەیەك حەفتا هەزار فریشتەی لەگەڵە).[1] پاشان خوای گەورە باسی ئەو خوانەناسانە دەكاتو دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِينَ كَانَتۡ أَعۡيُنُهُمۡ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكۡرِي﴾ واتە: ئەوانەی كە چاویان لە یادی من نابوو بە یەكدا،یانی خۆیان بێئاگاو كوێروكەڕ كردبوو لە وەرگرتنی هیدایەتی خوا و پێڕەوی كردن لە هەق، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يَعۡشُ عَن ذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ نُقَيِّضۡ لَهُۥ شَيۡطَٰنٗا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٞ﴾[2] واتە: وە هەر كەس پشت لە یادی خوا هەڵكات شەیتانێكی بۆ ئامادە دەكەن كە هەمیشە لەگەڵی بێتو لێی جیانەبێتەوە. لێرەیشدا دەفەرموویێت: ﴿وَكَانُواْ لَا يَسۡتَطِيعُونَ سَمۡعًا﴾ واتە: توانای بیستنیشیان نیەو ئاوەزی تێگەیشتنی ئەو شتانەیان نیە كە خوا فەرمانی پێداون بیكەن یان قەدەغەی كردووە لێیان نەیكەن. پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا﴾ واتە: ئایا خوانەناسان وادەزانن لە غەیری من بەندەكانم بكەن بە گەورەی خۆیان هیچ سودێكی لی وەردەگرن، ئێمە جەهەنەممان بۆ ئەو خوانەناسانە ئامادە كردووەو پێشوازیان لی دەكات. بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿كَلَّاۚ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا﴾[3] واتە: نەخێر (وا نیە) بەڵكو پەرستراوەكان (لە قیامەتدا) ئینكاری پەرستنەكەی ئەوان دەكەنو دەبنە دژیانو بەرپەرچیان دەدەنەوە.

---

[1] مسلم (٤/٢١٨٤).

[2] الزخرف (٣٦).

[3] مريم (٨٢).

﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا (١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا (١٠٤) أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا (١٠٥) ذَلِكَ جَزَاؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا وَاتَّخَذُوا آيَاتِي وَرُسُلِي هُزُوًا (١٠٦)﴾

ڕەنجبخەسارترین کەس وپاداشتی دواڕۆژیان، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەمرەوە لە موسعەبەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە باوکم واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لەم ئایەتە: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا﴾ واتە:بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمی کی ڕەنجبخە سارترین کەسە؟ ئایا ئەوانە حەروریەکانن (الحرورية[1])؟ وتی: نەخێر، ئەوانە مەسیحیو جوولەکەکانن، چونکە جولەکە محمدیان(ﷺ) بە ڕاست نەدەزانی، گاورەکانیش بڕوایان بە بەهەشت نەبوو، دەیان وت: خواردنو خواردنەوەی تێدا نیە، حەروریەکانیش ئەوانەن کە پەیمانی خودا دەشکێنن پاش گرێدانو بەستنی، سەعد هەربە (فاسقەکان) ناوی دەبردن.[2] عەلی کوڕی ئەبو تالبو زەححاكو کەسانی تریش وتوویانە: ئەوانە حەروریەکانن.[3] بەم قسەی لەعیەدا وا دەردەکەوێت ئەم ئایەتە چۆن حەروریەکان دەگرێتەوەبەپێی قسەکەی (علی) بێت گاورو جوولەکەو ئەوانەیش دەگرێتەوە. ئەو ئایەتە تایبەت نەهاتووەتەخوار بۆ ئەوانە یان ئەمانە ، بەڵکوئایە تێکی گشتگیرە، چونکە ئەم ئایەتە لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە لە پێش ئەوەی ڕووی قسە بکاتە گاورو جوولەکە، وە لە پێش پەیدابوونی خەواریجیشەوەبەگشتی، بەڵکو ئەم ئایەتە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە عیبادەت بە شێوەیەکی چاك ناکەن، بەڵام خۆیان وا دەزانن زۆر چاکەو باش پێکاویانە، بەڵام نەیان پێکاوەو کردارەکانیان لی وەرناگیرێت، وەك خوای گەورە لەم ئایەتانەدا دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَاشِعَةٌ (٢) عَامِلَةٌ نَاصِبَةٌ (٣) تَصْلَى نَارًا حَامِيَةً﴾[4] واتە: زۆر دەمو چاو لەو ڕۆژەدا ترسناكو ڕیسواو شەرمەزارن، هەوڵدەرێکی ڕەنجەڕۆن، دەچنە ناو ئاگری هەرە گەرمەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا﴾[5] واتە: هاتین هەر کردەوەیەکیان کردبوو هەموویمان وەك تۆزی پرشو بڵاو لی کرد. وە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَعْمَالُهُمْ كَسَرَابٍ

---

[1] حەروریـە کـان لەقـەبی (خەواریجـەکان)بووەچـونکە سـەرەتا لـەدێی (حـەروورا)لەعێراقدادروسـت بـوون وگەشـەیان کرد(وەرگێڕ)

[2] فتح الباري (٨/٢٧٨).

[3] الطبري (١٨/١٢٧).

[4] الغاشية (٢-٤).

[5] الفرقان (٢٣).

بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا﴾[1] واتە: وە ئەوانەی کە بێباوەڕن کردەوە (چاکە)کانیان وەك سەرابێك وایە لە بیابانێکدا (بریسکە بداتەوە)[2]، (کەسێکی) زۆر تینوو بە ئاوی دەزانی (لە دوورەوە) (بە پەلە دەڕوات بۆی) کاتێك دەگاتە لای هیچ بەدی ناکات. خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم﴾ واتە: بڵێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ، ﴿بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا﴾ جادێت تەفسیری ئەم رەنجبخە سارانە دەکات و دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە: ئەو کەسانەن کە لە دنیادا هەوڵیان داوەو هەوڵەکەیان بەفیڕۆچووەیانی کومەڵێك کاری بەتاڵیان کردووەدورلەپەیڕەوی کردنی شەرع وشەریعەت وباش و وەرگیراو لەلای خوا، ﴿وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا﴾ واتە: ئەوانە لایان وایە کارێکی چاکیان کردووە، لەسەر هەق بوون ولای خوا مەقبولن وجێی ڕێزو خۆشەویستین، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ﴾ واتە: ئەوانە کەسانێکن بڕوایان بە نیشانەکانو دیداری پەروەرندەیان نیە، واتە: ئینکاری ئەو نیشانانەیان کردووە کە هەموو بەڵگەن لەسەر تەنهایی خوداو ڕاستی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە دنیاداو بڕواشیان بە ڕۆژی دوایی نەبووە. ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا﴾ واتە: تەرازووەکانیشیان بۆ سەنگین ناکەین، چونکە چاکەی نیەو بۆشە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی وا دێت کە زۆر گەورەو قەڵەوە، لە لای خودا کێشی باڵە مێشوولەیەکی نیە، پاشان فەرمووی ئەگەر حەز دەکەن ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا﴾ بخوێنن). موسلیم ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە.[3] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمۡ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُواْ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا﴾ واتە: لەبەر ئەو خوانەناسو گاڵتە کردنەیان بە نیشانەکانو پێغەمبەرەکانم، ئەوانە پاداشتیان سزاو جەزرەبەی جەهەنەمە، چونکە ئەوانە لە دنیادا زۆر بی شەرمانە حاشایان لی دەکردنو گاڵتەیان پی دەکردن.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ١٠٧ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ١٠٨﴾

**پاداشتی خاوەنباوەڕە چاکەکان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا﴾ واتە: ئەوانەی کە خاوەن باوەڕو ئاکار چاك بوون، شوێنی میوانداریان باغاتی بەهەشتە، خوای گەورە باسی

---

[1] النور (٣٩).

[2] سەراب تیشکێکە کاتی زۆر گەرما لە بیاباندا وەك ئاو دێتە پێش چاو.

[3] فتح الباري (٨/٢٧٩)، مسلم (٤/٢١٤٧).

بەندە بەختەوەرەكانی دەكات ئەوانەی كە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەكەی بووە، بڕواشیان بەو پەیامانەش بووە كە پێغەمبەرەكانی تر هێناویانە بۆ خەڵكی، كە باشترین شوێنی بەهەشتیان بۆ ئامادە كراوە كە فیردەوسە ، ئەبو ئومامە دەڵێت: فیردەوس شوێنێكی خۆشی بەهەشتە.[1] قەتادە دەڵێت: فیردەوس، بەرزایی‌و ناوەڕاست‌و چاكترین شوێنی بەهەشتە.[2] ئەم فەرموودەیە ڕیوایەتی كراوە بە مەرفوعی لە سەمورەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (فیردەوس بەرزاییەكی بەهەشتە، ناوەڕاست‌و چاكترین شوێنی بەهەشتە). ڕیوایەتیش كراوە لە قەتادەوە لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە بە مەرفوعی هەر بەو شێوەیەی پێشوو، ئەم فەرموودانە هەموو ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردوون (ڕەحمەتی خوای لی بێت).[3] وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (كاتێك داوای بەهەشتتان كرد لە خوا، داوای فیردەوسی لی بكەن، چونكە بەرزترین شوێنی بەهەشتەو ناوەڕاستی بەهەشتە، لەوێوە ڕووبارەكانی بەهەشت دێنە دەرەوە).[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نُزُلًا﴾ واتە: (میوانداریان) لی دەكرێت، چونكە (النزول):میوانداری و پەزێرایی لی كردنە. ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ واتە: دەمێننەوەو تێیدا دادەنیشن هەرگیز لێی وەڕەس نابن، ﴿لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلًا﴾ واتە: ئارەزووی هیچ شوێنێكی تر ناكەن، هیچ شوێنێكی تریان پی خۆش نیە ئەو شوێنە نەبێت، خوای گەورە كە دەفەرمووێت: ﴿لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلًا﴾ وەبیرهێنانەوەیەكە، ئەوەندە شوێنەكەی خۆیان لا چاكەو پی خۆشە لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوانەی كە هەمیشە لە شوێنێكدا دەمێننەوە وا دەزانن كە هەراسان دەبن لەو شوێنە، خوای گەورە فەرموویەتی لەگەڵ ئەو مانەوەیەدا بە بەردەوامی بەبی بڕانەوە، ئارەزووی شوێنێكی تر ناكەن بۆی بڕۆن، شوێنەكەی خۆیان ناگۆڕنەوە بە هیچ شوێنێكی تر.

﴿قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ﴿١٠٩﴾﴾

## قسەی خودا هەرگیز تەواو نابێت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا﴾ واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) ! بڵێ: ئەگەر بۆ نووسینی قسەی پەروەردگاری من دەریا هەموو ببێتە مورەكەب، لە پێش تەواوبوونی وتاری پەروەردگارم دەریا هیچی تێدا نامێنێت با

[1] الطبري (١٨/١٣٠).

[2] الطبري (١٨/١٣٠).

[3] الطبري (١٨/١٣٤).

[4] فتح الباري (١٣/٤١٥).

ئەوەندەی تریشی مورەکەب بێتە سەرو بەردەوام دەریا دوای دەریاش ببێتە مورەکەب قسەی خودا هەر دوایی نایەتو هەموو دەریاکان وشك دەبن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[1] واتە: بێگومان ئەگەر هەرچی درەخت لە زەویدایە قەڵەمو پێنووس بێت هەموو دەریای زەوی ببێتە مورەکەب حەوت دەریای تر دوای ئەو(ەی باسکرا) ببێت بە مرەکەب وتەو زانراوەکانی خودا دوایی نایەتو تەواو نابن بە ڕاستی خودا زاڵی کار دروستە. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێت: نموونەی زانیاری بەندەکانی خودا بەرامبەر زانیاری خودا وەك دڵۆپێك لە ئاوی هەموو دەریاکان وایە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى﴾ وە دەفەرموێت: ئەگەر هەموو دەریاکان بۆ نوسینی وتاری خودا ببێتە مەرەکەبو هەموو درەختەکانیش ببێتە پێنووس هەموو پێنووسەکان دەشکێنو هەموو دەریاکان چۆڕەیان لی دەبڕێتو تەواو دەبن، وتاری خودا هەر تەواو نابێت، هیچ شتێك تەواوی ناکات، چونکە ئەوەی خودا دەیکات هیچ کەسێك ناتوانێت بیکات، وە بەو شێوەیەی کە پێویستە ناتوانێت سوپاسی خودا بکات، هەتا خۆی ستایشی خۆی دەکاتو بێگومان پەروەردگارمان چۆن دەفەرموێت هەر وایەوئەو زۆر مەزنترە لەوەی ئێمە دەیڵێین، نموونەی بەهرەکانی خودا لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی دنیا لە چاو بەهرەکانی دواڕۆژ وەك دەنکە خەرتەلەیەك وایە.

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾﴾

### موحەمەد (ﷺ) مرۆڤەو پێغەمبەریشەو خودایش یەك خودایە

خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ): ﴿قُلْ﴾ واتە: بڵێ: ئەو موشریکانەی کە بڕوا ناکەن بەو پەیامەی کەتۆبۆت هێناون: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ منیش هەروەك ئێوە مرۆڤێکم، یانی: هەرکەسێك وا دەزانێت من درۆزنم، با ئەو کەسە وەك ئەمەی من هێناومە ئەویش شتێك بهێنێ، چونکە من غەیب زان نیم کە باسی بەسەرهاتی ئەو بەسەرهاتە پێشینانەتان بۆ دەکەم کە پرسیارتان کرد لە بارەیەوە وەك بەسەرهاتی (أصحاب الكهف، یارانی ئەشکەوت)و زولقەرنەین، چۆن بووە وەك خۆی، ئەگەر خودای مەزن خۆی ئاگاداری نەکردمایە چۆنم دەزانی هەربۆیە هەواڵی ئەوەشتان ئەدەمێ،

---

[1] لقمان (٢٧).

﴿أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾ کە خوای ئێوەتاقانەیە و بانگتان دەکەم کە عیبادەتی بکەن‌و شەریکی بۆدامەنێن، ﴿فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ﴾ واتە: هەر کەسێك لە ئێوە بەتەمای دیداری پەروەردگاریەتی، ﴿فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا﴾ واتە: با هەوڵبدات کاری چاکە بکات بەو شێوەیەی لەگەڵ شەرعدا دەرەخسێت، ﴿وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾ واتە: جگە لە پەروەردگاری خۆی هیچ کەسێکی تر نەپەرستێت، خواپەرستیەکەی تەنها لەبەر خودا بێت‌و کەس نەکاتە شەریکی، ئەم دوو شتە کۆڵەکەو پایەی هەرە گرنگی خواپەرستین، دەبێت ئەو عیبادەتە هەر بۆ خودا بێت‌و لەسەر شەریعەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بێت‌و لێی لانەدات، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە مەحمودی کوڕی لەبیدەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (بە ڕاستی ئەوەی کە من زۆر لێی دەترسم توشتان بێت شیرکی بچووکە). وتیان: شیرکی بچووك کامەیە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: (ڕیایە) خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك پاداشتی خەڵکی دایەوە لەسەر کردارەکانیان، دەفەرموێت: بڕۆن بۆ لای ئەوانەی کە ئێوە ڕیاتان بۆ دەکردن لە دنیادا، سەیربکەن‌و بزانن ئایا لای ئەوانە هیچ پاداشتێك وەدەست دێنن).[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی کوڕی ئەبو فەزالەی ئەنصاری یەوەکە یەکێك بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەیفەرموو: (وەختێك خوای گەورە ئەوەڵ‌و ئاخیری کۆکردەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەو ڕۆژەی کە گومان لە هاتنیدا نیە، جارچیەك جاڕ دەدات: هەر کەسێك کارێکی کردووەو کەسێکی تری کردووە بە شەریکی خودا لە کارەکەیدا، با داوای پاداشتەکەی لە غەیری خودا بکات، چونکە خودا زۆر بێنیازە لە شەریك).[2] تیرمزی‌و ئیبنو ماجەیش ئەم فەرموودەیان هێناوە[3].

## تەفسیری سورەتی (مریم)

## ئەم سوورەتە لە مەککەدا هاتووە تەخوارەوە

موحەمەدی کوڕی ئیسحاق لەکتێبی سیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەیەکی ئوممو سەلەمەوە.[4] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە لە بەسەرهاتی کۆچ بۆ سەر

[1] أحمد (٤٢٨/٥).

[2] أحمد (٢١٥/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] تحفة الأحوذي (٥٩٩/٨)، إبن ماجه (١٤٠٦/٢)، حەسەنە.

[4] ابن هشام (٣٥٧/١).

زەمینی حەبەشە لە مەککەوە کە جەعفەری کوڕی ئەبو تالب (ڕەزای خوای لی بێت) سەرەتای ئەم سورەتەی خوێندووەتەوە بەسەر نەجاشیو هاوەڵەکانیدا[1].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّى خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِىَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾

**بەسەرهاتی زەکەریاو پاڕانەوەی بۆ فەرزەندێك!**

﴿كٓهيعٓصٓ﴾، (كاف، ها، يا، عەين، صاد) باسی ئەم پیتانە لەسەرەتای سورەتی (البقرة)دا کراوە، پێویست بە باس کردنەوەی ناکات لێرەدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ﴾ واتە: ئەمە باسی بەزەیی پەروەردگارتە لە بارەی بەندەی خۆیەوە زکریا، یەحیای کوڕی یەعمور بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندووەتەوە: (ذَكَّرَ رحمةَ ربك عَبدَهُ زكريا[2]).[3] (زكريا) بە مەدو بە قەسریش ئەخوێنرێتەوەدوو خوێندنەوەی بەناوبانگن ، زەکەریا پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرە مەزنەکانی نەوەی ئیسرائیل بووە، لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، زەکەریا دارتاش بووە ولە ڕەنجی شانی خۆیی خواردووە.[4] کە ئەو دارتاشیە بووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا﴾ واتە: کاتێك هانای بۆپەروەردگاری برد بە هێواشی، چونکە خودا ئەو دەنگ نزمیەی پی خۆشترە، وەك قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا﴾ دەڵێت: (ان الله يعلم القلب التقى ويسمع الصوت الخفى )خودا ئاگای لە دڵی لە خواترسە، دەنگی نزمیش دەبیستی.[5] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى﴾ واتە: وتی: پەروەردگارم ئێسکم لاواز بووەو توانام کەم بووەتەوە، ﴿وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا﴾ واتە: پیریش سەری لی داومو سەرم بریسکەی دێت، واتە: ئاگری مووی

---

[1] أحمد (٤٦١/٢٠١/١).

[2] بەم خوێندنە وەیە بێت ،یانی:باسی ئەوڕەحمەتە تایبەتە بکە کەخواڕشتی بەسەرعەبدی خۆیدا زەکەریا (وەرگێڕ)

[3] القرطبي (٧٥/١١).

[4] مسلم (١٨٤٧/٤).

[5] الطبري (١٤٢/١٨).

سپی سەرم بەربووەتە مووی ڕەشم ، مەبەست پێی ئەوەیە کە لاوازو پیر بووە بەو نیشانە دیارو نەدیارانەی کە باسی کردن، ﴿وَلَمْ أَكُنْ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا﴾ واتە: پەروەردگارم من هەرگیز لە پاڕانەوە لێت نائومێد نەبووم مەگین قەبوڵت کردووە لێمو دەستت بە ڕوومەوە نەناوە لەو داوایانەی کە لێم کردووی،﴿ وَإِنِّي خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴾ واتە: من لە خزمانم دەترسم دوای خۆم و ژنەکەشم نەزۆکە سا تۆ لەلای خۆتەوە منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە، موجاهیدو قەتادەو سودی دەڵێن: مەبەست بە ﴿ٱلْمَوَٰلِيَ﴾ خزمی پشتی باوکە.[1] ترسەکەی ئەوە بوو لە دوای خۆی خزمەکانی لەناو خەڵکیدا بە ناشیرینی مامەڵە بکەن، بۆیە پاڕاوەتەوە لە خودا کە منداڵێکی بداتیو بیکات بە پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لە دوای خۆیو فەرمانەکانی خودایان پێ بگەیەنێت، خودای گەورەیش داواکەی قەبوڵ کرد، زەکەریا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەماڵو سامانی خۆی نەترساوە کە خزمانی داگیری بکەن، چونکە ئەو پلەی پێغەمبەریەتیە زۆر مەزنترە لەوەی کە بیر لە ماڵو سامان بکاتەوە، پێی ناخۆش بێت پاش خۆی خزمەکانی داگیری بکەن، حەزکا منداڵێکی ببێت ببێتە میراتگری لە باتی ئەوان ئەمە یەك. دووهەم: باسی ئەوەی نەکردووە کە خاوەن سامانە، بەڵکو دارتاشێك بووە لە ڕەنجەشانی خۆی خواردووە، کەسێك دارتاش بێت ماڵی بۆ کۆناکرێتەوە، بە تایبەتی پێغەمبەرانیش، چونکە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) لە هەموو کەس زیاتر دنیا نەویست بوون. سێهەم: لە دوو صەحیحەکەدا هاتووە لە ڕێگای ترەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (میراتمان لێ جێنامێنێت، هەر چیمان بەجێ هێشت ئەوە خێرو سەدەقەیە).[2] لە ڕیوایەتێکی تردا لە ترمزیەوە هاتووە بە سەنەدێکی صەحیح: (ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێ جێنامێنێت).[3] بەم پێیە ئەبێت مەبەست بەم ئایەتە: ﴿فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ۝٥ يَرِثُنِى﴾ میراتی پێغەمبەریەتی بێت، بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾ وە فەرموویەتی: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾[4] واتە: داود لە پاش خۆی سولەیمانمان بۆ بەجێ هێشت. واتە: لە پێغەمبەرێتیدا خۆ ئەگەر بۆ ماڵو سامان بوایە لە براکانی تری جیای نەدەکردەوەو باس کردنیشی هیچ سودێکی نەدەبوو، چونکە لە هەموو ئاینو شەریعەتەکاندا هاتووە منداڵ میراتی باوکی دەبات، ئەگەر

---

[1] الطبري (١٤٤/١٨).

[2] فتح الباري (٢٢٧/٦)، مسلم (١٣٨٢/٣).

[3] تحفة الأحوذي (٢٣٤/٥)، سەنەدەکە سەحیحە.

[4] النمل (١٦).

ئەم میراتیە میراتیەکی تایبەتی نەبوایە خوای گەورە باسی نەدەکرد، ئەمانە هەموو بەڵگەو نیشانەن ئەوە دەسەلمێنن کە لەم فەرموودە صەحیحەدا هاتووە: (ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێجێنامێنێت ، ئەوەی بەجێمان هێشت سەدەقەیە).[1] موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾ واتە: با میراتی منو بنەماڵەی یەعقوب بەری ئەو بکەوێت، میراتی زەکەریاو یەعقوب زانیاری بووە، چونکە زەکەریا لە نەوەی یەعقوب بووە.[2] هوشەیم دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالد بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو سالحەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾ دەڵێت: ببێتە پێغەمبەر وەك چۆن بابو باپیرانی پێغەمبەر بوون.[3] ﴿وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا﴾ واتە: پەروەردگارم ئومێدەوارم تۆش قەبوڵی بکەیو لە لای خەڵکیش جێی ڕەزامەندی بێت، خۆشت بوێتو خۆشەویستیشی بکەی لە لای خەڵکی چ دینەکەی وچ ڕەوشتەکانیشی .

﴿ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ ﴾

### قەبوڵ بوونی دوعاکەی زەکەریا

لەم ئایەتەدا (مەحزوف)ێکی تێدایە کە لێرەدا باسی لی نەکراوە، ئەو شتەیش ئەوەیە کە ئەو دوعایەی کردوویەتیو لێی قەبوڵ کراوەو پێی وتراوە: ﴿يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ﴾ واتە: ئەی زەکەریا ئێمە مژدەی منداڵێکت پی دەدەین کە ناوی یەحیایە. وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ ۖ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً ۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾[4] واتە: ئا لەو کاتەدا پاڕایەوە زەکەریا لە پەروەردگاری وتی: ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە لە لایەنی خۆتەوە کوڕێکی سروشت پاك بە ڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت، جا فریشتە بانگی لێکرد لە کاتێکدا کە زەکەریا لە میحرابەکەدا وەستابوو نوێژی دەکرد بە ڕاستی خوا مژدەت دەداتی بە (کوڕێك ناوی) یەحیایە کە بڕواهێنەرە بە عیسای وتەی خواو پێشەوایەو جڵەوگری نەفسی خۆیەتیو یەکێکە لە پێغەمبەرانی پاك کردار. ﴿لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا﴾ واتە: لە پێش

[1] تحفة الأحوذي (٢٣٤/٥)، سەنەدەکە سەحیحە.

[2] الطبري (١٤٦/١٨).

[3] الطبري (١٤٦/١٨).

[4] ال عمران (٣٨ـ٣٩).

ئەمدا کەسمان وا ناو نەناوە. قەتادەو ئیبنو جورەیجو ئیبنو زەید دەڵێن: هیچ کەسێك لە پێش ئەمدا ناونەنراوە بەو ناوە.[1] ئیبنو جەریریش (ڕەحمەتی خوای لی بێت) هەمان ڕای هەڵبژاردووە.

﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا ﴿٩﴾ ﴾

**سەرسوڕمانی زەکەریا پاش قبوڵ بوونی دوعاکەی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَكَانَتِ امْرَأَتِي عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ الْكِبَرِ عِتِيًّا ﴾ واتە: وتی: ئەی پەروەردگام من چۆن منداڵم دەبێت کە ژنەکەم نەزۆکەو منیش ئەوەندە پیرم پەکم کەوتووە، زەکەریا لەوە زۆر سەری سوڕما، کاتێك کە دوعاکەی قەبوڵ کراو مزگێنی منداڵێکی پێدرا، زۆری پی خۆش بوو، پرسیاری چۆنیەتی منداڵ بوونەکەی کرد، دەبێت چۆن بێت، ئەوە ژنەکەیەتی هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە نەزۆك بووە و منداڵی نەبووەو پیر بووەو خۆیشی پەکی کەوتووەو کەلەلا بووەو ئێسکی چووەتەیەکو توانای ژنو مێردی پێوە نەماوە، عەرەبەکان کاتێك کە (چڵە دارێك) وشك ببێت ئەڵێن: (عَتا يَعتو عَتياً وعتواً، وعسي يَعسو عسواً وعسياً) واتە: تەڕایی تێدا نەماوە.

**وەڵامی فریشتەکە بۆ زەکەریا**

﴿ قَالَ ﴾ واتە: فریشتەکە وەڵامی زەکەریای دایەوە، لەوەی کە ئەو سەری لێی سوڕماوە، ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ﴾ واتە: هەر ئەوەیە پەروەردگاری تۆ دەفەرموێت ئەوە لای من ئاسانە لە خۆتو ژنەکەت منداڵ وەدی بهێنم، نەك لە ژنێکی تر ﴿هَيِّنٌ﴾ لای خودا گران نیەو ئاسانە، پاشان خودا باسی شتێکی لەوە سەرسوڕهێنەرتری بۆ دەکات لەوەی کە داوای کردووە، دەفەرموێت: ﴿وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ شَيْئًا ﴾ واتە: من تۆم دروست کردووە لە پێشدا لە نەبوونو هیچی نەبووی، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا ﴾[2] واتە: بێگومان لەسەر ئادەمی تێپەڕی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار کە شتێکی وا نەبوو ناوببرێت.

﴿ قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِ مِنَ الْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾

---

[1] الطبري (١٨/١٤٨).

[2] الانسان (١).

## نیشانەی سك پڕبونەکە

خوای گەورە باسی زەکەریا دەکاتو دەفەرمووێت کە زەکەریا وتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً ﴾ واتە: وتی: ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم پی بدە لەسەر بوونی ئەو منداڵە کە بەڵێنت پێداوم، بۆ ئەوەی دڵم ئاو بخواتەوەو گیانم ئاسودە بێت بەو بەڵێنەی کە پێت داوم، وەك ئیبراهیم (سەلامی خوای لی بێت) دەڵێت: ﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ﴾[1] واتە: ئەی پەروەردگارم نیشانم بدە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە؟ (خوا) فەرمووی: بڕوات پێی نەهێناوە؟ وتی: بەڵی بڕوام پێیەتی بەڵام (دەمەوێت ببینم) بۆ ئەوەی دڵنیا بم. خوای گەورەیش فەرمووی: ﴿قَالَ ءَايَتُكَ﴾ نیشانەکەت ئەوەیە ﴿أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا﴾ واتە: سی شەو زمانت دەگیرێتو قسە لەگەڵ خەڵکی ناکەی تۆ تەندروستیو هیچ نەخۆشیەکت نیەو عەیبت نیە، ئیبنو عەباسو موجاهیدو عیکریمەو وەهەبو سودیو قەتادەو کەسانی تریش دەڵێن: زمانی بەسترا بەبی ئەوەی نەخۆشیەکی هەبێتو عەیبێکی تێدا بێت.[2] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت:هەر دەیخوێندەوەو تەسبیحاتی دەکرد بەڵام نەیدەتوانی قسە لەگەڵ هۆزەکەی بکات مەگین بە ئیشارەت.[3] عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا ﴾ واتە: سی شەو لەسەر یەك، ڕای یەکەمی ئیبنو عەبباسو جەماوەری زانایان ڕاست ترە، وەك خوای گەورە لە سورەتی (ال عمران)دا دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴾[4] واتە: (زەکەریا) وتی: ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم بۆ دابنی (خوا) فەرمووی: نیشانەکەت ئەوەیە کە ناتوانیت قسە لەگەڵ خەڵکیدا بکەیت سی ڕۆژ مەگەر بە ئاماژە (هێما)وتۆ زۆر یادی پەروەردگارت بکەو تەسبیحاتی خوا بکە بە ئێوارانو بەیانیان. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زەکەریا ئەو سی شەوەو ڕۆژەکانیشی قسەی لەگەڵ خەڵکیدا نەکردووە، ﴿إِلَّا رَمْزًا﴾ واتە: مەگین بەئیشارەت. بۆیەلەم ئایەتەپیرۆزەدا دەفەرمووێت: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ﴾ واتە: پاشان لە میحرابەکەیەوە چووە دەرەوە بۆ لای هۆزەکەی ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ﴾ بە هێمایەکی پەلە تێی

---

[1] البقرة (٢٦٠).

[2] الطبري (١٨/١٥٢).

[3] الطبري (١٨/١٥٢).

[4] ال عمران (٤١).

گەیاندن، ﴿أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا﴾ واتە: بەیانیان‌و ئێواران تەسبیحاتی خوا بکە لەگەڵ ئەودا لەو سی ڕۆژەدا لەسەر کردارەکانی‌و شوکرانە بژێری خوا بن بۆ ئەو ڕێزەی لێی ناوە. موجاهید دەڵێت: ﴿فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ﴾ واتە: بە هێمایەك تێی گەیاندن.[1] وەهەبو قەتادەیش هەر وایان وتووە.[2]

﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ١٢ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ١٣ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ١٤ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ١٥﴾

**لە دایك بوونی منداڵەكەو سیفەتەكانی**

ئەم ئایەتەیش (محزوف)ێکی تێدا باس نەکراوە ئەوەیش کە ئەو منداڵەی کە مزگێنی پێدراوە کە ناوی یەحیایە (سەلامی خوای لی بێت)لەدایك بوو، خوای گەورەیش تەوراتی فێرکرد کە لە نێوان خۆیاندا دەیان خوێندەوەو ئەو پێغەمبەرانەش کە لە نەوەی ئیسرائیل بوون‌و زاناو خواناسەکانی نەوەی ئیسرائیلیش بە فەرمانەکانی تەورات هەڵدەسان‌و بەجێیان دەهێنا، لەو کاتەدا یەحیا منداڵ بوو، بۆیە خوای گەورە ئیشارەتی پێ دەدات‌و ئەو بەهرەیە دەخاتە پێش چاوی خۆی‌و باب‌و دایکی دەفەرموێت: ﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ﴾ واتە: ئەی یەحیا ئەو کتێبە توند بگرەو چاك فێری ببە، زۆر خۆتی پێوە خەریك بکەو پابەندبە پێیەوەو ماندوو مەبە، ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا﴾ واتە: هەر لە منداڵیدا کارزانیمان پێداو یانی تێگەیشتن و زانیاری ولێبڕان وئیرادەبەهێزی و ڕووکردنە خێروسەرقاڵ بوون پێوەی وەهەوڵدانی بێوچانمان بەومناڵە پێدا ﴿وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا﴾ واتە: عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: بەزەیمان خستە دڵیەوە لە لایەن خۆمانەوە.[3] عیکریمەو قەتادەو زەححاکیش هەر وایان وتووە، ئەوەیان بۆ زیاد کرد: هیچ کەسێك ناتوانێ سۆزی وا بنوێنێ ئێمە نەبێت. قەتادە دەڵێت: بەو سۆزە خودا بەزەیی هاتەوە بە زەکەریادا.[4] موجاهید دەڵێت: ﴿وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا﴾ بەزەیەك بوو لە لایەن پەروەردگاریەوە بەرامبەری.[5] وە لە ئایەتەکەوە وا دەردەکوێت: ﴿وَحَنَانٗا﴾ عەتف کراوەتە سەر ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا﴾ واتە: هەر بەو منداڵیە کارزانی‌و سۆزو پاکیمان پی

---

[1] الطبري (١٨/١٥٣).

[2] الطبري (١٨/١٥٤).

[3] الطبري (١٨/١٥٦).

[4] الطبري (١٨/١٥٦).

[5] الطبري (١٨/١٥٦).

بەخشیوە. واتە: وامان لێکرد کە خاوەن بەزەیی و پاکو بێگەردی بێت، (حەنان) بریتیە لەو خۆشەویستیەی کە ئارەزوو سۆزی لەگەڵدایە، ﴿وَزَكَوٰةً﴾ عەتف کراوەتە سەر ﴿وَحَنَانًا﴾ (الزكاة) واتە: پاکی و بێگەردی لە پیس و چەپەڵی و گوناهو تاوان، قەتادە دەڵێت (الزكاة) واتە: ئاکاری چاك.[1] زەححاك و ئیبنو جورەیج دەڵێن: ئاکاری چاك و پاك.[2] عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿وَزَكَوٰةً﴾ واتە:موبارەك. ﴿وَكَانَ تَقِيًّا﴾ واتە: پاك و خۆپارێز بووە لە گوناه.[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبَرًّا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾ واتە: لەگەڵ دایك و باوکیشیدا چاك بووەو توندوتیژو لاساریش نەبووە، کاتێك خوای گەورە باسی گوێڕایەڵی یەحیا دەکات بۆ پەروەردگاری کە هەر بە پاکی و بە بەسۆزی و لە خواترس دروستی کردووە، دێتە سەر باسی ئەوەی کە چەندە لەگەڵ باب و دایکیشی چاك بووەو هەرگیز دڵی نەیەشاندوون بە قسەیەك یان بە کردارێك یان بڵی بۆ ئەوە دەکەن یان بۆ ئەوە ناکەن، بۆیە دەفەرموێت: ﴿وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيًّا﴾ .پاش ئەو گشت وەسفەجوان و چاکانەی، باسی پاداشتدانەوەی چاکەکانی دەکات دەفەرموێت: ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيًّا﴾ واتە: سەلامی لی بێت ڕۆژێك کە لە دایك بووەو ڕۆژی کە دەمرێت و ڕۆژی کە زیندوو دەکرێتەوە، واتە: لەو سی کاتەدا ترسی نیەو پارێزراوە، سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێت: ترسناکترین شتێك کە مرۆڤ بەسەری دێت لە سی شوێندایە، ڕۆژێك کە لە دایك دەبێت، خۆی لە شوێنێکدا دەبینێت کە پێی ڕا نەهاتووەو جیاوازە لەو شوێنەی تێدابووە. وە ڕۆژی کە دەمرێت کەسانێك دەبینێت کە پێیان ئاشنا نەبووەو نەیبینیون، وە ڕۆژی زیندوو دەکرێتەوە خۆی دەبینێت لەناو قەرەباڵغیەکی زۆر گەورەدایە،جا سوفیان دەڵێت: خوای گەورە لەو شوێنانەدا ڕێزی لە یەحیای کوڕی زەکەریا ناوەو تایبەت سەلامی لی دەکات، دەفەرموێت: ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيًّا﴾ ئیبنو جەریر ئەمەی ڕیوایەتی کردووە لە ئەحمەدی کوڕی مەنسوری مەروزیەوە لە سەدەقەی کوڕی فەزلەوە.

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانًا شَرۡقِيًّا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابًا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ

---

[1] الطبري (١٨/١٥٩).

[2] الطبري (١٨/١٥٩).

[3] الطبري (١٨/١٥٩)، الدر المنثور (٥/٤٨٦).

لِأَهَبَ لَكِ غُلَـٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَـٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾﴾

**بەسەرهاتی مەریەم و مەسیح (سەلامی خوای لی بێت)**

کاتێك خوای گەورە باسی بەسەرهاتی زەکەریای کرد، کە منداڵێکی پێ بەخشی لە کاتی پیری و نەزۆکی ژنە کەیدا، بوو ئەو منداڵە زۆر چاكو پاكو پیرۆز بوو، بە دوای ئەو ڕووداوەدا باسی ڕووداوی مەریەمیش دەکات چۆن خودا عیسا پێغەمبەریشی لە ئەو وەدی هێنا بەبی باوك، لە نێوان ئەم دوو ڕووداوەدا لەیەك چوونێك هەیە، بۆیە خوای گەورە لە سورەتی (ال عمران)و ئەم سورەتەیشدا باسی هێناون، وە لە سورەتی (الأنبياء)یشدا دیسان باسی هێناون، چونکە لە مانادا زۆر لە یەکەوە نزیکن، بۆ ئەوەی سەرنجی عەبدەکانی ڕاکێشێت بۆ ئەو توانا مەزنەی خۆی کە هەرچی مەیلی لی بێت دەتوانێت بیکات، دەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَـٰبِ مَرْيَمَ﴾ واتە: لەم کتێبەدا باسی مەریەمیش بکە. ناوی مەریەمی کچی عیمرانە لە بنەماڵەی داودە (سەلامی خوای لی بێت) لە بنەماڵەیەکی پاکی چاکە لە نەوەی ئیسرائیل، خودای مەزن باسی لە دایك بوونی دەکات لە سورەتی (ال عمران)دا. کاتێك لە دایك بوو، دایکی کردیە نەزری قودسی پیرۆز (بيت المقدس) چونکە ئەوەیان بە عیبادەت ئەزانی. خودایش لیی قەبوڵ کرد وەك دەفەرموێت: ﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا ﴾[1] واتە: ئینجا پەروەردگار مەریەمی وەرگرت بە وەرگرتنێکی جوانو ڕواندی بە ڕواندنێکی جوان. واتە ، لەناو نەوەی ئیسرائیلدا زۆر بە چاکی پەروەردەکراو بووە خواناسێکی زۆر دیارو بەناوبانگ، بەو عیبادەتە زۆرو چاكو بەردەوامەی، زەکەریا کە مێردی خوشکی بوو(هەندێکیش ئەڵێن مێردی پوری بووە ) یەکێکیش بوو لە پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل سەرپەرشتی بەخێو کردنی دەکرد، کە زۆر پیاوێکی مەزن بوو لە نێوانیاندا بۆ کاروباری ئاینیان هۆزەکەی پرسیاریان لەو دەکرد، زەکەریا (سەلامی خوای لی بێت) کەرامەتی زۆر گەورەی وەدی دەکرد لەژیانی مەریەمەدا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[2] واتە: هەر کات زەکەریا بڕۆیشتایە بۆ لای مەریەم لە شوێنی خواپەرستیەکەیدا خواردەمەنی لە لا دەبینی (زەکەریا) ووتی: ئەی مەریەم! ئەمەت لە کوێ بوو (مەریەم) وتی: ئەوە لە لایەن خواوەیە بە ڕاستی خوا ڕۆزی دەدات بە هەر کەسێك کە بیەوێت بەبی شومار.واباس ئەکرێ کە

[1] ال عمران (٣٧).

[2] ال عمران (٣٧).

زەکەریا بەروبوومو میوەی زستانەی لە کاتی هاویندا لە لا دەبینی، هی هاوینیشی لە زستاندا لە لا دەبینی، وەك لە پێشەوە لە سورەتی (ال عمران)دا باس کرا، وەختێك خوای گەورە مەیلی لی بوو (هەموو کارێکی پڕە لە کارزانیو قسەی کاربڕ) کە عەبدو پێغەمبەری خۆی لە مەریەم وەدی بهێنێت کە یەکێکە لە پێنج پێغەمبەرە لێبڕاوە نەبەردە مەزنەکان، ﴿إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا﴾ واتە: وەختێك دوور کەوتەوە لە کەسوکاریو شوێنێکی لە ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی قودسی پیرۆزەوە بۆ خۆی هەڵبژارد ئیبنو عەباس دەڵێت: من لە هەموو کەسێك چاکتر دەزانم لەبەرچی مەسیحیەکان ڕۆژهەڵاتیان کردە قیبلەو ڕووگە ،لەبەر ئەم ئایەتە بووکە ئەفەرموێ: ﴿إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا﴾ شوێنی لەدایك بوونی عیسایان(سەلامی خوای لی بێت) کردە قیبلە.[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا﴾ واتە:مەریم لە نێوان خۆیو ئەواندا پەردەیەکی گێڕایەو بۆ ئەوەی لێیان دیار نەبێت، خوای گەورە جوبرەئیلی نارد بۆ لای (سەلامی خوای لی بێت) ﴿فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا﴾ وەك مرۆڤێکی ئاسایی هاتە بەرچاوی، موجاهیدو زەححاكو قەتادەو ئیبنو جورەیجو وەهەبی کوڕی مونەبیهو سودی لەم ئایەتەدا: ﴿فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا﴾ دەڵێن: واتە: جوبرەئیل (سەلامی خوای لی بێت).[2] ﴿قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا﴾ واتە: مەریەم وتی: من پەنا دەبەمە بەر خودا لە تۆ ئەگەر تۆ لە خوا ترسی، واتە: کاتێك کە جوبرەئیل لە شێوەی مرۆڤێکدا خۆی نیشان دا، مەریەم بە تەنها بوو، لە نێوان خۆیو خزمەکانیدا پەردەیەکی گێڕابووەوە. ترساو وای زانی بۆ ئەو هاتووە، بۆیە وتی: ﴿إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا﴾ واتە: خوای وەبیر هێنایەوەو وتی ئەگەر لە خوا ترسی، ئەمەیش شتێکی دروستە بۆ بەرگری لە خۆکردن، هەتا بکرێت بە شێوەیەکی ئاسانتر ڕزگارت ببێت چاکترە. بۆیە لە سەرەتاوە بە پەنا بردن بۆ خوا ترساندی، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە (عاسیم)ەوە دەڵێت: ئەبو وائل بەسەرهاتەکەی مەریەمی باس کردو وتی: مەریەم دەیزانی لە خواترس خاوەنی پیاوەتیو جوامێریە، کاتی کە وتی: ﴿إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا﴾، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ﴾ واتە: فریشتەکە وەڵامی دایەوەو پێی وت: من لە لایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانە کراوم، بۆ ئەوەی ئەو گومانەی بۆی پەیدا بووەو ئەو ترسەی لێی نیشتووە برەوێتەوەو نەیمێنێت،وتی:من ئەوە نیم تۆگومانت بۆی ئەچێت بەڵکو خودا منی ناردووە بۆ لای

---

[1] الطبري (١٨/١٦٢).

[2] الطبري (١٨/١٦٣).

تۆ.[1] ئەڵێن : کاتێك مەریەم پەنای برد بە خوا جوبرەئیل لە ترسا لەرزی و چوویەوە شێوەکەی خۆیو وتی: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَـٰمًا زَكِيًّا﴾ واتە: من لە لایەن خوداوە ڕاسپێردراوم بۆلای تۆ تا منداڵێکی پاكو خاوێنت پی ببەخشم. ﴿قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَـٰمٌ﴾ مەریەم سەری سوڕما لەو قسەیەو وتی: من چۆن منداڵم دەبێت؟ واتە: ئەو منداڵە بە چ شێوەیەك پەیدا دەبێت لە من، کە خاوەنی مێرد نیمو خراپەیش لە من ناوەشێتەوە بۆیە وتی: ﴿وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا﴾ واتە: دەستی کەسم لی نەکەوتووەو هەرگیز(باغی) و داوێن پیسیش نەبووم. لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کرێی(بەغی) و داوێن پیسی حەرام کردووە.[2] ﴿قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ﴾ واتە: بڕیار هەر ئەوەیەو قسەی پەروەردگارتە و دەفەرمووێت ئەوە لای من ئاسانە. واتە: جوبرەئیل وەڵامی دایەوە لەسەر ئەو پرسیارەی کردی دەڵێت: خوای گەورە فەرموویەتی بەو زووانە تۆ منداڵێکت دەبێت، با مێردیشت نەبێت، وە تۆ ئافرەتێکی پاد داوێنیو خودا ئارەزووی هەر شتێکی بوی دەیکاتو خاوەن توانایە، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾ واتە: تا بیکەینە نیشانەو بەڵگەیەك بۆ خەڵکی کە خودا وەدیهێنەریانەو بە هەر شێوەیەك مەیلی لی بێت دروستیان دەکات، ئەوەتا بابیان ئادەمی دروست کردووە بەبی نێرینەو مێینەو حەوایشی دروست کردووە لە نێرینە بەبی مێینەو بەرەی ئادەمیشی لە نێرینەو مێینە وەدی هێناوە، تەنها عیسا نەبێت کە لە مێینە دروستی کردووە بەبی نێرینە، خوای گەورە بە چوار جۆر مرۆڤی وەدی هێناوە، ئەوەیش نیشانەی دەسەڵاتو توانای تەواوی خوای گەورەیە کە غەیری ئەو هیچ کەسێك خودا نیەو هەر ئەویش پەروەردگارە، ﴿وَرَحْمَةً مِّنَّا﴾ واتە: دەمانەوێت ئەو منداڵە چاکەیەك بێت لە ئێمەوەو یەکێکیش بی لە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لی بێت) بانگی خەڵکی بکات بۆ خواناسیو پەرستنی بە تەنها، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾[3] واتە: کاتێك کە فریشتەکە وتی: ئەی مەریەم بێگومان خوا مژدەت دەداتی بە وتەیەك لەوەوە کە ناوی مەسیح (عیسا)ی کوڕی مەریەمە بەڕێزو پایە بەرزە لە هەردوو جیهانداو لە نزیکانی

---

[1] الطبري (١٨/١٤).

[2] أحمد (١/٢٣٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] ال عمران (٤٥ـ٤٦).

خواوەندە ، قسە دەکات لەگەڵ خەڵکیدا لە بێشکەداو لە (کاتی) گەورەییداو لە پیاوچاکانیشە. واتە: بانگی خەڵکی دەکات بۆ ناسینی پەروەردگاری لە ناو بێشکەو بە گەورەیش، ﴿وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا﴾ واتە: ئەم قسەی جوبرەئیلە کە دەیکات بۆ مەریەمو هەواڵی دەداتی، کە ئەمە فەرمانی خودایەو لە لای ئەو بڕاوەتەوەو مەیلی خۆیەتی دەبی هەر بێتەجی، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: ﴿وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا﴾ واتە: خودا بڕیاری ئەمەی داوە،و هیچ چارەنوسێك نیە دەبێت بێتەجی[1].

﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾﴾

## پەیدابوونی منداڵەکەو پاشان لە دایك بوونی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا﴾ واتە: منداڵەکە کەوتە سکیو دوو گیان بوو بەو سکەوە ڕۆیشت بۆ شوێنێکی دوور. خوای گەورە باسی مەریەم دەکات کاتێك کە جوبرەئیل لە لایەن خوداوە هەواڵی دایە کە ئەو فەرموویەتی، مەریەم ڕەزامەندی خۆی دەربڕی بۆ فەرمانی خودای گەورە. زۆرێك لە زانایانی پێشینە وتوویانە ئەو فریشتە جوبرەئیل بووە (سەلامی خوای لی بێت) لەو کاتەدا فووی کردووە بە باخەڵی کراسەکەیدا فووەکە ڕۆیشتە خوارەوە هەتا چووە ناو عەیبیو سکی پڕبوو بەو منداڵەوە بە ئیزنی خوای گەورە، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: کاتێك کە دووگیان بوو بە منداڵەکە وە سکی بەرز بووەوەو ئێشی لی هاتو خوێنو عادەی نەماو بڕاو تووشی ئەو شتانە بوو کە دووگیان تووشی دەبێت کە منداڵ کەوتە سکی، وەك ئارەزووی خواردنو بێزوو هەست بە ئێشو ئازارکردنو ڕەنگ گۆڕانو هەتا وای لێهات زمانی قڵیش قڵیش بوو، ئەوەی تووشی ئەم خانەوادەی زەکەریا هاتووە بەسەر کەسی تر نەهاتووە. لەناو نەوەی ئیسرائیلدا ئەم دەنگو باسە بڵاوەی کرد دەیان وت: ئەمە کاری یوسفی هاوەڵیەتی ، چونکە ئەو نەبێت کەسی تری لەو کلێسایەدا لەگەڵ نەبووە، دوورکەوتەوە لە خەڵکی پەردەیەکی گێڕایەوە هەتا کەس نەی بینێتو ئەویش چاوی بە کەس نەکەوێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ﴾ واتە: کاتێك کە ژانی منداڵ بوونی لی هات وای لی کرد چووە لای دارخورمایەك لەو شوێنەی کە مەبەستی بوو، زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر شوێنەکە، سودی دەڵێت: لە لای خۆرهەڵاتی میحرابەکەیەوەیە کە نوێژی تیا دەکرد لە (بيت المقدس).[2] وەهەبی کوڕی مونەبیە (مُنَبِّه) دەڵێت:

---

[1] الطبري (١٨/١٦٥).

[2] الطبري (١٨/١٦١).

ڕۆیشتو سەری خۆی هەڵگرتو ڕای کرد کاتێك کە لە نێوان شامو وڵاتی میسردا بوو، ژانی منداڵ بوونی لی هات.[1] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە وەهەبەوە دەڵێت: شوێنێکە کە هەشت میل لە (بیت المقدس)ەوە دوورە لە گوندێك لەو ناوەدا کە پێی دەڵێن (بیت لحم).[2] منیش ئەڵێم: لە فەرموودەکانی (الاسراء)دا کە نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لی بێت) ئەو شوێنە (بیت لحم)ە.[3] بەیهەقیش ڕیوایەتی کردووە لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە (ڕەزای خوای لی بێت) کە ئەو شوێنە (بیت لحم)ە.[4] والله أعلم، ئەم ڕیوایەتە کە خەڵکی لە یەکترەوە پێیان گەیشتووە مەشهورە، مەسیحیەکان بێگومانن کە ئەو شوێنە (بیت لحم)ە، خەڵکی بەو شێوەیە وەریان گرتووە، فەرموودەیش لەو بارەیەوە هاتووە ئەگەر فەرموودەکە ڕاست بێت، پاشان خوای گەورە لە بارەی مەریەمەوە دەفەرمووێت: ﴿قَالَتْ يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ واتە: مەریەم وتی: خۆزگە بەر لە ئەمە دەمردمو لە بیردەچوومەوەو هەر باسیشم نەدەبوو، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دروستی ئاوات خواستن بەمردن لە کاتی توش بوونی بەڵادا  چونکە مەریەم دەیزانی تووشی تاقیکردنەوەو بەڵا دەبێت، بە هۆی ئەم منداڵەوە خەڵکی بەو شێوە ڕاستەی خۆی بڕوای پی ناکەنو ئەو قسانەی کە باسی دەکات نایسەلمێننو بە ڕاستی نازانن، پاش ئەوەی کە مەریەم بە لای ئەوان خواناسێکی چاكو خۆپارێز بووە، وای لی هاتووە، گومان دەبەن کە ژنێکی خراپو داوێن پیسە، بۆیە وتی: ﴿يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا﴾ واتە: خۆزگە پێش ئەم بەسەرهاتە دەمردم، ﴿وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ واتە: هەر وەدی نەهاتمایەو نەبوومایە، ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسە.[5] قەتادە دەڵێت: ﴿وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ واتە: نەناسرامایەو باسم نەبووایە، کەس نەیزانیایە من کێم.

﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا (٢٤) وَهُزِّيٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا (٢٦)﴾

[1] الطبري (١٨/١٧٠).
[2] الطبري (١٨/١٧٠).
[3] النسائي في الكبرى (١/٢٢١).
[4] دلائل النبوة (٢/٣٥٥).
[5] الطبري (١٨/١٧٢).

**ئەو قسانەی بە مەریەم دەوترا دوای منداڵ بوونەکەی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا﴾ واتە: لە خواریەوە بانگی کرد خەفەت مەخۆ پەروەردگارت لە ژێر تۆدا جۆگە ئاوی دەرهێناوە، هەندی خوێندوویانەتەوە بە (مَنْ تَحتَها) واتە: ئەوەی لە خواریەوەیە، هەندێکی تر بە (مِن تَحۡتِهَآ )یان خوێندووەتەوە، واتە بە حەرفی جەڕ، زانایانی تەفسیر ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی لە خوارەوە، ئەو کەسە کێیە؟ عەوفیو کەسانی تریش وتووینە: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ﴾ واتە: جبریل.[1] چونکە عیسا قسەی نەکردووە هەتا مەریەم هێنایە لای هۆزەکەی، سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاکو عەمری کوڕی مەیمونو سودیو قەتادەیش دەڵێن ئەو کەسە جوبرەئیلی فریشتە بووە (سەلامی خوای لی بێت).[2] واتە: لە خوارووی شیوەکەوە (دۆڵەکەوە) بانگی کرد. موجاهید دەڵێت: ﴿فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ﴾ واتە: عیسای کوڕی مەریەم بانگی کرد. عبدالرزاقیش دەڵێت: لە موعەممەرەوە لە قەتادەوە دەڵێت، حەسەن دەڵێن: ئەوەعیسای کوڕی بووە (سەلامی خوای لی بێت). ئەوە یەکێکە لەو دوو ڕیوایەتەی لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە، ئەوەی بانگی کردعیسای کوڕی بووە (سەلامی خوایان لی بێت). وە دەڵێت: ئایا گوێت لە خوای گەورە نیە کە دەفەرموێت: ﴿فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِ﴾ واتە: ئیشارەتی بۆ منداڵەکەکرد. ئیبنو زەیدو ئیبنو جەریریش ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە، ﴿أَلَّا تَحۡزَنِي﴾ واتە: پاشان بانگیکرد وتی: خەفەت مەخۆ، ﴿قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا﴾ واتە: پەروەردگارت لە ژێرتدا ئاوێکی دەرهێناوە، سوفیانی سەوریو شوعبە دەڵێن لە ئیبنو ئیسحاقەوە لە بەڕای کوڕی عازیبەوە: ﴿قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا﴾یانی : جۆگە ئاو.[3] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە (السری) واتة: ڕووبار.[4] عەمری کوڕی مەیمونیش دەڵێت: (السری) واتە: ڕووبارێك کە ئاوی لی دەخورێتەوە.[5] موجاهید دەڵێت (السری) واتە: ڕووبار بە _سریانی_.[6] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: (السری) واتە:

---

[1] الطبري (١٨/١٧٣).
[2] الطبري (١٨/١٧٣).
[3] الطبري (١٨/١٧٥).
[4] الطبري (١٨/١٧٦).
[5] الطبري (١٨/١٧٦).
[6] الطبري (١٨/١٧٦).

ڕووباری بچووك بە زمانی نەبەتی.[1] هەندێکی تر وتوویانە: مەبەست بە( سەری) عیسا پێغەمبەرە (سەلامی خوای لی بێت)، لەوانە حەسەنی بەسریو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو محمدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەرو قەتادەیش لە ڕیوایەتێکیداو عبدالرحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان وتووە، بەڵام ڕای یەکەم دیارو ڕوونترە. بۆیە لە دوای ئەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ﴾ واتە: کۆتەرەی ئەو دارخورمایە ڕاوەشێنە، خوای گەورە منەت دەکات بەسەر مەریەمدا کە خواردنو خواردنەوەی بۆ وەدی هێناوە وەك دەفەرموێت: ﴿تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ۝٢٥ فَكُلِي وَٱشۡرَبِي وَقَرِّي عَيۡنٗاۖ﴾ واتە: دارخورمایەکە ڕاوەشێنە خورمای تازەو تەڕ بەسەرتدا دەبارێت بە چاوی ڕوونو دڵی خۆش بخۆو بخۆرەوە، بۆیە عەمری کوڕی مەیمون دەڵێت: هیچ شتێك نیە لە خورمای تازەی پێگەیشتوو چاکتر بێت بۆ ژنی زەیسان (النفاسد) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ أَحَدٗا﴾ واتە: هەر کەسێکت بینی لە مرۆڤ، ﴿فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا﴾ واتە: بڵێ من بڕیارم داوە کە ئەمڕۆ قسە لەگەڵ هیچ کەسێك نەکەم، مەبەست بەم قسەیە هێماکردنە، نەك قسەکردن بە وتە لەبەر ئەوەی دژایەتی پەیدا نەکات لەگەڵ ئەمەدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيّٗا﴾ ئەنەسی کوڕی مالیك لەم ئایەتەدا: ﴿إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمٗا﴾ دەڵێت: (صمتاً) واتە: نەزرم کردووە لەسەر خۆم بۆ خودا کە قسە نەکەم.[3] ئیبنو عەبباسو زەحاکیش هەر وایان وتووە.[4] مەبەستەکە ئەوەیە کاتێك کە لە ئاینی ئەواندا ڕۆژوویان گرتبێت خواردنو قسەکردنیشیان لی قەدەغە(حەرام) کراوە، ئەمە قسەی سودیو قەتادەو عبدالرحمانی کوڕی زەیدە.[5] عبدالرحمانی کوڕی زەید دەڵێت: کاتێك کە عیسا وتی بە مەریەم (سەلامی خوایان لی بێت): ﴿أَلَّا تَحۡزَنِي﴾ مەریەم وتی: چۆن خەم نەخۆم کە تۆ لە لامی نە خاوەنی مێردمو نە کەنیزەکیشم؟ واتە: چ بیانوویەکم بە دەستەوەیە بۆ خەڵکی؟ خۆزگە پێش لەمە دەمردمو هەر باسیشم نەدەبوو، عیسا وتی بە دایکی: من لە باتی تۆ وەڵامیان دەدەمەوە، ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلۡبَشَرِ

[1] الطبري (١٨/١٧٦).

[2] الطبري (١٨/١٧٩).

[3] الطبري (١٨/١٨٢/١٨٢).

[4] الطبري (١٨/١٨٢/١٨٢).

[5] الطبري (١٨/١٨٣)، القرطبي (١١/٩٨).

أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرۡتُ لِلرَّحۡمَٰنِ صَوۡمًا فَلَنۡ أُكَلِّمَ ٱلۡيَوۡمَ إِنسِيًّا﴾ عبدالرحمانی کوڕی زەید دەڵێت: ئەم قسانە قسەی عیسایە کە بە دایکی وت، وەهەبیش هەر وای وتووە.

﴿فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيۡنَ مَا كُنتُ وَأَوۡصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمۡتُ حَيّٗا ﴿٣١﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿٣٣﴾﴾

**مەریەم لەگەڵ عیسادا لەبەردەم هۆزەکەیداو نارەزایی هۆزەکەی لێی‌و وەڵامدانەوەی عیسا (سەلامی خوای لی بێت) بۆیان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَتَتۡ بِهِۦ قَوۡمَهَا تَحۡمِلُهُۥۖ قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا﴾ خوای گەورە باسی مەریەم دەکات کاتێك هاتەوە ناو هۆزەکەی‌و منداڵێکی بە باوەشەوە بوو، فەرمانی پێدرابوو کە ئەو ڕۆژە بێدەنگ بێت‌و قسە لەگەڵ کەسدا نەکات لە مەردم، خوای گەورە خۆی بە کارەکانیا دەگات‌و ئەوی بەسە، خۆی تەسلیمی فەرمانی خوای گەورە کردو پێی ڕازی بوو، کاتێك هۆزەکەی بەو شێوەیە چاویان پێی کەوت زۆر بە لایانەوە گران بوو، بێزاری خۆیان دەربڕی لێی: ﴿قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا﴾ وتیان: ئەی مەریەم! وامان سەیر نەدەکرد کە شتی وا گەورە لە تۆ ڕووبدات. موجاهیدو قەتادەو سودی‌و کەسانی تریش دەڵێن: واتە: کارێکی وا گەورە.[1] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە نەوفی بیکالیەوە دەڵێت: هۆزەکەی ڕۆیشتن دەگەڕانبۆی، دەڵێت: مەریەم لەبنەماڵەیەکی بەڕێزبوو هەریەخانەدانی و پێغەمبەرایەتی هاتبوون،زۆر گەڕان وهیچیان چنگ نەکەوت ،گاوانێکیان بینی ووتیان: ئافرەتێکی لەوشێوەو لە شێوەیەت بەرچا و نەکوتووە(بۆیان وەسف کرد) وتی: نەخێر، بەڵام من ئەمشەو شتێکم لەمانگاکانم دا چاو پی کەوتووە هەرگیز لێم نەبینیون، وتیان: چیت لی بینیون؟ وتی: بینیم ئەمشەو ڕووەو ئەو شیوە (الوادی) سوژدەیان دەبرد. عبدالله ی کوڕی زیاد دەڵێت: لە( سەییار) هوەئەمەم لەبەرکردووە کە گاوانەکەی پێی ووتن: ڕووناکیەکی درەوشاوەم چاو پێکەوت، خەڵکەکە ڕوویان کردە ئەو شوێنەی کە ئەم پێی وتن، مەریەم بەرەو ڕوویان هات، کاتێك مەریەم چاوی پێیان کەوت دانیشت‌و منداڵەکەی خستە باوەشی، خەڵکەکە هاتن‌و لێی کۆبوونەوەو دەورەیان دا، ﴿قَالُواْ يَٰمَرۡيَمُ لَقَدۡ جِئۡتِ شَيۡـٔٗا فَرِيّٗا﴾ واتە: وتیان شتێکی سەیرو سەمەرە

---

[1] الطبري (١٨/١٨٥).

ڕووی داوە لێت. واتە ئێمە وامان بۆ نەدەڕوانیت، ﴿يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ﴾ واتە: ئەی خوشکی هارون! یان ئەو کەسەی لە خواناسیدا لە هارون دەچی، ﴿مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٖ وَمَا كَانَتۡ أُمُّكِ بَغِيّٗا﴾ واتە: نە باوکت پیاو خراپ بووەو نە دایکیشت داوێن پیس بووە، تۆ لە بنەماڵەیەکی پاکو چاکو ناسراو بە چاکەخوازو خۆپارێز بوویت، کەی کاری وا لە تۆ چاوەڕوان کراوە ڕوویدات؟ !عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو سودی دەڵێن پێی وتراوە: ﴿يَٰٓأُخۡتَ هَٰرُونَ﴾ واتە: ئەی خوشکی هارونی برای موسا، چونکە مەریەم لە تۆرمەی ئەوە. وەك چۆن دەوترێت بە تەمیمیەك: (یا أخا تمیم) وە دەوترێت بە موزەڕیەك (یا أخا مضر).[1] وە وتراویشە: پیاوێك لە ناویاندا بووە ناوی هاروون بووە، نسبەتی مەریەمیان داوەتە پاڵ ئەو پیاوچاکە لەخواناسیو دنیا نەویستیدا، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا﴾ واتە: ئیشارەتی بۆ منداڵەکە کرد، وتیان: چۆن ئێمە قسە لەگەڵ منداڵێکی ناو بێشکە بکەین، چونکە ئەوانە بە گومان بوون لەو کارەی مەریەمو بڕوایان پێ نەدەکرد، بوختانیان بۆ دەکردو لەو بارەیەوە قسەی زۆریان دەوت، مەریەم ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بوو قسەی نەدەکرد.ئەوان هەرچیان دەوت مەریەم هێمای بۆ دەکردن کە قسە لەگەڵ منداڵەکە بکەن، لەگەڵ ئەو بدوێن، ئەوانیش زیاتر تووڕە دەبوونو وایان دەزانی گاڵتەیان پێ دەکات دەیانوت: ﴿كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا﴾، مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێت: ﴿فَأَشَارَتۡ إِلَيۡهِۖ﴾ مەریەم ئیشارەتی بۆ کرد لەگەڵ منداڵەکە بدوێن، وتیان: لەگەڵ ئەوە دا ئەم کارە گەنەشی کردووە کەچی ، پێمان دەڵێت لەگەڵ منداڵێك قسە بکەین کە بوویەتیو لەناو بێشکەدایە.[2] سودی دەڵێت کاتێك ئیشارەتی کرد بۆ لای منداڵەکە تووڕە بوونو وتیان: ئەم گاڵتەکردنەی پێمان زۆر خراپو تاوانترە لامان لە داوێن پیسیەکەی کە فەرمانمان پێ دەکات قسە لەگەڵ ئەم منداڵەدا بکەین لەناو بێشکەدایە، ﴿قَالُواْ كَيۡفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلۡمَهۡدِ صَبِيّٗا﴾.[3] واتە: منداڵێك بەو ساواییە لەناو بێشکە دابێت چۆن قسە دەکات؟ منداڵەکە وتی: ﴿إِنِّي عَبۡدُ ٱللَّهِ﴾ من عەبدی خودام، یەکەم شتێك لە دەمی هاتە دەر باسی پاکیو بی عەیبی خودای کرد کە خودا منداڵی نیەو ئەمیش عەبدی خودایەو هەر خودایش پەروەردکاریەتی، ﴿ءَاتَىٰنِيَ ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيّٗا﴾ واتە: کتێبی داومەتیو کردومی بە پێغەمبەر، لێرەدا داوێن پاکی دایکی دەسەلمێنێت بۆ

[1] الطبري (١٨٧/١٨).

[2] الدر المنثور (٥٠٨/٥).

[3] الطبري (١٨٩/١٨).

ئەو بوختانەی بۆیان هەڵبەستبوو، نەوفی بیکالی دەڵێت: کاتێك ئەوانە ئەو قسەیان بەرامبەر مەریەمی دایکی کرد، مەمکی دایکی دەمژی، مەریەم مەمکەکەی لە دەمی لابردو لەسەر لای چەپی داینا مندالەکە وتی: ﴿إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا﴾ هەتا دەگاتە ﴿مَا دُمْتُ حَيًّا﴾. پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ﴾ واتە: لە هەر کوێش بم پیرۆزی کردووم، موجاهیدو عەمری کوڕی قەیس‌و سەوری دەڵێن: واتە: کردوومی بە مامۆستا بۆ چاکە.[1] لە ڕیوایەتێکی تردا لە موجاهیدەوە دەڵێت: (مباركاً) واتە :زۆر بەسوود.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە وەهیبی کوڕی وەردەوە مەولای بەنی مەخزوم دەڵێت :زانایەك گەیشتە لای زانایەکی لە خۆی زاناتر پێی وت: لەو کارو کردەوانەی کە هەمە چی ئاشکرا بکەم‌و بگەیەنم؟ وتی: فەرمان دان بە چاکەو قەدەغەکردن لە خراپە، چونکە ئەوە ئاینی خودایە کە پێغەمبەرەکانی خۆی پێدا ناردووە بۆ بەندەکانی، هەموو زانایانی فیقهزانەکان یەکدەنگن لەسەر ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ﴾ وتویانە: موبارەکیەکەی کامەیە؟ وەڵام دراوەتەوە:ئەوەیە فەرمان بە چاکەئەکات بەرگری لە خراپە ئەکات لە هەر کوێیەك بێت.[3] ﴿وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾ واتە: داواشی لی کردوم کە نوێژ بکەم‌و زەکات بدەم هەتا زیندووم. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە فەرمان بە حەزرەتی محمددەکات و دەفەرموویت: ﴿وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ﴾[4] واتە: پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پی دەگرێت. عبدالرحمانی کوڕی قاسم دەڵێت لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾ دەڵێت: هەواڵی هەموو ئەو شتانەی داوەتیّ کە لە ئەو ڕوو دەدات هەتا دەمرێت ئەم قسەیە چەند ڕوونە بۆ ئەوانەی بڕوایان بە قەزاو قەدەر نیە[5]! وە دەفەرموویت: ﴿وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي﴾ واتە: فەرمانی پێداوم لەگەڵ دایکیشم چاك بم، دوای گوێڕایەڵی خودا باسی چاکەکردنی کردووە لەگەڵ دایکی، چونکە خودای گەورە زۆرجار کە باسی عبادەتی خۆی کردووە باسی چاکەکردنیشی کردووە لەگەڵ دایك‌و باوك. وەك دەفەرموویت: ﴿وَقَضَىٰ

---

[1] الطبري (١٨/١٩١).
[2] الطبري (١٨/١٩١).
[3] الطبري (١٨/١٩١).
[4] الحجر (٩٩).
[5] القرطبي (١١/١٠٣).

رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾[1] واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێك نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایكو باوكتان چاكە بكەن. وە دەفەرموێت: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾[2] واتە: (فەرمانمان بە ئادەمی دا) کە سوپاسگوزاری من و باوكو دایكت بكە تەنها بۆ لای منە گەڕانەوەتان. وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ واتە: نەی كردووم بە زۆردارێكی لاسارو فیزنل کە لە فەرمانی دەرچمو عبادەتی نەكەمو خراپە لەگەڵ دایكم بكەمو بەدبەخت ببم، پاشان خودای مەزن لەسەر زمانی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لی بێت) دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾ واتە: سڵاوم لی بێت ڕۆژێك کە لە دایك بوومو ڕۆژی کە دەمرمو ڕۆژێكیش کە زیندوو دەكرێمەوە. لێرەدا بەندایەتی خۆی دەسەلمێنێت بۆ خودای گەورە، کە ئەمیش دروست كراوێكە لە دروستكراوەكانی خودا دەبیو دەمریو زیندوو دەكرێتەوە وەك ئەو خەڵكەی تر بەڵام لەو كاتانەدا سەلامەتە کە ناڕەحەتترینو گرانترین كاتە لەسەر بەندەكانی خودا، درودو سەلام لەسەر عیسا پێغەمبەر.

﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾﴾

**عیسا عەبدی خودایەو كوڕی خودا نیە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ واتە:ئەمەیە قسەی ڕاست لەسەر عیسای كوڕی مەریەم کە ئەوان تێیدا دوو دڵن، خوای گەورە باسی عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لی بێت) دەكات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ئەوەی کە بۆ تۆمان گێڕاوەتەوە لە بارەی عیساوە (سەلامی خوای لی بێت) ﴿قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾ ئەوقسەڕاستە یە كەئەوان تێیدا دوودڵن ، واتە: ئەوانەی شوێنی پڕوپوچ كەوتوونو بڕوایان پێی نیەوئەوانەیش لەسەرهەقنو بڕوایان پێی هەیە كێشەیانە لەسەری، بۆیە زۆرێك خوێندوویانەتەوە بە (قَولُ الحق) بە ڕەفعی (قَولُ) ،عاسیم و عەبدوڵای كوڕی عامریش خوێندوویانەتەوە بە مەنسوبی (قَولَ)، ئیبنو مەسعودیش

[1] الاسراء (٢٣).
[2] لقمان (١٤).

خوێندوویەتیەوە بە: (ذلك عيسى ابن مريم قال الحق)[1] ڕەفعەکە لە ڕووی ئیعرابەوە باشتر دیارە. ئەم ئایەتەیش دەبێتە پشتگیر بۆئەم (رەفعه) کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾[2] واتە: ڕاست ئەوەیە (کە بۆت هاتووە) لە پەروەردگارتەوە کەواتە لە گومانداران مەبە. پاش ئەوەی خودای مەزن باسی عیسا دەکات کە خۆی دروستی کردووەو عەبدی خودایەو کردوویەتی بە پێغەمبەر باسی پاکو بی عەیبی خۆی دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَـٰنَهُۥٓ﴾ واتە: لە خوا ناوەشێتەوە مندالّی هەبێت، پاکیو بی عەیبی بۆ خودایە لەو ڤسانە کە ئەو خوانەناسو ستەمکارو نەفامو تاوانکارانە ئە یلّێن: ﴿إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ واتە: هەر کاتێك مەیلی لی بوو شتێك ببێت، هەر پێی وت ببە دەبێت. بەو شێوەیەی مەیلی لێیەتی، وەك لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾[3] واتە: بە ڕاستی وێنەی (دروست بوونی) عیسا لای خوا وەك وێنەی ئادەم وایە کە دروستی کرد لەگلّ لە پاشان پێی وت ببە، ئەویش بوو، قسەی ڕاست ئەوەیە کە لە خواوە بە تۆ گەیشت کەواتە لە گومانداران مەبە.

## عیسا فەرمانی داوە کە تەنها خوا بپەرستری بە لام خەلکی دوای ئەو کێشەو جیاوازی کەوتە نێوانیان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ واتە: عیسا فەرمانی دا بە هۆزەکەی ئەو کاتەی کە هەر لە بێشکەدا بوو پێی وتن کە خوای گەورە پەروەردگاری ئەوە و پەروەردگاری ئەوانیشە داوای لی کردن کە خوا بپەرستن. ﴿فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ !هەر ئەو بپەرستن ،ئەمە ڕێگەی ڕاستە ،یانی: ئەوەی من بۆم هێناون لە لایەن خواوە هەر ئەوە ڕاستەڕێیە، واتە: ئەو ڕێگە ڕاستە هەر کەسێك شوێنی بکەوێت ئەوە شارەزایەو ڕێی ڕاستی گرتووە، هەر کەسیش دژایەتی بکات ئەوە گومڕابووەو سەری لی شێواوە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ﴾ واتە: ئەهلی کتێب کەوتنە کێشەوە لەسەر عیسا لە نێوان خۆیاندا، پاش ڕوونکردنەوەو دەرخستنی حالّی عیسا کە عەبدو پێغەمبەری خودایەو بە فەرمانی خۆیو هەر لە ڕوحی

---

[1] الطبري (١٨/١٩٤).

[2] البقرة (١٤٧).

[3] ال عمران (٥٩ـ٦٠).

پیرۆزی خۆی خستیه ناو ڕەحمی مەریەم. کۆمەڵێك لەوانە کە زۆرینەی جوولەکەکانە (بەر لەعنەتی خوا بکەون) جەختیان دەکردەوە لەسەر ئەوە کە عیسا زۆڵەو ئەم قسانەیش دەیکات جادووە، دەستەیەکی تریان دەی وت: بێگومان قسەی خودایە، هەندێکی تر دەیان وت: عیسا کوڕی خودایە، هەندێکی تریش دەیان وت: عیسا یەکێکە لە سی خوداکە، هەندێکیشیان دەیان وت: بە ڕاستی عیسا عەبدی خودایەو پێغەمبەری خودایە، ئەمە ئەو قسە ڕاستەیە کە خوای گەورە باوەڕدارانی لی شارەزا کردووە. هەر بەو شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە عەمری کوڕی مەیمون‌و ئیبنو جورەیج‌و قەتادەو کەسانی تریشەوە لە زانایانی پێشینەو پاشینەشەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: هاوار بۆ ئەو خوانەناسانە لە بینینی ئەو ڕۆژە گەورەو ناڕەحەتە، ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە بۆ ئەو کەسانەی کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن‌و وا دەزانن کە خودا کوڕی هەیە، بەڵام خودا بی باکەو مۆڵەتیان دەدات‌و دوایان دەخات بۆ ڕۆژی قیامەت ،خوا زۆر لەسەرخۆیە، دەزانێت لە دەستی دەرناچن، پەلە ناکات لەوانەی کە یاخی دەبن، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە مۆڵەتی ستەمکار دەدات هەتا کاتی ئەیگرێت، ئیتر بەری نادات، پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[1]، واتە: ئا بەو شێوەیە سزادانی پەروەردگارت کاتێك خەڵکی شارەکان سزا دەدات کە ستەمکاربوون بە ڕاستی تۆڵەسەندنی ئەو ئازاردەرو بە تینە. دیسان لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: ( هیچ کەسێك خۆگرتر نیە لە خودا لەسەر ئازاردانێك کە بیستبێتی، ئەوانە منداڵی بۆ بڕیار دەدەن ئەویش ڕۆزیان دەدات‌و تەندروستیان دەکات(و تووشی بەڵایان ناکات).[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾[3] واتە: وە (خەڵکی) چەندەها شا ر و دی (هەبوون) مۆڵەتم دان کە ستەمکار بوون لە پاشان تۆڵەم لی سەندن‌و لەناوم بردن‌و هەر بۆ لای من دەگەڕێنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾[4] واتە: وا مەزانە خوا بی ئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن، بێگومان ئەو دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکان تێیدا ئەبڵەق دەبن‌و نانوقێن

---

[1] فتح الباري (٨/٢٠٥)، مسلم (٤/١٩٩٧). (هود:١٠٢).

[2] فتح الباري (١٠/٥٢٧)، مسلم (٤/٢١٦٠).

[3] الحج (٤٨).

[4] ابراهيم (٤٢).

له ترسا. بۆیه لێرەیشدا دەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾یانی : ڕۆژی قیامەت.
وە له فەرموودەی صەحیحدا هاتووە که بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە له عوبادەی کوڕی سامیتەوە (ڕەزای خوای لی بێت ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێك شایەتی بدا هیچ پەرستراوێك نیه غەیری خوداو ئەو خوایه تەنیایەو شەریکی نیه، موحەمەدیش (ﷺ) بەندەو پێغەمبەری خودایه، عیسایش بەندەی خوداو پێغەمبەری خودایەو به فەرمانی خودا له ڕۆحی پیرۆزی خۆی خستە ناو ڕەحمی مەریەمەوە، هەروەها بەهەشت ڕاستەو ئاگریش ڕاستە، خودا دەیخاتە بەهەشت بەو کارانەیشەوە که هەیەتی)[1].

﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا لَٰكِنِ الظَّالِمُونَ الْيَوْمَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾﴾

**ترساندنی خوانەناسان له ڕۆژی داخ و کەسەر**

خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات له ڕۆژی قیامەتدا که زۆر چاویان تیژەو گوێیان سووکە، وەك له ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰ إِذِ الْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَا أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا﴾[2] واته: ئەگەر دەبینی کاتێك (له قیامەتدا) تاوانباران له حوزوری پەروەردگاریاندا (له خەجاڵەتیدا) سەریان داخستووە (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پی دابوین) دیمانو بیستمان. واته: کاتێك ئەو قسانە دەکەن هیچ سوودی نیه بۆیان، ئەگەر له پێش تووش بوونیان به سزا ئەو قسانەیان بوتایه سوودمەند دەبوون پێیو له جەزرەبەی خودا لای دەدانو ڕزگاری دەکردن، بۆیه خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ﴾ واته: چاك دەبیستنو چاکیش دەبینن، واته: له ڕۆژی قیامەتدا، ﴿لَٰكِنِ الظَّالِمُونَ الْيَوْمَ﴾ واته: بەڵام ستەمکاران ئەمڕۆ له دنیادا ﴿فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ واته: به ئاشکرا گومڕان. نابیسنو نابینن و بی ئاوەزن، کاتێك که داوایان لی دەکرێت ڕێی ڕاست بگرن نایگرن، بەڵام وەختێك بەرفەرمانن که هیچ قازانجێکی نیه بۆیان، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ﴾ واته: لەو ڕۆژی داخو خەفەتە بیان ترسێنە، ﴿إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ﴾ کاتێك هەموو شتێك دەبڕێتەوەو کار له کار دەترازێت، خەڵکی ناو بەهەشتو خەڵکی ناو ئاگر جیادەکرێتەوە، هەر کەسەو دەڕوات بۆ ئەو شوێنەی خۆی تا هەتایه تێیدایه ﴿وَهُمْ﴾ ئەوانە کەچی

---

[1] فتح الباري (٥٤٦/٦)، مسلم (٥٧/١٠).
[2] السجدة (١٢)

ئەمڕۆ ﴿فِي غَفۡلَةٖ﴾ بی ئاگان لەو ترسەی تووشیان دێت لەو ڕۆژی داخ و کەسەرو پەشیمانیەدا، ﴿وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: ئەوانە بڕواشیان نیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ( کاتێك خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشت و خەڵکی ئاگریش چوونە ناو ئاگر، مردن دەهێنرێت لە شێوەی بەرانێکی سپیو ڕەش لە نێوان بەهەشت و ئاگردا دەوەستێنرێت، دەوترێ: ئەی خەڵکی بەهەشت ئایا ئەمە دەناسن؟ فەرمووی:خەڵکی مل بەرز دەکەنەوەو سەیر دەکەن دەڵێن: بەڵێ ئەمە مردنە، فەرمووی: دەوترێ: ئەی خەڵکی ئاگر ئایا ئەمە دەناسن؟ فەرمووی: مل بەرز دەکەنەوەو سەیر دەکەنو دەڵێن: بەڵێ ئەمە مردنە، فەرمووی: جافەرمانی پێ دەکرێت کە سەر ببڕرێت، فەرمووی: پاشان دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت تا هەتایە مانەوەیەو مردن نیە، وە ئەی خەڵکی ئاگر تاهەتایە مانەوەیەو مردن نیە). پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡحَسۡرَةِ إِذۡ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ وَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بە دەستی ئیشارەتی کردو پاشان فەرمووی: (خەڵکی دنیا لەناو بی ئاگایی دنیادان)![1] هەر بەم شێوەیە ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە، بوخاریو موسلیمیش لە صەحیحەکەیاندا هێناویانە.[2] لەفزەکانیان لەم فەرموودەیەوە نزیکە. وە لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە لە بەسەرهاتێکدا باس کردووە دەڵێت: هیچ گیانێك نیە مەگین ئەو گیانە دەڕوانێت بۆ ماڵێك لە بەهەشتداو ماڵێك لە ئاگردا، ئەو ڕۆژە ڕۆژی داخو کەسەرە. خەڵکی ناو ئاگر ئەو ماڵە دەبینن کە خودا بۆی دانابوون ئەگەر خاوەن بڕوا بوونایە، پێیان دەڵێن: ئەگەر بڕواتان بهێنایەو ئاکار چاك بوونایە، ئا ئەوە بۆ ئێوە دەبوو لە بەهەشتدا کە چاوتان پێی دەکەوێت، لەوێدا خەمو خەفەت دایان دەگرێت، وە دەفەرموێت: خەڵکی بەهەشتیش ئەو ماڵەی ناو ئاگر دەبینن، پێیان دەڵێن: ئەگەر خودا منەتی نەکردایە بەسەرتاندا)[3].

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَرِثُ ٱلۡأَرۡضَ وَمَنۡ عَلَيۡهَا وَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ﴾ واتە: ئەم زەمینەو هەرچی تیایەتیو وا بەسەریەوە دەمێنێتەوە بۆ ئێمەو ئێوەش دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای ئێمە، خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەر خۆی وەدیهێنەرو خاوەن شکۆو کاربەدەستە، هەموو خەڵکی لەناودەچنو هەر خودا خۆی دەمێنێتەوە پاکو بی عەیبی هەر بۆ ئەوە، هیچ کەسێك خۆی بە خاوەن تواناو دەسەڵات نازانێت، بەڵکو هەر خۆی خاوەنی هەموو خەڵکەو پاش ئەوان ماوەتەوەو

---

[1] أحمد (٣/٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٨/٢٨٢)، مسلم (٤/٢١٨٨).

[3] الطبري (٨/٣٤٤).لە(المصباح المنير)ە کەداهەرئەوەندەی هێناوە وئێمەش وەك خۆی وەرمان گێراوماناکەشی ڕۆشنە (وەرگێڕ)

بەکارەکانیاندا دەکاتو ناهەقی بە هیچ کەسێك ناکات بە ئەندازەی باڵی مێشوولەیەكو مێروولە وردیلەیەك، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە حەزمی کوڕی ئەبو حەزمی قەتعیەوە دەڵێت : عومەری کوڕی عبدالعزیز نووسی بۆ عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمان خاوەنی کوفە (والی کوفە) أما بعد، بێگومان خوای گەورە مردنی لەسەر دروستکراوەکانی نووسیوە کاتێك کە دروستی کردوون، دەبێت هەر پێی بگەن، وە لەو کتێبە ڕاستەی ڕەوانەی کردووە بە زانایی خۆی پاراستوویەتیو فریشتەکانیشی کردووە بە شایەت لەسەر پاراستنی فەرموویەتی: کە خۆی خاوەنی ئەم زەمینەیەوخاوەنی ئەویشە لەسەریەتیو هەمووش بۆ لای خۆی دەگەڕێنەوە[1].

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾﴾

### ئامۆژگاری ئیبراهیم بۆ باوکی

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەری خۆی موحەمەد (ﷺ): ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا﴾ واتە: لەم قورئانەدا باسی ئیبراهیمیش بکە کە لە کردارو گفتاردا ڕاستو دروست بووەو پێغەمبەریش بووە، یانی :باسی ئیبراهیم بکە بۆ هۆزەکەت ئەوانەی کە بت دەپەرستن و خۆیان بە وەچەو پێڕەو کەری ئەو دەناسێننو وا دەزانن لەسەر ئاینی ئەون، سەیری ئیبراهیم بکەن کە چەندە پێغەمبەرێکی ڕاستگۆ بوو لەگەڵ باوکیو چۆن ئامۆژگاری دەکرد کە واز بێنێت لە بتپەرستی، ﴿إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا﴾ واتە: کاتێك بەباوکی وت: بابە تۆ بۆ شتێکی وا دەپەرستی نە دەبیستیو نە دەبینی و نە قازانجت پی دەگەیەنێتو نە زیانیشت لی دەدات، ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ﴾ واتە:ئەی بابە من زانیاریەکم بۆهاتووە کەنە هاتووە بۆتۆ،یانی: ئەی بابە هەرچەندە من کوڕی تۆم دەمبینی بچووکترم لە تۆو لە تۆرمەی تۆم، باش بزانە کە من شارەزای زانیاریەکم لە لایەن خوداوە، تۆ نایزانیو ئاگاداری نیتو بۆیشت نەهاتووە، ﴿فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا﴾ واتە: شوێنم بکەوی شارەزای ڕاستەڕێت دەکەم کە بتگەیەنێت بەوەی ئارەزووتەو

---

[1] ابن أبي حاتم (٣٤١٠/٧).

ڕزگاریشت دەبێت لەوەی ترسناکە، ﴿يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَ﴾ واتە: ئەی باوکە شەیتان مەپەرستەو گوێبیستی مەبە لەپەرستنی ئەم بتانەدا، چونکە هەرشەیتانەداوای ئەوەت لێدەکات‌و پێی خۆشە بتپەرست بی، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾[1] واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم ئایا وەسێتم بۆ نەکردن کە شەیتان نەپەرستن چونکە بە ڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئێوەیە. وە فەرموویەتی: ﴿إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثٗا وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنٗا مَّرِيدٗا﴾[2] واتە:ئێوە جگە لە خوا هاوار ناکەن لە خوا تەنها لە چەند (بتێکی ناولێنراوی) مێینە نەبێت وە ناپەرستن جگە لە شەیتانی یاخی‌و سەرکەش نەبێت. وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا﴾ واتە: شەیتان سەرپێچی فەرمانی خودای کرد خۆی بە زل زانی گوێبیستی فەرمانی پەروەردگاری نەبوو، خودایش لە بەزەیی خۆی دووری خستەوەو دەری کرد، شوێنی شەیتان مەکەوە با وەك ئەوت لی نەیەت، ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ واتە: ئەی بابە من دەترسم تووشی جەزرەبە ببی لە لایەن خوداوە لەسەر ئەو شەریك دانان‌و یاخی بوونەت کە شەیتان فەرمانت پی دەکات، ﴿فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا﴾ واتە: ببی بە دۆستی شەیتان، جگە لە شەیتان هیچ کەسێك نەبی بە دۆست‌و یارمەتی دەرو فریادڕەست، وە باش بزانە کە نە شەیتان‌و نە هیچ کەسێکی تریش هیچیان بە دەست نیەو ناتوانن هیچ کارێك بکەن، بەڵکو شوێنکەوتنت دەبێتە هۆی ئەوەی کە سزا دەورت بدات. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی پێغەمبەرانمان لە پێش تۆ ناردووە بۆ سەر گەلانێکی زۆر جا شەیتان کردەوە(ی بەد)ی بۆ ڕازاندنەوە بۆیە ئەمڕۆ (شەیتان) پشتیوانیانەو بۆ ئەوانە سزای سەختی بە ئازارهەیە.

---

[1] يس (٦٠).

[2] النساء (١١٧).

[3] النحل (٦٣).

﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ ﴾

**وەڵامی باوکی ئیبراهیم**

خوای گەورە باسی وەڵامی ئیبراهیم دەکات بۆ ئیبراهیمی کوڕی کاتێك کە بانگی کرد شوێنی بکەوی، باوکی وتی: ﴿ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾ واتە: ئەی ئیبراهیم تۆ بۆ بێزاری لەوانەی کە من دەیان پەرستم؟ واتە: ئەگەر تۆ ناتەوی بیانپەرستیو ڕازی نیت پێیان، واز بێنە لە قسە پی وتنیانو بە سووکی ناویان مەهێنەو باسیان مەکە بە خراپی، خۆ ئەگەر تۆ واز نەهێنی لەو کارەت ئەوا منیش سزات دەدەم قسەیشت پی دەڵێمو خراپیشت بەسەر دێنم، ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ﴾ واتە: بەردەبارانت دەکەم، ئەمە قسەی ئیبنو عەبباسو سودیو ئیبنو جورەیجو زەححاکو کەسانی تریشە.[1] ﴿وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾ واتە: ماوەیەکی درێژیش لە لام برۆ، موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێن: واتە: ماوەیەك[2]. حەسەنی بەسری دەڵێت:ماوەیەکی درێژ[3]. سودی دەڵێت:﴿وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾ تاهەتایە لام برۆ.[4] عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو عەوفی دەڵێن: لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾ بە ساغو سەلامەتی لە لام برۆ پێش ئەوەی ناچاربم سزات بدەم، زەححاکو قەتادەو عەتیەی جەدەلیو مالیکو کەسانی تریش هەر وایان وتووە، ئیبنو جەریریش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.

**وەڵامی خەلیلی خودا ئیبراهیم (سەلامی خوای لی بێت)**

کاتێك ئیبراهیم بە باوکی وت: ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكَ﴾ سڵاوت لی بێت وەك چۆن خوای گەورە وەسفی موسڵمانان دەکات دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمًا﴾[5] واتە: کاتێك نەزانو نەفامەکان (بە وتەی ناشیرین) لەگەڵیان بدوێن وتەیەك دەڵێن پێیان گوناه نەبێت. وە دەفەرمووێت:

---

[1] الطبري (١٨/٢٠٥).

[2] الطبري (١٨/٢٠٥/٢٠٦).

[3] الطبري (١٨/٢٠٥).

[4] الطبري (١٨/٢٠٦).

[5] الفرقان (٦٣).

﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ اللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى الْجَٰهِلِينَ ﴾[1] واتە: وە کاتێك قسەی ناپەسەندو هیچو پوچ ببیستن پشتی تی دەکەن‌و دەڵێن (بە نەفامان ئەنجامی) کردەوەکانمان بۆ خۆمانەو (ئەنجامی) کردەوەکانی ئێوەش بۆ خۆتانە سەلامتان لی بێت ئێمە هاوڕێی نەفامانمان ناوێت. مانای قسەکەی ئیبراهیم بۆ باوکی ﴿سَلَٰمٌ عَلَيْكَ﴾ واتە: لەبارەی منەوە هەرگیزتووشی ئازارو‌ناڕەحەتی نابی، لەبەر ڕێزی باوکایەتی، ﴿سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ﴾ واتە: داوا ش دەکەم لە خودا بۆت کە ڕێگات نیشان بداتو لێت خۆش بێت، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴾ واتە: بێگومان پەروەردگارم لەگەڵ من میهرەبانە. ئیبنو عەبباس‌و کەسانی تریش وتوویانە: ﴿حَفِيًّا ﴾ بە سۆزە، واتە: بەرامبەر من بەسۆزە.[2] چونکە ڕێی نیشانداوم بۆ عیبادەتی خۆیی‌و ناسینی بە دڵێکی پاك، سودی دەڵێت: (الحفي) واتە: ئەو خودایەی کە گرنگیم پێدەداو فەرامۆشم ناکات. ئیبراهیم داوای لێبوردنی کرد بۆ باوکی لە لای خودا بۆ ماوەیەکی زۆر هەتا کۆچ کردنیش بۆ شام‌ودروستکردنی کەعبەی پیرۆزیش ، وە دوای ئەوەیش کە خودا ئیسماعیل‌و ئیسحاقیشی پی بەخشی (سەلامی خوایان لی بێت) وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ رَبَّنَا اغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ ﴾[3] واتە: ئەی پەروەردگارمان لە من‌و باوکم‌و دایکم‌و هەموو بڕواداران ببوورەو خۆش ببە لە ڕۆژێکدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت، موسڵمانانیش داوای لێبوردنیان دەکرد بۆ خزم‌و کەس‌و کارە بت پەرستەکانیان لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە، وەك چاولێکەرییەك لە ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوای لی بێت) هەتا خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَٰوَةُ وَالْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِاللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾[4] واتە: بە ڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی جوان‌و چاك لە ئیبراهیم‌و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوەو لەو شتانەیش کە دەیانپەرستن لە جیاتی خوا ،ئێمە باوەڕمان نیە بە (ئایینی) ئێوەو پەیدابووە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا

---

[1] القصص (٥٥).

[2] الطبري (٢٠٧/١٨).

[3] ابراهیم (٤١).

[4] الممتحنة (٤).

دوژمنایەتی‌و کینە بۆ هەمیشە، تا کاتێك نەبێت کە بڕوا بە خوای تەنها دەهێنن، جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە باوکی وت بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم‌و من هیچم بە دەست نیە لە بەرامبەر خودادا بۆ تۆ.یانی: تەنیا لەم قسەیەدا نەبێت چاوی لی مەکەن، کە داوای لێبوردنی کرد بۆ باوکی، پاشان خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە ئیبراهیم وازی هێنا لە پاڕانەوە بۆ باوکی و پەشیمان بووەوە لەو پاڕانەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴾[1] واتە: ڕەواو شایستە نیە بۆ پێغەمبەرو باوەڕداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران با خزمی نزیکیشیان بن لە پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوتووە کە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵو پێڕی دۆزەخن، وە داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لەبەر وادەو بەڵێنێك بوو کە بە باوکی دابوو (کە داوای لێبوردنی بۆ بکات) جا کاتێك بۆی ڕوون بوویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خودایە خۆی لی بەری کرد، بە ڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خواترس‌و لەسەرخۆ بوو. پاشان خوای گەورە لەسەر زمانی ئیبراهیم دەفەرموێت: ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّى ﴾ واتە: من لە ئێوەو لەوانەیش کە لە غەیری خوا دەپاڕێنەوە دوور دەکەومەوە، هەر لە خوای خۆم دەپاڕێمەوە، ئەو دەپەرستم بە تەنها کە شەریکی نیە، ﴿عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا ﴾ واتە: داوام وایە لە پاڕانەوەمدا بۆ لای خودا چارەڕەش نەبم، ئەم ﴿عَسَىٰٓ ﴾یە لێرەدا بێگومان بۆ قەبوڵ کردنە، چونکە ئیبراهیم گەورەی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لی بێت) دوای موحەمەد (ﷺ).

﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ ﴾

## خوای گەورە ئیسحاق‌و یەعقوبی بەخشی بە ئیبراهیم (سەلامی خوایان لی بێت)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ﴾ واتە: کاتێك کە وازی لەوانە هێناو ئەوانەیش دەیان پەرستن جگە لە خوا، ئیسحاق‌و یەعقوبمان پێدا، واتە: کاتێ ئیبراهیم دوورکەوتەوە لە باوکی‌و هۆزەکەی لەبەر ڕەزامەندی خودا، خوای گەورە پاداشتی دایەوەو بۆی گۆڕی بە چاکتر لەوان، ئیسحاق‌و یەعقوبی پی بەخشی، واتە: ئیسحاق‌و یەعقوبی کوڕی

---

[1] التوبة (١١٣ـ١١٤).

ئیسحاق، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَيَعۡقُوبَ نَافِلَةٗ﴾[1] واتە: یەعقوب بە زیاد (لە داواکەی ئیبراهیم کە داوای منداڵێکی کرد) وە فەرموویەتی: ﴿وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ﴾[2] واتە: وە لە پاش ئیسحاق (مژدەمان پێدا) بە یەعقوب (کە کوڕی ئیسحاقە)، جیاوازی لە نێو زانایاندا نیە کە ئیسحاق باوکی یەعقوبە، ئەوەیش دەقی قورئانە کە لە سورەتی (البقرة) هاتووە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِي قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ﴾[3] واتە: (ئەی خاوەن نامەکان) ئایا ئێوە ئامادەبوون کاتێك کە یەعقوب لە سەرەمەرگدا بە کوڕەکانی وت دوای من کێ دەپەرستن؟ (ئەوانیش) وتیان: خوای تۆو خوای باوباپیرانت کە ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقە. بۆیە لێرەدا باسی ئیسحاقو یەعقوبی کردووە، واتە: ئیسحاقو یەعقوبمان کردە وەچەو جێنشینی ئیبراهیمو بوونە پێغەمبەرو چاومان پێ ڕۆشن کردەوە لە ژیانی خۆیدا، بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَكُلّٗا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا﴾ واتە: گشتمان کردن بە پێغەمبەر، ئەگەر یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) پێغەمبەر نەبووایە لە ژیانی ئیبراهیمدا، باسی یەعقوبو یوسفی کوڕی نەدەهێنا، کە ئەمیش هەر پێغەمبەر بووە، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی لە فەرموودەیەکدا کە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، کاتێك پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ)دەربارەی چاکترین مرۆڤ، فەرمووی: (یوسف پێغەمبەری خودا کوڕی یەعقوب پێغەمبەری خودا، کوڕی ئیسحاق پێغەمبەری خودا، کوڕی ئیبراهیم خەلیلی خودا).[4] وە لە وتەیەکی تردا هاتووە: (بەڕێزی) کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز، یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم).[5] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُم مِّن رَّحۡمَتِنَا وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ لِسَانَ صِدۡقٍ عَلِيّٗا﴾ واتە: بەر بەزەیی خۆمان خستنو واشمان کرد کە زۆر بە چاکە باسیان بکرێت، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە، واتە: باسکردن بە چاکە.[6] سودیو مالیکی کوڕی

---

[1] الانبياء (٧٢).

[2] هود (٧١).

[3] البقرة (١٣٣).

[4] فتح الباري (٢١٢/٨).

[5] فتح الباري (٤٦٠/٦).

[6] الطبري (٢٠٨/١٨).

ئەنەسیش هەر وایان وتووە، ئیبنو جەریر دەڵێت: بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿عَلِيًّا﴾ چونکە گشت ئاینەکان باسیان بە چاکە دەکەن‌و وەسفیان دەکەن (سەلامی خوای گەورە لە هەموویان).[1]

﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥١ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ٥٢ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ٥٣﴾

**باسی موساو هارون (سەلامی خوایان لێ بێت)**

کاتێك کە خوای گەورە باسی ئیبراهیم خەلیل دێنێت‌و وەسفی دەکات، پاشان دێتە سەر باسی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا﴾ واتە: هەر لەم کتێبەدا (لەم قورئانەدا) باسی موسایش بکە کە بێگومان هەڵبژاردە بووە، هەندی بە (مخلِصاً) خوێندوویانەتەوە بە کەسری لامەکە واتە: خواناسی کردن بە دڵەوە، سەوری دەڵێت لە عبدالعزیزی کوڕی ڕوفەیعەوە لە ئیبنو لوبابەوە دەڵێت: حەواریەکان وتویانە: ئەی ڕوحوڵلا (واتە: عیسا پێغەمبەر) باسی کەسی دڵسۆز بۆ خوامان بۆ بکە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە لەبەر ڕەزای خوای کار دەکات‌و، پێی خۆش نیە خەڵکی سوپاسی بکەن، هەندێکی تر خوێندوویانەتەوە بە ﴿مُخۡلَصٗا﴾ بەفەتحی لامەکە، واتە: لەهەڵبژاردەکان بووە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾[2] واتە: بێگومان من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر هەموو خەڵکیدا[3]، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا﴾ واتە: ڕاسپاردەو پێغەمبەر بووە، خوای گەورە هەردوو وەسفە کەی تیا کۆکردوەتەوەو یەکێکە لەو پێنج ڕاسپاردە لێبڕاوە مەزنانە کەبریتین لە: نوح‌و ئیبراهیم‌و موساو عیساو موحەمەد(سەلامی خوا لەمان‌و لە پێغەمبەرانی تریش بێت)، ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ﴾ واتە: لە لای ڕاستی کێوی توردا بانگی موسامان کرد، کاتێك ڕۆیشت بۆ ئەوەی لەو ئاگرە چلۆسکی بینێت،کە ئاگرەکەی بینی‌و بەرەو ڕووی چوو کە لە لای ڕاستی کێوی توردابوو لە کەناری شیوەکەدا، خودای مەزن بانگی کردو قسەی لەگەڵ کردو ﴿وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا﴾ واتە: لە خۆمان نزیك کردەوە کە بە نهێنی تێی بگەیەنین، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا﴾ واتە: هەر لە

---

[1] الطبري (١٨/٢٠٨).

[2] الاعراف (١٤٤).

[3] (مخلِص) ئیسمی فاعیلە واتە کە سە کە خۆی رە نجئە دات وخۆی‌پاك ئەکاتەوەو دڵسۆزی لەخۆیدادروست ئەکات بەڵام(مخلَصاً)ئیسمی مەفعولەوواتە خۆی پاکی دەکاتەوەوهەڵیدەبژێرێت(وەرگێڕ)

میهرەبانی خۆمانەوە هارونی برایمان پی بەخشی لەسەر داوای خۆی کە بۆی پاڕایەوە ئەویشمان کردە پێغەمبەر، وەك لە ئایەتی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأَخِي هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴾[1] واتە: وە هارونی برام لە من زمانی پاراوترە جا ئەوم لەگەڵدا بنێرە پشتیوانم بێت وتەکانم بسەلمێنێت بە ڕاستی من دەترسم کە بە درۆزنم دابنێن و باوەڕم پی نەهێنن. وە فەرموویەتی: ﴿قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَـٰمُوسَىٰ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئەوەی داوات کرد پێت درا ئەی موسا. وە فەرموویەتی: ﴿فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَـٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقْتُلُونِ﴾[3] واتە: کەواتە (خوایە جوبرەئیل) بنێرە بۆ لای هارون (و بیکە بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات)، وە ئەوان (گەلی فیرعەون) تۆڵەی تاوانێکیان لە سەرمە بۆیە دەترسم کە بمکوژن (لە جیاتی ئەو کوژراوە). بۆیە هەندی لە زانایانی پێشینە گوتویانە: هیچ کەسێك نەبووە لە دنیادا پاڕانەوەو لاڵانەوەیەکی کردبێت گەو رەترلەپاڕانەوەی موسا بۆ هارون کە خوا بیکاتە پێغەمبەر، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَـٰرُونَ نَبِيًّا﴾.

﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِسْمَـٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴿٥٥﴾﴾

**باسی ئیسماعیل (سەلامی خوای لی بێت)**

ئەمە وەسفی خوای گەورەە بۆ ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوایان لی بێت) کە باوکی گشت عەرەبەکانی حیجازە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِسْمَـٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا﴾ واتە: لەم کتێبەدا (لەم قورئانەدا) باسی ئیسماعیلیش بکە، ئەو لە بەڵێنی خۆیدا ڕاست بووەو پێغەمبەرێکی ڕاسپاردەش بووە، ئیبنو جورەیج دەڵێت: ئیسماعیل هیچ بەڵێنێکی نەداوە بە پەروەردگاری خۆی مەگین ئەو بەڵێنەی بەجی هێناوە،[4] واتە: هەرگیز پابەند نەبووە بە عیبادەتێکەوە کە نەزری کردبێت لەسەر خۆی مەگین زۆر بە چاکی جێبەجێی کردووەو هەقی خۆی بە تەواوی پێداوە، هەندی لە زانایان وتوویانە: بۆیە پێی وتراوە ﴿صَادِقَ ٱلْوَعْدِ﴾ چونکە بە باوکی وت:

---

[1] القصص (٣٤).

[2] طه (٣٦).

[3] الشعراء (١٣_١٤).

[4] الطبري (٢١١/١٨).

﴿سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾[1] واتە: دڵنیابە دەمبینی بە ویستی خوا لە خۆڕاگران دەبم. لەو بەڵێنەیدا ڕاستی کرد، بەڵێن دروستیش لە ڕەوشتە جوانەکانە، وەك چۆن درۆکردن لە ڕەوشتە ناشیرینەکانە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە بۆچی ئەوەی دەیڵێن ئەنجامی نادەن، زۆر مایەی ڕقو تورەییە لای خوا کە قسەیەك بڵێن کردەوەی پی ناکەن. پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (نیشانەی دووڕوو سی شتە کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، وە کاتێك بەڵێنێکی دا نایباتەسەر، کاتێك ئەمانەتێکی پی سپێردرا خیانەتی لێدەکات)،[3] لەبەر ئەوەی ئەمانە ڕەوشتی دووڕووانەو پێچەوانەکەی ڕەوشتی خاوەن باوەڕانە، بۆیە خوای گەورە وەسفی ڕاسپاردەی خۆی ئیسماعیل دەکات بە خاوەن بەڵێنی ڕاست، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) لە خاوەن بەڵێنە ڕاستەکان بووە، هەرگیز بەڵێنێکی بە هیچ کەسێك نەداوە مەگین بۆی جێبەجی کردووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی ئەبو عاس کوڕی ڕەبیعی مێردی زەینەبی کچی کردووە فەرموویەتی: (قسەی لەگەڵ کردمو ڕاستی کرد، بەڵێنی دامیو بەڵێنەکەی بردەسەر بۆم).[4] کاتێك کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکری صدیق (ڕەزای خوای لی بێت) وتی: هەر کەسێك بەڵێنێك یان قەرزێکی لە لای پێغەمبەرە (ﷺ) با بێت بۆ لام بۆی جێبەجی بکەم، جابیری کوڕی عبدالله هاتو وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر سامانی بەحرەین هات، ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەت دەدەمی) یانی: پڕ بە هەردوو چنگی ، وەختێك سامانی بەحرەین هات، ئەبو بەکر فەرمانی کرد بە جابیرمشت بکات بەو سامانە دا، پاشان دوای ئەوەی دەستی پڕکرد کە پێنج سەد درهەم بوو فەرمانی پێکرد دوو ئەوەندەی تر لەو سامانە لەگەڵ خۆی ببات).[5] ﴿وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا﴾ واتە: پێغەمبەرێ ڕاسپاردە بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسماعیل بەڕێز ترە لە ئیسحاقی برای، چونکە ئیسحاقی برای هەر پێغەمبەر بووە، ئیسماعیل پێغەمبەرو ڕاسپاردەیش بووە، وەك لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا لە ناو منداڵەکانی

---

[1] الصافات (١٠٢).

[2] الصف (٢ـ٣).

[3] البخاري (٣٣/٢٦٨٢/٦٠٩٥).

[4] فتح الباري (٥/٤٨٠).

[5] فتح الباري (٤/٥٥٤).

ئیبراهیمدا ئیسماعیلی هەڵبژارد)،[1] پاشان فەرموودەکەی بە تەواوی باس کرد. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەو قسەی کە کردمان، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا﴾ واتە: فەرمانی دەکرد بە کەس و کاری نوێژ بکەن و خێر بکەن و جێی ڕەزامەندی پەروەردگاری بوو، ئەمەیش دیسان باسی وەسفی جوان و ڕەوشتی چاك و زۆر پەسەندی ئیسماعیلە کە خوای گەورە دەیکات، کە زۆر پابەندبووە بە خواناسیەوە و کەس و کاریشی هەڵپێچاوە بۆ ئەو خواپەرستیە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾[2] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) فەرمانبدە بە ئەندامانی خێزانەکەت بە نوێژکردن و خۆشت خۆڕاگرو بەردەوام بە لەسەر بەجێهێنانی. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[3] واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەس و کارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنیەکەی ئادەمی و بەردە سەرپەرشتیاری ئەو (ئاگری دۆزەخەن) چەند فریشتەیەکی دڵ ڕەقی توندوتیژی وا کە نافەرمانی خوا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پی بدات و چ فەرمانێکیان پی بدرێت دەیکەن.مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە: فەرمان بەماڵ ومناڵتان بکەن بە چاکەکردن و داوایان لی بکەن واز لە خراپە بێنن پشتگوێیان مەخەن هەتا ئاگر نەیانسوتێنێت لە ڕۆژی قیامەتدا، لە فەرموودەیەکدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەحمەتی خوا لە پیاوێك لە شەودا هەڵدەسێت و نوێژ ئەکات و ژنەکەی هەڵساندووە، ئەگەر هەڵنەسابێت ئاوی پرژاندووە بە دەم و چاویدا. ڕەحمەتی خوا لە ژنێك هەڵساوە لە شەودا نوێژی کردووە و مێردەکەیشی هەڵساندووە، ئەگەر هەڵنەسابێت ئاوی پرژاندووە بە دەم و چاویدا) ئەبو داود و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە.[4]

﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِدْرِيسَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾﴾

**باسی ئیدریس پێغەمبەر (سەلامی خوای لی بێت)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِدْرِيسَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا﴾ واتە: لەم کتێبەدا باسی ئیدریسیش بکە کە زۆر ڕاستگۆ بووە و پێغەمبەریش بووە، ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ واتە: بە پلەی

[1] مسلم (١٧٨٢/٤).

[2] طه (١٣٢).

[3] التحریم (٦).

[4] أبو داود (٧٣/٢)، ابن ماجه (٤٢٤/١)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

بڵندیشمان گەیاند، خوای گەورە وەسفی ئیدریس پێغەمبەر دەكات (سەلامی خوای لی بێت) كە زۆر ڕاستگۆ بووەو پێغەمبەریش بووە، پلەی بەرزیشی داوەتی، لە فەرموودەی صەحیحدا لە پێشەوە باسمان كرد كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شەوی ئیسرادا بە لایدا تێپەڕی لە ئاسمانی چوارەمدا بوو، سوفیان دەڵی لە مەنسورەوە لە موجاهیدەوە ﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ دەڵێت: ئاسمانی چوارەم[1].

حەسەنو كەسانی تریش وتوویانە﴿وَرَفَعْنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾واتە :بەهەشت.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ﴿٥٨﴾﴾

## ئەم پێغەمبەرانە لەوانەن كە هەڵبژێردراون و پێغەمبەرە كانی تریش هەڵبژاردەن

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا﴾ واتە: ئەوانە لەو پێغەمبەرانەن خودا بەهرەی خۆی ڕشت بەسەریاندا، لە تۆرمەی باوكە ئادەم بوون، ئەوانەیش لەگەڵ نوحدا هەڵمانگرتن لە ڕەچەڵەكی ئیبراهیمو ئیسماعیلو لەو كەسانەیش خۆمان شارەزامان كردنو هەڵمانبژاردن، هەركاتێك نیشانەكانی خودایان بەسەردادەخوێنرایەوە، بە ڕوودا دەكەوتنە زەوی بۆسوژدەبردنو دەگریان! خوای گەورەدەفەرمووێت: ئەوپێغەمبەرانە، مەبەست پێی ئەو پێغەمبەرانە نییە لەم سورەتەدا باسیان هاتووەو بەس، بەڵكو مەبەستی هەموو پێغەمبەرانە بە گشتی (سەلامی خوایان لی بێت) كە ناوی ئەو كەسانەی بردووە،ئەوە وەك جنسی پێغەمبەران ناوی هێناون، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ﴾ سودیو ئیبنو جەریر دەڵێن: مەبەستی ئایەتەكە لە تۆرمەی ئادەم ئیدریسە، ومەبەستیش بە تۆرمەی ئەو كەسانەن كە هەڵمانگرتن لەگەڵ نوحدا ئیبراهیمە،مەبەستیش بە تۆرمەی ئیبراهیم ئیسحاقو یەعقوبو ئیسماعیلە، مەبەستیش بە تۆرمەی ئیسرائیل موساو هارونو زەكەریاو یەحیاو عیسای كوڕی مەریەمە، ئیبنو جەریر دەڵێت: بۆیە بنەچە و ڕەچەڵەكەكانیانی جیاكردووەتەوە، چونكە لەناو ئەو پێغەمبەرانەدا هەیە لە تۆرمەی ئەو كەسانە نیە لەگەڵ نوح هەڵگیرابوون لە كەشتیەكەدا، لەوانە: ئیدریس پێغەمبەر هەرچەندە هەموو پێغەمبەران لە تۆرمەی ئادەمن (سەلامی خوا لە هەموویان بێت) چونكە ئیدریس باپیرەی نوح بووە(سەلامی خوای

[1] الطبري (١٨/٢١٣).

لێبێت.[1] منیش ئەڵێم: ئەمە دیارو ئاشکرایە کە ئیدریس لە زنجیرەی ڕەچەڵەکی نوحە (سەلامی خوایان لی بێت) ئەم ئایەتانەی سورەتی (الانعام) بەڵگەو پشتگیرە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەم ئایەتە جنسی پێغەمبەرانە(نەك تەنیا ئەوچەندپێغەمبەرە) وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا ۚ وَكُلًّا فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ۖ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ۚ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ﴾[2] واتە: ئەو (بەڵگانە) بەڵگەی ئێمە بوون کە دابوومان بە ئیبراهیم لە بەرامبەر گەلەکەیەوە هەر کەسێك بمانەوێت پلەوپایەی بەرز دەکەینەوە بە ڕاستی پەروەردگارت کاردروستی زانایە، وە ئیسحاقو (لە ئیسحاقیش) یەعقوبمان پی بەخشی ڕێنموونی هەموویانمان کردووە لەوەوپێش ڕێنموونی نوحیشمان کردو لە نەوەکانی نوح داودو سولەیمانو ئەیوبو یوسفو موساو هارونمان (ڕێنموونی کرد) ئا بەو چەشنە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، وە زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاس هەریەك لەمانە لە چاکەکاران بوون، وە ئیسماعیلو یەسەعو یونسو لووت هەریەکە لەمانە ڕێزمانداون بەسەر هەموو خەڵکیدا، هەروەها هەندی لە باوكو نەوەو براکانیان هەڵمانبژاردوونو ڕێنموونیمان کردوون بۆ ڕێگەی ڕاست، ئەوە ڕێنموونی خوایە ڕێنموونی هەر بەندەیەکی پی دەکات لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێت وە ئەگەر هاوبەشیان ڕەوا بدایە بۆ خوا بێگومان ئەو چاکانەی کردبوویان هەمووی بی پاداشت دەردەچوو، ئەوانە کەسانێکن پەیامو زانینو حوکمڕانیو پێغەمبەرێتیمان پی بەخشیبوون جا ئەگەر ئەوانە (قورەیش) بڕوای پی نەهێنن ئەوە بێگومان بە دەستەیەکی ترمان سپاردووە (چاودێری بکەنو) بێباوەڕیش نابن پێی، ئەوانە (ئەو پێغەمبەرانەی باسکران) کەسانێك بوون خوا ڕێنموونی کردن دەی پەیڕەوی ڕێگەو ڕێبازی ئەوان بکەن (ئەی موحەممە(ﷺ)). وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە

---

[1] الطبري (١٨/٢١٤).

[2] الانعام (٨٣ـ٩٠).

فەرموویەتی: ﴿مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَ﴾[1] واتە: بەسەرهاتی هەندێکمان بۆ باس کردووی‌و هەندێکیانمان بۆ باس نەکردووی. وە لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە لە موجاهیدەوە کە پرسیاری کردووە لە ئیبنو عەباس: ئایا لە سورەتی (ص)دا سوژدە هەیە؟ وتی: بەڵی، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ﴾، وە پێغەمبەری ئێوە لەو کەسانەیە کە فەرمانی پێکراوە شوێن پێی ئەوان هەڵگرێت، واتە بە ڕێی ئەواندا بڕوات، داودیش لەو پێغەمبەرانەیە (سەلامی خوایان لێ بێت)کە ڕێ‌و شوێنی هەڵگیرێت‌و چاوی لێ بکرێت.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا﴾ واتە: کاتێك کە گوێیان لە وتەی خودا ئەگرت کە پڕە لە بەڵگەو نیشانەی گەورە بە ڕوودا دەکەوتن بە زەویدا بە ترس‌و دڵە لەرزەو سوپاس‌و ستایشی خودای مەزنیان دەکەن لەسەر ئەو هەموو بەهرەیەی کە پێی بەخشیون‌و دەگرین، (البكيّ) جەمعی (باك) بۆیە هەموو زانایان لەسەر دروستی سوژدە بردن لێرەدا، وەك چاولێکەریەك لەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) شوێنکەوتنی ڕێ‌و ڕچەی ئەوان.

﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾﴾

## ئەوانەی دوای ئەوان دێن خراپیان هەیەو چاکیشیان هەیە

وەختێك خوای گەورە باسی کۆمەڵی بەختەوەرانی کرد کە بریتیە لە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) ئەوانەیش کە هەڵدەستن بە بەجێهێنانی سنوورو یاساکانی خوداو فەرمانەکانی، ئەو ئەرك‌و فەرمانانەی خوا لەسەری داناون جێبەجێی دەکەن، باسی ئەو کەسانە دەکات کە لە دوای ئەوان دێن لەو گەلانەی پاش خۆیان‌و دەبنە جێگریان، دەفەرموێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ﴾ دوای ئەوان کەسانێك بوونە جێگریان، ﴿أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژەکانیان بە باشی بەجێ نەدەهێنا، دیارە لە ئەرکەکانی تردا کەمتەرخەمیان زیاتر کردووەو گرنگیان پێ نەداوە، چونکە نوێژ پایەو کۆڵەکەی ئاین‌و چاکترین کرداری بەندەکانی خوایە، لە باتی ئەوەدا سەریان کردە ئارەزووبازی‌و ڕابواردنی دنیاو ڕازی بوون بە ژیانی دنیا، پاڵیان دایەوە تێیداو ئەوانە بەو زووانە تووشی زیان‌و چەرمەسەری دەبن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ واتە: شوێن ئارەزووەکانی خۆیان

---

[1] الغافر (٧٨).

[2] فتح الباري (١٤٤/٨).

کەوتن‌و تووشی ئازارو زیان بوون لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوزاعی دەڵێت: لە موسای کوڕی سولەیمانەوە، لە قاسمی کوڕی موخەیمیرەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِ﴾ دەڵێت:یانی: کاتی نوێژەکانیان بە فیڕۆ داوە،چونکە ئەگەر وازهێنان بوایە لە نوێژ ئەوە کوفرو خوانەناسی بوو،[1] وە لە ئیبنو مەسعودەوەئەگێڕنەوە کە پێی وتراوە:ئەرێ خوای گەورە زۆر باسی نوێژی کردووە لە قورئاندا،[2]وەك ئەفەرموێ ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾[3] ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێئاگان. وە ﴿عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ دَآئِمُونَ﴾[4] ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان. وە ﴿صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾[5] واتە: ئەوانەی کە ئاگاداری نوێژیان دەکەن.(ئەوە هۆی چی یە؟) ئیبنو مەسعود دەڵێت: واتە لەسەرکاتی نوێژەکانیان بەردەوامن، وتیان: بە لای ئێمەوە مەبەست ئەوە واز لە نوێژەکانیان ناهێنن، ئیبنو مەسعود وتی: جا وازهێنان کوفرە.[6] مەسروق دەڵێت: هیچ کەسێك نیە پارێزگاری لە پێنج نوێژە فەرزەکە بکات لە ڕێزی بی ئاگاو کەمتەرخەمان ناوی بنووسرێت، چونکە گوێنەدان بە نوێژەکان لەناوچوونە، گوێنەدانیش پێی، نەکردنیەتی لە کاتی خۆیدا.[7] ئەوزاعی دەڵێت: لە ئیبراهیمی کوڕی یەزیدەوە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ پاشان وتی: مەبەست لە فەوتان‌و لەناوچوونی نوێژەکانیان، وازهێنانیان نیە لە نوێژکردن بەڵکولەکاتەکانیاندا کەمتەرخەمبون.[8] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا﴾ واتە: بەو زووانە تووشی زیان دەبن.[9] قەتادە دەڵێت: تووشی خراپە دەبن.[10] سوفیانی سەوری‌و شوعبەو موحەمەدی کوڕی ئیسحاقی سەبیعی لە ئەبو عوبەیدەوە لە عەبدوڵای کوڕی

---

[1] الطبري (١٨/٢١٥).
[2] الطبري (١٨/٢١٦).
[3] الماعون (٥).
[4] المعارج (٢٣).
[5] المعارج (٣٤).
[6] الطبري (١٨/٢١٦).
[7] الطبري (١٨/٢١٦).
[8] الطبري (١٨/٢١٦).
[9] الطبري (١٨/٢١٩).
[10] الطبري (١٨/٢١٨).

مەسعودەوەلەتەفسیری ﴿فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾دا دەڵێت: (غيّ )شیوێکە لەناو جەهەنەمدا، بنی قووڵەو تامیشی پیسە.[١] ئەعمەش دەڵێت: لە زیادی کوڕی ئەبو عەیازەوە ﴿فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا﴾ دەڵێت: شیوێکە لە کێمو خوێن لەناو جەهەنەمدا، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ واتە: مەگین ئەوانەی کە پەشیمانی خۆیان دەربڕیوە لەوەی کە نوێژەکانیان فەوتاندووەو شوێنی ئارەزووی خۆیان کەوتوون، بێگومان خوای گەورە تەوبەکەیان لی قەبوڵ دەکاتو چارەنووسیان بە چاکە دەگێڕێتو دەیانکات بە خاوەن ئەو بەهەشتە پڕ بەهرەیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا﴾ واتە: ئەوانەی دەچنە ناو بەهەشتو هیچ ناهەقیان لی ناکرێت، چونکە تەوبەکردن هەموو گوناهێکی پێش خۆی دەسڕێتەوە، وە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (پاشگەزبوونەوە لە گوناه وەك ئەو کەسە وایە کە گوناهی نەبووبێت).[٢] لەبەر ئەوە ئەو کەسانەی کە تەوبەکار بوون هیچ لەو کارانەی کە کردوویانە کەم ناکرێتەوە، وە ئەو کارانەیش لە پێشدا کردوویانە لە باتی ئەم کارانەدا لە دوایدا داناشکێت، چونکە ڕۆیشتوونو وازیان لی هێنراوە، خودا بە ڕێزو بەزەییو دڵفراوانی خۆی لێی بووراوەو، لێیان ناپرسێتەوە، ئەم ئیستیسنایە لێرەدا وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە لە سورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[٣] واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خودا هیچ پەرستراوێکی ترناپەرستنو هیچ کەسێك کە خوا کوشتنی ئەوی (حەرام) کردووەناکوژن بە هەقو ڕەوا نەبێتو زیناو داوێن پیسی ناکەنو هەر کەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران)، تووشی تۆڵەکەی دێت سزای بۆ چەندبارە دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتداو بی برانەوە بەبی ڕێزو ڕیسوایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بێجگە لە کەسێك تەوبەی کردبێتو باوەڕی هێنابێتو کاروکردەوەی چاکیشی کردبێت ئا ئەوانە خودا خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکەو خوا هەمیشە لێبوردەی بە بەزەییە.

---

[١] الطبري (٢١٨/١٨).

[٢] ابن ماجه (١٤٢٠/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[٣] الفرقان (٦٧ـ٧٠).

﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ ﴾

**شێوەو تایبەتمەندی باغەکانی ئەوانەی کە بە ڕاستی پاشگەزبوونەتەوە لە گوناه**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾ واتە: باغاتی بەردەوامو هەمیشە خۆش کە خوای گەورە بەڵێنی داوە بە بەندەکانی بی ئەوەی چاویان پی کەوتبێت، ئەوانە کە پاشگەزبوونەتەوە لە گوناه دەچنە ناوی، ئەو بەهەشتە لەو شتە نادیارانەیە کە خاوەن باوەڕان بڕوایان پێی هەیەو نەشیاندیوە، بەڵام ئەوەندە باوەڕیان بەهێزەو بێگومانن لە بوونی، وەك ئەوە وایە چاویان لێی بێت، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا﴾ واتە: بەڵێنی خودا هەر دێتەجیو گومانی تێدا نیە، وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿مَأۡتِيّٗا﴾ واتە: هاتووە، چونکە هەر شتێك بەرەو تۆ هات، بێگومان تۆش بۆی دەڕۆیت، وەك عەرەب وتوویانە: من پەنجا ساڵم تێپەڕاندووە یان پەنجا ساڵ بەسەرمداگوزەراوە، هەردوو یەك مانایان هەیە، ﴿ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗا ﴾ واتە: قسەی پڕوپوچی تێدا ناکرێت، ﴿إِلَّا سَلَٰمٗا ﴾ سڵاوکردن نەبێت، ئیستیسنای مونقەتیعە، واتە: ئەو باغانە قسەی سوكو بی مانای تێدا ناکرێت، وەك لە دنیادا دەکرێتو دەبیسرێت، وەك ئەم ئایەتانە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴾[1] واتە: نابیستن لەو بەهەشتانەدا نە قسەی بێهودەو نە تاوانبارکردن، جگە لەوتەی سڵاوو سەلام کردن (لە یەکتری). پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا﴾ واتە: بەیانیانو ئێواران خواردنیان پی دەدرێت، واتە: بە ئەندازەی کاتی بەیانیانو ئێواران خواردنیان هەیە، چونکە لەوی شەوو ڕۆژ نییە، بەڵام بەو کاتانەی کە بە دوای یەکدا دێنو پرشەیان دێتو دەدرەوشێنەوە کاتی بەیانیانو ئێواران دەزانن، وەك ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (یەکەم کۆمەڵێك دەچنە ناو بەهەشت شێوەیان وەك شێوەی مانگ وایە لە شەوی چواردەدا، بەڵغەمو چڵمو پیسیان نیە لە بەهەشتدا، قاپو تاچاغو شانەکانیان لە زێڕو زیوە، ئەو بوخوردەیش کە بۆنی دێت بە داری عودەکەوەیە، ئارەقیشیان بۆنی میسکی لی دێت، هەریەکێك لەوانە دوو ژنی هەیە، مۆخی لاقیان (لە پشتی) گۆشتیانەوە دەبینرێت ئەوەندە جوانن، هیچ جیاوازیو کینەیەك لە نێوانیاندا نیە، دڵەکانیان لەسەر دڵی یەك پیاوە،

[1] الواقعة (٢٥ـ٢٦).

بەیانیانو ئێواران تەسبیحاتی خوا دەكەن).[1] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو صەحیحەكەدا هاتووە،[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (شەهیدان وان لەسەر كەناری ڕووبارێك لە دەروازەی بەهەشتدا لە گومەزێكی سەوزدا بەیانیانو ئێواران ڕۆزیان لە بەهەشتەوە بۆ دێتە دەرەوە) تەنها ئەحمەد بەم شێوەیە هێناویەتی، زەحاك دەڵی لە ئیبنو عەباسەوە ﴿وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا﴾یانی: بە ئەندازەی شەوو ڕۆژ(ێكیدونیا) ڕۆزیان بۆدەهێنرێت ، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَنْ كَانَ تَقِيًّا﴾ واتە: ئەو بەهەشتەی كە بەو شێوە چاكە باسمان كرد، ئەم بەهەشتەیە كە دەیبەخشین بە عەبدانی خۆپارێزمان، ئەوانەی كە بەرفەرمانی خوای گەورە بوون لە خۆشیو ناخۆشیداو كینەی خۆیان خواردووەتەوەو چاوپۆشیان لە خەڵكی كردووە، وەك خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی (المؤمنون)دا دەفەرمووێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۝١ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۝٢ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۝٣ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ۝٤ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ۝٧ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ۝٨ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ۝٩ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ۝١٠ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾[3] واتە: بە ڕاستی باوەڕداران ڕزگار دەبن، ئەو كەسانەی كە لە نوێژەكانیاندا لە خواترسن، وە ئەوانەی لە شتی بێهودە خۆیان دوور دەگرن، وە ئەوانەی كە زەكاتی (سامانیان) دەردەكەن، وە ئەوانەی كە پارێزەری داوێنیانن، مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان بۆ كەنیزەكێك كە بووبن بە خاوەنیان ئەوە بە ڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناكرێن، ئەنجا هەر كەسێك نیازی جگە لەو (دوو جۆرە ئافرەتە) بكات (و ئارەزووی خۆی تێر بكات) ئەوە ئەوانە دەستدرێژی كەرن، وە ئەوانەی كە پارێزەری سپاردەو پەیمانەكانیانن، وە ئەوانەی كە بەردەوامن لەسەر نوێژەكانیان، هەر ئەوانەن میراتگران، ئەوانەی كە دەبنە خاوەنی فیردەوس (بەهەشت) ئەوان لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

---

[1] أحمد (٢/٣١٦)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٣٦٧)، مسلم (٤/٢١٨٠).

[3] المؤمنون (١ـ١١).

﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٥﴾ ﴾

**فریشتەکان دادەبەزن بە فەرمانی خودانەبێت**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾ واتە: بە فەرمانی پەروەرندەی تۆ نەبێت ئێمەنایەینە خوارەوە، هەرچی ئێستا لامانەو هەرچیش لە دوامانەوەیەو هەرچیش لەو نێوانەدایە هەر بۆ ئەوەو پەروەردگاری تۆ هیچ شتی لەبیر نەچووە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بە جوبرەئیل: (چی بووەتە ڕێگرت بەسەرمان بکەیتەوە زیاتر لەوەی کەئێستا بەسەرمان دەکەیتەوە؟ وتی: ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ﴾).[1] هەتا کۆتایی ئایەتەکە، بوخاری بە تەنها هێناویەتیو ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.[2] عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: جوبرەئیل لە پێغەمبەری خوا بڕا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەسەر ئەوە خەمگین بوو، جوبرەئیل هات بۆ لایو وتی: ئەی موحەممەد: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ﴾ واتە: بە فەرمانی پەروەرندەی تۆ نەبێت دانابەزین.[3] وە دەفەرمووێت: ﴿ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾ وتراوە: مەبەست پێی: ئەوەی لە لامانە لە کاروباری دنیاو ئەوەیش لە دوامانەوەیە لە کاروباری ڕۆژی دواییو ئەوەیش لە نێوان هەردوو فووەکەدایە هەر لە ژێر فەرمانی خودایە. ئەمە قسەی ئەبولعالیەو عیکریمەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو سودیو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسە:[4] وتراویشە: ﴿ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا ﴾ ئەوەی دێت لە فەرمانی ڕۆژی دوایی ﴿ وَمَا خَلْفَنَا ﴾ ئەوەیش ڕۆیشتووە لە دنیا ﴿ وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: ئەوەی لە نێوان دنیاو ڕۆژی دواییشدایە، هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەبباسو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاکو قەتادەو ئیبنو جورەیجو سەوریەوە.[5] ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە، والله أعلم. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾

---

[1] أحمد (١/٢٣١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٨/٢٨٢).

[3] الطبري (١٨/٢٢٢).

[4] الطبري (١٨/٢٢٤).

[5] الطبري (١٨/٢٢٤)، القرطبي (١١/١٢٩)..

واتە: پەروەرندەی تۆ هیچی لە بیرنەچووە. موجاهید دەڵێت: یانی: پەروەردگارت تۆی لەبیرنەچووە.[1]

﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ واتە: پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیش لە نێوانیاندایە وەدیهێنەرو خاوەن دەسەڵاتو کاربەدەستو هەڵسوڕێنەریانە هیچ کەسێك ناتوانێت دەست بخاتە کارو فەرمانی، ﴿فَٱعۡبُدۡهُ وَٱصۡطَبِرۡ لِعِبَٰدَتِهِۦۚ هَلۡ تَعۡلَمُ لَهُۥ سَمِيّٗا﴾ واتە: تۆیش ئەو بپەرستەو دەبێت بۆ پەرستنی ئەو خۆڕاگربی، ئایا دەزانی هاوناوێکی هەبێت؟ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە: ئایا دەزانی پەروەردگار هاوشێوە یان هاو ناوێکی تری هەبێت؟[2] موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو ئیبنو جورەیجو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[3] عیکریمە دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە: هیچ کەسێك ناوی نابرێت بە ڕەحمان خودا نەبێت، پاكو بی عەیبو پیرۆزە ناوی خودا[4].

﴿وَيَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوۡفَ أُخۡرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذۡكُرُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ يَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمۡ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا ﴿٧٠﴾﴾

**سەرسوڕمانی خەڵکی لە ژیانی دوای مردنو وەڵامدانەوە ی ئەو سەرسوڕمانە**

خوای گەورە باسی مرۆڤ دەکات کە سەری سوڕدەمێنێتو زیندووبوونەوەی خۆی بە دوور دەزانێت پاش مردن وەك دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ﴾[5] واتە: جا ئەگەر تۆ سەرت سوڕبمێنێت ئەوە قسەی ئەوانە جێی سەرسوڕمانە کە دەڵێن ئایا کاتی (کە مردینو) بووینەوە بە خاك ئایا ئێمە سەرلەنوێ دروست دەکرێینەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ﴿٧٨﴾ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾[6] واتە: ئایا ئادەمی نەیزانیوە کە ئەومان لە نوتفەیەك دروست کردووە کەچی یەکسەر دەبێتەوە دوژمنێکی دیار (دەمەقاڵێکەرێکی ئاشکرایە)، نموونەمان بۆ دێنێتەوەو بەدیهێنانی خۆی لەبیرچۆتەوە (ئەو بێباوەڕە)

---

[1] الطبري (١٨/٢٢٥).

[2] الطبري (١٨/٢٢٦).

[3] الطبري (١٨/٢٢٦).

[4] القرطبي (١١/١٣٠).

[5] الرعد (٥).

[6] يس (٧٧-٧٩).

دەڵێت کێ ئێسکەکان زیندوودەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون، (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەمجارەوە بەدیهێناون و ئەو بە هەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە. وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا﴾ واتە: مرۆڤ دەڵێت: ئەگەر مردم، ئایا وەك چۆن لە پێشدا زیندووبووم، هەروا دەهێنرێمەوە دەری بە زیندووی، ﴿أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا﴾ واتە: ئەو خەڵکە بۆ بیرێك ناکاتەوە، لە سەرەتاوە ئێمە ئەومان دروستکرد کە هیچ نەبوو، خوای گەورە سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ بە بەڵگە دەهێنێتەوە لەسەر دووبارە زیندووبوونەوەی، واتە: خودایە کە مرۆڤی دروستکرد کاتێك کە هیچ نەبوو، ئایا ناتوانێت جارێکی تر دروستی بکاتەوە کە ئێستا شتەو هەیە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: ئەو (خوا) زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردووە لە پاشان (دوای مردنی) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروستکردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە. لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەوەی ئادەم بڕوای پێ نەکردم، بۆی نەبوو بڕوام پێ نەکات وە ئەوەی ئادەم ئازاری دام بۆی نەبوو ئازارم بدات، بڕوا نەکردنەکەی پێم ئەوەیە کە ئەڵێت :زیندووم ناکاتەوە جارێکی تر وەك لە سەرەتاوە دروستی کردووم، وەدیهێنانی سەرەتا ئاسانتر نییە لە لام لە دوایەکەی، ئازاردانیشی بۆم ئەوەیە ئەڵێت :من منداڵم هەیە من ئەو تەنهاو بێ نیازو جێ نیازەم کە کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، هەرگیز کەسیش نەیتوانیوە هاوتای بێت).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ﴾ خوای گەورە سوێند دەخوات بە خۆی ودەفەرمووێت: سوێند بە پەروەردگارت هەر دەبێت لەگەڵ شەیتانەکانیاندا کۆیان بکەینەوە ئەوانەی کە غەیری خویان دەپەرست، ﴿ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا﴾ واتە: پاشان دەیانهێنین بە دەوری جەهەنەمدا چۆك دابدەن. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿جِثِيًّا﴾ یانی بە دانیشتوویی، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾[3] واتە: دەبینی هەموو تیرەیەك بە ڕیز بەسەر چۆکدا هاتوون.[4] سودی دەڵێت: ﴿جِثِيًّا﴾ واتە: بەپێوە

---

[1] الروم (٢٧).

[2] أحمد (٢/٢٥٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الجاثية (٢٨).

[4] الطبري (١٨/٢٢٧).

وەستاون. ڕیوایەت کراوە لە مورەوە لە ئیبنو مەسعودەوە هەر بەو شێوەیە، ﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾ واتە: پاشان لەناو هەر کۆمەڵێك ئەوەی زیاتر دژی خودای ڕەحمان بووبن ئێمەجیایان دەکەینەوە، موجاهید دەڵێت: ﴿مِن كُلِّ شِيعَةٍ ﴾ لە هەموو کۆمەڵێك.[1] ﴿أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا﴾ سەوری دەڵێت: لە عەلی کوڕی ئەقمەری کوڕی ئەبو ئەحوەس لە ئیبنو مەسعودەوە: لە سەرەتاوە هەتا دواین کەس هەموو بەند دەکرێت هەتا کاتێك هەموو دەهێنرێن یەك لەو دوای یەك، وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴾.[2] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا ادَّارَكُوا فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَاهُمْ لِأُخْرَاهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾[3] واتە: هەتا هەموو دەگەن بە یەکو کۆدەبنەوە یەك دەگرن دواییەکانیان (کە شوێنکەوتوون) دەربارەی پێشوەکانیان ( کە پێشەوابوون) دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوانە ئێمەیان گومڕاکرد دە تۆش لە ئاگر دووقات سزایان بدە (پەروەردگار) دەفەرموویت بۆ هەر کامتان (سزا) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە نازانن و بێ ئاگان، سەرۆك و چاولێکراوەکان بە شوێن کەوتووەکانیان دەڵێن ئێوەش هیچ زیادە ڕێزێکتان بەسەر ئێمەدا نییە ئێوەش سزا بچەژن بە هۆی ئەو (خراپانەوەی) دەتانکرد. پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴾ واتە: خۆمان چاکتردەزانین کامیان لە پێشترە بۆ چوونە ناو جەهەنەم، ئەمە لێرەدا عەتفی خەبەرە لەسەر خەبەر، واتە: خودا چاکتر دەزانێت کێ لە بەندەکانی شایەنترە کەبخرێنە ناو ئاگرو هەر تێیدا بمێنێتەوە، وە کێش شایەنی ئەوەیە جەزرەبەکەی بۆ دووقات بکرێتەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴾[4] واتە: (پەروەردگار) دەفەرموویت بۆ هەر کامتان (سزا) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە نازانن و بێ ئاگان.

---

[1] الطبري (١٨/٢٢٨).

[2] الدر المنثور (٥/٥٣٣).

[3] الاعراف (٣٨ـ٣٩).

[4] الاعراف (٣٨).

﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾

**هەموو دەبرێنە جەهەنەم پاشان لە خواترسان ڕزگاریان دەبێت**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ واتە: هەمووتان مەگین دەبێت بچنە جەهەنەم، بڕیارێکە پەروەردگارت داویەتیو دەبێت هەر جێبەجی ببێت، جابیر ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵاوە لەم ئایەتەدا: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾ دەڵێت: ڕێگە(الصراط) بەسەر جەهەنەمەوەیە وەك دەمی شمشێر وایەدەستەی یەکەم دەڕوات بەسەریدا وەك بریسکە، دووهەم وەك با سێهەم وەك چاکترین وڵاغی سواری، چوارەم وەك چاکترین چوارپێی پاشان ئەوانی تر تێدەپەڕن (بەسەر جەهەنەمدا) فریشتەکان هەر ئێژن: (اللهم سلم سلم).[1] واتە: ئەی خوایە بە سەلامەت، بە سەلامەت تێپەڕن، بۆ ئەم باسە نموونە زۆرە لە هەردوو صەحیحەکەو غەیری ئەمانیشدا کە ڕیوایەتکراوە لە ئەنەسو ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیرەو جابیرو کەسانی تریش لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ). ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە ئومو موبەشیرەوە کە ژنی زەیدی کوڕی حارثە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ماڵی حەفسە بوو فەرمووی: (ناچێتە ناو ئاگر هەر کەسێك کە ئامادەی بەدرو حودەیبیە بووبێت) حەفسە دەڵێت: ئایا خوای گەورە نافەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا ﴾.[2] وە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەکەی زوهریەوە لە سەعیدەوە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێکی موسڵمان نیە سی منداڵی بمرێتو ئاگری (جەهەنم)ی بەرکەوێت).[3] مەگەر بۆ ئاهی سوێن[4]، واتە: مەگەر کە بەر ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾. لە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾ دا دەڵێت: ڕۆشتنی موسڵمانان بۆجەهەنم تێپەڕبوونە بەسەر ئەو پردە داکە بە سەریەوەیە، وە ڕۆیشتنی موشریکەکان بۆجەهەنم چوونە ناوی جەهەنەمە، سودی دەڵێت

---

[1] الطبري (٢٣٢/١٨).

[2] أحمد (٣٦٢/٦)، فەرموودەیەکی حسەنە.

[3] فتح الباري (١٤٢/٣)، مسلم (٢٠٢٨/٤).

[4] واتە مەگەرلەبەرئەم ئایەتەکەخوای گەورە دەفەرمێت (وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا )(وەرگێڕ).

لە مورەوە لە ئیبنو مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: ﴿كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ دەڵێت: سوێندێکە دەبێت بێتەجی.[1] موجاهید دەڵێت: بڕیارە دەبێت بێتەجی.[2] ئیبنو جورەیجیش هەروای وتووە.[3] ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا﴾ واتە: پاشان خواناسانیش ڕزگاردەکەین، وەختێك کە خەڵکی هەموو تێپەڕین بەسەر ئەو ئاگرەدا، ئەوەی دەکەوێتە خوارەوە لە خوانەناسو تاوانبارو سەرپێچیکەران دەکەونە خوارەوە هەر کەسەو بەپێی تاوانو خراپەکاری خۆی، خاوەن باوەڕە لەخواترسەکانیش خوای گەورە ڕزگاریان دەکات لەو ئاگرە هەر کەسەو بەپێی کرداری خۆی، لەسەر پردی سیرات دەیانپەڕێنێتەوە، تیژ ڕۆیشتنیان بەپێی ئەو کردارەیان لە دنیا کردوویانە، پاشان دەلاڵێنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە تاوانە گەورەکانیان کردووە لە خاوەن باوەڕان، فریشتەکانو پێغەمبەرانو بڕواداران دەست دەکەن بە لالانەوەو خەڵکێکی زۆر دەردێنن کە ئاگرەمووگیانی سوتاندوون، ڕوویان نەبێت کە شوێنی سوژدەیە، دەرهێنانیشیان لەو ئاگرە بەپێی ئەو باوەڕەیە کە لە ناو دڵیاندایە، یەکەمجار ئەو کەسانە دەردەهێنن کە مسقاله دینارێك بڕوا لە دڵیاندایە، پاشان لە خوا ئەوەوە دێت، پاشان ئەوەی لەخوار ئەوەوە دێت، پاشان ئەوەی لە دوای ئەوەوە دێت، پاشان ئەوە دەردەهێنن کە بە ئەندازەی مسقاله زەڕەیەك کەمترو کەمتر باوەڕ لە دڵیدایە، پاشان خوای گەورە ئەو کەسانە دەردەهێنێت لە ئاگردا کە ڕۆژێك لە ڕۆژان(بەدڵ) وتوویانە: (لا اله الا الله) با هەرگیز چاکەیەکیشی نەکردبێت، هیچ کەسێك لەوان لەئاگردا نامێنێتەوە مەگین کەسێك بڕیار درابێت تاهەتایە لەناو ئاگردا بمێنێتەوە، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە لەو بارەیەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾[4].

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا أَيُّ الْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا وَرِئْيًا ﴿٧٤﴾﴾

[1] الطبري (١٨/٢٣٧).
[2] الطبري (١٨/٢٣٧).
[3] الطبري (١٨/٢٣٧).
[4] فتح الباري (١٣/٤٨).

**خوانەناسان شانازی دەکەن بەوەی کە خۆشبەختن لە دنیادا**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ واتە: هەرکاتێك نیشانە دیارەکانی ئێمەیان بۆ دەخوێنرێتەوە، خوانەناسان بە خاوەن باوەڕان دەڵێن: ﴿أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا﴾ واتە: کام کۆمەڵ لەم دوو کۆمەڵە ڕێ‌و شوێنی خۆشترەو دیوەخانی چاکترە. دژایەتی نیشانەکانی خوا دەکەن‌و دەبنە لەمپەر لە ڕێی خوداو خۆیان هەڵدەبڕن بە خاوەن باوەڕاندا، شانازی دەکەن بەو ئاینە پڕوپوچەی لە سەرینی، بەڵگەیش بەوە دەهێننەوە کە خاوەنی ماڵ‌و پلەو شوێنی چاکن، ﴿خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا﴾ واتە: چاکترین شوێن‌و بەرزترین کۆشك‌و باشترین دیوەخانی هەیە،(ندياً) شوێنی کۆبوونەوەی پیاوان بۆ وتووێژکردن، واتە: دیوەخانی ئەوان ئاوەدانترو خەڵکی زیاتر بۆ دەچێت، مەبەستیان ئەوەیە، چۆن دەبێت ئێمە بەو هەموو ڕێزو قەدرەوە لەسەر پڕوپوچ بین، ئەوانەیش بە پەنهان‌و خۆیان شاردووەتەوەو وان لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم‌و ماڵانی تردا وەك ماڵی ئەوان لەسەر هەق بن، وەك خوای گەورە باسیان دەکات‌و دەفەرموویت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ﴾[1] واتە: ئەوانەی بێباوەڕن دەربارەی ئەوانەی باوەڕیان هێناوەدەڵێن ئەگەر ئیسلام‌و باوەڕهێنان چاك بووایە ئەوانە پێش ئێمە نەدەکەوتن بۆ ئەو (باوەڕهێنانە). هۆزی نوحیش وتیان: ﴿أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ﴾[2] واتە: ئایا (چۆن) باوەڕ بە تۆ بێنین لە کاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتوون پەسترین کەسن (هەژارو داماون). جارێکی تریش خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ﴾[3] واتە: وە بەو جۆرە هەندێکیانمان بە هەندێکی تریان تاقیکردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێزو بەهرەی پی بەخشیون لەناو ئێمەدا! ئایا خوا لە هەموو کەس زاناتر نییە بەوانەی شوکرانەبژێرن. بۆیە خوای گەورە لێرەدا وەڵامی ئەو گومانەیان دەداتەوەو دەفەرموویت: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ﴾ ئای چەند گەل‌و کۆمەکی بێباوەڕانمان لە پێش ئەوان لەناوبرد لەسەر خوانەناسیان ﴿هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا﴾ واتە: کە لەوانە کەلوپەلی ناوماڵیان چاکترو ڕازاوەتر بوو، ئەعمەش دەڵێت لە ئەبو زەبیانەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا﴾ دەڵێت: (المقام)جێ

---

[1] الاحقاف (١١).

[2] الشعراء (١١١).

[3] الانعام (٥٣).

و شوێن (الندي) دیوەخان (الأثاث) کەلوپەل (الري) تابلۆی جوانو ڕازاوە[1]. عەوفی دەڵێت: لەئیبنوعەباسەوە: (المقام)جێو شوێن، (الندي) دیوەخان و ئەو خۆشیو ڕابواردنەی تێدابوون، ئەمە وەك ئەوە وایە کە کاتێك خوای گەورە باسی بەسەرهاتی هۆزی فیرعەونن دەکات چۆن لەناوی بردن دەفەرموێت: ﴿كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ﴾[2] واتە: چەندەهایان بەجێهێشت لە باخاتو کانیاوو کشتوکاڵو جێو ماوای چاكو خۆش.لێرەدا (المقام) جێو شوێن و نازونیعمەتی خۆش، (الندي) دیوەخانو ئەو شوێنەی کە تێیدا کۆدەبوونەوە، وەك خوای گەورە باسی بەسەرهاتی لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لی بێت) دەکات بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾[3] واتە: لە دیوەخانی خۆتاندا کاری بەدو ناشیرین دەکەن، عەرەبەکان بە شوێنی دانیشتن دەڵێن(نادي)یانی دیوەخان[4].

﴿قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾﴾

### سەرپێچیکەر ماوە دەدرێت بەڵام لەبیرناکرێت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بێژە بەو موشریکانەی کە هاوەڵ بۆ پەروەردگاریان دادەنێنو خۆیان بە حەقو ئێوە بە ناهەق دەزانن ﴿مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ﴾ ئەوەی لە گومڕایدا سوڕدەخواتو لە ئێمە بێت یان لە ئێوە ﴿فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا﴾ ئەوە خوای ڕەحمان مۆڵەتی ئەدات لەسەر ئەو گومڕایە ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ﴾ هەتا کاتێك کە دەبینن خودا بەڵێنی پێداونو دەگەنە لای خوداو ژیانیان کۆتایی پی دێت، یان تووشی جەزرەبە دەبن ﴿وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ﴾ یان لە ناکاو قیامەتیان بەسەردادێت ﴿فَسَيَعْلَمُونَ﴾ ئەوسا تێدەگەن ﴿مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا﴾ کی شوێنی خراپو ناخۆشەو کێش لەشکرو یارمەتی دەری کەمترە، ئەمە لە وەڵامی قسەی ئەو خوانەناسانەدایە کە دەیانوت ئێمە ڕێیو شوێنو پلەوپایەو دیوەخانمان زۆر چاکترو باشترە لە خاوەن باوەڕان، ئەم ئایەتە موباهەلەیە ( واتە: پاڕانەوەو نەفرینکردن لەوەی کە درۆ بە دەم خوداوە دەکات

[1] الطبري (١٨/٢٣٩/٢٤١).

[2] الدخان (٢٥_٢٦).

[3] العنكبوت (٢٩).

[4] الطبري (١٨/٢٣٩).

،وەرگێڕ) لەبەرانبەر بتپەرستاندا ئەوانەی کە وا دەزانن لەسەر ڕێی ڕاستن وەك خوای گەورە لە باسی موباهەلە لەگەڵ جولەکەکاندا دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾[1] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: ئەی ئەوانەی لەسەر دینی جوولەکەن ئەگەر پێتان وایە کە بە ڕاستی ئێوە دۆستی خوان بێجگە لە خەڵکی تر کەوابوو داوای مردن بکەن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. جوولەکەکان خۆیان لاداو زاتیان نەکرد ئەو دوعایە بکەن. لە پێشەوە لە سورەتی (البقرة)دا ئەو باسە بە ڕوونی هاتووە. وەك چۆن خوای گەورە باسی موباهەلەی کردووە لەگەڵ گاورەکاندا لە سورەتی (ال عمران)دا وەختێك کە بەردەوام بوون لەسەر بێدینیو کۆڵیان نەدەدا لە لاساریو ڕۆچوون لە بارەی عیساوەو دەیانوت عیسا کوڕی خودایەو خودایش بەڵگەو نیشانەکانی خۆی باسکردووەو ڕوونی کردووەتەوە کە عیسا بەندەی خودایەو وەك ئادەم ئەویش دروستکراوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ﴾[2] واتە: ئینجا هەر کەسێك دەمەقاڵێی لەگەڵ کردیت (لە بارەی عیساوە) دوای ئەو زانینەی کە (بە سروش) بۆت هات تۆش پێیان بڵێ وەرن با بانگی کوڕەکانمانو کوڕەکانتانو ژنەکانمانو ژنەکانتانو خۆمانو خۆتان بکەین لە پاشان لە خوا بپاڕێینەوە ئینجا نەفرەتی خوا بکەین لە درۆزنان. مەسیحیەکان خۆیان لاداو زاتیان نەکرد ئەوە بکەن وەك جوولەکەکانیشنەیان کرد.

﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًىۗ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾ ﴾

## زیاتر شارەزاکردنی ئەو کەسانەی کە شارەزان

کاتێك خوای گەورە باسی ئەو کەسانەی کرد کە لە گومڕایدا سوڕدەخۆن، مۆڵەتیان دەدات زیاتر دەیانهێڵێتەوە لەو گومڕاییەدا، پاشان دێتە سەر باسی ئەو کەسانەی کە زیاتر ڕێیان نیشان دەداتو شارەزایان دەکات، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ﴾[3] واتە: وە کاتێك کە

---

[1] الجمعة (٦).

[2] ال عمران (٦١).

[3] التوبة (١٢٤ـ١٢٥).

بنێردرێتەوە خوارەوە سورەتێك (لە قورئان) (دووڕووەکان) هی وایان هەیە دەڵێت کام لە ئێوە زیادی کرد بەم (سورەتە) جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەئەڵێن: ئێمە ئیمانیان زیاد دەکات (و بەهێزتر دەبێت) باوەڕی وە ئەوان مژدە بەخشنو خۆشحاڵن، بەڵام ئەوانەی لەنێودڵیاندا نەخۆشیو ناپاکی هەیە ئەوە سورەتەکە سەرەڕای پیسی و ناپاکی خۆیان بۆیان زیاددەکات پیسیو ناپاکی تریش ئەو (ناپاکانە) دەمردن لە کاتێکدا کە بێباوەڕان. لێرەیشدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى ۗ وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە خودا شارەزای کردوون زیاتر شارەزایان دەکات، ئەو کارە چاکانەش کەوا دەمێننەوە، پاداشتەکەیان لە لای پەروەردگارت چاکترەو ئەنجامیشی باشترە﴿وَٱلْبَـٰقِيَـٰتُ ٱلصَّـٰلِحَـٰتُ﴾ لەپێشەوە لەسورەتی (الكهف)دا تەفسیری کراوەو ئەو فەرموودانەیش پەیوەندی بووە پێیەوە لەو باسەدا هێنراوە ﴿خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا﴾ واتە: پاداشتَ لە لای پەروەردگارت چاکترەو ﴿وَخَيْرٌ مَّرَدًّا﴾ واتە: سەرئەنجامیشی باشترە بۆ خاوەنەکەی.

﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾﴾

**وەڵامدانەوەی ئەو خوانەناسانەی وادەزانن لە قیامەتیشدا ماڵو منداڵیان هەر پێدەدرێت**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا﴾ واتە: ئایا ئەو کەسەت دی کە ئینکاری لە نیشانەکانی ئێمە دەکردو وتی: چاك دەزانم کە ماڵو منداڵم هەر پێدەدەن؟ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە خەبابی کوڕی ئەرەتتەوە من پیاوێکی ئاسنگەر بووم، قەرزێکم لە لای عاسی کوڕی وائل بوو، هاتم بۆ لای داوای قەرزەکەی لی بکەم وتی: نەخێر سوێند بە خوا قەرزەکەت نادەمەوە هەتا بێباوەڕی خۆت لە موحەمەد دەرنەبڕی، منیش وتم: نەخێر سوێند بە خوا بێباوەڕی خۆم دەرنابڕم لە موحەممەد(ﷺ) هەتا تۆ دەمریو پاشان زیندوو دەکرێیتەوە، عاس وتی: وەختێك مردمو پاشان زیندووکرامەوە هاتی بۆ لام لەوی ماڵو منداڵم دەبێتو قەرزەکەت دەدەمەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا

يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴾[1]. خاوەنی هەردوو صەحیحەکەدا ئەم فەرموودەیان هێناوە، لە وتەیەکی بوخاریدا هاتووە: من لە مەککەدا ئاسنگەر بووم شمشێرێکم بۆ عاسی کوڕی وائل دروست کرد، هاتم قەرزەکەی لی وەرگرم،..جا فەرمووده‌کەی گێڕایەوە. هەروەها دەڵێت: ﴿أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾(عهداً) واتە:پەیمانێك.[2] ﴿أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ﴾ واتە: ئایا نهێنی دەزانێت، کە دەڵێت لە ڕۆژی قیامەتدا ماڵو منداڵی دەبێتو بەڵێن دەداتو سوێند دەخوات ﴿أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا﴾ یان لە خوداوە بەڵێنێکی پێدراوەکە ئەو ماڵەی پێدەدرێت؟ لە پێشەوە باسمان کرد کە بوخاری دەڵێت: (عهد) واتە پەیمان.[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّا﴾ پیتێکە ڕەدی پێش خۆی دەداتەوەو جەخت لەسەر دوای خۆی دەکاتەوە ﴿سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ﴾ واتە: نەخێر هەرچی ئەو دەیڵێتو داوای کردووەو بڕیاری داوەو دەخوازێت پێی بدرێتو بڕوای بە خوای گەورە نەبووە هەمووی دەنووسین، ﴿وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا﴾ واتە: ماوەی سزادانی زیاتر دەکەین لە ڕۆژی قیامەتدا، لەسەر ئەو قسانەی لە دنیادا کردوویەتی بڕوای بە خوای گەورە نەبووە، ﴿وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ﴾ واتە: ئێمە دەبینە میراتگری هەرچی دەڵێت یانی هەموو ئەوانەی هەیەتی لە ماڵو منداڵ هەمووی لی وەردەگرینەوە، بە پێچەوانەی ئەو قسانەی کەئەیوت لە ڕۆژی قیامەتدا ماڵو منداڵی پی دەدرێت زیاتر لەوەی لە دنیا پێی دراوە!نەخێر بەڵکو لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەیشی لە دنیادا پێی درابوو لێی دەسێنرێتەوەوتاکو تەنیا دەمێنێتەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَأْتِينَا فَرْدًا﴾ واتە: بە تەنهاو بەبی ماڵو منداڵ دێتە لامان!

﴿وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾﴾

**خواکانی درۆیی بتپەرستان حاشا لە بتپەرستان دەکەن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا﴾ واتە: لە جێی خوا ئەوان پەرستراوانێکی تریان پەرست، تا ببنە هۆی سەربەرزیان، خوای گەورە باسی ئەو خوانەناسانە دەکات ئەوانەی کە شەریك بۆ پەروەردگاریان دادەنێنو لە جێی خوا دەیانپەرستن هەتا بە هۆی

[1] أحمد (٥/١١١)،فەرمووده‌یەکی سەحیحە.
[2] فتح الباري (٤/٣٧٢)، مسلم (٤/٢١٥٣).
[3] فتح الباري (٤/ ٣٧٢).

ئەوانەوە سەرکەوتن بە دەست بێنن‌و خۆیانی پێوە هەڵکێشن‌و شانازی پێوە بکەن، پاشان دەفەرمووێت: نەخێر، بەو شێوەیە نیە ئەوان دەیزانن‌و هیوایان پێیەتی ﴿كَلَّاۚ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ﴾ نەخێر ئەو پەرستراوانە ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕن لێیان لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو پەرستنەیان ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا﴾ واتە: بەو شێوەیە نییە ئەوان دەیزانن بەڵکو لە دژیان دەوەستن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ﴾[1] واتە: کێ گومڕاترە لەو کەسەی کە هاوار لە غەیری خوا بکات کە وەڵامی ناداتەوە تا ڕۆژی دوایی‌و ئەو (هاوارلێکراو)انە لە هاواری ئەوان بێ ئاگان، کاتێکیش خەڵك کۆدەکرێنەوە (لە قیامەت) پەرستراوەکان دەبنە دوژمنیان‌و (پەرستراوەکان) بە پەرستنەکەیان باوەڕ نادەن. سودی دەڵێت: ﴿كَلَّاۚ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ﴾ پەرستراوەکان حاشا دەکەن لەوەی کە ئەوانە بتیان پەرستووە.[2] ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا﴾ واتە: بە پێچەوانەوە ئەوەی ئەوانە ئومێدیان پێی بووە، دژیاندەوەستن، سودی دەڵێت: ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا﴾(ضِدًّا ) دوژمنایەتی ودژایەتێکی زیاد لە ئەندازەیان دەکەن، زەححاك دەڵێت: ﴿وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا﴾ دەبنە دوژمنیان[3].

### دەسەڵاتی شەیتانەکان بەسەر خوانەناساندا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّآ أَرۡسَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا﴾ واتە: تۆ نەتزانی ئێمە شەیتانەکانمان ناردووەتە سەر خوانەناسان، دنەو هانەیان دەدەن؟ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا﴾ سەریان لی دە شێوێنن‌و گومڕایان دەکەن.[4] عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە دنەو هانی خوانەناسانی دەدا دژایەتی پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی بکەن.[5] قەتادە دەڵێت: خوانەناسانی هەڵدەناو ڕایدەکێشان بۆ ئەوەی گوناه بکەن.[6] عەبدوڕەحمانی کوڕی

[1] الاحقاف (٥ـ٦).
[2] الطبري (١٨/٢٥١).
[3] الطبري (١٨/٢٥٠).
[4] الطبري (١٨/٢٥١).
[5] الدر المنثور (٥/٥٣٨).
[6] الطبري (١٨/٢٥٢).

زەید دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ﴾[1] واتە: وە هەر كەسێك پشت لە یادی خوا هەڵكات شەیتانێكی بۆ ئامادە دەكەین كە هەمیشە لەگەڵی بێتو لێی جیانابێتەوە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پەلە مەكە لە دابەزینی سزا بۆ ئەوانە، ئێمە دوایان دەخەین بۆ ماوەیەكی دیاریكراو، بێگومان ئەوانە بەرەو ئەو سزاو جەزرەبەیە دەڕۆنو هەر تووشیان دێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلًا عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ﴾[3] واتە: وا مەزانە خوا بی ئاگایە لەوەی كە ستەمكاران دەیكەن. وە فەرموویەتی: ﴿فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾[4] واتە: ئینجا مۆڵەتی بێباوەڕەكان بدە كەمێك لێیان بوەستە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوا إِثْمًا﴾[5] واتە: بە ڕاستی ئێمە مۆڵەتی ئەوان دەدەین بۆ ئەوەی گوناهی زیاتر بكەن. وە فەرموویەتی: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾[6] واتە: كەمێك نازو نیعمەتیان پی دەدەین (لە دنیادا) لە پاشان ناچاریان دەكەین كە بڕۆنە ناو سزای سەختەوە. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ تَمَتَّعُوا فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى النَّارِ﴾[7] . سودی دەڵێت:﴿إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا﴾ یانی بێگومان ئێمە بە ژماردن ساڵو مانگو ڕۆژو كاتەكانیان لەسەر دەژمێرین.

﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَنِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾﴾

## حاڵو گوزەرانی لەخواترسانو تاوانباران لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا ئێمە خواناسان بە سواری دەبەینە لای خوا. خودای گەورە باسی دۆستە خواناسەكانی دەكات، ئەوانەی كە لە دنیادا

---

[1] الزخرف (٣٦).

[2] الطبري (١٨/٢٥٢).

[3] ابراهيم (٤٢).

[4] الطارق (١٧).

[5] ال عمران (١٧٨).

[6] لقمان (٢٤).

[7] ابراهيم (٣٠).

لێی ترساون‌و شوێنی پێغەمبەرەکانی کەوتوون ئەو پەیامەیان بە ڕاست زانیوە کە بۆیان هێناون‌و بەرفەرمانیان بوون‌و ئەوەی پێغەمبەران قەدەغەیان کردبوو لێیان نزیکی نەدەکەوتنەوەو دوورەپەرێزبوون لێی، لە ڕۆژی قیامەتدا بە سواری دەبرێنە دیداری خوای گەورە،( وەفد) ئەو کەسانەن بە سواری دێن بۆ شوێنێك، وەفدەکەسواری جوانەماینی لەنووردروستکراو ئەکرێن کەبریتین لەکەرەسەکانی گواستنەوە لەودنیادا،جانەمانەبەسواری ئەو شتەباشانە ئامادەکراون بۆ سواربوون لە ڕۆژی قیامەتدا، دەبرێنە خانەیەی ڕێزو ڕەزامەندی ( دەبرێنە دیدەنی خوای گەورە)وەرگێڕ. بەڵام ئەو کەسانەی کە تاوانبارن‌و بڕوایان نەبووە بە پێغەمبەران‌و دژایەتیان کردوون، ڕاپێچ دەکرێن بە لێدان بۆ ناو ئاگر ﴿وِرۡدٗا﴾یانی بە تینوویەتی، ئەمە قسەی عەتاو ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو حەسەن‌و قەتادەو کەسانی تریشە.[1] ئا لەوێدا پێیان ئەڵێن: ﴿أَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ خَيۡرٞ مَّقَامٗا وَأَحۡسَنُ نَدِيّٗا﴾[2] واتە: کام لەم دوو کۆمەڵە جێو شوێنیان خۆشترەو کۆڕو دیوەخانیان چاکترە؟! ئیبنو ئەبی ... ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی قەیسی مولائیەوە لە ئیبنو مەرزوقەوە: ﴿يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا﴾ دەڵێت: خاوەن باوەڕ کاتێك لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە، جوانترین‌و بۆنخۆشترین کەس کە چاویان پێی کەوتبێت پێشوازی لی دەکات، ئەڵێت: تۆ کێیت؟ دەڵێت: ئایا نامناسیت؟ ئەمیش ئەڵێ: نەخێر، خوا بۆنی خۆش کردووی‌و ڕوویشی جوان کردووی، دەڵێت: من کرداری چاکتم، تۆ لە ژیانی دنیادا کارچاك‌و پاك بووی، لەو ماوەدرێژەدا من بە کۆڵی تۆوە بووم، فەرموو وەرە کۆڵی من، ئەمیش دەچێتە کۆڵی‌و سوار دەبێت. ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا﴾( عەلی کوڕی تەڵحەش ئەفەرموێ ﴿ يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴾ یانی: بە سواری)[3] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا﴾ واتە: تاوانبارانیش ڕاپێچ دەکەین بە لێدان بۆ ناو ئاگر بە تینوویەتی، ﴿ لَّا يَمۡلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾ واتە: توانای تکاکردنیان نییەو کەسیش نیە تکایان بۆ بکات وەك خاوەن باوەڕان تکا بۆ یەکتری دەکەن، وەك خوای گەورە باسیان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٖ﴾[4] واتە: وە هیچ تکاکارێك بۆ ئێمە نییە، وە هیچ هاوڕێیەکی

---

[1] الطبري (١٨/٢٥٣)، الدر المنثور (٥/٥٤١).

[2] مريم (٧٣).

[3] الطبري (١٨/٢٨٠).

[4] الشعراء (١٠٠_١٠١).

دڵسۆزمان نیە. لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا﴾ واتە: مەگین ئەوەی پەیمانی لە خودا وەرگرتبێت، ئەمە ئیستیسنای مونقەتیعە واتە: بەڵام ئەو کەسانە کە پەیمانیان لە خودا وەرگرتبێت، کە ئەوەیش سەلماندنی (لا إله الاّ الله) ئەنجامدانی هەقەکەیەتی ، عەلی کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا﴾ دەڵێت: پەیمانەکە شایەتیدانە بە (لا إله الاّ الله)داو خۆ بەریکردنە لە هەموو تواناو دەسەڵاتێك بەبێ یارمەتی خواو ئومێدی بە هیچ شتێك نەمێنێت خوای گەورە نەبێت[1].

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا (٨٨) لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا (٨٩) تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا (٩٠) أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا (٩١) وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا (٩٢) إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا (٩٣) لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا (٩٤) وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا (٩٥)﴾

## بێزاریەکی زۆر توند لەوانەی کە دەڵێن خودا منداڵی هەیە

دوای ئەوەی خوای گەورە لەم سورەتە پیرۆزەدا باسی بەندەبونی عیسای کرد (سەلامی خوای لی بێت) کە لە مەریم وەدیهێنا بەبی باوك، دێتە سەر باسی ئەو کەسانەی وادەزانن خودا منداڵی هەیە، خودا پاكو پیرۆزەو بی عەیبەو دوورە لەو شتانەی کە ئەوانە ئەیڵێن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا﴾ واتە: وتوویانە خودا بووەتە خاوەنی منداڵ، ﴿لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا﴾ واتە: بێگومان قسەیەکی زۆر مەزنتان کردووە. ئیبنو عەبباسو موجاهیدو قەتادەو مالیك دەڵێت قسەیەکی زۆر گەورە، ﴿إِدّٗا﴾ بە کەسری هەمزەو فەتحیش هاتووە لەگەڵ مەددە پێدانیدا بە سی شێوە هاتووە، بەڵام یەکەم شێوەیان بەناوبانگترە، ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا﴾ واتە: خەریکە لەکاتی بیستنی ئەو قسەیەدا کە بەرەڵاکانی ناو ئەم نەوەی ئادەمە ئەیکەن ئاسمانەکان پارچەپارچە بن‌و زەمینیش شەق بباتو کێوەکانیش بەسەریەکدا بڕوخێن‌و لەتلەت بن، لە ترسی خوداو گەورەیی خودا !چونکە ئەوانە دروستکراوی خوان‌و خوایان بە تەنها ناسیووەوئەزانن هیچ خودایە نیە غەیری ئەو هاوتاو هاوەڵو منداڵو خێزانی نییە، بەڵکو خودا تەنهاو بی نیازو جی نیازە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتانەدا: ﴿تَكَادُ

[1] الطبري (١٨/٢٥٧).

ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدًا﴾ دەڵێ: شەریك دانان بۆ خودا ئاسمانەكانو زەمینو كێوەكانو هەرچی گیانەوەران هەیە هێناویەتە لەرزە لە ترساندا مرۆڤو جنۆكە نەبێت، خەریك بوو هەموو لەناو بچن لە ترسی خودا،بۆیە وەك چۆن خێرو چاكە هیچ سودێكی نیە لەگەڵ هاوەڵدانان بۆ خودا، بە هەمان شێوەش هیواهەیەلە تاوانەكانی یەكتاپەرستانهەموو خۆش ببێت ! پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (وتەی شایەتومان (لا إله الاّ الله) بخەنە سەر زمانیانی مردووەكانتان، هەر كەسێك وتەی (لا إله الاّ الله) ی وت لە كاتی مردنیدا بەهەشتی پی دەدرێت). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەی ئەگەر كەسێك لە كاتی لەش ساغیو تەندروستیدا وتی؟ فەرمووی: (ئەوە واجبتر دەبێت، واجبتر دەبێت)، پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر ئاسمانەكانو زەمینو ئەوەی تیایاندایەو ئەوەی لە نێوانیاندایەو ئەوەی لە ژێریاندایە لە تای تەرازوویەكدا دابنرێتو وتەی شایەتومانیش (لا إله الاّ الله) لە تاكەی تریدا دابنرێت،وشەكانی(لا اله الا الله)ەكە دەیانهێنێتەوە ، ئیبنو جەریریش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی كردووە.[1] فەرموودەی بلیتەكە دەبێتە پشتگیری.[2] زەححاك دەڵێت: ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ﴾ واتە: لەتلەت دەبێت لە ترسی گەورەیی خودا، عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێت: ﴿وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ﴾ واتە: خەریكە زەمین شەق ببات لە توڕەییدا لەتاو ئەوقسەیە و لەبەرخاتری خوا-عزوجل- ﴿وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا﴾ ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿هَدًّا﴾ واتە: بتەپن، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: ﴿هَدًّا﴾ واتە: وەختە كێوەكان یەك لەدوای یەك وردبن بەسەر یەكدا ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو موساوە (ڕەزای خوای لی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ كەسێك نیە خۆڕاگرتر بێت لە خوا لەسەر ئازارێك كە بیستبێتی، كە شەریكی بۆ دادەنێنو دەیكەنە خاوەنی منداڵ، كەچی خودا تەندروستیان دەكاتو دەیانپارێزێتو ڕۆزیشیان دەدات).[3] لە هەردوو صەحیحەكەدا هاتووە، وە لە وتەیەكی تردا هاتووە: (ئەوانە منداڵی بۆ دادەنێن كەچی ئەو ڕۆزیان دەداتو تەندروستیشیان دەكات.[4] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن

---

[1] الطبري (١٨/٢٥٨).

[2] تحفة الأحوزي (٧/٣٩٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە،حەدیسی(البطاقة)بەناوبانگەوبۆئاگاداربوون لێی سەیری كتێبەكانی عقائدبكەوبۆنمونەكتێبی (فتح المجيدشرح كتاب التوحيد)ص٦٦.(وەرگێڕ)

[3] احمد (٤/٤٠٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] فتح الباري (١٠/٥٢٧)، مسلم (٤/٢١٦٠).

يَتَّخِذَ وَلَدًا﴾ واتە: لە خودا ناوەشێتەوە کە هیچ فەرزندێکی هەبێت، لەبەر دەسەڵاتی بی پایانیو زۆر مەزنی هیچ کەس لە دروستکراوەکانی نەیتوانیووە هەمبەرو هاوتای بێت، چونکە هەموو دروستکراوەکانی بەندەی زۆر بی تواناو ملکەچی ئەون، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا﴾ واتە: هەرچی لەناو ئاسمانەکانو زەمیندایە هەموو بە بەندایەتی دێنە لای خودا، خوای گەورە زانیویەتی ژمارەیان چەندە لەو ڕۆژەوە دروستی کردوون هەتا ڕۆژی قیامەت، ئاگاداری نێرو میو گەورەو بچووکیانە، ﴿لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا﴾ واتە: هەموویانی تۆمارکردووەو بە ژماردن ژماردوونی، ﴿وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا﴾ واتە: هەموو لە ڕۆژی قیامەتدا بە تەنها دێنە لای خودا، هیچ پەناو یارمەتی دەرێکیان نیە لە غەیری خودا کە شەریکی نیەو بە کاروباری دروستکراوەکانیا دەگا بە مەیلی خۆی، ئەو دادپەروەرەیە کە مسقالە زەڕەیەك ناهەقی لە هیچ کەسێك ناکات.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًۢا ﴿٩٨﴾﴾

## خوای گەورە خۆشەویستیی پیاوچاکان دەخاتە ناو دڵانەوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکاری چاکیان هەیە، خوای گەورە خۆشەویستیان دەکات لە دڵی بەندە چاکەکانی خۆیدا، ئەمەیش شتێکە گومانی تێدا نیەو دێتەجی، لە چەند ڕێگاوە فەرموودەی صەحیح هاتووە دەربارەی ئەمە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا کاتێك بەندەیەکی خۆی خۆشویست، جوبرەئیل بانگ دەکات، دەفەرمووێت: ئەی جوبرەئیل من فڵانە کەسم خۆش دەوێت تۆیش خۆشت بوێت، فەرمووی ئیتر جوبرەئیل خۆشی دەوێت، فەرمووی: پاشان جوبرەئیل لەناو ئەهلی ئاسماندا جاڕ دەداتو ئەڵێ: خودا فڵانە کەسی خۆش دەوێت ئێوەیش خۆشتان بوێ، فەرمووی: ئیتر ئەهلی ئاسمان خۆشیان دەوێ، پاش ئەمە لەسەر زەمیندا ئەو خۆشەویستیەی بۆبڕیار دەدرێت ، وە هەرکاتێك خودا ڕقی بوو لە بەندەیەکی خۆی، جوبرەئیل بانگ دەکاتو دەفەرمووێت: ئەی جوبرەئیل من ڕقم لە فڵانە کەسە تۆیش ڕقت لێی بێت، فەرمووی:ئیتر جوبرەئیل ڕقی لێیەتی، پاشان لەناو ئەهلی ئاسماندا جاڕدەداو ئەڵێ: خودا ڕقیەتی لە فڵانە کەس، ئێوەیش ڕقتان لێی بێت، فەرمووی: ئیتر ئەهلی

ئاسمانیش ڕقیان لێیەتی، پاش ئەمە لەسەر زەمیندا ئەو ڕقەی لی هەڵدەگرێت).[١] بوخاریو موسلیمیش بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە.[٢] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لی بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك خودا بەندەیەکی خۆی خۆشبوێت، جوبرەئیل بانگ ئەکاتوئەفەرمووێ : من فلانە کەسم خۆش دەوێت تۆیش خۆشت بوێت، جوبرەئیلیش بانگ دەکات لە ناو ئاسماندا، پاش ئەمە خۆشەویستیەی بۆ دادەبەزێنێتە ناو خەڵکی سەر زەوی، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا﴾[٣]. موسلیمو تیرمزی ڕیوایەتیان کردووە، تیرمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە[٤].

**قورئان هاتووە بۆ مژدەدانو ترساندن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا﴾ واتە: ئێمە ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەم قورئانەمان بە ئاسانی، بە زمانی خۆت، ئەو زمانە عەرەبیە ڕوونو ئاشکرایە ناردووە هەتا مزگێنی بدەی بەوانەی وەڵامی بانگی خودا دەدەنەوەو پێغەمبەرەکانیش بە ڕاست دەزانن‌و بڕوایان پی دەکەن، وە گەلی سەرسەختو لە هەق لادەرو شوێنکەوتووی پڕوپوچی پی بترسێنیت، پاشان دەفەرمووێت: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ﴾ واتە: چەندین گەلانمان لە پێش ئەمانە مان قڕتێ خست کە حاشایان دەکرد لە نیشانەکانی خوداو بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی نەدەکرد قڕتی خست ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾ واتە: ئایا کەسیان دەبینیو یان گوێت لە دەنگی هیچ کەسیانە، ئیبنو عەبباسو ئەبولعالیەو عیکریمەو حەسەنی بەسریو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاكو ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿رِكْزًا﴾ واتە: دەنگێك.[٥] حەسەنو قەتادە دەڵێن: ئایا کەسێك دەبینی یان گوێت لە دەنگێکە.[٦] (الركز) لە ئەسلی زمانی عەرەبیدا بریتیە لە دەنگی نزك (سرتە).

---

[١] احمد (٢/٤١٣/٤١٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] فتح الباري (١/٤٧٦)، مسلم (٤/٢٠٣٠).

[٣] عبدالرزاق (١٠/٤٥٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٤] مسلم (٤/١٠٣١)، تحفة الأحوزي (٨/٦٠٠).

[٥] الطبري (١٨/٢٦٥).

[٦] الطبري (١٨/٢٦٥).

## سورەتی ( طه )

## لە مەککە دا هاتووە تەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿طه ﴿١﴾ مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى ﴿٤﴾ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾﴾

### ئەم قورئانە لە لایەن خوداوە هاتووەتەخوارو یادەوەریە

﴿طـه﴾ لە پێشەوە قسە لەسەر ئەم پیتانە کرا لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا پێویست ناکات لێرەدا جارێکی تر باسی بکەینەوە، ﴿مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ﴾ واتە: ئەم قورئانەمان بۆئەوەبۆ نەناردووی کە تووشی چەوسانەوە بی، جوەیبر دەڵێت لە زەحجاکەوە: کاتێك خوای گەورە قورئانی نارده خوار بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) خۆیی‌و هاوەڵەکانی هەڵسان بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، بتپەرستەکانی قورەیش وتیان: خودا ئەم قورئانەی نەناردووەتە خوارەوە بۆ چەوسانەوەی موحەممەد(ﷺ) نەبێت، خوای گەورەیش ئەم ئایەتانەی نەناردەخوار ﴿طه ﴿١﴾ مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ﴾[1] یانی: بەو شێوەیە نیە کە خوانەناسان گومان دەبەن، بەڵکو هەر کەسێك خودا شارەزای کرد توشی خێروبێری زۆری دەکات، وەك لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە معاویەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك خودا بیەوێت تووشی خێری بکات شارەزای دەکات لە ئایندا).[2] موجاهید دەڵێت ئەم ئایەتە: ﴿مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ﴾ وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾[3] واتە: دەی ئەوەندەی بۆتان ئاسانە لە قورئان دەوری بکەنەوە. هاوەڵەکانی پێغەمبەر پەتیان دەبەست بە ناو قەدیانەوەو خۆیان هەڵدەواسی لە کاتی نوێژکردندا![4] قەتادە دەڵێت: ﴿مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ﴾ واتە: نەخێر سوێند بە خوا ئەو قورئانەی نەناردووە تووشی چەوسانەوەت بکات بەڵکو کردوویەتی بە ڕەحمەت‌و

---

[1] القرطبي (١١/١٦٧).

[2] فتح الباري (٨١/١٩٧)، مسلم (٢/٧١٩).

[3] المزمل (٢٠).

[4] الطبري (١٨/٢٦٩).

میهرەبانیو ڕووناكیو ڕێنیشاندەر بۆ بەهەشت.[1] ﴿إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ﴾ خوای گەورە بۆیە كتێبی خۆی ناردووەو پێغەمبەریشی ڕەوانەكردووە بەزەییەكەی خوای گەورە خۆیەتی ،تائەوكەسەی زیكری دەویٚ بیخوێنێتەوەونەوكەسەی گوێبیستی ئەبێت سودی لی وەربگرێت،چونكە ئەم قورئانە یادەوەریەكە كە خوای گەورە باسی حەڵاڵو حەرامەكانی خۆی تێداكردووە. پاشان دەفەرموویٚت: ﴿تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى﴾ واتە: ئەم قورئانە كە بۆت هاتووە ئەی موحەممەد(ﷺ) لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە، كە پەروەردگاری هەموو شتێكەو خاوەنیشیەتیو توانای بەسەریاندا هەیە، ئەو خودایەی كە زەمینی بەو بەرزییو نزمیو قەبارەیەو ئەو ئاسمانە بەرزانەش بەو جوانیو ڕێكیە وەدیهێناوە. خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ﴾ دەربارەی(ئیستیوا)لە پێشەوە لە سورەتی (الاعراف) قسەی لێكراوە پێویست ناكات لێرەدا جارێكی تر باسی بكەینەوە، چاكترین ڕێڕەوو ئەمینترین ڕێگا لەم بارەیەوە شوێنكەوتنی زانایانی پێشینە بۆ تێگەیشتن لەدین ئەوەیە هەرچی لە قورئانو فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ)داهاتووە باسیان بكەین بەبی چەندو چۆنوبەبیٚ گۆڕینو شوبهاندن وبەبیٚ پەكخستنو شێوەدانان لە بەرانبەریدا. پاشان خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَىٰ﴾ هەرچی لەناو ئاسمانەكانو زەویدا هەیەو هەرچیەكیش لە نێوانیاندایەو هەرچیش لە ژێر خاكدایە هەمووی خودا خاوەنیەتیو لە ژێر دەستی ئەودایەو هەڵی دەسوڕێنێت بە مەیلو فەرمانو دەسەڵاتی خۆی، ئەو وەدیهێنەرو خودایانە، غەیری خودا پەرستراوو پەروەرینێكی تریان نیە، ﴿وَمَا تَحْتَ الثَّرَىٰ﴾ موحەممەدی كوڕی كەعب دەڵێت: واتە: ئەوەی لە ژێر زەمینی حەوتەمیشدایە.[2] خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى﴾ واتە: ئەگەر دەنگیشت بەرزكردووە، ئەو خودایەی كە قورئانی ناردووە هەر ئەو خاوەنی زەمینو ئاسمانە بڵندەكان هەر ئەویش بە ڕازی دڵو نزمتریش لەوە دەزانێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[3] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵی زاتێك ئەم قورئانەی ناردووەتە خوارەوە كە هەموو نهێنی ئاسمانەكانو زەوی دەزانێت بە ڕاستی ئەو (خوایە) لێبوردەی

---

[1] الطبري (١٨/٢٦٩).

[2] الطبري (١٨/٢٧١).

[3] الفرقان (٦).

میهرەبانە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە: ﴿يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى﴾ دەڵێت: ﴿ٱلسِّرَّ﴾ ئەوەی مرۆڤ لەدڵی خۆیدا دەیشارێتەوە و ئاشکرای ناکات، ﴿وَأَخۡفَى﴾ ئەوەی لە مرۆڤ شاراوەتەوە لەو شتانەی کە دەیکات پێش ئەوەی پێی بزانێت، خوای گەورە ئەوانە گشت دەزانێت، زانستی خودا بۆ ئەوانەی تێپەڕیوەو ڕۆیشتووەو ئەوەیش لەمەودوا ماوەو دێت وەك یەکە، هەموو دروستکراوەکان لەو بارەیەوە لای خودا وەك یەك گیان وایە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموویێت: ﴿مَّا خَلۡقُكُمۡ وَلَا بَعۡثُكُمۡ إِلَّا كَنَفۡسٖ وَٰحِدَةٍ﴾[1] واتە: دروستکردنی هەمووتان(لەسەرەتاوە)و زیندووکردنەوەتان وەك (دروستکردنو زیندووکردنەوەی) تەنها کەسێك وایە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ واتە: ئەوەی کە قورئانی ناردەخوار بۆ تۆ، هەر ئەو خودایە لە غەیری ئەو کەس بۆ پەرستن نابێت، ناوە هەرە پیرۆزەکانو سیفەتە هەرە بەرزەکان هەر بۆ ئەون.

﴿وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ۝٩ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ۝١٠﴾

ئایابەسەرهاتی موسات پێگەیشتووە کاتێك ئاگرێکی بینی ووتی بەخێزانەکەی ئێوە لێرە بمێنن من ئاگرێکم بەدی کردووە بەڵکو بڕۆم چڵوسکێکی لێ بهێنم یان ڕێگە پیشاندەرێك لای ئەوئاگرە بدۆزمەوە

**بەسەرهاتی پەیامەکەی موسا (سەلامی خوای لی بێت)**

لێرەوە خوای گەورە دێتە سەر باسی بەسەرهاتی موسا (سەلامی خوای لی بێت) ·کە چۆن لە سەرەتاوە وەحی بۆ هاتو خودا قسەی لەگەڵ کرد، دوای ئەوەی موسا (سەلامی خوای لی بێت) ئەو ماوە شوانیەی تەواو کرد کە بەڵێنی دابوو بە خەزوری، لەگەڵ خێزانیدا بەڕێکەوتن وەك وتراوە بەرەو وڵاتی میسر پاش ئەو ماوە درێژەی کە لێی دوورکەوتبووەوە کە زیاتر لە دە ساڵ بوو، کە شەویان بەسەردا هات ڕێیان لی تێکچوو لە شەوێکی زستاندا، چوونە شوێنی لە نێوان ئەو کێوو دۆڵانەدا بەو سەرماو زستانو هەورو تاریکیو تەمو مژەدا، پیوو چەخماخەیەکی پێبوو بۆ ئاگرکردنەوە ، هەرچەندە هەوڵی دەدا ئاگری لی دەرکات، وەك چۆن لەو زەمانەدا عادەت بوو ئاگریان بەو دەزگایە دەکردەوە، هیچ تروسکەی لێوە نەهات، کاتێك موسا (سەلامی خوای لی بێت) سەرقاڵی ئەوەبوو بەڵکو ئاگرێك بکاتەوە، لە لای کێوی توورەوە ئاگرێکی چاوپێکەوت کە لە لای ڕاسیتەوە بوو، مژدەی دا بە خێزانیو

---

[1] لقمان (٢٨).

[2] الطبري (٢٧٢/١٨).

وەك خوای گەورە دەفەرموویت وتی:﴿ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ ﴾ واتە: ئەو كاتەی ئاگرێكی دی وتی بە خاوخێزانەكەی: لێرە مەجوڵێن من ئاگرێكم بەدیكرد، بەڵكو چلوسكێكتان بۆ بێنم(قبس): چلۆسكێك ئاگری پێوە بێت ،لەئایەتێكی تردائەفەرموێ(أوجذوة من النار) (جذوة) بریتیە لەسكێك كە گڕی هەڵگرتبێت لە ئایەتێكی تردا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ﴾[1] واتە: خۆتانی پی گەرم كەنەوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە شەوێكی ساردو سەرمابووە، وە دەفەرمووێت: ﴿بِقَبَسٍ﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە شەوێكی تاریكیش بووە، ﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى﴾ واتە: یان كەسێكی شارەزام لەوی دەستكەوێت، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت كە ڕێیان لی ون بووە، وەك سەوری دەڵێت: لە ئەبو سەعیدی ئەعوەرەوە لە عریكریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى﴾ دەڵێت: یان كەسێكم دەست دەكەوێت ڕێم نیشاندا، چونكە ڕێیان ون كردبوو نەیاندەزانی ڕوو لە كوی بكەن، كاتێك ئاگرەكەی دی وتی: ئەگەر كەسم دەست نەكەوت شارەزای ڕێم بكات، ئاگرێكتان بۆ دێنم دەوری خۆتانی پی ڕۆشن بكەنەوە[2].

﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ١١ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ١٢ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ١٣ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ١٥ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ١٦﴾

**سەرەتای هاتنی نیگاو وەحی بۆ موسا (سەلامی خوای لی بێت)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا﴾ واتە: كاتێك گەیشتە لای ئاگرەكە ﴿نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ بانگی لێكرا ئەی موسا، لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێت: ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ ﴾[3] واتە: ئینجا كاتێك هاتە نزیكی ئەو (ئاگرە) بانگی لێكرا لە كەناری لای ڕاستی شیوەكەوە لەو پارچە زەویە بە فەڕو پیرۆزەی نزیك درەختەكەوە كە: ئەی موسا !بە ڕاستی من ئەو خوایەم... وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ﴾ واتە: ئەوەی كە قسەت لەگەڵ دەكەم، من خودی پەروەردگاری تۆ، ﴿فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ﴾ كەوشەكانت فڕێدە ،عەلی كوڕی

---

[1] القصص (٢٩).

[2] الطبري (١٨/٢٧٧).

[3] القصص (٣٠).

ئەبو تالب‌و ئەبوزەڕو ئەبو ئەیوب‌و کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە وتوویانە: کەوشەکانی لە پێستی کەر بووەو خۆشە نەکراوە( چاك نەبووە)، وتراویشە: بۆیە فەرمانی پێدراوە پێڵاوەکانی داکەنی‌و فرێیدا ئەوە بووە وەك رێزێك بۆ ئەو شوێنەی تێیدایە.[1] ﴿إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾ واتە: تۆ وای لەناو شیوی پیرۆزی (توا)دا. ﴿طُوًى﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: (توا) ناوی شیوەکەیە.[2] زۆرێکی تریش لە زانایان وتوویانە لەسەر ئەم ڕایە، ﴿طُوًى﴾ عەتفەبەیانە، وتراویشە، مەبەست پێی فەرماندانە بە موسا کە هەردوو پێی بخاتە سەر ئەو شوێنە پیرۆزە، دیسان وتراوە: چونکە دووجار پیرۆز کراوەو خێرو بێری تێداپێچراوەتەوە ، بەڵام ڕای یەکەم چاکترە، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾[3] واتە: کاتێك کە پەروەردگاری بانگی کرد لە شیوی پیرۆزی (طوا) وە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ﴾ واتە: من تۆم هەڵبژاردووە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِى وَبِكَلَٰمِى﴾[4] واتە: بێگومان من تۆم هەڵبژاردووە بەسەر هەموو خەڵکیەوە بە پەیامەکانم‌و قسەکردنم (لەگەڵت ڕاستەوخۆ). وتراوە: خوای گەورە فەرموویەتی بە موسا: ئەی موسا ئایا دەزانی بۆچی بە تایبەتی تۆم لە نێوان هەمووخەڵکیدا هەڵبژاردووە قسەت لەگەڵ بکەم ؟ موسا وتی: نەخێر، فەرمووی: چونکە هیچ کەسێك وەك تۆ خۆی ئەوەندە بە کەم نەزانیووە کە تۆ دەیزانی، ﴿فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ﴾ واتە: سا گوێ بگرە بۆ ئەو قسانەی پێت ڕادەگەیەنم‌و فەرمانت پێدەکەم، ﴿إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾ واتە: من خودام‌و جگە لە من خودای تر نییە، ئەم وتەیە یەکەم شتێکە کە کراوە بە ئەرکی لەسەر ئەوانەی ئەرك هەڵدەگرن (موکەلەفن) کە بزانن، جگە لە خودا خودایەکی تر نییەوئەو خوایە تەنهایەو شەریکی نییە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿فَٱعْبُدْنِى﴾ واتە: تەنها من بپەرستەو عیبادەتی من بکەو شەریکم بۆ دامەنێ، ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ﴾ واتە: نوێژ بکە بۆ ئەوەی وەبیر خۆتم بخەیتەوە، وتراوە: واتە: بۆ یادکردنم نوێژ بکە، وە وتراوە: لە کاتی یادکردنی مندا هەڵسە بۆ نوێژکردن، بەڵگە لەسەر ئەم ڕای دووەمە،ئەوەیە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك

---

[1] الطبري (١٨/٢٧٨).

[2] الطبري (١٨/٢٨١).

[3] النازعات (١٦).

[4] الاعراف (١٤٤).

یەکێکتان خەوت و نوێژی نەکرد، یان نوێژی لەبیرچوو، با هەرکاتێك وەبیری هاتەوە نوێژەکەی بکات، چونکە خودای مەزن فەرموویەتی: نوێژ بکە تا وەبیرخۆتم بخەیتەوە).[1] وە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتوە لە ئەنەسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێك خەوت و نوێژی نەکرد، یان لە یادی چوو، کەفارەتەکەی ئەوەیە کاتێك وەبیری هاتەوە نوێژەکەی بکات، هیچ کەفارەتێکی تری نیە ئەوە نەبێت).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ﴾ واتە: ڕۆژی قیامەت وا بەڕێوەو هەر دێت و گومانی تێدا نیە، ﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾ زەحاك دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: (أكاد أخفيها من نفسي).[3] دەیوت: ڕۆژی قیامەت هەرگیز لە نەفسی خوای گەورەدا ناشارێتەوە.[4] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿أَكَادُ أُخْفِيهَا﴾ دەڵێت: واتە: کەسی تری لێ ئاگادار ناکەم خۆم نەبێت.[5] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾[6] واتە: بڵێ کەسانێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدان غەیب نازانن بێجگە لە خودا (تەنها ئەو دەیزانێت). وە دەفەرمووێت: ﴿ثَقُلَتْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً﴾[7] واتە: (هاتنی قیامەت) بۆ ئاسمانەکان و زەویش گران و قورسە نایەت بەسەرتاندا لە ناکاودا نەبێت. واتە: زانینی گرانە بۆ ئەوانەی لەناو ئاسمانەکان و زەمیندان، لە پڕ ئەو ڕۆژە ڕووتان تێدەکات، وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ﴾ واتە: هەموو کەسێك بەری ڕەنج و بەهرەی خۆی وەردەگرێت لەو ڕۆژەدا، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾[8] واتە: ئینجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە، وە هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی

---

[1] احمد (٨٤/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[2] فتح الباري (٨٤/٢)، مسلم (٤٧٧/١).
[3] فتح القدير (٣٦١/٣).
[4] الدر المنثور (٥٦٣/٥).
[5] الطبري (٢٨٥/١٨).
[6] النمل (٦٥).
[7] الاعراف (١٨٧).
[8] الزلزلة (٧ــ٨).

کردبێت دەیبینێتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: چونکە بێگومان پاداشت دەدرێنەوە لەسەر ئەوەی کە دەتانکرد. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ﴾ مەبەست بەم ئایەتە قسەکردنە لەگەڵ تاکە تاکەی خەڵکدا یانی شوێن ڕێبازی کەسێك مەکەون کەبڕوای بەقیامەت نیە و سەری کردوەتە خۆشیەکانی دونیا ولەخوا یاخی بوەو شوێن حەزەکانی کەوتووە، هەر کەسێك هاوکاریان بێت بێگومان گومڕاو زەرەرمەند ئەبێت، ﴿فَتَرْدَىٰ﴾ تووشی تیاچوون وبێکەڵکی ئەبێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾[2] واتە: ئەگەر مردیش (لەناوچوو) ماڵەکەی هیچ سودێکی پی ناگەیەنێت.

﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾﴾

**عەساکەی موسا بوو بە مارێك**

ئەمە بەڵگەو موعجیزەیەکی گەورەو نیشانەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێك ناتوانێت کاری وا بکات جگە لە خودای مەزن، وە لەسەر دەستی پێغەمبەرانی ڕاسپاردەش نەبێت ڕوونادات، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: ئەی موسا ئەوە چیە بە دەستی ڕاستتەوە؟ هەندی لە زانایانی تەفسیر وتوویانە: بۆیە خوای گەورە ئەوەی پی وتووە هەتا ترس نەچێتە دڵی. وتراویشە: بۆیە وای پی وتووە کە چاك بزانێت عەساکەیەتی، واتە: ئەوەی کە لە دەستی ڕاستی دایە ئەو عەسایەیە کە خۆت دەیناسی، ئێستا دەبینی چی لی دەکەین، ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ ئیستیفهامێکی تەقریریە، ﴿قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا﴾ واتە: وتی: ئەمە عەساکەمەو وەبەر پشتی خۆمی دەدەم (لە کاتی ڕۆیشتندا سوودی لی وەردەگرم) ﴿وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى﴾ واتە: درەختی پی ڕادەوەشێنم بۆ ئەوەی گەڵاکەی داکەوی بۆ ڕانەکەم‌و بیخۆن، عەبدوڕەحمانی کوڕی قاسم دەڵێت لە ئیمامی مالیکەوە (الهش): بریتیە لەوەی پیاوێك گالۆك (عاسا) بگیرێنێتە چڵە دارێك‌و ڕایوەشێنێت بۆ ئەوەی گەڵاو بەرەکەی داکەوی چڵەکەیش نەشکێنێت، ئەمە هەششە (الهش) لێت

---

[1] التحريم (٧).

[2] الليل (١١).

نەشێوێت.[1] مەیمونی کوڕی مەهرانیش هەروای وتووە، ﴿وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ﴾ واتە: چەند ئیشی چاكو بە سودی تریشی پی دەكەم، هەندی كەمێك زیادەڕەویان كردووە شتی زۆریان هێناوە لەو بارەیەوە مەبەستیان نەپێكاوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ أَلۡقِهَا يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: ئەو عەسایە كە بە دەستتەوەیە فڕێی بدە ئەی موسا، ﴿فَأَلۡقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ﴾ واتە: كە فڕێیدا لەپڕ دیتی بووە مارێكی خزی تیژڕەو پەلاماری دەدا وەك پەرییەك ئە جولایەوە، لەو مارانە دەچوو كە زۆر توندو تیژو بچووكن، بەلام ئەم زۆر گەورەو تیژڕەوتر بوو، ﴿تَسۡعَىٰ﴾ دەڕۆیشتو خۆی پێچ ئەدا، ﴿قَالَ خُذۡهَا وَلَا تَخَفۡۖ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلۡأُولَىٰ﴾ فەرمووی: بیگرەو ترست نەبێت هەر ئێستا وەك خۆی لی دەكەینەوە،

﴿وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخۡرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى ﴿٢٣﴾ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾﴾

### دەستی موسا سپی هەڵگەڕا بی ئەوەی نەخۆشی پێوە بێت

ئەمە بەڵگەی دووەمە كە خوای گەورە دای بە موسا (سەلامی خوای لی بێت) خوای گەورە فەرمانی پێدا كە دەستی بخاتە باخەڵی وەك لە ئایەتێكی تردا ئاماژەی پێكردووە، لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ﴾ واتە: دەستت بخە ژێر باڵت، وە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ﴾[2] واتە: دەستت بلكێنە بە خۆتەوە (و بیخەرە سەر دڵت) بۆ (نەهێشتنی) ترسو بیم ئا ئەم دووانە (گۆچانەكەتو دەستت) دوو موعجیزەن لە لایەن پەروەردگارتەوە (نێردراوە) بۆ فیرعەونو دارودەستەكەی. موجاهید لەم ئایەتەدا ﴿وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ﴾ دەڵێت: دەستت بخەرە ژێر باڵت.[3] ئەوە بوو موسا (سەلامی خوای لی بێت) هەر كاتێك دەستی بخستایەتە باخەڵیو دەری بهێنایە،

---

[1] الدر المنثور (٥/٥٦٤).

[2] القصص (٣٢).

[3] الطبري (١٨/٢٩٧).

سپی دەکردەوەو دەدرەوشایەوە وەك مانگ شەوقی دەدایەوە، ﴿تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ﴾ واتە: دێتە دەری بەبێ ئازارو نەخۆشی بەڵەکی، ئەمە قسەی ئیبنو عەبباس‌و موجاهیدو عیکریمەو قەتادەو زەححاك‌و سودی‌و کەسانی تریشە[1]. حەسەنی بەسری دەڵێت: سوێند بە خوا کەدەستی دەرهێناوە وەك چرا شەوقی داوەتەوە، موسا لەو کاتەدا بۆی دەرکەوت کەبەدیداری خوای خۆی گەیشتووە.[2] ﴿ءَايَةً أُخۡرَىٰ﴾ واتە: واتە: ئەمەیش نیشانەکی ترە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِنُرِيَكَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى﴾ واتە: تا ئێمە لەهەندێ نیشانەکانی هەرە گەورەی خۆمانت نیشان بدەین.

### خوای گەورە فەرمانی دا بە موسا بڕوا بۆ لای فیرعەون‌و بانگی بکات بۆ خواناسی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ واتە: بڕۆ بۆ لای فیرعەون (پاشای میسر)، ئەوەی کە تۆڵە ترسی ئەو ڕات کردو دەرباز بووی لە دەستی، بانگی بکە بۆ پەرستنی خودا کە تەنهایەو شەریکی نیە، داوای لی بکە با بە چاکی مامەڵە بکات لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلداو جەزرەبەیان نەدا، دیارە فیرعەون زۆر ستەمکارو خراپ‌و لە سنوور دەرچووەو ژیانی دنیای زۆر بە لاوە گرنگترو خۆشەویستترەو پەروەردگاری مەزنی لە یادکردووە.

### دوعاکردن‌و پاڕانەوەی موسا (سەلامی خوای لی بێت)

﴿قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي﴾ واتە: ئەمە داوای موسایە (سەلامی خوای لی بێت) لە پەروەردگاری کە پشووی درێژ بکات‌و کاریشی بۆ ئاسان بکات لەسەر ئەو پەیامەی کە بۆی ناردووە، چونکە فەرمانێکی زۆر گرنگ‌و کارێکی زۆر مەزنە، ناردوویەتی بۆ لای گەورەترین فەرمانڕەوای سەر زەمینی ئەو کاتە، کە ستەمکارترین‌و خوانەناسترین کەس‌و خاوەنی لەشکرێکی زۆرو تەمەنێکی زۆریش بووە لەچاو فەرمانڕەواکانی تردا، وە زۆر گومڕاو سەرکەش بووە، هەتا وای لێهاتووە دانی بە بوونی خوادا نەناوە، جگە لە خۆی کەسی بە خوای ژێردەستەو دەربارەکانی خۆی نەزانیووە، موسایش ماوەیەکی زۆر لە ماڵی ئەودا ژیاوەو گەورە بووە، پاشان پیاوێکی لێیان کوشتووەو ترساوە بیکوژن‌و لە دەستیان ڕای کردووەو خۆی دەربازکردووە هەتا ئەو کاتە، پاش ئەو ڕووداوە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ لایان هەتا بیانترسێنێت‌و بانگیان بکات بۆ لای خودا، کە بە تەنها بیپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن، بۆیە وتوویەتی: ﴿رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي﴾ واتە: ئەی پەروەردگارم ئەگەر تۆ پشتیوان‌و یارمەتیدەرم نەبی‌و پشوودرێژیم پی نەدەی‌و کارئاسانیم بۆ نەکەی من توانای ئەم کارە

---

[1] الطبري (١٨/٢٩٧/٢٩٨).

[2] الطبري (١٨/٢٩٨).

مەزنەم نیە، ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةً مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي﴾ واتە: گیریەك لە زمانمدایە بۆم بەردە تا لە قسەکانم تێبگەن، ئەمەیش لە کاتێکدا زمانی گیر بوو، وەختێك کە خورماو پشکۆیەکیان بۆ هێنا سکڵەکەی هەڵگرتو خستیە سەر زمانی، وەك لە دوایدا باسی دەکرێت، دیارە موسا (سەلامی خوای لی بێت) داوای نەکرد بە تەواوی زمانی چاك بێتەوە بەڵکو هەر ئەوەندەی دەویست کە خەڵکی لە قسەی بگەنو ئەوەی دەیەوێت پێیان بگەیەنێتو لێی وەرگرن، بە پێی پێویست، خۆ ئەگەر داوای بکردایە کە بە تەواوی زمانی بەر ببێت خودا دوعاکەی لی قبوڵ دەکرد، دیارە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لی بێت) بە پێی پێویست نەبێت دوعا ناکەن، بۆیە زمانی موسا ئەو گرتنەی پێوە مایەوە، خوای گەورە باسی فیرعەون دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿ أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴾[1] واتە: بەڵکو من باشترم لەو (موسا)ی کە لاوازو بی ڕێزەو ناتوانێت بە چاکی قسە بکاتو زمانی تەواو نییە. واتە: باش نازانێت قسە بە ڕەوانی بکات. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ أَخِي﴾ واتە: لە کەسو کارم، یارمەتیدەرێکم بۆ دانی، مەبەستم هارونی برامە، ئەمەیش داوایەکی تری موسایە (سەلامی خوای لی بێت) هەر بۆ خۆی ناکات بەڵکو داوا دەکات کە هارونی برایشی ببێتە یاریدەدەری، سەوری دەڵێت: لە ئەبو سەعیدەوە لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە دەڵێت: ئەو ساتەی کە موسا بووە پێغەمبەر هارونیش هەر لەو ساتەدا بووە پێغەمبەر.[2] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە کە دەرچوو بۆ ئەوەی عومرە بکات، لە لای هەندی عەرەبی کۆچەری دابەزیو گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: چی برایە بەسوودتر بووە بۆ براکەی لە دنیادا؟ وتیان: نازانین، پیاوەکە وتی: سوێند بە خوا من دەزانم، عائیشە وتی لە دڵی خۆمدا وتم سوێندەکەی بە شێوەیەك دەخوات دەزانێت کە چ برایەك بە سوودترە بۆ براکەی لە دنیاداو کەسی لی جیاناکاتەوە، وتی: موسایە کاتێك کە دوعای کرد بۆ براکەی کە ببێتە پێغەمبەر، عائیشە وتی: سوێند بە خوا ڕاست ئەکات منیش ئەڵێم (قسەکە هی ئیبن کەسیرە): بۆیە لە وەسفی موسادا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴾[3] واتە: لە لای خودا بەڕێز بوو. ﴿ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي﴾ واتە: پشتی منی پی بەهێزکە، موجاهید دەڵێت: پشتی منی پی قایم بکە، ﴿وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي﴾ واتە: بیکە بە شەریك لە کارمداو ڕاوێژمدا، ﴿كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ٣٣ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا﴾ واتە: تا ئێمە زیاتر تەسبیحاتی تۆ بکەینو زیاتر یادی تۆ بکەین، موجاهید دەڵێت: هیچ

---

[1] الزخرف (٥٢).

[2] الدر المنثور (٥/٥٦٧).

[3] الأحزاب (٦٩).

بەندەیەك ناتوانێك ببێت بەو كەسانەی كە( زۆر یادی خودا دەكەن) هەتا بە پێوەو بە دانیشتنو بە پالكەوتنەوە یادی خوا نەكات.[1] ﴿إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا﴾ واتە: تۆ چاودێریت لی كردووین لەوەی كە ئیمەت هەڵبژاردووەو پلەی پێغەمبەریت پی بەخشیوینو ڕەوانەت كردوین بۆ سەر دوژمنی خۆت فیرعەون، سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە لە كارو فەرمانەكانتدا.

﴿قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾﴾

**مژدەدان بە قبولكردنی دوعاكەیو وەبیرهێنانەوەی ئەو چاكانەی كە پێشتر خودا لەگەڵ موسا كردبوونی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: ئەی موسا ئەوەی تۆ ویستت پێت درا، ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ﴾ واتە: جارێكی تر تۆمان وەبەر چاكەی خۆمان خستی، ئەمەیش وەڵامدانەوەی دووعایەكی تری پێغەمبەرەكەیەتی موسا (سەلامی خوای لی بێت) كاتێك كە لە پەروەرندەی خۆی پاڕایەوە، وەبیرهێنانەوەی ئەو هەموو چاكانەیە كە لەگەڵی كردووە: كە خستمانە دڵی دایكتەوە لە وەختی شیرپێدانیدا كە زۆر ترسی هەبوو لە فیرعەونو دارودەستەكەی كە بیكوژن، چونكە لەو ساڵەدا لە دایك بوو كە منداڵان تێیدا دەكوژران، كە داربەستێ (تابوت) دروست بكاتو بیخاتە ناویو فڕێی بداتە دەریا، ئاوەكە بردیو دایكی موسا زۆر خەفەتبارو دلگران بوو وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا﴾[2] واتە: جا دڵی دایكی موسا خاڵی بوو (لە هەموو شت جگە لە منداڵەكەی) نزیك بوو (نهێنی) ئەو منداڵە ئاشكرا بكات ئەگەر دڵیمان نەبەستایەتەوەو بەهێزمان نەكردایە. هەتا لە لای ماڵی فیرعەوندا دەریاكەتابووتەكەی لادا، ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾[3] واتە:

---

[1] القرطبي (١٨٦/١٤).

[2] القصص (١٠).

[3] القصص (٨).

(دایکی )موسای خستە ئاوی نیلەوە، ئینجا دارو دەستەی فیرعەون (پێیان زانیو) هەڵیانگرتەوە بۆ ئەوەی ببێت بە دوژمنو هۆی خەفەت بۆیان. واتە: بڕیارێکی خودا بوو درابوو لە کاتێکدا کە ئەوان منداڵیان دەکوشت لە نەوەی ئیسرائیل لە ترسی ئەوەی نەکا موسا لە دایك بێت، بە بڕیاری خودا، کە خاوەنی تواناو دەسەڵاتێکی بی پایانەو دەتوانێت موسا پەروەردە بکات لە ماڵی فیرعەونداو بە ئاوو خۆراکی ئەو بەخێوی بکات لەگەڵ خۆشەویستی خێزانی فیرعەون بۆی، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى﴾ واتە: وام کردووە لە دوژمنەکەت کە تۆی خۆش بوێت، سەلەمەی کوڕی کوهەیل دەڵێت: خۆشەویستم کردووی لە لای بەندەکانم، ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ﴾ واتە: تا لە ژێر چاودێری خۆم پەروەردە ببی،[1] ئەبو عیمرانی جونی دەڵێت: تا لە ژێر چاودێری خودادا بەخێو بکرێن[2]، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾ چونکە کاتێك کە لە ماڵی فیرعەوندا دامەزرا چەند دایەنیان بۆ هێنا کە شیری بداتی مەمکی کەسیانی نەدەگرتو شیری نەدەخوارد، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ﴾[3] واتە: وە ئێمە پێشتر (شیری) شیردەرەکانمان حەرام کرد لە موسا (مەمکی کەسیانی نەدەمژی) ئینجا خوشکەکەی موسا وتی پێیان ئایا ماڵێکتان نیشان بدەم کە ئەو منداڵە بۆ ئێوە بەخێو بکەن (و شیری بدەنی)و دڵسۆز بن بۆی. بردیو ئەوانیش لەگەڵی ڕۆیشتن بۆ لای دایکی، مەمەکی بۆ دەرهێناو خستیە دەمیو مژی، زۆر دڵخۆش بوون پێیو کرێی شیردانەکەیان دەدایەو زۆر حاڵو گوزەرانیان چاك بوو، بەهۆی ئەو پارەیەوە کە بۆیان برایەوە لە دنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا زیاترو چاکتر دەحەسێنەوەو خۆشبەخت دەبن، خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾ واتە: ئا بەم شێوەیە تۆمان گەڕانەوە بۆ لای دایکت، تا چاوی پێت ڕوون ببێتەوەو خەفەت نەخوات، ﴿وَقَتَلْتَ نَفْسًا﴾ واتە: پیاوێکی قیبتیشت کوشت، ﴿فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ﴾ واتە: لەو خەمەیش ڕزگارمان کردی، کاتێك داروده‌ستەی فیرعەون دەیانویست بیکوژن، لە دەستیان

---

[1] الطبري (١٨/٣٠٣).

[2] فتح القدير (٣/٣٦٧).

[3] القصص (١٢).

دەربازی بوو ڕای کرد هەتا گەیشتە لای ئاوی مەدیەن ئەو پیاوە چاکە کە لەوی بوو، پێی وت: ﴿لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[1] واتە: مەترسە لە کۆمەڵی ستەمکاران ڕزگارت بوو.

﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾﴾

**هەڵبژاردنی موساو فەرمانپێکردنی کە بڕوا بۆ لای فیرعەون و بە نەرم و نیانی لەگەڵی بجوڵێتەوە**

خوای گەورە باسی موسای کردووە (سەلامی خوای لی بێت)کە لەناو خەڵکی مەدیەندا ماوەتەوە لە دەستی فیرعەون و داروەدەستەکەی ڕایکردووە لە لای خەزووری بووە بە شوان و هەتا ئەو ماوەیەی کە بڕیار بووە تەواوی بکات، تەواوی کردووە و پاشان هاتووە و ڕێکەوتی ئەو کاتەی کردووە کە خوا بڕیاری داوە بەبی ئەوەی بۆی دیاری کرابێت، هەموو کارو فەرمانێك بە دەستی خوای گەورەیە، هەر خۆی بەندەو دروستکراوەکانی بە هەر شێوەیەك بوێت ڕامدەهێنێت، بۆیە فەرموویە تی: ﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: پاشان لەسەر بڕیاری خۆم وا هاتی، موجاهید دەڵێ: واتە: لە کاتی دیاریکراودا هاتی.[2] عبدالرزاق دەڵێت: لە موعەممەرەوە لە قەتادەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ﴾ دەڵێن: لەسەر بڕیاری خۆم هاتی، هەتا ببیتە پێغەمبەرو خاوەنی پەیام،[3] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى﴾ واتە: من تۆم کردە تایبەتی خۆم، تۆم هەڵبژاردو کردمی بە پێغەمبەری خۆم، چۆنم دەوێت و ئارەزوومە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیرەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (موساو ئادەم (سەلامی خوایان لی بێت) بە یەککەیشتن موسا وتی: ئەوە تۆ بووی خەڵکت بەدبەخت کردو لە بەهەشت دەرتکردن؟ ئادەم وتی: ئەوە تۆی خودا هەڵیبژاردووی پەیامی خۆی پێداوی و کردویتی بە پێغەمبەری خۆی و تەوراتی بۆ ڕەوانەکردووی؟ وتی: بەڵی، وتی: بینیوتە کە لەسەرم نووسرابوو پێش ئەوەی کە دروستم بکات؟ موسا وتی: بەڵی، ئادەم سەرکەوت بەسەریداو پێی سەلماند).[4] موسلیم و بوخاری هەردووکیان ڕیوایەتیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى﴾ واتە: بە نیشانەکانی منەوە خۆت و

[1] القصص (٢٥).

[2] الطبري (٣١١/١٨).

[3] عبدالرزاق (١٧/٣).

[4] فتح الباري (٢٨٨/٨)، مسلم (٢٠٤٣/٤/٢٠٤٤).

براكەت بڕێنو سستیو كەمتەرخەمی مەكەن لە یادی من ﴿بِـَٔايَـٰتِى﴾ واتە: بە بەڵگەو نیشانەو موعجیزەكانی منەوە، ﴿وَلَا تَنِيَا فِى ذِكْرِى﴾ عەلی كوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: سستی مەكەن.[1] موجاهید دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە: لاواز مەبن، مەبەست پێی یانی: ماندوو نەبن لە یادی خوداو بەڵكو هەر یادی خودا بكەن لە كاتی ڕووبوونەوە لەگەڵ فیرعەوندا، بۆ ئەوەی ئەو یادی خوایە ببێتە یارمەتی بۆیان بەرامبەر فیرعەونو توانایان زیاد بكاتو زاڵیان بكاتو ببێتە هۆی پشت شكاندنی فیرعەون، ﴿ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ واتە: هەردوو بچنە لای فیرعەون ئەو سنوری بەزاندووەو یاخی بووەو لایداوەو خۆی بە زل دەزانێتو بی فەرمانی خوا دەكات، ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ﴾ واتە: بە نەرمو نیانی قسەی لەگەڵ بكەن، سا بەڵكو بیربكاتەوەو بترسێت، ئەم ئایەتە پیرۆزە پەندێكی زۆر مەزنی تێدایە، چونكە فیرعەون لەوپەڕی سەركەشیو لەخۆباییبووندا بوو، موسایش باشترین هەڵبژاردەی خودابوو لەودەمەدا لەناو دروستكراوەكانیدا، لەگەڵ ئەوەیشدا خوای گەورە فەرمانی دا بە موسا كە بە نەرمو نیانیو لەسەرخۆیی نەبێت لەگەڵ فیرعەون نەدوێت، دەبێت زۆر بە هێمنیو لەسەرخۆیی بانگی بكەنو لەگەڵی بجولێنەوە، چونكە بەو شێوەیە دڵەكان زیاتر ڕادەچڵەكێنو كاریگەرترو سوودبەخشترە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾[2] واتە: (خەڵكی) بانگ بكە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانیو دانایىو ئامۆژگاری چاكو شیرینو لەگەڵیان بدوی (موجادەلە بكە) بە چاكترین شێوە. ﴿لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ﴾ واتە: بەڵكو بگەڕێتەوە لەو گومراییو هەڵدێرەی كە تێیدایەو خەریكە لەناوی بدات، یان بترسێتو ڕێگەی خواناسی بگرێتەبەر، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴾[3] واتە: بۆ ئەو كەسەی بیەوێت بیربكاتەوە (لە دروستكراوەكانی خوا) یا بیەوێت شوكرانەبژێری خوا بكات. چونكە بیركردنەوەو گەڕانەوە لە تاوانو خراپەكارىو ترسان لە خوا خواناسیو گوێڕایەڵی وەدی دەهێنێت لە دڵدا.

---

[1] الطبري (١٨/٣١٢).

[2] النحل (١٢٥).

[3] الفرقان (٦٢).

﴿ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ ﴾

**ترسانی موسا لە فیرعەون و دڵ قایمکردنی لە لایەن خوداوە**

خوای گەورە باسی موساو هارون دەکات (سەلامی خوایان لی بێت) کە پەنا دەبەن بۆ خواو دەردەدڵی خۆیانی لا دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە دەفەرموویت: ﴿قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ أَوْ أَن يَطْغَىٰ﴾ واتە: وتیان ئەی پەروەردگارمان دەترسین فیرعەون لێمان تورە بێت یان زیاتر پێی لی ڕاکێشێت و سەرپێچی بکات. مەبەستیان ئەوە بوو کە لەوانەیە تووشی سزایان بکات و ئازاریان بدات، کە ئەوان شایەنی ئەو دەستدرێژیەی فیرعەون نەبن، زەححاك دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿أَوْ أَن يَطْغَىٰ﴾ واتە: یان دەستدرێژی بکات.[1] خوای گەورە فەرمووی: ﴿ قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴾ واتە: هیچ ترسێکتان نەبێت من لەگەڵ ئێوەم و دەبیسم و چاویشم لێیە، واتە: گوێم لە قسەکانی ئێوەو ئەویشە، ئاگاداری شوێنی ئێوەو ئەویشم، هیچ شتێکی ئێوەم لا شاراوە نیە، چاك بزانن چارەنووسی فیرعەون لە دەستی مندایەو هیچ قسەو هەناسەیەك و ملهوڕێکی نیە مەگین بە ئیزنی منەو هەر بە فەرمانی منە، من لەگەڵتانم لە ژێر چاودێری و یارمەتی و پشتیوانی منداین.

**ئامۆژگاری موسا ( سەلامی خوای لی بێت ) لەبەردەم فیرعەوندا**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ﴾ واتە: تۆبەرەی ئیسرائیلمان لەگەڵدا بنێرەو ئیترجەزرەبەیان مەدە، وا لە لایەن پەروەردگارتەوە بەڵگەو موعجیزەشمان بۆ هێناوی، ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ﴾ واتە: درودیش لەسەر ئەو کەسە بێت، ڕاستەڕێی گرتووە، واتە: ئەگەر ڕێی ڕاستت گرتەبەر سلاوی خوات لی بێت، بۆیە کاتێك کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ هیرەقل گەورەی ڕۆم، سەرەتا نامەکە ئەمە بوو: (بسم الله الرحمن الرحیم، لە موحەمەدی کوڕی عبدالله بۆ هیرەقل گەورەی ڕۆم سلاو لەو کەسەی شوێن ڕێی ڕاست کەوتووە:أما بعد، من بە بانگەوازی ئیسلام بانگت دەکەم، موسڵمان ببە پارێزراو دەبی و خوا دووجار پاداشتت دەداتەوە).[2] بۆیە موساو هارون (سەلامی خوایان لی بێت) وتیان بە فیرعەون: ﴿وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ

[1] الدر المنثور (٥/٥٨٠).

[2] فتح الباري (١/٤٢).

مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾ واتە: ئێمە ئاگادار کراوین کە هەر کەسێك بڕوا نەکاتو پشتی تی بکات سزا دەدرێت، واتە خودای مەزن هەواڵی پێداوینو ئاگاداری کردووین کە سزاو ئازار بۆ ئەو کەسەیە کە بڕوای بە نیشانەکانی خودا نیەو پشت لە فەرمانەکانی خودا دەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾[1] واتە: (لەو ڕۆژەدا چاکەو خراپە بە پێی کردەوە دابەش دەکرێت) ئینجا ئەو کەسەی سەرکەش بووبێت، وە ژیانی دنیای هەڵبژاردبێت، ئەوە بێگومان دۆزەخ جێگایەتی. وە دەفەرموێت: ﴿فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ ﴿١٤﴾ لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى ﴿١٥﴾ ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾[2] واتە: کەس ناچێتە ناو دۆزەخەوە مەگەر خراپترین کەس، ئەو کەسەی کە بڕوای نەبێتو پشتی هەڵکردبێت (لە ئاینی ڕاست). وە دەفەرموێت: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾[3] واتە: جا (کافر) نە بڕوای هێناو نە نوێژی کرد، بەڵکو بەدرۆی دەزانیو پشتی تێدەکرد. بە دڵ بڕوای نەهێناو بە کرداریش پشتی هەڵگرت.

﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَٰبٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾﴾

**گفتوگۆی نێوان موسا (سەلامی خوای لی بێت)و فیرعەون**

خوای گەورە باسی فیرعەون دەکات کە بڕوای بە بوونی وەدیهێنەرو پەروەردگاری خاوەنو خوای ئەم هەموو شتە نەبوو لە بوونەوەردا، دەیوت: ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ﴾ واتە: وتی موسا پەروەردگاری ئێوە کێیە؟ واتە: ئەوەی تۆی ناردووەو ڕایسپاردوی کێیە؟ من هەر نایناسمو واشدەزانم جگە لە من خودایەکی ترتان هەبێت، ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ واتە: وتی پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە کەبوونی بە هەموو شتێك داوە بەوەی کە دروستی کردووەو پاشان ڕێگەشی نیشانداوە، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: هەموو شتێك هاوجووتی بۆ دروستکردووە.[4] زەححاك دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە، ئەو خودا کە مرۆڤی بە مرۆڤو کەر بە کەرو مەڕ بە مەڕی دروستکردووە، لەیس لە ئەبو سولەیمەوە لە موجاهیدەوە دەڵێت: ئەو

[1] النازعات (٣٧-٣٩).
[2] الليل (١٤-١٦).
[3] القيامة (٣١-٣٢).
[4] الطبري (١٨/٣١٦).

خودایەی کە وێنەی بە هەموو شتێك داوە، ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت: لە موجاهیدەوە: ئەو خودایەی کە هەموو گیانەوەری دروستکردو ڕێکو پێکیشی کردو، سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا: ﴿أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ دەڵێت: ئەو خودایەی کە هەموو دروستکراوەکانی بەو پێیە دروست کردووە کە شایەنیەتی.[1] مرۆڤی وا دروست نەکردووە لە ئاژەڵو ماڵات بچێتو مەڕو ماڵاتیشی وا دروست نەکردووە لە سەگ بچێتو سەگیشی وا دروست نەکردووە لە مەڕ بچێت، هەر شتەو پێویستی خۆی بە تەواوی پێداوە بۆ زاوزێ کردن، بۆی ڕەخساندوون لەو بارەیەوە، هیچ شتێك لەوانە ڕەفتارو هەڵسوکەوتیان لە یەك ناچێت، لە شێوەو ڕۆزیو جووت بووندا، هەندی لە زانایانی تەفسیر وتوویانە: خوای گەورە هەموو شتێکی بە دروستکراوەکانی خۆی داوەو پاشان ڕێی نیشان داوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴾[2] واتە: بۆ هەموو شت ئەندازەی داناو ڕێی نیشاندا، واتە: کردارو ماوەی ژیانو ڕۆزی بۆ نووسیون، پاشان گشت دروستکراوەکان لەسەری دەڕۆن بەڕێوەو لێی لانادەنو کەس ناتوانێت لێی دەرچێت، ئەو خودایەی کە گیانلەبەری هەموو دروستکردووەو ماوەی بۆ دیاری کردوونو ڕامیشی هێناون بەو شێوەیەی کە خۆی ویستوویەتی، ﴿قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَىٰ﴾ واتە: ئەوانەی پێشوو چیان بەسەرهات؟ ڕاستترینی قسە ئەوەیە لەم بارەیەوە، فیرعەون کاتێك موسا (سەلامی خوای لی بێت) هەواڵی دایە کە ئەو خودایەی ئەوی ڕاسپاردووە، هەر ئەو خودایە کە دروستکەرو ڕۆزیدەرو ڕێنیشاندەرەو ئەندازەی هەموو شتێك دیاری دەکات. ئینجا فیرعەون باسی گەلە پێشووەکانی بۆ دەکات کە خودایان نەناسیووە دەڵێت ئەی ئەوانە چارەنووسیان بە چی دەگاتو چیان بەسەردێت، کە پەروەردگاری تۆیان نەپەرستووە، بەڵکو غەیری ئەویان پەرستووە، موسایش (سەلامی خوای لی بێت) لە وەڵامی ئەوەدا وتی ئەوانەی خودایان نەپەرستووە، کردارەکانیان لەسەریان نوسراوە لە لای خودا، پاداشتی ئەو کردارەی خۆیان وەردەگرن کە لە (لوح المحفوظ) ودەفتەری کردارەکانیاندا نووسراوە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٍ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى﴾ وتی: لە دەفتەرێکدایە لە لای پەروەردگارم ئەو دەیزانێت، پەروەردگارم هیچی لی ون نابێتو هیچیشی لەبیر ناچێت، واتە: هیچی لە دەست دەرناچێتو ون نابێت نە گەورەو نە بچووكو لەبیریشی ناچێت، زانیاری خوای گەورە وا وەسف دەکرێت کە دەوری هەموو شتێکی داوەو هیچ شتێکی لە بیرناچێتو پاكو بی عەیبە، بەڵام زانستی دروستکراوەکانی کەمو

---

[1] القرطبي (١١/٢٠٤).

[2] الأعلى (٣).

کورتەو تەواونیە لە هەردوو لاوە: زانیاریان نیە بەهەموو شتێك و کە شتێکیان زانی پاش ماوەیەك لە بیریان دەچێتەوە،بۆیە خودای گەورەخۆی لەو دووعەیبە بەدورگرتووە .

﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾﴾

## پاشماوەی وەڵامەکانی موسا بۆ ئەو پرسیارانەی تری فیرعەون کە مابوو

ئەمە دواین قسەکانی موسایە (سەلامی خوای لی بێت) کە کردی لە بارەی وەسفی خودای گەورەوە، کاتێك کە فیرعەون پرسیاری کرد لە موسا دەربارەی خوا وتی: ﴿أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾ واتە: پەروەردگاری من ئەو کەسەیە کە هەموو پێداویستیەکی بە دروستکراوەکانی خۆی داوە، پاشان جوملەیەکی (ڕستەیەکی) موعتەرەزەی لە نێوان ئەو قسانەیە داهێناوەو فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا﴾ ئەو کەسەی زەوی بۆ کردوونەتە لانکە لە خوێندنەوەی هەندێکی تریاندا هاتووە: ﴿مِهادًا﴾ واتە: ئەو خوایەی کە زەمینی کردووەتە ڕایەخ بۆ ئێوە، بۆ ئەوەی لەسەری جێگیر بنو بمێننەوە تێیدا لەسەری هەڵسنو دانیشنو بخەونو ئاموشۆو سەفەری تێدا بکەن، ﴿وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ واتە: ڕێگای زۆریشی تێدا وەدیهێناوە بۆ ئەوەی پێیدا بگەڕێن وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾[1] واتە: چەند ڕێگامان لەناو زەمیندا پێکهێناوە بەڵکو ئەوان شارەزا بن. وە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ﴾ واتە: لەو ئاسمانەوە بارانی باراند کە زۆر جووتەی هەمەڕەنگی ڕووەکمان پی دەرهێناو سەوزکرد، لە کشتوکاڵو میوە، لە شیرینو ترشو تاڵ لە ڕەنگو جۆری تریش، ﴿كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَٰمَكُمْ﴾ واتە: بخۆنو مەڕو ماڵاتەکەیشتان بلەوەڕێنن، واتە: هەندێکی بۆ خۆراکی خۆتان بیخۆن لەو کشتوکاڵو میوەیەو هەندێکی تریش بۆ خۆراکی مەڕو ماڵاتەکەتان بە سەوزیو بە وشکی، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ﴾ واتە: لەمەدا زۆر نیشانە هەیە بۆ خاوەن ئاوەزە ڕاستو ڕێکەکان لەسەر ئەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو هیچ

---

[1] الانبیاء (٣١).

پەروەردەیەکیش نیە غەیری ئەو، پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ﴾ واتە: لە زەمین وەدیمان هێناون، جارێکی تر دەتانخەینەوە ناوی، وە دیسان دەرتاندەهێنینەوە لێی، واتە: سەرەتای بونتان لە زەمینەوە بووە، باوکتان ئادەم لەگڵی ئەم زەمینە دروست کراوە، لە خۆڵو پێکهاتەکانی خۆڵ وە هەر بۆ ناوی زەمینیش دەگەڕێنەوە کاتێك کە مردنو ڕزانو پووکانەوە، جارێکی تریش دەرتان دەهێنینەوە لەو زەمینە، وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی کە بانگتان دەکەن (لە گۆڕەکانتانەوە) جا ئێوەش دەست بەجی دێن بە دەم بانگکردنەکەوە بە سوپاسو سەناکردنەوەو وا دەزانن نەماوەتەوە (لە دنیادا) ماوەیەکی کەم نەبێت. واتە: ڕۆژێك کە بانگتان دەکات، ئێوەش بە سوپاسەوە وەڵامی دەدەنەوە، وا دەزانن کەمێك نەبێت لە دنیادا نەماونەتەوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ﴾[2] واتە: (خوا) فەرمووی: لە زەویدا دەژینو لەویشدا دەمرنو هەر لەویش دەردەهێنرێن (و زیندوو دەکرێتەوە). وە لەم فەرموودەیەی کە لە سونەنەکاندا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئامادەی جەنازەیەك بوو دەیاننناشت، کاتێك کە مردووەکەیان دەناشت مشتێك خۆڵی هەڵگرتو فڕێیدایە ناو گۆڕەکەوەو فەرمووی لەم خۆڵە دروستمان کردوون، پاشان مشتێکی تری هەڵگرت (تێی فڕیدا)و فەرمووی: دەشتانگێڕینەوە بۆ ئەوی، دیسان مشتێکی تری هەڵگرتو (تێی فڕێدا) فەرمووی: لەم زەمینەش جارێکی تر دەرتاندەهێنینەوە.

## هەموو نیشانەکان پیشانی فیرعەون درا بەڵام بڕوای پێ نەکرد

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ﴾ واتە: ئێمە هەموو نیشانەکانمان نیشاندا، ئەو هەر بڕوای پێ نەکردو گوێی پێ نەدا، واتە: هەموو نیشانەکان خرانە بەرچاوی فیرعەونو بە چاوی خۆی بینیو بڕوای پێ نەکردو گوێی پێ نەدا، ئەوەندە خوانەناسو لاسارو ستەمکارو سەرکەش بوو، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمًا وَعُلُوًّا﴾[3] واتە: ئەو موعجیزانەیان دان پێدا نەدەنا هەرچەندەلە دڵی خۆیاندا ئەو (موعجیزانە)یان بە ڕاست دەزانی لەبەر ستەمکاریو خۆبەزلزانین(یان).

---

[1] الاسراء (٥٢).

[2] الاعراف (٢٥).

[3] النمل (١٤).

﴿ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ ﴾

**فیرعەون دەیوت نیشانەكانی موسا جادووە، پاشان ڕێككەوتن لەسەر ڕووبەڕووبوونەوە**

خوای گەورە باسی فیرعەون دەكات كاتێك كە موسا نیشانە گەورەكەی نیشاندا، ئەوەیش هاوێژتنی گاچۆنەكەی بوو كە ئەبوو بە مارێكی زۆر گەورەو دەستیشی لە بن باڵی دەردەهێنا، بە ڕۆشن دەرئەكەوت بی ئەوەی هیچ نەخۆشیەكی پێوەبێت، فیرعەون وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴾ واتە: وتی: ئەی موسا ئایا هاتوویتە لامان، تا بە جادوەكەت لەسەر زەمینی خۆمان دەرمانكەی؟ واتە: ئەم جادووەی كە تۆ هێناوتە دەتەوێت بە هۆی ئەو جادووەتەوە دەسەڵات بگری بەسەر خەڵكیداو شوێنكەوتەت زیاد ببن و زاڵ ببن بەسەر ئێمەدا، ئەوە بۆ تۆ سەرناگرێت، چونكە ئێمەیش ئەو جادووەمان هەیە كە تۆ دەیكەی، لە خۆت بایی مەبە بەوەی كە خەریكیتی ﴿ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴾ واتە: دەبێت ئێمەش جادوی وەك ئەمەت بۆ بێنین،جا تۆ خۆت كاتێك دیاری بكە لە شوێنێكی تەختداو هیچ كەسمان لێی دوانەكەوین، واتە: ڕۆژێك كە هەموومان لەوی كۆببینەوە، ئێمەیش‌و ئێوەیش، هەتا ئەوەی كە تۆ دەیكەی ئێمەش بەو جادووەی هەمانە بەرپەرچی بدەینەوە لە كات‌و شوێنێكی دیاریكراودا، ﴿ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ ﴾ واتە: موسا وتی: كاتەكەمان لە ڕۆژی ڕازانەوە بێت، ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژنیان بوو،( جەژنی نەورۆز )كە ڕۆژی پشودانیان بوو لە كاركردن، گشت كۆدەبوونەوە، بۆ ئەوەی خەڵكی هەموو دەسەڵات‌و توانای خودا بە چاوی خۆیان ببینن، كە مەیلی هەر شتێكی هەبوو دەیكات، موعجیزە دەدات بە پێغەمبەرانی‌و جادووی دژەكانیانی پی پوچەڵ دەكاتەوە، بۆیە وتی: ﴿وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى﴾ واتە: لە وەختی چێشتەنگاودا (پێش نیوەڕۆدا) كە خەڵكی كۆدەكرێتەوە، بۆ ئەوەی دیاترو ڕوونترو ئاشكراتر خەڵكەكە ڕووداوەكە بە چاوی خۆیان ببینن، ئەمەیش كارو بەرنامەی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لی بێت) كە هەموو شتێكیان دیارو ئاشكرایە، هیچ تەمومژو پاساودانێكی تێدا نییە، بۆیە نەیوتووە لە كاتی شەودا بەڵكو لە ڕۆژداو لە كاتی چێشتەنگاودا، ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئەو ڕۆژی ڕازانەوەیە ڕۆژی عاشورا بووە.[1] سودی‌و قەتادە ئیبنو زەید گوتیان ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژنیان بووە، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: ئەو ڕۆژە ڕۆژی بازاڕ

[1] الدر المنثور (٤/٥٤٠).

کەرییان بووە، هیچ دژایەتیەك لە نێوان قسەکانیاندا نییە، منیش ئەڵێم لە ڕۆژێکی لەوشێوەیەشدابوو کەخوا فیرعەون وسەربازەکانی تێدا لەناوبرد، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە.[1] عەبدوڕەزاقی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ﴿مَكَانًا سُوًى﴾ واتە: شوێنێکی تەختو ڕێك بێت ئەو خەڵکەو ئەو شتانە کە تێیدا ڕوودەدات بەجوانی ببینن و هیچ شتێك نەبێتە ڕێگری خەڵکەکە لێی[2].

﴿ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾ ﴾

## کۆبوونەوەی هەردوو لایەنەکەو بانگکردنی موساو جادوگەرەکان

خوای گەورە باسی فیرعەون دەکات، کاتێك کە ئەوو موسا (سەلامی خوای لی بێت) ڕێککەوتن لەسەر کاتو شوێنێکی دیاریکراو، فیرعەون هەڵسا بە کۆکردنەوەی ئەو جادوگەرانەی کە لە شارو ولاتەکەیدا هەبوو، هەر کەسێك کمێك شارەزایی بووبێت لە جادووگەری لەو وەختەدا بانگکراوە، چونکە جادوگەری زۆر باوبووە لەناویاندا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ﴾[3] واتە: فیرعەون وتی: هەموو جادوگەرە شارەزاکانم بۆ کۆبکەنەوە، پاشان خەڵکی هاتنو هەموو کۆبوونەوە لەو ڕۆژە دیاریکراوەدا کە ئەو ڕۆژە ڕۆژی ڕازانەوە بوو، فیرعەون لەسەر تەختی پاشایی خۆی دانیشتو هەموو پیاو ماقوڵو ناودارانی ولاتەکەی لە دەوری ڕیزیان بەست، خەڵکەکەی تریش لە لای ڕاستو چەپی ڕاوەستان، موسا هات هارونی برایشی لەگەڵدا بوو (سەلامی خوایان لی بێت) خۆی دابوو بەسەر گاچۆنەکەیدا (عەساکەیدا)، جادوگەرەکانیش لەبەردەم فیرعەوندا بە ڕیز ڕاوەستابوون، فیرعەون هەڵی دەنانو دڵی خۆش دەکردنو بۆ ئەوەی لەو ڕۆژەدا کارەکەیان زۆر بە چاکی بە ڕێوەبەرن، جادوگەرەکانیش بە هیوای پاداشتێکی زۆر چاك بوونو فیرعەونیش بەڵێنی پی دەدان کە زۆر چاك پاداشتیان دەداتەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾[4] واتە:

---

[1] فتح الباري (٨/٢٨٨).

[2] الطبري (١٨/٣٢٣).

[3] یونس (٧٩).

[4] الاعراف (١١٣ـ١١٤).

بێگومان ئێمە پاداشتو خەڵاتی گەورەمان دەبێت ئەگەر ئێمە سەرکەوتین (بەسەر موسادا)، (فیرعەون) وتی: بەڵی پاداشتی گەورەتان دەبێت: و بێگومان ئێوە لە نزیکانی (خۆشم) دەبن. لێرەیشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ﴾ واتە: فیرعەون کۆمەڵەکەی بەجی هێشتو هەموو خێڵی خۆی کۆکردەوەو پاشان گەڕایەوە بۆ ناو خەڵکەکە، موسایش (سەلامی خوای لی بێت) پێی وتن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ واتە: موسا بە فێڵبازانی وت: واوەیلا بۆ ئێوە نەچن درۆ بە دەم خواوە هەڵبەستن، بە جادووتان خەڵکی وا لی بکەن وابزانن ئێوە شتی ڕاستیان نیشان دەدەن کەچی وایش نیەو هەموو فرۆفێڵەو بە دەمی خوداوە هەڵیدەبەسن ﴿فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ﴾ واتە: بە سزایەك لەناوتان دەباتو قڕتان تی دەخات هیچتان نەمێنێت، ﴿وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ﴾ واتە: هەر کەسێك بوختان بۆ خوا هەڵبەستی ڕەنجەڕۆیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ﴾ لێیان بووە ناکۆکیو دەستیان دایە چفەچفو سرتەسرت، یانی مقۆمقۆیان تێکەوت، یەکێك دەیوت: ئەمەی موسا دەیڵێت قسەی جادوگەر نیە، بەڵکو ئەمە قسەی پێغەمبەرە، یەکێکی ترئەیووت :ناموسا جادووگەرە ئەوی تر شتێکی تری دەوت،وەشتی تریش لەمانای ئەم ئایەتەدا هەر وتراوە. والله أعلم. ﴿وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ﴾ بە چفە لە نێوان خۆیاندا قسەیان دەکرد، ﴿قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا﴾ واتە: وتیان: ئەمانە دوو جادوگەرن دەیانەوێت بە جادوویان لەسەر زەمینی خۆتان دەرتان بکەن،هەندێ ئەیخوێننەوە(انّ هذان لساحران)کە ئەم خوێندنەوەیە لەسەر زمانی هەندی لە عەرەبەکاندا هاتووەو خوێندنەوەیەکی ڕاستەو بەوپێیەش ئیعراب دەکرێت، هەندێکی تریان بەم شێوەیە (انّ هذین لساحران) خوێندوویانەتەوە، کە زمانێکی بەناوبانگو مەشهورە، زانایانی زمانی عەرەبی لەسەر خوێندنەوەی یەکەم وەڵامو قسەی زۆریان هەیە کە ئێرە جێی ئەوە نیە باسی لی بکرێت، مەبەستەکە ئەوەیە جادوگەرەکان دەیانوت: زۆر چاك دەزانن کە موساو هارون جادوگەرێکی زۆر شارەزان جادوو چاك دەزانن، دەیانەوێت ئەمڕۆ سەرکەونو بەسەر ئێوەو گەلەکەتانداو بە تەواوی زاڵ بن بەسەر خەڵکیدا، هەموو شوێنیان کەونو بچن بە گژ فیرعەونو سوپاکەیداو سەرکەون بەسەریداو ئێوەش لە زێدی خۆتان وەدەرنێن، ﴿وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾ واتە: نەریتو شتە چاکەکانی ئێوە داگیر بکەن (کە جادوکردنە) خۆیان ببنە خاوەن دەسەڵاتوماڵو سامان بەو هۆیەوە، وتیان: ئەگەر ئەم دووانە سەرکەوتن، ئەوسا لەناوتان دەبەنو لەم سەر زەمینە وەدەرتاندەنێن، بە

ئارەزووی خۆیان هەرچیان بوێت دەیکەن‌و فەرمانڕەوایی دەگرنە دەست‌و ئێوەی لی بێبەش دەبن. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید دەڵێت: ﴿بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ﴾ ئەوەی ئێوە لەسەرینی ﴿فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا﴾ واتە: فێڵی خۆتان کۆبکەنەوەو بیخەنەکار پاشان هەموو بەڕیز وەرن، هەمووتان بە یەك جار ئەوەی لە دەستتاندایە بیهاوێژن هەتا چاوەکانی پی سەرسام‌و ئەبلەق بکەن‌و زاڵ بن بەسەر موساو براکەیدا ﴿وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ﴾ واتە: ئەمڕۆ هەر کەسێك سەرکەوێت ڕزگار دەبێت، چ ئێمە بین یان ئەو، بە نیسبەت ئێمەوە ئەم پاشایە بەڵێنی پێداوین پاداشتی چاکمان بداتەوە، بەڵام ئەو واتە: موسا دەبێتە دەسەڵاتدارێکی مەزن ئەگەر سەرکەوتن بە دەست بێنێت.

﴿قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾﴾

**ڕووبوونەوەکەو سەرکەوتنی موسا (سەلامی خوای لی بێت)و باوەڕهێنانی جادووگەران**

خوای گەورە باسی جادوگەرەکان دەکات کاتێك کە لەگەڵ موسادا (سەلامی خوای لی بێت) ڕێککەوتن ڕووبەڕووی یەکتری ببنەوە ﴿قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ﴾ واتە: وتیان: ئەی موسا یان تۆ بهاوێژە یان ئێمە پێش تۆ دەهاوێژین، ﴿قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟﴾ واتە: موسا وتی: نەخێر ئێوە بهاوێژن، هەتا بزانین جادووەکانی ئێوە چۆنە، بۆ ئەوەی کارەکانیشیان بە چاکی بۆ خەڵکی دەرکەوێت‌و ڕوون ببێتەوە، ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ﴾ واتە: موسا وایزانی بەو جادووەی ئەوانە پەتەکان‌و عەساکانیان دێن‌و دەچن، وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت کاتێك کە ئەوان پەت‌و عەساکانیان فڕێدا: ﴿وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾[1] واتە: وتیان: سوێندبەگەورەیی فیرعەون هەر ئێمە دەیبەینەوە، لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾[2] واتە: چاوبەستیان لە خەڵك کردو ترسێکی گەورەیان خستە دڵیانەوەو جادوویەکی گەورەیان نواند. واتە: چاوی خەڵکەکەیان پی

[1] الشعراء (٤٤).

[2] الاعراف (١١٦).

خەڵەتاندو لێیان ترسانو جادووی زۆر سەرسوڕهێنەریان کرد، خەڵکێکی ئێجگار زۆر کە لە ژمارە نەدەهاتن کۆبووبوووەوە، هەر جادوگەرە پەتو عەساکەی خۆی فڕێدا هەتا شێوەکە وای لێهات پڕبوو لە مارو دەکەوتن بەسەر یەکدا، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ﴾ واتە: ئەوسا موسا لە دڵی خۆیدا کەمێك ترسا، ﴿ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ واتە: پێمان وت: هیچ ترسێکت نەبێت تۆ (بڵندتری)، چونکە موسا ترسی ئەوەی هەبوو خەڵکەکە سەری لی بشێوێت بخەڵەتێن لە پێش ئەوەی ئەو عەساکەی دەستی بهاوێژێت، ئا ئەو کاتەدا پڕ لە ترسو بیمەدا خوای گەورە فەرمانی دا بە موساو فەرمووی: ﴿وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓاْ﴾ واتە: ئەوەی لە دەستی ڕاستتدایە فرێی بدەهەرچی ئەمان کردوویانە قوتی دەداتو هەڵی دەلوشێت، عەساکەی موسا (سەلامی خوای لی بێت) بوو بە مارێکی زۆر گەورەو ترسناك، کە چوار لاقو سەرو ملو دانی هەبوو، بە پەلە شوێنی ئەو پەتو مارانە کەوتو هەموویانی قوتداو هەڵی لوشینو هیچی نەهێشتن، جادوگەرانو ئەو هەموو خەڵکە سەیری ئەو ڕووداوەیان دەکرد بە چاوی خۆیانو بە ئاشکرا لە ڕۆژی نیوەڕۆدا دەیانبینی، موعجیزەو نیشانەی گەورەیی خودا دەرکەوتو ڕاستی سەرکەوت، جادویش بە پڕوپوچ دەرچوو، بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّمَا صَنَعُواْ كَيْدُ سَٰحِرٍۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾ واتە: ئەوانە تەڵەکەی جادوگەرانە، جادوگەرانیش لە هەر شوێنێك بن سەرناکەون، کاتێك جادوگەران ئەوەیان بە چاوی خۆیان بینی، کە خۆیان زۆر چاك شارەزای هونەری جادوو بوون کە چۆن دەکرێت، چاك بۆیان دەرکەوتو گومانیان نەما کە ئەوەی موسا (سەلامی خوای لی بێت) پێی هەڵساوەو کردوویەتی، بە هیچ شێوەیەك لە جادوو فڕوفێڵ ناچێت، شتێکی زۆر ڕاستەو هیچ کەسێك توانای ئەوەی نیە شتی وا بکات مەگین ئەو کەسەی کە فەرمانی دا بە شتێكو فەرمووی: ببە ببێت، بۆیە لەو کاتەدا بە ڕوودا کەوتن و سوژدەیان برد بۆ خوای گەورەو ﴿قَالُوٓاْ﴾ وتیان: ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾[1] واتە: بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری جیهان کە پەروەردگاری موساو هارونە (سەلامی خوایان لی بێت)بۆیە ئیبنو عەبباسو عوبەیدەی کوڕی عومەیر دەڵێن: ئەوانە سەر لە بەیانی جادوگەر بوون سەر لە ئێوارە بوونە شەهیدو پیاوچاك.[2] وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿فَأُلْقِيَ

---

[1] الاعراف (١٢١_١٢٢).

[2] الطبري (١٨/٣٤٠/١٣/٣٦).

ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ﴾ واتە: جادوگەران سوژدەیان بردو وتیان: بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری موساو هارون.

### ژمارەی جادوگەران

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: جادوگەرەکان ژمارەیان حەفتا کەس بوو، سەر لە بەیانی جادوگەر بوون، سەر لە ئێوارە بوونە شەهید.[1] دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەوزاعیەوە دەڵێت: کاتێك جادوگەرەکان بە ڕووداکەوتن‌و سوژدەیان برد، بەهەشتیان بۆ بەرزکرایەوەوئەوانیش بۆیان ئەڕوانی.[2] وەدەڵێت: وە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا﴾ دەڵێت: شوێنی خۆیانیان بینی بەڕوونی، کاتێك کە لە سوژدەدا بوون، عیکریمەو قاسمی کوڕی ئەبی بەزەیش هەر وایان وتووە[3].

﴿قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾﴾

### هەڵگەڕانەوەی فیرعەون لە جادوگەران‌و هەڕەشەلیکردنیان‌و وەڵامدانەوەی ئەوانیش بەرامبەر فیرعەون

خوای گەورە باسی بێ دینی‌و لاساری‌و لە خۆباییبوون‌و سەرکەشی فیرعەون دەکات لە بەرامبەر ئەو ڕاستیەداکە خواناردی بەو بیروڕا پڕوپوچەی کە خۆی هەیبوو، کاتێك کە ئەو موعجیزەو نیشانە گەورەیەی بە چاوی خۆی بینی، ئەوانیشی بینی کە بە هیوای سەرکەوتن‌و یارمەتیان بوو، هەموو بڕوایان هێنا لەبەر چاوی ئەو هەمووە خەڵکە، کە بە تەواوی تێکشکاو سەرشۆڕ بوو، دەستی دایە خۆهەڵبڕین‌و بوختانکردن‌و پەنای برد بۆ دەسەڵات‌و هێزبەکارهێنان‌و هەڕەشەی لە جادوگەرەکان دەکردو دەیترساندن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ﴾ واتە: وتی: پێش ئەوەی من ڕێگاتان پێبدەم بڕواتان پێ هێنابوو، ئێوە بوونە هۆی ئەم ئەزموون‌و تێکشکانەی من لەو کارەساتەدا، هەندێ قسەی کرد خۆیشی‌و جادوگەرەکانیش‌و ئەو خەڵکەیش هەموو دەیانزانی کە

[1] ابن أبي حاتم (٧/٢٤٢٨).
[2] ابن أبي حاتم (٧/٢٤٢٨).
[3] الطبري (١٨/٣٣٤).

درۆو بوختان دەکاتو دەیوت: ﴿إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ﴾ واتە: دیارە موسا گەورەتانەو فێری جادووی کردوون، ڕێکەوتوون لەگەڵی کە دژایەتی منو ژێردەستەکانم بکەنو یارمەتیو پشتگیری ئەو بکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: ئێوەی فێڵباز لەم شارەدا ویستووتانە فێڵێك بکەن هەتا ئەو خەڵکەی لی دەرکەن، بەو زووانە دەزانن (چیتان بەسەر دێنم). پاشان دەستی دایە هەڕەشەکردنو وتی: ﴿فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ﴾ واتە: ڕاستو چەپ (پێچەوانە) دەستو پێکانتان دەبڕمو بە کۆتەرەی دارخورمادا هەڵتاندەواسمو ئابڕووتان دەبەم، ئیبنو عەبباس دەڵێت: فیرعەون یەکەم کەس بووە هەڵساوە بەو کارە، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە.[2]

﴿وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ﴾ واتە: ئەوسا تێدەگەن کی سزای توندو تیژترە، واتە: ئێوە دەڵێن: منو هۆزەکەم گومڕاینو ئێوەو موساو هۆزەکەی لەسەر ڕێی ڕاستن، بەو زووانە دەزانن کی سزا دەدرێتو بەردەوام تێیدا دەمێنێتەوە، کاتێك فیرعەون بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ کردنو هەڕەشەی لی کردن، زۆر بە لایانەوە ئاسایی بوو گیانی خۆیان بدەن لە ڕێی خوای گەورەدا، ﴿قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا﴾ لە پاش ئەو نیشانانەی کە بۆمان هات، سوێند بەو کەسەی کە ئێمەی دروستکردووە هەرگیز بۆ تۆ لەو دەست هەڵگر نابین، کە ڕێی ڕاستو ڕەوانی نیشان داوین، ﴿وَٱلَّذِى فَطَرَنَا﴾ هەڵدەگرێت سوێند بێت، هەڵیش دەگرێت مەعتوف بێت بۆ ﴿ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾، واتە: ئێمە هەرگیز بۆ تۆ دەستهەڵگر نابین لەو خودایەی دروستکەرمان بووەو لە نەبوون ئێمەی وەدیهێناوە لە خۆڵ، هەر ئەو شایستەی پەرستنو مل بۆ کەچکردنە، نەك تۆ، ﴿فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ﴾ چیت لە دەست دێت درێغی مەکەو بیکە، ﴿إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ﴾ واتە: تۆ هەر لەم ژیانی دنیایەدا دەستت دەڕوات، ئەم دنیایەش دەڕواتو نامێنێت، ئێمە دواڕۆژمان هەڵبژاردووە کە شوێنی مانەوەیە، ﴿إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا﴾ واتە: ئێمە بڕوامان بە پەروەردگارمان هێناوە بۆ ئەوەی لە هەڵەکانمان خۆش ببێت، ﴿وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ﴾ واتە:لەوەشمان خۆش ببێت کە تۆ بەسەرت هێناین، لەو جادووانەی کە بەزۆربە ئێمەتەنجام ئەدا تا دژایەتی نیشانەکانی خوداو موعجیزەی پێغەمبەرەکەی پێ بکەین. ئیبنو ئەبی

---

[1] الاعراف (١٢٣).

[2] الطبري (١٣/٣٤).

حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ﴾ واتە: وتی: فیرعەون چل لاوی برد لە نەوەی ئیسرائیل فەرمانی دا کە فێری جادوو بکرێن لە فەرەما پێی، وتن: جادویەکی وایان فێر بکەن هیچ کەسێك لەسەر زەمیندا نەیزانێت. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئەوانە ئەو کەسانە بوون کە بڕوایان هێنا بە موسا (سەلامی خوای لی بێت)، ئەو کەسانەش بوون وتیان: ﴿ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ﴾،[1] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەروای وتووە.[2] ﴿وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾ واتە: خودا چاکترەو هەر دەمێنێت، پاداشتی نەبڕاوەترەو بەردەوامە لە تۆ لەوەی کە بەڵێنت پێداینو منەتت دەکرد بەسەرماندا لەسەری، وادەردەکەوێت فیرعەون لەعنەتی خوای لی بێت قسەکەی خۆی بردبێتە سەر ئەوکەسانەی شەهید کردبێت خودایش بەوهۆیەوە سۆزو بەزەیی خۆی ڕژاند بەسەر ئەو خاوەن باوەڕانەدا، لەبەر ئەمەیە ئیبنو عەبباسو کەسانی تریش لە پێشینان وتوویانە: سەرلەبەیانی جادوگەر بوونو سەرلەئێوارە بوونە شەهید.

﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾﴾

### ئامۆژگاری جادوگەرەکان لەبەردەم فیرعەوندا

لە ئایەتەکانەوە وادەردەکەوێت کە ئەمە دوا ئامۆژگاریە کە جادوگەرەکان پێی هەڵدەستن بەرامبەر فیرعەونو دەیترسێنن لە تۆڵەو سزای خودا کە هەرگیز تەواو نابێتو نابڕێتەوە، وە بە هیوای پاداشتی بەردەوامو هەمیشەی خودان ئەڵێن: ﴿إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا﴾ واتە: هەر کەسێك بە تاوانباری بڕواتە لای پەروەردگاری لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾ واتە: دیارە شوێنی جەهەنەمە نەمرو نەژی تیایدادەبێت، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ﴾[3] واتە: نە ڕێی مردنیان پی دەدەنو نە سزای جەهەنەمیان لەسەر سوك دەکرێت، هەر کەسانێك بە چاکەی خودا نەزانێت بەوشێوەیە سزا ی دەدەین، وە فەرموویەتی: ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾

---

[1] الدر المنثور (٥/٥٨٧).

[2] الطبري (١٨/٣٤١).

[3] الفاطر (٣٦).

﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾[1] واتە: ئەوەی زۆر خراپیش بێت خۆی لی دووردەخاتەوە، ئەو کەسەی دەچێتە ناو ئاگری گەورە، پاشان لەوێدا نە دەمرێتو نە زیندووشە، وە فەرموویەتی: ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ﴾[2] واتە: هاوار دەکەن ئەی مالك! (سەرپەرشتیاری دۆزەخ) با پەروەردگارت بمانمرێنێت (تا ڕزگار ببین) (ئەویش) دەڵێت بێگومان ئێوە دەمێننەوە. ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خەڵکی ناو ئاگر ئەوانەی کە ئەهلی ناوئاگرن ئەوانە نە دەمرن تێیداو نە زیندوویشن تێیدا بەڵام خەڵکێك هەن کە ئاگر دەیانسوتێنێت بە هۆی گوناهەکانیانەوە،خوای گەورەجۆرە مردنێك دەیانمرێنێت هەتا وەختێك کە دەبن بە خەڵوز، کاتێك ئیزنی شەفاعەت دەدرێت دەیانهێنن بە پارچەپارچەیی لەسەر ڕووباری بەهەشت دادەنرێن، دەوترێت بە خەڵکی بەهەشت ئاویان بەسەردابکەن،جا وەك دەنکی دانەوێڵە کە لافاو هەڵیان دەگرێت لە قنگۆڵەکاندا سەوز دەبنەوە)، یەکێك لەو پیاوانەی کە لەوی بوو وتی: ئەڵی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەلادێ و دەشتداژیاوە!![3]. هەر بەم شێوەیە موسلیمیش هێناویەتی لە کتێبە صەحیحەکەیدا.[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ﴾ واتە: هەر کەسیش خاوەنی باوەڕو ئاکار چاك بێتو بچێتە لای پەروەردگاری لە ڕۆژی قیامەتدا بە قسەو ئاکار سەلماندبێتی کە باوەڕدارە، ﴿فَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلَىٰ﴾ واتە: ئەوانە پلەی بەرزیان هەیە لە بەهەشتدا، ئەو بەهەشتەی کە پلەپلەی بەرزی تێدایەو پڕە لە کۆشكو شوێنی چاكو ئارامو بی ترس، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوبادەی کوڕی سامتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (بەهەشت سەد پلەیە، نێوانی هەموو دوو پلەیەك وەك نێوانی ئاسمانو زەمین وایە، فیردەوس بەرزترین پلەیانە، لەوێوە هەر چوار ڕووبارەکە دێنەدەر، تەختیش لەسەریەوەیە، وەختێك داواتان لە خودا کرد، داوای فیردەوسی لی بکەن).[5] تیرمزیش ڕیوایەتی کردووە.[6] لە هەردوو صەحیحەکەیشدا هاتووە: (بەڕاستی ئەهلی پلە بەرزەکانی بەهەشت سەرەوەی خۆیان دەبینن، وەك چۆن ئێوە ئەستێرە دوورەکان دەبینن لە کەناری ئاسماندا، بە پێی پلەو ڕێزیان لەناو خۆیاندا، وتیان:

---

[1] الأعلى (١١ـ١٣).

[2] الزخرف (٧٧).

[3] احمد (١١/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (١٧٣/١٧٢/١).

[5] احمد (٣١٦/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] تحفة الأحوزي (٢٣٨/٧) ، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو شوێنەبەرزانەی پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لی بێت)؟ فەرمووی: ئەری، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هی پیاوانێکن کە بروایان هێناوە بە خوداو پێغەمبەرانیشیان بە ڕاست زانیووە).[1] وە لە سونەنەکاندا هاتووە کە ئەبو بەکرو عومەریش لەوکەسانەن‌و لە خۆشیدان.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿جَنَّٰتُ عَدۡنٍ﴾ شوێنەکانیان باغاتێکە، ئەمە بەدەلە بۆ ﴿ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ۝٧٥ جَنَّٰتُ عَدۡنٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ واتە: ڕووبار بە بەردەمیاندا دەڕوات‌و تاهەتایە تێیدا دەمێننەوە، ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ﴾ واتە: ئەوەیە پاداشتی خەڵکی پاك، واتە: گیانی خۆی پاککردووەتەوە شوێنی پێغەمبەران کەووە، لەو پەیامەی کە هێناویانە بۆیان کە پڕە لە خێروبێر.

﴿وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ۝٧٧ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ۝٧٨ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ۝٧٩﴾

**دەرچوونی نەوەی ئیسرائیل لە میسر**

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات، کاتێك فیرعەون ڕازی نەبوو بەوەی ئیسرائیل لەگەڵ موسا (سەلامی خوای لی بێت) بنێرێت، فەرمانی دا بە موسا کە لە شەودا بیانبات‌و لە دەستی فیرعەون ڕزگیاریان بکات، خوای گەورە ئەم باسەی لە قورئاندا بە ڕوونی هێناوەلە جگە لەم سورەتە پیرۆزەشدا، کاتێك کە موسا (سەلامی خوای لی بێت) بە نەوەی ئیسرائیلەوە لە میسر دەرچوو، فیرعەون‌و دارودەستەکەی کە بەیانی هەڵسان هیچ کەسێك لە بەرەی ئیسرائیل لە میسردا نەمابوو، فیرعەون زۆر تووڕە بوو، ناردی بە شارەکانداو لەشکرێکی زۆری کۆکردەوە، لەناوچەو هەرێمەکانی خۆیدا، وەك لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي﴾ واتە: موسامان ئاگادارکرد کە لەگەڵ بەندەکانی من بە شەو بڕۆ، کاتێك کە فیرعەون بەمەی زانی، بە لەشکرێکی زۆرەوە شوێنیان کەوت، دەیوت: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرۡذِمَةٞ قَلِيلُونَ ۝٥٤ وَإِنَّهُمۡ لَنَا لَغَآئِظُونَ﴾[3] واتە: خۆ ئەوانە کۆمەڵێکی کەمن، کە بە ڕاستی ئێمەیان تووڕە کردووە، بۆیە لە بەرەبەیاندا کە خۆر گزنگی دا شوێنیان کەوت، ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ﴾ واتە: کاتێك کە هەردوو کۆمەڵ یەکتریان دی، ﴿قَالَ أَصۡحَٰبُ

---

[1] فتح الباري (٦/٣٦٨)، مسلم (٤/٢١٧٧).

[2] أبو داود (٤/٢٨٧)، تحفة الأحوذي (١٠/١٤١)، ابن ماجه (١/٣٧)، سەنەدەکەی لاوازە لەبەر بوونی عەتیەی عەوفی.

[3] الشعراء (٥٤_٥٥).

مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ﴾[1] واته: هاوەڵەکانی موسا وتیان: چاك تووش بوین، ﴿قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ﴾[2] واته: موسا وتی: نابێت ترستان هەبێت، چونکە پەروەردگارم لەگەڵەو پەروەردگارم دەروویەکم لی دەکاتەوە، موسا لەگەڵ نەوەی ئیسرائیلدا گەیشتنە سەر دەریاکەو، دەریاکە لەبەردەمیاندا بوو، فیرعەونیش بە دوایانەوە بوو، ئا لەو کاتەدا خوای گەورە موسای ئاگادارکردو فەرمووی: ﴿فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ﴾ واته: ڕێگایەکی وشکیان بۆ بکرەبەرو نیگەران مەبە لەو کارەی فیرعەونو ترسیشت نەبێت لە دەریاکە کە هۆزەکەت بخنکێنێت، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ ﴾ واته: فیرعەون بە خۆیو لەشکرەکەیەوە شوێنیان کەوت شەپۆلی دەریا دای بەسەریانداو دایپۆشین چ داپۆشینێك یانی، ئەو ڕووداوەی کە دیارو بەناوبانگە، (غشیهم ماغشیهم )لە کاتی شتێکی گەورەو بەناوبانگدا دەوترێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ۝٥٣ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ﴾[3] واته: شاری هۆزی لوتیش سەرەوژێرکرد، هەرچی دەبوو بەرخۆبدرێت دایپۆشی چ داپۆشینێك. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ﴾ واته: فیرعەون ڕێی لە گەلەکەی هەڵەکردو شارەزای نەکردن، وەك لە پێشەوە باسکرا فیرعەون بەرەو ناو دەریا هۆزەکەی بردو ڕێی ڕاستی نیشان نەدان، هەر بەو شێوەیەش لە ڕۆژی قیامەتدا پێشیان دەکەوێتو بەرەو ناو ئاگر دەیانبات ئای چ شوێنێکی خراپە ئەو شوێنەی بۆی دەچن.

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ ۝٨٠ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ ۝٨١ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ۝٨٢﴾

### وەبیرهێنانەوەی ئەو بەهرانەی کە خودا دای بە بەرەی ئیسرائیل

خوای گەورە باسی ئەو بەهرانەی خۆی دەکات کە بەخشی بە بەرەی ئیسرائیل، کە چەندە گەورەو پڕ خێروبێرە بۆیان، لە دەستی دوژمنەکەیان کە فیرعەون بوو ڕزگاری کردن، چاوی ڕون کردنەوەو بە چاوی خۆیان بینیان کە چۆن فیرعەونو لەشکرەکەی نوقم بوون لە دەریاو خنکان لە بەرەبەیانێکداو

[1] الشعراء (٦١).

[2] الشعراء (٦٢).

[3] النجم (٥٣_٥٤).

تەنها یەك كەسیان لی دەرنەچوو، وەك خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ﴾[1] واتە: دارودەستەی فیرعەونمان خنكاند ئیّوە چاوتان لی بوو سەیرتان دەكرد، بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەلّیّت: كاتیّك كە پیّغەمبەری خودا (ﷺ) گەیشتە مەدینە، جولەكەكانی بینی لە عاشورادا بە ڕۆژو بوون، پرسیاری لیّكردن وتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە خودا موسای تیّدا زاڵكردو سەریخست بەسەر فیرعەوندا، پیّغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئیّمە لە ئیّوە نزیكترین بە موسا، ئیّوەش ئەو ڕۆژوە بگرن).[2] موسلیمیش لە صەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە.[3] وە لیّرەیشدا خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾ واتە:ئەی بەرەی ئیسرائیل لە ژیّر دەستی دوژمنتان ڕزگارمان كردن، بەلّیّنیشمان پیّدان كە لە لای ڕاستی كیّوی تور بیّنە لامان، گەزۆو مەلی شیلاقەشمان بۆ ناردنەخوار دوای خنكانو لەناوچوونی فیرعەون، خوای گەورە بەلّیّنی دا بە موساو نەوەی ئیسرائیل كە لە لای ڕاستی كیّوی تور بچنە لای، ئەو شویّنەی كە خودا قسەی تیاكردو موسا داوای لە خودا كرد كە ببینیّتو هەر لەویّدا تەوراتیشی پی بەخشی، وە هەر لەو كاتەدا بەرەی ئیسرائیل دەستیان دایە گویّرەكە پەرستی وەك خوای گەورە بەم نزیكانە باسی دەكات لەم سورەتەدا، گەزۆو ڕیشۆلّەیشی ﴿ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾بۆناردن، لە سورەتی (البقرة)و سورەتی تریشدا لە پیّشەوەئەمەباسكرا، گەزۆ شیرینیەك بوو لەئاسمانەوە بۆیان دەباری، ڕیشۆلّەش ﴿وَٱلسَّلۡوَىٰ﴾ مەلیّك بوو دەكەوتەخوارەوە بۆیان لە هەردووكیان بەپیّی پیّویستی خۆیان لیّیان هەلّدەگرت هەتا بەیانی، ئەمەیش سۆزو بەزەییو چاكەیەك بوو خودا لەگەلّی دەكردن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِي﴾ واتە: لەو ڕۆزیە پاكانەی كە پیّمان دان بخۆن، نەچن بە پیّچەوانەی فەرمانەكانی منەوە بجولّیّنەوە ئیتر شایستەی تووڕەیی من ببن، ﴿وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ﴾ واتە: هەر كەسیّك شایستەی تووڕەیی من ببیّت هەلّدیّراوەو ڕەنجەڕۆبووە، عەلی كوڕی ئەبو تەلحە دەلّیّت لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خوای لی بیّت) ﴿فَقَدۡ هَوَىٰ﴾ واتە: ئەوە ئەو كەسە بەدبەخت بووە.[4] پاشان خوای گەورە

---

[1] البقرة (٥٠).

[2] فتح الباري (٨/٢٨٨).

[3] مسلم (١/٧٩٥).

[4] الطبري (١٨/٣٤٧).

دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾ واتە: هەر کەسێك پەشیمان‌و باوەڕدارو ئاکارچاك‌و شارەزای ڕاستەڕێ بێت من لێی خۆش دەبم، واتە: کەسێك هەر تاوانێکی کردبێت لە دوایدا تەوبە بکات خودا لێی دەبورێت، وەك چۆن خودا لە گوێرەکەپەرستەکان خۆش بوو لە بەرەی ئیسرائیل کە پەشیمان بوونەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَابَ﴾ واتە: گەڕایەوە لەو بێدینی‌و بتپەرستی‌و تاوانباریی‌و دووڕوویییەی کە تیایدا ژیاوە، ﴿وَءَامَنَ ﴾ بە دڵ بڕوای هێنا، ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾ ئاکاری چاکیشی کرد بە ئەندامەکانی لەشی، ﴿ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە: پاشان دوودڵ نەبوو[1] ،قەتادە دەڵێت: ﴿ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴾ یانی پابەند ببێت بە ئیسلامەوە هەتا دەمرێت، ﴿ثُمَّ﴾لێرەدا بۆڕێکخستنی خەبەرەلەسەرخەبەر، وەك خوای گەورە لەئایەتێکیتردا فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾[2] واتە: پاشان دەبێت لەوانەش بێت کە بوونەتە خاوەن باوەڕ.

﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾﴾

### ڕۆیشتنی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بەدەم بەڵێنی خوداوەو تووشبوونی بەرەی ئیسرائیل بە گوێرەکە پەرستی

کاتێك موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بەرەی ئیسرائیلی لەگەڵ خۆی برد دوای خنکان‌و لەناوچوونی فیرعەون ﴿فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾[3] واتە: پاشان تووشی هۆزێك هاتن، خەریکی پەرستنی چەند بتێکی خۆیان بوون، وتیان: ئەی موسا خودایەکی وەك خوداکانی ئەوانمان بۆ

---

[1] الطبري (١٨/٣٤٧).

[2] البلد (١٧).

[3] الأعراف (١٣٨ـ١٣٩).

پەیدابکەن، موسا وتی: ئێوە گەلێکی هیچ نەزانن، ئەو کارەی ئەوان دەیکەن بی بەهرەیەو هەرچیشیان کردووە بی سوودو پرپوچە، خوای گەورە بەڵێنی(٣٠ )سی شەوی دا بە موسا (سەلامی خوای لی بێت) پاشان دە شەوی تریشی بۆ خستەسەر، بو بە چل شەو، واتە: بە شەوو بە ڕۆژ بە ڕۆژو بێت تێیدا، ، موسا (سەلامی خوای لی بێت) بە پەلە بەرەو کێوی تور ڕۆیشت، هارونی برای لە جێی خۆی دانا لەسەر بەرەی ئیسرائیل، بۆیە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ﴾ واتە: ئەی موسا ئەوە چیە وا لە هۆزەکەت بە پەلەتر بووی؟ وتی: ئەی پەروەردگارم من پەلەم بوو کە زوو بگەم بە تۆ، هەتا زیاتر لێم ڕازی ببی، وا ئەوانیش وان بە دوامەوە لە نزیکی کێوی تور جێگیر دەبن، ﴿قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ﴾ واتە: خوای گەورە فەرمووی پاش تۆ ئێمە هۆزەکەتمان تاقیکردەوە، سامیری سەری لی شێواندن‌و ڕێی لی دەرکردن، خوای گەورە موسای ئاگادارکرد کە هۆزەکەی چیان کردووە لە پاش خۆی‌و دەستیان داوەتە پەرستنی ئەو گوێرەکەیەی کە سامیری بۆی دروست کردن، پاشان خوای گەورە لەو ماوەیەدا لەسەر (پارچە تەختە یان پارچە بەردی تەنك) لەوحەکانی تەوراتی بۆ نووسی وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾[1] واتە: لە بارەی هەموو شتێکەوە بۆمان نووسی‌و ئامۆژگاریمان کردن‌و هەموو شتێکمان بەبی کەموکوڕی خستە سەر لەوحەکەو بە توندی بیانگرەو فەرمانیش بە هۆزەکەت بدە با چاکترینیان وەرگرن، من بەو زووانە پێیان نیشان دەدەم شوێنی ئەوانەی سەرپێچی دەکەن بەرەو کوێیە، پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا﴾ واتە: جا موسا بە تورەیی‌و داخ لە دڵی هاتەوە بۆ ناو هۆزەکەی،یانی: دوای ئەوەی کە خوای گەورە موسای ئاگادارکرد لە کرداری هۆزەکەی کە چەندە توورەیە لێیان، لەکاتێکدا کە ئەوەندە گرنگی داوە بە خۆیان‌و کارەکانیان، تەوراتیشی پێداون کە بەرنامەو شەریعەتی تێدایەو ڕێزلێنانیشە بۆیان، کەچی ئەوان غەیری خودایان پەرستووە، کە هەموو کەسێکی ژیرو هۆشمەند دەزانێت کەئەمانە شوێنی پڕوپوچ کەوتوون‌و زۆر کەم ئاوەزو دەبەنگن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: موسا گەڕایەوە بۆ ناویان زۆر توورەو دڵتەنگ بوو لەو

[1] الاعراف (١٤٥).

کارەیان، موجاهید دەڵێت: ﴿غَضْبَٰنَ أَسِفًا﴾ زۆر دڵگران بوو.[1] قەتادەو سودی دەڵێن: تورەو دڵگران بوو لەسەر ئەو کارەی هۆزەکەی پێی هەڵسابوون دوای خۆی.[2] ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا﴾ موسا وتی: کەسەکانم !باشە پەروەدگاری ئێوە بەڵێنی باشی پێنەدان؟ لەسەر زمانی من کە خێرو بێری دنیاو قیامەت برێژێت بەسەرتانداو پاشەڕۆژتان بەخێر بگێرێت، وەك چۆن بە چاوی خۆتان بینیتان سەری خستن بەسەر دوژمنەکانتانداو زاڵی کردن بەسەریدا، چەندین شتی تریش کە خودا بۆی کردن، ﴿أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ﴾ یان لەژورەوە چاوەڕوانی ئە بەڵێنانەدەکەن کە خودا دابووی پێتان وئەو بەهرەو بەڵێنانەی لە پێشەوە پێی دان لەبیرتان چوو، ﴿أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى﴾ یان هەر ویستووتانە بەر تووڕەیی پەروەردگارتان بکەون وا پەیمانی منتان شکاند؟ ﴿أَمْ﴾ لێرەدا بە مانای (بل) هاتووە بۆ گواستنەوەو لادان لە ڕستەی یەکەمەوە بۆ ڕستەی دووهەم، وەك بڵێیت: هەر ویستووتانە بەو کارەتان بەر تووڕەیی پەروەردگارتان بکەون، ئەوانیش لە وەڵامی ئەو تورەبوون‌و سەر زەنشتەی موسادا (سەلامی خوای لی بێت) وتیان: ﴿مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا﴾ واتە: بە ئارەزووی خۆمان بەڵێنەکەی تۆمان نەشکاند، ﴿وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ﴾ واتە: چەندجار خشڵی گەلەکەیان دابوو بە کۆڵماندا، ناچار فرێمان دایە ناو بۆتەوە هەر بەو شێوەیەش سامیری تێی فڕێدا، واتە: پاشان دەستیان دایە بڕوبیانووی بی سەروبەرو وتیان: ئەو خشڵ‌و زێڕەی قیبتیەکان لە لایان بوو وەك ئەمانەت دایان نا پێیان ناخۆش بوو هەڵیگرنبۆخۆیان! بۆیە خۆیان لی ڕزگارکرد، لە ڕیوایەتێکی سودیادا هاتووە لە ئەبو مالیکەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: بۆیە هارون ویستی ئەو خشڵە کۆبکاتەوە هەموو لەو چاڵەداو ببێتە یەك ماڵێکی قەدەغە، هەتا کاتێك موسا (سەلامی خوای لی بێت) گەڕایەوەو بە کەیفی خۆی چی لی دەکات بیکات، پاشان ئەو سامریە هات‌و ئەو مشتە(خۆڵەی) کە لە ژێر پێی ڕاسپاردەکە هەڵیگرتبووکردی بەسەرئەوچاڵەدا و داوای کرد لە هارون لە خوا بپاڕێتەوەخوائەم داوایەی لی قبوڵ بکات، هاورنیش دوعای بۆ کرد نەیدەزانی مەبەستی سامری چییەئەوە بوو دوعاکەی قبوڵ کرا، ئا لەو کاتەدا سامیری وتی: داوام وایە لە خوا ببێتە گوێرەکەیەك، بووە گوێرەکەیەك دەنگی لێوەدەهات‌و دەیبۆڕاند، بوویە تاقیکردنەوەو بەڵاو ئیستیدراج وهەڵێکی تر بۆیان، بۆیە خوای گەورە

---

[1] الطبري (١٨/٣٥٠).

[2] الطبري (١٨/٣٥٠).

دەفەرمووێت: ﴿فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ۝٨٧ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ﴾.[1] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوەئایەتی ﴿فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ﴾یانی: وتیان: ئەمە خوای ئێوەو خودای موسایشە، زۆر خۆشیان دەویستو دەیانپەرست بە شێوەیەك هیچ شتێکیان هەرگیز بەو شێوەیە لە لا خۆشەویست تر نەبوو، خوای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿فَنَسِىَ﴾ واتە: ئەو ئاینو ئیسلامەی کە لە سەری بوو سامیری وازی لی هێنا.[2] خودایش وەڵامی دانەوەو ئابڕووی بردنو تێر سەرزەنشتی کردن، کە چەندە بی عەقلّ بوون لەو کارەیاندا وەك دەفەرمووێت: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ واتە: ئاخۆ ئەمانە نابینن، (ئەوگویرەکەیە)نە وەڵامێکیان دەداتەوەو نە زیانێکی بۆیان هەیەو نە قازانجێك؟یانی: ئەم گوێرەکەیە کە پرسیاری لی دەکەن یان قسەی لەگەڵ دەکەن هیچ وەڵامێکیان ناداتەوە ﴿وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ نە لە دنیاو نە لە دواڕۆژدا سوود یان زیانیان پی ناگەیەنێت، ئیبنو عەبباس دەڵێت: نەخێر سوێند بە خوا قۆڕەکەی بێجگە لە هەوایەك کە لە دوایەوە دەچووە ژوورەوەو لە دەمیەوە دەردەچوو دەنگێکی لێوە دەبیسرا هیچێکی تر نەبوو.[3] لە پێشەوە لە فەرموودەکەی (فتون)دا باس کراوە لە حەسەنی بەسریەوە کە ئەو گوێرەکەیە ناوی بوهموت بووە.[4] ئەم بی عەقڵانە هەموو بڕوبیانوویەکیان هەر ئەوەبوو کە ئەو خشڵەی قیبتیەکان لە لایان دانا بوون، بووبووە کۆڵ بەسەریانەوەو حەزیان لی نەبوو لە لایان بێت، فڕێیانداو لە خۆیان دوورخستەوەکەچی دەستیان دایەگوێرەکەپەرستی! یانی: لەشتێکی بی نرخو کەم بایەخ خۆیان وەدوورگرت کەچی خۆیان خستەناوگوناهێکی زۆر گەورە!! وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لی بێت) کە پیاوێکی خەڵکی عێراق پرسیاری لێکرد لە خوێنی مێشوولە کە لە جلوبەرگ بکەوێت، (واتە: ئایا نوێژی پێوە بکات یان نەیکات؟) عەبدوڵای کوڕی عومەریش (ڕەزای خوای لی بێت) وتی: سەیری خەڵکی عێراق بکەن، کچەزای پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەکوژن (واتە: حوسەین (ڕەزای خوای لی بێت) )کەچی پرسیار لە خوێنی مێشوولە دەکەن![5]

---

[1] تأريخ الطبري (٤٢٢/١).

[2] تأريخ الطبري (٤٢٤/١/٤٢٥).

[3] النسائي في الكبرى (٣٩٦/٦).

[4] النسائي في الكبرى (٣٩٦/٦).

[5] فتح الباري (٤٤٠/١٠).

﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَـٰرُونُ مِن قَبْلُ يَـٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَـٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَـٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ ﴾

**هارون داوای لێکردن ئەو گوێرەکەیە نەپەرستن، بەڵام بەرەی ئیسرائیل هەر کۆڵیان نەدا لە پەرستنی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَـٰرُونُ مِن قَبْلُ يَـٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦ ۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَـٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴾ واتە: هارون لە پێشدا پێی وتن: کەسەکانم !ئێوە بەو گوێرەکەیە هەڵخەڵەتاون، پەروەرێنتان هەر خودای ڕەحمانە، سا وەرن شوێنی من بکەون‌و فەرمانی من بەجێ بێنن، خوای گەورە لێرەدا باسی هارون دەکات کە چەندی هەوڵی دا کە واز لەو گوێرەکە پەرستیە بێنن‌و ئاگاداری کردن کە ئەوە تاقیکردنەوەیەکە بۆیان، خوای ڕەحمان ئەو خودایە کە وەدیهێنەری هەموو شتێک‌و گشت شتێکێ بە ئەندازە دروستکردووە، خاوەنی عەرشی پیرۆزەو هەرچی مەیلی لی بێت دەیکات‌و﴿فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴾واتە:ئەوەی فەرمانتان پێدەکەم بەجێی بێنن‌و ئەوەیش لێتان قەدەغە دەکەم مەیکەن، ﴿قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَـٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ﴾ واتە: وتیان: وازی لی ناهێنین‌و دەیپەرستین هەتا موسا دەگەڕێتەوە لامان‌و گوێبیستی دەبین، بزانین چی ئەڵی لە بارەیەوە، دژایەتی هارونیان کردو هەڕەشەیان لێکرد، خەریك بوو بیکوژن.

﴿ قَالَ يَـٰهَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓ ۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ ﴾

**وتووێژی نێوان موساو هارون (سەلامی خوایان لی بێت) دوای ئەوەی کە موسا گەڕایەوە**

خوای گەورە باسی موسا دەکات (سەلامی خوای لی بێت) کاتێك کە گەڕایەوە بۆ لای هۆزەکەی وئەو کارەساتە گەورەیەی بینی، زۆر تووڕە بوو، ئەو لەوحانەی بە دەستیەوە بوو فڕێی دان‌و قژی براکەی بەرەو خۆی ڕاکێشا، وەك لە سورەتی (الاعراف)دا لە پێشەوە بە چاکی باسی لێکرا، ئەو فەرموودەیەشمان لەوی هێناو باسمان کرد کە کەفەرمووێت: (ليس الخبر كالمعاينة).[1] واتە: هەواڵ گێڕانەوە وەك بینینی نیە، پاشان موسا دەستی کرد بە سەرزەنشتی هارونی برای‌و ﴿قَالَ يَـٰهَـٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِ ۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴾ واتە: موسا وتی: هارون کاتێك ئەوانەت بینی کە لە ڕێ لایانداوە، چی نەیهێشت تۆ شوێنی من بکەوی؟ ئایا تۆیش سەرپێچی فەرمانی منت کرد؟

[1] احمد (٢٧١/١).

بۆچی لە سەرەتاوە کە ئەو ڕووداوە ڕوویدا هەواڵت پی نەدام، پێم نەوتی: تۆ لەناو هۆزەکەمدا بەو لە جێی من بەو هەموو کارێکی چاك لە بیر مەکەو بە دوای خراپەکاراندا مەچۆ، وەك خوای گەورە دەفەرموویێت لەسەر زمانی موسا (سەلامی خوای لی بێت): ﴿ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾[1] واتە: تۆ لەناو گەلەکەمدا جێنشینم بەو کاری چاك بکەو شوێنی ڕێبازی خراپەکاران مەکەوە. هارون وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ يَبۡنَؤُمَّ﴾ وتی: ئەی کوڕی دایکم! بەناوهێنانی دایکی ویستی دڵی بۆ لای خۆی ڕاکێشێت، هەرچەندە برای دایكو باوکی بوون، چونکە ناوهێنانی دایك لێرەدا سەرەنجراکێشترو باشترو چاکتر سۆزو بەزەیی دەورووژێنێت، بۆیە وتی: ﴿يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي﴾ واتە: ئەی کوڕی دایکم ڕیش‌و قژم مەگرە، من لەوە ترسام کە بڵێ ی بۆ ناکۆکیت خستە نێوان منو بەرەی ئیسرائیل، لەسەر قسەی من ڕانەوەستای.یانی ئەمە بیانووی هارون بوو لە لای موسای برای کە دواکەوت نەگەیشت پێی هەواڵی بداتی بەو کارەساتە گەورەیەی کە ڕوویداوە، وتی: ﴿إِنِّي خَشِيتُ﴾ واتە: من ترسام بێم بە دواتداو ئەو هەواڵەت بدەمی، تۆ بڵێ ی: بۆچی بە تەنها بەرەی ئیسرائیلت بەجێهێشتووەو ناکۆکیت خستووەتە نێوانیان، ﴿وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي﴾ واتە: لەسەر قسەی من ڕانەوەستاوی کە لە جێی خۆم لەناو ئەواندا دامنایت، ئیبنو عەبباس دەڵێت: هارون زۆر بەرفەرمان‌و گوێڕایەڵی موسا بوو[2].

﴿قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرۡتُ بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾﴾

### سامیری چۆن گوێرەکەکەی تاشی‌و دروستی کرد

موسا (سەلامی خوای لی بێت) بە سامیری وت: چی وای لی کردی ئەو کارەت کردو چ شتێك پاڵی پێوە نای هەتا هەڵسی بەو کارە؟ وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ﴾ موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: سامیری پیاوێکی خەڵکی

---

[1] الأعراف (١٤٢).

[2] الطبري (٣٥٩/١٨).

باجەرما بوو، کە هۆزەکەی مانگایان دەپەرست، خۆشەویستی مانگاپەرستی زۆر چووبووە دڵیەوە، ئیسلامەتی خۆی ئاشکرا کردبوو لەگەڵ بەرەی ئیسرائیلدا، ناوی موسای کوڕی زەفەر بوو،[1] قەتادە دەڵێت: لە ڕیوایەتێکی ئیبنو عەبباسەوە هاتووە کە سامیری خەڵکی کرمانە. قەتادە دەڵێت: سامیری خەڵکی شاری سامەڕا بووە.[2] ﴿قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُواْ بِهِۦ﴾ شتێکم بینی کەئەوانەیتر نەیاندی، سامیری وتی:جوبرەئیلم بینی کاتی کە هات فیرعەون لەناو بەرێت، ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾ لە جی پێی ڕاسپاردەکەدا مشتێك خۆڵم هەڵگرت، یان لە ژێر پێی ئەسپەکەیدا مشتێك خۆڵم هەڵگرت ئەمە مەشهورترە لە لای زۆرێك لە زانایانی تەفسیر، بەڵکو لەلای زۆربەیان. موجاهید دەڵێت: ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ﴾ واتە: مشتێك لە خۆڵی هەڵگرت لە ژێر سمی ئەسپەکەی جوبرەئیلدا،[3] وە ئەڵێ: (القبضة) واتە: پڕی مشت، بە گرتنی پەنجەکان، موجاهید دەڵێت: سامیری ئەوەی لە دەستدابوو هاویشتیە ناو خشڵەکانی بەرەی ئیسرائیلو خشڵەکە تواوەو شێوەی گوێرەکەیەکی هەڵگرتو دەنگێکی لێوە دەهات، وەك بای تێدابێ، ئەوە قوڕەکەی بوو.[4] ئەڵێ: ﴿فَنَبَذْتُهَا ﴾ واتە: هاوێشتم لەگەڵ ئەو خشڵەی ئەوان دەیانهاوێشت، ﴿وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِي نَفْسِي﴾ واتە: بەو شێوەیە نەفسم ئەوەی لا شیرینو جوان کردم.

**سزادانی سامیریو سوتاندنی گوێرەکەکە**

خوای گەورە لەسەر زمانی موسا (سەلامی خوای لی بێت) دەفەرمووێت: ﴿ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ﴾ واتە: وتی: دەسا بڕۆ گوم بە، دەبێت هەتا ژینت ماوە، هەر بڵێ ی نزیکم مەکەونەوە، واتە: هەر چۆن ئەو خۆڵەت هەڵگرتو لە مشتت گرت کە نەدەبوو لە جی پێی ئەو ڕاسپاردەیە هەڵی گریو دەستت لێی بکەوێت، سزاکەت لە دنیادا ئەوەیە کە بڵێ ی توخنم نەکەون، واتە: بە هیچ شێوەیەك خەڵکی نزیکت نەکەوەنەوەو تۆیش لێیان نزیك نەبیتەوە، ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا ﴾ واتە: چارەنووسێکیشت هەیە، ﴿لَّن تُخْلَفَهُۥ﴾ هەر دێتە ڕێت لە ڕۆژی قیامەتدا، قەتادە دەڵێت: ﴿أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ﴾ سزایەك بوو بۆ بەرەی ئیسرائیلو ئەو ئیسرائیلیانەی ئەمڕۆیش کە لەوان ماونەتەوە

---

[1] تأريخ الطبري (١/٤٢٤).

[2] الطبري (١٨/٣٦٣).

[3] الطبري (١٨/٣٦٢).

[4] الطبري (١٨/٣٦٢).

ئەڵێن بە خەڵکی نزیکمان مەکەونەوە، خەڵکیش توخنیان ناکەن، ﴿وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ﴾ حەسەن‌و قەتادەو ئەبونەهیك دەڵێن: چارەنووسێکت هەیە ناتوانی لێی لادەی.[1] ﴿وَانظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ﴾ واتە: سەیری ئەو خودایەکە کە دەتپەرست، ﴿الَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا﴾ ئەوەی کە دەتوت هەرگیز واز لە پەرستی ناهێنم، واتە: گوێرەکەکە، ﴿لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى الْيَمِّ نَسْفًا﴾ واتە: چۆن دەیسوتێنین‌و خۆڵەکەیشی دەپرژێنین بە دەریادا بە پرژاندن، پاشان خوای گەورە لەسەر زمانی موسا (سەلامی خوای لی بێت) دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ اللَّهُ الَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾ کە پێی وتن: پەرستراوی ئێوە هەر خوایە کە هیچ شتێك جگە لەو شایەنی پەرستن نییەو هەموو شتێك دەزانێت‌و هەموو شتێك نیازی هەر بە خودایە، ڕستەی، ﴿وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾، ﴿عِلْمًا﴾ مەنسوبە لەسەر تەمیز، واتە: هەر ئەو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًا﴾[2] واتە: بە زانین دەوری هەموو شتێکی داوە، ﴿وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًا﴾[3] واتە: وە هەموو شتێکی هەڵژماردووە بە هەڵژماردن. ﴿يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ﴾[4] واتە: لە خوا ون نابێت قورسایی گەردیلەیەك، ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ الْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[5] واتە: وە هەر گەڵایەك بکەوێت خوارەوە خوا پێی دەزانێت‌و هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکیەکانی زەویدا بێت‌و هەر تەڕو وشکێك هەبێت هەر هەموویان لە کتێبی ئاشکرادان. ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[6] واتە: هیچ گیانلەبەرێك نیە لە زەویدا مەگەر لەسەر خوایە ڕزق‌و ڕۆزیەکەی وە (خوا) دەزانێت شوێنی مانەوەی‌و شوێنی لی دەرچوونی هەمووی نووسراوە لە کتێبی ڕوونکەرەوە (لوح المحفوظ). ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە.

---

[1] الطبري (١٨/٣٦٤).

[2] الطلاق (١٢).

[3] الجن (٢٨).

[4] سبأ (٣).

[5] الانعام (٥٩).

[6] هود (٦).

﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾﴾

**ئەم قورئانە فەرموودەی خوایە، پڕە لە هەموو باسێك، باسی تۆڵە لەوانەیش پشتی تێدەکەن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا﴾ واتە: ئا بەم شێوەیە بەسەرهاتی پێشینەکانت بۆ دەگێڕینەوە، هەروەها ئەو قورئانەشمان لە خۆمانەوە داوە بە تۆ، واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) وەك چۆن باسی موساو فیرعەون و لەشکرەکەی و ئەوەی ڕوویدا لە نێوانیاندا بۆمان کردی، بە ڕوودانی ئاشکرا، هەر بەو شێوەیەش باسی بەسەرهاتی پێشنەکانی تریشت بۆ دەکەین وەك خۆی بەبێ زیادو کەم، وە ئەم قورئانەشمان لە لایەن خۆمانەوە بۆ ناردی لە کارزانی و شایەنی سوپاسەوە هاتووەتەخوار، ئەو خودایەی کە وێنەی ئەم قورئانەی بە هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی نەداوە لەو کاتەی کە ڕەوانەکراون هەتا دوایین پێغەمبەریان کە موحەممەدە کە ئەم قورئانەی بۆ نارد، وە هیچ کتێبێکیش وەك ئەم قورئانە تەواوترو کۆکەرەوەی هەواڵی پێشینان و ئەو شتانەش کە لەمەودوا ڕوودەدات باس نەکردووە، بڕیاری یەکلاکەرەوە لە نێوان خەڵکیدا هەر لە قورئانەوە وەردەگیرێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ﴾ واتە: هەر کەسێ گوێ نەدات بەم قورئانەو پشتی تێ بکات و بڕوای پێ نەکات و بە تەمای ڕێنشاندەرێکی تر بێت غەیری ئەم قورئانە، خوای گەورە ڕێی تێك دەدات و بەرەو ناوەڕاستی جەهەننەمی دەبات، بۆیە خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا﴾ واتە: هەر کەسێك خۆی لێ لاداو پشتی تێ بکات لە ڕۆژی قیامەتدا بارێکی گران هەڵدەگرێت، واتە: گوناهەکانی بە کۆڵیەوەیە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[1] واتە: هەرکەس لەو کۆمەڵانە بڕوای پێ نەکات جێی لە ئاگردا بۆ ئامادەکراوە، ئەم ئایەتە گشتگیرەو هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە ئەم قورئانەی پێ گەیشتبێت لە عەرەب و عەجەم و هەموو خاوەن کتێب و کەسانی تریش، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[2] واتە: تا بە هۆی ئەم قورئانەوە، ئێوە بترسێنم و هەر کەسێکیش کە پێی دەگات، واتە: هەر کەسێ ئەو قورئانەی پێ گەیشتبێت، ئەوە بانگکراوەو ترسێنراوە، هەر کەسێك شوێنی کەوتبێت ڕێی نیشاندراوە، هەر کەسیش پشتی لێ هەڵکردبێت و دژایەتی کردبێت، ڕێی لێ تێکچووەو بەدبەخت بووە لە دنیاو لە ڕۆژی

[1] هود (١٧).

[2] الأنعام (١٩).

قیامەتیشدا ناو ئاگر جێگایەتی، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَـٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ حِمْلًا﴾ واتە: هەر تێیدا دەمێننەوە ئای ڕۆژی قیامەت بۆ ئەوانە چەند بارێکی نالەبارو گرانە، هەرگیز لەناو ئاگر نایەنە دەرەوەو ڕزگاربوونیان بۆ نیەو ژیانێکی زۆر خراپیان هەیە.

﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَـٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾﴾

**فووکردن بە کەڵەشاخداو هاتنی ڕۆژی قیامەت**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا کە فوو بە کەڵەشاخدا دەکرێت، لەو ڕۆژەدا تاوانباران کۆدەکرێنەوە، کوێرن‌و شین هەڵگەڕاون، لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) پرسیاری لێکرا لە بارەی صورەوە فەرمووی: (کەڵەشاخێکە فووی پیا دەکرێت).[1] وە لە فەرموودەکەی کەڵەشاخدا (الصور) هاتووە، ئەبوهورەیرە ڕیوایەتی کردووە، کەڵەشاخێکی گەورەیە، بازنەیەکی (ئەڵقەیەکی) بە ئەندازەی ئاسمانەکان‌و زەمینە، ئیسرافیل (سەلامی خوای لی بێت) فووی پیا دەکات،[2] وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (چۆن خۆشی ڕابوێرم خاوەنی کەڵەشاخەکە، کەڵەشاخەکەی بە دەمەوە گرتووەو سەری دانەواندووەو چاوەڕوانە کە ئیزنی پی بدرێت) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چی بڵێین؟ فەرمووی: بڵێن: خوامان بەسەو چاکترین پشت‌و پەنایە، پشتمان هەر بە خودایە).[3] ﴿وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا﴾ئەڵێن:یانی: چاویان شین هەڵگەڕاوە لە ترسی ئەو نارەحەتیەی تێی کەوتوون، ﴿يَتَخَـٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ﴾ ئیبنو عەبباس دەڵێت: لە بەینی خۆیاندا قسە دەکەن،[4] واتە: بە یەکتریان دەڵێن: ﴿إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا﴾ واتە: دە ڕۆژ نەبێت نەماونەتەوە لە ژیانی دنیادا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ﴾ واتە: ئەوەی ئەوان قسەی لی دەکەن ئێمە باشتر لێی ئاگادارین، ﴿إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً﴾ واتە: لە هەموویان ژیرتر ئەڵێ: ﴿إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا﴾ واتە: ڕۆژێك نەبێت

---

[1] تحفة الأحوذي (٩/١١٦).

[2] الطبراني في الطوال (٣٦).

[3] تحفة الأحوذي (٩/١١٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] الطبري (١٨/٣٧١).

نەماونەتەوە لە ژیانی دنیادا، لەبەر کورتی ژیانی دنیا لە چاو ڕۆژی قیامەتدا لە لایان، چونکە دنیا هەمووی بە دووبارەبوونەوەی کاتەکانو هاتنی شەوو ڕۆژ بە دوای یەکدا وەك یەك ڕۆژ وایە، بۆیە خوانەناسان ماوەی ژیانی دنیا زۆر بە کەم دەزانن لە چاو ڕۆژی قیامەتدا، مەبەستیان ئەوە بووە کە ئەو قسەی خۆیان بکەنە بەڵگە بۆ کەمیو کورتی ژیانی دنیا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيْرَ سَاعَةٍ﴾[1] واتە: ڕۆژی کە قیامەت دێت، تاوانباران سوێند دەخۆن جگە لە سەعاتێك نەماونەتەوە، وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾[2] واتە: ئایا ئێمە تەمەنی درێژمان بە ئێوە نەدا بە هەر کەسێك بیویستایە پەندی لی وەرگرتایە؟ ترسێنەریشتان بۆ هات، وە دەفەرمووێت: ﴿قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[3] واتە: ئەڵێ: ئەگەر بتانزانیایە، کەمێك نەبێت نەماتەوە، زۆر کەم لە دنیادا دەژیان، ئەگەر شارەزا بوونایە گرنگیتان زیاتر بە ڕۆژی دوایی دەدا لە جێی ژیانی دنیا، بەڵام دەستتان کردە کرداری خراپو ناشیرین، دنیای دوا کۆتاتان هەڵبژارد بەسەر ڕۆژی دوایی هەر نەبراوەدا.

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾﴾

**وردبوون و هاڕینی کێوەکانو زەمین دەبێتە دەشتێکی فراوان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ﴾ واتە: لە بارەی کێوەکانەوە لێت دەپرسن، ئایا ڕۆژی قیامەت دەمێنن یان نامێنن؟ ﴿فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا﴾ واتە: بڵێ: پەروەرندەم هەر بە هاڕین دەیانهاڕێت، لە شوێنی خۆیان لایان دەباتو بە ڕووی زەمیندا پەرشو بڵاویان دەبن، ﴿فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا﴾ واتە: دەیکات بە فەرشێك، (القاع) واتە: دەشتی کاکی بە کاکی، (صفصفاً) تەئکیدە بۆ مانای پێشوو، وتراویشە: زەویەکی بی ڕووەك، مانای یەکەم چاکترە هەرچەندە ئەمەیش هەمان مانا دەبەخشێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا﴾ واتە: نە هیچ کەنو

---

[1] الروم (٥٥).

[2] الفاطر (٣٧).

[3] المؤمنون (١١٤).

کۆسپێکی تێدا دەبینی، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا نە شیوو تەپۆلکەو نە بەرزیو نزمیو چیا دەبینی لەسەر زەمیندا، ئیبنو عەباسو عیکریمەو موجاهیدو حەسەنی بەسریو زەحاکو قەتادەو زۆرێك لە زانایانی پێشینەیش هەر وایان وتووە[1].

**خەڵکی وەدەنگ بانگکەرێکەوە دەچن**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا کە ئەو کارەساتە گرانو ناڕەحەتانە دەبینن، بە پەلە وەڵامی ئەو بانگدەرە دەدەنەوە هەر فەرمانێکیان پی بکات زۆر زوو بە دەمیەوە دەچنو سەرپێچی لی ناکەن، خۆ ئەگەر لە دنیادا وایان بکردایە زۆر سودیان لی وەردەگرت، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ سودێکی نیە بۆیان، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾[2] واتە: ڕۆژێك کە دێنە لای ئێمە زۆر چاك دەبیننو دەبیسن، وە لە ئایەتێکی تریشدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾[3] واتە: بە پەلە بە دەنگ بانگدەرەکەوە دەچن، لێرەدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ﴾ واتە: لەبەر خوای ڕەحمان هەموو دەنگێك نزم دەبێتەوە، ئیبنو عەبباس دەڵێت: هەموو دەنگێك، بێدەنگ دەبێت.[4] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: واتە: تەپەی (دەنگی) پی.[5] واتە: دەنگی پی نەبێت هیچ دەنگێك نابیسی، عیکریمەو موجاهیدو زەحاکو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو قەتادەو ئیبنو زەیدو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[6] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾ دەنگی هێواش.[7] ئەم مانایە لە عیکریمەو زەحاکیشەوە ڕیوایەت کراوە، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ﴿فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا﴾ قسەی هێواشو تەپەی پی، (واتە: چپەچپو تەپەی پی نەبێت هیچ شتێك نابیی).

---

[1] الطبري (١٨/٣٧٢)، الدر المنثور (٥/٥٩٨/٥٩٩).

[2] مريم (٣٨).

[3] القمر (٨).

[4] الطبري (١٨/٣٧٤).

[5] الطبري (١٨/٣٧٤).

[6] الطبري (١٨/٣٧٥).

[7] الطبري (١٨/٣٧٥).

﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾﴾

**تکاکردن و پاداشت و وەرگرتن**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی قیامەت) تکاو لالانەوە سودێکی نیە بۆ کەس مەگین خودا ئیزنی تکای بداتو قسەکەیشی پەسەندبکات. ئەم ئایەتەوەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾[1] واتە: کێیە ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا بتوانێت تکای لە لا بکات مەگەر بە ڕێپێدانی خۆی. وە دەفەرموویت: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾[2] واتە: وە چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکاندا هەن تکاو شەفاعەتیان هیچ سودی نیە مەگەر دوای ئەوەی کە خوا مۆڵەت بدات بۆ کەسێك کە خۆی بیەوێتو ڕازی بێت. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ﴾[3] واتە: وە (فریشتەکان) تکا ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت (خوا) ڕازی بێت (تکای بۆ بکەن) وە ئەوان (فریشتەکان) لە ترسو هەیبەتی خوا زۆر دەترسن. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾[4] واتە: وە تکاکردن لای خودا سوودی نیە مەگەر بۆ کەسێك ئەو (خوا) ڕێگە بدات. وە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾[5] واتە: لە ڕۆژێکدا کە جبریلو فریشتە بەڕیز دەوەستن کەسیان قسە ناکەن مەگەر ئەوە کە خوا ڕێ بداتو قسەی بەڕێو جێ بکات. وە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە بە شێوەی تریش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە مەزنترینی کوڕی ئادەمو بەڕێزترین دروستکراوی خودایە، لە لای خودای گەورە کە فەرموویەتی: (دەچم لە ژێر (العرش)دا دەکەوم بە سوژدەدا بۆ خودا، خودا فێری سوپاسو ستایشێکم دەکات کە ئێستا ناتوانم بەو

---

[1] البقرة (٢٥٥).

[2] النجم (٢٦).

[3] الانبياء (٢٨).

[4] سبأ (٢٣).

[5] النبأ (٣٨).

شێوەیە سوپاسو ستایشی بکەم، ئەوەندەی خۆی مەیلی لی بێت وازم لی دێنێت، پاشان دەفەرمووێت: ئەی موحەممەد (ﷺ) سەرهەڵبڕە، بڵی، تا لێت ببیسرێت، تکا بکە لێت قەبوڵ دەکرێت، پاشان سنوورێکم بۆ دادەنرێت، دەیانخەمە بەهەشتو پاشان دەگەڕێمەوە).[1] چوار جار پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی باس کرد، وە لە فەرموودەیەکی تریشدا فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: لەناو ئاگر دەری بێنە ئەوەی بە ئەندازەی دەنکە دانەوێڵەیەك باوەڕ لە دڵیدایە، خەڵکێکی زۆر دێنە دەرەوە، پاشان دەفەرمووێت: دەریان بێنە لە ئاگر ئەوەی بە ئەندازەی نیوەی دانەوێڵەیەك باوەڕ لە دڵیدایە، دەریان بێنە لە دۆزەخ ئەوانەی بە ئەندازەی کێشی زەڕەیەك باوەڕ لە دڵیدایە، دەریان بێنە ئەوانەی کەمتر لە زەڕەیەك باوەڕ لە دڵیاندایە).[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾ واتە: ئەو دەزانێت (واتە خوا) چیان بەسەرعات یان چیان بەسەردێت، هەر ئەمانن لە بارەی ئەوەوە هیچ نازانن، واتە: خودا ئاگاداری گشت دروستکراوەکانیەتی، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾[3] واتە: وە کەس ئاگای نیە لە هیچ شتێك لە زانینو زانیاری ئەو (خوا) مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَيِّ ٱلْقَيُّومِ﴾ واتە: هەموو خەڵکی لارەملی ئەو خودایەن کە هەر نامرێتو پایەدارە، ئیبنو عەبباسو کەسانی تریش وتوویانە: هەموو خەڵکی چاو لەبەرو سەرنەویو لارەملی ئەو خودایەن کە هەر نامرێتو پایەدارەو هەرگیز ناخەوێت.[4] هەر ئەویش بە هەموو کارەکاندا دەگاتو بەڕێوەیان دەباتو دەیانپارێزێت، پاکو بی عەیبە لە هەموو کەمو کوڕیەك، هەموو شتێك نیازی بە خوایەو بەبی ئەو هیچ شتێك نازێتو پایەدار نابێت، ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾ واتە: کێش ناهەقی کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا بی هیواو نائومێدە، چونکە خوای گەورە لە هەموو هەقی دەداتەوە بە خاوەنەکەیو بە شێوەیەك کە هەقی بەرانی بی شاخ بەسەر بەرانی شاخدارەوە ناهێڵێت. لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (خوای گەورە دەفەرمووێت: سوێند بە گەورەییو دەسەڵاتی خۆم، ئەمڕۆ (واتە: ڕۆژی قیامەت) ناهەقی هیچ ناهەقیکارێك بە لامدا تێپەڕ نابێت) واتە: (تۆڵەی لی دەسێنم) وە لە فەرموودەیەکی تری صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ)

---

[1] فتح الباري (٨/٢٤٧)، مسلم (١/١٨٤).

[2] فتح الباري (١٣/٤٨١).

[3] البقرة (٢٥٥).

[4] الطبري (١٨/٣٧٧/٣٧٨).

دەفەرمووێت: (دەتانترسێنم لە ستەمکاری چونکە ستەمکردن لە ڕۆژی قیامەتدا تاریکاییە، نائومێدیو سەرشۆڕی ئەوەیە کە کەسێك بە موشریکی بگاتە لای خودا، چونکە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[1] واتە: چونکە بە ڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا﴾ واتە: هەر کەسیش ئاکار چاکەو خاوەن باوەڕیشە ناترسێت پاداشتەکەی لی داگیربکرێت یان کەمتر بێت وەك چۆن باسی ستەمکارانی کردو هەڕەشەی لی کردن لێرەدا باسو وەسفی پارێزەرانو پاداشتیان دەکات کە هەقی خۆیانیان بە تەواویو بی کەموکوڕی وەردەگرن، واتە: گوناهیان بۆ زیاد ناکرێتو چاکەکانیان گشت بۆ حیساب دەکرێت، ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو موجاهیدو زەححاكو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریشە.[3] (الظلم) یانی: زیادە هەڵناگرێت، واتە: تاوانو گوناهی کەسی تر هەڵناگرێت، (الهضم) یانی: چاکەیشی کەم ناکرێتەوە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾

**خوای گەورە قورئانی ناردووە، تا خەڵکی بترسنو بیربکەنەوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیەیش قورئانێکی عەرەبیمان ناردە خوار زۆر شتی ترسێنەرمان تیا باسکردووە، بەڵکو خۆ بپارێزنو بە خۆیاندا بچنەوەو بیربکەنەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت، لەبەر ئەوەی کە ڕۆژی قیامەت هەر دێتو ڕوودەداتو پاداشتی گشت کەسێك بە چاکە یان بە خراپە هەر دەدرێتەوە قورئانمان ناردەخوارەوە کە مژدەدەرو ترسێنەربێت بۆ مەردم بە زمانێکی عەرەبی ڕوونو ڕەوان، کە هیچ نارێکیو ناتەواویەکی تێدا نیە، ﴿ فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ بە چەند شێوە هەڕەشەمان تێداکردووە بۆ ئەوەی واز لە تاوانو خراپەکاری و داوێن پیسی بێنن، ﴿أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴾ واتە:یان تا بیربکەنەوە دەست بدەنە خواناسی و ئەو شتانەی کە لە خودا نزیکیان دەکاتەوە، ﴿فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ﴾ واتە: پایەبەرزە ئەو خوایە کە پاشای ڕاستەقینەیەو پاكو بی عەیبە،

---

[1] لقمان (١٣).

[2] مسلم (١٩٩٦/٤).

[3] الطبري (٣٧٩/١٨-٣٨٠).

بەڵێنی ڕاستەو هەڕەشەی ڕاستەو ڕاسپاردەی ڕاستەو بەهەشت ڕاستەو جەهەنەم ڕاستەو هەر شتی لە لایەن خوداوە بێت هەمووی ڕاستەو لە دادپەروەری خودایە کە سزای هیچ کەسێك نادات هەتا ئاگاداری نەکاتو پێغەمبەری بۆ ڕەوانە نەکات، قسەی هەموو کەسێك دەبڕێت بۆ ئەوەی هیچ کەسێك بروبیانوو نەهێنێتەوەو گومانی نەمێنێت.

**خودا فەرمانی داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) گوێبیستی قورئان بێت لە کاتی هاتنەخوارەوەیدا پەلە نەکات لە خوێندنەوەیدا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ﴾ واتە: تۆیش پەلە مەکە بۆ خوێندنەوەی ئەم قورئانە، پێش ئەوەی ئێمە پێت ڕابگەیەنین ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە لە سورەتی ﴿لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ دایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾[1] واتە: زمانت مەجوڵێنە بە خوێندنەوەی سروش تا پەلەی تیا بکەیت، بە ڕاستی (وەك بەڵێنمان داوە) بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لەسنگتداو خوێندنەوەی، ئینجا کاتێك کە قورئانمان بۆ خوێندیەوە (بەهۆی جوبرەئیلەوە) تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە، لە پاشان دڵنیا بە ڕوونکردنەوەشی لەسەر ئێمەیە. لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە لە ئیبنو عەبباسەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) چارەسەری ئەو ناڕەحەتیەی لە وەحیدا (لە قورئاندا) بۆی دەهات، بەوە دەکرد کە زمانی بە قورئان خوێندنەوە خەریك دەکرد) خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾[2] یانی: کاتێك جوبرەئیل بەنیگاوە دەهاتە لای، کەجوبرەئیل ئایەتێکی دەخوێندئەمیش لەگەڵی دەیخوێندەوە ئەوەندە ئارەزوومەندی لەبەرکردنی قورئان بوو، خوای گەورە ڕێنمایی کرد بۆ شتێك کە سوكو ئاسانتر بێتو نەبێتە مایەی ناڕەحەتی بۆی فەرمووی: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ واتە: لە سنگتدا کۆی دەکەینەوە، پاشان دەیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بی ئەوەی هیچت لەو قورئانە لەبیر بچێت، ﴿فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾[3] واتە: وە لێرەدا لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن

---

[1] القيامة (١٦ـ١٩).

[2] فتح الباري (٣٩/١).

[3] القيامة (١٨ـ١٩).

يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥ﴾ واتە: پەلەت نەبێت بۆ خوێندنی ئەم قورئانە پێش ئەوەی ئێمە ئاگادارت بکەین، واتە: بێدەنگ بە، کاتێك ئەو فریشتە لی بووەوە لە خوێندنەوەی بۆت، تۆش لە دوای ئەوەوە بیخوێنە، ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا﴾ واتە: ئەی پەروەردگارم زانیاریم زیادبکە، ئیبنو عویەینە (ڕەحمەتی خوای لی بێت) دەڵێت: بەردەوام زانیاری پێغەمبەر (ﷺ) هەر زیادی دەکرد، تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی.

﴿وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾﴾

## بەسەرهات و چیرۆکی ئادەم و شەیتان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا﴾ بەر لە ئێستایش لەگەڵ ئادەم پەیمانمان بەست، کەچی لەبیری چوو، پێی نەکرا پێی هەڵسێت، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: بۆیە ئەمڕۆ ناونراوە بە (الانسان) لەبەر ئەوەی بەڵێنی لەگەڵ بەستراو لەیادی چوو،[1] عەلی کوڕی ئەبو تەلحەیش لە ئیبنو عەبباسەوە ڕیوایەتی کردووە بەو شێوەیە.[2] موجاهیدو حەسەنیش دەڵێن: وازی هێنا.[3] واتە: وازی لە بەڵێنەکە هێنا، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ﴾ واتە: پاشان بە فریشتەمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، هەموویان سوژدەیان بۆ برد جگە لە شەیتان، ئەو سەرپێچی لە فەرمان کرد، خوای گەورە باسی ڕێزو قەدری ئادەم دەکات کە چەندە ڕێزی لی گرتووەو پلەی بەرزی داوەتی لە نێوان زۆرێك لە دروستکراوەکانیدا لە پێشەوە باسی ئەم ڕووداوە لە سورەتی (البقرة)و (الاعراف)و (الحجر)و (الكهف)دا کراوە، لەمەوبەدوایش لە سورەتی (ص)دا خوای گەورە

---

[1] الطبري (٣٨٣/١٨).

[2] الطبري (٣٨٣/١٨).

[3] الطبري (٣٨٣/١٨).

باسی دروستبوونی ئادەمو فەرماندانی بە فریشتەکان دەکات کە سوژدەی بۆ بەرن، وەك ڕێزو قەدرێك بۆ ئادەم، پاشان دوژمنایەتی شەیتان بۆ ئادەمو نەوەکانی ڕوون دەکاتەوە لە دێرزەمانەوە، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ﴾ واتە: هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد بۆ ئادەم جگە لە شەیتان کە سوژدەی نەبردو فیزی کردو خۆی بە زال زانی، ﴿فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ﴾ واتە: وتمان ئادەم ئەمە دوژمنی خۆتو ژنەکەتە، ﴿فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ﴾ واتە: لەم بەهەشتە دەرتان نەکات، بەدبەخت ببن، نەکەی شەیتان هەوڵ بدات لە بەهەشت دەرت بکات، ئەو کاتە توشی مەینەتیو گیروگرفت بیت بۆ بە وەدەستهێنانی بژێوی، چونکە تۆ لێرەدا لە ژیانێکی زۆر خۆشو بەختەوەری دای بەبی خۆماندووکردنو ڕەنجکێشان، ﴿إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ﴾ واتە: لێرە بی هەرگیز ڕووتییو برسیەتی توشت نایەت، بۆیە خوای گەورە ڕووتی داوەتە پاڵ برسیەتی، چونکە برسیەتی شکستی بەسەر ناوەوەی لاشەدا دێنێتو ڕوتیش زەبوونی دێنێت بەسەر دەرەوەی لاشەدا، ﴿وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ﴾ واتە: نە هەرگیز تینوت دەبێتو نە خۆریش دەتبات، تینوێتیو گەرمایش نزیکن لە یەکەوە، (الظمأ) واتە: گەرمای ناوسك، کە تینویەتیە، (الضحي) گەرمای دەرەوە (خۆر)، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ﴾ واتە: شەیتان دنەی ئادەمی دا بۆ خراپەو وتی: ئایا دەتەوێت درەختی نەمریت نیشان بدەمو ماڵو سامانی دوایی نەهاتووت پی بڵێم، لە پێشەوە باسکرا کە شەیتان زۆر هەوڵی لەگەڵدانو لە خشتەی بردنو هەڵی خەڵەتاندن سوێندی بۆ خواردن کە مەبەستی مۆچیاری کردنیانەو هیچ مەبەستێکی تری نیە، ﴿وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾[1] واتە: وە سوێندی بۆ خواردن وتی بێگومان من لە ئامۆژگارانی دڵسۆزی ئێوەم. لە پێشەوە باسکرا کە خودا پەیمانی لەگەڵ ئادەم بەست کە لە هەموو میوەیەك بخۆن تەنها ئەو درەختە دیاری کراوە نەبێت لەناو بەهەشتدا، شەیتان وازی لی نەهێنان هەتا لەو درەختەیان خوارد، پێی دەوتن ئەو درەختە درەختی هەر مانەوەیە، واتە: هەر کەسێك لێی بخوات هەر دەمێنێتەوە لەو بەهەشتەدا هەرگیز لێی دەرناچێت، لەم فەرموودەیەدا باسی درەختی هەرماوە کراوە ئەبو داودی تەیالیس ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە، سەد ساڵ سوار بە ژێر سێبەریدا دەڕوات

[1] الاعراف (٢١).

نایبڕێت، ئەوەش درەختی هەرمانە).[1] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە،[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا﴾ واتە: هەردوویان (ئادەمو حەواء) لە بەری دارەکەیان خوارد، شەرمگەی خۆیان بۆ دەرکەوت، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە ئادەمی دروست کرد پیاوێکی باڵابەرز بوو قژی سەری زۆر بوو، وەك دارخورمایەکی بەرز وابوو، وەختێك کە تامی دارەکەی کرد جلوبەرگەکەی لەبەری داکەنرا (بووەوە)، یەکەم شتێك کە لێیەوە دەرکەوت شەرمگەی (عەورەتی) بوو، کاتێك کە شەرمگەی خۆیی بینی بە پەلە لەناو بەهەشتدا دەگەڕا، درەختێك قژی گرتو لێی کردەوە، خوای ڕەحمان بانگی کرد: ئەی ئادەم لە من ڕادەکەی، کاتێك ئادەم فەرموودەکەی خوای بیست، وتی: ئەی پەروەردگارم نەخێر !لە تۆ ڕاناکەم، بەڵام شەرم دەکەم، ئەگەر پەشیمان بوومەوەو گەڕامەوە، دەمگێڕیتەوە بۆ بەهەشت؟ فەرمووی: بەڵی).[3] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَتَلَقَّىٰ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ﴾[4] واتە: ئادەم لە پەروەردگاریەوە چەند وتەیەکی پێگەیشتو تەوبەکەی لی وەرگرت، ئەم ڕیوایەتە لە نێوان حەسەنو ئوبەیی کوڕی کەعبدا بڕاوەو لێی نەبیستووە، لە بەرزکردنەوەکەیشدا هەر قسە هەیە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ﴾ واتە: خەریك بوون بە گەڵای بەهەشت خۆیان داپۆشن، موجاهید دەڵێت: گەڵای بەهەشتیان لە خۆیان دەگرت وەك پۆشاك، قەتادەو سودیش هەروایان وتووە.[5] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾ واتە: ئادەم لە فەرمانی پەروەردگاری لایداو لە ڕێ دەرچوو، پاشان پەروەردگاری ئەوی هەڵبژاردو تەوبەی لی قبوڵ کردو ڕێی نیشاندا، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (موسا گفتوگۆی لەگەڵ ئادەم کرد (سەلامی خوایان لی بێت) پێی وت:تۆ ئەو کەسەی خەڵکیت لە بەهەشت وەدەرنا بە گوناهتو بەدبەختت کردن؟ ئادەم وتی: ئەی موسا تۆ ئەو کەسەی خودا هەڵی بژاردووی بە وتەو پەیامەکانی، ئایا تۆ سەرزەنشتی من دەکەی لەسەر شتێك کە خودا لەسەر منی نووسیوە پێش

---

[1] مسند الطيالسي (٣٣٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد (٢/٤٥٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الطبري (١٢/٣٥٤).

[4] البقرة (٣٧).

[5] الطبري (١٨/٣٨٨).

ئەوەی کە دروستم بکات، یان بڕیاری داوە لەسەرم پێش ئەوەی دروستم بکات؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ئادەم سەرکەوت بەسەر موسادا).[1] واتە: (بەڵگەی دایە دەستی) ئەم فەرموودەیە چەند ڕێگایەکی تری هەیە لە هەردوو صەحیحەکەداو موسنەدەکانی تریشدا[2].

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ ﴾

**دابەزینی ئادەم بۆ سەر زەمین‌و بەڵێنی چاکەکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی ڕێی ڕاستیان گرتووەتەبەرو تۆڵەسەندنیش لەوانەی لە ڕێ لایانداوە**

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ﴾ واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: هەردووتان لە بەهەشت دابەزن‌و بچنە خواری‌و گشت نەوەکانتان دەبنە دژی یەکتری، وە لە سورەتی (البقرة)دا دەفەرمووێت: ﴿قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا﴾[3] واتە: وتمان: گشتتان لە بەهەشت بڕۆنە خواری، واتە: ئادەم‌و حەواو شەیتان، ﴿بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ﴾ وتی: ئادەم‌و نەوەکانی‌و شەیتان‌و نەوەکانی، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى﴾ واتە: ئەگەر لە منەوە ڕێنموونیتان بۆ هات، ئەبولعالیە دەڵێت: پێغەمبەران‌و ڕاسپاردەکان‌و ڕوونکردنەوەتان بۆ هات.[4] ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ﴾ واتە: ئەوسا هەر کەسێك ڕێگەی منی گرتەبەر ئیتر نە ڕێ هەڵە دەکات‌و نە تووشی بەدبەختی دەبێت، ئیبنو عەبباس دەڵێت: لە دنیا ڕێ ون ناکات‌و لە قیامەتیشدا بەدبەخت نابێت،[5] ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى ﴾ واتە: هەر کەسیش پشت لە ئامۆژگاری من هەڵکات‌و بێ گوێیی فەرمانی من بکات‌و ئەوەی ناردوومە بۆ پێغەمبەرەکانم، ڕێنمایی لە ڕێگای ترەوە وەرگرێت، ﴿فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا﴾ ژیانی لە تەنگانەدایە لە دنیادا، دڵی ئارام ناگرێت‌و لە دڵەڕاوکە دایە، بەڵکو دڵتەنگ‌و نارەحەتە بە هۆی ئەو ڕێگە لارو چەوتەی لەسەریەتی، با بە ڕووالەت خۆشی ڕابوێرێت‌و جلوبەرگی

---

[1] فتح الباري (٢٨٨/٨).

[2] فتح الباري (٥٠٨/٦/٥١٣/١١)، مسلم (٢٠٤٢/٤/٢٠٤٣)،، أحمد (٢٨٧/٢/٣١٤).

[3] البقرة (٣٨).

[4] الطبري (٥٤٩/١).

[5] الطبري (٣٨٩/١٨).

جوان لەبەر بکاتو هەرچی بوی بیکات بە ئارەزووی خۆی، لە خواردنی چاکو شوێنی باش، چونکە دڵی لەگەڵ خودا نیەو خاوەن باوەڕ نیەو لەسەر ڕێی ڕاست ناڕوات، هەمیشە لە گومانو سەرلێشێواویو دڵەڕاوکێدایە، بەردەوام ئەوە حاڵیەتی، لە ژیانی ناخۆشو تەنگانەدایە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بە کوێری حەشری دەکەین، موجاهیدو ئەبو سالحو سودی دەڵێن: هیچ بیانوو بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە،[1] عیکریمە دەڵێت: هەموو شتێکی لی ون دەکرێت کوێرە لە ئاستی جگە لە جەهەنەم، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ﴾[2] واتە: وە لە ڕۆژی دواییدا حەشریان دەکەین بەسەر ڕوو دەمو چاویاندا کە کوێرو لاڵو کەڕن شوێنی نیشتەجێیان دۆزەخە. بۆیە ئەڵێ: ﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا﴾ واتە: ئەی پەروەردەی من، بۆچی منت بە کوێری حەشر کردو زیندووکردەوە؟ خۆ من ئەوسا چاوم ساغ بوو لە دنیادا، ﴿قَالَ﴾ خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَـٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ﴾ واتە: هەروەك تۆ نیشانەکانی ئێمەت بۆ هاتو لەبیر خۆت بردەوە، ئەمڕۆئێمەش تۆ لەبیردەبەینەوە، واتە: کاتێك کە تۆ پشتت هەڵکرد لە نیشانەکانی خودا وەك کەسێك کە هەر لەبیرت نەبوبێت پاش ئەوەی کە ئاگادارکرای، ئێمەش هەر بەو شێوەیە مامەڵەت لەگەڵ دەکەین، خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَـٰذَا﴾[3] واتە: بۆیە ئەمڕۆ ئەوان لەبیر خۆمان دەبەینەوە هەرچۆنێك ئەوان دیداری ئەم ڕۆژەیان لەبیری خۆیان بردبۆوە. چونکە ئەو پاداشتە لە شێوەی ئەو ئاکارەیە، بەڵام لەبیرچوونەوەی وتەی قورئان، تێگەیشتن لە ماناکانیو هەڵسان بە فەرمانەکانی بەری ئەم هەڕەشەیە ناکەوی لێرەدا، هەرچەندە بە شێوازی تر هەڕەشە کراوە.

﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾﴾

**سزای سەخت بۆ ئەوانەی لە ئەندازە دەردەچن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسانە دەدەینەوە کە لە ئەندازەی خۆیان لایانداوەو بڕوایان بە نیشانەکانی خودا نەبووە لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿لَّهُمْ عَذَابٌ فِى

---

[1] الطبري (١٨/٣٩٤/٣٩٥).

[2] الاسراء (٩٧).

[3] الاعراف (٥١).

ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَقُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾[1] واتە: هەتا لەسەر دنیا دەژین هەر تووشی سزا دەبن، دیارە سزای دواڕۆژیش گرانترەو کەس ناتوانێت لە خوا بیانپارێزێت، (واتە لە سزای خودا لایان بدات) بۆیە لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ﴾ دیارە سزای دواڕۆژیش توندترو بەردەوامترە، هەر تێیدا دەمێننەوە بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەو دوو کەسەی کە نەفرین لە یەکتری دەکەن (المتلاعنین) دەفەرموێت: (بێگومان جەزرەبەی دنیا لە جەزرەبەی دواڕۆژ سوکترە).[2]

﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾﴾

## زۆر گەلان لەناوچوون جێی پەندو تێڕامانن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوانەی کە بڕوایان نیە بەو پەیامەی کە تۆ بۆت هێناون ئەی موحەممەد (ﷺ) نازانن ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ﴾ هەر لەو شوێنەی ئەوان پیا دێنو دەچن، چەند بەرەمان لەناوبرد لە پێش ئەوان، کە بڕوایان نەبوو بە پێغەمبەرەکانیان، قڕمان تێخستنو لە ڕەگو ڕیشە دەرمانهێنان هیچ ناونیشانێکیان نەما، جگە لەو کەلاوە ڕووخاوانەی لەبەر چاویانەو بۆیان ماوەتەوەو پێیدا دەڕۆنو تێیدا دەژین، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ﴾ واتە: ئا لەمەدا زۆر نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی بە ئاوەزو ژیرن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ﴾[3] واتە: دەی ئایا ئەوانە بە زەویدا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێت بیری پێ بکەنەوە (لەو وێران بوونە) یا گوێیان هەبێت گوێی پێ بگرن (بۆ ڕاستی) ،لە ڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەکاندان. وە لە سورەتی (الیف، لام، میم)ی سوژدەدا فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْقُرُونِ

---

[1] الرعد (٣٤).

[2] مسلم (٢/١١٣١).

[3] الحج (٤٦).

يَمْشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمْ ﴾[1] واتە: چەندین لەو گەلانەی کە لەناو ماڵەکانیاندا هاتوچۆیان دەکرد هەموومان قڕ نەکردن لە پێش ئەوانەدا، ئایا ڕاستیان بۆ ئەوان دەرنەخست؟ پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى﴾ واتە: ئەگەر بەڵێنێك لە پێشەوە لە پەروەردگارتەوە نەدرایەو کاتێکیش دیاری نەکرایە کە هیچ کەسێك جەزرەبە نادرێت مەگین دوای هێنانەوەی بەڵگەو نیشانە بۆی ئەوەلە پڕ سزایان بۆ دەهات.

### فەرماندان بە خۆڕاگریو بەجێهێنانی پێنج نوێژەکە

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ واتە: خۆڕاگر بە لەسەر هەرچی ئەوانە ئەیڵێنو بڕوات پی ناکەن، ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا﴾ واتە: لە بەیانیو پێش خۆرهەڵاتو (لە عەسردا) لە پێش خۆرئاوادا هەر پەسەنی خوا بدەو وەك لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە جەریری کوڕی عەبدوڵای بەجەلیەوە (ڕەزای خوای لی بێت) دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) دانیشتبووین لە شەوی چواردەدا سەیری مانگی کرد فەرمووی: (ئێوە خوای خۆتان دەبینن، لە بینینیدا هیچ پاڵەپەستۆو شان شانێنی یەکتری نادەن،وەك چۆن ئەم مانگە دەبینن وا دەیبینن، واتە ئەگەر دەتوانن هیچ شتێك بەسەرتاندا سەرنەکەوێت لەسەر نوێژێك لە پێش ڕۆهەڵاتنداو نوێژی پێش ڕۆژئاوادا (واتە: نوێژی بەیانیو عەسر) بکەن)، (واتە با هیچ شتێك نەبێتە ڕێگرتان (پاشان ئەم ئایەتەی خوێند).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەماری کوڕی ڕوەیبەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (هەر کەسێ لە پێش ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا نوێژ بکات واتە: نوێژی بەیانیو عەسر بکات، ئەو کەسە هەرگیز ناچێتە ئاگر).[3] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە،[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْ ءَانَآيِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ﴾ واتە: لە بەشێك لە کاتەکانی شەودا پەسەندی خوا بدەنو تەسبیحاتی بکەن، هەندێ دەڵێن: مەبەست بە( شەو) مەغریبو عیشایە، ﴿وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ﴾ بەرامبەرەکەیەتی واتە: لە کاتی ڕۆژیشدا هەر سەرکەرمی سوپاسی خوا بە، ﴿لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ﴾ بەڵکو بە ئاواتت بگەی، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا

---

[1] السجدة (٢٦).

[2] فتح الباري (٢/٤٠)، مسلم (١/٣٤٩).

[3] أحمد (٤/١٣٦)، فەرموودەیەکی.

[4] مسلم (١/٤٤٠).

دەفەرمووێت بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾[1] واتە: بەو زووانە پەروەردگارت چاکەی وەهات لەگەڵ دەکات ڕازی دەبی، وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە دەفەرمووێت ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەوانیش ئەڵێن: بەڵی ئەی پەروەردگارمان بەڵی! خوای گەورە دەفەرمووێت: ئایا ڕازی بوون؟ دەڵێن: پەروەردگارمان چیمانە کە ڕازی نەبین کە تۆ شتێکت بە ئێمە داوە بە هیچ کەسێك لە دروستکراوەکانت نەداوە، دەفەرمووێت: من لەوە چاکترم داوە بە ئێوە، ئەڵێن: چ شتێك چاکترە لەوە کە پێت داوین؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: لێتان ڕازی (خۆش) دەبم و دوای ئەمە هەرگیز لێتان تووڕە نابم).[2] وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (ئەی خەڵکی بەهەشت لە لای خودا بەڵێنێکتان پێدراوە دەیەوێت بۆتان جێبەجی بکات، ئەڵێن: ئەوە چیە: ئایا خودا ڕووی سپی نەکردووین و ترازووەکانی سەنگین و قورس نەکردووین و لە ئاگر لای نەداوین و نەیخستووینەتە بەهەشت؟ پەردە لادەبرێت و سەیری دەکەن، سوێند بە خوا هیچ چاکەیەکی پی نەداون لە ڕوانینی بۆ ڕووی خۆی چاکتر بێت، ئەوەیش ئەو زیادەیە)[3].

﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾﴾

## گوێ مەدەرە خۆشگوزەرانی دەوڵەمەندەکان و خۆگر بە لەسەر خواناسی

خوای گەورە دەفەرمووێت: بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد(ﷺ) سەیری دەوڵەمەندەکان و ئەوانەی وەك ئەوانە مەکە هەر خەریکی ڕابواردنن لە نازونیعمەتدا دێن و دەچن ، چونکە ئەو ژیان و خۆشیە دەڕوات و نامێنێت، ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بەو خۆشگوزەرانیەی کە تێیدان، زۆر کەمێك لە بەندەکانمان شوکرانەبژێرن، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ واتە: چاوت مەبڕە سەر ئەو شتەی کە داومانە بە کۆمەڵێك لەوانە، کە ئەمە هەر خۆشی ژیانی دنیایە و هەر ویستوومانە تاقیان بکەینەوە، بژێوی پەروەردەی تۆ چاکترو بەردەوامترە، قەتادە دەڵێت: ﴿أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ واتە: دەوڵەمەندەکان.[4] بێگومان ئەوەی خودا بە تۆی داوە لەوەی ئەوان چاکترە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَـٰكَ سَبْعًا

---

[1] الضحى (٥).
[2] فتح الباري (٤٢٣/١١).
[3] أحمد (٣٣٢/٤).
[4] الطبري (١٤١/١٧).

﴿مِنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ۝٨٧ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی حەوت ئایەتی دووبارەکراوەمان پێ بەخشیت هەروەها قورئانی گەورەش، (ئەی موحەممەد(ﷺ)) چاوت مەبڕە ئەو نازونیعمەتی _دنیا) کە داومانە بە کۆمەڵێك لە بێباوەڕان، ئەوانەی کە خودا هەڵی گرتووە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە دواڕۆژدا، زۆر گەورەترە لەوەی ئەمانەو هەر باس‌و وەسف ناکرێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێت کە ڕازی بیت. بۆیە خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ واتە: بژێوی پەروەرندەت چاکترو بەردەوامترە. وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتاب کاتێك کە چووە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەو شوێنەدا کە کەناری گرتبوو (جیابووبووەوە) لە ژنەکانی کاتێك کە شوێنی لی خواردبوون، بینی لەسەر پارچە حەسیرێك پاڵکەوتبوو جگە لە هەندی گەڵای دار کەبۆ دەباغکردن بەکار ئەهات وچەند پێستەیەکی هەڵواسراویش نەبێت هیچێکی تر لەو ماڵەدا نەبوو، چاوەکانی عومەر فرمێسکیان پێدا هاتە خوارەوە و دەستی کرد بە گریان، پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی وت: (چی دەتگرێنێت ئەی عومەر؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا– (ﷺ) کیسراو قەیسەر ئەوە ژیانیانە کە بەسەری دەبەن، تۆیش کە چاکترینی خەڵکی خودای ئەوە ژیانتە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا تۆ گومانت هەیە ئەی کوڕی خەتاب؟ ئەوانە کۆمەڵێکن خۆشگوزەرانی ژیانی دنیایان بۆ پێش خراوە)[3]. پێغەمبەری خودا (ﷺ) زاهدترین کەس بووە لە دنیادا لەگەڵ توانای بەدەستهێنانیدا، خۆ ئەگەر وەدەستیشی بهاتایە دەیبەخشی بەملاو بەولادا بەسەر بەندەکانی خودادا، هیچی بۆ بەیانی خۆی پاشەکەوت نەدەکرد، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ترسناکترین شتێك کە دەترسم بەسەرتان بێت کە خوای گەورە دەرگای خێروبێری دنیاتان لێبکاتەوە، وتیان: خێروبێری دنیا (زهرة الدنيا) کامەیە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فەرمووی: (خێروبێری ئەم زەمینە).[4] قەتادەو سودی دەڵێن: (زهرة الحياة)یانی : جوانی‌و ڕازاوەیی ژیانی دنیا.[5] قەتادە دەڵێت:

---

[1] الحجر (٨٧_٨٨).

[2] الضحى (٥).

[3] فتح الباري (١٣٧/٥).

[4] ابن أبي حاتم (٢٤٤٢/٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] الطبري (٤٠٤/١٨).

﴿لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ﴾ تاقیان دەکەینەوە تێیدا.[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾ واتە: بە کەس‌و کاری خۆت بێژە نوێژ بکەن، خۆشت وازی لی مەهێنەو خۆڕاگر بە لەسەری، لە سزای خودا ڕزگاریان بکە بە نوێژکردن وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا﴾[2] واتە: ئەی ئەوانەی خاوەن باوەڕن خۆتان‌و کەس‌و کارتان لەو ئاگرە بپارێزن، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە لە باوکیەوە کە دەڵێت: من‌و یەرفەء (يرفأ) لە لای عومەری کوڕی خەتتاب دەماینەوە بە شەو، کاتێکی خۆی هەبوو لە شەودا نوێژی تێدا دەکرد، کاتی وا هەبوو هەڵنەدەسا، دەمانوت ئەمشەو هەڵناسێت بۆشەو نوێژ وەك شەوانی ترکەهەڵ دەسا،کەچی، کە خەبەری دەبووەوەو هەڵدەسا، کەس‌و کارەکەشی هەڵدەساندو دەیوت: ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا﴾[3] واتە: فەرمان بدە بە کەس‌و کارت نوێژ بکەن‌و خۆشت وازی لی مەهێنەو ئارامت ببێت لەسەری، ﴿لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ واتە: ئێمە بژێویمان لە تۆ ناوی، خۆمان بژێوی بە تۆ دەدەین، کە تۆ نوێژت کرد، لە شوێنێکەوە ڕۆزیت بۆ دێت کە هەر وەبیریشتدا نەهاتووە، وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾[4] واتە: هەر کەسێك لە خودا ترسا خودا دەرووی لی دەکاتەوەو لە شوێنێکەوە ڕۆزی بۆ دەنێرێت هەر بە خەیاڵیشیدا نایەت، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ۝٥٧ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾[5] واتە: من بۆیە جنۆکەو مرۆڤم دروست کرد کە بمپەرستن، من هیچ بژێویم لەوان ناوی، نامەوی ئەوانە خۆراکم بدەنی، هەر خوا ڕۆزی دەنێرێت‌و خاوەنی هێزێکی توندو بتەوە. بۆیە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ﴾ تیرمزی‌و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەرەی ئادەم خۆت یەکلابکەرەوە بۆ عیبادەت سنگت پڕ دەکەم لە دەوڵەمەندی‌و هەژاریت لەسەرلا دەبەم، ئەگەر وانەکەی ،سنگت پڕ

---

[1] الطبري (١٨/٤٠٥).

[2] التحريم (٦).

[3] الطبري (١٨/٤٠٦).

[4] الطلاق (٢ـ٣).

[5] الذاريات (٥٦ـ٥٨).

دەکەم لە سەرقاڵی‌و هەژاریەکەیشت لا نابەم).[1] وە لە زەیدی کوڕی سابتەوە دیسان ڕیوایەت کراوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (هەر کەسێك مەبەستی دنیا بی خودا کاروباری پەرش‌و بڵاوە پێدەکات،( هەژاری)ش دەخاتە نێوچاوانی، لە دنیایشدا ڕۆزی بۆ نایە مەگین ئەوەی کە بۆی نووسراوە، وە هەر کەسیش ڕۆژی دوایی مەبەست بێت، خودا کاروباری بۆ کۆدەکاتەوە، دڵ دەوڵەمەندی دەکات، دنیاشی بۆ دەبێت‌و ڕووی تێدەکات بە ناچاری).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡعَـٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ واتە: پاشەڕۆژی چاکیش هەر بۆ پارێزەرانە لە دنیاداو لە قیامەتیشدا ئەو بەهەشتەیە کە ئامادەکراوە بۆیان، لەم فەرموودە صەحیحەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ( ئەمشەو بینیم وەك ئەوەی ئێمە لە ماڵی عوقبەی کوڕی ڕافیعدا بین، هەندی خورمای تەڕیان بۆ هێنایین لە خورماکانی(ابن طاب) ئەوەم وا لێکدایەوەو ماناکرد کە پاشەڕۆژ هەر بۆ ئێمەیە لە دنیادا لەگەڵ سەربەرزیدا، ئاینەکەیشمان پاك‌و چاکە).[3]

﴿وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُواْۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾﴾

## قورئـان خۆی بەڵگەیە کەچی بتپەرستان داوای بەڵگە دەکەن

خوای گەورە باسی خوانەناسەکانی قورەیش دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَا يَأۡتِينَا بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّهِۦٓ﴾ واتە: خوانەناسان وتیان: ئەی بۆچی بەڵگەیەکی پەروەردگارمان بۆ ناهێنی؟ واتە: بۆچی موحەممەد (ﷺ) نیشانەیەکمان لە پەروەردگارتەوە بۆ ناهێنێت، بەڵگە بێت لەسەر ڕاستی ئەوەی کە دەڵێی من پێغەمبەری خودام؟ خوای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ واتە: ئایا بەڵگەی ئاشکرایان لە قورئان نەهاتە لا لە پێشەوە کە بۆ ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە هاتەخوار کە شارەزای نووسین نەبوو لە لای ئەهلی کتێبیش نەیخوێندبوو، کەچی دەنگ‌و باس‌و بەسەرهاتی پێشینەکانی تێدا هاتووە وەك چۆن لە کتێبە صەحیحەکانی پێشوودا هاتووە، چونکە ئەم قورئانە ئاگاداری هەیە بەسەر گشت کتێبەکاندا، دان بە ڕاستیەکانیاندا دەنێت‌و هەڵەکانیش کە جێی بڕوا نین ڕاست دەکاتەوەو ڕاستەکانیش ڕوون دەکاتەوەو دەیسەلمێنێت، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە

---

[1] تحفة الأحوزي (١٦٦/٧)، ابن ماجە (١٣٧٦/٢)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[2] ابن ماجە (١٣٧٥/٢)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

[3] مسلم (١٧٧٩/٤).

وایه له سورەتی (العنكبوت)دا كه دەفەرموویت: ﴿وَقَالُوا لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾[1] واته: وه وتیان ئەوه بۆ چەند موعجیزەو بەلگەیەك دانابەزێنی بۆ سەری (موحەممەد(ﷺ)) له لایەن پەروەردگاریەوه بلّی (پێیان هێنانه خوارەوەی) موعجیزەكان تەنها له لایەن خواوەیەو بە ڕاستی من تەنها ترسێنەرێكی ئاشكرام، ئایا بۆ ئەوان بەس نیه كه ئێمه قورئانمان ناردۆته خوارەوه بۆ سەر تۆ دەخوێنرێتەوه بەسەریاندا بە ڕاستی لەم قورئانەدا بەزەیی‌و پەندو ئامۆژگاری هەیه بۆ باوەڕداران. له هەردوو صەحیحەكەدا هاتووه له پێغەمبەری خوداوه (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ پێغەمبەرێك نەبووه مەگین چەند نیشانەیەكی پێدراوه، لەسەر ئەو نیشانانه خەلكی بڕوایان هێناوه، بەلام ئەوەی بە من دراوه نیگایەكه (وەحیەكه) خودا منی لی ئاگادار كردووه، ئاواتەخوازم له ڕۆژی قیامەتدا شوێنكەوتووانم زیاتر بێت لەوان).[2] لێرەدا باسی گەورەترین نیشانه دەكات له نیشانەكان كه خوای گەورە پێی بەخشیوه كه قورئانی پیرۆزه، چونكه پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەندە موعجیزه له ژێر دەستیدا ڕوویداوه كه له ژمارە نایەت، وەك له كتێبەكانی فەرموودەدا باسكراوه له شوینی خۆیدا، پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا﴾ واته: ئەگەر ئێمه پێش ئەم قورئانه ئەوانمان لەناوبردایه دەیانوت: ئەی پەروەردگارمان بۆچی پێغەمبەرێكی خۆت بۆ نەناردووین هەتا بڕوامان پی بهێنایه، ﴿فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ﴾ واته: شوێنی بكەوتینایه پێش ئەوەی بێچارەو ڕیسوا ببین، خوای گەورەیش خۆی ئاگادارەو دەیانناسێت بۆیه ڕوونی دەكاتەوه كه ئەو خوانەناسانه درۆ دەكەن‌و زۆر لاسارن بڕوا ناهێنن، بۆیه دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[3] واته: جا با هەموو نیشانەیەكیان بۆ بێت (بڕواناهێنن) هەتا ئازاری بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن، وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ

---

[1] العنكبوت (٥٠ـ٥١).

[2] فتح الباري (٦١٩/٨)، مسلم (١٣٢/١).

[3] یونس (٩٧).

ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنۡهَاۗ سَنَجۡزِى ٱلَّذِينَ يَصۡدِفُونَ عَنۡ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يَصۡدِفُونَ﴾[1] واتە: ئەم کتێبە پیرۆزە پڕ لە پیتەمان ناردەخوار هەموو شوێنی ئەو کتێبە بکەون، هەر لە خودایش بترسن، بەڵکو بەزەیی بێتەوە پێتاندا مەڵێن کتێب هەر بۆ ئەو دوو کۆمەڵەی پێش ئیمە هاتووەتەخوارەوە، ئێمە ئاگامان لە زانستی ئەوان نەبووە، یان بڵێن: ئەگەر ئێمەیش وەك ئەوان کتێبمان بۆ بهاتایە، دیارە لەوان زیاتر شارەزا دەبووین، ئەوا ئێستا لە لایەن پەروەردگارتانەوە نیشانەیەکی زۆر ئاشکراو شارەزاییو بەزەییتان بۆ هاتووە، ئەمجار دەبێت کی لەو کەسە ستەمکارتر بێت کە بە نیشانەکانی خودا بڕوا نەکاتو لە فەرمانی لا بدات؟ ئەو کەسانەی لەم کتێبە خۆ لادەدەنو بە نیشانەکانی ئێمە باوەڕ ناکەن زۆری پی ناچێت بە توندی سزایان دەدەین. وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِن جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ لَّيُؤۡمِنُنَّ بِهَا﴾[2] واتە: زۆر بەتوندی سوێندیان بە خوا دەخوارد، هەر تاکە نیشانەیەکیان لە خواوە بۆ بێتەخوار بڕوا دێنن، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلۡ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ بەو کەسانەی بڕوایان پی نەکردی و دژایەتیان کردیو بەردەوامن لەسەر خوانەناسیو لاساری خۆیان ﴿كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ ﴾ هەموو چاوەڕوانین ئێمەیشو ئێوەیش ﴿فَتَرَبَّصُواْ﴾ سا ئێوەش چاوەڕوان بن، ﴿فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ﴾ بەو زووانە دەزانن کی ڕێی ڕاستی گرتووە ﴿وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾ کێش شارەزای هەقو ڕێی ڕاستە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ حِينَ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ مَنۡ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾[3] واتە: دواجار کە ئازار دەبینن دەزانن کی زیاتر لە ڕێگەی ڕاست لایداوە. وە دەفەرمووێت: ﴿سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ ٱلۡأَشِرُ﴾[4] واتە: بەو زووانە دەزانن کی درۆزنو خۆپەسەندە.

---

[1] الانعام (١٥٥ـ١٥٧).

[2] الانعام (١٠٩).

[3] الفرقان (٤٢).

[4] القمر (٢٦).

## تەفسیری سورەتی (الانبیاء) سەلامی خوایان لێ بێت

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

### ڕێزی سورەتی (الأنبیاء)

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدەوە، ئەمیش لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: سورەتی بەنو ئیسرائیل و (الکهف)و (مریم)و (طه)و (الانبیاء)، ئەمانە لە سورەتە دێرینە سەرەتاکانن وە ئەمانە لە دێرزەماندا بوون[1] .

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡۖ أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّي يَعۡلَمُ ٱلۡقَوۡلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلۡ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمِۭ بَلِ ٱفۡتَرَىٰهُ بَلۡ هُوَ شَاعِرٞ فَلۡيَأۡتِنَا بِـَٔايَةٖ كَمَآ أُرۡسِلَ ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ مَآ ءَامَنَتۡ قَبۡلَهُم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآۖ أَفَهُمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾﴾

### قیامەت زۆر نزیکە و خەڵکی لێی بێ ئاگان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ﴾ واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە بەڵام ئەوان لە بێ ئاگایی و غەفڵەتدا پشت تێکەرو ڕووەرگێڕن (لە ئاینی خوا)، ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکە لە لایەن خواوە لەسەر نزیکی هاتنی ڕۆژی قیامەت، کەچی خەڵکی زۆر لێی بێ ئاگان، واتە: کاری بۆ ناکەن و خۆیانی بۆ ئامادە ناکەن، نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ): ﴿فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ﴾ واتە: (لە دنیادا)[2]، وە خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ﴾[3] واتە: ئەوا فەرمانی خودا بە (سزادانیان) هات بۆیە پەلە مەکەن (لە هاتنی)، وە فەرموویەتی: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ﴾[4] واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوەو مانگ لەت بوو، وە

---

[1] فتح الباري (٢٨٩/٤).

[2] النسائي في الکبری (٤٠٧/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] النحل (١).

[4] القمر (١ـ٢).

ئەگەر بێباوەڕان موعجیزەیەك ببینن پشت هەڵدەكەنو دەڵێن ئەمە جادوویەكی بەردەوامە (و موحەممەد لێمان دەكات). پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەكات كە ئەوان گوێ بۆ ئەو نیگایە ناگرن كە خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەكەی، ئەم وتارە ڕوودەكاتە قورەیشو ئەوانەی وەك قورەیشیش وان لە خوانەناسانو دەفەرموێت: ﴿مَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّن رَّبِّهِم مُّحۡدَثٍ﴾ واتە: هەر شتێكی تازە بێتە خوارەوە لە لایەن خواوە، ﴿إِلَّا ٱسۡتَمَعُوهُ وَهُمۡ يَلۡعَبُونَ﴾ واتە: كاتێك كە گوێی لێ دەگرن دەیكەنە گاڵتەو گەپ، وەك ئیبنو عەبباس دەڵێت: چیتانە وا پرسیار لە ئەهلی كتێب دەكەن لەوەی كە لەبەر دەستاندایە بێگومان ئەوان كتێبەكانیان گۆڕیوەو دەستكاریان كردووەو لێیان زیادكردوەو لێشیان دەرهێناوە، ئەم كتێبەی ئێوە سوێند بە خوا تازەترین كتێبە كە دەیخوێننەوە تەمەنی نەكردووەو كۆن نەبووە، بوخاریش بەم شێوەیە ڕیوایەتی كردووە.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَاهِيَةٗ قُلُوبُهُمۡۗ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾ واتە: دڵەكانیان بێ ئاگایەو زۆر بە نهێنی چپەیان دەكرد ئەوانەی ستەمیان كردبوو ئەڵێن: ﴿هَلۡ هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ﴾ واتە: ئایا ئەمەیش بەشەرێك نیە وەك ئێوە، مەبەستیان پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، بە درۆیان دەزانی كە پێغەمبەر بێت، چونكە مرۆڤێكە وەك خۆیان، چۆن دەبێت ئەو بە تایبەتی لە نێوانیاندا نیگای بۆ بێت، بۆیە وتوویانە: ﴿أَفَتَأۡتُونَ ٱلسِّحۡرَ وَأَنتُمۡ تُبۡصِرُونَ﴾ واتە: ئاخۆ شوێن كەسێك دەكەون، ئێوەش وەك ئەو ببنە جادوگەر، خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە لەسەر ئەو درۆیەی هەڵیانبەستووەو دروستیان كردووە دەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّي يَعۡلَمُ ٱلۡقَوۡلَ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: (پێغەمبەر(ﷺ)) فەرمووی: ئەو خوایەی من هەر قسەیەك لە زەویو ئاسمانەكان بكرێت لێی ئاگادارە، هیچ شاراوەیەكی لێ ون نابێت، هەر ئەو خوایە كە ئەم قورئانەی ناردووە هەواڵی گشت پێشینەكانو پاشینەكانیشی تێدایە، كە هیچ كەسێك ناتوانێت بە وێنەی ئەم قورئانە بێنێت غەیری ئەو خوایەی كە ئاگاداری پەنهانیەكانە لە ئاسمانەكانو زەمیندا، ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ واتە: قسەكانتان باش دەبیستێت و دەزانێت چی دەكەن، ئەمە خۆی ترساندنو هەڕەشەیەكە لەوانە.

---

[1] فتح الباري (١٣/٥٠٥).

**قسەی خوانەناسان بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) داواکردنی نیشانەو موعجیزەو وەڵامدانەوەیان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ ﴾ واتە: ئەمە باس‌و هەواڵی سەرپێچی‌و بێدینی‌و ڕاڕایی خوانەناسانە لە بارەی قورئانەوە، سەرسامن لێی‌و سەریان لێ شێواوە، جارێ ئەڵێن جادووەو جارێ ئەڵێن شیعرەو جارێ ئەڵێن قسەیەو هەڵبەستراوەو جارێکی تریش ئەڵێن وڕێنەیەو خەونی درۆینەیە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴾[1] واتە: سەرنج بدە چۆن ئەوانە نموونەی جۆراوجۆرت بۆ دێننەوە، سەرەنجام گومڕابوون، ئیتر ناتوانن ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە، پاشان ئەو خوانەناسانە وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ﴾ واتە: دەباموعجیزەو نیشانەیەکمان بۆبێنێ وەك (ئەو موعجیزانەی) پێغەمبەرانی پێشووی پێ نێردرابوو، مەبەستیان وشترەکەی پێغەمبەر ساڵح و بەڵگەکانی موساو عیسا پێغەمبەرە (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْءَايَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ﴾[2] واتە: وە هیچ شتێك بەرگری ئێمەی نەکردووە کە ئەو موعجیزانە بنێرین جگە لەوەی کە پێشینەکان بە درۆیان دەزانی. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿مَآ ءَامَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: هەر نیشانەیەکمان ناردووە بۆ شارێك لەو شارانە کە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانەکراوە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەیاندا، بڕوایان پێ نەکردووەو ئێمەش لەبەر ئەوە قڕمان تێخستن، ئاخۆ ئەوانەیش باوەڕ دێنن بەو نیشانانە ئەگەر دوای ئەوانە چاویان پێی بکەوتایە؟ نەخێر، بەڵکو: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[3] واتە: بەڕاستی ئەوانەی دەرچووەو چەسپاوە بۆیان بڕیاری پەروەردگارت بڕوا ناهێنن، (بڕوا ناهێنن) هەرچەند بۆیان بێت هەموو بەڵگەو نیشانەیەك هەتا دەبینن (بە چاوی خۆیان) سزای سەختی ئازاردەر. ئەم خوانەناسانە زۆر نیشانەی دیارو ئاشکراو بەڵگەی بەهێزو ڕوونیان لەسەر دەستی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نیشان دراوە کە زۆر دیاترو ئاشکراترو بەهێزترو زاڵتر بووە، لەوەی کە بۆ پێغەمبەرەکانی تر نیشانیان داوە (سەلامی خوا لە هەموویان بێت).

---

[1] الاسراء (٤٨).

[2] الاسراء (٥٩).

[3] یونس (٩٦_٩٧).

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقۡنَٰهُمُ ٱلۡوَعۡدَ فَأَنجَيۡنَٰهُمۡ وَمَن نَّشَآءُ وَأَهۡلَكۡنَا ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٩﴾ ﴾

**پێغەمبەران هەموو مرۆڤ بوون**

خوای گەورە وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە بڕوا ناکەن پێغەمبەر لە مرۆڤ ڕەوانە بکرێت دەفەرمووێت: ﴿أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡ﴾ نەماننناردووە پێش تۆ (ئەی موحەممەد(ﷺ)) جگە لە پیاوانێك کە نیگاو سروشیان بۆ کردوون. واتە: هەموو ئەو پێغەمبەرانەی لە پێشەوە هاتوون مرۆڤ بوون، فریشتەیان لەناودا نەبووە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓ ﴾[1] واتە: وە ئێمەیش تۆ (پێغەمبەرمان) نەناردووە جگە لە پیاوانێك کە نیگامان بۆ دەکردن لە خەڵکی شارەکان. وە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾[2] واتە: بڵێ من یەکەم پێغەمبەر نیم (نێردراوم)، خوای گەورە باسی بەسەرهاتی گەلە پێشووەکان دەکات کە ئەوانیش بڕوایان نەبووە کە پێغەمبەران لە مرۆڤ بن، دەیانوت: ﴿أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا﴾[3] واتە: چۆن دەبێت ئادەمیەك لە خۆمان ڕێنموونیمان بکات. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: پرسیار بکەن زانایانی گەلە پێشووەکان وەك جوولەکەو گاورەکانو خەڵکانی تریش ئایا ئەو پێغەمبەرانەی کە هاتوون بۆیان مرۆڤ بوون یان فریشتە؟ ئەگەر ئێوە نازانن. بێگومان مرۆڤ بوون، ئەمەیش لە بەهرە مەزنەکانی خودایە بەرامبەر بەندەکانی کە پێغەمبەری ناردووە بۆیان لە خۆیان. کە دەتوانن ئەو پەیامەی بۆی هێناون بە باشی وەری بگرنو لێی تێبگەن، وە دەفەرمووێت: ﴿جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ﴾ واتە: لاشەیەکی وامان پێ نەدان خواردن نەخۆن، بەڵکو خواردنیان خواردووە وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي

---

[1] يوسف (١٠٩).

[2] الاحقاف (٩).

[3] التغابن (٦).

ٱلۡأَسۡوَاقِ﴾[1] واتە: ئێمە پێش تۆ هەر کام لە پێغەمبەرانمان ناردبێت بێگومان ئەوان خواردنیان خواردووەو بە بازاڕدا ڕۆیشتوون، واتە: مرۆڤ بوون وەك مرۆڤەکانی تر دەیانخواردو دەیانخواردەوە، دەچوونە ناو بازاڕەکان بۆ کاسپیو بازرگانی، ئەو کارانەیان هیچ زیانو شوورەییەکی تێدا نیە، وەك موشریکەکان واگومان دەبەنو ئەڵێن: ﴿مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ۝٧ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَا﴾[2] واتە: ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە خواردن دەخوات و بە بازاڕدا دەڕوات بۆچی فریشتەیەك نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ لای بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ترسێنەر بێت، یان گەنجینەیەکی (لە ئاسمانەوە) بۆ فڕێ بدرایە یا باغێکی ببوایە لێی بخواردایە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانُواْ خَٰلِدِينَ﴾ واتە: تاهەتایە نەماونەتەوە لە دنیادا، بەڵکوژیاونو پاشان مردوون، ﴿وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَ﴾[3] واتە: هیچ مرۆڤێکمان وا نەهێناوە لە پێش تۆوە هەر بمێنێتو نەمرێت، هەڵبژاردەکانیش لەو مرۆڤانە کە نیگایان بۆ هاتووە لە لای خواوە فریشتە هاتوونەتە لایان ئەو شتانەیان فێرکردوون کە فەرمانڕەوایی پێ بکەن لە نێوان خەڵکیدا چاکە بکەنو دوورکەونەوە لە خراپەکاری، ﴿ثُمَّ صَدَقۡنَٰهُمُ ٱلۡوَعۡدَ﴾ واتە: پاشان ئەو بەڵێنانەی کە پێی دابوون کە ستەمکاران لەناوبەرێت بۆی جێبەجێ کردن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُمۡ وَمَن نَّشَآءُ﴾ واتە: ئەوانیشو هەر کەسیش ویستمان ڕزگارمان کردن، ﴿وَأَهۡلَكۡنَا ٱلۡمُسۡرِفِينَ﴾ واتە: ئەوانەشی کە زیادەڕەویان کردو بڕوایان بەو پەیمانانە نەکرد کە پێغەمبەران بۆیان هێنان قڕتێخستن.

﴿لَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا فِيهِ ذِكۡرُكُمۡۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ۝١٠ وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ وَأَنشَأۡنَا بَعۡدَهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ۝١١ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأۡسَنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَرۡكُضُونَ ۝١٢ لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡـَٔلُونَ ۝١٣ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ۝١٤ فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ۝١٥﴾

**ڕێزی قورئان**

---

[1] الفرقان (٢٠).

[2] الفرقان (٧ـ٨).

[3] الانبیاء (٣٤).

خوای گەورە باسی ڕێزو قەدری قورئان دەکاتو ئاگاداریان دەکات کە چاك ڕێزی لێ بگرنو بە گەورە سەیری بکەن دەفەرموویت: ﴿لَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ كِتَٰبٗا فِيهِ ذِكۡرُكُمۡ﴾ واتە: سوێند بە خوا ناردوومانەتە خوارەوە کتێبێك بۆئێوەکە سەربەرزیو ناوبانگی ئێوەی تێدایە، ئیبنو عەباس دەڵێت: واتە: باسی ڕێزی ئێوەشی تێدایە.[1] ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ واتە: دەی ئایا بۆ بیر ناکەنەوە. واتە: تا کەی لەو بەهرەیە حاڵی نابنو بە چاکی وەری ناگرنو پێشوازی لێ ناکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ﴾[2] واتە: وە بێگومان ئەم قورئانە هۆی ناوداریە بۆ خۆتو گەلەکەت لە داهاتووشدا پرسیارتان لێ دەکرێت.

## چۆن خودا ناهەقیکارانی فڕتێخست

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ﴾ واتە: چەند شارمان کاول کرد کە خەڵکەکەی ستەمکار بوون، ئەم وتەی ﴿وَكَمۡ﴾ە بۆ زۆرینە بەکاردێت. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموویت: ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِنۢ بَعۡدِ نُوحٖ﴾[3] واتە: وە زۆر (گەلو میللەت)مان لەناو برد لە چەرخەکانی پاش نوح، وە دەفەرموویت: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾[4] واتە: ئینجا چەندەها شارو دێهاتمان وێران کرد کە (خەڵکەکەی) ستەمکار بوون ئەو (شارانە دیواری خانووەکانی) کەوتبوون بەسەر بانەکانیاندا، پاشان دەفەرموویت: ﴿وَأَنشَأۡنَا بَعۡدَهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ﴾ واتە: لە دوای ئەوان گەلانی ترمان لە جێیان دانا. پاشان دەفەرموویت: ﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأۡسَنَآ﴾ واتە: گومانیان نەما کە سزایان بۆ دابەزیووەو چار نیە، وەك پێغەمبەرەکەیان بەڵێنی پێداون، ﴿إِذَا هُم مِّنۡهَا يَرۡكُضُونَ﴾ واتە: بە پەلە لەو شارانە ڕایان دەکردو لێی دەردەچوون، ﴿لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمۡ﴾ واتە: ڕامەکەنو بگەڕێنەوە، ئەمەیان بۆ سوکایەتی پێکردنو کەم سەیرکردنیان پێدەوترێت، واتە: ڕامەکەنو بۆی دەرچن لەو سزایەی بۆتان دێت، بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان بۆ ڕابواردنو کەیفکردنو ئەو ژیانە نەخۆشەی کە تیایدا بوون، قەتادە

---

[1] الطبري (٢١/٦١١).

[2] الزخرف (٤٤).

[3] الاسراء (١٧).

[4] الحج (٤٥).

دەڵێت: بۆ سوکایەتی پێکردنیان پێیان ئەمەیان پێ ئەڵێن. وە پاشان دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّكُمْ تُسْـَٔلُونَ﴾ واتە: بەڵکو پرسیارتان لێ بکرێت لەسەر ئەو شوکرانەبژێریەی کردووتانە لەسەر ئەو بەهرانەی خوا پێی بەخشین، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ واتە: دەڵێن: ڕەنجەڕۆ خۆین ئێمە ستەمکار بووین، وەختێك داندەنێن بە تاوانەکانیاندا کە هیچ سوودێکی نیە بۆیان، ﴿فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ﴾ واتە: بەردەوام ئەم قسەیە دووبارە دەکەنەوەو دان بە تاوانەکانیاندا دەنێن، هەتا بە تەواوی دەریان دەکەینو دایاندەمرکێنینەوەو لە جوڵەیان دەخەینو سرتەیان لێ دەبڕین.

﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلۡ نَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَى ٱلۡبَٰطِلِ فَيَدۡمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٞۚ وَلَكُمُ ٱلۡوَيۡلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَنۡ عِندَهُۥ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَلَا يَسۡتَحۡسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ لَا يَفۡتُرُونَ ﴿٢٠﴾﴾

**وەدیهێنانی بوونەوەر بە دادو کارزانی خودا خۆی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ واتە: ئێمە دروستمان نەکردووە ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لە نێوانیاندایە بە گاڵتەو بێ هودە. خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە لە ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیشی لەناویاندایە بە هەقو ڕاستیو دادوەری دروست کردووە. ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى﴾[1] واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە بە پێی کردەوەکانیانو پاداشتی ئەوانەش بداتەوە کە چاکەیان کردووە بە چاکەتر (لەوەی کردویانە)، ﴿وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا بَٰطِلٗاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[2] واتە: ئێمە ئاسمانو زەویو ئەوەی لە نێوانیاندایە بەبێ هودە دروستمان نەکردووە ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە بێ باوەڕبوون سا هاوار بۆ ئەوانەی کە بێباوەڕبوون لە ئاگری دۆزەخ. وە دەفەرموێت: ﴿لَوۡ أَرَدۡنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهۡوٗا لَّٱتَّخَذۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ﴾ واتە: ئەگەر بمانویستایە سەرقاڵی بۆ خۆمان هەڵبژێرین (وەك هاوسەرو منداڵ) لە لایەن خۆمانەوە هەڵماندەبژارد. ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت لە موجاهیدەوە

[1] النجم (٣١).

[2] ص (٢٧).

﴿ لَوْ أَرَدْنَآ أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَٰهُ مِن لَّدُنَّآ ﴾ واتە:ئەگەر بمانویستایە گەمەو گاڵتە بکەین هەر لە لای خۆمانەوە دەمانکرد، نە بەهەشتو نە جەهەنەمیشمان دروست نەدەکردو کەسیشمان نەدەمراندو زیندوومان نەدەکردەوەو لێشمان نەدەپرسیەوە.[1] قەتادەو سودیو ئیبراهیمی نەخەعیو موغیرەی کوڕی میقسەم دەڵێن: ﴿إِن كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ واتە: (ما كنا فاعلين) واتە: ئەگەر بمانویستایە دەمانکرد، بەڵام نەمانکرد.[2] موجاهید دەڵێت: هەر شتێك لە قورئاندا بە (إن) بێت، ئەوە بۆنکولیکردنە لەوشتە.[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَٰطِلِ﴾ واتە: ڕاستی ڕوون دەکەینەوەو پروپووچ لەناو دەچێت. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾ واتە: بە هۆیەوە (بەتاڵ) مێشکی دەپژێو تێکدەشکێت ئینجا دەستبەجێ بەتاڵ دەفەوتێتو لەناو دەچێت. واتە دەڕواتو نامێنێتو دەتوێتەوە. ﴿وَلَكُمُ الْوَيْلُ﴾ واتە: هاوارو واوەیلا بۆ ئەو کەسانەی دەڵێن خودا کوڕی هەیە، ﴿مِمَّا تَصِفُونَ﴾ واتە: ئەو درۆیە هەڵدەبەستنو دەیڵێن، پاشان خوای گەورە باسی بەندایەتی فریشتەکان دەکات بۆ خۆی کە چۆن بە شەوو بە ڕۆژ بەردەوام لە عیبادەتدان.

### هەموو شتێك موڵکی خودایەو بەندەی ئەوە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَهُۥ مَن فِى السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُۥ﴾ واتە: ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەمینەو فریشتەکانیش هەموو تەنها بۆ خودایە ﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ﴾ واتە: خۆ بە زل نازانن لە پەرستنی خودادا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ الْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا الْمَلَٰٓئِكَةُ الْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴾[4] واتە: هەرگیز مەسیح لاری نیەو ناڕازی نیە لەوەی بەندەی خوا بێت هەروەها فریشتەنزیکەکانیشو هەر کەس بە بەندایەتی خوا ڕازی نەبێتو خۆی بە گەورە دابنێت ئەوە لە داهاتوودا هەموویان کۆدەکاتەوە لای خۆی. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ﴾ واتە: ماندوو نابنو تەمەڵی ناکەن، پاشان دەفەرموێت: ﴿ يُسَبِّحُونَ الَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴾ واتە: شەوو ڕۆژ

---

[1] الطبري (١٨/٤٢٠).

[2] الطبري (٢١/٦١١).

[3] الدر المنثور (٥/٦٢٠).

[4] النساء (١٧٢).

تەسبیحاتو ستایشی دەکەن ماندوو نابنو سارد نابنەوە. واتە: بەردەوام هەمیشە لە کارکرداندانو بە دڵسۆزیەوە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودانو بە چاکی بەجێی دێنن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[1] واتە: خودا چۆن فەرمانیان پێ بدات، لە فەرمانی دەرناچنو هەرچیان پێ بسپێرێت بەجێی دێنن.

﴿أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾﴾

**وەڵامدانەوە لەسەر ئەو خوا درۆزنانەی بتپەرستان دەیانپەرستن**

خوای گەورە ڕازی نیە هیچ کەسێك جگە لەو خوداگەلێکی تر بکاتە خودای خۆی بیانپەرستێت: ﴿أَمِ اتَّخَذُوا آلِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ﴾ واتە: ئایا ئەو خودایانە مردوو زیندوو دەکەنەوەو لە زەوی دەریاندەهێننە دەرەوە، واتە: ئەوانە هیچ شتێکی وا ناتوانن بکەن کەواتە چۆن کردوویانن بە شەریکی خواو لەگەڵ خوادا دەیانپەرستن،؟ پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات ئەگەر جگە لە خودا، خودایەکی تر هەبێت، ئاسمانەکانو زەمین تێك دەچێتو نامێنێت، وەك دەفەرمووێت: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ﴾ واتە:ئەگەر لە ئاسمانەکانو زەمیندا جگە لە خودا، خودایەکی تر بوایە، ﴿لَفَسَدَتَا﴾ واتە: بێگومان هەردوویان تێکدەچوون. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾[2] واتە: خودا هیچ رۆڵەیەکی بۆ خۆی بڕیار نەداوە هیچ پەرستراوێکی تری لەگەڵدا نەبووە (ئەگەر پەرستراوی تری لەگەڵ بووایە) ئەو کاتە هەر پەرستراوێك چی دروست کردووە (بۆ خۆی) دەیبردو هەندێکیان زاڵ دەبوون بەسەر هەندێکی تریاندا خوا پاكو بێگەردە لەوەی ئەوان دەیڵێن. وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە: خوای گەورە زۆر پاكو بێ عەیبە لەو قسانە ئەوانە هەڵی دەبەستنو ئەڵێن: خودا کوڕو شەریکی هەیە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ﴾ واتە: ئەو کاربەدەستێکی وایە هیچ کەسێك ناتوانێت دەست وەکاری بداتو خۆی تێ هەڵقورتێنێت، وە هیچ کەس ناتوانێت لەمپەر بێت لە ڕێیدا لەبەر مەزنیو

[1] التحریم (٦).

[2] المؤمنون (٩١).

بێباکیو زانیاریو کارزانیو دادپەروەریو بەسۆزی خودا، ﴿وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ﴾ واتە: هەر خودایە دەپرسێتەوە لە دروستکراوەکانی لەوەی کە دەیکەن، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾[1] واتە: جا سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین، لەوەی کە دەیانکرد (لە دنیادا)، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ﴾[2] واتە: وە پەنای (هەموو لایەك) دەداتو کەس لەو پەنا نادرێت.

﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡۖ هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِيۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٢٤﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ قُلۡ﴾ واتە: ئایا ئەوانە جگە لە خوا چەند خودایەکی تریان بۆ خۆیان داناوە؟ ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: ﴿هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ﴾ واتە: بەڵگەی خۆتان بێنن لەسەر ئەو قسەیەی دەیکەن. ﴿هَٰذَا ذِكۡرُ مَن مَّعِيَ﴾ واتە: ئەم قورئانە هاتووە بۆ ئەوانەی لەگەڵ منن، ﴿وَذِكۡرُ مَن قَبۡلِي﴾ واتە: وە قسەی ئەو (پەیامانەیە) لە پێش منەوە هاتوون. واتە: کتێبە پێشووەکانیش بە پێچەوانەی ئەو قسانەن کە ئێوە ئێژنیو وا دەزانن، ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٱلۡحَقَّۖ فَهُم مُّعۡرِضُونَ﴾ واتە: ئەی خوانەناسان ئێوە ڕاستی نازانن و پشتی تێدەکەن و خۆتانی لێ دەبوێرن، هەموو کتێبێك کە هاتووەتە خوارەوە بۆ هەر پێغەمبەرێك کە ڕەوانە کراوە تیایدا هاتووە کە غەیری خودا هیچ خودایەتی تر نیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾ واتە: وە ئێمە نەماننناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە کەواتە تەنها من بپەرستن. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ﴾[3] واتە: تۆ پرسیار بکە لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردومانن ئایا بێجگە لە

---

[1] الحجر (٩٢_٩٣).

[2] المؤمنون (٨٨).

[3] الزخرف (٤٥).

خوای میهرەبان بڕیارمان داوە پەرستراوێك بپەرسترێت، وە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾[1] واتە: هەموو پێغەمبەرێك كە خودای گەورە ڕەوانەی كردووە بانگی خەڵكی كردووە بۆ عیبادەتی خودا بە تەنهاو داوای كردووە لێیان شەریكی بۆ دانەنێن، سروشتی مرۆڤ خۆی شایەتە لەسەر ئەوە، موشریكەكان هیچ بەڵگەیەكیان بە دەستەوە نیە، بەڵگەكانیان بەتاڵو پڕوپوچە لای پەروەردگاریان، خوای گەورە لێیان توورەیەو جەزرەبەی زۆر توندیش دەدرێن.

﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَانَهُ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ (٢٦) لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ (٢٧) يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ (٢٨) وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ (٢٩) ﴾

**وەڵامدانەوەی ئەو كەسانەی وا دەزانن كە فریشتەكان كیژی خودان و باسی كارەكانیان پلەیان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴾ واتە: (وە بێباوەڕان) وتیان خوای میهرەبان منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە (كە فریشتەكانن)، خوای گەورە وەڵامی ئەو كەسانە دەداتەوە كە ئەڵێن خودا منداڵی هەیەو ئەومنداڵش لە فریشتەكان، وەك هەندێك لە عەرەبەكان وایاندەزانی كە: فریشتەكان كیژی خودان، خوای گەورە وەڵامی دانەوەو فەرمووی: ﴿بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴾ واتە: ئەو فریشتانە بەندەی ڕێزلێگیراون لە لای خوداو پلەوپایەو شوێنی بەرێزیان بۆ دانراوە، ئەوانیش بە زۆری بێ وچان بە گفتارو بەكردار هەر خەریكی خواپەرستین، ﴿لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴾ واتە: لە قسەی خوا پێش ناكەونو لە هیچ شتێكداو ئەو فەرمانانەی دەیدات بەسەریاندا هەرگیز سەرپێچی لێ ناكەن، بەڵكو زۆر بە پەلە جێبەجێی دەكەن، ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾ واتە: خوا ئاگادارە بە ئەوەی كە دنیا لەبەر دەستیاندایەو بە ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادە كراوە. واتە: ئاگادارە بەوەی كردوویانەو ئێستاش دەیكەن، چونكە زانیاری خودا دەوری داونو هیچ شتێكی شاراوەی لێ ون نابێت، ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ ﴾ واتە: هەر كەسێك ئەو ڕازی نەبێت ناتوانن تكای بۆ بكەن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە كە دەفەرمووێت: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ

---

[1] النحل (٣٦).

إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾[1] واتە: کێیە ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا بتوانێت تکای لە لا بکات مەگەر بە ڕێپێدانی خۆی. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾[2] واتە: وە تکاکردن لای خوا سوودی نیە مەگەر بۆ کەسێك ئەو (خوا) ڕێگە بدات، ئایەت لەم بارەوە ئێجگار زۆرە. ﴿وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ﴾ واتە: فریشتەکان لەترسی خوا دەلەرزن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ﴾ واتە: هەر کەسێك بێژێت من خودایەکم غەیری خودا، واتە: لەگەڵ خوادا، ﴿فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: هەر کەسێك وا بێژێتو ئەو قسەیە بکات، سزای ئەو کەسە جەهەنەمە، تۆڵەیش لە ناهەقیکار دەسێنین بەو شێوەیە. ئەمە خۆی مەرجە (شەرتە)، مەرجیش پێویست ناکات ڕووبدات، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ﴾[3] واتە: ئەگەر خودا فەرزندەی بێت، من یەکەمین کەسێکم کە دەیپەرستم، ئەمە مەرجەو هەرگیز ڕوونادات، وە دەفەرمووێت: ﴿لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾[4] واتە: ئێمە بە تۆمان ڕاگەیاندووە ئەی موحەممەد- (ﷺ) ئەگەر شەریك بۆ خودا دابنێن بێگومان بە کارەکەت لێ پوچەڵ دەبێت، ئەم مەرجەیش هەرگیز نایەتەدی.

﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَّعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾﴾

**نیشانەکانی خودا لە ئاسمانو زەویو شەوو ڕۆژدا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: ئایا ئەوانەی بێباوەڕبوون نەیاندی و نەیانزانیوە کە ئاسمانەکانو زەوی هەردووکیان پێکەوە لکابوونو یەك پارچە بوون ئینجا لە یەکترمان جیاکردنەوەو

---

[1] البقرة (٢٥٥).
[2] سبأ (٢٣).
[3] الزخرف (٨١).
[4] الزمر (٦٥).

فەرامەممان هێنا لە ئاو هەموو شتێکی زیندوو، دەی ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن؟ خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لە تواناو دەسەڵاتی تەواوو مەزنی خۆی لە دروستکردنی گشت شتەکانداو زاڵی بەسەر هەموویداو دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ واتە: ئاخۆ خوانەناسان ئەوانەی کەبڕوایان بە دەسەڵاتی تەواوی خودا نیەو کەسی تر لەگەڵیدا ئەپەرستن، ئایا نازانن کە خودا خۆی بە تەنها هەموو شتێکی وەدیهێناوەو بە کارەکانیدا دەگات، چۆن شایەنی ئەوەیە کەسی تری لەگەڵدا بپەرستی یان کەسی تر بکەی بە شەریکی، ئایا ئەوانە نابینن کە ئاسمانەکانو زەمین یەك پارچە بوونو واتە: بەسەر یەکەوە بوونو تۆکمەو پتەوبوون و چووبوون بەیەکدا، لە سەرەتای دروستبوونیانەوە، پاشان ئەمیانی لەئەویان جیاکردەوەو ئاسمانەکان بوونە حەوت ئاسمانو زەمینیش بووە حەوت زەمینو بە هەوا ئەمیانی لەئەویان جیاکردەوە، ئاسمان بارانی لێ باریو زەویش ڕوەکی تیاڕوا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ﴾یانی: ئەوانە بە چاوی خۆیان دروستکراوەکان ئەبینن کە کەم کەم دێنە بەرهەم وهەموو ئەمانەش بەڵگەی ئاشکران لەسەر بوونی وەدیهێنەرێکی بە توانای خاوەن دەسەڵات کە مەیلی هەر شتێکی ببێت دەیکات، وەك ئەم شاعیرە دەڵێت:

فَفي كُلِّ شيءٍ لَهُ آيةٌ      تَدُلُّ عَلَى أنَّهُ واحِدُ

سوفیانی سەوری لە باوکیەوە لە عیکریمەوە دەڵێت: پرسیار کرا لە ئیبنو عەبباس، ئایا شەو لە پێشەوە بووە یان ڕۆژ؟ وتی: ئایا بینیوتانە کاتێك ئاسمانەکانو زەمین یەکپارچە بوون، ئاخۆ جگە لە تاریکستانی هیچی تر لە نێوانیاندا هەبووە؟ بەوەدا بزانن کە شەو لە پێش ڕۆژەوە بووە.[1] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە کە پیاوێك هات پرسیاری لە بارەی ئاسمانەکانو زەمینەوە لێکرد، ئایا یەکپارچە بوون خوای گەورە جیای کردنەوە، ئیبنو عومەر وتی: برۆ بۆ لای ئەو مامۆستایە لێی بپرسە، دوایی بێو هەواڵم بدەرێ کە چی وتووە. وتی: ڕۆیشت بۆ لای ئیبنو عەبباس پرسیاری لێکرد، ئیبنو عەبباس وتی: بەڵێ، ئاسمانەکان یەك پارچە بوونو بارانیان نەدەباراند، زەمینیش یەك پارچە بوو ڕووەکی لێ نەدەڕوا، کاتێك خودا خەڵکێکی دروست کرد بۆ ئەم زەمینە، ئاسمانی والێکرد باران ببارێنێتو زەمینیشی چاكو بە پیت کرد کە ڕووەك بڕوێنێت، پیاوەکە گەڕایەوە بۆ لای ئیبنو عومەرو هەواڵەکەی دایە، ئیبنو عومەر وتی: ئێستا تێگەیشتم کە ئیبنو عەبباس زانیاری فێرکراوە لە بارەی قورئانەوە ڕاستی وتووە هەر بەو شێوەیە بووە،ئیبنو عومەر وتی: ئەوسا دەموت: ئەو چاو قایمییەی ئیبنو عەباسم بە لاوە چاك نیە لە بارەی تەفسیری قورئانەوە هەیەتی، ئێستا بۆم

---

[1] الطبري (١٨/٤٣٣).

دەرکەوت کە ئەو زانیاری قورئانیی پێدراوە.[1] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ئاسمان‌و زەمین بە یەکەوە (لکابوون) کاتێك ئاسمان بەرزبووەوەو زەوی لێ جیابووەوەو ئەوە ئەو لێکهەڵوەشاندنەوە بوو کە خوای گەورە باسی کردووە لە قورئاندا، حەسەن‌و قەتادە دەڵێن: هەموو بەیەکەوە بوون، بەم هەوایە لەیەکی جیاکردنەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ واتە: هەرچی گیانەوەریش هەیە لە ئاو بەرهەممان هێناوە، کەواتە سەرچاوەی گشت گیانەوەران لە ئاوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من کاتێك کە تۆ ئەبینم دڵم خۆش ئەبێت و چاوم ڕوون ئەبێتەوە، بۆیە باسی هەموو شتێکم بۆ بکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەموو شتێك لە ئاو وەدی هاتووە) دەڵێت: وتم: شتێکم فێر بکە کارم پێکرد بچمە بەهەشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( سڵاو بکەو خواردن بدە بە خەڵکی، پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنەو بە شەو هەڵسە کاتێك کە خەڵکی خەوتوون، پاشان بەبێ ترس بڕۆ بۆ بەهەشت).[2] ئەمە ئیسنادێکە لەسەر مەرجی هەردوو سەحیحەکە، جگە لەوە نەبێت کە ئەبو مەیمونە لەڕاویەکانی لای (سنن )ەو ناویشی (سولەیم)ە، تیرمزیش حەدیسی بۆ ڕاست دەکاتەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾ واتە: ئەو کێوانەشمان داکوتاوە بەناو زەویدا بۆ ئەوەی ڕایوەستێنێت‌و قورسی بکات‌و نەلەرزێت بەو خەڵکەوە لەسەریەتی، واتە: بجوڵێت‌و بەملاولادا بڕوات‌و نەوەستێ‌و بۆ ئەوە نەشێ خەڵکی لەسەری بژین، چونکە هەمووی نوقم بووە لەناو ئاودا چواریەکێکی نەبێت، خوای گەورە هەواو خۆری وەدیهێنا هەتا ئەو خەڵکە ئاسمان‌و ئەوەی تیایەتی ببینێت کە چەند نیشانەی گەورەو بەڵگەی ڕوون‌و ئاشکرای تێدایە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾ واتە: نەوەکا بیانلەرزێنێت‌و لەگەڵ خۆی بیانبات، ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا﴾ واتە: وەچەند دەروازەو ڕێمان تێدا کردووەتەوە بۆ ئەوەی پێیدا بڕۆن لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر، وەك خۆتان دەیبینن کە ئەو کەژو کێوانە چۆن بونەتە ڕێگر لە نێوان ئەم وڵات‌و ئەو وڵاتدا، خوای گەورە ڕێگای تێدا هێشتووەتەوە بۆ ئەوەی خەڵکی پێیدا بڕۆن لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ واتە: بەڵکو شارەزابن. وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾ واتە: ئاسمانیشمان وەك سەربانێك (گومەزیەك) لێکردووە بەسەر زەمینەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا

---

[1] ابن أبي حاتم (٨/٢٤٥٠).

[2] أحمد (٢/٢٩٥/٣٢٣/٣٢٤)، فەرموودەیەکی لاوازە.

لَمُوسِعُونَ﴾[1] واتە: وە ئاسمان بە دەستی خۆمان دروستمان کردووە، وە ئێمە فراوانکەری (ئاسمانین)، وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا﴾[2] واتە: وە سوێند بە ئاسمانو بەوەی دروستی کردووە، وە فەرموویەتی: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾[3] واتە: دەی ئایا سەرنجی ئەو ئاسمانەیان نەداوە کە لەسەریانەوەیە چۆن دروستمان کردووەو ڕازاندوومانەتەوەو هیچ درزو کەلێنێکی تێدا نیە. مەبەست لە بینا دانانی گومەزیە وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئیسلام لەسەر پێنج (پایە) دانراوە).[4] واتە: پێنج پایە، ئەمەیش لە چادرا نەبێ نابێت، وەك باوە لای عەرەبەکان. ﴿مَّحْفُوظًا﴾ واتە: بەرزو پارێزراوە لەوەی کە دەستی وەردرێت، موجاهد دەڵێت: گومەزیەکی بەرزکراوەیە.[5] ﴿وَهُمْ عَنْ ءَايَٰتِهَا مُعْرِضُونَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانە سەبارەت بە ئایەتەکانی ئاسمان پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕ بوون. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾[6] واتە: وە زۆر بەڵگەو نیشانە هەیە لە ئاسمانەکانو زەمیندا بە لایاندا دەڕۆن بەڵام ئەوان ڕوویان لێ وەردەگێڕن. واتە: بیرناکەنەوە لەوشتانەی کە خودا تێیدا دروست کردووە لەو هەموو فراوانیو بەرزیە مەزنو بێ وێنەیە کە ڕازێنراوەتەوە بەو هەموو ئەستێرە گەڕۆكو وەستاوانە لە شەوو ڕۆژدا، وە ئەو خۆرەی کە لە ماوەی شەوو ڕۆژێکدا ئەو شوێنەی خۆی دەبڕێت کە بۆی دیاریکراوە، بە شێوەیەك کە هەر خودا خۆی دەزانێت چۆنە، ڕامی هێناوەو دەڕوات، پاشان خوای گەورە لە هەندێ نیشانەی خۆی ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ واتە: هەر ئەو خودایە کە شەوو ڕۆژی دروست کردووە، شەو بە تاریکیو بێدەنگیو ڕۆژیش بە ڕووناکیو قەرەباڵغیو جارێ شەو درێژەو جارێ کورتەو بە پێچەوانەشەوە، ﴿وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ واتە: خۆرو مانگیش، ئەوە خۆر کە ڕووناکیەکی تایبەتی خۆی هەیەو لە شوێنی دیاریکراوی خۆیدایەو کاتو جوڵانو ڕۆیشتنی تایبەتی خۆی هەیە،

---

[1] الذاريات (٤٧).

[2] الشمس (٥).

[3] ق (٦).

[4] فتح الباري (١/٦٤).

[5] الطبري (١٨/٤٣٦).

[6] يوسف (١٠٥).

ئەوە مانگیش بە هەمان شێوە ڕووناکیو شوێنو جموجۆڵو کاتی تایبەتی خۆی هەیە، ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ واتە: لە شوێنی خۆیاندا دەسوڕێنەوە. ئیبنو عەبباس دەڵێت: دەسوڕێنەوە وەك چۆن تەشی دەسوڕێتەوە لە شوێنی خۆیدا.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَالِقُ الْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَنًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾[2] واتە:(خوا) بەدیهێنەری شەبەق و ڕووناکی ڕۆژبوونەوەیەو شەوی کردووە بە کاتو هۆی ئارامگرتنو خۆرو مانگی کردووەتە هۆی حساب دیاریکردنو زانینی کات ئەوەش ئەندازەگرتنی خوای بە دەسەڵاتی زانایە.

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾﴾

## هیچ کەسێك نیە بمێنێتو نەمرێت لە دنیادا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ﴾ واتە: ئەی موحەممەد وامان نەکردووە لە دنیادا هیچ مرۆیەك هەبێتو نەمرێت، بەڵکو دەبێت هەموو بمرن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾[3] واتە: هەرچی کەس لەسەر زەویدایە نامێنێتو تیادەچێت، وە هەر پەروەردگارت دەمێنێت کە خاوەن شکۆی ڕێزدارە. وە دەفەرموێت: ﴿أَفَإِن مِّتَّ﴾ واتە: چۆن ئەگەر تۆ بمری ئەی موحەممەد ﴿فَهُمُ الْخَالِدُونَ﴾ واتە: ئەوان بە هیوای ژیان بن شتی وا هەرگیز نابێت، بەڵکو دەبێت هەموو لەناو بچێت بمرێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ واتە: هەموو کەسێك مردن دەچێژێتو دەمرێت، ڕیوایەت کراوە لە شافیعیەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم دوو دێرە شیعرەی بە ئاوازەوە دەوت:

| | |
|---|---|
| تمنى رجال أن أموتَ، وإن أمُتْ | فتلكَ سبيل لستُ فيها بأوحَد |
| فقل للّذي يبغي خلاف الذي مضى | تَـهَيّـَا لأخـرى مِثلِهـا فـكأن قَد |

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ واتە: جارێ بە کارەساتی ناڕەحەت تاقیتان دەکەینەوە جارێکی تر بە خێروبێری زۆر، تا سەیر بکەین بزانین کێ شوکرانەبژێرەو

[1] الطبري (٢٠/٥٢٠/٥٢١).

[2] الانعام (٩٦).

[3] الرحمن (٢٦ـ٢٧).

کێش سپڵەو بەدنمەکە، وە کێ خۆڕاگرەو کێش بێهیوایە. وەك عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿وَنَبْلُوكُم﴾ واتە: تاقیتان دەکەینەوە، ﴿بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً﴾ واتە: بە خۆشیو ناخۆشی، بە لەش ساغیو نەخۆشی، بە دەوڵەمەندیو هەژاری، بە حەڵاڵو حەرام، بە گوێڕایەڵیو گوناه، بە شارەزاییو گومڕایی ﴿وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾ واتە: پاشان دەگەڕێنەوە بۆمان لەسەر کردارەکانتان پاداشتان دەدەینەوە.[1]

﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ سَأُو۟رِيكُمْ ءَايَـٰتِى فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ ﴿٣٧﴾﴾

**گاڵتەجاڕی بتپەرستان بە پێغەمبەر (ﷺ)**

خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ): ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ واتە: هەر کاتێك کە خوانەناسان تۆ دەبینن وەك ئەبو جەهلو هاوشێوەکانی ﴿إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾ واتە: گاڵتەت پێ دەکەنو بە سووکی ناوت دەبەن وئەڵێن: ﴿أَهَـٰذَا ٱلَّذِى يَذْكُرُ ءَالِهَتَكُمْ﴾ واتە: ئایا ئەمەیە قسە دەڵێت بە خواکانتانو بەبێ ئاوەز سەیریان دەکات. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُم بِذِكْرِ ٱلرَّحْمَـٰنِ هُمْ كَـٰفِرُونَ﴾ واتە: ئەوانە خۆیان خوانەناسن لە کاتێکدا خۆیان بە باسی خوای میهرەبان بێباوەڕان. کەچی ئەوەندە نەفامن گاڵتە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَـٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾[2] واتە: وە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) کاتێك تۆ ببینن بەس گاڵتەت پێ دەکەنو (دەڵێن) ئا ئەمەیە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر، (وە دەڵێن) نزیك بوو لە پەرستراوەکانمان لامان بدات ئەگەر لەسەر (پەرستنی)یان خۆگرنەبووینایە، لە داهاتوودا دەزانن کاتێك سزای خوا دەبینن کێ (گومڕاترە)و ڕێگای ونکردووە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَـٰنُ مِنْ عَجَلٍ﴾ واتە: خەڵکی لە پەلە دروست بووە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ

---

[1] الطبري (١٨/٤٤٠).

[2] الفرقان (٤١-٤٢).

عَجُولًا﴾[1] واتە: وە ئادەمی هەمیشە پەلەکەرە. واتـە: مرۆڤـەکان هـەر پەلـەن لـە ئیش‌و کارەکانیانـدا، حیکمەت لە باسی پەلـەکردنی مـرۆڤ لێرەدا لەبـەر ئەوەیـە کاتێك کـە باسـی گاڵتەچیەکان دەکرێت، یەکسەر بە پەلە چاوەڕوانی تۆڵەسەندن دەکرێت لەوانە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿خُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ مِنْ عَجَلٍ﴾ خوای گەورە مۆڵـەتی ناهـەقیکار دەدات هـەتا کاتێك کـە گرتـی هـەرگیز ڕزگاری نابێت، خـوا مۆڵـەت دەدات پـاش ئـەو مۆڵەتـە بـە پەلـە ئـەو ستەمکارە دەگرێـت‌و تۆڵـەی لێ دەسـێنێت، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿سَأُوْرِيكُمْ ءَايَٰتِي﴾ واتە: بەو زووانـە زۆر زوو بڕیـارو دەسـەڵات‌و تۆڵـەی خۆمتـان نیـشان دەدەم بەرامبەر ئەو خوانەناسانەی کە سەرپێچیم دەکەن ﴿فَلَا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ واتە: پەلەم لێ مەکـەن‌و خۆڕاگرن.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلْ تَأْتِيهِم بَغْتَةً فَتَبْهَتُهُمْ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾﴾

### پەلەکردنی موشریکەکان بۆ هاتنی سزا

خوای گەورە باسی موشریکەکان دەکات کە داوای سزا دەکەن بۆیان بێت، چونکە لە لایان درۆیـە و نکوڵی لێدەکەن‌و بڕوایـان پێـی نیـەو بـە دووری دەزانـن شـتی وا ڕوودەدات، بۆیـە ئـەڵێن: ئەگـەر ڕاسـت دەکەی، با ئـەو سـزایەمان بـۆ بێـت، وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ واتە: وە (بتپەرستان بە گاڵتەوە) دەڵێن ئەم بەڵێنی (تۆڵەیـە)کـەی دێت ئەگـەر ئێـوە ڕاسـتگۆن. خـودای مـەزنیش دەفـەرمووێت: ﴿لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ﴾ واتە: ئەگەر ئەوانە بێگومـان بوونایـە لـەوەی کـە ئـەو سزایان بـۆ دێت‌و هەر ڕوودەدات، ئەوەندە پەلە داوایـان نـەدەکرد، وە ئەگـەر دەیـانزانی کاتێـك ئـەو ئـاگرە دایـان دەپۆشێت لە هەموو لایەکەوە لەسەریانەوەو لە ژێر پاکانیانـدا نـاتوانن لـە خۆیـانی دوورخەنـەوە، ئـەو قـسەیان نـەدەکرد، ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾[2] واتـە: بـۆ ئـەوان هەیـە لـە لای سەریانەوە چەند تەبـەقێك (وەك هـەوری ڕەش) لـە ئـاگرو لـە ژێریشیانەوە چـەند تەبـەقێك هەیـە، وە

---

[1] الاسراء (١١).

[2] الزمر (١٦).

دەفەرمووێت: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٍۚ﴾[1] واتە: ئەوانەی لە دۆزەخدا فەرشو ڕاخەریان (لە ئاگرە)و لە لای سەروشیانەوە لێفەو داپۆشەریان (لە ئاگرە)، وە لەم ئایەتەیشدا دەفەرمووێت: ﴿حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ﴾ واتە: کاتێك ناتوانن دووری بخەنەوە بلێسەی ئاگر لە دەمو چاوو پشتیان، وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٖ وَتَغۡشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ﴾[2] واتە: پۆشاکیان قەترانی ڕەشەو دەمو چاویشیان ئاگری پۆشیوە، ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ واتە: کەسیش بە هانایانەوە نایەت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ﴾[3] واتە: وە بێگومان هیچ پارێزەرێك نیە بۆ ئەوان لە (سزای) خوا، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ﴾ واتە: لەناکاو ئاگریان تێ بەردەبێتو ﴿فَتَبۡهَتُهُمۡ﴾ واتە: واقیان وڕدەمێنێتو نازانن ڕوو لە کوێ بکەن، ﴿فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا﴾ واتە: ناتوانن لەخۆیانی دور بخەنەوەو خۆیانی لێ لادەن، ﴿وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ﴾ یانی: هیچ مۆڵەتێکیان پێ نادرێتو تەنها یەك سەعاتیش ئەو سزایان بۆ دواناخرێت.

﴿وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾﴾

## پەندوەرگرتن لەوانەی پێشەوە کە گاڵتەیان دەکرد بە پێغەمبەران

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) دەداتەوە لەسەر ئەو گاڵتەکردنەی خوانەناسان بەرامبەری دەیانکردو ئازاریان دەداو بڕوایان پێ نەدەکرد دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا بێگومان گاڵتەو لاقرتێ بە پێغەمبەرانی پێش تۆش کراوە، ئەوانەش کە بڕوایان پێ نەدەکردو بە دووریان دەزانی ڕوویدات تووشی سزای سەخت بوون، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ كُذِّبَتۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ فَصَبَرُواْ عَلَىٰ مَا

---

[1] الاعراف (٤١).

[2] ابراهیم (٥٠).

[3] الرعد (٣٤).

كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِى۟ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾[1] واتـه: سـوێند بـه خوا بێگومان پێغەمبەرانی پێش تۆش ئەی موحەممەد(ﷺ) باوەڕیان پێ نەكراوە بەڵام ئارامیـان گـرت لەسەر ئەو باوەڕ پێ نەكردنەیان وە ئەزیەتو ئازاردران تا یارمەتیو سەرخستنی ئێمـەیان بـۆ هـات وە فەرمانو بەڵێنەكانی خوا بە هیچ كەسێك ناگۆڕدرێت، بێگومـان هـەواڵی هەنـدێ لـەو پێغەمبەرانـەت بـۆ هاتووە. پاشان خوای گەورە باسی ئەو هەموو بەهرانەی خۆی دەكات كە بەخشیویەتی بـە بەنـدەكانی كە بـە شـەوو بـە ڕۆژ پاراسـتوویەتیو چاوی لێیانـەو هـەرگیز لێیـان بـێ ئاگـا نیـە بـە ئەنـدازەی چـاو لێكنانێك، وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ مَن يَكْلَؤُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ﴾ واتە: بڵێ: (بە گاڵتەكـەران) كێ (دەتوانێت) ئێوە بپارێزێـت بـە شـەوو بـە ڕۆژ لـە (سـزای) خـوای میهرەبـان، ﴿مِنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ﴾ یانی: لـەجیاتی خـوا واتـە: غـەیری خـوای ڕەحمـان، ﴿بَلْ هُمْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِم مُّعْرِضُونَ﴾ واتـە: ئـەو خوانەناسانە دان نانێن بەو بەهرە چاكانەی كە خـودا پێـی داون بـەڵكو خۆیـان دەبـوێرن لـەو هـەموو بەهرەو نیشانانەی خودا، پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿أَمْ لَهُمْ ءَالِهَةٌ تَمْنَعُهُم مِّن دُونِنَا﴾ پرسـیارێكی ئینكاریـەو هەڕەشـەو سەرزەنـشتی تێدایە. واتـە: ئایـا ئەوانـە خوداگـەلێكیان هەیـە كـە دەیانپارێزێت لە بەڵاو كارەسات جگە لـە ئێمـە؟ بـەو شـێوەیە نیـە ئـەوان وادەزانـنو تێدەگـەن، بۆیـە دەفـەرمووێت: ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَ أَنفُسِهِمْ﴾ واتـە: ئـەو خوداگەلـەی كـە ئەوانـە پـشتیان پـێ بەستووەو جگە لە خـودا یارمـەتی خۆشیان نـاتوانن بـدەن، ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾ واتـە: وە لـە لایەن ئێمەشەوە پەنا نادرێن. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسـەوە: ﴿وَلَا هُم مِّنَّا يُصْحَبُونَ﴾ واتـە: ئێمەش نایانگرینە خۆمانو پەنایان پێ نادەین.[2]

﴿ بَلْ مَتَّعْنَا هَـٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۗ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ۚ أَفَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَـٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَـٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾

---

[1] الانعام (٣٤).

[2] الطبري (١٨/٤٤٨).

**لەخۆبایی بوونی موشریکەکان بەهۆی ڕابواردنیان لە دنیادا بۆ ماوەیەکی زۆرو ڕوونکردنەوەی هەق بۆیان**

خوای گەورە باسی موشریکەکانمان بۆ دەکاتو هۆکاری ئەو لەخۆ گۆڕانو گومڕاییەیان کە تێی کەوتوون دەگێڕێتەوە بۆ ئەو ڕابواردنو تەمەن درێژیو بەهرانەی کە پێیان دراوە، وا دەزانن شتێکی چاکە، پاشان خوای گەورە ئامۆژگاریان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ بَلْ مَتَّعْنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۗ أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِى ٱلْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَآ ۚ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾ واتە: بەڵکو ئێمە ئەوانو باوباپیرانیانمان ژیاندووە بەخۆشی (نازو نیعمەتی دنیامان پێ دابوون) تا تەمەنی زۆریان بەسەر برد دەی ئایا ئەوانە (قورەیش) سەرنج نادەن کە بێگومان ئێمە (وردە وردە) دێینە خاکو وڵاتی (ئەوان) لە هەموو لایەکیەوە کەمی دەکەینەوە (بە ڕزگارکردن لە لایەن موسڵمانانەوە) دەی ئایا ئەوان زاڵو سەرکەوتوون (یا ئێمە)؟! زانایانی تەفسیر ڕای جیاوازیان هەیە لە مانای ئەم ئایەتەدا، چاکترین تەفسیر بۆی ئەم ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾[1] واتە: زۆرێك لەو شارانەمان قڕ تێ خستن کە هەر لە دەوری ئێوە بوون، هەموو جۆرە نیشانەیەکمان بۆ گۆڕین، کە بەڵکو بگەڕێنەوە. حەسەنی بەسری دەڵێت: مەبەست بەم ئایەتە سەرکەوتنی ئیسلامە بەسەر خوانەناسیدا.[2] واتە: ئاخۆ پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن کە چۆن خوای گەورە دۆستەکانی خۆی سەرخست بەسەر دوژمنەکانیداو ئەو گەلانەی قڕ تێخست کە بڕوایان نەدەهێناو ئەو شارانەشی کە ناهەقیکاربوون وێران کردو خاوەنباوەڕانی ڕزگارکرد، بۆیە دەفەرموێت: ﴿ أَفَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾ واتە: ئایا ئەوانە سەرکەوتن، واتە: نەخێر ئەوان ژێر کەوتن سەرشۆڕو ڕیسواو زەرەرمەند بوون، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ﴾ واتە: بڵێ: من تەنها گەیەنەرێکم لە لایەن خواوە دەتانترسێنم بە سزاو تۆڵەی خودا ئەوەی خودا فەرمانم پێدەکات پێتان دەگەیەنم، بەڵام ئەم بانگەوازەی من سوود ناگەیەنێت بەو کەسانەی کەڕو کوێرو دڵ مردوونو مۆر نراوە بەسەر چاوو دڵیاندا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴾ واتە: بانگدان بە گوێی کەڕانداو ترساندنیان بێ کەڵکە، خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾ واتە: ئەو بێباوەڕانە

---

[1] الاحقاف (٢٧).

[2] الطبري (١/٤٩٤).

تووشی کەمترین سزا ببن لە لای خواوە، خێرا دان دەنێن بە تاوانەکانیانداو ئەڵێن: کە ئەوان ناهەقیان لە خۆیان کردووە لە دنیادا، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازووی داد دادەنێین، زۆربەی زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە یەك تەرازووە، بۆیە بە کۆش (جمع) هاتووە لەبەر زۆری ئەو کردارانەی کە پێی دەکێشرێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾ واتە: هیچ کەسێك بە ئەندازەی دەنکە خەردەلەیەك ناهەقی پێ ناکرێت، وە هەر خوا خۆی بەسە بۆ ئەوەی بە کاری ئەو خەڵکەدا ڕابگات. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾[1] واتە: پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾[2] واتە: بە ڕاستی خوا قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناکات وە ئەگەر چاکەیەك هەبێت (خوا) چەندانەی دەکاتەوەو دەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە. وە خوای گەورە لە زمانی لوقمانەوە دەفەرموێت: ﴿يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾[3] واتە: لوقمان وتی: کوڕە شیرینەکەم! بە ڕاستی ئەو (چاکەو تاوانە) ئەگەر کێشی تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت لەناو بەردێکدا یا لە ناو ئاسمانەکان یا لە زەویدا بێت خوا (لە قیامەتدا) دەیهێنێت بە ڕاستی خوا وردبینو ئاگادارە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (دوو وتە لەسەر زمان سوکن لە تەرازوودا قورسن، خۆشەویستن لای خوای ڕەحمان: سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم).[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەردەم پێغەمبەری خودا (ﷺ) دانیشتبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوو کۆیلەم هەیە درۆم لەگەڵ دەکەنو خەیانەتم لێ دەکەنو بەرفەرمانیشم نین، منیش لێیان دەدەم قسەشیان پێ دەڵێم، ئەم کارەی من بەرامبەر بەوانە چۆنە؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی وت: (بە ئەندازەی ئەو درۆو خەیانەتو سەرپێچیانەیان کە تۆ لێیان دەدەی، ئەگەر سزاکەت بە ئەندازەی تاوانەکانیان بێت، ئەوە باشە نە

[1] الكهف (٤٩).

[2] النساء (٤٠).

[3] لقمان (١٦).

[4] فتح الباري (١٣/٥٤٧)، مسلم (٤/٢٠٧٢).

خێرت دەگاتو نە سزایش دەدرێت، وە ئەگەر سزادانەکەت کەمتر بوو لە تاوانەکانیان ئەوە پیاوەتییەکە بۆ تۆ، خۆ ئەگەر سزادانەکەت زیاتر بوو لە تاوانەکانیان، تۆڵە لە تۆ دەسێنرێت بۆ ئەوان بە ئەندازەی ئەو زیادەیەی دەکەوێتە سەرت)، پیاکەوە دەستی کردە گریان لەبەردەم پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاواری کردو دەینالاند، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (چیەتی؟ قورئانی نەخوێندووەتەوە ؟: ﴿وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾)، پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هیچ شتێك لەوە بە چاکتر نازانم جیابوونەوە لێیان نەبێت ، ئەوا من تۆم کردە شایەت کە ئەوانە هەموو ئازادن[1].

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ ۚ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾﴾

**ناردنەخوارەوەی تەورات و قورئان**

خوای گەورە لە زۆر شوێندا لە پێشەوە لە قورئاندا باسی موساو موحەممەد پێغەمبەری هێناوە (درودو سەلامی خوایان لێ بێت) بە یەکەوەو یا کتێبەکانیشی لەگەڵ بەکارهێناوە. بۆیە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ﴾ واتە: هۆی جیاکەرەوەیان داوە بە موساو هارون. موجاهید دەڵێت: واتە: کتێبمان پێداون.[2] ئەبو سالح دەڵێت: تەورات، قەتادە دەڵێت: تەورات کە باسی حەڵاڵو حەرامو جیاکردنەوەی تێدایە لە نێوان هەقو ناهەقدا.[3] گشت قسەکان لەم بارەیەوە ئەوەیە کە هەموو کتێبە ئاسمانیەکان پێکهاتووە لە هەڵاواردنو جیاکردنەوە لە نێوان هەقو ناهەقو شارەزاییو گومڕاییو ڕێی ڕاستو ڕێی چەوتو حەڵاڵو حەرامو ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی وەدەستهێنانی ڕووناکی دەروونو شارەزاییو ترسانو گەڕانەوە بۆ لای خودا. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: هۆی جیاکردنەوەو ڕووناکیو بیرەوەریە بۆ لە خوا ترسان،یانی: ئامۆژگاریو بیرخستنەوەیە بۆیان، پاشان خوای گەورە وەسفیان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ﴾ واتە: ئەوانەی لە شوێنی پەنهانیدا لە ترسی خوا دەلەرزن. وەك ئەم ئایەتانە کە

---

[1] أحمد (٦/٢٨٠)، فەرموودەیەکی مونکەرە.

[2] الطبري (١٨/٤٥٣).

[3] الطبري (١٨/٤٥٣).

دەفەرموویّت: ﴿ مَّنْ خَشِيَ الرَّحْمَٰنَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴾[1] واتە: ئەوەی لە خوای میهرەبان ترسابیّت کە نادیارەو بە دلّیکی ڕوو لە خواوە گەڕابیّتەوە (بۆ لامان)، وە دەفەرموویّت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِالْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾[2] واتە: ئەوانەی لە پەنهانیدا لە خوای خۆیان دەترسن لیّخۆشبوونو پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە. پاشان لیّرەدا دەفەرموویّت: ﴿وَهُم مِّنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴾ واتە: ئەوانە لە ترسی ڕۆژی قیامەت دەلەرزن. وە دەفەرموویّت: ﴿ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَاهُ ﴾ واتە: ئەمەیش قورئانیّکی پیرۆزو مەزنە کە هیچ پڕوپوچیّکی تیّکەلاّو نابیّت نە لە ئیّستاو نە لەمەوداش لە لایەن کارزانی مەزنەوە ڕەوانەکراوە، ﴿أَفَأَنتُمْ لَهُ مُنكِرُونَ ﴾ واتە: ئایا ئیّوە ئینکاری دەکەنو بڕوای پیّ ناکەن کە قورئانیّکی زۆر دیارو ڕوونو ئاشکرایە؟

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا هَٰذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَآبَاؤُكُمْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الَّذِي فَطَرَهُنَّ وَأَنَا عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٥٦﴾﴾

**بەسەرهاتی ئیبراهیمو هۆزەکەی**

خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِن قَبْلُ﴾ واتە: سویّند بە خوا بە ڕاستی بەخشیمان بە ئیبراهیم ڕیّنموونیو شارەزایی لە پیّشدا. خوای گەورە باسی ئیبراهیمی خەلیل دەکات (سەلامی خوای لیّ بیّت) کە پیّش پیّغەمبەریەتی شارەزای کردووە، واتە: هەر لە منداڵیەوە فیّری هەقبیّژیو بە بەڵگە سەلماندوویەتی بە هۆزەکەی کە لەسەر ناهەقین، وەك خوای گەورە لە ئایەتیّکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِ﴾[3] واتە: ئەمانە چەند بەڵگەیەك بوون دامان بە ئیبراهیم تا بەرامبەر بە هۆزەکەی بەکاریان بیّنیّت، مەبەست لیّرەدا ئەوەیە کە خوای گەورە هەر بە منداڵی لە پیّش ئەوەی ببیّتە پیّغەمبەر شارەزای کردبوو ﴿وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ ﴾ واتە: هەمیشە ئاگامان لیّی بووەو دەمانزانی شایستەی پیّغەمبەریەتیە، پاشان دەفەرموویّت: ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا

---

[1] ق (٣٣).

[2] الملك (١٢).

[3] الانعام (٨٣).

هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾ واتە: کاتێك وتی بە باوکیو گەلەکەی ئەم پەیکەرانە چین وا ئێوە دەیانپەرستن، ئەمە ئەو شارەزاییە بوو کە پێی درابوو، هەر لە منداڵیەوە دژی ئەو بتپەرستیە بوو کە هۆزەکەی خەریکی بوون، لە جیاتی پەرستنی خودا بتیان دەتاشیو دەیانپەرست، پێی دەوتن: ﴿مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾ واتە: ئەم هەیکەلانە چین وا ئێوە دەیانپەرستن، ﴿قَالُواْ وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ﴾ واتە: دەیانوت: بابو باپیرانی ئێمە هەر ئەمانەیان دەپەرست، هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەبوو جگە لەوەی کە بابو باپیرانیان ئەمانەیان پەرستووە ئەمانیش لەسەر ڕێی بابو باپیرانی خۆیان دەڕۆن، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ لَقَدۡ كُنتُمۡ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُمۡ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ واتە: ئیبراهیم وتی: ئێوەو بابو باپیرانتان وەك یەك لەسەر ڕێی چەوتو گومڕاینو ڕێی ڕاستتان ون کردووە، کاتێك کە ئیبراهیم تێی گەیاندن کە بابو باپیرانیان گومڕاو بێ ئاوەزبوونو سوکایەتیشی کرد بە بتەکانیان، وتیان: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا بِٱلۡحَقِّ أَمۡ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ﴾ واتە: دەیانوت: ئەم قسەی تۆ دەیڵێی گاڵتەمان پێ دەکەی یان هەر بە ڕاستتە. ئێمە شتی وامان لەمەوپێش نەبیستووە، ئیبراهیم دەڵێت: ﴿قَالَ بَل رَّبُّكُمۡ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلَّذِي فَطَرَهُنَّ﴾ واتە: پەروەرندەی ئێوە کە هیچ خودایە نیە غەیری ئەو هەر ئەو پەروەرندەیە کە ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیشی لە نێوانیاندایە لە دروستکراوەکانی تریش هەر خۆی دروستی کردوون، چونکە هەر ئەو دروستکەری هەموو شتێکە، ﴿وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ واتە: وە منیش شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەك نیە غەیری ئەو پەروەردگاریش هەر خۆیەتی.

﴿وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ ﴿٥٧﴾ فَجَعَلَهُمۡ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرٗا لَّهُمۡ لَعَلَّهُمۡ إِلَيۡهِ يَرۡجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتٗى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ فَأۡتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعۡيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلۡتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلۡ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمۡ هَٰذَا فَسۡـَٔلُوهُمۡ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾﴾

### ئیبراهیمو شکاندنی بتەکان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ﴾ واتە: سوێند بە خوا پلان دادەنێم بۆ (لەناوبردنی) بتەکانتان دوای ئەوەی پشتتان تێکردنو بەجێتان هێشتن، پاشان ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) سوێندی خوارد کە بتەکانیان پارچە پارچە بکات، لەو کاتەدا هەندێ

کەسی هۆزەکەی گوێیان لە قسەکانی بوو، واتە: حەزی دەکرد بتەکانیان بشکێنێت و ئازاری دڵیان بدات دوای ئەوەی کە چوون بۆ جەژنەکەیان، هۆزەکەی جەژنێکیان هەبوو لەو کاتەدا دەچوونە دەرەوە بۆ گێڕانی ئەو جەژنە، ئەبو ئیسحاق دەڵێت: لە ئەبو ئەحوەصەوە لە عەبدولاوە دەڵێت: کاتێك هۆزەکەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) چوونە دەرەوە بۆ جەژنەکەیان بە لایدا تێپەڕین و پێیان وت: ئەی ئیبراهیم ئایا تۆ نایەیت لەگەڵمان؟ ئیبراهیم وتی: من نەخۆشم، ڕۆژی پێشوو وتبووی: ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصۡنَٰمَكُم بَعۡدَ أَن تُوَلُّواْ مُدۡبِرِينَ ﴾ هەندێ کەسی هۆزەکەی گوێیان لێ بووە، سوێندی خواردووە کە بتەکانیان بشکێنێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلَهُمۡ جُذَٰذًا ﴾ واتە: هەموو بتەکانی شکاندو پارچە پارچەی کردن، ﴿إِلَّا كَبِيرٗا لَّهُمۡ﴾ واتە: بێجگە لە گەورەکەیان نەبێت، ئەوەی کە لە لای ئەوان بەڕێزترو مەزنتر بوو، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَرَاغَ عَلَيۡهِمۡ ضَرۡبَۢا بِٱلۡيَمِينِ﴾[1] واتە: ئینجابەدەستی ڕاستی (بە تەور) دەستیکرد بە لێدانیان (ورد وردی کردن جگە لە گەورەکەیان)، وە دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّهُمۡ إِلَيۡهِ يَرۡجِعُونَ﴾ واتە: بە ئومێدی ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو (یانی ئیبراهیم تائەویش ڕاستی مەسەلەکەیان پێ بڵێ بەڵکو باوەڕ بێنن)، دەگێڕنەوە ئیبراهیم تەورەکەی لە دەستی بتە گەورەکەیاندا دانا بەڵکو وابزانن کە ئەو بتە گەورەیە قینی هەڵساوەو پێی ناخۆش بووە ئەو بتە بچووکانەی لەگەڵ بپەرستن بۆیە شکاندوونی و تیکەتیکەی کردوون. کاتێك کە گەڕانەوەو بینیان کە ئیبراهیم چی بەسەر خوانیان هێناوە لەو سوکایەتی پێکردن و پارچە پارچەکردنە سەلماندی کە ئەو بتانە خوا نین و ئەوانەیشی دەیانپەرستن نەفام و بێ ئاوەزن، ﴿ قَالُواْ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: (بتپەرستان) وتیان: کێ ئەمەی کردووە بە خواکانمان بە ڕاستی ئەو کەسە لە ستەمکارانەو (دەبێ سزا بدرێت). ئەوانەی گوێیان لێ بووە کە ئیبراهیم سوێندی خواردووە کە دەبێت نەخشەیەك بۆ نەهێلانی بتەکانیان دابنێت، وتیان: ﴿قَالُواْ سَمِعۡنَا فَتٗى يَذۡكُرُهُمۡ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبۡرَٰهِيمُ ﴾ واتە: گوێمان لێ بوو لاوێك کە ناوی ئیبراهیمە باسی ئەکردن. ﴿قَالُواْ فَأۡتُواْ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعۡيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡهَدُونَ ﴾ واتە: وتیان: بیهێنن، با خەڵکێکی زۆر ئامادە بکرێت و ببینن و بەڵکو شایەتی لێ بدەن، ئیبراهیمیش تەنها مەبەستی ئەوەبوو لەو کۆبوونەوە گەورەدا نیشانیان بدات و بۆیان ڕوون بکاتەوە کە چەندە نەفام و بێ عەقڵن، ئەو بتانە دەپەرستن کە ناتوانن زیان لە خۆیان دوورخەنەوەو یارمەتی

[1] الصافات (٩٣).

خۆیان بدەن، کەواتـە چۆن داوای یارمـەتیان لێ دەکرێـتو داوای قـازانجو دوورخستنەوەی زیانیـان لێ دەکرێـت؟ ﴿ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾ واتـە: وتیـان ئایـا تـۆ ئەمـەت کـردووە بـە خواکانمـان ئـەی ئیـبراهیم، ﴿قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾ واتـە: (ئیبراهیم) وتی: بەڵکو ئەم بتە گەورەیان ئەوەی کردووە! دەپرسیار لەوانـە (بتـە شکاوەکان) بکـەن ئەگـەر ئەوانـە قسە دەکـەن. ئیـبراهیم (سـەلامی خـوای لێ بێـت) دەیویـست بـەو شـێوەیە بیریـان پـێ بکاتەوەو تێڕامانێك لە خۆیان بکەن، دان بەوەدا بنێن کـە ئـەو بتانـە نـاتوانن قـسە بکـەن، چـونکە بـێ گیانن، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرموویـەتی: (ئیبراهیم سێ جار نەبێت درۆی نەکردووە، دوانیـان لـە زاتـی خـوادا وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾ واتـە: ئـەم بتـە گـەورەیان ئـەوەی کـردووە، وە دەفـەرموێت: ﴿إِنِّى سَقِيمٌ﴾[1] واتە: من نەخۆشم (نایەم بۆ جەژنەکەتان لە دەرەوەی شـار)، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: لـە کاتێکدا بەناو زەوی زۆردارێك لـە زۆردارەکانـدا دەڕۆیـشت سـارەی (خێزانـی) لەگـەڵ بـوو، وەختـێ لـە شوێنێکدا دابەزی (دانیشت) پیاوێك چوو بۆ لای ئەو زۆردارە پێی وت: پیاوێـك لەوێدایـە هاتووەتـە نـاو زەمینی تۆ ژنێکی لەگەڵ جوانترین ژنە . ناردی بە شوێن ئیبراهیمداو هات بـۆ لای، پێـی وت: ئـەم ژنـە چیتە؟ وتی: خوشکمە، وتی: برۆ بینێرە بۆ لام، ئیبراهیم ڕۆیـشت بـۆ لای سـارە پێـی وت: ئـەم پیـاوە زۆردارە پرسیاری لێم کرد لە بارەی تۆوە، منیش پێم وت: خوشکمە، لە لای ئەو بـە درۆم نەخەیتـەوە، بێگومان تۆ خوشکی منی لە کتێبی خوادا، چونکە لەسەر زەمیندا موسڵمانی تر نیە بێجگە لە منو تـۆ. ئیبراهیم بردی بۆ لای زۆردارەکە پاشان هەڵساو دەستی کرد بە نوێژکردن، کاتێك سارە چووە ژوورەوە بۆ لای پیاوەکە دەستی بۆ ڕاکێشا پیاوە زۆردارەکە دەستی گیرا بـە گیرانێکـی زۆر توند (وشـك کـرا)، وتی: دوعام بۆ بکە لای خودا زیانـت پـێ ناگەیـەنم، سـارە دوعـای بـۆ کـرد و دەسـتی بـەربوو، دیـسان دەستی ڕاکێشا بیگرێت ئەمجارەش دەستی گیرا لە جاری پێشوو توندتر، جـاری سـێهەمیش دووبـارەی کردەوە دیسان دەستی گیرایەوە وەك دوو جارەکەی پێشوو، وتی: دوعـام بـۆ بکـە زیـانم بـۆت نابێـت، دوعای بۆ کردو بەرەڵا بـوو، پاشـان پیـاوە زۆردارەکـە بـە خزمەتکارەکـەی خـۆی وت: تـۆ مرۆڤـت بـۆ نەهێناوم، بەڵکو شەیتانێکت بۆ هێناوم،وەدەری نێو هاجەریشی بدەرێ، چـووە دەرەوەو هاجەریـشی درایە،هاتەوە،کاتێك ئیبراهیم هەسـتی کـرد کـە سـارە گەڕایـەوە، کۆتـایی بـە نوێژەکـەی هێنـاو وتـی: دەنگو باس چیە؟ وتی: خوا پاراستمیو لایدام لە فێڵی ئەو خوانەناسی لەڕێ لادەرە هاجەریشی پێدام

---

[1] الصافات (٨٩).

بۆ خزمەت کردن)، موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێت: هەر کاتێك ئەبو هورەیرە ئەم فەرموودەی باس بکردایە، دەیوت: ئەوە دایکتانە ئەی نەوەکانی ئاوی ئاسمان.[1] مەبەستی ئاوی زەم زەم بوو کە لە ژێر پێی ئیسماعیلدا کە کوڕی هاجەرە هاتە دەرەوە، هەندێکی تریش ئەڵێن: مەبەستی بارانی ئاسمان بووە، چونکە هەر ئاوی بارانیان خواردووە.

﴿فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾﴾

## دانانی هۆزەکەی بەبێ دەسەڵاتی خواکانیان و ئامۆژگاری ئیبراهیم بۆیان

خوای گەورە باسی هۆزی ئیبراهیم دەکات کاتێك کە ئیبراهیم ئەو قسانەی بۆ کردن دەفەرموێت: ﴿فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ﴾ واتە: ئینجا گەڕانەوە بۆ لای یەکتری، واتە: دەستیان کردە لۆمەکردنی خۆیان کە چەندە کەمتەرخەم بوون و چاودێری خواکانیان نەکردووە هەتا ئاوایان بەسەر هاتووە، ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ واتە: دەیانوت خۆتان تاوانبارن کە دەوری خواکانتان چۆڵ کردووە و پارێزەرتان لە لا دانەناون. ﴿ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ﴾ واتە: پاشان سەریان داخست، ﴿لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ﴾ واتە: وتیان: بە ئیبراهیم تۆ چۆن دەڵێی بە ئێمە پرسیاریان لێ بکەن ئەگەر قسە دەکەن و وەڵامتان دەدەنەوە، تۆ خۆت چاك دەزانی ئەمانە قسە ناکەن، لەو کاتەدا دانیان بەوە نا کە ئەو بتانە ناتوانن قسە بکەن، ئیبراهیم پێی وتن: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ﴾ واتە: وتی: ئایا جگە لە خوا ئێوە شتێك دەپەرستن کە نە هیچ قازانجتان پێ دەگەیەنێت و نە زەرەریشتان لێ دەدات، ئایا بیر ناکەنەوە لەو حاڵەی ئێوەی تێدان. ﴿أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ واتە: تۆف لەدەست ئێوەو لەو شتانەی کە لە غەیری خوا دەیانپەرستن و لەسەر ئەو گومراییی و خوانەناسیەی خۆتان هەر بەردەوامن، ئەو کارەی ئێوە دەیکەن، کاری نەفام و ستەمکارو لە ڕێ لادەرانە، دەی ئایا ژیر نابن. ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بەڵگەی تەواوی بۆ هێنانەوە و قسەی بڕین، بۆیە خوای

[1] فتح الباري (٦/٤٤٧)، مسلم (٤/١٨٤٠).

گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ﴾[1] واتە: ئەو (بەڵگانە) بەڵگەی ئێمە بوون کە دابوومان بە ئیبراهیم لە بەرامبەر گەلەکەیەوە.

﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾﴾

کاتێك خوانەناسان هەموو توانایەکیان بەکارهێنا گشتی پووچەڵ کرایەوەو بێدەسەڵاتیان دیاریداو ڕاستی سەرکەوتو پڕوپوچی چزکراو لەناوی برد، پاشان دەستیان دایە ناهەقی کردن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾ واتە: هەندێ لە بتپەرستان (وتیان) ئیبراهیم چاك بسوتێنن‌و یارمەتی خواکانتان بدەن ئەگەر ئێوە ئەو کارە دەکەن. دارو سوتەمەنیەکی ئێجگار زۆریان کۆکردەوە، سودی دەڵێت: هەتا وای لێهات ئەگەر ژنێك نەخۆش بکەوتایە نەزری دەکرد لەسەر خۆی ئەگەر چاك بووەوە لەو نەخۆشیە کۆڵێك دار ببات بۆ سوتاندنی ئیبراهیم، هەموو ئەو دارو سوتەمەنیەیان لە چاڵێکدا کۆکردەوەو ئاگریان تێ بەردا بڵێسەو کڵپەی زۆر گەورەی لێ بەرزەبووەوە، هەرگیز ئاگری وەها بەو شێوەیە نەکرابووەوە، ئیبراهیمیان خستە ناو مەنجەنیقەوە بە ئاماژەی پیاوێکی دەشتەکی فارسەکان کەکورد بوو.[2] شوعەیبی جوببایی دەڵێت: ئەو پیاوە ناوی هەیزەن بووە، خوای گەورەش نوقمی ناو زەمینی کردو تا ڕۆژی قیامەت هەر ناڵەناڵیەتی‌و دەڕواتە خوارەوە بەناو زەمیندا! کاتێك کە ئیبراهیمیان خستە ناو ئاگرەکە وتی: (حسبي الله ونعم الوکیل)[3] واتە: خوامان هەبێت بەسمانە هەر ئەو پشت‌و پەنامە. وەك بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە دەڵێت: (حسبي الله ونعم الوکیل) ئیبراهیم فەرموویەتی کاتێك کە فڕێ درایە ناو ئاگرەکە. وە موحەممەدیش (ﷺ) فەرموویەتی: کاتێك وتیان (وەك خوای گەورە دەفەرموێت): ﴿إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾[4] واتە: بە ڕاستی خەڵکی (بێباوەڕ) لەشکرو کۆمەڵی زۆریان کۆکردووەتەوە لە دژتان کەواتە بترسن لێیان کەچی ئەوان بەمە باوەڕیان زیادتر بووو وتیان: هەر خوامان بەسە چەند پشت پێ بەستراوێکی

---

[1] الانعام (٨٣).

[2] القرطبي (١١/٣٠٣).دەقەکەئەڵێ (بأشاره رجل من اعراب فارس من الاکراد)،زانایان ئەڵێن بەدەشتەکیەکانی عەرەب ئەوترێ ئەعراب وبەدەشتەکیەکانی فارس ئەوترێ ئەکراد وبەدەشتەکیەکانی ڕۆم ئەوترێ ئەحباش...(وەرگێڕ).

[3] الطبري (١٨/٤٦٥).

[4] ال عمران (١٧٣).

چاکە.[1] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ڕیوایەتیش کراوە لە ئیبنو عەبباسەوە (کاتێک ئیبراهیم فڕێ درایە ناو ئاگرەکەوە) فریشتەی باران دەیوت: کەی فەرمانم پێ دەکرێت بە باران بارین تا ڕەوانەی بکەمو بیبارێنم؟ سەعید ئەڵێت: فەرمانی خوا پەلەتر بوو لە فەرمانی ئەو،ئەوە بوو خوای گەورە فەرمووی: ﴿قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ واتە: (کە ئیبراهیمیان خستە ناو ئاگرەوە) وتمان: ئەی ئاگر سارد بەرەوە بێ زیان بە بۆ ئیبراهیم، دەڵێت: هیچ ئاگرێک لەسەر زەمیندا نەماو نەکوژێتەوە.[2] ئیبنو عەبباسو ئەبولعالیە دەڵێن: ئەگەر خوای گەورە نەیفەرموایە: ﴿وَسَلَٰمًا﴾ سەرمای ئاگرەکە ئازاری ئیبراهیمی دەدا.[3] قەتادە دەڵێت: هیچ گیانەوەرێك لەو ڕۆژەدا نەهاتووە بەلای ئەو ئاگرەدا و هەوڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکەی نەدابێت بێجگە لە وەزەغە (سەرمازولە).[4] زوهری دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە کوشتنی وەزەغەو ناوی یاخیەکانی لێ ناوە.[5] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ واتە: خوای گەورە ئاگرەکەی ساردکردەوەو ئیبراهیم هیچ ئازارێکی پێ نەگەیشت، وە ئەگەر خوای گەورە نەیفەرموایە: ﴿وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ﴾ لەوانە بوو ئیبراهیم لەناو ئاگرەکەدا سەرمای ببوایە، ﴿وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ﴾ واتە: ئەوان ویستیان پیلان بگێڕن بە ئیبراهیم (بە سوتان لەناوی بەرن) بەڵام ئێمە ئەوانمان کردە زەرەرمەندترینو دۆڕاوترین کەسو خوای گەورە فێڵەکەیانی بەتاڵ کردەوەو ئیبراهیمی لە سوتانی ئەو ئاگرە ڕزگارکرد.

﴿وَنَجَّيْنَٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً وَكُلًّا جَعَلْنَا صَٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِي كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدْخَلْنَٰهُ فِي رَحْمَتِنَآ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾﴾

---

١ فتح الباري (٧٧/٨).

٢ الطبري (٤٦٦/١٨).

٣ الطبري (٤٦٥/٤٦٦/١٨).

٤ الطبري (٤٦٧/١٨).

٥ الطبري (٤٦٧/١٨).

**کۆچکردنی ئیبراهیمی خەلیل بۆ شام و لەگەڵ (لوط) پێغەمبەردا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِي بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ﴾ واتە: وە ئیبراهیمو (لوت)مان ڕزگارکردو ناردمانن بۆ ئەو زەویەی (ولاتی شام) کە پیتو فەرمان تێ خستبوو، خوای گەورە باسی ئیبراهیم پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) لەو ئاگرەی کە مۆزەکەی هەڵیانگیرساندو خستیانە ناوی ڕزگاری کردو دەری کرد لە ناویان بەرەو ولاتی شام ڕۆیشت بۆ ئەو سەر زەمینە پیرۆزە. پاشان دەفەرموێت: ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَـٰلِحِينَ ﴾ واتە: ئیسحاقمان پێ بەخشیو یەعقوبیشمان بە زیادە پێ بەخشیو هەموویانمان کرد بە پیاوی چاك. عەتاو موجاهید دەڵێن: بەخشیشێکیشمان پێدا.[1] ئیبنو عەبباسو قەتادەو[2] حەکەمی کوڕی عوتەیبەش.[3] دەڵێن: ﴿نَافِلَةً﴾ کوڕی کوڕ (کوڕەزا)، واتە: یەعقوبی کوڕی ئیسحاقە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَبَشَّرْنَـٰهَا بِإِسْحَـٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَـٰقَ يَعْقُوبَ﴾[4] واتە: ئێمەش مژدەمان پێدا بە ئیسحاقو لە پاش ئیسحاق (مژدەمان پێدا) بە یەعقوب (کە کوڕی ئیسحاقە)، عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ئیبراهیم داوای یەك منداڵی کرد وتی: ﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾[5] واتە: ئەی پەروەردگارم! منداڵێکی چاکم پێ ببەخشە، خوای گەورە ئیسحاقی پێ بەخشیو یەعقوبیشی بە زیادە پێ بەخشی، ﴿وَكُلًّا جَعَلْنَا صَـٰلِحِينَ ﴾ واتە: هەموویان چاکەخوازو پیاوچاك بوون، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَـٰهُمْ أَئِمَّةً ﴾ واتە: کردمانن بە پێشەوا هەتا خەڵکی چاویان لێ بکەن، ﴿يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا﴾ واتە: بانگی خەڵکی بکەن بە فەرمانی ئێمە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ﴾ واتە: بە هەموویانمان ڕاگەیاندووە کاری چاکە بکەنو نوێژ بکەنو زەکات بدەن، ئەمە لە بابی عەتفی خاسە بۆ سەر عەتفی عام، ﴿وَكَانُوا۟ لَنَا عَـٰبِدِينَ ﴾ واتە: ئەوەی بە خەڵکی ڕادەگەیەنن خۆشیان هەڵدەسنو بەجێی دێنن.

---

[1] الطبري (٤٧١/١٨).

[2] الطبري (٤٧١/١٨).

[3] الدر المنثور (٦٤٣/٥).

[4] هود (٧١).

[5] الصافات (١٠٠).

**باسی (لوت) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)**

دوای باسی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) خوای گەورە دێتە سەر باسی (لوت) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)، پێغەمبەر (لوت) کوڕی (هاران)ی کوڕی (ئازەر)ە، باوەڕی هێنابوو بە ئیبراهیم شوێنی کەوتبوو، لەگەڵیشی کۆچی کرد بۆ شام، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓۖ﴾[1] واتە: ئینجا لوت باوەڕی بەو (ئیبراهیم) هێناوە (ئیبراهیم) وتی بێگومان من کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم (لە بابلەوە بۆ شام) خوای گەورە کارزانیو زانستی پێ بەخشیو وەحی بۆ ناردو کردیە پێغەمبەرو ڕەوانەی کرد بۆ سەدومو خەڵکەکەی، دژایەتیان کردو بڕوایان پێ نەهێنا، خوایش قڕی تێ خستنو شارەکەیانی وێرانکرد بەسەریاندا، وە لە زۆر شوێندا لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە بەسەرهاتەکەی باس کردوونو بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلُوطًا ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗا وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَت تَّعۡمَلُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە: بەخشیمان بە لوت پێغەمبرێتیو زانیاریو لەو شارەی کە بێناموسی تێدا دەکرا لوتمان ڕزگارکرد چونکە ئەوانە گەلێکی خراپەکارو لە ڕێ لادەر بوون، وە ئەویشمان بەر بەزەیی خۆمان خست چونکەئەو لە پیاوچاکان بوو.

﴿وَنُوحًا إِذۡ نَادَىٰ مِن قَبۡلُ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٧٧﴾﴾

**باسی نوح و گەلەکەی**

خوای گەورە باسی پێغەمبەری خۆی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) دەکات کە چۆن بە دەنگیەوە هاتو ئەو نزایەی قەبوڵ کرد کە لە گەلەکەی خۆی کرد کاتێك کە بڕوایان پێ نەکرد، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾[2] واتە: جا (نوح) هاواری کردە پەروەردگاریو (وتی) بە ڕاستی من شکستم خواردووە (بێ دەسەلاتم) دەی تۆ یارمەتیم بدە، وە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ نُوحٞ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرۡهُمۡ يُضِلُّواْ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓاْ إِلَّا فَاجِرٗا كَفَّارٗا﴾[3] واتە: نوح فەرمووی: ئەی پەروەردگار! هیچ کەسێك لە بێباوەڕان مەهێڵە لەسەر زەوی (چونکە) بێگومان ئەگەر

[1] العنکبوت (٢٦).
[2] القمر (١٠).
[3] نوح (٢٦_٢٧).

تۆ وازیان لێ بێنیت: بەندەکانی تۆ گومڕا دەکەن‌و هەر منداڵی تاوانباری سوپاس نەکەر دەخەنەوە.

بۆیە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿وَنُوحًا إِذْ نَادَىٰ مِن قَبْلُ فَاسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ﴾ واتە: نوح لە پێشدا بانگی کردین‌و وەڵاممان دایەوەو خۆیی‌و کەس‌و کارەکەیمان ڕزگار کرد (ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێنا) وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ﴾[1] واتە: ژن‌و منداڵەکانیشت هەڵبگرە ئەوەیان نەبێت بڕیاری لەسەر دراوە (بە خنکاندن) هەر ئەوانەش (هەڵبگرە کە) بڕوایان هێنا (لە گەلەکەت) وە خەڵکێکی کەم نەبێت بڕوایان نەهێنا لەگەڵیدا.

﴿مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە:ئەومان لەو هەموو ناڕەحەتی‌و ئازاردان‌و بڕوا پێ نەکردنە ڕزگارکرد، نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەناو گەلەکەیدا ماوەی نۆ سەدو پەنجا ساڵ مایەوە، بانگی دەکردن بۆ لای خوای گەورە، ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت بڕوایان پێ نەهێنا، دژایەتیان دەکردو ئازاریان دەداو ئامۆژگاری کەس‌و کاریان دەکرد کە گوێ بۆ نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) نەگرن‌و دژایەتی بکەن، ﴿وَنَصَرْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَوْمِ﴾ واتە: ڕزگارمان کردو سەرمان خستن بەسەر گەلەکەیدا، ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە:ئەوانەی کە بەڵگەو ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی بە ڕاستی ئەوانە گەلێك بوون ڕۆچوون لە خراپەدا لەبەر ئەوە هەموویانمان خنکان (لە ئاوی تۆفانەکەدا)، بەو شێوەیە نوح دوعای لێکردن (سەلامی خوای لێ بێت).

﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِى ٱلْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمْنَٰهَا سُلَيْمَٰنَ ۚ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَٱلطَّيْرَ ۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ ۖ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾﴾

**باسی داودو سولەیمان‌و ئەو شتانەی کە پێیان درا، وە باسی بەسەرهاتی ئەو ئاژەڵەی بە شەو کەوتە ناو کشتوکاڵەکە**

ئەبو ئیسحاق دەڵێت لە مورەوە لە ئیبنو مەسعودەوە دەڵێت: ئەو کێڵگەیە ڕەزە مێو بوو بۆڵەکانیشی شۆڕبووبوونەوە،[2] شورەیحیش هەر وای وتووە.[1] ئیبنو عەبباس دەڵێت: (النَّفشُ) واتە:

[1] هود (٤٠).

[2] الطبري (١٨/٤٧٤).

لەوەڕاندن[2] (لەوەڕاندنی مەڕومالآت)، شورەیحو زوهریو قەتادە دەڵێن: (النَّفشُ) لە شەودا نەبێت ڕوونادات.[3] قەتادە ئەمەی بۆ زیادکردووە (الهمل)یش لە ڕۆژدا دەبێت،[4] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ﴾ واتە: (باسی) داودو سولەیمان بکە کاتێك بڕیاریان دەرکرد دەربارەی ئەو کشتوکاڵەی کە بە شەو ئاژەڵی کەسانێك تێیدا لەوەڕابوون وە ئێمە بۆ دادوەری بڕیارەکەمان (ئاگادار) بووین،ئەڵێ: باغێکی ترێ بوو بۆڵێشی لێ دابوو ئەو ڕانە خراپی کرد، دەڵێت داود بڕیاری دا کە ڕانە مەڕەکە بدرێت بە خاوەن ڕەزەکە، سولەیمانیش وتی:من بڕیارێکی ترم لەم بڕیارە پێ باشترە ئەی پێغەمبەری خوا، داود وتی: کامەیە ئەو بڕیارە؟ سولەیمان وتی: باغە ڕەزەکە بدە بە خاوەنی مەڕەکان بەخێوی بکات هەتا وەك خۆی لێ دێتەوە، مەڕەکانیش بدە بە خاوەنی ڕەزەکە سودی لێ وەربگرێت هەتا باغە ڕەزەکە وەك خۆی لێ دێتەوە، ئەو کاتە باغە ڕەزەکە بدەرەوە بە خاوەنەکەیو مەڕەکانیش بدەرەوە بە خاوەنەکەی. ئەمە ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَ﴾[5] هەر بەم شێوەیە عەوفیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە.[6] واتە: باسی داودو سولەیمانیش بکە، کاتێك کە بڕیاریاندا کێشەی ئەو کێڵگەیە چارەسەر بکەن کەبە شەوئاژەڵی کۆمەڵێکی تێکەوتبوو، ئێمە ئاگاداری ئەو بڕیارەیان بووین. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمًا وَعِلۡمًا﴾ واتە: سولەیمانیشمان شارەزا کرد کە چی بکات، کارزانیو زانیستیشمان دا بە هەردووکیان. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیاسی کوڕی مەعاویەوە کاتێك کە داوای لێ کرا ببێت بەقازی، حەسەن هات بۆ لای ئیاسو گریا، حەسەن پێی وت: بۆچی دەگریت؟ وتی: ئەی ئەبوسەعید بیستوومە قازیەکان چەندۆرێکن: پیاوێك ئیجتیهادی کردووەو نەیپێکاوەو هەڵەی کردووە ئەوە لەناو ئاگردایە، یان پیاوێکە ئارەزوو باز ئەویش لەناو ئاگردایە، وە پیاوێکیشە کە ئیجتیهادی کردووەو پێکاویەتی ئەوە لەناو بەهەشتدایە. حەسەنی بەسری وتی: ئەوەی خوای گەورە بۆی باس کردووین لە هەواڵی داودو سولەیمانو پێغەمبەران لەو بڕیارانەی کە داویانە، وەڵامی قسەی ئەو کەسانە

---

[1] الطبري (١٨/٤٧٥).
[2] الطبري (١٨/٤٧٧/٤٧٨).
[3] الطبري (١٨/٤٧٧/٤٧٨).
[4] الطبري (١٨/٤٧٧).
[5] الطبري (١٨/٤٧٥).
[6] الطبري (١٨/٤٧٥).

دەداتەوە کە وانەڵێن،ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَدَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ ﴾ خوای گەورە وەسفی سولەیمانی کردووەو باسی خراپی داودی نەکردووە، پاشان حەسەن وتی: خوای گەورە سێ مەرجی لەسەر کاربەدەستان داناوە:یاسای خوا بە نرخێکی کەم نەفرۆشن، بە ئارەزووی خۆیان بڕیار نەدەن، لەو بڕیارەیانەشدا لە کەس نەترسن. پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە: ﴿ يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ﴾[1] واتە: ئەی داود بێگومان ئێمە تۆمان کرد بە جێنشین-ی پێغەمبەرانی پێش خۆت-کەوابوو تۆش لە نێوان خەڵکدا بە ڕاستی فەرمانڕەوایی بکەو شوێن هەواو ئارەزووت مەکەوە با لە ڕێگای خوا لاتنەدات. وە دەفەرموویت: ﴿فَلَا تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ ﴾[2] واتە: کەواتە لە کەس مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾[3] واتە: وە نیشانەو ئایەتەکانی من مەگۆڕنەوە بە شتێکی کەم نرخ.[4] منیش ئەڵێم: بە نیسبەت پێغەمبەرانەوە (سەلامی خوایان لێ بێت هەموویان بێ گوناه بوونو مەعسوم بوون) لە لایەن خواوە پشتیوانیان لێ کراوە. بەڵام غەیری پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە عەمری کوڕی عاسەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر دادوەر ئیجتیهادێکی کردو پێکای دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر ئیجتیهادی کردو نەیپێکاو هەڵەی کرد یەك پاداشتی بۆ هەیە).[5] ئەم فەرموودەیە وەڵامە بۆ ئیاسی کوڕی مەعاویە کە وای دەزانی ئەگەر قازی ئیجتیهادی کرد نەیپێکاو هەڵەی کرد ئەو قازیە لەناو ئاگردایە، والله أعلم. وە لە شێوەی ئەم بەسەرهاتە کە لە قورئاندا باسی هاتووە، ئەم فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (جارێکیان دوو ژن دوو کوڕیان لەگەڵ بوو، کە گورگێك هاتو یەکێك لە کوڕەکانی برد، هاتن بۆ لای داود دادوەریان بکات، داود بڕیاری دا لەبەرژەوەندی ژنە گەورەکە، چوونە دەرەوە سولەیمان وتی: کێردێکم بۆ بێنن لە نێوانتاندا لەتی دەکەم، ژنە بچووکەکە وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت منداڵی ئەوە لەتی مەکە، سولەیمان بڕیاری دا

---

[1] ص (٢٦).

[2] المائدة (٤٤).

[3] البقرة (٤١).

[4] تهذيب تأريخ دمشق (١٨٤/٣)، ابن ابي حاتم (٢٤٥٨/٨).

[5] فتح الباري (٣٣٠/١٣).

کوڕەکە بۆ ژنە بچووکەکە بێت).[١] بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە لە سەحیحەکەیاندا.[٢] نەسائیش لەسەرئەم فەرموودەیە بابێکی داناوە لە کتێبی قەزادا.[٣] (بابی ئەو قازیەی بڕیارێك دەدات بە پێچەوانەی ئەو بڕیارەی کەئەبێت بیدات،بۆئەوەی ڕاستی بۆدەربکەوێت). خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ﴾ کێوەکانو پەلە هەورەکانیشمان ڕامکرد لەگەڵی بن لەبەر دەنگی خۆشی کاتێك کە زەبووری بە دەنگەوە دەخوێندو دەیلەراندەوە باڵندەکان لە هەوادا دەوەستانو وەڵامیان دەدایەوەو کێوەکانیش بە هەمان شێوە دەیانوتەوە، بۆیە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بە لای ئەبو موسای ئەشعەریدا ڕۆیشتو تێپەڕی ئەبو موسا قورئانی دەخوێند بە شەوا، دەنگێکی خۆشی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) وەستاو گوێی لە قورئان خوێندنەکەی دەگرتو فەرمووی: (بێگومان ئەم موسایە سازێکی لە سازی ئالی داودی پێدراوە). ئەبو موسا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر زانیبام کە تۆ گوێ دەگری زۆر جوانتر دەملەراندەوە.[٤] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ﴾ واتە: وە داودمان فێری دروستکردنی پۆشاکی زرێ کرد بۆ ئێوە تا بتانپارێزێت لە کاتی شەڕو کوشتاردا، واتە: پۆشاکی ئاسنی دروست کرد، قەتادە دەڵێت: پۆشاکی ئاسن لە کاتی خۆی پان بوو، یەکەم کەسێك کە پۆشاکی ئاسنی لە زنجیر دروست کرد پێغەمبەر داود بوو.[٥] وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ ۝١٠ أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ﴾[٦] واتە: وە ئاسنمان بۆ نەرك كردبوو، (فەرمانمان پێکرد) کە پۆشاکانی داپۆشەری (هەموو لەشی لێ) دروست بکەو لە چنینی زرێدا بە ئەندازەی ئەڵقەکان وەك یەك بن. واتە: بزمارەکان ئەوەندە بڵاو نەبنو زۆریش نزیك نەبن لە یەك. بۆیە فەرموویەتی: ﴿لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ﴾ واتە: هەتا لە شەڕدا بتاپارێزێت، ﴿فَهَلْ أَنْتُمْ شَاكِرُونَ﴾ واتە: ئایا ئێوە لەسەرئەو بەهرانەی کە خودا پێی داون کە عەبدی خۆی داودی فێری ئەو شتانە کردووە لەبەر خاتری ئێوە شوکری خوا دەکەن.

---

[١] أحمد (٢/٣٢٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] البخاري (٦٧٦٩)، مسلم (١٧٢٠).

[٣] النسائي في الكبرى (٥٩٥٨).

[٤] فتح الباري (٨/٧١١).

[٥] الطبري (١٨/٤٨٠).

[٦] سبأ (١٠-١١).

**دەسەڵاتداری سولەیمان بێوێنە بووە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً﴾ واتە: بای بەهێزمان ڕامهێنا بۆ سولەیمان، ﴿تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦٓ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا﴾ واتە: بە فەرمانی ئەو بڕوا بۆ ئەو زەویەی کە ئێمە پیت و بەرەکەتمان تێخستووە،یانی: سەر زەمینی شام، ﴿وَكُنَّا بِكُلِّ شَيۡءٍ عَٰلِمِينَ﴾ واتە: ئێمە ئاگاداری هەموو شتێکین، سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرشێکی (بەڕەیەکی) دارینی هەبوو هەرچی پێویستی وڵات بوو لەسەری دادەنرا لەگەڵ لەشکرو وڵاغی سواری و چادرو وشتردا، فەرمانی دەدا بەو با بەهێزە هەڵیان بگرێت، با بەهێزەکە دەچووە ژێری و هەڵی دەگرت و بەرزی دەکردەوەو دەیبرد، پەلەوەرەکانیش سێبەریان بۆ دەکرد هەتا لە گەرما بیانپارێزێت، بۆ هەر شوێنێك مەیلی لێ بووایە لەو سەر زەمیندا. پاشان دەهاتە خوارەوە خەڵکەکەو ئەو شتانەشی لەگەڵی بوون دایدەگرت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَسَخَّرۡنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ رُخَآءً حَيۡثُ أَصَابَ﴾[1] واتە: بامان بۆ ڕام هێنا بە فەرمانی ئەو بە نەرمی دەڕۆیی بۆ هەر جێگایەك کەئەو بیویستایە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞ﴾[2] واتە: بەیانیان (تا نیوەڕۆ با) ڕێگای مانگێکی دەبڕی و (نیوەڕوان تا) ئێوارانیش مانگێك ڕێگەی دەبڕی. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ﴾ واتە: لە شەیتانەکانیش دەچوونە بن دەریاو مرواری و شتی تری بە نرخ و نایابیان بۆ دەرهێنا، ﴿وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَ﴾ واتە: وە جگە لەوە کاری تریشیان دەکرد. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ۝٣٧ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ﴾[3] واتە: وە هەموو (پەری) و شەیتانەکانمان بۆ ڕام هێنابوو کە بیناسازو مەلەوانی ژێردەریا بوون، وە هەندێکی تریان (کە سەرپێچی سولەیمانیان کردبوو) ڕامامان هێنابوو بۆی بە پێبەستراوی لە کۆت و زنجیردا. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ﴾ واتە: خوای گەورە دەیپاراست لەوەی کە شەیاتینێك ئازاری بدات، بەڵکو هەموو لە ژێر دەستیدا بوون لێی دەترسان و نەیاندەوێرا نزیکی ببنەوەو بە ئارەزووی خۆی دەیگرتن و ئازادی دەکردن، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ﴾ واتە: هەندێکی ترشیان کە تەوق لەملن.

[1] ص (٣٦).
[2] سبأ (١٢).
[3] ص (٣٧-٣٨).

﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾﴾

**باسى ئەيوب پێغەمبەر (سەلامى خواى لىٚ بێت)**

خواى گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ واتە: وە (باسى) ئەيوب (بكە) هاوارى لە پەروەردگارى كرد (لە دواى ناساغى ماوەيەكى زۆر): بە ڕاستى من زيان و ئازارو نەخۆشى دووچارم بووەو تۆش ميهرەبانترينى ميهرەبانانى. خواى گەورە باسى ئەيوب پێغەمبەر دەكات (سەلامى خواى لىٚ بێت) كە چ بەلايەكى بەسەردا هات لە سامان و مندالٚ و لاشەيدا، چونكە ئەيوب پێغەمبەر (سەلامى خواى لىٚ بێت) مەڕو مالأت و چوارپىٚ و كێلگەيەكى ئێجگار زۆرى هەبوو، لەگەلٚ مالٚ و مندالێكى زۆرو شوێنى خۆش، تووشى بەلاٚو مەينەتى بوو هيچى نەماو هەمووى تياچوو، دواى ئەوەيش تووشى نەخۆشيش بوو بە تەنها لە سوچێكى ئەو شارەدا بەو نەخۆشيەوە دەينالأند، هيچ كەسێك بە لايدا نەدەچوو بێجگە لە خێزانەكەى خۆى، كە هەميشە بە دەميەوە بوو، دەگێڕنەوە: ئەوەندە هەژار كەوتن ژنەكەى دەچوو كارى دەكرد بۆ خەلٚكى هەتا خۆيى و ئەيوب پێغەمبەر (سەلامى خواى لىٚ بێت) بەخێو بكات. پێغەمبەرى خودا (ﷺ) فەرموويەتى: (پێغەمبەران زياترو توندتر تووشى مەينەتى دەبن، پاشان پياوچاكان، پاشانيش چاكترين و چاكترين).[1] وە لە فەرموودەيەكى تردا هاتووە: (خەلٚك تووشى مەينەتى دەبێت بە پێى ئاينى، ئەگەر لە ئاينەكەيدا توندو بەهێز بوو،تووشى مەينەتى زياتر دەبێت).[2] پێغەمبەر ئەيوب (سەلامى خواى لىٚ بێت) ئێجگار خۆڕاگر بوو، نموونە بە ئەو دەهێنرێتەوە لە خۆڕاگريدا، يەزيدى كوڕى مەيسەرە دەلٚێت: كاتێك خودا پێغەمبەر ئەيوبى تاقى كردەوە بە نەمانى سامان و مالٚ و مندالى و هيچى بۆ نەمايەوە، زۆر چاك يادى خوداى دەكردو پاشان وتى: سوپاست دەكەم ئەى خاوەنى گشت خاوەنشتەكان، ئەو كەسەى كە چاكەت لەگەلٚ كردم، سامان و مندالٚت پێدام، هيچ شوێنێكى ناو دلٚم نەماوە ئەوانە نەچووبنە ناوى، ئەوانەت هەموو لىٚ وەرگرتمەوە، ناو دلٚمت چۆلٚ كرد، هيچ شتێك نەما لە نێوان من و تۆدا ببێتە لەمپەرو ڕێگر، خۆ ئەگەر دوژمنەكەم شەيتان بزانێت بەوەى كردووتە بۆمن ئەوە بەغيلى پىٚ دەبردم! دەلٚێت: پێغەمبەر ئەيوب (سەلامى خواى لىٚ بێت) وتى: ئەى پەروەردگارم تۆ سامان و مندالٚت پێداوم كەسێك لەبەر دەرگاكەمدا نەوەستاو نارەزايى دەربڕێت لێم لەسە ناهەقيەك پێم كردبێت، تۆ خۆت ئەمە دەزانى، وەخۆت ئەزانى كەفەرشى نەرمم بۆ ڕائەخرا من نەمدەويست! و بە خۆم ئەوت : (ئەى

---

[1] الطبراني (٢٤/٢٤٥/٢٤٦)، فەرموودەيەكى سەحيحە.

[2] أحمد (١/١٨٠).

نەفسەکە) تۆ بۆ ئەوە دروست نەکراوی کەلەسەر جێگەی نەرم پاڵبکەوی! ئەوەم واز لێ نەهێناوە لەبەر خاتری تۆنەبێت.[1] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك خوای گەورە ئەیوب پێغەمبەری چاك کردەوە کوللەی زێڕینی بەسەریدا باراند، بە هەردوو دەستی کۆی دەکردەوەو دەیخستە ناو جلەکانی، دەڵێت: پێی وترا: ئەی ئەیوب تێرت نەخوارد؟ وتی: ئەی پەروەردگارم کێ لە چاکەی تۆ تێر دەبێت). ئەسلی ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە، لە شوێنێکی تردا باسەکەی دەکرێتەوە.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ﴾ واتە: جا ئێمەش هاوارو نزاکەیمان گیراکردو لامان برد ئەو زیانو ئازارو نەخۆشیەی هەیبوو وە هەموو ماڵو منداڵیمان پێ بەخشیەوە (کە پێشترهەیبوو)و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا. ئیبنو عەبباس دەڵێت: گشت سامانو منداڵەکانی گەڕایەوە.[3] واتە: خودا هەموو سامانو ماڵەکەی پێدایەوە. عەوفیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە.[4] هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو مەسعودو موجاهیدەوە، حەسەنو قەتادەیش هەروایان وتووە.[5] موجاهید دەڵێت: پێی وترا: ئەی ئەیوب: خاوخێزانەکەت بۆ خۆتە لە بەهەشتدان، ئەگەر حەز دەکەیت بۆت دەهێنینەوە، ئەگەر حەزیش دەکەی بۆت دەهێڵینەوە لەناو بەهەشتداو بە ئەندازەی ئەوانت پێ دەدەین؟ وتی: نەخێر، بۆم بهێڵەرەوە لە ناو بەهەشتدا، بۆی هێڵرایەوە لەناو بەهەشتداو بە ئەندازەی ئەوانەی لە دنیادا پێدرا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا﴾ واتە: بەزەیی‌و سۆزێك بوو لە ئێمەوە کە وامان لێکرد، ﴿وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ﴾ واتە: وەبیرخەرەوەو ئامۆژگاری بوو بۆ خواپەرستان، واتە/ ئەمەمان کرد بۆ ئەوەی پەندێك بێت بۆ خەڵکی هەتا وا نەزانن ئەوەی تووشی بەڵاو مەینەتی بوو خوا لێی ڕەنجاوە، بەڵکو دەبێت بیکەنە سەرمەشقی خۆیان لە خۆڕاگریدا لە کاتی بەڵاو ناڕەحەتیدا کە مەیلی لێ بێت تووشیان بکات، خوا کارزانیەکی تەواوی هەیە لەو شتانەدا.

---

[1] حلية الأولياء (٥/٢٣٩).

[2] ابن أبي حاتم (٨/٢٣٦١)، سەنەدەکانی حەسەنە پیاوەکانی جێی متمانەن.

[3] الطبري (١٨/٥٠٦/٥٠٧).

[4] الطبري (١٨/٥٠٦/٥٠٧).

[5] الطبري (١٨/٥٠٦/٥٠٧).

﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾﴾

**باسی ئیسماعیل و ئیدریس و زیلکیفل پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێ بێت)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ واتە: وە (باسی) ئیسماعیل و ئیدریس و زیلکیفل (بکە) هەموویان لە ئارامگران بوون. ئیسماعیل مەبەست پێی ئیسماعیلی پێغەمبەرە کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێت) لە پێشەوە باسکرا لە سورەتی مەریەمدا ئیدریس پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێت) هەر بەو شێوەیە باسی لێکرا، زیلکیفلیش لە ئایەتەکەوە وا دەردەکەوێت کە پێغەمبەر بێت چونکە ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەراندا ناوی بێت حەتمەن پێغەمبەرە، هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: زەلکیفل پیاوچاکێك بووە، پاشایەکی دادپەروەرو کارزانی کارڕاست بووە، ئیبنو جەریر لەوە زیاتر لەسەری نەچووە.[1] ئیبنو جورەیج دەڵێت لە موجاهیدەوە: ﴿وَذَا ٱلۡكِفۡلِ﴾، دەڵێت: پیاوچاکێك بووە، پێغەمبەر نەبووە، بووبووە کەفیلی پێغەمبەری گەلەکەی لە جێی ئەو فەرمانی گەلەکەی ببات بە ڕێوەو وایان لێ بیکات لە قسەی ئەو پێغەمبەرە دەرنەچن و بە کاریشیاندا ڕابگات بە دادپەروەری، قسەی خۆی بردە سەرو وای کرد لەبەر ئەوە ناوی زەلکیفی لێ نرا، ئیبنو ئەبی نەجیحیش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کردووە لە موجاهیدەوە، ﴿وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە: وە ئێمە ئەوانمان خستە ناو ڕەحمەتی خۆمان (کە بەهەشتە) بێگومان ئەوانە لە چاکانن.

﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾

**باسی یونس پێغەمبەر (سەلامی خوا لێ بێت)**

ئەم بەسەرهاتە لێرەداو لە سورەتی (ن) و سورەتی (الصّافات) باسی هاتووە، ئەوە بوو یونسی کوڕی مەتتا (سەلامی خوای لێ بێت) خوای گەورە ناردی بۆ سەر شاری نەینەوا کە یەکێك بوو لە شارەکانی زەوی موسڵ، بانگی کردن بۆ لای خوای گەورە، قەبوڵیان نەکرد دەستیان دایە سەرپێچی و لەسەر خوانەناسی خۆیان بەردەوام بوون، یونس بە تووڕەییەوە لەناویان چووە دەرەوە بەڵێنی سزای خوای پێدان پاش سێ ڕۆژ، کاتێك بە تەواوی بۆیان دەرکەوت و زانیان کە یونس پێغەمبەر درۆ ناکات،

---

[1] الطبري (١٨/٥٠٧).

هەموو چوونە دەرەوە بۆ دەشت بە منداڵو مەڕو ماڵاتو گشت چوارپێکانیانەوە، دایكو بەچكەكانیان لە یەك جیاكردەوە، پاشان دەستیان دایە هاناو پاڕانەوە لە خوای گەورە، وشترو بێچووەكەی دەیانپڕماندو مانگاو گوێرەكەكەی دەیانبۆڕاندو بزنو مێو كارو بەرخیش دەیانقاڕاند، خوای گەورە سزاكەی لەسەر لابردن، خوای بەبەزەیی دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾[1] واتە: هیچ شارێك نەبووە كە بڕوای هێنابێتو باوەڕەكەی قازانجی پێ گەیاندبێت بێجگە لە گەلی یونس كاتێك كە بڕوایان هێنا ئازاری ئابڕوبەرمان لە دنیادا لەسەر لابردنو وامان كرد كە هەتا ماوەیەك خۆشی ڕابوێرن. بەڵام یونس پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەڵ كۆمەڵێكدا ڕۆیشتە ناو (كەشتیەك)وكەشتیەكە لاریووەوە بە خەڵكەكەوە، ترسان نوقم ببن . تیرو پشكیان كرد بۆ پیاوێك هەتا لەناو خۆیان فڕێی بدەنە ناو ئاوەكەو كەشتیەكەیان سوك ببێت، تیرو پشكەكە كەوتە سەر یونس، ڕازی نەبوون بیخەنە ناو دەریاكە، دووبارەیان كردەوە دیسان كەوتەوە سەر یونس، ئەم جارەیش ڕازی نەبوون بیخەنە ناو ئاوەكە، جاری سێیەمیش هەر كەوتەوە سەر یونس، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ﴾[2] واتە: ئینجا قورعەكێشی كرد (لەگەڵ خەڵكی ناو كەشتیەكە)و ئەو لە دۆڕاوان بوو. یونس هەڵساو خۆی ڕووت كردەوەو جلەكانی لابردو خۆی فڕێ دایە ناو دەریاكە. خوای گەورە لە دەریای سەوزەوە وەك ئیبنو مەسعود دەڵێت: نەهەنگێكی ناردو دەریای بڕیو هەتا خۆی گەیاندە یونسو هەڵی لوشیو قوتی دا، لەو كاتەدا كە خۆی فڕێ دا لە كەشتیەكە. خوای گەورە فەرمانی دا بە نەهەنگەكە كە گۆشتەكەی نەخواتو (ئێسكیشی) نەشكێنێت، چونكە یونس خواردنی تۆ نیەو ناو سكی تۆ بەندیخانەیەكە بۆی.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ﴾(نون) واتە: ماسی،بەوپێیە ئیزافەی (ذا) كراوەتە سەر (النون) واتە: خاوەن ماسی، ﴿إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا﴾ واتە: بە تووڕەیی (گەلەكەی بەجێ هێشت)، زەححاك دەڵێت: بە تووڕەییەوە گەلەكەی بەجێ هێشت.[3] ﴿فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ﴾ واتە: وایدەزانی ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین، واتە: تەنگەتاوی بكەین لەناو سكی ماسیەكەدا، هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە ئیبنو عەبباسو موجاهیدو زەححاكو كەسانی تریشەوە.[4] ئیبنو جەریریش هەمان

---

[1] یونس (٩٨).

[2] الصافات (١٤١).

[3] الطبري (٥١١/١٨).

[4] الطبري (٥١٥/٥١٤/١٨).

ڕای هەڵبـژاردووە، ئـەم ئایەتـەی بـە بەڵگـە هێناوەتـەوە: ﴿وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾[1] واتە: وە هەر کەسێك کەم دەستو هەژار بوو با بە پێی ئەوەی کە خوا داوێتی نەفەقە بدات خوا داوا لە کەس ناکات مەگەر بە پێی ئـەوەی کـە داوێتـی بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت. پاشان خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: جا لە تاریکیەکاندا (تـاریکی شـەوو دەریاو ناو سکی نەهەنگ) هاواری کرد (ئەی خوا)! بە ڕاستی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تـۆ پـاکیو بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم. ئیبنو مەسعو دەڵێت لەناو تاریکایی سکی نەهەنگو تاریکایی ناو دەریاو تاریکایی شەو.[2] وە هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کراوە لـە ئیبنـو عـەبباسو عـەمری کوڕی مەیمونو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موحەمەدی کوڕی کـەعبو زەححـاكو حەسـەنو قـەتادەوە.[3] سالمی کوڕی ئەبولجەعد دەڵێـت: لـە تاریکـایی سـکی نەهەنگێکدا لـە سـکی نەهـەنگێکی تـرداو لـەناو تاریکایی دەریادا.[4] ئیبنو مەسعودو ئیبنـو عـەباسو کەسـانی تـریش دەڵـێن لەبـەر ئـەوەی نەهەنگەکە بردی بەناو دەریاداو هەتا گەیاندیە بنی دەریاکە یونس گوێی لە تەسبیحاتی بەردو چەوی بنی دەریاکە بوو ئـا لـەو کاتـەداو لـەو شـوێنەدا وتـی: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[5] واتە: لەوێدا هاواری کرد: جگە لە تۆ ئەی خودایە خودایەکی تر شك نابەم، پـاکیو بـێ عـەیبی هـەر بـۆ تۆیە، من لە دەستەی ستەمکاران بووم. عەوفی ئەعرابی دەڵێت: کاتێك یونس لە سکی ماسیەکەدا بـوو وایدەزانی مردووە. پاشان هەردوو قاچی جوڵاند، کاتێك کە قاچی جوڵا لە شـوێنەکەیدا سـوژدەی بـرد، پاشان هاواری کرد ئەی پەروەردگارم! شوێنێکم کردووەتە سـوژدەگا هـیچ کەسـێك پێـی نەگەیـشتووە لەخەڵکی.[6] خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ﴾ واتـە: دەرمـان هێنـا لـە سـکی ماسیەکەداو لـەو تاریکاییانـە، ﴿وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتـە: ئێمـە هـەر بـەو شـێوەیە خاوەنباوەڕان ڕزگار دەکەین، ئەگەر لە ناڕەحەتیو تەنگانـەدا بـنو هاوارمـان لێ بکـەنو تەوبـە بکـەنو

---

[1] الطلاق (٧).

[2] القرطبي (١١/٣٣٣).

[3] الطبري (١٨/٥١٦/٥١٧).

[4] الطبري (١٨/٥١٧).

[5] ابن أبي شيبة (١١/٥٤١/١٣/٥٧٨).

[6] الطبري (١٨/٥١٨).

بگەڕێنەوە، بە تایبەتی ئەگەر ئەم دوعایە بکەن لە کاتی بەلادا پێغەمبەریش (ﷺ) هانی خەڵکی داوە کە ئەم دوعایە بکەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: تێپەڕیمو ڕۆیشتم بە لای عوسمانی کوڕی عەفاندا (ڕەزایی خوای لێ بێت) لە ناو مزگەوتدا، سڵاوم لێکرد، بە هەردوو چاوی بۆی دەڕوانیم، پاشان وەڵامی نەدامەوە، هاتم بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب، پێم وت: ئەی گەورەی موسڵمانان ئایا شتێك لە ئیسلامدا ڕوویداوە؟ دووجار وتم: وتی: نەخێر، چی بووە؟ووتم: نەخێر هیچ نەبووە، بەڵام من ماوەیەك پێش ئێستا دام بە لای عوسماندا لە مزگەوتدا بوو، سڵاوم لێکرد بە هەردوو چاوی بینی، کەچی وەڵامی نەدامەوە، دەڵێت: عومەر ناردی بە شوێن عوسماندا، بانگی کردو پێی وت: چی وای لێ کردی کە وەڵامی سڵاوی برای خۆت نادەیتەوە؟ وتی:شتی وام نەکردووە. سەعد وتی: وتم: بەڵێ وەڵامت نەدامەوە، کارگەیشتە ئەوە ئەو سوێندی دەخواردو من سوێندم دەخوارد، دەڵێت: پاشان عوسمان بیری کردەوەو وتی: بەڵێ، خوایە پەشیمانمو داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم، تۆ ماوەیەك لەمەوپێش بە لامدا ڕۆیشتی، من لەو کاتەدا وردو کردی دڵی خۆمم دەکردو بیرم دەکردەوە لە وتەیەك کە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بیستبوو، نەخێر سوێند بە خوا کاتێك نیە ئەو وتەیە بێتەوە بیرم و چاوو دڵم پەردەیەك نەیەت بەسەریداو داینەپۆشێت، سەعد وتی: من ئەو قسەیەت بۆ باس دەکەم، پێغەمبەری خودا (ﷺ)باسی یەکەمین دوعای بۆ کردین، عەرەبێکی کۆچەری هاتو سەرقاڵی کرد هەتا پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵساو منیش شوێنی کەوتم، ترسام لەوەی کە پێش من بگاتە ماڵیان بە پەلە ڕۆیشتم، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لای کردەوە بۆمو فەرمووی: (ئەوە کێیە، ئەبو ئیسحاقی؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فەرمووی: (دەی بۆچی هاتوی؟)، وتم: شتێکی وا نیە، سوێند بە خوا ئەوە نەبێت کە تۆ باسی یەکەم دوعات بۆ کردین، پاشان ئەو عەرەبە کۆچەریە هاتو سەرقاڵی کردی، فەرمووی: (بەڵێ دوعاکەی (زەنون) بوو کاتێك کە ئەو لە سکی ماسیەکەدا بوو وتی: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ چونکە هیچ موسڵمانیك نیە هەرگیز دوعای پێ کردبێت لە پەروەردگاری لە شتێکداو خودا دوعاکەی لێ قەبوڵ نەکردبێت).[1] تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە لە دوعای شەوو ڕۆژدا .[2] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ)

---

[1] أحمد (١٧٠/١)، سەنەدەکانی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي (٤٧٩/٩)، النسائي في الكبرى (١٦٨/٦)، سەنەدەکانی سەحیحە.

فەرموویەتی: (هەر کەسێك دوعا بكات بە دوعاكەی یونس لێی قەبوڵ دەكرێت) ئەبو سەعید دەڵێت: مەبەستی پێی ئەمەیە كە خوا دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾[1].

﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ ﴿٩٠﴾﴾

**باسی زەكەریاو یەحیا پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێ بێت)**

خوای گەورە باسی بەندەی خۆی زەكەریا دەكات كاتێك داوای كرد لە خوا كە كوڕێكی بداتێ هەتا دوای خۆی ببێتە پێغەمبەر، لە پێشەوە ئەم بەسەرهاتە بە تەواوی لە سورەتی (مریم)و (ال عمران)دا باسكرا، بە كورتی لێرەدا باسی لێ دەكەین، ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ﴾ واتە: بە پەنهانی هۆزەكەی ئاگایان لێ نەبوو وتی: ﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا﴾ واتە: ئەی خوایە! بە تەنهام مەهێڵەوە، كوڕم نیەو كەسیشم نیە لە دوای خۆم بە كارەكانم هەڵسێت لەناو خەڵكیدا، ﴿وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾ واتە: تۆ چاكترین كەسی هەر دەمێنیت، ئەم دوعایە سوپاس‌و ستایشی خوداشە جێی خۆیەتی بۆ ئەو داوایەی كە دەیكات، خوای گەورەیش لێی وەرگرت‌و دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَوَهَبْنَا لَهُ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُ زَوْجَهُ﴾ واتە: ئێمەش دوعای ئەومان وەڵامدایەوەو یەحیامان پێ بەخشی‌و خێزانەكەشیمان بۆ چاك كردەوە (لە نەزۆكی)، ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێن: خێزانەكەی نەزۆك بوو خوا منداڵی پێدا.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ واتە: پەلەیان دەكرد بۆ كاری چاكەو خواناسی‌وخۆنزیك خستنەوە لە خوا، ﴿وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا﴾ واتە: هاواریان لە ئێمە دەكرد بە ئومێدی (بەهەشت)و لە ترسی (دۆزەخ)، سەوری دەڵێت: ئومێدیان هەبوو بەوەی لامانەو دەترسان لە سزاشمان.[3] ﴿وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ﴾ واتە: وە ئەوان ملكەچ بوون بۆ ئێمەو دەترسان لێمان، عەلی كوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە

---

[1] الحاكم (٢/٥٨٤)، فەرمودەیەكی حەسەنە.

[2] الطبري (١٨/٥٢٠).

[3] تفسير الثوري (٢٠٤).

دەڵێت: واتە: بڕوایان دەکرد بەوەی خودا ڕەوانەی دەکردە خوارەوە.[1] موجاهید دەڵێت: خاوەن باوەڕێکی ڕاست بوون.[2] ئەبولعالیە دەڵێت: لە خواترس بوون.[3] ئەبو سینان دەڵێت: ملکەچ بوون ترسێکی بەردەوامە لەناو دڵدا کە هەرگیز لێی دەرناچێت. موجاهید دەڵێت: ﴿خَٰشِعِينَ﴾ واتە: خۆیان بە کەم دەزانی، حەسەنو قەتادەو زەححاك دەڵێن: ﴿خَٰشِعِينَ﴾ واتە: ملکەچ بوون بەرامبەر خودای مەزن.[4] ئەم قسانە هەموو ماناکانیان لە یەکەوە نزیکە.

﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٩١﴾

**باسی عیسا پێغەمبەرو مەریەمی دایکی**

بەم شێوەیە خودا باسی بەسەرهاتی مەریەمو کوڕەکەی دەکات (سەلامی خوایان لێ بێت) لەگەڵ بەسەرهاتی زەکەریاو یەحیای کوڕیدا (سەلامی خوایان لێ بێت) لە سەرەتاوە باسی بەسەرهاتی زەکەریا دەکاتو پاشان بە دوایدا بەسەرهاتی مەریەمیش باس دەکات، چونکە ئەم بەسەرهاتە پەیوەندی بەوی ترەوە هەیە، ئەمەیان وەدیهێنانی کوڕێك بوو لە پیاوێکی بە تەمەنی بە ساڵاچوو، لە ژنێکی پیری نەزۆك، کە لە کاتی لاویدا منداڵی نەدەبوو، پاشان باسی بەسەرهاتی مەریەم دەکات کە لەم بەسەرهاتە سەرسوڕهێنەرترە، ئەمەیان وەدیهێنانی کوڕێك بوو لە مێینەیەك بەبێ نێرینە، هەر بەم شێوەیەلە سورەتی (ال عمرانو مریم)دا باسکراوە. لێرەدا باسی بەسەرهاتی زەکەریای کردووە، بە دوایدا باسی بەسەرهاتی مەریەمیشی هێناوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا﴾ واتە: وە (باسی) ئەو ئافرەتە (مەریەمی کچی عیمران بکە) کە داوێنی خۆی پاراست ئینجا فومان پیاکرد (بەهۆی جوبرەئیلەوە) لەو ڕوحەی هی خۆمان بوو، وەك لە سورەتی (التحریم)یشدا فەرموویەتی: ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾[5] واتە: وە (بە) مەریەمی کچی عیمران ئەوەی کە داوێنی خۆی پاك ڕاگرت ئەوسا ئێمە فومان پێدا کرد لە ڕوحی خۆمانەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: خۆی و کوڕەکەیمان کردە نیشانەیەك بۆ هەموو خەڵکی دنیا، واتە: نیشانەیەك

---

[1] الطبري (٢/١٦).

[2] الطبري (٢/١٦).

[3] الطبري (٢/١٦).

[4] الکشاف (٣/١٣٣)، البغوي (٣/٢٦٧)، ابن أبي شیبة (١٣/٥٨٠).

[5] التحریم (١٢).

لەسەر ئەوەی کە خودا خاوەنی تواناو دەسەلاتە بەسەر هەموو شتێکدا، مەیلی لە هەر شتێك بێت وەدی دەهێنێت، بەڵکو هەر کاتێك فەرمان بدا بە شتێك بفەرمووێت ببە دەبێت. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ﴾[1] واتە: بۆ ئەوەی بیکەین بە موعجیزەو نیشانەیەك بۆ خەڵکی.

﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ ﴿٩٣﴾ فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ ﴿٩٤﴾ ﴾

## هەموو خەڵکی ئاینیان یەکە

ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێن: لەم ئایەتەدا: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾ واتە: ئاینتان یەك ئاینە.[2] حەسەنی بەسری لەم ئایەتەدا دەڵێت: خوای گەورە بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە چۆن خۆ بپارێزن‌و چی بکەن، پاشان دەڵێت: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾ واتە: ڕێگەو بەرنامەی ئێوە یەك ڕێگەو بەرنامەیە، ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ ﴾ ئینەوئیسمی (أنّ)یە ﴿أُمَّتُكُمۡ﴾ خەبەری (إنّ)یە، واتە: ئەمە ئەو شەریعەتەیە کە بۆتان ئاشکراو ڕوونکراوەتەوە، ﴿أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ واتە: یەك شەریعەتە، (مەنسوبە لەسەر حاڵ) بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ واتە: وە تەنها منیش پەروەردگاری ئێوەم و دەبێت من بپەرستن. وەك دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ﴾[3] واتە: ئەی نێردراوانی خودا لە خۆراکی پاك‌و حەلاڵ بخۆن‌و کردەوەی چاك بکەن (چونکە) بە ڕاستی من بەوەی ئێوە دەیکەن ئاگادارم، وە بێگومان هەر ئەمەیە ئاین‌و دینی ئێوە (ئەی پێغەمبەران دەستی پێوە بگرن) کە یەك ئاین‌و بەرنامەیەو منیش پەروەردگارتانم کەواتە خۆتان بپارێزن (لە تۆڵەم)، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران لە گەلانی جیاجیاین‌و یەك باوکمان هەیەو ئاینیشمان یەکە).[4]

---

[1] مريم (٢١).

[2] الطبري (١٨/٥٢٣).

[3] المؤمنون (٥١ـ٥٢).

[4] فتح الباري (٦/٥٥٠).

واتە: مەبەست پێی پەرستنی خودایە بە تەنهاو شەریك دانەنانە بۆی، بە پێی ئەو شەریعەتانەی کە بە پێغەمبەرکانیدا ڕەوانەی کردووە. وەك دەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[1] واتە: دامان ناوە بۆ هەر ئومەتێك لە ئێوە شەریعەتو ڕێگەیەکی ڕوون. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ﴾ واتە: گەلەکان جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەر پێغەمبەرکانیانو هەندێکیان بڕوایان پێ کردنو هەندێکیشیان بڕوایان پێ نەکردن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلٌّ إِلَيْنَا رَٰجِعُونَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو دەگەڕێنەوە بۆ لامان. هەر کەسەو پاداشتی خۆی وەردەگرێت بە پێی کرداری خۆی، ئەگەر چاك بوو بە چاکەو ئەگەر خراپیش بوو سزا دەدرێت. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ واتە: بە دڵ خاوەن باوەڕ بێتو کاری چاکیشی کردبێت، ﴿فَلَا كُفْرَانَ لِسَعْيِهِۦ﴾ واتە: هەوڵەکەی بە فیڕۆ ناچێت، وەك ئەم ئایەتەیش کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا﴾[2] واتە: پاداشتی ئەوانەی کە کاری چاك دەکەن نافەوتێنینو بە فیڕۆی نادەینو سوپاسی دەکرێتو بە ئەندازەی مسقالە زەڕەیەك ناهەقی پێ ناکرێت، وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ﴾ واتە: هەموو کردارەکانی دەنووسینو هیچی لەناو ناچێت.

﴿وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٩٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتْ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ وَٱقْتَرَبَ ٱلْوَعْدُ ٱلْحَقُّ فَإِذَا هِىَ شَٰخِصَةٌ أَبْصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيْلَنَا قَدْ كُنَّا فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا بَلْ كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٩٧﴾﴾

### هەر کەسێك مرد ناگەڕێتەوە بۆ دنیا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَآ أَنَّهُمْ لَا يَرْجِعُونَ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێت: پێویست بووە واتە: بڕیارێکەو دراوە کە هەر شارێك قڕی تێکەوت جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ دونیا پێش ڕۆژی قیامەت، هەر بەم شێوەیە ئیبنو عەبباسو ئەبو جەعفەری باقرو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە.[3]

---

[1] المائدة (٤٨).

[2] الكهف (٣٠).

[3] البغوي (٣/٢٦٨)، الطبري (١٨/٥٢٥)، الرازي (٢٢/١٩١).

## باسی یەئجوج و مەئجوج

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ ﴾ واتە: لە پێشەوە باسمان کرد کە یەئجوج و مەئجوج لە نەوەی ئادەمن، وە لە تۆرمەی نوح پێغەمبەریشن (سەلامی خوای لێ بێت) لە منداڵی (یافس)ن واتە: یافس بابی تورکەکانە، ئەم تورکانە دەستەیەکیان لە دوای بەنداوەکەی زولقەرنەینەوە بەجێمان کە دروستی کرد، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت وتی: ﴿هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا ٩٨ ۞ وَتَرَكۡنَا بَعۡضَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ يَمُوجُ فِي بَعۡضٖۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَجَمَعۡنَٰهُمۡ جَمۡعٗا﴾[1] واتە: (ذوالقرنين) وتی: ئەم (دروستکردنە) ڕەحمەتێکە لە لایەن پەروەردگارمەوە جا هەر کات بەڵێنی پەروەردگارم هات (بە دەرچوونی یەئجوج و موئجوج)ئەم بەنداوە دەکاتە زەویەکی تەخت و بێگومان بەڵێنی پەروەردگارم هەق و ڕاستە، واز (لە خەڵکی) دێنین لەو ڕۆژەدا دێن و دەچن بەناو یەکتردا (وەکو شەپۆلی دەریا)و فوو دەکرێت بە شەیپوردا ئەوسا هەموویان کۆدەکرێنەوە (سەراپا) کەسیان لێ جێ نامێنێت. وە لەم ئایەتە پیرۆزەیشدا دەفەرمووێت: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴾ واتە: هەتا دەرگا لە یەئجوج و مەئجوج دەکرێتەوە بە پەلە دەڕۆن بۆ خراپەکاری، (الحدب) واتە شوێنی بەرز لەسەر زەمیندا، ئەمە قسەی ئیبنو عەباس و عیکریمە و ئەبو ساڵح و سەوری و کەسانی تریشە.[2] ئەمە خورەوشتیانە لە کاتی دەرچوونیاندا،ئەمە وەك ئەوەوایە ئەو کەسەی ئەم قسەیە دەبیستێ، بە چاوی خۆیشی ببینێت، ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٖ﴾[3] واتە: جگە لە خوا کە هەموو شتێك دەزانێت کەس ناتوانێت لەوانە ئاگادارت بکات. چونکە ئەمە هەواڵی کەسێکە، ئاگاداری ئەوەیە کە بووە و ئەوەیشی لەمەودوا دەبێت هەر ئەوە ئاگاداری نهێنیەکانی ئاسمان و زەمینە. هیچ خودایەکیش نیە غەیری ئەو. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی ئەبی یەزیدەوە دەڵێت: ئیبنو عەبباس کۆمەڵێك منداڵی بینی بازیان بەسەر یەکتردا ئەداو یاریان دەکرد، وتی: ئا بەم شێوەیە یەئجوج و مەئجوج دەردەچێت.[4] باسی دەرچوونی یەئجوج و مەئجوج لە چەند فەرموودەیەکدا هاتووە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، فەرموودەی یەکەم: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرمووی:

---

[1] الكهف (٩٨ـ٩٩).

[2] الطبري (١٨/٥٣٢).

[3] الفاطر (١٤).

[4] الطبري (١٨/٥٢٨).

(دەرگا دەکرێتەوە لە یەئجوج و مەئجوج)و دێنە دەرەوە بۆناو خەڵکی وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾ خەڵکی داگیر دەکەن موسڵمانان خۆیان لەناو شارو قەڵاکانیاندا قایم دەکەن و مەڕو ماڵاتیشیان دەبەنە لای خۆیان، یەئجوج و مەئجوج ئاوی سەر زەمین دەخۆنەوە، هەتا هەندێکیان کە تێدەپەڕن بە لای ڕووبارێکدا هەرچی ئاوی تێدایە دەیخۆنەوەو بە وشکی بەجێی دەهێڵن، هەتا وای لێ دێت ئەوانەی کە دەڕۆن بە لای ئەو ڕووبارەدا ئەڵێن: خۆلێرەدا ئاو هەبوو! کار دەگاتە ئەوە هیچ کەسێك نامێنێت لەسەر زەویدا مەگەر کەسێك لە ناو شارو قەڵاکاندا مابێت، یەکێك لە یەئجوج و مەئجوج ئەڵێ: لەمانەی سەر زەمین لێ بووینەوە، ماوەتەوە خەڵکی ئاسمان. فەرمووی: یەکێکیان تیرەکەی دەجوڵێنێت و بەرەو ئاسمان دەیگرێت بە خوێنەوە بۆی دەگەڕێتەوە، دەبێتە بەڵاو فیتنە بۆیان. ئا لەو کاتەدا کە خەریکی ئەو خراپەکاریو گەندەڵیەن، خوای گەورە کرمێکیان لەناو ملیاندا بۆ دەنێرێت وەك کرمی ناو لووتی وشترو مەڕو ماڵات وایە، لە ملیان دێتەدەرەوەو یەك کەسیان نامێنێت هەموو دەمرن و جووڵەیان لێ دەبڕێت، موسڵمانان ئەڵێن: چ پیاوێك خۆیمان بۆ دەکاتە قوربانی بزانێت ئەم دوژمنە چی بەسەر هاتووە؟ پیاوێکیان لە خۆی دەبڕێت بە تەمای ئەوە نیە بگەڕێتەوەو خۆی بە کوژراو دەزانێت، دەڕوات بۆ ناویان دەیانبینێت هەموو مردوون و کەوتوون بەسەر یەکدا، هاوار دەکات: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان! مژدەبێت لێتان خوای گەورە لە جیاتی ئێوە دوژمنەکەتانی لەناو بردووە. ئەوسا موسڵمانەکان لە شارو قەڵاکانیان دێنە دەرەوەو مەڕو ماڵاتەکانیان دەبەن بۆ لەوەڕ هیچ لەوەڕگایەك شك نابەن(لەوماوەیەدا) جگە لە گۆشتی خۆیان، پێی قەڵەو دەبوون بە چاکتر لەوەی لە شوێنێکدا لەوەڕابن.[1] ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتی کردووە.[2] فەرموودەی دووەم: دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە نەوواسی کوڕی سیمعانی کیلابیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەیانیەك باسی دەججالی بۆ کردین، زۆر نزمی دەکردەوەو بە سوك سەیری دەکرد، زۆریشی بەرزدەکردەوەو ئەو کارانەشی کە لە توانای خەڵکیدا نەبوو باسی کرد: هەتا وامان زانی کە لەناو هەندێ لەباخە خورماکانی نزیکماندایە، کە چووین بۆ لای خورماکانەوە پێغەمبەر (ﷺ) بە دەم و چاوماندا هەستی پێکردین، پرسیارمان لێ کرد: تۆ بەیانی باسی دەججالت بۆ کردین زۆر نزمت دەکردەوەو زۆریش بەرزت کردەوە، هەتا وامانزانی لەناو هەندێ لە دارخورماکاندایە، فەرمووی: (دەججال هیچ نیە، ئەوەی کە زۆر لێی دەترسم بۆی لە ئێوە دەججال نیە، ئەگەر دەججال بێت من لەناوتاندا بم من دژایەتیو بەرهەڵستی دەکەم لە جیاتی ئێوە، ئەگەر بێت و من لە ناوتاندا نەبم هەر

---

[1] أحمد (٧٧/٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] ابن ماجه (١٣٦٣/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

کەسێك لە ئێوە با بەرهەڵستی لە خۆی بکات، خوای گەورە لە جیاتی منە بۆ هەموو موسڵمانێك، دەججال لاوێکی مووگرژو لوولە، چاوی وەك بۆڵە ترێ بەرز بووەتەوە، لە نێوانی شام‌و عێراقدا پەیدا دەبێت، بە ڕاست‌و چەپدا خراپە‌و فەساد بڵاودەکاتەوە، ئەی بەندەکانی خوا خۆڕاگربن. وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چەندێ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بە ئەندازەی ساڵێکە، ڕۆژێکی تری بە ئەندازەی مانگێکە، ڕۆژێکی تری بە ئەندازەی هەفتەیەکە، ڕۆژەکانی تری وەك ڕۆژەکانی تری ئێوە وایە، پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو ڕۆژەی کە بە ئەندازەی ساڵێکە نوێژی ڕۆژێکی ئێمەی بەسە؟ فەرمووی: نەخێر، بە ئەندازەی ڕۆژەکانی خۆتان حیسابی بکەن، وتیان: پێغەمبەری خودا (ﷺ) پەلە‌و خێرایی لە زەویدا چۆنە؟ فەرمووی: وەك بارانێکە کە بای لە پشتەوە بێت، بەسەر گەلێکدا دەڕوات‌و بانگیان دەکات، باوەڕی پێ دەهێنن‌و فەرمانی بەجێ دێنن، فەرمان دەکات بە ئاسمان باران دەبارێنێت، فەرمان دەکات بە زەوی کشتوکاڵ دەڕوێنێت، مەڕومالآتیان ئێوارە کە دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە بەرزو گوان پڕو کەلەکە هەڵئاوساوە، پاشان بەسەر گەلێکی تردا دەڕوات، بانگیان دەکات، فەرمانی بەجێ ناهێنن، لێیان دەگرێتەوە هەموو هەژار دەبن، لە ماڵ‌و سامانی خۆیان هیچیان بە دەستەوە نامێنێت، بە لای کەلاوەدا دەڕوات، بە کەلاوەکە دەڵێت هەرچی گەنجینەت هەیە بیخەرە دەرێ، هەرچی هەیە وەك شاژنی هەنگ شوێنی دەکەوێت، لە پاشان فەرمان دەکات پیاوێك بکوژن، بە شمشێر لێی دەدات، دەیکات بە دوو پارچەوە، نێوانی پارچەکانی بە ئەندازەی ئەوەی تیر بگرێتە نیشان لێك دوورن، لە پاشان بانگی دەکات بە پێکەنین‌و ڕوخۆشیەوە دێتەوە لای. لەو کاتەدا کە دەججال لەسەر ئەو حاڵەیە، خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) دەنێرێت لە لای منارە سپیەکە لە لای ڕۆژهەڵاتی دیمەشقەوە دێتە خوارەوە. لەناو دوو پشتەماڵدایە دەستی ناوەتە سەر باڵی دوو فریشتە، عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) شوێنی دەججال دەکەوێت تا بەر دەرگای شاری لود (لُدّ) دەیگاتێ‌و دەیکوژێت. ئا لەو کاتەدا خوای گەورە عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ئاگادار دەکات‌و دەفەرموێت: هەندێ لە بەندەکانی وەدەرناوە، هیچ کەس توانای نیە شەڕیان لەگەڵ بکات، بەندەکانم ببە بۆ کێوی توور لەوێ پارێزگاریان لێ بکە، خوای گەورە یەئجوج‌و مەئجوج دەنێرێت وەك دەفەرموێت: ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ﴾ لە هەموو بەرزاییەکەوە دێنە خوارەوە، عیساو هاوەڵەکانی لە خوا دەپاڕێنەوە، خودا کرمێکیان لەناو ملیاندا بۆ دەنێرێت، بە یەك جار وەك یەك نەفەر دەمرن، لە پاشان عیساو هاوەڵەکانی لە کێوی تور دێنە خوارەوە، هیچ ماڵێك نامێنێت لە زەویدا کە لاشەو بۆنی پیسی ئەوان پڕی نەکردبێت، عیسا پێغەمبەرو (سەلامی خوای لێ بێت) هاوەڵەکانی لە خوا دەپاڕێنەوە، خوای

گەورە مەلێك دەنێرێت وەك ملی وشتر گەورەیە ئەو لاشانە هەڵدەگرن‌و فرێیان دەدەنە ئەو شوێنەی کە خودا فەرمانی داوە، ئیبنو جابیر دەڵێت: عەتای کوڕی یەزیدی سەکسەکی بۆی گێڕامەوە لە (کەعبە) وە دەڵێت: فڕێیان دەدەنە مەهبەل ، ئیبنو جەریر دەڵێت: گوتم ئەی ئەبو زەید، مەهبەل کوێیە؟ وتی: خۆرهەڵات. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خوای گەورە بارانێك دەبارێنێت چل ڕۆژ دەخایەنێت هیچ ماڵ‌و چادرێك نامێنێت بەرگەی بگرێت، خوا بەو بارانە زەمین دەشواتەوە وەك مینای لێ دەکات (زۆر جوانی دەکات) پاشان خودا فەرمان بە زەمین دەکات درەختی میوەدار بڕوێنەو بەرەکەتەکەت بێنەرەوە، دەڵێت: عەشیرەتێکی گەورە لە هەنارێك دەخۆن، لەبەر سێبەری توێکڵەکەیدا دادەنیشن، بەرەکەت دەکەوێتە شیرەوە بە شێوەیەك وشترێکی تازەزاو بەشی عەشیرەتێك دەکات، مانگایەکی تازەزاو بەشی کۆمەڵێك لەو عەشیرەتە دەکات، مەڕێکی تازەزاو بەشی خێڵێك دەکات دەڵێت: لەسەر ئەو حاڵە دەبن، خوا بایەکی بۆن خۆش دەنێرێت، لە بن باخەڵیان دەدات‌و هەرچی موسڵمانە دەمرێت –یان وتی: هەرچی خاوەنباوەڕە دەمرێت– خەڵکی خراپ‌و لەڕێ لادەرو بەدخو دەمێننەوە، وەك کەرگەل لە لای یەکتریدا لەیەك هەڵدێن قیامەت لەکاتی ئەواندا هەڵدەسێت.[1] موسلیمیش بە تەنها ڕیوایەتی کردووە.[2] بوخاریی لەگەڵ نیە، ولەگەڵ خاوەنی سونەنەکانی تر ڕیوایەتی کردووە لە چەند ڕێگاوە. تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاك‌و ڕاستە (حسن صحیح).[3] فەرموودەی سێیەم: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو حەرمەلەوە ئەمیش لە پوریەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتارێکی دا پەنجەی پیرۆزی پێچابوو بە هۆی گەستنی دووپشکێکەوە فەرمووی: (ئێوە ئەڵێن دوژمنتان نەماوە، بەڵام ئێوە بەردەوام شەڕ لەگەڵ دوژمندا دەکەن، هەتا یەئجوج‌و مەئجوج دێن، ڕوومەت پان‌و خڕو گۆشتن وەك قەلغانی دوو چین وایەو چاو بچکۆلەو سورحاڵن (ڕوومەت سوورن) لە هەموو بەرزاییەکەوە دێنە خوارەوە).[4] هەر بەم شێوەیە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە فەرموودەکەی موحەمەدی کوڕی عەمرەوە ئەمیش لە خالیدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حەرمەلەی مودلەجەوە ئەمیش لە پورێکیەوە کە هەر بەم شێوەیە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە.[5] لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) حەجی کەعبەی پیرۆزی کردووە. ئیمامی ئەحمەد

---

[1] أحمد (٥/١٨١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٤/٢٢٥٠).

[3] ابو داود (٤/٤٩٦)، تحفة الأحوزي (٦/٤٦٩)، النسائي في الکبری (٦/٢٣٥)، ابن ماجه (٢/١٣٥٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] أحمد (٥/٢٧١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] ابن ابي حاتم (٨/٢٤٦٧).

ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان دوای دەرچوون و هاتنی یەئجوج و مەئجوجیش حەج و عەمرەی ئەم ماڵە (واتە: کەعبەی پیرۆز) دەکرێت. بوخاری خۆی بە تەنها ڕیوایەتی کردووە.[1] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ﴾ واتە: بەڵێنە ڕاستەکە،خەریکە کە نزیك ببێتەوە واتە: ڕۆژی قیامەت، کاتێك کە بومەلەرزەو لافاوو بەلاو مەینەتی زۆربوو ڕۆژی قیامەت نزیك دەبێتەوەو کە قیامەت هات خوانەناسان ئەڵێن: ئەمە ڕۆژێکی زۆر گران و مەینەتیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: لە پڕ لەو کاتەدا چاوی خوانەناسان ئەبلەق دەبێت لە ناڕەحەتی ئەو شتە گەورانەی کە بە چاوی خۆیان دەیبینن، ئەڵێن: هاوارو واوەیلا بۆ ئێمە ﴿يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا﴾ واتە: هاوارو مەرگ بۆ ئێمە لە دنیادا خۆمان لەمە بێ ئاگا کرد، ﴿بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾نا،بەڵکو ئێمە زۆر دار بووین، واتە: دان دەنێن بەوەی کە خۆیان ناهەقیان بە خۆیان کرد، بەڵام پەشیمانی هیچ سودێکمان پێ ناگەیەنێت.

﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨ لَوۡ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٩٩ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ ١٠٠ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ١٠٢ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ١٠٣﴾

**بتپەرستان و خواکانیان سوتەمەنی جەهەنەمن**

خوای گەورە ڕووی وتەی دەکاتە خەڵکی مەککە لە بتپەرستانی قورەیش و ئەوانەی کە وەك ئەوان بت و دارو بەرد دەپەرستن دەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێوەو ئەوانەش دەتانپەرستن جگە لە خوا (دەبنە) سوتەمەنی و هەڵگیرسێنەری دۆزەخ. ئیبنو عەبباس دەڵێت: سوتەمەنی جەهەنەم.[2] وەك ئەم ئایەتەیش کە دەفەرموێت: ﴿وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ

---

[1] أحمد (٣/٢٧)، البخاري (١٥٩٣).

[2] القرطبي (١١/٣٤٣).

وَٱلْحِجَارَةُ ﴾[١] واتە: کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیو بەردە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: ﴿حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ واتە: داری جەهەنەم، بە زمانی زنجی. موجاهیدو عیکریمەو قەتادەش دەڵێن: داری جەهەنەم. زەححاك دەڵێت: ﴿حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ واتە: ئەوشتەی پێی فڕێ دەدرێتە ناو جەهەنەم.[٢] کەسانی تریش جگە لەو هەر وایان وتووە.[٣] ﴿أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾ واتە: دەبێت هەر بچنە ناویەوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا﴾ واتە: ئەگەر ئەوانە (بتەکان) خوا بوونایە نەدەچوونە ناو ئەو (ئاگری دۆزەخ)ەوە، ﴿وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ واتە: پەرستراوەکانو ئەوانەشی کە دەیانپەرستن هەموو دەچنە ناویو تاهەتایە تێیدا دەمێننەوە. ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ﴾ واتە: لەناو جەهەنەمدا هەناسە دەدەن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴾[٤] مەبەست بە ﴿زَفِيرٌ﴾ هەناسە دانەوەیە بە ﴿وَشَهِيقٌ ﴾ یش هەناسە هەڵکێشانە. ﴿وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ﴾ واتە: لەناو جەهەنەمدا هیچ نابیسن.

**باسی ژیانی بەختەوەران**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ﴾ واتە: بێگومان ئەوانەی لە لایەن ئێمەوە پێشتر بەختەوەریان بۆ بڕیار دراوە ، عیکریمە دەڵێت: بەر بەزەی خۆمانمان خستون. کەسانی تر بێجگە لەم وتوویانە: بەختەوەرمان کردوون، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴾[٥] واتە:ئەوانە لەدۆزەخ دووردەخرێنەوە. کاتێك خوای گەورە باسی خەڵکی ناو ئاگرو جەزرەبەیانی کرد بەهۆی ئەوەی کە موشریك بوون دێتە سەر باسی بەختەوەران، ئەوانەی کە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکانی هەبووە، خوای گەورە لە پێشەوە بڕیاری داوە کە بەختەوەرنو کاری چاکیشیان لە دنیادا کردووە. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾[٦] واتە: بۆ ئەوانەی

---

[١] التحريم (٦).

[٢] الطبري (١٨/٥٣٦).

[٣] الطبري (١٨/٥٣٦).

[٤] هود (١٠٦).

[٥] الطبري (١٨/٥٤١).

[٦] يونس (٢٦).

چاكەیان كردووە پاداشتی چاكتر (بەهەشت)و زیاتریان بۆ هەیە. وە دەفەرمووێت: ﴿ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴾[1] واتە: ئایا پاداشتی چاكە هەر چاكە نیە؟، وەك چۆن لە دنیادا چاكەیان كردووە خودایش چاكەی لەگەڵ كردوون‌و پاداشتی چاك‌و شوێنی باشی پێداون، پاشان دەفەرمووێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ١٠١ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَا﴾ واتە: ئەوانە دوورن لە جەهەنەمەوەو گوێیان لە كڵپەی نابێت كە لاشە دەسوتێنێت، ﴿فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ واتە: دەیانپارێزێت لەو شتانەی كە جێی ترس‌و بیمن، ئەوەیش ئارەزووی دەكەن‌و پێیان خۆشە لەبەر دەمیاندایە. وتراوە: ئایەت هاتووەتەخوارەوەو عیساو عوزەیر پێغەمبەری جیاكردووەتەوە لە پەرستراوەكانی تر. وەك حەجاجی كوڕی موحەممەدی ئەعوەر وتوویەتی لە ئیبنو جورەیج‌و عوسمانی كوڕی عەتا، لە عەتاو ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾ووتویانە: دوای ئەمە خودا ئەمەی جیاكردووەتەوەو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی لە پێشوودا بڕیارمان دا چاكەیان لەگەڵ بكەین، ئەوانە لە جەهەنەمەوە دوورن. وەك فریشتەكان‌و عیسای كوڕی مەریەم‌و ئەوانەشی وەك ئەمانن كە پەرستراون بێجگە لە خوای گەورە. عیكریمەو حەسەن‌و ئیبنو جورەیجیش هەر وایان وتووە.
موحەممەدی كوڕی ئیسحاقی كوڕی یەسار لە سیرەتەكەیدا وتوویەتی: وەك پێم گەیشتووە، ڕۆژێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) دانیشتبوو لەگەڵ وەلیدی كوڕی موغیرە لەناو مزگەوتدا. نەزری كوڕی حارس هات لەگەڵیان دانیشێت، زۆرێك لە پیاوانی قورەیش لە مزگەوت بوون، پێغەمبەری خودا (ﷺ) قسەی دەكرد نەزری كوڕی حارس بووە هاوقسەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) قسەی بۆ كرد هەتا كۆڵی پێداو لە قسەی خست، ئەم ئایەتەی بەسەر ئەوو قورەیشیەكانی تریشدا خوێندەوە: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ٩٨ لَوۡ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٩٩ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ﴾ پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵساو ڕۆیشت، عەبدوڵای كوڕی زیبەعری سەهمی هات‌و دانیشت لەگەڵیان، وەلیدی كوڕی موغیرە وتی بە عەبدوڵای زیبەعری، بە خوا نەزری كوڕی حارس لەبەر كوڕی عەبدولموتەلیب نەیدەزانی چی بكات، موحەممەد دەیوت ئێوەو ئەوانەی ئێمە دەیانپەرستین لەم خودایانەمان سوتەمەنی جەهەنەمین، عەبدوڵای كوڕی زیبەعری وتی: سا بە خوا ئەگەر چاوم پێی بكەوتایە وەڵامم دەدایەوە،

[1] الرحمن (٦٠).

پرسیار لە موحەمەد بکەن گشت ئەوانەی کە پەرستراون و ئەوانەش پەرستوویانن پێکەوە ئەخرێنە جەهەننەم؟ خۆ ئێمە فریشتەکان دەپەرستین جولەکەیش عوزەیر دەپەرستن و گاوریش عیسای کوڕی مەریەم دەپەرستن، وەلیدو ئەوانەی کە لە مەجلیسەکەدا بوون قسەکەی عەبدوڵای کوڕی زیبەعریان بە لاوە سەیر بوو، وایان زانی کە عەبدوڵا بەڵگەی تەواوەو وەڵامی پێغەمبەری خودا (ﷺ)ی داوەتەوەو زاڵ دەبێت بەسەریدا، ئەو قسەی عەبدوڵایان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (هەموونەوانەی پێیان خۆشە لەگەڵ خوادا بپەرسترێن ئەوەلەگەڵ ئەوەدایە کە پەرستوویەتی ،ئەوانە بەدڵنیایەوە شەیتان ئەپەرستن وەهەر کەسێك فەرمانی پێی پێداون شەیتان بپەرستن) خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَـٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسۡمَعُونَ حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ﴾ واتە: عیساو عوزەیرو ئەوانەشی پەرستراون لە زانایانی گاورو جولەکە کە ژیانیان لە خواپەرستیدا بەسەربردووە کۆمەڵێك نەزان و شوێنکەوتووی پڕوپوچ هەڵساون پەرستوویانن و کردویانن بە شەریکی خودا، وە لەو بارەیشەوە ئایەت هاتەخوارەوە کە باسیان دەکرد کە فریشتە دەپەرستن و ئەو فریشتانەش کیژی خودان. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾[1] واتە: (وە بێباوەڕان) وتیان خوای میهرەبان منداڵی بۆ خۆی بڕیارداوە (کە فریشتەکانن) پاك و بێگەردە خوا (لەم شتانە) بەڵکو ئەوانە (فریشتە) بەندەی ڕێزلێگیراوی خودان لە خوایش پێش ناکەون بە قسەو وتە وە ئەوانە بەرفەرمانی خوا دەکەن، (خوا) دەزانێ و ئاگادارە بە ئەوەی کە دنیا لەبەر دەستیاندایەو بە ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا بۆیان ئامادە کراوە. وە (فریشتەکان) تکا ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت (خوا) ڕازی بێت (تکای بۆ بکرێت) وە ئەوان (فریشتەکان) لە ترس و هەیبەتی خوا زۆر دەترسن. وە هەر کام لەوانە (فریشتەکان) بڵێ بێگومان منیش پەرستراوم جگە لە خودا ئەوە بە (ئاگری) دۆزەخ تۆڵەی لێ دەسەنین هەر بەو جۆرە پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوەو تۆڵەیان لێ دەکەینەوە)، وە ئایەتیش لە بارەی عیسایشەوە هاتەخوارەوە کە دەپەرسترێت (بێجگە لە خوا) وەلیدو ئەوانەی کە ئامادە بوون سەریان سوڕما لەو گێچەڵ و شەڕفرشتنەی عەبدوڵای کوڕی زیبەعریە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا

[1] الانبیاء (٢٦ـ٢٩).

قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا﴾[1] واتـه: وه کاتێك عیسای کوڕی مەریەم بە نموونـه هێنرایەوە دەست بەجێ گەلەکەت دەیکەنـه هـاوارو قیژەی خۆشی (وا دەزانن قسەی ئەوان بەسەر قسەی پێغەمبەردا (ﷺ) سەرکەوتووە)، دەڵێن ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترە یان عیسا، ئەوانە نموونەی عیسایان تەنها بۆ دەمبازی بۆ دەهێنایەوە (وا نیە کە دەیڵێن) بەڵکو ئەوانەی گەلێکی زۆر دەمەقاڵێ کەرن، عیسا هیچ نیە جگە لە بەندەیەك کە بەهرەمان ڕشتووە بەسەریدا وە کردوومانە بە نموونە بۆ نەوەی ئیسرائیل، ئەگەر بمانویستایە لە جیاتی ئێوە فریشتەمان دادەنا لە زەویدا دەبوونە جێنشینی ئێوە، وە بێگومان (دابەزینی عیسا بۆ سەر زەوی) یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت کەواتە دەربارەی قیامەت هیچ گومانتان نەبێت ڕاستە، واتە: ئەوەی لەسەر دەستی عیسا پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێ بێت) وەدیم هێنا لەو نیشانانە وەك زیندووکردنەوەی مردوو و چاککردنەوەی نەخۆش، ئەوە یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت ﴿فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾[2] واتە: گومانت لە هاتنی نەبێت پەیڕەوی هەر لە من بکەن، ئەمە ڕێگەیەکی ڕاستە.[3] ئەوەی کە ئیبنو زیبەعری دەڵێت هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە ڕووی قسەی کردووەتە خەڵکی مەککە کە ئەو بتانەیان دەپەرست کە دارو بەرد بوون و بێ ئاوەز بوون، بۆ ئەوەی سەرزەنشت و هەڕەشە بێت بۆ ئەوانەی کە ئەو بتانە دەپەستن، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ واتە: ئیتر چۆن ئەمە بەکاردەهێنرێت بۆ عیساو عوزەیر پێغەمبەرو ئەو کەسانەی وەك ئەمان ئاکار چاك بوون و ڕازی نەبوون بە پەرستنی ئەو کەسانەی کە پەرستوویانو کردویانن بە هاوەڵی خودا. پاشان خوای گەورە دێتە سەر وەسفی خاوەن باوەڕان و دەفەرمووێت: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ﴾ واتە: ترسە گەورەکە غەمباریان ناکات، وتراوە مەبەست بە ﴿ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ﴾ مردنە، عبدوڕڕەززاق ڕیوایەتی کردووە لە یەحیای کوڕی ڕەبیع و لە عەتاوە، ئیبنو

---

[1] الزخرف (٥٧ـ٦١).

[2] الزخرف (٦١).

[3] ابن هشام (١/٣٨٤).

عەبباس و عەوفی دەڵێن: مەبەست بە ﴿ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ﴾ فووکردنە بە کەڵەشاخدا.[1] ئەبو سینان (سەعیدی کوڕی سینانی شەیبانیش) هەر وای وتووە. ئیبنو جەریریش لە تەفسیرەکەیدا هەمان ڕای هەیە، ﴿وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ واتە: فریشتەکان پێیان دەگەن ئەڵێن: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە بەڵێنتان پێدرابوو، فریشتەکان مژدەیان دەدەنێ کاتێك لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت. ﴿هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ واتە: ئومێدەواری خۆشی و کامەرانی بن.

﴿يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِۚ كَمَا بَدَأۡنَآ أَوَّلَ خَلۡقٖ نُّعِيدُهُۥۚ وَعۡدًا عَلَيۡنَآۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾﴾

### هەڵپێچانی ئاسمان لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە دەفەرموێت لە ڕۆژی قیامەتدا: ﴿يَوۡمَ نَطۡوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِ﴾ واتە: ئاسمان وەك تۆماری نووسین هەڵدەپێچرێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ﴾[2] واتە: (کافران) خوایان نەناسیوە و بە گەورەیان نەزانی بەو جۆرەی شیاوێتی لە ڕۆژی دواییدا هەموو زەوی لە چنگی ئەودایە و ئاسمانەکانیش بە دەستی ئەو ئەپێچرێنەوە، خوا پاك و بڵندترە لەوەی دەیکەنە هاوبەشی. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو زەمین لە مستی دەگرێت ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستی)، بوخاری بە تەنها ڕیوایەتی کردووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).[3] وە دەفەرموێت: ﴿كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلۡكُتُبِ﴾ مەبەست بە ﴿ٱلسِّجِلِّ﴾ کتێبە. سودی دەڵێت لەم ئایەتەدا ﴿ٱلسِّجِلِّ﴾ ئەو فریشتەیە کە دەفتەری مرۆڤ پێ ی پسپێردراوە، کاتێك کە خەڵکی مردن کتێبەکەیان دەباتەوە بۆ تۆمارگەو دەیپێچێتەوەو هەڵیدەگرێت بۆ ڕۆژی قیامەت. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ﴿ٱلسِّجِلِّ﴾ دەفتەرە.[4] عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو عەوفیش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو

---

[1] الطبري (١٨/٥٤٢).

[2] الزمر (٦٧).

[3] فتح الباري (١٣/٤٠٤).

[4] الطبري (١٨/٥٤٣).

عەبباسەوە.[1] موجاهدیو قەتادەو کەسانی تریش هەروایان وتووە.[2] ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە چونکە ئەم مانایە لە زمانەوانیدا دیارو ناسراوە، بەم پێیە مانای ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ نَطْوِي ٱلسَّمَآءَ كَطَيِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ﴾ واتە: ئاسمانەکان ئەخرێنەسەر یەك وەك چۆن کتێب ئەخرێنە سەر یەکتری وئەپێچرێنەوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ﴾[3] واتە: ئینجا کاتێك هەردووکیان ملکەچ بوون (بۆ فەرمانی خوا)و ئیبراهیم ئیسماعیلی بە ڕوودا خستە سەر زەوی. یانی (للجبين) مانای (على الجبين) ی تێدایە وەك (للكتب) مانای (على الكتب)ی تێدایەو لە زماندا وێنەی ئەمە زۆرە، والله أعلم. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ واتە: ئەمە هەر ڕوودەداتو گومانی تێدا نیە، ڕۆژێك دێت جارێکی تر دروستیان دەکەینەوە وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کردوون، وە ئەمە بەڵێنی خودایە هەر دەبێت بێتەجیٚو خوای گەورە لە بەڵێنی خۆیدا نکوڵی ناکاتو خاوەنی تواناو دەسەلاتێکی بیٚ پایانە، بۆیە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ واتە: بێگومان ئێمە (ئەو بەڵێنە) بەدی دەهێنین. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە نێوانماندا هەڵساو ئامۆژگاری کردین فەرمووی: (ئێوە (کۆ) دەکرێنەوەو دەچنە خزمەت خودای مەزن بەپێی پەتیو بەڕوتو قوتیو خەتەنە نەکراوی !﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾ واتە: وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کرد دیسان دروستیان دەکەینەوە، بەڵێنێکە لە ئێمەوە هەر دەشیکەین).[4] جافەرموودەکە بە تەواوی باس دەکات،ئەم فەرمودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. بوخاری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە کتێبەکەیدا باسی کردووە[5].

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِى هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوْمٍ عَٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾﴾

**ئەم زەویە بۆ پیاو چاکان دەمێنێتەوە**

---

[1] الطبري (١٨/٥٤٣).

[2] الطبري (١٨/٥٤٣).

[3] الصافات (١٠٣).

[4] أحمد (١/٢٣٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] فتح الباري (٨/٢٩٢)، مسلم (٤/٢١٩٤).

خوای گەورە باسی ئەوە دەكات كە بڕیارێكەو داویەتیو گەڕانەوەی بۆ نیە كە بەختەوەریو سەرفرازی هەر بۆ عەبدە چاكەكانیەتی لە دنیاو لە قیامەتدا، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ واتە: لە زەبوردا دوای زیكر ﴿الذِّكْرِ﴾ نوسیومانە، ئەم زەمینە هەر بۆ بەندە چاكەكانمان دەمێنێتەوە. وەك لەم ئایەتانەشدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾[1] واتە: بێگومان هەموو زەوی مولكی خوایە دەیدات بە هەر كەس لە بەندە (شیاوە) كانی كە خۆی بیەوێتو سەرئەنجامی چاك بۆ خوانەناسانە. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەركەوتوو دەكەین لە ژیانی دنیاداو لەو ڕۆژەی (قیامەت) كە شایەتەكان هەڵدەسنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ﴾[3] واتە: خوا بەڵێنی داوە بەو كەسانەتان كە باوەڕیان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە كە بێگومان دەیانكاتە جێنشینی (خەڵكی تر) لە زەویدا هەروەك (ئیماندارانی) پێش ئەمانی كردە جێنشینو ئاینەكەیان بۆ دەچەسپێنێت ئەو (ئاینە)ی كە خوا پێی ڕازی بووە بۆیان. وە خوای گەورە هەواڵی داوە كە ئەمە لە كتێبی شەرعیو لەكتێبی قەدەریشدا نووسراوەو هەر دەبێت ڕوویداتو گومانی تێدا نیە، بۆیە خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ﴾ ئەعمەش دەڵێت: پرسیارم كرد لە سەعیدی كوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ﴾ وتی: زەبوور تەوراتو ئینجیلو قورئانە.[4] موجاهید دەڵێت: زەبوور واتە كتێب.[5] ئیبنو عەبباسو شەعبیو حەسەنو قەتادەو كەسانی تریش وتوویانە: زەبوورئەو كتێبەیە كە بۆ داود هاتووە، زیكریش ﴿الذِّكْرِ﴾ دایكی كتێبە (أم الكتاب) لە لای خوایە.[6] زەیدی كوڕی ئەسلەمیش هەروای

---

[1] الاعراف (١٢٨).
[2] الغافر (٥١).
[3] نور (٥٥).
[4] الطبري (٥٤٧/١٨).
[5] الطبري (٥٤٧/١٨).
[6] الطبري (٥٤٧/١٨).

وتووە: واتە: کتێبی یەکەمە. سەوری دەڵێت: لەوحولمەحفوزە. موجاهید دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ﴿أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّـٰلِحُونَ﴾ واتە: زەمینی بەهەشت.[1] ئەبولعالیەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو شەعبیو قەتادەو سودیو ئەبو سالحو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو سەوریش هەر وایان وتووە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي هَـٰذَا لَبَلَـٰغًا لِّقَوۡمٍ عَـٰبِدِينَ﴾ واتە: بێگومان لەمەدا (کە لەم سورەتەدا باس کرا) بەسەو زیاتر پێویست ناکات بۆ گەلی خواپەرستان. واتە: ئەم قورئانەی کە ناردوومانە بۆ بەندەی خۆمان موحەممەد (ﷺ)(لبلاغاً) بانگەوازێکە: پڕە لە خێرو بەرەکەتێکی نەبڕاوەو بێ کۆتایی بۆخواناسان، ئەوانەی کە خواپەرستیان کردووە بەو جۆرەی کە خوا ڕازیەو پێی خۆشەو ڕێزی خواپەرستیو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوایان داوە بەسەر گوێڕایەڵی شەیتانو ئارەزووەکانی خۆیاندا.

### موحەممەد (ﷺ) خێرو بەزەییە بۆ خەڵکی گشت دنیا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان. خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە موحەممەدی ناردووە بە ڕەحمەتو بەزەیی بۆ هەموو خەڵکی سەر زەمین، واتە: بە گشتیو بەبێ جیاوازی هەر کەسێك ئەم چاکەیەی وەرگرتو سوپاسی ئەم بەهرەیەی کرد لە دنیاو لە قیامەتدا بەختەوەرە. هەر کەسیش وەری نەگرتو بڕوای پێ نەکرد لە دنیاو قیامەتدا دۆڕاوەو زەرەرمەندە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرًا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ﴾[3] واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە لە جیاتی (سوپاسی) بەهرەو چاکەی خوا بێباوەڕو سپڵە بوونو گەلەکەیان بەرەو هەڵدێر برد، ئەویش دۆزەخە کە دەچنە ناوی کە ئارامگەیەکی زۆر خراپە. وە لە بارەی وەسفی قورئانەوە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدًى وَشِفَآءٌۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٌ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ أُوْلَـٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ﴾[4] واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێك باوەڕیان پێی هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانەو ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لە گوێیاندا گرانیو کەڕی هەیە (لە بیستنی هەق)

---

[1] الطبري (١٨/٥٤٩).

[2] الطبري (١٨/٥٤٩/٥٥٠).

[3] ابراهيم (٢٨ـ٢٩).

[4] فصلت (٤٤).

هەروەها لە ئاست ئەو قورئانەدا کوێرن ئەوانە لە شوێنێکی زۆر دوورەوە بانگ دەکرێن. موسلیم لە سەحیحەکەیدا دەڵێت: ئیبنو ئەبی عومەر بۆی گێڕاینەوە، مەروانی فەزاری بۆی گێڕاینەوە، لە یەزیدی کوڕی کیسانەوە، لە ئەبو حازمەوە، لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نزا بکە لە موشریکەکان، فەرمووی: (من بۆ ئەوە ڕەوانە نەکراوم نەفرەت بم، بەڵکو ڕەوانەکراوم ڕەحمەت بم) تەنها موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی ئەبو قوڕڕەی کیندیەوە دەڵێت: حوزەیفە لە مەدائین بوو، باسی هەندێ شتی دەکرد کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی، حوزەیفە هات بۆ لای سەلمان، سەلمان وتی: ئەی حوزەیفە پێغەمبەری خودا (ﷺ)کە تووڕە دەبوو فەرمایشتی دەفەرموو، کە ڕازیش دەبوو هەر فەرمایشتی دەیفەرموو، من ئاگادارم پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتاری دەدا فەرمووی: (هەر پیاوێك لە ئومەتی من قسەیەکم پێی وت لە کاتی تووڕەیمدا یان نەفرەتێکم لێکرد، بێگومان منیش نەوەیەکم لە نەوەکانی ئادەم، تووڕە دەبم وەك چۆن ئێوە تووڕە دەبن، بە ڕاستی خودا منی ڕەوانە کردووە بەزەیی‌و چاکە بم بۆ هەموو خەڵکی دنیا، بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدائەو قسەو نەفرەتانە دەکەمە دوعاو پاڕانەوە بۆی).[2] ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئەحمەدی کوڕی یونسەوە، لە زائیدەوە.[3] ئەگەر بوترێ: باشە چ ڕەحمەتێکی دەستکەوتووە ئەوکەسەی کە بڕوای بەپێغەمبەر نەهێنابێ؟ وەڵامەکەی، ئەوەیە کە جەعفەری کوڕی جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ﴾ئەڵێت: ئەوەی بڕوای هێناوە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، ئەوە ڕەحمەت‌و بەزەیی خودای بۆ نووسراوە لە دنیاو لە قیامەتدا، ئەو کەسەشی بڕوای نەهێناوە بە خوداو بە پێغەمبەرەکەی، چاوپۆشی لێکراوە لەو شتانەی تووشی گەلەپێشوەکان هاتووە لە چوونە خوارەوە بەناو زەویداو لە بەردەباران‌و قڕبوون[4].

﴿ قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمۡ إِلَـٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ ءَاذَنتُكُمۡ عَلَىٰ سَوَآءٖۖ وَإِنۡ أَدۡرِيٓ أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٞ مَّا تُوعَدُونَ ﴿١٠٩﴾ إِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلۡجَهۡرَ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡتُمُونَ ﴿١١٠﴾ وَإِنۡ أَدۡرِي لَعَلَّهُۥ فِتۡنَةٞ لَّكُمۡ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿١١١﴾ قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾

---

[1] مسلم (٢٠٠٦/٤).

[2] احمد (٤٣٧/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أبو داود (٤٥/٥).

[4] الطبري (٥٥٤/١٨).

## وەحی بە کورتی واتە: خوا بە تەنهاپەرستن

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بڵێ بە موشریکەکان: ﴿قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ واتە: من فەرمانم پێدراوە کە پێتان بڵێم کە خوداتان یەکە، ئایا ئێوە شوێنی قسەکەم دەکەون و خۆتان دەدەن بە دەستەوەو مل دادەنەوێنن، ﴿فَإِن تَوَلَّوْا﴾ واتە: ئەگەر وازیان هێنا شوێنت نەکەوتن، ﴿فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ﴾ واتە: وا من ئاگادارم کردن کە من دوژمنی ئێوەمو ئێوەش دوژمنی منن، من هیچ پەیوەندیەکم بە ئێوەوە نیەو ئێوەش لە منەوە دوورن و هیچ پەیوەندیەکتان بە منەوە نیە، وەك ئەم ئایەتەیش کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر ئەڵێن: تۆ درۆ دەکەی، بڵێ: کاری خۆم بۆ خۆمو کاری ئێوەش بۆ خۆتان، ئێوە لە کاری من بەرین و منیش بەریم لەو کارەی ئێوە دەیکەن. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ﴾[2] واتە: کاتێك هەستت کرد کە کۆمەڵێك خیانەتت لەگەڵ دەکەن لە سوێند خواردندا، تۆش پەیمانەکە بدەرەوە بەسەریاندا، واتە: وەك یەك ئێوەش پاشگەز ببنەوە. بۆیە لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ﴾ واتە: پێم گەیاندوون، کە من لەگەڵ ئێوە نیمو ئێوەش لەگەڵ من نین، ئەوەی لێی ئاگادار بم دوورین لە یەکتری.

## زانیاری بە هاتنی ڕۆژی قیامەت نیە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: گومانی تێدا نیە کە ڕۆژی قیامەت دێت، بەڵام پێیان بڵێ: نازانم زوو دێت یان ماوەیەك دەخایەنێت، ﴿إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ﴾ واتە: خودا ئاگاداری گشت نهێنیەکانە دەزانێت بەندەکانی چ قسەیەك دەکەن بە ئاشکراو بە پەنهانی، چ کارێکیش دەکەن بە نهێنی و بە ئاشکرا، هیچ شتێك لای خودا شاراوە نیە، لەسەر هەمووی پاداشتیان دەداتەوە کەم بێت یان زۆر، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ واتە: نازانم لەوانەیە تاقیکردنەوەیەك بێت بۆ ئێوە، هەتا ماوەیەکی دیاریکراو ڕابوێرن. ئیبنو جەریر دەڵێت: لەوانەیە

---

[1] یونس (٤١).

[2] الانفال (٥٨).

دواخستنی ئەوە تاقیکردنەوەیەك بێت بۆ ئێوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.[1] عەونیش گێڕاویەتیەوە لە ئیبنو عەباسەوە، والله أعلم. ﴿قَٰلَ رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ﴾ واتە: دەڵێت: ئەی پەروەردگارم تۆ چۆن ڕاستە دادوەری بکەلە نێوان منو هۆزەکەمدا. قەتادە دەڵێت: پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) دەیانوت: ﴿رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ﴾[2] واتە: ئەی خودای پەروەردگارمان تۆ لە نێوان ئێمەو هۆزەکەماندا دادوەری بکە، چاکترین دادوەر هەر خۆتی. خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم دوعایە بکات.[3] لە مالیکەوە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە: کاتێك پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئامادەی شەڕێك ببوایە دەیفەرموو: ﴿رَبِّ ٱحۡكُم بِٱلۡحَقِّۗ﴾ واتە: ئەی پەروەردگار بە دادگەرانە بڕیار بدەن (لە نێوان منو ئەم بێباوەڕانەدا) وە فەرموویەتی: ﴿وَرَبُّنَا ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ واتە: لە بارەی ئەو درۆو دەلەسەو گشت قسە پڕوپوچانەی ئەوانە هەڵیان بەستووە یارمەتی هەر لە خودای مەزن دەخوازین.

## تەفسیری سورەتی (الحج)

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ① يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ②﴾

### ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ﴾ خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە لێی بترسن، وە ئاگاداریان دەکاتەوە کە بەرەو ڕووی مەینەتیو نارەحەتیەکانی قیامەت دەڕۆن، وەك بوومەلەرزەو کارەساتەکانی تری؛ وەك دەفەرموێت: ﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ① وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا﴾[4] واتە: کاتێك زەوی هاتە لەرزە بە لەرزینی

[1] الطبري (١٨/٥٥٤).
[2] الأعراف (٨٩).
[3] القرطبي (١١/٣٥١).
[4] الزلزلة (١ـ٢).

خۆی، وە زەوی هەرچی شتی قورس و گرانی (ناوی) هەیە هەمووی فڕێ دایە دەرەوە. وە دەفەرموویت: ﴿وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ۝١٤ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾[1] واتە: وە زەوی و شاخەکان هەڵگیران بە جارێك دران بە یەکداو تەخت کران، ئەو ڕۆژە ڕووداوی گەورە ڕوو دەدات. وە دەفەرموویت: ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ۝٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا﴾[2] واتە: کاتێك کە زەوی هێنرایە جوڵان بە جووڵەیەکی توند، وە شاخەکان زۆر وردکران بە وردکردن. هەندێ ئەڵێن: ئەم بوومەلەرزەیە لە کۆتایی تەمەنی دنیاو سەرەتای هاتنی ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات، ئیبنو جەریر دەڵێت: لە عەلقەمەوە لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ﴾ دەڵێت: ئەم بوومەلەرزەیە لە پێش ڕۆژی قیامەتدا ڕوودەدات.[3] هەندێکی تریش وتوویانە: نەخێر، ئەو بوومەلەرزەو ترس و مەینەتی و ناڕەحەتیە لە ڕۆژی قیامەتداو لە گۆڕەپانی مەحشەردا ڕوودەدات دوای هاتنە دەرەوە لە گۆڕەکان. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای پەسەند کردووە بەڵگەیشی بەم فەرموودانە هێناوەتەوە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عیمرانی کوڕی حوسەین (حُصین) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە یەکێك لە سەفەرەکاندا فەرمووی کە لە نێوان هاوەڵەکانیدا دەڕۆیشت بە ڕێدا ئەم دوو ئایەتەی بە دەنگی بەرزەوە دەخوێند: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ۝١ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ﴾ کاتێك هاوەڵەکانی گوێیان لێ بوو، پەلەیان بە وڵاغەکانیان کرد کە سواری بوون زانیان کە ئەو ئایەتە دەخوێنێت، وەختێك نزیك بوونەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەو ڕۆژە کامەیە؟ ئەو ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت) بانگ دەکرێت، پەروەردگاری بانگی دەکات دەفەرموویت: ئەی ئادەم کۆمەڵی خۆت بنێرە بۆ ناو دۆزەخ. ئادەم ئەفەرموێ: ئەی پەروەردگار کۆمەڵی ناو ئاگر کامانەن؟ خوای گەورە دەفەرموویت: لە هەموو هەزارێك نۆ سەدو نەوەدو نۆ کەسی بۆ ناو ئاگرو یەك دانە بۆ ناو بەهەشت). وتی هاوەڵەکانی دڵتەنگ بوون و بزەی سەر لێویان نەما، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی بینی فەرمووی: (مزگێنی بێت لێتان و بزانن سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی (ﷺ) بە دەستە، ئێوە لەگەڵ دوو جۆر دروستکراودان ئەوانە هەرگیز لەگەڵ هیچ شتێکدا نەبوون و زۆریان نەکردبێت: یەئجوج و مەئجوج و ئەوانیشی کە تیاچوون لە نەوەی ئادەم و

---

[1] الحاقة (١٤ـ١٥).

[2] الواقعة (٤ـ٥).

[3] الطبري (١٨/٥٥٧).

شەیتان)، دەڵێت: هاوەڵان دەموچاویان گەش بوویەوە ، پاشان فەرمووی: (بزانن و مزگێنی بێت لێتان، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی (ﷺ) بە دەستە، ئێوە لەچاو ئەوانەدا وەك خاڵێك وان لە لاتەنیشتی وشترێکدا یان وەك نیشانەیەك لە دەستی چوارپێیەکدا).[1] هەر بەم شێوەیە تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە کتێبی تەفسیرەکەیاندا لە هەردوو سوننەکاندا، تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی(حسن صحيح)ە.[2] ڕێگایەکی تر بۆ ئەم فەرموودەیە: تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ئەم ئایەتانە هاتە خوارەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ۝١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ﴾ لە سەفەردا بوو، فەرمووی: (ئایا دەزانن ئەوە کام ڕۆژەیە؟ وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باش دەزانن. فەرمووی: (ئەوە ڕۆژێکە کە خودا دەفەرموێت بە ئادەم: کۆمەڵی ناو ئاگر ڕەوانە کە، دەڵێت: ئەی پەروەردگار کۆمەڵی ناو ئاگر کامەن؟ فەرمووی: نۆسەدو نەوەدو نۆ کەسی بۆ ناو ئاگرو یەك کەسی بۆ ناو بەهەشت) موسڵمانەکان دەستیان بە گریان کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خۆتان نزیك خەنەوەو چاکە بکەن، هەرگیز پێغەمبەرێك نەبووە قۆناغێکی نەفامی نەبووبێت بەپێشیەوە، ئەو ژمارەیە لەوانە تەواو ئەکرێت، ئەگەر تەواوی نەکردبێت ئەوە لە دووڕووەکان تەواوکراوە. نموونەی ئێوەو ئەو گەلانە وەك نیشانەیەك وایە لە دەستی چوارپێیەکدا یان وەك خاڵێك وایە لە دەستی وشترێکدا). پاشان فەرمووی: (هیوام وایە ئێوە چواریەکی ئەهلی بەهەشت بن)هاوەڵان "الله أكبر" یان کرد، پاشان فەرمووی: (هیوام وایە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن)، دیسان "الله أكبر"یان کرد. پاشان عیمران وتی: نازانم ئایا ئەوەشی فەرموو کەدووبەش لەسێ بەشی بەهەشت ئێوەن یان نەیفەرموو.[3] هەر بەم شێوەیە ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە.[4] دیسان تیرمیزی دەڵێت ئەمە فەرموودەیەکی ڕاستو چاکە (حسن صحيح)، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو سەعیدەوە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: ئەی ئادەم، ئادەمیش ئەفەرموێ : بەڵێ وا هاتم و لە خزمەتتدام ئەی پەروەردگارم، بە دەنگێك بانگ دەکرێت: خوا فەرمانت پێ دەکات لە نەوەکانت کۆمەڵێك دەربهێنیت بۆ

[1] أحمد (٤٣٥/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الأحوذي (١٢/٩)، النسائي في الكبرى (٤١٠/٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] تحفة الأحوذي (٩/٩)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[4] أحمد (٤٣٢).

ناو ئاگر، دەڵێت: ئەی پەروەردگار کۆمەڵی ناو ئاگر کامەیە؟ئەفەرموێ: لە هەموو هەزارێك (وا دەزانم وتی نۆ سەدو نەوەدو نۆ کەس)، ئا لەو کاتەدا ئەوەی بێچوی (منداڵی) لە زکدایە فرێی دەدات (بەردەخات)و منداڵان سەر سپی دەکەن، ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾ ئەوەندە لەسەر خەڵکی گران و مەینەتیە ڕەنگیان دەگۆڕێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( لە یەئجوج و مەئجوج نۆ سەدو نەوەدو نۆ کەس،ولەئێوەش دانەیەك ئێوە لەناو خەڵکیدا وەك موویەکی ڕەش وان لە لاتەنیشتی گایەکی سپیدا یان وەك مویەکی سپی لە لاتەنیشتی گایەکی ڕەشدا، وە من هیوادارم ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن، دەڵێت: "الله اکبر"مان کرد پاشان فەرمووی: سێیەکی خەڵکی بەهەشت بن، "الله اکبر"مان کرد، پاشان فەرمووی نیوەی خەڵکی بەهەشت بن).[1] دیسان "الله اکبر"مان کرد، بوخاریش دیسان ڕیوایەتی کردووە، لە شوێنی تردا جگە لەم شوێنە.[2] موسلیم ڕیوایەتی کردووەو نەسائیش لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.[3] فەرموودەو ڕووداوی پێشینەکان ئێجگار زۆرە، لە شوێنی خۆیدا باسی لێ دەکرێت بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ﴾لەرزینەوەی ڕۆژی قیامەت شتێکی زۆر گەورەیە.یانی: کارەساتێکی زۆر گەورە ڕووداوێکی زۆر گرنگ و ڕاوەشانێکی ترسناك و بەسەرهاتێکی دڵتەزێن و سەرسوڕهێنەرە، بوومەلەرزە خۆی بۆ خۆی ترس و لەرزە دەخاتە دڵەکانەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾[4] واتە: لەوێدا ئیمانداران تاقیکرانەوەو ڕاوەشێنران بە ڕاوەشاندنێکی توند. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا﴾ ئەمە لە بابی زەمیری شەئنە ، واتە:لەو ڕۆژەدا ئێوە ئەو (بوومەلەرزەیە) دەبینن، ﴿تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ﴾ (لە ترسی ئەو ڕۆژە) هەموو ئافرەتێکی شیردەر) کاتێك مەمکی لەدەمی منداڵەکەیدایە، بۆیە دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مُرْضِعَةٍ﴾ نەیفەرمووە (مُرضِع). وە دەفەرموێت: ﴿عَمَّآ أَرْضَعَتْ﴾ واتە: لە شیرەخۆرەکەی خۆی لە پێش برینەوەی لە شیرخواردن، ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا﴾ واتە: هەرچی سکپڕ هەیە بێچوەکەی فرێ دەدات، پێش ئەوەی کە ماوەی تەواو بکات لەبەر ترسناکی ئەو ڕۆژە، ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ﴾

---

[1] فتح الباري (٨/٢٩٨).

[2] فتح الباري (٦/٤٤٠).

[3] مسلم (١/٢٠١)، النسائي في الكبرى (٦/٤٠٩).

[4] الاحزاب (١١).

وە بە (سَكْرَى)ش خوێندراوەتەوە، واتە: لەبەر ئەو كارەساتە توندو گرانەی تێیكەوتوون ئاوەزی خۆیان لە دەست دەدەنو سەرسام دەبن هەر كەسێك چاوی پێیان بكەوێت وا دەزانێت سەرخۆشن ﴿وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾ واتە: سەرخۆشیش نین، بەڵام سزای خودا زۆر توندو گرانە.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَـٰنٍ مَّرِيدٍ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾ ﴾

**باسی خراپی شوێنكەوتووانی شەیتان**

خوای گەورە باسی خراپی ئەو كەسانە دەكات كە بڕوایان بە ڕۆژی زیندوبوونەوە نەبووەو وتویانە خودا مردوو زیندوو ناكاتەوەو بوونەتە لەمپەر لە ڕێی ئەو پەیامەی كە خودا ناردویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەكانی، لە هەڵسانو كردارو گفتارو بێ ئایینیو لاسارییاندا شوێنی ئەو شەیتانە بەدفەڕانەدا دەكەون لە مرۆڤو جنۆكە، ئەمە كارو پیشەی خەڵكی دوور لە خواو گومڕاكانە، ئەوانەی كە پشت لە هەق دەكەنو شوێنی پڕوپوچ دەكەونو واز لەو پەیامە دەهێنن كە خوا ڕەوانەی كردووە بۆ پێغەمبەرەكەی كە هەقو ئاشكرایەو شوێنی قسەی سەرۆكە گومڕاكانیان دەكەون كە بانگیان دەكەن بۆ ئەو شتانەی بە خەیاڵو ئارەزووی خۆیان بۆیان دادەنێن، بۆیە خوای گەورە لە بارەی ئەو كەسانەو هاوشێوەكانیان دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ واتە: هەندێ كەس هەیە بەبێ ئەوەی هیچ بزانن (واتە: زانیاری ڕاستو تەواو) كێشە لەسەر خوا دەكەن، ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَـٰنٍ مَّرِيدٍ﴾ واتە: شوێنی هەموو شەیتانێكی بەدفەڕ دەكەون، ﴿كُتِبَ عَلَيْهِ﴾ موجاهید دەڵێت: واتە: شەیتان.[1] یانی: بۆ شەیتان نوسراوەو بڕیاردراوە لە لای خودا، ﴿أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ﴾ واتە:هەركەس شوێنی كەوتبێتو چاوی لێ كردبێت، ﴿فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ واتە: لە دنیا گومڕای دەكاتو لە ڕۆژی دواییشدا بەرەو سزای ناو ئاگری دەبات، كە ئەو ئاگرە زۆر گەرمو بەژانەو مەردم هەراسان دەكاتو ژیانی لێ تاڵ دەكات، سودی دەڵێت لە ئەبو مالیكەوە: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر نەزری كوڕی حارس.[2] ئیبنو جورەیجیش هەر وای وتووە[3].

---

[1] المحرر الوجيز (١٠٧/٤).

[2] الدر المنثور (٨/٦).

[3] الطبري (٥٦٦/١٨).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾ ﴾

## نیشانەکانی زیندووبوونەوە لە دروستکردنی مرۆڤو ڕووەکدا

کاتێك کە خوای گەورە باسی ئەو کەسانەی کرد کە بڕوایان بە زیندووبوونەوە نیەو نکوڵی لە ڕۆژی قیامەت دەکەن. باسی نیشانەکانی تواناو دەسەڵاتی خۆی دەکات کە هەموو بەڵگەن لەسەر ڕۆژی قیامەتو زیندووبوونەوە، لە سەرەتای دروستکردنی مرۆڤەوە کە وەدی هێناوە، دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر گومانتان هەیە، ﴿مِّنَ ٱلْبَعْثِ﴾ واتە: لە زیندوبوونەوەو هەڵسانەوەی گیانو لاشە لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ﴾ واتە: سەرەتا دروستمان کردوون لە خۆڵ، ئەو خۆڵەی کە ئادەمی لێ دروست کرا (سەلامی خوای لێ بێت)، ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾ واتە: پاشان نەوەی ئادەمی لە تنۆکێك ئاوی بێنراو وەدی هێنا.

## گۆڕانی ئەم تنۆکە ئاوو کۆرپەلەییەلەناو منداڵداندا

﴿ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ ﴾ واتە: پاشان لە خوێنێکی بەستراو پاشان لە پارچە گۆشتێك، چونکە کاتێك ئەو تنۆکە ئاوە لەناو منداڵداندا جێگیر بوو چل ڕۆژ دەمێنێتەوە، هەر بەو شێوەیە ئەوەی لەو دەورەیە دەچێتە سەری و پاشان دەگۆڕێت دەبێتە پارچە خوێنێکی بەستراو، بە ئیزنی خودا، دیسان چل ڕۆژی تر دەمێنێتەوە، پاشان دەگۆڕێتو دەبێت بە پارچە گۆشتێك هیچ شێوەو شکلێکی نیە پاشان بەرەو شێوەو شکڵ دەڕواتو سەرو هەردوو دەستو سكو سنگو هەردوو ڕانو قاچو بەشەکانی تری لاشەی لێ پەیدا دەبێت، جاری وا هەیە ژن منداڵەکەی لەبارئەچێت لە پێش ئەوەدا کە شێوەی بۆدروست ببێت ، جاری واش هەیە دوای ئەوەی کە شێوەو شکڵی لێ پەیدا دەبێت منداڵەکەی لەبار ئەچێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ واتە: پاشان لە پلە گۆشتێکی بیچم پێدراو یان بیچم پێنەدراو وەك خۆتان چاوتان پێی دەکەوێت، ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾

﴿وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ واتە: جاری واش هەیە لە منداڵداندا جێگیری دەکەین نە لە باری دەچێت و نە فرێشی دەدات، وەك موجاهید دەڵێت: ﴿مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ واتە: ئەو پلە گۆشتە بیچم پێدراوە یان بیچم پێنەدراوە کە لەبار دەچێت ئەگەر چل ڕۆژی بەسەردا چووبوو ئەوە پارچە گۆشتە ﴿مُضْغَةٍ﴾، خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت بۆ لای هەتا گیانی پێدا بکات و ڕێك و پێکی بکات و بەو شێوەیەی خوای گەورە مەیلی لێیە لە جوانی و ناشیرینی و نێرو مێیی، وە ڕۆزی و کاتی مردن و بەختەوەری و بەدبەختیشی نوسراوە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری ڕاستگۆو بەڕاستزانراوی خودا (ﷺ) بۆی باس کردین فەرمووی: (بێگومان دروست بوونی هەریەکێك لە ئێوە چل شەو لە سکی دایکیدا کۆدەبێتەوە پاشان دەبێتە خوێنێکی بەستراو هەر بەو شێوەیە پاشان دەبێتە پلەگۆشتێك هەر بەو شێوەیە، پاشان خوای گەورە فریشتەیەکی بۆ دەنێرێت فەرمانی پێ دەدرێت بە چوار وتە: بە نوسینی ڕۆزی و کرداری و کاتی مردنی و بەدبەختە یان بەختەوەرە، پاشان گیان دەکرێت بەبەریدا)[1].

### گۆڕانی مرۆڤ لە منداڵیەوە بۆ پیری

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا﴾ واتە: پاشان دەوهێنینە دەرێ بە لاوازی لە لاشە و گوێ و عەقڵ و قاچ و دەست و هەموو ئەندامەکانی تریش، پاشان خوای گەورە وردە وردە بەهێزی دەکات و باب و دایکی بە سۆزو بەزەییەوە بە شەوو بە ڕۆژ چاودێری دەکەن، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ﴾ واتە: پاشان تا دەگەنە توانای تەواوو بەهێزو دەکەونە تافی لاوی و جوانی و جەهێڵی، ﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّىٰ﴾ واتە: هەندێکتان لە کاتی لاوی و بەهێزیدا دەمرن، ﴿وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَىٰ أَرْذَلِ الْعُمُرِ﴾ واتە: هەندێکیشتان لە کاتی پیری و بێ هێزی و لاوازی هێزو تواناو عەقڵ و بیروبۆچوون و نەگونجان لەگەڵ ئەو بارودۆخەی کە تێیدا دەژی دەمێننەوە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا﴾ واتە: هەتا ئەوەی دەیزانێت لە بیری دەچێتەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْقَدِيرُ﴾[2] واتە: خوا زاتێکە ئێوەی

[1] فتح الباري (٦/٤١٨)، مسلم (٤/٢٠٣٦).

[2] الروم (٥٤).

دروست کردووە لە لاوازی پاشان دوای لاوازی بەهێزی کردون (بوون بە لاو) لە دوای بەهێزکردنتان لاوازیو پیری بۆ دانان خوا هەرچی بوێت دروستی دەکات وە هەر ئەوە زانای بە دەسەڵات.

## نموونەیەکی تر بۆ زیندووبوونەوە لە ڕووەکدا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً﴾ واتە: ئەم زەمینەش دەبینن کە گیانی تێدا نیە، ئەمەیش نیشانەیەکی ترە لەسەر دەسەڵاتو توانای خودا لەسەر زیندووکردنەوەی مردووەکان وەك چۆن ئەم زەمینە مردووە بێ هەست و نەستە زیندوو دەکاتەوەو ئەو هەموو ڕووەکەی تیا دەڕوێنێت، قەتادە دەڵێت:(هامدە) یانی: بێ ڕووەك ماوەتەوە بێ پوشو پلە. سودی دەڵێت: واتە: مردووە. ﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ﴾ واتە: وەختێك خودا بارانی بەسەردا دەبارێنێت ﴿ٱهْتَزَّتْ﴾دەجووڵێتەوە واتە: ڕووەكو گیاو گژەی لێ دەڕوێنێتو زیندوو دەبێتەوە پاش مردنی، ﴿وَرَبَتْ﴾ واتە: بەرزدەبێتو گەشە دەکات، بە هۆی ئەو خۆراکەی لە زەمیندایە هەموو جۆرە ڕووەکێکی دیمەن جوان دەڕوێنێت لە درەختی بەردارو کشتوکاڵو هەموو جۆرە ڕووەکێکی تری هەمەڕەنگ بە تامو بۆن خۆشو هەریەکە شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیەو سودێکی لێی وەرگرێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾ واتە: لە هەموو جوتەیەکی دیمەن جوانو بۆن خۆش لە ڕووەك دەڕوێنێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ﴾ واتە: ئەمە بەڵگەیە کە هەر خوا هەقەو وەدیهێنەرەو بە کارەکاندا دەگاتو هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکات، ﴿وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ واتە: هەر ئەویش مردوو زیندوو دەکاتەوە، وەك چۆن ئەم زەمینە زیندوو دەکاتەوەو ئەم هەموو جۆرە ڕووەکەی تیا دەڕوێنێت، وەك لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[١] واتە: بێگومان ئەوەی (زەوی وشك) دەبوژێنێتەوە زیندووکەرەوەی مردووەکانیشە بە ڕاستی ئەو (خوا) بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[٢] واتە: بە ڕاستی کاری ئەو (خوا) ئەمەیە هەر کاتێك بیەوێت شتێك بەدی بێنێت پێی دەڵێت: ببە دەست بەجێ (ئەو شتە) دەبێت. ﴿وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: بێگومان ئەو (خوایە) توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. وە پاشان

---

[١] فصلت (٣٩).

[٢] یس (٨٢).

دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا ﴾ واتە: ڕۆژی قیامەت هەر دەبێتو گومانی تێدا نیە، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ﴾ واتە: خوا ئەوانەی کە لە ناو گۆڕدان زیندوویان دەکاتەوە، دوای ئەوەی کە ڕزانو بوونەوە بە خۆڵ، وەك چۆن لە سەرەتاوە لە نەبوون دروستی کردن. وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴾[1] واتە: وە نموونەمان بۆ دێنێتەوەو بەدیهێنانی خۆی لەبیرچۆتەوە (ئەو بێ بڕوایە) دەڵێت کێ ئێسکەکان زیندوودەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون، ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ ئەو زاتە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بەدی هێناونو ئەو بە هەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە، زاتێك کە لە درەختی سەوز ئاگری بۆ دروست کردون ئێوە ئاگری پێ دەکەنەوە. ئایەت لەم بارەیەوە زۆر هاتووە.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٨﴾ ثَانِىَ عِطْفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ لَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾ ﴾

### باسی ژیانی سەرۆکە گومڕاو ئارەزوو پەرستەکان

کاتێك خوای گەورە باسی ژیانی ئەو سەرلێشێواوو نەفامو شوێنکەوتووانەی کرد فەرموویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٍ مَّرِيدٍ ﴾[2] واتە: لێرەدا باسی ژیانی ئەو بانگخوازانە دەکات لە کاربەدەستو سەرۆکە گومڕاو خوانەناسو ئارەزووپەرستەکانن، دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴾ واتە: لە مرۆڤەکاندا کەسی وا هەیە موجادەلە دەکات دەربارەی خواو سیفەتەکانی بەبێ هیچ زانیاریو زانستێك وە شوێنی هەموو شەیتانێکی سەرکەش دەکەوێت، واتە: لەناو خەڵکدا کەسی وا هەیە موجادەلە دەکات دەربارەی خوا بەبێ هیچ زانیاریو شارەزاییو بەڵگەیەك وە بەبێ کتێبی ڕوونکەرەوە (لە لایەن خواوە)، ﴿ ثَانِىَ عِطْفِهِۦ ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێت کاتێك کە بانگ کرا بۆ لای هەق خۆی بە زل دەزانێت.[3] قەتادەو

---

[1] یس (٧٨-٨٠)

[2] الحج (٣).

[3] الطبري (٥٧٣/١٨).

موجاهیدو مالیك دەڵێن: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ﴿ ثَانِيَ عِطْفِهِۦ ﴾ واتە: ملی بە لاوە دەنێت‌و فیزدەکات، یانی پشت دەکاتە ئەو هەقەی کە بۆی بانگ دەکرێت، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذۡ أَرۡسَلۡنَٰهُ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ ﴾[1] واتە: هەروەها لە بەسەرهاتی موسادا (چەند بەڵگەو پەند هەیە) کاتێك ناردمان بۆ لای فیرعەون بە بەڵگەی ڕوون‌و ئاشکراوە، فیرعەونیش ڕووی وەرگێڕاو سەرپێچی کرد بە هۆی دەسەلاتەکەیەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴾[2] واتە: وە ئەگەر پێیان بوترێت وەرن بۆ لای ئەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە وەرن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) دەبینی ئەی موحەممەد(ﷺ) دووڕووەکان ڕووت لێ وەردەگێڕن بە وەرگەڕانێکی تەواو. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ يَسۡتَغۡفِرۡ لَكُمۡ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوۡاْ رُءُوسَهُمۡ وَرَأَيۡتَهُمۡ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴾[3] واتە:کاتێك پێیان بوترێ وەرن بۆ لای پێغەمبەری خوا تا داوای لێبوردنتان بۆ بکات (سەرپێچی دەکەن) سەریان با دەدەن‌و دەیانبینیت ڕوو وەردەگێڕن لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان بە گەورە دەزانن. لوقمان دەفەرمووێت بە ڕۆڵەکەی وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ﴾[4] واتە: ڕوو لە خەڵك وەرمەگێڕە، وە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا ﴾[5] واتە: وە هەر کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە ڕوو وەردەگێڕێت بە خۆبەگەورەزانیەوە. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: تا خەڵکی لە ڕێی خەڵکی لابدات، مەبەست بەم ئایەتەیان ئەو لاسارو خوا نەناسانەیە، یان مەبەست ئەو کەسەیە ئەو کارە دەکات،یانی: هەر بەو شێوەیەو لەسەر ئەو ڕەوشتە خولقاندوومانە کە خەڵکی لە ڕێ لادەدەن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾ واتە: هەر لە دنیادا سوك‌و ڕسوان‌و وەك چۆن ئەو فیزی کردووەو لاملی کردووەتە ئایەتەکانی خودا، خودایش تووشی سەرشۆڕی‌و سوك‌و ڕیسوایی دەکات هەر لە دنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا تووشی سوتانی بە ژانی دەکەین چونکە

---

[1] الذاريات (٣٨-٣٩).

[2] النساء (٦١).

[3] المنافقون (٥).

[4] لقمان (١٨).

[5] لقمان (٧).

شایستەیە بەوە.﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ ﴾ واتە: بە سوکایەتیو هەڕەشەوە پێی ئەڵێن ئەمە سزای ئەو کارانەیە کە کردت، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ﴾ واتە: بێگومان خودا ناهەقی لە بەندەکانی ناکات، وەك ئەم ئایەتەیش کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ﴾[1] واتە: (ئەو کافرە) بیگرنو بە توندی ڕایکێشن تا (دەیبەنە) ناوەڕاستی دۆزەخ، پاشان بیڕێژن بەسەر سەریدا هەندێ ئاگرو ئاوی زۆر گەرم، (پێی دەوترێت) بیچێژە چونکە بە ڕاستی تۆ بە دەسەلاتو بەڕێزی (گاڵتەی پێ دەکرێت)، بێگومان ئەمە ئەو سزایەیە ئێوە گومانتان لێی هەبوو.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدۡعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقۡرَبُ مِن نَّفۡعِهِۦۚ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ﴿١٣﴾﴾

**مانای خواپەرستی لەسەر گومان و دوودڵی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖ﴾ واتە: هەر لەناو خەڵكیدا هەیە لەسەر کەلا خواپەرستە، قەتادەو موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: لەسەر گومان.[2] هەندێکی تر دەڵێن: لەسەر لا، وەك بێزراوە لای کێو، واتە: لا تەنیشتی. واتە: چووەتە ناو ئایینەوە بە گومانەوە، ئەگەر چاکەیەکی بینیو بە دڵی بوو بە دڵنیاییەوە وەری دەگرێت، وە ئەگەر بە دڵی نەبوو وازی لێ دێنێت، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖ﴾ دەڵێت پیاوی وا هەبووە هاتووەتە مەدینە ئەگەر ژنەکەی کوڕێکی بووایەو ماینەکەی بزایە، دەیوت ئەمەیە ئایینێکی چاکە، خۆ ئەگەر ژنەکەی منداڵی نەبووایەو ماینەکەی نەزایە، دەیوت ئاینێکی چەند خراپە.[3] عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ئەگەر یەکێکیان بهاتایە بۆ مەدینە (زەوی مەدینە شوێنی نەخۆشیە ساریەکان بووە) ئەگەر تەندروست بوایەو ماینەکەشی جوانوی چاکی ببوایە، ژنەکەیشی کوڕێکی ببوایەو دڵی پێی خۆش بوایەو بە دڵنیایشەوە ژیانی بەسەر بردایە، دەیوت: لەو کاتەوە هاتوومەتە سەر ئەم ئاینە خێروبێر نەبێت تووشی هیچ شتێکی تر نەبووم، ﴿فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ

[1] الدخان (٤٧ـ٥٠).

[2] الطبري (١٨/٥٧٦).

[3] فتح الباري (٨/٢٩٦).

﴿ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ﴾ واتە: جا ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵخۆش دەبێت پێی (بەردەوام دەبێت لە خواپەرستیدا) وە ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەو بەلابوو، ﴿فِتْنَةٌ ﴾ واتە: بەلا، ئەگەر توشی بەلاو نەخۆشیەك ببوایە یان ژنەکەی کچی ببوایە و خێرو بێر درەنگ دەستی بکەوتایە شەیتان ئەهاتە بنکڵیشەیی و پێ ی ئەوت : ئەوەتەی تۆهاتویتەتە سەر ئەم ئاینە توشی شەڕ نەبێت هیچی ترت بە دەست نەهێناوە، ئەوە ئەو بەلایە کە تووشی دەبێت.[1] هەر بەم شێوەیە قەتادەو زەححاكو ئیبنو جورەیجو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا باسیان کردووە.[2] موجاهید دەڵێت لەم ئایەتەدا: ﴿انْقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِ ﴾ واتە: هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێتە خوانەناس.[3] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ﴾ واتە: لە دنیادا هیچی وەدەست نەهێنا، لە ڕۆژی دوایشدا لەبەر ئەوەی خوای گەورەی نەناسیوە، زۆر بەدبەختو ڕیسوایە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ ﴾ واتە: دۆڕاندنو زەرەری گەورە ئەمەیە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُ وَمَا لَا يَنفَعُهُ ﴾ واتە: هانا بۆ ئەو بتو دارو بەردە دەباتو لێیان دەپاڕێتەوەو داوای یارمەتیو بژێویان لێ دەکات کە زیانی لێ نادات‌وقازانجیشی پێ ناگەیەنێت، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ﴾ واتە: ئا ئەوەیە لە ڕێ لادانو گومڕایی ئاشکرا، ﴿ يَدْعُو لَمَن ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِ﴾ واتە: ئەو هاوار دەکات، کەسێك دەپەرستێت کە زیانی لە سودی نزیکترە. ﴿لَبِئْسَ الْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ ﴾ واتە: ئای چ دۆستێکی خراپو هاوەڵێکی نالەبارو بەدفەڕە. موجاهید دەڵێت: واتە: بتەکان.[4] واتە: ئەوەی کە هانای بۆ دەبرد غەیری خوا بچێت بە دەمیەوە یارمەتی بدات چەندە دۆستێکی خراپو بەدکارو نالەبارە.

---

[1] الطبري (١٨/٥٧٥).

[2] الطبري (١٨/٥٧٦).

[3] الطبري (١٨/٥٧٦).

[4] الطبري (١٨/٥٧٩).

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ جَنَّـٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ١٤﴾

**پاداشتی پیاوچاكان**

كاتێك خوای گەورە باسی ئەو خەڵكە گومڕاو بەدبەختەی كرد دێتە سەر باسی پیاوچاكان ئەوانەی كە بە ڕێزو بەختەوەرن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ جَنَّـٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُۚ﴾ واتە: ئەوانەی كە بە دڵ بڕوایان هێناوەو بە كرداریش بڕواكەیان سەلماندووە، لە هەموو كارێكی خێردا بەشدارییان كردووەو وازیان لە خراپەكاری هێناوە، خوای گەورە لە شوێنو پلەی بەرزدا لە باغەكانی بەهەشتدا دایان دەنێت، وە كاتێك خوای گەورە باسی ئەوەی كرد كە هەر خۆی ئەوانەی گومڕا كردووەو ئەمانەشی شارەزا كردووە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ واتە: خودا هەرچیەكی بوێت دەیكات.

﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ١٥ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَـٰهُ ءَايَـٰتِۭ بَيِّنَـٰتٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ ١٦﴾

**هەرچۆنێك بووە خودا بە هانای پێغەمبەرەكەیەوە دێت (ﷺ)**

﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێت: هەر كەسێك وادەزانێت كە خودا بە هانای موحەممەدەوە (ﷺ) نایەت لە دنیاو قیامەتدا ﴿فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ﴾ واتە: با پەتێك ﴿إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: بە بانی خانوەكەی خۆیەوە هەڵواسێت، ﴿ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ﴾ واتە: پاشان خۆی بخنكێنێت.[1] موجاهیدو عیكریمەو عەتاو ئەبو جەوزاو قەتادەو كەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2] ﴿مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ﴾ واتە: هەر كەسێك پێی وایە كە خودا بە هانای موحەممەد (ﷺ)و كتێبەكەیو ئایینەكەیەوە نایە، با بچێت خۆی بكوژێت ئەگەر بەوە دڵی ئاو دەخواتەوەو ئارامی بۆ دێت، گومانی تێدا نیە كە هەر خودا سەری دەخات. وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ

---

[1] الطبري (١٨/٥٨١).

[2] الطبري (١٨/٥٨٠/٥٨٢).

﴿فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان‌و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دنیاداو لەو ڕۆژی (قیامەت)دا کە شایەتەکان هەڵدەسنەوە. بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ﴾ سودی دەڵێت: دەبا بزانێت بەوەی دەیکات لە بارەی موحەممەدەوە (ﷺ) دڵی ئۆخەی دەکات.[2] عەتای خۆراسانی دەڵێت: دەبا بزانێت بەوەی دەیکات دڵی چاك دەبێتەوەو داخی دڵی نامێنێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ﴾ واتە: هەر بەم شێوەیە ئەم قورئانەمان ناردەخوار ﴿ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ﴾ واتە: کە زۆر ماناو وتەکانی ئاشکران، بیانو بڕو بەڵگەیە لە لایەن خواوە بۆ خەڵکی، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ﴾ واتە: خوا مەیلی لە هەر کەسێك بێت گومڕای دەکات‌و مەیلی لە هەر کەسیش بێت ڕێی نیشاندەدات، لەکارزانەو سەلمێنەری بەڵگەیە لەوەدا، ﴿لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ﴾[3] واتە: (خوا) پرسیاری لێ ناکرێت (ڕەخنەی لێ ناگیرێت) لە هەر کارێك کە دەیکات بەڵام ئەوان (ئادەمیزاد) پرسیاریان لێ دەکرێت. ئەمەیش هەموو لە بەزەیی‌و لە کارزانی‌و دادوەری‌و زانیاری‌و گەورەیی خودا خۆیەتی. هیچ کەس ناتوانێت دەست لەکاریەوە بدات‌و زۆر توندە لە لێپرسینەوەیدا.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ١٧﴾

## خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەری لە نێوان گشت گرۆکاندا دەکات

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ﴾ واتە: بە ڕاستی کەسانێك کە بڕوایان هێناوەو کەسانێك کە بوون بە جوولەکەو ئەستێرە (یان فریشتە) پەرستەکان‌و (نەسرانیەکان)‌و ئاگرپەرستەکان‌و ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا دادەنا، خوای گەورە باسی خەڵکی هەموو ئایینەکان دەکات لە خاوەن باوەڕان‌و غەیری خاوەن باوەڕان لە جوولەکەو گاورو و ئاگر پەرست‌و بتپەرستان، لە سورەتی (البقرة)دا لە پێشەوە باسمان کردن‌و ڕای زانایانمان لە بارەیانەوە باس کردوە، وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ واتە: خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بە کاری هەموویاندا ڕادەگات بە دادوەری خۆی،

---

[1] الغافر (٥١).

[2] الرازي (١٣/١٥).

[3] الانبياء (٢٣).

ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەیانخاتە بەهەشتو ئەوانەشی خوانەناسن دەیانخاتە جەهەنەم، چونکە خوای گەورە ئاگاداری گشت کردارەکانیانە قسەکانیشیان لە یاد ناکاتو زانیاری هەیە بەسەر هەموو پەنهانیەکانیداو ئەوەیشی لەناو دڵیاندا شاردوویانەتەوە.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَن يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ ﴾

## هەموو شتێك سوژدە بۆ خوا دەبات

خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هەر خۆی بە تەنها شایەنی پەرستنە، دیارە لەبەر مەزنیەتی هەموو شتێك پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت سوژدە بۆ خوا دەبات، وە هەر شتەو سوژدەیەکی تایبەت بە خۆی هەیەو بەو شێوەیە سوژدە دەبات، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴾[1] واتە: ئایا ئەوانە نابیستنو سەرنج نادەن کە هەرچی خوا دروستی کردووە سێبەرەکانیان دەگۆڕێت بە لای ڕاستو چەپیاندا بە ملکەچیەوە سوژدە بۆ خوا دەبەن. وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ﴾ واتە: ئایا نەتدی کە بە ڕاستی سوژدە بۆ خوا دەبات ئەوەی لە ئاسمانەکانو ئەوەی لە زەویدایە، ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾[2] واتە: هەموو شتێك مەگین سوپاسو ستایشی خوای گەورە دەکات. وە دەفەرمووێت: ﴿وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ﴾ واتە: هەروەها ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانو چیاکانو درەخت، بۆیە ناوی خۆرو مانگو ئەستێرەکانی هێناوە بە تایبەتی، چونکە غەیری خودا پەرستراون، خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە کە ئەمانیش سوژدە هەر بۆ وەدیهێنەریان دەبەن، چونکە ئەوانیش بەرفەرمانی خودانو لە فەرمانی دەرناچنو ژێربارن، ﴿لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾[3] واتە: سوژدە مەبەن نە بۆ خۆرو نە بۆ مانگ بەڵکو سوژدە بەرن بۆ ئەو خوایەی ئەوانی وەدیهێناوە ئەگەر ئێوە تەنها ئەو دەپەرستن. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو زەڕڕەوە

---

[1] النحل (٤٨).

[2] الاسراء (٤٤).

[3] فصلت (٣٧).

(ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەت کراوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا دەزانی ئەم خۆرە بۆ کوێ دەچێت؟) وتم: خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) باش دەزانن. فەرمووی: (ئەم خۆرە دەڕوات لە ژێر (عرش)دا سوژدە دەبات پاشان داوای ئیزن دەکات شکی هەبوو کە پێی بوترێت: بگەڕێرەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی هاتووی).[1] لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەمشەو خەوتبووم لە خەومدا دیتم وەك ئەوەی کە نوێژەکەم لە پشت درەختێکەوە سوژدەم برد، درەختەکەیش سوژدەی برد کە من سوژدەم برد، گوێم لێ بوو درەختەکە دەیوت: ئەی خودایە بۆ ئەم سوژدەیە پاداشتم لای خۆت بۆ بنووسە، وە تاوانێکیشم بەو سوژدەیە لەسەر لابەرەو بیکە بە توێشوویەکیش بۆم لای خۆتو لێشم قەبوڵ بکە وەك چۆن لەبەندەت داود قەبووڵ کرد. ئیبنو عەباس دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) سوژدەیەکی خوێندو پاشان سوژدەی بردو ئەوەی خوێند کە پیاوەکە بۆی گێڕایەوە لە قسەی درەختەکە. تیرمیزیو ئیبنو ماجەو ئیبنو حیببان ڕیوایەتیان کردووە.[2] ﴿وَٱلدَّوَآبُّ﴾ واتە: گیانەوەر هەموو. لەم فەرموودەیەدا هاتووە لە ئیمامی ئەحمەدەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) قەدەغەی کردووە کە سەر پشتی گیانەوەر بکرێت بە مینبەر (چونکە لەوانەیە ئەوەی بەکاردەهێنرێت بۆ سواری چاکتر بێتو زۆرتر یادی خوا بکات لەوەی کە سواری بووە).[3] وە دەفەرموێت: ﴿وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ واتە: زۆرێك لە مەردمیش سوژدە بۆ خوا دەبەن بە مەیلی خۆیان لە خودا دەپاڕێنەوە لە کاتی ئەو سوژدە بردنەدا، ﴿وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ﴾ واتە: زۆرێکیش بڕیاری سزایان بۆ دراوە، کە خۆ بە زل دەزانن ملکەچ ناکەنو سوژدە نابەن بۆ خودا، ﴿وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ واتە: هەر کەسێك خودا توشی سوکایەتی بکات، هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێزی لێ بگرێت، خودا مەیلی هەر شتێکی ببێت دەیکات. لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێك نەوەی ئادەم سوژدەی برد شەیتان گۆشەگیر دەبێتو دەگریو ئەڵێ: واوەیلا بۆ من نەوەی ئادەم فەرمانی پێدرا سوژدە ببات، سوژدەی بردو بەهەشتی بۆ خۆی برد، فەرمانیش کرا بە من سوژدە ببەم، سوژدەم نەبرد، ئاگریش بۆ من بوو). موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئایا ڕێزی سورەتی (الحج) دراوە بەسەر سورەتەکانی تری

---

[1] فتح الباري (٦/٢٤٢)، مسلم (١/١٣٨).

[2] تحفة الأحوزي (٣/١٨١)، ابن ماجه (١/٣٣٤)، ابن حبّان) (٤/١٩١)، تیرمیزی وتوویەتی: فەرموودەیەکی غەریبە.

[3] أحمد (٣/٤٤١)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[4] مسلم (١/٨٧).

قورئاندا بە دوو سوژدە؟ فەرمووی: (بەڵێ، هەر کەسێك سوژدەیان تێدا نەبات با نەیانخوێنێت). ئەبو داودو تیرمزیش ڕیوایەتیان کردووە.[1] ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە (المراسیل)دا لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە کە ئەبو داود دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بە شێوەیەکی تر هاتووە واتە لەڕێگەیەکی ترەوە بەلاّم(بەڕەحمەت بێت)کە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی (فضلت سورة الحج على سائرالقرآن بسجدتين) پاشان[2] بە سەحیح دانانرێت. حافیز ئەبو بەکری ئیسماعیلی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو جەهمەوە کە عومەر دوو سوژدەی برد لە سورەتی (الحج) کاتێك لە جابیە بوو، پاشان وتی: ئەم سورەتە ڕێزی لێ نراوە بە دوو سوژدە.[3] ئەبو داودو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لە عەمری کوڕی عاسەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) پانزە سوژدەی خوێندووە لە قورئاندا، سێ سوژدەیان لە موفەسەلەکاندان دوانیش لە سورەتی (الحج)دا ئەمانە چەند بەڵگەیەکن یەکتری بەهێز دەکەن[4].

﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ ۖ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾﴾

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە، لە ئەبو زەڕەوە: کە سوێندی خواردووە ئەم ئایەتە: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾ واتە: ئەمانە دوو کۆمەڵی دژ بەیەکن دەمەقاڵێو کێشەیانە دەربارەی پەروەرگاریان. لەسەر حەمزەو دوو هاوەڵەکەیو عوقبەو دوو هاوەڵەکەی ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە ئەو ڕۆژەی کە چوون بە گژ یەکداو پەلاماری یەکتریان دا لە بەدردا. ئەمە دەقی وتەی بوخاریە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.[5] جارێکی تریش بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە کە دەڵێت: من یەکەم کەسێکم کە بە ئەژنۆدا دەکەوم لەبەر دەستی خوای ڕەحماندا بۆ کێشە لە ڕۆژی قیامەتدا. قەیس دەڵێت: ئەم ئایەتە: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾ لەسەر ئەوان هاتووەتەخوارەوە: ئەوانەی کە پەلاماری یەکتریان داو لە ڕۆژی بەدرداهەڵگژان بەیەکدا کەبریتین لە:

---

[1] الترمذي (٥٧٨)، سەرەتای فەرموودەکە حەسەنە.

[2] أبو داود في المراسل (٧٨)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

[3] البيهقي (٢/٣١٧).

[4] ابو داود (١٤٠١)، ابن ماجه (١٠٧٥)، نەوەویو مونزیری بە حەسەنیان داناوە.

[5] فتح الباري (٨/٢٩٧)، مسلم (٤/٢٣٢٣).

عەلی‌و حەمزەو عوبەیدە بەبەرانبەر، شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبەوە. بوخاری خۆی بە تەنها ڕیوایەتی کردووە.[1] ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت لە موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا: ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ﴾ دەڵێت: ئەمە نموونەی خوانەناس‌و خاوەن باوەڕ کە کێشە دەکەن لەسەر زیندووبوونەوە. وە لە ڕیوایەتێکی تردا موجاهیدو عەتا دەڵێن: لەم ئایەتەدا، ئەوانەی کێشە دەکەن لەسەر پەروەردگاریان خاوەنباوەڕو خوانەناسانن. جارێکی تریش موجاهیدو عەتا دەڵێن: مەبەست بەم ئایەتە خاوەن باوەڕو خوانەناسە، ئەم قسانە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، بەسەرهاتی ڕۆژی بەدرو غەیری بەدریش دەگرێتەوە، چونکە خاوەن باوەڕان دەیانەوێت ئایینی خودای گەورە سەربخەن، خوانەناسانیش دەیانەوێت ڕووناکی باوەڕ بکوژێننەوەو خەڵکی لە هەق دووربخەنەوەو پڕوپوچی خۆیان برەو پێ بدەن ئەمەش کێشمەکێشێکی بەردەوامە... ئەمە ڕاوبۆچوونی ئیبنو جەریرەو ڕایەکی چاکیشە.

## پاداشتی خوانەناسان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ﴾ واتە: جا ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون لە (ڕۆژی دواییدا) پۆشاکیان بۆ دەبڕدرێت (پڕ بەبەریان) لە ئاگر، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: چۆشاکی مس چونکە لە هەموو شتێك زیاتر گەرم دەبێت کە گەرم بکرێت.[2] ﴿يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ الْحَمِيمُ﴾ واتە: بەسەریاندا دەڕژێنرێت ئاوی زۆر گەرم، ﴿يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ﴾ واتە: دەتوێنرێتەوە بەو (ئاوە گەرمە) ئەوەی لەناو سکیاندایەو پێستەکانیش(یان)، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو ئاوە کوڵەکە دەکرێت بەسەریاندا (مێشکی) سەریان کون دەکات‌و دەچێتە ناو بۆشایی مێشکیان‌و بەناو لاشەیاندا دەڕواتە خوارەوەو دەیبڕێت هەتا دەگاتە هەردوو پایان دەسوتێ‌و پارچە پارچە دەبێت‌و دێتەخوار، ئەوە توانەوەیە، پاشان دەڵێت: چۆن بوو وەك خۆی لێ دێتەوە).[3] تیرمزیش ڕیوایەتی کردووە و دەڵێت: فەرموودەیەکی چاك‌و ڕاستە (حسن صحيح).[4] ئیبنو ئەبی حاتەمیش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کردووە. دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی سەرییەوە دەڵێت: فریشتە دێتە لای دەفرێکی بە دوو مەقاش هەڵگرتووە ئەوەندە گەرمە وەختێك نزیك دەبێتەوە

---

[1] فتح الباري (٨/٢٩٧)

[2] الطبري (١٨/٥٩٠).

[3] الطبري (١٨/٥٩١).

[4] تحفة الأحوزي (٧/٣٠١)، فەرموودەیەکی لاوازە.

لە دەمو چاوی ڕقی لێیەتی، دەڵێت گورزێکی ئاسنی پێیە بەرزی دەکاتەوە دەیکشێنێت بەسەریدا مێشکی دەپرژێنێتو پاشان ئەو ئاوە کوڵە لەو دەفرەدا دەکاتە مێشکی و دەچێتە بۆشایی مێشکی، ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ﴾[1] واتە: بەو ئاوە کوڵاوە ناو سکیانو پێستیان دەسوتێنێتو دەتوێتەوەو دێتە خوارەوە. ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا ﴿وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ﴾ دەڵێت: لێیان دەدرێت بەو گورزە ئاسنینە هەر پارچەیەکی لە شوێنێك دەکەوێت. هاوارو واوەیلایانە.[2] ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ واتە: هەر کاتێك بیانەوێت لە ناو ئەو ئاگرە بێنە دەرەوە، لەو مەینەتیە خۆیان ڕزگار بکەن دەخرێنە ناوی‌و پێیان دەوترێت: ژیانی ئاگری سوتێنەر بچێژن. ئەعمەش دەڵێت: لە ئەبو زەبیانەوە لە سەلمانەوە دەڵێت: ئەو ئاگرە زۆر ڕەشو تاریکە گڕو پشکۆکەی ڕووناك نابێتەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا﴾، ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ﴾[3] واتە: پێیان دەوترێت بچەژن سزای ئەو ئاگرەی کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾﴾

### پاداشتی خاوەنباوەڕان

کاتێك خوای گەورە باسی ژیانی خەڵکی ناو ئاگر دەکات (خوا پەنامان بدات لەو ژیانە) کە تێیدا دەژین لە جەزرەبەو مەینەتی‌و سوتاندنو زنجیر لە دەستو قاچو لەگەڵ پۆشاکی ئاگرین کە دەکرێتە بەریان، پاشان دێتە سەر باسی خەڵکی بەهەشت داوامان وایە لە خوا کە لە ڕێزو بەزەیی خۆی بێ بەشمان نەکات، دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕن خوای گەورە دەیانخاتە باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوات، واتە: ئەو ڕووبارە بەبەردەمو لە پشتو بە تەنیشتو بە ژێر درەختو کۆشکەکانیدا دەڕوات،

---

[1] الدر المنثور (٦/٢١).

[2] الطبري (١٨/٥٩٣).

[3] السجدة (٢٠).

بە ئارەزووی خۆیان بۆ هەر شوێنێك حەزی لێ بكەن و ئارەزوویان بێ دەیبەن، ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا﴾ واتە: لەو بەهەشتەدا خشڵی بازنی زێڕو مرواریان لە دەستدایە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەكی سەحیحدا فەرموویەتی: (خشڵی خاوەن باوەڕ دەگاتە ئەو شوێنەی كە ئاوی دەستنوێژ پێی دەگات).[1] ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾ واتە: پۆشاكیان لەناو بەهەشتدا ئاوریشمە بە پێچەوانەی خەڵكی ناو جەهەنەم، كە پۆشاكیان ئاگرە، پۆشاكی ئەمان لە ئاوریشمی تەنك و سفتە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێت: ﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاءً وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا﴾[2] واتە: لەبەریاندایە بەرگی نەرم و نۆڵی سەوزكارو پۆشاكی ئاوریشمین و ڕازێنراوەتەوە بە بازنی زیو و پەروەردگاریان شەرابی پاك و تەمیزیان پێ نۆش ئەكات، ئەم بەهەشتە پاداشتی ئێوەیە و هەموو كۆششێكتان سوپاسكراوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (لە دنیادا پۆشاكی ئەوریشم و ئەوەی بە ئاوریشم تێكەڵكراوە و ڕازاوەتەوە لەبەر مەكەن، چونكە هەر كەسێك لە دنیادا لەبەری كرد لە ڕۆژی دواییدا لەبەری ناكات).[3] عەبدوڵای كوڕی زوبەیر دەڵێت: هەر كەسێك هەتا ئاوریشم لەبەر نەكات لە ڕۆژی دواییدا ناچێتە بەهەشت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾[4] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُدُوا إِلَى الطَّيِّبِ مِنَ الْقَوْلِ﴾ واتە: بەرەو قسەی پاك و چاك دەبرێن، وەك ئەم ئایەتە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأُدْخِلَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ ۖ تَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَامٌ﴾[5] واتە: وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و كردەوەی چاكیان كردووە دەخرێنە بەهەشتانێك كە ڕووبارەكان دێن و دەچن بە هەمیشەیی تیایدا دەبن بە ئیزنی پەروەردگاریان بەخێرهاتنیان لەو (بەهەشتە) بە وتەی سەلامە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَامٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ﴾[6] واتە: فریشتەكانیش

---

[1] فتح الباري (١٠/٣٩٨)، مسلم (١/٢١٩).

[2] الانسان (٢١ـ٢٢).

[3] مسلم (٣/١٦٤٢/١٦٣٨).

[4] النسائي في الكبرى (٥/٤٦٥).

[5] ابراهيم (٢٣).

[6] الرعد (٢٣ـ٢٤).

دەچنە ژوورەوە بۆ لایان لە هەموو دەرگایەکەوە، (پێیـان دەڵێن) سـەلامتان لێ بێـت چـونکە ئارامتـان گرت (لە دنیادا) جا چـەند سـەرەنجامێکی چـاکتان بـوو. وە دەفـەرمووێت: ﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴾[1] واتە: نابیستن لەو بەهەشتەدا نە قسەی بێ هودەو نە تاوانبارکردن، جگە لـە وتەی سڵاوو سەلام کردن (لە یەکتری). دەڕۆن بـەرەو شـوێنێ کـە هەمیـشە قـسەی چاکو پـاکی تێدا دەبیستن، وە دەفەرمووێت: ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا﴾[2] واتە: لەو شوێنەدا سڵاویان لێ دەکرێت (لە لایەن فریشتەکانەوە زۆر بە گەورەیی). نـەك وەك خـەڵکی ئـاگر کـە سـوکایەتیان پـێ دەکرێـت بـە قسەو لێدان پێیان دەوترێـت: سـزای سـوتێنەر بـچەژن. وە دەفـەرمووێت: ﴿وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ واتە: بەرەو شوێنێك دەبرێن کـە سوپاسـی خـودای تێدا دەکـەن بـۆ ئـەو چاکەیەی کـردی لەگـەڵیانو بەهرەمەندی کردوونو ڕێزی لێناون، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (ئەوانە فێری تەسبیحاتو سوپاسو ستایش دەکرێن، وەك فێری هەناسەدان کراون).[3] هەندێ لە زانایـانی تەفـسیر لـەم ئایەتـەدا: ﴿وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ وتوویانە: فێری قورئان دەکرێن. هەندێکی تر وتوویانە فێری (لا إله الاّ الله) دەکرێن. هەندێکی تریش وتوویانە: فێری پاڕانەوەی چاكو دروست دەکرێن. ﴿وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾ واتە: شارەزای ڕێی ڕاست دەکرێن لە دنیادا . ئەمانەی کە باسمان کرد دژایـەتیان نیـە لەگـەڵ ئەو قسانەی باسمان کرد.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾﴾

**هەڕەشە لەو کەسانەی بوونەتە لەمپەر لە ڕێی خواو کەعبەی پیرۆزداو دەیانەوێت بێـدینی تێـدا بکەن**

خوای گەورە بێزاری خۆی دەردەبڕێت لەو خوانەناسانەی کە دەبنە لەمپەر لە ڕێی خاوەن باوەڕاندا کە بچنە کەعبەی پیرۆزو مەناسیکەکانی خۆیان بەجێ بێنن (یاسای قوربـانی بـەجێ بهێـنن) وە خۆیـان بە خاوەنو کاربەدەسـتی دەزانـی، خـوای گـەورەیش لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرمووێت: ﴿وَمَا كَانُوٓا۟

---

[1] الواقعة (٢٥ـ٢٦).

[2] الفرقان (٧٥).

[3] مسلم (٤/٢١٨٠/٢١٨١).

أَوۡلِيَآءَهُۥٓۚ إِنۡ أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُتَّقُونَ﴾[1] واتە: لە کاتێکدا ئەوان خۆشەویستو سەرپەرشتیاری ئەو (مزگەوتە) نین بە ڕاستی سەرپەرشتیارو خۆشەویتی ئەو (مزگەوتە) خواناسانو پارێزکارانن. لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە لە مەدینە هاتووە، وەك لە سورەتی (البقرة)دا دەفەرمووێت: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفۡرُۢ بِهِۦ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَإِخۡرَاجُ أَهۡلِهِۦ مِنۡهُ أَكۡبَرُ عِندَ ٱللَّهِۚ﴾[2] واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی مانگی حەرام جەنگکردن تیایدا بڵێ جەنگ لە مانگی ئاگربەستدا گوناهێکی گەورەیە بەڵام بەرهەڵستی ڕێبازی خواو بێبروایی پێیو (ڕێگری موسڵمانان) لە مزگەوتی حەرامو دەرکردنی خەڵکی ئەو مزگەوتە لێی گەورەترە لە لای خودا (لە جەنگکردن لە مانگی حەرامدا). وە لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ واتە: لەگەڵ ئەوەیشدا کە خوانەناس بوون و دەبوونە لەمپەریش لە ڕێگەی خوداو ڕۆیشتن بۆ ناو کەعبەی پیرۆز، واتە: نەیاندەهێشت خاوەن باوەڕان بچنە ناو کەعبەی پیرۆز کە لە ڕاستیدا خاوەن باوەڕان خاوەنو شایستەترن لەو خوانەناسانە بەو شوێنە، ئەم ڕستەیە لەم ئایەتەدا، وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ﴾[3] واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو دڵیان ئارام دەبێت بە یادی خوا ئاگادار بن کە هەر بە یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن.یانی سیفەتیان وایە کەبەیادی خوا دڵئارام ئەبن.

**باسی بەکرێدانی خانووی مەککە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ﴾ واتە: کە ئەوێمان داناوە (بۆ خواپەرستی) بۆ هەموو خەڵکی یەکسانە چ ئەوانەی لەوێدان یان لە دوورەوە بۆی دێن. ئەو خوانەناسانە ڕێیان دەگرت لە خەڵکی کە بچنە ناو کەعبەی پیرۆز، کە خوای گەورە کردبووی بە شوێنی هەموو کەسێك بەبێ جیاوازی، با ئەو کەسانە دانیشتووی ئەوێ بووبن یان خەڵکی شوێنێکی دووری مەککە بن، ﴿سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ﴾ واتە: چ نیشتەجێ چ خەڵکی شوێنی تر. لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە خەڵکی یەکسانن لەناو سەر زەمینی مەککەو دانیشتن تێیدا، وەك عەلی کوڕی ئەبو

[1] الانفال (٣٤).

[2] البقرة (٢١٧).

[3] الرعد (٢٨).

تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِ﴾ دەڵێت: خەڵکی مەککەو خەڵکی غەیری مەککە دادەبەزینە ناو کەعبەی پیرۆز.[١] موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِ﴾ دەڵێت: خەڵکی مەککەو خەڵکی غەیری مەککە یەکسان بوون لە خانووەکاندا، ئەبو سالحو عەبدوڕەحمانی کوڕی سابتو (سابط) عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان وتووە. عەبدوڕەزاق دەڵێت: لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە دەڵێت: خەڵکی مەککەو خەڵکی غەیری مەککە یەکسانن، ئەم باسە ئەوەیە کە شافیعیو ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی لە مزگەوتی خەیفدا کێشەیان بوو لەسەری، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش لەوێ بوو، شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ڕای وابوو کە زەوی و شوێنەکانی مەککە دروستە تەملیك بکرێن لەسەر خەڵکیو بەکرێش بدرێنو بۆ کەسو کاریشیان بەمیراتی بمێننەوە، فەرموودەکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی کردە بەڵگە کە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئایا بەیانی لە ماڵەکەی مەککەت دابەزین؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (جائایا عەقیل هیچ شوێنێکی هێشتۆتەوە بۆمان[٢]) پاشان فەرمووی: (خوانەناس هیچ نابا لە موسڵمان موڵمانیش هیچ نابا لە خوانەناس) (واتە: نابنە میراتگری یەکتری وەرگێڕ) (ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە.[٣] ڕیوایەت کراوە کە عومەری کوڕی خەتاب خانوویەکی کڕی لە سەفوانی کوڕی ئومەییە لە مەککە بە چوار هەزار (درهەم)، کردیە بەندیخانە. تاوس و عەمری کوڕی دیناریش هەر وایان وتووە. ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی دەڵێت: خانووی مەککە نە دەبێتە میراتیو نە بە کرێیش دەدرێت. ئەمە ڕاوبۆچوونی هەندێ لە زانایانی پێشینەیە عەتاو موجاهیدیش هەر وایان وتووە، ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی ئەو فەرموودەی ئیبنو ماجەی کردووەتە بەڵگە کە ڕیوایەتی کردووە لە عەلقەمەی کوڕی نەزلەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ئەبو بەکرو عومەو وەفاتیان کرد، باسی خانووی مەککە نەکراوە، زەوییەك نەبێت چۆڵ بووبێت هەر کەسێك پێویستی بووە تێیدا دانیشتووە وە هەر کەسێك پێویستی پێی نەبووە داویەتی بە خەڵکی تر.[٤] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە کە دەڵێت: دروست نیە فرۆشتنی خانووی مەککەو بەکرێدانی. دیسان ئیبنو جورەیج دەڵێت: عەتانە نەهی کردبوو لە کرێ وەرگرتن لە حەرەمی مەککەدا، ئیبنو جورەیج دەڵێت: عەتا هەواڵی دامێ کە عومەری کوڕی خەتاب نەهی کردووە لە دانانی دەرگا بۆخانووەکانی مەککەدا بۆ

---

[١] الطبري (١٨/٥٩٦).

[٢] چونکە عەقیل وطالب کەکوڕی (ابوطالب)بوون،میراتی ئەبوتالبیان بۆمابوویەوە وئەویش هەمووی فرۆشتبوو.(وەرگێڕ).

[٣] البخاري (٧٦٧٤)، مسلم (١٦١٤).

[٤] ابن ماجه (٣١٠٧)، سەنەدەکانی سەحیحە.

ئەوەی حاجیەکان لەو حەوشەکانیاندا دابەزن، یەکەم کەسێك دەرگای بۆ خانووەکەی کرد سوهەیلی کوڕی عەمر بوو، لەبەر ئەوە عومەر ناردی بە شوێنیدا، سوهەیل وتی: ئەی گەورەی موسڵمانان مۆڵەتم بدە، من پیاوێکی بازرگانم، بۆیە دوو دەرگام داناوە هەتا پشتم لێ بگرن، عومەر وتی: باشە مۆڵەت دەدرێی بۆ ئەوە. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە موجاهیدەوە کە عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: ئەی خەڵکی مەککە دەرگا بۆ خانووەکانتان دامەنێن تا خەڵکی لە دوورەوە دێن با بە مەیلی خۆیان لە هەر شوێنێکدا دادەبەزن دانیشن.[1] عەبدوڕەزاق دەڵێت: موعەممەر هەواڵی داینێ لەو کەسانەی کە لە عەتایانەوە بیستووە لەم ئایەتەدا: ﴿سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِ﴾دەیووت: لە هەر شوێنێکدا مەیلیان لێ بێت دادەبەزن. دارەقوتنی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە بە مەوقوفی کەئەفەرموێ: (هەر کەسێك کرێی خانووی مەککە بخوات ئەوە ئاگری خواردووە).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕێگایەکی مامناوەندی گرتووەتە بەر لەم بارەیەوە، وەك سالحی کوڕی لێوەی گێڕاوەتەوە کە وتوویەتی: خانووی مەککە دەبێتە ماڵو میراتیشی لێ دەدرێت، بەڵام نادرێت بە کرێ تاکار بە هەردوو جۆرە فەرمودەکە بکرێت، والله أعلم.

### هەڕەشە لەو کەسانەی دەیانەوێت تاوانی گەورە بکەن لە حەرەمدا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ واتە: هەر کەسێك لەوێ دەست درێژی بکاتو لە ڕێ لابدات سزای بە ژانی پێ دەچێژرێت. هەندێ لە زانایانی تەفسیرو زمانی عەرەبی ئەڵێن: ئەو بایە (الباء) لێرەدا بۆ زیادەیە وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ﴾[3] واتە: (تُنبت الدّهن)واتە چەور شین ئەکات. هەر بەو شێوەیەش ﴿بِإِلۡحَادِۭ﴾ واتە: (إلْحَاداً) واتە: هەرکەسێك هەڵسێت بە کارێکی ناشیرین لە تاوانە گەورەکان، وە دەفەرمووێت: ﴿بِظُلۡمٖ﴾ واتە: بزانێت ناهەقیەو بە ئەنقەست بیکاتو هیچ تەفسیرێکی تری بۆ نەکات. وەك ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: بە ئەنقەست هەڵسان بە کارێك.[4] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿بِظُلۡمٖ﴾ واتە: بە شەریك دانان بۆ خوا.[5] عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەبباسەوە

---

[1] الدر المنثور (٤/٦٣٣).

[2] الدار القطني (٢/٣٠٠).

[3] المؤمنون (٢٠).

[4] الطبري (١٨/٦٠١).

[5] الطبري (١٨/٦٠٠).

﴿بِظُلْمٍ﴾ واتە: ئەو شتانە حەڵاڵ بكات لە حەرەمی مەككەدا كە خودا حەرامی كردووە بۆت لە خراپەكاریو كوشتنی خەڵكی، ناهەقی بكەی بە كەسێك كە ناهەقی بەرانبەر تۆ ناكاتو كەسێك بكوژی كە تۆ ناكوژێت هەر كەسێك ئەوەی كرد سزای بە ژانی بۆ خۆی بەدەست هێناوە.[1] موجاهید دەڵێت: ﴿بِظُلْمٍ﴾ واتە: هەڵسێت بە كارێكی ناشیرین لە حەرەمدا. ئەمەیش یەكێكە لە تایبەتمەندیەكانی حەرەم كەخوا سزای ئەو كەسانە دەدات نیازی خراپە بەرامبەر حەرەم ئەكەن، با خراپەكەشیان نەكردبێت، وەك ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە تەفسیرەكەیدا، لە ئیبنو مەسعودەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾ دەڵێت: ئەگەر پیاوێك بیەوێت لە حەرەمدا دەستدرێژی بكاتو لە ڕێ لابدات، با لە عەدەنی ئەبیەنیش بێت خوای گەورە هەر سزای بە ژانی پێ دەچێژێت.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە.[3] منیش ئەڵێم: ئەم سەنەدانە ڕاستن لەسەر مەرجی بوخاری. سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت:قسەوتن و زیاتر لەوەش بە خادمی حەرەم تاوانە، حەبیبی كوڕی ئەبی سابت دەڵێت: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾ واتە: ئەوەی شت دەشارێتەوە لە مەككەدا. كەسانی تریش هەر وایان وتووە. وە ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾ دەڵێت:ئەم ئایەتە لەسەر عەبدوڵای كوڕی ئونەیس هاتوەتەخوارەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناردی لەگەڵ دوو پیاودا، یەكێكیان كۆچەری بوو ئەوی تریان ئەنساری بوو، خۆیان بە بنەماڵەدا هەڵدەكێشاو شانازیان پێوە دەكرد، عەبدوڵای كوڕی ئونەیسیش تووڕەبوو،ئەنساریەكەی كوشت پاشان لە موسڵمانیەتی پاشگەزبووەوەو هەڵات بۆ مەككە، ئەم ئایەتانەی لەسەر هاتەخوار: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾یانی: هەر كەسێك هەڵسا بە دەستدرێژی لە مەككەدا، واتە: پاشگەز بێتەوە لە ئیسلامەتی، ئەم فەرمودانە هەرچەندە بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەم شتانە(ئیلحاد)ن، بەڵام ئایەتەكە لەوە گشتگشیترە، بەڵكو هەڕەشەیە بۆ ئەو كەسانەی كە بەكاری خراپتر هەڵدەسن، وەك چۆن خاوەن فیلەكان ویستیان مەككەی پیرۆز وێران بكەن خوای گەورە دەستە دەستە باڵداری ناردە سەریان ﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾[4] واتە: بەردبارانیان دەكردن بە وردە زیخی گڵین، سەرەنجام وەك كای خوراویان لێ كردن. واتە: تێكیشكاندنو كردنیە پەندی ڕۆژگار بۆ هەر

---

[1] الطبري (٦٠٠/١٨).

[2] الطبري (٦٠١/١٨).

[3] أحمد (٤٢٨/١)، فەرموودەیەكی لاوازە.

[4] الفيل (٤ـ٥).

کەسێك بیری خراپەکردنی هەبێت لە مەککەی پیرۆز. بۆیە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژێك دێت سوپایەك دەیەوێت ئەم ماڵە (کەعبەی پیرۆز) داگیر بکات، تا کاتێك دەگەنە بەیدا[1] .( ئەوەڵ‌و ئاخریان بەناو زەمیندا دەبرێتە خوارەوە).[2]

﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾﴾

## دروستکردنی کەعبەو جاڕدان بۆ حەج

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا﴾ واتە: کاتێك کە ئیبراهیممان لە جێی ئەم ماڵەدا پەنادا، (پێمان وت) کە کەس نەکەی بە شەریکی من. ئەمە خۆی هەڕەشەو ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ ئەو کەسانەی شەریکیان بۆ خوا داناوەو غەیری خوایان پەرستووە، خوای گەورە باسی ئیبراهیم دەکات کە شوێنی ئەو ماڵەی نیشاندا. واتە: شارەزای کردو ئەو ماڵەی دایە دەستی‌و فەرمانی پێدا کە دروستی بکات. زۆرێك لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە کە: ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) یەکەم کەس بووە کە ئیزن دراوە کە ئەم ماڵە (واتە: کەعبەی پیرۆز) دروست بکات لە پێش ئەو دروست نەکراوە). وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە ئەبو زەڕەوە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کام مزگەوت یەکەم جار دانراو دروست کرا؟ فەرمووی: (المسجد الحرام). وتم: پاشان کام مزگەوت؟ فەرمووی: (بيت المقدس). وتم: نێوانیان چەند بوو؟ فەرمووی: (چل ساڵ).[3] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ﴾[4] واتە: بە ڕاستی یەکەم ماڵێك دانرا بۆ (خواپەرستی) خەڵکی ئەو ئەو ماڵەیە کە لە بەککە (مەککە) دایە پیرۆزکراوەو ڕێنموونیە بۆ هەموو جیهانیان، تیایدا هەیە چەند بەڵگەو نیشانەی ڕوون (کە یەکێکیان) شوێن وەستانەکەی ئیبراهیمە. وە فەرموویەتی: ﴿وَعَهِدْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾[5]

---

[1] بەیداء: شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدایە.

[2] فتح الباري (٤/٣٩٧).

[3] فتح الباري (٦/٤٦٩)، مسلم (١/٣٧٠).

[4] ال عمران (٩٦_٩٧).

[5] البقرة (١٢٥).

واتە: وە سپاردمان بە ئیبراهیمو ئیسماعیل کە ماڵەکەم پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوەو ئەوانەی کە تێیدا دەمێننەوە، هەروەها کڕنوش بەرانو سوژدەبەران. وە خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿أَن لَّا تُشْرِكْ بِى شَيْـًٔا﴾یانی: تەنیا بە ناوی منەوە دروستی بکە، ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِىَ﴾ واتە: وە ماڵەکەم (کەعبە) پاك بکەرەوە، موجاهید دەڵێت: واتە: ماڵی من خاوێن بکەرەوە لە بتپەرستی.[1] ﴿لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ واتە: خاوێنی بکەرەوە بۆ ئەو کەسانەی کە بە تەنها خودا دەپەرستنو شەریکی بۆ دانانێن، (الطائف) دیارە ئەو کەسانەن کە بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا دەسوڕێنەوە، ئەو سوڕانەوەیە عیبادەتێکی تایبەتیە لە لای کەعبەی پیرۆزدا دەکرێت، چونکە ئەم تەوافکردنە لە هیچ شوێنێك لە زەویدا ناکرێت جگە لەوێ نەبێت، ﴿وَٱلْقَآئِمِينَ﴾ واتە: ئەوانەی کە لە نوێژدا وەستاون. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ واتە: کڕنوشو سوژدەبەران، بەیتو نوێژی داوەتە پاڵ یەك، چونکە ئەم تەوافو نوێژکردنە تایبەتن بە کەعبەی پیرۆزەوە. بەبێ کەعبە نایەتەجێو ناکرێت، لەبەر ئەوە تەواف لەوێ نەبێت ناکرێتو بۆ نوێژکردنیش هەر دەبێت ڕوو لە کەعبە بکرێت لە زۆرینەی کاتدا، مەگەر لە هەندێ شوێندا کە قیبلە نەزانرێت یان لە کاتی شەڕو سوننەت کردندا لە سەفەردا، والله أعلم. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ﴾ واتە: بانگی خەڵکی بکە بۆ حەجو داوایان لێ بکە بێن بۆ ئەم ماڵەی کە فرمانمان پێداوی دروستی بکەی. باسکراوە کە ئیبراهیم وتویەتی: ئەی پەروەردگارم! چۆن بانگی خەڵکی بکەم کەدەنگم پێیان ناگات؟خوا پێی فەرمووە: تۆ بانگیان بکە گەیاندن لەسەر ئێمەیە، ئیبراهیم لە شوێنەکەی خۆی هەڵساوەو وتویەتی: ئەی خەڵکینە! پەروەردگارتان ماڵێکی بۆ داناون، بێن بۆ حەجی، وتراوە: کەژو کێوەکان سەریان دانەواند هەتا دەنگەکە گەیشتە هەموو شوێنەکانی سەر زەمین، هەرچی لەناو سکی دایکانانو پشتی باوکاندا هەبوو بیستی، هەرچی بەردو ڕەشماڵ ودرەخت هەیە کە گوێی لێ بوو وەڵامی دایەوە، هەموو ئەوانەش کە خوا حەجی بەنسیب کردوون هەتا ڕۆژی قیامەت وەڵامیان دایەوە وتیان: ﴿لبيك اللهم لبيك﴾، ئەمە پوختەی ئەوەیە کە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسو موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو[2] کەسانی تریشەوە لە زانایانی پێشینە والله أعلم. ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمیش بە درێژی ئەمەیان هێناوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ﴾ واتە: دێن بۆ لات (بۆ حەج) بە پیادەو بە سوار

---

[1] الطبري (١٨/٦٠٤).

[2] الطبري (١٨/٦٠٥/٦٠٦/٦٠٧).

هەموو وشترێکی لاواز، هەندێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە کە حەجکردن بە پێ بۆ کەسێك بتوانێت چاکترە لە حەج کردن بە سواری، چونکە لە باسەکەدا پێشی خستون، ئەوە بەڵگەیە لە گرنگی پێدانو زۆر لێبڕاوییان بۆ حەجکردن، وەکیع دەڵێت: لە ئەبو عومەیسەوە لە ئەبو حەلحەلەوە لە موحەممەدی کوڕی کەعبەوە لە ئیبنو عەباسەوە، دەڵێت: هیچ شتێك ئەوەندە دلگرانی نەکردوم ئەوە نەبێت کە پێم خۆش بوو حەجم بە پێ بکردایە. چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَأْتُوكَ رِجَالًا﴾[1] ئەوەی زۆرینەی زانایان لە سەرینی حەجکردن بە سواری چاکترە،وئەمەش شوێنکەوتنی سوننەتی ئەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بە سواری حەجی کردووە کە زۆر بە تواناش بووە ﴿وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ واتە: بە سواری وشتری لاواز لە ڕێی دووورودرێژەوە دێن بۆ حەج. ﴿فَجٍّ﴾ واتە: ڕێگە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا﴾[2] واتە: وە چەند دەروازەو ڕێمان تێدا کردووەتەوە بۆ ئەوەی پیایدا بڕۆن. ﴿عَمِيقٍ﴾ واتە: دوور. ئەمە قسەی موجاهیدو عەتاو سودیو قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەییانو سەوریو کەسانی تریشە.[3] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە باسی ئیبراهیم دەکات کاتێك لە دوعاکەیدا دەیوت: ﴿فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ﴾[4] واتە: بەڵکو دڵی خەڵکانێك وا لێ بکەیت سۆزیان ببێت بۆ لایان. هیچ کەسێك لە گرۆی موسڵمانان نیە حەزنەکاتو پێی خۆش نەبێت کەعبەی پیرۆز ببینێتو تەوافی بکات. ئەوەتا خەڵکی لە هەموو کونو قوژبنێکی سەر زەمینەوە بەرەو ئەوێ دەکەونەڕێ بۆ حەج کردن .

﴿ لِّيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ ۖ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ﴾

[1] الدر المنثور (٦/٣٥).
[2] الانبياء (٣١).
[3] الطبري (١٨/٦٠٨).
[4] ابراهيم (٣٧).

## له حەجدا قازانجی دنیاو قیامەت هەیە

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴾ واتە: با سودو قازانجی خۆیان ببینن، ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴾ قازانجی دونیاو ڕۆژی دوایی، قازانجی ڕۆژی دوایی بریتیە لە ڕەزامەندی خودای مەزن، قازانجی دنیاش ئەو سودانەیە کە وەری دەگرن لە قوربانی کردنی وشترو سەربڕینی ئاژەڵو ماڵاتو بازرگانی،[1] موجاهیدو کەسانی تریش هەر وایان وتووە کە بریتیە لە قازانجی دونیاو ڕۆژی دوایی.[2] وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾[3] واتە: گوناهتان لەسەر نیە کە دوای ڕۆزی پەروەردگارتان بکەون. وە لێرەدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ واتە: وە ناوی خوا ببەن (کاتێك کە قوربانی سەردەبڕن) لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا لەسەر ئەو ئاژەڵانەی خوا پێی داون. شوعبەو هوشەیم ، لە ئەبی بیشرەوە لە سەعیدەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: (چەند ڕۆژی دیاریکراو؟)،یانی: دە ڕۆژەکە (أيام العشر).[4] بوخاریش بە(معلق)ی باسی کردووەو جەختی لەسەر کردەوە.[5] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئەبو موسای ئەشعەریو موجاهیدو قەتادەو عەتاو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنو زەحاکو عەتای خۆراسانیو ئیبراهیمی نەخەعیشەوە.[6] بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە، ئەمیش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کارێکی چاك نیە لە ڕۆژانەدا لە کاری ئەم ڕۆژانە چاکتر بێت) وتیان: تەنانەت جیهادیش لە ڕێگەی خوادا ؟ فەرمووی: (جیهادیش چاکتر نیە مەگەر پیاوێك خۆیو سامانی لە ڕێی خوادا دابنێو هیچی بۆ نەمێنێتەوە).[7] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ ڕۆژێك نیە گەورەترو خۆشەویستتر بێت لە لای خودا کارکردن تیایاندا لەم دە ڕۆژە،(لا إله الاّ الله الله أكبر والحمد لله)ی زۆری تێدا بکەن).[8] بوخاریش دەڵێت:

---

[1] الطبري (١٨/٦٠٩).

[2] الطبري (١٨/٦٠٩).

[3] البقرة (١٩٨).

[4] فتح الباري (٢/٥٣١)، الطبري (٤/٢٠٨).

[5] فتح الباري (٢/٥٣١).

[6] الطبري (١٨/٦١٠)، الرازي (٢٣/٢٦).

[7] فتح الباري (٢/٥٣٠).

[8] أحمد (٢/٧٥)، سەنەدەکانی زۆر بەهێز نیە.

ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرە لەم دە ڕۆژەدا ئەچوون بۆ ناو بازاڕو( الله اكبر)یان دەکرد خەڵکیش (الله أكبر) یان دەکرد لەگەڵیاندا.[1] ئەم دە ڕۆژە، ڕۆژی عەرەفەیش دەگرێتەوە، وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە، لە ئەبو قەتادەوە دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە بارەی ڕۆژوی ڕۆژی عەرەفەوە، فەرمووی: (داوام هەیە لە خوا ببێتە کەفارەتی گوناهیساڵی ڕابردوو و داهاتویشی).[2] ئەمە ڕۆژی قوربانیش دەگرێتەوە کە ڕۆژی حەجی گەورەیە، لەم فەرموودەدا هاتووە کە ڕۆژی قوربانیکردن بەڕێزترین ڕۆژە لە لای خوا، ﴿عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ واتە: یادی خوا بکەن لەسەر ئەو مەڕو ماڵاتەی کە پێی داون لە وشترو گاو مانگاو مەڕو بزن وەك خوای گەورە لە سورەتی (الانعام)دا بە درێژی باسی کردووەو جیای کردووەتەوە، ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖ﴾[3] واتە: (خوا) هەشت جۆر ئاژەڵو ماڵاتی (دروست کردووە). وە دەفەرمووێت: ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ﴾ واتە: خۆشیان لێی بخۆنو ئەو کەسانەش لێی بخۆن کە زۆر پێویستیانەو هەژارن. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك کە قوربانیەکانی سەربڕی، فەرمانی دا لە هەر قوربانیەك پارچەیەکی بێننو کوڵاندیان وئەویش هەندێکی لە گۆشتەکەی خواردو لە ئاوەکەیشی کەم کەم دەخواردەوە.[4]

هوشەیم دەڵێت: لەحوصەینەوە، لە موجاهیدەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا﴾ دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ﴾[5] واتە: وە کاتێك ئیحرامتان شکاند (دروستە) ڕاوبکەن. وە دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾[6] واتە: جا کاتێك کە نوێژی هەینی تەواو بوو ئیتر بڵاوببنەوە بەسەر زەویدا.[7] ئەمە ڕای ئیبنو جەریریشە لە تەفسیرەکەیدا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ﴾ عیکریمە دەڵێت: ئەو کەسەی کە زۆر پێویستی پێیەتیو داماوو هەژار بێت کە خۆی وا دەرناخات هەژارە.[8] موجاهید دەڵێت: ئەوکەسەی

---

[1] البغوي/ العيدين/ باب فضل العمل في أيام الشريف.

[2] مسلم (٨١٩/٢).

[3] الانعام (١٤٣).

[4] أحمد (٣١٤/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] المائدة (٢).

[6] الجمعة (١٠).

[7] الطبري (٦١١/١٨).

[8] الطبري (٦١٢/١٨).

دەست پان ناکاتەوە[1]. پاشان خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ ﴾ واتە: پاشان چڵك لە خۆ بکەنەوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ئەوە ئیحرام شکاندنە وەك سەرتاشین‌و جل لەبەرکردن‌و نینۆك کردن‌و لەو شتانە.[2] عەتاو موجاهیدیش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەباسەوە هەر بەو شێوەیە.[3] عیکریمەو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیش هەر وایان وتووە.[4] ﴿وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ ﴾ واتە: نەزرەکانیشیان بەجێ بێنن، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە: ئەو وشترەیش نەزریان کردووە، با بیکەنە قوربانی‌و سەری بڕن.[5] ﴿وَلْيَطَّوَّفُواْ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ واتە: با بە دەوری ماڵی مێژینەشیان بخولێنەوە. موجاهید دەڵێت: واتە: ئەو تەوافە واجیبەی ڕۆژی قوربانی بکەن.[6] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبی جەمرەوە دەڵێت: ئیبنو عەباس پێی وتم: ئایا سورەتی (الحج) دەخوێنیتەوەکە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلْيَطَّوَّفُواْ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ بێگومان دواین دروشم (مەناسك) خولانەوەیە بە دەوری ماڵی مێژینەدا ﴿بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ منیش ئەڵێم : پێغەمبەری خودایش (ﷺ) هەر وای کردووە، کاتێك گەڕایەوە بۆ مینا لە ڕۆژی قوربانیدا دەستی کرد بە هەڵدانی بەردەکان کە حەوت بەرد بوون ، پاشان قوربانیەکەی سەربڕی‌و سەری تاشی‌و هاتە خوارەوەو بە دەوری ماڵی خوادا سوڕایەوەو تەوافی کرد.[7] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی دا بە خەڵکی کە کۆتا شتیان لە ماڵی خوادا تەواف کردنە بەڵام ئەوەی لەسەر ژنی حەیزدار سوك کردبوو.[8] ﴿بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ﴾ واتە: تەواف بکەن لەپشت حیجرەوە چونکە ئەو حیجرە بەشێکە لە بناغە (ئەسڵی)یەکەی کەعبە کە ئیبراهیم دروستی کرد،هەرچەندە قورەیشیەکان هێنابوویانە دەرەوە لە ماڵی خودا، لەبەر هەژاری‌و کەم دەرامەتیان، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە دوای (حیجرەوە) تەوافی دەست پێ

---

[1] الطبري (٦١٢/١٨).

[2] الطبري (٦١٣/١٨).

[3] الطبري (٦١٠/١٨).

[4] الطبري (٦١٠/١٨).

[5] الطبري (٦١٤/١٨).

[6] الدر المنثور (٦٤٣/٤).

[7] ابن ابي حاتم (٢٤٩٠/٨).

[8] فتح الباري (٦٨٢/٢)، مسلم (٩٦٣/٢).

دەكردو دەیفەرموو: بێگومان حیجریش بەشێكە لە ماڵی خوا و دەستی نەدەهێنا بە هەردوو ڕوكنە شامیەكاندا، چونكە ئەو دوانە لەسەر بناغە كۆنەكەی ئیبراهیم تەواو نەكرابوون. قەتادە دەڵێت: لە حەسەنی بەسریەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ﴾ دەڵێت: چونكە یەكەم ماڵ بوو كە دانراو دروست كرا بۆ خەڵكی.[1] عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەمیش هەر وای وتووە.[2] عیكریمە وتی: بۆیە ناونراوە بە (ماڵی مێژینە) (البیت العتیق) چونكە لە ڕۆژی تۆفانەكەدا لە زەمانی نوح پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێ بێت) پارێزراوەو ماوەتەوە، خەسیف دەڵێت: بۆیە ناونراوە بە ماڵی قەدیمی چونكە هەرگیز هیچ زۆردارێك نەیتوانیوە داگیری بكات.

﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتۡ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ﴿٣١﴾﴾

## پاداشت لەسەر دووركەوتنەوە لە گوناه

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ﴾ واتە: هەر كەسێك ئا بەو شێوەیەی كە فەرمانمان پێداوە، بە گوێڕایەڵیو ڕێزگرتن لە دەستوورەكانی خوداو بەجێهێنانیانو ئەو هەموو پاداشتەی بۆ ئەو كەسانەی كە پێی هەڵدەسنو دووردەكەونەوە لە قەدەغە كراوەكانو گوناهو تاوانو گوناهكردنیان زۆر بە لاوە گرانە، ﴿فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ﴾ واتە: ئەوانە لای خوا خێرێكی زۆریان بۆدانراوەو پاداشتی چاكو زۆر دەدرێنەوە. وەك چۆن لەسەر خواپەرستی پاداست وەردەگرن لەسەر وازهێنان لە گوناهو تاوانو دووركەوتنەوە لە گوناهیش پاداشت وەردەگرن.

## ئاژەڵو ماڵاتیان بۆ حەلاڵە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأُحِلَّتۡ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ واتە: ئاژەڵو ماڵاتتان گشت بۆ حەلاڵە ئەوەنەبێت كە بۆتان باس كراوە، وە لە بارەی (بەحیرە)و (سائیبە)و (حام)و (وەصیلە)یشەوە هیچ بڕیارێك نەدراوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ﴾[3] واتە: خوا دایننەناوەو بڕیاری نەداوە (سود وەرنەگرن لەم

---

[1] القرطبي (١٢/٥٢).

[2] الطبري (١٨/٦١٥).

[3] المائدة (١٠٣).

چـوارجۆرە وشـترە)[1]، وە دەفـەرمووێت: ﴿إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ تـەنیا ئەوانـە نـەبێت کـە پێتـان ڕاگەیەنراوە وەك: لە قەدەغەکردنی خواردنی مردارەوەبوو خوێنو گۆشتی بەرازو ئەوانەیشی کـە نـاوی غەیری خوای لەسەر هێنراوە لە کاتی سـەربڕینداو خنکێنـراویش، ئەمـە قـسەی ئیبنـو جـەریرە کـە لـە قەتادەوە گێڕاویەتیەوە.[2]

**فەرماندان بە دوورەپەرێزی لە بتپەرستیو درۆکردن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ﴾ واتە: دوورکەونەوە لـە چڵكو چـەپەڵی بتپەرسـتیو دوورەپـەرێزیش بـن لـە درۆ. ﴿مِنَ﴾ لێرەدا بـۆ بـەیانی جنسە، واتە: دوورکەونەوە لە چڵكو چەپەڵی کە بتەکانە، شەریك دانـانی بـۆ خـوا هـاوملی قـسەی درۆ کردووە. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾[3] واتـە: بڵـێ بێگومان پەروەردگارم تەنها ئەو کردەوانەی حەرام کردووە کە زۆر بەدو خراپن، ئەوانەی کە ئاشکرانو ئەوانەشی نهێنینو گوناهی (حەرام کـردووە) وە دەسـتدرێژی بـە نـاهـەقی (حـەرام کـردووە) وئەوەشـی حەرامکردووە کە شتێك بکەنە هاوبەش بۆ خوا لەکاتێکدا بەڵگەی بـۆ نـەهاتووە وە (حـەرامی کـردووە) کە بەدەم خواوە شتانێك بڵێن کە نایزانن. لەوانە شایەتی درۆ، وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هـاتووە لـە ئەبی بەکرەتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئایا هەواڵتان بدەمێ دەربارەی گـەورەترین تاوانەکان؟) وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فـەرمووی: (شـەریك بـۆ خـوا دانـان، ئـازاردانی باوكو دایك (شانی دادابوو دانیشت) فەرمووی: باش بزانن! قـسەی درۆو شـایەتی درۆیـش)، بـەردەوام هەرئەمـەی دەفـەرموو هـەتا وتمـان خۆزگـە بێدەنگ دەبـوو.[4] ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە خورەیمی کوڕی فاتیکی ئەسەدیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) نوێژی بەیانی کرد، وەختێك کە لێ بووەوە هەڵسایە سەر پێ‌و فەرمووی: (شایەتی درۆ بەرامبەرە لەگەڵ شەریك دانان بۆ خـوای گـەورەدا) پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ۝٣٠

---

[1] بەحیرە: وشترێك بوو پێنج سکی بکردایەو پێنجەم نێر بووایە، ئەو کاتە گوێچکەیان لەت دەکردو بەرەڵایان دەکرد)، (سائیبە: وشترێك بوو کە دە تا دوانزە سکی بکردایە هەموو مێینە بووایە)، (وەصیلە: وشترێك بوو یەکەمو دووەم سکی مێینە بووایە)، (حام: وشترێکی نێر بوو کە لە پشتی ئەو دە سك ببوایە.(وەرگێڕ).

[2] الطبري (٦١٨/١٨).

[3] الاعراف (٣٣).

[4] فتح الباري (٤١٩/١٠)، مسلم (٩١/١).

حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ﴾.[1] خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ﴾ واتـە: بـە دڵـی پـاك خـودا دەپەرستن‌و شوێن ئاینەکەی دەکەون‌و لە ڕێی پڕوپوچ کەلان‌و بەرەو هـەق دەڕۆن بۆیـە خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ﴾ واتە: شەریکی بۆ دانانێن، پاشان نموونەیەك بۆ موشریك دەهێنێتەوە کە چەندە گومڕاو تیاچووو سەرلێشێواون‌و دوورن لـە ڕێـی ڕاسـتەوە، دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: ئەوەی موشریکە وەك ئەوە وایە لە ئاسمانـەوە بکەوێتـە خـوارەوە، ﴿فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ﴾ واتە: باڵندە تێی بەر بێن‌و لە حەوادا پارچە پارچـەی بکـات، ﴿أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾ واتە: یان وەك ئەوە وایە کە ڕەشەبا ببیبات بۆ شوێنێکی دوور لە ڕێ‌و لەناوی بدات، بۆیە لـە فەرموودەکـەی بەرائـدا هـاتوە: بێگومـان خوانـەناس کاتێـك فریـشتەی مـەرگ گیـانی دەکێـشێت‌و گیانەکەی بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان، دەرگاکانی ئاسمانی لێ ناکرێتەوە، بەڵکو گیانەکەی فڕێ دەدرێت لەوێدا.[2] پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە،ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لە سورەتی (ابـراهیم)دا باسـی لێ کراوە. خوای گەورە نموونەیەکی تریشی هێناوەتەوە لە سورەتی (الانعام) لە بـارەی موشـریکەکانەوە، وە دەفـــــەرموێت: ﴿ قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَـٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَـٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾[3] واتە: بڵێ ئایا هاوار بکەینە بێجگە لە خوا (و بپەرستین) کـە نـە سوودمان پێ دەگەیەنێت‌و نە زیان وە بەرەودوا بگەڕێنەوەو پاشگەزبببینەوە لە پـاش ئـەوەی کـە خـوا ڕێنموونی کردین (بۆ ڕێگای ڕاست)؟ بە وێنەی ئـەو کەسـەی کـە شـەیتانەکان سـەریان لێشێواندوە لـە زەویداو سەرگەردان بووەو چەند هاوڕێیەکی هەیە بانگی ئەکەن بۆ ڕێی ڕاست —وئـەڵێن پێـی _ بڵێن: وەرە بۆ لای ئێمە (کەچی بە گوێیـان نـەکات) بڵێ بـە ڕاسـتی هـەر ڕێنمـوونی خـوا ڕێنمـوونی ڕاسـتەو فەرمانمان پێدراوە کە ملکەچ‌و گوێڕایەڵ بین بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ ﴾

---

[1] أحمد (٣٢١/٤).

[2] أحمد (٦٢١/٤).

[3] الانعام (٧١).

## باسی قوربانی و مانای دروشمەکانی خوا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ واتە: دیارە هەر کەسێك دەستوورەکانی خوا ڕێز لێ بگرێت، ﴿فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ ئەوە نیشانەی لە خواترسیەتی لە دڵەوە. لەو ڕێزلێنانە قوربانیو وشتر کردنە قوربانیە، وەك حەکەم دەڵێت لە میقسەمەوە لە ئیبنو عەباسەوە: ڕێزلێگرتنی قوربانی، قەڵەوکردنو ڕێوپێك کردنیەتی.[1] ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل دەڵێت: ئێمە قوربانیمان قەڵەو دەکرد لە شاری مەدینەداو هەموو موسڵمانانی تریش قەڵەویان دەکرد، بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[2] لە سونەنی ئیبنو ماجەدا هاتووە لە ئەبو نافیعەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) قوربانی کرد بە دوو (بەران)ی گەورەی قەڵەوی شاخداری موو ڕەشو سپی، خەسێنرابوون.[3] هەر بەم شێوەیە ئەبو داودو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لە جابیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) قوربانی کردووە بە دوو بەرانی شاخداری ڕەشو سپی و خەسێنرابوون.[4] لە (علی) یەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی پێ دەکردین چاك سەیری چاوو گوێی قوربانی بکەین، قوربانیەك نەکەین سەری گوێی یان بنی گوێی بڕابێت یان گوێی بڕابێت، یان بە دەرزی گوێی کون کرابێت، کونەکەی دیارو خڕبێت ،ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکان ڕیوایەتیان کردووە، تیرمزیش بە سەحیحی داناوە.[5] (المقابلة) ئەو ئاژەڵو ماڵاتەیە سەری گوێی بڕابێت (المدابرة) ئەوەیە کە بنی گوێی بڕابێت، (الشرقاء) ئەوەیە کە گوێی لەباری درێژیدا بڕابێت، شافیعی دەڵێت: (الفرقاء) ئەوەیە کە بە دەرزی گوێی کون کرابێت، کونەکەی دیارو خڕ بێت، والله أعلم. لە بەرئەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (چوار ئاژەڵو ماڵات دروست نیە بکرێنە قوربانی: کوێرێك کوێریەکەی دیاربێت، نەخۆشێك نەخۆشیەکەی دیار بێت، شەلێك شەلیەکەی دیار بێت، لاق شکاوێك کە چاك نەبێتەوە). ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکان ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزیش بە سەحیحی داناوە[6].

---

[1] الطبري (٦٢١/١٨).

[2] فتح الباري (١١/١٠).

[3] أحمد (٨/٦)، جامع المسانيد والسنن (٢١/١٤).

[4] ابو داود (٢٣١/٣)، ابن ماجه (١٠٤٣/٢).

[5] أحمد (١٠٨/١)، ابو داود (٢٣٧/٣)، تحفة الأحوذي (٨٢/٥)، ابن ماجه (١٠٥٠/٢).

[6] احمد (٢٨٤/٤)، ابو داود (٢٨٠٢)، الترمذي (١٤٩٧)، النسائي (٢١٥/٧)، ابن ماجه (٣١٤٤).

## سودی وشتری قوربانی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ ﴾ واتە: بۆ ئێوە لەو (ئاژەڵانە) چەند سود وەرگرتنێك هەیە (وەك خوریەكانیان، مووەكانیان سواربوونیان، خواردنی شیریان)، ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ واتە: تا كاتی دیاریكراو (بۆ سەربڕینیان)، میقسەم دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ دەڵێت كاتێك سودی لێ وەردەگیرێت ناوی قوربانی لێ نەنرابێت.[1] وتراوە: بۆی هەیە سودی لێوەربگیرێت با داشنرابێت بۆ قوربانی –ئەگەرپێویستی تێیكەوت– وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوێكی بینی وشترێكی قوربانی لێ دەخوڕی (ڕادەكێشا) فەرمووی: (سواری ببە)، پیاوەكە وتی: وشتری قوربانیە. فەرمووی: (هاوار بۆ تۆ سواری ببە) دووجار یان سێ جار ئەمەی فەرموو.[2] وە لە ڕیوایەتێكی تری موسلیمدا هاتووە لە جابیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) كە فەرمووی: (كاتێك پێویستت پێی بوو ڕێكو پێك سواری ببە).[3] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴾ واتە: پاشان شوێنی (سەربڕینی) ئەوانە ئەو كاتەیە كە ئەگەر ماڵی دێرینی بە نرخ (كەعبە). وەك لەئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ ﴾[4] واتە: بە شێوەی قوربانی بگاتە كەعبە (و لەوێ بیكات بە قوربانی) وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ﴾[5] واتە: وە–نەیانهێشت–قوربانیە وەستێنراوەكان–لەحودەیبیەدا–بگاتە شوێنی سەربڕینی خۆی.

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

[1] الطبري (١٨/٦٢٣).
[2] فتح الباري (٥/٤٥٠)، مسلم (٢/٩٦٠).
[3] مسلم (٢/٩٦١).
[4] المائدة (٩٥).
[5] الفتح (٢٥).

**هەموو خاوەن ئایینەکانی جیهان دەستووری قوربانیان هەبووە**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا ﴾ واتە: بۆ هەموو ئومەتێك قوربانی کردنمان داناوە. خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموویت: لەناو هەموو خاوەن ئایینەکاندا دەستووری قوربانی کردن‌و خوێن ڕژاندن هەر بووە‌و ناوی خوایان لێ هێناوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت، لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا ﴾ دەڵێت: واتە: جێژنێك، عیکریمە دەڵێت: سەربڕینێك. زەیدی کوڕی ئەسلەم لەم ئایەتەدا: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا ﴾ دەڵێت: مەبەست پێی مەککەیە، خوای گەورە هەرگیز بۆ هیچ خاوەن ئایینێك غەیری مەککەی دانەناوە.[1] پاشان دەفەرموویت: ﴿لِّيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ناوی خوا ببەن (کاتی سەربڕین) لەسەر ئەو ئاژەڵانەی خوا پێی داون. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوو بەرانی ڕەش‌و سپی‌و شاخداری کردە قوربانی، ناوی خوای لێ هێناو (الله أکبر)ی کردو پێی خستە سەر لاملیان،[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا﴾ واتە: جا خوای ئێوە پەرستراوێکی تەنهایە کەواتە تەنها ملکەچی ئەو بن.یانی: خوای ئێوە تاك‌و تەنهایە، هەرچەندە ئایینی پێغەمبەرەکانی تر وەك یەك نەبوون‌و یەکتریان نەسخ کردووەتەوە. بەڵام هەموویان بانگەوازیان کردووە بۆ عیبادەتی خوای گەورە بە تەنها کە شەریکی نیە، وەك دەفەرموویت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴾[3] واتە: وە ئێمە نەماننناردووە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە (بەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، کەواتە تەنها من بپەرستن. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَلَهُ أَسْلِمُوا﴾ واتە: بە دڵپاکی گوێڕایەڵی بن‌و فەرمانەکانی بەجێ بێنن، ﴿وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ واتە: وە مژدە بدە بە ملکەچان‌و خۆ بە کەمزانان. موجاهید دەڵێت: ئەوانەی کە دڵنیان.[4] سەوری دەڵێت: ﴿وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ﴾ واتە: ئەوانەی کە دڵنیان‌و ڕازین بە قەزاو بڕیاری خواو ملکەچن بۆی.[5] چاکترین

---

[1] الدر المنثور (٦/٤٨).

[2] فتح الباري (١٠/٢٥)، مسلم (٣/١٥٥٦).

[3] الانبياء (٢٥).

[4] الطبري (١٨/٦٢٨).

[5] تفسير الثوري (٢١٣).

مانا بۆ ئەم وتەیە ئەم ئایەتەی دوای خۆیەتی کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ واتە: ئەوانەی هەر کاتێك ناوی خوا برا دڵـەکانیان دەترسێتو دەلـەرزێت، ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ ﴾ واتە: وە ئارامگران لەسەر ئەوەی تووشیان دەبێت (لە ناخۆشـی)، ﴿وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾ واتە: وە بەجێهێنـەرانی نوێـژەکانیان، ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ واتـە: وە (ئەوانـەی) لـەو ڕزق و ڕۆزیـەی پێمان داون دەبەخشن. واتە: لەو بژێوەیەی کە خـوا پێـی داون لـە مـاڵی حـەلاڵ بەشـی مـاڵو منـداڵی خۆیـانو کۆیلـەکانیانو هــەژارانو بـێ نـەوایانی لێ دەدەنو بـە چـاکی لەگـەڵ خـەڵك دەجوڵێنـەوەو سنوورەکانی خـوا نابـەزێنن، ئـەم ڕەوشـتانە بـە پێچەوانەی ڕەوشـتی دووڕووەکانـەو زۆر جیـاوازە لـە کرداری ئەوان وەك لە تەفسیری سورەتی بەرائەتدا (البراءة) لە پێشەوە باسکرا.

﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾

**فەرماندان بەسەربڕینی وشتر**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئـەو وشـترە گـەورەو قەڵەوانە (دەبڕێن لە بیت الحرام سەردەبڕێن) ئێمە کردوومانەتە دروشمی خوا بۆ ئێـوە. واتـە: وشـتری قوربانیمان داناوە بۆتان، لەو قوربانیانەیە کە بەر یاسای خـوا دەکـەوێت، خـوای گـەورە منـەتی خـۆی دەکات بەسەر بەندەکانیدا کە وشتری دروست کردووە بۆیانو کردوویەتی بە یاساو دروشمێکـی خـۆیو بکرێتە قوربانی بۆ ماڵەکەی خۆی (کەعبەی پیرۆز) بەڵکو ئەمـە چـاکترین قوربانیـە وەك خـوای گـەورە دەفــــەرموویت: ﴿لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾[1] واتە: ڕێ مەگرن لە دروشمەکانی خواو هەڵی مەوەشێننەوەو جەنگ مەکەن لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا وە ڕێ مەگرن لەو قوربانیانەی بە دیاری دەهێنرێن بۆ مەککە (ڕێمەگرنو زیان مەدەن) لەو قوربانیانەی ملوانکەیان لە ملکراوە (دیاری کراون بۆ نەزر) وە مەشکێنن ڕێـزی ئەوانـەی نیـازی مـاڵی خـوا دەکـەن.

ئیبنـو جـورەیج دەڵێـت: عـەتا لـەم ئایەتـەدا: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ ﴾دەڵێـت: (البُدْنَ)بریتی یەلە مانگاو وشـتر.[2] هـەر بـەم شـێوەیەش ڕیوایـەت کـراوە لـە ئیبنـو عومـەرو سـەعیدی

[1] المائدة (٢).

[2] الطبري (١٨/٦٣٠).

موسەیەبو حەسەنی بەسریەوە.[1] موجاهید دەڵێت: (البُدْنَ) بەشێکە لە وشتر.[2] لەتەفسیرێکی تردا وتراوە(بدن)هەروەها بەمانگاش ئەوترێت وپاشان جەماوەری زانایان لەسەر ئەوڕایەن کە ئەم قوربانیە بۆحەوت کەس ئەشێت وەك موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵاو کەسانی تریشەوە وتوویانە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی پێداوین بۆ قوربانی کردنی وشترێك حەوت کەس بکەینە شەریكو بۆ مانگایش حەوت کەس.[3] ئەم ئایەتەش کەئەفەرموێ ﴿لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ واتە: بۆ ئێوە لەواندا خێرو چاکە هەیە. واتە: پاداشتی لەسەر وەردەگرن لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ﴾ واتە: کەواتە (کاتی کردنیان بە قوربانی) ناوی خوایان لەسەر بێنن لە کاتێکدا لەسەر سێ پەل وەستاونو دەستی چەپیان بەستراوەتەوە (لەبەر ئەوەی وشتر بە پێوە سەردەبڕێت). لە موتەلیبی کوڕی عەبدوڵای کوڕی حەنتەبەوە ئەمیش لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەڵێت: نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە جەژنی قورباندا، وەختێك کە لێبووەوە بەرانێکی هێنا سەری بڕیو فەرمووی: (بەناوی خوا، الله أكبر، ئەی خوایە ئەم قوربانیە لە جیاتی خۆمو ئەو کەسانەیەلە ئومەتم کە قوربانیان نەکردووە)، ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە.[4] مەحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت لە یەزیدی کوڕی ئەبو حەبیبەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەمیش لە جابیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوو بەرانی کردە قوربانی لە ڕۆژی جەژندا کاتێك کە پاڵی خستن بۆ سەربڕین فەرمووی: (وا من بە دڵێکی پاك ڕوم کردە ئەو کەسەی کە ئاسمانەکانو زەمینی داهێناوەو لەوانە نیم شەریکی بۆ دادەنێن، نوێژو قوربانیو ژیانو مردنم بۆ خودایە، کە ڕاهێنەری جیهانیان هەر خۆیەتی، خوا هیچ شەریکی نیەو فەرمانم وا پێدراوە من یەکەمی موسڵمانانم . ئەی خودایە لە تۆوەیەو بۆ تۆیە لە جیاتی موحەممەدو ئومەتەکەی) پاشان ناوی خوای لێ هێناو الله أكبری کردو سەری بڕی.[5] لە عەلی کوڕی حوصەینەوەو لە ئەبو ڕافیعەوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك کە قوربانی کردبێت دوو بەرانی قەڵەوی شاخداری سپیو ڕەش کاتێك کە نوێژی کردو وتاری دا بۆ خەڵکی، لە نوێژەکەی هەڵساو یەکێکیانی هێناو خۆی سەری بڕی لە مەدینە، پاشان فەرمووی: (ئەی خوایە ئەمە لە جیاتی هەموو ئومەتەکەم، ئەوەی شایەتی داوە کە تاكو تەنهایتو شایەتیشی داوە بۆ منیش بە گەیاندنی پەیامی

---

[1] مسلم (٨٨٢/٢).

[2] ابن أبي شيبة/الجزء المفقود (٣٦٧).

[3] مسلم (٨٨٢/٢).

[4] احمد (٣٥٦/٣)، ابو داود (٢٣٠/٣)، تحفة الأحوزي (١١٣/٥).

[5] ابو داود (٢٣١/٢٣٠/٣).

تۆ) پاشان ئەو بەرانەکەیشی هێناو سەری بڕی. پاشان فەرمووی: _ئەمەیان لە جیاتی موحەمەدو ئالی موحەمەد) هەمووی کردە خواردەمەنی بۆ هەژاران‌و خۆیی‌و ماڵ‌و منالیشی لێیان خوارد. ئەحمەدو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە.[1] ئەعمەش دەڵێت لە ئەبو زیبیانەوە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّ﴾ دەڵێت: ناوی خوای لێ بێنن بە پێوە لەسەر سێ پەل (لاق)و دەستی چەپی بەسترابێت‌و بڵێ، بە ناوی خواوەو (الله أكبر)و( لا إله الاّ الله) بکات‌و بڵێ: لە تۆوەیەو بۆ تۆیە، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوەکەجارێکیان هات بۆ لای پیاوێك وشترەکەی یەخ دابوو ئەیویست سەری ببڕێت، وتی: بەرەڵای بکەو بەپێوە دەستی ببەستە، واتە: (ئەوساسەری ببڕە)،ئەمەسووننەتی ئەبولقاسمە(ﷺ)[2]. ﴿فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا﴾ واتە: جا کاتێك کەوتنە سەر زەوی بە تەنیشتدا (کاتێك گیانیان دەرچوو)، ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە موجاهیدەوە، یانی کاتێك لەسەر زەوی کەوتن.[3] ئەمە ڕیوایەتێکیشە لە ئیبنو عەباسەوە، موقاتیلی کوڕی حەیانیش هەروای وتووە. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ﴿فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا﴾ واتە: کاتێك کە گیانی دەرچوو،[4] ئەم قسەیە هەر ئەو قسەیە کە ئیبنو عەباس‌و موجاهید وتوویانە. چونکە خواردنی ئەو قوربانیە دروست نیە کاتێك دەجولێت هەتا تەواو گیانی دەردەچێت‌و جولەی نامێنێت، لە فەرموودەیەکی مەرفوعدا هاتووە: (پەلە مەکەن لەو گیانانە تا تەواو دەمرن).[5] سەوری ڕیوایەتی کردووە لە جامیعەکەیدا لە عومەری کوڕی خەتابەوە، کە ئەو وای وتووە، فەرموودەکەی شەدادی کوڕی ئەوسیش بووەتە پشتگیری بۆئەم فەرمودەیە کە لە سەحیحی موسلیمدایە: (بێگومان خودا لەسەر هەموو شتێك چاکەی نووسیووە، کاتێك کە شت ئەکوژن بە باشی بیکوژن، کاتێکیش سەری ئەبڕن بە چاکی سەری ببڕن، با هەر کەسێك سەری بڕی (چەقۆکەی) تیژ بکات‌و سەربڕاوەکەی ئاسودە بکات).[6] لە ئەبی واقیدی لەیسیەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی لە ئاژەڵ‌و مالات (کرایەوە) لەکاتێکدا کە زیندو بێت، ئەوە مردارەوە بووە) ، ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیزی

---

[1] احمد (٦/٨)، ابن ماجه (٢/١٠٤٣/١٠٤٤).
[2] البخاري (١٧١٣).
[3] الطبري (١٨/٦٣٥).
[4] الطبري (١٨/٦٣٥).
[5] البيهقي (٩/٢٧٨).
[6] مسلم (٣/١٥٤٨).

ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی بە سەحیحی داناوە.[١] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّ﴾ واتە: ئەوە لە گۆشتەکەیان بخۆن‌و دەرخواردی هەژاران‌و سواڵکەرانی بدەن. واتە: لەو قوربانیە بخۆن‌و بەشی ئەوانەی کە زۆر پێویستیان پێی هەیەو تامەزرۆن بۆیی‌و ئەوانەشی کە شەرم دەکەن داوای لێ بکەن بدەن، ئەمە فەرمانە بۆ خواردن‌و بەخشینی قوربانی. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿ٱلۡقَانِعَ﴾ واتە: ئەو کەسەی بێ نیازەو پێویستی پێی نیە کە بەشی بدەی‌و لە ماڵی خۆیدایە، ﴿وَٱلۡمُعۡتَرَّ﴾ واتە: ئەو کەسەیە کە خۆی دەردەخات‌و خۆی دەدات لە دەورت، بە تەمایە بەشە گۆشتی بدەیتێ بەڵام داوای ناکات.[٢] موجاهیدو موحەممەدی کوڕی کەعبی کوڕی قورەزیش هەر وایان وتووە.[٣] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ٱلۡقَانِعَ﴾ ئەوەیە کە داوا ناکات، ﴿وَٱلۡمُعۡتَرَّ﴾ ئەوەیە کە داوا دەکات.[٤]

ئەمە قسەی قەتادەو ئیبراهیمی نەخەعی‌و موجاهیدە لە ڕیوایەتێکدا کە لێیەوە کراوە.[٥] هەندێکیش بە پێچەوانەوە وتوویانە، هەندێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە قوربانی دەکرێتە سێ بەشەوە، سێیەکی بۆ خاوەنەکەی لێی بخوات، سێیەکێکی تری بۆ دیاری بۆ دۆست‌و هاوەڵانی، سێیەکێکیشی بۆ خێرو بەخشینی بەسەر هەژاراندا، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّ﴾ لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بە خەڵکی: (من لێم قەدەغە کردبوون کە گۆشتی قوربانی هەڵگرن‌و پاشەکەوتی بکەن زیاتر لە سێ ڕۆژ،لەمەودوا لێشی بخۆن‌و چەندیشتان بۆ دەکرێت لێی هەڵگرن).[٦] لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (لێی بخۆن‌و لێشی هەڵگرن‌و خێریشی لێ بکەن).[٧] لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: (لێی بخۆن، دەرخواردی خەڵکیشی بدەن‌و خێریشی لێ بکەن).[٨] بەڵام پێستی قوربانی، لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە لە قەتادەی کوڕی نوعمانەوە لە فەرموودەی قوربانیدا: (لێی بخۆن‌و خێری لێ بکەن‌و

---

[١] احمد (٥/٥١٨)، ابو داود (٣/٢٧٧)، تحفة الأحوزي (٥/٥٥).

[٢] الطبري (١٨/٦٣٦).

[٣] الطبري (١٨/٦٣٦).

[٤] الطبري (١٨/٦٣٦/٦٣٧).

[٥] الطبري (١٨/٦٣٦/٦٣٧).

[٦] النسائي (٧/٢٣٤).

[٧] النسائي (٧/١٧٠).

[٨] فتح الباري (١١/٢٩).

سود لە پێستەکەی وەربگرن و مەیفرۆشن).[١] (بابەتێك) لە بەرائی کوڕی عازیبەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (یەکەم شتێك کە دەستی پێ دەکەین نوێژ دەکەین پاشان دەگەڕێینەوە قوربانی دەکەین، هەر کەسێك وای کرد ئەوە سونەتی ئێمەی بەجێ هێناوە، هەر کەسێك پێش نوێژ سەری ببڕێت ئەوە گۆشتێکە پێشکەشی ماڵو منداڵی کردووە، ئەوە هیچ پەیوەندیەکی بە قوربانیەوە نیە) لە هەردوو سەحیحەکەدا بوخاریو موسلیم هێناویانە.[٢] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: قوربانی مەکەن تا پێشەوا قوربانی دەکات، سەربڕین دەست پێدەکات لە ڕۆژی سەربڕینەوە سێ ڕۆژی (ئەیامو تەشریق)یش لە دوایەوە، شافیعیش هەر وای وتووە، لەسەر فەرموودەکەی جوبەیری کوڕی موتعیم کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (أيام التشريق) هەمووی (کاتی) سەربڕینە) ئەحمەدو ئیبنو حیببان ڕیوایەتیان کردووە.[٣] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: ئا بەو جۆرە ئەو ماڵاتانەمان بۆ ئێوە ڕامهێناوە تا سوپاسگوزار بن بۆ خوا،یانی: وامان لێکردوون هەرچیان لێ دەکەن فەرمانبەرتانو ملکەچن، ئارەزووی خۆتانە سواریان دەبن یان شیرەکەیان بەکاردێنن بۆ خۆتان یان سەریان دەبڕن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾[٤] واتە: ئایا نەیاندیو نەیانزانیوە کە بێگومان بە دەستی خۆمان ئاژەڵمان بۆ دروست کردوون ئەنجا ئەوان خاوەنیانن‌و ڕاممان هێناون بۆیان ئەنجا سواری هەندێکیان دەبنو (گۆشتی) هەندێکیشیان دەخۆن، وە زۆر سودیان لێ دەبینن‌و شتی خواردنەوەشیان لێ وەردەگرن دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن. وە لەم ئایەتە پیرۆزەشدا دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾.

﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾﴾

---

[١] احمد (٤/١٥).

[٢] فتح الباري (٢/٥٢٦)، مسلم (٣/١٥٥٣).

[٣] احمد (٤/٨٢).

[٤] يس (٧١-٧٣).

**مەبەست لە قوربانی کردن لە لای خودا هەستی دڵسۆزیو لەخواترسی بەندەیە**

خوای گەورە دەفەرموویت لەبەر ئەوە ئەم دەستووری قوربانیەمان داناوە بۆ ئێوە، هەتا لە کاتی سەربڕیندا یادی خوا بکەن، کە هەر ئەو وەدیهێنەرو بژێویدەرەو هیچێك لەو گۆشتو خوێنە بەو ناگات، چونکە خوای گەورە بێنیازە لە غەیری خۆی، عەرەبەکان لە کاتی نەفامیدا ئەگەر ئاژەڵو ماڵاتیان سەربڕیایە، گۆشتەکانیان لەسەر بتەکانیان دادەناو خوێنەکەیان لێ دەپرژاندن خوای گەورەیش فەرمووی: ﴿لَن يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا﴾ واتە: هەرگیز ناگات بە خوا نە گۆشتی ئەو (قوربانی)انە نە خوێنیان. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو جورەیجەوە دەڵێت: خەڵکی زەمانی نەفامی گۆشتو خوێنی ئەو وشترانەی سەریان دەبڕین دەدا لە کەعبەی پیرۆز، هاوەڵەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) وتیان: ئێمە لەوان خاوەن هەقترین کە لێی بدەین، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَن يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ التَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾ واتە: هەرگیز ناگات بە خوا نە گۆشتی ئەو (قوربانی)انە نە خوێنیان بەڵام ئەوەی بە خوا دەگات تەقواو پارێزگاری ئێوەیە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خوا سەیری وێنەو ڕەنگتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵو کارتان دەکات).[1] وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (خێر (الصدقة) دەکەوێتە دەستی خوای ڕەحمان پێش ئەوەی بکەوێتە دەستی داواکەر).[2] وە ئەو خوێنە لە لای خوا دەکەوێت لە شوێنێکدا پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی. وەك لە پێشەوە لە فەرموودەیەکدا باسکرا کە ئیبنو ماجەو تیرمزی ڕیوایەتیان کرد.[3] کەخوای گەورەش ئەفەرموێ(كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ )یانی:لەبەرئەوەیە خوا ئەوحوشترانەی بۆ ژێربارخستون ،(لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ) یانی:تائێوەش خوا بەگەورە ڕابگرن وەك چۆن ئەوشارەزای کردوون لەئاین وشەریعەتی خۆیدا،لەوشتانەدا کەخۆشی ئەوێن وپێتان ڕازیە،بەرگری لێکردوون لەوشتانەی کەپێی ناخۆشەو نایەوێن،کەئەشفەرموێ (وَبَشِّرِ الْمُحْسِنِينَ )مژدەبەچاکەکاران بدە، یانی: ئەی محمد! مژدەبدە بەچاکەکاران ،یانی ئەوانەی کەسنورەکانی خوا بەرقەرار ئەکەن وپێڕەوی لەو شەریعەتە ئەکەن کەبۆیان دانراوە، ئەوانەی کەبڕوایان بەپێغەمبەر(ص)هەیە لەهەموو ئەوشتانەدا کەپێیان ئەگەیەنێت وبۆیان دەهێنێت لەلایەن خوای گەورەوە.

---

[1] مسلم (١٩٨٧/٤).

[2] الحلية (٨١/٤).

[3] الترمذي (١٤٩٣)، ابن ماجه (٣١٢٦).

(بابەتێك)قوربانیکردن سوونەتێکی چاکە،یەك حەیوان لەبری بنەماڵەیەك ئەبێت،ئیبن عومەر ئەفەرموێ: پێغەمبەر(ﷺ) تا(١٠)ساڵ بەردەوام قوربانی دەکرد،تیرمزی ریوایەتی کردووە[1]، ئەبوئەیوبیش ئەڵێت:لەسەردەمی پێغەمبەردا(ص) پیاوێك لەجیاتی هەموو ماڵ ومناڵی تەنیا یەك حەیوانی ئەکردەقوربانی، خۆشیان لێیان ئەخواردو دەرخواردی خەڵکیشیان ئەدا، تاخەڵکی دەستیان دایە خۆهەڵکێشان وکارگەیشتەئەوەی کەئێستا ئەیبینی !تیرمزی ئەم فەرمودەیە ریوایەت ئەکات وبە(صحیح)ی دائەنێت ئیبنو ماجەش هەر ریوایەتی کردووە.

عەبدوڵلای کوری هیشامیش یەك مەری کردە قوربانی بۆ خۆیی‌و ماڵ‌و منداڵی، بوخاری ریوایەتی کردووە.[2] لە بارەی ئەندازەی تەمەنی قوربانیەوە موسلیم ریوایەتی کردووە لە جابیرەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (نێونیّ (دوو ساڵەی مانگا) نەبێت سەری مەبڕن ئەگەر نەتانتوانی کاورێك (یەك ساڵەی مەڕ) سەربڕن)[3].

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾﴾

### مژدەی بەرگری کردن لە خاوەنباوەڕان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ واتە: بە ڕاستی خوا پشتیوانی دەکات لەوانەی کە بڕوایان هێناوە. خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی بەندە خاوەنباوەڕەکانی دەکات کە بەرگرییان لێ دەکات‌و دەچێت بە هاواریانەوە، ئەو بەندانەی کە هەمیشە پشت بە خوا دەبەستن‌و دەگەڕێنەوە بۆ لای، لە شەڕی شەڕخوازان‌و فروفێڵی بەدکاران پارێزگاریان لێ دەکات‌و ئاگای لێیانەو یارمەتیان دەدات، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥ﴾[4] واتە: ئایا خوا بۆ بەندەی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) بەس نیە؟ وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا﴾[5] واتە: وە هەر کەسێك پشت بە خوا ببەستێت ئەوە خوای بەسە بە ڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاریکراوی داناوە. وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ﴾ واتە: بێگومان خوا خۆشی ناوێت هەموو خیانەتکارو بێباوەڕو کافرێك. ئەوانەی ناپاکی لە بەڵێن‌و پەیماندا دەکەن‌و قسەی

---

[1] تحفة الاحوزي (٥ /٩٦) .

[2] فتح الباري (٢١٣/١٣).

[3] مسلم (١٥٥٥/٣).

[4] الزمر (٣٦).

[5] الطلاق (٣).

خۆیان نابەنەسەر، (الکفر) واتە: ئەو بەهرانەی کە خوا پێی داوە لەبەر چاوی نیەو سپڵەیەو دانی پێدا نانێت.

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾﴾

**ڕێگەدان بە جەنگکردن، ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتی جیهادە هاتە خوارەوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ واتە: ڕێ دراوە بەوانەی کە شەڕیان پێ دەگێڕێت، لەبەر ئەوەی ناهەقیان لێکراوە دەتوانن تۆڵەی خۆیان بسێنن، خودایش دەتوانێت سەریان بخات، عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر موحەممەدو (ﷺ) هاوەڵەکانی، کاتێك وەدەرنران لە مەککە.[1] موجاهیدو زەحاكو زۆرێکی تریش لە زانایانی پێشینە وەك ئیبنو عەباسو عورووەی کوڕی زوبەیرو زەیدی کوڕی ئەسلەمو موقاتیلی کوڕی حەییانو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە: ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتە لەسەر جیهاد هاتە خوارەوە.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە دەرچوو، ئەبو بەکر وتی: پێغەمبەرەکەیان دەرکرد (إنا لله وإنا إليه راجعون) بێگومان لەناو دەچن، ئیبنو عەباس دەڵێت: خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾ ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: زانیم کە بەو زووانە کوشتارێك دەست پێدەکات. ئیمامی ئەحمەد ئەم زیادەشی هێناوە: ئیبنو عەباس دەڵێت: ئەم ئایەتە یەکەم ئایەت بوو هاتە خوارەوە لە بارەی جەنگەوە.[3] تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە تەفسیردا لە هەردوو سونەنەکەیاندا.[4] تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی (حسن صحيح)ە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾یانی: خودا خاوەنی توانایە کە بەندە باوەڕدارەکانی یارمەتی بدات بەبێ شەڕو هەرا، بەڵام خودا دەیەوێت خۆیان ماندوو بکەنو هەوڵی تەواو بدەنو خودا لە خۆیان ڕازی بکەن، وەك دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ

---

[1] الطبري (١٨/٦٤٣).

[2] الطبري (١٨/٦٤٣/٦٤٤)، الدر المنثور (٦/٥٧).

[3] احمد (١/٢١٦).

[4] تحفة ألأحوزي (٩/١٥)، النسائي في الكبرى (٦/٤١١).

أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾[1] واته: ئەنجا (له جەنگدا)كه گەیشتن بەوانەی بێباوەڕن ئەوە بدەن لـه گـەردنیاو بیانکوژن هـەتا کاتێك کوشتاری زۆریان لێ دەکەن ئەنجا (دیلەکانیان) قایم ببەستنەوه جا دواتـر یا بـه منـەتو چاکه (بەرەڵایان بکەن) یان به فیدیەو بریتی هەتا جەنگ چەکەکان (به بێبـاوەڕان) دادەنـێ (یـان تـا جـەنگ کۆتایی دێت به نەمانی بتپەرستان)، فەرمان ئەوەیه ئەگەر خوا بیویستایه خۆی تۆڵـەی لێ دەسـەندن بەڵام (فەرمانی پێدان به جەنگ) تا به یەکتری تاقیتان بکاتەوه ئەو کەسانەش له پێنـاو ڕێبـازی خـوادا کوژران ئەو خوا هەرگیز (پاداشتی) کردەوەکانیان ون ناکات بێگومان ڕێنموونیان دەکـاتو دڵو بیریـان سافـو خۆش دەکاتو دەیانخاته ئـەو بەهەشـتەی بـۆی بـاس کـردوون. وه دەفـەرموێت: ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾[2] واتـه: (بـاوەڕداران)! بیـانکوژن، خـوا بـه دەستی ئێوه سـزایان دەداتو ڕیسوایان دەکـاتو سـەرتان دەخـات بەسـەریانداو (خـوا) سینەو دڵـی کۆمەڵی بڕوادار خۆش دەکاتو ڕقو خەشمی دڵەکانیان دادەمرکێنێتو ناهێڵێـتو خـوای گـەورە تەوبـه وەردەگرێت له هەر کەسێك که بیەوێت وه خـوا زانـای دانایـه. وه دەفـەرموێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ ﴾[3] واته: سوێند به خوا تاقیتـان دەکەینـەوه تـا دەری بخـەینو دیاربێت موجاهیدانو خۆڕاگرانتانو تا هـەواڵتان چیه ئاشـکرای بکـەین. ئایـەت لـەم بارەیـەوه ئێجگـار زۆره. بۆیه ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا: ﴿ وَإِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴾ دەڵێت: بێگومان خـوای گـەوره ئەوەیشی کرد.[4] خوای گەوره له کاتێکی زۆر شیاودا ڕێگەی جیهادکردنی دا چونکه ئـەو کاتـەی کـه لـه مەککەدا بوون موشریکەکان زۆر بوونو موسڵمانەکانیش زۆر کەم بـوون ئەگـەر خـودا فـەرمانی جـەنگی بدایه، موسڵمانەکان تووشی مەینەتی زۆر دەبوون بۆیه کاتێك خەڵکی یەسریب (مەدینه) شەوی عەقەبه پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) که زیاتر له هەشتا کەس بوون، وتیان: ئـەی پێغەمبـەری

---

[1] محمد (٤ـ٦).

[2] التوبة (١٤ـ١٥).

[3] محمد (٣١).

[4] الطبري (١٨/٦٤٣).

خودا(ﷺ) ئایا نەدەین بەسەر خەڵکی ئەم شیوەدا (مەبەستیان ئەو خەڵکە بوو کە لە مینا بوون) ئەمشەو بیانکوژین؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (من فەرمانی ئەوەم پێ نەدراوە).[1] وەختێك موشریکەکان دەستیان دایە دەستدرێژی کردنو پێغەمبەریان (ﷺ) لەناو خۆیاندا لە مەککە وەدەرناو ویستیان بیکوژن، هاوەڵەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) دەربەدەرکرد هەر یەکێك بە لایەکداو هەندێکیان بەرەو حەبەشە ڕۆیشتنو ئەوانی تریشیان بەرەو مەدینە چوون، کاتێك لە مەدینە نیشتەجێ بوونو پێغەمبەریش (ﷺ) چووە مەدینەو گەیشت پێیان، هەموو لە دەوری کۆبوونەوەو بوونە پشتیوانی،موسڵمانان پێگەی ئیسلامییان بۆ پەیدابوو کە پەنای پێ ببەن، خوای گەورە ڕێی پێدان کە بچن بە گژ دوژمنداو جیهاد بکەن، ئەم ئایەتە یەکەم ئایەت بوو هاتە خوارەوە لەو بارەیەوە وەك دەفەرمووێت: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ واتە: ئەوانەی بە ناهەقی لە زێدی خۆیان دەرکران، عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ئەوانەی بە ناهەقی لە مەککە دەرکران بۆ مەدینە، واتە: موحەممەدو هاوەڵەکانی.[2] ﴿إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾ واتە: گوناهیان هەر ئەوەبوو دەیانوت پەروەردگارمان خوایە، واتە: هیچ تاوانێکیان بەرامبەر هۆزەکەیان نەبوو جگە لەوەی خوایان بە تەنیا دەناسیو شەریکیان بۆ دانەدەنا، ئەم ڕستەیە ئیستیسنای مونقەتیعە سەبارەت بەشتە سەرەکیەکە، بەڵام ئەوشتە بە لای موشریکەکانەوە گەورەترین تاوان بوو، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يُخْرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمْ ۙ أَن تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ رَبِّكُمْ﴾[3] واتە: پێغەمبەر (ﷺ)و ئێوەش دەردەکەن (لەبەر ئەوەی) باوەڕ دەهێنن بە خوای پەروەردگارتان. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ﴾ واتە: ئەگەر خودا هەندێکی بە هەندێکی پاڵ نەنایەو دەرنەکردایە، هەتا هەندێکی لە جەنگو هەرا ڕزگاری ببێت، بەو هۆکارانەی کە خۆی بڕیاری داوە سەر زەمین وێران دەبوو زۆردار هەژارو لاوازی لەناو دەبرد، ﴿لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ﴾ واتە: پەرستگاکان وێران دەبوون، ئیبنو عەباسو موجاهیدو ئەبولعالیەو عیکریمەو زەححاكو کەسانی تریش وتوویانە: مەبەست پێی پەرستگای بچووکی ڕاهیبەکانە،[4] قەتادە دەڵێت: دێری سابیئە کانە وە هەر لە ڕیوایەتێکی تردا لە قەتادەوە دەڵێت: پەرستگای مەجوسەکانە،موقاتیلی

---

[1] دلائل النبوة للأصبهاني (٢٦٥).

[2] الطبري (٦٤٣/١٨).

[3] الممتحنة (١).

[4] الطبري (٦٤٧/١٨)، الدر المنثور (٦/٥٩/٦٠)، الرازي (٣/٣٦).

کوڕی حەییان دەڵێت: ئەو ماڵانە بوون لەسەرەڕێدا، ﴿ وَبِيَعٌ ﴾ ئەمە لە ئەو فراوانترە،زۆرینەی ئەو کەسانەی لەم پەرستگایەدا بوون مەسیحی بوون ئەمەیش قسەی ئەبولعالیەو قەتادەو زەححاكو ئیبنو صەخرو موقاتیلی کوڕی حەیانو خەسیفو کەسانی تریشە.[1] ئیبنو جەریر گێڕاویەتیەوە لە موجاهیدو کەسانی تریشەوە دەڵێن: کڵێسای جولەکەکانە والله أعلم. ﴿وَصَلَوَٰتٌ﴾ عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (الصلوات) واتە: کڵێساکان.[2] عیکریمەو زەححاكو قەتادە دەڵێن: کڵێسای جولەکەکانە، چونکە ئەوانە بە سەلوات (صَلوات) ناویان بردووە. ئەبولعالیەو کەسانی تریش دەڵێن (الصلوات) دێری سابیئەکانە، ئیبنو نەجیج دەڵێت: لە موجاهیدەوە (الصلوات) مزگەوتەکانی ئەهلی کتێبو ئەهلی ئیسلامن لەسەر ڕێگاکاندا.[3] بەلاَم (المساجد) مزگەوتەکان هی موسڵمانانە، ﴿يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ کە ناوی خودایان زۆر تێدا دەبرێت، وتراوە ئەو زەمیرەی لە (يُذكَر)دا دەگەڕێتەوە بۆ (مساجد) چونکە لەوانەی تر نزیکترە لێیەوە، زەححاك دەڵێت: هەموویان یادی خوایان زۆر تێدا کراوە،ئیبنو جەریر دەڵێت: ڕاست ئەوەیە: دێری ڕوهبانەکانو پەرستگای مەسیحیەکانو کڵێسای جوولەکەکانو مزگەوتی موسڵمانان وێران دەبوون کە ناوی خودایان زۆر تێدا دەبرێت، چونکە ئەمەباوی زمانی عەرەبەو وا مەشهورە لەناو یاندا.[4] هەندێ لە زانایان وتوویانە: ئەمە بەرز دەبێتەوە لە کەمەوە بۆ زۆر تا دەگاتە مزگەوتەکان، چونکە مزگەوتەکان زیاتر ئاوەدانو خەڵکی زۆرتریان تێدایەو زۆرتریش خواپەرستی دەکەن کەسانێکی نیاز دروستن .پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ﴾ واتە: خودا بە هاواری ئەوانەوە دێت کە یارمەتی دەدەن. واتە یارمەتی ئاینی خودا دەدەن، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ۝٧ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ﴾[5] واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتی (ئایینی) خوا بدەن خواش ئێوە زاڵو سەرکەوتوو دەکات (بەسەر کافراندا) وە پێیەکانتان جێگیر دەکات (لە جەنگدا خۆڕاگرتان دەکات)، ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون ئەوە نەگبەتیو سەرشۆڕی بەشیانەو (خوا) کردەوەکانیان بێ مایە دەکات. پاشان لە کۆتایی

[1] الطبري (١٨/٦٤٨).

[2] الطبري (١٨/٦٤٩).

[3] الطبري (١٨/٦٥٠).

[4] الطبري (١٨/٦٥٠).

[5] محمد (٧–٨).

ئایەتەکەدا دەفەرموویت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ خوای گەورە وەسفی خۆی دەکات بە خاوەن تواناو خاوەن دەسەلات، بە توانای خۆی هەموو شتێکی دروست کردووەو بە ئەندازەی خۆی دایناوەو بەو دەسەلاتەی کە هیچ کەسێك خۆی لەبەریدا ناگرێتو بەرامبەری ناوەستێت، بەلکو هەموو شتێك بێدەسەلاتو هەژارەو پێویستی بە خودا هەیە، وە هەر کەسیش خودای بە تواناو دەسەلات یارمەتیدەری بێت هەمیشە سەرکەوتووەو دوژمنەکەی سەرشۆڕو بەزیوە. خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا پێشتر بڕیارمان داوە بۆ بەندە نێردراوەکانمان، کە بێگومان هەر ئەوان سەردەخرێن. وە دەفەرموویت: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾[2] واتە: خوا نووسیویەتی کە بێگومان منو پێغەمبەرانم سەردەکەوین بە ڕاستی خوا توانای بالادەستە.

﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾

**ئەرکی موسلمانان کاتێك کە دەستیان ئەگاتە دەسەلات**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ واتە: ئەوانەی کەکاتێك لەسەر زەمیندا دایانمەزرێنین، نوێژدەکەنو زەکات ئەدەنو فەرمان دەکەن بە چاکەو بەر لە کاری خراپە دەگرن، سەرەنجامی هەموو کاریش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عوسمانی کوڕی عەفانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەلێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئێمە هاتە خوارەوە: ﴿ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ دەلێت: لە زێدی خۆمان بە ناهەقی دەرکراین گوناهمان هەر ئەوە بوو دەمانووت پەروەردگارمان خودایە، پاشان لەسەر زەمیندا دامەزرێنراینو نوێژمان کردو زەکاتمان داو فەرمانمان کرد بە کاری چاکەو بەرمان لە کاری خراپە گرت، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، ئەمە بۆ منو هاوەلەکانم هاتەجێ.[3] ئەبولعالیە دەلێت: ئەوانە هاوەلەکانی پێغەمبەرن (ﷺ). سەباحی کوڕی سەوادەی کنیدی دەلێت: بیستم لە عومەری کوڕی عبدولعزیزەوە وتاری دەداو ئەم ئایەتەی

---

[1] الصافات (١٧١ـ١٧٣).

[2] المجادلة (٢١).

[3] ابن ابي حاتم (٢٤٩٧/٢٤٩٦/٨).

خوێندەوە: ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ پاشانفەرموی: ئەوسا بزانن ئەمە تەنها لەسەر فەرمانڕەوا نیە، بەڵکو لەسەر فەرمانڕەواو ژێردەستەکانیشیەتی، ئایا ئاگادارتان بکەم لەومافانەی کە ئێوە هەتانە بەسەر فەرمانڕەواوەو بەومافانەش فەرمانڕەوا هەیەتی بەسەر ئێوەوە؟ لەسەر کاربەدەستە ئەو مافانەی خواتان بەسەردا جێبەجێ بکاتو ئەو مافانەیش بەسەر یەکەوە هەتانە لەناو یەکتریدا بۆتان وەرگرێتو ڕاستەڕێتان نیشان بدا بەپێی توانا، پێویستە لەسەر ئێوەیش فەرمانبەری بنو پێتان نارەحەت نەبێتو سەپیچی فەرمان بکەن بە ئاشکراو پەنهانی. عەتیەی عەوفی دەڵێت: ئەم ئایەتە ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾[1] واتە: خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەکانیان کردووە کە بێگومان دەیانکاتە جێنیشنی (خەڵکی تر) لە زەویدا. ئەم ئایەتەش کە دەفەرمووێت: ﴿ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾[2] زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ﴿ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴾ واتە: پاداشتی ئەو کارەی کە کردوویانە لای خودایە.[3]

﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَثَمُودُ (٤٢) وَقَوۡمُ إِبۡرَٰهِيمَ وَقَوۡمُ لُوطٖ (٤٣) وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ (٤٤) فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ (٤٥) أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ (٤٦) ﴾

### چارەنووسی بێباوەڕان

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەرەکەی موحەممەد (ﷺ) دەداتەوە لەسەر بڕوا نەهێنانی ئەو کەسانەی هۆزەکەی کە دژایەتیان دەکردو دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَثَمُودُ (٤٢) وَقَوۡمُ إِبۡرَٰهِيمَ وَقَوۡمُ لُوطٖ (٤٣) وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾ واتە: ئەگەر ئەمانە تۆ بە درۆزن دەزانن، پێش ئەمانیش هۆزی نوحو عادو سەمودیش هەر ئەمە پیشەیان بوو (دیسان هۆزی ئیبراهیمو هۆزی لوتیش) خەڵکی مەدیەنیش،

---

[1] نور (٥٥).

[2] الاعراف (١٢٨).

[3] ابن ابي حاتم (٨/٢٤٩٦/٢٤٩٨).

هەروەها موسایش بە درۆزن زانرا، ئەوسا هەتا ماوەیەك وازمان لەو خوانەناسانە هێنـا، پاشان غـەزەبم لێ گرتن بەڵام چۆن غەزەب لێگرتنێك، (لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئەبو موساوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ)) كە فەرموویەتی: (خوا مۆڵـەتی ستەمكار دەدات هـەتا كاتێك كـەگرتی ئیترلـە دەستی دەرناچێت)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَٰلِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[1] واتە: ئا بەو شێوەیە سزادانی پـەروەردگارت كاتێك خـەڵكی شارەكان سزا دەدات بە راستی گـرتنی ئـەو ئـازاردەرو بـە تینـە.[2] پاشان خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا ﴾ واتە: ئای كە چەند شاری ترمان وێران كـرد، ﴿وَهِىَ ظَالِمَةٌ ﴾ ستەمكاربوونو بروایـان بە پێغەمبـەركانیان نـەهێنا، ﴿فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ داریـان بەسـەر بـەردەوە نـەماو رووخـان بەسەر یەكدا، زەححاك دەڵێت: سەربانەكانیان تەپی بەسەر یەكدا.[3] واتـە: ماڵیـان وێـران بـوو هـەمووی بێ خاوەن بەو ناوەدا كەوتن، ﴿وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ﴾ واتە: چاوانەكانیشیان بە چۆڵی مایـەوەو كـەس ئـاوی لێ نەدەخواردەوەو كەس بە دەوریدا نەدەهات، كە لە پێشەوە ئەوەنـدە قـەرەباڵغ بـوو ڕێ بـەر ڕێـدار نەدەكـەوت، ﴿وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ﴾ واتـە: كۆشكو تـەلاری پتـەوو چاكیـشیان هـەبوو، عیكریمـە دەڵێـت: (وقصر مشیدە) واتە: كۆشكی سپیكراو بە گەچ.[4] ڕیوایەت كراوە لە عەلی كوڕی ئەبو تالیبو موجاهیدو عـەتاو سـەعیدی كـوڕی جوبـەیرو ئـەبو مولـەیح و زەححاكو كەسانی تریـشەوە هـەر بـەو شێوەیە.[5] هەندێكی تر دەڵێن: كۆشكی چاكو بڵند، هەندێكی تریش دەڵێن: (المشید) واتە: كۆشـكی تونـدو قـایم، ئەم قسانە هەموو لە یەكەوە نزیكنو دژایەتی لە نێوانیاندا نیە، ئەم هەموو كۆشكە توندو تـۆڵو بـەرزو چاكانە خاوەنەكانی لە غەزەبی خوا نەپاراستو ڕزگاری نەكردن، وەك خوای گەورە لـە ئایـەتێكی تـردا فەرموویەتی: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾[6] واتە: لە هەر شـوێنێك بـن مـردن پێتان دەگات با لە ناو قەڵاو كۆشكی بەرزو قایمیشدا بن. پاشان خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ أَفَلَمْ

---

[1] هود (١٠٢).

[2] فتح الباري (٨/٢٠٥)، مسلم (٤/١٩٩٧).

[3] الطبري (١٨/٦٥٣).

[4] الطبري (١٨/٦٥٤/٦٥٥).

[5] الطبري (١٨/٦٥٥/٣/٢٩١).

[6] النساء (٧٨).

﴿يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئایا بەناو زەویدا نەگەڕاون، بە چاوی خۆیان نەیاندەیوەو بە دڵ تێڕامانیان نەکردووە، ئەوەی ئیبنو ئەبی دنیا لە کتێبی (التفکیر والاعتبار) (تێڕامانو پەند وەرگرتندا) باسی کردووە بەسە کە هێناویەتی وئەڵێ: هەندێ لە داناکان وتوویانە: دڵت زیندوو بکەرەوە بە ئامۆژگاریو ڕووناکی بکەرەوە بە تێڕامانو بە دنیا نەویستیو بیمرێنەو بە یەقین بەهێزی بکەو بەیادی مردن سەری پێدانەوێنەو قەناعەتی پێ بکە بە نەمانو ئاگاداری بکەرەوە لە کارەساتە دڵتەزێنەکانی دنیاو بیترسێنە لە پەلامارو هەڕەشەی زەمانەو خراپیو گۆڕانکاریەکانی ڕۆژگارو باسی بەسەرهاتی پێشینەکانی بۆ بکەو یادی ئەوانەی وەبیربێنەوە لە پێشەوە هاتنو بگەڕێ بەناو پاشماوەو شوێنەوارەکانیانداو سەیر بکەو بزانە چیان کردو بۆ کوێ چوونو چیان بەسەرهات واتە: سەیری ئەو گەلە خوانەناسانە بکە کە توشی چ کارەساتو بەدبەختیەك هاتنو قڕبوون، ﴿فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَا﴾ واتە: هەتا ببنە خاوەن گوێچکەو دڵانێك کە پێی تێبگەنو ببیسنو پەندی پێ وەرگرن. ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: لە ڕاستیدا چاویان کوێر نیە بەڵکو دڵەکانیان کوێرە، هەرچەندە ئەو دڵانە تەندروستن بەڵام پەند وەرناگرنو ئاگایان لە خۆیان نیە چ باسە، چەند جوانە ئەو قسەی کە ئەبو موحەممەدی عبدالله کوڕی موحەممەدی کوڕی سارەی ئەندەلوسی شەنتەرینی وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| يا مَنْ يُصيخُ الى داعي الشَّقاءِ وقد | نادَى به النَّاعيان: الشّيبُ والكِبَرُ |
| إن كُنتَ لا تسمع الذِّكرى، ففيم تُرى | في رأسك الواعيان: السمع والبصر |
| ليس الأصمُّ ولا الأعمى سوى رجل | لم يَهدِه الهاديان: العين والأثر |
| لا الدّهر يبقى ولا الدنيا ولا الفلك أل | أعلى ولا النَّيران: الشمس والقمر |
| لَيَرحلَنَّ عن الدنيا وأن كرِها | فِراقها الثاويان: البدو والحضرُ |

واتە: ئەی ئەو کەسەی قیڕاندیو هاواری کرد بە دوای جاڕدەری بەدبەختیدا، وا مووی سپیو پیری هەواڵی مردنیان هێنا، گەر تۆ گوێ بۆ ئامۆژگاری ناگری ، ئەو دوو هەستەت بۆچیە کە چاوو گوێن؟ کەڕو کوێر کەس نیە ئەوپیاوە نەبێت کە دوو ڕێ نیشاندەرەکەش کە چاوو شوێنەوارە شارەزای ناکات ، نەزەمانە ئەمێنێتو نەدنیاو نەگەردوون ونە ئەو ئەو دوو ڕووناککەرەوەوەیش کە خۆرو مانگە، هەموو لە دنیا دەڕۆن هەرچەندە پێشیان ناخۆشە دێت ، هەموو بەجێی دەهێڵن:چ شاریو چ لادێیش.

﴿وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥۚ وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَمۡلَيۡتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ ثُمَّ أَخَذۡتُهَا وَإِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٨﴾﴾

**خوانەناسان داوای سزا دەكەن**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت بـە پێغەمبەرەكـەی (ﷺ): ﴿وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ﴾ واتـە: ئـەو خوانەناسە بێ ئاینانە كە بڕوایان بە خواو بە كتێبی خواو بە پێغەمبەرەكەیو ڕۆژی دوایی نیە پەلـەت لێ دەكەن كە زوو سزایان لە لایەن خوداوە بۆ بێت، وەك خـوای گـەورە لـە ئایەتی تـردا دەفـەرمووێت: ﴿وَإِذۡ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلۡحَقَّ مِنۡ عِندِكَ فَأَمۡطِرۡ عَلَيۡنَا حِجَارَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئۡتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾[1] واتە: (بیربكـەرەوە) كاتێك (كـە بێبـاوەڕان) دەیانوت ئـەی پـەروەردگار ئەگـەر ئـەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە یان سزای سـەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە. وە دەفـەرمووێت: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ﴾[2] واتـە: وە وتیـان: ئەی پەروەردگارمان پێش ڕۆژی لێپرسینەوە بەشەكەمان (لە سزا یان پاداشت) پێ بدە. خـوای گـەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ﴾ واتە: خودا هەرگیز لە بەڵێنی خـۆی پاشـگەز نابێتـەوەو ڕۆژی قیامـەت هـەر دێـتو تۆڵـە لـە دوژمنـەكانی دەسـێنێتو ڕێـز لـە دۆسـتەكانی دەنێت. پاشـان دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ واتە: ڕۆژێك لـە لای پـەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵە كە ئێوە حیسابی دەكەن، خوای گەورە پەلەی نیە، چونكە ئەوەنـدەی هـەزار سـاڵی دروسـتكراوەكانی بـە ئەنـدازەی یـەك ڕۆژی لای خودایـە (بـە نیسبەت) بڕیـاری خـوداوە، لەبـەر ئاگاداریو توانای لەسەر تۆڵەسەندن لە تاوانبـاران، هـەرگیز هیـچی لێ ون نابێت هەرچـەندە مۆڵـەتیان بداتو بیانهێڵێتەوەو دوایان بخات، بۆیە لە پاش ئەمـە دەفـەرمووێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَمۡلَيۡتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ ثُمَّ أَخَذۡتُهَا وَإِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ﴾ واتـە: زۆرێـك لـە شـاران كـە سـتەمكاربوون مۆڵـەتمان دان، پاشان بەر سزای خۆم خستن، پاشەڕۆژیش هەر بۆ لای منە، ئیبنو ئـەبی حاتـەم ڕیوایـەتی كـردووە لـە ئەبو هورەیرەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (موسڵمانانی هـەژار دەچـنە بەهەشـت پـێش دەوڵەمەنـدەكان بـە نیـو ڕۆژ كـە پێـنج سـەد سـاڵە) تیرمیـزیو نەسـائیش ڕیوایـەتیان كـردووە لـە فەرموودەكـەی سـەوریەوە لـە موحەممـەدی كـوڕی عـەمرەوە هـەر بـەو شـێوەیە، تیرمیـزی دەڵێـت: فەرموودەیـەكی چـاكو ڕاسـتە (حـسن صـحیح).[3] ئـەبو داود ڕیوایـەتی كـردووە لـە كۆتـایی كتێبـی (الملاحم)دا لـە سـونەنەكەیدا لـە سـەعدی كـوڕی ئـەبی وەقاسـەوە لـە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) كـە

[1] الانفال (٣٢).

[2] ص (١٦).

[3] تحفة الأحوذي (٢١/٧)، النسائي (٤١٢/٦).

فەرموویەتی: (من ئومێدەوارم کە ئومەتەکەم بێ توانا نەبن لە لای پەروەردگاریان کە نیوەی ڕۆژێ دوایان بخات) وترا بە سەعد: نیوەڕۆژێ یانی چی؟ وتی: پێنج سەد ساڵە[1].

﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ ﴾

**پاداشتی خەڵکی چاکەخوازو خەڵکی خراپەکار**

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کاتێک خوانەناسەکان داوای جەزرەبەدانیان کردو زۆر بە پەلە بوون کە سزایان لە لایەن خوداوە بۆ بێت: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە من تەنها ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، واتە: خودا منی ناردووە بۆ لای ئێوە کە بتانترسێنم بە سزایەکی زۆر توند، وە من هیچ کارێکم بەسەر ئێوە نیە، کاری ئێوە لای خوایە ئەگەر مەیلی لێ بێت زوو سزاتان دەداتو مەیلیشی لێ بێت دوای دەخات بۆتانو ئەگەر مەیلیشی لێ بێت تەوبەی ئەوانە قەبوڵ دەکات کە پەشیمان دەبنەوەو ئەگەر مەیلیشی لێ بوو ئەوانە گومڕا دەکات کە بەدبەختیان لەسەر نووسراوە، خودا خۆی هەر کارێکی حەز لێ بێت دەیکات: ﴿لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾[2] واتە: کەس ناتوانێت بڕیاری ئەو (خوا) بگۆڕێت (یان هەڵوەشێنێتەوە)و ئەو (خوا) لێپرسینەوەی خێرایە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ واتە: ئەوانەی بە دڵ خاوەن باوەڕنو بە کرداریش باوەڕەکەیان سەلماندووە، ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ واتە: لێخۆشبوونو بژێوی باشیان دەبێت، واتە: لەو گوناهانەی کە لە پێشدا کردوویانە خۆش دەبێتو پاداشتی چاکیشیان دەداتەوە لەسەر ئەو چاکە کەمانەی کە کردوویانە، موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێت: کاتێك گوێت لێ بوو بە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ ئەوە مەبەستی بەهەشتە.[3] ﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا ﴾ واتە: ئەوانەی دەیانەوێت خەڵکی بگێڕنەوە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)[4]. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش هەر وای وتووە.[5] ئیبنو عەباس

[1] أبو دا (٥١٧/٤).

[2] الرعد (٤١).

[3] الدر المنثور (٦٣/٦).

[4] الطبري (٦٦٢/١٨).

[5] الدر المنثور (٦٤/٦).

دەڵێت: خەڵكی زۆر پێدێننو ناچاری دەكەن شوێن پێغەمبەر نەكەوێت.[1] ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: ئەوانە جێگایان جەهەننمە، ئاگرێكی زۆر گەرمی بە ژانە، سزاكە زۆر توندو بەهێزە، خودا بمانپارێزێت لێی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ﴾[2] واتە: ئەوانەی كە بێباوەڕ بوونو بەرگری خەڵكیشیان كردووە لە ڕێگەی خوا جگە لە سزاكەی خۆیان سزای تریشیان بۆ زیاد دەكەین لەبەر ئەوەی كە خراپەكاریان دەكرد. یانی: ئەوانەی خوانەناس بوونو دەبوونە لەمپەر لە ڕێی خوادا لە پاش ئەو بەدفەڕیەدا، چەندجار لەسەر یەك سزایان بۆ زیاد دەكەین.

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٢﴾ لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٤﴾﴾

**دەخاڵەتی شەیتان لەقسەی پێغەمبەراندا (ﷺ) و پوچەڵكردنەوەی خواش بۆی.**

زۆرێك لە زانایانی تەفسیر لێرەدا بەسەرهاتو ڕووداوی غەرانیق وگەڕانەوەی كۆچەریەكان لەسەر زەمینی حەبەشەوەباسكردووە كە وایانزانی موشریكەكانی مەككە بڕوایان هێناوە، بەڵام گشت ڕێگاكانی ئەم فەرموودەیە مورسەلە، نەشم بینیوە كە تەنانەت لە یەك ڕوویشەوە سەنەدەكەی ڕاست بێت، والله أعلم. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ واتە: لە پێش تۆشدا ئێمە هیچ پێغەمبەرو ڕاسپاردەیەكمان نەناردووەو نیشانەكانی ئێمەی بە مەردم ڕاگەیاندبێت مەگین شەیتان بە هەڵی زانیوەو شتێكی خۆی خستووەتە ناو ئادەتەكانی ئەو، بەڵام خودا فرت و فێڵەكەی شەیتانی پوچەڵ كردووەتەوەو پاشان نیشانەكانی خۆی بتەو كردووەتەوە، خودا زانای كارزانە. بوخاری دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ﴾ واتە: كاتێك قسەی كردبێت شەیتان قسەی خۆی خستووەتە ناو قسەكانی، خوای گەورە ئەوقسانەی شەیتان دەیخستە ناوی

[1] الدر المنثور (٦/٦٤).

[2] النحل (٨٨).

پوچەڵ دەکردەوە.[1] ﴿ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ﴾ پاشان خودا نیشانەکانی خۆی توندو پتەو کردووەتەوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە ﴿إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ﴾ دەڵێت: کاتێك قسەی بکردایە شەیتان قسەی دەئاخنیە ناو قسەکانی.[2] موجاهید دەڵێت: ﴿إِذَا تَمَنَّىٰٓ﴾ کاتێك قسەی بکردایە.[3] وە وتراوە: ﴿أُمۡنِيَّتِهِۦ﴾ خوێندنەوەی ﴿إِلَّآ أَمَانِيَّ﴾[4]یانی ئەوەی کە دەیڵێنو ناینوسن، بەغەوىو زۆرێك لە زانایانی تەفسیر وتوویانە: مانای : (إذا تمنی) کاتێك کتێبی دەخوێندو دەخوێندەوە ﴿أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ﴾ واتە: شەیتان قسەی خۆی دەخستە ناو خوێندنەوەکەی.[5] زەححاك دەڵێت: (إذا تمنی) کاتێك ئەخوێنێتەوە.[6] ئیبنو جەریر دەڵێت ئەم قسەیە لە تەئویلی ڕستە دەچێت،[7] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ واتە: خودا فرِوفێڵەکەی شەیتانی دەسرِیەوەو پوچەڵی دەکردەوە، نەسخ لە ڕاستیدا واتە: سرینەوەو لابردن، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە واتە: ئەوەی شەیتان دەیخزاندە ناو قسەکانی، خودایش پوچەڵی دەکردەوە،[8] ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ﴾. واتە: خودا ئاگاداری ئەو بەسەرهاتو ڕووداوانە بوو کە ڕووی دەدا، چونکە هیچی شتێکی لێ ون نابێتو ناشارێتەوە، ﴿حَكِيمٌ﴾واتە: کارزانە لە هەموو کاروبارو بریارێکیدا، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ واتە: هەتا وابکات ئەوەی شەیتان خستوویەتیە ناویەوە ببێتە بەڵایەك بۆ ئەوانەی دڵیان نەخۆشە، ﴿وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡ﴾ واتە: ئەوانەشی کە دڵیان ڕەقەو واتە: ئەوانەی کە بتپەرستیو بێدینیو دووڕوویی لەناو دڵیاندا جێگیربووە. ئیبنو جورەیج دەڵێت: ﴿لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ﴾ واتە: دووڕووەکان. ﴿وَٱلۡقَاسِيَةِ

---

[1] فتح الباري (٨/٢٩٢).
[2] الطبري (١٨/٦٦٧).
[3] الطبري (١٨/٦٦٧).
[4] البقرة (٧٨).
[5] البغوي (٣/٢٩٣).
[6] الطبري (١٨/٦٦٨).
[7] الطبري (١٨/٦٦٨).
[8] الطبري (١٨/٦٦٨).

قُلُوبُهُمْ ﴾ واتە: بتپەرستەکان.[1] ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ﴾ واتە: ستەمکاران زۆر بۆ ئاژاوەنانەوەو دژایەتی کردنو گومڕاییو لاساری خۆیان بەردەوامن. واتە: دوورن لە هەقو ڕاستیەوە، ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ﴾ واتە: تا شارەزایانیش بزانن ئەوانەی زانیاری بەسودیان وەرگرتووە کە جیاوازی دەخەن نێوان هەقو ناهەقو خاوەنباوەڕن بە خواو بە پێغەمبەرەکەیو (ﷺ) بەوەی بۆ تۆمان ناردووە بڕوایان وایەکە ڕاستەو لە لایەن پەروەردگارتەوە هاتووە بە ئاگاداریو پارێزگاری ئەو نێرراوەتە خوارەوە، نەیهێشتووە هیچی تری تێکەڵاو ببێت. بەڵکو ئەو قورئانە کتێبی پڕ لەکارزانیە ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[2] واتە: بە تاڵ ڕووی تێ ناکات نە لە ئێستاو نە لە دواڕۆژدا (نە بە لێ کەمکردن نە بە لێ زیادکردن) چونکە نێردراوەتەوە خوارەوە لە لایەن (خوای) کاردروستی ستایشکراوەوە. پاشان دەفەرموێت: ﴿فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ﴾ واتە: باوەڕی پێ بهێننو ملی بۆ کەچ بکەن، ﴿فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵیشیان پێی دامەزرێتو سەری بۆ شۆڕ بکەن. ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە: بێگومان خودا خاوەنباوەڕانی شارەزای ڕاستەڕێ کردووە لە دنیاو لە قیامەتدا، لە دنیادا ڕێی ڕاستی نیشان داونو شوێنی کەوتوونو یارمەتیشی داون کە دژی پڕوپوچ بنو لێی دوورکەونەوە، لە ڕۆژی قیامەتیشدا ڕاستەڕێی نیشانداون کە بیانگەیەنێت بە پلەکانی بەهەشتو لایاندا لە سزای بەژانو ڕۆچوون بەناو جەهەنەمدا.

﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾﴾

## بەردەوام خوانەناسان لە گومانو دڵەڕاوکەدان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾ واتە: ئەوانەی خوانەناسن هەتا ئێستاش هەر دوو دڵن واتە: گومانیان هەیە لەم قورئانە. ئەمە قسەی ئیبنو جورەیجو ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەبووە.[3] ﴿حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً ﴾ تا لە ناکاو قیامەت بەسەریاندا دێت،

---

[1] الطبري (٦٧٠/١٨).

[2] فصلت (٤٢).

[3] الطبري (٦٧٠/١٨).

﴿بَغْتَةً﴾ موجاهید دەڵێت: لەپڕ[1]. قەتادە دەڵێت: ﴿بَغْتَةً﴾ فەرمانی خودا لە پڕ هات بەسەر ئەو گەلەدا، خوای گەورە هەرگیز هیچ گەلێکی توشی بەڵا نەکردووە کاتێك نەبێت ئەو گەلە لە خۆیان بایی بووبن‌و سەریان کردبێتە ڕابواردن‌و بێ شەرمی‌و خوایان لەبیرکردبێت، سا ئێوە لە خۆتان مەگۆڕێن‌و لەخۆبایی مەبن چونکە هیچ کەس خودا لەیاد ناکات ئەوانە نەبێت کە لە ڕێی لادەرن پاشان دەفەرموێت: ﴿أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ﴾ واتە: سزایەکی وایان بۆ دێت کە هیوای ڕزگاربوونیان نامێنێت. موجاهید دەڵێت: ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێت: ئەوە مەبەست پێ ی ڕۆژی بەدرە . عیکریمەو موجاهید دەڵێن: ئەوە ڕۆژی قیامەتە کە شەوی نیە.[2] حەسەنی بەسری‌و زەحەاکیش هەر وایان وتووە.[3] بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا هەر خوا فەرمانڕەوایە بە کاری هەموو ڕادەگات وەك لە ئایەتی تردا دەفەرموێت: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾[4] واتە: خاوەنێ ڕۆژی سزاو پاداشتدانەوەیە. وە دەفەرموێت: ﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ عَسِيرًا﴾[5] واتە: لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایەتی تەنها بۆ خوای میهرەبانە ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر سەختە لەسەر بێباوەڕان. پاشان دەفەرموێت: ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێنا بە دڵ‌و خوداو پێغەمبەریان بە ڕاست زانی بەو پێیەش کارەکانیان بەجێهێناو دڵ‌و زمان‌و ئاکاریان وەك یەك بوو، ﴿فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ واتە: لە باغاتی پڕ خێروبێر دادەمەزرێن، کە هەرگیز ناگۆڕێت‌و دوایی نایەت‌و لەناو ناچێت، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ واتە: ئەوانەی کە بە دڵ خوانەناس بوون‌و ملیان پێ نەدا، بڕوایان پێ نەکردو دژایەتی پێغەمبەرانیان دەکرد، پێیان شورەیی بوو شوێنیان بکەون، ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ واتە: ئەوانە لە بری ئەو خۆ بەزلزانین‌و مل دانەنەواندنەیان بۆ فەرمانەکانی خوا سزایەکی ئابڕوبەر بەشیانە، وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[6] واتە:

---

[1] الطبري (٣٦٠/١١).

[2] البغوي (٢٩٥/٣).

[3] البغوي (٢٩٥/٣).

[4] الفاتحة (٤).

[5] الفرقان (٢٦).

[6] الغافر (٦٠).

بە ڕاستی ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن کە بمپەرستن بەسەرشۆڕی دەچنە دۆزەخەوە. واتـە: زەلیلو سوكو بێ نرخن.

﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوْ مَاتُواْ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٦٠﴾﴾

**پاداشتی مەزن بۆ ئەو کەسانەیە کە لەبەر خودا کۆچیان کردووە**

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوْ مَاتُواْ﴾ خـوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە لـە ڕێـی خـوادا ئـاوابوونو پاشان کوژراون یان مردوون لەبەر ڕەزامەنـدیو ئومێـدی پاداشـتی خـوا، مـاڵو منـداڵو دۆسـتو وڵاتـی خۆیـان بـەجێ هێشتووەو لێـی دوورکەوتوونەتەوە، شوێنی فەرمانی خوداو پێغەمبەرو (ﷺ) ئاینەکەی کەوتوون لەو پێناوەدا کوژراون یان مردوون، واتە: لە شەڕدا نەکوژراونو لەسەر جێ لە ماڵی خۆیاندا مردوون، ئەوانـە پاداشـتی چـاکی خۆیان وەدەستهێناوە سوپاس کراونو ڕێزیان لێ گیراوە لە لای خودا وەك خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةًۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾[1] واتە: وە هەر کەسێك لە مـاڵی خـۆی دەرچێتو کـۆچ بکـات بـۆ لای خـواو پێغەمبەرەکەی پاشان مـردن پێـی بگـات ئـەوە بێگومـان پاداشـتی ئـەو کەسـە کەوتووەتە سەر خوا.لە پاشاندا دەفەرمووێت: ﴿لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾ واتە: خودا ڕۆزیـەکی زۆر چاکیان دەداتێ، واتە: خودا بە فەزڵی خۆی پاداشتیان دەداتەوەو بژێویەکی چاکیان لە بەهەشتدا پێ دەبەخشێ کە چاوو دڵیـانی پـێ ڕۆشـن ببێتـەوە، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ واتـە: بێگومـان خـودا چـاکترین ڕۆزی دەرە، پاشـان دەفـەرمووێت: ﴿لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ﴾ دەشیانخاتە ئەو شوێنەی خۆیان ئارەزوویان لێیەتی، واتە: دەیانباتە بەهەشت، وەك خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرمووێت: ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ﴾[2] واتـە: خۆشگوزەرانیو بژێوی باشو بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتیان پـێ دەبەخشێت، پاشـان دەفـەرمووێت: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ﴾ واتە: خودا ئاگای لەو کەسانەیە کە کۆچیان کـردووەو جیهادیان لـە ڕێـی خـوادا

---

[1] النساء (١٠٠).

[2] الواقعة (٨٨-٨٩).

کردووە، دەزانن کێ شایەنی ئەو پاداشتەیە ﴿حَلِيمٌ﴾ لەسەرخۆیەو چاوپۆشی دەکاتو لە گوناهەکانیان خۆش دەبێتو دەبوورێت لەبەر ئەو ئاوارەبوونەو پشت بەستنەیان بە خودا. بەڵام ئەوانەی دەکوژرێن لە ڕێی خوادا، ئاوارە بن یان ئاوارە نەبن، ئەوانە زیندوونو لە لای خودا بژێوی دەدرێن وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾[1] واتە: هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کە کوژراون لە ڕێی خوادا مردوون (نەخێر وا نیە) بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن. فەرموودە لەم بارەیەوە زۆرە وەك لە پێشەوە باسمان کرد، ئەوانەی کە لە ڕێی خوادا دەمرن چ ئاوارە بن یان نا، ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەو فەرموودە سەحیحانە بژێوی بەردەوام و پاداشتی زۆر گەورەی خودا یان لەخۆ گرتووە بۆیان، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە شەرحەبیلی کوڕی سەمتەوە دەڵێت: زۆر شەونخونیمان کێشاو ماینەوە لە لاي قەڵایەم لەسەر زەمینی ڕۆمدا سەلمانی فارسی بە لاماندا تێپەڕی (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: من لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)م بیستووە فەرموویەتی: (کەسێك بەردەوام ڕووبەڕووی دوژمن وەستاو مرد خودا پاداشتی وەك ئەوانەی دەداتەوە لە ڕێی خوادا کوژراونو ڕۆزیشیان دەدرێتو بێترسیش دەبن لە دوو فیتنەکە ئەگەر پێشتان خۆشە ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓا۟ أَوْ مَاتُوا۟ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۝٥٨ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾[2] دیسان ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی جەحدەمی خەولانیەوە دەڵێت: فەزالەی کوڕی عوبەید لەگەڵ دوو تەرمدا بوو لەناو دەریادا یەکێکیان بە مەنجەنیق کوژرابوو ئەوی تریان مردبوو، فەزالە لە لای گۆڕی مردووەکە دانیشت، پێیان وت: شەهیدەکەت واز لێ هێناوە لە لای دانەنیشتووی؟ وتی: من گوێنادەم بەوەی لە هەر گۆڕێکیانەوە زیندوو بکرێمەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓا۟ أَوْ مَاتُوا۟ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾دەی، ئەی عەبدەکە! ئیتر چیت دەوێت کە بچیتە شوێنێك کە خۆت ئارەزووی دەکەی، وە بژێویشتان بە چاکترین شێوە پێبدرێت؟، سوێند بە خوداگوێنادەمێ لەهەر گۆڕکیانەوە زیندوو بکرێمەوە[3]. ﴿ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ﴾

---

[1] ال عمران (١٦٩).

[2] ابن ابي حاتم (٢٥٠٣/٨).

[3] الطبري (١٨٢/٩).

واتە: ئەگەر ناهەقی لێكراوێك بە ئەندازەی ئەو ناهەقیەی كە پێی كراوە تۆڵەی خۆی بسێنێت ﴿ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ﴾ واتە: پاشان ناهەقی تری لێ بكرێت ﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾ واتە: خودا یارمەتی دەدات. موقاتیلی كوڕی حەییانو ئیبنو جورەیج دەڵێن:ئەم ئایەتە لەسەر كۆمەڵێك لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتەخوارەوە گەیشتنە دەستەیەك لە موشریكەكان لە مانگی موحەڕڕەمدا، موسڵمانەكان داوایان لێ كردن كە شەڕیان لەگەڵدا نەكەن لە مانگی حەرامدا، موشریكەكان كۆڵیان نەداو وتیان: هەر شەڕ دەكەین، پەلاماریان دان، موسڵمانانیش بەشەڕهاتن لەگەڵیاندا خودا سەری خستن بەسەر موشریكەكاندا، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾ واتە: خودا لێبوردەو گوناه بەخشە[1].

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ ﴾

**وەدیهێنەری دنیاو هەڵوسڕێنەریشی هەر خودایە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ﴾ واتە: چونكە خودا شەو دەخاتە ناو ڕۆژو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو، واتە: خودا ئاگاداریان دەكات كە خۆی دروستكەرو هەڵسوڕێنەری هەموو كاروبارەكانی بوونەوەرەو بە مەیلی خۆی هەرچی بوێ دەیكات وەك لەم ئایەتانەدا دەفەرمووێت: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِي ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾[2] واتە: بڵێ ئەی خوایە خاوەن دەسەڵات! دەسەڵات دەدەیت بە هەر كەسێك كە بتەوێتو دەسەڵات دەسێنیتەوە لە هەر كەسێك كە بتەوێتو بە ڕێزی دەكەیت ئەوەی كە بتەوێتو بێڕێزی دەكەیت ئەوەی بتەوێت تەنها بە دەستی تۆیە هەموو چاكەیەك بە ڕاستی تۆ بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایت، شەو دەكەیت بەناو ڕۆژداو ڕۆژ دەكەیت بەناو شەوداو زیندوو دەردێنی لە مردوو وە مردوو دەردێنی لە زیندوو وە ڕۆزی دەدەیت بە هەر كەسێك كە بتەوێت بەبێ شومار، (ایلاج) خستنە ناو،

[1] الطبري (١٨/٦٧٥).

[2] ال عمران (٢٦ـ٢٧).

واتە: شەو دەخاتە ناو ڕۆژو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو، جاریٚ شەو درێژ دەبێتو ڕۆژ کورتە وەك زستانو جارێکی تر ڕۆژ درێژ دەبێتو شەو کورت دەبێت وەك هاوین، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ﴾ واتە: بێگومان خودا دەبینێتو دەبیسیٚ،واتە: قسەی بەندەکانی دەبیستێتو خۆشیان دەبینێت، هیچی لیٚ ون نابێتو ئاگاداری ژیانو هەڵسوکەوتیانە، کاتێك کە ڕوونی کردەوە کە هەر خۆی بەکارەکانیدا دەگات لەم بوونەوەرەدا، هەر خۆی فەرمانڕەوایەو هیچ کەس ناتوانێت دەست وەکاریەوە بدات، پاشان دەفەرمووێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ واتە: چونکە هەر ئەو خودایەکی ڕاستەو دروست نیە عیبادەت بۆ کەسی تر بکرێت جگە لەئەو، لەبەر ئەوەی خاوەن دەسەڵاتێکی ئەوەندە مەزنە مەیلی لە هەر شتێك بێت ئەوشتە دەبێت، مەیلی لە هەر شتێکیش نەبیٚ نابێت، هەموو شتێکیش نیازی بەو هەیەو ملکەچی ئەوە، ﴿وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ﴾ واتە: هەر شتێك غەیری خودا هاواری بۆ دەبەن لە پڕوپوچ زیاتر هیچ شتێکی تر نیە، لەو بتو دارو بەردو ئەو شتانەی تریش کە دەیانپەرستن غەیری خودا پڕوپوچن، چونکە توانای زەرەو قازانجیان نیە، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾ واتە: هەر خودا باڵادەستی زۆر مەزنە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾[1] واتە: وە هەر ئەوە بڵندپلەی پایە گەورە. وە دەفەرمووێت: ﴿ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ﴾[2] واتە: گەورەو بەرزە. هەموو شتێك لە ژێر تواناو دەسەڵاتی مەزنی ئەودایە، هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو، پەروەردگاریش هەر خۆیەتی، چونکە ئەو باڵادەستێکە هیچ کەس لەو باڵادەستتر نیە، ئەوەندەیش مەزنە هیچ کەسێك لەو مەزنتر نیە، خودا پاكو بیٚ عەیبە لەو شتانەی کە ئەو ستەمکارو خوانەناسو لادەرانە دەیدەنە پاڵی.

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٦٤﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ﴿٦٦﴾﴾

---

[1] البقرة (٢٥٥).

[2] الرعد (٩).

**چەندین نیشانە لەسەر تواناو دەسەڵاتی خودا**

خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ دیسان ئەم ئایەتانەش باسی تواناو گەورەیی دەسەڵاتی خودا دەکەن کە هەوا دەنێرێتو هەور دەگێڕێت، باران دەبارێنێت بەسەر زەویە بێگیانو مردووەکاندا کە هیچ گیاو گژەیەکی تێدا نەماوە وشکو ڕەش هەڵگەڕاوە، ﴿فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾[1] واتە: جا کاتێك بارانمان بەسەردا باراند زەوی (ڕووەکی لێ دەڕوێتو) دەجوڵێت زەوی هەڵدەداتو بەرز دەبێتەوە. هەر کاتێك بارانمان لێ باراند گەشە دەکاتو بە خۆیدا دێت، وە لێرەیشدا دەفەرموویت: ﴿فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً﴾ واتە: زەمین سەوز هەڵدەگەڕێت بە هۆی ئەو بارانەوە، ئەم فایە لە ﴿فَتُصْبِحُ﴾دا بۆ تەعقیبە، واتە: هەموو شتێك بە پێی خۆی بە دوای یەکتریدا دێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً﴾[2] واتە: دواتر نوتفەکەمان کرد بە خوێنی مەییو ئینجا خوێنە مەییوەکەشمان کرد بە پارچە گۆشتێکی جواو. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: نێوانی هەموو دوو شتێك چل ڕۆژی پێدەچێت.[3] با ئەوەفای تەعقیبیش بە دوایدا هاتووە، هەر بەو شێوەیش لێرەدا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً﴾ واتە: سەوز هەڵگەڕاوە پاش ئەوەی کە وشکو تینوو بێ ئاو بوو، لە هەندێ خەڵکی حیجازەوە باس کراوە وتوویانە دوای باران بارین زەمین سەوز هەڵدەگەڕێت، والله أعلم. ﴿إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾ بێگومان خودا هەموو شتی لێ دیارەو ئاگادارە، دەزانێت بەو شتانەی کە لەسەر ناوچەکانی سەر زەمیندا هەیە لە تۆمو دانەوێڵە با هەرچەندە بچوك بێت، هیچی لێ وون نابێتو بەشی خۆی ئاوی بۆ دەچێتو پێی سەوز دەکات، وەك لوقمـان دەڵێـت: ﴿يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾[4] وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾[5] واتە: بۆ ئەوەی سوژدە نەبەن بۆ ئەو خوایەی

---

[1] الحج (٥).

[2] المؤمنون (١٤).

[3] فتح الباري (٦/٣٥٠)، مسلم (٤/٢٠٣٦).

[4] لقمان (١٦).

[5] النمل (٢٥).

کە ئەوەی شاراوە بێت لە ئاسمانەکانو زەویدا دەریدەخاتو دەریدێنێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾[1] واتە: وە هەر گەڵایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێتو هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکیەکانی زەویدا بێتو هەر تەڕو وشکێك هەبێت هەر هەموویان لە کتێبی ئاشکرادان پاشان دەفەرمووێت: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هەموو ماڵی ئەوەو خوا بۆ خۆی بێنیازەو هەموو شتێك نیازی بەو هەیەو بەندەی ملکەچی ئەوە، دەبێت هەر سوپاسو ستایشی ئەو بکرێت، وە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئەی نەتدیوە کە خودا هەرچی لەناو زەمیندا هەیە دەستەمۆی کردووە بۆ ئێوە لە گیانەوەرو بێ گیانو کشتوکاڵو بەروبووم، وەك لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾[2] واتە: خوا ڕامی هێناوە بۆتان ئەوەی لە ئاسمانەکانو ئەوەی لە زەویدایە. واتە: ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هەمووی بۆ ڕام هێناون بە فەزڵو ڕێزو چاکەی خۆی، ﴿وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ﴾ واتە: کەشتیش هەر بە فەرمانی ئەو لەناو ئەو دەریا بێبنو پڕ لە شەپۆلەدا بە هۆی باوە لەسەرخۆ هەرچی شتتانە لێی بار دەکەن بە ئارەزووی خۆتان لە کەلوپەلی بازرگانیو هەر شتێکی تر کە بەسوودە بۆتان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، کەلوپەلی ئەم دەبەن بۆ ئەو، هی ئەویش دێنن بۆ ئەم، هەریەکەو بەپێی پێویستو داوای خۆیان، ﴿وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓ﴾ واتە: ئەم ئاسمانەشی ڕاگرتووە کە نەکەوێت بەسەر زەمیندا مەگەر خۆی ئیزنی لەسەر بێت، ئەگەر مەیلی لێ بێت ئاسمان دەخات بەسەر زەمیندا ئەوەی کە لەناویدایە لەناو بچێت، بەڵام بە سۆزو بەزەییو توانای خۆی ئاسمانی ڕاگرتووە کە ناکەوێت بەسەر زەمیندا، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ واتە: بێگومان خودا بۆ ئەم خەڵکە زۆر بەسۆزو دڵۆڤانە. لەگەڵ ئەو هەموو ناهەقیەشدا کە دەیکەن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلۡمِهِمۡۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ﴾[3] پاشان خوای گەورە

[1] الانعام (٥٩).

[2] لقمان (٢٠).

[3] الرعد (٦).

دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ﴾ واتە: هەر خودایە کە ژیانی پێداونو لە پاشان دەتانمرێنێت، پاشانیش زیندووتان دەکاتەوە، بە ڕاستی مرۆڤ سپڵەو پێ نەزانە، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾[1] واتە: چۆ بێباوەڕ دەبن بە خوا!؟ لە کاتێکدا کە ئێوە بێ گیان بوونو گیانی بەبەرداکردن لە پاشان دەتانمرێنێت دوای ئەوە زیندووتان دەکاتەوە ئینجا بۆ لای خۆی دەگەڕێنرێنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يَجۡمَعُكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾[2] واتە: بڵێ: خوا زیندووتان دەکاتەو لە پاشان دەتانمرێنێت پاشان کۆتان دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا هیچ گومانی تێدا نیە بەڵام زۆربەی خەڵکی نەزانن. وە دەفەرمووێت: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ﴾[3] واتە: ئەی پەروەردگارمان تۆ دوو جارت مراندووینو دوو جاریش ژیانت بەبەردا کردووین. واتە: چۆن ئێوە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێنو دەیکەنە شەریکی خوداو لەگەڵیدا دەیپەرستن، کە هەر ئەو خۆی بە تەنها دروستکەرو ڕۆزیدەرو بە کارەکانتاندا دەکات، ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ﴾ واتە: دروستی کردوون پاش ئەوەی ئێوە شتێك نەبوون کە باستان لێ بکرێت، ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾ پاشان مراندنیو ﴿ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾ واتە:پاشانیش لە ڕۆژی قیامەتدا زیندووتان دەکاتەوە، ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ﴾ واتە: بە ڕاستی مرۆڤ پێ نەزانەو هیچی لەبەر چاو نیە.

﴿لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا هُمۡ نَاسِكُوهُۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِۚ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾﴾

### هەموو گەلێك دەستووریکی خۆی هەبووە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا هُمۡ نَاسِكُوهُۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِۚ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسۡتَقِيمٖ﴾ واتە: بۆ هەموو گەلێك ڕێو شوێنمان داناوە، کە بەو دەستوورانە

---

[1] البقرة (٢٨).

[2] الجاثية (٢٦).

[3] الغافر (١١).

کاری خۆیان بەڕێوە بەرن، وە نابێت لەسەر ئەم کارە ئەوان دژایەتیت بکەن، تۆ هەر بۆ لای پەروەردگارت بانگ بکە، چاك بزانە تۆ لەسەر ڕێی ڕاستی. خوای گەورە لێرەدا باسی ئەوە دەکات کە بۆ هەموو گەلێك دروشمو ڕێوشوێنێکی داناوە. ئیبنو جەریر دەڵێت: واتە: بۆ هەموو ئومەتێك پێغەمبەرو دەستوورێکی داناوە. وە دەڵێت: ئەسڵی مەنسەك (المنسك) لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لەو شوێنەی کە خەڵکی لەسەری ڕاهاتوونوبەردەوام هاتوچۆی دەکەن، بۆ چاکەبێت یان بۆ خراپە بێت، دەڵێت: بۆیە مەناسیكو دروشمی حەج بەو شێوەیە ناودەبرێت، لەبەر هاتوچۆی بەردەوامی خەڵکی بۆیو مانەوەیان تێیدا.[1] ئەگەر وەك ئەوە بێت کە ئیبنو جەریر دەڵێت: مەبەست پێی دروشمی هەموو گەلێك یانی :پێغەمبەرێك بێت ،کەواتە مەبەستیش بەوەی کە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ ئەو موشریکانەیە کە کێشە لەگەڵ پێغەمبەر دەکەن. ئەوکاتە مەبەست پێی ئەوەیە هەموو کۆمەڵێك ڕێوشوێنی بۆ دانراوەو دیاری کراوەو بڕاوەتەوە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلِكُلّٖ وِجۡهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا﴾[2] واتە: هەر لایە شوێنێکیان هەیە ڕووی تێ دەکەن بۆیە لێرەیشدا فەرمنوویەتی: ﴿هُمۡ نَاسِكُوهُۖ﴾ واتە: دەستورێکی خۆیان هەیە پێی هەڵدەسن، زەمیرەکە (واوەکە) لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە دەستوورو ڕێوشوێنی تری خۆیان هەیە،یانی: ئەوانەی کە ئەو کارانە دەکەن بڕیاری خودای لەسەرەو بڕاوەتەوە، تۆ هیچ دڵگران مەبە بەو کێشانەی ئەوان دەیکەن بەرامبەر بە تۆ، و با لات نەبەن لەسەر ئەو هەقەی لەسەریتی. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسۡتَقِيمٖ﴾ واتە: بانگەواز بکە بۆ لای پەروەردگارت بە ڕاستی تۆ لەسەر ڕێگەی ڕاستی، واتە: ئەو ڕێگا ڕوونو ئاشکراو ڕێكو ڕاستەی کە دەتگەیەنێتە مەبەست. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعۡدَ إِذۡ أُنزِلَتۡ إِلَيۡكَۖ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾[3] واتە: وە با (بێباوەڕان) بەرگریت نەکەن لە (گەیاندنی) ئایەتەکانی خوا دوای ئەوەی دابەزێنراوە بۆت بانگی (خەڵك) بکە بۆ لای پەروەردگارت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ واتە: ئەگەر کێشەیان پێ کردی، بڵێ: خودا ئاگادارترە لەو کارەی ئێوە دەیکەن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ

---

[1] الطبري (١٨/٦٧٨/٦٧٩).

[2] البقرة (١٤٨).

[3] القصص (٨٧).

عَمَلُكُمۡۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر بڕوایان پێ نەهێناوی ئەوە پێیان بڵێ (پاداشتی) کردەوەی خۆم بۆ خۆمو (پاداشتی) کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان ئێوە بەرینو بەرپرسیار نین لەوەی من دەیکەم منیش بەریمو بەرپرسیار نیم لەوەی ئێوە دەیکەن. ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندو ترس ئامێزە. وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ أَعۡلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۖ﴾[2] واتە: خوا چاك دەزانێت بەو توانجانەی دەیدەن لە قورئان ئەوە خوا بەسە کە شایەت بێت لە نێوان منو ئێوەدا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴾ واتە: خودا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو کێشانەتان بۆ شیدەکاتەوە کە لەسەری ناکۆك بوون. ئەم ئایەتەیش وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ﴾[3] واتە: کەواتە تۆ بۆ ئەوە بانگەواز بکەو ڕاوەستە لەسەر ئاینەکەت بەو جۆرەی فەرمانت پێکراوەو شوێن ئارەزوەکانی ئەوان مەکەوەو بڵێ باوەڕم هێناوە بە هەر نامەیەك کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە.

﴿أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧٠﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾ واتە: ئایا تۆ نەتزانیوە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە خودا ئاگای لێیەتی؟ ئەوە هەموو لەناو دەفتەردایە، ئەمەیش بۆ خوا ئاسانە، خوای گەورە باسی زانیاری خۆی دەکات کە چەندە ئاگاداری دروستکراوەکانیەتی، زانیاری ئەو دەورەی ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیش لەناویاندایە داوەو مسقالە زەڕەی لێ ون نابێت، وە ئاگاداری هەموو بوونەوەریش بووە لە پێش ئەوەی پەیدا ببێت، هەمووی لە کتێبی خۆیدا لە (لوح المحفوظ) نووسیوە. وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا ئەندازەی دروستکراوەکانی دیاریکردووە لە پێش دروستکردنی ئاسمانەکانو زەمین بە پەنجا هەزار ساڵ

[1] یونس (٤١).
[2] الاحقاف (٨).
[3] الشوری (١٥).

(العرش)یش لەسەر ئاو بووە).[1] لە سونەنەکاندا هاتووە لەسەر زمانی کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ)، کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (یەکەم شتێك کە خودا دروستی کرد پێنوس بوو فەرمووی پێی: بنووسە! پێنووس وتی: چی بنووسم؟ فەرمووی: ئەو شتانەی کە دەبن بیاننووسە، پێنووسیش هاتە نووسینی ئەو شتانەی کە هەتا ڕۆژی قیامەتدێنە بوون).[2] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ واتە: هەموو شتێك لە دەفتەردا (لوح المحفوظ) نووسراوە ئەو کارەیش لای خوا زۆر ئاسانە.

﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾﴾

**بتپەرستەکان غەیری خودا دەپەرستن و بە توندیش حاشا لە نیشانەکانی خودا دەکەن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتە: شتێك دەپەرستن غەیری خوا، خوای گەورە باسی موشریکەکان دەکات کە ئەوەندە نەزان وسپڵەن غەیری خودا دەپەرستن کە بەڵگەیەکی بەهێزیان بۆ ڕەوانە نەکراوە لەو بارەیەوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفـــــەرموێت: ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾[3] واتە: هەر کەسێك بپەرستێت پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا کە هیچ بەڵگەیەکی نەبێت لەسەر ئەو (پەرستنە) ئەوە بە ڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگارێتی، بێگومان کافران ڕزگار نابن. بۆیە لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌۗ﴾ واتە: هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە کە بۆیان هاتبێتە خوارەوەو خۆشیان هیچ زانیاریەکیان لەو بارەیەوە نیە کە کێشەو ناکۆکیان لەسەری هەیە. بەڵکو هەر شتێك لە باب و باپیران و پێشینەکانی خۆیانەوە پێیان گەیشتووە بەبێ هیچ نیشانەو بەڵگەیەك، بەڵکو سەرچاوەکەیان لە شەیتانەوەیەو ئەو لەبەرچاوی شیرین کردوون بۆیە خوای گەورە هەڕەشەیان لێ دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ واتە: ناهەقیکارانیش هیچ یارمەتی دەرێکیان نیە لە دەستی خودا ڕزگاریان بکات، کاتێك کە

[1] مسلم (٤/٢٠٤٤).

[2] ابو داود (٥/٧٦)، تحفة الأحوزي (٩/٢٣٢).

[3] المؤمنون (١١٧).

تۆڵـەیان لێ دەسـێنێت‌و سـزایان دەدا. پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ واتە: کاتێك کـە قورئانیـان بەسـەردا دەخوێنرێتـەوەو ئـەو هـەموو بەڵگـە ئاشـکرایان بـۆ بـاس دەکرێت لەسەر تەنهایی خودا کە غەیری ئەو هیچ خودایەك نیەو پێغەمبەرە بـەڕێزەکانیش هـەق‌و ڕاسـتن، ﴿تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ واتە: لە نێوچەوانی خوانەناساندا نیشانەی ناڕەزایی دەبینـی، خەریکـە پـەلاماری ئـەو کەسـانە بـدەن کـە نیـشان ئاشـکراکانی ئێمـەیان بەسـەردا دەخوێننـەوەو لێیـان بـدەن‌و قـسەیان پـێ بڵـێن، خـودایش دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ واتە: ئـەی موحەمـەد بڵـێ: ئایا هەواڵتان بدەمێ کە چی لەمە خراپترە؟ ئەو ئاگرو جەزرەبـەو سـوکایەتی پێکردنـە خـراپترو گرانتـرو گەورەترە لەوەی کە ئێوە بەرامبەر بەو دۆستی خوداو خاوەن باوەڕانە دەیکەن‌و هەڕەشەیان لێ دەکـەن‌و دەیانترسێنن لە دنیادا. کە لە ڕۆژی قیامەتدا تووشتان دێت لەسەر ئەو کـارە خراپـەی دەتانـەوێت بیکـەن لەگـەڵیان، ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ واتـە: چ ئاکـام‌و ڕێوشـوێنێکی خـراپ‌و نالـەبارە ئـەو ئـاگرە، ﴿إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾[1] واتە: بە ڕاستی دۆزەخ جێگەو شوێن‌و مانەوەیـەکی زۆر خراپـە. بـە ڕاسـتی جەهەنـەم شوێنێکی زۆر خراپ‌و نالەبارە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾﴾

### باسی بێنرخی ئەو بتانەو بێئاوەزی ئەوانەی کە دەیانپەرستن

خوای گەورە باسی بێنرخی بتەکان‌و بێئاوەزی ئەو کەسانە دەکات کە دەیانپەرستن‌و دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە نموونەیەك هێنراوەتەوە باش گوێی بۆ بگـرن، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە نـەفام‌و موشـریکەکان دەیکەنـە هـاوەڵی خـوداو هانایـان بـۆ دەبـەن غـەیری خـودا، ئەگـەر هـەموویان کۆببنەوەو بیانەوێت مێشێك دروست بکـەن نـاتوانن دروستی بکـەن، وەك ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە بە مەرفوعی دەڵێت: (خوای گەورە دەفەرموێت کێ لـەو کەسـە ناهـەقترو

[1] الفرقان (٦٦).

ستەمكارترە كە شتێك دروست بكا وەك ئەوەی من دروستم كردووە با وەك من چۆن مێروولە یان مێشێك یان (تۆوێك) دروست بكات).[1] بوخاری‌و موسلیمیش ڕیوایەتیان كردووە لە ڕێگەی عەممارەوە لە ئەبو زورعەوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت كێ لەو كەسە ناهەقترە دەڕوات وەك ئەوەی من دروستم كردووە ئەویش شتێك دروست دەكات، با مێروولەیەك دروست بكات، با دەنكە جۆیەك دروست بكات).[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ﴾ واتە: ئەگەر مێشەكە شتێكیان بفڕێنێت‌و بیبات ناتوانن لێی بسێننەوە، ئەوانە ناتوانن مێش دروست بكەن، بەڵكو ناتوانن بەر لە مێش بگرن ئەگەر لەبەر دەستیاندا شتێكی هەڵگرت‌و بردی، دیارە مێش لە هەموو گیانەوەرەكانی تری خودا لاوازو زەبوونترە. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ﴾ واتە: داواكارو داوالێكراو زۆر لاوازن. ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿ٱلطَّالِبُ﴾ واتە: بتەكە: ﴿وَٱلْمَطْلُوبُ﴾ واتە: مێشەكە.[3] ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە. وەك لە دەقەكەوە دیارە. سودی‌و كەسانی تریش دەڵێن: ﴿ٱلطَّالِبُ﴾ واتە: بتپەرستەكە ﴿وَٱلْمَطْلُوبُ﴾ بتەكە.[4] پاشا دەفەرمووێت: ﴿مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ﴾ واتە: خودایان بەو گەورەییە نەناسیووە كاتێك كە ئەوانەیان كردووە بە شەریكی‌و لەگەڵیدا پەرستوویانە، كە ناتوانن مێشێك لە خۆیان دووربخەنەوەو ئەوەندە لاوازو زەبوون‌و بێدەسەڵاتن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ﴾ واتە: خوا زۆر بە تواناو دەسەڵاتە، ئەو خوایەی كە ئەوەندە بەهێزە بەدەسەڵات‌و توانای خۆی هەموو شتێكی وەدیهێناوە ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[5] واتە: ئەو (خوا) زاتێكە بەدیهێنانی دەست پێكردووە لە پاشان (دوای مردنی) دووبارە دروستی دەكاتەوە (ئەم دروستكردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾[6] واتە: بە ڕاستی دەست وەشاندنی پەروەردگاری تۆ زۆر سەختە، بێگومان هەر ئەوە كە لە

---

[1] احمد (٣٩١/٢).

[2] فتح الباري (٤٣٧/١٣)، مسلم (١٦٧١/٣).

[3] الطبري (٦٨٥/١٨).

[4] البغوي (٢٩٨/٣).

[5] الروم (٢٧).

[6] البروج (١٢_١٣).

سەرەتاوە (مرۆڤ) دروست دەكاتو (دوای مردن) زیندووی دەكاتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾[1] واتە: بە تەنها خوا خۆی ڕۆزیدەرە كە خاوەن دەسەڵاتی زۆر بەهێزە. ﴿عَزِيزٌ﴾ واتە: خاوەنی دەسەڵاتو زاڵە بەسەر هەموو شتێكدا، هیچ كەسێك ناتوانێت ڕێگری بێتو لەبەر دەسەڵاتیدا بوەستێت لەبەر زۆر مەزنیو خاوەن دەسەڵاتی خودا، وە هەر خۆی تەنهاو زاڵە.

﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ ﴾

## خودا لەناو فریشتەكان و لەناو مرۆڤیشدا پەیامنێری هەڵبژاردووە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ﴾ واتە: خوا لەنێو فریشتەكاندا نێردراو هەڵدەبژێرێت بۆ هەر شتێك مەیلی لێ بێت بۆ بەجێهێنانی ئەو بڕیارو بەرنامەیەی بڕیاری داوە، وە لەناو مرۆڤیشدا بە هەمان شێوە بۆ گەیاندنی پەیامەكەی، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ واتە: خوا قسەی بەندەكانی دەبیستیو ئاگای لێیانە، دەزانێ كێ شایەنی ئەوەیە لە نێوانیاندا ئەو پەیامەی پێ بسپێرێت، وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾[2] واتە: خوا چاك دەزانێ پەیامو فرستادەی خۆی لە كوێ دادەنێت (و كێ شیاوترە بۆ ئەو كارە). وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ واتە: ئەوەی دەیكەنو ئەوەشی كردوویانە خوا لێی ئاگادارە، دەزانێت چی دەكات لەگەڵ ئەو پەیامنێرەی كە پەیامەكەی پێدا ناردووە، هیچێك لە كارەكانیانی لێ ون نابێت، وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا۟ رِسَٰلَٰتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَىْءٍ عَدَدًۢا﴾[3] واتە: هەر خوایە زانا بە نهێنیەكانو كەس ئاگادار ناكات بەسەر نهێنی خۆیدا، مەگەر پێغەمبەرێكی كە لێی ڕازی بێت جا بێگومان خوا دەنێرێت لەبەردەمیو پشتیەوە پاسەوان (لە فریشتە) تا بزانێت كە سروشتی خوای خۆی گەیاندووەو خوا ئاگادارە بەوەی كە لایانەو هەموو شتێكی هەڵژماردووە بە هەڵژماردن.

---

[1] الذاريات (٥٨).

[2] الانعام (١٢٤).

[3] الجن (٢٦-٢٨).

خوای گەورە خۆی چاودێرە بەسەریانەوەو ئاگادارە چیان پێ دەوترێت، پارێزەریانەو یارمەتیدەریشیانە، وەك دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕایگەیەنە (بە خەڵك) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوەو ئەگەر ڕانەگەیەنی ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندووەو بەجێت نەهێناوەو خوا تۆ دەپارێزێت لە خەڵکی (کە بتکوژن). پاشان دەفەرموویت: ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ واتە: هەموو کارەکان دەچێتەوە لای خوا.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۩ (٧٧) وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ (٧٨)﴾

**فەرماندان بە خواپەرستی و تێکۆشان (الجهاد)**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ واتە: ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان کڕنوش و سوژدە بەرن و پەروەردگارتان بپەرستن و کاری چاکەیش بکەن، بەشکو ڕزگار ببن، لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (سورەتی (الحج) ڕێزی لێ نراوە بە دوو سوژدە، هەر کەس سوژدەیان تیا نەبات با نەیانخوێنێت).[2] وە دەفەرموویت: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾ واتە: بەڕاستی و بە دڵ لە ڕێی خوادا جیهاد بکەن. واتە: بە سامان و زمان و گیانتان لە ڕێی خوادا تێبکۆشن، وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾[3] واتە: بترسن لە خوا ترسانێك کە شیاویتی. پاشان دەفەرموویت: ﴿هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ﴾ واتە: ئەی خاوەن باوەڕانی ئەم ئومەتە خوا ئێوەی هەڵبژاردووە لەناو ئومەتەکانی تردا و ڕێزو قەدری بە تایبەتی لێ ناون بە بەڕێزترین پێغەمبەرو تەواوترین شەریعەت، ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾ واتە: لەم ئاینەیشدا تووشی

---

[1] المائدة (٦٧).

[2] الحاكم (١/٢٢١).

[3] ال عمران (١٠٢).

نارەحەتی نەکردوون و ئەرکێکیشی نەخستووە سەرتان نەتوانن بەجێی بێنن، شتێکیشی فەرز نەکردووە لەسەرتان نارەحەتتان بکات و دەروویەکی لێ نەکردبنەوەو ڕێگای بۆ ئاسان نەکردبن، ئەوسا نوێژکردن کە یەکێکە لە پایە هەرە مەزنەکانی ئیسلام دوای شایەتومانە (أشهد أن لا إلـه الاّ الله وأشهد أنّ محمدً رسول الله) لەناو شارو شوێنی نیشتەجێدا چوار ڕەکاتە لە کاتی سەفەردا دەبێتە دوو ڕەکات و لە کاتی ترسدا هەندێ لە پێشەوایان ڕەکاتیان داناوە بکرێت، وەك لە فەرموودەدا هاتووە.[1] وە بە پیادەیی و بە سواریش و بەرەو قیبلەو بەبێ ڕوو لە قیبلەیش نوێژ دەکرێت، وەك لە سەفەردیشدا لە نوێژی سوننەت کردندا. یان وەستان بە پێوە نامێنێت لە کاتی نەخۆشیدا، نەخۆش بە دانیشتن نوێژ دەکات، وە ئەگەر کەسێك بە دانیشتنیش نەیتوانی بە پاڵەوە نوێژ بکات، چەندە چاوپۆش و ئاسانکاری تریش لە ئەرکەکانی تریشدا، بۆیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بعثتُ بالحنيفية السمحة) واتە: من ڕەوانەکراوم بە ئاینێکی ڕاستی ئاسان).[2] وە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك کە مەعازو ئەبو موسای بە ئەمیری نارد بۆ یەمەن پێی فەرموون: (مزگێنی بدەن و خەڵکی ڕاومەنێن، ئاسانکاری بکەن و شتیان لەسەر گران مەکەن).[3] فەرموودە لەم بارەیەوە زۆرە. بۆیە ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾ئەفەرموێت: یانی: تووشی زەحمەتی نەکردوون.[4] واتە لەم ئاینەدا خودا تووشی نارەحەتی نەکردوون. ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ واتە: هەر ئاینی ئیبراهیمی باوکتانە. ئیبنو جەریر دەڵێت: مەنسوب کراوە لەسەر تەقدیر )، ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾ واتە: تووشی زەحمەتی نەکردوون بەڵکو فراوانی کردووە بۆتان وەك ئایینی ئیبراهیمی بابتان، وە دەڵێت: هەڵیش دەگرێت مەنسوب کرابێت بەفیعلی (إلزموا). واتە: پابەند بن بە ئاینی ئیبراهیمی بابتانەوە.[5] منیش ئەڵێم: مانای ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّنِي هَدَىٰنِي رَبِّيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ دِينٗا قِيَمٗا مِّلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗا﴾[6] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بێگومان من پەروەردگارم ڕێنموونی کردووم بۆ ڕێگای ڕاست ئاینێکی زۆر ڕاست و پاك (کە هیچ لاریەکی تێدا نیە) ئایینی ئەو ئیبراهیمەیە

---

[1] أبو داود (٢/٣٨).

[2] أحمد (٥/٢٦٦).

[3] فتح الباري (٧/٦٥٧).

[4] الطبري (١٨/٦٨٩).

[5] الطبري (١٨/٦٩١).

[6] الانعام (١٦١).

کە لە هەموو ئایینە ناڕاستەکان لایداوە بۆ پەرستنی خوا بە تەنها. وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: خوا ناوی ناون موسڵمان لە پێشدا، ﴿وَفِي هَٰذَا﴾ واتە:لەناو ئەم قورئانەشدا، عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەڵێت: لە ئیبنو جەریرەوە لە عەتاوە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ﴾ دەڵێت: خوای گەورە لە پێشدا ناوی ناون موسڵمان.[1] موجاهیدو عەتاو زەححاكو سودیو موقاتیلی کوڕی حەیانو قەتادەیش هەر وایان وتووە.[2] موجاهید دەڵێت: خودا ناوی ناون موسڵمان لە کتێبە پێشووەکانداو لە قورئانیشدا، ﴿وَفِي هَٰذَا﴾ واتە: لەناو ئەم قورئانەشدا.[3] کەسانی تریش هەر وایان وتووە. چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ پاشان هانیان دەداتو دڵخۆشیان دەکات بەوەی کە ئەو پەیامەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی بۆیان هەر ئاینو پەیامەکەی ئیبراهیمی خەلیلی باییانە، پاشان خوای گەورە منەتی خۆی دەکات بەسەر ئوممەتی پێغەمبەردا (ﷺ) کە باسی هێناونو وەسفی کردوون لە دێرزەمانەوە لە کتێبی پێغەمبەرەکانی پێشوداو خوێنراوەتەوە بەسەر زانایانی ئەو کاتەی خۆیاندا، ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: لە پێش هاتنی قورئاندا. ﴿وَفِي هَٰذَا﴾ لەم قورئانەشدا. نەسائی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: لە حاریس ئەشعەریەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێك بانگەواز بکات بە شێوازی بانگەوازی نەفامی ئەوە لەو کەسانەیە لە جەهەنەمدا فڕێ دراونو کەوتوون) پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر ڕۆژو نوێژیشی کردبێت؟ فەرمووی: (بەڵێ با ڕۆژو نوێژیشی کردبێت)، سا ئێوە بانگەواز بکەن بەشێوەی بانگی ئەو خودایەی کە بە موسڵمانو خاوەنباوەڕو بەندەکانی خودا ناوی بردون.[4] وە دەفەرموێت: ﴿لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ واتە: بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) شایەت بێت لەسەر ئێوەو ئێوەش شایەت بن لەسەر خەڵکی، چونکە ئێوە بە ئوممەتێکی مامناوەندی هەڵبژێردراون لەناو ئوممەتەکانی تردا شایەتی دادپەروەریتان بۆ دراوە، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ شایەت بن لەسەر خەڵکی. چونکە گشت ئوممەتەکان دانیان ناوە بە مەزنیو ڕێزی ئەم ئوممەتەدا بەسەر

---

[1] الطبري (١٨/٦٩١).

[2] الطبري (١٨/٦٩١/٦٩٢).

[3] القرطبي (١٢/١٠١).

[4] النسائي في الكبرى (٦/٤١٢).

هەموو ئوممەتەکانی تردا لە ڕۆژی قیامەتدا، لەبەر ئەوە شایەتیان قەبوڵ دەکرێت لەسەر ئەو ئوممەتانە لە ڕۆژی قیامەتدا، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پەیامەی خودای پێ ڕاگەیاندوون و شایەتی دەدات کە ئەو ئوممەتەیش ئەم پەیامەی گەیاندووە. پاشان دەفەرموێت: ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ واتە: نوێژ بکەن و زەکات بدەن لە بارتەقای ئەم هەموو بەهرە گەورەیەدا شوکری خودا بکەن ئەوەی فەرمانی پێ کردوون بیکەن و ئەوەش قەدەغەی کردووە لێتان وازی لێ بێنن، گرنگترینی ئەو ئەرکانە نوێژکردن و زەکات دانە کە بریتیە لە خێرو چاکەکردن لە لایەن دەوڵەمەندەکانەوە بە هەژاران و لێقەوماوان لە دەرکردنی ئەو سامانە کەمەی کە خوا فەرزی کردووە لە ماوەی ساڵێکدا لەسەریان. وەك لە پێشەوە بە درێژی باسی لێکراوە لە سورەتی (التوبة)دا. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ﴾ واتە: تەنها پشت بە خوا ببەستن و هانا بەو بەرن و داوای یارمەتی هەر لەو بکەن، ﴿هُوَ مَوْلَىٰكُمْ﴾ واتە: هەر خوا پارێزەرو یارمەتیدەرتانەو هەر ئەویش سەرتان دەخات بەسەر دوژمنەکانتاندا، ﴿فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ واتە: خودا چەندە مەزن و یارمەتیدەرێکی چاکە، بۆ خاوەنباوەڕان بەرامبەر دوژمنان.

## تەفسیری سورەتی (المؤمنون)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾﴾

### ڕزگاربوون هەر بۆ خاوەن باوەڕانەو باسی هەندێ لە ڕەوشتەکانیان

﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾، واتە: بێگومان خاوەنباوەڕان سەرکەوتن و بەختەوەری و ڕزگارییان بەدەست هێنا، ئەو خاوەن باوەڕانەی کە ئەم ڕەوشتانەیان کردبووە کاڵای باڵای خۆیان.

﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴾، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا ملکەچن وئارامو لەسەرخۆن،[1](هەر بەو شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو حەسەنو قەتادەو زوهری)ەوە،[2] عەلی کوڕی ئەبو تالیب ئەڵێت: خاوەن باوەڕان ترسان ترسانی دڵە،[3] ئیبراهیمی نەخەعییش هەر وای وتووە،[4] حەسەنی بەسری ئەڵێت: خاوەن باوەڕان ترسیان لەناو دڵیاندایە، بۆیە چاویان داخستووەو پاراستوویانەو باڵیشیان ڕاخستووە، واتە خۆیان ئامادە کردبێ بۆیو سەرقاڵی کردبنو ڕێزیان دابێت بەسەر هەموو شتێکدا. ئەو کاتە ئەو نوێژە دەبێتە چاوڕۆشنی و ئارامی دڵی، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی لەو فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەدو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (بۆن خۆشیو ژنان خۆشەویست کراوە لامو نوێژیش بووەتە مایەی چاوڕوونیم)[5].

﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴾، واتە: ئەوانەی لە قسەی پڕوپوچ خۆ وەدوور دەگرن، کە بتپەرستیو تاوانیش دەگرێتەوە، وە هەر شتێك کە سوودی نەبێت لە کردارو گفتاردا هەر (لغو)ە، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴾،[6] واتە: هەر کاتێك بە لای کاری پڕوپوچانە دەڕۆن مەردانە خۆیان لێ دەپارێزن، قەتادە ئەڵێت: سوێند بە خوا ئەو کەسانە هەر فەرمانێکیان لە لای خوداوە بۆ هاتبێت لێیان لانەداوە[7].

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴾، ئەوانەش کە زەکات دەدەن، زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە مەبەست لە زەکات – الزكاة– لێرەدا زەکاتیماڵو سامانە، هەرچەندە ئەم ئایەتە لە مەککە هاتووەو زەکات لە ساڵی دووەمی کۆچیدا واجیب کراوە، بەڵام وا دیارە ئەوەی لە مەدینەدا فەرزکراوەکاتو ئەندازەی ماڵو ئەو شتانەی کە زەکاتیان تێدا ئەدرێت دیاری کراوە، چونکە زەکات لەبناغەدا لە مەککەدا فەرز کراوە، وە خوای گەورە لە سوڕەتی ئەنعام دا فەرموویەتی: ﴿ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ

---

[1] الطبري (۹/۱۹).

[2] الطبري (۸/۱۹، ۹).

[3] الطبري (۹/۱۹).

[4] الطبري (۹/۱۹).

[5] احمد (۱۹۹/۳)، النسائي (۶۲/۶۱/۷).

[6] فرقان: (۷۲).

[7] الزهد لأبن المبارك (۵۵).

حَصَادِهِۦ﴾[1] وە هەڵیش دەگرێ مەبەست بە زەکات لێرەدا خاوێنی گیان بێت ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾[2]، واتە: کەسێك گیانی خاوێن ڕاگرتبێت ڕزگاری بووەو هەر کەسیش پێچابێتی بە گوناهەوە دۆڕاندوویەتی. دەشبێت مەبەست پێی هەردووکیان بێت پاککردنەوەی گیانو سامان. چونکە ماڵ بەخشینیش لە ڕیزەی پاککردنەوەی گیانە، خاوەنباوەڕی تەواو ئەو کەسەیە کە ماڵو گیانی خاوێن بکاتەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ﴾

واتە: ئەوانەی کە شەرمگەی خۆیان پاراستووە لە حەرام، ئەوەی خودا قەدەغەی لێکردوون لە داوێنپیسیو نێربازیو لێی نزیك ناکەونەوەو لێیەوە دوورن مەگین ژنەکانیان کە خودا بۆی حەڵاڵ کردوون یان ئەوانەی کە خۆیان خاوەنیانن لە کەنیزەك. هەر شتێکیش خودا پێی دابنو حەڵاڵی کردبێت هیچ شورەییەکی تێدا نیەو چاکە بۆیان، بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ﴾ئەوانە هیچ گلەییەکیان لەسەرنییە، پاشان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ﴾، واتە: هەر کەسێك لە ژنو کەنیزەکانی زیاتربوێ ئەوەی لەئەندازە لادەرەوزیادەڕەوی کردووە. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ﴾، واتە: ئەوانەی کاتێك کە ئەمانەتێکیان درایە دەست ناپاکی لێ ناکەن بەڵکو دەیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی. وە هەر کاتێك بەڵێنێکیان دا یان پەیمانێکیان لەگەڵ یەکێکدا بەست، ئەو بەڵێنو پەیمانە بەجێ دێنن. وەك دووڕووەکان نین کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە بارەیانەوە فەرموویەتی: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، کاتێك بەڵێنی دا بەجێی ناهێنێت، کاتێکیش ئەمانەتی درایە دەست خیانەتی لێ دەکات)،[3] خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾، واتە: ئەوانەی بەردەوام نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا دەکەن وەك ئیبنو مەسعود ئەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چ کارێك خۆشەویستە لای خودا؟ فەرمووی: (نوێژ لە کاتی خۆیدا)، گوتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (چاکە لەگەڵ دایكو باوك)، گوتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (جیهادکردن لە ڕێی خودا)، بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.[4] قەتادە

---

[1] الانعام: (١٤١)، واتە: لە ڕۆژی دروێنەو چنیندا مافەکەی (زەکاتەکەی) لێ بدەن.

[2] الشمس: (٩-١٠).

[3] فتح الباري (٥٢٢/١٠).

[4] فتح الباري (٤١٤/١٠)، مسلم (٨٩/١).

ئەڵێت:کاتیٚ نوێژەکان دەکەن بە ڕکوعو سوژدەی ڕێکو پێکەوەدەیانکەن.[1] خوای گەورە بە نوێژکردن ئەم سیفەتانەی دەست پێکردووەو هەر بە نوێژکردنیش کۆتایی پیٚ هێناوە، ئەمەش نیشانەی گەورەیی نوێژکردنە وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕێك ڕاوەستن هەرچەندە ناشتوانن، وە بزانن چاکترین کردارەکانتان نوێژکردنە، بەردەوامیش نابێت لەسەر دەستنوێژ – پارێزکاریش لە دەستنوێژەکان ناکات – مەگین خاوەن باوەڕ)،[2] کاتێك کە خودای گەورە باسی ئەو خاوەنباوەڕانە دەکات کە هەڵدەستن بەو ڕەوشتە جوانو ئاکارە چاکانە پاشان دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ۝١٠ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[3]، لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك داوای بەهەشتتان کرد لە خودا، داوای فیردەوسی لیٚ بکەن، چونکە فیردەوس ژووری سەرەوەو ناوەڕاستی بەهەشتە، هەر لەوێشەوە ڕووبارەکانی بەهەشت دێنە دەرەوە، لە سەرووی ئەویشەوە تەختی ڕەحمانە "جل جلاله" – عرش الرحمن–)،[4] ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) ئەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێك نیە لە ئێوە مەگین دوو شوێنی هەیە، شوێنێك لە ناو بەهەشتداو شوێنێك لە ناو ئاگردا، ئەگەر مردو چووە ناو ئاگر خەڵکی بەهەشت بوونەتە میراتگری، واتە: شوێنەکەی دەبەن بۆ خۆیان. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ﴾،[5] ئیبنو جورەیج ئەڵێت: لە لەیثەوە (لیث) لە – موجاهیدەوە–ئەڵێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ﴾ واتە: خاوەنباوەڕان شوێنی خوانەناسەکان دەبەن بۆ خۆیان چونکە ئەوان وەدی هێنراون بۆ عیبادەتی خودای مەزن کە تەنهایەو شەریکی نیە، کاتێك ئەو خاوەنباوەڕانە هەڵسان بەو عیبادەتەی کە خودا لەسەری داناون، وە ئەو خوانەناسانەش وازیان هێنا لەوەی کە خودا فەرمانی پێکردوون بیکەنو بۆ ئەوەیش دروست کراون ئەوانە بەشی ئەمانە دەبەن بۆ خۆیان ئەگەر فەرمانبەرداری دروستکەری مەزنی خۆیان بووبن، لەمە ڕوونترو بەهێزتر ئەو فەرموودەیە کە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لەئەبو بوردەوەلەباوکیەوە،باوکیشی لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (لەڕۆژی قیامەتداخەڵکی لە موسڵمانان دەهێنرێن کە تاوانەکانیان بە وێنەی کێوەکانە،

---

[1] الدر المنثور (٨٩/٦).

[2] ابن ماجه (١٠١/٢).

[3] واتە: هەر ئەوانە میرات گران، ئەوانەی کە خاوەن فیردەوسن ئەوان لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

[4] فتح الباري (٤١٥/١٣).

[5] ابن ماجه (١٤٥٣/٢).

خودای مەزن لە تاوانەکانیان دەبووریٚت‌و دەیانخاتە سەر گاورو جوولەکە)،[1] وە هەمیسان لە ئیمامی موسلیمەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك ڕۆژی قیامەت هات خودای گەورە لە بری هەموو موسڵمانێك گاورێك یان جوولەکەیەکی ناردووە، دەڵێت: ئەمە ڕزگارکەری تۆ بووە لە ئاگر)، عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەبو بوردەی سوێند دا بەو خوایەی کە هیچ کەسێك نیە لە جگەلە ئەو (سێ جار)، کەئایا باوکی ئەمەی بۆی گێڕاوەتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)؟ئەڵێت: ئەبو بوردە سوێندی بۆ خوارد.[2] منیش ئەڵێم: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا﴾[3]، وەك ئەم ئایەتەش وایە کە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[4]، واتە: ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە بۆ ئێوە ماوەتەوە (پێتان دراوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە دەتانکرد.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾﴾

## نیشانەی دەسەڵاتی خودا لە کاتی وەدیهێنانی مرۆڤ لە خۆڵ‌و پاشان لە تنۆکێك ئاو و حاڵەتەکانی تریش

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ﴾ خودای مەزن باسی دروست کردنی مرۆڤ دەکات لە سەرەتاوە لە قوڕێکی خۆشەکراو وەدی هاتووە، واتە: ئادەم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) خودای مەزن دروستی کردووە لە قوڕێکی ڕەشی خۆشکراوی وشك بووەوە، ئیبنو جەریر ئەڵێت: بۆیە ئادەم ناوی قوڕی لێ نراوە، چونکە لە قوڕ دروست بووە،[5] قەتادە ئەڵێت: ئادەم لە قوڕ وەدی هاتووە،[6] ئەم قسەیە لە ماناو دەقەکەوە دیاترو نزیکترەکە ئادەم لە قوڕێکی ڕەشی خۆشەکراوی وشك کراوە وەدی

---

[1] مسلم (٢١٢٠/٤).

[2] مسلم (٢١١٩/٤).

[3] مريم (٦٣)، واتە: ئەو بەهەشتەی باسی کرا ئەوەیە کە دەیبەخشین بەو کەسانەی کە (لە دنیادا) پارێزکارو لە خوا ترس بوون لە بەندەکانمان.

[4] زخرف (٧٢).

[5] الطبري (١٥/١٩).

[6] الطبري (١٤/١٩).

هاتووە. واتە: لە خۆڵ دروست کراوە. وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ﴾[1]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو موساوە ئەمیش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (خودای گەورە ئادەمی دروست کرد لە مشتێك لە هەموو زەمیندا، ئەڵێت: تۆرەمەی نەوەی ئادەم بە پێی ئەو زەویە پەیدا بوون، سوورو سپیو ڕەشو تێکەڵاو لەو ڕەنگانەی تێدایە، چاکو خراپو مامناوەندیش هەیە،[2] ئەبو داوودو ترمزیش بەو شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە.[3] ترمیزی ئەڵێت:ئەم فەرمودەیە فەرموودەیەکی(حسن وصحیح )ە.

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾، واتە: سوێند بە خوا مرۆڤمان دروست کرد لە خولاسەو پاڵفتەیەك لە قوڕ پاشان بڕیارمان دابێتەئاوێك ولەجێگەیەکی پتەودا، ئەم جێناوە(واتە:جعلناه) دەگەڕێتەوە بۆ جنسی مرۆڤ، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴾[4]، واتە: ئاوێکی کەم بایەخ، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَـٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَـٰدِرُونَ﴾[5]، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴾.

﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، واتە: پاشان لەو تنۆکەوە،( ئاوێکی هەڵقوڵاوەکە لە پشتی پیاوو پێشەوەی سنگی ئافرەت دێتەدەر لە بەر ملیەوە تا مەمکی).دەبێتە خوێنپارەیەك خوێنێکی توندبووەوەی کەمێك شلی سوور بەشێوەیەکی لاکێشەیی کە لە زاڵو دەچێت – گیانەوەرێکی ڕەشی خوێنمژە– عیکریمە ئەڵێت: ئەوەخوێنە. ﴿فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾ پاشان خوێنپارەکەمانکردە گۆشتپارەیەك کە بریتیە لە پارچەیەك پلە گۆشت کە هیچ شێوەو شکلێکی نیە.

---

[1] روم (٢٠)، واتە: لە نیشانەکانی ئەو (خوایە) کە ئێوەی لە خاك دروست کردووە لە پاش (ماوەیەك) کتوپڕ ئێوە ئادەمینو بڵاوبوونەتەوە لە زەویدا.

[2] احمد (٤٠٠/٤).

[3] ابو داود (٧٦/٥) تحفة الاحوزي (٢٩٠/٨).

[4] سجدة (٧–٨)، واتە: جا مرۆڤ لە سەرەتاوە لە قوڕ دروست کرد، لە پاشان نەوەی مرۆڤی لە پوختەیە لە ئاوی بێ نرخو قێزەون دروست کردووە.

[5] المرسلات (٢٠–٢٣)، واتە: ئایا ئێوەمان دروست نەکردووە لە ئاوێکی بێ نرخ؟ ئینجا خستمانە جێگایەکی پتەوەوە، تا ماوەیەکی دیاری کراو، ئینجا ماوەمان بۆ دانا چاك ئەندازە گرێکین.

﴿فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا﴾ واتە: پاشان لە پلە گۆشتەکە ئێسکمان دروست کردو سەرو هەردوو دەستو قاچ بە پێشەو ڕەنگو دەمارەکانەوە لێ وەدی هێنا، ﴿فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا﴾ لە دواییدا ئێسکەکەمان بە گۆشت داپۆشیو توندو بەهێزی کرد. ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾ واتە: پاشان گیانمانکرد بە بەریاو کەوتە جوولەو بووە شتێکی تر کە گوێو چاوو هەستو جموجوڵی لێ پەیدا بوو، ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾ واتە: چاکسازی هەر بۆ ئەو خودایە کە هیچ کەسی پێ ناگات، عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە ئەگوازێتەوەکە ووتویەتی:﴿ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾ واتە: دەیگۆڕین لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر هەتا دەبێتە منداڵێکو دێتە دەرەوەو پاشان بە منداڵی نەشو نما دەکاتو باڵغ دەبێتو دەبێتە لاوێکو پاشان دەبێتە پیاوێکی تەواو پاشان دەچێت بەساڵەوەو پاشانیش بە تەواوی پیر دەبێتو لاوازی ڕووی تێدەکات.[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسەنەدەکەیدا لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بۆی باس کردین فەرمووی: (هەر یەکێك لە ئێوە چل ڕۆژ دەمێنێتەوە – کۆ دەکرێتەوە – لە سکی دایکیاو وەدی دێت. پاشان دەبێتە خوێنێکی توندو شل(خوێنپارە)بە هەمان شێوە، پاشان دەبێتە پلێك گۆشت(گۆشتپارە)بە هەمان شێوە، پاشان فریشتە ڕەوانە دەکرێت گیانی پێدا دەکات، فەرمانی پێ دەکرێت بە چوار وتە: بژێویو ئەجەلی– کۆتایی ژیانی– کرداری ئایا ئەو کەسە بەدبەختە یان بەختەوەرە. سوێند بەو کەسەی غەیری ئەو خودا نیە، کەسی واتان هەیە کاردەکات بە کرداری خەڵکی بەهەشت هەتا لە نێوانی ئەوو بەهەشتدا باڵێ نەبێت نامێنێتەوە، کتێب – نووسینی – پێش دەکەوێتو کۆتایی پێ دەهێنێت بۆی بە کرداری خەڵکی ئاگرو دەچێتە ناو ئاگر، پیاوی واش هەیە کار دەکات بە کرداری خەڵکی ئاگر هەتا لەنێوان ئەوو ئاگردا باڵێ نەبێت نامێنێتەوە نوسینی – کتێب – پێشی دەکەوێتو بۆی دەنووسێت بە کرداری خەڵکی بەهەشتو دەچێتە بەهەشت).[2] بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە،[3] ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾ پاكو بێ عەیبی هەر بۆ خودایە کە هیچ دروستکەرێك پێی ناگات، واتە: وەختێك باسی تواناو بەسۆزی خۆی کردووە لە وەدی هێنانی ئەو تنۆکە ئاوەو گۆڕانی لە بارێکەوە بۆ بارێکی ترو لە شکلێکەوە بۆ شکلێکی تر هەتا وای لێهاتووە بووەتە ئەو مرۆڤە ڕێكو پێكو تەواوە: ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ

---

[1] الطبري (١٨/١٩).

[2] احمد (٣٨٢/١).

[3] فتح الباري (٤١٨/٦)، مسلم (٢٠٣٦/٤).

﴿أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ إِنَّكُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ﴾، واتە: دوای ئەم ژیانەی یەکەمجار کە لە نەبوون پەیدابوون، بەرەو مردن دەچنەوە، ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ﴾، واتە: جارێکی تر لە قیامەتدا زیندوو دەکرێنەوە. لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَ﴾[1] واتە: پاشان خودا دروست بوونی دوایش وەدی دێنێ، لە ڕۆژی قیامەتداو گیانەکان دەگەڕێنێتەوە ناو لاشەکانو خەڵکی هەموو موحاسەبە دەکرێت، هەموو کەسێك بەپێی کرداری خۆی پاداشت دەدرێتەوە چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندن.

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾﴾

**نیشانەی خودا لە وەدیهێنانی ئاسمانەکاندا:**

کاتێك خودای گەورە باسی دروست بوونی مرۆڤ دەکات لەگەڵیدا باسی دروست بوونی حەوت ئاسمانەکەیشی کردووە. وە زۆرجاریش کە باسی ئاسمانەکان دەکات باسی دروست بوونی مرۆڤیش دەکات. وەك فەرموویەتی: ﴿لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ﴾،[2] وە هەر بەم شێوەیەش لە سەرەتای سورەتی سوجدەدا کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەنوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی دا دەیخوێند کە لە سەرەتاوە باسی دروست بوونی ئاسمانەکان دەکاتو پاشان دێتە سەر باسی دروست بوونی مرۆڤ کە لە ماکی قوڕ وەدی هێناوەو پاشان باسی ڕۆژی قیامەتو پاداشتی چاکان بە چاکەو خراپەکارانیش بە جەزرەبەدان ئەداتەوەو چەند باسی گرنگی تریش. ﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ﴾ واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی لەسەری ئێوەوە دروستمان کردوون حەوت نهۆم ئاسمان،موجاهید ئەڵێت: واتە: حەوت ئاسمانەکە.[3] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾،[4] وە فەرموویەتی: ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ كَيۡفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا﴾[5]، وە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ وَمِنَ ٱلۡأَرۡضِ مِثۡلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ

[1] العنكبوت (٢٠).

[2] غافر (٥٧)، واتە: بە ڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی لە بەدی هێنانی خەڵکی گەورەترە.

[3] الدر المنثور (٦/٩٤).

[4] الاسراء (٤٤)، واتە: هەر حەوت ئاسمانەکانو زەویو هەرچی لەناویاندایە ستایشی خوا دەکەن.

[5] نوح: (١٥)، واتە: ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی دروست کردووە نهۆم لەسەر نهۆم؟!

لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا ﴾[1] وە هەر بەو شێوەیەش لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴾، واتە: وە ئێمە لە دروستکراوەکان بێ ئاگا نین ، یانی ئاگادارە لەوەی دەچێتە ناو زەمین‌و لەوەش دێتە دەرەوە لێی ولەوەی کە لە ئاسمان دێتە خوارو لە ئەوەیش بەرەو ژوور دەچێ تێیدا، بۆ هەر کوێیەك بڕۆن خودا لەگەڵتانەو هەرچیش دەکەن چاوی لێیە، هیچ ئاسمانێك نابێتە پەردە لەبەر ئاسمانەکەی ترو هیچ زەمینێکیش نابێتە ڕێگری یەکتری لە لای خودای مەزن، هەروەها هیچ کێوێك‌و هیچ دەریایەکیش مەگین خودا ئاگاداری سەختی کێوەکانەو قوڵی بن دەریاکانیشە، ژمارەی کێوو تەپۆلکەو تۆزو خۆڵ‌و دەریاو بیابان‌و دارو درەختەکان دەزانێت، ﴿وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾[2]، واتە: وە هەر گەڵایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێت‌و هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکیەکانی زەویدا بێت‌و هەر تەڕو وشکێك هەبێت هەر هەموویان لە کتێبی ئاشکرادان (لوح المحفوظ).

﴿ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَسۡكَنَّٰهُ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأۡنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ لَّكُمۡ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٞ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةٗ تَخۡرُجُ مِن طُورِ سَيۡنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٞ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾

## نیشانەو بەهرەکانی خودا لە باران‌و ڕووەك‌و دارو درەخت‌و مەڕو ماڵات

﴿ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ﴾، واتە: وە لە ئاسمانەوە بە ئەندازەی پێویست بارانمان باراندووە، خوای گەورە باسی ئەو بەهرانەی خۆی دەکات کە بەخشیویەتی بە بەندەکانی کە ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن لە بارینی باران بە پێی پێویست، نە ئەوەندە زۆر دەبارێت کە زەمین‌و ئاوەدانیەکان لەناوبەرێ‌و نە ئەوەندەش کەمە بەشی دارو درەخت‌و بەرهەم‌و کشتوکاڵ نەکات. بەڵکو بە پێی پێویست بۆ ئاودێران‌و خواردنەوەو سوود لێ وەرگرتنی دەینێرێت، بۆیە زەوی وا هەیە پێویستی بە

---

[1] الطلاق (١٢)، واتە: خوا زاتێکە کە حەوت ئاسمانی دروست کردووە وە بە وێنەی ئەوان زەویشی دروست کردووە فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت، تا چاك بزانن کە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە وە بێگومان خوا بە زانین دەوری هەموو شتێکی داوە.

[2] الانعام (٥٩).

ئاوێکی زۆر هەیە بۆ کشتوکاڵ کردن تێیدا، بەڵام زەویەکەی هەڵی ناگرێت بارانی زۆری لێ ببارێت، ئاوی لە وڵاتی ترەوە بۆ دێت وەك زەوی میسر کە ئاو بە خۆیەوە ناگرێتو ئەڕوات، بۆیە بە زەوی میسر گوتراوە زەوی جرز (الأرض الجرز) خودای گەورە ئاوی نیلی بۆ هێناوە تێکەڵاو بە قوڕی سور کە لافاو دێنێتی لە وڵاتی حەبەشەوە لە کاتی باران باریندا، کە ئەو ئاوە دێت قوڕە سوورەی پێوەیە زەوی میسر ئاودێر دەکاتو ئەو قوڕە سوورە لەو زەمینەدا دەمێنێتەوەو دەیکەنە کشتوکاڵ، چونکە زەوی ئەوان لماویەو بە کاری کشتوکاڵ نایەت، پاکیو بێ عەیبی بۆ ئەو خوایەی کە چەندە بەسۆزو دلۆڤانو زاناو لێبوردەیە ! ! ﴿فَأَسْكَنَّٰهُ فِي ٱلْأَرْضِ﴾، واتە: ئەو ئاوەمان وا لێکردووە کاتێك کە لە ئاسمانەوە باری لە زەویدا بمێنێتەوەو زەمینیشمان وا لێکردووە کە وەری گرێتو بیخواتەوە هەتا ئەو تۆو بەرو گیاو گژە هەڵی مژنو پێی گەورە ببن، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ﴾ واتە: بێگومان ئێمە بەسەر لەناوبردنی ئەو ئاوەدا بە توانایین، یانی ئەگەر بمانەوێت بارانی لێ نابارێت، خۆ ئەگەر مەیلیشمان لێ بێت دەینێرین بۆ ئەو شوێنە چۆڵو بیابانو لماویانەو ئێرەی لێ بێبەش دەکەین، وە ئەگەر بمانویستایە تاڵو تفتمان دەکرد کە بۆ خواردنەوە نەشێتو ئاودێریشی پێ نەکرێت، وە ئەگەر حەزمان بکردایە، ئەو ئاوە نەدەچووە ناو زەوی بەڵکو بەسەریدا تێدەپەڕی وە ئەگەر حەزیشمان بکردایە ئەو ئاوە نقووم دەبوو لەناو زەویداو ئەوەندە دەچووە خوارەوە دەستتان پێنەدەگەیشتو سوودتان لێ وەرنەدەگرت. ئەمانە هەمووی بە لای خوداوە ئاسانە. بەڵام بەسۆزو دلۆڤانی خۆی خودا بارانتان بۆ دەبارێنێت لە هەورەکانەوە کە ئاوێکی شیرینو سازگارو زۆرەو لە ناو زەمیندا جێگیری دەکاتو بە شێوەی کانیاو لە زەوی دێتە دەرو دەبێتە ڕووبارو بەسەر زەویدا دەڕواتو سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دارو درەختو کشتوکاڵو خۆتانو مەڕو گیانەوەرەکانی تریش لێی دەخۆنەوەو خۆتانیشی پێ دەشۆنو پاكو خاوێن دەکەنەوە،سوپاسوستایشی هەربۆئەوخودایە بۆ ئەم هەموو بەهرەیەی کە پێی بەخشیون.دەفەرمووێت: ﴿فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾، واتە: بە هۆی ئەو بارانەوە کە لە ئاسمانەوە بۆتان دەبارێنین باغو باغاتی جوانو ڕازاوەتان بۆ وەدی دەهێنین ﴿مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾ لە دارخورماو ڕەزی زۆر کە خەڵکی حیجاز پێی ئاشنان، هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان شتێكو هاوشێوەکانی، چونکە هەموو وڵاتی بەرهەمی تایبەتی خۆی هەیە، جێی خۆیەتی کە شوکرانەبژێری خودای لەسەر بکەین لەسەر ئەو بەهرانەی کە پێی بەخشیون، کە ناشتوانن بە تەواوی شوکرانە بژێری بن ﴿لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ﴾، واتە: لە هەموو جۆرە میوەیەکی بە زۆریی پێداون. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرْعَ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلنَّخِيلَ

وَٱلْأَعْنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ﴾،[1] پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾، واتە: وە لە هەندێکیان دەخۆن، وەك ئەوە وایە کە عەتف کرابێتە سەر شتێکی دانراو کە دیاری کرابێتو سەیری جوانیو پێگەیشتویەکەی بکەیو لێی بخۆی، پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ﴾[2] واتە: داری زەیتون، توریش واتە کێو، هەندێك وتویانە: کاتێك ناوئەبرێت بە تور (طور) کە درەختی تێدا بێت، ئەگەر درەختی تێدا نەبێتو ڕووت بێت پێی دەوترێت کێو – چیا – نەك (طور) والله أعلم. توری سینا هەر توری سینینە – سینین – ئەو کێوەیە کە خودای مەزن قسەی لەگەڵ موسای کوڕی عیمران کرد لەسەریو ئەو کێوانەش کە لە دەوری ئەون داری زەیتونی تێدایە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ﴾، واتە: کە ڕۆن دەگرێتو هەندێ وتویانە:ئەوبایە—الباء—زیادەیە. بەو شێوەیە دانراوە (تنبت الدهن) وەك لە زمانی عەرەبدا ئەوترێ: (ألقى فلان بيده) واتە: (يده) بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَصِبْغٍ﴾ واتە: پێخۆرە، قەتادەئەم تەفسیرەی کردووە.[3] ﴿لِّلْأٓكِلِينَ﴾، واتە: بۆ ئەوانەی دەیخۆن، یانی لەو دارەدا شتی وای تێدایە سودی لێ وەردەگیرێت بۆ پێخۆریو خۆچەورکردن – هەنوین – عەبدی کوڕی حومەید ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدو تەفسیرەکەیدا لە عومەری کوڕی خەتابەوە ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرموویەتی: (زەیت بەکار بهێنن بۆ خواردنو خۆتانی پێ بهەنون – چەور بکەن – چونکە لە دارێکی پیرۆز دێتە دەر) ترمیزیو ئیبنو ماجەش ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە.[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾،[5] خوای گەورە باسی ئەو مەڕو ماڵاتانە دەکات کە چەند خێروبێری تێدایە وەدی هێناون بۆ مەردووم کە سوودی لێ وەرگرن لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، ئەوەتا لە شیرەکەیان دەخۆنەوە کە لە گوانیان دێتە دەرەوە لە نێوان ئەو خوێنو هەموو پاشەڕۆیەدا – سەنێرەدا – کە لە لاشەو ورگیاندایە، گۆشتەکانیشیان دەخۆنو موو خوریەکانیشیان دەکەنە

[1] النحل: (١١)، واتە: ئەو (ئاوە خوا) بۆتان دەڕوێنێت کشتوکاڵو زەیتونو دارخورماو مێوژو ڕەزو هەموو بەرو میوەیەك.

[2] واتە: هەروەها ڕواندوومانە جۆرە دارێك (زەیتون) کە لە توری سینا دەڕوێت.

[3] الدر المنثور (٦/٩٥).

[4] المنتخب لعبد بن معيد (١٣)، الترمذي (١٨٥١) ابن ماجه (٣٣١٩).

[5] واتە: بە ڕاستی بۆ ئێوە لە ماڵاتو ئاژەڵدا پەند هەیە دەرخواردتان دەدەین لەو (شیرە)ەی لەناو سکیاندایە وە بۆ ئێوە لەو (ئاژەڵانەدا) سودو کەڵکێکی زۆر هەیەو لێشیان دەخۆن.

جلوبەرگو لەبەری دەکەن ﴿وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾، واتە: سواری سەر پشتی ئەوان و کەشتیەکان دەبن و باری قورسیشیان لێ دەنێن بۆ ئەو وڵاتانەی کە لێیانەوە دوورن کە بۆ ئێوە زۆر دژوار بوو بیگەیەنن. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ ۚ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾﴾[1]، وە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾[2].

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾﴾

### بەسەرهاتی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) و هۆزەکەی

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ﴾، واتە: خوای گەورە باسی نوح پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك ناردی کە بیانترسێنێت لە سزای توندو تۆڵەی بەهێزی خوداو کە چۆن حەق دەسێنێت لەو کەسانەی شەریکی بۆ دادەنێن و دژایەتی فەرمانەکانی دەکەن و بڕوا بە پێغەمبەرەکانی ناکەن. ﴿فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾، واتە: جا پێی وتن ئەی هۆزەکەم خوا بپەرستن ئێوە جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نیە، دەی ئایا خۆتان ناپارێزن؟یانی ئایا لە خودا ناترسن کە شەریکی بۆ دادەنێن؟ ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾، واتە: پیاوماقوڵانی هۆزەکەی کە خودایان نەدەناسی دەیان وت: ئەم نوحە مرۆڤێکە لە خۆمان گەر ئەیەوێت خۆی فەرز بکات بەسەرماندا چۆن فەرمان (وەحی) دێ بۆ ئەو بۆ ئێمە نایەت؟! ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾، واتە: ئەگەر خودا مەیلی لێ بوایە پێغەمبەرێك بنێرێت فریشتەیەکی دەنارد لە لای خۆیەوە،

---

[1] النحل: (٧)، واتە: وە (هەندێ لەو ماڵاتانە) بارەکانتان هەڵدەگرن (و دەیبەن) بۆ شارو جێگایە کە ئێوە پێی نەدەگەیشتن مەگەر زۆر بە ناڕەحەت، بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر بەسۆزو بە بەزەییە (بۆ ئادەمی).

[2] یس (٧١-٧٣)، واتە: ئایا نەیاندیت (نەیان زانیوە) کە بێگومان بە دەستی خۆمان ئاژەڵمان بۆ دروست کردوون ئەنجا ئەوان خاوەنیانن، وە رامامان هێناون بۆیان، ئەنجا سواری هەندێکیان دەبن و (گۆشتی) هەندێکیشیان دەخۆن، وە زۆر سودیان لێ دەبینن و شتی خواردنەوەیان لێ وەردەگرن، دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن.

مرۆڤێکی نەدەنارد، ﴿مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ﴾، واتە: لە باب‌و باپیرانمانەوە هیچ شتی وامان نەبیستووە. مەبەستیان ئەوە بووە کە لە پێش نوحەوە، نەیان بیستووە لە باب‌و باپیرانیانەوە لە چەرخە پێشووەکانەوە کە مرۆڤ ڕەوانە کرابێت بۆ سەریان ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ﴾، واتە: ئەم پیاوە – نوح – دیارە شێت بووە کە دەڵێت خودا منی ناردووە بۆ سەر ئێوە بە تایبەتی هەڵی بژاردووم‌و وەحی بۆ ناردووم لەنێوان ئێوەدا، وا باشە چاوەڕوانی بکەن تا ماوەیەك وە خۆتان ڕاگرن تا دەمرێت‌و ڕزگارتان دەبێت لێی.

﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ٢٦ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡۖ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ٢٧ فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ فَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٨ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ٢٩ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ وَإِن كُنَّا لَمُبۡتَلِينَ ٣٠﴾

﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾ خودای گەورە باسی نوح پێغەمبەر دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کە داوا لە خودای مەزن دەکات بە هانایەوە بێت‌و ڕزگاری بکات لە دەستی هۆزەکەی لەبەر ئەوەی باوەڕی پێ ناهێنن، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ﴾ واتە: جا (نوح) هاواری کردە پەروەردگاری‌و ووتی: بە ڕاستی من شکستم خواردووە (بێ دەسەلاتم) دەی تۆ یارمەتیم بدە. وە لێرەشدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡ﴾ واتە: ئینجا ئێمە نیگامان بۆ کرد کە کەشتیەك دروست بکە بە چاودێری‌و نیگای ئێمە ئینجا کاتێك فەرمانی ئێمە هات‌و ئاو لە تەنوورەوە هەڵقوڵا (نیشانەی دەستپێکردنی توفانەکەیە) تۆش بیخەرە ناو کەشتیەکەوە لە هەموو جۆرە (ئاژەڵێك) جوتێك (نێرو مێیەك) هەروەها ئەندامانی خێزانەکەت سوار بکە جگە لەوانەیان کە بڕیاری لەناوچوونیان دراوە. واتە: خودا فەرمانی دایە کە کەشتیەکی زۆر چاك دروست بکات لە هەموو شتێك جوتێکی نێرو مێ بخاتە ناوی واتە: لە زیندەوەرو ڕووەك‌و دارودرەخت. وە خێزانەکەیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرێت،ئەو کەسانە نەبێت لە هۆزەکەت کە بڕیاریان لەسەر دراوە لە لایەن خوداوە کە دەبێت لەناو بچن، ئەوانەی کە بڕوایان پێ نەدەکرد لە خێزانەکەیدا وەك کوڕو ژنەکەی. (والله أعلم) وە فەرمووی: ﴿وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم

مُّغْرَقُونَ ﴾یانی: وە قسەشم لەگەڵدا مەکە لە بارەی ئەوانەی کە ستەمیان کردووە، چونکە بێگومان ئەوانە نوقم دەکرێنو دەخنکێنرێن . یانی کاتێك کە بارانە گەورەکە دەستی کردە بارین، با سۆزی خزمایەتی وات لێ نەکات بەزەیت بێتەوە پیایانداو بە هیوای ئەوە سا بەڵکو بڕوا بهێنن، داوای دواخستنی ئەو بەڵایە بکەیت کە دێتە سەریان چونکە من بڕیاری خۆم داوە کە دەبێت ئەو ناهەقیکارو یاخیانە بخنکێنم، بە درێژی لە (سورەتی هود)ئەم بەسەرهاتەش باس کراوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتە: ئینجا کاتێك تۆو ئەو کەسانەی لەگەڵتدان سواری کەشتیەکە بوون بڵێ: سوپاس بۆ خوایەکی ئەوتۆ کە ئێمەی ڕزگار کرد لە دەست گەلی زاڵمان . وە خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ واتە: وە کەشتیو وڵاخی بۆ فەراهەم هێناون، بۆ ئەوەی سواری پشتیان بن لە پاشان بیر لە بەهرەی پەروەردگارتان بکەنەوە کاتێك سواریان بوون وە بڵێن: پاكو بێگەردی بۆ ئەو (خوایە)ی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین کە ئێمە توانامان بەسەریدانەبوو، وە بەڕاستی ئێمەبۆلای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. نوح فەرمانەکەی خودای بەجێ هێنا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱرْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ﴾، واتە: (نوح) وتی: هەمووتان سوار بن لەو (کەشتیەدا)هاوڕێ لەگەڵ ناوی خوادا لە کاتی ڕۆیشتنووەستانیدا. یانی لە سەرەتای ڕۆیشتنەکەوەو لە کۆتایشدا سوپاسو یادی خوایکرد.

خوای گەورەیش فەرمووی: ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ﴾ واتە: بشڵێ: ئەی پەروەردگاری خۆم لە شوێنێکی بە پیتم دابەزێنەو تۆ لە هەموو میوانداران باشتر میوان بەخێو دەکەیتو چاکترینی دابەزێنەرانی. دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ﴾ واتە: لەم بەسەرهاتەدا کە خوای گەورە خاوەنباوەڕانی ڕزگارکردو خوا نەناسانی لەناو برد، هەموو نیشانەی مەزنو بەڵگەی ئاشکران لەسەر ڕاستی پێغەمبەران لەو پەیامەی کە لە لایەن خوداوە هێناویانە، وە هەر خوای گەورەیە هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکاتو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو ئاگای لە هەموو شتێکیشە. پاشان فەرموویەتی: ﴿وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ﴾، واتە: وە بە ڕاستی ئێمە تاقی کەرەوەین، یانی بەندەکانی خۆمان تاقی دەکەینەوە بە ناردنی پێغەمبەران بۆیان (سەلامی خوایان لێ بێت).

﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾﴾

**بەسەرهاتی عادو سەموود**

﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ﴾ واتە: پاشان لە دوای ئەوان بە دیمان هێنا گەلو نەوەیەکی تر، ئینجا لە ناو ئەواندا پێغەمبەرێکمان لە خۆیان نارد (پێی وتن) تەنها خوا بپەرستن جگە لەو خوایە پەرستراوێکی ترتان نیە دەی ئایا خۆتان ناپارێزن (لە خوا ناترسن)، پیاوماقوڵانی گەلەکەی (هود سەلامی خوای لێ بێت) وتیان ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو بێباوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی وە لە ژیانی دنیادا نازو نیعمەتمان پێ دابوون (وتیان) ئەمە هەر مرۆڤێکە وەك ئێوە لەوەی ئێوە دەیخۆن دەخواتو لەوەی ئێوە دەیخۆنەوە دەخواتەوە، سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی بەشەرێکی وەك خۆتان بکەن بێگومان ئەو کاتە ئێوە لە زیانباران دەبن. یانی خوای گەورە باسی ئەوە دەکات پاش هۆزی نوح هۆزی تری وەدی هێناوە، هەندێ ئەڵێن: مەبەست پێی هۆزی عادە، چونکە هۆزی عاد دوای هۆزی نوح هاتوونو جێی ئەوانیان گرتۆتەوە، هەندێکی تریش ئەڵێن: مەبەست بەوانە هۆزی سەموودە. وەك خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ﴾، چونکە خوای گەورە پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردن بانگی کردن بۆ پەرستنی خودا بە تەنهاو شەریکی بۆ دانەنێن، بڕوایان پێ نەکردو کەوتنە دژایەتی کردنیو سەریان بۆ دانەنواند لەبەر ئەوەی کە مرۆڤێك بوو لە خۆیان، پێیان شورەیی بوو شوێنی پێغەمبەرێك بکەون ئادەمی بێت، وە بڕوایان بە دیداری خودای مەزن نەبوو لە قیامەتداو بڕواشیان بە زیندووبوونەوە نەبوو. بۆیە دەیانگوت:

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ﴾ واتە: ئایا هود (سەلامی خوای لێ بێت) بەڵێن بە ئێوە دەدات کە بە ڕاستی کاتێك مردنو بوون بە خاكو ئێسکی ڕزیو بێگومان ئێوە (لە گۆڕ) دەردەهێنرێن (زیندوو دەکرێنەوە). واتە: شتێکی زۆر دوورو باوەڕ پێنەکراوە ئەو بەڵێنەی بە ئێوە دراوە، ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾، واتە: ژیان لەوە پتر نیە، لەسەر دنیادا هەمانە، ئێمە هەر دەمرینو دەژین، هەر کە مردین تازە زیندوو نابینەوە، ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەمە پیاوێکە درۆ دەکات بە ناوی خواوە ئەڵێ پەیامم لە خواوە بۆ هێناون دەتانترسێنێت و باسی زیندووبوونەوەتان بۆ دەکات، هەرگیز ئێمە بڕوای پێ ناکەین، بۆیە ئەو پێغەمبەرە دوعای لێ کردن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ رَبِّ انصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾، واتە: لە خوا پاڕایەوەو داوای یارمەتی لە خوا کرد، خوای گەورەش دوعاکەی قبووڵ کرد. فەرمووی: ﴿قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَادِمِينَ﴾ واتە: خوا فەرمووی بەم زووانە پەشیمانی خۆیان دەردەبڕن کە بۆچی دژایەتیو سەرپێچی ئەو پەیامەیان کرد کە تۆ بۆت هێناون. ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ واتە: ئینجا شریخەو دەنگێکی زۆر بەهێز هەموویانی گرت کە هەقیان بوو وە ئەوانمان کرد بە (وێنەی) پوشو کەفی (سەر ئاو) جا دووری لە ڕەحمەتی خوا بۆ ستەمکاران. یانی تریشقەیەك — نەعرەتەیەك — لێی دانو وەك ئاوماڵکی بەر لافاوی لێ کردن چونکە ئەوانە شایەنی ئەو بەڵایە بوون بە هۆی ئەو خوا نەناسیو سەربزێویانەیانەوە. وا دەردەکەوێت خوای گەورە جەربەزەی داون بە نەعرەتەو ڕەشەبایەکی زۆر توندو بەهێزی زۆر سارد. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ﴾[1] وە دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً﴾ واتە: بەسەر یەکدا کەوتنو قڕکران وەك چیلکەو پووشی بەر لافاویان لێ هات، یانی ئەوەندەش بێنرخو قێزەون بوون بە کەڵکی هیچ شتێك نەدەهاتن، ﴿فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾، واتە: ستەمکاران هەر لەوە خراپتریان بەسەر دێتو لەولاتر بچن، بە هۆی ئەو خوانەناسیو لاساریو دژایەتیەیان بەرامبەر پێغەمبەران با ئەوانەش گوێبیستی ئەم ڕووداوەن بترسن ئەگەر بڕوا بە پێغەمبەرەکانیان نەکەن.

---

[1] الاحقاف (٢٥)، واتە: بەر فەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێك دەڕوخێنێت ئیتر وایان بەسەر هات تەنها شوێنی خانووەکانیان دەبینرا

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾

**باسی نەتەوەکانی تر**

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴾ واتە: پاش هۆزی عادو سەموود هۆزو بەرەی ترمان وەدی هێنا ﴿مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ﴾ واتە: هەر ئومەتێك لە ماوەی دیاری کراویان نە پێش دەکەونو نە دوا دەکەون. یانی کە وەختی مردنیان هات هەر یەکە بە پێی ئەو بڕیارەی کە خودای مەزن بۆی داوە لەو کتێبەی کە پارێزراوە، خوای گەورە پێش پەیدابوونیان نەتەوە پاش نەتەوەو هۆز دوای هۆزو بەرە دوای بەرەو پاشینە دوای پێشینە لێی ئاگادار بووە. ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا﴾ ئیبنو عەباس دەڵێت: واتە یەك بە دوای یەکدا پێغەمبەرمان بۆ ناردوون،[1] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ﴾[2] وە دەفەرمووێت: ﴿كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ﴾ واتە: بۆ هەر گەلێك لەوانە پێغەمبەرمان ڕەوانە کرد زۆرینەی زۆریان بڕوایان پێ نەکردن وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾[3] پاشان دەفەرمووێ: ﴿فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا﴾، واتە: بە دوای یەکدا بە دەردێکی خراپمان بردن، واتە قڕمان کردن وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ ٱلْقُرُونِ مِنۢ بَعْدِ نُوحٍ ﴾،[4] ﴿وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ﴾، واتە:وامانکرد کە خەڵکی بە چیرۆك بیگێڕنەوە، وەك ئەم ئایەتەش

[1] الطبري (١٩/٣٤).

[2] النحل (٣٦)، واتە: سوێند بە خوا لە ناو هەموو گەل‌و ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن‌و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر جا خوا هەندێکی لەو (ئومەت)انە ڕێنمووونی کردو هەندێکیشیان (لەبەر خراپیان) گومڕایی یەخەی گرتن.

[3] یس (٣٠)، واتە: ئای پەشیمانی داخی سەخت بۆ ئەو بەندانەی (کە بێباوەڕن) هەر پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە تەنها گاڵتەیان پێ دەکردو (هیچی تر)

[4] الإسراء (١٧)، واتە: وە زۆر (گەل‌و میللەت)مان لەناو برد لە چەرخەکانی پێش نوح.

که خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾[1] بۆیە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿فَبُعْدًا لِقَوْمٍ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، واتە: دووری لە ڕەحمەتی خوا بۆ ئەوانەی بڕوا ناهێنن.

﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾﴾

**بەسەرهاتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)و فیرعەون**

﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَارُونَ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ خودای مەزن باسی موسا دەکات کە لەگەڵ هارونی برای ناردی بۆ سەر فیرعەون و دارودەستەکەی بە نیشانەو بەڵگەی زۆر مەزن و ئاشکرا، فیرعەون و هۆزەکەی زۆر خۆیان بە زلتر دەزانی لەوەی کە شوێنی موساو هارون بکەون و بەرفەرمانیان بن، وە ئەوان گەلێکی دەسەڵاتدار بوون بەسەر خەڵکیدا بۆیە وتیان چۆن شوێنی دوو کەسی وەك خۆمان بکەوین لە مرۆڤ لە کاتێکدا کە گەلەکەیان (بەنی ئیسرائیل) ئێمە دەپەرستن، لەبەر ئەوە باوەڕیان پێ نەهێنان ئەمانیش (وەك گەلانی تر) لەناو بران، سوێند بە خوا بێگومان ئێمە تەوراتمان بەخشی بە موسا تا بەنی ئیسرائیل) ڕێنموون بن. یانی وەك چۆن گەلە پێشینەکان ناڕەزاییان دەردەبڕی کاتێك کە پێغەمبەریان لە خۆیان بۆ ڕەوانە دەکرا، چونکە خوانەناسان لە دێرزەمانەوە سروشتیان لە یەك چووە، بۆیە خوای گەورە فیرعەون و شوێنکەوتوانی قڕکردو لە ڕۆژێکدا هەمووی خنکاندن و تەوراتیشی بۆ موسا ناردە خوارەوە، کە پڕ بوو لە ڕێنمایی و فەرمان بە چاکەکردن و ڕێگری لە خراپەکاری و تاوانکردن، دوای ئەوەی کە خوای گەورە تەوراتی ناردە خوارەوە هیچ گەلێکی بە گشتی قڕ نەکردووە، بەڵکو فەرمانی داوە بە خاوەنباوەڕان کە دژی خوانەناسان بجەنگن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِنْ بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَىٰ بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا بێگومان تەوراتمان بەخشی بە موسا لە پاش ئەوەی خەڵکی

---

[1] سبأ (١٩)، واتە: ئێمەش کردمانن بە داستانێك لە ناو خەڵکدا بیگێڕنەوەو پرژو بڵاومان کردن (بە وڵاتاندا) بەوپەڕی پەرتەوازەیی.

چەرخە پێشووەکانمان لەناو برد تا بەرچاوڕوونیو ڕێنموونیو ڕەحمەت بێت بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە بیر بکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن.

﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾﴾

**باسی عیسا پێغەمبەرو مەریەمی دایکی (سەلامی خوایان لێ بێت)**

﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً﴾ واتە: خوای گەورە باسی عەبدو پێغەمبەری خۆی عیساو دایکی دەکات (سەلامی خوایان لێ بێت) کە کردنیە نیشانەیەك بۆ خەڵکی، لەسەر تواناو دەسەلاتی خۆی،کە مەیلی لەهەرچی بێت دەیکات، وەك چۆن ئادەمی بەبێ دایكو باوك دروست کردووە، حەواش لە نێرینەو بەبێ دایكو عیساش لە مێینە بەبێ باوكو باقی خەڵکی تریشی لە نێرو مێیەك وەدی هێنا، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ وە هەردووکیانمان دانا لە شوێنێکی بڵند (بيت المقدس) کە خاوەنی (هەموو هۆیەکی) حەسانەوەو کانیاوە. زەححاك دەڵێ: (الرّبوة) واتە: شوێنێکی بەرز لەسەر زەمین، ئەو شوێنەی کە ڕووەکی باش تێدا دەڕوێت،[1] موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەیش هەر وایان وتووە.[2] ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿ذَاتِ قَرَارٍ﴾ شوێنی بەپیتو (معين) کانیاوی لێبوو،[3] موجاهید و عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەیش هەر وایان وتووە.[4] موجاهید دەڵێ: گردێکی تەخت،[5] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ﴿ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ واتە: ئاوی تیا وەستابوو، موجاهیدو قەتادە دەڵێن: ئاوی لەبەر ڕۆیشتووە،[6] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾، دەڵێ: ئەو شوێنە دیمەشقە،[7] وە دەڵێ:ڕیوایەتیش کراوە لە عبدالله ی کوڕی سەلامو حەسەنو زەیدی کوڕی ئەسلەمو خالیدی کوڕی مەعدانەوە – معدان – هەر بەو شێوەیە. دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوەکە ﴿ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ واتە: ڕووبارەکانی دیمەشق،[8] وە

---

[1] الدر المنثور (٦/١٠٠).

[2] الطبري (٥/٥٣٧، ٥٣٧).

[3] الطبري (١٩/٣٨).

[4] الطبري (١٩/٣٩).

[5] الطبري (١٩/٣٨).

[6] الطبري (١٩/٣٩).

[7] الطبري (١٩/٣٧).

[8] القرطبي (١٢/١٢٦).

لەیسی کوڕی ئەبو سەلیم دەڵێت: موجاهید دەربارەی ﴿وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ﴾ دەڵێ: عیساو دایکی کاتێك کە چوونە ناو دیمەشقو دەوروبەری دامەزران تێیدا،[1] عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لەم ئایەتەدا دەڵێ: ﴿إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ ئەو شوێنە ڕەملەیە لە فەلەستین، نزیکترین قسە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە عەوفی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ کە دەڵێ: (معین) واتە: کانیاوێك ئاوی لەبەر بڕوات، ئەو ڕووبارەی کە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾ واتە: بێگومان پەروەردگارت لە خوارتەوە جۆگەیەك ئاوی بۆ فەراهەم هێناوی. زەححاكو قەتادەش ئەڵێن: ﴿إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ قودسی پیرۆزە (بیت المقدس) ئەم تەفسیرە دیارو ئاشکراترە – واللە أعلم – چونکە لە ئایەتی تردا باسی هاتووە، قورئانیش هەندێکی تەفسیری هەندێکی تری دەکات. ئەم تەفسیرەش باشترین تەفسیرە بۆ ئەم ئایەتە، پاشان فەرموودە صەحیحەکانو پاشانەوەش ئەسەرەکان هەرئەمە ئەسەلمێنن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾﴾

**فەرماندان بە خواردنی حەڵاڵو ئاکاری چاك**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾ خوای گەورە فەرمان دەدات بە بەندەو هەموو پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لەسەر بێت) کە خۆراکی پاكو حەڵاڵ بخۆنو هەڵسن بە ئاکاری چاك، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حەڵاڵ خواردن یارمەتی دەرە لەسەر ئاکاری چاك، پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لەسەر بێت) بە چاکترین شێوە پێی هەڵساونو هەرچی خێروبێرە کۆبوووبووەوە لە کردارو گفتارو ئامۆژگاریو شوێنەواریاندا، خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاك دەڵێن: ﴿كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾واتە: بژێوی حەڵاڵ. وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (هیچ پێغەمبەرێك نەبووە مەگین شوانی کردووە) گوتیان تۆش ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ من بە قیراتێ ئاژەڵم دەلەوەڕاند – شوانیم دەکرد – بۆ خەڵکی مەککە)،[2] وە لە سەحیحی موسلیمو

---

[1] الدر المنثور (٦/١٠٠).

[2] البخاري (٢٢٦٢)، ابن ماجه (٢/٧٢٧).

جامیعی ترمیزیو موسنەدی ئیمامی ئەحمەدا هاتووە وتەکە هی ئەحمەدە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لیّ بیّت) دەڵیّ: پیّغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! خودا پاکەو تەنها پاکیش قەبوڵ دەکات)، ئەوەی فەرمانی داوە بە پیّغەمبەران (سەلامی خوایان لیّ بیّت) بیکەن، فەرمانیشی داوە بە خاوەن باوەڕانیش بیکەن پاشان ئەفەرمویّ: ﴿وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ واتە: کردەوەی چاك بکەن بە ڕاستی من لەوەی دەیکەن ئاگادارم، وە فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هیّناوە بخۆن لەو خواردەمەنیە پاکانەی کردوومانە بە ڕۆزیتان. پاشان باسی پیاوێکی کرد کە ڕێبوارە – لە سەفەردایە – قژبژو تۆزاوی – چڵکن – خواردنو خواردنەوەی حەرامەو جلوبەرگی حەرامەو بە حەرام گۆشکراوە هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە بەرەو ئاسمان ئیّژیّ: (ئەی پەروەرندەم ئەی پەروەرندەم! دەی چۆن داوای ئەوە وەردەگیرێت؟)،[1] ترمیزی دەڵیّ: فەرموودەیەکی چاکی غەریبە – حسن غريب – وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە: (کە داود پیّغەمبەر (سەلامی خوای لیّ بیّت) لەبەرهەمی کاری دەستی خۆیی دەخوارد)[2].

**ئاینی گشت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) بریتیە لە یەکخواپەرستی – ناسینی خوا بە تەنها – هەڕەشەیش لەو کەسانەی کە ناکۆکی دروست دەکەن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾، واتە: ئەی کۆمەڵی پێغەمبەران ئاینی ئێوە یەك ئاینەو یەك پرۆگرامە کە بریتیە لە بانگەوازکردن بۆ عیبادەتی خودا بە تەنهاو هاوەڵ دانەنان بۆی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ﴾ واتە: منیش پەروەردگارتانم کەواتە خۆتا بپارێزن (لە تۆڵەم)، لە پێشەوە لەم بارەیەوە قسە کرا لە سورەتی ئەنبیائدا (الانبیا) وە فەرموویەتی: ﴿أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ مەنسوبە لەبەرئەوەی (حاڵ)ە. منصوب علی (الحال) پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ﴾ واتە: ئاینەکەیان پارچەپارچە کرد لە نێوان خۆیاندا بە چەند پارچەیەك، یانی ئەو گەلانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە کرا ﴿كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ﴾ واتە: جا هەر کۆمەڵو دەستەیەکیان دڵیان خۆشە بەو گومڕاییەی کە لەسەری دەڕۆنو وا دەزانن زۆر شارەزاو ڕێناسن، بۆیە خوای گەورە هەڕەشەیان لیّ دەکاتو دەیانترسێنێتو دەفەرموێت: ﴿فَذَرۡهُمۡ فِي غَمۡرَتِهِمۡ حَتَّىٰ حِينٍ﴾

---

[1] فتح الباري (٣٥٥/٤).

[2] مسلم (٧٠٣/١)، تحفة الاحوزي (٣٣٥/٨) وأحمد (٣٢٨/٢).

واته: وازیان لێ بێنه با له گومڕایی و سەرلێشێواوی خۆیاندا بتلێنەوه.﴿ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ تا کاتی قەلاچۆکردنیان دێتو لەناودەبرێن. وەك خوای گەورە له ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا﴾ واته: ئینجا مۆڵەتی بێبڕواکان بده، کەمێك لێیان بوەسته. وه فەرموویەتی: ﴿ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ واته: لێیان گەڕێ با بخۆنو ڕابوێرنو ئومێد بێئاگایان بکات جا بێگومان لەمەودوا دەزانن (چۆن سزایان دەدرێت). پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾ واته: ئاخۆ ئەو له خۆباییبووانه وا دەزانن که ئەوەی پێیان داون له ماڵو کوڕو کاڵ لەبەر ئەوەیه بەڕێزن لای ئێمەو پلەیان بەرزه؟ نەخێر وا نیه بەڵکو گێلو نەفامن که دەڵێن: ﴿وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ واته: وتیان ئێمه سامانو منداڵمان زۆرتره (له ئێوه) وه ئێمه هەرگیز سزا نادرێین). بێگومان ئەوانه نەیان پێکاوه به هەڵەدا چوون بەڵکو ئێمه مۆڵەتیان ئەدەینو دەیان هێڵینەوەو وازیان لێ دێنین بۆ ئەوەی زیاتر له خراپەکاری خۆیاندا ڕۆبچن. بۆیه خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ واته: جا با سەرنجت ڕانەکێشێت (سەرسامت نەکات) (زۆری) ماڵو دارایی‌و منداڵیان، بێگومان خوا دەیەوێت سزایان بدات بەهۆی ئەو (ماڵو منداڵەوه) لەم ژیانی دنیایەدا. وه فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ ﴾ واته: به ڕاستی ئێمه مۆڵەتی ئەوان دەدەین بۆ ئەوەی گوناهی زیاتر بکەن. وه فەرموویەتی: ﴿فَذَرْنِى وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ ۖ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ﴾ واته: وازم لێ بێنه بۆ ئەوانەی که ئەم قورئانه به درۆ دەزانن بەرەبەره کێشیان دەکەم به ڕەنگێك که پێی نەزانن، وه مۆڵەتیان دەدەم به ڕاستی نەخشەی من تۆکمەو بەهێزه. وه فەرموویەتی: ﴿ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا﴾ : واز له منو ئەو کەسه بێنه که دروستم کردووه به تەنها، وه دارایی زۆرو زەبەندم پێداوه، وه کوڕانی ئامادەو بەردەست، وه هۆی ژیانم بۆ ڕاخستووه به چۆن ڕاخستنێك، دوای ئەمانەش هێشتا به تەمایه زیاتری بدەمێ، نا (چاوەڕوان نەبێت) به ڕاستی ئەو دەربارەی ئایەتانی ئێمه بێباوەڕێکی کەللە ڕەقه . وه فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ واته: سامانو منداڵتان

شتێك نین لای ئێمە پلەو پایەتان نزیك بكەنەوە مەگەر ئەوەی باوەڕی هێنابێتو كردەوەی چاكی كردبێت. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ (٥٧) وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ (٥٨) وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ (٥٩) وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ (٦٠) أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ (٦١)﴾

## ڕەوشتی (سیفاتی) پیاوچاكان

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ﴾ واتە: ئەوانەی لەگەڵ ئەو هەموو چاكەو بڕواو ئاكارە چاكەیاندا لە خوا دەترسنو دڵیان دێتە لەرزەو لێوە لەرزەیانە لە بێباكی خودا بەرامبەریان، وەك حەسەنی بەسری دەڵێ: خاوەنباوەڕ لە نێوان چاكەو ترسدا ژیان بەسەر دەبەن، بەڵام خوانەناس لە نێوان خراپەكاریو دڵنیاییدا – نەترسیدا – ژیان بەسەر دەبەن،[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: ئەوانەی كە بڕوایان بە هەموو نیشانەكانی خودا هەیە لە بوونەوەرداو پەیڕەوی ئەو فەرمانانەشی دەكەن كە لە كتێبەكانیدا بۆی ناردوون. وەك ئەم ئایەتەی كە خوای گەورە باسی مەریەم دەكاتو دەفەرمووێت ﴿وَصَدَّقَتۡ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ﴾،[2] واتە: بە وتەو كتێبەكانی پەروەردەی بڕوای هێنا، بێگومان بوو لەوەی كە خودا كردیوتیو فەرمانو بڕیاری ئەوە، ئەوەیش خودا دایناوە هەر ئەوەیەو ئەگەر فەرمان بوو ئەوە لەو شتانەیە كە خۆی پێی خۆشەو لێی ڕازیەو، ئەگەر لەو شتانەش بوو قەدەغەی لێكرابوو، ئەوە پێی ناخۆشەو ناڕازیە لێی. وە ئەگەر چاكەیش بوو ئەوەدیارە ڕاستە، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ﴾ واتە: ئەوانەی لەگەڵ خوادا هیچ كەسی تر ناپەرستن، بەڵكو هەر ئەو دەپەرستنو دەزانن كە هیچ كەسێك بۆ پەرستن ناشێت تەنها ئەو نەبێت، بێ نیازەو جێی نیازە،خێزانو منداڵی نەبووەو بێوێنەو بێهاوتایشە. ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ﴾ واتە: ئەوانەی كە ماڵ دەبەخشن لە ڕێی خوداو دەترسنو دڵەلەرزەیانە لەوەی كە لێیان وەرنەگیرێت، چونكە ترسیان هەیە كە كەمتەرخەمیان كردبێت لە بەجێهێنانی ئەو مەرجانەی كە پەیڕەو دەكرێت لە ماڵ بەخشیندا، ئەمەیش لەبەر گرنگی پێدانو ترس لە خودایە، وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە

---

[1] الطبري (١٩/٤٥).

[2] التحريم (١٢).

(ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ﴿وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ﴾ ئایا ئەو کەسەی دزی دەکاتو داوێن پیسی دەکاتو ئارەق دەخواتەوە ئەوە لە خوا دەترسێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر ئەی کچی ئەبو بەکر ئەی کچی ڕاستگۆ – الصديق – بەڵکو ئەو کەسەی کە نوێژ دەکاتو ڕۆژو دەگرێتو سەدەقە دەکات، ئەوە لە خوای گەورە دەترسێت)،[1] هەر بەم مانایەش ترمیزیو ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتیان کردووە، فەرمووی: (نەخێر ئەی کچی ڕاستگۆ، ئەو کەسانەی کە نوێژ دەکەنو ڕۆژو دەگرنو سەدەقە دەکەن، ئەوانە دەترسن کە لێیان وەرنەگیرێت)، ﴿أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾،[2] ئیبنو عەباسو محمدی کوڕی کەعبی قورەزی حەسەنی بەسریش هەر وایان گوتووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا،[3] ﴿أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ﴾ واتە: ئەوانەن کە لە چاکەدا پەلە دەکەنو بۆ ئاکاری چاك لە پێشن.

﴿وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنطِقُ بِالْحَقِّ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ مِّنْ هَٰذَا وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰ إِذَا أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِالْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجْأَرُوا الْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدْ كَانَتْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِ سَامِرًا تَهْجُرُونَ ﴿٦٧﴾﴾

## باسی دادپەروەری خوداو نەوەستانی بتپەرستان لەسەر بارێك

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنطِقُ بِالْحَقِّ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ خوای گەورە باسی دادپەروەری خۆی دەکات لەپەیامەکەیدا کە بەرامبەر بەندەکانی لە دنیادا بەپێی توانا نەبێت ئەرك ناخاتە سەریان، واتە: فەرمانیان پێ ناکات بە کارێك کە نەتوانن هەڵی گرن، وە لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو کردارانەی کە پێی هەڵساون لەو کتێبەدا کە لەسەریان نووسراوە پرسیاریان لێ دەکرێت کە هیچ شتێکی تیا ون نابێت، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنطِقُ بِالْحَقِّ﴾ واتە: کتێبی کردەوەکان، ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ واتە: لە چاکەکانیان هیچ کەم ناکرێتەوە، بەڵام لە تاوانو خراپەی عەبدە خاوەنباوەڕەکانی دەبوورێتو چاوپۆشی لێ دەکات. پاشان بێزاری خۆی دەردەبڕێت لەو خوانەناسو بتپەرستانەی قوڕەیشو دەفەرموێت: ﴿بَلْ قُلُوبُهُمْ فِي غَمْرَةٍ﴾ واتە: بەڵکو ئەمانە

---

[1] أحمد (٦/١٤٩).

[2] تحفة الاحوزي (٩/١٩).

[3] الطبري (١٩/٤٥، ٤٦).

هۆشیان بە خۆیانەوە نیەو گومڕاو بێئاگان، ﴿مِّنْ هَٰذَا﴾ واتە: لەم قورئانەی کە خوا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، ﴿وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ﴾ حەکەمی کوڕی ئەبان لە عیکریمەوە ئەمیش لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: ﴿وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ﴾ واتە: جگە لەمەیش کرداری خراپی تریان هەیە، واتە: بتیش دەپەرستن، ﴿هُمْ لَهَا عَامِلُونَ﴾ دەڵێ: کە خۆیانی پێوە خەریک دەکەن،[1] هەر بەم شێوەیەش لە موجاهیدو حەسەنو کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە.[2] هەندێکی تریش گوتویانە ﴿وَلَهُمْ أَعْمَالٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَامِلُونَ﴾ واتە: کردارە خراپەکانی تریشیان نووسراوە هەر دەبێت بیکەن پێش مردنیان، بۆ ئەوەی ئەو سزایە بچەژنو بێتەدی، وە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موقاتیلی کوڕی حەیانو سودیو عبدالرحمن کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە.[3] ئەم ڕایە بەهێزو دیارو چاکە لە پێشەوە لە فەرموودەکەی ئیبنو مەسعودا باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی کە هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو، پیاوی وا هەیە کاردەکات بە کرداری خەڵکی بەهەشت تا لە نێوان ئەوو بەهەشتدا تەنها باڵێك دەمێنێت کتێب پێشی دەکەوێتو کار دەکات بە کرداری خەڵکی ئاگرو دەچێتە ناو ئاگر،[4] پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ إِذَا أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِالْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ﴾ واتە: کاتێك سزای خودا دابەزیە سەر ئەوانەی کەوان لە نازو نیعمەتدان لە ژیانی دونیادا ﴿إِذَا هُمْ يَجْأَرُونَ﴾ واتە: لە ناکاودا هاوار دەکەنو دەپاڕێنەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَذَرْنِي وَالْمُكَذِّبِينَ أُولِي النَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا﴾ واتە: واز بێنە لە من و ئەو خاوەن نازو نیعمەتانەی کە ئاینی من بە درۆ دەزانن وە کەمێك مۆڵەتیان بدە، بێگومان لای ئێمە هەیە کۆتو زنجیری قورسو گران وە ئاگری هەڵگیرساو. وە فەرموویەتی: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ واتە: چەندەها گەلمان پێش ئەوان (کافرانی مەککە) لەناو برد ئینجا هاواریان کرد لە حاڵەتێکدا کاتی ڕزگار بوون نەمابوو. وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿لَا تَجْأَرُوا الْيَوْمَ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ﴾ واتە: ئیمڕۆ هاوار مەکەن هیچ کەسێك نایات بە هاوارتانەوە یارمەتیتان نادات لەو بەڵایەی کە توشتان

---

[1] الدر المنثور (٦/١٠٧).

[2] الطبري (١٩/٤٩)، القرطبي (١٢/١٣٤).

[3] الطبري (١٩/٥٠).

[4] أحمد (١/٣٨٢).

هاتووه، هاوار بکەنو هاوار نەکەنو بێ دەنگ بن وەك یەك وایە. هیچ شوێنو پەنایەك نیە بۆتان، کار لە کار ترازاوەو بەلاو جەزرەبە هاتووە، پاشان خوای گەورە باسی تاوانە هەرە گەورەکانیان دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ﴾ واتە: کاتێك بانگ کران پشتتان تێکردو داواشتان لێ کرا تەنها خوا بپەرستن قەبوڵتان نەکرد. ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ﴾ واتە: ئەم سزایەتان لەبەر ئەوەیە کە بە ڕاستی هەر کاتێك خوا بە تاكو تەنیایی بپەرسترایە ئێوە بێباوەڕ دەبوون وەئەگەر هاوبەشی بۆ بنێرایە باوەڕتان دەهێنا (بەو هاوبەش دانانە)و بڕیاردان هەر بۆ خوای بڵندو بەرزو گەورەیە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێ: ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ﴾ واتە: خۆیان هەڵدەبڕی – فیزیان دەکرد – بە کەعبەی پیرۆزەوە شانازیان پێوە دەکردو بڕوایان وابوو کە هەر ئەوان خاوەنی کەعبەن، لە ڕاستیشدا واتەبوون وەك نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە بەشی تەفسیردا لە سونەتەکەیدا (من سنن) ئەحمەدی کوڕی سلیمان بۆی باس کردین، عبیدالله کوڕی ئیسرائیل بۆی باس کردین لە عبدالاعلی کە بیستی لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، دەیگێڕێتەوە لە ئیبنو عەباسەوە کە دەڵێ: شەونشینیم کردووە بۆ کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ﴾ دەڵێ: (مستكبرين بالبيت) قورەیشیەکان لە شەونشینیاندا دەیانگوت: ئێمە خاوەنی کەعبەین، خۆیان پێوە هەڵدەکێشاو شەو لەوێ دەمانەوەو ئاوەدانیان نەدەکردەوە بەڵکو قسەی پڕوپوچیان تیادەکرد[1].

﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا۟ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾﴾

**وەلامدانەوەی موشریکەکانو زەم کردنیان – باس کردنیان بە خراپە –**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ واتە: ئەم سزایەتان لەبەر ئەوەیە کە بە ڕاستی هەر کاتێك خوا بە تاكو تەنیایی بپەرسترایە ئێوە بێباوەڕ دەبوون

[1] النسائي في الكبرى (٦/٤١٢).

وەئەگەر هاوبەشی بۆ بنێرایە باوەڕتان دەهێنا (بەو هاوبەش دانانە)و بڕیاردان هەر بۆ خوای بڵندو بەرزو گەورەیە. یانی خوای گەورە سەرزەنشتی ئەو بتپەرستانە دەکات کە خۆیان لەو قورئانە مەزنە لادەدەنو نایانەوێت لێی تێ بگەنو لێی ڕانامێننو پشتی تێ دەکەن. کە بە تایبەتی ئەم قورئانە بۆ ئەوان هاتووە کە بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوانە نەکراوە چاکترو بەڕێزتر بێت لە پێغەمبەر (ﷺ) وەك باب‌و باپیرانیان کە پێش ئەوان مردن نە کتێبیان بۆ هات‌و نە پێغەمبەریش ڕەوانەکرا بۆیان، چاکتر وابوو کە ئەوانە شوکرانەبژێری ئەو بەهرەیە بوونایەو قبوڵیان بکردایە، لێی ڕا بمانایەو فەرمانەکانیان بەجێ بهێنایە بە شەوو بە ڕۆژو بەبێ ماندووبوون (وەك چۆن پیاوچاکانی خۆیان پێی هەڵسان ئەوانەی کە بڕوایان هێناو شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) کەوتن. قەتادە دەڵێ: ﴿أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ﴾ سوێند بە خوا ئەوەی لە گوناهو نافەرمانی خودا دەیگێڕانەوە لەناو قورئاندا وەدەستیان دەهێنا ئەگەر ئەو خەڵکە بیریان لێ بکردایەتەوەو لێی تێ بگەشتنایە، بەڵام ئەوانە بتپەرستییان هەڵبژارد بۆیە تیاچوون.[1] پاشان خودای گەورە جارێکی تر سەرزەنشتیان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾ واتە: ئەم سزایەتان لەبەر ئەوەیە کە بە ڕاستی هەر کاتێك خوا بە تاك‌و تەنیایی بپەرسترایە ئێوە بێباوەڕ دەبوون وەئەگەر هاوبەشی بۆ بنێرایە باوەڕتان دەهێنا (بەو هاوبەش دانانە)و بڕیاردان هەر بۆ خوای بڵندو بەرزو گەورەیە. یانی ئایا ئەوان محمدو (ﷺ) ڕاستگۆیی وئەمینی ئەویان نەدیوە کە لە ناو خۆیاندا پێی هەڵساوەو پاراستوویەتی، ئایا دەتوانن حاشا لەوە بکەنو بە ڕاستی نەزانن، بۆیە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) بە نەجاشی پاشای حەبەشەی گوت: ئەی پاشا خودا پێغەمبەرێکی بۆ ناردین شارەزای ڕەچەڵەك‌و – بنەماڵەو – ڕاستگۆیی‌و ئەمانەتی ئەووین،[2] موغەیرەی کوڕی شوعبەش هەر وای گوتوە بە جێگرەکەی کیسرا کاتێك دەستەیەخەیان وەستابوو، ئەبو سوفیانیش – سەخری کوڕی حەرب – هەر وای گوت بە هەرقەل پاشانی ڕۆم کاتێك کە پرسیاری لە خۆی‌و هاوەڵەکانی کرد لە بارەی ڕەوشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و ڕەچەڵەکی‌و ڕاستگۆیی‌و ئەمانەت‌و بەڕێزی بنەماڵەکەی[3]، ﴿أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ﴾ خوای گەورە باسی بتپەرستەکان دەکات کە دەیانوت: بە پێغەمبەر (ﷺ) کە خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووەو درۆ دەکات، یان جنۆکە دەستی لێ وەشاندووەو لە خۆیەوە قسە دەکات‌و نازانێ چی دەڵێ، خوای گەورە باسیان دەکات، کە ئەوانە لە دڵی خۆیاندا نایانەوێت بڕوای پێ بهێنن، چونکە خۆیان چاك دەزانن ئەو قسانەی کە ئەیڵێن لە بارەی

---

[1] الدر المنثور (٦/١١٠).

[2] ابن هشام (١/٣٧٥).

[3] فتح الباري (١/٤٢).

قورئانەوە ڕاست نیەو ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون لە لایەن خوداوەیەو فەرموودەی خودایە، نکۆڵی لێ ناکرێتو هیچ کەسێك ناتوانێ شتی وا بێژێت، خوای گەورەیش بەرەو ڕووی ئەوانو هەموو خەڵکی سەر زەمین دەوەستێو دەفەرمووێت: ئەگەر دەتوانن با شتێك بێنن وەك ئەم قورئانە، کە هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن بێننی بۆیە فەرموویەتی: ﴿بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾ واتە: (نەخێر وانیە) بەڵکو حەقو ڕاستی بۆ هێناون بەڵام زۆربەیان بوغزێنەری حەقو ڕاستین (ڕقیان لێیەتی). هەڵ دەگرێت ئەم ڕستەیە ڕستەیەك بێت بۆ (حال) دەست بدات، واتە: لە حاڵێکدا کە ئەوان خۆشیان لە ڕاستی نایە، وە هەڵیش دەگرێت ڕستەیەکی خەبەری بێت -والله أعلم-.

### ڕاستی شوێن ئارەزووی خەڵك ناکەوێت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ﴾ ئەبو سالح و سودی دەڵێن: ئەو هەقە (الحق) هەر خوای گەورەیە،[1] لێرەدا مەبەست ئەوەیە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە، ئەگەر خودای مەزن بە ئارەزووی دڵی ئەوانی بکردایە، بە دڵی ئەوانە بەرنامەکانی دارشتایە، ئاسمانەکانو زەمین خراپ دەبوون ئەوەیشی تیایاندایە خراپ دەبوونو تێك دەچوون، لەبەر جیاوازیو خراپی ئارەزووەکانیان. وەك خوای گەورە باسیان دەکات کە ئەڵێن: ﴿لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ﴾،جاخوا ئەفەرموێ: ﴿ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَ﴾ واتە: وتیان بۆچی ئەم قورئانە نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ پیاوێکی گەورەی (ناودارو دارا) لەم دوو شارە (مەککەو طائف)، ئایا ئەوان ڕەحمەتی پەروەردگارت دابەش دەکەن؟. وە فەرموویەتی: ﴿قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ﴾ واتە: بڵێ ئەگەر ئێوە خاوەنی خەزنەکانی چاکەو نیعمەتەکانی پەروەردگارم بن ئەو کاتە دەتانگرتەوە (لە بەخشین) لە ترسی خەرج بوونو تەواو بوون. وە فەرموویەتی: ﴿أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴾ واتە: ئایا ئەوانە (جوولەکەکان) بەشیان هەیە لە دەسەڵاتی پاشایەتی (خاوەنێتی بوونەوەر)) (جا ئەگەر بیانبوایە) ئەو کاتە بە خەڵکیان نەدەبەخشی (بە ئەندازەی) توێکڵی دەنکە خورمایەك. لەم ئایەتانەوە هەموو لاوازی بەندەکانی خوداو جیاوازی بۆچوونو ئارەزووەکانیان دەردەکەوێت، هەر خودا خۆی پاكو بێعەیبەو خاوەنی گشت سیفەتێکی تەواوو کرادارو گفتارو بڕیارو بەرنامەیەکەو، هەر خۆیشی بەکاری دروستکراوەکانی دەکات، پاكو پیرۆزەو هیچ پەرستراوو پەروەرندەیەك نیە جگە لە خودا خۆی.

---

[1] الطبري (١٩/٥٧)، القرطبي (١٢/١٤٠).

پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ﴾ واتە: بەڵكو ئێمە قورئانمان بۆ ناردن کەڕێزو حورمەتی ئەوانی تێدایە﴿فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ﴾ واتە: ئەوان پشتیان لەو ئامۆژگاریە کرد کەحورمەتی خۆیانی تێدایە!

## پێغەمبەر (ﷺ) پاداشتی لەوان ناوێت بەڵکو بانگیان دەکات بۆ سەر ڕاستەڕێ

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا ﴾ واتە: یا داوای پارەو خەرج لەوان دەکەیت، حەسەن دەڵێ: یانی پاداشت،[1] قەتادە دەڵێت: یانی کرێ -هەقی کار-[2]، ﴿فَخَرَاجُ رَبِّكَ﴾ واتە: ئەوە بەخشش‌و ڕۆزی پەروەردگارت چاکترە. یانی تۆ داوای پاداشت‌و کرێ یان شتێکیان لێ ناکەیت لە بری ئەوەی کە ڕێیان نیشان دەدەی بەڵکو تۆ بە تەمای پاداشتی چاکی خودای مەزنی، ﴿وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ واتە: خوا چاکترینی ڕۆزی دەرانە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ﴾[3]، وە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ﴾،[4] وە فەرموویەتی: ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾،[5] وە فەرموویەتی: ﴿ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٢٠ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا ﴾[6]، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ واتە: بە ڕاستی تۆ دەتەوێت بانگیان بکەیت بۆ سەر ڕاستەڕێ، ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە هەر نایانەوێت ڕاستەڕێ بگرن‌و لێی لادەدەن، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو فریشتە هاتنە لای – وەك کەسێك نوستبێت‌و خەو ببینێت – فریشتەیەکیان لە لای هەردوو پێیەوە دانیشت‌و ئەوی تریان لە لای سەریەوە، ئەو فریشتەی لای

---

[1] الطبري (١٩/٥٨).

[2] الدر المنثور (٦/١١٠).

[3] سبأ (٤٧)، واتە: بڵێ هەر کرێ‌و پاداشتێکم لێ داواکردوون ئەوە بۆ خۆتانە پاداشتی من تەنها لەسەر خوایە.

[4] ص (٨٦)، واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ من هیچ کرێ‌و پاداشتێك لەسەر گەیاندنی ئەم ئاینە لە ئێوە داوا ناکەم‌و من لەو کەسانە نیم کە درۆ هەڵبەستم‌و زۆر لە خۆم بکەم.

[5] شورى (٢٣)، واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری مەگەر خۆشویستنی خزمایەتی.

[6] يس (٢٠-٢١)، واتە: لەوپەڕی شارەکەوە پیاوێك (حەبیبی نەجاڕ) بە پەلە هات وتی ئەی گەلەکەم شوێن ئەم پێغەمبەرانە بکەون، شوێن کەسانێ بکەون داوای هیچ کرێ‌و پاداشتێکتان لێ ناکەن.

پێکانیەوە بوو گوتی: بەئەوەی لە لای سەریەوە بوو:من بەسەرهاتی ئەمەو – واتە پێغەمبەر (ﷺ)– ئومەتەکەیت بۆ دەگێڕمەوە، پاشان گوتی: نموونەی ئەمو نموونەی ئومەتەکەی وەك نموونەی کۆمەڵێك وایە لە سەفەردا بن، بچنە شوێنێکی چۆڵی بێئاو، ئەوەندە توێشوویان – خواردنو خواردنەوەیان – پێ نەبێت کە ئەو چۆڵەوانیەی پێ ببڕن یان پێی بگەڕێنەوە، ئا لەو کاتەدا کە ئەوەیان بەسەر دێ، پیاوێك هاتە لایان جلوبەرگێکی تازەو جوانی پۆشیبوو – لەبەر دابوو – دەڵێ: چۆنە بە لاتانەوە ئەگەر بتانگەیەنمە باخچەیەکی پڕ لە ڕووەك – سەوزایی – حەوزی پڕ لە ئاو ئایا شوێنم دەکەون؟ گوتیان: بەڵێ،ئەڵێ: بردنی وگەیاندنیە ناو باخچەو کانیاوێکی سازگار خواردیانو خواردیانەوە بە تەواوی تێربوون، پاشان پێی گوتن: ئایا من ئەم حاڵەتەم بۆ وەدی نەهێنانو ئێوەش بەڵێنتان پێ نەدام ئەگەر بتانگەیەنمە باخچەیەکی پڕ لە ڕووەكو گژوگیاو حەوزی پڕ لە ئاو شوێنم دەکەون؟ وتیان:بەڵێ، ئەڵێ:دەی بەڕاستی باخچەی پڕ ڕووەك ترو حەوزی پڕ لە ئاوتر لەبەر دەممانەوەیە لەمە زیاتر، دەی شوێنم دەکەون؟ دەستەیەکیان وتیان: بە خوا ڕاستی کرد شوێنی دەکەوین، دەستەیەکی تریان وتیان: ئێمە بەمە ڕازینو تێیدا دەمێنینەوە(هیچی ترمان ناوێ)[1] !

**باسی گوزەرانی – ژیانی – خوانەناسان**

خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَـٰكِبُونَ﴾ واتە: ئەوانەی باوەڕ ناهێنن بە ڕۆژی قیامەت هەمیشە لە ڕێگە لادەدەنو ستەمکارو گومڕان. عەرەب ئەڵێن:(نكب فلان عن الطريق) فلانە کەس کەلا بوو لە ڕێ، کاتێك لە ڕێگە لایدا. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوْ رَحِمْنَـٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا۟ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ خوای گەورە باسی لاساری خوانەناسان دەکات کە چەندە خراپو لاسارو سپڵەن، ئەگەر بەڵاشیان لەسەر لابەرێتو شارەزاشیان بکات لە قورئان ئەوانە هەر سەرپێچی دەکەنو بەردەوام دەبن لەسەر تاوانو خراپەکاریو بێدینی خۆیان. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴾،[2] وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَـٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هِىَ إِلَّا

[1] احمد (١/٢٦٧).

[2] الانفال: (٢٣)، واتە: وە ئەگەر خوا بیزانیایە چاکەیەك لەو (کەڕو لاڵانەدا) هەیە بێگومان وای لێ دەکردن ببیستن ئەگەر خوا (فەرمانی خۆی) پێ ببیستنایە هەر ڕوویان وەردەگێڕا وە ئەوان هەر گوێ پێ نەدەرن.

حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾[1]، ئەمە لەو شتانەیە کە خوای گەورە خۆی ئاگاداری هەیە لەوەی کە نابێ‌و ئەگەر بشبێت چۆن دەبێ، زەحاك دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە هەر شتێ (لو)ی تێدا بێت ئەو شتە هەرگیز ڕوونادات –نایەتەجێ–.

﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَـٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَـٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَـٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَـٰهُم بِٱلْعَذَابِ﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی توشی بەڵاو کارەساتی زۆر گرانمان کردن، ﴿فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ واتە: بەڵام ئەوان لە بەرامبەر پەروەردگاریاندا نە خۆیان بە کەم زانی وە نە هاناو نزایانی بۆ دەبەن لە کاتی نارەحەتیدا، یانی ئەو بەڵاو کارەساتە نایان گێڕێتەوە لەو بێ دینی‌و خراپەکاریەی لە سەرینی،بەڵکو بەردەوامن لەسەر ئەو گومڕایی‌و لاساریە، ﴿فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟﴾ واتە: ملیان کەچ نەکردو﴿وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾ ناشپاڕێنەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَـٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ﴾[2] ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: ئەبو سوفیان هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) گوتی: ئەی محمد (ﷺ)تکایی خواوتکای خزمایەتیت لێدەکەم کەفریامان کەوە،کەوتوینەتە خواردنی عیلهیز[3]، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَـٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُوا۟﴾

---

[1] الانعام (٢٧–٢٩)، وە ئەگەر بیانبینیت کاتێك لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێنراون کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیا بەڵگەکانی پەروەردارمان بە درۆ نەدەزانی وە لە بڕواداران دەبووین، (نەخێر بە ڕاستیان نیە) بەڵکو ئەوەی کە لەوەوپێش دەیانشاردەوە بۆیان دەرکەوتووە وە ئەگەر بگەڕێنرێنەوە (بۆ دنیا) بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدەغەکرابوو وە بە ڕاستی ئەوانە درۆزنن، وە وتیان بە ڕاستی هەر ئەم ژیانە (ی دنیا)مانەو ئێمە زیندوو ناکرێینەوە.

[2] الانعام (٤٣)، واتە: دەی بۆ نەپاڕانەوە کاتێك سزای ئێمەیان بۆ هات؟ بەڵام دڵیان ڕەق بوو.

[3] (عیلهین)واتەخواردنی خوێن ومووی حوشتر کەتێکەڵ ئەکرێت وسورنەکرێتەوە هەروەهاعیلهیز بەمانای (مەیمونی زۆرگەورەش)دێت،بەمانای ڕووەکێکی تایبەتیش دێت کەلەولاتی(بەنی سلیم)دائەڕوێ ولەکاتی قاتیدا خەڵك ناچارئەبن بیخۆن..(النهایة في غریب الحد یث والاثر:ابن الاثیر، کلمة(علهین)) .(٢٩٣/٣)

نەسائیش ئەم فەرمودەیەی ڕیوایەت کردووە[1]. ئەسڵی ئەم فەرموودەیە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزای کرد لە قورەیش کاتێ کە یاخی بوونو بە گوێیان نەکرد فەرمووی: (ئەی خودایە یارمەتیم بدە قاتو قڕیەکی وەك قاتو قڕیەکەی یوسفیان بۆ بنێرە کە حەوت ساڵی خایاند)،[2] پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا ذَا عَذَابٖ شَدِيدٍ إِذَا هُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ﴾ واتە: هەتا کاتێك بڕیاری خوایان بۆ دابەزی لە ناکاو سزای توندی بۆ ناردن، کە هیچ حیسابێکیان بۆ نەکردبوو، ئا لەو کاتەدا بە تەواوی نائومێد بوونو دەستیان لە هەموو چاکەیەك بڕاو هەموو شتێکیان لە دەست چوو گشت هیواو ئومێدەکانیان گۆڕکراو تیاچوو.

## وەبیرهێنانەوەی بەهرەکانی خوداو توانی بەهێزو مەزنی ئەو

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾ پاشان خوای گەورە باسی بەهرەکانی خۆی دەکات بەسەر بەندەکانیەوە کە چاوو گوێو دڵی پێداون کە بە هۆی عەقڵەوە لە هەموو شتێك تێ دەگەنو هەست بەم بوونەوەرە دەکەنو بیری لێ دەکەنەوەو پەند وەردەگرن لەو نیشانانەی کە دەبنە بەڵگە لەسەر تاکو تەنهایی خودا کە خاوەنی هەموو شتێکەو هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکات. ﴿قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ﴾ واتە: زۆر کەم سوپاسی خودا دەکەن لەسەر ئەو هەموو بەهرانەی کە پێی بەخشیون، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾،[3] پاشان دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ﴾ پاشان خودای گەورە باسی تواناو دەسەڵاتی بەهێزو گەورەیی خۆی دەکات کە ئەم هەموو خەڵکەی دروست کردووەو بڵاوی کردووەتەوە بە هەموو کیشوەرو وڵاتەکاندا لەسەر زەمیندا کە هەر گەلێ لە گەلێکی تر جیاوازی هەیە لە ئێوەو ڕەنگو زمانو سروشتو ڕەوشتدا، پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا هەر لە سەرەتای ژیانەوە تا کۆتایی، هەموو کۆدەکاتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کە دیاری کراوە – کە ڕۆژی قیامەتە – هیچی لەبیر ناچێت لە گەورەو بچووك لە نێرو مێ بە ڕێزو بێ ڕێز یەکەمجار چۆن بووە وەك خۆی لێ دەکاتەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ﴾ واتە: خوا زاتێکە زیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێت، یانی ئێسکی –پێشەی– ڕزیو زیندوو دەکاتەوەو گەلانیش دەمرێنێت، ﴿وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ

---

[1] النسائي في الكبرى (٦/٤١٣).

[2] فتح الباري (٨/٤٣٥)، مسلم (٤/٢١٥٦).

[3] يوسف (١٠٣)، واتە: وە زۆربەی خەڵکی هەرچەند تۆ سوور بیت (لەسەر باوەڕهێنانیان) نابنە ئیماندار.

وَٱلنَّهَارِ﴾ واتە: وە جیاوازی شەوو ڕۆژیش هەر بە دەست ئەوە، یانی بە فەرمانی ئەو شەوو ڕۆژ ڕام هێنراوە لە پڕ بە دوای یەکتردا دێن‌و لە یەکتری نابڕێن‌و دوا ناکەون لەو کاتەی بۆیان دیاری کراوەو پێشیش ناکەون، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾[1] وە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ واتە: دەی ئایا ئێوە بیر ناکەنەوە؟ یانی ئایا خاوەن عەقڵ نین کە خوای زاناو خاوەن دەستەڵاتتان نیشان بدات، کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو هەموو شتێك ملی کەچە بۆی‌و سەری بۆ نەوی دەکات.

## بت پەرستان زیندوو بوونەوەی پاش مردن بە دوور دەزانن

پاشان خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە بڕوایان بە زیندووبوونەوە نیە کە ئەمانەیش وەك پێشوەکانیان وان بڕوایان بە زیندووبوونەوە نەبوو، ﴿بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ﴾ واتە: بەڵکو ئەوان هەر ئەوەیان دەوت کە پێشوەکانیان دەیان وت کە زیندووبوونەوەیان بە دوور دەزانن پاش ئەوەی کە دەبنەوە بە خۆڵ‌و ئێسکی ڕزیو بۆیە دەیان وت وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَـٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾،[2] یانی زیندووبوونەوەیان بە لاوە مەحاڵەو ئەڵێن ئەمەی کە باسی دەکات هەموو چیرۆك‌و بەسەرهاتی پێشوەکانەو لە کتێبەکانی ئەوانەوە وەرگیراوەو لە خۆیانەوە هەڵیان بەستووە،ئەمەیش هەموو نیشانەی خوانەناسین‌و بڕوانەکردنیانە بە زیندووبوونەوە، وەك خوای گەورە باسی بێدینان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿أَءِذَا كُنَّا عِظَـٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾[3]، هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ

---

[1] یس (٤٠)، واتە: خۆر بۆی نیە (ناتوانێ) بگات بە مانگ‌و شەویش ناتوانێ پێشکەوێ لە ڕۆژو هەریەکەیان (خۆرو مانگ) لە خولگەیەکدا مەلە دەکەن‌و دەسوڕێنەوە.

[2] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئەم بەڵێنە بە ئێمەو باوو باپیرانمان درابوو لەمەوپێش ئەم (بەڵێنانە) هیچ نیە جگە لە داستانی (قسەی پڕوپوچی) پێشووەکان.

[3] النازعات (١١-١٤)، واتە: ئایا کە بووین بە ئێسقانی ڕزیو چۆن (زیندوو دەبینەوە)، وتیان: ئا ئەوە ئەگەر وابێت گەڕانەوەیەکی بە زیانە، بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەریەك نەعرەتەیە، ئیتر کوتوپڕ وان لە دەشتێکی سپی کاکی بە کاکیدا.

مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾[1].

﴿قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾﴾

**دانپیانانی بتپەرستان کە هەموو شتێك خودا دروستی دەكات، ئەو دانپیانانەش پێویستی دەكات لەسەریان كە تەنها هەر خوا بپەرستن**

﴿قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ خوای گەورە تاكو تەنهایەو دەسەڵاتو توانای خۆی دەسەلمێنێتو دەری دەخات بۆ خەڵكی كە هەر خۆی خودایەو غەیری ئەو هیچ خودایەكی تر نیە، دەبێت هەر عیبادەت بۆ ئەو بكرێت بە تەنهاو هاوەڵی بۆ دانەنرێت، بۆیە فەرموویەتی بە پێغەمبەرەكەی محمد (ﷺ) كە بڵێت بەو موشریكانەی كە شتی تر دەپەرستن، لەگەڵیو دانیش دەنێن بەوەی كە خودا پەروەردەیانە كەچی شەریكی بۆ دادەنێنو لەگەڵ ئەودا دەیپەرستن، باشیش دەزانن كە ئەوانەی دەیانپەرستن ناتوانن هیچ شتێك دروست بكەنو خاوەنی هیچ شتێك نینو ناتوانن هیچ شتێكیش بۆ خۆیان داگیر بكەنو نەهێڵن كەس بیبات، ئەوانە وا دەزانن ئەو بتانە لە خوداوە نزیكیان دەكەنەوە. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت ئەوانە ئەڵێن: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾،[2] بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ﴾ واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) بڵێ: كێ خاوەنی ئەو زەمینەیەو دروستی كردووە ئەوەیشی كە تێیدایە لە گیانەوەرو ڕووەكو بەرهەمو دروست كراوی تری هەمەجۆر ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: ئەگەر هیچ زانیاریەكتان هەیە، ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ﴾ واتە: بێگومان پێت ئەڵێن: هەموو ئەوانە هی خودایە كە تاكو تەنهایەو شەریكی نیە، مادام وایە

---

[1] یس (٧٧-٧٩)، واتە: ئایا ئادەمی نەیزانیوە كە ئەومان لە نوتفەیەك دروست كردووە كەچی یەكسەر دەبێتە دوژمنێكی دیار (دەمەقاڵێكەرێكی ئاشكرایە)، نموونەمان بۆ دێنێتەوەو بەدیهێنانی خۆی لەبیرچۆتەوە (ئەو بێبڕوایە) دەڵێت: كێ ئێسكەكان زیندوو دەكاتەوە لە كاتێكدا كە ڕزیون، (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ ئەو زاتە زیندویان دەكاتەوە كە لە یەكەمجارەوە بەدی هێناونو ئەو بە هەموو دروستكراوێك زاناو بە ئاگایە.

[2] الزمر (٣) واتە: (دەڵێن) تەنها لەبەر ئەوە دەیانپەرستین نزیكمان بخەنەوە لە خوا.

هی خودایە، ﴿قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ واتە: بلێ:دەی بۆچی بیر ناکەنەوەو حاڵی نابن کە عیبادەت بۆ کەسی تر ناکرێت تەنها بۆ خودا نەبێت کە وەدیهێنەرو ڕۆزیدەرە؟ ﴿قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾، واتە: کێ وەدی هێنەری حەوت ئاسمانو جیهانی سەرەوەیە کە بریتیە لەو ئەستێرە ڕووناکو ئەو فریشتانەی گوێڕایەڵی فەرمانی ئەون لە گشت بەشو لایەکی ئاسماندا، وە کێ پەروەرێنی تەختی هەرە گەورەیە ﴿ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ئەو تەختەی کە سەری هەموو دروست کراوەکانە، بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ واتە: تەختی هەرە مەزن، وە لە کۆتایی سورەتەکەشدا فەرموویەتی: ﴿رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ﴾ واتە: چاکو جوان وەسفی تەختی کۆکردووەتەوە لە نێوان زۆر مەزنیو فراوانیو بەرزیو چاکیو جوانیدا، لەبەر ئەوەیە ئەوانەی کەئەم تەفسیرەئەکەن دەڵێن: ئیبنو مەسعود دەڵێت: بە ڕاستی پەروەرندەی ئێوە نەشەوی لایەونەڕۆژ، ڕوناکی تەخت – العرش – لە ڕووناکی ڕووی ئەوە. ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾ واتە: بێگومان دەڵێن هەمووی هی خوایە، بلێ دەی ئایا خۆتان ناپارێزن، یانی وەختێك ئێوە دانی پێدا دەنێن کە خودا پەروەرندەی ئاسمانەکانو تەختی هەرە مەزنە، ئاخۆ لە تۆڵەو جەربەزەی خودا ناترسن کە شتی تر لەگەڵی دەپەرستنو شەریکی بۆ دادەنێن؟ ﴿قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ واتە: بلێ دەسەلاتی هەموو شت بە دەستی کێیە؟ واتە بە دەستی خوایە ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآ﴾[1] واتە: هەموو شتێك وا لە ژێر دەسەلاتی خوای گەورەاو هەڵسوکەوتی بەدەست خوایە، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (لا والذي نفسي بيده) واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، کاتێك کە سوێندی بخواردایە دەیفەرموو: (لا ومقلب القلوب) واتە: سوێند بەو کەسەی دڵەکان هەڵدەگێڕێتەوە – ئەم دیو ئەودیوی دەکات – چونکە هەر خوایە کە وەدیهێنو خاوەنو کاربەدەستە، ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾،[2] عەرەبەکان کاتێك کە گەورەکەیان کەسێکی پەنا بدایە کەس نەیدەتوانی دەست درێژی بکاتە سەرو ئازاری بدات لەبەر ڕێزی ئەو گەورەیانەو قسەی نەشکێ، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ﴾ واتە: هەر خوا مەزنو پایە بەندە کە هیچ کەسێك لەو گەورەتر نیە، کەس ناتوانێت دەست لە کاری وەربداتو دژایەتی بکات،

---

[1] هود (٥٦).

[2] واتە: بلێ کێ فەرمانڕەوایی و هەموو شتێکی بە دەستە، وە پەنای (هەموو لایەك) دەداتو کەس لەو پەنا نادرێت ئەگەر ئێوە شت دەزانن.

بوون‌و نەبوون بەدەستی خۆیەتی‌و هەرچیە مەیلی لیٚ بێت دەیکات‌و مەیلیشی لیٚ نەبێت نایکات، وەك دەفەرموویٚت: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾[1]، واتە: هەرچی خوا بیکات نابێت پرسیاری لیٚ بکرێت بەڵکو ئەوان بەرپرسیارن، لەبەر مەزنی‌و پایەبەرزی‌و دەسەڵات‌و توانای بەهێزو کارزانی‌و دادپەروەری خوای گەورە، بەڵام هەموو خەڵکی بەرپرسیارن لە کردارەکانیان وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾[2]، پاشان دەفەرموویٚت: ﴿سَيَقُولُونَ لِلَّهِ﴾ واتە دانی پێدا دەنێن کە گەورەو خاوەن شکۆ هەر خودایەکە پەنای بۆ دەبرێت‌و هەر کەسێك دژی ئەوبێت کەس ناتوانێت پەنای بدات، تاك‌و تەنهایەو شەریکی نیە، ﴿قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ﴾ واتە: بلیٚ کەواتە ئێوە چۆن سیحرو جادووتان لێکراوە، یانی کەواتە چۆن عەقڵتان رێتان پیٚ ئەدات کەسی تر بپەرستن لەگەڵ خودا، کە خۆتان دانی پێدا دەنێن‌و چاك دەزانن وایە، ﴿بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ﴾ ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکە غەیری خودا پەرستراوێکی تر نیە، بەڵگەی تەواو ئاشکراو ڕاست‌و دروستمان هێناوەتەوە لەسەری ﴿وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە ئەو بتانە دەپەرستن‌و دەیانکەنە شەریکی خودا درۆزنن‌و هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە لەسەر ئەو بت پەرستیە، وەك خودای گەورە لە کۆتایی سورەتەکەدا فەرموویەتی ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾[3] موشریکەکان ئەو کارە ناکەن لەبەر ئەوەی بەڵگەیان بە دەستەوەیە لەسەر ئەو درۆو گومڕاییە، بەڵکو هەر لەبەر ئەوە شەریك بۆ خوا دادەنێن‌و دەیپەرستن چونکە باب‌و باپیران‌و گومڕایانی پێش خۆیان کە زۆر نەفام بوون بتیان پەرستووە، وەك خوای گەورە باسیان دەکات‌و دەفەرموویٚت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ﴾[4] واتە: باب‌و باپیرانمان لەسەر ئاینێك ڕۆیشتوون‌و ئێمەش شوێن کەوتووی ئەوانین.

﴿مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾﴾

---

[1] الانبياء (٢٣).

[2] الحجر (٩٢-٩٣)، واتە: جا سوێند بە پەروەردگارت پرسیار لە هەموویان دەکەین، لەوەی کە دەیانکرد (لە دنیادا).

[3] المؤمنون (١١٧)، واتە: هەرکەس بپەرستیٚ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا کە هیچ بەڵگەیەکی نەبێت لەسەر ئەو (پەرستنە) ئەوە بە ڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگاریەتی بێگومان کافران ڕزگاریان نابێت.

[4] زخرف (٢٣).

**خودا شەریکی نیە**

خودای مەزن باسی پاكو بێعەیبی خۆی دەكات لەوەی كە ڕۆڵەی یان هاوەڵی هەبێت لە دەسەڵاتو كارو فەرمانو پەرستندا بۆیە فەرموویەتی: ﴿مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ﴾،[1] یانی ئەگەر وا دابنرایە چەند خوایەك ببێت، هەر خودایە بە مەیلی خۆی شتی دروست دەكردو ئەو كاتە بوونەوەر ڕێك نەدەنرا، ئەوەتا ئێستا بوونەوەر بەو ڕێكو پێكیە ڕێكخراوە هەر لە جیهانی سەرەوە هەتا خوارەوە بە یەكترەوە بەستراون زۆر بە چاكیو تەواوی ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ۖ﴾[2] خۆ ئەگەر چەند خوایەك بوونایە هەریەكە ئەیویست ئەوی تر ببەزێنێتو دژایەتی بكاتو زاڵ بێت بەسەر ئەوی تردا – زانایانی كەلام – المتكلمون – باسی ئەمەیان كردووە بەم مانایەو ناویان بردووە بە دەلیلی تەمانوع واتە: ئەگەر وا دابنرێت لە دوو خوا یان زیاتر ببوونایە، یەكێك دەیویست شتێك بجوڵێنێت ئەوی تر دەیویست بیوەستێنێت، ئەگەر مەبەستی هەردووكیان بەجێ نەهات، هەردووكیان ناتەواو دەردەچوون، واجبیش دەبێت ناتەواو نەبێ، خۆ نابێت مەبەستی هەردووكیانیش بێتەجێ، لەبەر كۆبوونەوەی دوودژ لەیەك كاتدا، مەگین وا دابنرێت لە یەك زیاترە، ئەمەیش هەر نابێت، ئەگەر مەبەستی یەكێكیان هاتەدیو مەبەستی ئەوی تریان نەهاتەدی، سەركەوتووەكەیان دروستەو (واجب)ەوئەوی تریان بەزیوەو سەرنەكەوتووە، ئەمەیان گونجاوە (ممكن) چونكە واجب ناشێ بەزیو بێتو لە سیفەتی ئەو نیە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە:هەندێكیان سەرئەكەوتن بەسەرئەوانی تریاندا،خودا پاكو بێ عەیبە لەو قسانەی ئەو ستەمكارانە هەڵی دەبەستنو ئەڵێن خودا ڕۆڵەو شەریكی هەیە، ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ﴾ واتە: ئاگاداری ئەو شتانەیە كە خەڵكی چاویان لێی نیەو ئەوەیشی دەیبینن، ﴿فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: خودا پاكو پیرۆزەو بەرزترە لەوەی كە ناهەقیكارو بێبڕوایان دەیكەنە هاوبەشی.

---

[1] واتە: خوا هیچ ڕۆڵەیەكی بۆ خۆی بڕیارنەداوە وە هیچ پەرستراوێكی تری لەگەڵدا نەبووە (ئەگەر پەرستراوی لەگەڵدا بووایە) ئەو كاتە هەر پەرستراوێك چی دروست كردووە (بۆ خۆی) دەبرد وە هەندێكیان زاڵ دەبوون بەسەر هەندێكی تریاندا.

[2] الملك (٣)، واتە: تۆ (ئەی تەماشاكەر) لە دروست كردنی خوای میهرەباندا هیچ ناڕێكیەك نابینیت.

﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ ﴿٩٥﴾ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ ﴾

**هانابردن بۆ خودا لە كاتی هاتنی بەڵاداو وەڵامی خراپە بە چاكەو هانابردن بە خودا لەدنەدانی شەیتان**

خودای مەزن فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەكەی محمد (ﷺ) لە كاتی دابەزینی بەڵادا ئەم دوعایە بكات ﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴾ واتە: بڵێ ئەی پەروەردگارم ئەگەر هەر نیشانم دەدەیت ئەو سزایەی كە بەوان بەڵێن دراوە، یانی ئەگەر سزات دان و من لەو كاتەدا لەوێ بووم منیش وەك ئەوان لێ نەكەیت وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە كە ئیمامی ئەحمەدو ترمیزی ڕیوایەتیان كردووە، ترمیزی فەرمودەكەی بە صەحیح داناوە كە ئەفەرموێ: (ئەگەر ویستت بەڵایەك بدەی بەسەر گەلێكدا بم بەرەوە بۆ لای خۆت توشی ئەو بەڵایەم مەكە،[1] ﴿رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ واتە: پەروەرندەم! لەگەڵ ستەمكارانم دامەنێ، ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ﴾ واتە: ئەگەر بمانەوێت ئەوەی تووشی ئەوانی دەكەین لە تاقی كردنەوەو بەڵاو ئازار نیشانی تۆشی دەدەین، پاشان خودای مەزن ڕێی نیشان دەدا بۆ چاكەكردن لەگەڵ ئەوانەی كە خراپەی لەگەڵ دەكەن لە كاتێكدا كە تێكەڵاویان دەكات — لەگەڵیان دەژی — بۆ ئەوەی سەرنجیان ڕابكێشێت، هەتا ئەو دوژمنایەتیو ڕقو كینەیان بێتە دۆستایەتیو خۆشەویستی وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ واتە: تۆ وەڵامی خراپە بە چاكە بدەرەوە، ئێمە باشتر دەزانین ئەوان چی دەڵێن وە هەر بەم شێوەیە خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾[2] واتە: كەسی تر ئەو ئامۆژگاریو ڕەوشتو سیفەتە بەجێ ناهێنێت ﴿إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا﴾ مەگین ئەوانەی خۆڕاگرن لەسەر ئازاری خەڵكیو بە چاكی مامەڵەیان لەگەڵ دەكەن هەرچەندە ئەوان بە

---

[1] احمد (٥/٢٤٣)، تحفة الأحوذي (٩/١٠٨).

[2] فصلت (٣٤-٣٥)، واتە: بە چاكترین شێوە وەڵامی (خراپە) بدەوە ئەوسا كەسێ كە لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەیە وەك دۆستێكی دڵسۆزو گیانی بە گیانی لێ دێت، بەم ئاستە ناگات كەسانێ نەبێت كە خۆڕادەگرنو بە ئارامن وە پێی ناگات مەگەر كەسێك خاوەنی بەشی هەرە گەورە بێت (لە پاداشت).

قسەی ناشیرینو خراپە وەلامیان دەدەنەوە ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ واتە: توشی نابێت مەگین کەسێك لە دنیاو ڕۆژی قیامەتدا بەختەوەر بێت. ﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکات کە هانا ببات بۆ خودا لە دنەدانی شەیاتینەکان، چونکە شەیاتین فێڵو خۆگونجان لەگەڵیان سوودی نیە هەرگیز بەرەو چاکە نایەن لە باسی هانابردندا (الاستعاذة) لە پێشەوە باسمان کرد کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: (هانا دەبەمە بەر خودای زۆر بیسەرو زانا لەشەیتانی نەفرینلێکراو– بێ بەش لە بەزەیی خودا – لە دنەدانیو لەخۆبایی کردنیو لە خەلافاندنی.[1] ﴿وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾ واتە: وە پەنات پێ دەگرم لەوەی (شەیتانەکان) ئامادە بن لام (سەرم لێ بشێوێنن). یانی: هانا دەبەم بە تۆ لە هەر شتێکدا کە من دەیکەم ئەی خودایە، بۆیە خوای گەورە فەرمانی داوە بە زیکری خودا لە سەرەتای کارەکانەوە بۆ دوورخستنەوەی شەیتان لە کاتی نان خواردنو سەرجێکەییکردن لەگەڵ هاوسەرو سەربڕینی مەڕو ماڵاتدا وە هەر شتێکی تر لەوانە. بۆیە ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوایە هانا بە تۆ دەبەم لە پیریو لە خنکانو بون بە ژێرەوە (الهدم)، وە هانا دەبەم بە تۆ لە دەست لێوەشاندنی شەیتان لەکاتی مردندا)[2].

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾

**خۆزگەو ئاواتی خوانەناسان لە کاتی گیان کێشاندا – مردندا –**

خوای گەورە باسی حاڵی کەسێکی خوانەناس دەکات لە کاتی گیان دەرچوونایەو خەریکە دەمرێتو زۆر سەرپێچی فەرمانی خودای گەورەی کردووە، کە داوای گەڕانەوە دەکات بۆ دنیا بۆ ئەوەی ئەو کارە خراپانەی کردوویەتی کاری چاکەی لەجێ بکات هەتا لە دنیادا بمێنێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ﴾ واتە: هەتا کاتی مردن دێت بۆ هەر کامیان ئەوسا دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بمگێڕەرەوە (بۆ دنیا)، بەڵکو کردەوەی چاك بکەم لەو تەمەنەی لە دەستم چووە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ

---

[1] أبو داود (٤٩٠/١).

[2] أبو داود (١٩٤/٢).

ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١١﴾﴾[1] وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَۗ أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ﴾[2]، وە فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي تَأۡوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ أَوۡ نُرَدُّ فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ﴾[3] وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾[4]، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾[5] وە فەرموویەتی: ﴿وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ﴾[6] وە فەرموویەتی: ﴿قَالُواْ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَٱعۡتَرَفۡنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلۡ إِلَىٰ خُرُوجٖ

---

[1] المنافقون (١٠-١١)، واتە: ببەخشن هێندێ لەو ڕۆزیانەی پێمان داون پێش ئەوەی مردن یەخە بە یەکێکتان بگرێت ئەوسا بڵێن: خوایە خۆزگە مردنی منت دوا بخستایە بۆ ماوەیەکی نزیك جا ماڵم ببەخشیایەو لە چاکان بوومایە، هەرگیز خوا هیچ کەسێك دواناخات (لە مردن) کاتێك کە وەختی هات وە خوا شارەزایە بەوەی کە دەیکەن.

[2] ابراهیم (٤٤)، واتە: وە (ئەی موحەمەد (ﷺ)) خەڵکی ئاگادار بکەو بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان دوامان بخە بۆ ماوەیەکی کەم تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوەو شوێنی پێغەمبەران بکەوین ئەی ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد کە هەرگیز لەناو ناچن.

[3] الاعراف (٥٣)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە سەرەنجامی (هەڕەشەکانی) بەدی دێت ئەوانەی لەوەپێش لە بیریان کردبوو دەڵێن: بە ڕاستی نێردراوەکانی پەروەردگارمان بە ڕاستیەوە هاتن، جا ئایا (ئەمڕۆ) تکا کارانێك بۆ ئێمە هەیە تکامان بۆ بکەن یا بگەڕێنرێینەوە بۆ دنیا تا کردەوەی چاك بکەین نەك ئەوەی دەمان کرد.

[4] السجدة (١٢)، واتە: ئەگەر دەبینی کاتێك (لە قیامەتدا) تاوانباران لە حوزوری پەروەردگاریاندا (لە خەجاڵەتیدا) سەریان داخستووە (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمانو بیستمان دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دنیا) تا کردەوەی چاك بکەین ،بە ڕاستی ئێمە دڵنیاین (لە قیامەت).

[5] الانعام (٢٧-٢٨)، واتە: وە ئەگەر بیان بینیت کاتێك لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێنراون کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیاو بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانی وە لە بڕواداران دەبووین، (نەخێر بە ڕاستیان نیە) بەڵکو ئەوەی کە لەوەوپێش دەیانشاردەوە بۆیان دەرکەوتووەو ئەگەر بگەڕێنرێنەوە (بۆ دنیا) بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدەغە کرابوو وە بە ڕاستی ئەوان درۆزنن.

[6] شوری (٤٤)، واتە: وە ستەم کارەکان دەبینی کاتێك سزای (خوا) دەبینن دەڵێن ئایا ڕێگەیەك هەیە بگەڕێینەوە بۆ دنیا.

مِن سَبِيلٍ ﴾،[1] وە فەرموویەتی: ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَـٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴾،[2] خودای مەزن باسی ئەوە دەكات كە خوانەناسان داوای گەڕانەوە دەكەن بۆ دونیا بەڵام وەڵامیان نادرێتەوە لە كاتی گیاندەرچوون‌و ڕۆژی زیندووبوونەوەدا كە دەوەستێنرێن لەبەر دەم خوای گەورەدا، وە لەو كاتەشدا كە دەخرێنە ناو ئاگر لە قوڵایی جەهەنەمدا جەزرەبە دەدرێن، وە لێرەشدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ ﴾، واتە: نەخێر بێگومان ئەمە تەنها وشەیەكە ئەو دەیڵێت، (كلا) وتەیەكە بۆ گەڕاندنەوەو پیاهەڵشاخان بەكاردێت – للردع والزجر – واتە: وەڵامیان نادەینەوەو داواكەیان قبوڵ ناكەین، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ قَآئِلُهَا ۖ ﴾ واتە: قسە بۆ خۆی دەكات كە داوای گەڕانەوە دەكات بۆ ئەوەی كرداری چاكە بكات، خۆ ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ دنیا كاری چاكە بكات درۆ دەكات كەوا ئەڵێت، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴾،[3] قەتادە دەڵێ: سوێند بە خوا بە تەمای ئەوە نیە بگەڕێتەوە بۆ ناو كەس‌و كارو عەشیرەتی وە بە تەمای ئەوە نیە سامان كۆ بكاتەوەو ڕابوێرێت، بەڵكو بە تەمای ئەوەیە كە بگەڕێتەوە فەرمانەكانی خوای گەورە بەجێ بێنێت، ڕەحمەتی خوای گەورە لە كەسێك ئەو كارەی كردووە كە خوانەناس ئاواتی بۆ دەخوازێت وەختێك كە جەزرەبە دەدرێت لەناو ئاگردا.

## بەرزەخ و سزای بەرزەخ

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ ئەبو صالح‌و كەسانی تریش لەم ئایەتەدا ﴿وَمِن وَرَآئِهِم﴾ وتویانە: واتە: لەپێشیانەوە،موجاهید دەڵێ: ﴿بَرْزَخٌ﴾ پەردەیەكەلە نێوان دنیاو قیامەتدا، محمدی كوڕی كەعب دەڵێ: لەمپەرێكە لە نێوان دنیاو قیامەتدا،نەئەوەیە لەگەڵ خەڵكی

---

[1] غافر (١١)، واتە: دەڵێن ئەی پەروەردگارمان تۆ دوو جارت مراندووین وە دوو جاریش ژیانت بەبەردا كردووین جا دانمان نا بە تاوانەكانماندا، دەی ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ دەربازبوون.

[2] فاطر (٣٧)، واتە: وە ئەوانە لە دۆزەخدا هاوار دەكەن (دەڵێن): ئەی پەروەردگارمان (لە دۆزەخ) دەرمان بێنە تا كردەوەی چاك بكەین جیاواز لەوەی دەمانكرد (وەڵام دەدرێنەوە): ئایا تەمەنمان درێژ نەكردن ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێت بیربكاتەوە تیایدا بیربكاتەوە وە ترسێنەرتان بۆ نەهات؟ دەی (ئەو سزا) بچەژن چونكە هیچ یاریدەدەرێك بۆ ستەمكاران نیە.

[3] الانعام (٢٨)، واتە: وە ئەگەر بگەڕێنرێنەوە (بۆ دنیا) بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو كارانەی كە لێیان قەدەغە كرابوو وە بە ڕاستی ئەوان درۆزنن.

دنیادان بخۆن‌و بخۆنەوە،وەنەئەوەشە لەگەڵ خەڵکی قیامەتدابن و لەسەر کردەوەکانیان پاداشت بدرێنەوە، ئەبو سەخر دەڵێ: بەرزەخ گۆڕستانە نە لە دنیادان‌و نە لە قیامەتیشدان،لەوێدا دەمێننەوە تا ڕۆژی زیندووبوونەوە،[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ﴾ ئەمە هەڕەشەیە لەو کەسانەی کەستەمکارن و لە گیاندانان‌و خەریکە دەمرن، واتە: جەزیەزەی بەرزەخیش لە پێشیانەوەیە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ﴾،[2] وە دەفەرمووێت: ﴿وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ﴾[3]، پاشان دەفەرمووێت: ﴿ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ واتە: بەردەوام جەزرەبەدەدرێن تا ڕۆژی زیندووبوونەوە. وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (بەردەوام جەزرەبە دەدرێن تێیدا)، واتە: لەناو زەمیندا[4].

﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾

**فووکردن بە کەڵشاخاو کێشانەی کردارەکان**

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کاتێك کە فوکرا بە کەڵەشاخدا، فوی زیندووبوونەوە، خەڵکی لە گۆڕەکانیان هەڵسانەوە، ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ واتە: خزمایەتی هیچ سودێکی نامێنێت‌و پرسیاری یەکتری ناکەن، باوك خەمی کوڕی خۆی ناخوات‌و نای لاوێنێتەوەو گوێی پێ نادات، خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ يُبَصَّرُونَهُمْ ۚ يَوَدُّ ٱلْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِى مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍۭ بِبَنِيهِ﴾[5]، واتە: کەس لە کەسی خۆی ناپرسێتەوە چاویشی لێیەتی، با ئەوەندە تاوانی زۆر بێت‌و پشتی نەوی کردبێت‌و وە ئەو کەسە بەڕێزترین‌و خۆشەویسترین کەسیش بووبێت لە لای لە دنیادا، لای لێ ناکاتەوەو بە ئەندازەی باڵی مێشوولەیەك

---

[1] الدر المنثور (٦/١١٦).

[2] الجاثية (١٠)، واتە: لە پێشیانەوە ئاگری دۆزەخە.

[3] ابراهيم (١٧)، واتە: لە دوای ئەوەش سزای سەخت (دەدرێت).

[4] تحفة الأحوزي (٤/١٨٣).

[5] المعارج (١٠-١١).

یارمەتی نادات، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ﴾[1]، ئیبنو مەسعود دەڵێ: کاتێك ڕۆژی قیامەت هات، خوای گەورە هەموو خەڵکی کۆدەکاتەوە لە یەکەمین کەسەوە تا دواهەمین کەس، پاشان جارچییەك جاڕئەدات کێ ناهەقیەکی پێکراوە با بێت هەقەکەی خۆی وەرگرێتەوە، دەڵێ: پیاو پێی خۆشەو هەقی هەبێت بەسەر باوکیەوە یان برایەوە یان خێزانیەوە با زۆر بچووکیش بێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە،[2] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ واتە: هەر کەسێك چاکەکانی قورستر بوو بەسەر خراپەکانیدا با بە یەك چاکەیش بێت، ئەم قسە قسەی ئیبنو عەباسە[3] ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ واتە: ئەوانە بەو کارەیان کە کردوویانە سەرکەوتوون‌و ڕزگاریان بووە لەو خراپەی کە لە دەستی ڕایان دەکرد، ﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾ واتە: ئەوەی خراپەکانی قورستر بوو لە چاکەکانی ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾ واتە: ئەوانە دۆڕاندوویانەو تیاچوون‌و زەرەرێکی زۆریان کردووە بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ واتە: دەمێننەوە لەناو جەهەنەمدا بە بەردەوامی‌و هەرگیز لێی دەرناچن‌و ناڕۆن ﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ واتە: (ئاگری دۆزەخ) دەم‌و چاویان دەسوتێنێت‌و هەموویان لەئاگری دۆزەخدا لێویان هەڵقرچاوەو دانەکانیان دەرکەوتووە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێك تردا فەرموویەتی: ﴿وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴾،[4] وە دەفەرموویت: ﴿ لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ﴾،[5] پاشان فەرموویەتی: ﴿وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەگوازێتەوە کەئەڵێ: (کالحون) واتە: ناشیرینن[6].

---

[1] عبس (٣٤-٣٦)، واتە: ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ ڕادەکات لە برای، و دایکی‌و باوکی، و ژنی‌و کوڕانی.

[2] الطبري (١٩/٧٢).

[3] الدر المنثور (٦/٤١٨).

[4] ابراهيم (٥٠)، واتە: دەم‌و چاویشیان ئاگر دایپۆشیوە.

[5] الانبياء (٣٩)، واتە: ئەگەر ئەوانەی کە کافرن بیانزانیایە (چ سزایەکی سەخت لەبەر دەمیاندایە) کاتێك ناتوانن بڵێسەی ئاگر لە دەم‌و چاوو پشتیان دوور بخەنەوە.

[6] الطبري (١٩/٧٤).

﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾﴾

**سەرزەنشتی خەڵکی ناو ئاگرو داننانیان بە بەدبەختی خۆیانداو داواکردنیان بۆ دەرچوون لە ئاگر**

ئەمە هەڕەشەو سەرزەنشتێکە لە لایەن خواوە لە خەڵکی ناو ئاگر لەسەر ئەو تاوانانەی کردوویانە لە خوانەناسیو گوناهو خراپەکاریو لاساری کە بووەتە هۆی زەلیلیو لەناوچوونیان، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾ واتە: ئایەتەکانی من لە دنیادا بەسەرتاندا نەدەخوێنرایەوە کەچی ئێوە بە درۆتان دەزانیو ئیمانتان پێ نەدەهێنا، واتە پێغەمبەرانم بۆ ڕەوانە کردنو کتێبیشم بۆ ناردنو هاوڕێنەی ئێوەشم زەلیل کرد، هیچ بەڵگەیەکتان بە دەستەوە نەما بیکەنە بیانوو و خۆتانی پێ دەرباز بکەن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾،[1] وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾،[2] وە فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾،[3] بۆیە ئەڵێن وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ﴾ واتە: دەڵێن ئەی پەروەردگاری ئێمە بەڵگەی تەواومان بۆ هات بەڵام ئێمە بەدبەختی ڕووی تێ کردین سەرمان لێ شێواو سەرمان بۆ دانەنەواندو شوێنی نەکەوتینو گومڕاو بێبەش بووین، پاشان وەك خوای گەورە دەفەرمووێت لەناو ئاگردانەپاڕێنەوەوئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ﴾ ئەی پەروەردگارمان لە دۆزەخ دەرمان بێنەو بمانگێڕەوە بۆ ژیانی دونیا ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە سەر ئەو کارانەی پێشوومان، ئەوان ئێمە ستەمکارینو هەقی خۆیەتی

---

[1] النساء (١٦٥)، واتە: بۆ ئەوەی خەڵکی بیانوی نەبێت بەسەر خواوە دوای (ناردنی) پێغەمبەران.

[2] الاسراء (١٥)، واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان).

[3] الملك (٨-١١)، واتە: هەرچەند دەستەیەك فڕێ بدرێنە ناویەوەو دەرگاوانەکانی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەکەن ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە (لە دنیادا)، دەڵێن: بەڵێ بۆمان هاتووە بەڵام بەدرۆمان دەزانیو دەمانووت (پێی): خوا هیچی نەناردووەتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان، وە دەڵێن: ئەگەر قسەی (پێغەمبەر)مان ببیستایە یا تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبووین، ئیتر پێیان نا لە گوناهەکەیان، کەوابوو دووری لە میهرەبانی خوا بۆ هاوڕێیانی دۆزەخ.

تۆڵەمان لێ بکرێتەوە. وەك خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِىَ ٱللَّهُ وَحْدَهُۥ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِۦ تُؤْمِنُوا۟ ۚ فَٱلْحُكْمُ لِلَّهِ ٱلْعَلِىِّ ٱلْكَبِيرِ﴾[1].

﴿قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾﴾

**وەڵامی خوای گەورەو دەمکوتکردنی خوانەناسان**

ئەمە وەڵامی خوای گەورەیە بۆ خوانەناسان کاتێك داوای لێ دەکەن لە ئاگر بێنە دەرەوەو بیانگێڕێتەوە بۆ ئەم ژیانەی دنیا، خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا﴾ واتە: بمێننەوە لەناو ئاگردا بە زەلیلیو سوكو ڕیسوایی ﴿وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ واتە: جارێکی تر ئەم داوایە دووبارە نەکەنەوە، وەڵامی ئێوە لای من نیە، عەوفی دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ ئەمە قسەی خوای ڕەحمانە کاتێك کە ئەوانە پەیوەندیان دەبڕێو قسەیان ناگاتە لای خوا.[2] ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە دەڵێ: خەڵکی جەهەنەم هاوار دەکەنە مالیك – مالك – چل ساڵ وەڵامیان ناداتەوە، پاشان وەڵامیان دەداتەوە ئەڵێ: ئێوە دەمێننەوە، دەڵێ: سوێند بە خوا داواکەیان لە لای مالیكو پەروەرندەی مالیك هیچ قورساییەکی نیە – بێ ڕێزە – پاشان دەپاڕێنەوە لە خوداو ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ﴾، دەڵێن: لێیان بێدەنگ دەبێت – وەڵامیان ناداتەوە – بە ئەندازەی دووجار لەتەمەنی دونیا پاشان وەڵامیان دەداتەوە ﴿ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾ دەڵێ: سوێند بە خوا دوای ئەوە ئیتر ئەوانە قسەیەك بە دەمیاندا نایەت، هەناسە دەدەنو وەری دەگرنەوە لە جەهەننەمدا، دەنگیان بە وێنەی دەنگی کەرە لە سەرەتاوە هەناسە دەدەن[3]و لە دوابیەکەیدا وەری دەگرنەوە.[1] پاشان خوای

---

[1] غافر (١١–١٢)، واتە: جا دانمان بە تاوانەکانماندانا، دەی ئایا ڕێگایەك هەیە بۆ دەربازبوون، ئەم سزایەتان لەبەر ئەوەیە کە بە ڕاستی هەر کاتێك خوا بە تاكو تەنهایی بپەرستراية ئێوە بێباوەڕ دەبوون وە ئەگەر هاوبەشی بۆ دابنرايە ئێوە باوەڕتان دەهێنا (بەو هاوبەش دانانە) بڕیاردان هەر بۆ خوای بڵندو بەرزو گەورەیە.

[2] الطبري (١٩/٧٩).

[3] الزهد لنهاد بن السرى (١/١٥٨).

گەورە تاوانەکانی دنیایان بیردێنێتەوە کە چۆن گاڵتەیان بە بەندە خاوەن باوەڕو دۆستەکانی کردووە، دەفەرموێت: ﴿ فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا ﴾ واتە: ئێوە هەر گاڵتەتان پێ دەکردن کاتێك ئەوان بە ترس‌و لەرزەوە لە من دەپاڕانەوە ﴿حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي ﴾ واتە: ئەوەندە ڕق‌و کینەتان لێیان بوو، وای لێکردن یادی منیان لە بیربردنەوە ﴿وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ﴾ واتە: ئێوە بەو کارە چاك‌و عیبادەتەی ئەوان پێدەکەنین. وەك خوای گەورە لەم ئایەتەی تردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ﴾[2] واتە: تیرو توانج‌و گاڵتەیان پێدەکردن. پاشان خوای گەورە باسی دۆست‌و پیاوچاکانی خۆی دەکات کە چۆن پاداشتی داونەتەوەو دەفەرموێت: ﴿إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ ﴾ واتە: وا من ئەمڕۆ پاداشتم دانەوە بەهۆی خۆگریانەوە لەسەر ئەوەی کە ئێوە ئازارتان دان‌و گاڵتەتان پێ دەکردن ﴿أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴾ واتە: خستماننە ڕیزی ڕزگاران‌و بوونە بەندەی بەختەوەری‌و هێمنی‌و بەهەشت‌و ڕزگاریان بوو لە ئاگری جەهەنەم.

﴿قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٍ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾

خوای گەورە بەندەکانی خۆی ئاگادار دەکاتەوە لەسەر ئەو تەمەنە کەمەی لە خوا پەرستیدا بەسەریان نەبردووەو بێ هودە تەواویان کردووە لە دنیادا، ئەگەر خۆڕاگر بوونایە لەو ماوە کەمەی ژیانی دنیادا ڕزگاریان دەبوو. وەك چۆن دۆستە لەخواترسەکانی ڕزگاریان بوو ﴿قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴾ واتە: خوا دەفەرموێت: چەندێ مانەوە لە دنیادا ﴿قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٍ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴾ واتە: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێك ماینەوە، پرسیار لەوانە بکەن کە سەرژمێری دەکەن، ﴿قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ واتە: خوا دەفەرموێت: ماوەیەکی زۆر کەم مانەوە بە هەموو پێوەرێك

---

[1] ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ واتە: بێگومان لە دنیادا کۆمەڵێك لە بەندەکانی من دەیان وت ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە دەی لێمان خۆش بەو ڕەحممان پێ بکە چونکە تۆ چاکترینی میهرەبانانی

[2] المطففين (٢٩-٣٠)، واتە: بێگومان ئەوانەی کە بەدکار بوون پێدەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هێنابوو، وە کاتێك کە بە لایاندا بڕۆیشتنایە چاویان لێ دادەگرتن.

﴿لَوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەگەر بتانزانیایە ڕێزی دنیایەکی کەم تەمەنتان نەئەدا بەسەر ژیانێکی نەبڕاوەو هەتاهەتاییدا. وە هەڵنەئەستان بەو کارە خراپانەی کە کردتان وە خواتان لە خۆتان نەدەڕەنجاندو بەر تورەیی نەدەکەوتن لەو ماوە کەمەی ژیاندا، ئەگەر ئێوەش خۆڕاگر بوونایە لەسەر خواپەرستیو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا وەك چۆن خاوەنباوەڕەکان پێی هەڵسان، ڕزگارتان دەبوو، وەك چۆن ئەوان ڕزگاریان بوو، ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە لە سەفوانەوە ئەویش لە ئەیفەعی کوڕی عەبدی کەلاعیەوە کە گوێی لێ بووە وتاری ئەدا بۆ خەڵکیو دەیگوت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (کاتێك خوای گەورە خەڵکی بەهەشتی خستە بەهەشتو خەڵکی ئاگریشی خستە ناو ئاگر پێیان ئەفەرموێت: ئەی خەڵکی بەهەشت چەند ساڵ لە زەمین مانەوە؟ ئەڵێن: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێك، دەفەرمووێت: چەندە بازرگانیەکی چاکتان کردووە لەو ڕۆژەدا یان کەمتر لەو ڕۆژە!.ئەوەدلۆڤانیو ڕەزامەندیو بەهەشتی منە تێیدا بمێننەوە هەتا هەتایەو لێی دەرناچن، پاشان دەفەرمووێت: ئەی خەڵکی ناو ئاگر چەند ساڵ لە زەمین مانەوە؟ ئێژن: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێك، پێیان دەفەرمووێت: چەندە بازرگانیەکی خراپتان کردووەو لەو ڕۆژەدا یان کەمتر لەو ڕۆژە!.ئەوە ئاگرو توورەیی منە تێیدا بمێننەوە هەتا هەتایە لێی دەرناچن)[1].

## خوای گەورە بەندەکانی بێهودە دروست نەکردووە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا﴾ واتە: ئایا وا دەزانن کە بە گاڵتە دروست کراون بەبێ ئارەزوو مەبەستی خۆتانو کارزانی ئێمە. گوتراوە: (للعبث) یانی گەمەو گاڵتە، واتە: یاری بکەنو ڕابوێرن وەك گیانەوەرەکانی تر چۆن وەدی هاتوون، نە پاداشتیان هەیەو نە سزایش دەدرێن، نەخێر، ئێوەمان دروست کردووە بۆ عیبادەت کردنو بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوای گەورە ﴿وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ واتە: واتان دەزانی ئێوە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ لامان لە ڕۆژی قیامەتدا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾،[2] واتە: ئاخۆ مرۆڤ وادەزانێ بە خۆڕایی وازی لێ دەهێنرێت، ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾ واتە: خوای گەورە پاکو بێ عەیبە لەوەی کە شت دروست بکات بە خۆڕاییو بێ هودە، چونکە ئەو پاشایەکی ڕاستو پایە بەرزە ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾ واتە: هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو کە پەروەردگاری عەرشی بەڕێزو بەرزە، باسی تەختی کردووە — العرش — کە سەری هەموو دروستکراوەکانە وەسفیشی

---

[1] اسد الغابة (١/١٨٧).

[2] القيامة (٣٦).

کردووە بە گەورە، واتە: شێوە جوانو شکل شیرین، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾،[1] واتە: بەهۆی ئەو (بارانەوە) لە زەویدا هەموو جۆرە ڕووەکێکی بە کەڵكو جوانمان ڕواند.

﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾ ﴾

## شەریك دانان بۆ خودا ناهەقیەکی زۆر مەزنە، بۆیە ڕزگاربوون بۆ موشریك نیە

﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ ﴾ خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە شەریکی بۆ دادەنێنو لەگەڵیدا دەیپەرستنو دەفەرموێت: ئەوەی شەریك بۆ خوا دەدەنێ هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە، ئەم ڕستەیە ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ ﴾ ڕستەیەکی موعتەرەزەیە وەڵامی مەرجەکە لەم ئایەتەی تردایە کە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ﴾ واتە: خوا موحاسەبەی دەکات لەسەر ئەوە، پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ واتە: بێگومان بێباوەڕان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕزگاریان نابێتو لەدەست دەرناچن. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾،[2] ئەمە ڕێ نیشاندانی خودای گەورەیە بۆ بەندەکانی بۆ ئەم پاڕانەوەیە (الغفر) کاتێ بە ڕەهایی مانا بکرێت واتە: سڕینەوەی گوناهو شارینەوەی لەسەر خەڵك (الرحمة) واتە: سەرکەوتنو ڕاستەڕێ گرتن لە کردارو گفتاردا.

## تەفسیری سورەتی (نور)

### لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَـٰهَا وَفَرَضْنَـٰهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَآ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾﴾

## گرنگی سورەتی نور

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَـٰهَا﴾ واتە: ئەمە سورەتێکە ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە ئاگاداری گرنگی تێدایە پێویستە لەبیری نەکەن ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت گرنگی بە سورەتەکانی تر

---

[1] لقمان (١٠).

[2] واتە: ئەی محمد (ﷺ) بڵێ ئەی پەروەردگارم لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکە وە تۆ چاکترینی میهرەبانانی.

نەدرێت ﴿وَفَرَضۡنَٰهَا﴾ واتە: فەرزمان کردووە. موجاهیدو قەتادە دەڵێن: واتە حەڵاڵو حەرامو فەرمانو قەدەغەو – ئەمرو نەهی – سنوورەکانمان ڕوون کردووەتەوە تێیدا،[1] بوخاری دەڵێ: هەرکەسێك بە﴿وَفَرَّضۡنَٰهَا﴾ خوێندوویەتیەوە،ئەڵێ: واتە: ئەم ئەرکە پێویستەمان خستووەتە سەر ئێوەو ئەوانەی دوای ئێوەش دێن.[2] ﴿وَأَنزَلۡنَا فِيهَآ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ﴾ واتە: چەند نیشانەی ئاشکراشمان ناردووەتە خوارەوە ﴿لَّعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾ بەڵکو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن.

**باسی تۆڵەی داوێنپیسی – زینا –**

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ﴾،[3] ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی حوکمی داوێنپیسی – زینا – و چۆنیەتی حەد لێدانی دەکات کە بە درێژی لێی دەدوێین، داوێنپیس – زیناکەر – یان کچو کوڕە کە شووی نەکردووەو ژنی نەهێناوە – بکر – یان ژنو پیاوە شووی کردووەو ژنی هێناوە – محصن – کە ئازادو باڵغو عاقڵە، ئەگەر ژنی نەهێنابوو یان شووی نەکردبوو – بیکر بوو – حەدەکەی سەد قەمچیە – جەڵدەیە – لەسەر ئەوەیشەوە ساڵێك دووردەخرێتەوە لە وڵاتەکەی خۆی، وەك لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە، لە ئەبو هورەیرەو زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیەوە لە بارەی ئەو دوو عەرەبە کۆچەریەوە کە هاتن بۆلای پێغەمبەری خودا (ﷺ) یەکێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم کوڕەی من ڕەنجبەری – کرێگرتەی – ئەم پیاوە بووە، داوێن پیسی لەگەڵ ژنەکەی کردووە لە باتی ئەوەدا کە کوڕەکەم کردوویەتی سەد مەڕو کەنیزەیەکم داوە، پاشان پرسیارم کرد لە خەڵکی زانا، پێیان گوتم: سەد جەڵدە لەسەر کوڕەکەتە لەگەڵ ساڵێك دوورخستنەوەو ژنەکەی ئەم پیاوەش ڕەجم دەکرێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە بڕیارتان بۆ دەدەم بە کتێبی خودای گەورە، کەنیزەکو مەڕەکان دەگەڕێتەوە بۆ تۆ کوڕەکەشت سەد جەڵدەی لێ دەدرێتو ساڵێك دووردەخرێتەوە، بڕۆ ئەی ئونەیس – پیاوێك بوو لە بنەماڵەی ئەسلەم – بۆ لای ژنی ئەم پیاوە ئەگەر وتی داوێنپیسی کردووە – دانی پێدانا– ڕەجمی بکە) ئونەیسیش ڕۆیشت بۆ لای ژنەکەو دانی نا بە داوێن پیسیەکەیداو بەردبارانی کرد،[4] ئەمە بەڵگەیە لەسەر دوورخستنەوەو سەد جەڵدە، ئەگەر کوڕ ژنی نەهێنابوو یان کچ شووی نەکردبوو، بەڵام ئەگەر پیاو بوو یان ژن – محصن – هاوسەرێتیان گرتبوو بە نیکاحێکی ڕاستو

---

[1] الطبري (٨٩/١٩) الدر المنثور (١٢٤/٦).

[2] فتح الباري (٣٠١/٨).

[3] واتە: ژنو پیاوی زیناکەر هەر یەکێکیان سەد دار (شەلاق)یان لێ بدەن.

[4] فتح الباري (٣٥٥/٥)، مسلم (١٣٢٤/٣).

تەواو ئازادو باڵغو عاقڵیش بوون، ئەوە بەردەباران – ڕەجم – دەکرێن، وەك ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردووە لە ئیمامی عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە هەڵساو سوپاسو ستایشی خوای گەورەی کردو پاشان گوتی: (أما بعد: ئەی خەڵکینە خودای گەورە محمدی (ﷺ) بە ڕاستی نارد، کتێبیشی پێدا ڕەوانە کرد یەکێ لەو ئایەتانە کە بۆی نارد ئایەتی بەردەبارانە – ڕەجم – خوێندمانەوەو باشیش لێی تێگەیشتین، پێغەمبەری خوا بەردبارانی کردوەو ئێمەش دوای ئەو کردوومانە، دەترسم ماوەیەك بەسەر خەڵکیدا بڕوات کەسێك بێژێت لە کتێبی خوا ئایەتی بەردباران – ڕەجم – نەبووە، بەهۆی وازهێنان لەو ئەرکە کە خودای گەورە ناردوویەتیە خوارەوە گومڕا بنو ڕێیان لێ تێك بچێت، بەردباران –ڕەجم– لە کتێبی خودا هەقە بۆ کەسێ کە داوێنپیسی کردبێت ئەگەر موحسەن بوو لە پیاوو ژندا، ئەگەر شایەت هەبوو یان سکی پڕبوو یان خۆی دانی پێدانا)،[1] بوخاریو موسلیم ئەم حەدیسەیان بەدرێژی هێناوە لە صەحیحەکەیاندا لە فەرموودەیەکی ئیمامی مالیکەوە، ئەمە بەشێکە لەو فەرموودەیە کە مەبەستەکەی ئێمەی تێدایە لێرەدا.[2]

### بەزەییتان نەبێت لەکاتی بەجێهێنانی حەددا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ واتە: لە حوکمی خودا بەزەیی نیە، واتە: بەزەیتان پیایاندا نەیەتەوەو سۆزتان بۆیان نەبێت لەبڕیارو شەرعی خودادا، بەڵام سۆزی سروشتی نەهی لێنەکراوە لەسەر بەجێهێنانی حەد، بەڵکو ئەو بەزەییەنەهی لێکراوە کە پاڵ بنێت بە فەرمانڕەواوە واز لەو بڕیاری حەدانە بێنێت، ئەوە بۆ ئەو فەرمانڕەوایە دروست نیە، موجاهید دەڵێ: ﴿وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ﴾ بەجێهێنانی سنوورەکانی– حودودەکانی–خودایە کاتێك کە بەرزدەکرێتەوە بۆ فەرمانڕەوا جێبەجێ دەکرێت و ناوەستێنرێت، هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتای کوڕی ئەبو ڕەباحەوە[3] لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (لەناو خۆتاندا لە یەکتری خۆش بن لە حودودا ئەوەی بگاتەلای من لەحەددا جێبەجێ دەکرێت لەسەری)[4] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە هەڵسن بەو کارەو سنوورەکانی – حودودەکانی – خودا جێبەجێ بکەن لەسەر ئەوانەی کە داوێنپیسی دەکەنو باش لێیان دەن بەڵام با زۆر گرانو توند نەبێت،

---

[1] موطأ (٢/٨٢٣).

[2] فتح الباري (١٣/١٤٨)، مسلم (٣/١٣١٧).

[3] البغوي (٣/٣٢١).

[4] أبو داود (٤/٥٤).

بۆ ئەوەی ئەو کەسانە واز بێنن‌و جارێکی تر بەو کارە هەڵنەسن، کەسانی تریش تەمێ‌و دەرس وەرگرن لێی، لە موسنەددا هاتووە لە هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە کە وتویانە: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من کاتێك کە مەڕێك سەردەبڕم بەزەییم پێدا دێتەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لەوەدا پاداشت بۆ تۆ هەیە)[1].

## حەددەکانی جێبەجێ بکەن لەبەرچاوی خەڵکی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: با کۆمەڵێك لە خاوەنباوەڕان ئاگاداری ئەو لێدانە بن، ئامادەبوونی ئەو خەڵکەو لێدانی لەبەر چاویان سوکایەتیکردنە بەو داوێنپیسانە، بۆ ئەوەی جارێکی تر نزیکی ئەو کارە بەدڕەوشتیە نەکەونەوەو دەرسێکی باشیشە بۆیان کە لەبەر چاوی ئەو خەڵکە ئابڕوویان دەچێت‌و سوکایەتیان پێ دەکرێت، حەسەنی بەسری لەم ئایەتەدا دەڵێ: ﴿وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: بە ئاشکرا لێیان بدرێت بەدیارچاوی خەڵکیەوە، پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً﴾ ئەمە هەواڵێکە لە لایەن خوداوە کە پیاوی داوێنپیس دەبێت هەر ژنی داوێنتەڕ بخوازێت، یان ژنی بتپەرست، واتە چونکە پیاوی داوێنپیسیش ژنی داوێنپیس نەبێت بۆی نالوێت‌و دەستی ناکەوێ، چونکە وەك خۆی تاوانبارو یاخیە، یان ژنێکی بتپەرست کە بە تاوانی نازانێ‌و ئاساییە بە لایەوە هەر بەو شێوەیەش ﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾ یان بتپەرست بێت کە باوەڕی بە حەرامبوونی نیە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەم کارە حەرامە بۆ خاوەنباوەڕان. واتە: خاوەنباوەڕ بۆی نیە کە ژنی داوێنتەڕ بخوازێت یان ژنی خاوەنباوەڕ بۆی نیە کە شو بکات بە پیاوی داوێنپیس‌و بەدڕەوشت. قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەییان دەڵێن: خوای گەورە ژنی داوێنتەڕی حەرام کردووە لەسەر خاوەنباوەڕ کە مارەی بکات،[2] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾،[3] وە فەرموویەتی: ﴿مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾،[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوای لێ بێت

---

[1] أحمد (٣٤/٥).

[2] الدر المنثور (١٢٧/٦).

[3] النساء (٢٥)، واتە: لە کاتێکدا ئەو کەنیزەکانە پاکداوێن بن داوێنپیس (و زیناکاری بە ئاشکرا) نەبن‌و دۆستیان نەبێت (بە نهێنی بۆ زینا کردن).

[4] النساء (٢٤)، واتە: (بە مەرجێك) کە داوێنپاك بن‌و داوێنپیس نەبن.

– کە پیاوێك لە خاوەنباوەڕان ئیزنی خواست لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ژنێك کە مارەی بکات پێیان دەگوت – ئومومەهزول کە داوێنتەڕ بوو گوتبووی بەخێویشی دەکات دەڵێ: داوای ئیزنی کرد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) یان باسی ئەو ژنەی بۆ کرد، گوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾،[1] ئیبنو ئەبی حاتمیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (داوێنپیسی دار لێدراو داوێنپیس ی وەك خۆی نەبێت ناخوازێت) ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردووە[2].

﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥﴾﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی حوکمی شەلاقی ئەو کەسە دەکات کە بوختانی بۆ ژنێکی داوێنپاك دەکات، واتە ژنێکی ئازادی باڵغی داوێنپاك، وە هەر پیاوێکیش کە بوختانی بۆ بکرێت، ئەو کەسەی کە بوختانەکە دەکات شەلاقی لێ دەدرێت، خۆ ئەگەر ئەو کەسەی کە قسەکە دەکات بەڵگەی بە دەستەوە بێت لەسەر قسەکەی، شەلاقەکەی لێ نادرێت بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾ واتە: وە ئەوانەی بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێنپاك لە پاشان چوار شایەت ناهێنن بوختانکەرەکە سێ بڕیاری بەسەردا دەسەپێنرێت، ئەگەر بەڵگەی نەهێنا لەسەر ئەو قسەیەی کە گوتوویەتی، یەکەم هەشتا (٨٠) شەلاقی لێ دەدرێت، دوەم: هەرگیز شایەتیشی لێ وەرناگیرێت، سێهەم: بەفاسیق و لەڕێلادەر دەژمێردرێتو بە(خاوەن عەدالەت) ڕاست دانانرێت نە لە لای خواو نە لە لای خەڵکی.

**باسی پەشیمان بوونەوەی – تەوبەی – بوختانچی**

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾،[3] ئەم ئیستیسنایە (الاستثناء) دەگەڕێتەوە بۆ ڕستەی یەکەمو دووهەم لە سێ بڕیارەکە، بە نیسبەت شەلاقەکەوەئەوە ڕۆیشتووەو بەسەرچووە، با تەوبەی کردبێت یان هەر جەخت لەسەر قسەی خۆی

---

[1] احمد (١٥٨/٢)، النسائي في الكبرى (٤١٥/٦).

[2] أبو داود (٥٤٣/٢).

[3] واتە: جگە لەوانەی کە دوای ئەوە تەوبە دەکەنو کردەوەیان چاك دەکەن ئەوسا بە ڕاستی خوا لێخۆشبووی بە بەزەیی یە.

بکات، هیچ بڕیارێکی بۆ نیە دوای ئەوە بەبێ ناکۆکی – بلا خلاف – ئەگەر تەوبەی کرد شایەتی قبوڵ دەکرێت، وە بڕیاری – حوکمی – لادەری لەسەر هەڵدەگیرێت، ئەمە قسەی سەعیدی کوڕی موسەیەبە– گەورەی تابعین – و کۆمەڵێك لە زانایانی پێشینە،[1] شەعبیو زەحاکیش گوتویانە: شایەتی قبوڵ ناکرێت ئەگەر تەوبەیشی کردبێت مەگین دانی پێدا بنێ کە ئەو بوختانەی کردووە ئەو کاتە شایەتیەکەی قەبوڵ دەکرێت،[2] والله أعلم.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٦ وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٧ وَيَدۡرَؤُاْ عَنۡهَا ٱلۡعَذَابَ أَن تَشۡهَدَ أَرۡبَعَ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٨ وَٱلۡخَٰمِسَةَ أَنَّ غَضَبَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَآ إِن كَانَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٩ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ ١٠ ﴾

**نەفرین کردن – اللعان –**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۭ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾[3]، ئەم ئایەتە دەروویەکی تیایە بۆ هاوسەرانو دەروازەیەکی چاکە کاتێك یەکێکیان تاوانی داوێنپیسی دایە پاڵ ئەوی ترو نەی دەتوانی بەڵگەی تەواوی لەسەر بێنێت، نەفرینی خوا لە خۆی دەکات ئەگەر درۆ بکات، وەك خوای گەورە فەرمانی پێکردووە، دەیهێنێت بۆ لای پێشەوا باسی ئەو کارە پیسە دەکات کە ژنەکەی پێی هەڵساوە دادوەریش چوارجار سوێندی دەدات بە خوا لە بری چوار شایەت ﴿إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ خودای لێ بە شایەت بگرێت کە لەو شایەتی دانەدا درۆ ناکات کە ئێژێ داوێن پیسی کردووە ﴿وَٱلۡخَٰمِسَةُ أَنَّ لَعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ واتە: با بۆ جاری پێنجەم بڵێ: ئەگەر ئەم قسەم درۆیە بەر نەفرینی خودا کەوم، ئەگەر ئەوەی گوت، لێی جیادەبێتەوە بەو نەفرین کردنە هەتا هەتایی لێی حەرام دەبێت، دەبێ مارەیشی بداتێ، ئەو کاتە تاوانی داوێنتەڕیەکە بەرەو ڕووی ژنەکە دەبێتەوە. سزای لە کۆڵ نابێتەوە هەتا ئەویش نەفرین دەکاتو چوار جار خودا بە شایەت بێنێتەوە کە مێردەکەی درۆ دەکات، بۆیە خوای گەورە

---

[1] الطبري (١٩/١٠٥).

[2] الطبري (١٩/١٠٣–١٠٨).

[3] واتە: ئەو (پیاوانە) بوختان بۆ خێزانەکانیان دەکەن وە بێجگە لە خۆیان هیچ شایەتێکیان نیە ئەوە شایەتی دانی هەریەك لەوانە (بەم جۆرەیە) کە چوار سوێند بە خوا بخوات کە بێگومان ئەو لە ڕاستگۆیانە.

فەرموویەتی: ﴿وَيَدْرَؤُا عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ ئەو کاتە ژنەکە لە سزادان ڕزگاری دەبێت کە چوار جار خودای بە شایەت گرت کە مێردەکەی لە درۆزنانە، ﴿وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ جاری پێنجەم ژنەکە دەڵێ: ئەگەر قسەی مێردەکەم ڕاست بێت، بەر غەزەبی خودا کەوم، بە زۆری پیاو بە لایەوە گرانە باسی ناموسی خۆی لەبەر دەم خەڵکیدا بکاتو تاوانی داوێنپیسی بداتە پاڵ خێزانی مەگین قسەکەی ڕاستە، بەڵام ناچارە، ژنەکەیش دەزانێت قسەی پیاوەکەی ڕاستە – گوتویەتی: داوێنپیسی کردووە – بۆیە جاری پێنجەم دەبێت بڵێت: بەر غەزەبی خوا کەوم ئەگەر قسەی مێردەکەم ڕاست بێت، ئەوەی بەر غەزەبی خوا دەکەوێت ڕاستیەکە دەزانێت بەڵام خۆی لێ لادەدات، پاشان خوای گەورە باسی سۆزو بەزەیی خۆی دەکات بەرامبەر بەندەکانی کە دەرگای لێ کردوونەتەوە لە کاتێکدا زۆر ناڕەحەتو بێ دەرەتانن‌و نازانن ڕوو لە کوێ بکەن‌و دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ﴾ واتە: ئەگەر سۆزو بەزەیی خوا نەبووایە ناڕەحەت دەبوون‌و زۆر شتیش بە لاتانەوە گران دەبوو بۆتان نەدەکرا ﴿وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: لێبوردەیە بەرامبەر بەندەکانی خۆی، هەرچەندە بەندەکانی سوێندی گەورەو گرانیش بخۆن دوای ئەوەیش خوای گەورە هەر لێبوردەیەو لە گوناه خۆش دەبێت ﴿حَكِيمٌ﴾ واتە: کارزانە لەو بڕیارانەی کە دەیداتو فەرمان دەدا کە بەجێی بهێنن، یان وازی لێ بێنن‌و مەیکەن، چەندین فەرموودە ڕیوایەت کراوە لە بارەی ئەم ئایەتەوەو چۆنیەتی کارپێکردنی، وە باسی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەو، وە لەسەر کام کەسێ لە هاوەڵەکان هاتووەتە خوارەوە.

**هۆی دابەزینی ئایەتی نەفرین کردن (اللعان)**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ ئەو کەسانەی بوختان بۆ ژنی داوێنپاك دەکەن، چوار شایەتیش ناهێنن، هەشتا شەلاقیان لێ بدەن، شایەتیشیان هەرگیز لێ قبووڵ مەکەن، ئەوانە لەڕێی خودا لایان داوە، سەعدی کوڕی عوبادە – کە سەرۆکی ئەنصاریەکان بوو – ڕەزای خوای لێ بێت –وتی: ئاخۆ ئەم ئایەتە بەم شێوەیە هاتووەتە خوارەوە؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی ئەنصاریەکان گوێتان لێ نیە سەرۆکەکەتان – گەورەکەتان – چی ئەڵێت؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لۆمەی مەکە چونکە پیاوێکی بە غیرەتە – ئازایە – سوێند بە خوا هەرگیز ژنێکی نەخواستووە کچ نەبێت، وە هیچ ژنێکی تەڵاق نەداوە، کەسێك لە ئێمە توانیبێتی مارەی بکات لەبەر ئازایی‌و غیرەتی، – واتە کەس زاتی نەبووە ژنی سەعد

مارە بكات كاتێ تەلاقی داوە، سەعد وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من چاك دەزانم ئەو ئایەتە هەقەو خودایش ڕەوانەی كردووە. بەڵام من سەرم سوڕماوە لەوەی من ژنێكی داوێنپیسم بینی ڕانی (لنگی) بە ڕانی پیاوێكەوە بێت، ناتوانم هیچی لێ نەكەمو دەستی لێ نەدەم، هەتا چوار شایەتی لەسەر دەگرم، سوێند بە خوا شایەتیان لەسەر ناگرم هەتا كاری خۆی تەواو دەكات، ئەوەندەیان پێ نەچوو تا هیلالی كوڕی ئومەیە هات، –كە یەكێك بوو لەو سێ كەسەی خوای گەورە تەوبەی لێ قبولْ كردن– لە كاتی عیشادا لە كێڵگەكەی گەڕایەوە، لە لای خێزانەكەی پیاوێكی دی، بە چاوی خۆی بینیو بە گوێی خۆی بیستی، خۆی ناڕەحەت نەكرد تا بەیانی ڕۆژ بووەوە – ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من هاتمەوە بۆ لای خێزانەكەم لە كاتی عیشادا، دیم پیاوێكی لە لایە،بە هەردوو چاوی خۆم بینیمو بە هەردوو گوێی خۆم بیستم، پێغەمبەری خوا پێی ناخۆش بوو ئەو هەواڵەی بۆ هێناو ناڕەحەت بوو لێی، ئەنصاریەكان لێی كۆبوونەوە وتیان: توشی ئەزموونی خۆمان بووین بەهۆی ئەو قسەوەكە سەعدی كوڕی عوبادە كردی. هەر ئێستا پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەلاق دەدات لە هیلالی كوڕی ئومەیە، شایەتیەكەی لەناو خەڵكیدا بەتاڵ دەبێتەوە، هیلال وتی: بە خوا من بەهیوام خوای گەورە دەرویەكم لێ بكاتەوە، پاشان هیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من دەبینم تۆ زۆر ناڕەحەتی لەسەر ئەوەی كە من بۆم باس كردیت! خودا خۆی دەزانێت من ڕاستگۆم، سوێند بە خودای گەورە پێغەمبەری خوا ویستی فەرمان بدات بە لێدانی، لەو كاتەدا خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەرەكەی ناردە خوارەوە، كاتێك كە وەحی بۆ بهاتایە هاوەڵەكانی بە گۆڕانی دەمو چاویان دەزانی، واتە: وازیان لێ هێنا هەتا وەحیەكەی لەسەر تەواو بوو، ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ أَزۡوَٰجَهُمۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ شُهَدَآءُ إِلَّآ أَنفُسُهُمۡ فَشَهَٰدَةُ أَحَدِهِمۡ أَرۡبَعُ شَهَٰدَٰتِۢ بِٱللَّهِ ﴾ وەحیەكە تەواو بوو لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (مژدەبێت ئەی هیلال خودا دەروازەو ڕێی دەرچوونی لە تۆ كردەوە) هیلال وتی: من خۆم بە هیوای ئەوە بووم لە پەروەردگاردەی مەزنی خۆم . پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بنێرن بە دوای ئەو ژنەدا) ناردیان بە دوایداو هات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایەتەكەی بەسەردا خوێندەوەو بۆی باس كردنو پێی وتن كە جەزرەبەی دواڕۆژ زۆر توندترە لە جەزرەبەی ئەم دنیایە، هیلال وتی: سوێند بە خوا، ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من ڕاستم كرد لەوەی كە وتم لە بارەیەوە ژنەكە وتی: درۆی كردووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (نەفرین لەیەكتركردنیان پێ بكەن) وترا بە هیلال: شایەتی بدە، ئەویش خودای كردە شایەت كە لەم بارەوە درۆ ناكات، لە جاری پێنجەمدا پێی وترا: ئەی هیلال لە خوا بترسە، چونكە جەزرەبەی دنیا سوكترە – هێواشترە – لە جەزرەبەی دواڕۆژ، ئەم كارە دەبێتە هۆی جەزرەبە دانت، وتی: بە خودا، خودا سزام نادات لەسەری وەك چۆن شەلاقی لێ نەدام لەسەری، لە جاری پێنجەمدا گوتی: بەر نەفرینی خوا كەوم

ئەگەر ئەم قسەیەم درۆبێت، پاشان بە ژنەکە وترا کە: چوار جار خوا بکە بە شایەت کە مێردەکەت درۆ دەکات، لە جاری پێنجەمدا پێی وترا لە خوا بترسە جەزرەبەی دنیا سوکترە لە جەزرەبەی دواڕۆژ، ئەم کارە دەبێتە هۆی جەزرەبە دانت، ماوەیەك وەستاو، خەریك بوو دان بە تاوانەکەیدا بنێت، پاشان وتی بە خودا ئابرووی هۆزەکەم نابەم، پاشان لە جاری پێنجەمدا وتی: ئەگەر قسەی مێردەکەم ڕاست بوو بەر غەزەبی خوا کەوم، پێغەمبەری خوا لێکی جیاکردنەوەو بڕیاریشی دا کە منداڵیان بە ناوی باوکیەوە بانگ نەکرێت، منداڵەکەیشی بە خراپ — حەرامزادە — ناونەبرێت، هەر کەسێك بوختان بۆ ئەو ژنەو منداڵەکەی بکات دەبێت حەدی — شەلاقی — لێ بدرێت، بڕیار درا لە لای مێردەکەی نەمێنێتەوە خۆراکیشی پێ نادرێت لەبەر ئەوەی بێ تەڵاقدان لە یەکتری جیابوونەتەوەو مێردەکەیشی نەمرووە. پاشان فەرمووی: (ئەگەر ئەو منداڵەی بوو، قژی گژو سوورو ڕەش تێکەڵاوو لاق باریك بوو ئەوە منداڵی هیلالە، وە ئەگەر بووی ئەسمەرو — گەنم ڕەنگ — لاشە گەورەو لاق زلو سمت — پشت — پان بوو، ئەوە ئەو کەسەیە تاوانەکەت داوەتە پاڵی)، وەختێك ژنەکە منداڵی بوو، منداڵێکی لاشە گەورەی ئەسمەری لاقزلی سمت پان بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەرلەبەر سوێند نەبووایە، ئەو کاتە لە نێوان منو ئەو ژنەدا شتێکی تر دەبوو)، واتە بە شێوەیەکی تر مامەڵەم لەگەڵ دەکرد، عیکریمە دەڵێ: لە دوای ئەوەئەوکوڕە بوویە ئەمیری میسرو بە ناوی دایکیەوە بانگ دەکراو بە ناوی باوکیەوە بانگ نەدەکرا،[1] ئەبو داودیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە،[2] بۆ ئەم فەرموودەیە نموونە زۆرە لە صەحیحەکانو شوێنی ترشیدا، لە چەند ڕووەوە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾﴾

**فەرموودەی بوختانەکە (الافك)**

ئەم دە ئایەتە هەموو لەسەر دایکی موسڵمانان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتە خوارەوە کاتێك دووڕووەکان ئەو بوختانەیان هەڵبەستو ئەو درۆ گەورەیان کرد، خوای گەورە هاتە جواب لێیان دەمکوتی کردنو پشتیوانی لە عائیشەو پێغەمبەرەکەی خۆی کرد (ﷺ) قورئانی نارده خوارەوە پاك داوێنی عائیشەی ڕاگەیاند ئابرووی پێغەمبەرەکەی پاراستو فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾ واتە: ئەوانەی ئەو بوختانەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان، واتە: یەكو دوو کەس نەبوون بەڵکو کۆمەڵێك بوون، یەکەم کەسێ کە بەر ئەو نەفرینە کەوت عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی

---

[1] احمد (١/٢٣٨).

[2] أبو داود (٢/٦٨٨).

سەلول بوو سەرۆکی دووڕووەکان، چونکە ئەو درۆکانی کۆدەکردەوەو بڵاوی دەکردەوە بەناو خەڵکیدا تا وای لێ هات هەندێ لە موسڵمانانیش پێوە گلانو باسیان دەکردو هەندێکی تریشیان بە دروستیان دەزانی، ئەم دەنگو باسە درێژەی کێشا هەتا ماوەی مانگێك تا قورئان هاتە خوارەوە. وەك باسەکە بە تەواوی لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زوهریەوە دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەیبو عوروەی کوڕی زوبەیرو عەلقەمەی کوڕی وەقاسو عوبەیدالله کوڕی عبدالله ی کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود هەواڵیان دامێ لە فەرموودەکەی عائیشە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)وەکاتێك کە بوختانچیەکان بوختانەکەیان بۆ هەڵبەست، خوای گەورە پاکی عائیشەی ڕاگەیاند، هەموویان ئەو فەرموودانەی لایان بوو بۆیان گێڕامەوە، هەندێکیان باشتریان دەگێڕایەوەو چاکتر وەریان گرتبوو، منیش چاك تێگەیشتم لێیان لەو فەرموودەیەی کە بۆیان گێڕامەوە لە عائیشەوەو هەندێکیان ڕاستی یەکتریان دەسەلماند، باسیان کرد: کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) خێزانی پێغەمبەر (ﷺ)فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك بچوایە بۆ سەفەرێك لە نێوان ژنەکانیدا قورعەی ڕائەکێشا، هەر کامێکیان قورعەکەی بۆ دەربچووایە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، عائیشە ئەڵێت: لە یەکێك لە غەزاکاندا قورعەی بۆ کردینو قورعەکە بۆ من دەرچوو، لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووم، ئەمە دوای دابەزینی ئایەتی خۆداپۆشین – الحجاب –بوو، منیش لەوسەفەرەدا لەناو کەژاوەدا سواردەکرامو دادەبەزێنرام، تا پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزاکەی گەڕایەوە بۆ مەدینەو لە مەدینە نزیك بووینەوە شەوێ فەرمانی دا کە بارکەن وبکەونەڕێ، کە فەرمان درا بە بارکردن هەڵسام بۆ دەرکردنی پێویستی خۆم –قەزای حاجەت– ڕۆیشتم تا لە لەشکرەکە تێپەڕ بووم، کە پێویستی خۆم تەواو کرد گەڕامەوە بۆ لای بارخانەکەمەوە کە دەستم دا لە سنگم ملوانکەکەم پچڕابووەوە، ملوانکەکەیشم لەبەردی زەفار بوو گەڕامەوە کە بۆ ملوانکەکەم بگەڕێم، بۆی گەڕام درەنگی پێ خستم، ئەوانەی کە کەژاوەکەی منیان لە وشترەکە ئەنا هاتن کەژاوەکەیان هەڵگرتو نایانە سەر وشترەکەی کە سواری ئەبووم، وایان زانی کە لەناو کەژاوەکە دام، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەو وەختە ژنان سووك بوون، گۆشت قورسی نەکردبوون، هەر بە ئەندازەی نەمرو نەژی کەمیان دەخوارد، قورسیو سوکی کەژاوەکە کە هەڵیان گرتو نایان لە وشترەکە بە لایانەوە ئاسایی بوو، من ئەو وەختە کچێکی تازەساڵ بووم، واتە: منداڵ بوومو قورس نەبووم، وشترەکەیان هەڵساندو ڕۆیشتن کە لەشکرەکە کەوتەڕێ ملوانکەکەم دۆزیەوەو هاتمەوە بۆ جێی لەشکرەکە، نە بانگکەری لێ بوو نە جوابدەرەوە، چوومەوە ئەو جێیەی کە لێی بووم، وا تێگەیم کە بۆم دەگەڕێنو دێن بە شوێنمدا، لەو وەختەدا کە لە جێگەکەی خۆمدا دانیشتبووم خەو گرتمیو نوستم، سەفوانی کوڕی موعەتەلی سەلەمی زەکەوانی لەدوای لەشکرەکەوە لە کۆتایی شەوا لێی نوستبوو، لە کۆتایی شەودا دەستی دایە ڕۆیشتن، لای

شوێنەکەی منەوە ڕۆژی لێ بووەوە، تارمایی کەسێکی نوستووی بەدی کرد، هات بە لامەوە کە چاوی پێم کەوت ناسیمیەوە، لە پێشی ئەمەدا کە ئایەتی خۆداپۆشین دانەبەزیبوو منی دیبوو بە (إنا لله وإنا الیه راجعون)ی ئەو خەبەرم بووەوە، ڕووی خۆمم بەو لیباسەی –جلانەی– لەبەرمدا بوو داپۆشی، سوێند بە خوا کەلیمەیەك قسەی لەگەڵ نەکردم، وتەیەکیشم لێ نەبیست جگە (إسترجاع)ەکەی تا وشترەکەی ییخ داو پێی نا بەسەر دەستی وشترەکەداو سواری بووم، سەری وشترەکەی ڕاکێشا تا هاتینە ناو لەشکرەکەوە لە وەختی گەرمای نیوەڕۆدا، بۆ حەسانەوە باریان لێ خستبوو، ئیتر ئەوەی لە بارەی منەوە تیاچوو تیاچوو – واتە تووشی ئەو بوختانە گەورە بوو ماڵی وێران بوو – ئەو کەسەی کە زۆر بوختانەکەی گەورە کرد عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی دووڕوو بوو – موناڤ بوو –. هاتینەوە مەدینە، کە گەیشتینە مەدینە مانگێك نەخۆش کەوتم، خەڵکی هەر باسی ئەو بوختانەیان دەکرد کە ئەو بوختانچیانە هەڵیان بەستبوو، منیش هەواڵم لە هیچ نەبوو، هەر ئەوەندەی منی دەخستە گومانەوە لە نەخۆشیەکەمدا ئەو سۆزەی کە لە پێغەمبەرم (ﷺ) دەدی کە نەخۆش بوومایە ئەمجارە لێم نەدی، ئەوەندە نەبێت دەهاتە لام سەلامی دەکردو دەیفەرموو: نەخۆشیەکەتان چۆنە؟ ئەوە گومانی بۆ دروست دەکردم، هەستم بە خراپە – شەڕ – نەدەکرد، تا لە دوای ئەوە کە نەخۆشیەکەم بەرەو چاك بوونەوە چوو، هێشتا تەواو چاك نەبووبوومەوە، چوومە دەرێو ئوموموستەحیش لەگەڵمدا هات بۆ مەناسیح کە شوێنێکە لە دەری مەدینە، ئەو شوێنە جێی چوونە سەر ئاومان بوو، هەر شەواوشەو دەچووینە دەرێ بۆ سەراو، ئەوە لە پێش ئەوەدا بوو کە لە نزیك ماڵەکەماندا سەراوێك – ئاودەست خانەیەك – دروست بکەین، هەر وەك عەرەبی پێشوو وابووین، کە پێمان ناخۆش بوو ئاودەستخانەیەك لە نزیك خانووەکانمانەوە دروست بکەین، منو ئوموموستەح لێمان داو ڕۆیشتین، ئومو موستەح کچی ئەبو ڕوهمی کوڕی موتەلیبی کوڕی عبدالمناف بوو، دایکی موستەح کچی سەخری کوڕی عامیر بوو، پووری خوشکی دایکی – ئەبو بەکری سدیق بوو (ڕەزای خوای لێ بێت) ناوی ئومو موستەح سەلما بوو، کوڕەکەی کە موستەحە کوڕی ئەساسەی کوڕی عوببادەی کوڕی موتەلیب بوو – لە دوای قەزای حاجەت – منو کچی ئەبو ڕوهم ڕوومان کردە ماڵەوە، ئومو موستەح پێی هەڵکەوت لەو جلەی لەبەریدا بوو، گوتی: دەك ملی موستەح بشکێ! پێم گوت: چ شتێکی خراپت گوت! بۆ جوێن ئەدەی بە پیاوێك کە لە غەزای بەدردا بووبێت؟ گوتی: ئەی فڵانە بۆ تۆ نەتبیستووە کە چی گوتووە؟ گوتم: چی گوتووە؟ گوتیو هەواڵی ئەو خەڵکە بوختانچیانەی بۆ گێڕامەوە، نەخۆشی لەسەر نەخۆشیەکەم زیادی کرد،کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە لام سەلامی کرد، لە دوای سەلام فەرمووی: ئەوە چۆنە؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیزنم دەدەی بچمە لای دایكو باوکم؟ عائیشە دەڵێ: ئەو کاتە ئیزنی دام، چوومە لایانو بە دایکم گوت: ئەی دایکە خەڵکی باسی چی

دەکەن؟ گوتی: ئەی کچی خۆم خۆت ناڕەحەت مەکە، سوێند بە خوا، کەم وابووە کە ژنی جوان لای پیاوێ بووبێت‌و ئەو پیاوە ئەو ژنەی خۆش بووێت‌و هەوێی زۆری ببێت‌و قسەی زۆری لە بارەوە نەکەن، عائیشە وتی: وتم (سبحان الله) بۆ خەڵکی لەمە دەدوێن؟ دەڵێ: ئەو شەوە تا ڕۆژوو بووەوە هەر گریام فرمێسکم نەدەنیشتەوە، خەو نەچووە چاوم، ڕۆژیشم لێ بووەوە هەر دەگریام، پێغەمبەری خوا(ﷺ) عەلی کوڕی ئەبو تالیب‌و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کرد (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەو وەختەدا کە وەحی وەستابوو نەدەهاتە خوار، گفتوگۆی لەگەڵ کردن لە بارەی جیاکردنەوەی خێزانیەوە لە خۆی. عائیشە گوتی: ئوسامە لە بارەی پاکی خێزانی پێغەمبەرو (ﷺ) بوونی ئەو خۆشەویستی‌و ڕاستیەی کە لەگەڵیاندا هەیەتی ئەوەی دەیزانی گوتی بە پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەوانە ئەهلی خۆتن، ئێمە لە بارەیانەوە جگە لە چاکە هیچی تر نازانین، عەلی کوڕی ئەبو تالب گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خودا ژنی لێ قات نەکردووی. جگە لەو ژن زۆرە، واتە دڵی خۆت ناڕەحەت مەکە، گومانت لێی هەیە تەلاقی بدەو یەکێکی تر بهێنە، عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا بەریدەی بانگ کرد لێی پرسی: ئەی بەریدە تۆ هیچت لە عائیشە دیووە لێی بکەویتە گومانەوە؟ بەریدە گوتی: سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە هەق ناردووە هیچ شتێکم لێ نەدیوە لێی کە چاوپۆشی لێ بکەم. جگە ئەوە کە کچێکی – جاریەیەکی – تازە ساڵەو دەخەوێت‌و ئاگای لە هەویریماڵەوە نامێنێت‌و بزنی ناوماڵ دێن‌و هەویرەکەی دەخۆن عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا لەسەر مینبەر ڕاوەستاو داوای مەعزەرەتی کرد لە خەڵکی لە عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول‌و موحاسەبەی بکات، چونکە بوختانی بۆ عائیشە کردووە، لەسەر مینبەر فەرمووی: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان کێ پۆزشم بۆ دەکات دەربارەی پیاوێك کە ئێش‌و ئازاری ئەوم بەرامبەر ئەهل‌و بەیتم پێگەیوەتەوە؟ سوێند بە خوا، جگە لە چاکە بەرامبەر بە خێزانەکانم هیچی ترم نەدیوە، بوختانیان بۆپیاوێکیش کردووە جگە لە چاکە لەو پیاوە هیچ خراپەیەکی لێ نەبینیوە، لەگەڵ خۆمدا نەبێت نەهاتووەتە ماڵی ئێمەوە، سەعدی کوڕی موعاز هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) من داوای پۆزشت لێ دەکەم، ئەگەر ئەو پیاوە لە ئەوس بێت لە گەردنی ئەدەین، ئەگەر لە برادەرانی خەزرەخیشمان بێت. فەرمانمان پێ دەکەی فەرمانەکەت بەجێ بێنین، عائیشە دەڵێ: سەعدی کوڕی عوبادە کە سەرۆکی خەزرەج بوو هەڵساو – سەعدی کوڕی عوبادە پیاوێکی چاك بوو – بەڵام سۆزی خزمایەتی هەڵەیەکی پێکرد بە سەعدی کوڕی مەعازی گوت: سوێند بە خوا نایکوژین‌و ناتوانی بیکوژی، لە دوای ئەوە ئوسەیدی کوڕی حوزەیر کە ئامۆزای سەعدی کوڕی مەعاز بوو هەڵساو بە سەعدی کوڕی عوبادەی گوت: درۆت کرد، سوێند بە خوا دەیکوژین، بە ڕاستی تۆ دوو ڕوویت، بەرگری لە دووڕووان دەکەیت، ئەوس‌و خەزرەج پەلاماری یەکتریان دا کە بە گژ یەکدا بچن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر مینبەرەکەی ڕاوەستابوو هەر خەریك بوو

ئارامی دەکردنەوە تا بێدەنگ بوون‌و ئەویش بێدەنگ بوو، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ئەو ڕۆژە هەر گریام فرمێسکم نەدەنیشتەوەو خەو نەدەچووە چاوم، شەوی دوایش هەر گریام‌و فرمێسکم نەئەنیشتەوەو خەو نەدەچووە چاوم، دایك‌و باوکم وایان زانی کە گریان جەرگم لەت دەکات، لەو وەختەدا کە ئەوان لام دانیشتبوون‌و منیش دەگریام ژنێك لە ئەنساریەکان ئیزنی خواست کە بێت بۆ لام، منیش ئیزنم داو هات دانیشت‌و دەگریا، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کە ئێمە بەو حاڵەوە بووین، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات‌و دانیشت، لەو ڕۆژەوە بوختانەکەم بۆ هەڵواسرابوو لەلامدا دانەنیشتبوو، مانگێك تێپەڕی لە بارەی منەوە هیچ وەحی نەهاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە هات دانیشت‌و شایەتومانی هێناو لە دواییدا فەرمووی: أما بعد: ئەی عائیشە لە بارەی تۆوە ئەوەو ئەوەم پێگەیشتووە، ئەگەر بەری بیت لە خودا تەبریەت دەکات – ئەگەر پاك بیت خوا پاکیەکەت ڕادەگەیەنێت – ئەگەر گوناهێکیشت کردبێت داوای لێخۆشبوون بکە لە خوداو تەوبەی لێ بکە، چونکە بەندە کە دانی بە تاوانەکەی خۆیدا نا، تەوبەی کرد خوا تەوبەکەی لێ قبوڵ دەکات، کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەکەی تەواو کرد فرمێسکەکەم نیشتەوە، بە شێوەیەك نەما هەستم بە دڵۆپێك نەدەکرد کە لێی بێتە خوارێ، عائیشە گوتی: بە باوکم گوت: بابە لە باتی من تۆ وەڵامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدەرەوە، باوکم گوتی: سوێند بە خوا نازانم چی وەڵامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدەمەوە، عائیشە گوتی: بە دایکم گوت تۆ وەڵامی پێغەمبەر (ﷺ) بدەرەوە، دایکم گوتی: سوێند بە خوا نازانم چی وەڵامی پێغەمبەر (ﷺ) بدەمەوە، عائیشە گوتی: من کچێکی منداڵ بووم لە قورئان زۆر شارەزا نەبووم، گوتم: سوێند بە خوا دەزانم کە ئێوە ئەمەتان بیستووە تا لە دڵتاندا جێگیر بووە، بە تەواوی چەسپیووەتە دڵتان، بڕواتان پێ کردووە، ئەگەر بڵێم: من بێ تاوانم، –خودایش دەزانێ من بێ تاوانم– ئێوە بڕوام پێ ناکەن، ئەگەر دانیش بنێم بە شتێکدا – کە من ئاگام لێی نیە – خودایش ئاگادارە کە من بێ تاوانم، ئێوە باوەڕم پێ دەکەن، سوێند بە خوا من هیچ نموونەیەك بۆ ئێوەش‌و خۆیشم نابینم جگە لە نموونەی باوکی یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) گوتی: کارو فەرمانی من لە بارەی یوسفەوە هەر خۆڕاگرتنە، هەر خودایە کە هانای پێ ببرێت لەسەر ئەو شتە کە ئێوە ئەیلێن: ﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾[1] لە دوای ئەوە وەرگەڕام‌و لەسەر جێگەکەم ڕاکشام، عائیشە دەڵێ: سوێند بە خوا ئەو کاتە دەمزانی کە من بێ تاوانم، دەشمزانی خوای گەورە لەبەر بێتاوانی من لەو بوختانە ڕزگارم دەکات، بەڵام سوێند بە خوا وام نەدەزانی کە خوای گەورە لە بارەی منەوە وەحی – نیگا –

---

[1] یوسف (١٨)، واتە: (وتی جا ئارام دەگرم) بە ئارام گرتنێکی چاك‌و پەسند خواش یارمەتی دەرمە لەسەر ئەوەی باسی دەکەن.

ڕەوانەبکاتو بخوێنرێتەوە، وە من خۆم بە کەمتر دەزانی کە خوای گەورە لە بارەی منەوە قسەیەکی وا بفەرمووێتو بخوێنرێتەوە، بەڵام بەهیوابووم کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خەودا خەوێ ببینێتو بەو خەوە بێتاوانیم دەربخات، عائیشە گوتی: سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە جێگەی خۆی نەجوڵاو هیچ کەسیش لە ئەهلو بەیتی نەچووە دەرێ تا خوای گەورە وەحی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەندە ناڕەحەت دەبوو لە کاتی دابەزینی وەحیدا، تا وای لێدەهات لە ڕۆژی ساردی زستاندا لەبەر گرانی ئەو قورئانەی کە ڕەوانە دەکرا بۆی وەك مرواری — دور — عەرەقی لێ دەهاتە خوارێ، ئەم جارەیش گرتی. کە ئەو ناڕەحەتیەی لەسەر لاچوو پێکەنی یەکەم قسەیەك کە کردی ئەوە بوو فەرمووی: مژدە بێت ئەی عائیشە بە ڕاستی خودا بێتاوانی تۆی ڕاگەیاند، عائیشە ئەڵێ دایکم پێی وتم: هەڵسە بچۆرە لای، گوتم: سوێند بە خوا ناچمە لایو غەیری خوا سوپاسو ستایشی هیچ کەس ناکەم، هەر خوایە کە بێتاوانی منی ڕاگەیاندەوە، عائیشە گوتی: خوای گەورە ئەم دە ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾، هەمووی بێتاوانی منی تێدا ڕاگەیاند، پاشان عائیشە دەڵێ: ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) لەبەر خزمایەتیو هەژاری میستەح (مسطح) یارمەتیو بژێوی میستەحی دەدا، گوتی: سوێند بە خوا ئیتر یارمەتیو کۆمەکی میستەح نادات لەبەر خاتری خزمایەتیو هەژاری. دوای ئەوەی ئەو بوختانەی بۆ عائیشە هەڵبەست،ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) گوتی: من زۆر حەز دەکەم خودا لێم خۆش بێت، یارمەتیەکەی گەڕاندەوە بۆ میستەح، کە وەختی خۆی بۆی

دەنارد، پاشان گوتی: سوێند بە خوا هەرگیز ئیترئەو موچەیەی لێ ناگرمەوە، عائیشە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لە زەینەبی کچی جەحش کرد – خێزانی پێغەمبەر – لە بارەی منەوە، فەرمووی: (ئەی زەینەب چیت زانیووەو چیت دیوە لە عائیشە) زەینەب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چاوو گوێی خۆم لەوە دەپارێزم، سوێند بە خوا جگە لە چاکە هیچی تر نازانم، عائیشەئەڵێ: لە خێزانەکانی پێغەمبەر تەنها ئەو بوو کە وەك من وابێتو جوانو خاوەن پلە بێت لە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆیم بەسەردا هەڵبرێت، بە هۆی خواناسیو لە خواترسیەوە خوای گەورە پاراستی لەو بوختانەو تووشی نەبوو، حەمنەی کچی جەحش کە خوشکی ئەو بوو، کەبەردەوام شەڕی لەسەر دەکرد لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە تیاچوون، ئیبنو شەهاب دەڵێ: ئەمە کۆتایی ئەو ڕووداوە بوو لە بارەی ئەو تاقمەوەوتراوە،[1] بوخاری و موسلیمیش ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە لە صەحیحەکانیاندا لە فەرموودەکەی زوهرییەوە[2]، هەر بەم شێوەیەش ئیبنو ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە زوهریەوە.[3] هەر بەو شێوەیە دەڵێ: یەحیای کوڕی عەبدی کوڕی عبدالله ی کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە لە باوکیەوە ئەویش لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وە عبدالله ی کوڕی ئەبو بەکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمی ئەنصاریەوە لە عومرەتەوە، ئەویش لە عائیشەوە بۆی گێڕاومەتەوە بەو شێوەیەی کە لە پێشەوە باسمان کرد، والله أعلم، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلۡإِفۡكِ﴾ واتە ئەوانەی کە درۆو بوختانەکەیان هەڵبەست ﴿عُصۡبَةٞ مِّنكُمۡ﴾ واتە: کۆمەڵێك بوون لە خۆتان، ﴿لَا تَحۡسَبُوهُ شَرّٗا لَّكُمۖ﴾ واتە: ئەی ئالی ئەبو بەکر وا مەزانن بۆ ئێوە خراپ دەبێت ﴿بَلۡ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۚ﴾ واتە: بەڵکو بۆ ئێوە چاك بووە لە دونیاو لە ڕۆژی قیامەتدا، ڕاستگۆیی ئێوە دەردەخات لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا پلەی بەرزو بەڕێزە بۆتان، کە خوای گەورە ڕێزی لە عائیشە گرت (دایکی موسڵمانان) ڕەزای خوای لێ بێت لەو کاتەدا قورئانی ناردە خوارەوە بێتاوانی ئەوی ڕاگەیاند لە قورئانی پیرۆزدا، ئەو قورئانەی کە ﴿لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦ﴾،[4] بۆیە کاتێك ئیبنو عەباس چووە لای لە کاتی مردنیدا پێی گوت: مژدە بێت بۆ تۆ کە خێزانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)و خۆشی دەویستی، جگە لە تۆش کچی

---

[1] احمد (١٩٤/١).

[2] فتح الباري (٣٠٦/٨)، مسلم (٢١٢٩/٤).

[3] إبن هشام (٣٠٩/٣).

[4] فصلت (٤٢)، واتە: بەتاڵ ڕووی تێ ناکات نە لە ئێستاو نە لە دواڕۆدا (نە بە لێ کەمکردنو نە بە لێ زیادکردن).

ئەهێناوە بێتاوانی تۆش لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە.[1] ﴿لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ﴾ واتە: هەر کەسێك لەوانە کە لەو بارەیەوە قسەیان کردو ئەو بوختانەیان هەڵبەست بۆ دایکی موسڵمانانو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو قسە ناشرینەیان بڵاوکردەوە بەشێکی گەورەیان هەیە لەو جەزرەبەیەدا ﴿وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ﴾ وتراوە: ئەوەی یەکەمجار ئەو بوختانەی هەڵبەست، وتراویشە: ئەو کەسەی دەگەڕا بە شوێن ئەو بوختانەداو کۆی دەکردەوەو بڵاوی دەکردەوە بەناو خەڵکیدا ﴿لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: جەزرەبەی گرانو گەورە بۆ ئەو کەسەیە ئەو بوختانەی هەڵبەست کە عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە بەر نەفرینی خوا کەویێو ڕووی ڕەش بێت.

﴿لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُواْ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُواْ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُوْلَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾﴾

**دەرس دادانی خاوەنباوەڕان لەسەر بڵاوکردنەوەی بوختان هەڵبەستن**

ئەمە دەرس دادانو ئامۆژگاریەکی گرنگ بوو خوای گەورە لەم بەسەرهاتەی عائیشەدا (ڕەزای خوای لێ بێت) پێشانی خاوەنباوەڕانی دا، کاتێك کە هەندێکیان ڕۆچوون لەو کارە خراپەداو خۆیان تلاند بەو بوختانەوە کە هەڵبەسترابوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّوْلَآ﴾ واتە: چاکتر نەبوو بۆ خاوەنباوەڕان ﴿إِذْ سَمِعْتُمُوهُ﴾ واتە: کاتێك کە گوێیان لەو قسەیە بوو کە هەڵبەسترا بۆ دایکی موسڵمانان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) ﴿ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا﴾ واتە: بەباشی لێکیان بدایەتەوە بۆ خۆیان خۆ ئەگەر ئەو کارە بۆ ئەوان ناشێتو خراپەو شایانی ئەوان نیە، دیارەو ڕوونە کە زۆرترو زیاتر شایانی دایکی موسڵمانان نیە،ئەڵێن:کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە خوای گەورە باسی ئەو کەسانەی کرد کە بوختانەکەیان هەڵبەست: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ﴾ کە حەسانو هاوەڵەکانی بوون ئەوانەی کە ئەو قسانەیان دەکرد، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ واتە: بۆچی هەر کاتێك ئەو قسەیان بەرگوێ کەوت بە چاکیان لێك نەدایەوە وەك ئەبو ئەیوبو ژنەکەی،[2] وە دەفەرموێت: ﴿ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا﴾ واتە: با چاکیان لێك بدایەتەوە چونکە دایکی موسڵمانان زیاترو چاکترە لەوانو دوورترە لەو قسەو بێتاوانترەو لە ڕاستیەوە

---

[1] فتح الباري (٨/٣٤٠).

[2] الطبري (١٩/١٢٩).

دووره ﴿وَقَالُوا۟﴾ واته: به زمانی خۆیان بیانگوتایه ﴿هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ﴾ واته: ئەمه درۆیەکی ئاشکرایه بۆ دایکی موسڵمانانی هەڵدەبەستن، ئەو ڕووداوه جێی گومان نیه، چونکه هاتنی دایکی موسڵمانان به سواری وشتری سەفوانی کوڕی موعەتەل (صفوان بن معطل) له کاتی نیوەڕۆدا سوپاکه هەموو ئەوه دەبینن‌و پێغەمبەری خوا(ﷺ) له نێوانیان دایه ئەگەر ئەو کاره گومانێکی تێدا بووایه، ئا بەو شێوەو بەو ئاشکراییه نەدەبوو، که بەو شێوەیه‌و لەبەر چاوی ئەو خەڵکەوه نەدەهاتن، بەڵکو ئەگەر شتی وا ببووایه، به پەنهانی‌و دوور له چاوی خەڵکی دەهاتن، خۆی ئەمه بەڵگەیه لەسەر ئەوەی که ئەو خەڵکه بوختانچیه هەڵیانبەستبوو، درۆیەکی ئاشکراو بوختانێکی گەورەو قسەیەکی ناشیرین‌و بەدفەڕی زیانبەخش بوو بۆیان، خوای گەوره دەفەرموویت: ﴿لَّوْلَا﴾ واته: بۆچی ئەوانه ﴿جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ﴾ چوار شایەتیان لەسەر ڕاستی ئەو قسەیەی که کردیان نەهێنا شایەدیان بۆ بدەن لەسەر ڕاستی قسەکەیان ﴿فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ﴾ خۆ ئەگەر شایەتیشیان نەدەهێناو ناشی هێنن ئەوانه لای خودا به درۆزن‌و بەدخو دەژمێردرێن.

﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾﴾

**باسی سۆزی خودا بۆ ئەوانەی بوختانەکەیان کرد که یارمەتی دان تەوبه بکەن**

خوای گەوره دەفەرموویت: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئەگەر خودا چاکەی لەگەڵ نەکردنایه‌و بەزەیی پێتاندا نەهاتایەوه ئەی بوختان چیەکان، بەهۆی باوەڕبوونتان به خودا لەسەر ئەو بوختانەی هەڵتانبەست بۆ عائیشه، خودا تەوبەو پاڕانەوەی لێ وەرنەدەگرتن له دنیاو له ڕۆی قیامەتدا لێتان خۆش نەدەبوو، ﴿لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ تووشی سزایەکی گەوره دەبوون لەبەر ڕۆچوونتان لەو بوختانەدا، ئەمه له بارەی ئەوانەوه که خاوەن باوەڕ بوون، بەهۆی ئەو باوەڕەوه خودا تەوبەی لێ قبووڵ کردن وەك میستەح‌و حەسسان‌و حەمنەی کچی جەحش که خوشکی زەینەبی کچی جەحش بوو، بەڵام ئەو دووڕووانەی که بوختانەکەیان کرد وەك عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول‌و هاوەڵەکانی بەری ئەم ئایەته ناکەون، چونکه ئەوان باوەڕیان نیەو ئاکاری چاکیشیان نیه که به ئەندازەی ئەوه بێت یان لەبەریدا بوەستێت، هەر بەو شێوەیه حاڵی ئەوانەش که هەڕەشەیان لێ دەکرێت لەسەر کارێکی دیاری کراو که گشتی‌و پەیوەست بێت بەو تەوبه نەکردنەو یان ئاکاری چاك بەری نەگرێت‌و هاوتای بکات یان قورستری بکات بۆی. خوای گەوره دەفەرموویت: ﴿ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ

بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێن: واتە: کاتێك بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە،[1] ئەو دەیگوت من لە فلانە کەسم بیست، ئەوی تر دەیگوت من لە فلانە کەسم بیست، ئەوی تر دەیگوت: فلانە کەس وای گوت، هەندێکی تر ئەم ئایەتەیان بە شێوەیەکی تر دەخوێندەوە: ﴿ إِذْ تَلِقُونَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ﴾ واتە: کاتێك ئەم بوختانەتان بە دەماودەم لە یەکترەوە وەردەگرت، لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) بەم شێوەیە ئەم ئایەتەی خوێندووەتەوە.[2] وتی: (هو من ولق القول) واتە: درۆیەکی وەها کە خاوەنەکەی بەردەوام بێت لەسەری، عەرەب ئەڵێن: (ولق فلان مني السير) کاتێك کەسێك هەر بەردەوام بێت لەسەر ڕۆیشتن. بەڵام خوێندنەوەی یەکەم مەشهورترو باشترە کۆمەڵی زانایان ڕایان لەسەریەتی، بەڵام خوێندنەوەی دووەم لە دایکی موسڵمانانەوە ڕیوایەت کراوە:

﴿وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ واتە: وە بە زمانتان شتێك دەڵێن کە زانیاریتان دەربارەی نەبوو، یانی ئەوەی دەماودەم دەتانگوتو بۆ یەکتریتان باس دەکرد لە بارەی دایکی موسڵمانانەوە، واتان دەزانی شتێکی زۆر سوكو ئاسانە، خۆ ئەگەر خێزانی پێغەمبەریش (ﷺ) نەبووایە هەر ئاسان نەدەبوو، ئەی ئەو قسانە بەرامبەر خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) بکرێت کە گەورەی پێغەمبەرانو کۆتا پێغەمبەرەدەبێ چۆن بێت؟لەلای خودا زۆرگەورەیە کەئەوبوختانەبۆخێزانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بکرێت خوای گەورە زۆر توندو تیژە لەسەر ئەوە، چونکە خودا شتی وا بە ڕەوا نابینێت بۆ ژنی پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان هەرگیزو هەرگیز، کەواتە چۆن بە ڕەوای دەبینێت بۆ بەڕێزترین ژنی پێغەمبەرێك کە بەڕێزترینی نەوەی ئادەمە لە دونیاو لە قیامەتدا؟ بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ﴾ واتە: ئێوە ئەو قسەیە بە لاتانەوە ئاسانو ئاساییە، بەڵام لەلای خودا زۆر گەورە بوو، لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەسی وا هەیە قسەی وا دەکات خودا لەخۆی دەڕەنجێنێت، نازانێ چەندێ لە خراپەدا ڕۆچووە، بە دووری نێوان ئاسمانو زەمین بەناو ئاگردا دەچێتە خوارەوە) لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە (هیچ گوێ بەو قسەیە نادات).[3]

﴿وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾﴾

**جارێکی تریش دەرس دادان**

---

[1] الطبري (١٣٢/١٩).

[2] فتح الباري (٣٤٠/٨).

[3] فتح الباري (٣١٤/١١)، مسلم (٢٢٩٠/٤).

ئەمەیش دەرس دادانێکی ترە دوای دەرسی یەکەم، کە خودای مەزن فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان کە گومانی باش بەرن بە یەکتری، واتە: کاتێك کە گومانی شتێك برا بە کەسێکی بەڕێزو شایەنی ئەو قسەیە نەبوو، چاکتر وایە کە گومانی باش ببرێتو جگە لەوە هیچ شتێکی تر بە بیردا نەیەت، خۆ ئەگەر شتێ لەدنەدانی شەیتان هات بەدڵدا یان بەخەیاڵدا، نابێت باس بکرێت، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن چاوپۆشی کردووە لەو شتەی کە بە دڵی ئومەتی مندا دێت هەتا نەیلێتو نەیکات)،ئەم فەرمودەیە لە هەردوو صەحیحەکەدا بوخاریو موسلیم هێناویانە،[1] خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا﴾ واتە: دەبوایە کاتێك ئەو قسەیەتان بیست بتان گوتایە: ئێمە چیمان بەسەر ئەو قسەوە هەیە، بۆمان نیە لە دەممان بێتە دەرو باسی بکەین، هیچ کەسێك لیمان ببیستێ، ﴿سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ﴾ پاکیو بێ عەیبی بۆ خودایە، ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەیە کە باسی خێزانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەو شێوەیە بکرێت، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا﴾ واتە: خودا ئامۆژگاریتان دەکات کە هەرگیز نەگەڕێنەوە بۆ وێنەی ئەوەی کە ڕوویداو هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە بوختانی وا هەڵدەبەستن لەمەوبەدوا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خواو پەیامەکەی هەیەو ڕێز لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگرن، بەلام ﴿وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ واتە: خودای مەزن نیشانەو بڕیارو فەرمانەکانی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: زانایە بەوەی کە بۆ عەبدەکانی دەشێو وە کارزانە لە بڕیارو فەرمانەکانیدا کە دەیدا بۆیان.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾﴾

**دەرس دادانی ئەوانەی حەز دەکەن تۆمەتی داوێنپیسی لەنێوان موسڵماناندا بڵاوبکەنەوە**

ئەمە دەرسی سێهەمە، خوای گەورە ئەیدا لەبارەی ئەو کەسەی کە قسەیەکی خراپ دەبیستێو شتێ دەکەوێتە خەیاڵیو باسی دەکات، با زۆر لەسەری نەڕواتو بڵاوی نەکاتەوەو دنیای پێدابگرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەوانەی حەزدەکەن کە کاری بێناموسی لەناو خاوەن

---

[1] فتح الباري (١١/٥٥٧)، مسلم (١/١١٦، ١١٧).

باوەڕاندا بڵاوبکەنەوە ﴿لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە: سزای بە ژانیان دەدرێت لە دنیادا، واتە: شەلاقیان لێ دەدرێت: ﴿وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾ لە ڕۆژی قیامەتیشدا جەزرەبە دەدرێن: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾ واتە: خوا دەزانێتو ئێوە نازانن، یانی خودا ئاگای لێتانە، هەموو کارەکان بگێڕنەوە بۆ لای خودا، ئەو کاتە دەکەونە سەر ڕاستەڕێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەوبانەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (بەندەکانی خودا ئازار مەدەنو قسەی ناشیرین مەخەنە شوێنیان – بوختانیان بۆ مەکەن – مەگەڕێن بە شوێن ناموسیاندا – عەیبو عاریاندا – چونکە هەر کەسێك بە شوێن عەیبو عاری برای موسڵمانی خۆیدا بگەڕێت، خودایش بەشوێن عەیبو عاری ئەودا دەگەڕێت، هەتا لە ماڵەکەی خۆیدا ئابڕووی دەبات)[1].

﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٠﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ ﴾

## وەبیرهێنانەوەی چاکەکانی خوداو ئاگادارکردنەوە لە شوێنکەوتنی شەیتان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾ واتە: ئەگەر سۆزو بەزەیی خوا نەبووایە ئەوکاتە شتێکی تر دەبوو، بەڵام خودا زۆر میهرەبانو دلۆڤانە بەرامبەر بەندەکانی خۆی، دەبووڕێت لەو کەسانەی کە پەشیمان دەبنەوە لەو ڕووداوەی کە ڕوویدا لێیانو ئەوانیش پاك دەبنەوە بەو شەلاقەی کە لێیان دەدرێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾،[2] ئەمە فەرمان کردنە بە دوورکەوتنەوەو خۆ لادان لە شوێنکەوتنی شەیتان بە ڕەوانترینو بەهێزترینو کورتترین دەستەواژە عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێ لە ئیبنو عەباسەوە ﴿خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ واتە: کرداری

---

[1] أحمد (٢٧٩/٥).

[2] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بە دوای هەنگاوەکانی شەیتاندا مەڕۆن وە هەر کەس شوێن هەنگاوەکانی شەیتان بکەوێت،چونکە بە ڕاستی شەیتان فەرمان دەکات بە کاری زۆر ناشیرین (زینا)و خراپە ئەگەر بەهرەو میهرەبانی خوا نەبووایە بە سەرتانەوە هەرگیز کەسێك لە ئێوە پوختو پاك نەدەبووەوە بەڵام خوا هەر کەسی بوێت پاکی دەکاتەوە خوا بیسەری زانایە.

شەیتان،[1] عیکریمە دەڵێ: ﴿خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ دڵەڕاوکێکانی (وەسوەسەکانی) شەیتان. قەتادە دەڵێ: هەموو گوناهێك لە هەنگاوەکانی شەیتانە،[2] ئەبو میجلەز دەڵێ: ئەو نەزرانەی دەکرێن لە ڕێی ناڕەوادا – گوناهدا – لە هەنگاوەکانی شەیتانە،[3] خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا﴾ واتە: ئەگەر خودا تەوبەی قبوڵ نەکردایە لەو کەسانەی کە خۆی مەیلی لێیەتی کە بگەڕێنەوە بۆ لایو دڵەکانی پاك نەکردایەتەوە لەو بتپەرستیو بەدخوییو پیسیو چەپەڵیو ڕەوشت ناشیرینیەی کە تیایاندا بوو – هەر کەسەو بە پێی خۆی هیچ کەسێك دڵی خۆی بە پاکی نەدەبینیو تووشی چاکەیش نەدەبوو! ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ﴾ واتە: بەڵام خوا مەیلی لە هەر کەسێك ببێ لە بەندەکانی پاکی دەکاتەوەو مەیلیشی لێ بێت گومڕای دەکاتو ملی دەشکێنێتو سەری لێ دەشێوێنێت، ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ﴾ واتە: قسەی بەندەکانی دەبیستێ ﴿عَلِيمٞ﴾ دەشزانێ کێ شایستەی شارەزابوونەو کێش شایستەی گومڕابوونە لە ئێوە.

﴿وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾

## هاندانی خاوەن چاکە کە بەردەوام بن لەسەر بەخشینو لێبوردن

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَأۡتَلِ﴾ لە (الالیە) وەهاتووە کە سوێند خواردنە. واتە: با سوێند نەخوات ﴿أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ﴾ دەوڵەمەندو چاکەخوازو خێرکەر، ﴿وَٱلسَّعَةِ﴾ خواپێداو ﴿أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ﴾،[4] یانی سوێند مەخۆن کە پەیوەندی خزمایەتی بپچڕن لە هەژارانو ئاوارەکان، ئەمە ئەوپەڕی نەرمی نواندنو سۆزە بۆ نەپچڕانی پەیوەندی خزمایەتی. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ﴾ واتە: ئایا تاوانیان نابوریو چاوپۆشیان لێ ناکەن لەسەر ئەو خراپەو ئازارەی لێیانەوە ڕوویدا؟ ئەمەیش لە حیلمو گەورەییو ڕێزو سۆزی خودای مەزنە بۆ بەندەکانی لەگەڵ ئەو هەموو ناهەقیەدا کە لە خۆیانی دەکەن، ئەم ئایەتە لەسەر ئەبو بەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتەخوارەوە کاتێك کە سوێندی خوارد خێر نەکات بە میستەحی کوڕی ئەساسە

---

[1] الطبري (٣٠١/٣).

[2] الدر المنثور (٤٠٤/١).

[3] الطبري (٣٠١/٣).

[4] واتە: کە یارمەتی نەدەن بە خزمانو هەژارانو کۆچەران لە پێناوی خوادا.

بە هیچ شێوەیەك لە دوای ئەو قسانەی بەرامبەر عائیشەکردی وەك لەپێشەوە لەفەرمودەکەدا هاتوە،کاتێ کەخودا قورئانی ناردەخوارەوە بێتاوانی دایکی موسڵمانانی دەرخست و موسڵمانان دڵیان خۆش بوو و ئارامیان وەبەردا هاتەوە. خوای گەورە لەو کەسانەخۆش بوو کە قسەیان کردبوو لە باوەڕداران لەو بارەیەوە، شەلاق درا لەو کەسانەی کە بەرکەوتن، خوای گەورە هەر خۆی خاوەنی ڕێزو ستایشە، سۆزی ئەبو بەکر دەجولێنێت بەرامبەر خزمو کەسیو میستەحی کوڕی ئەساسە، کە پورزای ئەبو بەکر بوو چونکە میستەح هیچ سامانێکی نەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە ئەبو بەکر دەیدایە، زۆر هەژار بوو لە کۆچەرەکانیش بوو کە لە ڕێی خودا ئاوارە بووبوو یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لەسەر ئەو بوختانە بەردەوام بووە پاشان تەوبەی کردو شەلاقی لێدرا لەسەر ئەو بوختانەیو خودا تەوبەی لێ قەبوڵ کرد، ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) ناسرابوو بە خێرخوازی، چاکەو پیاوەتی زۆربوو بەسەر خزمو بێگانەوە کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِي ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾[1] چونکە پاداشت بە پێی جنسی ئەو کارەیە. واتە: تۆ چۆن خۆش دەبیت لە کەسێ کە تاوانی کردووە بەرامبەرت. ئێمەش لە تۆ خۆش دەبین، وە چۆن چاوپۆشی دەکەیت، ئێمەش چاوپۆشیت لێ دەکەین، ئا لەو کاتەدا ئەبو بەکر گوتی: بەڵێ سوێند بە خوا پێمان خۆشە – ئەی پەروەدگارمان – کە لێمان خۆش ببی. پاشان ئەوەی کە دابووی بە میستەح بۆی گێڕایەوە لەو خێرەو گوتی: سوێند بە خوا هەرگیز ئەو خێرەی لێ نابڕم. لە باتی ئەوەی کە گوتی: بە خوا هەرگیز هیچ چاکەیەکی لەگەڵ ناکەم. لەبەرئەوەبووە صدیق ئەوسیدیقە بوو(ڕەزای خوا لە ئەبوبەکرو کچەکەیشی).

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ﴾

### هەڕەشە لەسەر بوختان کردن بۆ ژنانی داوێنپاکی خاوەنباوەڕی بێئاگا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾ ئەمە هەڕەشەیەکی خوای گەورەیە بۆ ئەو کەسانەی کە بوختان ڕێك دەخەن بۆ ژنانی داوێنپاکی خاوەن باوەڕی بێئاگای سەربەخۆ، خۆ دایکی موسڵمانان زۆرتر لە پێشە بۆ داوێنپاکی چونکە ئەم ئایەتانە بە تایبەتی لەسەر داوێنپاکی ئەو هاتووەتەخوارو ئەو خێزانی پێغەمبەرەو (ﷺ) کچی ئەبو بەکریشە (ڕەزای خوای لێ

[1] واتە: ئایا پێتان خۆش نیە خوا لێتان خۆش ببێت وە خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

بێت) زانایان هەموو کۆن (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لەسەر ئەوەی هەر کەسێك جوێن بداو ئەو بوختانە بە ڕاست بزانێت دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە، ئەو کەسە خوانەناسە – کافرەو – دژایەتی قورئان دەکات، هەمان بڕیار بۆ گشت دایکانی موسڵمانانە، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: نەفرینیان لێکراوە لە دنیاو لە ئاخرەتدا وە بۆیان هەیە سزای زۆر گەورە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا﴾[1]. ئیبنو عەباس دەڵێ: ئەم ئایەتە گشتگیرە هەموو ژنێکی داوێنپاکی خاوەنباوەڕی بێئاگای سەربەخۆ دەگرێتەوە هەر کەسێك بوختانیان بۆ ڕێك بخات بەر ئەو نەفرینە – لەعنەتە – دەکەوێت لە دنیاو لە قیامەتدا، عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەروای گوتووە بەڵام عائیشە پێشەوای داوێن پاکانە.[2] ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە ئەمیش لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (دووركەونەوە لە حەوت تاوانە – لەناوبەرەکە) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو حەوت تاوانە کامانەن؟ فەرمووی: (شەریك بۆ خوا دانانو، جادووگەریو، کوشتنی گیانێك کە خودا قەدەغەی کردبێت مەگین بە هەق، سوخواردنو، ماڵی هەتیو خواردنو، ڕاکردن – پشت هەڵکردن – لە ڕۆژی چوون بۆجەنگ لەگەڵ دوژمنانداو، بوختان ڕێکخستن بۆژنانی داوێن پاکی بێئاگای خاوەنباوەڕ)[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾،[4] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: ئەوانە واتە موشریکەکان کاتێ بینیان کەس ناچێتە بەهەشت ئەوانە نەبێت نوێژیان کردووە، دەڵێن: وەرن با ئینکاری بکەین، ئینکاری دەکەن، مۆر دەنرێت بەسەر دەمیاندا دەستو پاکانیان شایەتیان لێ دەدەنو هیچ قسەیەك لە خوا ناشارنەوە.[5] دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەر دا بووین (ﷺ) پێکەنی هەتا دانی پیرۆزی دەرکەوت، پاشان فەرمووی: (ئایا دەزانن بەچی پێکەنیم؟) گوتمان: خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەزانن. فەرمووی: (لە کێشەی بەندە لەگەڵ پەروەردگاریو ئەڵێت: ئەی پەروەردگارم! لە

---

[1] الاحزاب (٥٧)، واتە: بە ڕاستی کەسانێك کە ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن خوا نەفرینی لێ کردوون لە دنیاو لە ئاخیرەتدا وە سزای ڕیسواکەری بۆ ئامادە کردوون.

[2] الطبري (١٣٩/١٩).

[3] فتح الباري (٤٦٢/٥)، مسلم (٩٢/١).

[4] واتە: ڕۆژێك (دێ) شایەتی ئەدات لەسەریان زمانیانو دەستو قاچەکانیان بەو کردەوانەی کە کردوویانە.

[5] الدر المنثور (٣١٧/٧)، الطبري (٣٧٣/٨).

ناهەقی نەوپاراستم؟ خودایش دەفەرمووێت: بەڵێ، بەندەکە ئەڵێت: شایەت قبوڵ ناکەم لەسەر خۆم، لەخۆم نەبێت، خودایش دەفەرمووێت: تەنها خۆت بەسە کە ئەمڕۆ شایەتیت لەسەر بدا، فریشتە بەڕێزەکانیش شایەتن بەسەرتەوە، مۆر دەنرێت بەسەر دەمیدا ، دەگوترێت بە ئەندامەکانی لاشەی: قسە بکەن، کردارەکانی باس دەکەن، پاشان مۆڵەتێکیان لە نێوان خۆیی‌و قسەکانیا پێ دەدرێت، بەندەکە ئەڵێت: هەی دوور بن‌و لە ئارادا نەمێنن من لەبەر ئێوە ئەم هەموو هەوڵەم دا) موسلیم‌و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە،[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ﴾،[2] ئیبنو عەباس دەڵێ ﴿دِينَهُمُ﴾ واتە: پاداشتی تەواو هەموو ئەوەی لە قورئاندایە پاداشتی تەواوی لەسەر دەدرێتەوە، کەسانی تریش هەر وایان گوتوە.[3] ﴿وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ﴾ ئەوسا دەزانن کە هەر بەڵێن‌و لێپرسینەوەی خودا ئەو هەقەیە کە ستەمی تێدا نیە.

﴿ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ ﴾

### عائیشە پاکە چونکە بۆ چاکترین کەس بووە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ[4] ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێ: ناپاکانی ژنان لە قسەدا، بۆ ناپاکان لە پیاوان‌و ناپاکان لە پیاوان بۆ ناپاکان لە ژناندا لە قسەدا، پاکان لە ژنان لە قسەدا بۆ پاکان لە پیاوان‌و پاکان لە پیاوان بۆ پاکان لە ژنان لە قسەدا. دەڵێ: ئەم ئایەتە لەسەر عائیشە‌و بوختانچینەکان هاتووەتە خوارەوە.[4] هەر بەم شێوەیەڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو عەتاو سەعیدی کوڕی جوبەیرو شەعبی‌و حەسەنی کوڕی ئەبو حەسەنی بەسری‌و حەبیبی کوڕی ئەبو سابت‌و زەححاك، ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[5] واتە: قسەی ناشیرین هەر شایەنی کەسانی پیسە لە مەردم، قسەی چاکیش – پاکیش – هەر شایەنی کەسانی پاکە لە مەردم، ئەو بوختانەی کۆمەڵی دووڕووەکان هەڵیان بەستبوو بۆ عائیشە خۆیان شایەنی ئەوەن‌و عائیشەش زۆر پاکە‌و دوورە لەو بوختان چیانەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی:

---

[1] مسلم (٢٩٦٩).

[2] واتە: لەو ڕۆژەدا خوا پاداشتی تەواویان بە ڕاستی‌و داد دەداتەوە.

[3] الطبري (١٩/١٤١).

[4] الطبري (١٩/١٤٢)، الدر المنثور (٦/١٦٧).

[5] الطبري (١٩/١٤٣، ١٤٤).

﴿أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾ عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: ناپاکان لە ژنان بۆ ناپاکان لە پیاوان، ناپاکان لە پیاوان بۆ ناپاکان لە ژنانو پاکان لە ژنان بۆ پاکان لە پیاوانو پاکان لە پیاوان بۆ پاکان لە ژنان.[1] ئەمەیش دیسان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بوختانچیانە بەبێ کەمو زیاد، واتە: خوا عائیشەی نەکردووە بە خێزانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەگین دەبێت پاک بێت چونکە پێغەمبەر (ﷺ) پاکترینی هەموو پاکانە لەناو مرۆڤدا، ئەگەر پاک نەبووایە نەدەشیا بۆ پێغەمبەرو(ﷺ) نەدەبووە خێزانی. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ﴾ واتە: دوورن لەو قسانەوە کە بوختانچیانو خراپەکاران ڕێکیان خست ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ﴾ واتە: لەبەر ئەو بوختانەی کە ڕێکیان خست بۆیان، خودا ئەوانی بەخشیوە ﴿وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ واتە: لە لای خودا وان لە بەهەشتی پڕ بەهرەدا، ئەمەیش بەڵێنێکە ئەوە دەگەیەنێ کە عائیشە خێزانی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە بەهەشتدایە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾﴾

### مۆڵەت وەرگرتن و ئادابی چوونە ناو ماڵان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾،[2] ئەمە چەند ئادابێکی شەریعەتە کە خوای گەورە دایناوە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی، لە شێوازی ئیزن وەرگرتن، فەرمانی پێکردوون کە نەچنە هیچ ماڵێك جگەماڵی خۆیان تا ئیزن وەرنەگرن لە پێش ئەوەی بچنە ژوورەوە، پاشان سڵاو بکەن لە خەڵکی ئەو ماڵە. پێویستە سێ جار ئیزن بخوازرێت، ئەگەر ڕێیان دا باشە ئەگینا دەبێت بگەڕێتەوە. وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە ئەبو موسا کاتێك سێ جار داوای ئیزنی کرد بچێتە لای عومەر ئیزنی نەدراو ڕۆیشت پاشان عومەر فەرمووی: ئایا گوێم لە عبداللە ی کوڕی قەیس نیە داوای ئیزنی کرد؟ ئیزنی بدەن، گەڕان بە شوێنیدا نەیاندی ڕۆیشتبوو، دوای ئەوەی کە هات فەرمووی: بۆ گەڕایتەوە؟

---

[1] الطبري (١٤٤/١٩).

[2] واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ! مەچنە هیچ ماڵێك جگە لە ماڵەکانی خۆتان تا پرس دەکەن وە سەلام بکەن لە خاوەن ماڵەکە ئەوە چاکترە بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری وەرگرن.

وتی: من سێ جار داوای ئیزنم کرد، ئیزن نەدرام، منیش گوێم لە پێغەمبەر بوو (ﷺ)دەیفەرموو: (وەختێك یەکێکتان داوای ئیزنی کرد سێ جار، ئیزن نەدرا با بگەڕێتەوە) عومەر فەرمووی: دەبێت بەڵگەم بۆ بێنی لەسەر ئەم قسەیەت ئەگینا شەلاقت لێدەدەم – دارکاریت دەکەم – ئەویش ڕۆیشت بۆ لای کۆمەڵێکی ئەنساری، قسەکەی عومەری بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش وتیان: بچوکترین کەسمان نەبێت شایەتیت بۆ نادات، ئەبو سەعیدی خودری لەگەڵی ڕۆیشت، ئەوەی بۆ عومەر گێڕایەوەو عومەر گوتی: بازرگانی بازاڕ ئەوەی لەبیر بردوومەتەوە.[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەس و کەسانی تریشەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای ئیزنی کرد لە سەعدی کوڕی عوبادە فەرمووی: (السلام علیك ورحمة الله) سەعد وتی: وعلیك السلام ورحمة الله، پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لێ نەبوو هەتا سێ جار سەلامی کرد، سەعدیش سێ جار وەڵامی دایەوە، بەڵام وەڵامی سەلامەکەی سەعد نەگەیشتە گوێی پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوەو سەعد شوێنی کەوتو وتی:ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایك و باوکم بە قوربانت بێت، هیچ سەلامێکت نەکردووە مەگین گوێم لێ بووە، وەڵامم دایتەوە بەڵام نەمدەگەیاندە گوێت کە بیبیستی، حەزم دەکرد زۆر سەلامی جەنابت و بەرەکەتم بەسەردا بڕژێت، پاشان بردیە ماڵەوەو مێوژی خستە بەردەمی و پێغەمبەر (ﷺ) لێی خوارد، کاتێك کە لێ بوویەوە – دەستی هەڵگرت – لە خواردنی فەرمووی: (پیاوچاکان خواردنتان بخوات و فریشتەکان نزاتان بۆ بکەن و ڕۆژوەوان ڕۆژو بشکێنێ لاتان)،[2] پاشان دەبێت بزانرێت کە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە ئیزن وەردەگرێت لە خەڵکی ئەو ماڵە، نابێت بوەستێت و ڕووبکاتە دەرگاکە، بەڵکو دەبێت لای ڕاستی یان لای چەپی دەرگاکەوە بوەستێ، بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە عبدالله ی کوڕی بوسرەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) بهاتایەتە دەرگای هەر کەسێك ڕووی نەدەکردە دەرگاکەو بەردەمی بەڵکو یان لە لای ڕاستەوە یان لەلای چەپی دەرگاکەوە دەوەستا، پاشان دەیفەرموو (السلام علیکم، السلام علیکم) چونکە ئەو ماڵانە لەو ڕۆژەدا پەردەیان – دەرگایان –نەبوو، تەنها ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە.[3] وە لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەگەر کەسێ سەیرت بکات بەبێ ئیزن بەردێکت دا لە چاوی و کوێرت کردت – چاوت دەرهێنا – هیچ تاوانێك ڕووت تێ ناکات – تاوانبار نابی)،[4] گشت صەحیحەکان ڕیوایەتیان کردووە لە جابیرەوە دەڵێ: هاتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر قەرزارییەك کە لەسەر باوکم بوو، دام لە دەرگاو فەرمووی: (ئەوە

---

[1] احمد (١٣٨/٣).

[2] أبو داود (٣٧٤/٥).

[3] فتح الباري (٢٥٣/١٢)، مسلم (١٦٩٩/٣).

[4] فتح الباري (٣٧/١٢)، مسلم (١٦٩٧/٣)، ابو داود (٣٧٤/٥)، تحفة الاحوزي (٤٩١/٧).

کێیە؟) گوتم: منم: فەرمووی: (منم، منم) وەك ئەوەی پێی ناخۆش بێت،[1] بۆیە ئەوەی پێ ناخۆش بوو چونکە بەو وتەیە خاوەنەکەی ناناسرێت، هەتا بە ناوی یان کونیەیەکی خۆی ڕوونی نەکاتەوە کە پێی ناسراوبێت، چونکە هەموو کەسێك بە من ناوی خۆی دەبات، ئەو مەبەستە نایەتەدی لە ئیزن خواستندا کە فەرمانی پێکراوە لە ئایەتەکەدا، عەوفی دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە (الاستئناس) واتە ئیزن خواستن، چەند کەسانی تریش هەر وایان وتووە،[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە کەلەدەی کوڕی حەنبەلەوە کە سەفوانی کوڕی ئومەییە لەکاتی فەتحدا ئەینێرێت بۆخزمەتی پێغەمبەر(ص)وەهەندێ شیرو ئاسکێکی شەش مانگە وبڕێك کولەکەی ئاسکیشی پێدا ئەنێرێ بۆی. پێغەمبەر (ﷺ)لەماڵێکدابوو لەئەوسەری مەککەدا وتی: چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ) نە سڵاوم کردو نە ئیزنیشم خواست، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بگەڕێرەوە سڵاو بکەو بڵێ ئایا بێمە ژوورەوە؟)دیارە ئەمە دوای ئەوەی کە سەفوان موسڵمان بوو بوو،[3] ئەبو داودو نەسائیو ترمیزی ڕیوایەتیان کردووە، ترمیزی دەڵێ: فەرموودەیەکی چاکی غەریبە[4]، ئیبنو جورەیج دەڵێ: بیستم لە عەتای کوڕی ئەبو ڕەباحەوە، ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە گێڕایەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێ: سێ ئایەت هەیە خەڵکی نکولی لێ دەکەن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾،[5] دەڵێ: ئەوان دەڵێن: بەڕێزترینتان لە لای خودا ئەوەیە خانووەکەی گەورەتر بێت، وە دەڵێ:ئەدەبی ئیزن خواستنیش خەڵکی هەموو نکولی لێدەکەن، دەڵێ: منیش وتم: ئایا ئیزن بخوازم لە خوشکە هەتیوەکانم کە لەگەڵ خۆمن لە یەك خانوودا؟ وتی: بەڵی، دەڵێ: دووبارەم کردەوە بۆئەوەی ڕێم پێ بدات، قەبوڵی نەکرد، وتی: پێت خۆشە بە ڕووتی خوشکەکەت چاو پێ بکەوێت؟ وتم: نەخێر، وتی: کەواتە ئیزن بخوازە، دەڵێ: جارێکی تر چوومە لای پێی وتم: ئایا پێت خۆشە فەرمانی خودا بەجێ بێنی؟ وتم: بەڵێ، وتی: کەواتە ئیزن بخوازە، ئیبنو جورەیج دەڵێ: طاوس هەواڵی دامێ لە باوکیەوە دەڵێ: هیچ ژنێك نیە ئەوەندە پێم ناخۆش بێت چاوم پێی بکەوێت بە ڕووتی زیاترلە مەحرەم، (طاوس)لەو مەسەلەدا توند بوو، ئیبنو جورەیج دەڵێ: زوهری دەڵێ: بیستم لە هوزەیل کوڕی شورحەبیلی ئەلئەودی کە نابینا بوو ئەویش بیستبووی لە ئیبنو مەسعودەوە دەیوت: دەبێت ئیزن وەرگرن لە دایکانتان، ئیبنو جورەیج دەڵێ: وتم بە عەتا ئایا پیاو لە ژنی خۆی ئیزن وەردەگرێت؟ وتی: نەخێر، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە واجب نیە، بەڵام باشتر وایە کە

---

[1] النسائي في الكبرى (٦/٩٠)، ابن ماجه (٢/١٢٢٢).

[2] الطبري (١٩/١٤٦).

[3] أحمد (٣/٤١٤).

[4] أبو داود (٥/٣٦٨)، تحفة الاحوزي (٧/٤٩٠)، النسائي في الكبرى (٦/١٧٦).

[5] الحجرات (١٣).

ئاگاداری بکات پێش چوونە ژوورەوە، لە ناکاو خۆی نەکات بە ژووردا، چونکە لەوانەیە بە شێوەیەك بێت حەز نەکات لەو کاتەدا چاوی پێی بکەوێت، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە برازای زەینەبەوە، (زەینەب ژنی عبدالله ی کوڕی مەسعود بوو) کە زەینەب دەڵێ: کاتێك عبدالله بگەڕایەتەوە لە پێویستیەکی خۆی کە دەگەیشتە دەرگاکە کۆکەی لێوە دەهاتو تفی دەکردەوە نەوەك بێتە لامانو شتێك ببینێت پێی ناخۆش بێت، سەنەدەکەی صەحیحە.[1] موقاتیلی کوڕی حەییان دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾ئەڵێت: لەسەردەمی نەفامیدا کەسێك بگەیشتایە بە هاوەڵێکی خۆی سڵاوی لێ نەدەکرد، دەیوت: بەیانیت باش، ئێوارەت باش، ئەمە سڵاوی خەڵکی بوو لە نێوان خۆیاندا، وە کاتێك کەسێك بچووایە بۆ لای هاوەڵێکی خۆی ئیزنی نەدەخواست هەتا خۆی دەکرد بە ژوورداو دەیوت هاتمە ژوورەوە یان قسەیەکی تری وای دەکرد، ئەمە زۆر ناڕەحەت بوو لەسەر پیاو، لەوانە بوو لەگەڵ خێزانەکەی بێت، خوای گەورە ئەمانەی هەمووی گۆڕی بە داپۆشینو پاکیەتیو کردیە مایەی پاکیو خاوێنیو دوور لە پیسیو چەپەڵی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ﴾،[2] ئەمەی کە موقاتیل ئەیڵێ شتێکی چاکە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ واتە: ئیزن خواستن شتێکی چاکە بۆ هەردوولا، بۆ ئەو کەسەی ئیزن دەخوازێتو بۆ خاوەن ماڵەکەیش ﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ واتە: بەڵکو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾ واتە: ئەگەر کەستان تێدا نەدی مەچنە ژوورەوە هەتا ڕێتان پێ دەدرێت، لەبەر ئەوەی دەست وەردانە لە ماڵی خەڵکی بەبێ ئیزنی خاوەنەکەی کە لەوانەیە ئیزن نەدات بۆ چوونە ژوورەوە ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ﴾ واتە: ئەگەر وتیان بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە ئەوە زۆر چاکترە بۆ ئێوەو پاکتریشە، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾،[3] قەتادە دەڵێ: هەندێك لە کۆچەریەکان ئەڵێن: بە درێژایی تەمەنمان چاوەڕوان بوین، نەمانبینی کە جارێك داوای ئیزن بکەین لە هەندێك لە براکانمان پێمان بڵێن: بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە، چونکە پێمان خۆش بوو ئەم ئایەتە جێبەجێ بکەین کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ

---

[1] الطبري (١٤٨/١٩).

[2] الدر المنثور (١٧٦/٦).

[3] واتە: وە خوا زانایە بە هەموو ئەو کردەوانەی دەیکەن.

أَرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾[1] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ أَرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ﴾ واتە: ئەگەر پێتان گوترا بگەڕێنەوە، بگەڕێنەوە لەبەر دەرگای خەڵکی مەوەستن، خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ ﴾ ئەم ئایەتە تایبەتترە لە ئایەتەکەی پێشوو، ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە چوونە ژوورەوە بۆ ئەو ماڵانەی هیچ کەسی تێدا نیەو کەلوپەلی خۆتانی تێدایە دروستەو ئیزنی ناوێ، وەك ئەو ماڵانەی کە ئامادە کراون بۆ میوان، ئەگەر یەکەمجار ئیزنی خواست جارێکی تر پێویست بە ئیزن ناکات، ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئیبنو عەباس دەڵێ: ﴿لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ﴾ لە دوایدا نەسخ بووەتەوە، ماڵێ کەسی تێدا نەبێت جیاکراوەتەوە لە ماڵەکانی تر وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَٰعٌ لَّكُمْ ﴾ هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە عیکریمەو حەسەنی بەسریەوە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾ واتە: وە خوا دەزانێ بەوەی ئاشکرای دەکەن‌و بەوەی دەیشارنەوە.

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾

### فەرماندان بەچاوداخستن

ئەمە فەرمانێکە لە لایەن خواوە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی کە چاویان داخەن لەو شتانەی خوا حەرامی کردووە بۆی بنواڕن، سەیری شتێك نەبێت کە دروستە و چاویان لە قەدەغەکراوەکانی بپارێزن، ئەگەر جارێك بە ڕێکەوت چاویان پێکەوت بە ئەنقەست نەبوو، با زوو چاویان لادەن، وەك موسلیم لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە جەریری کوڕی عبدالله ی بەجەلیەوە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ڕوانینی کتوپڕ، فەرمانی پێ کردم بە پەلە چاوم لادەم،[3] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (نەکەن لە ڕێگادا دانیشن)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناتوانین دانەنیشین قسەی تێدا دەکەین – وتووێژی تێدا دەکەین – پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر وازتان نەهێنا هەقی ڕێگا بدەن) وتیان: هەقی ڕێگا کامەیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)؟ فەرمووی: (چاوداخستن، ئازارنەدان‌و

---

[1] الطبري (١٥٠/١٩).

[2] الطبري (١٥٣/١٩).

[3] مسلم (١٦٩٩/٣).

وەلامدانەوەی سەلامو فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغەکردن لە خراپە)،[1] ئەبولقاسمی بەغەوی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئومامەوە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو دەیفەرموو: (کەفیلی شەش شتم بۆ بکەن، منیش کەفیلی بەهەشتتان بۆ دەکەم، کاتێك یەکێکتان قسەی کرد با درۆ نەکات، وە کاتێك بووە خاوەنی متمانە خیانەت نەکاتو کاتێك کە بەڵێنێکی دا دوانەکەوێتو چاوتان داخەنو دەستتان بگرنەوە لە تاوانو شەرمگەتان بپارێزن)،[2] لەبەر ئەوەی چاو هۆکاری خراپکردنی دڵە خوای گەورە فەرمانی داوە بە پاراستنی شەرمگە وەك فەرمانی داوە بە پاراستنی چاو و فەرموویەتی: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ﴾،[3] پاراستنی شەرمگە – عەیب – جاری وا هەیە بە گێڕانەوەیەتی لە داوێنپیسی – الزنا – وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾[4]، وەجاری وا هەیە بە پاراستنیەتی لە سەیرکردن. وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکانی تریش هێناویانە (شەرمگەت بپارێزە لە ژنەکەت نەبێتو ئەو کەنیزانەی خۆت خاوەنیتی)،[5] ﴿ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ﴾ واتە: ئەوە باشترە بۆیانو پاکترە بۆ دڵیانو خاوێنترە بۆ ئاینیان، وەك وتراوە: هەر کەسێك چاوی بپارێزێت خوای گەورە بەرچاوی ڕۆشن دەکاتەوە وە ڕیوایەتیش کراوە(ڕووناکی دەخاتە دڵی). خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾ واتە: خوا ئاگای لە هەموو ئەو کارانە هەیە کە دەیکەن وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾،[6] وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (نەوەی ئادەم بەشی خۆی لە داوێنپیسی – الزنا – بۆ نووسراوە، دەبێت هەر پێی بگاتو گومانی تێدا نیە، زینای چاو سەیرکردنە، زینای زمان قسەکردنە، زینای هەردوو گوێ

---

[1] فتح الباري (١٣٤/٥).

[2] تأريخ الخطيب (٣١٤/٧)، ابن حيان (٢٠٤/٢)، ابن ماجه (٦١٨/١).

[3] واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) بڵێ بە پیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان داخەنو بپارێزن (لە سەیرکردنی نامەحرەم) وە عەورەتیان بپارێزن (لە داوێن پیسی).

[4] المؤمنون (٥-٦)، واتە: وە ئەوانەی کە پارێزەری داوێنیان (لە شەروالْ پیسی)، مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان بۆ کەنیزەکێك کە بووبن بە خاوەنیان ئەوە بە ڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێت،

[5] أحمد (٣/٥)، أبو داود (٣٠٤/٤)، الترمذي (٥٣/٨)، النسائي في الكبرى (٣١٣/٥).

[6] غافر (١٩)، واتە: خوا دەزانێت بە خیانەتی چاوانو هەرچی دڵان دەیشارنەوە.

بیستنه، زینای هەردوو دەستیش گرتنەو زینای هەردوو پێیەکانیش هەنگاونانە، دەرونیش ئارەزووی بۆ دەکاتو ئاواتی بۆ دەخوازێت، شەرگەش – عەیبیش – هەڵدەستێت بەو کارە یان پێی هەڵناسێ – و بە درۆی دەخاتەوە) بوخاری ڕیوایەتی کردووە بە موعەللەقی،[1] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە بە موسنەدی بە شێوازێکی تر وەك ئەو فەرموودەی پێشەوە.[2] زۆرێك لە زانایانی پێشینە قەدەغەیان کردووە کە پیاو وردبێتەوەو زۆر سەیری لاوی موو لێ نەهاتوو (الامرد) بکات. ئیبنو ئەبی دونیا ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (گشت چاوەکان دەگرین لەڕۆژی قیامەتدا جگە لە چاوێك کە خۆی لادابێت لە قەدەغەکراوەکانی خوداو چاوێکیش لە ڕێگەی خوادا بە خەبەر بووبێتو چاوێکیش بە ئەندازەی سەری مێشێك فرمێسکی لێ بێتە دەرەوە لە ترسی خوای گەورە)[3].

﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾

**بڕیاری خۆدا پۆشین**

ئەمە فەرمانێکی خوای گەورەیە بۆ ژنانی خاوەنباوەڕ، وە ڕێزێکیشە لە خواوە بۆ مێرەدەکانیان لە بەندە خاوەنباوەڕەکانی خۆیو جیاکردنەوەی ژنەباوەڕدارەکانیشە لە ڕەوشتو هەڵسوکەوتی ژنانی بتپەرستی ئەو سەردەمی نەفامیە، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە موقاتیلی کوڕی حەیان باسی کردووە دەڵێ: ئاگادار کراین (والله أعلم) کە جابیری کوڕی عبدالله ی ئەنساری گێڕاویەتیەوە کە ئەسمای کچی مورسەدە لە شوێنێکی – محل – خۆیدا بوو لە ناو بەنی حاریسەدا، ژنان دەچوونە ژوورەوە بۆ لایو خۆیان دانەدەپۆشی، ئەو خرخاڵەی لە پایاندا بوو دەردەکەوت پەلکەکان و سنگو بەرملیان دەرئەخست بوو ئەسماء دەڵێ: ئەم ڕووتیە چەند ناشیرینە! خوای

---

[1] فتح الباري (١١/٢٨).

[2] مسلم (٤/٢٠٤٧).

[3] الفردوس للدليمي (٣/٢٥٦)، الدر المنثور (٦/١٧٨).

گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾،[1]
خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ﴾ بە ژنانی خاوەن باوەڕ بڵێ ئەی محمد (ﷺ) با چاو داخەن لە ڕووی ئەو پیاوانەی کە خودا حەرامی کردووە سەیری بکەن جگە لە پیاوەکانی خۆیان، هەندێك لە زانایان ڕایان وایە دروستە سەیرکردنی بێگانە بەبێ ئارەزوو — شەهوەت — وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)کاتێك سەیری قولە ڕەشەکانی (الحبشة) دەکرد کە بە حەربەکانیان یارییان دەکرد لە مزگەوتداو لە ڕۆژی جەژندا، عائیشەش _دایکی موسڵمانان_ سەیری دەکردن لە دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) بەردەمی عائیشەی گرتبوو ئەوان نەیاندەبینی، هەتا عائیشە ماندوو ئەبوو ئەگەڕایەوە[2]، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾ واتە: هیچ کەسێك چاوی پێ نەکەوێت،[3] وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾ واتە: شتە جوانەکان دەرنەخەن بۆ بێگانە مەگین شتێك کە نەتوانرێت بشارێتەوە، ئیبنو مەسعود دەڵێ: وەك پۆشاكو جلوبەرك،[4] مەبەست پێی ئەو شتانەی کە ژنانی عەرەب پێی ڕاهاتوون وەك سەرپۆشو ئەو شتانەی کە لە خوارەوە دەردەکەونو دیارن، ئەوانە هیچ خراپیەکی تێدا نیەو ناشاردرێنەوەو هاوێنەی ئەو شتانەش کە ژنان دەیپۆشنو ناتوانرێت بشاردرێتەوە . حەسەنو ئیبنو سیرینو ئەبو لجەوزاو ئیبراهیمی نەخەعیو کەسانی تریش هەمان قسەی ئیبنو مەسعودیان کردوە،[5] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ واتە باسەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سنگیاندا بۆ شاردنەوەی سنگو مەمکیان، تا جیا ببنەوە لە باوو دروشمی ژنانی کۆمەڵی نەفامی، چونکە ئەوانە شتی وایان نەدەپۆشی، بەڵکو هاتوچۆیان دەکرد بەناو پیاوانداو سنگیان دەردەخستو بە هیچ شتێ دانەپۆشرابوو، وە زۆرجار گەردنو ملو قژو گوارەی گوێیان دەردەخست، خودای مەزنیش فەرمانی دا بە ژنە خاوەنباوەڕەکان کە خۆیان داپۆشن بەو شێوەیەی کە فەرمانیان پێکراوە لە هەڵسوکەوتو ژیانی ڕۆژانەیاندا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا

[1] الدر المنثور (١٧٩/٦).
[2] البخاري (٤٥٤) وغيره.
[3] الطبري (١٥٤/١٩).
[4] الطبري (١٥٦/١٩).
[5] الطبري (١٥٦/١٩).

یۆذَیْنَ﴾،[1] وە لەم ئایەتەیشدا فەرموویەتی: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾، (الخمر) کۆی (خمار) واتە: ئەوەی سەری پێ دادەپۆشرێت، ئەوەی کە خەڵکی بەسەرپۆش ناوی دەبەن، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ واتە: با سەرپۆشەکان بدەن بەسەرو سنگی خۆیاندا هەتا هیچی لێوە دەرنەکەوێت،[2] بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ:ڕەحمەتی خوا برژێت بەسەر ژنە کۆچەریەکانی پێشیندا کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ قۆڵی پۆشاکەکانیان دەبڕیو سەریان پێ دادەپۆشی،[3] دیسان ڕیوایەت کراوە لە سەفیەی کچی شەیبەوە کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾ پۆشاکەکانیان لە هەر چواردەورەوە دەبڕیو خۆیانیان پێ دادەپۆشی[4]، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ واتە: جوانیەکانی خۆیان دەرنەخەن مەگین بۆ مێردەکانیان نەبێت: ﴿أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ﴾ واتە: یا باوکیان یان باوکی مێردەکانیان یا کوڕەکانیان یا کوڕی مێردەکانیان یان براکانیان یا کوڕی براکانیان یان کوڕی خوشکەکانیان . ئەمانە هەموو مەحرەمی ژنن‌و دروستە خۆڕازاندنەوە لە لایاندا بەڵام زیادەڕەوی تێدا نەبێت لاشەیان دەرنەخەن، ئیبنول مونزیر ڕیوایەتی کردووە لە عیکریمەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە، دەڵێ: باسی مام‌و خاڵ نەکراوە چونکە مام‌و خاڵی منداڵەکانیانن، سەرپۆش لای مام‌و خاڵ دانادرێتەوە.[5] بەڵام مێر هەموو شتێك لەبەر خاتری ئەوەو خۆڕازاندنەوە بۆ ئەو بە شێوەیەکە، لە لای کەسی تردا بەو شێوەیە دروست نیە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوْ نِسَآئِهِنَّ﴾ واتە: جوانی خۆی دەردەخات بۆ ژنانی خاوەن باوەڕ بەڵام ئەو ژنانە نابێت لای پیاوەکانیان باسی

---

[1] الاحزاب (٥٩)، واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ بە هاوسەرانت‌و بە کچانت‌و بە ئافرەتانی بڕواداران با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان‌و جوانیانی پێ داپۆشن) ئەوە نزیکترە بناسرێن (بە داوێن پاك) تا بە هۆیەوە ئازار نەدرێن.

[2] الدر المنثور (١٨٢/٦).

[3] فتح الباري (٣٤٧/٨).

[4] فتح الباري (٣٤٧/٨).

[5] ابن لبي شيبة (٣٣٨/٤).

بکەن، بەڵام نابێت جوانیەکانی خۆیان بۆ ئەهلی زیمە دەر بخەن، چونکە هیچ لەمپەرێك نیە لای مێردەکانیان باسی بکەن، بەڵام ژنی موسڵمان دەزانێ باسکردنی ئەوشتانەحەرامە و تۆڵەیان لێ دەسەندرێت بۆیەنایکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: با ژن خۆی لە ژنەوە نەداو، واتە: بە ڕووتی دەستی لێ نەداو سەیری نەکات دوایی بۆ مێردەکەی باسی بکات وەك ئەوەی چاوی لێیەتی)ئەم فەرمودەیە بوخاری‌و موسلیم لە هەدوو صەحسحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە،[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ﴾ ئیبنو جەریر دەڵێ: واتە: یان لە لای ئافرەتانی بتپەرست، دروستە ژنی موسڵمان جوانی خۆی دەرخات بۆی هەرچەندە بتپەرستیشە، لەبەرئەوەی کەنیزەکی ژنەکە خۆیەتی.[2] سەعیدی کوڕی موسەیب هەمان بۆچوونی هەبووە،[3] وە دەفەرمووێت: ﴿ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ﴾ واتە: یان ئەو پیاوانەی کەم ئەندامن‌و ئارەزووی جنسیان نیەو عەقڵیشیان تەواو نیەو گێژن، ئیبنو عەباس دەڵێ: ئەو بێئاگایەی کە ئارەزووی نیە (لا شهوة له)،[4] عیکریمە دەڵێ:بریتیە لەونێرەمووکەی کە زەکەری هەڵناسێت! و زۆرێك لە زانایانی پێشینەش هەر وایان وتووە. وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە عائیشەوە دەڵێ:نێرەموك دەهاتە ناو خێزانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)وایان دادەنا لەو کەسانەیە کە ئارەزووی ژنیان نیەو کەم عەقڵە، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە ژوورەوە ئەو پیاوە وەسفی ژنێکی دەکردو دەیگوت: ئەو ژنە کە دێت بە چوار دێت و کاتێکیش پشت هەڵدەکات و دەڕوات بە هەشت دەڕوات! واتە: ئەوەندە قەڵەوەو گۆشت پڕە ورگی لۆچی تێ دەکەوێت‌و لۆچەکانی دەبینرێت،(کابراشتەکەی پێ جوان دەبێت) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئاگادارین !من وائەبینم ئەمە بزانێت ئا ئێرە چی تێدائەگوزەرێ؟ با لەمەودوا نەیەتە ژوورەوە بۆ لاتان)،دوای ئەوە دەری کرد،ئیتر دوای ئەوە هەموورۆژێکی هەینی دەهات بۆئەوەی خواردنی بدرێتێ لەدەرەوە ئەوەستاو نەئەهاتەژوورەوە.[5] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ﴾ یان ئەو مندالانەی نەگەیشتوونەتە ئەو تەمەنەی کە ئارەزوویان بچێتە سەر مێینە لەبەر بچووکیان لە ژیانی ئافرەتان‌و نەرمی قسەیان‌و سەرنج ڕاکێشانی پیاوان بۆ خۆیان لەهەڵسوکەوتیاندا، کە منداڵ بچووك بوو لەوە ناگات، بۆیە ئاساییە بچێتە ناو ژنان، بەڵام ئەگەر

---

[1] فتح الباري (٩/٢٥٠).

[2] الطبري (١٩/١٦٠).

[3] الدر المنثور (٦/١٨٣).

[4] الطبري (١٩/١٦١).

[5] مسلم (٤/١٧١٥، ١٧١٦)، أحمد (٦/١٥٢)، أبو داود (٥/٢٢٤)، النسائي في الكبرى (٥/٣٩٥).

چووە ناو ئەو تەمەنەی ئارەزووی مێینە بکات یان بەرەو ئەوە دەچوو کە ئەوە بزانێتو جیاوازی لە نێوان ژنی جوانو ناشیریندا بکات، ئەوە بۆی نیە بچێتە ناو ژنان، لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە گێڕاویانەتەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (نەکەن بچنە ناو ژنان) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەگەر خزمی ژنەکەش بوو(ارأيت الحمو؟) فەرمووی: (الحمو الموت)[1] واتە:خزمی ژن ئەوەمەر مردنە،یانی برای یان برازای یان ئامۆزای ژن مایەوە بە تەنها لەگەڵ ژنەکەی ئەوە مردنە، واتە: دەبێتە هۆی لەناوبردنی ئایینو نەمانی خۆشیان.(خزمی پیاوەکەش هەمان حوکمی هەیە)[2].

## شێوازی – ئادابی – ڕۆیشتنی ژنان لەناو ڕێگادا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ﴾ واتە: قاچیان نەدەن بە زەویدا، یانی: ژنان لە زەمانی نەفامیدا کاتێك بەناو ڕێگادا بڕۆیشتایەو زریزەی خرخاڵەکانی پێ ی نرەی لێوەی نەهاتایە، پاکانی دەکێشا بە زەویداو پیاوانی لێ ئاگادار دەکرد، خوای گەورە ئەم کارەی لە ژنە خاوەنباوەڕەکان قەدەغەکرد، وە ئەگەر شتێکی جوانی لەبەردا بێت ودیارنەبێت وئەم بە شێوەیەك بجوڵێتەوە تا ئەو شتەی کە دیار نیەو داپۆشراوە دەربکەوێت، ئەمەیش بەر ئەو قەدەغەیە دەکەوێت کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە،[3] وەدیسان ئەچێتە ناوئەو قەدەغەکراوانە عەترو بۆن خۆش لەخۆدان لە کاتی چوونە دەرەوەی ژنان لە ماڵەوە، کەپیاوان بۆنەکەی هەڵ دەمژن.بەبەڵگەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ص)کە ترمیزی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو موساوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (گشت چاوێ زیناکەرە، ئەو ژنەی کاتێ بۆنی خۆش لە خۆی دەدات بەناو کۆمەڵو خەڵکدا تێدەپەڕێت ئەوە ئاواو ئاوایە) واتە: زیناکەرە. دەڵێ: وەهەر لەم بابەدا ڕیوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەوە وە ئەم فەرموودەیە چاكو ڕاستە،[4] ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە،[5] وە هەر لەم بارەیەوە دیسان ئەوەش قەدەغەکراوە کە ڕنافرەتان بە ناوەڕاستی ڕێگاداهاتوچۆبکەن، چونکە ئەمەیش جۆرێکە لە خۆدەرخستنو ڕازانەوە بۆ بێگانە، ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لەحەمزەی کوڕی ئەبو ئەسیدی ئەنساریەوە ئەمیش لە

---

[1] فتح الباري (٥/٢٤٢)، مسلم (٤/١٧١١).

[2] زانایان ئەفەرمون:تێکەڵاویکردنی خزمی ژن وخزمی مێرد لەگەڵ ئافرەتاندا وەك مردن وایە ،چونکە خانەگومانی دروست ئەکات وتۆوی بێسۆزی لەناو خزماندا ئەچێنێت وئەبێتەهۆی ئاژاوەوشەڕوکوشت وکوشتاریش لەبەرئەوەی زیادلەسنور هاتوچۆی یەکتری دەکەن ولەگەڵیەکتردا ئەمێننەوە..(الحلال والحرام: يوسف القرضاوي)

[3] ﴿لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ﴾، واتە: بزانرێت بەو جوانیەی پێیان کە شاردوویانەتەوە.

[4] تحفة الاحوزي (٨/٧٠).

[5] أبو داود (٤/٤٠٠)، النسائي (٨/١٥٣).

باوکیەوە کە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)کاتێك کە لە دەرەوەی مزگەوت بوو،بینی ژنان لەگەڵ پیاوان تێکەڵاو بوون لەناو ڕێگادا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی بە ژنان: (ئێوەخۆتان دوا بخەن، چونکە بۆتان نیە لە ناوەڕاستی ڕێگادا بڕۆن، ئێوەبە لێواری ڕێگاکەدا بڕۆن)،دوای ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ص) ژنان ئەوەندە قەراغی جادەکانیان ئەگرت لەڕۆشتندا ،پۆشاکەکانیان ئەلکابە دیوارەکانەوە،[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾،[2] یانی ئەوەی فەرمانتان پێ دەکەم جێبەجێی بکەن لەو ڕەوشتە جوانو چاکانە، واز بێنن لەو ڕەوشتە خراپو ناشیرینانەی کۆمەڵی نەفامان، چونکە ڕزگاری و سەرفرازی هەر لەو ڕەوشتانەوە وەدەست دێت کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فەرمانیان پێ کردووە، دوورکەوتنەوەلەو شتانەش کە قەدەغەیان کردووە. هەر خوای گەورە یارمەتی دەرو پشتیوانە.

﴿وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُواْ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُواْ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾﴾

### فەرماندان بە ژن هێنانو ژن بەشوودان

ئەم ئایەتە پیرۆزانە پێکهاتوون لە چەند بڕیارێکی توندوتۆڵو چەند فەرمانی کاربڕو تەواوو ڕێکوپێك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ﴾ ، واتە: ژن مارە ببڕن بۆ پیاوانی بێ ژنو ژنانی بێ مێردیش بدەن بە شوو،[3] تا کۆتایی ئایەتەکە. ئەمە فەرمانە بە ژنهێنان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی گرووپی گەنجان ! هەر کەسێك لە ئێوە توانای ژنهێنانی هەیە با ژن بێنێ، چونکە باشترین قەڵغانە بۆ چاوو چاکترین پارێزەریشە بۆ شەرمگە — الفرج

---

[1] أبو داود (٤٢٢/٥).سبحان الله !ئافرەتانی بەرەی صەحابەچەندەبەدین وگوێڕایەڵ بوون، هەرئەوەندەی پێغەمبەر (ص)وای پێ فەرموون ،ناوەڕاستی ڕێگەکانیان وازلێهێناو قەراغی ڕێگەکانیان ئەگرت،کەچی بەداخەوە ئافرەتی ئەم سەردەمەی ئێمەلەباتی گوێڕایەڵی ئەکەونە پرسیارکردن وئەمەبۆچی وایەو بۆچی ئەبێ وابێ! ! هەربۆیەبەرەکەت لەویەرەیەدامەبوو،لەم بەرەیەشدا ئەوەندە کزبووە ! !

[2] واتە: هەمووتان تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ئەی ئیمانداران تا ڕزگارو سەرکەوتوو بن.

[3] هەروەها ئەوانەی ئیماندارو چاکن لە کۆیلەکان (ژنیان بۆ بێنن)و کەنیزەکەکانیش بدەن بە شوو.

– وە کەسێك لە ئێوە توانای ژن هێنانی نەبوو با ڕۆژوو بگرێت، چونکە ڕۆژوو خەساندنە بۆی) واتە: ئارەزووی کەم دەکاتەوە.ئەم فەرموودەیە لە هەردوو صەحیحەکەدا ڕیوایەت کراوە لە فەرموودەکەی ئیبنو مەسعودەوە،[1] وە لە (سونەنە)کاندا هاتووە جگە لەم شێوەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ژن بخوازن‌و با منداڵتان ببێت‌و زۆر بن، چونکە من شانازیتان پێوە دەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا لە ناو گەلاندا)،[2] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە (هەتا بە مردوویش لە دایك بووبێت) ﴿ٱلۡأَيَـٰمَىٰ﴾ کۆی (أیم)ە، ئەم وتەیە دەگوترێت بۆ ژنێ کە مێردی نەبێت وە بۆ پیاوێکیش ژنی نەبێت یان ژنیشی هێنابێت‌و لێی جیابووبێتەوە یان پیاکەوە هەر ژنی نەهێنابێت‌و ژنەکەش شووی نەکردبێت، جەوهەری (الجوهری) باسی کردووە لە زانایانی زمانەوەئەوتریێ :– (رجل أیم – وأمرأةأیم) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾،[3] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەگێڕێتەوە کەووتویەتی : خوای گەورە هانیان دەدات بۆ ژن هێنان، خوای گەورە فەرمانی داوە بە ئازادو بەندەیش کە ژن بێنن، بەڵێنیشی داوە پێیان بێنیازیان بکات.[4] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ وە لە ئیبنو مەسعودەوە گێڕاوەتەوەکەدەڵێ: دەوڵەمەندی وەدەست بێنن بە ژن هێنان ! خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئیبنو جەریرئەمەی ڕیوایەت کردووە،[5] بەغەویش هەر بەم شێوەیە باسی کردووە لە عومەرەوە ،[6] لە محمدی کوڕی عەجلانەوە لە سەعیدی کوڕی مەقبەریەوە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (سێ کەس مافیان بەسەر خواوەهەیە کە یارمەتیان بدات – ژن خوازێ دەیەوێت داوێنپاك بێت، (موکاتیبێ)[7] دەیەوێت ئەو ماڵەی لەسەری دانراوە بیدا بە خاوەنەکەی ، غەزاکەر لە ڕێی خوادا) ئیمامی ئەحمەدو ترمیزیو نەسائیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە،[8]

---

[1] فتح الباري (١٤/٩)، مسلم (١٠١٩/٢).

[2] لم نعثر على هذا اللفظ، وإنما رواه أبو داود والنسائي بلفظ قريب من هذا.

[3] واتە: ئەگەر ئەوان هەژارو کەم دەست بن خوا لە بەخشندەیی‌و بەهرەی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازیان دەکات.

[4] الطري (١٦٦/١٩).

[5] الطبري (١٦٦/١٩).

[6] البغوي (٣٤٢/٣).

[7] موکاتیب:ئەوکۆیلەیە کەقەواڵەی نووسیوە بۆسەردارەکەی کە بە بڕێك پارە خۆی بکڕێتەوە وئیترئازاد ببێت ولەکۆیلەیەتی ڕزگاری ببێت ،ئەو ڕۆژەی قەواڵەکە ئەنووسێت ئازاد ئەبێت وپرەپارەکە ئەبێتە قەرز لەلای .

[8] أحمد (٢٥١/٢)، تحفة الأحوزي (٢٩٦/٥)، النسائي (٦١/٦)، إبن ماجه (٨٤١/٢).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژنی خواست بۆ ئەو پیاوەی کە هیچی نەبوو جگە لەو پۆشاکەی لەبەریدا بوو، توانای کڕینی ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی نەبوو، کەچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کردیە هاوسەری ئەو ژنەو مارەییەکەی ئەوەبوو کە ئەو پیاوە چەندێك قورئانی لەبەرە پێویستە ژنەکەی فێر بکات، خودای مەزنیش بە سۆزو ڕێزی خۆی بژێوی خۆیو ژنەکەی دابین دەکات بە تەواوی، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ واتە: وە خوا بەهرە فراوانو زاناو دانایە.

## فەرماندان بە پاکداوێنی ئەو کەسانەی توانای ژن خواستنیان نیە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ﴾ ئەمە فەرمانێکە لە لایەن خوداوە بۆ ئەو کەسانەی توانای ژن هێنانیان نیە کە دەبێت پاك داوێنی خۆیان بپارێزنو خۆیان تووشی داوێن پیسی نەکەن هەتا خوا بە بەهرە (و ڕۆزی) خۆی بێنیازیان دەکات، وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی کۆمەڵی لاوان هەر کەسێك لە ئێوە دەتوانێت زەماوەند بکات، با بیکات چونکە ئەو ژن هێنانە باشترین شتە بۆ داپۆشینی چاوو چاکترین پارێزەریشە بۆشەرمگە – الفرج – وە هەر کەسێکیش لە ئێوە توانای ژن هێنانی نیە با ڕۆژوو بگرێت، چونکە ئەو ڕۆژوە ئارەزووی دەگرێتەوە – دەیخەسێنێت –).[1] ئەم ئایەتە گشتگیرە بەڵام ئەو ئایەتەی لە (سورەتی نیساء)دایە تایبەتترە لەم ئایەتە. کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾،[2] چونکە ئەو منداڵە بە کۆیلەیی

---

[1] فتح الباري (٩/١٤).

[2] النساء (٢٥)، واتە: وە ئەوەی لە ئێوە نەیتوانی لەبەر هەژاری کە ئافرەتانی ئازادی ئیماندار مارە بکات ئەوا بـا لەوانـە مارە بکات کە بوونەتە موڵکتان لە کەنیزەکە ئیماندارەکانتان وە خوا زاناترە لە باوەڕەکـەتان هەنـدێکتان لـە هەنـدێکی ترتانن (هەمووتان نەوەی ئادەمن) لەبەر ئەوە مارەیان بکەن بە ڕەزامەندی خاوەنەکانیانو مارەییەکەیان پـێ بـدەن بـە شێوازێکی چاك لە کاتێکدا ئەو کەنیزەکانە پاکداوێن بن وداوێنپیس (و زیناکاری بە ئاشکرا) نـەبنو دۆستیان نـەبێ (بـە نهێنی بۆ زیناکردن) جا ئەگەر ئەو (کەنیزەکانە) شوویان کرد پاشان خراپەیـەکی ئاشـکرایان کرد (زینـا) ئـەوە نیـوەی سزای ئافرەتە ئازادەکانیان لەسەرە (کە پەنجا جەڵدە) ئەو (مارەکردنی کەنیزەکە) بۆ کەسێکە لـە ئێـوە لـە تـاوانکردن واتە(زینا) بترسێت بەڵام ئەگەر ئارام بگرن (و کەنیزەك مارە نەکەن) چاکترە بۆتان.

لە دایك دەبێت ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: خودایش گوناه بەخشو دلۆڤانە. عیکریمە لەم ئایەتەدا دەڵێ: ﴿وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا﴾ ئەو پیاوەی چاوی دەکەوێت بە ژنێك وەك ئەوەی ئارەزوو دەکات، ئەگەر ژنی هەبوو با بڕوات بۆ لای ژنەکەیو پێویستی خۆی دەرکات لە ژنەکەی خۆی، خۆ ئەگەر ژنیشی نەبوو با تێڕامێنێ لە دەسەڵاتی خودا لە ئاسمانەکانو زەمیندا هەتا خوا دەوڵەمەندی دەکات.

### فەرماندان بە قەواڵە(سەنەد) نووسین بۆ کۆیلەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرًا﴾ ئەمە فەرمانی خودایە بۆ ئەو خاوەن دەسەڵاتانەی، ئەگەر کۆیلەکانیان داوای قەواڵە نووسینیان لێ کردن با قەواڵەیان بۆ بنووسن بە مەرجێك ئەو کۆیلەیە توانای ئیشو ماڵ پەیداکردنی هەبێت، ئەو ماڵەی پەیدای دەکاتو بە مەرج گیراوە لەسەری دەبێت بیدات بە خاوەنەکەی. بوخاری دەڵێت: ئیبنو جورەیج دەڵێ: وتم بە عەتا: ئایا پێویستە لەسەرم کاتێك ماڵم پێوە بینی قەواڵەی بۆبنووسم؟ وتی: وا نازانم پێویست نەبێت، واتە پێویستە قەواڵەی بۆبنووسی، عەمری کوڕی دینار دەڵێ: وتم بە عەتا: ئایا لەئەوەت لەکەسێك بیستوە؟ وتی: نەخێر، پاشان هەواڵی دامێ کە (موسای کوڕی ئەنەس) پێی گوتووە کە سیرین داوای لە ئەنەس کردووە کەقەواڵەی بۆبنووسێت ، چونکە خاوەنی سامانێکی زۆربووە،ئەنەس قەبوڵی نەکردووەو پاشان چووە بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت)ئەمەی پێ وتووە. عومەر وتوویەتی: قەواڵی بۆبنووسە. هەر قەبوڵی نەکردووە. عومەر بەدارەکەی دەستی بەر شەلاقی داوەو ئەم ئایەتەی بۆ خوێندووەتەوە: ﴿فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرًا﴾_قەواڵەیان بۆبنووسن کاتێك خێریان تێدا ئەبینن_ئەنەسیش قەواڵەکەی بۆنووسی، هەر بەم شێوەیەش بوخاری ڕیوایەتی کردووە بە تەعلیقی ،[1] عبدالرزاقیش ڕیوایەتی کردووە کە ئیبنو جورەیج هەواڵی داونەتێ دەڵێ: ووتم بە عەتا: ئایا پێویستە لەسەرم کاتێ زانیم کە خاوەنی ماڵە قەواڵەی بۆبنووسم؟ گوتی: وا نابینم کە پێویست نەبێت.[2] دیسان ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە (سیرین) ویستوویەتی قەواڵەی بۆ بنووسێت، ئەویش قبوڵی نەکردووە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی وتووە: دەبێ قەواڵەی بۆ بنووسێت، سەنەدەکانی ئەم فەرموودانە صەحیح و ڕاستن،[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرًا﴾ هەندێك گوتوویانە: ئەگەر خاوەن

---

[1] فتح الباري (٢١٩/٥).

[2] عبدالرزاق (٣٧١/٨).

[3] الطبري (١٦٧/١٩).

ئەمانەت بوون. هەندێکی تر گوتوویانە: ئەگەر ڕاستگۆ بوون. هەندێکی تر گوتوویانە ئەگەر خاوەن سامان بوون، هەندێکی تر گوتوویانە: ئەگەر توانای ئیش‌و کاریان هەبوو. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ﴾ واتە: وە لەو ماڵەی کە خوا بە ئێوەی داوە پێیان بدەن. ئەو بەشەی کە خوا بۆی داناون لە ماڵی زەکات، ئەمە قسەی حەسەن‌و عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و باوکی‌و موقاتیلی کوڕی حەییان‌و ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەبووە،[1] ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێ: لەم ئایەتەدا: ﴿وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ﴾ واتە: خەڵکی هانداوە لەسەر ماڵ بەخشین چ خاوەنەکەی یان کەسانی تر، بورەیدەی کوڕی حوسەیبی ئەسلەمی و قەتادەش هەر وایان گوتووە، ئیبنو عەباس دەڵێ: خودای مەزن فەرمانی داوە بڕواداران کە هاوکاری بکەن لە کۆیلە ئازادکردندا.

**نەهی کردن لە ناچارکردنی کەنیزەك لەسەر داوێنپیسی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ﴾واتە:کەنیزەکەکانتان ناچارمەکەن لەسەرداوێنپیسی، خەڵکی زەمانی نەفامی ئەگەر کەنیزەکێکیان ببوایە دینارد بۆ داوێنپیسی‌و گومرگێکی لەسەر دانابوو هەموو کاتێك لێی دەسەند، کاتێك کە ئیسلام هات ئەوەی لە موسڵمانان قەدەغەکرد، هەر ئەوەیش بوو، بووە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە، وەك زۆرێك لە زانایانی تەفسیرو لە پێشینەکان‌و پاشینەکانیش باسیان کردووەو وتوویانە:ئەم ئایەتە لەسەر عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هاتووەوە خوارەوە. چونکە ئەو کەنیزەکی هەبووە، زۆری لێدەکردن کە بچن داوێنپیسی بکەن، بۆ ئەوەی باجیان لێ بسێنێت‌و تەماحیشی بە منداڵەکانیان بووە، بۆ ئەوەی بە خەیاڵی خۆی بەکاریان بێنێ بۆ دەسەڵاتی خۆی.

**هەندێ (ئە ثە ر) وفەرموودە لەو بارەیەوە**

حافیز (الحافظ) ئەبو بەکر ئەحمەدی کوڕی عەمری کوڕی عبدولخالقی بەزاز ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە موسنەدەکەیدا لە زوهریەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: کەنیزەکێکی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هەبوو پێیان دەگوت مەعازە (معاذة)، عبدالله ی کوڕی ئوبەی زۆری بۆدەهێنا کە داوێنپیسی بکات. کاتێك کە ئیسلام هات ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ﴾،[2] ئەعمەش دەڵێ: ئەبو سوفیان لە جابیرەوە گێڕاویەتیەوە کەلەبارەی ئەم ئایەتەوە وتویەتی: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر کەنیزەکێکی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول، پێیان دەگوت موسەیکە (مُسَيكة) زۆری لێ دەکرد کە داوێن پیسیبکات، کەنیزەکێکی چاك بوو، ڕازی نەبوو کە داوێن پیسیبکات،خوای

---

[1] الطبري (١٩/١٧٣)، البغوي (٣/٦١).

[2] كشف الاستار (٣/٦١).

گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾،[1] نەسائیش بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[2] موقاتیلی کوڕی حەییان دەڵێ: وام پێگەیشتووە – والله أعلم – ئەم ئایەتە لەسەر دوو پیاو هاتۆتە خوارەوە کە زۆریان دەکرد لە کەنیزەکانیان کەداوێنپیسی بکەن، یەکێکیان ناوی موسەیکە – مسیکة – بوو کە هی ئەنصاریەك بوو، وە ئومەیمە – أميمة – دایکی موسەیکە کە کەنیزەی عبدالله ی کوڕی ئوبەی بوو،(مەعازەو ئەروا)ش هەروەك ئەوان وابوون موسەیکەو دایکی هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەو باسەیان بۆ گێڕایەوە، خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ﴾ واتە: کەنیزەکانتان ناچار مەکەن لەش بفرۆشن.[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ واتە: ئەگەر دەیانەوێت پاك بژین، ئەمە تەنها پەیوەندینیە بەم باسەوە بەڵكو بڕیارێکی گشتی یە،هەروەها دەفەرمووێت: ﴿لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ماڵی دنیاتان دەست کەوێت لەو زەریبەو مارەیی‌و منداڵانەی کە دیانبێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی لە کرێی خوێن گرتن‌و – کەڵەشاخ–و مارەیی– داوێنپیسی‌و شت دان بە فاڵچی کردووە.[4] وە لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی: کرێی زینا پیسە، کرێی خوێن گرتن – کەڵەشاخ – پیسە، نرخی سەگ – فرۆشتنی – پیسە).[5] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: هەر کەسێك ناچاریان بکات خودا دوای ناچارکردنیان لە گوناهیان دەبوورێت‌و دلۆڤانە. وەك لە فەرموودەکەی جابیردا لە پێشەوە باسکرا.[6] وە ئیبنو تەلحە دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە: تاوانەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە ناچاریان دەکات بۆ ئەو کارە پیسە.[7] موجاهیدو عەتای خۆراسانی‌و ئەعمەش‌و قەتادەیش هەر وایان گوتووە.[8] پاش ئەوەی خوای گەورە ئەم بڕیارەی بە تەواوی ڕوون کردەوە دەفەرمووێت:

---

[1] الطبري (١٩/١٧٤).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٤١٩).

[3] الدر المنثور (٦/١٩٣).

[4] مسلم (٣/١١٩٨).

[5] مسلم (٣/١١٩٩).

[6] النسائي في الكبرى (٦/٤١٩).

[7] الطبري (١٩/١٧٥).

[8] الطبري (١٩/١٧٥، ١٧٦)، الدر المنثور (٦/١٩٥).

﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ ءَايَـٰتٍ مُّبَيِّنَـٰتٍ﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە ناروومانەتە خوارەوە بۆ ئێوە چەند ئایەتێکی ڕوونکەرەوە. یانی: قورئان کە پڕە لە نیشانەی ئاشکراو دیارو ڕەوان ﴿وَمَثَلًا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: چەند نموونەو هەواڵی گەلە پێشووەکانی تێدایە کە چیان بەسەرهاتووە لەسەر دژایەتی کردنی فەرمانەکانی خودا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَجَعَلْنَـٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْـَٔاخِرِينَ﴾،[1] وە پەندو ئامۆژگاریشە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن‌و خۆدەپارێزن.

﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَـٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾﴾

**نموونەی ڕووناکی خوای گەورە**

عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەگێڕێتەوە لەتەفسیری ئەم لەم ئایەتەدا:﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ فەرموویەتی: خوا ڕێ نیشاندەری ئەهلی ئاسمانەکان‌و زەمینە.[2] ئیبنو جورەیج دەڵێ: موجاهیدو ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ وتویانە: کاروباری ئاسمانەکان‌و زەمین‌و ئەستێرەو خۆرو مانگ بەڕێوە دەبات[3].

"سودی" لەم ئایەتەدا ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ دەڵێ: بە ڕووناکی خۆی ئاسمانەکان‌و زەمینی ڕۆشن کردووەتەوە. لە هەردوو صەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا کاتێك هەڵدەسا لە شەودا، دەیفەرموو: (ئەی خودایە! سوپاس بۆ تۆیە، تۆ ڕووناکی ئاسمان‌و زەمینی‌و ئەوەیشی کە تێیدایە).[4] وە لە ئیبنو مەسعودەوەگێڕاوەتە کە دەڵێ: بێگومان پەروەردگاری ئێوە نە شەوی لە لایەو نە ڕۆژ، ڕووناکی عەرش ڕووناکی ڕووی ئەوە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ نُورِهِۦ﴾ لە ماناکردنی ئەم (ضمیر)ەدا دوو ڕا هەیە: یەکەمیان ئەو (زەمیرە) دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورە واتە: وێنەی ڕێ نیشاندانی خودا لە دڵی خاوەن باوەڕدا وەك

---

[1] زخرف (٥٦)، واتە: وە کردمانن بە نموونەو ئامۆژگاریی‌و پەند بۆ کەسانێ کە دواتر دێن.

[2] الطبري (١٩/١٧٧).

[3] الطبري (١٩/١٧٧).

[4] فتح الباري (٣/٥)، مسلم (١/٥٣٢).

تاقێك وایە ﴿كَمِشْكَوٰةٍ﴾ ئەمە قسەی ئیبنو عەباسە.[1] ڕای دووهەم ئەو (زەمیرە) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خاوەن باوەڕەی كەسیاقی ئایەتەكە دەبێتە بەڵگە لەسەری، كەماناكەی بەم شێوەیەی لێ دێت: وێنەی ڕووناكی خاوەن باوەڕە كە لە ناو دڵیدایە، وەك تاقێك وایە،خوای گەورەدڵی ئیماندارو ئەوسروشت و هیدایەتەی كە پێیدراوە لەگەڵ ئەو هیدایەتە زیادەی كەبەهۆی قورئانخوێندنەوە وەریدەگرێت یەكسان كردووەو بەیەكتری شوبهاندون. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ﴾،[2] واتە: ئاخۆ كەسێك لە پەروەردگاری خۆیەوە بەڵگەی ڕوونی پێدرابێت و شایەتێكیش لە خواوە بە شوێنیدا هاتبێت(وەك كەسێك وایەلەتاریكایدا بژی). خوای گەورە تەشبیهی دڵی خاوەن باوەڕی لە پاكو خاوێنیدا كردووە بە چرایەك كە لە شووشەی ناسكو ئەوەیشی كە دەبێتە ڕێ نیشاندەری لەو قورئانو بەرنامەیە كە بۆی هاتووە بە زەیتێكی چاكو پاڵفتەو درەوشاوەو مامناوەندی (المعتدل) كە هیچ خاشاكو لاریەكی – ترازانێكی – تێدا نیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَمِشْكَوٰةٍ﴾ موجاهیدو ئیبنو عەباسو محمدی كوڕی كەعبو كەسانی تریش وتوویانە: شوێنی پڵیتەكەیە لە چراكەدا.[3] ئەم تەفسیرە زۆر بەناوبانگە – مەشهورە –، بۆیە خوای گەورە لەدوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿فِيهَا مِصْبَاحٌ﴾ ئەو پڵیتەیەی كەدادەگیرسێت_ دەگرێو ڕۆشنایی دەدات – ، وە وتراویشە: ﴿كَمِشْكَوٰةٍ﴾ تاقێكە لەناوماڵدا، ئەمە نموونەیەكە كە خوای گەورە هێناویەتیەوە بۆ ئەو كەسانەی كە گوێڕایەڵی خودان، گوێڕایەڵیەكەی ناوناوە بە ڕووناكی، پاشان بە زۆر شتی تر ناوی بردووە، ئوبەی كوڕی كەعب دەڵێ: ﴿ٱلْمِصْبَاحُ﴾ واتە: ڕووناكی، كە بریتیە لە قورئانو ئەو باوەڕەی لە دڵی دایە.[4] سودی دەڵێ: ئەو چرایە: ﴿ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ﴾ واتە: ئەو ڕووناكیە درەوشاوەیە لەو شووشە ناسكو ڕوونەدا، ئوبەی كوڕی كەعبو كەسانی تریش وتوویانە: ئەو شوشەیە هاووێنەی دڵی خاوەن باوەڕە.[5] ﴿ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ﴾ واتە: ئەو شوشەیەش وەك ئەستێرەیەكی گەشو پڕشنگدار وایە، هەندێ ﴿دُرِّىٌّ﴾ دالەكەی بە مەزمومی (بضم الدال) خوێندووەتەوە، بەبێ ئەوەی هەمزەی لەگەڵدا بێت، واتە:

---

[1] الطبري (١٧٩/١٩).

[2] هود (١٧).

[3] الطبري (١٩/ ١٨٠، ١٨٣).

[4] الطبري (١٨١/١٩).

[5] الطبري (١٨٧/١٩).

وەك (كَوْكَبٍ من دُرّ)هەندێكی تر خوێندوويانەتەوە بە (دُرِّيٌّ ودِرِّيٌّ)يانی: دالەكەبە(ژێر) يان بە(بۆر) بخوێنرێتەوە لەگەڵ هەمزەكەدا كە لە (الدرء) ەوە هاتووە، واتە: پاڵ پێوەنان، چونكە كاتێك كە ئەستێرە پاڵی پێوە دەنرێت زياتر ڕووناكترە لە حاڵەتەكانی تری، عەرەبەكان ئەو ئەستێرانەی كە نەناسراون پێيان ئەڵێن: دەراری –دراری –. ئوبەی كوڕی كەعب لەتەفسيری(كوكب درّی)دا دەڵێ: ئەستێرەيەكی ڕووناك، قەتادە دەڵێ: ئەستێرەيەكی ڕووناكی گەورەی ئاشكرا. ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ واتە: دادەگيرسێت بە (ڕۆنی) درەختێكی زەيتونی بە فەڕو بەرەكەت. يانی يارمەتی وەردەگرێت لە زەيتی زەيتونی دارێكی پيرۆز ﴿ زَيۡتُونَةٍ﴾يان بەدەلە يان عەتفە بەيانە (بدل أو عطف بيان)، ﴿لَّا شَرۡقِيَّةٍ وَلَا غَرۡبِيَّةٍ﴾ واتە: لە ڕۆژهەڵاتی ئەو شوێنەوە نيە كە خۆر پێی نەكات لە سەرەتای بەيانيەوە، وە لە ڕۆژئاوايشيەوەلەشوێنێكدا نيە كە سێبەر داگيری بكات پێش خۆرئاوابوون، بەڵكو لە شوێنێكی مامناوەندی دايە خۆر لێی دەدا لە سەرەتای ڕۆژەوە هەتا كۆتايی ڕۆژ، زەيتێكی پاكو مامناوەندی بريقەدار بەرهەم دێنێت، ئيبنو ئەبی حاتم ڕيوايەتی كردووە لە ئيبنو عەباسەوەكەلەمانای ئەم ئايەتەدا ﴿ زَيۡتُونَةٍ لَّا شَرۡقِيَّةٍ وَلَا غَرۡبِيَّةٍ﴾، دەڵێ: درەختێكە لە بياباندا نە درەختو نە چياو نە ئەشكەوتو نە هيچ شتێكی تر سێبەری بۆ ناكات. ئەوە بووەتە هۆی ئەوەی چاكترين زەيتی هەبێت.[1] موجاهيديش لەم ئايەتەدا ﴿لَّا شَرۡقِيَّةٍ وَلَا غَرۡبِيَّةٍ﴾ دەڵێ: ئەوەندە لە ڕۆژهەڵاتەوە نيە هەتا خۆر لێی نەدا كاتێك كە خۆر ئاوا دەبێت وە زۆريش لە ڕۆژئاواوە نيە كە خۆر لێی نەدا كاتێك كە خۆر هەڵ دێت، بەڵكو ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوايشە، خۆر لێی دەدات كاتێك هەڵدێتو كاتێكيش كە ئاوا دەبێت،[2] سەعيدی كوڕی جوبەير لەم ئايەتەدا ﴿زَيۡتُونَةٍ لَّا شَرۡقِيَّةٍ وَلَا غَرۡبِيَّةٍ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ﴾ دەڵێ: ئەو زەيتە چاكترين زەيتە: كاتێك كە خۆر هەڵدێت بەری دەكەوێت لە ڕۆژهەڵاتەوە، كاتێكيش خۆر بەرەو ئاوابوون چوو هەر بەری دەكەوێت. بەيانی و ئێواران خۆر لێی دەدات، ئەم جۆرە پێی ناڵێن ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوايی، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٌ﴾ واتە: (ڕۆنەكەی ئەوەندە پاك بێت) نزيكە ڕۆنەكەی داگيرسێت با ئاگريشی بەرنەكەوێت . عبدالرحمن ی كوڕی زەيدی كوڕی ئەسلەم دەڵێ: واتە: لە پرشەی ڕووناكی ئەو زەيتە.[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ﴾ڕووناكی

---

[1] ابن ابي حاتم (٨/٢٦٠٠).

[2] الطبري (١٩/١٨٦).

[3] الطبري (١٩/١٨٣).

لەسەرڕووناکی دروست ئەبێت، عەونی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: واتە: بەهۆی باوەڕی عەبدو ئاکاریەوە.[1] سودی دەڵێت لەم ئایەتەدا ﴿نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ﴾ واتە: ڕووناکی لەسەر ڕووناکی، ڕووناکی ئاگرو ڕووناکی زەیت کاتێك کە کۆدەبنەوە دەدرەوشێنەوە، هیچ یەکێکیان بەبێ ئەوی تریان ڕووناك نابێت.[2]

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ﴾ واتە: خوا ڕێ نیشانی ئەو کەسانە دەدات کە خۆی هەڵی دەبژێرێت، وەك ئەو فەرموودەیەی کە ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) دەیفەرموو: (خوای گەورە دروستکراوەکانی خۆی وەدی هێنا لەناو تاریکیدا پاشان هەندێ لە ڕووناکی خۆی خستە ناویان لەو ڕۆژەدا، هەر کەسێك ئەو ڕووناکیەی بەرکەوت لەو ڕۆژەدا ڕێی دۆزیەوەو هەر کەسیش ئەو ڕووناکیەی بەرنەکەوت گومڕا بوو، لەبەر ئەوەیە ئەڵێم: پێنووس وشك بووەتەوە لە لای خودای مەزن)،[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ ۗ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ کاتێك خوا باسی نمونەی هیدایەتی خۆی کرد لەناو دڵی خاوەنباوەڕدا، کۆتایی ئایەتەکەی هێناوە بەمە کە دەفەرموێت: ﴿وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ ۗ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: وە خوا چەندین نموونە دەهێنێتەوە بۆ خەڵکی وە خوا زاناو ئاگادارە بە هەموو شتێك. یانی: خوا باشتر دەزانێت کێ شایستەی ڕێ نیشاندانەو کێش شایەنی گومڕاییە.

﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ يُسَبِّحُ لَهُ فِيهَا بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ ۙ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ ﴾

### ڕێزی مزگەوتەکان و ئادابەکانی و ڕێزی ئەوانەی کە پێ لە مزگەوت نابڕن

کاتێك خوای گەورە نموونەی دڵی خاوەنباوەڕو ئەوەی کە تیایەتی لە شارەزایی و زانیاری هێنایەوە بە چرایەك لەناو شوشەیەکی ڕونی پاکدایەو هەڵدەگیرسێت بە زەیتی پاك و باسی شوێنەکەیشی ئەکات، کە بریتیە لەو مزگەوتانەی کە خۆشەویستترین پارچە زەویە لە لای خوای گەورە، مزگەوت ئەو ماڵی خودایە کە تەنها ئەوی تێدا دەپەرسترێت و هاوەڵی بۆ دانانرێت تێیدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ اللَّهُ أَن تُرْفَعَ﴾ واتە: لەناو ئەو ماڵانەدا کە خودا ڕێگای داوە کە بە گەورەو پاك ڕابگیرێت

---

[1] الطبري (١٩/١٨٢).

[2] الدر المنثور (٦/٢٠٢).

[3] أحمد (٢/١٧٦).

ڕێزی لێ بگیرێتو فەرمانی داوە کە ئامەشۆی بکرێتو – پێی لێ نەبڕێت – پاکوخاوێنی ڕابگیرێتو قسەی پڕوپوچو کارێکی وەهای تێدا نەکرێت کە بۆ ئەو شوێنە ناشێ، وەك عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوەڕیوایەت کراوە کەلەتەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: ﴿فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ﴾ فەرموویەتی: خوای گەورە قسەی پڕوپوچی قەدەغە کردووە لە مزگەوتدا.[1] عیکریمەو ئەبو ساڵحو زەحاكو نافیعی کوڕی جوبەیرو ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو خەیسەمەو (خیثمة) سوفیانی کوڕی حوسەینو کەسانی تریش لە زانایانی تەفسیر جگە لەمان، وتوویانە: فەرموودەی زۆر هاتووە لەسەر دروستکردنی مزگەوتو ڕێزلێنانو پاكو خاوێنی ڕاگرتنو بۆن خۆش کردنی، ئەوانە شوێنێکی تایبەتی خۆیان هەیە باس بکرێن و باسێکی تەنیاوتایبەتم لەو بارەیەوە نووسیوە، سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە. ئێمە لێرەدا لایەنێك لەو بارەیەوە باس دەکەین خوا مەیلی لێ بێت پشتو پەناشمان هەر خوایە.

لە گەورەی موسڵمانانەوە عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێت) گوازراوەتەوە کە دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)دەیفەرموو: (هەر کەسێك مزگەوتێکی دروست کردبێت مەبەستی ڕەزای خوا بێت، خودا مزگەوتێکی وەك ئەوەی لە بەهەشتدا بۆ دروست کردووە) لە هەردوو سەحیحەکەدائەم فەرمودەیە هاتووە.[2] ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك مزگەوتێکی دروست کردبێت، باسی ناوی خودای تێدا کردبێت خودا ماڵێکی بۆ دروست کردووە لە بەهەشتدا)،[3] نەسائیش وەك ئەو ڕیوایەتی کردووە،[4] فەرمووده لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردین بە دروست کردنی مزگەوت لەناو ماڵەکانداو پاكو خاوێنیش بکرێتەوەو بۆن خۆشیش بکرێت. ئیمامی ئەحمەدو ئەهلی سونەنیش ڕیوایەتیان کردووە جگە لە نەسائی،[5] ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودیش ڕیوایەتیان کردووە لە سەمورەی کوڕی جوندەوبەوە (سمرة بن جندب) بەو شێوەیە.[6] بوخاری دەڵێ: عومەر دەڵێ: مزگەوتێك دروست بکە بۆ خەڵکی بە ئەندازەی ئەوەی کە

---

[1] الطبري (١٩/١٩١).

[2] فتح الباري (١/٦٤٨)، مسلم (١/٣٧٨).

[3] ابن ماجه (١/٢٤٣).

[4] النسائي (٢/٣١).

[5] أحمد (٦/٢٧٩)، تحفة الأحوزي (٣/٣٠٦)، ابن ماجه (١/٢٥٠).

[6] أحمد (٥/١٧)، أبو داود (١/٣١٥).

جێگایان ببێتەوە نەکەی سوورو زەردی بکەی – بیڕازێنیتەوە – سەر لە خەڵکی تێك بدەی.[١] وە ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (فەرمانم پێ نەکراوە بە بەرزکردنەوەی مزگەوت) ئیبنو عەباس دەڵێ:مەبەست ئەوەیە، نابێ بیڕازێنمەوە وەك چۆن گاورو جوولەکە دەیڕازێننەوە.[٢] ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژی قیامەت هەڵناسێت هەتا خەڵکی خۆیان لەناو مەزگەوتەکاندا هەڵدەبڕن –شانازی بە ڕازاندنەوەیەوە دەکەن). ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکان ڕیوایەتیان کردووە جگە لە ترمیزی.[٣] بورەیدەوە (بُرَيدة) دەڵێ: پیاوێك جاڕی دەدا لەناو مزگەوتدا دەیوت کێ ئاگاداری وشترێکی سورە؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی:(خوابکا) نەی دۆزیتەوە، مزگەوت بۆ ئەوە کراوە کە بۆی دروست کراوە) واتە: مزگەوت بۆ عیبادەت کردن دروست کراوە. موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[٤] وە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێك بینیتان کەسێك دەکڕێتو دەفرۆشێت لەناو مزگەوتدا، بڵێن: خوا قازانج نەخاتە بازرگانیەکەت وە ئەگەر بینیتان کەسێك جاڕی دەدا بۆ ونبووەکەی (ضالة) لەناو مزگەوتدا بڵێن: خودا بۆت نەگێڕێتەوە) واتە: یاخوا نەیدۆزیتەوە، ترمیزی ڕیوایەتی کردووەو دەڵێ: فەرموودەیەکی چاکی غەریبە – حسن غريب –[٥]، بۆخاریش لە سائیبی کوڕی یەزیدی کیندیەوە ڕیوایەتی ئەکات و دەڵێ: لە مزگەوتدا ڕاوەستابووم پیاوێك بەردێکی تێ گرتم سەیرم کرد عومەری کوڕی خەتاب بوو گوتی: بڕۆ ئەو دوو کەسەم بۆ بێنە، منیش چووم هێنامن، عومەر گوتی: ئێوە کێن؟ یان لە کوێوە هاتوون؟ گوتیان: خەڵکی تائیفین، دەڵێ: ئەگەرخەڵکی ئەم شارە بوونایە دارکاریم دەکردن، ئێوە دەنگتان بەرزدەکەنەوە لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا.[٦] واتە چۆن دەنگتان لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرز دەکەنەوە، نەسائیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عەوفەوە دەڵێ:عومەر گوێی لە دەنگی پیاوێکەوە بوو لە ناو مزگەوتدا. پێی گوت: ئایا دەزانی تۆ لە کوێدای؟ ئەم فەرموودەیەش صەحیحە.[٧] حافیز ئەبو یەعلای موسڵی (أبو يعلى الموصلي) ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە، کە عومەر

---

[١] فتح الباري (٦٤٢/١).

[٢] أبو داود (٣١٠/١).

[٣] أحمد (١٣٤/٣)، أبو داود (٣١١/١)، النسائي (٣٢/٢)، ابن ماجه (٢٤٤/١).

[٤] مسلم (٣٩٧/١).

[٥] تحفة الأحوزي (٥٥٠/٤).

[٦] فتح الباري (٦٦٧/١).

[٧] تحفة الاشراف (٤/٨).

مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆنخۆش دەکرد لە هەموو ڕۆژێکی هەینیدا سەنەدەکەی چاکەو خراپ نیە – والله أعلم –،[١] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (نوێژی ئەو پیاوەی بە کۆمەڵ (جەماعەت) دەیکات خێری زیاترە لەو نوێژەی لەماڵەوە یان لە بازاڕەکەیدا دەیکات بە بیستو پێنج قات). وە کاتێکیش کە دەستنوێژێکی چاك دەگرێتو پاشان لەماڵ دەڕواتە دەرەوە بۆ مزگەوتو هیچ مەبەستێکی تری نیە جگە لەو نوێژەی بۆی دەڕوات، هیچ هەنگاوێك نانێ مەگین خودا بەهۆی ئەو هەنگاوەیەوە پلەیەکی بەرزدەکاتەوەو گوناهێکی پێ دەسڕێتەوە بۆی. کاتێك نوێژیشی کرد بەردەوام فریشتەکان داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن لە لای خودا هەتا ئەو کەسە بمێنێتەوە لە شوێنی نوێژەکەیدا ئەڵێن: خودایە لێی خۆش بەو بەزەییت پێیدا بێتەوە، ئەوکەسە بەردەوام لە نێوژدایە هەتا چاوەڕوانی نوێژ بکات.[٢] لە سونەنەکاندا هاتووە: (مژدە بدە بەو کەسانەی لە تاریکیدا دەڕۆن بۆ مزگەوتەکان بە ڕووناکی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا).[٣] سونەتە ئەو کەسەی دەچێتە ناو مزگەوت پای ڕاستی پێش بخات وئەم دوعایەبلێت: وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کاتێك کە دەچووە ناو مزگەوت دەیفەرموو: (خۆم دەخەمەپەنای خودای مەزن، وپەنای ڕووی پڕفەڕوبەرەکەتی، وە دەسەڵاتی هەر بووی لە شەیتانی بێبەش لە ڕەحمەتی خوا)، دەڵێ کاتێك ئەمەی وت: شەیتان ئەڵێت:هەموو ئەمڕۆ پارێزراوە لە من.[٤] وە موسلیم ڕیوایەتی کردووە بە سەنەدی خۆی لە ئەبو حومەیدەوە یان ئەبو ئوسەیدەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێك یەکێکتان چووە ناو مزگەوت با بڵێت: ئەی خودایە دەرگاکانی بەزەیی خۆتم لێ والآ کە وەختێکیش هاتە دەرەوە بڵێ: ئەی خودایە داوای چاکەت ئەکەم!)،[٥] واتە: لە چاکەکانت بێ بەشم مەکە، نەسائیش ڕوایەتی کردووە لێیانەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)کە ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت)ریوایەتی کردووەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك یەکێکتان چووە مزگەوت با سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەرو (ﷺ) بڵێ: ئەی خوایە دەروازەکانی بەزەیی خۆتم لێ بکەرەوە، کاتێکیش ڕۆیشتە دەرەوە سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەرو (ﷺ) بڵێ: ئەی خودایە بمپارێزە لە شەیتانی بێبەشکراو لە بەزەیی – مەلعون –)،[٦] ئیبنو

---

[١] مسند أبي يعلى (١/١٧٠).

[٢] البخاري (٦٤٧)، مسلم (٦٤٩).

[٣] أبو داود (٥٦١)، الترمذي (٢٢٣).

[٤] أبو داود (٢/٣١٨).

[٥] مسلم (١/٤٩٤).

[٦] النسائي (٢/٥٣).

ماجەو ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حەیان ڕیوایەتیان کردووە لە سەحیحەکانیاندا.[1] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ﴾ واتا: ناوی خودایان تێدا ببرێت وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ﴾ واتە: ئەی نەوەی ئادەم، پۆشاکی جوانو ڕازاوەتان بپۆشن لە کاتی هەموو نوێژێکدا. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ واتە: وە لە کاتی هەموو نوێژێکدا ڕاست ڕووبکەنە خوا دڵسۆزانەو هاواری لێ بکەنو بیپەرستن. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ﴾ واتە: بێگومان مزگەوتەکان تایبەتی خوان . وە لێرەیشدا دەفەرموویت: ﴿وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ﴾، ئیبنو عەباس دەڵێ: واتە: لەناو مزگەوتەکاندا کتێبەکەی بخوێنرێتەوە.[2] پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ﴾ واتە: هەموو بەیانیو ئێوارانێ هەر باسی پاکیو بێ عەیبی خودای تێدا بکرێت ﴿وَٱلۡأٓصَالِ﴾ کۆی (أصيل) واتە: ڕۆژ، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿رِجَالٞ لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾[3] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوا دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە !باسەروەتەکانان ومناڵەکانتان لەیادی خوابێئاگاتان نەکات، ئەم ئایەتەش کە دەفەرموویت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ﴾ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە !کاتێك بانگکرابۆنوێژی هەینی،خێرابچن بەرەویادی خواو وازلە کڕین وفرۆشتن بهێنن.[4] خودای مەزن دەفەرموویت: خۆشیو ڕابواردنو ڕازاندنەوەو قازانجەکانی دنیا با یادی خوایان لە بیر نەباتەوە، ئەو خوایەی کە دروستی کردوونو بژێوی داون، ئەو کەسانە چاك دەزانن ئەوەی لای خودایە زۆر چاکترەو قازانجی زیاترە لەوەی کە هەیانەو لەبەر دەستیاندایە، چونکە ئەوەی لەبەر دەستی ئەوان دایە تەواو دەبێتو نامێنێت، بەڵام ئەوەی لای خودایە هەر دەمێنێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا تُلۡهِيهِمۡ تِجَٰرَةٞ وَلَا بَيۡعٌ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ﴾ واتە: پیاوانێك کە بازرگانیو کڕینو فرۆشتن بێ ئاگایان

---

[1] ابن ماجه (٢٥٤/١) ابن خزيمة (٢٣١/١)، ابن حيان (٢٤٦/٣، ٢٤٧).

[2] الطبري (١٩١/١٩).

[3] المنافقون (٩).

[4] الجمعة (٩).

ناکات لە یادی خواو نوێژکردنو زەکات دان. یانی: ئەو کەسانەی گوێڕایەڵیو خۆشەویستی خوداو فەرمانەکانی پێش مەبەستو خۆشەویستیەکانی خۆیان دەخەن، لە سالمەوە ئەویش لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ((ڕەزای خوایان لێ بێت)ئەگێڕنەوەکە دەڵێ: لە بازاڕدا بوو، بانگی دا، دوکانەکانیان داخستو چوونە مزگەوت ئەم ئایەتەیان لەسەر هاتە خوارەوە: ﴿رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾، ئیبنو ئەبی حاتمو ئیبنو جوبەیر ڕیوایەتیان کردووە،[1] عەلی کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ یانی: نە بازرگانیو نە کاروکەسابەت نوێژە فەرزەکانیان لەبیر نابات،[2] موقاتیلی کوڕی حەیانو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وایان گوتووە: "سودی" دەڵێ: نوێژی جەماعەتیان لەبیر نابات، موقاتیلی کوڕی حەیان دەڵێ: بازرگانیو کڕینو فرۆشتن دوایان ناخات لە ئامادەبوونیان لە کاتی نوێژەکانیداو بەو شێوەیەی خوای گەورە فەرمانی پێکردوون بەجێی دێنن و لەسەری بەردەوامنو پارێزگاری لێ دەکەنو کەمتەرخەمی تێدا ناکەن، خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ﴾ واتە: دەترسن لە ڕۆژی قیامەت کە چاو دڵەکان هەڵدەگەڕێن، وە لە ترسناکیو ناڕەحەتیو گەورەییو گرانیەکانی ئەو ڕۆژە وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْءَازِفَةِ إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ ﴾ واتە: وە ئەوان لە ڕۆژە نزیکە (قیامەت) بترسێنە لەو کاتەی دڵەکان (لە ترسان) گەیشتوونەتە گەروو، هەموو پیش دەخۆنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ﴾ واتە: بێگومان ئەو دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانیان تێیدا ئەبڵەق دەبن (وە نانوقێن لە ترسا). وە فەرموویەتی: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمِ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا﴾ واتە: وە خواردەمەنی دەرخواردی هەژارانو هەتیوانو دیلان دەدەن با حەزیشیان لێی بێت، (دەڵێن) بە ڕاستی ئێمە خواردەمەنیتان دەدەینێ هەر لەبەر خوا، چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە نە پاداشتو نە سوپاس، بە ڕاستی ئێمە لە سزای پەروەردگارمان دەترسین لە ڕۆژێکی ترشو تاڵو دژواردا، جا خوا لە بەدی ئەو ڕۆژە پاراستنی وە پێی دان پاراویو خۆشی. وە لێرەشدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟﴾ واتە: ئەوانە لەو کەسانەن کە خوای گەورە چاکەکانیان لێ قبوڵ دەکاتو پاداشتیان

---

[1] ابن ابي حاتم (٢٦٠٧/٨).

[2] الطبري (١٩٣/١٩).

دەداتەوەو لە گوناهیشیان دەبووریت ﴿وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ واتە: بە زیادیشەوە بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾ واتە: بە ڕاستی خوا قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناكات. وە فەرموویەتی: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا﴾ واتە: هەر کەسێك چاکە بکات ئەوە (لە ڕۆژی دواییدا) دە ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی بۆ هەیە. وە فەرموویەتی: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ واتە: کێیە ئەو کەسەی قەرز بدات بە خوا بە قەرزێکی باش. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ﴾ واتە: خوا لەمەش زیاتری دەکات بۆ هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت. وە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واتە: خودا مەیلی لە هەر کەسێك بێت ئەوەندە بژێوی دەداتێ لە ژمارە نەیەن.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ ﴾

## دوو نموونە لە جۆری خوانەناسان

ئەو دوو نموونەیە خودای گەورە هێناویەتیەوە لەسەر دوو جۆر لە خوانەناسان، وەك چۆن دوو نموونەی لەسەرتای سورەتی بەقەرەدالەسەر دووڕووەکان هێناوەتەوە: یەکێکیان ئاگریو ئەوی تریان ئاوی، وە وەك چۆن دوو نموونەیشی لە سورەتی ڕەعددا هێناوەتەوە لەوەی کە لە دڵەکاندا جێگیر دەبێت لە زانیاریولە ڕێنیشاندان: یەکێکیان ئاویو ئەوی تریان ئاگری، لە شوێنی خۆیاندا قسەمان لە هەردووکیان کرد لێرەدا پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوە، سوپاسو ستایش بۆ خودای مەزن، یەکەمیان لەم دوو نموونەیە، لە بارەی خوانەناسانەوەیە کە بانگی خەڵك دەکەن بۆ ئەو خوانەناسیەی خۆیانی لەسەرن بە خەیاڵی خۆیان وا دەزانن شتێکی چاکیان کردووە لەو کردارو بیروباوەڕەی کە هەیانەو بڵاوی دەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا شوێن کڵاوی بابردوو کەوتنو هیچ شتێکیان نەکردووە، نموونەی ئەوانە وەك ئەوە وایە کەسێك سەرابێکی چاو پێ بکەوێت لە بیابانێکدا کە وەك دەریایەکی گەورە چاو بدات، خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا﴾ واتە: وە ئەوانەی کە بێباوەڕن کردەوەکانیان وەك سەرابێك وایە لە بیابانێکدا کەسێکی زۆر تینو بە ئاوی دەزانێ (بە پەلە دەڕوات بۆی) کاتێ دەگاتە لای هیچ بەدی ناکات. (القيعة) کۆی (قاع) وەك (جار وجيرة)يان(قاع وقيعة) وە (القاع) دیسان تاکی

(القيعان) وەك گوتراوە (جار – جيران) يان(قاع وقيعان) كە بريتيە لەو زەمينە تەختو فراوانو ڕێكەی كە سەرابی تێدا پەيدا دەبێت، ئەم سەرابەيش پاش نيوەڕۆ پەيدا دەبێت، بەلآم ئەو سەرابەی لە هەوەڵی ڕۆژەوە پەيدا دەبێت، پێی ئەڵێن ئال – ال – وەك ئاوێك بەرچاو دەكەوێت لە نێوان ئاسمانو زەميندا، كاتێك كەسێك چاوی بەو سەرابە دەكەوێت پێويستی بە ئاو هەيە و تينوويەتی و وا دەزانێ ئاوە دەڕوات بۆ ئەوەی لێی بخواتەوە، كاتێك كە نزيكی دەبێتەوە هيچ نابينێ خوانەناسيش هەر بەو شێوەيە وا دەزانێ هەڵساوە بە كارێكو شتێكی وەدەست هێناوە بۆ خۆی، كاتێك گەيشتە لای خودای گەورە پرسياری لە كردەوەكانی كردو گفتوگۆی لەگەڵ كرا لەسەری، هيچ شتێكی چاكی نەبوو لێی وەرگيرێت لەبەر ئەوەی دڵسۆزی تێدا نەبووەو لەبەر خودای گەورە نەبووە يان لەسەر پەيڕەوو پرۆگرامی ئەو نەبوە. وە خوای گەورە فەرموويەتی: ﴿وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا﴾ واتە: هاتين هەر كردەوەيەكيان كردبوو هەموويمان وەكو تۆزی پرشوبڵاو لێكرد. وە لێرەيشدا فەرموويەتی: ﴿وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ واتە: (لە قيامەت كافر) دەبينێت خوا ئامادەيە لە لايدا ئينجا خوا باش پاداشتی دەداتێ وە خوا بەپەلەو چەسپانە لە لێپرسينەوەدا، هەر بەو شێوەيە ڕيوايەت كراوە لە ئوبەی كوڕی كەعبو ئيبنو عەباسو موجاهيدو قەتادەو كەسانی تريشەوە.[1] وە لە هەردوو سەحيحەكەدا هاتووە كە لە ڕۆژی قيامەتدا دەوترێت بە جوولەكە: ئێوە چيتان دەپەرست؟ ئەڵێن: ئێمە عوزەيری كوڕی خوامان دەپەرست، پێيان دەوترێت: درۆتان كرد خوا منداڵی بۆ خۆی دانەناوە چيتان دەوێ؟ ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان تينومانە، تێر ئاومان بكە، پێيان دەگوترێت: ئايا ئەوە دەبينن؟ ئاگرێكيان نيشان دەدرێت وەك سەراب وايە بەسەر يەكدا دەڕوات، بەرەو ئەو ئاگرە دەڕۆنو دەكەونە ناوی،[2] ئەم نموونەيە نموونەی ئەو كەسانەيە جەهلی مورەكەبيان هەيە، واتە: وا دەزانن چاكە دەكەن كەچی هەتا بينە قاقەيان لە تاوانو خراپەدا چەقيون – بەلآم ئەوانەی كە سادەو نەفامن – لە هيچ حاڵی نابن، زۆر بێ عەقڵن، شوێن پێشەوا خواناسەكانيان دەكەونو كەڕو لاڵو بێ ئاوەزن وێنەی ئەم كەسانە وەك ئەوەيە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ كَظُلُمَـٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ﴾ كردەوەی بێبڕوايان وەك تاريكايی ناو دەريايەكی زۆر قووڵ وايە قەتادە دەڵێ: يان وەك تاريكاييەك وايە لە دەريايەكی قوڵدا، ﴿يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَـٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا﴾ واتە: كە شەپۆل لەسەر شەپۆل دايپۆشابێت،

[1] الطبري (١٩/١٩٦).

[2] فتح الباري (١٣/٤٣١)، مسلم (١/١٦٨).

لەسەر ئەو شەپۆلەیشەوە هەورێکی ڕەشی باراناوی بێت تاریکیەکان نیشتبنە سەر یەکتری ئەگەر دەستی دەربهێنێت نزیکە دەستی خۆی نەبینێت . یانی ئەوەندە تاریکە بیەوێت دەستی خۆی ببینێت هەرگیز نای بینێت، ئەمە نمونەی دڵی خوانەناسی سادەی نەفامە، شوێنکەوتوویەکە کە ئاگای لە ژیانی ئەو کەسەش نیە کە شوێنی کەوتووەو پێشەوایی دەکات، وە نازانێت بۆ کوێش دەڕوات وەك لە مەسەلا (المثل) هاتووە بۆ مرۆڤی نەفام،پێی ئەوترێ: بۆ کوێ دەچی؟ دەڵێت: لەگەڵ ئەوانەم، پێی ئەوترێ: ئەوانە بۆ کوێ دەچن؟ دەڵێ: نازانم! ئوبەی کوڕی کەعب لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ﴾ دەڵێ: لە پێنج تاریکاییدا دێتو دەڕواتو هەڵدەسوڕێت، قسەکانی تاریکییە، کردارەکانی تاریکییە، چوونە ژوورەوەی بۆماڵ تاریکییە، هاتنە دەرەوەی لەماڵ تاریکییە، پاشەڕۆژیشی لە ڕۆژی قیامەتدا بەرەو تاریکستانو ناو ئاگرە.[1] سودیو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وایان گوتووە ﴿وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾ واتە: جا هەر کەس خوا نوری ئیمانی پێ نەبەخشێت ئەوەی ڕووناکی بێت نیەتی، یانی: ئەو کەسەی خوا ڕێی نیشان نەدابێت ئەوە تیاچووەو تووشی نەفامی بووەو گوێ بۆ کەس ناگرێو نازانێ خەریکی چیەو خوا ناناسێت، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥ﴾ واتە: هەر کەس خوا گومڕای بکات (بە تاوانی کردەوەی خراپی) ئەو هیچ ڕێبەرێکی بۆ نیە. ئەم نموونەیە لە بەرامبەری ئەو نموونەدایە کە خوای گەورە فەرموویەتی لە بارەی خاوەنباوەڕەکانەوە ﴿يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ واتە: خوا هەر کەسی بوێت ڕێنموونی دەکات بۆ لای ڕووناکی (ئاینی) خۆی. داوامان وایە کە خوای گەورە لە ڕووناکی خۆی بخاتە دڵمانەوە، لای ڕاستمان ڕووناك بکاتو لای چەپمان ڕووناكو بکاتو ڕووناکیەکەمان بۆ گەورەتر بکات.

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٖۖ كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٢﴾﴾

**هەموو شتێك پەسەنی پاکی خودا دەداو هەر خودا خۆی فەرمانڕەوایە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە هەموو باسی پاکو بێ عەیبی خودا دەکەن لە فریشتەو جنۆکەو گیاندارو هەتا بێ گیانیش، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿تُسَبِّحُ

[1] الطبري (١٩/١٩٨).

لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ﴾ واتە: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکانو هەرچی لەناویاندایە. وە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿وَٱلطَّيۡرُ صَٰٓفَّٰتٍۖ﴾ واتە: پەلەوەرەکانیش لە کاتی فڕیندا هەر پەسەنی پاکی پەروەدگاری خۆیان دەدەن، بەو شێوەیەی کە خودا خۆی فێری کردوون دەیپەرستنو ڕێی نیشان داونو دەزانێ چی دەکەن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿كُلّٞ قَدۡ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسۡبِيحَهُۥۗ﴾ واتە: خودا ڕێی نیشانی هەمووی داوە گشت دەزانێ چۆن ڕێگای خۆی وەبەرگرتووە لە عیبادەتی خودای مەزندا. پاشان هەواڵی پێداوین کە ئاگای لە هەموو شتێکەو هیچی لێ ون نابێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ﴾ واتە: خوا ئاگاداری ئەو کارانەیە کە دەیکەن، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾، واتە: خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەمین هەر خۆیەتیو هەر خۆشی کاربەدەستو فەرمانڕەوایەتی، دەبێت هەر ئەو بپەرسترێتو کەسی تر غەیری ئەو نابێ بپەرسترێت، هیچ کەسێك ناتوانێت دەست لە کاری خودا وەربدات ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا گەڕانەوە بۆ لای خودایە، فەرمانڕەوایی تێدا دەکات بە مەیلی خۆی ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى﴾ واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە بە پێی کردەوەکانیان وە پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە چاکەیان کردووە بە چاکتر (لەوەی کردوویانە). هەر ئەو وەدیهێنەرو خاوەن دەسەڵاتە، هەموو فەرمانو بڕیارێك لە دنیاو لە قیامەتدا بە دەستی خودایەو ئەو ئەیدات، سوپاسو ستایش هەر بۆ خوای گەورەیە لە دنیاو لە دواڕۆژیشدا.

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٖ فِيهَا مِنۢ بَرَدٖ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُۖ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٣﴾ يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٤﴾﴾

**ئاگاداری لەسەر دەسەڵاتی خودا لە وەدی هێنانی هەورو ئەو شتانەی بە دوایدا دێت**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا﴾ واتە: ئایا نابینی کە خوا لە هەورەکان دەبات بە هێواشی، خوای گەورە باسی ناردنی هەور دەکات کە چۆن بە لاوازیو بێهێزی لە سەرەتاوە وەدی دەهێنێت ﴿ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ﴾واتە: دوای ئەو لاوازیە کۆی دەکاتەوە، ﴿ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا﴾ پاشان دەیکات بە هەورێکی پڕی لەسەر یەك، واتە: بەسەر یەکدا دەکەون، ﴿فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ﴾ تۆ ئەو دڵۆپە بارانە دەبینی، ﴿يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ﴾ واتە: لەنێو هەورەکەوە دەبارێت،لێی دێتە دەرەوە ﴿مِنۡ

خِلَٰلِهِۦ﴾ئیبنو عەباس‌و زەححاکیش هەر وایان خوێندووەتەوە.[١] عوبەیدی کوڕی عومەیری لەیس (عبید بن عمیر اللّيث) دەڵێ: خوای گەورە – بای – جوڵێنەر دەنێرێت ئەدات بەسەر زەمینداو پاشان خودا بای بەرزکەرەوە دەنێرێت هەورەکان بەرز دەکاتەوەو پاشان بای کۆکەرەوە دەنێرێت‌و کۆیان دەکاتەوەو پاشانیش خودای گەورە بای موتوربەکەر دەنێرێت هەورەکان موتوربە دەکات! ئیبنو ئەبی حاتم‌و ئیبنو جەریرئەم تەفسیرەیان ڕیوایەت کردووە.[٢] ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ﴾ هەندێ لە زانایانی زمانی عەرەبی گوتوویانە: (مِنْ) ی یەکەم بۆ ئیبتیدائی غایەیەو (مِنْ) ی دووەم بۆ تەبعیزە (للتبعيض) (مِنْ) ی سێهەمیش بۆ بەیانی جنسە (لبيان الجنس) ئەمە لەبەر ئەوەیە وا باس کراوە چونکە هەندێ زانایانی تەفسیر لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ ﴾ وتویانە: مانای وایە لە ئاسماندا کێوی تەرزە هەیە، خوای گەورە لەو کێوانەوە تەرزە دەبارێنێت، بەڵام ئەوانەی کە وایان داناوە کێوەکان لێرەدا مەبەست پێی هەورە، کەواتە (مِنْ)ی دووەم لای ئەمانە بۆ ئیبتیدائی غایەیە دیسان بەڵام بەدەلی (مِنْ)ی یەکەمیشە – والله أعلم – خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ﴾ لەوانەیە مەبەست بەمەی کە دەفەرمووێت: ﴿فَيُصِيبُ بِهِۦ﴾ واتە: ئەوەی لە ئاسمان دەبارێت لە باران‌و تەرزە ﴿فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ بۆ هەر کەسێك کە مەیلی لێ بێ دەیبارێنێت‌و بەزەییە کە لە خواوە بۆی ﴿وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ﴾ واتە: بۆ هەر کەسیش حەز بکات ئەو بارانەی لێ دوادەخات. وە هەڵیش دەگرێت مەبەست بەمەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَيُصِيبُ بِهِۦ﴾ واتە: بۆ هەر کەسێ مەیلی لێ بێت تەرزە بارانی دەکات، بەروبووم‌و کشتوکاڵی‌و درەختەکان لەناو دەبات وئەبێتە موسیبەت بۆی!، وە بۆ هەر کەسیش مەیلی لێ بێت ڕەحمی پێ دەکات‌و لێی لا دەدات، پاشان دەفەرمووێت: ﴿يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾ واتە: لەوانەیە ڕووناکی بروسکەکەی ئەوەندە بەهێز بێت چاوی کوێر بکات ئەگەر چاوی تێ ببڕێت و سەیری بکات، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ واتە: خوای گەورە ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژ دەکات لە درێژی ئەم هەوڵدەگرێت‌و دەیخاتە سەری ئەوی تر، هەتا بەرامبەر بوەستن، پاشان لە درێژی ئەوی تر هەڵدەگرێت‌و دەیخاتە سەر ئەوی تر هەتا بەرامبەر بوەستنەوە جارێکی تر، هەر خوا خۆی خاوەنی دەسەڵات‌و توانایە هیچ کەس ناتوانێت دەست لە کاری بدات، هەر خۆی زاڵ‌و زۆر مەزن‌و زانایە، گشت شتێك بە فەرمانی ئەوە

---

[١] الطبري (١٩/٢٠٢).

[٢] الطبري (١٩/٢٠١).

﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ واتە: بە ڕاستی لەمەدا پەندێك هەیە بۆ خاوەن ژیرییەکان. یانی ئەمانە بەلگەن لەسەر گەورەیی خودای گەورە، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ﴾،[1] واتە: بە ڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویداو لە جیاوازیو گۆڕانی شەوو ڕۆژدا چەندەها بەلگە هەیە بۆ خاوەن ژیریەکان.

﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٥﴾﴾

**تواناو دەسەلاتی خودا لە دروست کردنی گیانەوەردا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ﴾ خوا هەموو گیانەوەرێکی لە ئاو خولقاندووە، خوای گەورە باسی توانای تەواو و دەسەلاتی مەزنی خۆی دەکات لە دروستکردنی هەموو جۆرە گیانەوەرێك کە هەر گیانەوەرێك شێوەو ڕەنگو جموجۆلو هەلسوکەوتی تایبەتی خۆی هەیەو لە یەك ناچن، وهەموشیان لە یەك ئاوخولقاون ﴿فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ بَطْنِهِۦ﴾ هەیە لەسەر سك دەڕوات وەك ماروخشۆکەکان ﴿وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰ رِجْلَيْنِ﴾ هەشیانە لەسەر دوو پێ دەڕوات وەك مرۆڤو پەلەوەر ﴿وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَىٰٓ أَرْبَعٍ﴾ هەیشە لەسەر چوار پەل دەڕوات، وەك بزنو مەڕو وشترو گاو مانگاو گیانەوەرەکانی تر لەم جۆرە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿يَخْلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ واتە: خودا مەیلی لە هەر شتێك بێت دروستی دەکات بە دەسەلاتو توانای خۆی، چونکە هەرچی مەیلی لێی بێت دەبێتو هەرچیش مەیلی لێ نەبێت نابێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: خودا دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّقَدْ أَنزَلْنَآ ءَايَٰتٍ مُّبَيِّنَٰتٍ﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت کە لەم قورئانەدا زۆر فەرمانو بڕیارو لە کارزانیو نموونەی ئاشکراو بەهێزو تەواوی ناردووە، بێگومان ئەو کەسانە شارەزا دەکات بۆ گەیشتنو بیرکردنەوەی کە خاوەن ئاوەزنو هۆشمەندن، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە: خوا مەیلی لە هەر کەسێك بێت شارەزای ڕاستەڕێی دەکات.

---

[1] ال عمران (١٩٠).

﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓاْ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾

**فرت و فێڵی دوو ڕووان و ڕەوشتی خاوە نباوەڕان**

خوای گەورە باسی ڕەوشتی دووڕوەکان دەکات کە ئەوەی دەری دەخەن پێچەوانەی ئەوەیە کە لە ناو دڵیاندایەو ئاشکرای ناکەن، بەدەم قسەیە دەکەن وبەدڵ شتێکی تر، ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: وە ئەوانە دەڵێن باوەڕمان بە خوداو پێغەمبەر هێناوەو بەر فەرمانین، لە پاشان هەندێکیان پشت هەڵدەکەن لە پاش ئەوە، قسەکانیان دژی کردارەکانیانە، ئەوەی دەیڵێن نایکەن بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەوانە خاوەن باوەڕ نین، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ﴾ واتە: کاتێك داوایان لێ بکرایە شوێنی ئەو ڕاستە ڕێیە بکەون کە خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بۆ ئەوەی حوکم بکات لە نێوانیاندا ڕوویان وەردەگێڕاو فیزیان دەکردو پێیان شورەیی بوو شوێنی بکەون، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴾ واتە: ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بە لای ئەوانەی وا خۆنیشان دەدەن کە بە ڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیووە بۆ تۆ (کە قورئانە)و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیووە (کە تەوراتە) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات لە کاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێکراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گوێڕایەڵی دوور لەڕاستی،وەئەگەر پێیان بووترێت: وەرن بۆلای ئەوەی خوا ناردوویەتیە خوارەوە و بۆلای پێغەمبەر(ص)،دەبینی (ئەی محمد)دوو ڕووەکان ڕووت لێوەردەگێڕن بەوەرگەڕانێکی تەواو. خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓاْ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴾

واتە: ئەگەر ئەو بڕیارە لە قازانجی ئەوان بوو دژیان نەبوو دێن‌و باش گوێ دەگرن‌و لێی دەرناچن، ئەوە مانای ﴿مُذۡعِنِينَ﴾ە. بەڵام ئەگەر ئەو بڕیارە لە بەرژەوەندیان نەبوو خۆی لێ لادەدەن ئەو کاتە ڕێی ناهەقی دەگرنەبەرو، پێیان خۆشە بچنە لای کەسێکی تر دادگاییان بکات‌و نەڕۆنە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی برەو بەو شتە پڕوپووچەی خۆیان بدەن، ئەو کاتەی کە ڕازی دەبن لەبەر ئەوە نیە بڕوایان پێی هەیەو هەر ئەوە ڕاستە بەڵکو لەبەر ئەوەیە لەگەڵ ئارەزووی خۆیاندایەو پێیان خۆشە. چونکە هەر کاتێك حەق لەگەڵ خواست‌و ئارەزووی ئەواندا نەبوو لێی لادەدەن‌و بڕوای پێ ناکەن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ واتە: ئەو کارەیان لەمانە بە دەر نیە: یان دڵیان نەخۆشی تێدایەو پێیەوە دەناڵێنن، ﴿أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ﴾ یان گومانیان بۆ پەیدا بووە لەم ئاینە، ﴿أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥ﴾ یان ترسیان هەیە کە خواو پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناهەقیان پێ بکەن لەو دادوەریەدا کە دەیان کەن، هەر کامێك لەوانە بێت، ئەوە بێ ئایینی‌و خوانەناسیەکی تەواوە، خوای گەورە ئاگاداری هەموو ئەو شتانەیەو هیچی لێ ون نابێت، ﴿بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ واتە: بەڵکو ئەو دووڕووانە خۆیان ناهەقیکارو بەدفەڕو لە دین لادەرن، خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر دوورن لەوەی کە ئەوان گومانی بۆ دەبەن‌و وا دەزانن ناهەقیان پێ دەکەن. پاشان خوای گەورە باسی ڕەوشتی ئەو خاوەنباوەڕانە دەکات کە چوون بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەکەیەوە (ﷺ) وە هیچ ئاینێکی تریان ناوێ جگە لە قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ﴾ واتە: قسەی خاوەن باوەڕان ئەمەیە کاتێك داوایان لێ کراوە بەرەو خواو پێغەمبەرەکەی بێن دادوەریان بکات، بە پەلە دێن‌و دەڵێن: بیستمان‌و گوێڕایەڵین، بۆیە خوای گەورە بە ڕزگاربووان ناویان دەبات، کە گەیشتنە بە مەست‌و بێ خەمیە لە ناڕەحەتی‌و سامناکی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ واتە: هەر ئەوانە ڕزگارن، قەتادە دەڵێ: دەربارەی ئە ئایەتە ﴿أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ﴾ بۆیان گێڕاوینەتەوە کە عوبادەی کوڕی سامیت لەو پیاوانە بووە لە پەیمانی عەقەبەو ڕۆژی بەدردا ئامادە بووە، یەکێکیش بووە لە نەقیبە ئەنساریەکان، لەسەرەمەرگدا وتی بە برازاکەی کە ناوی جونادەی کوڕی ئەبو ئەمییە بوو: ئایا هەواڵت بدەمێ بەوەی کە ئەرکە لەسەرت‌و بەوەیش کە مافی خۆتە؟ وتی: بەڵێ، وتی: بێگومان ئەرکی سەرشانتە کە گوێڕایەڵ‌و بەرفەرمان بی لە تەنگانەو لە کاتی ئاسایتدا، وە لە خۆشی‌و ناخۆشیتدا، وە لە هەڵبژاردنی کەسێك بەسەرتدا — ڕێزلێنانی کەسێك بەسەرتدا — وە لەسەرتە هەمیشە زمانت ڕاستگۆ بێت، وە نابێت ململانێ و کێشمەکێش بکەیت لەگەڵ ئەوەی دەسەڵات دارەو حوکمی لەدەستدایە ،

مەگەر فەرمانت پێ بکات بەسەرپێچی خوا بە ئاشکرا، هەر فەرمانێکت پێکرا دژی کتێبی خودا – قورئان – بوو، تۆ شوێنی کتێبی خوا بکەوە.[١] قەتادە دەڵێ: بۆیان گێڕاوینەتەوە کە ئەبو دەردا (أبا درداء) گوتوویەتی: موسڵمانیەتی پەیدا نابێت بە گوێڕایەڵیکردنی خوا نەبێت، وە خێریش نیە مەگین لەناو کۆمەڵدا، وە دڵسۆزیش ئەبێت بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی‌و (ﷺ) وە بۆ خلیفەو بۆ خاوەن باوەڕان بێت بە گشتی. گوتی: بۆمان باس کراوە کە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی:( پەرژینی ئەم ئیسلامە شایەتی دانە کە جگە لە خودا هیچ خودایەکی تر نیەو نوێژکردنەو زەکات دانەو گوێڕایەڵیە بۆ ئەو کەسەی کە خودا کاروباری موسڵمانانی داوەتە دەستی)، ئیبنو ئەبی حاتم ڕیوایەتی کردووە.[٢] فەرموودەو ئەثەر زۆرن لەسەر پێویستی گوێڕایەڵی بۆ کتێبی خوداو پێغەمبەری خواو(ﷺ) خەلیفەکانی ڕاشیدین و پێشەواکان – وەختێك فەرمانیان دا بە گوێڕایەڵی خودا، فەرموودە ئێجگار زۆرە لەم بارەیەوەو ناتوانرێت لەم شوێنە داهەمووی باس بکرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ واتە: هەر کەسێك گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی بێت‌و واز بێنێت لەو شتانەی کە قەدەغەیان کردووە، ﴿وَيَخْشَ ٱللَّهَ﴾ وە ترسی هەبێت لەو گوناهانەی لە ڕابردوودا کردوویەتی ﴿وَيَتَّقْهِ﴾ وە لەمەودواش هەر لە خوا بترسێت‌و خۆی لادات لە گوناه ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾ واتە: ئا ئەوانە سەرکەوتوون‌و گشت خێرێکیان وەدەست هێناوەو دڵنیاشن لە هەموو خراپەیەك لە دنیاو لە قیامەتدا کە تووشیان نابێت.

﴿وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ قُل لَّا تُقْسِمُواْ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ﴾ خوای گەورە باسی کۆمەڵی دووڕووەکان دەکات، کە سوێندیان دەخوارد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر کاتێك فەرمانیان پێ بکات بچن بۆ غەزا لەگەڵی دەڕۆن بۆ غەزا، خوای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّا تُقْسِمُواْ﴾ واتە:بڵێ: سوێند مەخۆن،﴿طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ﴾ گوێڕایەڵیەکەتان گوێڕایەڵیەکی ناسراوە لای گشت کەسێك، واتە هەموو کەس ئاگای لێیانە کە هەر قسە بووەو کرداری لەگەڵ نەبووە، هەر کاتێك سوێندتان خواردبێت

---

[١] إبن ابي حاتم (٢٦٢٣/٨).

[٢] إبن ابي حاتم (٢٦٢٣/٨، ٢٦٢٤).

درۆتان کردووه ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ واته: بەڕاستی خوا ئاگاداره بەو کردەوانەی دەیکەن، وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ﴾ واته: (بە درۆ) سوێندتان بۆ دەخۆن بۆ ئەوەی لێیان ڕازی بن. وە فەرموویەتی: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً﴾ واته: سوێنده (درۆ)کانی خۆیان کرد بە قەڵغان (بۆ خۆیان). چونکە دووڕووەکان سروشتیان هەمیشە درۆکردن بووە هەتا لەو شتانەشدا کە خۆیان پێی ڕازینو هەڵی دەبژێرن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ واته: ئایا سەرنجێکت نەداوە بە لای ئەوانەی کە دووڕووبوون ئەڵێن بەو برادەرانەیان کە بێباوەڕ بوون لە (جوولەکە) خاوەن کتێبەکان: ئەگەر دەربکرێن ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین وە هەرگیز فەرمانبەریی کەس ناکەین لە دژی ئێوه وە ئەگەر جەنگتان لەگەڵدا بکرێت بێگومان ئێمە یارمەتی ئێوه دەدەین، بەدڵنیایی یەوە خوا شایەتی دەدات کە ئەوان درۆزنن، ئەگەر دەربکرێن ئەوان لەگەڵیاندا دەرناچن وە ئەگەر جەنگیان لە دژ کرا یارمەتیان نادەن وە ئەگەر یارمەتیان بدەن بێگومان (ئەشکێنو) پشت هەڵئەکەن پاشان سەرناخرێن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾ واته: شوێنی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەون ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ واته: ئەگەر پشتیان تێکرد وازیان هێنا لەوەی کە تۆ بۆت هێناون ﴿فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ﴾ واته: ئەو هەر ئەوەی لەسەره پێتان ڕابگەیەنێتو ئەو سپاردەیەی لەسەر شانیەتی جێبەجێی بکات ﴿وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ﴾ ئێوەش ئەوەتان لەسەره قەبوڵی بکەنو ڕێزی لێ بگرنو بەپێی ئەوە کاروبارتان بەڕێوەبەرن ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْ﴾ ئەگەر بە فەرمانی ئەو هەڵسن شارەزا دەبن وهیدایەت وەردەگرن، چونکە ئەو بانگتان دەکات بۆ سەر ڕاستەڕێ، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ واته: ڕێگەی ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکانو هەرچی لە زەویدایە هی ئەوە . وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ واته: پێغەمبەر(ﷺ) هەر ئەوەی لەسەره بە چاکیو ئاشکرا ڕایگەیەنێت، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ

ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ ﴾ واتە: بێگومان تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە. وە فەرموویەتی: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ ﴿٢٢﴾﴾ واتە: کەوابوو ئامۆژگاری بکە، تۆ هەرکارت ئامۆژگاری کردنە، تۆ دەسەڵاتدار نیت بەسەریاندا.

﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾

**خودای گەورە بەڵێنی داوە بە خاوەنباوەڕان کە دەیانکاتە جێنشین لەسەرزەویدا**

ئەمە بەڵێنی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی کە ئومەتەکەی دەکاتە جێنشین لەسەر زەمیندا واتە: دەبنە پێشەوای مەردمو فەرمانڕەوایان، بەوە وڵات دادەمەزرێتو خەڵکی ملیان بۆ دادەنەوێنن، ئەو ترسو ناڕەحەتیەیان بۆ دەگۆڕێت بە ئاشتیو ئارامیو دڵنیایی، ترسیان لە خودا نەبێت لە کەس نامێنێتو کاروباری خەڵکیش بەڕێوە دەبەن، خوای گەورەش ئەمەی بۆ کردن سوپاسو ستایش هەر بۆ خوایە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەمرد هەتا مەککەو خەیبەرو بەحرەینو باقی دوورگەی عەرەبیو سەرزەمینی یەمەنی بە تەواوی خستە ژێر دەسەڵاتیو ڕزگاری کرد، سەرانەشی (الجزیة) لە مەجوسیەکانی هەجەر و دەوروبەری و هەندێك ناوچەی شام ئەسەند، "هەرقەل" پاشای ڕۆمو خاوەنی میسرو ئەسکەندەریەو موقەوقەس پاشاکانی عومانو نەجاشی پاشای حەبەشە لە دوای "ئەسحەمە" بووە فەرمانڕەوای حەبەشە، ئاشتیان کرد لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)داو شەڕیان نەکرد، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەفاتی کردو بەڕێزەوە بەرەو لای خوای خۆی بوویەوە، پاش پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکر بوو بە جێنشینیو هەڵسا بەو فەرمانە، ئەوەی مابووەوە لە نیوە دوورگەی عەرەبی هەمووی ڕزگار کردو لەشکری ئیسلامی ڕەوانەی وڵاتی فارس کردو خالیدی کوڕی وەلیدی لەگەڵ ناردن (ڕەزای خوای لێ بێت) لایەکی ڕزگار کرد، خەڵکێکی زۆری لێ کوشتن، وە لەشکرێکی تری بەڕێ کرد ئەبو عوبەیدەی (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ چەند فەرماندەیەك بۆ سەر زەمینی شام ، لەشکرێکی تریشی بەڕێکرد عەمری کوڕی عاس – عاص – لەگەڵ ناردن بۆ وڵاتی میسر، خودای مەزن لەشکری شامی سەرخست هەر لە ژیانی ئەبو بەکرداو بوسرای دیمەشقی ڕزگار کرد لەگەڵ ئەوانەی کە نەیاریان بوون لە وڵاتی حورانو دەوروبەری، پاشان خوای گەورە ئەویشی بردەوە بۆ لای خۆیو پلەو ڕێزێکی باشی پێ بەخشیو منەتیشی خستە سەر ئوممەتی ئیسلامی بەوەی کە ئەبو بەکری تێگەیاند کە عومەری فاروق بکاتە جێنشینی خۆی، عومەریش زۆر بە چاکی ئەو فەرمانەی جێبەجێ کرد. جیهان دوای پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) نموونەی عومەری بە خۆیەوە نەدیووە کە ئەوەندە ڕەوشت

چاك‌و بە توانا‌و دادپەروەر بوو‌بێت، وە لە کاتی ئەودا وڵاتی شام بە تەواوی‌و وڵاتی میسریش هەمووی‌و زۆرێکیش لە وڵاتی فارسی ڕزگار کرد، پشتی کیسرای شکاندو بە تەواوی سەرشۆڕی کردو لووتی پێ دانەواندو پاشەکشەی پێکرد بۆ شوێنێکی ئەولاتری وڵاتەکەی، دەمکوتی قەیسەریشی کردو لە وڵاتی شام وەدەری ناو بەرەو قوستەنتینیە ڕۆشت، ماڵ‌و سامانەکانیانی لە ڕێی خودا بەخشی، وەك چۆن پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی پێدا بوو کە پەروەردگاری بەڵێنی پێداوە، پاشان لە کاتی دەوڵەتی عوسمانیدا دەسەڵاتی ئیسلامی فراوان بوو بڵاوەی کرد بۆ ئەملاو لای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا، وڵاتی مەغریب ئازاد کرا هەتا گەیشتە ئەندەلوس‌و وڵاتی قیرەوان‌و (سەبتە)یش لە لای دەریای موحیتەوە (بحر المحيط) وە لە لای ڕۆژهەڵاتیشەوە هەتا لای وڵاتی صین کیسرا کوژراو دەستەڵاتەکەی لەناو برا بە تەواوی، مەدائین‌و عێراق‌و خۆراسان‌و ئەهوازیش ئازاد کران وموسڵمانان لەگەڵ تورکیشدا تووشی شەڕێکی خوێناوی بوون و کوشتارێکی ئێجگار زۆریان لێ کردن وە خوای گەورە پاشا مەزنەکەیانی زەلیل‌و سەرشۆڕ کرد کە ناوی خاقان بوو. سەرانە — خەراج —لەهەموو ئەوشوێنانەوە لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاواوە کۆدەکرایەوەو دەهێنرایە بەردەم گەورەی موسڵمانان عوسمانی کوڕی عەفان (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەوەیش بە هۆی پیرۆزی‌و بەرەکەتی خوێندنەوەی بەردەوامی بۆ قورئان‌و دیراسەکردنی ئەو خەلیفە بەڕێزەوە کە ئوممەتی ئیسلامی هەموویەك خست بۆپاراستنی ئەم قورئانە، بۆیە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە زەمینی بۆ کۆکردمەوە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوایم بینی، بەم زوانە دەستەڵاتی ئوممەتی من دەگاتە ئەو شوێنانەی کە بۆم کۆکرایەوە)،[1] ئەوەتا ئێمە هاتووچۆ دەکەین بەو شوێنانەدا کە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بەڵێنیان پێداین، خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو، ئێمەش سوپاس‌و ستایشی خوای گەورە دەکەین بەو شێوەیەی کە خۆی پێی خۆشەو لێمان ڕازی دەبێت، ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێ: ئەبو عالیە (أبو العالية)دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنًاۚ ﴾واتە : خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە وە کردەوە چاکەکانیان کردووە کە بێگومان دەیانکاتە جێنشینی (خەڵکی تر) لە زەویدا هەروەك ئەوانی پێش ئەمانی کردە جێنشین وە ئاینەکەیان بۆ دەچەسپێنێت ئەو ئاینەی کە خوا پێی ڕازی بووە بۆتان وە ترس‌و بیمیان بۆ دەگۆڕێ بە ئاسایش‌و ئارامی . ئەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ)و هاوەڵەکانی نزیکەی دەساڵ لە مەککەدا بوون وبەنهێنی بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ ناسینی خودا بە تەنهاو شەریکی بۆ دانەنێن،

[1] مسلم (٤/٢٢١٥)

ترسیان لە موشریکەکان هەبوو، فەرمانی جەنگیان پێ نەدرابوو، هەتا ئەو کاتەی فەرمانیان پێ درا کۆچ بکەن بۆ مەدینە، کە ڕۆیشتنە ناو مەدینە، خوای گەورە فەرمانی جەنگی پێدان،لەوێشدا هەرترسیان هەبوو شەوو ڕۆژ چەکیان لە شاندا بوو، ماوەیەکی زۆر بەو شێوەیە مانەوە، پاشان یەکێك لە هاوەڵەکان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە تاهەتا هەتایە بەم شێوەیە ترسمان هەر دەمێنێ؟ ڕۆژێك نایەت کەبێترس ببین وئەم چەکانەمان دابنێین؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (کەمێکی تر ئارامگرتنتان لەپێدا ماوە ، ڕۆژێك دێت پیاوێك لە ئێوە لە کۆمەڵێکی گەورەدا دەست ئەخاتە بەرئەژنۆی و دادەنیشێت بێ ترس‌و چەکیش لەمەجلیسەکەدا نیە)،ئەوەبوو لە پاشاندا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەرخست بەسەر دوورگەی عەرەبیدا، هەموو بڕوایان هێناو چەکەکانیان دانا، پاشان خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ)بردەوە بۆ لای خۆی‌و هەر بەو شێوەیە مانەوە لە کاتی جێنشینی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان هەتا ئەو کارەساتەی کە ڕوویدا، ترس‌و بیم کەوتە نێوانیان و خۆیان لە یەکتری دەپاراست وپاسەوان ودەرگاوانیان بۆخۆیان داناو خۆیان گۆڕی و خوداش گۆڕانی بەسەردا هێنان، هەندێ لە زانایانی پێشینە – السلف – وتویانە: جێنشینی ئەبو بەکرو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) بە هەق باسکراوە لە قورئاندا پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾،[1] هەتا کۆتایی ئایەتەکە. بەڕای (براء) کوڕی عازب دەڵێ:تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ئێمە لە ترسێکی زۆردا بووین.[2] ئەم ئایەتە پیرۆزە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ واتە: بیر بکەنەوە کاتێك کە ئێوە کەم‌و لاوازو ژێردەستە بوون لە زەوی (مەککە)دا دەترسان کە خەڵکی بتان فڕێنن ئەنجا خوا پەنای دان وە بە یارمەتی خۆی پشتیوانی کردن‌و ڕزق‌و ڕۆزی لە شتە پاك (و حەلاڵە)کان پێ بەخشین بۆ ئەوەی سوپاس گوزاری خوا بن. وە دەفەرموێت: ﴿كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ وەك خودای مەزن لە بارەی موساوە فەرموویەتی، کە فەرمووی بە هۆزەکەی: ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: بەڵکو پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو بەرێت‌و ئێوە بکات بە جێنشین(ی دوژمنەکانتان) لەسەر زەوی. وە فەرموویەتی: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: وە ئێمە دەمانەوێ (بە چاکی

---

[1] الطبري (١٩/٢٠٩).

[2] الدر المنثور (٦/٢١٥).

خۆمان) منەت بنێین بەسەر ئەوانەی کە لاوازو ژێردەست کرابوون لە وڵاتی (میسر)دا.خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ﴾ وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی بە عەدی کوڕی حاتەم کاتێك کە هات بۆ خزمەتی: (ئایا حیرە شارەزای؟) حاتم وتی: شارەزانیم بەڵام ناوم بیستووە، فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، خوای گەورە ئەم کارەی خۆی تەواو دەکات هەتا وای لێ دێت کەژاوە(ی ئافرەت) لە حیرەوە دەردەچێتو تەوافی ماڵی خوا دەکات بەبێ ئەوەی لە پەنای هیچ کەسێکدا بێت گەنجینەکانی کیسرای کوڕی هورمزیش فەتح ئەکرێن!عەدی ئەڵێ:وتم کیسرای کوڕی هورمز؟فەرمووی:بەڵێ کیسرای کوڕی هورمز،پارەش ئەوەندە زۆر ئەبێت کەئەیبەخشی کەس نی یە وەری بگرێت!عەدی کوڕی حاتەم ئەڵێ:دەی ئەوە کەژاوەی ئافرەت لەحیرەوەدەردەچێت وتەواف بەدەوری کەعبەدا ئەکات ولە(جوار) ی کەسیشدانییە، وە من خۆم یەکێك بووم لەو کەسانەی کە گەنجینەی کیسرای کوڕی هورموزی فەتح کرد، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە سێهەمیش دێتەدی چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا﴾ واتە: (لەو کاتەدا ئیتر) هەر من دەپەرستنو هیچ هاوبەشیەکم بۆ بڕیار نادەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە موعازی کوڕی جەبەل گێڕاوەتەوەو وتوویەتی: کاتێك لە نزیك پێغەمبەرەوە بووم بە سواری کەرێك، لە نێوانماندا هیچ شتێك نەبوو جگە لەزینی وڵاغەکە، فەرمووی: (ئەی موعاز) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەخزمەتتدام ، پاشان ماوەیەك ڕۆیشتو فەرمووی: (ئەی موعاز) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)لەخزمەتتدام، موعاز وتی: ماوەیەکی تر ڕۆیشتو فەرمووی: (ئەی موعازی کوڕی جەبەل) وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا لەخزمەتتدام، فەرمووی: (ئایا دەزانی هەقی خودا چیە لەسەر بەندەکانی؟) وتم: خواو پێغەمبەری خوا باش دەزانن، فەرمووی: (هەقی خوا بەسەر بەندەکانیەوە ئەوەیە کە بیپەرستنو هەرگیز شەریکی بۆ دانەنێن) مەعاز دەڵێ: پاشان ماوەیەکی تر ڕۆیشتو لە دواییدا فەرمووی: (ئەی موعازی کوڕی جەبەل) وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فەرمووی: (ئایا دەزانی هەقی بەندەکان چیە بەسەر خوداوە ئەگەر ئەو ئەرکەیان بەجێ هێنا؟) مەعاز دەڵێ: گوتم: خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) باش دەزانن، فەرمووی: (بێگومان هەقی بەندەکان لەسەر خودا ئەوەیە کە سزایان نەدات)،[2] بوخاریو موسلیم لە سەحیحەکانیاندا هێناویانە.[3] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ

---

[1] أحمد (٤/٢٥٧).

[2] احمد (٥/٢٤٢).

[3] فتح الباري (١٠/٤١٢)، مسلم (١/٥٨).

ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ واتە: هەر کەسێك لە فەرمانی من دەرچوو دوای ئەوە، بێگومان لە فەرمانی خودا دەرچووە، ئەوە ئیتر ئەو کەسە تاوانێکی زۆر گەورەی کردووە، هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) چاکترین کەس بوون دوای پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمانەکانی خودایان بەجێ دەهێناو زۆر خواناسو بەرفەرمان بوون، بەو پێیەش خودای مەزن سەری دەخستن و ئایینی خودایان بڵاوکردەوە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا، خوداش زۆر بە چاکی یارمەتی دانو سەری خستنو بوونە فەرمانڕەوای هەموو خەڵکی لەو وڵاتانەدا، وەختێك کە خەڵکی کەمتەرخەمیان کرد دوای ئەوان لە کارەکانیاندا، بەرەو دواوە گەڕانەوە، بەڵام لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە بە چەند شێوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)گێڕراوەتەوەکە فەرموویەتی: (بەردەوام دەستەیەك لە ئوممەتی من لەسەر هەق دەمێننەوە تا ڕۆژی قیامەت ، ئەوانەی پشتیان تێ دەکەن و ئەوانەش کەدژایەتیان ئەکەن هیچ زیانێکیان پێ ناگەیەنن).[1] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (هەتا فەرمانی خودا دێت ئەوان هەر بەو شێوەیە دەمێننەوە)،[2] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (هەتا شەڕی دەجال دەکەن)،[3] وە لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە : (هەتا عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە ئەوان هەر دەمێنن)،[4] ئەم فەرموودانە هەموو ڕیوایەتەکانیان ڕاستەو دژایەتی لە نێوانیاندا نیە.

﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٥٧﴾﴾

**فەرماندان بەنوێژکردنو زەکاتدانو خواپەرستی هەروەها باسی هیچ لێنەهاتوویی خوانەناس و چارەنوسیان**

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ خوای گەورە فەرمان دەدات بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی کە نوێژ بکەن، واتە: خودا بپەرستن بە تەنهاو شەریکی بۆ دانەنێن، وە زەکاتیش بدەن، کە بریتیە لە خێرکردن بە خەڵکی هەژارو نەدارو لاوازو بێدەسەڵات، وە لەو کارە چاکانەشیاندا دەبێت بەرفەرمانی پێغەمبەری خوا بن(ﷺ) شوێنی ئەو بکەونو فەرمانەکانی بەجێ بێننو واز بهێنن لەو شتانەی کە قەدەغەی کردووە لێیان، بەڵکو خوای گەورە بەزەیی بێتەوە پیایاندا، گومانیشی تێدا نیە هەر کەسێك وا بکات بەر بەزەیی خوای گەورە دەکەوێت، وە خودای

---

[1] مسلم (١/١٣٧).

[2] مسلم (٣/١٥٢٣).

[3] احمد (٤/٤٣٧).

[4] فتح الباري (١٣/٣٠٦).

گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أُولَٰئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ﴾ واتە: ئەوانە لە داهاتوودا خوا ڕەحمیان پێ دەکات. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ﴾ واتە: با وانەزانن ئەی محمد (ﷺ) ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەوانەی دژایەتیت دەکەن و بڕوات پێ ناکەن، ﴿مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ﴾ لە دەستی خوا دەرباز نابن لە زەویدا، بەڵکو خوای گەورە دەسەڵاتی هەیە بەسەریاندا بەو زووانە جەربەزەیان دەدات بە توندترین جەربەزە، بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ﴾ شوێنیان لە ڕۆژی دواییدا ئاگرە ﴿وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ سەرەنجامیان خراپترین شوێنە لەناو ئاگردا، چ ئارامگاو شوێنێکی خراپە!

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ۚ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دەبێت مۆڵەتتان لێ وەرگرن ئەو کەسانەی بەندەی ئێوەن هەروەها منداڵەکانتان کە هێشتا باڵغ نەبوون لە سێ کاتدا (بۆ چوونە ژووری نوستنی ژن و مێرد) لە پێش نوێژی بەیانی. ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی ئیزن وەرگرتنی خزم و کەس و کار دەکات لە یەکتری، وە لە پێشەوە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا باسی ئیزنی بێگانەمان کرد لە یەکتری، خوای گەورە فەرمانی داوە بە خاوەن باوەڕان کە دەبێت کەنیزەک و غوڵام و ئەو منداڵانەی خۆیان کە باڵغ نەبوون لە سێ کاتدا ئیزنیان لێ وەربگرن، لە پێش نوێژی بەیانیداو چونکە خەڵکی لەو کاتەدا خەوتوون و لە ناو جێگەکانیاندا ﴿وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ﴾ واتە: لە کاتێکدا کە پۆشاک دادەنێن لە چێشتەنگاودا، چونکە خەڵك لەو کاتەدا جلوبەرگ لە خۆی دەکاتەوە لەگەڵ خێزاندا ﴿وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ﴾ وە دوای نوێژی عیشاش چونکە کاتی خەوتنە، دەبێت کەنیزەک و غوڵام و منداڵان خۆیان نەکەن بە ژووری ئەوماڵەدا لەو کاتانەدا چونکە ترسی ئەوەی لێ دەکرێت ئەو پیاوە لەگەڵ خێزانەکەیدا بێت و کاریان بە یەکتری هەبێت، بۆیە خوای گەورە

فەرموویەتی: ﴿ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: ئەم سێ کاتە کاتی خۆ دەرخستنە بۆتان دروستە دوای ئەم سێ کاتە (بێ مۆڵەت وەرگرتن)، نە بۆ ئێوەونەبۆ ئەوان گوناهێك نیە چونکە ئەوان زۆر بە دەورو بەرتاندا دێن (بۆ خزمەت کردنتان) ئێوە لەگەڵ یەکتردا تێکەڵن ئا بەو جۆرە خوا ئایەتەکانی ڕوونی دەکاتەوە بۆ ئێوە وە خوا زانای کار دروستە. یانی ئەگەر چوونە ژوورەوە دوای سێ کاتە، هیچ شتێکی تێدا نیە، نە بۆ خاوەنماڵو نە بۆ ئەو کاسانەی کە لە ناو ماڵدانو هاتوچۆ دەکەن لە منداڵو کەنیزەكو غولام، ئەگەر شتێکیان بینی جگە لەو سێ کاتە چونکە ئیزن دراون هاتوچۆ بکەنو خزمەتیان بکەن چاوپۆشیان لێ دەکرێت بەڵام چاوپۆشی لە کەسی تر ناکرێت، لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە موحکەمەو (محكمة) نەسخ نەبۆتەوە بە هیچ شتێك کەچی خەڵکیش زۆر کەم کاری پێ دەکەن، عبدالله ی کوڕی عەباس ناڕەزایی خۆی دەربڕیوە لە خەڵکی لەسەر ئەوە. ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: زۆرینەی خەڵکی باوەڕیان نیە بە ئایەتی ئیزن خواستن، وە من فەرمانم داوە بەم کەنیزەکەم،ئیزن وەرگرێت کە دێتە لام، ئەبو داود دەڵێ: هەر بەو شێوەیە عەتا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە کە فەرمانی پێ کردووە،[1] سەوری ئەڵێ لە موسای کوڕی کوڕی عائیشەوە کە وتوویەتی: پرسیارم کردووە لە شەعبی لەم ئایەتە: ﴿لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ دەڵێ: نەسخ نەبۆتەوە، گوتم: خەڵکی کاری پێناکەن، ئەویش گوتی: هانا بەخوا (والله المستعان)[2]، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ واتە: کاتێك ئەو منداڵانەی کە ئیزنیان دەخوازی لە سێ کاتەکەدا باڵغ بوون دەبێت لە هەموو کاتێکدا ئیزن بخوازن، واتە: لەگەڵ بێگانەو ئەو کاتانەش کە پیاو لەگەڵ ژنەکەیەتی، با لەو سێ کاتەیشدا نەبێت، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتە: ئا بەم جۆرە خوا ڕوونی دەکاتەوە ئایەتەکانی بۆ ئێوە وە خوا زانای دانایە.

## ئەو ژنانەی وەختی شوویان بەسەر چووەو پیربوون قەیناکات ئەگەر سەرپۆش لابەرن و نەیپۆشن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ واتە: ئەو ژنانەی کە دەچن بە ساڵاو تەمەن دەکەن، سەعیدی کوڕی جوبەیرو موقاتیلی کوڕی حەیانو زەححاكو قەتادە ئەڵێن: ئەو ژنانەی کە لە حەیز دەچنەوەو نائومێد دەبن لە منداڵ ﴿ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾ واتە: ئەو ژنانەی وەختیان بەسەر

---

[1] ابو داود (٣٧٧/٥).

[2] الطبري (٢١٣/١٩).

چووەو بە تەمای شوکردن نین ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ﴾ واتە: ڕێیان لێ ناگیرێت‌و بۆیان هەیە خۆ دانەپۆشن بەڵام زینەت‌و جوانی دەرنەخەن،ئەمان جیاوازن لەو ژنانەی کە دەبێت خۆیان داپۆشن.[1] ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوەکەدەربارەی ئەم ئایەتە ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ﴾ واتە: وە بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش چاویان داخەن‌و بیپارێزن (لە سەیرکردنی نامەحرەم). دەفەرموێ: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوەو ئەو ژنانەی جیاکردووەتەوە کە شووکردنیان بەسەر چووە ﴿وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا﴾،[2] ئیبنو مەسعود لەمانای ئەم ئایەتەدا ﴿فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ﴾ دەڵێ: سەرپۆش یان کەوا – ئەوەی بەسەر کراسەوەیە،[3] وە هەر بەو شێوەیەش لە ئیبنو عەباس‌و ئیبنو عومەرو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو شەعثاو (ابو الشعثاء) ئیبراهیمی نەخەعی‌و حەسەن‌و قەتادەو زوهری‌و ئەوزاعی‌و کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە.[4] سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا ﴿غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ﴾ دەیفەرموو: سەرپۆشیان لانەبەن بۆ ئەوەی خشڵیان دەرکەوێ‌و خەڵکی چاوی پێ بکەوێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ﴾ واتە: پۆشاکەکەیان لانەبەن‌و وازی لێ بێنن_ هەرچەندە دروستە_ زۆر چاکترو باشترە بۆیان ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ واتە: خودا بیسەرو زانایە.

﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾﴾

---

[1] الدر المنثور (٦/٢٢٢)، الطبري (١٩/٢١٦).

[2] ابو داود (٤/٣٦١).

[3] الطبري (١٩/٢١٧).

[4] الطبري (١٩/٢١٧، ٢١٨).

**خواردن لە ماڵی خزم و کەسوکاردا**

مەبەست ئەوەیە مەردمی ئەو کاتە پێیان ناخۆش‌و گران بوو لەگەڵ کوێر خواردن بخۆن، چونکە ئەو کوێرە خواردنەکەی نەدەبینی‌و نەیدەزانی کامەی چاکە دەستی بۆ ببات، جاری وا دەبوو ئەو کەسەی لەگەڵی خواردنی دەخواردئەم پێشی دەکەوت وخواردنەکەی دەخوارد، وە لەگەڵ شەل‌و کەم ئەندام خواردنیان نەدەخوارد، چونکە بۆی نەدەکرا خێرا دانیشێت و شوێنەکەی لێ دەگیرا، نەخۆشیش دیارە ناتوانێ خواردن بخوات وەك لەش ساغ لەبەر ئەوە پێیان ناخۆش بوو خواردنیان لەگەڵ بخۆن بۆ ئەوەی ناهەقیان پێ نەکەن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ڕێی پێدان کە خواردنیان لەگەڵ بخۆن، ئەمە قسەی سەعیدی کوڕی جوبەیرو میقسەمە –مقسم–[1]، زەححاك دەڵێ: پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) خەڵکی پێیان ناخۆش بوو خواردن لەگەڵ کوێرو کەم ئەندام‌و نەخۆشدا بخۆن ، خۆیان بە زل دەزانی‌و ئەوانەیان بە پیس‌و پۆخڵ‌و نەشیاو دادەنا! پێیان شورەیی بوو خواردنیان لەگەڵ بخۆن خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.[2] عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە موجاهیدەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ ﴾،[3] دەڵێ: کەسێك لەگەڵ کوێرێکدا یان شەلێکدا یان نەخۆشێکدا دەچوو بۆ ماڵی بابی یان برای یان پوری – خوشکی باوکی یان خوشکی دایکی – ئەو کەمئەندامانە پێیان ناخۆش بوو دەیان بەن بۆ ئەو ماڵانە دەیانوت: دەمان بەن بۆ ماڵی خەڵکی، پێیان ناخۆش بوو بڕۆن بۆ ماڵی کەسی تر، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو ڕێی پێدان.[4](سەدی) دەڵێ: پیاوی وا هەبوو دەچووە ماڵی باوکی یان برای یان کوڕی، ئەو ژنە خواردنی بۆ دەهێنان ئەو خواردنەی نەدەخوارد لەبەر ئەوەی خاوەنماڵ لەوێ نەبوو، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ لَّيۡسَ عَلَى ٱلۡأَعۡمَىٰ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَن تَأۡكُلُواْ مِنۢ بُيُوتِكُمۡ ﴾ واتە گوناهتان ناگات لە ماڵی خۆتاندا خواردن بخۆن، بۆیە ئەمەی باس کردووە کە دیارە تا ئەو وتانەی تری بخاتە پاڵ‌و بڕیارەکەیان وەك یەك بێت لەگەڵ ئەوان، وە ئەم بڕیارە ماڵی کوڕییش دەگرێتەوە، هەرچەندە باسی نەکردووە هەر بۆیە هەندێ لەزانایان ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەرئەوەی کە ماڵی کوڕی وەك ماڵی باوکی وایە، لە موسنەدو سونەنەکاندا – في المسند والسنن – هاتووە بە چەند

---

[1] الدر المنثور (٦/٢٢٣)، الطبري (١٩/٢٢١).

[2] الطبري (١٩/٢١٩).

[3] ﴿وَلَا عَلَى ٱلۡأَعۡرَجِ حَرَجٞ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرِيضِ حَرَجٞ﴾ واتە: کوێر گوناهی لەسەر نیە هەروەها نەخۆش گوناهی لەسەر نیە (ئەم جۆرە کەسانە گوناه نیە بۆیان نان خواردن لەگەڵ کەسانی ساغدا).

[4] عبدالرزاق (٣/٦٤).

شێوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: (خۆتو ماڵیشت هی باوکتە).[1] ﴿أَوۡ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ إِخۡوَٰنِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَعۡمَٰمِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ أَخۡوَٰلِكُمۡ أَوۡ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمۡ﴾ واتە: یان (نان بخۆن لە) ماڵی باوکتان یان ماڵی دایکتان یا ماڵی براکانتان یا ماڵی خوشکەکانتان یا ماڵی مامەکانتان یا ماڵە پورەکانتان (خوشکانی باوك) یا ماڵی خاڵەکانتان یا ماڵی پورەکانتان (خوشکی باوك). ﴿أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ﴾ واتە: یا ئەو ماڵانەی کە کلیلەکانیان بە ئێوەیە. ئەمە ئاشکرایەو دیارە، ئەوانەی دەڵێن دەبێت نەفەقەی کەسوکار – خزم – لەسەر یەکتر بێت ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە، بەڵام ئەمەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ﴾ سەعیدی کوڕی جوبەیرو سەدی دەڵێن: واتە: ڕەنجبەری – خادمی – ئەو پیاوە، وەك عەبدو بریکار – وکیل – دروستە لە خواردنی ئەو پیاوە بخوات کە هەڵی گرتووە بە پێی پێویست، زوهری دەڵێ لە عورووەوە ئەویش لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کاتێك موسڵمانان دەچوون بۆغەزا لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) کلیلەکانیان لای بریکارەکانیان دادەناو پێیان دەگوتن: گەردنمان ئازاد کردوون بە پێی پێویستی خۆتان لێی بخۆن، بریکارەکان – وکیل – دەیانگوت: بۆمان نیە لێی بخۆین چونکە بە دڵ ناڵێن لێی بخۆن، ئەو ماڵەیش ئەمانەتە لای ئێمە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿أَوۡ مَا مَلَكۡتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ﴾،[2] وە دەفەرمووێت: ﴿أَوۡ صَدِيقِكُمۡ﴾ واتە: هیچ قەیدی ناکات لە ماڵی برادەرو دۆستتان بخۆن ئەگەر زانیتان نارەحەتیان ناکەنو پێیان گران نیە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَأۡكُلُواْ جَمِيعًا أَوۡ أَشۡتَاتٗا﴾گوناهتان ناگات پێکەوەنان بخۆن یان تاکەتاکە عەلی کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ: ئیبنو عەباس لەمانای ئەم ئایەتەدا ئەڵێ: کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سامانی یەکتر مەخۆن لە نێوانتاندا بە ناڕەوا .موسڵمانەکان وتیان: خوای گەورە قەدەغەی کردووە لێمان کە لە ناو خۆماندا ماڵی یەکتری بخۆین، بەبێ هودە، خۆ خواردنیش چاکترین ماڵە کە بخورێت، کەواتە دروستە نیە بۆمان لە ماڵی هیچ کەسێك بخۆین، خەڵکی وازیان هێنا

---

[1] احمد (۲/۲۷۹، ۲۰٤، ۲۱٤)، ابن ماجه (۲/۷٦۹).

[2] کشف الأستار (۳/٦۱، ٦۲).

لە خواردن لەو ماڵانە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ﴾، وە دیسان پێیان ناخۆش بوو بە تەنها خواردن بخۆن، پێیان شورەیی بوو، کەسێك لەگەڵیان خواردن نەخوات، هەتا ئەوانەی شوانی وشتر بوون خۆیان بە برسیەتی دەهێشتەوەو خواردنیان نەدەخوارد هەتا یەکێکیان دەست دەکەوتو لەگەڵیدا دەیخواردو دەیخواردەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا﴾،[1] ئەمەیش ڕێپێدانێك بوو لە لای خوای گەورەوە کە پیاو بە تەنهاو بە کۆمەڵ خواردن بخوات هەرچەندە خواردن بە کۆمەڵ چاکترو پیرۆزترەو خێری زیاترە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە وەحشی – وحش – کوڕی حەربەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە کە پیاوێ دەڵێ بە پێغەمبەر (ﷺ): ئێمەخواردن دەخۆین تێر نابین ! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئێوە لەوانەیە بە جیاجیا خواردن بخۆن، کۆببنەوە لەسەر خواردنەکەتانو ناوی خوای لەسەر بێنن خودا بەرەکەتی تێ دەخات بۆتان) ئەبو داودو ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردووە،[2] وە ئیبنو ماجە جارێکی تریش ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە لە باوکیەوە لە عومەرەوە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (بە یەکەوە خواردن بخۆن بە جیاجیا مەیخۆن چونکە بەرەکەت لە کۆمەڵبوونەوەدایە)،[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە: جا کاتێك چوونە ماڵان ئەوە سەلام لە یەکتر بکەن . سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ حەسەنی بەسریو قەتادەو زوهری دەڵێن: واتە: با هەندێکتان سڵاو لەوی تر بکات،[4] ئیبنو جورەیج دەڵێ: ئەبو زوبەیر هەواڵی دامێ وتی: بیستم لە جابیری کوڕی عبدالله وە دەیوت: وەختێك چوویتەوە بۆ لای ماڵو منداڵت سڵاویان لێ بکە بەو سڵاوە پاکو پیرۆزەی خوا. دەڵێ وا دەزانم ئەو سڵاوەی بە واجب داناوە، دیسان ئیبنو جورەیج دەڵێ: زیبادی کوڕی ئەبو تاوس (طاوس) هەواڵی

[1] الطبري (١٩/٢٢٤).

[2] احمد (٣/٥٠١)، أبو داود (٣٧٦٤)، ابن ماجه (٣٢٨٦).

[3] ابن ماجه (٣٢٨٧)، قال البوصيري من الزوائد (٣/٧٧).

[4] البغوي (٣/٣٥٨)، الطبري (١٩/٢٢٦).

دامێ کە جابیری کوڕی عبداللە دەیگوت: هەر کاتێك یەکێکتان چووە ماڵەوە با سڵاو بکات.[1] موجاهید دەڵێ کاتێك چوویتە مزگەوت بڵێ: سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) وە چوویتە ماڵەوە سڵاویان لێ بکە، ئەگەر چویتە ماڵ کەسی تێدا نەبوو، بڵێ: سڵاو لە خۆمانو بەندە چاکەکانی خودا.[2] چونکە فەرمان کراوە بەئێوەیە سڵاو بکەن، بۆشیان گێڕاوینەتەوە کە فریشتەکان وەڵامی ئەو سڵاوە[3] ئەدەنەوە﴿تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً﴾ واتە: بە سەلام کردنێك لە لایەن خواوە سەلامێکی جوانو چاکو پاك . خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ وەختێ خوای گەورە باسی ئەو بڕیارە توندو تۆڵو بەرنامە ڕێكو پێكو نەگۆڕانەی کرد لەم سوڕەتە پیرۆزەدا، عەبدەکانیشی ئاگادار کردەوە بۆیە ئەم نیشانەی ڕوون کردووەتەوە بۆیان بە تەواوی تالێی وردببنەوەو دەرسی لێ وەرگرنو بێنە سەرهۆش خۆیان.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾﴾

**ئیزن خواستن لە پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی دەرچوون بە لایەکدا، هەر کاتێك بە کۆمەڵ بە یەکەوە دەرچوون**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ واتە: بەڕاستی ئیمانداران تەنها ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە وە هەر کاتێك لەگەڵ ئەودا بن لە کارێکی گرنگدا کە کۆیان دەکاتەوە ناڕۆن بە هیچ لایەکدا هەتا مۆڵەت لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرنەگرن بێگومان ئەوانەی مۆڵەتت لێ وەردەگرن ئەوانە کەسانێکن کە بڕوایان هەیە بە خواو پێغەمبەرەکەی. ئەمەیش دیسان ئەدەبێکی ترە کە خوای گەورە نیشانی بەندە خاوەن باوەڕەکانی دەدات، وەك چۆن فەرمانی پێدان ئیزن بخوازن لە کاتی چوونە ژوورەوەدا، هەر بەو شێوەیەش فەرمانی پێداون کە ئیزن بخوازن لە کاتی چوونە دەرەوەیشدا ئەگەر لە کارێکی بە کۆمەڵدا لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دابوون، وەك نوێژی هەینیو جەماعەتو جەژنو یان هەر کارێك پێویستی بە ڕاوێژکردن هەبێت خوای گەورە

---

[1] الطبري (١٩/٢٢٥).

[2] عبدالرزاق (٣/٦٦).

[3] الدر المنثور (٦/٢٢٨).

فەرمانی پێکردوون کە بڵاوەی لێ نەکەن‌و لە پێغەمبەر (ﷺ) دوورنەکەونەوە، مەگەر ئیزنی لێ بخوازن‌و ڕاوێژی پێ بکەن بۆ کارێکی پێویست، هەر کەسێك وا بکات ئەوە ئەو کەسە موسڵمانێکی خاوەن باوەڕی تەواوە، پاشان خودای مەزن فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەگەر کەسێکیان داوای ئیزنی لێ کرد لەو بارەیەوە، دەتوانێت ئیزنی بدات ئەگەر حەزی کرد، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا ٱسۡتَـٔۡذَنُوكَ لِبَعۡضِ شَأۡنِهِمۡ فَأۡذَن لِّمَن شِئۡتَ مِنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمُ ٱللَّهَ﴾ واتە: جا هەر کاتێك ئەوانە داوای مۆڵەتیان لێ کردیت بۆ هەندێ ئیش‌و کاری تایبەت بە خۆیان ئەوە هەر کامیان خۆت ویستت مۆڵەتی بدەو داوای لێبوردنیان بۆ بکە. ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێك یەکێکتان گەیشتە کۆمەڵێك با سڵاو بکات، وە ئەگەر ویستی هەڵسێ‌و بڕوات با هەر سڵاو بکات چونکە سڵاوی یەکەم گرنگتر نیە – هەقتر – نیە لە سڵاوە دواینەکە)،[1] وە هەر بەو شێوەیە ترمیزی‌و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە، ترمزی دەڵێ: فەرموودەیەکی چاکە (حديث حسن)،[2] ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: بە ڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە.

﴿لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضًاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذًاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٦٣)﴾

**باسی ڕێزلێنان‌و ئەدەب لە بانگ کردنی پێغەمبەردا (ﷺ)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضًاۚ﴾پێغەمبەر(ص)بەوشێوەیەبانگ مەکەن کەلەناو خۆتاندا یەکتری پێبانگ ئەکەن. زەحاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەگێڕێتەوەکەفەرمویەتی: بانگی پێغەمبەر (ﷺ)یان دەکردو دەیانگوت: ئەی محمد! ئەی ئەبالقاسم خوای گەورەئەمەی قەدەغە کرد لێیان، وەك ڕێزێك لە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فەرمووی: بڵێن ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی فرستادەی خودا.[3] موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیریش هەر وایان گوتووە.[4] خوای گەورە فەرمانی دا کە ڕێز لە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بگیرێت، بە قەدرو حورمەت‌و گەورە

---

[1] ابو داود (٥/٣٨٦).

[2] تحفة الأحوزي (٧/٤٨٥)، النسائي ن الكبرى (٦/١٠٠).

[3] الدر المنثور (٦/٢٣٠).

[4] الطبري (١٩/٢٣٠).

سەیری بکەن.[1] موقاتیل لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾ دەڵێ: خوای گەورە دەفەرمووێت: ناوی مەبەن کاتێك بانگی دەکەن، وەك ناوبردنی خۆتان لە یەکتری بڵێن: ئەی محمد! یان ئەی کوڕی عبدالله! بەڵکو ڕێزی لێ بگرن‌و بڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەی فرستادەی خودا(ﷺ)، ڕای دووهەم لەسەر مانای ئەم ئایەتە: ﴿ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ﴾ ئەمەیە: وا مەزانن دوعای پێغەمبەر (ﷺ) کە بیکات لە کەسێك وەك دوعای خەڵکی تر وایە، بێگومان دوعای پێغەمبەر (ﷺ) وەردەگیرێت بترسن لەوەی کە دوعاتان لێ بکات‌و لەناو بچن، ئیبنو ئەبی حاتم گێڕاویەتیەوە لە ئیبنو عەباس‌و حەسەنی بەسری‌و عەتبەی عەوفیەوە والله أعلم،[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ﴾ واتە: بە ڕاستی خوا دەزانێ‌و ئاگادارە بەوانەی لە ئێوە (بەبێ مۆڵەت) لە پەنای خەڵکی ترەوە دەردەچن بە دزیەوە. موقاتیلی کوڕی حەیان دەڵێ: ئەو دوو ڕووانە بوون کە بە لایانەوە گران بوو دانیشن‌و گوێ لە وتاری هەینی (الجمعة) بگرن‌و خۆیان دەدایە پاڵ هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و لە پەنای ئەوانەوە پێدزەیان دەکرد بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە لە مزگەوت، لەبەر ئەوەی کەس بۆی نەبوو لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە بە ئیزنی پێغەمبەر (ﷺ) نەبوایە لە ڕۆژی هەینیدا، پاش هەندێ گوێگرتن لە وتارەکە، هەر کەسێك دەیویست لە مزگەوت بچێتە دەرەوە بە پەنجەی ئیشارەتی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) ئیزنی دەدا بەبێ ئەوەی ئەو کەسە هیچ قسەیەك بکات، چونکە هەر کەسێکیان قسەی بکردایە لە کاتی وتاردانی پێغەمبەردا (ﷺ) جومعەکەی بەتاڵ دەبوویەوە.[3] سودی دەڵێ: ئەگەر ئەو دووڕووانە لەگەڵ پێغەمبەر بوونایە(ﷺ) لە کۆمەڵێکدا خۆیان دەدایە پاڵ یەکتری بۆ ئەوەی دەرنەکەون‌و پێغەمبەر (ﷺ) چاوی پێیان نەکەوێت.

## ڕێگری لە بێگوێیی کردنی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ﴾با ئەو کەسانەی کە لە فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆ دەدزنەوە بترسن، واتە: خۆیان لادەدەن لە ڕێ‌و ڕچەو بەرنامەو پرۆگرام‌و سونەتی ئەو، چاك بزانن کە هەرچی قسەو کردار هەیەپێویستە بە قسەو کرداری پێغەمبەر (ﷺ)بکێشرێت، هەر قسەو کردارێك لەگەڵ قسەو کرداری ئەوا ڕێك بوو وەردەگیرێت، هەرچیش نارێك بوو

---

[1] الطبري (١٩/٢٣٠).

[2] الطبري (١٩/٢٣٠).

[3] الدر المنثور (٦/٢٣١).

وەرناگیرێت و دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا با هەر کەسێك بێت خاوەن قسەو کردارەکە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەو ئەوانی تریشدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەر کەسێك کارێك بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەو کارەی وەرناگیرێت)،[1] کەواتە با بترسنو ئاگایان لە خۆیان بێت ئەو کەسانەی دژایەتی بەرنامەی پێغەمبەری خوا دەکەن (ﷺ) بە پەنهانی یان بە ئاشکرا، ﴿ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ ﴾بەلایەك بێت بەسەر دڵیانداو تووشی خوانەناسیو دووڕوویيو بیدەچێتی بن، ﴿أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ یانی: یان لە دونیادا توشی کوشتنو شەلاق لێدانو بەندیخانە یان هەر سزایەکی تر ببن، وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (وێنەی منو ئێوە وەك وێنەی پیاوێك وایە ئاگرێکی کردبێتەوە، کاتێك ئاگرەکە دەوری خۆی ڕووناك کردەوە، ئەو پەپولەو گیانەوەرە باڵندانە خۆیان دەکێشن پیایدا دەیانگرێتو بەریان نادات و دەکەونە ناوی ئاگرەکە، وێنەی منو ئێوەش هەر وایە، من دەستم گرتووە بە ئێوەوە هەتا بۆ ئەوەی نەکەونە ئەو ئاگرەوەو خۆتانی لێ لادەن، کەچی ئێوەسەرنکەون بەسەرمداو خۆتان هەڵئەدەنە ناوی)[2].

﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾ ﴾

**خودا دەزانێت ئێوە چی دەکەن**

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێت: ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾هۆشـــیاربن! هەرچـــی لەئاسمانەکان وزەویدا هەیە هەموو هەر هی خوایە. خـوای گـەورە باسـی ئـەوە دەکـات کـە هـەر خـۆی خاوەنی ئاسمانەکانو زەمینەو ئاگاداری گشت نهێنیو ئاشکراکانەو ئاگایشی لـە عەبدەکانیـەتی چیان کردووە لە کاتی پەنهانیو ئاشکرایاندا، فەرموویەتی: ﴿قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ ﴾ ئەم – قد – ە بۆتە حەقیقە، وەك لە پێش ئەم شایەتەوە فـەرمووی: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا﴾، وە فەرموویەتی: ﴿قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ﴾ واتە: بێگومان خوا دەزانێ بەو کەسانەتان کە ساردکەرەوەو کەڕێنەرەوەی (موسڵمانانە لە جیهاد). وە فەرموویەتی: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ﴾ واتە بە ڕاستی خوا بیستی وتەی ئەو ژنەی کە لە بارەی مێردەکەیەوە گفتو گۆی لەگەڵ ئـەکردی. وە فەرموویـەتی: ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ واتـە: بە ڕاستی ئێمـە دەزانـین کـە بێگومـان

---

[1] فتح الباري (٤/٤١٦)، مسلم (٣/١٣٤٣).

[2] أحمد (٢/٣١٢)، مسلم (٢٢٨٤).

ئەوەی کە ئەوان دەیڵێن غەمبارت دەکات بەڵام بێگومان ئەوان تۆ بە درۆزن دانانێن بەڵکو ئەو ستەمکارانەنکولی لە ئایەتەکانی خوا دەکەن . وە فەرموویەتی: ﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە گەڕانی ڕوخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین.هەموو ئەم ئایەتانە تەحقیقی کاریان – فعل – تێدایە، وەك بانگ وێژ دەڵێت: (قد قامت الصلاة قد قامت الصلاة) بۆ کردنو بەجێهێنانی نوێژ، وە خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ﴾ واتە: خوا خۆی ئاگای لێتانەو شایەتەو مسقالە زەڕەی لێ ون نابێت. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ واتە: وە پشت بەو خوایە ببەستە کە زاڵو بە بەزەییە، ئەو (خوایە) کە دەتبینێت کاتێ بە تەنها نوێژ دەکەی وە (دەبینێ) نوێژکردنت لە ناو نوێژکەرانیدا (کە پێش نوێژیان بۆ دەکەیت) بە ڕاستی تەنها ئەوە بیسەری ئاگادار.وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: وە ئەی (محمد (ﷺ)) تۆ لە هەر مەبەستو کارێکدا بیت وە هەرچی لە قورئان بخوێنیو (ئێوە) هەر کردەوەیەك بکەن بێگومان بەسەرتانەوە شایەتین، ئاگادارین کاتێك دەڕۆنە ناویەوەو پێوەی خەریکنو ون نابێت لە پەروەردگارت بە ئەندازەی گەردیلەیەك نە لە زەویو نە لە ئاسماندا وە نە بچوکتر لەو گەردیلەیەو نە گەورەتر لەو (گەردیلەیە) هەموولەناو پەڕاوێکی ئاشکرادان. وە فەرموویەتی: ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾[١] واتە: خوا خۆی شایەتە بەسەر بەندەکانیەوە لەوەی دەیکەن لە چاکەو لە خراپە، وە فەرموویەتی: ﴿أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ واتە: بێدار بن کاتێك ئەوانە خۆیان دادەپۆشن بە پۆشاکەکانیان (خوا) دەزانێ بەوەی دەیشارنەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەن. وە فەرموویەتی: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ ﴾ واتە: یەکسانە (بۆ خوا) ئەوەتان بە نهێنی قسە بکاتو ئەوەتان بە ئاشکرا (قسە) بکات.وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: هیچ گیانلەبەرێك نیە لە زەویدا مەگەر لەسەر خوایە ڕزقو ڕۆزیەکەی وە (خوا) دەزانێ شوێنی مانەوەی وە شوێنی لێ دەرچوونی، هەمووی نووسراوە لە کتێبێکی ڕوونکەرەوەدا (لوح

---

[١] الرعد (٣٣).

محفـــوظ).وە فەرموویـــەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ واتـــە: وەکیلی هەموو نهێنیەکان هەر لای خوایە کەس نایانزانێ بێجگە لە ئەو (خوا) وە (خوا) دەزانێ چی لـە وشکانیو دەریادا هەیە وە هـەر گەڵایـەك بکەوێتـە خـوارەوە خـوا پێـی دەزانـێو هـەر دانەوێڵەیـەك لـە تاریکیـەکانی زەویـدا بێـتو هـەر تـەڕو وشـکێك هـەبێت هـەر هـەموویان لـە کتێبـی ئاشـکرادان (اللـوح المحفوظ).ئایەتو فەرموودە لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی هەموو دروستکراوەکان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، کە ڕۆژی قیامەتـە ﴿فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟﴾ واتە: هەواڵیان دەداتێ کە لە دنیادا چیان کردووە لە باشو خـراپ لـە گـەورەو بچووك وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾، واتـە: لـەو ڕۆژەدا ئـادەمی هـەواڵی پـێ دەدرێت لەوەی کە پێشی خستووەو دوای خـستووە (لـە چاکەو خراپـە).وە فەرموویـەتی: ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾ واتـە: نامـەی کردەوەکـان دابـەش دەکرێـت (دەدرێتە دەستی ڕاستی چاکانو دەستی چەپی تاوانباران) ئینجا تاوانباران دەبینی زۆر دەترسن لـەو (هەموو تـاوانو خراپـە)ی کـە تێیدایـەو دەڵێن ئـای هـاوار بـۆ ئێمـە ئـەم نامـەو دەفتـەرە چیە؟ هـیچ کردەوەیـەکی بـچووكو گـەورەی بـەجێ نەهێـشتووەو تۆمـاری کـردووە هـەر کردەوەیـەکیان کردبێـت (تیایدا) ئامادەیەو پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات.بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ﴾ئـەوڕۆژەی ئـە گەڕێنرێنـەوە بـۆ لای خـوا دەسـتبەجێ هـەواڵی کردەوەکانیان پـێ ئـەدات وخـواش زانایـە بەهـەموو شـتێك.. ، سوپاسو ستایش بۆ خـودای هـەموو جیهان، کۆتایی سورەتی نورهات سوپاسو ستایش بۆ خوای گەورە.

## تەفسیری سورەتی (الفرقان)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖ فَقَدَّرَهُۥ تَقۡدِيرٗا ۝٢﴾

خوای گەورە سوپاس‌و ستایشی گەورەیی خۆی دەکات لەسەر ئەو قورئانە پیرۆزەی ڕەوانەی کردووە بۆ ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەی خۆی. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: هەموو سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ناردوویەتیە خوارەوە قورئان بۆ سەر بەندەی خۆی (موحەمەد (ﷺ))و هیچ جۆرە لاریەکی تیادا دانەناوە، (کتێبێکی) ڕاست‌و پایەدارە بۆ ئەوەی ئەوانەی کە باوەڕی پێ ناهێنن بە سزایەکی زۆر بە تین بترسێنێت) لە لایەن خۆیەوەو مژدەش بدات بەو باوەڕدارانەی کە کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن.وە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿تَبَارَكَ﴾ لە تەفاعەلەوە – تفاعل – هاتووە(وەك: تكامل) واتە: لە مەزنێکی هەمیشەیی تەواوی بەردەوامەوەیە، ﴿ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ﴾، ﴿نَزَّلَ﴾ لەسەر وەزنی (فعّل)یە، لەزۆر دووبارە بونەوەو زۆر دابەزینەوە هاتووە، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ﴾ واتە: بەو قورئانەی ناردوویەتیە خوارەوە بۆ فرۆستادەکەی وە بەو کتێبانەش کە پێشتر ناردوویەتیە خوارەوە.بێگومان کتێبە پێشووەکان بە یەکجار هاتوونەتەخوار، بەڵام قورئان بەشبەش‌و بە جیاجیا هاتووەتە خوارەوە ئایەت دوای ئایەت‌و بڕیار دوای بڕیارو سورەت دوای سورەت، ئەم شێوە هاتنە خوارەوەیە بەهێزترو توندترەو گرنگی دانە بەو کەسەی کە ئەم قورئانەی بۆ هاتووەتە خوارەوە، وەك خودای مەزن هەر لەم سورەتەدا فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ۝٣٢ وَلَا يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا﴾ واتە: وە ئەوانەی بێبڕوا بوون دەیان وت بۆچی (موحەمەد (ﷺ)) هەموو قورئانی بە یەکجار بۆ دانەبەزێنراوە ئا بەو جۆرە (دامانبەزاندووە) بۆ ئەوەی دڵی تۆ (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بەو قورئانە دامەزراوو بەهێز بکەین وە (بەو بۆنەیەوە) ئایەتانی خۆمم ناردن بەرەبەرە، هەر نموونەو مەسەلێکت بۆ بێنن (لە ڕەخنەو پێشنیارە نابەجێکانیان) ئێمە وەڵامەکەیمان بۆ تۆ هێناوە بە ڕاستی‌و

جوانترین ڕوون کردنەوە. بۆچی لێرەدا ناوی بردووە بە جیاکەرەوە – الفرقان – چونکە هەق لە ناهەقو ڕێی ڕاست لە گومڕاییو شارەزایی لە سەرلێشێواویو حەرام لە حەلاڵ جیادەکاتەوە ﴿عَلَىٰ عَبْدِهِۦ﴾ ئەمەیش وەسفو ڕێزێکە لە خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە بە عەبدی خۆی ناوی هێناوە. وەك چۆن لە شەوی ئیسرادا لە بەڕێزترین کاتی ژیانیدا بەو شێوەیە وەسفی کردووە فەرموویەتی: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ﴾ واتە: پاكو بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەوی کرد بە بەندەی خۆی لە شەوێکدا.وە لە کاتی هاناو پاڕانەوەیشدا لە لای خودا، خوای گەورە وەسفی کردووە بە بەندەی خۆی، ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ واتە: وە بەندەی خوا (محمد (ﷺ)) کە هەستا لە خوا بپاڕێتەوە (و بیپەرستێت) (بێبڕواکانی مەککە) نزیك بوو دابارن بەسەریدا. وە هەروەها لە کاتی ناردنی قورئانو ڕەوانەکردنی فریشتەیشدا هەر بەو شێوەیە وەسفی کردووە فەرموویەتی: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ واتە: گەورەو پیرۆزە ئەو زاتەی کە فورقان (قورئان)ی بۆ سەر بەندەی خۆی ناردۆتە خوارەوە تا ترسێنەر بێت بۆ هەموو جیهانیان.وە کە دەفەرموێت: ﴿لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾بۆئەوەی ببێتەئاگادار کەرەوە بۆهەمووجیهانیان. واتە: پێغەمبەری (ﷺ) تایبەت کردووە بەو کتێبەی کە شیکەرەوەیەو زۆر مەزنو ئاشکراو تەندو بەهێزە کە ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾، واتە: بەتاڵ ڕووی تێ ناکات نە لە ئێستاو نە لە دوارۆژدا (نە بە لێکەم کردن نە بە لێزیاد کردن) چونکە نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن (خوای) کاردروستی ستایش کراوەوە.ئەو قورئانەی کە خودا کردوویەتی بە جیاکەرەوەیەکی زۆر مەزن، بۆیە بەو شێوەیە وەسفی کردووە، چونکە پەیامێکە بۆ هەموو کەسێك کە ئاسمان بەسەریەوە بێتو لەسەر زەمین نیشتەجێ بێت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەوانە کرام بۆ سوورو ڕەشیش)،[1] وە فەرموویەتی: (پێنج شتم پێدراوە کەبە هیچ یەکێك لە پێغەمبەرەکانی پێش خۆم نەدراوە) یەکێك لەوانەی باسی کردووە فەرموویەتی: (پێغەمبەر هەبووە بە تایبەتی بۆ هۆزەکەی خۆی ڕەوانە کراوە من ڕەوانە کراوم بۆ خەڵکی بە گشتی)،[2] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾ واتە: بڵێ: ئەو کەسەی منی ناردووە هەر ئەو خاوەنی ئاسمانەکانو زەمینە، ئەو خودایەی بە هەر

---

[1] احمد (١٤٥/٥).

[2] فتح الباري (٦٣٤/١).

شتێك بفەرموێت ببە دەبێت، وە هەر ئەوە زیندووش دەكاتەوەو دەشمرێنێ، وە بەو شێوەیەش لێرەدا دەفەرموێت: ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ واتە: ئەو زاتەی كە دەسەڵاتو موڵكی ئاسمانەكانو زەوی هی ئەوەو هیچ منداڵی بۆ خۆی بڕیار نەداوەو كەس هاوبەشی نیە لە فەرمانڕەواییو موڵكو داریدا وە هەموو شتێكی دروست كردووە وە ئەندازەی بۆ دیاری كرد بە چاكی.خوای گەورە باسی بێ عەیبی خۆی كردووە كە كەسی نەكردووە بە كوڕو شەریكی خۆی، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا﴾ واتە: هەموو شتێك جگە لە خۆی گشت دروستكراوی ئەوەو هەر ئەو بەخێوی كردوون، خوای هەموو شتێكەو خاوەنو پەروەرندەیەتیو لە ژێر دەسەڵاتو بڕیارو فەرمانی ئەودایەو لێی دەرناچێت.

﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾﴾

**باسی نەفامی موشریكەكان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ واتە: بێجگە لە خوا چەند پەرستراوێكیان بۆ خۆیان بڕیار داوە كە هیچ شتێك دروست ناكەن بەڵكو خۆشیان دروست كراون دەسەڵاتیان نیە بۆ خۆیان نە زیان نە سوودو قازانج.خوای گەورە باسی نەفامی بت پەرستان دەكات كە بێجگە لە خوا كەسی تر دەپەرستن، ئەو خوایەی كە هەر خۆی وەدی هێنەری هەموو شتێكەو خاوەنی گشت بڕیارێكە، ئەوەی مەیلی لێ بێت دەبێتو ئەوەیشی مەیلی لێ نەبێت نابێت، كەچی ئەو نەفامانە ئەو بتانە دەپەرستن لەگەڵ خوادا كە توانای دروست كردنی باڵە مێشوولەیەكیان نیە، بەڵكو خۆیان دروست كراونو ناتوانن قازانجو زەرەر بە خۆیان بگەیەنن، كەواتە چۆن قازانج بەو كەسانە دەگەیەنن كە دەیان پەرستن، ﴿وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَاةً وَلَا نُشُورًا﴾ واتە: هەروەها مردنو ژیانو زیندووبوونەوەی خۆیان بە دەست نیە، یانی: هیچێ لەوانەیان بە دەست نیە، بەڵكو هەمووی بەدەست خوای گەورەیەوئەو دەمرێنێ‌و، وە هەر ئەویشە خەڵكی جارێكی تر زیندوو دەكاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە یەكەم كەسەوە هەتا دواین كەس، ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ واتە: دروست كردنی هەمووتان (لە سەرەتاوە)و زیندوو كردنەوەتان وەك (دروست كردنو زیندوو كردنەوەی) تەنها كەسێك وایە.وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَمْرُنَا

﴿إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِٱلْبَصَرِ﴾ واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە وەك چاوتروكاندنێك وایە (لە خێرایدا). وە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾ واتە: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەر یەك نەعرەتەیە، ئیتر کوتوپڕ ئەوەتان لە دەشتێکی سپی کاکی بە کاکیدا. وە فەرموویەتی: ﴿إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ واتە: تەنها شریخەو دەنگێکی گەورە دێت ئیتر کوتوپڕ هەمووتان (بە کۆمەڵی) لای ئێمە ئامادە کراون. خوا ئەو خوایەیە کە هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو پەروەرینیش هەر خۆیەتی، عیبادەت تەنها بۆ ئەو نەبێت دروست نیە هەرچی حەز بکاتو دەیکاتو هەرچیش حەز نەکات نایکات، خودایەکە کە نە کوڕی هەیەو نە باب، نە شەریكو نە هاوتاو نە هاوێنەو نە بریکارو نە وەزیری هەیە، بەڵکو خودایەکی تاكو تەنهایەو بێنیازەو جێنیازە، کەس لەو نەبووەو لە هیچ کەس نەبووە هەرگیز کەسیش نەیتوانیووە هەمبەری بێت.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٥﴾ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾﴾

**قسەی خوانەناسان لەبارەی قورئانەوە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ خوای گەورە باسی کەللە پوتیو بێ ئاوەزیو نەفامی ئەو خوانەناسانە دەکات کەچی دەربارەی قورئان دەڵێن ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ﴾ واتە: ئەمە هەموو درۆیە کە ﴿ٱفْتَرَىٰهُ﴾ واتە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی هەڵی بەستووە، ﴿وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ﴾ یارمەتی لەخەڵکی تر وەرگرتووە تا کۆی کردوونەتەوە، خوای گەورەش وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا﴾ واتە: ئەوانە خۆیان درۆیان هەڵبەستووەو قسەی پڕوپوچ دەکەن خۆشیان چاك دەزانن قسەکانیان پڕوپوچە، درۆش لەگەڵ خۆیاندا دەکەن،کە دەڵێن:﴿ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا﴾ چیرۆکی پێشینانە لە کتێبەکانی پێشەوە وەری گرتووە داوای کردووە بۆ بنووسن ﴿فَهِيَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ﴾ واتە: دەخوێنرێتەوە بەسەریدا ﴿بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ سەر لە بەیانیو ئێواران، ئەم قسەیە ئەوەندە بێبایەخو سووكو بێنرخە هەموو کەسێك دەزانێ ڕاست نیە، چونکە گومانی تێدا نیەو خەڵکێکی زۆر چاك دەزانن کە محمد (ﷺ) هیچ شارەزاییەکی لە نووسیندا نەبووە نە لە سەرەتای تەمەنیەوە نە لە کۆتایی تەمەنیشیدا، وە لە سەرەتای لە دایك بوونیەوە لەناو ئەواندا

گەورە بووەو تەمەنی بەسەر بردووە هەتا لە تەمەنی چل ساڵیدا خوا ڕەوانەی کرد، ئەوان ئاگاداری هاتوچۆو پاکیو چاکەخوازیو ئەمانەتو ڕاستگۆیی بوون، وە دەیانزانی کە زۆر دوورە لە درۆو بەدڕەوشتیو هەموو ڕەوشتێکی ناشیرین، ئەوە بوو هەر لە منداڵیەوە هەتا بوو بە پێغەمبەر (ﷺ) بە (محمدی ئەمین) ناویان دەهێنا، چونکە دەیانناسی چەندە چاکەخوازو ڕاستگۆیە، وەختێ خودای گەورە ئەو ڕێزەی لێ ناو کردی بە پێغەمبەر (ﷺ) دەستیان دایە دوژمنایەتی کردنیو ئەو قسە پڕوپوچو دوور لە ڕاستیانەیان دەربارەی ئەکرد، هەموو کەسێکی ژیر دەیزانی کە پێغەمبەر (ﷺ) پاكو بێگەردەو دوورە لەو قسانەوە کە ئەوانە دەیکەن، لەو درۆیانە کە هەڵیان دەبەست، جارێ دەیانگوت جادوگەرەو جارێ دەیانگوت شاعیرەو جارێ دەیانگوت شێتەو جارێکی تر دەیانگوت درۆزنە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴾ واتە: سەیرکە چۆن نموونە (ی پووچ) بۆ تۆ دێننەوە بەو هۆیەوە گومرابوون ئیتر ناتوانن ڕێگای حەقو ڕاستی بدۆزنەوە. خوای گەورە لێرەدا وەڵامی ئەو لاساریو درۆکردنەیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾، واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ زاتێك ناردوویەتیە خوارەوە کە هەموو نهێنی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێت.یانی: ئەو کەسەی کە قورئانی ناردووە پڕە لە دەنگو باسی خەڵکی هەر لە ئەوەڵەوە هەتا دوایی، هەواڵێکی ڕاستو دروستە کە ڕێك بەرامبەرە لەگەڵ ڕووداوەکاندا لە دەرەوە لە ڕابردووداو لەمەودوایش، ﴿الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ ﴾ ئەو خودایەی کە ئاگاداری نهێنیەکانی ئاسمانەکانو زەمینە ئاگای لە نهێنیەکانیان هەیە وەك چۆن ئاگاداری ئاشکراکردنیانە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەو (خوا) لێبوردەی میهرەبانە، یانی بانگیان دەکات کە تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای بەزەیی ئەو ئەوەندە فراوانە هەموو شتێك دەگرێتەوە،چونکە خودا زۆر بە سەبرە، هەر کەسێك تەوبە بکات تەوبەکەی لێ قبوڵ دەکات. ئەو خوانەناسانە لەگەڵ هەموو بێدینیو خراپەکاریو بەدڕەوشتیو بوختان هەڵبەستنو لاساریاندا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)و قورئاندا دەیکەن، کەچی خوای گەورە داوایان لێ دەکات کە تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای و موسڵمان بنو ڕێی ڕاست بگرنەبەر. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى اللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی بێباوەڕ بوون ئەوانەی کە وتیان بێگومان خوا یەکێکە لەو سێ خوا (کە بریتین لە پەروەردگارو عیساو دایکی) (لە

کاتێکدا) هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لە تەنها خوایەك وە ئەگەر وازنەهێنن لەو وتە ناڕەواو بەدانە سوێند بە خوا سزایەکی بە ئازارو سەخت دووچاری ئەوانەیان ئەبێ کە بێباوەڕ بوون ، دەی ئایا بۆ تۆبە ناکەن و ناگەڕێنەوە بۆ لای خوا؟ و داوای لێبوردنی لێ ناکەن؟ لە کاتێکدا خوا لێبوردەی میهرەبانە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاوو ژنە بڕواداره‌کانیان داو لە پاشان پەشیمان نەبوونەوە ئەوە بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخ، سزای (ئاگری) سوتێنەر.حەسەنی بەسری دەڵێ: سەیری ئەو گەورەیی و خاوەن ڕێزیەی خودا بکەن، دۆستەکانی دەکوژن، کەچی هەر بانگیان دەکات بۆ تۆبە کردن و ژێر بەزەیی خۆی.

﴿وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۙ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوْ يُلْقَىٰٓ إِلَيْهِ كَنزٌ أَوْ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٌ يَأْكُلُ مِنْهَا ۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَٰلَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًۢا ﴿١٠﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِٱلسَّاعَةِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾ إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلْقُوا۟ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا ﴿١٤﴾﴾

**قسەی خوانەناسان بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ)و وەڵام دانەوەیان و باسی چارەنووسی خوانەناسان**

خوای گەورە باسی سەرپێچی و لاساری خوانەناسان دەکات کە باوەڕ بە هەق ناکەن بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت، جگە لە چەند قسەیەکی بی سەرو بن و بێ مانا، ﴿وَقَالُوا۟ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأْكُلُ ٱلطَّعَامَ﴾ واتە: دەیانوت ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە خواردن دەخوات وەك ئێمە چۆن خواردن دەخۆین، هەر شتێك ئێمە پێویستمان پێی ببێت ئەویش پێویستی پێیەتی، ﴿وَيَمْشِى فِى ٱلْأَسْوَاقِ﴾ واتە: هاتوچۆی ناو بازاڕ دەکات بۆ کاری بازرگانی و بژێوی وەدەست هێنان، ﴿لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا﴾ دەڵێن: چاك وابوو فریشتەیەك بهاتایە بۆ لای لە لایەن خواوە بۆ ئەوەی لەگەڵی ترسێنەر بێت، شایەتی بدات، کە ئەوەی ئەو خەڵکی بۆ بانگ دەکات ڕاستە، ئەمە وەك ئەو قسەی فیرعەون وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ واتە: دە بۆچی بازنەی ئاڵتونی پێ نەدراوە؟ (ئەگەر ڕاست دەکات) یان

فریشتەی (گەواهی دەری) لەگەڵدا نەهاتووە.هەر بەو شێوەیە ئەم خوانەناسانەش هەر وا دەڵێن یەك سروشتیان هەیەو دڵەكانیان وەك یەكە، بۆیە ئێژن ﴿أَوْ يُلْقَىٰ إِلَيْهِ كَنزٌ﴾ واتە: یان گەنجینەیەكی بۆ فڕێ درایە. یانی: زانیاری‌و گەنجینەی ببوایەو لەگەڵی بوایەو لێی ببەخشیایە، یان باخێكی ببوایە لەگەڵی بگەڕایە بۆ هەر شوێنێك بڕۆیشتایە لێی بخواردایە، ئەمە بۆ خوا زۆر ئاسانە بەڵام كاری خوا پڕ لە كارزانیەو خۆی دەزانێ چی چاكە بۆ مەردم ﴿وَقَالَ الظَّالِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا﴾ واتە: ستەمكاران گوتیان ئێوە هەر شوێن كەسێك دەكەون كە جادووی لێ كراوە، خوای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا لَكَ الْأَمْثَالَ فَضَلُّوا﴾ واتە: سەیركە ئەوانە چۆن قسەی پڕوپوچ دەدەنە پاڵ تۆ دەڵێن: جادووگەرەو جادووی لێكراوەو شێتەو درۆزنەو شاعیرە، قسەكانیان هەموو پڕوپوچەو، هەر كەسێك تۆزێك ئارەزووی هەبێت‌و هۆشمەندبێت بڕوایان پێ ناكات، دەزانێت درۆزن‌و ئەو قسانە هەڵبەستنە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَضَلُّوا﴾ واتە: ڕێیان ون كردووە لە ڕێی ڕاست لایان داوە ﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا﴾ واتە: ناتوانن ڕێگای ڕاست بگرنە بەر، چونكە هەر كەسێك لە ڕێی ڕاست ترازا، سەری لێ تێك دەچێت‌و نازانێ ڕوو لە كوێ بكات، چونكە هەق هەر یەكێكەو بەرنامەكەیش یەك بەرنامەیەو بە یەكەوە بەستراوە، پاشان خوای گەورە پێغەمبەرەكەی (ﷺ) ئاگادار دەكات ئەگەر مەیلی لێ بێت لەوە چاكترت دەداتێ لە دنیادا لەوەی ئەوانە ئەیلێن وەك دەفەرمووێت: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي إِن شَاءَ جَعَلَ لَكَ خَيْرًا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَيَجْعَل لَّكَ قُصُورًا﴾ واتە: گەورەو پیرۆزە ئەو زاتەی ئەگەر بیەوێت (لە دنیادا) چاكتر لەوە (ی بڕوایان دەڵێن) بۆت ساز دەدات باخاتێك كە ڕووبارەكان بە ژێریاندا دەڕوات وە چەند كۆشكت بۆ فەرماهەم دێنێ. موجاهید دەڵێ: لەوە چاكتر هەر لە دنیادا، وە دەڵێ: قورەیشیەكان هەموو خانوویەك لەبەرد دروست كرابێت پێی دەڵێن كۆشك گەورە بێت[1] یان بچووك، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بَلْ كَذَّبُوا بِالسَّاعَةِ وَأَعْتَدْنَا لِمَن كَذَّبَ بِالسَّاعَةِ سَعِيرًا﴾[2] یانی بۆیە ئەوانە ئەو قسانە دەكەن چونكە بڕوایان بە قیامەت نیەو بە تەمای نین‌و نایانەوێ شارەزای ڕێی ڕاست ببن، بەڵكو ئەو بڕوانەكردنەیان بە ڕۆژی قیامەت وایان لێ دەكات ئەو قسانە بكەن، ﴿وَأَعْتَدْنَا﴾ ئاگری جەهەنەممان ئامادە كردووە ﴿لِمَن كَذَّبَ

---

[1] الطبري (١٩/٢٤٣).

[2] واتە: (ڕاست ناكەن وا نیە) بەڵكو ئەوانە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە وە ئێمە ئامادەمان كردووە بۆ كەسێ باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێت ئاگری هەڵگیرساوە.

بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴾بۆهەرکەسێك کەقیامەت بەدرۆ بزانێ. واتە: سزایەکی گەرمی زۆر بە ژانە کەس بەرگەی ناگرێت، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِذَا رَأَتۡهُم﴾،[1] یانی: جەهەنەم دەیان بینێت ﴿مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ﴾ واتە: لە دوورەوە لە گۆڕەپانی قیامەتدا – مەحشەردا – ، ﴿سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا﴾ واتە: گوێیان لە ناڵەو نرکەی جەهەنمە چەندە بە داخە بۆیان، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموویت: ﴿إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ۝٧ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِ﴾،[2] واتە: ئەوەندە تووڕەیە لە خوانەناسان خەریکە لە داخا پارچەپارچە ببێت، ئیمام ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: کە پیاوێك ڕادەکێشرێت بۆ ناو ئاگر، ئاگرەکە کرژ دەبێت و دەچێتەوە یەك ، خوای ڕەحمان دەفەرموویت پێی: چیتە تۆ؟ ئاگرەکەئەڵێت: ئەو پیاوە داوام لێ دەکات بیپارێزم، دەفەرموویت: عەبدەکەم ڕەوانەکەن، ئەو پیاوە ڕادەکێشرێت بۆ ناو ئاگرەکەو ئێژێ: ئەی پەروەردگارم من گومانم وا نەبوو بە تۆ، خوای گەورەیش دەفەرموویت: ئەی گومانت چۆن بوو؟ پیاوەکە دەڵێت: بە هیوای بەزەیی تۆم کە بمگرێتەوە. خودا دەفەرموویت: عەبدەکەم ڕەوانە بکەن، ئەو پیاوە ڕادەکێشرێت بۆ ناو ئەو ئاگرە، ئەو ئاگرە ناڵەو نرکەی لێوە دێت بۆی وەك هێسترێك چۆن دەپرمێنێت بۆ جۆ، ناڵەو نرکەی لێوە دێت هیچ کەس نامێنێت لێی نەترسێت،[3] ئەم فەرموودەیە سەنەکانی ڕاستە. وە عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە لەمانای ئەم ئایەتەدا ﴿سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا﴾ دەڵێ: جەهەنم ناڵەو نرکەی لێوە دێت هیچ لە فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەرە مورسەلەکانیش خۆیان بۆ ناگیرێت و بە ڕوودا دەکەوێن و گیانیان دێتە لەرزە لە ترساندا، هەتا ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بەسەر ئەژنۆکانیدا دەکەوێت و ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەمڕۆ داوای هیچ شتێکت لێ ناکەم تەنها خۆم نەبێت.[4] پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ﴾،[5] قەتادە دەڵێ: لە ئەبو ئەیوبەوە لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوەهاتوەکە دەڵێ: وەك ئاسنی سەری ڕم وایە ئەوەندە تەنگەلانە.[6] ﴿مُّقَرَّنِينَ﴾ پێوەند

---

[1] واتە: کاتێك (ئەم ئاگرە) ئەوان دەبینێت.

[2] الملك (٧–٨)، واتە: کاتێك کە فڕێ درانە ناویەوە لەو دۆزەخەوە لوورەو نرکەیەك دەبیستن وە ئەو دەکوڵێت و جۆش دەخوات، نزیکە (دۆزەخ) لە ڕقاندا پارە پارە ببێ.

[3] الطبري (٩/٣٧٠).

[4] عبدالرزاق (٣/٦٧).

[5] واتە: وە کاتێك فڕێ دەدرێنە جێگایەکی تەنگ لە دۆزەخدا بە جوت کراوی دەست و قاچ و ملیان لە کۆت و زنجیردا.

[6] الدر المنثور (٦/٢٤٠)، الزهد لإبن المبارك في الزوائد (٨٦).

کراون ،ئەبو صالح دەڵێ: دەستیان لە پشتیانەوە شەتەك دەدرێت، ﴿دَعَوْا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا﴾،[1] یانی داوا دەکەن زوو بمرن، هەناسەی نائومێدی هەڵدەکێشن و هاوار دەکەن ﴿لَّا تَدْعُوا۟ ٱلْيَوْمَ ثُبُورًا وَٰحِدًا﴾،[2] ﴿وَٱدْعُوا۟ ثُبُورًا كَثِيرًا﴾ واتە: بەڵكو داوای مردنی زۆر بکەن.

﴿قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا ﴿١٥﴾ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴿١٦﴾﴾

**ئاگر چاکترە یان بەهەشت**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ ٱلْخُلْدِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۚ كَانَتْ لَهُمْ جَزَآءً وَمَصِيرًا﴾،[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی محمد (ﷺ) ئەوەی کە بۆمان باس کردی لە ماڵی ئەو بەدبەختانەی کە بە دەمو چاودا ڕادەکێشرێن بۆ ناو جەهەنەم، کە زۆر بە تووڕەیی‌و ڕوویەکی ناشیرین‌و ناڵەو نرکەیەکی زۆر ترسناکەوە پێشوازیان لێ دەکات‌و کەسیش نایەت بە هانایانەوە بە زنجیرکراوی هەر دەمێننەوە. ئەمە باشە یان ئەو بەهەشتە هەر دوایی نەهاتووە کە خودای گەورە بەڵێنی داوە بە خۆپارێزان لە عەبدەکانی ئامادەی کردووەو کردوویەتیە پاداشتێکی چارەنووس ساز بۆیان بەهۆی ئەو گوێڕایەڵیەیان بۆ خودای گەورە لە دنیادا، کە شوێنی حەوانەوەو ئیستراحەتیانە تا هەتا هەتایە ﴿لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ﴾ هەرچی ئارەزوو بکەن لەوێ هەیە، لە خواردن‌و خواردنەوەو جلوبەرگ‌و شوێن‌و پلەوپایەو هەر شتێکی تر، نە چاوی بینیویەتی‌و نە گوێ بیستوویەتی‌و نە هەرگیز بە دڵی کەسیشدا هاتووە، ئەمانە بەردەوام بەو شێوەیە دەژین هەرگیز لێی دەرناچن تا هەتا هەتایە هەر دەمێنێ‌و بڕانی بەسەردا نایەت‌و لەناو ناچێ‌و داواش ناکەن لێی دەرچن، ئەمەیش یەکێکە لەو بەڵێنانەی کە خوا داویەتی بە عەبدەکانی‌و ڕێزێکە پێی بەخشیون، بۆیە فەرموویەتی: ﴿خَٰلِدِينَ ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا﴾،[4] یانی دەبێ هەر بێتەدی، بەو شێوەیەی کە ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر لە هەندێ لە زانایانی زمانی عەرەبیەوە گێڕاویەتیەوە لەمەدا کە خوای گەورە

---

[1] واتە: لەوێدا داوای تیاچوون‌و مردن دەکەن.

[2] واتە: ئەمڕۆ داوای تەنها مردنێك مەکەن.

[3] واتە: بڵێ ئایا ئەمە چاکترە یا ئەو بەهەشتە هەمیشەییەی کە بەڵێن دراوە بە پارێزکاران کە پاداشت‌و سەرەنجام‌و ئارامیانە.

[4] واتە: بە هەمیشەیی‌و بێبڕانەوە ئەوە بەڵێنێکە لە لایەن پەروەردگارەوە، ئەو لێی بەرپرسیارە.

فەرموویەتی: ﴿ وَعْدًا مَّسْـُٔولًا ﴾ واتە: بەڵێنێکەو هەر دێتەدی،[١] بەم شێوەیەیە لەم سورەتەدا باسی ئاگرو پاشان باسی خەڵکی ناو بەهەشت دەکات، وەك خوای گەورە لە سورەتی (الصافات)یشدا باسی حاڵو گوزەرانی خەڵکی بەهەشتو کەیف کردنو خۆش ڕابواردنیان دەکات پاشان دەفەرمووێت: ﴿ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾[٢].

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِى لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ نَسُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٨﴾ فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا ۚ وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا ﴿١٩﴾ ﴾

## خوداکانی بتپەرستان دوورە پەرێزی خۆیان دەردەبڕن لێیان لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات لە ڕۆژی قامەتدا چیان بەسەر دێتو چۆن ڕیسوا دەبن لەسەر ئەوەی کە شتی تریان پەرستووە جگەلە خودا وەك فریشتەبۆنمونە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾،[٣] موجاهید دەڵێ: وەك فریشتەو عیساو عوزەیر،[٤] ﴿ فَيَقُولُ ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴾ واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت بەم کەسانەی کە پەرستراون ئایا ئێوە ئەوانەتان بانگ کردووە کە بتان پەرستنو من نەپەرستن؟ یان هەر لە خۆیانەوە بە ئارەزوو ئێوەیان پەرستووە، بەبێ ئەوەی ئێوە بانگیان بکەن؟ وەك خوای گەورە لە

---

[١] الطبري (١٩/٢٤٧).

[٢] الصافات (٦٢-٧٠)، واتە: ئایا ئەو (نیعمەتانەی باسکران) ڕێزگرتنو میواندارییە باشە یا (بەری) درەختی ژەقنەمووت، بێگومان ئێمە ئەو (دار)ەمان کردە هۆی تاقیکردنەوەی ستەمکاران (کە لە دنیادا گاڵتەیان پێ دەکرد)، بە ڕاستی ئەو (ژەقنەمووتە) درەختێکە لە بێخی دۆزەخدا دەڕوێت، بەروبوومەکەی دەڵێی سەری شەیتانەکاتە (ناشیرینو چڵ چڵاویە)، جا بێگومان ئەو (دۆزەخیانە) لەو درەختە دەخۆنو سکیان لە (بەری) ئەو درەختە پڕ دەکەن، لە پاشان بە ڕاستی ئاوێکی لیڵی زۆر گەرمی بەسەردا دەخۆنەوە، بێگومان دواتر گەڕانەوەیان بۆ دۆزەخە، بە ڕاستی ئەوان باوو باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی بینی، ئینجا ئەوان هان دەدران بۆ شوێن کەوتنیان (لە گومڕاییدا).

[٣] واتە: وە لەو ڕۆژەدا خوا ئەو (بت پەرست)انە کۆدەکاتەوە لەگەڵ ئەو پەرستراوانەی کە پەرستونیان جگە لە خوا.

[٤] الطبري (١٩/٢٤٧).

ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَاعِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ ۚ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾[1]، هەر لەبەر ئەوەیە خودای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە پەرستراون چۆن وەڵام ئەدەنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ واتە: (پەرستراوەکان) دەڵێن پاکو بێگەردی بۆ تۆ بۆ ئێمە شایستە نەبووە کە بێجگە لە تۆ پەرستراوێك بۆ خۆمان دابنێین. زۆرێك لە زانایان بە فەتحی نونەکە ئەم ئایەتەیان ﴿نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ خوێندووەتەوە. واتە: هیچ کەسێك لە دروست کراوەکان بۆیان نیە کەسی تر بپەرستن جگە لە تۆ نە لە ئەوانو نە لە ئێمەش، وە ئێمە بۆ ئەوەمان بانگ نەکردوون، بەڵکو خۆیان بە ئارەزوو ئێمەیان پەرستووە، بەبێ ڕەزامەندیو فەرمانی ئێمە. وە ئێمە زۆر دوورین لەوانەوەو لەو عیبادەتانەی ئەوانە کردوویانە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَٰؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا سُبْحَانَكَ﴾[2] وە هەندێ خوێندوویانەتەوە ﴿مَا كَانَ يَنبَغِي لَنَا أَن نُّتَّخَذَ مِن دُونِكَ مِنْ أَوْلِيَاءَ﴾ واتە: هیچ کەسێك بۆی نیە ئێمە بپەرستێت، ئێمە عەبدێکی زۆر لاوازو هەژارو بێدەسەڵاتی تۆین، ئەمە مانای نزیکە لەوەوە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِن مَّتَّعْتَهُمْ وَآبَاءَهُمْ﴾ واتە: بەڵام نازو نیعمەتت دا بە ئەوانو باوو باپیرانیان. یانی تەمەنێکی زۆریان بەسەر بردووەو وایان لێ هاتووە، ئەوەی بۆیان

---

[1] المائدة (١١٦–١١٧)، واتە: وە (بیر بکەنەوە) کاتێك خوا دەفەرموێت (لە ڕۆژی دواییدا) ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا تۆ وتووتە بە خەڵکی کە منو دایکم بە دوو پەرستراو دابنێن (و بمانپەرستن) لە جیانی خوا؟ (عیسا) وتی: پاکو بێگەردی بۆ تۆ ئەی خوایە نابێتو ناگونجێت بۆ من شتێك بڵێم کە بە هیچ شێوەیەك مافی من نیە، ئەگەر من ئەو قسەیەم کردبێت ئەوە بەڕاستی تۆ ئاگات لێیە چونکە تۆ ئەوەی لە دڵم دایە دەیزانی بەڵام من نازانمو بێ ئاگام لەو نهێنیەی کە لای تۆیە بە ڕاستی تەنها تۆ زانای تەواوی بە هەموو نهێنیەك، هیچم پێ نەوتوون بێجگە لەوە نەبێت کە تۆ فەرمانت پێ داوم کە بەندایەتی خوا بکەن کە پەروەردگاری منو ئێوەیشەو من شایەتو چاودێر بووم بەسەریانەوە تا لەناویاندا بووم ئینجا کاتێك تۆ منت بردەوە (بەرزت کردمەوە بۆ ئاسمان). ئەوەئیتر خۆت چاودێربوویت بەسەریانەوەوهەرتۆش شایەتی بەسەرهەموشتێکەوە..

[2] سبأ (٤٠–٤١)، واتە: وە ڕۆژێك (خوا) هەموویان کۆدەکاتەوە پاشان بە فریشتەکان دەفەرموێت ئایا ئەوانە (لە دنیا) ئێوەیان دەپەرست، (فریشتەکان) دەڵێن پاکو بێگەری بۆ تۆ.

ڕەوانەکراوە لەسەر زمانی پێغەمبەرانت کە بانگیان کردوون بۆ عیبادەتی تۆ بە تەنهاو شەریکت بۆ دانەنێن، لە بیریان چووەتەوە ﴿وَكَانُوا۟ قَوْمًۢا بُورًا﴾ واتە: وە ئەوانە کۆمەڵێکی تیاچووی بێخێربوون. ئیبنو عەباس دەڵێ: یانی: بوونە گەلێکی لەناو چوو.[1] حەسەنی بەسری‌و مالیك لە زوهریەوەدەگێڕنەوە ووتویەتی: واتە: بوونە گەلێکی بێخێر.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَدْ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە ئێوە دەتانپەرستن جگە لە خوداو واتان دەزانی دۆست‌و پشتیوانی ئێوەن‌و لە خودا نزیکتان دەخەنەوە، بە درۆیان خستنەوە، وەك ئەم ئایەتانەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾[3]، وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿فَمَا تَسْتَطِيعُونَ صَرْفًا وَلَا نَصْرًا﴾ واتە: ناتوانن سزایان لێ لادەن‌و ناشتوانن یارمەتی دەرێ بۆ خۆیان پەیدا بکەن، ﴿وَمَن يَظْلِم مِّنكُمْ نُذِقْهُ عَذَابًا كَبِيرًا﴾ واتە: وە هەر کەس لە ئێوە ستەم بکات سزایەکی گەورەی پێ دەچەژێن.

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ۗ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴿٢٠﴾﴾

## هەرچی پێغەمبەران لە پێشەوە هاتوون هەموو مرۆڤ بوون

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرانەی لە پێشەوە ناردوونی هەموویان خواردنیان خواردووەو پێویستیان پێی بووە، بە بازاڕیشدا گەڕاون بۆ ئاڵ‌و وێڵ‌و بازرگانی، ئەم کارانەیان هیچ خراپەیەکی تێدا نەبووە بۆ ئەو پلەو پایەو فەرمانەی پێی هەڵساون، خودای گەورە زۆر سیفەتی چاك‌و ڕەوشتی جوان‌و قسەی بەنرخ‌و ئاکاری تەواو موعجیزەی گەورەو بەڵگەی ئاشکرای پێداون، کە نیشانەی ئاشکران بۆ هەر کەسێك تۆزی ئاوەزی هەبێ‌و ڕاستەڕێی گرتبێتەبەر لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی پێغەمبەران هێناویانە لە لای خوداوە، نموونەی ئەم ئایەتە پیرۆزە زۆرە، خوای گەورە

---

[1] الطبري (١٩/٢٤٨).

[2] الطبري (١٩/٢٤٨).

[3] الاحقاف (٥-٦)، واتە: کێ گومڕاترە لەو کەسەی کە هاوار لە غەیری خوا بکات کە وەڵامی نادانەوە تا ڕۆژی دوایی وە ئەو (هاوار لێکراو)انە لە هاواری ئەوان بێئاگان، کاتێکیش خەڵك کۆدەکرێنەوە (لە قیامەتدا) پەرستراوەکان دەبنە دوژمنیان‌و (پەرستراوەکان) بە پەرستنەکەیان باوەڕ ناکەن.

دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ ﴾،[1] وە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ ﴾،[2] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ ﴾ واتە: هەندێکمان بە هەندێکی ترتان تاقی کردەوەو توشی بەڵامان کردن، بۆ ئەوەی بزانین کێ بەرفەرمانەو کێش سەرپێچی دەکاتو لە ڕێ لادەدات، بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ﴾ واتە: ئاخۆ خۆ ڕادەگرن، خودا دەزانێ کێ شایستەی ئەوەیە کە وەحی بۆ بێت وەك فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴾ واتە: خوا چاك دەزانێت پەیامو فرستادەی خۆی لە کوێ دادەنێ (و کێ شیاوترە بۆ ئەو کارە).وە کێ شایەنی ئەوەیە کە خودا ڕێی نیشان بدات بەو پەیامەی کە بەو پێغەمبەرانەدا بۆی ناردوونو کێ شایەنی نیە. محمدی کوڕی ئیسحاق لەم ئایەتەدا ﴿ وَمَا جَعَلۡنَٰهُمۡ جَسَدٗا لَّا يَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ ﴾ دەڵێ: خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەگەر مەیلم لێ بوایە دنیام وا لێ دەکرد لەگەڵ ئێغەمبەرەکانمدا بنو دژایەتی نەکەن، بەڵام ویستم عەبدەکانمی پێ تاقی بکەمەوەو ئێوەشیان پێ تاقی بکەمەوە،[3] لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەیازی کوڕی حیمارەوە (عیاض بن حمار) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گواستویەتیەوەکە فەرموویەتی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: من تۆتاقی دەکەمەوەو خەڵکیشت پێ تاقی دەکەمەوە).[4] وە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە سەرپشك – موخەیەر – کراوە لە نێوان ئەوەی پێغەمبەرو پاشا بێت یان عەبدو ڕەسولی خوا بێت، عەبدو ڕەسولی هەڵبژارد[5].

---

[1] یوسف (١٠٩)، واتە: وە ئێمە پێش تۆ (پێغەمبەرمان) نەناردووە جگە لە پیاوانێك کە نیگامان بۆ دەکردن لە خەڵکی شارەکان.

[2] الانبیاء (٨)، واتە: ئێمە ئەو پێغەمبەرانەمان نەکردۆتە پەیکەرێك کە خواردن نەخۆن.

[3] الطبري (١٩/٣٧٧).

[4] مسلم (٢٨٦٥).

[5] أحمد (٢/٢٣١).

## پێڕست

پلەو پایەی یوسف لە لای پاشای میسر ........................ ١
فەرمانڕەوایی یوسف ( سەلامی خوای لێبێت ) لەناو میسردا ........................ ٢
گەیشتنی براکانی یوسف بۆ ناو میسرو گەڕاندنەوەیان بە دەغڵو دانەوەو بەڵێندانیان بە هێناوی برا بچووکەکەیان بۆ میسر ........................ ٣
داواکردنیان لە یەعقوب تابنیامینیان لەگەڵدا بنێرێتو وەڵامی یەعقوب بۆئەوان ........................ ٥
دەرهێنانی دراوەکان لە بارەکانیاندا ........................ ٦
یەعقوب ( سەلامی خوای لێبێت ) فەرمانی دا بە کوڕەکانی لە چەند دەروازەیەکەوە بچنە ناو میسر ........................ ٧
یوسف سەرخۆشی لە بنیامین دەکاتو دڵی دەداتەوە ........................ ٨
دەفری ئاوخواردنەوەی پاشایان خستە ناو باری براکەیو بەو فێڵە بەند کرا ........................ ٨
براکانی یوسف یوسفیان تاوانبار کرد بە دزی ........................ ١١
پێشنیاری براکان کە یەکێکیان لە جێی بنیامین گل بدرێتەوە وقەبوڵ نەکردنی ئەو پێشنیارە ........................ ١٢
ڕاوێژکردنیانو گفتوگۆی برا گەورەکەیان لەگەڵیاندا ........................ ١٣
وەڵامی پێغەمبەری خودا( یەعقوب )و ژیانی دوای بیستنی ئەو هەواڵە پڕ ژانە ........................ ١٤
فەرماندان بە گەڕان بە دوای یوسفو براکەیدا ........................ ١٦
براکانی یوسف چوونە لای یوسف ........................ ١٦
یوسف خۆی ناساند بە براکانیو لێشیان خۆش بوو ........................ ١٧
کراسەکەی یوسفو بۆنی بەسەر یەعقوبدا ( سەلامی خوای لێبێت ) ........................ ١٩
یەهوزا کراسەکەی یوسفی بە مژدە هێنا بۆ یەعقوب ........................ ٢٠
پەشیمانی دەربڕینی براکانی یوسف ( سەلامی خوای لێبێت ) ........................ ٢٠
پێشوازیکردنی یوسف لە دایکو بابیو هاتنەدی ڕاستی خەونەکەی ........................ ٢١
لاڵانەوەو دوعاکردن بە کۆتا هێنانی ژیان بە ئیسلامەتی ........................ ٢٣
ئەوەی لە پێشەوە باس کرا لە بارەی ئەم بەسەرهاتانەوە هەموونیگا بوون لە لایەن خوداوە ........................ ٢٤
بیرنەکردنەوەی خەڵکی لەو نیشانانەی کە لەبەر دەستیاندایە ........................ ٢٥
ڕێگەی پێغەمبەر( ﷺ ) ........................ ٢٨
پێغەمبەران پیاوبوونومرۆڤیش بوون ........................ ٢٩
پێغەمبەران لە مرۆڤن، لە فریشتە نین ........................ ٢٩
پەند وەرگرتن لەوانەی پێشوو ........................ ٣٠
لە کاتی زۆر تەنگانەدا پێغەمبەران یارمەتی دەدرێنو سەردەخرێن ........................ ٣١
پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسێکە دەرسی وەربگرێت ........................ ٣٤
تەفسیری سورەتی ( الرعد ) ........................ ٣٥
قورئان قسەو گوفتاری خوایە ........................ ٣٥
باسی تەواویو کەمالی توانای خودا ........................ ٣٦

چوونە سەرتەخت ........ ٣٦
خستنەکاری خۆرو مانگ و هاتوچۆیان ........ ٣٧
نیشانەکانی خودا لەناو زەمیندا ........ ٣٨
تکولیکردن و بڕوا نەکردن بەژیانی دوای مردن سەیرە! ........ ٤٠
خوانەناسان پەلەی سزادانیانە ........ ٤١
موشریکەکان داوای بەڵگە دەکەن و وەڵامدانەوەی قورئانیش بۆیان ........ ٤٣
ئاگادارلە نهێنی هەر خودایە ........ ٤٤
زانستی خودا دەوری هەموو دیارو نادیارێکی داوە ........ ٤٦
فریشتە پارێزەرەکان ........ ٤٧
هەورو بروسکەو هەورەگرمە بەشێکن لە تواناو دەسەڵاتەکانی خودا ........ ٤٩
دوعاکردن لە کاتی هەورەگرمەدا ........ ٥٠
نموونەی بێدەسەڵاتی خوکانی بتپەرستان ........ ٥٢
هەموو شتێك سوژدە بۆ خودا دەبات ........ ٥٣
سەلماندنی یەکخوا پەرستی ( التوحید ) ........ ٥٤
دوو نموونە لەسەر مانەوەی هەق و لەناوچوونی پڕو پووچی ........ ٥٦
نموونەی ئەو ئاوو ئاگرە لە قورئان و فەرموودەدا هەیە ........ ٥٧
پاداشتی بەختەوەران و بەدبەختان ........ ٥٩
خاوەن باوەڕو خوانەناس وەك یەك نین ........ ٦٠
ئەو ڕەوشتانەی بوونەتە هۆی چوونە بەهەشتی پیاوچاکان ........ ٦١
ڕەوشتە ناشیرینەکانی بەدبەختان کە دەبێتە هۆی چارەڕەشی و نەفرەت لێ کردنیان ........ ٦٣
فراوانی ڕۆزی و کەمی ڕۆزی بە دەستی خودایە ........ ٦٤
موشریکەکان وداوای بەڵگەکردنیان وەڵامدانەوەی خواش بۆیان ........ ٦٥
ئارامگربوونی دڵی خاوەن باوەڕ بە یادی خودا ........ ٦٧
ڕوون کردنەوەی ووشەی ( طوبى ) ........ ٦٧
مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر خوێندنەوەی ئەو پەیامەیە بۆی هاتووەو بانگکردنی خەڵکیە بۆی ........ ٦٨
ڕێزی قورئان و لاساری خوانەناسان ........ ٧٠
دڵدانەوەی پێغەمبەر( ﷺ ) ........ ٧٢
هیچ هاوبەشیەك لە نێوان خوداو پەرستراوی موشریکەکاندا نیە لە هیچ ڕوویەکەوە ........ ٧٣
باسی تۆڵە سەندن لە خوانەناسان و پاداشتی پیاوچاکان ........ ٧٥
خەڵکەڕاستگۆکان لە ئەهلی کتێب دڵخۆشن بەوەی هاتووەتە خوارەوە بۆ موحەمەد ( ﷺ ) ........ ٧٨
پێغەمبەران مرۆڤ بوون ........ ٨٠
بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە، تەنها بەڵگەیەك بێنێت مەگین خودا ئیزنی دابێت ........ ٨١
مانای ﴿يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ﴾ ........ ٨١

